# القرآن الكريم

وترجمة معانيه إلى

اللغة الكردية

إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ

إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ فِي كِتَابٍ مَكْنُونٍ لَا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ تَنْزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ

خادم الحرمين الشريفين مەلیك عبدالله کوڕی عبد العزیز ئال سعود
مەلیکی شانشینی عەرەبستانی سعودیە شەرەفمەندبوو بەبڕیاردان لەسەر چاپکردنی
قورئانی پیرۆز لەگەڵ وەرگێڕانی ماناکانی

تشرّف بالأمر بطباعة هذا المصحف الشريف وترجمة معانيه
خادم الحرمين الشريفين الملك عبد الله بن عبد العزيز آل سعود
ملك المملكة العربية السعودية

# القرآن الكريم

## وترجمة معانيه إلى اللغة الكردية

مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف

ئەم قورئانە پیرۆزە لەگەڵ وەرگێڕانی ماناکانی
دیاری ( خادم الحرمين الشريفين ) مەلیك عبدالله كوڕی عبدالعزیز ئال سعودە
( بەخۆڕایی دابەش دەكرێت )

# قورئانی پیرۆز

## لەگەڵ وەرگێڕانی ماناكانی بۆ زمانی كوردی

كۆمەڵگەی مەلیك فەهد بۆ چاپكردنی قورئانی پیرۆز

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## مقدمة

بقلم معالي الشيخ: صالح بن عبدالعزيز بن محمد آل الشيخ
وزير الشؤون الإسلامية والأوقاف والدعوة والإرشاد
المشرف العام على المجمع

الحمد لله رب العالمين ، القائل في كتابه الكريم: ﴿... قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ﴾.

والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين، نبينا محمد، القائل: « خيركم من تعلّم القرآن وعلّمه ».

أما بعد:

فإنفاذاً لتوجيهات خادم الحرمين الشريفين، الملك عبد الله بن عبد العزيز آل سعود، حفظه الله، بالعناية بكتاب الله، والعمل على تيسير نشره، وتوزيعه بين المسلمين، في مشارق الأرض ومغاربها، وتفسيره، وترجمة معانيه إلى مختلف لغات العالم.

وإيماناً من وزارة الشؤون الإسلامية والأوقاف والدعوة والإرشاد بالمملكة العربية السعودية بأهمية ترجمة معاني القرآن الكريم إلى جميع لغات العالم المهمة تسهيلاً لفهمه على المسلمين الناطقين بغير العربية، وتحقيقاً للبلاغ المأمور به في قوله صلى الله عليه وسلم: « بلّغوا عني ولو آية ».

وخدمة لإخواننا الناطقين باللغة الكردية يطيب لمجمع الملك

فهد لطباعة المصحف الشريف بالمدينة المنورة أن يقدم للقارئ الكريم هذه الترجمة إلى اللغة الكردية التي قام بها فضيلة الشيخ ملا محمد ملا صالح الباموكي، وراجعها من قبل المجمع كل من فضيلة الدكتور كمال صادق ياسين لَكْ، وفضيلة الأستاذ أوميد عمر الجرُوستَاني.

ونحمد الله سبحانه وتعالى أن وفق لإنجاز هذا العمل العظيم الذي نرجو أن يكون خالصاً لوجهه الكريم، وأن ينفع به الناس.

إننا لندرك أن ترجمة معاني القرآن الكريم - مهما بلغت دقتها - ستكون قاصرة عن أداء المعاني العظيمة التي يدل عليها النص القرآني المعجز، وأن المعاني التي تؤديها الترجمة إنما هي حصيلة ما بلغه علم المترجم في فهم كتاب الله الكريم، وأنه يعتريها ما يعتري عمل البشر كلّه من خطأ ونقص.

ومن ثم نرجو من كل قارئ لهذه الترجمة أن يوافي مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف بالمدينة النبوية بما قد يجده فيها من خطأ أو نقص أو زيادة للإفادة من الاستدراكات في الطبعات القادمة إن شاء الله.

والله الموفق، وهو الهادي إلى سواء السبيل، اللَّهُمَّ تقبل منا إنك أنت السميع العليم.

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

**بە پێنووسی پایەدار شیخ صالح کوڕی عبدالعزیز کوڕی محمد ئالی شیخ**
**وەزیری کاروباری ئیسلامی وئەوقاف وبانگەواز وئیرشاد وسەرپەرشتیاری گشتی**
**کۆمەڵگەی مەلیك فەهد بۆ چاپکردنی قورئانی پیرۆز**

سوپاس وستایش بۆخوای پەروردگاری جیهانیان کە لەکتێبە پیرۆزکەی دا فەرموویەتی: ﴿قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ﴾ واتە: بێگومان لەلایەن خوای گەورەوە نوور وکتێبێکی ڕوون وئاشکراتان بۆ هاتووە.

وەدروودوسڵاوبۆسەربەرێزترینی پێغەمبەران ونێردراوان، پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ) کەفەرموویەتی: «خیرکم من تعلم القرآن وعلّمه» واتە : چاکترینتان ئەوکەسەیەکەخۆی فێری قورئان دەکات وخەڵکیش فێردەکات.

ئەمجا لە پاشان :

بۆجێبەجێکردنی ڕێنمایەکانی (خادم الحرمين الشريفين) مەلیك عبدالله کوڕی عبدالعزیز ئالی سعود (خوا بیپارێزێت) بە بایەخ وگرنگی پێدان بەقورئانی پیرۆز وکارکردن بۆ ئاسانکاری لە پێناو بڵاوکردنەوە ودابەشکردنی لەنێو موسڵمانان لەڕۆژهەڵات وڕۆژئاوای سەر زەویدا، وە بۆ ڕاڤەکردن و وەرگێڕانی ماناکانی قورئان بۆ زمانە جۆراوجۆرەکانی جیهان .

وەزارەتی کاروباری ئیسلامی وئەوقاف وبانگەواز وئیرشاد لەشانشینی عەرەبستانی سعودیە، باوەڕی پتەوی هەیە بەگرنگی وەرگێڕانی ماناکانی قورئانی پیرۆز بۆگشت زمانە گرنگەکانی جیهان، بەمەبەستی ئاسانکردنی تێگەیشتنی قورئان بۆئەو موسڵمانانەی کەبە غەیری زمانی عەرەبی قسە دەکەن، ئەمەش لە پێناوجێبەجێکردنی ئەو فەرمانەی کە لەفەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دا هاتووە، کە دەفەرموێت : «بَلِّغُوا عَنِّي وَلَو آيَة »واتە : لە منەوە ڕایبگەیەنن بەخەڵکی ئەگەر تەنها تاکە ئایەتێکیش بێت.

وەك خزمەتێكیش بۆ ئەو برایانەمان كە بەزمانی كوردی قسە دەكەن، كۆمەڵگەی مەلیك فەهد بۆچاپكردنی قورئانی پیرۆز لە مەدینەی منەووەرە، خۆشحاڵە ئەم تەرجەمە قورئانیە بەزمانی كوردی پێشكەش بەخوێنەری بەڕێزی بكات، كە بەڕێز جەنابی **(مامۆستا مەلا محمد مەلا صالح بامۆكی)** پێی هەستاوە، وە لەلایەن كۆمەڵگەی مەلیك فەهد بۆ چاپكردنی قورئانی پیرۆزیش هەریەك لە بەڕێزان : **(دكتۆر كەمال صادق یاسین لەك)** و **(مامۆستا ئومێد عمر چرۆستانی)** پێیداچوونەتەوە .

وەسوپاسی خوای گەورە وپاك وبێگەرد وبالادەست دەكەین بۆئەنجام دانی ئەم كارە مەزنە، وە ئومێدەوارین كەنیاز ومەبەست لێی تەنها ڕەزامەندی خوای گەورە بێت، وخەڵكیش لێی سوودمەند بن ؟

بێگومان ئێمە دەزانین كە تەرجەمە و وەرگێڕانی ماناكانی قورئانی پیرۆز – هەرچەندە وورد بێت – كەموكورتی هەر دەبێت وناتوانرێت دەقاودەق ئەو مانا گەورانە بگەیەنێت كە دەقی قورئانی پیرۆز دەیبەخشێت، كە تەواوی خەڵكی لەئاست خۆیدا دەستەوسانكردووە، وە بەڕاستی ئەو مانایەی كە تەرجەمەی قورئانەكە دەیدات بەدەستەوە تەنها بریتی یە لەكۆی زانست وتێگەیشتنی وەرگێڕەكە لە قورئانی پیرۆز، وە ئەمەش كارێكە دووچاری هەڵەوكەم وكوڕی دەبێت، وەك هەمووو كار وئیشێكی تری ئادەمیزاد.

وە لە كۆتاییدا داواكارین لەهەموخوێنەرێكی ئەم تەرجەمەیە لەكاتی بینینی هەر هەڵە وكەموكوڕییەك یان زیادییەك ئەگەر هەبوو، ئاگاداری كۆمەڵگەی مەلیك فەهد بۆ چاپكردنی قورئانی پیرۆز لە مەدینەی مونەووەرە بكاتەوە؛ بۆسوود لێ وەرگرتن وچاككردنیان لە چاپەكانی داهاتوودا بەیارمەتی و وویسی خوای گەورە.

وە خوای گەورەش پشت وپەنایە وتەنها ئەو ڕێ نیشاندەرە بۆ ڕێگای ڕاست.

ئەی خوای پەروەردگار ئەم كارەمان لێ قەبوڵ بكە؛ چونكە بەڕاستی هەر تۆی بیسەر و زانا.




## سورەتی ﴿ الفَاتِحَة ﴾

ئەم سوورەتە ناونراوە (الفاتحة) چونكە قورئانی پیرۆز لەسەرەتاوە بەو دەست پێ دەكات ودەكرێتەوە، وە پێیشی دەوترێت ( المثانـي) چونكـە لەهەمـوو ڕكاتێكـی نوێژدا دەخوێنرێت .

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای
بەخشندەی میهرەبان ﴿١﴾ ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ﴾
هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خوای
﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ پەروەرد گاری
جیهانیان ﴿٢﴾ ﴿الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾
بەخشندەی میهرەبان، ( الرحمن ) بەو
مانایەی ڕەحم وبەزەیی پەروەردگار لەم
جیهانەدا هەموو مەخلوقاتی گرتوەتەوە
بەبێ باوەڕانیشەوە، وە (الرحیم) ڕەحم
وبەزەیی پەروەردگار، وەك زانایان دەڵێن
تایبەتە بەبڕوادارانەوە لە ڕۆژی دواییدا ﴿٣﴾
﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ ( تەنها ئەوە )
خاوەنی ڕۆژی سزا وپاداشت
دانەوە (باوەڕداران لە نوێژەكانیاندا هەموو ڕكاتێك ئەمە دەڵێنەوە، تاوەكو هەمیشە ڕۆژی دواییان
لەبیر بێت وبەكار وكردەوەی چاكە، خۆیانی بۆ ئامادە بكەن) ﴿٤﴾ ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ (خوایە
تەنها تۆدەپەرستین ( تەنها تۆیت شایستەی پەرستن وجگە لە تۆ هیچ كەس شیاوی ئەوە نییە)
﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ وە تەنها لەتۆ داوای یارمەتیی دەكەین (لەهەموو كار وكردەوە وپێداویستیەكماندا،
چونكە هەموو فەرمانێك بەدەست تۆیە، جگە لە تۆ هیچ كەس بەئەندازەی گەردیلەیەك خاوەنی
هیچ شتێك نییە) ﴿٥﴾ ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ ڕێنموونیمان بكە بۆڕێگای ڕاستی
(كە ڕێگای ڕاستی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە، وەبەردەوام بین لەسەری هەتا ئەو ڕۆژەی دەگەین بەدیداری
زاتی هەق تەعالای تۆ) ﴿٦﴾ ﴿صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ ڕێگای ئەوانەی كەچاكەت لەگەڵ كردوون
(لەپێغەمبەران وڕاستگۆیان وشەهیدان وچاكەكاران) ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾ نەك (ڕێگای) ئەوانەی
خەشمی ( تۆیان ) لێگیراوە ( وەك جولەكەو هاوكردەوەكانیان ) ﴿وَلَا الضَّالِّينَ﴾ وە نەك ( ڕێگای )
گومڕایان وەك ( گاورەكان و هاوكردەوەكانیان) ﴿٧﴾ لەكۆتایی ئەم سوورەتە پیرۆزەوە سوننەتە موسڵمانان
بڵێن ( ئامین ) واتە : ئەی خوای گەورە تەواوی ئەم نزا وداوایانەمان لێ وەربگرە .




## سورەتی ﴿ ٱلۡبَقَرَةِ ﴾

﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ الٓمٓ ﴾ بە (ئەلیف، لام، میم)
دەخوێنرێتەوە، خوای گەورە زاناترە
بە واتاکەی [1] (١) ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ ﴾ ئەم
قورئانە ﴿ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ ﴾ هیچ گومانێکی
تێدا نیە ( کە لەلایەن خوای گەورەوە
نێرراوە ) ﴿ هُدٗى ﴾ ڕێ نیشاندەری
﴿ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾ پارێزکارو لەخوتراسانە
(پارێزکاران ولەخوا ترسان بەزانست
وزانیاری بەسوود وکار وکردەوەی چاکە
سوودی لێ وەردەگرن، چونکە ئەوانن
لەپەروەردگاریان دەترسن وشوێن
فەرمان وڕێنمایەکانی دەکەون) (٢)
﴿ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ ﴾ ئەوانەی کەبڕوا دەهێنن
﴿ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾ بەشتە پەنهان ونادیارەکان
(ئەو شتە پەنهانەی کە بە حەواس وعەقڵی
مرۆڤ هەستیان پێ ناکرێت، لە ڕێگەی
وەحیەوە نەبێت، وەك باوەڕ بەفریشتەکان وبەهەشت ودۆزەخ وزۆر شتی تریش...) ﴿ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ وە نوێژ
دەکەن (بەڕێك وپێکی ولەکاتی خۆیدا ئەنجامی ئەدەن) ﴿ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾ لەوەی کردوومانە بەڕزق
وڕۆزیان دەبەخشن (لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە) (٣) ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ ﴾ وە ئەوانەی کەبڕوا
دەهێنن بەو قورئانەی کە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ نێرراوە) ﴿ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ ﴾ وە بەو کتێبانەشی کە بۆ
(پێغەمبەران ونێرراوانی) پێش تۆ نێرراونەتە خوارەوە ﴿ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴾ وەبڕوایان هەیە بەڕۆژی دوایی (٤)
﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ ﴾ (خاوەنی ئەم صیفەتانە) لەسەر ڕێگای ڕاستن ( بەتەوفیق ویارمەتیدان) لە لایەن
پەروەردگاریانەوە ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ وە هەر ئەوانەن ڕزگار بووان ( لە دوونیا ودواڕۆژدا) (٥)

(١) ئەم پیتانەی کە لەسەرەتای هەندێك لەسورەتەکانی قورئاندا هاتوون، تەنها خوای گەورە دەزانێت مەبەستی پێیان چیە، ئەمە ڕاسترین تەفسیرە بۆ ئەم پیتانە کرابێت، بەڵام بەچەند جۆرێکی تریش تەفسیرکراون لەوانە : ئەم پیتانە ناون بۆ ئەوسورەتانەی لەسەرەتایانەوە هاتوون، یان ناون بۆ خوای گەورە، یان بۆ دەستەوسانکردنی عەرەبە بێباوەڕەکانە کە دەیانووت ئەم قورئانە لەلایەن خوداوە نەهاتووە خوارەوە بۆ موحەممەد (ﷺ) پێیان دەڵێت : دەی ئەگەر وایە وێنە وهاوشێوەی ئەم قورئانە بهێنن، کە هەر لەو پیتانە پێکهاتووە کە ئێوە قسەی پێ دەکەن و بەکاریان دەهێنن .

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ بۆ ئەوان چوون یەکە
﴿ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ﴾ بیان ترسێنیت یان نەیان ترسێنیت ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بڕواناهێنن ﴿٦﴾ ﴿خَتَمَ
ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ﴾ خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و گوێیاندا ﴿وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ﴾ وە
پەردە بەسەر چاویانەوەیە ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ وە سزای زۆرگەورەیان بۆ هەیە ﴿٧﴾ ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن يَقُولُ﴾ وەلەناو خەڵکیدا هەندێ کەس هەیە کەدەڵێ: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ بڕوامان هێناوە
بەخواو بەڕۆژی دوایی ﴿وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان بڕوادار نین ﴿٨﴾ ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾
(بەلای خۆیانەوە) خواو ئەوکەسانە دەخەڵەتێنن کە بڕوایان هێناوە ! ﴿وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ﴾
کەس ناخەڵەتێنن تەنها خۆیان نەبێت ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ﴾ بەڵام هەستی پێ ناکەن ﴿٩﴾ ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ﴾
لە دڵیاندا نەخۆشی ( ناپاکی) هەیە ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ﴾ خواش نەخۆشی یەکەی زۆرتر کردن
(بەهاتنی قورئان) ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ﴾ وە سزای سەختیان بۆ هەیە بەهۆی ئەو
درۆیانەوە کە دەیان کرد (و دەیان وت بڕوامان هەیە) ﴿١٠﴾ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ﴾ وەکاتێك پێ یان بووترایە
﴿لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئاشوب مەنێنەوە لەزەوی دا (ئاژاوە بەرپا مەکەن لە وڵاتدا) ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ﴾
دەیان ووت : ئێمە هەر چاکەکارین (ڕێکخەرین) ﴿١١﴾ ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ﴾ ئاگادار بن کەبەڕاستی
هەر ئەوانن ئاشوبگێڕ ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ﴾ بەڵام هەستی پێ ناکەن ﴿١٢﴾ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ﴾ وەکاتێ پێ
یان بووترایە ﴿ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾ بڕوا بێنن وەك ئەوخەڵکانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ﴾
دەیان ووت: چۆن ئێمە بڕوابێنین ﴿كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ﴾ وەك ئەوگێل ونەفامانەی کە بڕوایان هێناوە
﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ بێدار بن کە بە ڕاستی هەرخۆیان گێل و نەفامن ﴿وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام
نازانن ﴿١٣﴾ ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ وەکاتێ (ناپاکان) بگەشتنایە بەوانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾
دەیانو وت : ئێمەش بڕوامان هێناوە ﴿وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ﴾ کاتێکیش بەتەنیا بوونایە لەگەڵ گەورە
فێڵبازەکانیان ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ﴾ دەیانووت : ئێمە هەر لەگەڵ ئێوەین ﴿إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ﴾ بێگومان
ئێمە هەر گاڵتە کەرین (بەوان) ﴿١٤﴾ ﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ﴾ خوا گاڵتە بەوان دەکات (لە بەرانبەر گاڵتە
کردنەکەیان) ﴿وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾ وەماوەیان دەدات تا لەسەرکەشیی خۆیاندا سەر لێ شێواو
بن ﴿١٥﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ﴾ ئەمانە ئەوانەن کە گومڕاییان کڕی ﴿بِٱلۡهُدَىٰ﴾ بە ڕێنموونیی
﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ﴾ جا نە بازرگانی یەکەیان قازانجی کردو ﴿وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ﴾ نە ڕێبازی
ڕاستیان گرت ﴿١٦﴾

﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا﴾ (دوو ڕووەكان) وێنەیان وەك یەكێك وایە كە (لەشەوێكی تاریكدا)
ئاگرێك هەڵگیرسێنێت ﴿فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ﴾ كە لەگەڵ دەوروبەری ڕووناك كردەوە ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ
بِنُورِهِمْ﴾ خوا (خێرا) ڕووناكی یەكەیان لێ بكوژێنێتەوە ﴿وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ﴾ وە بیان
هێڵێتەوە لەناو چەند تاریكیەكی وادا كەهیچ نەبینن ﴿١٧﴾ ﴿صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ﴾ كەڕو لاڵ و كوێرن ﴿فَهُمْ
لَا يَرْجِعُونَ﴾ بۆیە (لە گومڕایی خۆیان) ناگەڕێنەوە ﴿١٨﴾ ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ یا وەك (كەسانێك
لەچۆڵییەكدا) بارانێكی لێزمەوبەخوڕیان (لێ داكات) لەئاسمانەوە ﴿فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ﴾ كەتاریكی
زۆر و هەورە تریشقەو بروسكەی تێدا بێت ﴿يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ﴾ (بەجۆرێك كە)
پەنجەكانیان دەكەن بە گوێیاندا لەبەر گرمەی هەورە تریشقەكان ﴿حَذَرَ ٱلْمَوْتِ﴾ بۆخۆپاراستن لەمردن
﴿وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ﴾ وە خودا دەوری بێ بڕوایانی داوە ﴿١٩﴾ ﴿يَكَادُ ٱلْبَرْقُ﴾ نزیك بێ ئەو بروسكەیە
﴿يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ﴾ (بینایی) چاویان بفڕێنێ ﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم﴾ هەركاتێ ڕووناكیی بۆ بدانایەتەوە
﴿مَّشَوْا۟ فِيهِ﴾ تیایدا بڕۆشتنایە ﴿وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ﴾ وە كاتێ تاریكیشی بكردایە لێیان ﴿قَامُوا۟﴾ لەجێگەی
خۆیان ڕادەمان (دەوەستان) ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئەگەر خودا بیویستایە ﴿لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ﴾ (بەو
هەورەگرمە و بروسكانە) كەڕو كوێری دەكردن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان خوا بەسەر
هەموو شتێكدا دەسەڵاتدارە ﴿٢٠﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی خەڵكینە ﴿ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ﴾ پەروەردگارتان
بپەرستن ﴿ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ كەئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست كردووە ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾
بەڵكو بەو پەرستنە خۆتان بپارێزن ﴿٢١﴾ ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا﴾ ئەو (خوایەی) كەزەوی بۆ
ڕاخستوون ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾ وە ئاسمانی بۆ كردوون بەكۆشك (ئاسمانی بۆ گێڕاون بەگومەزی)
﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ وەئاوی (بارانی) لەئاسمانەوە هێناوەتە خوارەوە ﴿فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا
لَّكُمْ﴾ ئەمجا دەری هێناوە بەو ئاوە هەموو جۆرە میوە و بەروبومێك بۆ ڕۆزیی ئێوە ﴿فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ
أَندَادًا﴾ كەواتە هاوتا بۆخوا پەیدامەكەن. ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ كەئێوە خۆتان دەزانن (بێ هاوتایە) ﴿٢٢﴾
﴿وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ﴾ وەئەگەر ئێوە لەگومان دان ﴿مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾ لەم (قورئانەی) كەناردومانەتە
خوارەوە بۆ بەندەی خۆمان (موحەممەد ﷺ) ﴿فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ﴾ دە سورەتێك بێنن بەوێنەی ئەو
﴿وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ وە بانگی هاوكارەكانتان بكەن (لەڕەوان بێژان وشاعیران) بێجگەلە
خوا ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست دەكەن، (بەفەرموودەی خوای نازانن) ﴿٢٣﴾ ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟﴾
ئەمجا ئەگەر ئەمەتان نەكرد؟ ﴿وَلَن تَفْعَلُوا۟﴾ وە هەرگیز نایشی كەن (ئیتر بێ بڕوامەبن) ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ
ٱلَّتِى﴾ دەی خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ﴾ كە سوتەمەنی یەكەی خەڵك
(ی بەدكار) وبەردە ﴿أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ﴾ بۆبێ بڕوایان ساز كراوە (ئامادە كراوە) ﴿٢٤﴾

﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) مـژدە بـدە بەوانەی ﴿ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ کـە باوەڕیان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکانیان کـردووە ﴿أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ﴾ کـە بێگومـان بۆئـەوان هەیـە بەهەشـتانێك ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ کەجۆگـە ئـاوی زۆر بەژێریانـدا دەڕوات ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا﴾ هەرکاتێ لەوێ ڕۆزییان بدرێت لە میوەهات ﴿قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾ دەڵێن: ئەمە ئەوەیە کەلەمەو پێش پێمان درا (جیاواز لەتام وبۆندا) ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ ئێستا وێنەیان هێناوە ﴿وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ وەلـەو بەهەشـتانەدا بۆئـەوان هەیە هاوسـەرانی پاکیـزە ﴿وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ وەئەوان لەو (بەهەشـتانە) دا هەتـا هەتاییـن ﴿٢٥﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ﴾ بێگومان خوا شـەرم ناکات ﴿أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا﴾ بەوەی کە (بۆ تێگەیاندنی خەڵك) هەر نموونەیەك بهێنێتەوە ﴿بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾ بە مێشولەو بچوکتر (یاگەورەتـر) لەویـش ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەمجـا ئەوانەی کەبـاوەڕدارن ﴿فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ ئەوە چاك دەزانن کەئەو (نموونە هێنانەوەیە) ڕاست ودروستە لە پەروەردگاریانەوە ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانـەش کە بێ باوەڕن ﴿فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا﴾ دەڵێن: خوا چی ویسـتووە بـەم نموونە هێنانەوەیە ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا﴾ زۆر کەسـی پێ گومـڕادەکات ﴿وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا﴾ وە ڕێنموونـی زۆر کەسیشـی پـێ دەکات ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ وە گومڕانـاکات بـەو نموونـە هێنانەوەیە مەگەر بەدکاران نەبێت ﴿٢٦﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی کەپەیمانی خوا دەشـکێنن و(هەڵـی دەوەشـێننەوە) ﴿مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ پاش بەسـتنی ﴿وَيَقْطَعُونَ﴾ وە ئەیپچڕێنن ﴿مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ ئەو (پەیوەندیانە) ی کەخوا فەرمانی داوە بەپەیوەستیی کردنی ﴿وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وەلەزەویدا خراپە دەکەن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ هەر ئەوانن زەرەرمەند و ڕەنجەڕۆ ﴿٢٧﴾ ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ﴾ چـۆن بـێ باوەڕ دەبن بەخـوا!؟ ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ﴾ لەکاتێکدا کەئێوە بـێ گیان بوون، و گیانـی بەبـەردا کـردن ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ لەپاشـان دەتان مرێنـێ دوای ئـەوەش زیندووتان دەکاتەوە ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ ئەمجا بۆلای خۆی دەگەڕێنرێنەوە ﴿٢٨﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِى﴾ خوا ئەو خوایەیە ﴿خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ کەهەرچـی لەزەویی دایە دروسـتی کـردوە بۆئێوە ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ پاشـان ویسـتی ئاسـمان دروسـت بـکات ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ ئەمجـا ڕێکـی خسـتن بەحەوت ئاسمان ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ وە ئەو ئاگادارە بەهەموو شتێك ﴿٢٩﴾

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ (بیریـان بێنـەوە) كاتێـك كەپەروەردگـاری تـۆ بـە فریشـتەكانی ووت
﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ بەڕاسـتی من جێ نشـینێك دروسـت دەكەم لەسەر زەوی ﴿قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا
مَن﴾ (فریشـتەكان) ووتیان: ئایا كەسێكی وای تیا دروسـت دەكەیت ﴿يُفْسِدُ فِيهَا﴾ كە خراپەو بەدیی
تێدا بـكات ﴿وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ وە خوێنـی تیـا بڕێـژێ ؟ ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ﴾ لـە كاتێكدا كـە ئێمە
یـادت دەكەیـن بەسـتایش كردنـت ﴿وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ وە بەپـاك ڕات دەگرین ﴿قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾
(خـوا) فەرموی: بێگومان ئـەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانـن (٣٠) ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا﴾ خوا ناوی
هەموو شتێكی فێری ئادەم كرد ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ لەپاشان ئەو شتانەی نیشانی فریشتەكان دا
﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ وە (خوا پێی) فەرموون: ناوی ئەمانەم پێ بڵێن ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر
ڕاسـت دەكـەن، (كە ئێوە لـە ئادەم باشـترن) (٣١) ﴿قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ﴾ (هەمـوو) ووتیان: خوایـە تۆ پاكیت
لەهەڵـە ﴿لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ﴾ ئێمـە هیچ نازانین، مەگـەر ئەوەی كە خۆت فێـرت كردبین ﴿إِنَّكَ أَنتَ
ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بەڕاسـتی هـەر تۆیت زانـاو دانا (٣٢) ﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ﴾ (خوا) فەرمـووی: ئەی ئادەم ﴿أَنۢبِئْهُم
بِأَسْمَآئِهِمْ﴾ نـاوی ئەو شـتانەیان پـێ بڵـێ ﴿فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ﴾ جاكاتێك كە ناوەكانـی پێ ووتن
﴿قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ﴾ (خـوا) فەرمـووی: ئەی پێـم نەووتـن؟ ﴿إِنِّيٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ بێگومان
من ئاگادارم بەنهێنیی ئاسـمانەكان و زەوی ﴿وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ﴾ وە ئاگادارم بەوەی كەئاشكرای دەكەن
﴿وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾ وە بەئـەوەش كـە دەیشـارنەوە (٣٣) ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ (بێنـەوە بیـرت) كاتێك
ووتمـان بە فریشـتەكان ﴿ٱسْجُدُواْ لِأٓدَمَ﴾ سـوژدە ببەن بۆ ئـادەم ﴿فَسَجَدُوٓاْ﴾ جا(هەموو) سـوژدەیان برد
﴿إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ﴾ شەیتان نەبێت كە گوێی نەدایەو خۆی بەگەورە زانی ﴿وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ وە لە
بـێ بڕوایان بوو (٣٤) ﴿وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ﴾ وە ووتمـان: ئەی ئادەم ﴿ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ﴾ خۆت و ژنەكەت
نیشتەجێ بن لەم بەهەشتەدا ﴿وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا﴾ وە لە هەموو خواردەمەنی یەكی بخۆن بەتێرو تەسەلی
﴿حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ لەهەر شوێنێك كەحەز دەكەن ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ وە نزییكی ئەم درەختە مەكەون
﴿فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ تا لە ستەمكاران نەژمێردرێن - تا نەبنە ستەمكار- (٣٥) ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا﴾ ئەمجا
شـەیتان هەڵی خەڵەتاندن لە بەهەشـتدا ﴿فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ﴾ وەلەو خۆشگوزەرانیەی كە تێیدابوون
دەری پەڕاندن ﴿وَقُلْنَا ٱهْبِطُواْ﴾ وە ووتمان: (بە ئادەم وحەواو شـەیتان) بچنە خوارەوە(بۆ سەر زەوی)
﴿بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ هەندێكتـان دوژمن ئەبن لەگـەڵ هەندێكتاندا ﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ﴾ وە بۆتان
هەیـە جێگیربوون لەسـەر زەوی ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ﴾ وە بەهرەمەنـدی(و ئارەزووی دونیـا) تاماوەیەك (٣٦)
﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ ئەمجائادەم چەندووتەیەكی (پاڕانەوەی) لەپەروەردگارییەوەوەرگرت ﴿فَتَابَ
عَلَيْهِ﴾ (ئەویش)لێی گیراكرد ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەر ئەو تەوبەگیراكەری میهرەبانە (٣٧)

﴿قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ﴾ ووتمـان: هەمـوو بچنە خوارەوە لە بەهەشـت ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى﴾ ئەمجا
ئەگەر لەمنەوە ڕێنموونی یەکتان بۆ هات ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ﴾ ئەو کەسەی دوای ڕێنموونیی من کەوت
﴿فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ نە ترسیان لەسـەرەو نەخەم دەخۆن ﴿٣٨﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ وە
ئەوانەی کەبێ بڕوابوون و نیشانە و ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ ئەوانە هاوەڵ
و هاودەمـی ئاگرن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ تیایدا ئەمێننەوە بەهەتا هەتایی وهەمیشـەیی ﴿٣٩﴾ ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾
ئەی بەنی ئیسرائیل (نەوەکانی یەعقوب) ﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ﴾ بیری ئەو چاکانە بکەنەوە کە
ڕشـتوومن بەسـەرتاندا ﴿وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ﴾ وە پەیمانی من ببەنەسـەر ﴿أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ﴾ تا منیش پەیمانی ئێوە
ببەمەسەر ﴿وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ﴾ وەهەر لە من بترسن ﴿٤٠﴾ ﴿وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ﴾ هەروەها بڕوا بهێنن بەو قورئانەی
کەناردوومەتە خوارەوە ﴿مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ﴾ کە پشـتیوانی پەیامەکـەی لای ئێوەیە (تەورات و ئینجیلی
دەستکاری نەکراو) ﴿وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ﴾ وە ئێوە مەبن بەیەکەمین بێ بڕوا بەو قورئانە ﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ
بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا﴾ وە نیشـانە و ئایەتەکانی من مەگۆڕنەوە بەشـتێکی کەم نرخ ﴿وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ﴾ وەهەر لە
(بـێ فەرمانـی) من خۆتان بپارێزن ﴿٤١﴾ ﴿وَلَا تَلۡبِسُواْ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ﴾ ڕاسـت و ڕەوا تێکـەڵ مەکەن بەناڕەواو
درۆ ﴿وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ حـەق و ڕاسـتی مەشـارنەوە، لەکاتێکـدا کـە خۆتان ئەمـە دەزانن ﴿٤٢﴾
﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ نوێـژ بکـەن و زەکات بـدەن ﴿وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾ وەلەگـەڵ
کڕنـوش بەرانـدا کڕنوش بەرن (بۆ خـودا) ﴿٤٣﴾ ﴿أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ﴾ ئایا فەرمان بەسـەر خەڵکیدا
دەدەن بەچاکـە ؟ ﴿وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ﴾ وە خۆتـان فەرامـۆش دەکـەن ﴿وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ﴾ (لەگـەڵ
ئەمەشـدا) کەئێـوە پەڕاوەکە(تەورات) دەخوێننەوە ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایـا ژیرنابن و تێ ناگەن ؟ ﴿٤٤﴾
﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ﴾ پەنا ببەنە بەرئارام گرتن ونوێژکردن(بۆ بە مەبەستەکانتان) ﴿وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ﴾ وە
بێگومان نوێژ(ئەرکێکی) گەورەو گرانە ﴿إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ﴾ مەگەر لای ئەوانە نەبێ کەلەخوا ئەترسن
(خۆیان بەزل نازانن) ﴿٤٥﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ﴾ ئەوانەی کە دڵنیان بە خزمەت پەروەردگاریان
دەگـەن ﴿وَأَنَّهُمۡ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ وە ئـەوان دڵنیان بـۆ لای ئەو دەگەڕێنـەوە ﴿٤٦﴾ ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ ئەی بەنی
ئیسـرائیل(نەوەکانی یەعقـوب) ﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ﴾ یـادی ئـەو بەخششـانە بکەنـەوە کـە
ڕشتوومە بەسەرتاندا ﴿وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ وە من (کاتی خۆی) ڕێزی ئێوەم دا بەسەر هەمواندا ﴿٤٧﴾
﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا﴾ وە خۆتـان بپارێـزن لەڕۆژێـك ﴿لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا﴾ کـە کـەس هیچ سـوودێك
بەکەسـی تر ناگەیەنێت ﴿وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا شَفَٰعَةٞ﴾ وە هیچ تکایەکـی بۆ گیرا ناکرێت ﴿وَلَا يُؤۡخَذُ مِنۡهَا عَدۡلٞ﴾
وە بارمتەی لێ وەرناگیرێت ﴿وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾ وە ئەمانە یارمەتیی نادرێن ﴿٤٨﴾

﴿وَإِذۡ نَجَّيۡنَٰكُم﴾ (بیربکەنەوە) کاتێك کەڕزگارمان کردن ﴿مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ﴾ لەدەست و پێوەندی
فیرعەون ﴿يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ﴾ کەسزای سەختیان پێ ئەچەشتن ﴿يُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ﴾
کوڕەکانتانیان سەر دەبڕین ﴿وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ﴾ وە کچەکانتانیان دەهێشتنەوە (بۆ کارەکەری)
﴿وَفِي ذَٰلِكُم﴾ وە لەمەتاندا(لەم سزا سەختەی بەسەرتاندا درا) ﴿بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ﴾ تاقی
کردنەوەیەکی گەورە بوو لەپەروەردگارتانەوە بۆتان ﴿٤٩﴾ ﴿وَإِذۡ فَرَقۡنَا بِكُمُ ٱلۡبَحۡرَ﴾ (بیربکەنەوە)
کاتێك کە دەریامان بۆ لەت کردن ﴿فَأَنجَيۡنَٰكُمۡ﴾و ڕزگارمان کردن ﴿وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ﴾ وە
دەست وپێوەندی فیرعەونمان خنکاند و نوقمی (دەریامان) کردن﴿وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ﴾ لەکاتێکدا
ئێوە تەماشاتان دەکردن ﴿٥٠﴾ ﴿وَإِذۡ وَٰعَدۡنَا مُوسَىٰٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێك کەبەڵێنی چل
شەومان دا بەمووسا ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾ لەدوای ئەو(ڕۆشتنی مووسا بۆ کێوی طور)
گوێرەکەکەتان کرد بە(خوای خۆتان وپەرستتان) ﴿وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ﴾ لەکاتێکدا ئێوە ستەمکار بوون
﴿٥١﴾ ﴿ثُمَّ عَفَوۡنَا عَنكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ﴾ ئەمجا دوای ئەو(گوێرەکە پەرستی یەتان) لێتان خۆش بووین
﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ تاسوپاسی (خوا) بکەن ﴿٥٢﴾ ﴿وَإِذۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡفُرۡقَانَ﴾ بیربکەنەوە
کاتێك تەورات وجیاکەرەوە(لە نێوان دروست ونادروست) مان دا بەمووسا ﴿لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾ بۆ
ئەوەی ڕێنموونیی پێ بکەن ﴿٥٣﴾ ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ﴾ بیربکەنەوە کاتێك کە مووسا بەگەلەکەی
وت ﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم﴾ ئەی گەلەکەم بەڕاستی ئێوە ستەمتان کرد لەخۆتان ﴿بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلۡعِجۡلَ﴾
بەگوێرەکە پەرستیەکەتان ﴿فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمۡ﴾ کەواتە بگەڕێنەوە بەپەشیمانیی بۆ لای بەدی
هێنەرتان ﴿فَٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ و خۆتان بکوژن(بێ تاوانتان تاوان بارتان بکوژێت) ﴿ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ
لَّكُمۡ﴾ ئەمەتان باشترە بۆخۆتان ﴿عِندَ بَارِئِكُمۡ﴾ لای بەدی هێنەرتان ﴿فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۚ﴾ ئەمجا(خواش)
پەشیمانیەکەی لێ گیرا کردن ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەر خوایە گیراکەری پەشییمانی و
میهرەبانە ﴿٥٤﴾ ﴿وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێ ووتتان ئەی مووسا ﴿لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ﴾ بڕوات پێ
ناهێنین ﴿حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ﴾ تاخوانەبینین بەئاشکرا ﴿فَأَخَذَتۡكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ﴾ لەپڕ هەورە تریشقەیەك
لێ ی دان ﴿وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئێوە تەماشاتان دەکرد ﴿٥٥﴾ ﴿ثُمَّ بَعَثۡنَٰكُم﴾ لەپاشان زیندوومان
کردنەوە ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَوۡتِكُمۡ﴾ لەدوای مردنتان ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ بۆئەوەی سوپاسی (خوا) بکەن ﴿٥٦﴾
﴿وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡغَمَامَ﴾ وەبەهەور سێبەرمان کرد بەسەرتانەوە، ﴿وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ﴾ وە گەزۆ
و باڵندەی شێلاقەمان بەسەردا ڕشتن وبۆمان ناردن ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ﴾ (وە پێمان ووتن)
بخۆن لەو خواردنە پاکانەی کەکردمان بەڕۆزیتان ﴿وَمَا ظَلَمُونَا﴾ (ئەوانەی ناسوپاسی یان کرد)
ستەمیان لە ئێمە نەکرد ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾ بەڵکو ستەمیان لە خۆیان کرد ﴿٥٧﴾

﴿وَإِذۡ قُلۡنَا ٱدۡخُلُواْ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ﴾ (بیربكەنەوە) كاتێك كەووتمان: بچنە ئەم شارە(كە قودسە) ﴿فَكُلُواْ
مِنۡهَا حَيۡثُ شِئۡتُمۡ رَغَدٗا﴾ ئەمجا لەوێ(هەرچی ئارەزوو دەكەن) بخۆن بەتێروتەسەلی لەهەر لایەك
كەحەز دەكەن ﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا﴾ وە لەدەرگاوە بچنە ژوورەوە بە ملكەچی(بەكڕنوشەوە) ﴿وَقُولُواْ
حِطَّةٞ﴾ وە بڵێن (خوایە) لەگوناهەكانمان خۆش ببە ﴿نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطَٰيَٰكُمۡۚ﴾ ئەوسا لەگوناهەكانتان
خۆش دەبین ﴿وَسَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ وەلەئایندەدا پاداشتی چاكەكاران زۆرتر دەكەین ﴿٥٨﴾ ﴿فَبَدَّلَ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ كەچی ئەوانەی ستەمكار بوون (ئەوەی پێیان ووترا بوو) گۆڕییان ﴿قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ
لَهُمۡ﴾ بەقسەیەك كەپێیان نەووترا بوو ﴿فَأَنزَلۡنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ ئیتر ئێمەش ڕشتمان بەسەر ئەوانەی
كەستەمیان كرد ﴿رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ سزایەك لەئاسمانەوە ﴿بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ﴾ بەهۆی ئەونافەرمانی
یەی كەكردیان ﴿٥٩﴾ ﴿وَإِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ﴾ (بیربكەنەوە) كاتێك كەمووسا داوای باران بارینی
كرد بۆگەلەكەی ﴿فَقُلۡنَا ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَۖ﴾ ئێمەش پێمان ووت: گۆچانەكەت بدە بەو(تاشە)
بەردەدا ﴿فَٱنفَجَرَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ﴾ (كەلێی دا) لەپڕ دوانزە كانیی لێ هەڵقولا ﴿قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ
مَّشۡرَبَهُمۡۖ﴾ بێگومان هەموو تیرەیەك چاوگەی(ئاوە خۆرەی) خۆی ناسی ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ مِن رِّزۡقِ ٱللَّهِ﴾
(ئەمجا ووتمان) بخۆن وبخۆنەوە لەڕۆزی خوا ﴿وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ﴾ وە بڵاو مەبنەوە
لەزەویدا بەخراپەكردن ﴿٦٠﴾ ﴿وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ﴾ (بیربكەنەوە) كاتێك كەووتتان: ئەی مووسا ﴿لَن نَّصۡبِرَ عَلَىٰ
طَعَامٖ وَٰحِدٖ﴾ هەرگیز خۆمان ڕاناگریین لەسەر یەك جۆر خۆراك ﴿فَٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ كەواتە داوامان
بۆبكە لەپەروەردگارت ﴿يُخۡرِجۡ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ﴾ بۆمان دەربهێنێ لەوەی كەزەوی دەیڕوێنێ
﴿مِنۢ بَقۡلِهَا وَقِثَّآئِهَا﴾ لەسەوزەواتی و ترۆزیی وخەیاریی ﴿وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَاۖ﴾ و سیر ونیسكی
وپیازی ﴿قَالَ أَتَسۡتَبۡدِلُونَ ٱلَّذِي هُوَ أَدۡنَىٰ بِٱلَّذِي هُوَ خَيۡرٌۚ﴾ (مووسا) فەرمووی: ئایائێوەشتی چاك دەگۆڕنەوە
بەخراپ (واتە گەزۆ و گۆشتی باڵندە دەگۆڕنەوە بە سیر وپیاز) ﴿ٱهۡبِطُواْ مِصۡرٗا﴾ دابەزن بۆشارێك(لەم
شارانەی فەلەستین) ﴿فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلۡتُمۡۗ﴾ ئەوسا بەڕاستی چیتان داوا كردووە دەستتان دەكەوێت
﴿وَضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلۡمَسۡكَنَةُ﴾ وەدرابەسەریاندا ڕیسوایی وبێ نەوایی (هەژاری) ﴿وَبَآءُو بِغَضَبٖ مِّنَ
ٱللَّهِۗ﴾ وە خەشمی خوایان بۆخۆیان هێنایەوە ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەمە لەبەر
ئەوەبوو كەبێ بڕوابوون بەنیشانەو فەرمانەكانی خوا ﴿وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ﴾ وە پێغەمبەرانیان
دەكوشت بەناڕەوا ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ﴾ ئەمە بەهۆی ئەوەوە بوو كەسەرپێچی و دەست
درێژی یان دەكرد ﴿٦١﴾

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی ئیماندارن(موسوڵمانن) وەئەوانەی جوولەکەن ﴿وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ﴾ وەگاوروئەستێرەیان فریشتەپەرستەکان ﴿مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ هەرکامێك لەمانە بڕوای هێنا بەخواو ڕۆژی دوایی ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ وەکردەوەی چاکی کرد ﴿فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ ئەوە پاداشتیان بۆهەیە لەلای پەروەردگاریانەوە ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ نەترسیان لەبەرەو نەخەفەت دەخۆن ﴿٦٢﴾ ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ﴾ وە (بیربکەنەوە) کاتێك پەیمانمان لێ وەرگرتن ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ﴾ وە (کێوی) طورمان بەرز کردەوە بەسەر سەرتانەوە ﴿خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ﴾ (وە پێمان وتن) ئەوەی پێمان داوون (لەتەورات) باش کاری پێبکەن ﴿وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ﴾ وەبیرکەنەوە لەوەی کەتێیدایە ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەڵکو خۆتان بپارێزن ولەخوا بترسن ﴿٦٣﴾ ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ دیسان پشتتان هەڵکرد دوای پەیمان وەرگرتنەکە ﴿فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ﴾ ئەمجا ئەگەر بەخشش و میهرەبانی خوا نەبوایە بەسەر تانەوە ﴿لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ ئەوە ئێوە لەزەرەرۆمەندان دەبوون ﴿٦٤﴾ ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێوە (دەنگ وباسی) ئەوانەتان زانیبوو ﴿ٱعْتَدَوْاْ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ﴾ لەخۆتان کەدەست درێژیان کرد لە ڕۆژی شەممەدا ﴿فَقُلْنَا لَهُمْ﴾ ئەمجا پێمان وتن ﴿كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ﴾ ببن بەمەیموونی دوور خراوە لەبەزەیی خوا ﴿٦٥﴾ ﴿فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا﴾ ئەمجا ئەم سزایەمان کردە پەند بۆ خەڵکانی ئەو سەردەمەو ئەوانەی دوای ئەوان ﴿وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾ وەبەئامۆژگاریی بۆ پارێزکاران ﴿٦٦﴾ ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ﴾ وە (بیربکەنەوە) کاتێك موسا بەگەلەکەی ووت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ﴾ بێگومان خوا فەرمانتان پێ دەدات ﴿أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةً﴾ کە مانگایەك سەرببڕن ﴿قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا﴾ وتیان: ئایا گاڵتەمان پێ دەکەیت ؟ ﴿قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ ووتی: پەنا ئەگرم بەخوا کەلە نەفامان بم ﴿٦٧﴾ ﴿قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ ووتیان: داوامان بۆ بکە لەپەروەردگارت ﴿يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ﴾ پێمان بلێ ئەو مانگایە کامەیە وچۆنە ؟ ﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ﴾ ووتی: بێگومان خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ﴾ مانگایەك بێت نەزۆر پیرو نەزۆر جوان ﴿عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ﴾ مام ناوەندی بێ لەنێوان ئەم دوانەدا ﴿فَٱفْعَلُواْ مَا تُؤْمَرُونَ﴾ زوو بیکەن ئەوەی فەرمانتان پێدراوە ﴿٦٨﴾ ﴿قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ ووتیان: داوامان بۆبکە لەپەروەردگارت ﴿يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا﴾ پێمان بلێ ڕەنگی مانگاکە چۆن بێ ؟ ﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ﴾ ووتی: بەڕاستی خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا﴾ مانگایەکی زەردی تیربێ ﴿تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ﴾ (زەردێکی وا) دڵی تەماشاکاران خۆش بکات ﴿٦٩﴾

﴿قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ ووتیان: داوامان بۆ بکە لەپەروەردگارت ﴿يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ﴾ تەواو بۆمان ڕوون بکاتەوە
چۆن بێ ئەومانگایە؟ ﴿إِنَّ الْبَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا﴾ بەڕاستی مانگاکەمان لێ تێك چووە ﴿وَإِنَّا إِن شَاءَ اللَّهُ
لَمُهْتَدُونَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە ئەگەر خوا بیەوێ ڕێنموونی وەردەگرین ﴿٧٠﴾ ﴿قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ﴾ ووتی:
خوا ئەفەرموێ ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ الْأَرْضَ﴾ بەڕاستی مانگایەك بێ ڕانەهێنرابێ نە بە کێڵانی زەوی
﴿وَلَا تَسْقِي الْحَرْثَ﴾ وە نە بەئاودێری کشتوکاڵ ﴿مُّسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا﴾ بێ نەنگ وبێ پەڵەبێ ﴿قَالُوا
الْآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ﴾ ووتیان: ئائێستا هەواڵی ڕاستت هێنا ﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ﴾ ئەمجا سەریان
بڕی وخەریك بوو ئەو(سەربڕینە) نەکەن ﴿٧١﴾ ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا﴾ (وە بیربکەنەوە) کاتێك کە یەکێکتان
کوشت ﴿فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا﴾ وەهەموو لەخۆتانتان دوور دەخستەوەو ئاژاوەتان بوو ﴿وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ
تَكْتُمُونَ﴾ وە خواش ئاشکرای کرد ئەوەی ئەتان شاردەوە ﴿٧٢﴾ ﴿فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا﴾ ئەمجا ووتمان:
بەپارچەیەکی (مانگا سەربڕاوەکە) لەکەسە کوژراوەکە بدەن ﴿كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ﴾ ئا (بەو
شێوەیە) خوا مردووەکان زیندوو دەکاتەوە ﴿وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ﴾ وەنیشانەکانی خۆیتان پیشان دەدات
﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بۆئەوەی ژیربن وتێ بگەن ﴿٧٣﴾ ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ لە پاشان دڵتان ڕەق بوو
دوای ئەم (هەموو) موعجیزانە ﴿فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ دڵتان وەك بەردە بەڵکو زۆر ڕەقترە
﴿وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ﴾ چونکە بەڕاستی بەردی وا هەیە لەچەند لاوە جۆگە ئاوی لێ هەڵ
دەقوڵێ ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ﴾ وە بێگومان هی وایان هەیە کەلەت لەت دەبێ و ئاوی
لێ دێتەدەرێ ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ وە بەڕاستی هی وایان هەیە لەترسی خوا (لەلوتکەی
شاخەکان) بەرئەبێتەوە ﴿وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ وە خوا بێ ئاگا نی یە لەوەی کەدەیکەن ﴿٧٤﴾
﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ﴾ جا ئایا بەتەمان (ئەی موسوڵمانینە) کە (جوولەکە) بڕوا بێنن بەئایینەکەتان
﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ﴾ لەکاتێکدا دەستەیەك لەوان ﴿يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ﴾ فەرموودەی خوایان
ئەبیست (لەتەورات) ﴿ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ﴾ کەچی لەپاش تێ گەیشتنی دەست کارییان
دەکرد ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ وە ئەوان دەشیان زانی (کە کارێکی ناڕەوایە) ﴿٧٥﴾ ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا﴾
(جوولەکەکان) کاتێك تووشی موسڵمانەکان ببونایە دەیان وت: ﴿آمَنَّا﴾ ئێمەش بڕوامان هێناوە(بە
پێغەمبەرەکەتان) ﴿وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوا﴾ بەڵام کاتێك لەپەنایەکەوە هەندێکیان بەهەندێکیان
بگەشتنایە دەیان وت: ﴿أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ ئەوە ئێوە ئەو شتانە بەموسوڵمانەکان دەڵێن
کە خوا بۆئێوەی باس کردووە(لە تەورات دا)؟ ﴿لِيُحَاجُّوكُم بِهِ﴾ تائەو تەوراتە بکەنە بەڵگە بەسەرتانەوە
﴿عِندَ رَبِّكُمْ﴾ لای پەروەردگارتان(لەڕۆژی دوایی دا) ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ جا ئایا ژیرنابن و تێ
ناگەن؟ ﴿٧٦﴾

﴿أَوَلَا يَعۡلَمُونَ﴾ ئایا ئەوان نازانن ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ﴾ کەبەڕاستی خوا ئاگادارە بەوەی
کەپەنهانی ئەکەن و ئەوەی ئاشکرای ئەکەن ﴿٧٧﴾ ﴿وَمِنۡهُمۡ أُمِّيُّونَ﴾ وە هەندێکیان نەخوێندەوارن
﴿لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ﴾ لەپەڕاوەکە(تەورات) نازانن، تەنها ئاوات و هیوای هیچ وپووچ نەبێت
﴿وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ وە ئەوان هەر دوای گومان دەکەون ﴿٧٨﴾ ﴿فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ﴾ ئەمجا هاوارو تیاچوون
بۆ ئەوانەی ﴿يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ﴾ کەتەوراتە ( تێکدراوە) کە بەدەستی خۆیان دەنوسنەوە
﴿ثُمَّ يَقُولُونَ﴾ پاشان دەڵێن: ﴿هَٰذَا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەم (نامەیە) لە خواوەیە ﴿لِيَشۡتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗاۖ﴾
تاشتێکی کەمی پێ بکڕن ﴿فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ﴾ ساهاوارو تیاچوون بو ئەوان لەوە کەدەستی
ئەوان نوسیویتیەوە ﴿وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ﴾ وە هاوار بۆئەوان لەوەی کە ئەنجامی ئەدەن ﴿٧٩﴾ ﴿وَقَالُواْ
لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ﴾ وە ( جوولەکەکان) وتیان: ئاگری دۆزەخمان لێ ناکەوێت ﴿إِلَّآ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَةٗۚ﴾
مەگەر چەند ڕۆژێکی ژمێرراو نەبێت ﴿قُلۡ أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدٗا﴾ بلێ: ئایا پەیمانتان لەخواوە
وەرگرتووە ؟ (بۆ ئەمەی کە دەیلێن)﴿فَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ عَهۡدَهُۥٓۖ﴾ تا خواش پێچەوانەی پەیمانی خۆی
نەکات ؟ ﴿أَمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ یان شتێکی وا هەڵدەبەستن بەدەم خوداوە کەنایزانن
﴿٨٠﴾ ﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةٗ﴾ نەخێر وانی یە هەرکەسێك خراپەیەك بکات ﴿وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ﴾
وە تاوانەکەی خۆی لەهەموو لایەکەوە دەوری دابێت ودایگرێتەوە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ ئا
ئەوانە هاوەڵی ئاگرن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ تیایدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی ﴿٨١﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە ئەوکەسانەی کەبڕوایان هێناو کردەوەی باشیان کرد ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ﴾ ئا ئەوانە
هاوەڵی بەهەشتن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ تیایدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿٨٢﴾ ﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾
(وە بیربکەنەوە) کاتێك کەپەیمانمان لەجوولەکە وەرگرت ﴿لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ کە هیچ شتێك
نەپەرستن جگە لە خوای گەورە ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا﴾ وە چاکە بکەن لەگەڵ دایك و باوك ﴿وَذِي
ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ وە لەگەڵ خزمان ﴿وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ﴾ وە لەگەڵ هەتیوان و هەژاراندا ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ
حُسۡنٗا﴾ وە قسەی جوان بکەن لەگەڵ خەڵکیدا ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نوێژ بکەن ﴿وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾
وە زەکات بدەن ﴿ثُمَّ تَوَلَّيۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنكُمۡ﴾ ئەمجا پشتتان هەڵکرد کەمێکتان نەبێت
﴿وَأَنتُم مُّعۡرِضُونَ﴾ وە ئێوە هەر بەربەرەکانێکەر و (پشت هەڵکەرن) ﴿٨٣﴾

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ﴾ وه (بیربكه‌نه‌وه) كاتێك په‌یمانمان لێ وه‌رگرتن ﴿لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ﴾ كه
خوێنی یه‌كتری نه‌ڕێژن ﴿وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ﴾ وه خۆتان ده‌ربه‌ده‌ر نه‌كه‌ن له‌وولاتتان
﴿ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴾ پاشان بڕیارتان دا(له‌سه‌ر ئه‌م په‌یمانه) وه ئێوه(خۆتان) شایه‌تی له‌سه‌ر
ئه‌ده‌ن (٨٤) ﴿ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ ئه‌مجا ئێوه هه‌رئه‌وانه‌ن ﴿تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ كه‌یه‌كتری ده‌كوژن
﴿وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ﴾ وه هه‌ندێك له‌خۆتان ده‌ربه‌ده‌ر ده‌كه‌ن له‌ وولاتیان ﴿تَظَٰهَرُونَ
عَلَيْهِم﴾ پشتیوانی (بێگانه) ده‌كه‌ن دژی ئه‌وان ﴿بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ به‌ به‌دی و ده‌ست درێژی ﴿وَإِن
يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ﴾ وه ئه‌گه‌ر دیلتان بۆبێنن (له‌خۆتان ئه‌یانكرنه‌وه‌و) ﴿تُفَٰدُوهُمْ﴾ بریتی یان بۆ ده‌ده‌ن
﴿وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ﴾ له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌ش دا كه‌ده‌ربه‌ده‌ر كردنیان قه‌ده‌غه كراوه لێتان ( بۆچی
كار به‌وه‌یان ده‌كه‌ن و به‌مه‌یان ناكه‌ن) ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾ جا ئایا بڕوا ده‌هێنن
به‌هه‌ندێك له‌ته‌ورات، و بێ بڕوا ده‌بن به‌هه‌ندێكی تری ﴿فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ﴾ جاتۆڵه‌ی
ئه‌وكه‌سانه كه‌وا بكه‌ن له‌ئێوه ﴿إِلَّا خِزْيٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ هه‌ر ڕیسوایی و به‌د ناوی یه له‌ژیانی دونیادا
﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ وه له‌ڕۆژی دوایشدا ﴿يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ﴾ ده‌گه‌ڕێنرێنه‌وه بۆناو سه‌خترین
سزا ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ وه خوا بێ ئاگا نی یه له‌وه‌ی كه‌ده‌یكه‌ن (٨٥) ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾
ئه‌مانه ئه‌وانه‌ن ﴿ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ﴾ كه ژیانی جیهانیان كڕی به دوارۆژ ﴿فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ
ٱلْعَذَابُ﴾ ئیتر نه سزایان له‌سه‌ر سووك ده‌كرێت ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ وه نه یارمه‌تیی ده‌درێن و (نه‌پشتگیریی
ده‌كرێن) (٨٦) ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ سوێند به‌خوا به‌ڕاستی ئێمه ته‌وراتمان دا به مووسا
﴿وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ﴾ وه دوا به‌دوای ئه‌و پێغه‌مبه‌رانمان نارد ﴿وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾
وه چه‌ند نیشانه‌یه‌كی ڕۆشنمان دا به عیسای كوڕی مه‌ریه‌م ﴿وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ﴾ وه پشتیوانیمان
كرد به جوبره‌ئیل ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ﴾ جا هه‌ر كاتێ پێغه‌مبه‌رێكتان بۆ بهاتایه ﴿بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ
أَنفُسُكُمُ﴾ به جۆرێك كه به‌دڵی خۆتان نه‌بوایه ﴿ٱسْتَكْبَرْتُمْ﴾ لووت به‌رز بوون و خۆتان به‌گه‌وره
گرتووه ﴿فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ﴾ جا ده‌سته‌یه‌كتان(له پێغه‌مبه‌ران) به درۆ زانیوه ﴿وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ﴾ وه
ده‌سته‌یه‌كتان كوشتوون (٨٧) ﴿وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ﴾ وه (جووله‌كه‌كان) وتیان(به پێغه‌مبه‌ر ﷺ) دڵمان
داپۆشراوه ( قوفڵدراوه و قسه‌ی تۆی ناگاتێ) ﴿بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ﴾ (نه‌خێر وانیه ) به‌ڵكو خوا
نه‌فرینی لێكردن به‌هۆی بێ بڕواییانه‌وه ﴿فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ﴾ جا كه‌میان هه‌یه بڕوا بهێنن (٨٨)

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ﴾ کاتێك کەنامەیەکیان بۆهات(کە قورئانە) ﴿مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ لەلایەن خواوە
﴿مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾ کە پەسەندکەری تەوراتەکەی ئەوانە(پێش ئەوەی دەستکاری بکەن و بیگۆڕن)
﴿وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ﴾ وە ئەوان (جوولەکەکان) لەوەوپێش ﴿يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ داوای
زاڵ بوونیان ئەکرد لەخوا بەسەر ئەوانەی کە بێ بڕوابوون ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟﴾ کەچی کاتێك
ئەو(پێغەمبەر) ەی دەیان ناسی بۆیان هات ﴿كَفَرُوا۟ بِهِۦ﴾ بێ بڕوابوون پێی ﴿فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾
کەواتە نەفرینی خوا لەبێ بڕوایان بێ ﴿٨٩﴾ ﴿بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ﴾ شتێکی زۆر خراپ بوو کە
خۆیانیان پێ فرۆشت ﴿أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ (ئەو خراپەش) بێ بڕواییان بوو بەو قورئانەی
کەخوا ناردویەتیە خوارەوە ﴿بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ﴾ بەهۆی حەسودیانەوە بوو بەوەی کەخودا بڕێژێ
﴿مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾ لەبەخششی خۆی بەسەر هەرکەسێکدا کەخۆی بیەوێ ﴿مِنْ عِبَادِهِۦ﴾
لەبەندەکانی (کە موحەممەدە ﷺ) ﴿فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ﴾ ئەمجا تووشی خەشم و ڕقی یەك لەدوای
یەکی خوا بوون ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ وە بۆ بێ بڕوایان هەیە سزای ڕیسواکەر ﴿٩٠﴾ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ
ءَامِنُوا۟﴾ کاتێك پێ یان بووترایە: بڕوا بهێنن ﴿بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ بەوەی کەخوا ناردوویە تیە خوارەوە (کە
قورئانە) ﴿قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا﴾ ئەیانووت: ئێمە بڕوا بەوە دەهێنین کەبۆ خۆمان نێردراوەتە خوارەوە
﴿وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ﴾ وە بێ بڕوا ئەبوون بە ئەوانەی کە دوای (تەورات) نێراوە (وەك قورئان)
﴿وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ﴾ لەکاتێکدا کە ئەو قورئانە ڕاستە وپشتیوانی تەوراتە ( بێ دەستکاری)
یەکەی ئەوانەوبەڕاستی دەزانێت ﴿قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ﴾ بڵێ: بۆچی لەمەوپێش پێغەمبەرانی
خواتان دەکوشت ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر بڕوادار بوون ﴿٩١﴾ ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾
سوێند بەخوا بەڕاستی مووساتان بۆهات بەچەند نیشانەیەکی ڕۆشنەوە ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ
بَعْدِهِۦ﴾ کەچی لە دوای ئەو گوێرەکەتان پەرست ﴿وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ بێگومان ئێوە ستەمکارن ﴿٩٢﴾
﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ﴾ (وەبیربکەنەوە) کاتێك کەپەیمانمان لێ وەرگرتن ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ
ٱلطُّورَ﴾ وە کێوی طورمان بەرز کردەوە بەسەرتاندا ﴿خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ﴾ (وە ووتمان) ئەوەی
پێمانداوون (تەورات) باش کاری پێ بکەن (وتووند دەستی پێوە بگرن) ﴿وَٱسْمَعُوا۟﴾ وە گوێ بگرن
﴿قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾ (بەزمان) وتیان : بیستمان و(بەکردەوە) بێ فەرمانیمان کرد ﴿وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ
ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ﴾ وە بەهۆی بێ بڕوایی یانەوە دڵیان ئاو درابوو بەخۆشەویستی گوێرەکە کە
﴿قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ﴾ بڵێ: بڕواکەتان چ فەرمانێکی بەدتان پێ دەدات ﴿إِن كُنتُم
مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن ﴿٩٣﴾

﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الْآخِرَةُ عِندَ اللَّهِ﴾ ئـەی موحەممـەد ﷺ بڵێ: ئەگـەر ماڵی دوایی (بەهەشـت) بۆ
ئێوەیە لای خوا(وەك خۆتان دەڵێن) ﴿خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ﴾ بەتایبەتی بۆخۆتان بێت بەبێ ئەوەی
کەس بێ بە هاوبەشتان ﴿فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ کەواتە داوای مردن بکەن ئەگەر ڕاست گۆن
(٩٤) ﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا﴾ وە هەرگیـز داوای مـردن ناکـەن ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ بەهـۆی ئەو(گوناهانە)
کەبەدەستی خۆیـان پێشیان خستووە ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ وە خـوا ئاگـادارە بـە ستەمکاران (٩٥)
﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ﴾ سـوێندبێت ئەو(جوولەکانـە) دەبینیـت ﴿أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَىٰ حَيَاةٍ﴾ لەهەمـوو کەس زیاتر
حـەز لەژیان دەکەن ﴿وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾ وە لەوانەش کـە هاوبەش بۆ خوا پەیدادەکەن ﴿يَوَدُّ أَحَدُهُمْ﴾
(لەبەرئـەوە) هەریەکێکیـان ئـاوات دەخـوازێ ﴿لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ کـە هەزار سـاڵ بژیایە ﴿وَمَا هُوَ
بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ﴾ وە ئەو تەمەنە (کەبەسەری دەبات) ڕزگاری ناکات لەسزا ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا
يَعْمَلُونَ﴾ وە خـوا بینایە بەوەی کە دەیکەن (٩٦) ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ)
بڵێ: هەر کەسێك دوژمنی جوبرەئیل بێـت (ئەوە دوژمنی خوایە) ﴿فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾
چونکە ئەو بە فەرمانی خوا قورئانی هێناوەتە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ پشتیوانی
نامەکانـی پێش خـۆی دەکات و بەڕاستیان دەزانێـت ﴿وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ وە ڕێنموونیی کەرو
مژدە دەرە بۆ بڕواداران (٩٧) ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ﴾ هەر کەسێك دوژمنی خواو فریشتەکانی
خـوا ﴿وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ﴾ و پێغەمبەرانـی خوا و جوبرەئیل و میکائیل بێـت (ئەوە بێ بڕوایە)
﴿فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ﴾ وە بێگومـان خواش دوژمنی بێ بڕوایانە (٩٨) ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ﴾ سـوێند
بەخـوا بێگومـان بۆمان ناردوویت ﴿آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ چەند نیشـانەیەکی ڕوون و ئاشـکرا(کە قورئانە)
﴿وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ﴾ وە کـەس بـێ بـڕوا نابێـت پێیـان، مەگـەر بـەدکاران نەبێـت (٩٩)
﴿أَوَكُلَّمَا عَاهَدُوا عَهْدًا﴾ ئایا (بێ بڕوا ئەبن بەئایەتەکانی ئێمە) هەر جارێك پەیمانێك ببەستن (لەگەڵ
پێغەمبـەر ﷺ دا ) ﴿نَّبَذَهُ فَرِيقٌ مِّنْهُم﴾ دەسـتەیەك لەوانە پەیمانەکەیان هەڵوەشـاندۆتەوە ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ
لَا يُؤْمِنُونَ﴾ (نـەك هەر ئەوەندە ) بەڵکو زۆربەیان هەر بڕوا ناهێنن (١٠٠) ﴿وَلَمَّا جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ﴾
کاتێك کە پێغەمبەرێکیان بۆ هات لەلایەن خواوە ﴿مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾ بەپشتیوانی تەوراتە (دەستکاری
نەکراوە)کەیـان ﴿نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ كِتَابَ اللَّهِ﴾ دەسـتەیەك لەوانـەی کە خاوەن
نامەبـوون نامەکـەی خوایـان فـڕێ دایە ﴿وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ﴾ پشـت خۆیان و( پشـت گوێیان خسـت )
﴿كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ وەك نەزانن (کەئەوە نامەی خودایە) (١٠١)

﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ﴾ (جوولەکەکان) دوای ئەو(شتانە) کەوتن کەشەیتانەکان دەیان خوێندەوە (بۆ خەڵکی) ﴿عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ﴾ لەسەردەمی پاشایەتی سولەیمان دا، وە سولەیمان بێ بڕوا نەبوو ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڵام شەیتانەکان بێ بڕوا بوون ﴿يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ﴾ خەڵکیان فێری جادوو دەکرد ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ﴾ هەروەها ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە لە بابل بۆ سەر هارووت و ماروت(دوو فریشتە بوون) ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ﴾ وە(ئەمانە) کەسیان فێر نەدەکرد تا پێیان نەوتایە ﴿إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ﴾ ئێمە هەرتاقی کەرەوەی (ئادەمیزاد)ین کەواتە بێ بڕوامەبە ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ﴾ ئەمجا فێری جادووی وا دەبوون لێیانەوە کە ژن و مێردی پێ لەیەك جیا بکەنەوە ﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ﴾ ئەوان بەم جادووە ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن ﴿إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ مەگەر بەویستی خوا نەبێت ﴿وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ﴾ وە فێری شتێك دەبن کە زیانیان پێ دەگەیەنێ نەك قازانج ﴿وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ﴾ بێگومان زانیان هەرکەسێ جادو بکڕێ (وفێری ببێت) ﴿مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ﴾ (بەفەرموودەی تەورات) لەڕۆژی دواییدا بێ بەش دەبێ ﴿وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ﴾ بەڕاستی زۆر خراپە ئەو شتەی کە (بڕوای) خۆیانیان پێ فرۆشت ﴿لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر بیانزانیایە ﴿١٠٢﴾ ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ﴾ ئەگەر بەڕاستی ئەوان بڕوایان بهێنایە و پارێزکار بونایە ﴿لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ﴾ ئەوا پاداشتێکی چاکتر لەلایەن خواوە بۆ ئەوان دەبوو ﴿لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر بیانزانیایە ﴿١٠٣﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَقُولُواْ﴾ مەڵێن ﴿رَٰعِنَا﴾ ووشەی جوێن و بێ ڕێزییە بە لای جولەکەوە﴿وَقُولُواْ﴾، وە بڵێن ﴿ٱنظُرْنَا﴾ پەلەمان لێ مەکە و چاوەڕوانیمان لەسەر بکە ﴿وَٱسْمَعُواْ﴾ و ببیستن ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە بۆ بێ بڕوایان هەیە سزای سەخت ﴿١٠٤﴾ ﴿مَّا يَوَدُّ﴾ حەزناکەن ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ ئەوانەی کەبێ بڕوان لە خاوەن نامە و هاوبەش پەیداکەرەکان ﴿أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ کە هیچ شتێکی باشتان لەخواوە بۆ بنێردرێتە خوارەوە ﴿وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ بەڵام خواش بەخششی خۆی بۆ کەسێك کەبیەوێ تەرخان دەکات ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾ و خوا خاوەنی چاکەی گەورەیە ﴿١٠٥﴾

﴿مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا﴾ ئەگەر ئایەتێك (لە ئایەتەكانی قورئان) بسڕینەوە یان پشتگوێی بخەین
﴿نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ﴾ یەكێكی تری باشتر لەو ، یان وەك ئەو دەهێنین ﴿أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ
شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ ئایا نازانییت خوا بەسەر هەموو شتێكدا بەدەسەلاتە ﴿١٠٦﴾ ﴿أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِۗ﴾ ئایا نازانیت كە موڵكی ئاسمانەكان و زەوی هەر بۆ خوایە ؟ ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن
وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ﴾ وە هیچ پشتیوان و یاریدەدەرێكتان نی یە ، خوا نەبێت ﴿١٠٧﴾ ﴿أَمۡ تُرِيدُونَ أَن تَسۡـَٔلُواْ
رَسُولَكُمۡ﴾ یائێوەش دەتانەوێ داوای (شتی نەشیاو) بكەن لەپێغەمبەرەكەتان ؟ ﴿كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۗ﴾
وەك لەمەوپێش داواكرا لەمووسا (علیه السلام) ﴿وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ هەر كەسێك بڕوا بگۆڕێتەوە
بە بێ بڕوایی ﴿فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾ ئەوە بێگومان ڕێی ڕاستی وون كردووە ﴿١٠٨﴾ ﴿وَدَّ كَثِيرٞ مِّنۡ أَهۡلِ
ٱلۡكِتَٰبِ﴾ زۆر لەخاوەن نامەكان ئاواتە خوازن ﴿لَوۡ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِكُمۡ كُفَّارًا﴾ كەبتانكەنەوە
بە بێ بڕوا ، دوای بڕوا هێنانتان ﴿حَسَدٗا مِّنۡ عِندِ أَنفُسِهِم﴾ لەبەر حەسوودییەك كە لەدەروونیانەوەیە
﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡحَقُّۖ﴾ (ئەمەش) دوای ئەوەی كەڕاستیەكەیان بۆ ڕوون بوەتەوە ﴿فَٱعۡفُواْ
وَٱصۡفَحُواْ﴾ بەڵام ئێوە لێیان خۆش بن و چاو پۆشیان لێ بكەن ﴿حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ﴾ تا خوا
فەرمانی خۆیتان بۆ دەنێرێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ بێگومان خوا بەدەسەلاتە بەسەر هەموو
شتێكدا ﴿١٠٩﴾ ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ﴾ نوێژ بكەن وزەكات بدەن ﴿وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ
خَيۡرٖ﴾ وەهەرچی پێشبخەن لەچاكە بۆخۆتان ﴿تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِۗ﴾ لای خوا دەستتان دەكەوێتەوە
﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ بێگومان خوا بینایە بەوەی كەدەیكەن ﴿١١٠﴾ ﴿وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ﴾
(جوولەكەو گاوورەكان) وتیان: كەس ناچێتە بەهەشتەوە ﴿إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ﴾ مەگەر یەكێك
كە جوولەكە یا گاوور بێت ﴿تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ﴾ ئەمە ئاواتیانە ﴿قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ﴾ پێیان بڵێ: بەڵگەتان
بهێنن ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست دەكەن ﴿١١١﴾ ﴿بَلَىٰۚ مَنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ﴾ (نەء وانییە) بەڵكو هەر
كەسێك بەڕاستی ڕووبكاتە خوا ﴿وَهُوَ مُحۡسِنٞ﴾ و لەهەمان كاتدا چاكەكار بێت ﴿فَلَهُۥٓ أَجۡرُهُۥ عِندَ
رَبِّهِۦ﴾ ئەوە بۆی هەیە پاداشت لەلای پەروەردگاریەوە ﴿وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ نە ترسیان
لەبەرە و نەخەمیش دەخۆن ﴿١١٢﴾

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ جوولەکە ئەڵێن: گاوور لەسەر هیچ (ئایینێك ) نین
﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ وە گاوور دەڵێن: جوولەکە لەسەر هیچ (ئایینێك) نین
﴿وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان نامەکانیان دەخوێندەوە،(یەکێکیان تەورات و ئەوی تریش
ئینجیل) ﴿كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ﴾ هەر بەم جۆرەیان دەووت، ئەوانەی کە نەزانن
(لە بت پەرستەکان) ﴿فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ئەمجا خوا لە ڕۆژی دواییدا لە نێوانیاندا بڕیار
دەدات ﴿فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ لەوشتانەی کەتیایدا جیاواز و ناکۆکن ﴿١١٣﴾ ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن﴾ کێ
ستەمکارترە لەو کەسەی ﴿مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ﴾ کە ڕێگری لەمزگەوتەکانی خوا دەکات ﴿أَن يُذْكَرَ
فِيهَا ٱسْمُهُۥ﴾ لەوەی کە ناوی خوایان تێدا ببرێ ﴿وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ﴾ وە هەوڵ دەدات بۆ وێران کردنیان
﴿أُو۟لَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە(کە قەدەغەی خواپەرستی دەکەن لە مزگەوتەکاندا) ﴿مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ
إِلَّا خَآئِفِينَ﴾ بۆیان نی یە بچنە مزگەوتەکانەوە بە ترسەوە نەبێت ﴿لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ﴾ لەژیانی
دونیادا ڕیسوایی بۆ ئەوانە ﴿وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ وە لەڕۆژی دوایشدا سزای گەورە ﴿١١٤﴾
﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ﴾ ڕۆژهەڵات وڕۆژ ئاوا هەر بۆخوایە ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾ کەواتە
ڕوویکەنە هەرلایەك (لە نوێژ کردندا بەفەرمانی خودا) ئەوە ڕووگەیە وڕووتان لەخودا کردووە
﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خوا (بەزەیی و میهرەبانی) فراوانەو زانایە ﴿١١٥﴾ ﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا﴾
(گاوورو جوولەکە و بت پەرستەکان) ووتیان: خوا منداڵی بۆخۆی داناوە﴿سُبْحَٰنَهُۥ﴾ ئەو(خوا)
پاك و بەدوورە لەوە ﴿بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ بەڵکو هەرچی هەیە لە ئاسمانەکان و زەوی دا
موڵکی ئەوە ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ هەموو فەرمانبەردار وملکەچی ئەون ﴿١١٦﴾ ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾
(خوا) بەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەوی یە ﴿وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا﴾ وە کاتێ کەویستی شتێ بکات
﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ هەر ئەوەندەی پێ ئەوێ کە پێ ی بڵێ: ببە ئیتر ئەبێ ﴿١١٧﴾ ﴿وَقَالَ
ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ﴾ نەزانەکان ووتیان: بۆچی خوا خۆی قسەمان لەگەڵ ناکات
﴿أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ﴾ یا نیشانەیەکمان بۆ نایەت ﴿كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ﴾ ئەوانەی
کەلەپێش ئەمانیش دا بوون هەمان شتیان دەووت ﴿تَشَٰبَهَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵ و دەروونیان لەیەك دەچێت
﴿قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ بێگومان نیشانەی زۆرمان باس کردووە بۆ کەسانێك بەشوێن
دڵنیایی دا دەگەڕێن ﴿١١٨﴾ ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ بێگومان ئێمە تۆمان نارد بە ئاینێکی ڕاست
و درووستەوە بە مژدەدەر و ترسێنەر ﴿وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ﴾ وە تۆ بەرپرسیار نیت لەیارانی
دۆزەخ ﴿١١٩﴾

﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ هەرگیز نە جولەکە و نە گاوور لێت ڕازی نابن ﴿حَتَّىٰ تَتَّبِعَ
مِلَّتَهُمْ﴾ هەتا دوای ئاینیان نەکەویت ﴿قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ﴾ (پێ یان) بڵێ: هەر ڕێنموونیی
خوایە ڕێنموونی ڕاست ﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم﴾ وە ئەگەر دوای ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت(ئەی
موحەممەد ﷺ) ﴿بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ دوای ئەو زانینەی کە (لەخواوە) بۆت هاتووە (کە قورئانە)
﴿مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ هیچ سەرپەرشتی کەرو یاریدەدەرێکت نابێ لەلایەن خواوە ﴿١٢٠﴾ ﴿ٱلَّذِينَ
ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەوانە کەنامەمان پێداوون ﴿يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾ بەڕاستی دەیخوێننەوە ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ
بِهِۦ﴾ ئەوانە بڕوا ئەهێنن بەڕێنموونیی خوای گەورە (کە ئیسلامە) ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ﴾ وە ئەوانەی بێ
بڕوابن پێ ی ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ هەرئەوانن زەرەر مەند و خەسارۆمەند ﴿١٢١﴾ ﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ
ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ﴾ ئەی نەوەکانی یەعقوب (ئەی بەنی ئیسرائیل) بیری ئەو چاکانە بکەنەوە
کەڕشتوومن بەسەرتاندا ﴿وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ وەبێگومان من (پێشتر) ڕێزی ئێوەم دا بەسەر
هەمووانـدا ﴿١٢٢﴾ ﴿وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا﴾ وە خۆتان بپارێزن لەڕۆژێك ﴿لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا﴾ کەکەس
لەبری کەس تۆڵەو پاداشت نادرێتەوە ﴿وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ﴾ وەبارمتەی لێ وەرناگیرێت ﴿وَلَا تَنفَعُهَا
شَفَٰعَةٌ﴾ وە هیچ تکایەك کەڵکی ناگرێ ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ وەیارمەتیی نادرێن و سەرناخرێن ﴿١٢٣﴾
﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێك خوا ئیبراهیمی تاقی کردەوە بەچەند بڕیار
وفەرمایشتێك ﴿فَأَتَمَّهُنَّ﴾ کە ئەویش بەجێ ی هێنان ﴿قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾ (خوا) فەرمووی:
بێگومان من تۆ دەکەم بە پێشەوای خەڵکی ﴿قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى﴾ (ئیبراهیم) وتی: لەنەوەشم ئەکەیت
(بە پێشەوا)؟ ﴿قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ فەرمووی: پێغەمبەریەتیی من ناگات بەستەمکاران
﴿١٢٤﴾ ﴿وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا﴾ (بیربکەنەوە) کاتێك کە کەعبەمان گێڕا بەپەناگای خەڵکی
و جێ ی ئاسایش ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ (پێمان ووتن) شوێنی ئەو بەردەی ئیبراهیم (علیه
سلام) لە سەری ڕادەوەستا (کاتی دروست کردنی کەعبە) بکەنە جێگای نوێژ ﴿وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ
وَإِسْمَٰعِيلَ﴾ وە سپاردمان بە ئیبراهیم و ئیسماعیل ﴿أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ﴾ کە ماڵەکەم پاك بکەنەوە
بۆ ئەوانەی کە بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە ﴿وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ وە بۆ ئەوانەی کە تیایدا
ئەمێننەوە هەروەها بۆ کڕنوش بەران و سوژدە بەران ﴿١٢٥﴾ ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا﴾ (وە
بیربکەنەوە) کاتێك کەئیبراهیم ووتی: خوایە ئەم شوێنە (کە مەککەیە) بکە بەشارێکی پڕ لەئاسایش
﴿وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ وە ڕۆزی دانیشتوانی بدە لە بەروبووم و میوەهات ﴿مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ
ٱلْـَٔاخِرِ﴾ ئەوانەیان کەبڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە. ﴿قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا﴾ (خوا) فەرمووی:
ئەوەش بێ بڕوابێ ڕۆزی پێ ئەدەم بۆچەند ڕۆژێکی کەم ﴿ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾
لەپاشان ناچاری دەکەم بەسزای ئاگری دۆزەخ کەخراپترین سەرئەنجامە ﴿١٢٦﴾

﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ﴾ (بیربکەرەوە) کاتێك کە ئیبراهیم و ئیسماعیل بناغەکانی
کەعبەیان بەرز دەکردەوە ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ (دەیانووت) خوایە ئەم کردەوەیەمان
لێ گیرا بکە بەڕاستی هەر تۆی بیسەری زانا ﴿١٢٧﴾ ﴿رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ﴾ خوایە هەر دووکمان
بکە بە گوێڕایەڵ وفەرمان بەرداری خۆت ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ﴾ وە لەنەوەشمان گەلێك بکە
بەفەرمانبەرداری خۆت ﴿وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا﴾ وە ڕێگاکانی خوا پەرستیمان نیشان بدە ﴿وَتُبْ عَلَيْنَآ ۖ﴾ وە
پەشیمانیمان گیرابکە ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەرتۆی گیراکەری پەشیمانی و میهرەبان ﴿١٢٨﴾
﴿رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ﴾ خوایە لە ناو نەوەکانماندا پێغەمبەرێك بنێرە لەخۆیان ﴿يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ
ءَايَـٰتِكَ﴾ ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ﴾ قورئان و
دانایی یان فێربکات و پاکیان بکاتەوە (لە هەموو گوناهێك) ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بێگومان هەرتۆی
بەتوانای دانا ﴿١٢٩﴾ ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ﴾ کێ ڕوو وەرئەگێڕێ لە ئایینی ئیبراهیم؟ ﴿إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ﴾
مەگەر کەسێك کەخۆی گێل ونەفام کردبێت؟ ﴿وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ﴾ سوێندبێ بێگومان ئیبراهیممان
هەڵبژارد لە دونیادا ﴿وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ وە بێگومان ئەو لەڕۆژی دواییدا لەچاکەکارانە
﴿١٣٠﴾ ﴿إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ﴾ (هەڵی بژارد) لەکاتێکدا خوا پێی فەرمووو: گوێڕایەڵ وفەرمانبەرداربە
﴿قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ (ئیبراهیمیش) ووتی: وا خۆم سپارد بە پەروەردگاری جیهانیان ﴿١٣١﴾
﴿وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ﴾ ئیبراهیم و یەعقوب ئامۆژگاری کوڕەکانی خۆیانیان کرد کە
فەرمانبەرداری خوابن ﴿يَـٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ﴾ (وەهەریەکەیان پێیان وتن) ڕۆڵەکانم: خوائایینی
یەکتاپەرستی بۆ هەڵ بژاردوون ﴿فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ کەواتە مەمرن بە موسوڵمانێتی نەبێت ﴿١٣٢﴾
﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ﴾ (ئەی خاوەن نامەکان) ئایا ئێوە ئامادە بوون کاتێ یەعقوب
لەسەرەمەرگدا بوو ﴿إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى ۖ﴾ کاتێ بە کوڕەکانی ووت دوای من کێ
دەپەرستن؟ ﴿قَالُوا۟ نَعْبُدُ إِلَـٰهَكَ وَإِلَـٰهَ ءَابَآئِكَ﴾ (ئەوانیش) ووتیان: خوای تۆو باوو باپیرانت دەپەرستین
﴿إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا﴾ کە خوای ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقە کە خوایەکی تاك
وتەنهایە ﴿وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ﴾ وە ئێمەش فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی ئەوین ﴿١٣٣﴾ ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ﴾ ئەو
پێغەمبەرانە دەستەیەك بوون تێپەڕیین ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ﴾ هەرچیان کرد بۆ خۆیانیان
کردوە (ئێوەش) هەرچی بکەن بۆخۆتانی دەکەن ﴿وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ وە ئێوە بەرپرسیار
نین لە کردەوەی ئەوان ﴿١٣٤﴾

﴿وَقَالُوا۟ كُونُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُوا۟﴾ (جوولەکە و گاوورەکان) ووتیان: (بەموسڵمانەکان) بین
بە جوولەکە یان بەگاوور تابکەونە سەر ڕێگای ڕاست ﴿قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًا﴾ بڵێ: بەڵکو
پەیڕەویی ئایینی پاکی ئیبراهیم دەکەین ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ کەلە هاوبەش پەیداکەران نەبووە ﴿١٣٥﴾
﴿قُولُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ بڵێن: (ئەی موسڵمانینە) بڕوامان هێنا بە خواو ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾ بەو قورئانەی
کەبۆخۆمان نێرراوەتە خوارەوە ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ﴾ وە بەو نامەیەی کە
نێرراوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی یەعقوب ﴿وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ﴾
وە بەوەی کەدراوە بە مووساو عیسا ﴿وَمَآ أُوتِىَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ﴾ وە بەوەی کە دراوە بەهەموو پێغەمبەران
لەلایەن پەروەدگاریانەوە ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ﴾ جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کامێکیاندا
﴿وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ﴾ وە ئێمە فەرمانبەردار وگوێڕایەڵی خواین ﴿١٣٦﴾ ﴿فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ﴾
ئەمجا ئەگەر بڕوایان هێنا بەو وێنەیەی کە ئێوە بڕواتان پێ هێناوە ﴿فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟﴾ ئەوا بێگومان
ڕێی ڕاستیان دۆزیوەتەوە ﴿وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ﴾ وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوا ئەوان لە
دوو بەرەکیی دان ﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ﴾ وە خوا ئاگاداری تۆ ئەکات لەوان ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ وە
هەر خوایە بیسەری زانا ﴿١٣٧﴾ ﴿صِبْغَةَ ٱللَّهِ﴾ دەستبگرن بەو ئاینەی خوداوە کەفیترەتی پاکی ئێوەی
لەسەر خەلقکردوە ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً﴾ بێگومان هیچ فیترەتێکی بەوجۆرە پاك نیە ( کەواتە
چاك دەستی پێوە بگرن ) ﴿وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ﴾ وە ئێمەش پەرستن و عیبادەت هەر بۆ ئەو دەکەین
﴿١٣٨﴾ ﴿قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِى ٱللَّهِ﴾ بڵێ: ئایا دەمەقاڵێ و دەمەوەریمان لەگەڵ ئەکەن لەکاری خوا ﴿وَهُوَ رَبُّنَا
وَرَبُّكُمْ﴾ لە کاتێکدا ئەو پەروەردگاری ئێمە و ئێوەیشە ﴿وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ﴾ وە کردەوەی
خۆمان بۆخۆمانە و کردەوەی خۆتان بۆ خۆتانە ﴿وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ﴾ وە ئێمە تەنها بەدڵسۆزی
بەندایەتی خوا دەکەین ﴿١٣٩﴾ ﴿أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ﴾ یاخود ئێوە ئەڵێن: ئیبراهیم و ئیسماعیل
﴿وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ﴾ و ئیسحاق و یەعقوب وکوڕەکانی یەعقوب ﴿كَانُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ﴾
جوولەکە یا گاوور بوون ؟ ﴿قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ﴾ بڵێ: ئایا ئێوە زاناترن یا خوا؟ ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ﴾
کێ ستەم کارترە ﴿مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾ لەو کەسەی کە شایەتیەکی لەخوا وەرگرتبێ و
بیشارێتەوە ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ خودا بێ ئاگا نی یە لەوەی کە ئێوە دەیکەن ﴿١٤٠﴾ ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ﴾
ئەو پێغەمبەرانە دەستەیەك بوون تێپەڕین و ڕۆشتن ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ﴾ هەرچی یان
کرد بۆ خۆیانیان کرد ، وە ئێوەش هەرچی بکەن بۆخۆتانی دەکەن ﴿وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ وە
ئێوە بەرپرسیار نین لە کردەوەی ئەوان ﴿١٤١﴾

﴿سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ هەندێ نەزان و گێل ونەفام لەخەڵك دەڵێن : ﴿مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَاۚ﴾
چـی موسـڵمانەکانی وەرگێڕا لەو ڕووگەیان کەجاران لەسـەری بـوون ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُۚ﴾ بڵێ
ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەمووی موڵکی خوایە ﴿يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ کێ ی بوێ ڕێنموونیی
دەکات بۆ ڕێبازی ڕاست ﴿١٤٢﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ هەروەها کردمانن بەگەلێکی میانەڕەو
مامناوەند (ی هەڵبژاردە) ﴿لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًاۗ﴾ تاببنە شاهید وچاودێر
بەسـەر خەڵکەوە، و پێغەمبەریش ﷺ شـاهید وچاودێر بێت بەسـەر ئێوەوە ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ
عَلَيْهَآ﴾ ئەو ڕووگەیەی کەجاران لەسەری بوویت نەمانگێڕا (بەڕووگەو لەپاشان گۆڕیمان بەکەعبە)
﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ﴾ تەنها بۆئەوەی دەربکەوێت کێ شوێن پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت (وەجیادەبێتەوە)
﴿مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِۚ﴾ لەوانەی کەپاش گەزدەبنەوە ﴿وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً﴾ وە بەڕاسـتی (ئەم گۆڕینە)
کارێکی زۆر گەورەو گران بوو ﴿إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۗ﴾ مەگەر لای ئەوانەی کەخوا ڕێنموونیی کردوون
﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ﴾ وەخـوای گـەورە بـڕوا (و نوێژەکانی جـاران) تانـی بەزایە نەداوە
﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ﴾ بەڕاستی خوا لەگەڵ خەڵکیدا ﴿لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ دڵسۆزی میهرەبانە ﴿١٤٣﴾ ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ
وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ﴾ بەڕاستی ئێمە گەڕانی ڕووخسارت ڕووبەئاسمان دەبینین ﴿فَلَنُوَلِّيَنَّكَ﴾ دەی سوێند بەخوا
ڕووت دەکەینە ﴿قِبْلَةً تَرْضَىٰهَاۚ﴾ ڕووگەیەك کەپەسەندت بێ وڕازی بیت پێی ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ
ٱلْحَرَامِۚ﴾ ئیتر ڕووت وەرچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (مسجد الحرام) ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ﴾ ئێوەش ئەی
موسڵمانان لەهەر لایەك بوون ﴿فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥۗ﴾ (لەنوێژدا) ڕووتان بکەنە ئەوێ ،بەرەو (مسجد
الحـرام) ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـەی پەڕاویـان پێدراوە ﴿لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْۗ﴾
چاك ئەزانن کەئەمە شـتێکی ڕاسـتە لە پەروەردگاریانەوە ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾ وە خودا بێ ئاگا
نـی یە لەوەی کەدەیکەن ﴿١٤٤﴾ ﴿وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ﴾ سـوێند بێـت ئەگەر هەرچی
بەڵگـەو نیشـانە هەیە بی هێنێتـەوە بۆ ئەم خاوەن نامە وپەڕاوانـە ﴿مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَۚ﴾ دوای ڕووگەی تۆ
ناکـەوون ﴿وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْۚ﴾ وە تـۆش دوای ڕووگـەی ئـەوان ناکەویت ﴿وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ
بَعْضٍۚ﴾ وە ئەوان دوای ڕووگەی یەکتری ناکەوون ﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم﴾ سوێند بێت ئەگەر تۆ دوای
ئارەزووەکانـی ئەوان بکەویت ﴿مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ دوای ئەو زانینەی کە (بەسـرووش) بۆت
هاتووە ﴿إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی ئەو کاتە تۆ لەستەمکاران دەبییت ﴿١٤٥﴾

﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەوانـەی کە پەڕاومان پێ داوون ﴿يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ﴾ پێغەمبەر ﷺ
دەناسن وەك چۆن کوڕونەوەکانی خۆیان دەناسن ﴿وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ﴾ بێگومان کۆمەڵێك لەوان (لەئەهلی
کتاب) ﴿لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ﴾ ئەو ڕاستی یە دەشارنەوە ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا ئەوان دەزانن (موحەممەد
ﷺ پێغەمبەرە) (١٤٦) ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ ڕاست ئەوەیە (کەبۆت هاتووە) لەپەروەردگارتەوە. ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ
ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ کەواتـە لـە گومانداران مەبە (١٤٧) ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ﴾ وە هەمـوو گەلێك ڕووگەیەکی هەیە
﴿هُوَ مُوَلِّيهَا﴾ کە ڕووی تێ دەکات ﴿فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ دەی دەست پێشکەری بکەن لە کردارە چاکەکاندا
﴿أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟﴾ لەهـەر کوێ هەبن ﴿يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا﴾ خودا هەمووتان کۆدەکاتەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خـوا بەدەسـەڵاتە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا (١٤٨) ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ﴾ لەهەر کوێ
چوویتە دەرەوە(بەسەفەر) ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ ڕووت وەربگێڕە بۆ لای کەعبەی پیرۆز
﴿وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ وە ئەم ڕوو کردنەت ڕاستەو لە پەروەردگارتەوەیە ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ وە
خودا بێ ئاگانی یە لەوەی کە دەیکەن (١٤٩) ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ﴾ لەهەر کوێ چوویتە دەرێ ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ
ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ (لەکاتـی نوێژکردندا) ڕووت وەربگێڕە بۆ لای کەعبەی پیرۆز ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ﴾
وە ئێـوەش (ئەی موسـڵمانینە) لەهەر کوێ بـوون ﴿فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ﴾ ڕوو وەرگێڕن بۆ لای ئەو
(کەعبـە) ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ﴾ تـا بیانـوی خەڵکتـان نەیەتەسـەر ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ﴾ مەگەر
ستەم کارەکانیان ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ﴾ جا لێیان مەترسـن ﴿وَٱخْشَوْنِى﴾ و لە من بترسن ﴿وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ﴾
بـۆ ئەوەی بەخششـی خۆمتان بەتەواوی بەسـەردا بـڕژم ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ وە بەڵکو ڕێبازی ڕاسـت
بگـرن (١٥٠) ﴿كَمَآ أَرْسَلْنَا﴾ وەك ڕەوانەمـان کـرد ﴿فِيكُمْ﴾ لـە ناوتانـدا ﴿رَسُولًا مِّنكُمْ﴾ پێغەمبەرێك لە
خۆتـان ﴿يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا﴾ کەئایەتەکانـی ئێمەتان بەسـەردا بخوێنێتەوە ﴿وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ﴾ وە دڵ
ودەروونتـان پاکتـان بکاتەوە وەفێرتـان کات ﴿ٱلْكِتَٰبَ﴾ فێری قورئـان ﴿وَٱلْحِكْمَةَ﴾ وە فێری دانایی
(فەرمـوودەی خـۆی) ﴿وَيُعَلِّمُكُم﴾ وە فێرتـان کات ﴿مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ﴾ ئـەو شـتانەی کەنەتـان
دەزانـی (١٥١) ﴿فَٱذْكُرُونِىٓ﴾ کەواتـە یـادم بکـەن ﴿أَذْكُرْكُمْ﴾ تامنیش یادتـان بکـەم و لەبیرتـان نەکـەم
﴿وَٱشْكُرُوا۟ لِى﴾ وە سوپاسم بکەن ﴿وَلَا تَكْفُرُونِ﴾ پێ نەزان و ناسوپاسییم مەکەن (١٥٢) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟﴾ ئـەی ئەو کەسـانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱسْتَعِينُوا۟﴾ پشـت ببەسـتن ﴿بِٱلصَّبْرِ﴾ بەخۆڕاگرتن
﴿وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ و نوێژ (کردن) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ بەڕاستی خوا لە گەڵ خۆڕاگرانە (١٥٣)

﴿وَلَا تَقُولُوا۟﴾ هەرگیـز مەڵێن ﴿لِمَن يُقْتَلُ﴾ بەو کەسـانەی دەکوژرێـن ﴿فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەڕێگەی خوادا
﴿أَمْوَٰتٌۢ﴾ مـردوون ﴿بَلْ أَحْيَآءٌ﴾ بەڵکـو زیندوون ﴿وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ﴾ بـەڵام ئێوە هەسـتی پێ ناکەن
١٥٤ ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم﴾ سـوێند بەخـوا تاقیتـان دەکەینـەوە ﴿بِشَىْءٍ﴾ بـە هەندێـك ﴿مِّنَ ٱلْخَوْفِ﴾ لەتـرس
﴿وَٱلْجُوعِ﴾ و برسێتی ﴿وَنَقْصٍ﴾ و کەم بوونی ﴿مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ﴾ ماڵ و دارایی ﴿وَٱلْأَنفُسِ﴾ و خەڵکی (کەس
و کارتان) ﴿وَٱلثَّمَرَٰتِ﴾ وبەرووبووم ﴿وَبَشِّرِ﴾ جامژدەبدە ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ بەخۆڕاگران ١٥٥ ﴿ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانەی
﴿إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ﴾ کە لەگەڵ دووچاری سـەختی ونەهامەتی وناخۆشـیەك بـوون ﴿قَالُوٓا۟﴾ دەڵێن
﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ﴾ ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە ١٥٦ ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ﴾ ئا ئەوانە
﴿عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ﴾ درووود و بەزەیی بەسەر ئەواندا دەبارێت لە لایەن پەروەردگاریانەوە
﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ﴾ و ئەوانـە ئـەو کەسـانەن هیدایەتیان وەرگرتـووە ١٥٧ ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ﴾
بەڕاستی صەفاو مەڕوە ﴿مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾ لەدروشمەکانی (دینی) خوان ﴿فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ﴾ جاهەر کەسێك
حەجی ماڵی خوای کرد ﴿أَوِ ٱعْتَمَرَ﴾ یا عومرەی کرد ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ﴾ هیچ خراپە و تاوانی ناگات ﴿أَن
يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ کەهاتوچۆ وسەعی نێوان سەفاومەروەبکات ﴿وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا﴾ وەهەرکەسێك بەئارەزووی
خـۆی چاکەیەکی کـرد ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خـودا سوپاسـگوزارێکی زانایە ١٥٨
﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بێگومان ئەوانەی ﴿يَكْتُمُونَ﴾ دەیشـارنەوە ﴿مَآ أَنزَلْنَا﴾ ئـەوەی کە ناردوومانەتە خوارەوە
﴿مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ لە ئایەتانی ڕۆشن و ﴿وَٱلْهُدَىٰ﴾ ڕێنمایی ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ﴾ دوای ئەوەی کە ڕوونمان
کردوەتـەوە ﴿لِلنَّاسِ﴾ بـۆ خەڵکی ﴿فِى ٱلْكِتَٰبِ﴾ لە نامـە(ی تەورات و ئینجیـل) دا ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە
﴿يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ﴾ خـودا نەفرەتیان لێ دەکات ﴿وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ﴾ وە نەفرەتکەرانیـش نەفرەتیان لێ دەکەن
١٥٩ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ﴾ مەگـەر ئەوانـەی ﴿تَابُوا۟﴾ کە پەشـیمان بووبنـەوە ﴿وَأَصْلَحُوا۟﴾ وە کـردەوەی چاکیان
کردبـێ و ﴿وَبَيَّنُوا۟﴾ (ئـەوەی شـاردبویانەوە) ئاشـکرایان کردبێ ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ﴾ ئـا ئەوانە ﴿أَتُوبُ عَلَيْهِمْ﴾
پەشـیمانیان لـێ گیرادەکـەم ﴿وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ وە هـەر منـم گیراکـەری میهرەبـان ١٦٠ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟﴾ بەڕاسـتی ئەوانـەی بـێ بڕوابـوون ﴿وَمَاتُوا۟﴾ و مـردوون ﴿وَهُمْ كُفَّارٌ﴾ و بێ بـڕوا بوون
﴿أُو۟لَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە ﴿عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ﴾ لەسەریانە نەفرینی خوا ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ و فریشتەکان ﴿وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾
خەڵکـی بەتێکڕایی ١٦١ ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ تێیدا دەمێننەوە بەهەمیشـەیی ﴿لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ﴾ سـزایان
لەسـەر سـووك ناکرێتـەوە ﴿وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ وە دواناخرێـن لەسـزا ١٦٢ ﴿وَإِلَٰهُكُمْ﴾ پەرسـتراوی ئێـوە
﴿إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ پەرستراوێکی تاك و تەنهایە ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە بەتەنیا ئەو
نەبێت ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾ کە بەخشندەی میهرەبانە ١٦٣

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ﴾ بەڕاستی هەیە لە دروست کردنی ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ ئاسمانەکان ﴿وَٱلْأَرْضِ﴾ وزەوی
﴿وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ و جیاوازی شەووڕۆژ(بە کورتی و درێژی) ﴿وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي﴾ و ئەو کەشتیانەی
﴿تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ﴾ کەدێن ودەچن لەناو دەریادا ﴿بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ﴾ بەوشتانە کەقازانج دەگەیەنن بەخەڵکی
﴿وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ وە ئەوەی کە خوا لەئاسمانەوە باراندی ﴿مِن مَّآءٍ﴾ لە ئاو (باران) ﴿فَأَحْيَا
بِهِ ٱلْأَرْضَ﴾ پاشان زەوی پێ زیندوو کردەوە (پێ بووژاندەوە) ﴿بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ پاش مردنی ﴿وَبَثَّ﴾وە
بڵاوی کردەوە ﴿فِيهَا﴾ تێیدا ﴿مِن كُلِّ دَآبَّةٍ﴾ لەهەموو جۆرە زیندەوەرێك ﴿وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ﴾
وە گێڕانی بایەکان (بە هەموولایەکدا) ﴿وَٱلسَّحَابِ﴾وە ئەو هەورانەی ﴿ٱلْمُسَخَّرِ﴾ ڕام کراون
﴿بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لەناوەندی ئاسمان ﴿وَٱلْأَرْضِ﴾و زەویدا ﴿لَأَيَٰتٍ﴾ چەند بەڵگەن ﴿لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾
بۆ کەسانێك کە تێبگەن ﴿١٦٤﴾ ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن﴾ وە کەسانی واهەیە لە خەڵکی ﴿يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ
أَندَادًا﴾ کەهاوبەشی زۆر بۆ خوا پەیدا دەکەن ﴿يُحِبُّونَهُمْ﴾ خۆشیان دەوێن ﴿كَحُبِّ ٱللَّهِ﴾ وەك
خۆشەویستی (ئیمانداران بۆ) خوا ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە زۆر زیاتر
خوایان خۆش دەوێت ﴿وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟﴾ ئەگەر ببینن ئەوانەی ستەمیان کردوە (بە هاوبەشی
پەیدا کردن بۆخوا) ﴿إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ﴾ کاتێك کە چاویان دەکەوێت بەسزا(ی خوا دەزانن)
﴿أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ کە هەرچی دەسەڵات هەیە هەمووی بۆ خوایە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ﴾ وە
بێگومان سزای خوا زۆر سەختە ﴿١٦٥﴾ ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟﴾ کاتێك کە ئەو کەسانەی خەڵك
شوێنیان کەوتون لە دونیادا ( واتە سەرۆکە گومراکەرەکان ) یەخە هەڵئەتەکێنن ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟﴾
لەوانەی(لە دونیادا) دوایان کەوتوون ﴿وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ﴾ وە سزای (دۆزەخیان بەچاوی خۆیان)
بینی ﴿وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ﴾ وە هەموو پەیوەندی یەکیان بچڕایەوە ﴿١٦٦﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟﴾
وە ئەوانەی کە دوایان کەوتبوون ووتیان ﴿لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً﴾ خۆزگە ئێمە بگەڕاینایەتەوە (بۆ دونیا)
﴿فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ﴾ تا یەخەمان لێ هەڵبتەکاندنایە ﴿كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا﴾ هەر وەك(ئەوان)چۆن یەخەیان
لەئێمە هەڵتەکاند ﴿كَذَٰلِكَ﴾ هەر بەو شێوەیە ﴿يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ خوا کردەوەکانیان نیشان ئەدات
﴿حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ﴾ ئەیکات بەداخ لەسەر دڵیان ﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ﴾ وە ئەوان دەرچوونیان نی یە
﴿مِنَ ٱلنَّارِ﴾ لە ئاگر ﴿١٦٧﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿كُلُوا۟﴾ بخۆن ﴿مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ لەوەی کەلە
زەویی دایە ﴿حَلَٰلًا﴾ بەحەلاڵی و ﴿طَيِّبًا﴾ پاکی ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ وە دوای هەنگاوەکانی
شەیتان مەکەوون ﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکراتانە ﴿١٦٨﴾ ﴿إِنَّمَا يَأْمُرُكُم﴾
بەڕاستی (شەیتان) فەرمانتان پێ دەدات ﴿بِٱلسُّوٓءِ﴾ بەتاوان ﴿وَٱلْفَحْشَآءِ﴾ و خراپە ﴿وَأَن تَقُولُوا۟﴾ لەگەڵ
هەڵبەستنی شتی وا ﴿عَلَى ٱللَّهِ﴾ بەدەم خواوە ﴿مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ کە نازانن ﴿١٦٩﴾

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ﴾ کاتێك پێیان بووترێت ﴿اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ شوێن ئەو (قورئان) ە بکەون کە خوا
ناردویەتە خوارەوە ﴿قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا﴾ دەڵێن: نەخێر بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوین ﴿أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ
آبَاءَنَا﴾ کە باوو باپیرانمان لەسەری بوون ﴿أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ﴾ ئەگەر چی باوو باپیرانیشیان
﴿لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا﴾ هیچ تێ نەگەیشتبن ﴿وَلَا يَهْتَدُونَ﴾ و گومڕا بووبن (ڕێنمایش وەرنەگرن)
﴿١٧٠﴾ ﴿وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە نموونەی ئەو بێ بڕوایانە ﴿كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ﴾ وەك یەکێك وایە کە
دەنگ لە ئاژەڵێك بکات ﴿بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَاءً وَنِدَاءً﴾ تەنیا دەنگ و هاوارەکە نەبێ هیچ نابیستێ
﴿صُمٌّ﴾ ئەمانە کەڕن ﴿بُكْمٌ﴾ لاڵن، (لە ووتنی قسەی دروست) ﴿عُمْيٌ﴾ کوێرن(لە بینینی ڕێ
ی ڕاست) ﴿فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ بۆیە تێ ناگەن و ژیر نین ﴿١٧١﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەو کەسانەی
کە بڕواتان هێناوە ﴿كُلُوا﴾ بخۆن ﴿مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ لەو خواردەمەنی یە پاکانەی
کردومانە بەڕۆزیتان ﴿وَاشْكُرُوا لِلَّهِ﴾ وە سوپاسی خوا بکەن ﴿إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ ئەگەر
ئێوە هەر ئەو دەپەرستن ﴿١٧٢﴾ ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ﴾ ئەوەی (کە خوا) قەدەغەی کردووە لێتان تەنها
﴿الْمَيْتَةَ﴾ مردارەوە بوو ﴿وَالدَّمَ﴾ و خوێن (ی ڕۆشتوو) ﴿وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ﴾ و گۆشتی بەراز ﴿وَمَا أُهِلَّ
بِهِ﴾ و ئەوەی کە سەر بڕابێ ﴿لِغَيْرِ اللَّهِ﴾ (بەناوی) غەیری خواوە ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ﴾ ئەمجا هەر کەسێك
ناچار بوو (بە خواردنی یەکێك لەمانە) ﴿غَيْرَ بَاغٍ﴾ بەبێ یاخی بوون ﴿وَلَا عَادٍ﴾ و دەرچوون لەسنوور
﴿فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ ئەوە هیچ گوناهێکی لەسەر نی یە ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان خوا لێ
خۆشبووی میهرەبانە ﴿١٧٣﴾ ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ بێگومان ئەوانەی ئەو ئایەتانە دەشارنەوە
کەخودا ناردونیەتە خوارەوە ﴿مِنَ الْكِتَابِ﴾ لە تەورات ﴿وَيَشْتَرُونَ﴾ و دەیگۆڕنەوە ﴿بِهِ ثَمَنًا
قَلِيلًا﴾ بەنرخێکی کەم ﴿أُولَٰئِكَ﴾ ئەوانە ﴿مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلَّا النَّارَ﴾ ئاگر نەبێت هیچی تر ناچێتە
سکیانەوە ﴿وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ وە خوا لەڕۆژی دوایی دا قسەیان لەگەڵ ناکات ﴿وَلَا
يُزَكِّيهِمْ﴾ و پاکیان ناکاتەوە ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ و سزای سەختیان دەبێت ﴿١٧٤﴾ ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ
اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ﴾ ئا ئەوانە کەسانێکن کە گومڕایی یان کڕی ﴿بِالْهُدَىٰ﴾ بەڕێنموونیی ﴿وَالْعَذَابَ
بِالْمَغْفِرَةِ﴾ وە سزا (یان کڕی) بەلێ خۆشبوون ﴿فَمَا أَصْبَرَهُمْ عَلَى النَّارِ﴾ ئای چەند خۆڕاگرن لەسەر
ئاگر ﴿١٧٥﴾ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ نَزَّلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ ئەمە(هەمووی) بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا کتێبە (پیرۆزە) کانی
ناردۆتە خوارەوە بەڕاستی ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا﴾ وە بێگومان ئەوانەی دووبەرەکیان تێکەوت ﴿فِي
الْكِتَابِ﴾ لە تەوراتدا ﴿لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ﴾ لە دووبەرەکیەکی (وادان) کە دوورن (لەیەك
کەوتن) ﴿١٧٦﴾

﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ﴾ چاكە ئەوە نی یە كەڕوو بكەنە ﴿قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ﴾ بەرەو ڕۆژهەڵات
و ڕۆژئـاوا ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ﴾ بەڵكـو چاكە ئەوەیە ﴿مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ كە مرۆڤ بـڕوای ببێ بەخوا ﴿وَٱلْيَوْمِ
ٱلْـَٔاخِرِ﴾ وە بە ڕۆژی دوایی ﴿وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ﴾ وە بە فریشـتەكان ﴿وَٱلْكِتَـٰبِ﴾ وە بە كتێبەكان ﴿وَٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾
وە بـە پێغەمبـەران ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ﴾ وە دارایـی خـۆی ببەخشـێ ﴿عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾ لە گـەڵ ئـەوەی كەخۆشـی
دەویـت ﴿ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ بەخزمـان ﴿وَٱلْيَتَـٰمَىٰ﴾ و بـە هەتیـوان ﴿وَٱلْمَسَـٰكِينَ﴾وبەبـێ نەوایـان (هـەژاران)
﴿وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ و بەڕێبوارانی كەم دەست ﴿وَٱلسَّآئِلِينَ﴾ و بە سواڵكەران ﴿وَفِى ٱلرِّقَابِ﴾ و لەڕێ ی ئازاد
كردنـی كۆیلەكانـدا ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نوێژی بەچاكی كردبێـت ﴿وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾ و زەكاتی دابێت
﴿وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ﴾ و پەیمان بەجێ هێنەران ﴿إِذَا عَـٰهَدُوا۟﴾ كاتێك كەپەیمانیان دابێت ﴿وَٱلصَّـٰبِرِينَ﴾و
خۆڕاگران ﴿فِى ٱلْبَأْسَآءِ﴾ لەكاتی تەنگدەستی ﴿وَٱلضَّرَّآءِ﴾ و نەخۆشی ﴿وَحِينَ ٱلْبَأْسِ﴾ و لەكاتی جەنگدا
﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟﴾ ئا ئەوانەن كەڕاستیان كـرد ﴿وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ وە هەرئەوانەن پارێزكاران ﴿١٧٧﴾
﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەو كەسانەی كە بڕواتان هێناوە ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ﴾ پێویست كراوە لەسەر
تان تۆڵە سـەندنەوە ﴿فِى ٱلْقَتْلَى﴾ لە كوژراواندا (بەیەكسانی) ﴿ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ﴾ كەسی ئازاد بە كەسی ئازاد
﴿وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ﴾ و بەندەش بە بەندە ﴿وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ﴾ و ژن بە ژن (مێینە بە مێینە) ﴿فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ﴾ ئەمجا
هەركەسێك بەخشـرا ﴿مِنْ أَخِيهِ﴾ لەلایـەن برایەكـی دینـی یەوە ﴿شَىْءٌ﴾ بـە بەشـێك(لە خوێنەكە)
﴿فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ ئەبێ (خزمەكانی تر) پەیڕەوی بكەن بەباشی ﴿وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَـٰنٍ﴾ (بكوژیش) بەچاكی
خوێنەكە بدات ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ﴾ ئەمە سووككردنە ﴿مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ﴾ لەپەروەردگارتانەوەو میهرەبانی
یە ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾ ئەمجا هەركەسـێك دوای ئەمە دەسـت درێژیی كرد ﴿فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆئەو
هەیە سزای بەسوێ، (بەئازار) ﴿١٧٨﴾ ﴿وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ﴾ لە كوشتنەوە وتۆڵەسەندنەوەدا ژیان بۆ ئێوە
هـەیـە ﴿يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ ئەی هۆشمەندان ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەڵكو خۆتان بپارێزن ﴿١٧٩﴾ ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ﴾
پێویسـت كـراوە لەسـەرتان ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ﴾ كاتێك یەكێكتـان لەسـەرەمەرگدا بوو ﴿إِن تَرَكَ
خَيْرًا﴾ ئەگەر ماڵی لەپاش بەجێ ما ﴿ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ﴾ وەسیەتكردن بەباشی بۆ دایك وباوك ﴿وَٱلْأَقْرَبِينَ
بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ وخزمان(یـك كـە میراتیـان بەرنەكـەوێ) بەجوانـی وڕێكـو پێكی ؟ ﴿حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ﴾
پێویسـت كـراوە لەسـەر پارێـزكاران ﴿١٨٠﴾ ﴿فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ﴾ ئەمجـا هـەر كەسـێك وەسـیەتەكەی گـۆڕی
﴿بَعْدَ مَا سَمِعَهُۥ﴾ دوای بیسـتنی ﴿فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ﴾ ئەوە گوناهی(تاوانی) ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ﴾ هەر لە ملی
ئەو كەسانەدایە كە دەیگۆڕن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خواش بیسەری زانایە ﴿١٨١﴾

﴿فَمَنۡ خَافَ﴾ ئەمجا هەر کەسێك ترسا ﴿مِن مُّوصٍ﴾ لەوەسیەتكار ﴿جَنَفًا أَوۡ إِثۡمًا﴾ کەهەڵە یان گوناهێك
بکات ﴿فَأَصۡلَحَ بَيۡنَهُمۡ﴾ جا (ئەو کەسە) میراتگرانی پێك بێنێ ﴿فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ﴾ ئەوەهیچ گوناهێکی لەسەر
نی یە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بەڕاستی خودا لێخۆش بوو بەبەزەیی یە ﴿١٨٢﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی
ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ﴾ ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە وفەرزکراوە ﴿كَمَا
كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ هەروەك چۆن فەرزکراوەلەسەر ئەوئوممەتانەی لەپێش ئێوەدابوون ﴿لَعَلَّكُمۡ
تَتَّقُونَ﴾ بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن لەخودا بترسن ﴿١٨٣﴾ ﴿أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ﴾ (ڕۆژووتان لەسەر فەرزکرا)
چەند ڕۆژێکی دیاری کراوی ژمێراوە ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا﴾ جاهەر کەسێك لەئێوەنەخۆش بوو
﴿أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ﴾ یان لەسەفەردا بوو (وە بەڕۆژوو نەبوو) ﴿فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ﴾ ئەوە پێویستە بەئەندازەی
ئەو ڕۆژانەی (بەڕۆژوو نەبووە) قەزای بکاتەوە لەڕۆژانی تردا ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ﴾ وە پێویستە
لەسەر ئەوانە کە زۆر بەناڕەحەتی ئەتوانن بەڕۆژوو بن (و بەڕۆژوو نابن) ﴿فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ﴾
بریتی (یان لەسەرە)، کەخۆراکی هەژارێکە ﴿فَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥۚ﴾ ئەمجا هەر کەسێك زۆرتر
بریتی بدات ئەوە باشترە بۆی ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ و ئەگەر بەڕۆژوو بن بۆخۆتان باشترە
﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر بزانن ﴿١٨٤﴾ ﴿شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ﴾ مانگی ڕەمەزان مانگێکە
قورئانی تێدا نێرراوەتە خوارەوە ﴿هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ﴾ بە ڕێنما بۆخەڵکی وە بەڵگە گەلێکی ڕۆشن
﴿مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ﴾ بۆ ڕێنموونیی و جیاکردنەوە(ی دروست ونادروست) ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ
ٱلشَّهۡرَ﴾ ئەمجا هەر کەسێك لەئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی ﴿فَلۡيَصُمۡهُۖ﴾ با بەڕۆژوو بێت ﴿وَمَن كَانَ
مَرِيضًا﴾ وە هەر کەسێك نەخۆش بوو ﴿أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ﴾ لەسەفەردابوو ﴿فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۗ﴾ با بەئەندازەی
ئەوڕۆژانە قەزای بکاتەوە لەچەند ڕۆژێکی تردا ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ﴾ خوا ئاسانی ئەوێ بۆئێوە
﴿وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ﴾ وە گرانی ناوێت بۆتان ﴿وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ﴾ (قەزای ڕەمەزانتان لەسەر
دانرا) تا مانگەکە (بگرن) بەتەواوی ﴿وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ﴾ وە بەگەورە ناوی خوا بەرن
لەسەر ئەو ڕێنموونی یەی کە کردوونی ﴿وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ وە تا سوپاسی (خوا) بکەن ﴿١٨٥﴾
﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي﴾ هەر کاتێك بەندەکانی من پرسیاریان لێ کردیت دەربارەی من ﴿فَإِنِّي
قَرِيبٌۖ﴾ ئەوا بێگومان من لێیانەوە نزیکم ﴿أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ﴾ گیرا دەکەم نزای نزاکاران ﴿إِذَا دَعَانِۖ﴾
هەر کاتێك هاوار و نزام لێ بکەن ﴿فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي﴾ دەی با ئەوانیش بەدەنگ منەوە بێن ﴿وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي﴾
وە بڕوام پێ بهێنن ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ﴾ بۆ ئەوەی ڕێ ی ڕاست بدۆزنەوە ﴿١٨٦﴾

﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ﴾ ڕێتان پێ دراوە لەشەوانی ڕۆژوو(ی ڕەمەزان) دا ﴿ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾
کە بچەنە لای ژنەکانتان ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ﴾ ئەوان بۆ ئێوە پۆشاکن ﴿وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ وە ئێوەش
بۆ ئەوان پۆشاکن ﴿عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ خوا دەیزانی کەئێوە ناپاکیتان لەخۆتان
دەکرد ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ﴾ بۆیە پەشیمانی لێ گیراکردن ﴿وَعَفَا عَنكُمْ﴾ وەلێتان خۆش بوو ﴿فَٱلْـَٔـٰنَ
بَـٰشِرُوهُنَّ﴾ ئیتر لەئێستاوە(بە شەو ) بچنە لایان ﴿وَٱبْتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ وە بەدڵ بخوازن ئەوی
کە خوا بۆی نوسیوون(لە منداڵ) ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ﴾ وە بخۆن و بخۆنەوە ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ﴾
هەتا بۆتان جیا دەبێتەوە ﴿ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ﴾ ڕوشتەی سپی (ڕۆژ) ﴿مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ﴾ لە ڕوشتەی
ڕەشی (شەو) ﴿مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾ لەشەبەقدا ﴿ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾ لەپاشان ڕۆژووەکەتان تەواو
بکەن تاشەوی دوایی ﴿وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ﴾ وەمەچنەلای ژنەکانتان ﴿وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ﴾ لەکاتێکدا
کە لەمزگەوتدا مابنەوە بۆ خواپەرستی ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾ ئەمانە سنوورانی خودان و ﴿فَلَا تَقْرَبُوهَا﴾
نزیکیان مەکەونەوە ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ﴾ ئاوا خوا باسی فرمانی خۆی دەکات بۆ خەڵکی
﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ تا خۆیان بپارێزن ﴿١٨٧﴾ ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ﴾ ماڵی یەکتری
مەخۆن لەناو خۆتاندا بەناڕەوا ﴿وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ﴾ وە بە (بەرتییل) مەیدەن بەکاربەدەستان
وفەرمانداران ﴿لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ﴾ بۆ ئەوەی بەشێك لەماڵی خەڵکی بخۆن بەگوناه
﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا ئێوەش دەزانن ﴿١٨٨﴾ ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ﴾ پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی
نوێ بونەوەی مانگە نوێکان ﴿قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ﴾ بڵێ ئەمانە نیشانەی کاتەکانن بۆ
خەڵکی و بۆ حەج ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ﴾ وەچاکە ئەوە نی یە ﴿بِأَن تَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا﴾ کەلەپشتی ماڵ
وخانووەکانەوە بچنە ژوورەوە ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ بەڵکو چاکە ئەوەیە ئەو کەسە پارێزکارو لە
خوا ترس بێت ﴿وَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا﴾ وەبچنە ماڵەکان لە دەرگاکانیەوە ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ
تُفْلِحُونَ﴾ وە لە خوا بترسن تا ڕزگار ببن ﴿١٨٩﴾ ﴿وَقَـٰتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ جەنگ بکەن لە ڕێ ی خوادا
﴿ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ﴾ لەگەڵ ئەوانەی جەنگتان لەگەڵدا دەکەن ﴿وَلَا تَعْتَدُوٓاْ﴾ وە دەست درێژی
مەکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾ بەڕاستی خودا دەست درێژی کەرانی خۆش ناوێت ﴿١٩٠﴾

﴿وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ﴾ بیان کوژن (کافران) لەهەر شوێنێ دەستان کەوتن و زاڵ بوون بەسەریاندا
﴿وَأَخْرِجُوهُم﴾ وە دەریان بکەن ﴿مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ﴾ لەو شوێنانەی کە ئێوەیان لێ دەرکردوە ﴿وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ
الْقَتْلِ﴾ لادان لە ڕێی یەکتاپەرستی خوای گەورە لە خەڵك کوشتن سەخت و گەورەترە ﴿وَلَا تُقَاتِلُوهُمْ﴾ جەنگیان
لەگەڵ مەکەن ﴿عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ لەلای مزگەوتی کەعبەدا ﴿حَتَّىٰ يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ﴾ تا ئەوان لەوێدا نەجەنگن
لەگەڵتان دا ﴿فَإِن قَاتَلُوكُمْ﴾ ئەمجا ئەگەر جەنگین لەگەڵتاندا ﴿فَاقْتُلُوهُمْ﴾ ئێوەش بجەنگن لەگەڵیاندا ﴿كَذَٰلِكَ جَزَاءُ
الْكَافِرِينَ﴾ ئەمەیە تۆڵەی بێ بڕوایان ﴿١٩١﴾ ﴿فَإِنِ انتَهَوْا﴾ بەڵام ئەگەر دەستیان هەڵگرت (لەجەنگ) ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ
رَّحِيمٌ﴾ ئەوا خوای گەورە لێخۆشبوو میهرەبانە ﴿١٩٢﴾ ﴿وَقَاتِلُوهُمْ﴾ جەنگیان لەگەڵ بکەن ﴿حَتَّىٰ لَا تَكُونَ
فِتْنَةٌ﴾ تادوژمنایەتی بۆ ئاین وهاوەڵ بڕیاردان نەمێنێ ﴿وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ﴾ وە ئاین و ملکەچی هەر بۆ خوا دەبێت ﴿فَإِنِ
انتَهَوْا﴾ ئەمجا ئەگەر دەستیان هەڵگرت ﴿فَلَا عُدْوَانَ﴾ ئیتر دەست درێژیی نی یە ﴿إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ مەگەر لەسەر
ستەم کاران نەبێت ﴿١٩٣﴾ ﴿الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ﴾ ڕێزی مانگی حەرام بەرانبەر بەڕێز گرتنی ئەوانە بۆ مانگی
حەرام دەبێت ﴿وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ﴾ شکاندنی هەر ڕێزێکیش تۆڵەی هەیە ﴿فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ جا هەر کەسێك
دەست درێژی کردە سەرتان ﴿فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ﴾ ئێوەش دەست درێژی بکەنە سەری ﴿بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ﴾
بەوێنەی دەست درێژ کردنەکەی ئەو بۆ ئێوە ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ وە لەخوا بترسن ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ﴾ وە بزانن
کەخوا ﴿مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ لەگەڵ پارێزکارانە ﴿١٩٤﴾ ﴿وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ وە دارایی خۆتان بەخت بکەن لە
ڕێ ی خوادا ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ وە بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تیاچوونەوە ﴿وَأَحْسِنُوا﴾ وە
چاکە بکەن ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ بەڕاستی خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت ﴿١٩٥﴾ ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾
حەج و عومرە (تان کە دەست پێ کرد) تەنها بۆ خوا بە تەواوی بیکەن ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ﴾ ئەمجا ئەگەر هەر
(قەدەغەکران) ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ ئەوسا چیتان بۆ هەڵسوڕا لەقوربانی (سەری بڕن) ﴿وَلَا تَحْلِقُوا
رُءُوسَكُمْ﴾ وەسەرتان مەتاشن ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾ تاقوربانیەکە دەگاتە جێ ی دیاری کراوی خۆی ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم
مَّرِيضًا﴾ ئەمجا هەر کەسێك لە ئێوە نەخۆش بوو ﴿أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ﴾ یان ئازارێك لەسەریدا بوو ﴿فَفِدْيَةٌ
مِّن صِيَامٍ﴾ (ئەگەر سەری تاشی) بریتی یەك بدات کە ڕۆژوو (ی سێ ڕۆژە) ﴿أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ یان خێرێك
یان قوربانیەك بکات ﴿فَإِذَا أَمِنتُمْ﴾ جا کاتێك دڵنیا بوون (ترس نەبوو) ﴿فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ﴾ ئەمجا ئەو کەسەی
بەهرەمەند بوو بە بەجێهێنانی عومرە ﴿إِلَى الْحَجِّ﴾ تاکاتی حەج ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ ئەوە چی بۆ هەڵسوڕا لە
قوربانی (بیکات) ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ وە ئەگەر یەکێك نەیبوو ﴿فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ﴾ با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت
لە کاتی حەجدا ﴿وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ وە حەوت ڕۆژی تریش کاتێك گەڕانەوە ﴿تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾ ئەمە دەبێتە دە
ڕۆژی تەواو ﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ ئەمە بۆ کەسێکە کە (خۆی) و کەس و کاری دانیشتووی
دەوروبەری (مسجد الحرام) نەبێت ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ وە لەخوا بترسن ﴿وَاعْلَمُوا﴾ وە بزانن ﴿أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ
الْعِقَابِ﴾ کە بەڕاستی خوا خاوەنی تۆڵە و سزای سەختە ﴿١٩٦﴾

﴿ٱلۡحَجُّ أَشۡهُرٞ مَّعۡلُومَٰتٞۚ﴾ (کاتـى) حەج لەچەند مانگێکى دیارى کراودایە ﴿فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ﴾
ئەمجا هەرکەسێك لەم مانگانەدا حەجى لەسـەر خۆى پێویسـت کرد ﴿فَلَا رَفَثَ﴾ بائیتر نەچێتە لاى
ژن ﴿وَلَا فُسُوقَ﴾ وە بـەدکارى نـەکات ﴿وَلَا جِدَالَ﴾ وە دەمەقاڵـە نـەکات ﴿فِي ٱلۡحَجِّۗ﴾ لەحەجـدا
﴿وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ﴾ وە هەرچـى بکـەن لەچاکـە ﴿يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ﴾ خـوا پـێ ى دەزانێ ﴿وَتَزَوَّدُواْ﴾ وە
توێشـوو(ى پارێزکارى) و لەخواترسـان هەڵبگرن ﴿فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۖ﴾ کەباشـترین توێشـوو
لەخوا ترسانە ﴿وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ وەلەمن بترسن ئەى هۆشمەندان ﴿١٩٧﴾ ﴿لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ﴾
گوناهتـان لەسـەر نـى یـە ﴿أَن تَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡۚ﴾ کـەدواى ڕۆزى پەروەردگارتـان بکەون
﴿فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ﴾ ئەمجا کاتێك بلاوەتان لێکرد و گەڕانەوە لەعەرەفات ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ﴾
نـاوى خوا بێنن ﴿عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِۖ﴾ لەلاى(مشـعر الحـرام) دا ﴿وَٱذۡكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمۡ﴾
وەیادى خودا بکەن کە ڕێنموونى کردن ﴿وَإِن كُنتُم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ با لەپێش ئەوەشا ئێوە
لە گومڕایان بووبن ﴿١٩٨﴾ ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ﴾ لە پاشان بگەڕێنەوە لەوشوێنەى خەڵکى
لێ ى دەگەڕێتەوە ﴿وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۚ﴾ وەداواى لێ خۆشبوون بکەن لەخوا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾
بێگومان خوا لێ خۆشبوو میهرەبانە ﴿١٩٩﴾ ﴿فَإِذَا قَضَيۡتُم مَّنَٰسِكَكُمۡ﴾ ئەمجا کاتێك ئەرکان و واجباتى
حەجتـان تەواوکـرد ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ﴾ یادى خـوا بکـەن ﴿كَذِكۡرِكُمۡ ءَابَآءَكُمۡ﴾ وەك ناوبردنتان بۆ
باوو باپیرانتان ﴿أَوۡ أَشَدَّ ذِكۡرٗاۗ﴾ یان زۆرتر لەناوى ئەوان ﴿فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ﴾ ئەمجا هى وا هەیە
لەخەڵکـى (هـەر داواى دونیـا دەکات و) دەڵێت ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا﴾ خوایە بمانـدەرێ لەدونیادا
﴿وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖ﴾ وە (ئەوانـە) هیچ بەشـێکیان نـى یە لەڕۆژى دوایـى دا ﴿٢٠٠﴾ ﴿وَمِنۡهُم مَّن
يَقُولُ﴾ وەهـى واش هەیـە دەڵێـت ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ﴾ خوایـە هـەم
لەدونیا و هەم لە ڕۆژى دواییدا خێرو خۆشیمان پێ بدە ﴿وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ وە بمان پارێزە لەسزاى
ئاگـر ﴿٢٠١﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئا ئەوانە ﴿لَهُمۡ نَصِيبٞ﴾ بەشـێکیان هەیە ﴿مِّمَّا كَسَبُواْۚ﴾ لەوەى کە کردوویانە
﴿وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ وە خواى گەورو زۆر خێرایە لە لێپرسینەوەدا ﴿٢٠٢﴾

﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ﴾ ناوی خوا بەرن(اللە اکبر بکەن) ﴿فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ﴾ لەچەند ڕۆژێکی دیاری
کراودا ﴿فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ﴾ هەرکەسێك پەلە بکات لە دوو ڕۆژدا(هەرسێ جەمەرەکە بەردباران
بکات) ﴿فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ﴾ گوناهی ناگات ﴿وَمَن تَأَخَّرَ﴾ وە هەر کەسێکیش دوا بکەوێت (سێ ڕۆژ
ڕەجم بکات) ﴿فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ لِمَنِ ٱتَّقَىٰۗ﴾ گوناهی لەسەر نی یە بۆکەسێك پارێزکاری بکات و لەخوا
بترسێت ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لەخوا بترسن و (لەسزای) خۆتان بپارێزن ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ﴾ وە بزانن کە
ئێوە ﴿إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ﴾ بۆ لای ئەو(ئەگەڕێنەوەو) کۆدەکرێنەوە ﴿٢٠٣﴾ ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن﴾ لە ناوخەڵکی
کەسانێك هەن ﴿يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ﴾ کە بە قسە سەرسامت دەکات ﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ لەم ژیانی دونیادا
﴿وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ﴾ وە خوا دەکات بەشاهید ﴿عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ﴾ لەسەر(ڕاستیی) ئەوەی لە دڵیایەتی
﴿وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ﴾ کەچی ئەو دوژمنێکی سەر سەختە ﴿٢٠٤﴾ ﴿وَإِذَا تَوَلَّىٰ﴾ وەکاتێك پشتی هەڵکرد
﴿سَعَىٰ﴾ هەوڵ دەدات ﴿فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لە زەوی دا (لە وڵاتدا) ﴿لِيُفۡسِدَ فِيهَا﴾ بۆ ئەوەی خراپەی
تێدا بکات ﴿وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ﴾ وە کشتوکاڵ و وەچەو نەوە لەناو ببات ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ﴾
وەخوا خراپەکاری خۆش ناوێت ﴿٢٠٥﴾ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُ﴾ وە کاتێك پێ ی بووترێت ﴿ٱتَّقِ ٱللَّهَ﴾ لەخوا
بترسە ﴿أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ﴾ دەمار دەیگرێ بۆ بەد کرداریی ﴿فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ﴾ جا ئەو دۆزەخی
بەسە ﴿وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ﴾ کە بەدترین جێگایە ﴿٢٠٦﴾ ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ﴾ لە ناوخەڵکیش کەسانێك هەن
﴿مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ﴾ کە گیانی خۆی دەفرۆشێت ﴿ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ﴾ بۆ ڕەزامەندی خوا
﴿وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾ وە خوا میهرەبانە بەبەندەکان ﴿٢٠٧﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی بڕواداران
﴿ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ﴾ هەموو بەتەواوی بچنە ناو ئیسلامەوە ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ وەدوای
هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ چونکە بێگومان ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە ﴿٢٠٨﴾
﴿فَإِن زَلَلۡتُم﴾ ئەمجا ئەگەر لاتاندا(هەڵخلیسکان) ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَا﴾ دوای ئەوەی ﴿جَآءَتۡكُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ﴾ کە
نیشانە ئاشکراکانتان بۆهات ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئەوە چاك بزانن کە خوا ﴿عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ زاڵ و کار
دروستە ﴿٢٠٩﴾ ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ﴾ ئایا ئەوانە چاوەڕوانن ﴿إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ﴾ خوایان بۆ بێت ﴿فِي ظُلَلٖ﴾
لەناو چەند پارچە ﴿مِّنَ ٱلۡغَمَامِ﴾ هەورێکی سپی دا ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ هەروەها فریشتەکان(یان بۆبێ)
﴿وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ﴾ وە کارەکە کۆتایی پێ بێت ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ وە هەموو کارێك هەر بۆلای خوا
دەگەڕێتەوە ﴿٢١٠﴾

﴿سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) لەبەنی ئیسرائیل بپرسە ﴿كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ﴾ کە چەند بەڵگەو
نیشانەی ڕۆشنمان داوە بەوان ﴿وَمَن يُبَدِّلْ﴾ وە هەر کەسێك بیگۆڕێت ﴿نِعْمَةَ ٱللَّهِ﴾ بەهرەی(ڕێنموونی) خوا
﴿مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ﴾ دوای ئەوەی کەدەستی کەوت ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ ئەوەبێگومان خوداتۆڵەی زۆر سەختە
﴿٢١١﴾ ﴿زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ جوان کراوە بۆ بێ بڕوایان(ناسوپاس کەران) ﴿ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ ژیانی دونیا(بە جۆرێك)
﴿وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ کە گاڵتە دەکەن بە بڕواداران ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟﴾ (بەڵام پایەی) ئەوانەی لەخوا ترسن
﴿فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ گەلێ بەرزترە لەوان لە ڕۆژی دواییدا ﴿وَٱللَّهُ يَرْزُقُ﴾ وە خودا ڕزق و ڕۆزی دەدات
﴿مَن يَشَآءُ﴾ بەهەر کەسێك کەبیەوێت ﴿بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بەبێ شومار وحسابکردن ﴿٢١٢﴾ ﴿كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾
خەڵکی یەك کۆمەڵ بوون (بە سروشت) ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ ئەمجا خودا پێغەمبەرانی نارد ﴿مُبَشِّرِينَ﴾
بە مژدەدەر ﴿وَمُنذِرِينَ﴾ و ترسێنەر ﴿وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ﴾ وە کتێبی ڕاستی و دروستی لەگەڵدا
ناردونە خوارەوە ﴿لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ تا بڕیار بدات و حوکم بکات لەناو خەڵکی دا ﴿فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ﴾
لەو شتانەی کە جیاواز و دووبەرەك بوون تیایدا ﴿وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ﴾ وە کەس جیاواز و دووبەرەکی
نەکرد لە کتێبی ئاسمانیدا ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ﴾ مەگەر ئەوانەی کە کتێبیان پێ درابوو ﴿مِنۢ بَعْدِ﴾ دوای ئەوەی
﴿مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ نیشانەو بەڵگەی ڕۆشنیان بۆ هات ﴿بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ﴾ بەهۆی حەسادەتی ناو خۆیانەوە
﴿فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەمجا خوا خۆی ڕێنموونی بڕوادارانی کرد ﴿لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ﴾ بۆ
ئەو ڕێگا ڕاستەی کە دووبەرەکیان تیادا دەکرد ﴿وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ وە خوا کێ ی بوێت ڕێنموونی دەکات
﴿إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بۆ ڕێبازی ڕاست ﴿٢١٣﴾ ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ﴾ ئایا واتان زانییوە ﴿أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ﴾ کە دەچنە
بەهەشت ﴿وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم﴾ کەچی هێشتا نەهاتۆتە ڕێتان ئەوەی لەناڕەحتی تووشی ئەوانە
بوون کە لە پێش ئێوەدا تێپەڕین ﴿مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ﴾ (کە لە ڕێی خوادا) دووچاری سەختی و زەرەر و
زیان بوون ﴿وَزُلْزِلُوا۟﴾ وە زۆر بە توندی تەکان دران وزۆریان بوهات ﴿حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ﴾
بەڕەنگێك کە پێغەمبەرەکە و ئەوانەی کەبڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا دەیان ووت ﴿مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ﴾ سەرکەوتنی
خوا کەی دێت ﴿أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ﴾ ئاگادار بن و دڵنیابن بە ڕاستی سەرکەوتنی خوا نزیکە ﴿٢١٤﴾ ﴿يَسْـَٔلُونَكَ﴾
پرسیارت لێ دەکەن ﴿مَاذَا يُنفِقُونَ﴾ چی ببەخشن(لە ڕێ ی خوادا) ﴿قُلْ مَآ أَنفَقْتُم﴾ بڵێ: ئەوی دەیبەخشن
﴿مِّنْ خَيْرٍ﴾ لە ماڵی پاك و حەڵاڵ ﴿فَلِلْوَٰلِدَيْنِ﴾ با بۆ باوك و دایك ﴿وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾ و خزمانی نزیك ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ﴾ و
هەتیوان ﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾ و هەژاران ﴿وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ و ڕێبوارانی کەم دەست ﴿وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ﴾ وە هەرچی بکەن
لە چاکە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خوا ئاگادارە لێ ی ﴿٢١٥﴾

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ﴾ جەنگتـان لەسـەر پێویسـت کـرا ﴿وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ﴾ کەلاتـان ناخۆشـە ﴿وَعَسَىٰ
أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا﴾ وەئەگونجـێ شـتێکتان پێ ناخـۆش بێ ﴿وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ کەچی بـاش وخێر بێت
بۆتـان ﴿وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا﴾ وەئەگونجـێ شـتێکتان پـێ خـۆش بـێ ﴿وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾ و خـراپ
بێـت بۆتان ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ﴾ وە خـوا ( چاك وخراپی ئێوە ) ئەزانێـت ﴿وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ و ئێوە نایزانن ﴿٢١٦﴾
﴿يَسْأَلُونَكَ﴾ پرسیارت لێ دەکەن ﴿عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ﴾ دەربارەی مانگی حەرام ﴿قِتَالٍ فِيهِ﴾ جەنگ کردن
تیایدا ﴿قُلْ﴾ بڵێ ﴿قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ﴾ جەنگ لەمانگی حەرام دا گوناهێکی گەورەیە ﴿وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ
اللَّهِ﴾ بەلاّم بەرهەڵستیی ڕێبازی خوا ﴿وَكُفْرٌ بِهِ﴾ وەبێ بڕوایی پێی ﴿وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ وە( ڕێ گری
موسوڵمانان) لەمزگەوتی حەرام ﴿وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ﴾ ودەرکردنی خەڵکی ئەو مزگەوتە لێی ﴿أَكْبَرُ
عِندَ اللَّهِ﴾ گەورەترە لای خوا (لە جەنگ کردن لە مانگی حەرامدا) ﴿وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ﴾ وەهاوەڵ
پەیداکردن بوخوداوهەوڵدان بۆپەشیمان کردنەوەی موسڵمان گەورەترەلە(پیاو) کوشتن (لەومانگەدا)
﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾ بـەردەوام دەسـت هەڵناگـرن و جەنگتـان لەگەڵـدا دەکەن ﴿حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن
دِينِكُمْ﴾ تاپەشـیمانتان بکەنـەوە لەدینەکەتـان ﴿إِنِ اسْتَطَاعُوا﴾ ئەگـەر بتوانـن ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن
دِينِهِ﴾ وەهەرکەسێك لەئێوە لەدینی خۆی هـەڵ بگەڕێتـەوە ﴿فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ﴾ وە بەبێ بڕوایی
بمـرێ ﴿فَأُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ﴾ ئـا ئەوانە هەمـوو کردەوەکانیان پـوچ ئەبێتەوە ﴿فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾
لە دونیا و دواڕۆژیشـدا ﴿وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ وەئەوانە یارو هاودەمی ئاگرن ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾
تێیدا دەمێننەوە بەئێجگاری ﴿٢١٧﴾ ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بە ڕاسـتی ئەوانەی بڕوایان هێنا ﴿وَالَّذِينَ هَاجَرُوا﴾
وئەوانـەی کۆچیـان کـرد ﴿وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ و تێکۆشـان لەڕێ ی خـوادا ﴿أُولَٰئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ
اللَّهِ﴾ ئائەوانـە چاوەڕوانـی میهرەبانی خودان ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وەخوا لـێ خۆش بوو میهرەبانە ﴿٢١٨﴾
﴿يَسْأَلُونَكَ﴾ ئـەی موحەممەد پرسـیارت لێ دەکـەن ﴿عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ﴾ دەربارەی عـەرەق و قومار
﴿قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ﴾ بڵێ لەم دوانەدا گوناهی گەورە هەیە ﴿وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾ و چەند قازانجێك هەیە
بۆ خەڵکی ﴿وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ﴾ بەلاّم گوناهەکەیان گەورەترە ﴿مِن نَّفْعِهِمَا﴾ لە سوود وقازانجەکەیان
﴿وَيَسْأَلُونَكَ﴾ وە پرسـیارت لـێ دەکەن ﴿مَاذَا يُنفِقُونَ﴾ چی ببەخشـن ﴿قُلِ الْعَفْوَ﴾ بڵێ ئـەوەی لێتان
زیـادە ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ﴾ ئاوەهـا خـودا بەڵگـەکان ڕوون دەکاتـەوە بۆتـان ﴿لَعَلَّكُمْ
تَتَفَكَّرُونَ﴾ تا بیربکەنەوە ﴿٢١٩﴾

﴿فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ لـەكاری دونیـا ودواڕۆژتان ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ﴾ وەپرسیارت لـێ دەكەن ﴿عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ﴾
لەبارەی هەتیوان (كەچۆن بن لەگەڵیاندا) ﴿قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ﴾ بڵێ چاكسـازی (تێكەڵاوی كردن)
بـۆ ئەوان چاكتـرە ﴿وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ﴾ وەئەگەر تێكـەڵ ببن لەگەڵیاندا (قەینـاكات چونكە)
براتانـن ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ﴾ وەخوا دەزانێ كێ خراپەكار و كێ چاكەكارە (لەگەڵ هەتیوان)
﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ﴾ ئەگـەر خوا بیویسـتایە دوچـاری ڕەنج و ناڕەحەتـی دەكردن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ
حَكِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا زاڵ و كار دروستە ﴿٢٢٠﴾ ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ﴾ ژنانی هاوبەش پەیداكەر مارە
مەكەن ﴿حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ تابڕوا دەهێنن ﴿وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ﴾ كەنیزەكێكی بڕوادار ﴿خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ﴾ باشترە
لەژنـە (ئازادێكـی) هاوبـەش پەیداكەر ﴿وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ﴾ با (هاوبـەش پەیدا كەرەكە) سەرسامیشـی
كردبـن (بەجوانی یـان داراییـان) ﴿وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ وە ژنانی موسـڵمان مارە مەكـەن لەهاوبەش
پەیداكـەران ﴿حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟﴾ تابـڕوا دەهێنـن ﴿وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ﴾ وەكۆیلەیەكـی بـڕوادار ﴿خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ﴾
باشـترە لە(ئازادێكـی) هاوبـەش پەیداكـەر ﴿وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ﴾ با سەرسامیشـی كردبن (بـە دارایی یا
جوانیان) ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ ئەوانە بانگ (ی خەڵك) دەكەن بۆ ناو ئاگر ﴿وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ﴾
بـەڵام خوا (خەڵك) بانگ دەكات بۆ بەهەشـت ﴿وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ﴾ ولێخۆش بوون بەفەرمانی خۆی
﴿وَيُبَيِّنُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ﴾ وە نیشانەكانی خۆی ڕۆشن دەكاتەوە بۆخەڵكی ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بەڵكو
بیربكەنەوە ﴿٢٢١﴾ ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ﴾ وەپرسیارت لێ دەكەن دەربارەی حەیز ﴿قُلْ هُوَ أَذًى﴾ بڵێ حەیز
ئـازارە ﴿فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ﴾ كەواتـە دوور بكەونەوە لەهاوسـەرەكانتان ﴿فِى ٱلْمَحِيضِ﴾ لـە كاتی حەیزا
﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ﴾ وەنزیكیـان لەگەڵـدا مەكـەن ﴿حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ﴾ تا پـاك دەبنـەوە ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ﴾ كەخۆیان
شـت (دوای پاك بوونەوە) ﴿فَأْتُوهُنَّ﴾ ئەمجا بچنە لایان ﴿مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ﴾ لەو شـوێنەوە كە خوا
فەرمانـی پێـداون ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ﴾ بەڕاسـتی خـوا تەوبەكارانـی خـۆش دەوێت ﴿وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾
وپاكانـی خۆش دەوێـت ﴿٢٢٢﴾ ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ﴾ ژنەكانتان كێڵگـەی خۆتانن ﴿فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ﴾ جا
تـۆو بوەشـێننە ناو كێڵگەكەتانەوە (مەبەسـت چوونە لایانـە) ﴿أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾ بەهەرشـێوەیەك دەتانەوێ
(لەشـوێنی تایبەتی خۆی كە پێشـەوەیە نەك دواوە) ﴿وَقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُمْ﴾ كردەوەی باش پێش بخەن
بۆ خۆتان ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ لەخوا بترسن ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُم مُّلَـٰقُوهُ﴾ وە بزانن و دڵنیابن كەبەخزمەتی دەگەن
﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ وەمـژدە بـدە بەبـڕواداران ﴿٢٢٣﴾ ﴿وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً﴾ نەكەن سـوێند بەخوا خواردن
بكـەن بەبەرهەڵسـتی ﴿لِّأَيْمَـٰنِكُمْ﴾ ئەوشـتانەی سـوێندتان لەسـەری خـواردووە ﴿أَن تَبَرُّوا۟ وَتَتَّقُوا۟﴾
كەچاكیی و پارێزكاری ﴿وَتُصْلِحُوا۟ بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ و ڕێكخستنی نێوان خەڵكی یە ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾
وە خوا بیسەر و زانایە ﴿٢٢٤﴾

﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ﴾ خوا سوێندی بێ هوودە (لەدەم دەرچوون) تان لێ ناگرێ ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم﴾
بەڵام سوێندێکتان لێ دەگرێت ﴿بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ بە دڵ بتانەوێت ومەبەستتان بێت ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ
حَلِيمٌ﴾ وەخوا لێخۆشبوو لەسەر خۆیە (٢٢٥) ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَائِهِمْ﴾ بۆ ئەوانە هەیە سوێند دەخۆن
لەگەڵ ژنەکانیان دروست نەبن ﴿تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ﴾ چاوەڕوانیی چوار مانگ بکەن ﴿فَإِن فَاءُو﴾ ئەمجا
ئەگەر گەڕانەوە (بۆ لای ژنەکانیان) ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوا خوا لێخۆشبوو میهرەبانە (٢٢٦) ﴿وَإِنْ عَزَمُوا
الطَّلَاقَ﴾ وە ئەگەر بڕیاری تەڵاق دانیان دا ﴿فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئەوا خوا بیسەرو زانایە (٢٢٧) ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ﴾
وە ژنە تەڵاق دراوەکان ﴿يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ﴾ دان بەخۆیاندا دەگرن ﴿ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ﴾ تا ماوەی سێ حەیز
﴿وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ﴾ دروست نی یە بۆ ئەوان ﴿أَن يَكْتُمْنَ﴾ کە بیشارنەوە ﴿مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ﴾ ئەوەی خوا لە
منداڵدانیان دا دروستی کردوە (لە حەیز یا منداڵ) ﴿إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ﴾ ئەگەر بڕوایان هەیە بەخوا ﴿وَالْيَوْمِ
الْآخِرِ﴾ و بەڕۆژیی دوایی ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ﴾ وە مێردەکانیان شایستەن ﴿بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بە گێڕانەوەیان
لە عیددەدا ﴿إِنْ أَرَادُوا إِصْلَاحًا﴾ ئەگەر بیانەوێ بە باشی بژین ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ وە بۆ ژنان
هەیە بەسەر مێردیانەوە وەکو ئەوەی کە بۆ پیاوان هەیە بەسەر ژنانەوە بەپێ ی باوونەریتی (پەسەند)
﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ وە پیاوان پلەیەکیان هەیە بەسەر ژنانیانەوە ﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زاڵ و
کار دروستە (٢٢٨) ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ﴾ تەڵاق (یەك کە بردنەوەی لە دواوە بێ) دوو جارە ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ﴾
دوا ئەوە ڕاگرتنە بەخۆشیی ﴿أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ یان بەرەڵاکردن وتەڵاقدانیەتی بەباشیی ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ﴾
وە دروست نی یە بۆ ئێوە ﴿أَن تَأْخُذُوا﴾ کە لێ بسەنەوە ﴿مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا﴾ هیچێك لەوشتانەی
کەداوتانێ ﴿إِلَّا أَن يَخَافَا﴾ مەگەر هەردوولا بترسن (لەوەی) ﴿أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ﴾ کە سنووری خوا
ڕانەگرن ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ﴾ جا ئەگەر ترسان ﴿أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ﴾ لەوەی سنووری خوا ڕانەگرن ﴿فَلَا جُنَاحَ
عَلَيْهِمَا﴾ ئەو پیاوو ئافرەتەکە گوناهیان ناگات ﴿فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ بەوە کە ژنەکە لەبریتی خۆی بیدات
بەپیاوەکەی ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ﴾ ئەمانە (ی باسکران) سنووری خوان ﴿فَلَا تَعْتَدُوهَا﴾ لێیان دەرمەچن
ودەستدرێژی نەکەنە سەریان ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ﴾ وە هەرکەسێك لە سنوری خوا دەربچێت ﴿فَأُولَٰئِكَ
هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ئا ئەوانە ستەمکارن (٢٢٩) ﴿فَإِن طَلَّقَهَا﴾ ئەمجا ئەگەر تەڵاقی (سێهەمی) دا ﴿فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ﴾
ئیتر ئەو ژنە بۆ ئەو پیاوە دروست نی یە ﴿حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾ هەتا شوونەکات بە مێردیکی تر (بە
ئێجگاری) ﴿فَإِن طَلَّقَهَا﴾ ئەمجا ئەگەر (مێردی دووهەم) تەڵاقی دا (یا مرد) ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾ ئیتر
گوناه نی یە لەسەر ژن و مێردە (کۆنە) کە ﴿أَن يَتَرَاجَعَا﴾ کە بگەڕێننەوە لای یەکتر (بە مارەکردنیکی
تازە) ﴿إِن ظَنَّا﴾ ئەگەر بزانن ﴿أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ﴾ کە لە سنووری خوا دەرناچن ﴿وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ﴾
ئەمانە سنووری خوان ﴿يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ ڕوونیان دەکاتەوە بۆ گەلێك کە تێ بگەن (٢٣٠)

﴿وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ کاتێك ژنانی هاوسەرتان تەڵاق دا و ﴿فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ﴾ گەیشتن بە ئاخرو ئۆخری
عیددەیان ﴿فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ﴾ ڕایان بگرنەوە بەخۆشیی ﴿أَوۡ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖۚ﴾ یان بەرەڵایان بکەن
وتەڵاقیان بدەن بەباشی ﴿وَلَا تُمۡسِكُوهُنَّ ضِرَارٗا﴾ ڕایان مەگرنەوە بەئێش و ئازارەوە ﴿لِّتَعۡتَدُواْۚ﴾ بۆئەوەی
ستەمیان لێ بکەن ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ﴾ هەرکەسێك کاری وابکات ﴿فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ﴾ ئەوەستەمی لەخۆی
کردوە ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوٗاۚ﴾ وە گاڵتە بەفەرموودەکانی خوا مەکەن ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ و
بیربکەنەوە لەچاکەی خوا لەگەڵتاندا ﴿وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم﴾ و ئەوەی کەبەسەریدا ڕشتوون ﴿مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ
يَعِظُكُم بِهِۦۚ﴾ لەقورئان و فەرموودەی بەجێ بەوە ئامۆژگاریتان دەکات ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وە لەخوا بترسن
﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ وەبزانن کەخوا ﴿بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ بەهەموو شت زانایە ﴿٢٣١﴾ ﴿وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ کاتێك
ژنتان تەڵاقدا ﴿فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ﴾ عیددەیان تەواو بوو ﴿فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ﴾ ئیتر قەدەغەیان(بەرگرییان)
مەکەن ﴿أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ﴾ کە شووبکەن بەخەڵکانێکی تر کە دەبن بە مێردیان ﴿إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم﴾
ئەگەر ڕێك کەوتن لەناو خۆیاندا ﴿بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ﴾ بەباشی ﴿ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ﴾ ئەمە پەند وئامۆژگاری
تێدایە ﴿مَن كَانَ مِنكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ﴾ بۆئەو کەسەی کەبڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی بێت لە ئێوە
﴿ذَٰلِكُمۡ أَزۡكَىٰ لَكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ﴾ ئەم پەند وەرگرتنەتان باشترەو پاکترە ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ چونکە خوا
دەزانێ و ئێوە نایزانن ﴿٢٣٢﴾ ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ﴾ دایکان ﴿يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ﴾ شیر بدەن بە منداڵەکانیان ﴿حَوۡلَيۡنِ
كَامِلَيۡنِۖ﴾ دوو ساڵی تەواو ﴿لِمَنۡ أَرَادَ﴾ (ئەمە) بۆکەسێکە کە بیەوێت ﴿أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ﴾ شیری تەواو
بدات ﴿وَعَلَى ٱلۡمَوۡلُودِ لَهُۥ﴾ لەسەر باوکەکەیە ﴿رِزۡقُهُنَّ وَكِسۡوَتُهُنَّ﴾ ڕۆزی و کاڵای دایکەکان ﴿بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ﴾
بەباشی ﴿لَا تُكَلَّفُ نَفۡسٌ إِلَّا وُسۡعَهَاۚ﴾ هیچ کەسێك لەتوانای خۆی زیاتر داوای لێ ناکرێت ﴿لَا تُضَآرَّ
وَٰلِدَةُۢ بِوَلَدِهَا﴾ با زیان نەگەیەندرێ بەهیچ دایکێك بەهۆی منداڵەکەیەوە ﴿وَلَا مَوۡلُودٞ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦۚ﴾ وە بەهیچ
باوکێك بەهۆی منداڵەکەیەوە ﴿وَعَلَى ٱلۡوَارِثِ مِثۡلُ ذَٰلِكَۗ﴾ وە(ئەگەر باوکەکە مرد) لەسەر میراتگرە وەکو
ئەوەی(پێشوونەفەقەی دایکی منداڵە کە بدات) ﴿فَإِنۡ أَرَادَا فِصَالًا﴾ ئەمجا ئەگەر ویستیان(منداڵەکە)
لەشیر بیبڕنەوە(لەپێش دوو ساڵەکەدا) ﴿عَن تَرَاضٖ مِّنۡهُمَا وَتَشَاوُرٖ﴾ بەڕەزامەندی و ڕاوێژیی
هەردوولایەکیان ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَاۗ﴾ ئەوە گوناهیان ناگات ﴿وَإِنۡ أَرَدتُّمۡ﴾ وە ئەگەر (ئێوەی پیاوان)
ویستان ﴿أَن تَسۡتَرۡضِعُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ﴾ دایەن بگرن بۆ منداڵەکانتان ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەوە گوناهتان ناگات
﴿إِذَا سَلَّمۡتُم﴾ ئەگەر بیان دەنێ ﴿مَّآ ءَاتَيۡتُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ﴾ ئەوی بۆتان داناوون بەخۆشی ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ﴾
وە لەخوا بترسن و بزانن ﴿أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ بەڕاستی خوا بینایە بەوەی کە دەیکەن ﴿٢٣٣﴾

﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ﴾ ئەو پیاوانەی کەدەمرن لەئێوە ﴿وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا﴾ و هاوسەران جێ دەهێڵن
﴿يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ﴾ هاوسەرەكانیان دەبێت چاوەڕوانی بكەن ﴿أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ چوار مانگ و
دە شەو ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ ئەمجا كە عیددەیان تەواو بوو ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ ئیتر گوناهتان لەسەر
نی یە (ئەی كەس وكاری ژن) ﴿فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ لەوەی كە (ئەو ژنانە ) دەیكەن
لەخۆیاندا بەپێ ی باوی ناو كۆمەڵ ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ وە خوا ئاگادارە بەوەی كە دەیكەن ﴿٢٣٤﴾
﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ وە گوناهتان ناگات ﴿فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ﴾ لە خوازبێنی ژنانی (مێرد
مردوو) بە ناڕاستەوخۆ پێیان بڵێن ﴿أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ﴾ یا لەدڵی خۆتاندا(بڕیار بدەن) دەیانخوازن
﴿عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ﴾ خوای گەورە زانیویەتی كە بێگومان ئێوە ﴿سَتَذْكُرُونَهُنَّ﴾لەمەو دوا ناویان دەبەن
﴿وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا﴾ بەلام بەنهێنی بەڵێنیان پێ مەدەن ﴿إِلَّا أَن تَقُولُوا قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾ مەگەر قسەیەك
كەباش بێت ﴿وَلَا تَعْزِمُوا عُقْدَةَ النِّكَاحِ﴾ وە بڕیاری مارەكردنیان مەدەن ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾ تا
عیددەكەیان تەواو دەبێت ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ﴾ وە بزانن بێگومان خوا دەزانێت ﴿مَا فِي أَنفُسِكُمْ﴾
بەوەی كە لە دڵتاندایە ﴿فَاحْذَرُوهُ﴾ كەواتە خۆتان بپارێزن ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ﴾ وە بزانن دڵنیابن كە خوا
﴿غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ لێخۆشبووی لەسەر خۆیە ﴿٢٣٥﴾ ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ گوناهتان لەسەر نی یە ﴿إِن طَلَّقْتُمُ
النِّسَاءَ﴾ ئەگەر ژنانێك تەلاق بدەن ﴿مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ﴾ كە هێشتا نەچووبنە لایان ﴿أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾
یا مارەییتان بۆ دانەنابن ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ﴾وە بەهرەمەندیان بكەن (شتێكیان لەماڵی خۆتان بدەنێ) ﴿عَلَى
الْمُوسِعِ قَدَرُهُ﴾ دەوڵەمەند بەپێ ی خۆی ﴿وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ﴾ وە هەژار بەپێ ی خۆی ﴿مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ﴾
بەهرەو یارمەتی دانێك كە باو و نەریت بێت. ﴿حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ ئەوە پێویستە لەسەر چاكەكاران ﴿٢٣٦﴾
﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾ وە ئەگەر ژنانتان تەلاق دا ﴿مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾ پێش ئەوەی بچنە لایان ﴿وَقَدْ فَرَضْتُمْ
لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ وە مارەیی تان بۆدانابوون ﴿فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾ ئەوە نیوەی مارەیی یەكەیان دەكەوێ
﴿إِلَّا أَن يَعْفُونَ﴾ مەگەر ئەوان(لێتان) خۆش بن ﴿أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي﴾ یان ئەو كەسە لە (مێرد) ی خۆش
ببێت ﴿بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ﴾ كە مارەبڕینە كەی بەدەستە ﴿وَأَن تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ وە لێ خۆشبوونتان
لە پارێزكاریەوە نزیكترە ﴿وَلَا تَنسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ﴾ وە ئەو چاكەیەی كە لە نێوانتاندا بووە لەبیرتان
نەچێتەوە ﴿إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بێگومان خوا بینایە بەوەی كەوا دەیكەن ﴿٢٣٧﴾

﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ﴾ ئاگاداری لە نوێژەکانتان بکەن وبیانپارێزن ﴿وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ﴾ وە(بەتایبەتی)
نوێـژی ناوەڕاسـت(کە نوێژی عەسـرە) ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ وە لە نوێژدا بوەسـتن بـۆ خوا بە گەردن
کەچـی و (بـێ قسـە کردن) ﴿٢٣٨﴾ ﴿فَإِنۡ خِفۡتُمۡ﴾ ئەمجا ئەگەر ترسـان ﴿فَرِجَالًا أَوۡ رُكۡبَانٗا﴾ (نوێژ بکەن)
بە پیادە یان بەسـواری ﴿فَإِذَآ أَمِنتُمۡ﴾ کەترسـتان نەما ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ﴾ ئەوسا یادی خوا بکەن ﴿كَمَا
عَلَّمَكُم﴾ بەوڕەنگـەی کەفێـری کردوون ﴿مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ﴾ ئـەوەی جـاران نەتاندەزانی ﴿٢٣٩﴾
﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ﴾ ئـەو پیاوانـەی دەمـردن لەئێـوە ﴿وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا﴾ پـاش خۆیـان
ژنەکانیان بەجێ دەهێڵن ﴿وَصِيَّةٗ لِّأَزۡوَٰجِهِم﴾ (خوا فەرمانی کردووە) بە وەسیەت کردن بۆ ژنەکانیان
﴿مَّتَٰعًا إِلَى ٱلۡحَوۡلِ﴾ تاسـاڵێك بەخێـو بکرێن ﴿غَيۡرَ إِخۡرَاجٖ﴾ بێ ئـەوەی دەربکرێن (لە ماڵـی مێردیان)
﴿فَإِنۡ خَرَجۡنَ﴾ ئەمجا ئەگەر خۆیان چوونە دەرەوە ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئیتر هیچ گوناهتان لەسەر نی یە
(ئەی کەس وکاری مێرد) ﴿فِي مَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ﴾ لەوەی کە ئەو ژنانە دەیکەن دەربارەی خۆیان ﴿مِن
مَّعۡرُوفٖ﴾ بەباشیی ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ وەخوا زاڵ وباڵادەست و کار دروستە ﴿٢٤٠﴾ ﴿وَلِلۡمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعُۢ﴾
بۆ تەڵاق دراوان هەیە(بەسەر مێردەکانیانەوە) بەهرەمەند بکرێن (بە بڕێك پارە) ﴿بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ﴾ بەباشی
﴿حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ (ئـەوە) پێویسـتە لەسـەر پارێـزکاران ﴿٢٤١﴾ ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ﴾
ئـاوا خـوا ئایەتانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە ﴿لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ تاتێ بگەن و ژیربن ﴿٢٤٢﴾ ﴿أَلَمۡ تَرَ
إِلَى ٱلَّذِينَ﴾ ئایـا ووردنەبویتەوە لەوانـەی ﴿خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾ کەلە وڵاتی خۆیـان دەرچوون ﴿وَهُمۡ
أُلُوفٌ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوان هەزاران (کەس) بوون ﴿حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِ﴾ لەترسی مردن ﴿فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ﴾
ئەمجـا خـوا پێ ی وتـن بمرن ﴿ثُمَّ أَحۡيَٰهُمۡۚ﴾ لـە پاشـان زیندووی کردنـەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ﴾
بەڕاستی خوا خاوەنی چاکەیە ﴿عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بەسەر خەڵکەوە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ﴾ بەڵام زۆربەی
خەڵك ﴿لَا يَشۡكُرُونَ﴾ سوپاسی خوا ناکەن ﴿٢٤٣﴾ ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ جەنگ بکەن لەڕێ ی خوادا
﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ وە بزانـن ﴿أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾ بەڕاسـتی خـوا بیسـەری زانایـە ﴿٢٤٤﴾ ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ
ٱللَّهَ﴾ کێ یە ئەو کەسـەی قەرز بدات بەخوا ﴿قَرۡضًا حَسَنٗا﴾ بە قەرزێکی باش ﴿فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ﴾ ئەمجا
خوا بۆی زیاد دەکات ﴿أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗۚ﴾ بەزیاد کردنێکی زۆر ﴿وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ﴾ وە خوا(ڕۆزی
خۆی) ئەگرێتەوە وە فراوانی دەکات ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ وە هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنەوە ﴿٢٤٥﴾

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلَإِ﴾ ئایا وورد نەبوویتەوە لەبەسەرهاتی دەستە و كۆمەڵێك لەكاربەدەست و ناودارانی
﴿مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ بەنی ئیسرائیل (نەوەكانی یەعقوب) ﴿مِنْ بَعْدِ مُوسَىٰ﴾ لەدوای مووسا
﴿إِذْ قَالُوا لِنَبِيٍّ لَهُمُ﴾ كە بەپێغەمبەرێكی خۆیان ووت ﴿ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا﴾ پاشایەكمان بۆ بنێرە
﴿نُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ تا جەنگ بكەین لەڕێ ی خوادا ﴿قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ﴾ ووتی ئایا نزیك نییە ئێوە
﴿إِنْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ﴾ ئەگەر جەنگتان لەسەر فەرز و پێویست بكرێ ﴿أَلَّا تُقَاتِلُوا﴾ جەنگ
نەكەن ﴿قَالُوا وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ﴾ (لە وەڵامدا) ووتیان چ سودێكمان پێ دەگات ئەگەر جەنگ
نەكەین ﴿فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لەڕێ ی خوادا ﴿وَقَدْ أُخْرِجْنَا﴾ لەكاتێكدا كە دەركراوین ﴿مِنْ دِيَارِنَا
وَأَبْنَائِنَا﴾ لە وولاتمان و ماڵ و منداڵماندا ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ﴾ كەچی كاتێك جەنگیان
لەسەر پێویست كرا ﴿تَوَلَّوْا﴾ پشتیان هەڵكرد ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِنْهُمْ﴾ كەمێكیان نەبێت ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ
بِالظَّالِمِينَ﴾ خوایش ئاگادارە بەسەر ستەمكاراندا (٢٤٦) ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ﴾ وە پێغەمبەرەكەیان
پێی ووتن ﴿إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا﴾ بێگومان خوا طالووتی بۆ ناردن بە پادشا
﴿قَالُوا أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ﴾ ووتیان ئەو چۆن ئەبێ بە پادشا ﴿عَلَيْنَا﴾ بەسەر ئێمەوە ﴿وَنَحْنُ أَحَقُّ
بِالْمُلْكِ مِنْهُ﴾ كە ئێمە لەو شایستە ترین بەپادشایی ﴿وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِنَ الْمَالِ﴾ وە دارایی زۆری
نەدراوەتێ ﴿قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ﴾ فەرمووی: بەڕاستی خوا ئەوی هەڵبژاردووە بەسەر
ئێوەدا ﴿وَزَادَهُ بَسْطَةً﴾ وە بەشی زیاتری داوەتێ لە فراوانی ﴿فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾ لەزانین و توانایی
جەستە ﴿وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ﴾ وە خوا موڵك و پاشایی خۆی دەدات ﴿مَنْ يَشَاءُ﴾ بەهەر كەس
خۆی بیەوێ ﴿وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ وە خوا(بەهرە) فراوان و زانایە.(٢٤٧) ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ﴾ وە
پێغەمبەرەكەیان پێی ووتن ﴿إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ﴾ نیشانەی پادشایەكەی ئەوەیە ﴿أَنْ يَأْتِيَكُمُ
التَّابُوتُ﴾ كە سندوق و دارەمەیتەكەتان بۆ دێتەوە ﴿فِيهِ سَكِينَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ﴾ كەمایەی ئارامیتانە
لەپەروەردگارتانەوە ﴿وَبَقِيَّةٌ مِمَّا تَرَكَ﴾ لەگەڵ هەندێك لەكەلەپوری ﴿آلُ مُوسَىٰ وَآلُ هَارُونَ﴾
خانەدانی مووسا و هاروون ﴿تَحْمِلُهُ الْمَلَائِكَةُ﴾ فریشتە هەڵیدەگرن ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَكُمْ﴾
بێگومان لەمەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ ئێوە ﴿إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئەگەرئێوە بڕوادار بن (٢٤٨)

﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلْجُنُودِ﴾ ئەمجا کاتێك کە طالووت بەخۆی و لەشکرەکەیەوە (لەشار)
دەرچوون ﴿قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبْتَلِيكُم﴾ پێ ی ووتن بێگومان خوا تاقیتان دەکاتەوە ﴿بِنَهَرٍ﴾
بەچەمێك(ڕوبارێك) ﴿فَمَن شَرِبَ مِنْهُ﴾ ئەمجا هەرکەسێك لێی خواردەوە ﴿فَلَيْسَ مِنِّي﴾ ئەو
لە(لەشکری) من نی یە ﴿وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ﴾ وە هەرکەسێك لێی نەچەشت ئەوە لە منە ﴿إِلَّا
مَنِ ٱغْتَرَفَ غُرْفَةًۢ﴾ مەگەر کەسێك پڕمشتێکی لێ بگرێ ﴿بِيَدِهِۦ﴾ بە دەستی خۆی(و بیخواتەوە)
﴿فَشَرِبُوا۟ مِنْهُ﴾ جا هەموو تێریان لێ خواردەوە ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ﴾ کەمێکیان نەبێت ﴿فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ
هُوَ﴾ کاتێك طالووت لێ ی پەڕییەوە ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ﴾ ئەوانەش بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا(بێ
ئەوانەی کە تێریان لێ خواردەوە) ﴿قَالُوا۟ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾ ووتیان: ئەمڕۆ ئێمە
دەرەقەتی جالووت و لەشکرەکەی نایەین ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ﴾ وتیان: ئەوانەی کە پێیان وابوو
﴿أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ ٱللَّهِ﴾ بە خزمەت خوا دەگەن (لە ڕۆژی دوایی دا) ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ﴾ زۆر
دەستەی کەم زاڵ بووە بەسەر ﴿فِئَةً كَثِيرَةًۢ﴾ دەستەی زۆردا ﴿بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ بەفەرمانی خوا
﴿وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ وە خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە (٢٤٩) ﴿وَلَمَّا بَرَزُوا۟ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾ کاتێك
کە ڕووبەڕووی جالووت و لەشکرەکەی وەستان ﴿قَالُوا۟﴾ ووتیان: ﴿رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا﴾
خوایە خۆڕاگری بڕێژە بەسەرماندا ﴿وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا﴾ وە پێمان جێگیر بکە ﴿وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ﴾
وە زاڵمان بکە بەسەر گەلی ﴿ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بێ بڕوایاندا (٢٥٠) ﴿فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ ئەوسا
بەفەرمانی خوا شکاندنیان ﴿وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ﴾ وە داوود (کە یەکێك بوو لەسەربازانی
طالوت) جالووتی کوشت ﴿وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ وە خوا پاشایەتی و پێغەمبەریتی
دایە ﴿وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ﴾ وە ئەوەی ویستی فێری کرد ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ﴾ ئەگەر خوا خەڵکی لەناو
نەبردایە ﴿بَعْضَهُم بِبَعْضٍ﴾ هەندێکیان بەهەندێکی تریان ﴿لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ﴾ هەموو سەر زەوی
پڕدەبوو لە خراپە و تاوان ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ﴾ بەڵام خوا خاوەنی بەخششە ﴿عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾
بەسەر هەموو جیهانیانەوە (٢٥١) ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ﴾ ئەم (بەسەرهاتانە) نیشانەکانی خوان ﴿نَتْلُوهَا
عَلَيْكَ﴾ دەیان خوێنینەوە بەسەرتدا ﴿بِٱلْحَقِّ﴾ بەڕاستی ﴿وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ وە
بێگومان تۆ لە پێغەمبەرانیت (٢٥٢)

﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا﴾ ئـەو پێغەمبەرانەی (کە باسـکران) ڕێزمـان داوە ﴿بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ هەندێکیان بەسـەر
هەندێکیاندا ﴿مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللَّهُ﴾ لەو پێغەمبەرانە هی وایان بووە کە خوا قسەی لەگەڵ کردووە (وەك موسی علیه
السلام) ﴿وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ﴾ وە هەندێکیانی بەرز کردوەتەوە چەند پلەیەك ﴿وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ﴾
وە دامـان بـە عیسـای کـوڕی مەریـەم چەنـد بەڵگـە و (موعجیزەیەکی) ئاشـکرا ﴿وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾ وە
پشتگیریمان کرد بە فریشتەی سرووش (کە جبرییلە) ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ﴾ ئەگەر خوا بیویستایە ﴿مَا اقْتَتَلَ الَّذِينَ مِن
بَعْدِهِم﴾ ئـەو گەلانـەی کەلە دوای پێغەمبەرەکانیان دەهاتن لەگـەڵ یەکدا نە ئەجەنگین ﴿مِّن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ
الْبَيِّنَاتُ﴾ دوای ئەو نیشـانە ڕۆشـنانەی کەبۆیـان هاتبوو ﴿وَلَٰكِنِ اخْتَلَفُوا﴾ بەڵام دووبەرەکـی یان تێکەوت
﴿فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ﴾ ئەمجـا هـی وایـان بـوو بـڕوای هێنـا ﴿وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ﴾ وە هـی وایـان بـوو بـێ بڕوابـوو
﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ﴾ ئەگەر خوا بیویسـتایە ﴿مَا اقْتَتَلُوا﴾ یەکتریان نەدەکوشـت و شەڕیان نەدەکرد ﴿وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ
مَا يُرِيدُ﴾ بـەڵام ئـەوەی خـوا بیەوێت دەیـکات. ﴿٢٥٣﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەو کەسـانەی بڕواتـان هێناوە
﴿أَنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُم﴾ ببەخشـن لەو ڕۆزیەی کە پێمـان داوون ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ﴾ پێش ئەوەی کە ڕۆژێ بێ
﴿لَّا بَيْعٌ فِيهِ﴾ کە نە کڕین و فرۆشـتنی تێدایە ﴿وَلَا خُلَّةٌ﴾ و نە دۆسـتایەتی و ئاشـنایەتی تێدایە ﴿وَلَا شَفَاعَةٌ﴾
وە نـە تکای تێدایـە (تا ڕزگارتان کات لە سـزا) ﴿وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ وە هەر بێ بڕوایانن سـتەمکاران.
﴿٢٥٤﴾ ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ خوا ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق و ڕاست نیە بێجگە لەو ﴿الْحَيُّ﴾ هەمیشە
زیندووی ﴿الْقَيُّومُ﴾ تەدبیرکەر و ڕاگر(ی بوونەوەر) ە ﴿لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ﴾ نە وەنەوز ئەیگرێ و نە خەو
﴿لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ﴾ هەرهی ئەوەهەرچی لەئاسمانەکان ﴿وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ وهەرچی لەزەوی دایە ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ
عِندَهُ﴾ کێ یە ئەو کەسەی لەو ڕۆژەدا بتوانێ تکای لەلا بکات ﴿إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾ مەگەر بە ڕێ پێدانی خۆی نەبێت
﴿يَعْلَمُ﴾ ئاگـادارە ﴿مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾ بـە ئەوەی لەبەردەمـی (ئادەمی) یە وەیە(لە دونیا لە بەردەسـتیاندایە) ﴿وَمَا
خَلْفَهُمْ﴾ وە ئەوەی لە دواوەیەتی(لە ڕۆژی دوایی بۆیان ئامادەکراوە) ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ﴾ وە کەس ئاگای نی
یە لە هیچ شـتێك ﴿مِّنْ عِلْمِهِ﴾ لە زانین و زانیاری ئەو(خوا) یە ﴿إِلَّا بِمَا شَاءَ﴾ مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێ
﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ کورسـی یەکـەی خـودا هەمـوو ئاسـمانەکان و زەوی گرتۆتـەوە ﴿وَلَا يَئُودُهُ
حِفْظُهُمَا﴾ وە پارێزگـاری کردنـی ئاسـمانەکان و زەوی بۆ خوا ئاسـانە و (گـران نییە) ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ وە
هـەر ئـەوە بڵنـد پلـەی پایە گـەورە ﴿٢٥٥﴾ ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ بە هیـچ جۆرێك زۆر لێ کـردن لە دیندا نـی یە (بۆ
هاتنـە ناو ئیسـلام) ﴿قَد تَّبَيَّنَ﴾ چونکە بەڕاسـتی لـە یەك جیابوەتـەوە ﴿الرُّشْدُ﴾ ڕێنموونی و شـارەزایی ﴿مِنَ
الْغَيِّ﴾ لە گومڕایی و سـەر لێ شـێواوی (ئەم ئایەتە تایبەتە بە ئەوانەی ئایینی ئاسمانی یان هەیە) ﴿فَمَن يَكْفُرْ
بِالطَّاغُوتِ﴾ ئەمجا هەر کەس لە ڕێ ی بێ بڕوایی بگەڕێتەوە(بێ باوەڕ بێ بە هەر پەرسـتراوێك جگەلە خوا)
﴿وَيُؤْمِن بِاللَّهِ﴾ وە بـڕوا بهێنـێ بەخـوا ﴿فَقَدِ اسْتَمْسَكَ﴾ ئـەوە بێگومـان بە تونـدی دەسـتی گرتووە ﴿بِالْعُرْوَةِ
الْوُثْقَىٰ﴾ بە دەسـتەگیرەیەکی قایمی بەهێزی وا (کە ئیسلام، یان ئیمانەکەیەتی) ﴿لَا انفِصَامَ لَهَا﴾ کە پچڕان
و بەربونی بۆ نی یە ﴿وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ وە خوا بیسەری زانایە ﴿٢٥٦﴾

﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ﴾ خوا دۆست و پشتیوانی ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەوانەیە کە بڕوادارن ﴿يُخْرِجُهُم﴾ دەریان
دەهێنێت ﴿مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ لە تاریکستانی بێ بڕوایی ﴿إِلَى ٱلنُّورِ﴾ بۆ ڕووناکی باوەڕو ڕێنموونیی
﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ وە ئەوانەی کە بێ بڕوان ﴿أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ﴾ شەیتان دۆستیانە ﴿يُخْرِجُونَهُم﴾
دەریان دەهێنێ ﴿مِّنَ ٱلنُّورِ﴾ لە ڕووناکی (بیر و باوەڕ) ەوە ﴿إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ بۆ تاریکستانی (گومڕایی)
﴿أُو۟لَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە ﴿أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ هاوڕێی دۆزەخن ﴿هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ تیایا ئەمێننەوە هەتا هەتایە
﴿٢٥٧﴾ ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى﴾ ئایا ئاوڕێك نادەیتەوە بەلای ئەو (نەمروود) ەی ﴿حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ﴾ کە دەمەقاڵێی کرد
لەگەڵ ئیبراهیم (پێغەمبەردا علیه السلام) ﴿فِى رَبِّهِۦٓ﴾ دەرحەق بە پەروەردگاری ﴿أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ﴾
لەبەر ئەوەی خوا پادشایی دابوویە ﴿إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ﴾ کاتێ کە ئیبراهیم (لە وەڵامی نەمروود دا) ووتی:
﴿رَبِّىَ ٱلَّذِى﴾ پەروەردگاری من ئەو زاتەیە ﴿يُحْىِۦ﴾ ژیان ئەداو ﴿وَيُمِيتُ﴾ ژیان دەستێنێ (ودەمرێنێت)
﴿قَالَ﴾ (نەمروود) ووتی: ﴿أَنَا۠ أُحْىِۦ﴾ منیش ژیان ئەدەم ﴿وَأُمِيتُ﴾ وە ژیان دەستێنم ودەشمرێنم (دوو
زیندانی کراوی هێنا یەکێکیانی ئازاد کردو ئەوی دیکەیانی کوشت) ﴿قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ﴾ ئیبراهیم ووتی:
﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ﴾ بێگومان خوا خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەهێنێ ﴿فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ﴾
دە (ئەگەر دەتوانیت) تۆ لە ڕۆژئاواوە هەڵی بێنە ﴿فَبُهِتَ﴾ ئەمجا دەم کوت بوو ﴿ٱلَّذِى كَفَرَ﴾ ئەو بێ
بڕوایە (نەمروود) ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە خوا ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات ﴿٢٥٨﴾
﴿أَوْ كَٱلَّذِى﴾ یا وەك ئەو کەسە (عوزەیر) ﴿مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ﴾ کە ڕابورد بەلای شارێکدا (بیت المقدس)
﴿وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾ لە کاتێکدا ئەو (شارە) دیوارەکانی ڕووخا بوو بەسەر سەربانەکانیدا
﴿قَالَ﴾ (عوزەیر) ووتی: ﴿أَنَّىٰ يُحْىِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ﴾ خوا چۆن ئەم شارە ئاوەدان دەکاتەوە ﴿بَعْدَ مَوْتِهَا﴾
پاش مردنی ؟ (واتە پاش وێران بوونی) ﴿فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِا۟ئَةَ عَامٍ﴾ یەکسەر خوای گەورە (عوزەیری)
سەد ساڵ مراند ﴿ثُمَّ بَعَثَهُۥ﴾ و پاشان زیندووی کردەوە ﴿قَالَ كَمْ لَبِثْتَ﴾ (خوای گەورە) فەرمووی:
چەندە ماویتەوە لێرەدا ؟ ﴿قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ ووتی ڕۆژێك یا بەشێ لە ڕۆژێك ماومەتەوە
﴿قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِا۟ئَةَ عَامٍ﴾ (خوای گەورە) فەرمووی: نەخێر بەڵکو سەد ساڵ ماویتەوە ﴿فَٱنظُرْ إِلَىٰ
طَعَامِكَ﴾ جا تەماشای خواردن و ﴿وَشَرَابِكَ﴾ خواردنەوەکەت بکە ﴿لَمْ يَتَسَنَّهْ﴾ تێك نەچووە ﴿وَٱنظُرْ إِلَىٰ
حِمَارِكَ﴾ وە تەماشای گوێدرێژەکەت بکە ﴿وَلِنَجْعَلَكَ﴾ (وە زیندوومان کردیتەوە) تا بتگێڕین
﴿ءَايَةً لِّلنَّاسِ﴾ بە موعجیزە و (بەڵگە) بۆ خەڵکی ﴿وَٱنظُرْ إِلَى ٱلْعِظَامِ﴾ وە تەماشای ئێسقانەکانی
(گوێدرێژەکەت) بکە ﴿كَيْفَ نُنشِزُهَا﴾ چۆن بەرزیان دەکەینەوە (لە شوێنی خۆیان) و یەکیان
دەخەین ﴿ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا﴾ پاشان گۆشتی بەسەردا دەهێنین ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ﴾ ئەمجا کاتێ
ئەمانە دەرکەوت بۆی (عوزەیر) ﴿قَالَ أَعْلَمُ﴾ ووتی: بەچاکی تێگەیشتم ﴿أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا خاوەن دەستەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا ﴿٢٥٩﴾

﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ﴾ (ئـەی موحەممەد بەیاد بهێنە) کاتێك کە ئیبراهیـم ووتی: ﴿رَبِّ﴾ ئەی پەروەردگارم
﴿أَرِنِي﴾ نیشانم بدە ﴿كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە ؟ ﴿قَالَ﴾ (خوا) فەرمووی:
﴿أَوَلَمْ تُؤْمِن﴾ بـڕوات پیّ ی نەهێناوە؟ ﴿قَالَ بَلَىٰ﴾ ووتی: بەڵێ بڕوام پێیەتی ﴿وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى﴾ بەڵام
(ئەمەوێ ببینم) بۆئەوەی دڵنیا بم ﴿قَالَ﴾ (خوا) فەرمووی: ﴿فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ﴾ کەواتە چوار مەل
بگرە ﴿فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ﴾ ئەمجا (سەریان ببڕە) و پارچە پارچەیان بکە ﴿ثُمَّ﴾ لەپاشدا ﴿ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ
مِّنْهُنَّ جُزْءًا﴾ هـەر پارچەیەکیان لەسـەر شـاخێك دابنێ ﴿ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ﴾ لە پاشـان بانگیـان بکە ﴿يَأْتِينَكَ
سَعْيًا﴾ بەپەلـە دێـن بـۆلات ﴿وَٱعْلَمْ﴾ وە چاك بزانـە و ﴿أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ دڵنیابـە بێگومان خوا
باڵادەستی کار بەجـێ یـە ﴿٢٦٠﴾ ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ﴾ وێنەی (خێـری) ئەوانـەی ﴿يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ﴾ کـە ماڵـی
خۆیـان دەبەخشـن ﴿فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لـە ڕێ ی خـوادا ﴿كَمَثَلِ حَبَّةٍ﴾ وەك دەنکە (تۆوێـك) وایـە
(ڕوابێـت) و ﴿أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ﴾ حـەوت گوڵـی گرتبێـت ﴿فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ﴾ لەهـەر گوڵێکـدا
﴿مِّاْئَةُ حَبَّةٍ﴾ سـەد دانەی تێدا بێت ﴿وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ﴾ وە خوا لەمەش ، زیاتری دەکات ﴿لِمَن يَشَآءُ﴾
بـۆ هەر کەسێك کە خـۆی بیەوێت ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ وە خـوا خاوەن بەهرەی فراوانـی ئاگادارە ﴿٢٦١﴾
﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ﴾ ئەوانەی کە ماڵ و دارایی خۆیان دەبەخشن ﴿فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە ڕێ ی خوادا
﴿ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ أَذًى﴾ دوای ئـەوە هیـچ منەتێـك نانێـن و ئازارێك (بـە دڵی هـەژاران)
ناگەیەنن ﴿لَّهُمْ﴾ ئەو کەسـانە بۆیان هەیە ﴿أَجْرُهُمْ﴾ پاداشـتیان ﴿عِندَ رَبِّهِمْ﴾ لای پەروەردگاریان
﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ وە هیـچ ترسـێکیان لەسـەر نی یـە ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ وە هیچ خـەم و خەفەتێکیان
نیـە. ﴿٢٦٢﴾ ﴿قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ﴾ قسـە و گوفتـاری جـوان وشـیرین ﴿وَمَغْفِرَةٌ﴾ و چاوپۆشـی (لە هەڵـەدا)
﴿خَيْرٌ﴾ چاکتـرە ﴿مِّن صَدَقَةٍ﴾ لـە خێرێـك ﴿يَتْبَعُهَآ أَذًى﴾ کە ئـازارو دڵ ئێشـاندنی بـە دوادا بێ
﴿وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَلِيمٌ﴾ خـوا دەوڵەمەند و بێ نیاز و لەسـەر خۆیـە ﴿٢٦٣﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی
بڕواتان هێناوە ﴿لَا تُبْطِلُوا۟﴾ پوچەڵی مەکەنەوە ﴿صَدَقَٰتِكُم﴾ خێرو بەخشینەکانتان ﴿بِٱلْمَنِّ﴾ بە منەت
نـان ﴿وَٱلْأَذَىٰ﴾ و ئـازاردان و دڵ ئێشـان ﴿كَٱلَّذِى﴾ وەك ئـەو کەسـەی ﴿يُنفِقُ مَالَهُۥ﴾ ماڵ و سـامانی
خۆی دەبەخشـێت ﴿رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ بۆ ڕووپامایی خەڵك ﴿وَلَا يُؤْمِنُ﴾ وە باوەڕی نی یە ﴿بِٱللَّهِ﴾ بەخوا
﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ و بـە ڕۆژی دوایی ﴿فَمَثَلُهُۥ﴾ جا وێنەی ئـەو ناپاکە ﴿كَمَثَلِ صَفْوَانٍ﴾ وەك بەردێکی
سـاف و لووس وایە ﴿عَلَيْهِ تُرَابٌ﴾ کە گڵێکی کەمی بەسـەرەوە بێـت ﴿فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ﴾ ئەمجا بارانێکی
لێزمـەی لـێ بـدات ﴿فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا﴾ وە بەردەکە بهێڵێتەوە بـە ڕووتیی ﴿لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟﴾
ناتوانن دەستی بخەن هیچ شتێك لەوەی کە کردوویانە ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ وە خوا ڕێنموونی
گەلی بێ بڕوا وخوا نەناس ناکات ﴿٢٦٤﴾

﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ﴾ نموونەی ئەوانەی ﴿يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمُ﴾ کە ماڵ و دارایی خۆیان دەبەخشن ﴿ٱبۡتِغَآءَ
مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ﴾ لـە پێنـاو ڕەزامەنـدی خـوا ﴿وَتَثۡبِيتٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ﴾ وە بـۆ دامەزراندنـی دڵ و دەرونیـان
(لەسـەر چاکـە) ﴿كَمَثَلِ جَنَّةِۭ﴾ وەك باخێك وایـە ﴿بِرَبۡوَةٍ﴾ کە بە شـوێنێکی بەرزەوەبێت ﴿أَصَابَهَا
وَابِلٞ﴾ بارانـی دڵۆپ گەورەی لێ بدات ﴿فَـَٔاتَتۡ أُكُلَهَا ضِعۡفَيۡنِ﴾ ئەمجـا میوەی خۆی بدات بە دوو
هێنـدە ﴿فَإِن لَّمۡ يُصِبۡهَا وَابِلٞ﴾ وە ئەگـەر بارانی دڵۆپ گەورەشـی لێ نـەدات ﴿فَطَلّٞ﴾ بارانی وورد
لێـی ئەدات (واتە بـێ بەرهەم نابێت) ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ وە خوای گـەورەش بینایە بەوەی کە
دەیکـەن ٢٦٥ ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمۡ﴾ ئایـا کەس لـە ئێوە حـەز دەکات ﴿أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٞ﴾ کـە باخێکی ببێت
﴿مِّن نَّخِيلٖ﴾ لەدرەختی خورما ﴿وَأَعۡنَابٖ﴾ وە جۆرەها درەختی تری و ڕەز ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾
چەنـد جۆگـە ئاو بڕوا بەژێریاندا ﴿لَهُۥ﴾ بۆ خاوەن باخەکە ببێت ﴿فِيهَا﴾ لەناو ئەو باخەدا ﴿مِن كُلِّ
ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ لـە هەموو جۆرە میوەیەك ﴿وَأَصَابَهُ﴾ لەکاتێکدا (خاوەنەکەی) دووچاری ببێ ﴿ٱلۡكِبَرُ﴾
پیـری ﴿وَلَهُۥ﴾ وە ببیـێ ﴿ذُرِّيَّةٞ ضُعَفَآءُ﴾ چەنـد منداڵێکی ووردی بێ دەسـەڵات ﴿فَأَصَابَهَآ إِعۡصَارٞ﴾
ئەمجـا گەردەلوولێکـی لـێ هـەڵ بکات ﴿فِيهِ نَارٞ﴾ گـرو سـەمومی تێدا بێ ﴿فَٱحۡتَرَقَتۡ﴾ یەکسـەر
باخەکـە بسـوتێ ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئا بـەم ڕەنگـە ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ خـوا نیشـانەکانی (میهرەبانی)
خۆیتـان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە ﴿لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ﴾ بـۆ ئـەوەی بیـر بکەنـەوە ٢٦٦ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾
ئـەی ئەو کەسـانەی بڕواتـان هێنـاوە ﴿أَنفِقُواْ﴾ ببەخشـن ﴿مِن طَيِّبَٰتِ﴾ لـە پاکترینی ﴿مَا كَسَبۡتُمۡ﴾
ئـەوەی پەیداتـان کـردووە ﴿وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم﴾ وە لـەوەی کـە بۆمـان دەرهێناوون (ڕووانـدوون)
﴿مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ﴾ لە زەوی ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ﴾ مەڕۆن لەوەی ببەخشـن کە خراپە ﴿وَلَسۡتُم
بِـَٔاخِذِيهِ﴾ لـە کاتێکـدا کـە خۆتـان ئـەو شـتە خراپـە وەرناگرن (ئەگەر بتـان درێتـێ) ﴿إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ
فِيهِۚ﴾ مەگـەر چـاوی لـێ بپۆشـن ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ وە چـاك بزانـن کەخـوا ﴿غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ بـێ
نیازێکـی شایسـتەی ستایشـە ٢٦٧ ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ﴾ شـەیتان دەتـان ترسـێنێ بـە هـەژاری
﴿وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ﴾ وەفەرمانتـان پێدەدات بـە خراپە ﴿وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةٗ مِّنۡهُ وَفَضۡلٗاۗ﴾ وە خوا
بەڵێنـی لێخۆشـبوون و چاکەتان پێدەدات ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ﴾ خوا بەهرە فـراوان میهرەبانی زانایە ٢٦٨
﴿يُؤۡتِي﴾ ئەی بەخشـێ ﴿ٱلۡحِكۡمَةَ﴾ ژیری ودانایی ﴿مَن يَشَآءُۚ﴾ بە هەر کەسـێك کە بیەوێ ﴿وَمَن يُؤۡتَ
ٱلۡحِكۡمَةَ﴾ وە هـەر کەسـێك ژیـری و دانایی پێـدرا ﴿فَقَدۡ أُوتِيَ﴾ ئەوە بەڕاسـتی پـێ ی دراوە ﴿خَيۡرٗا
كَثِيرٗاۗ﴾ خێـر و چاکەیەکـی زۆر ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ﴾ پەند وەرناگـرن ﴿إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ تەنها خاوەن
ژیریی و هۆشمەندەکان نەبێت ٢٦٩

﴿وَمَآ أَنفَقْتُم﴾ ئەوەی بەخشییێتتان ﴿مِّن نَّفَقَةٍ﴾ لەچاکە ﴿أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ﴾ یا نەزرێکتان بڕیار
دابێ ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ﴾ ئەوە بێگومان خوا ئاگای لێ یە ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ﴾ وە بۆ ستەمکاران
نیە ﴿مِنْ أَنصَارٍ﴾ هیچ یارمەتی دەرێك ﴿٢٧٠﴾ ﴿إِن تُبْدُوا۟﴾ ئەگەر ئاشکرای بکەن ﴿ٱلصَّدَقَٰتِ﴾
خێرەکانتان ﴿فَنِعِمَّا هِىَ﴾ ئەوە کارێکی باشە ﴿وَإِن تُخْفُوهَا﴾ وە ئەگەر بیشارنەوە ﴿وَتُؤْتُوهَا﴾
و بیدەن ﴿ٱلْفُقَرَآءَ﴾ بە هەژاران ﴿فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەوە باشترە بۆ ئێوە ﴿وَيُكَفِّرُ عَنكُم﴾
وە خوا هەڵی ئەوەرێنێت لەسەرتان ودەیسڕێتەوە ﴿مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾ هێندێ لە گوناهەکانتان
﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ وە خوا بەوەی کە دەیکەن ئاگادارە ﴿٢٧١﴾ ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ﴾ لەسەر تۆ
نی یە(ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿هُدَىٰهُمْ﴾ ڕێنموونیی و موسوڵمان کردنی خەڵکی ﴿وَلَٰكِنَّ
ٱللَّهَ﴾ بەڵکو خوا ﴿يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ هەرکەسێکی بوێت هیدایەتی دەدات ﴿وَمَا تُنفِقُوا۟﴾ وە ئەوەی
ئێوە دەیبەخشن ﴿مِنْ خَيْرٍ﴾ لە دارایی (چاکە) ﴿فَلِأَنفُسِكُمْ﴾ ئەوە (قازانجەکەی) بۆ خۆتانە
﴿وَمَا تُنفِقُونَ﴾ ئێوە هیچ نابەخشن ﴿إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ﴾ مەگەر بۆ ڕەزای خوا نەبێ ﴿وَمَا تُنفِقُوا۟﴾
وەئەوەی دەیبەخشن ﴿مِنْ خَيْرٍ﴾ لەسامان و(چاکە) ﴿يُوَفَّ إِلَيْكُمْ﴾ پاداشتەکەیتان دەست دەکەوێتەوە
﴿وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾ و ئێوە ستەمتان لێ ناکرێ. ﴿٢٧٢﴾ ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ﴾ (ئەم خێرە) بۆ ئەو هەژارانەیە
﴿أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ کە دەست و پێ بەستراون لە ڕێ ی خوادا ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ ناتوانن ﴿ضَرْبًا
فِى ٱلْأَرْضِ﴾ (بۆ ڕۆزی پەیدا کردن) بگەڕێن بە زەوی دا ﴿يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ﴾ نەزانی بێ خەبەر وا
هەست دەکات ئەوان ﴿أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ﴾ کە دەوڵەمەندن بەهۆی بێ نیازی یانەوە(سواڵ نەکردنیانەوە)
﴿تَعْرِفُهُم﴾ تۆ(ئەی موحەممەد ﷺ) دەیان ناسییت ﴿بِسِيمَٰهُمْ﴾ بە شێوەیاندا ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ
ٱلنَّاسَ﴾ داوای هیچ لەکەس ناکەن ﴿إِلْحَافًا﴾ بەزۆر(وەك سواڵ کەرانی تر) ﴿وَمَا تُنفِقُوا۟﴾
وە ئەوەی دەیبەخشن ﴿مِنْ خَيْرٍ﴾ لە ماڵ و سامان ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خوا ئاگادارە
پێ ی ﴿٢٧٣﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم﴾ ئەوانەی کە ماڵ و دارایی خۆیان دەبەخشن ﴿بِٱلَّيْلِ﴾ بە شەو
﴿وَٱلنَّهَارِ﴾ و بە ڕۆژ ﴿سِرًّا﴾ بە پەنهانی ﴿وَعَلَانِيَةً﴾ و بە ئاشکرا ﴿فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ﴾ ئا ئەوانە هەر
پاداشتیان ﴿عِندَ رَبِّهِمْ﴾ لای پەروەردگاریانە ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ وە هیچ ترسێکیان لە سەر
نیە(لە داهاتوودا) ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ وە ئەوان خەفەت بار نابن لە ڕۆژی دواییدا ﴿٢٧٤﴾

﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ ئەوانەی کە سوود (ڕیبا) دەخۆن ﴿لَا يَقُومُونَ﴾ (کاتی زیندوو بوونەوە) ڕاست
نابنەوە (لە گۆڕەکانیاندا) ﴿إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى﴾ مەگەر چۆن کەسێ ڕاست دەبێتەوە ﴿يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ
ٱلْمَسِّ﴾ کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ (وە تووشی فێ بووبێ) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ﴾ ئەوە بەهۆی
ئەوەوەیە، سوود خۆران ووتیان: ﴿إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ﴾ کڕین و فرۆشتن ﴿مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ وەك سوود وایە ﴿وَأَحَلَّ
ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ﴾ لەکاتێکدا خوا ڕێ ی داوە بە کڕین و فرۆشتن وحەلاڵی کردووە ﴿وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ بەڵام سوود
(ڕیبا ) ی قەدەغە کردووە ﴿فَمَن جَآءَهُۥ﴾ ئەمجا ئەو کەسەی پێی گەیشت ﴿مَوْعِظَةٌ﴾ ئامۆژگاری
یەك ﴿مِّن رَّبِّهِۦ﴾ لە پەروەردگاری یەوە ﴿فَٱنتَهَىٰ﴾ وە خێرا دەستی لێ هەڵگرت ﴿فَلَهُۥ مَا سَلَفَ﴾ ئەوا
ئەوەی لەوەپێش وەری گرتووە بۆخۆیەتی( لە سوود خواردن) ﴿وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ وە کاری ئەو حەواڵە
بەخوایە﴿وَمَنْ عَادَ﴾ وە ئەوەی گەڕایەوە(بۆ سوود خواردن) ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ ئا ئەوانە هاوڕێی
ئاگرن ﴿هُمْ فِيهَا﴾ تیا دەمێننەوە ﴿خَٰلِدُونَ﴾ بە هەمیشەیی وهەتاهەتایی ﴿٢٧٥﴾ ﴿يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ خوا
فەڕ و بەرەکەتی سوود ناهێڵێت ﴿وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَٰتِ﴾ وە برەو بە خێرو بەخشین ئەدات وزیادی ئەکات
﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ﴾ وە خوا خۆشی ناوێت ﴿كُلَّ كَفَّارٍ﴾ هیچ بێباوەڕ و ناسوپاسگوزارێکی ﴿أَثِيمٍ﴾
تاوانکار ﴿٢٧٦﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە کردەوە
باشەکانیان کردوە ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نوێژیان بەهۆش و بیرەوە کردووە ﴿وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە
زەکاتیان داوە ﴿لَهُمْ أَجْرُهُمْ﴾ تەنها پاداشتیان ﴿عِندَ رَبِّهِمْ﴾ لای پەروەردگاریانە ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾
وە هیچ ترسێکیان لەسەر نی یە(لەڕۆژی دواییدا) ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ وە هیچ خەفەتێك ڕوویان
تێ ناکات. ﴿٢٧٧﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە (بە خوا) ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾
لە خوا بترسن ﴿وَذَرُواْ﴾ وە دەست هەڵگرن ﴿مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ﴾ لەو سودەی کە لای خەڵك ماوتانە
﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن ﴿٢٧٨﴾ ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ﴾ ئەمجا ئەگەر دەستان لێ هەڵنەگرت ﴿فَأْذَنُواْ﴾
کەواتە بزانن و ئاگادار بن ﴿بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ جەنگ لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەی ڕادەگەیەنن
﴿وَإِن تُبْتُمْ﴾ وە ئەگەر پەشیمان بوونەوە ﴿فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ﴾ ئەوا تەنها سەرمایەکانتان هی ئێوەیە
﴿لَا تَظْلِمُونَ﴾ نەستەم بکەن(لە خەڵکی ) ﴿وَلَا تُظْلَمُونَ﴾ وە نەستەمتان لێ دەکرێت ﴿٢٧٩﴾ ﴿وَإِن كَانَ
ذُو عُسْرَةٍ﴾ وە ئەگەر قەرزدار نەداربوو ﴿فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ﴾ ئەوە با مۆڵەتی بدرێت تا خوا دەسەڵاتی دەدا
﴿وَأَن تَصَدَّقُواْ﴾ وە ئەگەر (لە قەرزەکە) ئازادیان بکەن ﴿خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ باشترە بۆتان ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾
ئەگەر تێ بگەن ﴿٢٨٠﴾ ﴿وَٱتَّقُواْ﴾ وە بترسن ﴿يَوْمًا﴾ لە ڕۆژێك ﴿تُرْجَعُونَ فِيهِ﴾ دەگەڕێنرێنەوە ﴿إِلَى ٱللَّهِ﴾
بۆ لای خوا ﴿ثُمَّ تُوَفَّىٰ﴾ لەپاشان پاداشت ئەدرێتەوە ﴿كُلُّ نَفْسٍ﴾ بە هەموو کەسێك ﴿مَّا كَسَبَتْ﴾
(پاداشت و سزای) ئەوەی کردوویەتی ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ وە ئەوان ستەمیان لێ ناکرێ ﴿٢٨١﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ﴿إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ﴾ ئەگەر قەرزێکتان لەیەکتری
کرد ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾ بۆ ماوەیەکی ناوبراو(دیاری کراو) ﴿فَٱكۡتُبُوهُۚ﴾ ئەوە بینووسن ﴿وَلۡيَكۡتُب﴾
وە با بینوسێ ﴿بَّيۡنَكُمۡ﴾ لە نێوانتاندا ﴿كَاتِبُۢ﴾ نووسەرێك ﴿بِٱلۡعَدۡلِۚ﴾ بەڕاستی (ودادوەری)
﴿وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ﴾ وە هیچ نووسەرێك با سەرپێچی نەکات ﴿أَن يَكۡتُبَ﴾ لە نوسینی(سەنەدی
قەرز) دا ﴿كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ﴾ هەروەك خوا ئەوی فێری نووسین کردووە ﴿فَلۡيَكۡتُبۡ﴾ با بینوسێ
﴿وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي﴾ وە با ئەو کەسە دەقی سەنەدەکە بڵێ وبیخوێنێتەوە ﴿عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ﴾ کە قەرزەکەی
بەسەرەوەیە ﴿وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ﴾ وە لە پەروەردگاری بترسێ ﴿وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ﴾ وە هیچی لێ
کەم نەکاتەوە ﴿فَإِن كَانَ ٱلَّذِي﴾ ئەمجا ئەگەر ئەو کەسەی ﴿عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ﴾ قەرزەکەی بەسەرەوەیە
﴿سَفِيهًا﴾ بێ عەقڵ بوو ﴿أَوۡ ضَعِيفًا﴾ یان ناتەواو بوو ﴿أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ﴾ یا نەی دەتوانی ﴿أَن يُمِلَّ هُوَ﴾
خۆی دەقی سەنەدەکە بڵێت وبخوێنێتەوە ﴿فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ﴾ ئەوە با گەورەکەی بیڵێت وبخوێنێتەوە
﴿بِٱلۡعَدۡلِۚ﴾ بەڕاستی ( ودادپەروەری) ﴿وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ﴾ وە دوو شاهید بگرن ﴿مِن رِّجَالِكُمۡۖ﴾
لە پیاوانی خۆتان(موسوڵمان) ﴿فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ﴾ ئەمجا ئەگەر دوو پیاو نەبوو ﴿فَرَجُلٞ
وَٱمۡرَأَتَانِ﴾ ئەوە با پیاوێك و دوو ژن بن ﴿مِمَّن تَرۡضَوۡنَ﴾ لەوانەی کە پەسەندیان دەکەن ﴿مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ﴾
لە شاهیدەکان ﴿أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا﴾ بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکیان لەبیری چوو ﴿فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا
ٱلۡأُخۡرَىٰۚ﴾ با ئەوی تریان بیری بخاتەوە ﴿وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ﴾ با شایەتەکان سەرپێچی نەکەن ﴿إِذَا
مَا دُعُواْۚ﴾ کاتێك بانگ کران (بۆ شایەتی دان) ﴿وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ﴾ وە بێزار مەبن ﴿أَن تَكۡتُبُوهُ﴾ لەوەی کە
بینوسن ﴿صَغِيرًا﴾ بچووك بێت ﴿أَوۡ كَبِيرًا﴾ یان گەورە ﴿إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ﴾ تا کاتی خۆی ﴿ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ
عِندَ ٱللَّهِ﴾ ئەم نوسینەتان ڕاست ترە بەلای خواوە ﴿وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ﴾ وە چەسپێنەر ترە بۆ شایەتی دانەکە
﴿وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْ﴾ وە نزیك ترە لەوەی کە نەکەونە گومانەوە ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً﴾ مەگەر کاتێك
ئەو کردەوەیە بازرگانیەکی ﴿حَاضِرَةٗ تُدِيرُونَهَا بَيۡنَكُمۡ﴾ دەست بە دەست بێ بیگێڕن لە ناو خۆتاندا
﴿فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ﴾ ئەوە لەم کاتەدا گوناهتان ناگات ﴿أَلَّا تَكۡتُبُوهَاۗ﴾ ئەگەر نەینووسن
﴿وَأَشۡهِدُوٓاْ﴾ وە شاهید بگرن ﴿إِذَا تَبَايَعۡتُمۡۚ﴾ کاتێك کڕین و فرۆشتنتان کرد ﴿وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٞ
وَلَا شَهِيدٞۚ﴾ و با زیان بە نووسەر و شاهید نەگەیەندرێ ﴿وَإِن تَفۡعَلُواْ﴾ وە ئەگەر زیانتان گەیاند
﴿فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡۗ﴾ ئەوە بێگومان گوناهتان دەگات ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ﴾ وە لەخوا بترسن
﴿وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ﴾ وە خوا فێرتان دەکات﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ وە خوا بە هەموو شتێك
زانا وئاگادارە ﴿٢٨٢﴾

﴿وَإِن كُنتُمۡ عَلَىٰ سَفَرٖ﴾ ئەگەر لەسەر سەفەر بوون ﴿وَلَمۡ تَجِدُواْ﴾ و دەستتان نەكەوت ﴿كَاتِبٗا﴾ نووسەرێك ﴿فَرِهَٰنٞ مَّقۡبُوضَةٞۖ﴾ ئەوە بارمتەیەك وەرگرن ﴿فَإِنۡ أَمِنَ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا﴾ جا ئەگەر هەندێكتان لە هەندێكتان دڵنیا بوون ﴿فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤۡتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ﴾ با ئەو كەسەی كە بە ئەمین زانراوە سپاردەكە بداتەوە ﴿وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥۗ﴾ وە با لە پەروەردگاری بترسێت ﴿وَلَا تَكۡتُمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَۚ﴾ وە شایەتی مەشارنەوە ﴿وَمَن يَكۡتُمۡهَا﴾ وە ئەو كەسەی بیشارێتەوە ﴿فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٞ قَلۡبُهُۥۗ﴾ ئەوە بەڕاستی بە دڵ گوناهبارە ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ﴾ وە خوا ئاگادارە بە هەموو كردەوەیەكتان ﴿٢٨٣﴾ ﴿لِّلَّهِ﴾ هەر هی خوایە ﴿مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ ئەوەی لە ئاسمانەكانایە ﴿وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ و ئەوەی لە زەویدایە ﴿وَإِن تُبۡدُواْ﴾ ئەگەر ئاشكرای بكەن ﴿مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ ئەوەی لە دڵتاندایە ﴿أَوۡ تُخۡفُوهُ﴾ یا بیشارنەوە ﴿يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ﴾ خوا محاسەبەتان دەكات لەسەری ﴿فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ ئەوسا خۆش دەبێت لەو كەسەی كە بیەوێت ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ﴾ وە سزای كەسێك دەدات كە بیەوێت ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ وە خوا بەدەسەلات و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێكدا ﴿٢٨٤﴾ ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ﴾ پێغەمبەر ﷺ بڕوای هێنا ﴿بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ﴾ بەو نامەیەی كە بۆی نێرراوە ﴿مِن رَّبِّهِۦ﴾ لە پەروەردگاریەوە ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ﴾ لەگەڵ بڕواداراندا ﴿كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ هەموو بڕوایان هێناوە بەخوا ﴿وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ﴾ وە بە فریشتەكانی ﴿وَكُتُبِهِۦ﴾ وە ب نامەكانی ﴿وَرُسُلِهِۦ﴾ وە بە پێغەمبەرانی ﴿لَا نُفَرِّقُ﴾ جیاوازی ناكەین ﴿بَيۡنَ أَحَدٖ﴾ لە نێوان هیچ یەكێك ﴿مِّن رُّسُلِهِۦۚ﴾ لە پەیامبەرانی ﴿وَقَالُواْ﴾ (بڕواداران) وتیان: (پێغەمبەر ئایینی خوای پێ گەیاندین ئێمەش) ﴿سَمِعۡنَا﴾ بیستمان ﴿وَأَطَعۡنَاۖ﴾ فەرمانبەرییمان كرد ﴿غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا﴾ داوای لێخۆشبوونت لێدەكەین ئەی پەروەردگارمان ﴿وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ وە هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە ﴿٢٨٥﴾ ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا﴾ خوا داوا لە هیچ كەسێك ناكات ﴿إِلَّا وُسۡعَهَاۚ﴾ مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی ﴿لَهَا مَا كَسَبَتۡ﴾ (سوودی) بۆ خۆی هەیە هەر چاكەیەك بكات (با هەر بەدڵیش بێت) ﴿وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ﴾ وە (زیانی) بۆ خۆیەتی هەر خراپەیەك بكات ﴿رَبَّنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿لَا تُؤَاخِذۡنَآ﴾ لێمان مەگرە ﴿إِن نَّسِينَآ﴾ ئەگەر كردەوەیەكی پێویستمان لەبیرچوو ﴿أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ﴾ یا بەهەڵە گوناهێكمان كرد ﴿رَبَّنَا﴾ ئەی پەروەردگار ﴿وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا﴾ لەسەرمان دامەنێ باری قورس ﴿كَمَا حَمَلۡتَهُۥ﴾ وەك ئەوەی داتنا ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ﴾ لەسەر ئەوانەی پێش ئێمە (ئوممەتانی پێشووتر) ﴿رَبَّنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿وَلَا تُحَمِّلۡنَا﴾ بەڵای وامان بەسەردا مەدە ﴿مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ﴾ كە بۆمان هەڵنەگیرێت ﴿وَٱعۡفُ عَنَّا﴾ وە گوناهەكانمان بسڕەوە ﴿وَٱغۡفِرۡ لَنَا﴾ وە لێمان خۆشبە ﴿وَٱرۡحَمۡنَآۚ﴾ وە میهرەبانیمان لەگەڵدا بكە ﴿أَنتَ مَوۡلَىٰنَا﴾ تۆی یاریدەدەرو پشتیوانمان ﴿فَٱنصُرۡنَا﴾ كەواتە سەرمان بخە ﴿عَلَى ٱلۡقَوۡمِ﴾ بەسەر گەلی ﴿ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ بێ بڕوایاندا ﴿٢٨٦﴾

## سورەتی ﴿ آلِ عِمۡرَان ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓمٓ﴾ تەنها خوا ماناکەی دەزانێت بە(ئەلیف، لام، میم) دەخوێنرێتەوە بۆ ماناکەی سەیری سەرەتای سورەتی
(البقرة) بکە ﴿١﴾ ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ خوا ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نیە جگە لە ئەو ﴿ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾
زیندووە و هەمیشە ڕاگری بونەوەرە. ﴿٢﴾ ﴿نَزَّلَ عَلَيۡكَ﴾ ناردوویەتیە خوارەوە بۆت ﴿ٱلۡكِتَٰبَ﴾ قورئان
﴿بِٱلۡحَقِّ﴾ بەڕاستی و دروستی ﴿مُصَدِّقٗا﴾ بەڕاست دانەری ﴿لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ﴾ هەموو ئەو (کتێب) انە یە لەپێشیدا
بوون ﴿وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ﴾ وە تەورات و ئینجیلی نارده خوارەوە ﴿٣﴾ ﴿مِن قَبۡلُ﴾ لەپێش قورئاندا ﴿هُدٗى
لِّلنَّاسِ﴾ بەڕێنموونی خەڵکی ﴿وَأَنزَلَ﴾ وە ناردی یە خوارەوە ﴿ٱلۡفُرۡقَانَۗ﴾ فورقان(واتە: جیاکەرەوەی ڕاست
و ناڕاست _ مەبەست پێ ی قورئانە) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێگومان ئەوانەی کە بێ بڕوابوون ﴿بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بە
ئایەت و بەڵگەکانی خوا ﴿لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۗ﴾ بۆیان هەیە (لە قیامەت دا) سزای سەخت ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٞ﴾ وە خوا
باڵا دەست و بەتوانایە ﴿ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ خاوەنی تۆڵەو سزایە ﴿٤﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخۡفَىٰ عَلَيۡهِ شَيۡءٞ﴾ بەڕاستی خوا هیچ
شتێکی لێ وون نابێت. ﴿فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ نە لەزەوی ﴿وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ وە نە لەئاسماندا ﴿٥﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِي﴾ ئەو خوایە
زاتێکە ﴿يُصَوِّرُكُمۡ﴾ شێوەتان ئەکێشێ ﴿فِي ٱلۡأَرۡحَامِ﴾ لە منداڵدانەکاندا ﴿كَيۡفَ يَشَآءُۚ﴾ چۆنی بووێ ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا
هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی بەهەق و ڕاست نیە تەنها ئەو نەبێت ﴿ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ زاڵی باڵادەستی کار بەجێ یە ﴿٦﴾
﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ﴾ ئەو خوایە ﴿أَنزَلَ عَلَيۡكَ﴾ ناردوویەتی یە خوارەوە بۆت ﴿ٱلۡكِتَٰبَ﴾ قورئان ﴿مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ﴾
هەندێکی لەئایەتەکانی (مەبەستەکانیان) ڕۆشنن ﴿هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن
﴿وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ﴾ وە ئەوانی تر (ئایەتانێکن کە مەبەستەکانیان) ڕۆشن نین ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ﴾ ئەمجا ئەوکەسانەی
﴿فِي قُلُوبِهِمۡ﴾ کە لە دڵیاندا ﴿زَيۡغٞ﴾ لادان و چەوتی هەیە ﴿فَيَتَّبِعُونَ﴾ دوای ئەو ئایەتانە دەکەون ﴿مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ﴾ کە
لە قورئاندا موتەشابهن(هاوشێوەن ،واتاکانی ڕوشن نین) ﴿ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ﴾ بۆ تێکدانی بیروباوەڕی موسوڵمانان
﴿وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ﴾ وە بۆ ڕاڤەکردنی بە ئارەزووی ناپاکی خۆیان ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ﴾ لە حاڵەتێکدا کەس ڕاڤە
کردنی نازانێت ﴿إِلَّا ٱللَّهُۗ﴾ تەنیا خوا نەبێت ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾ لەگەڵ زانایان و ئەوانەی دامەزراوان لە
زانینی علمی شەرعیدا ﴿يَقُولُونَ﴾ ئەڵێن ﴿ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ ئێمە بڕوامان هێناوە بە(متشابه) ﴿كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ﴾
هەمووی لە پەروەردگارمانەوەن ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ﴾ بیر لە قورئان ناکەنەوە ﴿إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ تەنها خاوەنانی ژیریی
و بیر وهۆش نەبێت ﴿٧﴾ ﴿رَبَّنَا﴾ ئەڵێن ئەی پەروەردگارمان ﴿لَا تُزِغۡ﴾ لای مەدە(لە ڕێ ی ڕاست) ﴿قُلُوبَنَا﴾
دڵەکانمان ﴿بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا﴾ دوای ئەوەی کە ڕێنموونیت کردین ﴿وَهَبۡ لَنَا﴾ وە پێمان ببەخشە ﴿مِن لَّدُنكَ﴾
لە لای خۆتەوە ﴿رَحۡمَةًۚ﴾ بەزەیی یەك (میهرەبانیەك) ﴿إِنَّكَ أَنتَ﴾ بەڕاستی هەر تۆی ﴿ٱلۡوَهَّابُ﴾ بەخشندە ﴿٨﴾
﴿رَبَّنَآ﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنَّكَ﴾ بێگومان تۆ ﴿جَامِعُ ٱلنَّاسِ﴾ کۆکەرەوەی خەڵکیت ﴿لِيَوۡمٖ﴾ بۆ ڕۆژێك
﴿لَّا رَيۡبَ فِيهِۚ﴾ کە هیچ گومانی تێدا نی یە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا ﴿لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ﴾ بەڵێنی خۆی ناشکێنێت
و دەیباتە سەر ﴿٩﴾

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێگومان ئەوانەی بێ بڕوا بوون ﴿لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ﴾ هەرگیز کەڵك و سوودیان پێ ناگەیەنێت ﴿أَمْوَٰلُهُمْ﴾ نەماڵیان ﴿وَلَآ أَوْلَٰدُهُم﴾ وە نە منداڵیان ﴿مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ لە (سزای) خوا بەهیچ شێوەیەك ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ﴾ وە ئا ئەوانە ﴿وَقُودُ ٱلنَّارِ﴾ سووتەمەنی دۆزەخن ﴿١٠﴾ ﴿كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ﴾ (داب و باوی ئەم بێ بڕوایانە) وەك داب ونەریتی دەست و پێوەندەکانی فیرعەونە ﴿وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ و ئەوانەی لەپێش ئەواندا بوون وایە ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ کە نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆزانی ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ﴾ ئەمجا خواش گرتنی ﴿بِذُنُوبِهِمْ﴾ بەهۆی تاوانە کانیانەوە ﴿وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ وە خوا تۆڵەی سەختە ﴿١١﴾ ﴿قُل﴾ بڵێ: ﴿لِّلَّذِينَ﴾ بەوانەی ﴿كَفَرُواْ﴾ کە بێ بڕوان ﴿سَتُغْلَبُونَ﴾ لەمەولا ئەشکێن و ژێر دەکەون ﴿وَتُحْشَرُونَ﴾ وە کۆدەکرێنەوە ﴿إِلَىٰ جَهَنَّمَ﴾ بەرەو دۆزەخ ﴿وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ کە ناخۆشترین شوێنە ﴿١٢﴾ ﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ﴾ بێگومان نیشانەیەکی گرنگ ڕوویدا بۆ ئێوە(ئەی موسوڵمانینە یان ئەی کافرەکان) ﴿فِي فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا﴾ لەو دوو دەستەی(کە لە جەنگی بەدردا) دایان بەیەکدا ﴿فِئَةٌ﴾ دەستەیەکیان ﴿تُقَٰتِلُ﴾ دەجەنگیین ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە ڕێی خوادا ﴿وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ﴾ وە ئەوەی تریان بێ بڕوابوون ﴿يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ﴾ موسوڵمانەکانیان ئەدیی بەدوو ئەوەندەی خۆیان ﴿رَأْيَ ٱلْعَيْنِ﴾ بە بینینی چاو ﴿وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ﴾ وە خوا پشت گیری دەکات ﴿بِنَصْرِهِۦ﴾ بە یارمەتی خۆی ﴿مَن يَشَآءُ﴾ بۆ هەرکەس بیەوێت ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەم یارمەتیدانەدا ﴿لَعِبْرَةً﴾ پەند وئامۆژگاری هەیە ﴿لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ﴾ بۆ کەسانی خاوەن ژیری و بیروهۆش ﴿١٣﴾ ﴿زُيِّنَ﴾ جوان کراوە وڕازێنراوەتەوە ﴿لِلنَّاسِ﴾ بۆ خەڵکی ﴿حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ﴾ خۆشی و ئارەزوەکانی نەفس ﴿مِنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ لە ئافرەتان ﴿وَٱلْبَنِينَ﴾ و کوڕ وکاڵی زۆر ﴿وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ﴾ و دارایی زۆری کەڵەکە کراو ﴿مِنَ ٱلذَّهَبِ﴾ لە ئاڵتون و زێڕ ﴿وَٱلْفِضَّةِ﴾ و زیو ﴿وَٱلْخَيْلِ﴾ و ئەسپ و مایناني ﴿ٱلْمُسَوَّمَةِ﴾ نیشانەدار (بەسپیتی ناوچەوان و هەر چوار پەلی) ﴿وَٱلْأَنْعَٰمِ﴾ هەروەها ئاژەڵ و چوارپێ ﴿وَٱلْحَرْثِ﴾ و کشتوکاڵ ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەمانە ﴿مَتَٰعُ﴾ بەهرە و (کەل و پەل) ی ﴿ٱلْحَيَوٰةِ﴾ زیندەگانیی(ژیان) ی ﴿ٱلدُّنْيَا﴾ دونیان ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ﴾ وە لای خوا هەیە ﴿حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ﴾ خۆشترین جێگا و پاشەڕۆژ ﴿١٤﴾ ﴿قُلْ﴾ بڵێ: ﴿أَؤُنَبِّئُكُم﴾ خەبەرتان بدەمێ ﴿بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ﴾ بەباشتر لەمانەتان ﴿لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ﴾ بۆ ئەوانەی کە پارێزیان کرد و لەخودا ترسان ﴿عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ﴾ لای پەروەردگاریان چەند بەهەشتێك هەیە ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا﴾ کە بەژێریاندا دەڕوات ﴿ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ڕووبارەکان ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ بەهەمیشەیی و هەتا هەتایی تێیدا دەمێننەوە ﴿وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ وە (بۆیان هەیە) ژنانی پاکیزە ﴿وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ وە ڕەزامەندی لە خواوە ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ﴾ وە خوا بینایە بە بەندەکان ﴿١٥﴾

﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ﴾ (لە خوا ترسان) ئەوانەی کە دەڵێن ﴿رَبَّنَآ﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنَّنَآ﴾
بەڕاستی ئێمە ﴿ءَامَنَّا﴾ بڕوامان هێنا ﴿فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ دەی خۆش ببە لە گوناهەکانمان
﴿وَقِنَا﴾ وە بمانپارێزە ﴿عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ لە سزای ئاگری دۆزەخ (١٦) ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (ئەوانە بریتین لە)
ئارام گران ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ﴾ و ڕاستگۆیان ﴿وَٱلۡقَٰنِتِينَ﴾ و فەرمانبەردارانی خودا ﴿وَٱلۡمُنفِقِينَ﴾ و دارایی
ومالبەخشن ﴿وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ﴾ و ئەوانەی کە داوای لێ خۆشبوون دەکەن ﴿بِٱلۡأَسۡحَارِ﴾ لە پێش
بەیانیاندا (١٧) ﴿شَهِدَ ٱللَّهُ﴾ خوا شایەتی ئەدات(واتە ڕای دەگەیەنێت و بەبەڵگە دەیچەسپێنێت)
﴿أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ کە بەڕاستی هیچ پەرستراوێکی بەهەق وڕاست نی یە ئەو نەبێت ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾
وە فریشتەکانیش شایەتی ئەدەن (واتە ئیقرار ئەکەن) ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ﴾ وە خاوەن زانستەکان (زانایان) یش
شایەتی ئەدەن(واتە باوەڕی چەسپاویان هەیە) ﴿قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ﴾ (خوا) هەمیشە دادپەروەری ڕاگرتوە
﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لە خوا ﴿ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ کە بالادەستی
کاربەجێ یە (١٨) ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ﴾ بەڕاستی دینی پەسەند کراو ﴿عِندَ ٱللَّهِ﴾ لای خوا ﴿ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ﴾
(هەر) ئیسلامە ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفَ﴾ دوو بەرەکی نەکەوتنە ناو ﴿ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانەی ﴿أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ کە
نامەیان بۆ هاتبوو ﴿إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ﴾ دوای ئەوە نەبێت ﴿مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ﴾ کە زانینی بەڕاستیان بۆ هات
﴿بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ﴾ (ئەم لادانەشیان) لە ڕووی ستەم و حەسادەتەوە بوو لە نێو خۆیاندا ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ
بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ جا هەر کەسێك بێ بڕوا بێ بە ئایەتەکانی خوا(کە قورئانە) ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ
ٱلۡحِسَابِ﴾ ئەوە بەڕاستی خوا زوو حسابی لەگەڵ دەکات (١٩) ﴿فَإِنۡ حَآجُّوكَ﴾ ئەمجا ئەگەر(خاوەن
نامەکان) دەمەقاڵێ یان لەگەڵ کردیت ﴿فَقُلۡ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆش بڵێ ﴿أَسۡلَمۡتُ
وَجۡهِيَ لِلَّهِ﴾ ڕووی خۆم سپارد بەخوا (وملکەچی ئەوم) ﴿وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ﴾ لەگەڵ ئەوانەی پەیڕەوی
من ئەکەن ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بەوانە کە نامەی تەورات و
ئینجیلیان دراوەتێ(کە جوولەکە و گاوورەکانن) ﴿وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ﴾ وە بە نەخوێندەوارەکان(هاوبەش
پەیداکەرەکانی گەلی عەرەب) ﴿ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ﴾ ئایا ئێوە موسوڵمان بوون ؟ ﴿فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ﴾ ئەمجا
ئەگەر موسوڵمان بوون ﴿فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ﴾ ئەوە بەڕاستی مانانی ئەوەیە کە هیدایەتیان وەرگرتووە
﴿وَّإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ وە ئەگەر ڕووشیان وەرگێڕا ﴿فَإِنَّمَا﴾ ئەوە بەڕاستی ﴿عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ﴾ تۆ هەر ڕاگەیاندنت
لەسەرە ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾ وە خوا بینایە بە بەندەکان (٢٠) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی
بێ بڕوان ﴿بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بە ئایەتەکانی خوا(بە نیشانەکانی خوا) ﴿وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ وە پێغەمبەران
ئەکوژن ﴿بِغَيۡرِ حَقّٖ﴾ بە ناڕەوا ﴿وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ﴾ وە ئەو کەسانە ئەکوژن ﴿يَأۡمُرُونَ﴾ کە فەرمان
ئەدەن ﴿بِٱلۡقِسۡطِ﴾ بە دادگەری ﴿مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ لە خەڵکی ﴿فَبَشِّرۡهُم﴾ ئەوە مژدەیان بدەرێ (وەك
سووکایەتی کردن وایە) ﴿بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ بە سزای پڕ لە ئازار (٢١) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە کەسانێکن
﴿حَبِطَتۡ﴾ پووچ بووەتەوە ﴿أَعۡمَٰلُهُمۡ﴾ کردەوەکانیان ﴿فِي ٱلدُّنۡيَا﴾ لە دونیا ﴿وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ وە لە ڕۆژی
دوایی دا ﴿وَمَا لَهُم﴾ وە ئەوان نیانە ﴿مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ هیچ یارمەتیدەرێك (٢٢)

﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا ورد نابیتەوە ﴿إِلَى الَّذِينَ﴾ لەوانەی ﴿أُوتُوا﴾ پێیان دراوە ﴿نَصِيبًا﴾ بەشێك ﴿مِنَ
الْكِتَابِ﴾ لە تەورات ﴿يُدْعَوْنَ﴾ بانگ دەكرێن ﴿إِلَى كِتَابِ اللَّهِ﴾ بۆ لای كتێبی خوا(تەورات)
﴿لِيَحْكُمَ﴾ بۆ ئەوەی بڕیاربدات ﴿بَيْنَهُمْ﴾لە نێوانیاندا ﴿ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِنْهُمْ﴾ لە پاشان دەستەیەك
لەوان پشت هەڵدەكەن ﴿وَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ لە حاڵێكدا ئەوان ڕوو وەرگێڕن (٢٣) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ﴾
ئەمە بەهۆی ئەوەوەیە كە بێگومان ئەوان ﴿قَالُوا﴾دەیان ووت: ﴿لَنْ تَمَسَّنَا﴾ هەرگیز بەر لەشمان
ناكەوێت ﴿النَّارُ﴾ئاگر ﴿إِلَّا أَيَّامًا مَعْدُودَاتٍ﴾ تەنها چەند ڕۆژێكی ژمێررا و كەم نەبێت
﴿وَغَرَّهُمْ﴾ وە خەڵەتاندنی(و فریووی دان) ﴿فِي دِينِهِمْ﴾ لە دینەكەیاندا ﴿مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ ئەو
درۆیانەی كە هەڵیان دەبەست (٢٤) ﴿فَكَيْفَ﴾ ئەمجا دەبێ حاڵیان چۆن بێت ﴿إِذَا جَمَعْنَاهُمْ﴾ ئەو
كاتەی كە كۆیان دەكەینەوە ﴿لِيَوْمٍ﴾ لە ڕۆژێكدا ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ كە گومانی تێدا نی یە ﴿وَوُفِّيَتْ﴾
و پاداشتی تەواوی دەدرێتەوە ﴿كُلُّ نَفْسٍ﴾ هەموو كەسێك ﴿مَا كَسَبَتْ﴾ ئەوەی كردویەتی ﴿وَهُمْ
لَا يُظْلَمُونَ﴾ وە ئەوان هیچ ستەمێكیان لێ ناكرێت (٢٥) ﴿قُلِ اللَّهُمَّ﴾ بڵێ ئەی خوایە ﴿مَالِكَ الْمُلْكِ﴾
خاوەن دەسەڵات ﴿تُؤْتِي الْمُلْكَ﴾ دەسەڵات دەدەیت ﴿مَنْ تَشَاءُ﴾ بە هەر كەسێك كە بتەوێت
﴿وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ﴾ وە دەسەڵات ئەسێنیتەوە ﴿مِمَّنْ تَشَاءُ﴾ لە هەر كەسێك كە بتەوێت ﴿وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ﴾
وە بەڕێزی دەكەیت ئەوەی بتەوێت ﴿وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ﴾ وە بێ ڕێزی دەكەیت ئەوەی بتەوێت ﴿بِيَدِكَ﴾
تەنها بەدەستی تۆیە ﴿الْخَيْرُ﴾ هەموو چاكەیەك ﴿إِنَّكَ﴾ بەڕاستی تۆ ﴿عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ﴾ بەسەر هەموو
شتێكدا ﴿قَدِيرٌ﴾ بە توانایت (٢٦) ﴿تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ﴾ شەو دەكەیت بەناو ڕۆژدا ﴿وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي
اللَّيْلِ﴾ وە ڕۆژ دەكەیت بەناو شەودا ﴿وَتُخْرِجُ الْحَيَّ﴾ وە زیندوو دەردێنی ﴿مِنَ الْمَيِّتِ﴾ لە مردوو
﴿وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ﴾ وە مردوو دەردێنی ﴿مِنَ الْحَيِّ﴾ لەزیندوو ﴿وَتَرْزُقُ﴾ وە ڕۆزی دەدەیت ﴿مَنْ تَشَاءُ﴾
بە هەر كەسێ كە بتەوێت ﴿بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بەبێ حساب و بێ شومار (٢٧) ﴿لَا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ﴾
نابێ بڕواداران بێ باوەڕان بگرن ﴿أَوْلِيَاءَ﴾بە دۆستی خۆیان ﴿مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ لەجیاتی بڕواداران
﴿وَمَنْ يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ وە هەر كەسێك وابكات ﴿فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ﴾ ئیتر پەیوەستی لەگەڵ خوادا
نامێنێ ﴿إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً﴾ مەگەر بۆ خۆپاراستنتان بێت لێ یان (بەشێوەیەك كە بە دەم بیڵێن
و بەدڵ باوەڕتان پێی نەبێت) ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ﴾ وە خوا دەتان ترسێنێت لە سزای خۆی
﴿وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾ وە هەر بۆ لای خوایە گەڕانەوە (٢٨) ﴿قُلْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ:
﴿إِنْ تُخْفُوا﴾ ئەگەر بیشارنەوە ﴿مَا فِي صُدُورِكُمْ﴾ ئەوەی لە دڵتاندایە ﴿أَوْ تُبْدُوهُ﴾ یان ئاشكرای
بكەن ﴿يَعْلَمْهُ اللَّهُ﴾ خوا پێ ی دەزانێ ﴿وَيَعْلَمُ﴾ وە دەیزانێت ﴿مَا فِي السَّمَاوَاتِ﴾ ئەوەی لە ئاسمانەكان
﴿وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ وە ئەوەی لەزەوی دایە ﴿وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ﴾ وە خوا بەسەر هەموو شتێكدا ﴿قَدِيرٌ﴾ بە
توانایە (٢٩)

﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ﴾ (بترسن) لەو ڕۆژەی هەموو کەسێك ئەبینێت ﴿مَا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ﴾ هەر کارێکی
باشی کردبێت ﴿مُحْضَرًا﴾ ئامادەیە ﴿وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ﴾ وە هەر کارێکی خراپی کردبێت ﴿تَوَدُّ لَوْ
أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ﴾ ئاوات دەخوازێت کە لە نێوان ئەو و کارە خراپەکەیدا ﴿أَمَدًۢا بَعِيدًا﴾ ماوەیەکی
زۆر دوور ببوایە ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ﴾ وە خوا دەتان ترسێنێ ﴿نَفْسَهُۥ﴾ لە سزای خۆی ﴿وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ
بِٱلْعِبَادِ﴾ وە خوا میهرەبانە بە بەندەکانی خۆی. (٣٠) ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: ﴿إِن كُنتُمْ﴾ ئەگەر
ئێوە ﴿تُحِبُّونَ ٱللَّهَ﴾ خواتان خۆش دەوێت ﴿فَٱتَّبِعُونِى﴾ کەواتە دوای من بکەون ﴿يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ﴾ تا خواش
ئێوەی خۆش بوێت ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ وە لە گوناهەکانتان خۆش ببێت ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ﴾ وە خوا
لێخۆشبووی ﴿رَّحِيمٌ﴾ میهرەبانە (٣١) ﴿قُلْ﴾ بڵێ: ﴿أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ﴾ فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی خوا
و پێغەمبەر بن ﴿فَإِن تَوَلَّوْا۟﴾ ئەمجا ئەگەر پشت هەڵکەن ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ﴾ ئەوە بێگومان خوا ﴿لَا يُحِبُّ
ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بێ بڕوایانی خۆش ناوێت (٣٢) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ﴾ بێگومان خوا هەڵی بژاردووە ﴿ءَادَمَ
وَنُوحًا﴾ ئادەم و نووح ﴿وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ﴾ وە خانەوادەی ئیبراهیم ﴿وَءَالَ عِمْرَٰنَ﴾ وە خانەوادەی عیمران
﴿عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بەسەر هەموو جیهانیاندا (٣٣) ﴿ذُرِّيَّةًۢ﴾ نەوەیەکن ﴿بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍ﴾ هەندێکیان لە
هەندێکیان کەوتوونەتەوە ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ﴾ وە خوا بیسەری ﴿عَلِيمٌ﴾ زانایە (٣٤) ﴿إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ﴾
(بێنەوە بیر) کاتێك کە ژنی عیمران ووتی ﴿رَبِّ﴾ ئەی پەروەردگارم ﴿إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ﴾ بێگومان من
نەزرم کردوە بۆ تۆ ﴿مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا﴾ ئەوەی کە لە سکم دایە ئازادکراو بێت (بۆ خزمەتی خانەی
تۆ کە بیت المقدس) ە ﴿فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ﴾ دە تۆش (ئەم نەزرەم) لێ گیرا بکە ﴿إِنَّكَ أَنتَ﴾ بەڕاستی تۆ
﴿ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بیسەری زانایت (٣٥) ﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا﴾ جا کاتێك کە سکەکەی دانا ﴿قَالَتْ﴾ ووتی:
﴿رَبِّ﴾ ئەی پەروەردگارم ﴿إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ﴾ خۆ من کچم بوو ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ﴾ بەڕاستی خوا زاناترە
﴿بِمَا وَضَعَتْ﴾ بەوەی کە بوویەتی ﴿وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ﴾ کوڕیش وەك کچ نی یە (مەبەست لەوەیە لەو
کاتەدا کوڕان دەکران بە نەزر بۆ خزمەتکردنی بیت المقدس) ﴿وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ﴾ وە بێگومان
منیش ناوم نا مەریەم ﴿وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا﴾ وە من خۆی و نەوەی ئەپارێزم بە تۆ ﴿مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ
ٱلرَّجِيمِ﴾ لە شەیتانی دەرکراو (٣٦) ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا﴾ ئەمجا پەروەردگاری مەریەمی وەرگرت ﴿بِقَبُولٍ
حَسَنٍ﴾ بەوەرگرتنێکی جوان ﴿وَأَنۢبَتَهَا﴾ وە ڕوواندی (پەروەردەی کرد) ﴿نَبَاتًا حَسَنًا﴾ بە ڕواندنێك
(پەروەردەیەکی) جوان ﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا﴾ وە زەکەریا دەستەبەریی کرد (ئەرکی ژیانی گرتە ئەستۆ
و خودا کردی بەمامۆستای مەریەم) ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ﴾ هەر کات زەکەریا بڕۆشتایە
بۆ لای مەریەم لە شوێنی خواپەرستیەکەیدا ﴿وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا﴾ خواردەمەنی ورزق و ڕۆزی
لەلا دەبینی ﴿قَالَ﴾ (زەکەریا) ووتی: ﴿يَٰمَرْيَمُ﴾ ئەی مەریەم ﴿أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا﴾ ئەمەت لە کوێ بووە؟
﴿قَالَتْ﴾ (مەریەم) ووتی: ﴿هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەوە لەلایەن خواوەیە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ﴾ بەڕاستی خوا ڕۆزی
دەدات ﴿مَن يَشَآءُ﴾ بە هەر کەسێك کە بیەوێت ﴿بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بە بێ حساب و بێ شومار (٣٧)

﴿هُنَالِكَ﴾ ئا لـەو كاتەدا ﴿دَعَا﴾ پاڕایـەوە ﴿زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ﴾ زەكەریـا لە پەروەردگـاری ﴿قَالَ﴾ ووتی:
﴿رَبِّ﴾ ئـەی پەروەردگـارم ﴿هَبْ لِى﴾ پێـم ببەخشـە ﴿مِن لَّدُنكَ﴾ لەلایەنـی خۆتـەوە ﴿ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً﴾
كوڕێكی سرووشت پاك ﴿إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ بەڕاستی تۆ بیسەری پاڕانەوەیت ﴿٣٨﴾ ﴿فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ﴾
جا فریشـتە بانگی لێكرد ﴿وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ﴾ لەكاتێكدا كە زەكەریا لە میحرابەكەدا وەسـتابوو
نوێـژی دەكرد ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ﴾ بەڕاسـتی خوا مـژدەت دەداتێ ﴿بِيَحْيَىٰ﴾ بە(كوڕێك نـاوی) یەحیایە
﴿مُصَدِّقًۢا﴾ كە بڕواهێنەرە ﴿بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ بە عیسای ووتەی خوا ﴿وَسَيِّدًا﴾ و پێشەوایە ﴿وَحَصُورًا﴾ وە
جڵەوگری نەفسـی خۆیەتـی ﴿وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ وە یەكێكە لە پێغەمبەرانـی چاك كردار ﴿٣٩﴾ ﴿قَالَ﴾
(زەكەریـا) ووتـی: ﴿رَبِّ﴾ ئـەی پەروەردگارم ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَـٰمٌ﴾ مـن چۆن كـوڕم دەبێت ﴿وَقَدْ بَلَغَنِىَ
ٱلْكِبَرُ﴾ لـە حاڵێكـدا بەڕاسـتی پیـری یەخە گیرم بـووە ﴿وَٱمْرَأَتِى عَاقِرٌ﴾ وە ژنەكەشـم نەزۆكە ؟
﴿قَالَ﴾ (خـوای گـەورە) فەرمـووی ﴿كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ﴾ ئیشـی خـوا وایـە ﴿يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ﴾ چـی بوێت
دەیـكات ﴿٤٠﴾ ﴿قَالَ﴾ (زەكەریـا) ووتـی ﴿رَبِّ ٱجْعَل لِّىٓ ءَايَةً﴾ ئەی پەروەردگارم نیشـانەیەكم بۆ دابنێ
﴿قَالَ﴾(خـوای گەورە)فەرمـووی: ﴿ءَايَتُكَ﴾ نیشـانەكەت ئەوەیـە ﴿أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَـٰثَةَ أَيَّامٍ﴾ كـە
ناتوانیت قسە لەگەڵ خەڵكیدابكەیت سێ ڕۆژ ﴿إِلَّا رَمْزًا﴾ مەگەر بە ئاماژە (هێما) نەبێت ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ
كَثِيرًا﴾ وە زۆر یـادی پەروەردگارت بكە ﴿وَسَبِّحْ﴾ و تەسـبیحاتی خوا بكـە ﴿بِٱلْعَشِىِّ﴾ بە ئێواران
﴿وَٱلْإِبْكَـٰرِ﴾ و بەیانیـان ﴿٤١﴾ ﴿وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ﴾ (یـادی ئەوە بكـە) كاتێك كە فریشـتە (جیبرییل)
ووتـی : ﴿يَـٰمَرْيَمُ﴾ ئـەی مەریـەم ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بێگومـان خـوا ﴿ٱصْطَفَىٰكِ﴾ تـۆی هەڵبـژارد ﴿وَطَهَّرَكِ﴾
و پاكـی كردیتـەوە (لـە هەمووخووڕەوشـتێكی ناشـیرین) ﴿وَٱصْطَفَىٰكِ﴾ وە هەڵـی بـژاردوی ﴿عَلَىٰ
نِسَآءِ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ بەسـەر هەموو ژنانـی جیهاندا ﴿٤٢﴾ ﴿يَـٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ﴾ ئەی مەریـەم فەرمانبەرداری
پەروەردگارت بكە ﴿وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى﴾ وە سوژدەو كڕنووش بەرە ﴿مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾ لەگەڵ ئەوانەی كە
سـوژدەو كڕنـوش دەبەن ﴿٤٣﴾ ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ﴾ ئەوەی ووترا لـە هەواڵە پەنهانەكانن ﴿نُوحِيهِ إِلَيْكَ﴾
بـە وەحـی بـۆت دەنێرین (ئـەی موحممـەد ﷺ) ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ﴾ وە تۆ لە لای ئـەوان نەبوویت
﴿إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَـٰمَهُمْ﴾ كاتێك كە قەڵەمەكانیان هاوێشـت ﴿أَيُّهُمْ﴾ كامیان ﴿يَكْفُلُ مَرْيَمَ﴾ دەستەبەرێتی
وسەرپەرشـتی وبەخێو كردنـی مەریەمیان بەردەكەوێـت ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ﴾ وە تۆ لەلایان نەبوویت
﴿إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ كە دەمەقاڵێیان دەكرد (لەم ڕووەوە) ﴿٤٤﴾ ﴿إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ﴾ كاتێك كە فریشتەكە ووتی:
﴿يَـٰمَرْيَمُ﴾ ئەی مەریەم ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ﴾ بێگومان خوا مژدەت دەداتێ ﴿بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ﴾ بە ووتەیەك لەوەوە
﴿ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ كـە ناوی مەسیح (عیسـا)ی كوڕی مەریەمە ﴿وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ﴾
بەڕێزو پایەبەرزە لە هەردوو جیهاندا ﴿وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ وە لە نزیكانی خودایە ﴿٤٥﴾

﴿وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ﴾ وە قسـە دەكات لەگـەڵ خەڵكیـدا ﴿فِي ٱلْمَهْدِ﴾ لە بێشـكەداو ﴿وَكَهْلًا﴾ لە (كاتی)
گەورەیی دا ﴿وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وە لە پیاو چاكانیشـە ﴿٤٦﴾ ﴿قَالَتْ﴾ مەریەم ووتی: ﴿رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٌ﴾
ئـەی پەروەردگارم من چـۆن منداڵم دەبێت ﴿وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ﴾ لە كاتێكدا كە پیاو نەهاتۆتە لام (لێم
نەكەوتوە) ؟ ﴿قَالَ﴾ (جیبریل) فەرمووی ﴿كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ﴾ وایە(كە ئەڵێیت) خوا چی بوێت
دروستی دەكات ﴿إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا﴾ كاتێك كە بڕیاری شتێكی دا ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ﴾ هەر ئەوەندەی دەوێت
پـێ بڵێـت ﴿كُن فَيَكُونُ﴾ ببە، ئیتر دەبێـت ﴿٤٧﴾ ﴿وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ﴾ وە خوا
فێـری كتێـب و دانایـی وتـەورات و ئینجیلـی دەكات ﴿٤٨﴾ ﴿وَرَسُولًا﴾ وە پێغەمبەر (دەنێرێت) ﴿إِلَىٰ بَنِيٓ
إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ بۆ بەنو ئیسرائیل (نەوەكانی یەعقوب) ﴿أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ﴾ (پێ یان دەڵێت) بەڕاستی من
نیشانەیەكم بۆ هێناون ﴿مِّن رَّبِّكُمْ﴾ لە پەروەردگارتانەوە ﴿أَنِّيٓ أَخْلُقُ لَكُم﴾ كە من بۆتان دروست دەكەم
﴿مِّنَ ٱلطِّينِ﴾ لـە قوڕ ﴿كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ﴾ (شـتێك) لە وێنەی باڵنـدە ﴿فَأَنفُخُ فِيهِ﴾ ئەمجا فووی پیادەكەم
﴿فَيَكُونُ طَيْرًۢا﴾ یەكسـەر دەبێت بـە باڵندە ﴿بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ بە فەرمانی خـوا ﴿وَأُبْرِئُ﴾ وە چاكی ئەكەمەوە
﴿ٱلْأَكْمَهَ﴾ كوێـری زكمـاك ﴿وَٱلْأَبْرَصَ﴾ و بەڵەك ﴿وَأُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ وە مردوانیـش زیندوو دەكەمەوە
﴿بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ بە فەرمانی خوا ﴿وَأُنَبِّئُكُم﴾ وە خەبەرتان دەدەمێ (لە خواوە) ﴿بِمَا تَأْكُلُونَ﴾ چی ئەخۆن
﴿وَمَا تَدَّخِرُونَ﴾ چـی بـە زەخیرە هەڵئەگرن ﴿فِي بُيُوتِكُمْ﴾ لـە ماڵەكانتاندا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاسـتی هەیە
لەم موعجیزانەدا ﴿لَـَٔايَةً لَّكُمْ﴾ بەڵگە ونیشـانەی بەهێز بۆ ئێوە (لەسـەر ڕاسـتی پێغەمبەریەتی من)
﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن ﴿٤٩﴾ ﴿وَمُصَدِّقًا﴾ وە (من هاتووم) بەبڕواهێنەر ﴿لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ
ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ بـەو تەوراتەی كەلە بەردەستمدایە ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِي﴾ وە هاتـووم بۆ ئەوەی حەڵاڵ
بكـەم هێنـدێ لـەو شـتانەی ﴿حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾ كـە قەدەغـە كـراوە لێتـان ﴿وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾
وە بەڵگـەم بـۆ هێناون لـەلای پەروەردگارتانەوە ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ كەواتە بترسـن لە (بـێ فەرمانی) خوا
﴿وَأَطِيعُونِ﴾ وەفەرمانبەرداریـم بكـەن ﴿٥٠﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ﴾ بە ڕاسـتی خـوا پەروەردگاری من
و ئێوەیـە ﴿فَٱعْبُدُوهُ﴾ دەی بیپەرسـتن ﴿هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ ئـا ئەمەیە ڕێگای ڕاسـت ﴿٥١﴾ ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ
عِيسَىٰ﴾ ئەمجـا كاتێـك كـە عیسـا هەسـتی كـرد ﴿مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ﴾ بـە بـێ بڕوایـی گەلەكـەی
﴿قَالَ مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ووتـی: كـێ لەگـەڵ منـدا یارمەتـی دەری دینـی خوایـە ﴿قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ﴾
شـاگردەكانی (حەوارییەكانی) ووتیـان ﴿نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ﴾ ئێمە یارمەتـی دەری دینی خواین ﴿ءَامَنَّا
بِٱللَّهِ﴾ بڕوامـان بـە خـوا هێنـاوە ﴿وَٱشْهَدْ﴾ و تۆ ئەی عیسـا شـاهید بە ﴿بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ كـە ئێمە
گوێڕایەڵ وملكەچی ئەوین ﴿٥٢﴾

﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا﴾ ئـەی پەروەردگارمان ئێمـە باوەڕمان هێنا ﴿بِمَآ أَنزَلْتَ﴾ بەوەی کـە ناردووتەتە خوارەوە ﴿وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ﴾ وە پەیـڕەوی پێغەمبـەری تۆمـان کـرد ﴿فَٱكْتُبْنَا﴾ دەی خوایـە ناومان بنووسـە (بمانژمێرە) ﴿مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ لە دەفتەری بڕوادارانی (یەکتاپەرسـت)دا ﴿٥٣﴾ ﴿وَمَكَرُوا۟﴾ (جوولەکەکان) پیلانیـان گێڕا( بۆ کوشـتنی عیسـا) ﴿وَمَكَرَ ٱللَّهُ﴾ خواش لـە بەرانبەردا پیلانی لـێ گێڕان ﴿وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ﴾ وەخـواش چاکتریـن پیـلان گێـڕە (لەبەرانبـەر پیـلان گێڕانـدا بـۆ پووچەڵکردنـەوەی فروفێڵەکانیـان) ﴿٥٤﴾ ﴿إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ﴾ (بیهێنـەرەوە یـادت) کاتـێ خـوا فەرمووی ئەی عیسـا ﴿إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ﴾ مـن تـۆ دەبەمەوە و بـەرزت دەکەمەوە بـۆ لای خۆم ﴿وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ وە پاك کەرەوەی تۆم لە (هاودەمی) ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون ﴿وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ﴾ وە پەیڕەوانی (ڕاستەقینەی) تۆ بەرز دەکەمەوە ﴿فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ بەسەر بێ بڕوایاندا ﴿إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ تا ڕۆژی دوایـی ﴿ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ﴾ پاشـان گەڕانەوەتان بـۆ لای منە ﴿فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ﴾ ئەمجا بڕیـار دەدەم لە نێوانتاندا ﴿فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ لەو شـتانەی کە تیایاندا جیاوازو ناکۆکن ﴿٥٥﴾ ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ جا ئەوانەی بێ بڕوابوون ﴿فَأُعَذِّبُهُمْ﴾ سـزایان دەدەم ﴿عَذَابًا شَدِيدًا﴾ بەسـزای سـەخت ﴿فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ لە دونیاو ڕۆژی دوایشـدا ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ وە ئەوانـە هیچ یارمەتیدەرێکیان نی یە ﴿٥٦﴾ ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بـەڵام ئەوانـەی کە بڕوایـان هێناوە ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە کردەوە باشـەکانیان کـردووە ﴿فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ﴾ ئەوە خوا بەتەواوی پاداشـتیان دەداتـەوە ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومان خـوا سـتەمکارانی خـۆش ناوێـت ﴿٥٧﴾ ﴿ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ﴾ ئەم بەسـەرهاتانەی کـە ئەیـان خوێنینەوە بەسـەرتدا (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿مِنَ ٱلْءَايَٰتِ﴾ لە ئایەت وبەڵگە ونیشانەکان ﴿وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ﴾ و قورئانی پڕ لە حیکمەتن ﴿٥٨﴾ ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی وێنەی(دروست بوونی) عیسا لای خوا﴿كَمَثَلِ ءَادَمَ﴾ وەك وێنەی ئادەم وایە ﴿خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ﴾ کە دروستی کرد لە گڵ ﴿ثُمَّ قَالَ لَهُۥ﴾ لە پاشان پێی ووت ﴿كُن فَيَكُونُ﴾ ببە، ئەویش بوو (بەمرۆڤ) ﴿٥٩﴾ ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ قسەی ڕاست ئەوەیە کە لە خواوە بەتۆ گەیشـت ﴿فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ کەواتە لە گومانداران مەبە ﴿٦٠﴾ ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ﴾ ئەمجا هەر کەسـێك دەمە قاڵێی لەگەڵ کردیت(لە بارەی عیسـاوە) ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ دوای ئـەو زانینـەی کە(بەوەحی) بۆت هات ﴿فَقُلْ تَعَالَوْا۟﴾ تۆش پێیـان بڵێ وەرن ﴿نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ﴾ بـا بانگی کوڕەکانمـان و کوڕەکانتان بکەین ﴿وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ﴾ وە (بانگی) ژنەکانمان و ژنەکانتان بکەین﴿وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ﴾ وە (بانگی) خۆمان و خۆتان بکەین ﴿ثُمَّ نَبْتَهِلْ﴾ لە پاشاندا (هەمومان) لەخـوا بپاڕێینـەوە ﴿فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ﴾ ئەمجـا نەفرەتـی خـوا بکەیـن ﴿عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ لـە وانەمان کە لەدرۆزنان ﴿٦١﴾

﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ﴾ بێگومان هەر ئەمەیە چیرۆك و داستانی ڕاست و دروست ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ﴾ وە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نی یە ﴿إِلَّا ٱللَّهُ﴾ تەنها خوا نەبێ ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا ﴿لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ تەنها خۆی بالادەستی کار دروستە ﴿٦٢﴾ ﴿فَإِن تَوَلَّوْا۟﴾ ئەمجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد. ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ﴾ ئەوە بەڕاستی خوا ئاگادارە ﴿بِٱلْمُفْسِدِينَ﴾ بە کردەوەی بەدکاران (گەندەڵکاران) ﴿٦٣﴾ ﴿قُلْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەی خاوەن نامەکان ﴿تَعَالَوْا۟﴾ وەرن ﴿إِلَىٰ كَلِمَةٍ﴾ بۆ لای ووتەیەکی ﴿سَوَآءٍۭ﴾ ڕاست و (یەکسان) ﴿بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾ لە نێوان ئێمە و ئێوەدا ﴿أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ کە جگە لەخوا نەپەرستین ﴿وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ وە هیچ شتێك نەکەین بە هاوبەشی ﴿وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ وە هێندێکمان هێندێکمان بە پەروەردگار دانەنێین ﴿فَإِن تَوَلَّوْا۟﴾ ئەمجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ﴿فَقُولُوا۟﴾ ئێوەش بڵێن: ﴿ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ ئێوە شاهید بن کە ئێمە فەرمانبەردار و گوێڕایەڵ وملکەچی خوداین ﴿٦٤﴾ ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەی خاوەن نامەکان ﴿لِمَ تُحَآجُّونَ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ﴾ بۆچی دەمەقاڵێ دەکەن دەربارەی ئیبراهیم ﴿وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوْرَىٰةُ وَٱلْإِنجِيلُ﴾ لە کاتێکدا کە تەورات و ئینجیل نەنێرراونەتە خوارەوە ﴿إِلَّا مِنۢ بَعْدِهِۦٓ﴾ لە دوای ئیبراهیم نەبێت ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ دەی بۆ تێ ناگەن؟ ﴿٦٥﴾ ﴿هَٰٓأَنتُمْ﴾ ئاگادار بن ئێوە ﴿هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجْتُمْ﴾ ئەوانەن کەدەمە قاڵێتان کرد ﴿فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ﴾ لەوەی کە شتێکتان لێدەزانی ﴿فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ﴾ ئەی بۆ دەمە قاڵێ دەکەن لە شتێکدا کە هیچی لێ نازانن ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ﴾ وە خوا دەیزانێ ﴿وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ وە ئێوە نازانن ﴿٦٦﴾ ﴿مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا﴾ ئیبراهیم نەجوولەکە بووەو ﴿وَلَا نَصْرَانِيًّا﴾ نەگاوور ﴿وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا﴾ بەڵکو پاك و خواپەرست و گوێڕایەڵ وملکەچ بوو ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ وە لە هاوبەش پەیداکەران نەبوو ﴿٦٧﴾ ﴿إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ﴾ بێگومان نزیکترین کەس لە ئیبراهیم ﴿لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ﴾ ئەوانەن کە وەختی خۆی پەیڕەویان کرد ﴿وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ﴾ وە ئەم پێغەمبەرەو ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ وە خوا دۆستی بڕوادارانە ﴿٦٨﴾ ﴿وَدَّت﴾ حەزیان دەکرد ﴿طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ دەستەیەك لە خاوەن نامەکان ﴿لَوْ يُضِلُّونَكُمْ﴾ کە گومڕاتان بکەن ﴿وَمَا يُضِلُّونَ﴾ لە کاتێکدا کەس گومڕا ناکەن ﴿إِلَّآ أَنفُسَهُمْ﴾ خۆیان نەبێت ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ بەڵام هەستی پێ ناکەن (تێ ناگەن) ﴿٦٩﴾ ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەی خاوەن نامەکان ﴿لِمَ تَكْفُرُونَ﴾ بۆ بێ بڕوا دەبن ﴿بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بە ئایەتەکانی خوا ﴿وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴾ لە کاتێکدا کە شایەتی دەدەن (لە سەر ڕاستی ئەوان) ﴿٧٠﴾

﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەی خاوەن نامەکان ﴿لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ﴾ بۆ پۆشاکی درۆ ئەکەن بەبەر ڕاستی
دا ﴿وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ﴾ وەڕاستەکە دەشارنەوە ﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا خۆشتان ئەمە دەزانن ﴿٧١﴾
﴿وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ وە دەستەیەك لەخاوەن نامەکان ووتیان (بە هەندێکیان) ﴿ءَامِنُواْ
بِٱلَّذِيٓ﴾ بڕوابێنن بەو قورئانە ﴿أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە
﴿وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ﴾ سەرلە بەیانیان (بەفێڵ) ﴿وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ﴾ وە بێ بڕوا ببنەوە دەمەو ئێوارە ﴿لَعَلَّهُمۡ
يَرۡجِعُونَ﴾ بەڵکو ئەوانیش پەشیمان ببنەوە ﴿٧٢﴾ ﴿وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ﴾ باوەڕتان نەبێت ﴿إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ﴾
مەگەر بە کەسێك کە دوای دینی ئێوە کەوتبێت ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: بەڕاستی
ڕێنموونی ﴿هُدَى ٱللَّهِ﴾ هەر ڕێنموونی خوایە ﴿أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ﴾ (ئەی خاوەن نامەکان ئێوە
پێتان گرانە) کە بدرێ بە یەکێکی تر وێنەی ئەو دینەی کە بە ئێوە دراوە ﴿أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ﴾ یا دەمەقاڵێتان
لەگەڵ بکەن(بۆ ڕتان بدەن) ﴿عِندَ رَبِّكُمۡۗ﴾ لای پەروەردگارتان ﴿قُلۡ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ:
﴿إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ئەو بەهرەیە(واتە پێغەمبەرایەتی) بەدەستی خوایە ﴿يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ﴾
دەیدات بەهەر کەسێك کە بیەوێت ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ﴾ وە خوا خاوەنی بەخششی زۆر و زانایە. ﴿٧٣﴾
﴿يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ﴾ ئەو(خوایە) ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی تایبەت دەکات ﴿مَن يَشَآءُۗ﴾ بۆ هەر کەسێك
بیەوێت (شیاوی بێت) ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ وە خوا خاوەنی بەخشش و بەهرەی گەورەیە
﴿٧٤﴾ ﴿وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ وە لە ناو خاوەن نامەکانی هی وا هەیە ﴿مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ﴾ ئەگەر خەزنەیەك
بە سپاردە لای دابنێی ﴿يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ﴾ دەتداتەوە ﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ﴾ وە هی واشیان تیایە ﴿إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ﴾
ئەگەر دینارێکی لا دابنێیت ﴿لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ﴾ ناتداتەوە ﴿إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ﴾ مەگەر بەسەریەوە
بوەستیت ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ﴾ ئەم ناپاکی یە بەهۆی ئەوەوە بوو ﴿قَالُواْ﴾ کە دەیان ووت: ﴿لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي
ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ﴾ گوناهمان ناگات لە خواردنی ماڵی ئەم نەخوێندەوارانە (واتە عەرەبەکان) ﴿وَيَقُولُونَ
عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾ وە درۆ بەدەم خواوە دەکەن ﴿وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ وە خۆیان دەزانن (کە درۆ دەکەن) ﴿٧٥﴾
﴿بَلَىٰۚ﴾ نەخێر وانی یە (وەك دەڵێن) ﴿مَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ﴾ هەر کەسێك پەیمانی خۆی بەجێ بهێنێت
﴿وَٱتَّقَىٰ﴾وە پاریزکاری بکات ولەخودا بترسێت ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ ئەوە بەڕاستی خوا
پارێزکارانی خۆش دەوێت ﴿٧٦﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی دەیفرۆشن ﴿بِعَهۡدِ ٱللَّهِ﴾
پەیمانی خوا ﴿وَأَيۡمَٰنِهِمۡ﴾ و سوێندەکانی خۆیان ﴿ثَمَنٗا قَلِيلًا﴾ بە نرخێکی کەم ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ئەوانە
﴿لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ﴾ بێ بەشن (لە بەهرەی خوا) ﴿فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ لە ڕۆژی دوایی دا ﴿وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ﴾ وە خوا
قسەیان لەگەڵ ناکات ﴿وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ﴾وە تەماشاشیان ناکات﴿يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا
﴿وَلَا يُزَكِّيهِمۡ﴾ و لە گوناهیان خۆش نابێت وپاکیان ناکاتەوە ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ وە بۆ ئەوان هەیە
سزای بە ئێش و ئازار ﴿٧٧﴾

﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا﴾ بە ڕاستی لە خاوەن نامەکان دەستەیەك هەیە ﴿يَلْوُنَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ﴾ (ناو بەناو نامەکەیان تێکدەدەن و) زمانیان با ئەدەن و ئەپێچنەوە بە خوێندنەوەی کتێبەکەیان (تەورات) ﴿لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ﴾ تا تۆ وا بزانیت لە نامەی خوایە ﴿وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ﴾ (لە کاتێکدا) کە ئەوە لە نامەی خوا نی یە ﴿وَيَقُولُونَ﴾ وە دەڵێن ﴿هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ﴾ ئەوە لە خواوەیە ﴿وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوە لە خواوە نی یە ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ﴾ وە درۆ بەدەم خواوە دەکەن
و ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ خۆشیان دەزانن (کە درۆیە) ﴿٧٨﴾ ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ﴾ نابێ بۆ هیچ ئادەمی یەك ﴿أَن يُؤْتِيَهُ اللَّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ﴾ کە خوا نامەو شەریعەت و پێغەمبەرێتی دابێتێ ﴿ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ﴾ پاشان بە خەڵکی بڵێت ﴿كُونُوا عِبَادًا لِّي﴾ ببن بە بەندەی من ﴿مِن دُونِ اللَّهِ﴾ لە جیاتی خوا ﴿وَلَٰكِن كُونُوا رَبَّانِيِّينَ﴾ بەڵکو (پێیان دەڵێت) خوا پەرست بن ﴿بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ﴾ چونکە
ئێوە خەڵك فێری نامەکەی خودا دەکەن ﴿وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ﴾ وە ئێوە خۆشتان دەیخوێننەوە ﴿٧٩﴾
﴿وَلَا يَأْمُرَكُمْ﴾ وە خوا فەرمانتان پێ نادات ﴿أَن تَتَّخِذُوا الْمَلَائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ﴾ کە فریشتە و پێغەمبەران بکەن ﴿أَرْبَابًا﴾ بە پەرستراوی خۆتان ﴿أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ﴾ چۆن (خودا) فەرمانتان پێ دەدات بێ بڕوا بن
(کافر بن) ﴿بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ دوای ئەوەی کە ئێوە بڕوا دار بوون؟! ﴿٨٠﴾ ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ﴾
(بهێنەوە یادیان) کاتێك کە خوا پەیمانی وەرگرت لە پێغەمبەران ﴿لَمَا آتَيْتُكُم﴾ کە هەرچیم دانێ ﴿مِّن كِتَابٍ﴾ لە نامەو ﴿وَحِكْمَةٍ﴾ حیکمەت و (شەریعەت) ﴿ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ﴾ لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هات ﴿مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ﴾ بە بڕوا هێنەر بەو نامەی کەلە لاتانە ﴿لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ﴾ دەبێ بڕوای پێ بهێنن ﴿وَلَتَنصُرُنَّهُ﴾ وە یارمەتی بدەن ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی: ﴿أَأَقْرَرْتُمْ﴾ ئایا دانتان نا بەم پەیمانەدا؟ ﴿وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِي﴾ وە لەسەر ئەوە پەیمانی منتان وەرگرت ﴿قَالُوا﴾ پێغەمبەران وتیان: ﴿أَقْرَرْنَا﴾ بەڵێ دانمان پێداناو پەیمانمان بەست ﴿قَالَ فَاشْهَدُوا﴾ خوا فەرمووی کەواتە ئێوە بەشاهید بن
﴿وَأَنَا مَعَكُم﴾ وە منیش لەگەڵ ئێوە ﴿مِّنَ الشَّاهِدِينَ﴾ یەکێکم لە شاهیدان ﴿٨١﴾ ﴿فَمَن تَوَلَّىٰ﴾ جا ئەوەی پشتی هەڵکرد(لەم پەیمانە) ﴿بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾ دوای ئەم دان پێدانانە ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ کەواتە هەر
ئەوانن دەستەی دەرچوان لە فەرمانی خودا ﴿٨٢﴾ ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ﴾ ئایا(بێ بڕوایان) داوای غەیری دینی خوا دەکەن؟! ﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لە کاتێکدا کە هەرچی لەئاسمان و زەوی دایە گوێڕایەڵ وملکەچی خودان ﴿طَوْعًا﴾ بیانەوێ (بە ویستی خۆیان) ﴿وَكَرْهًا﴾ یا نەیانەوێ(بە ناچاری)
﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ وە هەموو هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە ﴿٨٣﴾

﴿قُلۡ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ ئێمە بڕوامان هێناوە بە خوای گەورە ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا﴾ وە بەوەی نێرراوەتە خوارەوە بۆمان ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ وە بەوەی کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ ئیبراهیم ﴿وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ﴾ وئیسماعیل وئیسحاق یەعقوب وکوڕانی یەعقوب ﴿وَمَآ أُوتِيَ﴾ وە بـەوەی کـە دراوە ﴿مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ﴾ بە مووساو عیسا ﴿وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ وەپێغەمبەرەکانی تر لە پەروەردگاریانەوە ﴿لَا نُفَرِّقُ﴾ جیاوازی ناکەین ﴿بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ﴾ لەنێوان هیچ کامێك لەم پێغەمبەرانە ﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ وە ئێمە بۆ خوای گەورە گەردن کەچین ﴿٨٤﴾ ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا﴾ وە هـەر کەسێك دوای هـەر ئاینێـك بکەوێـت جگە لە ئاینی ئیسـلام ﴿فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ﴾ ئەوە لێـی وەر ناگیرێ ﴿وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ وە ئەو لە ڕۆژی دوایی دا ﴿مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ لە زەرەرمەندانە ﴿٨٥﴾ ﴿كَيۡفَ يَهۡدِي ٱللَّهُ قَوۡمٗا﴾ چـۆن خـوا ڕێنموونیـی گەلێـك دەکات ﴿كَفَرُواْ﴾ بـێ بڕوابووبـن ﴿بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ﴾ دوای بـڕوا هێنانیـان ﴿وَشَهِدُوٓاْ﴾ وە شـایەتییان دابـێ ﴿أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقّٞ﴾ کـە ئـەو پێغەمبـەرە ڕاسـتە و (لەلایـەن خوداوە هاتووە) ﴿وَجَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ﴾ وە نیشـانەی زۆریـان بۆ هاتبێ ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە خـوا ڕێنموونیـی گەلـی ستەمکاران نـاکات ﴿٨٦﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمۡ﴾ ئەوانە سـزایان ئەوەیـە ﴿أَنَّ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةَ ٱللَّهِ﴾ کـە لە سـەریانە نەفرینی خـودا ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ و نەفرینی فریشـتەکان ﴿وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ﴾ و نەفرینـی هەمـوو خەڵکـی ﴿٨٧﴾ ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ لەو(نەفرینـە) دا دەمێننـەوە بـە ئێجگـاری وهەمیشـەیی ﴿لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ﴾ سـزایان لێ سـووك ناکرێـت ﴿وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾ وە مۆڵـەت نادرێـن. ﴿٨٨﴾ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ﴾ مەگـەر ئەوانـەی ﴿تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ﴾ تۆبەیان کردبـێ دوای ئەوە ﴿وَأَصۡلَحُواْ﴾ وە کردەوەی چاکیان کردبێت ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خوا لێ خۆشـبووی میهرەبانە ﴿٨٩﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بە ڕاستی ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون ﴿بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ﴾ دوای بڕوا هێنانیان ﴿ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا﴾ پاشان زیاتر بێ باوەڕ بوون ﴿لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ﴾ هەرگیز تەوبەیان لێ گیرا ناکرێت ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ﴾ ئا ئەوانە ئەوانـەن کە گومڕابوون ﴿٩٠﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بە ڕاستی ئەوانەی بێ بڕوابـوون ﴿وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ﴾ وە بـە بێ بڕوایی مـردن ﴿فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم﴾ ئەوە هەرگیز (فدیە) لـە هیـچ کامێکیان وەر ناگیرێت ﴿مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا﴾ با پڕ بە هەموو زەویش زێڕ بێت ﴿وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓۗ﴾ بیبەخشـێت لە بریتی دا (بۆ سووك کردنی سزا لەسەری) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ وە ئەوانە سزای بە ئازاریان بۆ هەیە ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ وە هیچ یاریدەدەر و سەرخەرێکیان نی یە ﴿٩١﴾

﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ﴾ ئێـوە هەرگیـز بە خێرو چاکە ناگەن (وە دەسـگیرتان نابێت) ﴿حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾
تا نەیبەخشـن هەندێ لەو دارایی یەی کە خۆشـتان دەوێت ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ﴾ وە هەرچی ببەخشـن
﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خودا ئاگای لێ یە (بە پێی دڵ و دەروونتان پاداشـتان دەداتەوە) ﴿٩٢﴾
﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا﴾ هەمـوو جـۆرە خواردەمەنیەکان حەڵاڵ بـوون ﴿لِّبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ بۆ نەوەی
یەعقـوب ﴿إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ﴾ بێجگە لەوەی کە یەعقوب حەرامی کرد ﴿عَلَىٰ نَفْسِهِۦ﴾ لەسـەر خۆی
﴿مِن قَبْلِ﴾ لـە پێش ﴿أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ﴾ ناردنە خوارەوەی تەورات ﴿قُلْ فَأْتُواْ بِٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) بڵێ: دەی تەورات بهێنن ﴿فَٱتْلُوهَآ﴾ و بیخوێننەوە ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن
﴿٩٣﴾ ﴿فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ﴾ ئەمجا هەر کەس درۆ بە دەم خواوە هەڵبەستێ ﴿مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ لە پاش
ئـەوە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ کەواتە ئەوانـە خۆیانن سـتەمکارن ﴿٩٤﴾ ﴿قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) بڵێ: خوا ڕاستی فەرموو ﴿فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ﴾ کەوا بوو پەیڕەوی ئایینی ئیبراهیم بکەن ﴿حَنِيفًا﴾
کـە پاکە (بە ویستی خۆی لە بیـرو باوەڕو کرداری هەڵـە لای داوە بۆ بیرو باوەڕو کرداری ڕاسـت)
﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ وە هیچ کاتێك لە هاوبەش بڕیاردەران نەبووە ﴿٩٥﴾ ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ﴾ بە ڕاستی یەکەم
ماڵێك ﴿وُضِعَ لِلنَّاسِ﴾ دانراوە بۆ (خواپەرستی) خەڵکی ﴿لَلَّذِي بِبَكَّةَ﴾ ئەو ماڵەیە کە لەبەککە(مەککە)
دایە ﴿مُبَارَكًا﴾ پیرۆز کراوە ﴿وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ وە ڕێنموونی یە بۆ جیهانیان ﴿٩٦﴾ ﴿فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ﴾ تیایدا
هەیـە چەند بەڵگەو نیشـانەی ڕوون ﴿مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ﴾ (کە یەکێکیان) شـوێن وەسـتانەکەی ئیبراهیمە
﴿وَمَن دَخَلَهُۥ﴾ وە هەر کەس چووبێتە ئەو شـوێنە ﴿كَانَ ءَامِنًا﴾ بێ ترس بووە (لە زیان و ئازاردان)
﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ خودابڕیاریداوەلەسەرخەڵکی و فەرزی کردوەلەسەریان ﴿حِجُّ ٱلْبَيْتِ﴾ حەجی ماڵەکەی
(خۆی) ﴿مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ لەسەرهەر کەسێك کەتوانای گەیشتن و(ڕۆیشتنی) هەبێت بۆی ﴿وَمَن
كَفَرَ﴾ وە هـەر کـەس بـاوەڕی نەبێ (یان توانـای هەبێت و نەچێـت) ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئەوە بە
ڕاستی خوا بێ نیازە لە هەموو جیهانیان ﴿٩٧﴾ ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ بڵێ: ئەی نامە داران (خاوەن کتێبەکان)
﴿لِمَ تَكْفُرُونَ﴾ لە بەر چی بێ بڕوان ﴿بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بە بەڵگەکانی خوا ﴿وَٱللَّهُ شَهِيدٌ﴾ کاتێکدا خوا بیناو
ئاگادارە. ﴿عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ﴾ بەئەوەی کە دەیکەن ﴿٩٨﴾ ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ بڵێ: ئەی خاوەن کتێبەکان
﴿لِمَ تَصُدُّونَ﴾ لەبـەرچی بەرگـری (ڕێگـری) دەکـەن ﴿عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لـە ڕێ ی خـوا ﴿مَنْ ءَامَنَ﴾
کەسێك کە بڕوای هێنابێ (مەبەست پێی پێغەمەرو باوەڕدارانە) ﴿تَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ دەتانەوێ بە ناڕاست
بیخەنـە بەرچـاوی خەڵـك ﴿وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ﴾ لە کاتێکـدا ئێوە زانـاو ئاگـادارن (بـەوەی ڕێ ی خوایە)
﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ﴾ وە خـوا بـێ ئاگا نی یە ﴿عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ لەوەی کـە ئێوە دەیکەن ﴿٩٩﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾
ئـەی ئـەو کەسـانەی کـە بڕواتـان هێنـاوە ﴿إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا﴾ ئەگـەر ئێـوە گوێڕایەڵی دەسـتەیەك بن
﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ﴾ لەوانەی کە نامەیان پێدراوە ﴿يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ﴾ دەتانکەنەوە بە کافر
دوای بڕوا هێنانەکەتان ﴿١٠٠﴾

﴿وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ﴾ چۆن بێ بڕوادەبن؟ ﴿وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ لە کاتێکدا دەخوێنرێتەوە بە سەرتاندا
﴿ءَايَٰتُ ٱللَّهِ﴾ بەڵگەکانی خوا ( ئایەتەکانی قورئان) ﴿وَفِيكُمۡ رَسُولُهُۥۗ﴾ وە پێغەمبەرەکەی لە ناوتاندایە
﴿وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ﴾ وە هەرکەس دەست بگرێ بە( ئایینی) خواوە ﴿فَقَدۡ هُدِيَ﴾ ئەوە بەڕاستی
ڕێنموونیی کراوە ﴿إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ بۆ ڕێبازێکی ڕاست و دروست ﴿١٠١﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی
ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ بترسن لە خوا ﴿حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾ ترسانێك کە شیاوێتی ﴿وَلَا تَمُوتُنَّ﴾
وە مەمرن ﴿إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ هەر بە موسوڵمانی نەبێ ﴿١٠٢﴾ ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا﴾ هەمووتان دەست
بگرن بەهۆی پەیوەستیتان بەخواوە (کە قورئانە) ﴿وَلَا تَفَرَّقُواْۚ﴾ چەند بەرەکە(و لێك جیا) مەبن
﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ بیر لە بەهرەو چاکەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە ﴿إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ﴾ لە
کاتێکدا کە ئێوە دوژمنی یەکتر بوون ﴿فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ﴾ بەڵام خوا هۆگری خستە نێوان دڵەکانتان
﴿فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا﴾ ئیتر بوون بە برای یەکتر بەهۆی ئەو چاکەی خواوە ﴿وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ
ٱلنَّارِ﴾ وە ئێوە لەسەر لێواری چاڵێ بوون لەئاگر ﴿فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ﴾ بەڵام خوا ڕزگاری کردن لێ ی
﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئا بەو جۆرە ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ﴾ خوا بەڵگە ونیشانەکانی خۆی ڕوون دەکاتەوە
بۆتان ﴿لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾ تا بەردەوام بن لەسەر ڕێنموونیی (یان لەسەر شارەزایی) ﴿١٠٣﴾ ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ
أُمَّةٞ﴾ ئەبێ لە ناو ئێوەدا کۆمەڵێك ببێت ﴿يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ﴾ بانگەواز بکەن بۆ چاکە ﴿وَيَأۡمُرُونَ
بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ فەرمان بدەن بە هەموو چاکەیەك ﴿وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ﴾ وە بەرگری بکەن لە هەموو
خراپەیەك ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ ئەوانە خۆیانن سەر کەوتوو وسەرفرازن ﴿١٠٤﴾ ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ﴾
بە وێنەی ئەوانە مەبن (وەك ئەهلی کتاب) ﴿تَفَرَّقُواْ﴾ کە بەش بەش و ﴿وَٱخۡتَلَفُواْ﴾ جیاواز بوون
﴿مِنۢ بَعۡدِ﴾ لە پاش ئەوەی ﴿مَا جَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ﴾ ئەو بەڵگانەی بۆیان هات ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ
عَظِيمٞ﴾ وە ئەوانە سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە ﴿١٠٥﴾ ﴿يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ﴾ ڕۆژێك دێت کە چەند ڕوویەك
سپی دەبن ﴿وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞۚ﴾ وە چەند ڕوویەك ڕەش دەبن ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ﴾ جا ئەوانەی ﴿ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ﴾
کە ڕوویان ڕەش بووە ﴿أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ﴾ (پێ یان دەووترێت) بۆچی بێ بڕوابوون لە پاش
بڕوا هێنانتان ﴿فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ﴾ کەواتە بچێژن سزا ﴿بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ﴾ بەهۆی بێ بڕوایی تانەوە ﴿١٠٦﴾
﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ﴾ وە ئەوانە کە ڕوویان سپی دەبێت ﴿فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِۖ﴾ ئەوە لەناو بەزەیی
خوادان (لەبەهەشتدان) ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە تێیدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿١٠٧﴾ ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ﴾
ئەمانە ئایەتەکانی خودان ﴿نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ﴾ دەیان خوێنینەوە بەسەرت دا ﴿بِٱلۡحَقِّۗ﴾ کە ڕاستن ﴿وَمَا ٱللَّهُ
يُرِيدُ﴾ خواش نایەوێت ﴿ظُلۡمٗا لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ هیچ ستەمێك بۆ جیهانیان ﴿١٠٨﴾

﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ تەنها بۆ خوایە هەرچی لە ئاسمانەکاندایە (وموڵکی خودایە) ﴿وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾
وە هەرچی لەزەوی دایە ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ﴾ وە هەر بۆلای خودا ﴿تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ دەگەڕێتەوە هەموو کارەکان (١٠٩)
﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ﴾ ئێوە(موسوڵمانان) باشترین گەلێك بوون ﴿أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ بۆ خەڵکی هێنرابێتە
دی ﴿تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ فەرمان دەدەن بەچاکە ﴿وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ وە جڵەوگیری دەکەن
لە خراپە ﴿وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ وە بڕوا دەهێنن بەخوا ﴿وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەگەر نامە دارەکان
(خاوەن کتێبەکان لە جولەکەو گاورەکان) بڕوایان بهێنایە ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم﴾ ئەوە باشتربوو بۆیان
﴿مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ هەندێ لەوان بڕوادارن و(باوەڕیان هێناوە بە ئاینی ئیسلام) ﴿وَأَكْثَرُهُمُ
ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان لە فەرمانی خوا دەرچوون (١١٠) ﴿لَن يَضُرُّوكُمْ﴾ هەرگیز ئەوان زیانتان
پێ ناگەیەنن ﴿إِلَّآ أَذًى﴾ مەگەر زیانێکی کەم ﴿وَإِن يُقَٰتِلُوكُمْ﴾ وە ئەگەر بجەنگێن لەگەڵتاندا
﴿يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ﴾ پشتان تێ دەکەن ﴿ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ﴾ دواتریش سەرکەوتوو نابن (١١١) ﴿ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ
ٱلذِّلَّةُ﴾ دراوە بەسەریاندا سەر شۆڕی و ڕیسوایی ﴿أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟﴾ لەهەر شوێنێك بن ﴿إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ
ٱللَّهِ﴾ مەگەر بە هۆی بەڵێن لەلایەن خوداوە نەبێت ﴿وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ وە بەڵێنێك لەلای خەڵکەوە
﴿وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ شایستەی خەشمێکی گەورەبوون لە لایەن خواوە ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُ﴾
وە دراوە بەسەریاندا هەژاری(دەروون و چاو برسێتی) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟﴾ ئەوە لەبەر ئەوە بوو ئەوان
﴿يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بێ بڕوابوون بە بەڵگەکانی خوا ﴿وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ﴾ وە پێغەمبەرانیان
دەکوشت ﴿بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ بەناڕەوا ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟﴾ ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە ئەوانە سەرپێچی
﴿وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ﴾ و دەست درێژیان دەکرد (١١٢) ﴿لَيْسُوا۟ سَوَآءً﴾ هەموو(نامە دارەکان) چوون یەك نین
﴿مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ لەناو خاوەن نامەکاندا ﴿أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ﴾ دەستەیەك ڕاست و ڕێك هەن ﴿يَتْلُونَ ءَايَٰتِ
ٱللَّهِ﴾ ئایەتەکانی خوا دەخوێنن(وباوەڕیان هێناوە بە ئاینی ئیسلام) ﴿ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ﴾ لە (کاتەکانی)
شەودا ﴿وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾ وە لە(کاتەکانی) کڕنوش بردنیان دا (١١٣) ﴿يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ بڕوایان هەیە
بەخوا ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ وە بە ڕۆژی دوایی ﴿وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ و فەرمان دەدەن بەهەرچی چاکەیە
﴿وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ وە بەرگری دەکەن لە هەرچی خراپەیە ﴿وَيُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ وە پێشبڕکێ
دەکەن لە هەموو چاکەکاندا ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وە ئەوانە لە کۆمەڵی چاکانن (١١٤) ﴿وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ
خَيْرٍ﴾ هەر خێرو چاکەیەك بکەن ﴿فَلَن يُكْفَرُوهُ﴾ ئەوە هەرگیز بێ بەش ناکرێن لە پاداشتەکەی
﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ﴾ خواش بەئاگایە لە پارێزکاران ولەوانەی لێی دەترسن (١١٥)

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەبێ بڕوا بوون ﴿لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ﴾ سوود بەوان ناگەیەنێ ﴿أَمۡوَٰلُهُمۡ﴾ نەماڵەکانیان ﴿وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم﴾ وە نە منداڵەکانیان ﴿مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ﴾ هیچێك لەلای خواوە ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئا ئەوانە ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ هاوەڵ وهاوڕێی ئاگر دەبن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوان تێیدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿١١٦﴾ ﴿مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ﴾ وێنەی ئەو ماڵ و دارایییەی کەبەختی دەکەن ﴿فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ لەم ژیانی دونیایەدا ﴿كَمَثَلِ رِيحٖ﴾ بە وێنەی بایەکە ﴿فِيهَا صِرٌّ﴾ سەرما و سۆڵەی تێدابێت ﴿أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ﴾ بدات لەکشتوکاڵی تاقمێك ﴿ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ کەستەمیان لەخۆیان کردبێت ﴿فَأَهۡلَكَتۡهُۚ﴾ جا ئەو (با) وسەرمایە کشتوکاڵەکەی لەناو بەرێت ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ﴾ وە خوا ستەمی لێ نەکردوون ﴿وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾ بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان دەکرد ﴿١١٧﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَتَّخِذُواْ﴾ مەگرن بۆ خۆتان ﴿بِطَانَةٗ﴾ دۆستی گیانی بەگیانی ﴿مِّن دُونِكُمۡ﴾ جگە لەخۆتان(واتە جگە لەباوەڕداران) ﴿لَا يَأۡلُونَكُمۡ﴾ درێغیتان لێ ناکەن ﴿خَبَالٗا﴾ لەهیچ شەڕ و خراپەیەك ﴿وَدُّواْ﴾ ئاواتە خوازی ﴿مَا عَنِتُّمۡ﴾ ناخۆشیتانن ﴿قَدۡ بَدَتِ﴾ بێگومان دەرئەکەوێت ﴿ٱلۡبَغۡضَآءُ﴾ خەشم و قین ﴿مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ لە(قسەکانی) دەمیانەوە ﴿وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ﴾ وەئەوەی لەدڵیاندا شاردویانەتەوە گەورەترە ﴿قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ﴾ بەڕاستی بەڵگە ونیشانەکانمان بۆ ڕوون کردونەتەوە ﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ ئەگەر ئێوە ژیربن ﴿١١٨﴾ ﴿هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ﴾ بێداربن ئائەوە ئێوەن کەئەوانتان خۆش دەوێت ﴿وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ﴾ وەئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ ﴿وَتُؤۡمِنُونَ﴾ وەباوەڕتان هەیە ﴿بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ﴾ بەهەموو نامە ئاسمانی یەکان ﴿وَإِذَا لَقُوكُمۡ﴾ کاتێك ئەوان پێتان بگەن ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ دەڵێن بڕوامان هێناوە ﴿وَإِذَا خَلَوۡاْ﴾ وە کاتێك تەنها بونەوە ﴿عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ﴾ سەرە پەنجەکانی خۆیان ئەگەزن لێتان ﴿مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ﴾ لەڕقدا ﴿قُلۡ مُوتُواْ﴾ بڵێ بمرن ﴿بِغَيۡظِكُمۡۗ﴾ بەداخ و ڕقی خۆتانەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ﴾ بەڕاستی خوا زانایە ﴿بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەوەی لەناو دڵەکاندایە ﴿١١٩﴾ ﴿إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ﴾ ئەگەر چاکە و خۆشیەکتان پێ بگات ﴿تَسُؤۡهُمۡ﴾ غەمبار دەبن ﴿وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ﴾ بەڵام ئەگەر ناخۆشیەکتان پێ بگات ﴿يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ﴾ دڵخۆش دەبن پێی ﴿وَإِن تَصۡبِرُواْ﴾ ئەگەر ئێوە بەئارام بن (لەسەر گوێڕایەڵی خوا) ﴿وَتَتَّقُواْ﴾ و لەخوا بترسن ﴿لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ﴾ پیلانی ئەوان هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ﴾ بەڕاستی خوا تەواو ئاگادارە بە هەرچی ئەوان دەیکەن ﴿١٢٠﴾ ﴿وَإِذۡ﴾ وە (بێنەوە بیریان) کاتێ ﴿غَدَوۡتَ مِنۡ أَهۡلِكَ﴾ کە بەیانی زوو دەرچوویت لەلای ماڵ و خێزانت ﴿تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بڕواداراەکانت نیشتەجێ ئەکرد ﴿مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِۗ﴾ لە چەند شوێنێکدا بۆ جەنگ کردن ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ وە خوا بیسەری زانایە ﴿١٢١﴾

﴿إِذۡ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمۡ﴾ لـەو كاتـەدا كـە دوو كۆمـەڵ لـە ئێـوە خەریك بوون ﴿أَن تَفۡشَلَا﴾ سست بـن وتێـك بشـكێن و (بگەڕێنەوە) ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَاۗ﴾ بەڵام خوا دۆست و یارمەتی دەریان بوو ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ وە بڕوا داران با پشت تەنها بە خوا ببەستن ﴿١٢٢﴾ ﴿وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ﴾ سـوێند بە خوا بێگومـان خوا ئێوەی سەرخست ﴿بِبَدۡرٍ﴾لە (جەنگی) بەدردا ﴿وَأَنتُمۡ أَذِلَّةٞۖ﴾ لە كاتێكـدا ئێوە كەم و لاواز بوون ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ دەی لە خوا بترسن ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ بەڵكو سوپاس گوزاری بن ﴿١٢٣﴾ ﴿إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ (بیریان بخەرەوە) ئەو كاتەی دەتووت بە بڕواداره كان ﴿أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ﴾ ئایا بەستان نـی یە ﴿أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم﴾ پەروەردگارتـان كۆمەكتان بكات ﴿بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ﴾ بە سێ هەزار ﴿مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾ لە فریشتە دابەزێنراوەكان ﴿١٢٤﴾ ﴿بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ﴾ بەڵێ، ئەگەر ئارام بگرن ﴿وَتَتَّقُواْ﴾ وە لە خوا بترسن ﴿وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا﴾ پەلامارتان بدەن لـەم كاتانـەدا ﴿يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم﴾ پەروەردگارتان كۆمەكتـان بكات ﴿بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ﴾ بە پێنج هەزار ﴿مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ لە فریشتە نیشـانەدارەكان ﴿١٢٥﴾ ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ﴾ وە خـوا تەنهـا ئـەو (كۆمەكـی) یـەی كـرد ﴿إِلَّا بُشۡرَىٰ لَكُمۡ﴾ بە مژدە بۆتان ﴿وَلِتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦۗ﴾ وە بـۆ ئـەوەی دڵەكانتانـی پـێ ئـارام ببـێ ﴿وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ (ئـەوەش بزانـن) سـەركەوتنیش تەنهـا لەلایـەن خوای ﴿ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ بـاڵا دەستی داناوەیـە ﴿١٢٦﴾ ﴿لِيَقۡطَعَ طَرَفٗا﴾ (وە ناردنـی فریشـتەكان) بۆ ئەوە بـوو دابڕێت (لە نـاوی بات) بەشـێك ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ لەوانەی كە بـێ بـڕوان ﴿أَوۡ يَكۡبِتَهُمۡ﴾ یـان خەفـەت باریـان بكات(بـە تێشـكانیان) ﴿فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ﴾ ئەمجا بگەڕێنەوە بە نائومێدی ﴿١٢٧﴾ ﴿لَيۡسَ لَكَ﴾ دەربارەی هەڵهاتووەكانی شـەڕی ئوحود بە ڕاستی بەدەست تـۆ نی یـە (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ﴾ هیچ شـتێك لـەو كارەدا ﴿أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ﴾ چ(خوا) تەوبەیـان لـێ وەرگـرێ ﴿أَوۡ يُعَذِّبَهُمۡ﴾ یان سـزایان بـدات ﴿فَإِنَّهُمۡ ظَٰلِمُونَ﴾ چونكـە بە ڕاسـتی ئەوانە سـتەمكارن ﴿١٢٨﴾ ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ هـەر بۆ خوایـە هەرچی لە ئاسـمانەكاندایە ﴿وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ وە هەرچـی لـە زەوی دایـە ﴿يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ﴾ خـۆش ئەبێ لـە هەر كەس خـۆی بیەوێ وە سـزای هەر كەسـیش ئەدات خۆی بیەوێ ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ وە خوا لـێ بوردەی میهرەبانە ﴿١٢٩﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی كەسـانێ كە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ﴾ سـوود مەخۆن ﴿أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ﴾ چەنـد بەرامبەر ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ و لە خوا بترسـن ﴿لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ بۆ ئـەوەی ڕزگاربن ﴿١٣٠﴾ ﴿وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ﴾ وە خۆتـان بپارێـزن لـەو ئاگـرەی ﴿ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ﴾ كـە ئامـادە كـراوە بـۆ بـێ بـڕواكان ﴿١٣١﴾ ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ﴾ وە گوێ ڕایەڵـی خودا و پێغەمبەر بن ﴿لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ بێگومان میهرەبانیتان لەگەڵ ئەكرێت ﴿١٣٢﴾

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ﴾ پێشبڕكێ بكەن بۆ لێ بووردنێكی گەورەی (خودا) ﴿مِّن رَّبِّكُمۡ﴾
لەلایەن پەروەرگارتانەوە ﴿وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا﴾ وە بۆ بەهەشتێك كە پانییەكەی (بە ئەندازەی)
﴿ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ﴾ ئاسمانەكان و زەوی یە ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ كە ئامادە كراوە بۆ لە خوا ترسان ﴿١٣٣﴾
﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ﴾ ئەوانەی ماڵ دەبەخشن (لە ڕێ ی خوادا) ﴿فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾ لە كاتی خۆشی
(دەوڵەمەندی) و ناخۆشی دا ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾ و ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوە و ﴿وَٱلۡعَافِينَ
عَنِ ٱلنَّاسِۗ﴾ دەبوورن لە خەڵكی ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ خواش چاكەكارانی خۆش دەوێت ﴿١٣٤﴾
﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً﴾ وە ئەوانەی كە كاتێك كردەوەیەكی ناشیرین دەكەن ﴿أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾
یاستەم لەخۆیان دەكەن ﴿ذَكَرُواْ ٱللَّهَ﴾ كە یادی خوایان كردەوە ﴿فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ﴾ ئەمجا
داوای لێ بووردن دەكەن بۆ گوناهەكانیان ﴿وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ﴾ ئایا كێ دەبوورێت لە گوناهەكان
﴿إِلَّا ٱللَّهُ﴾ بێجگە لە خوا؟ ﴿وَلَمۡ يُصِرُّواْ﴾ وە بەردەوام نابن ﴿عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ﴾ لەسەر ئەوەی كە كردوویانە
﴿وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ لە كاتێكدا بزانن (گوناهە) ﴿١٣٥﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئا ئەوانە ﴿جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ﴾ پاداشتیان
لێ بووردنە ﴿مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ لەلایەن پەروەردگاریانەوە ﴿وَجَنَّٰتٞ﴾ و چەند باخاتێك (بەهەشتێك)
﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ كەڕوبارەكان دەڕۆن بەژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا
بەهەمیشەیی ﴿وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ﴾ چەند چاكە پاداشتی چاكەكاران ﴿١٣٦﴾ ﴿قَدۡ خَلَتۡ﴾ بێگومان رابورد
﴿مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ﴾ لە پێش ئێوەوە چەند ڕێ و یاسایەك (باوێك) ﴿فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەمجا
ئێوە بگەڕێن بەزەویدا ﴿فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ﴾ و سەرنج بدەن ئایا چۆن بوو ﴿عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾
سەرئەنجامی بێ بڕواكان ﴿١٣٧﴾ ﴿هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ﴾ ئەمە ڕوون كردنەوەیە بۆ هەموو خەڵكی
﴿وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ﴾ و ڕێنموونیی و ئامۆژگاری یە ﴿لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ بۆ لە خوا ترسان ﴿١٣٨﴾ ﴿وَلَا تَهِنُواْ﴾
سست و دڵ لاواز مەبن ﴿وَلَا تَحۡزَنُواْ﴾ وە غەمبار مەبن ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ﴾ هەر ئێوە بەرز و بڵند ترن
﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر بڕوادار بن ﴿١٣٩﴾ ﴿إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ﴾ ئەگەر ئێوە (لە ئوحوددا) زام و برینتان
تووش بووە ﴿فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ﴾ ئەوە بێگومان ئەو هۆزە ( بتپەرستەكان لە بەدردا) زام و برینیان توش
بووە ﴿مِّثۡلُهُۥۚ﴾ بە وێنەی زامی ئێوە ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ﴾ ئەو چەرخ و ڕۆژانەی (زاڵبوون و سەركەوتنانە)
﴿نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ﴾ دەیگێڕین لە ناو خەڵكیدا (جارێك بۆ ئێوە و جارێك بۆ ئەوان) ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ﴾
لەبەر ئەوەی (لەدونیادا) خوا دەری بخات ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿وَيَتَّخِذَ
مِنكُمۡ﴾ و لە ناو ئێوەدا هەڵبژێرێت ﴿شُهَدَآءَۗ﴾ چەند كەسێك بە شەهید ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾
وە خوا ستەم كارانی خۆش ناوێت ﴿١٤٠﴾

﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ﴾ وە تـا خوا(لـە تـاوان) پـاك بكاتـەوە ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانـەی كە بـڕوادارن ﴿وَيَمْحَقَ
ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ وەبـێ بـاوەڕان بنەبـڕ بكات ﴿١٤١﴾ ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ﴾ ئایـا ئێوە وا گومانتـان دەبرد ﴿أَن تَدْخُلُواْ
ٱلْجَنَّةَ﴾ كـە دەچنـە بەهەشـت ﴿وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ﴾ لـە كاتێكدا هێشـتا خـوا دەری نەخسـتوە (واتـە تاقی
نەكردونەتەوە) ﴿ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمْ﴾ ئەوانەی تێ دەكۆشـن لە ئێوە ﴿وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ و هێشـتا دەری
نەخسـتوون كەسـانێك لە ئێـوە كە خۆڕاگران ﴿١٤٢﴾ ﴿وَلَقَدْ كُنتُمْ﴾ سـوێند بێ بێگومـان ئێوە ﴿تَمَنَّوْنَ
ٱلْمَوْتَ﴾ ئاواتی (شـەهیدی و) مردنتـان ئەخواسـت ﴿مِن قَبْلِ﴾ لەپێش ئـەوەی ﴿أَن تَلْقَوْهُ﴾ پێ ی بگەن
﴿فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ﴾ خۆ بەڕاسـتی مردنتان بینی ﴿وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ لە كاتێكدا ئێوە زەق سـەیرتان دەكرد ﴿١٤٣﴾
﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ﴾ موحەممەد ﷺ تەنها پێغەمبەرێكە (نەمر نی یە) ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ بێگومان
لەپێـش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردون ﴿أَفَإِيْن مَّاتَ﴾ جا ئایا ئەگەر وەفاتی كرد ﴿أَوْ قُتِلَ﴾ یان كوژرا
﴿ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ﴾ دەگەڕێنـەوە بـۆ دواوەی خۆتان (پاشـگەز دەبنـەوە) ﴿وَمَن يَنقَلِبْ﴾ هەر كەس
هەڵگەڕێتـەوە ﴿عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ بـۆ دواوەی خۆی (بۆ بت پەرسـتی) ﴿فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا﴾ ئـەوە هەرگیز
(ئەو كەسە) هیچ زیانێك ناگەیەنێت بەخوا ﴿وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ﴾ وە بەزوویی خوا پاداشتی ﴿ٱلشَّٰكِرِينَ﴾
سـوپاس گـوزاران دەداتەوە ﴿١٤٤﴾ ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ﴾ هیچ كەسـێك نەبـووە ﴿أَن تَمُوتَ﴾ كە بمرێت
﴿إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ مەگەر بە فەرمانی خوا ﴿كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا﴾ نوسراوێكی كات دیاری كراوە (لەو كاتەدا
كەخوای گەورە دیاری كردوە) ﴿وَمَن يُرِدْ﴾ هەر كەسێك دەیەوێت ﴿ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا﴾ پاداشت و دەستكەوتی
دونیایی ﴿نُؤْتِهِۦ مِنْهَا﴾ لەو(پاداشتی دونیا) هەندێكی پێ دەدەین ﴿وَمَن يُرِدْ﴾ وە هەركەسێك دەیەوێت
﴿ثَوَابَ ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ پاداشـتی پاشـەڕۆژ ﴿نُؤْتِهِۦ مِنْهَا﴾ لەو(پاداشـتی پاشـەڕۆژە) هەندێكی پێ دەبەخشین
﴿وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ وە بـەزووی پاداشـتی سـوپاس گـوزاران دەدەینـەوە ﴿١٤٥﴾ ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِىٍّ﴾
زۆر لـە پێغەمبـەران ﴿قَٰتَلَ مَعَهُۥ﴾ جەنگ و كوشـتاریان كردووە لەگاڵیاندا (شانبەشـانیان) ﴿رِبِّيُّونَ
كَثِيرٌ﴾ زۆر لـە زانایـان و خواناسـان ﴿فَمَا وَهَنُواْ﴾ جـا سسـت و دەسـتە پاچە نەبـوون ﴿لِمَآ أَصَابَهُمْ﴾
بەهـۆی ئەوەی كـە دووچاریان بووە ﴿فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە ڕێ ی خـوادا ﴿وَمَا ضَعُفُواْ﴾ وە بێ هێز و لاواز
نەبوون ﴿وَمَا ٱسْتَكَانُواْ﴾ وە سـەریان شـۆڕ نەكرد بۆ دوژمـن ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ وە خوا خۆڕاگرانی
خـۆش دەوێـت ﴿١٤٦﴾ ﴿وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ﴾ هـەر ئەمە ووتەی ئـەوان بوو ﴿إِلَّآ أَن قَالُواْ﴾ كەدەیـان ووت ﴿رَبَّنَا
ٱغْفِرْ لَنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان لێمان ببورە ﴿ذُنُوبَنَا﴾ لە گوناهەكانمان ﴿وَإِسْرَافَنَا﴾ وە لە زیادە ڕەویمان
﴿فِىٓ أَمْرِنَا﴾ لـە كاروبارمانـدا ﴿وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا﴾ و پێكانمان جێگیر بكە (لـە جەنگدا) ﴿وَٱنصُرْنَا﴾ و
سـەرمان بخە ﴿عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بەسـەر كۆمەڵی بێ بڕوایانـدا ﴿١٤٧﴾ ﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ﴾ بەهۆی ئەوەوە
خـوا پـێ ی بەخشـین ﴿ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا﴾ پاداشـتی دونیـا ﴿وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ وە پاداشـتی چـاك و
شیرینی ڕۆژی دوایی ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ خوا چاكەكارانی خۆش دەوێت ﴿١٤٨﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە﴿إِن تُطِيعُواْ﴾ ئەگـەر ئێـوە گوێڕایەڵـی بکەن
﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بـۆ ئەوانـەی بـێ بـڕوان ﴿يَرُدُّوكُمۡ﴾ ئەتـان گێڕنـەوە﴿عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ﴾
بـۆ دواوەی خۆتـان (بـۆ بـت پەرستـی) ﴿فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ﴾ ئەمجـا ئەگەڕێنەوە بـە زیانباری ﴿١٤٩﴾
﴿بَلِ ٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ﴾ (ئەوانـە دۆسـتان نیـن) بەڵکـو خـوا یارمەتـی دەر و دۆسـتی ئێوەیە﴿وَهُوَ خَيۡرُ
ٱلنَّٰصِرِينَ﴾ وەخواباشـترینی هەمـوو یارمەتـی دەرانـە ﴿١٥٠﴾ ﴿سَنُلۡقِي فِي قُلُوبِ﴾ بەزوویـی دەخەینـە دڵـی
﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانـەی بـێ بڕوان ﴿ٱلرُّعۡبَ﴾ ترس و بیمـی بەتین ﴿بِمَآ أَشۡرَكُواْ بِٱللَّهِ﴾ بەهۆی
ئەوەی کرد بوویانە هاوبەشـی خوا﴿مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗاۖ﴾ شـتانێ کە خوا هیچ بەڵگەی نەناردۆتە
خوارەوە لەسـەری﴿وَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ﴾ کە جێگا و شـوێنی ئەوان ئاگـرە ﴿وَبِئۡسَ مَثۡوَى﴾ وەچەند
نیشـتە جێیەکی خراپە ﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (جێگەی) سـتەمکاران ﴿١٥١﴾ ﴿وَلَقَدۡ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ سوێند
بێت بێگومان خوا بەجێی هێنا بۆتان﴿وَعۡدَهُۥٓ﴾ بەڵێنەکەی﴿إِذۡ تَحُسُّونَهُم﴾ کاتێك (سەرەتای جەنگی
ئوحـود) هەسـتتان لێ بڕیـن (دەتان کوشـتن) ﴿بِإِذۡنِهِۦۖ﴾ بەفەرمانـی خوا﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ﴾ هەتا
کاتێك (لە ناکاو) سست بوون﴿وَتَنَٰزَعۡتُمۡ﴾ ئاژاوە و دووبەرەکیتان کرد﴿فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾ لەکاری جەنگدا
﴿وَعَصَيۡتُم﴾ وەبـێ فەرمانیتـان کـرد ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم﴾ لەپـاش ئـەوەی کەخـوا نیشـانی دان
﴿مَّا تُحِبُّونَۚ﴾ ئـەوەی (لـە جەنگەکەدا) پێتان خۆش بوو (کەسـەرکەوتن لەسـەرەتایی جەنگەکەدا)
﴿مِنكُم﴾ هەندێك لە ئێوە ﴿مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا﴾ (دەسـکەوتی)دونیایی دەویست ﴿وَمِنكُم مَّن﴾ وە
هەندێکتان ﴿يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ﴾ پاداشـتی ڕۆژی دوایی دەویسـت﴿ثُمَّ صَرَفَكُمۡ عَنۡهُمۡ﴾ پاشـان (خوا)
ئێوەی گێڕایەوە لە(جەنگی) ئەوان( و تێ شکان) ﴿لِيَبۡتَلِيَكُمۡۖ﴾ تاتاقیتان بکاتەوە (لەخۆڕاگرتندا)
﴿وَلَقَدۡ عَفَا عَنكُمۡۗ﴾ سـوێندبێ بێگومان خوا لێتـان بوورا ﴿وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ﴾ و خوا خاوەنی بەهرەو
چاکەیـە ﴿عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بەسـەر بڕوادارانـەوە ﴿١٥٢﴾ ﴿إِذۡ تُصۡعِدُونَ﴾ کاتێـك دووردەکەوتنەوە
(سـەردەکەوتن بەکێـوی ئوحـوددا) ﴿وَلَا تَلۡوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٖ﴾ وەبەرێـی کـەس نەئەوەسـتان
ولاتـان نەدەکـردەوە بەلایـدا ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ﴾ لەکاتێکـدا پێغەمبـەر بانگی لـێ دەکردن ﴿فِيٓ
أُخۡرَىٰكُمۡ﴾ لـە دواتانـەوە ﴿فَأَثَٰبَكُمۡ غَمَّۢا بِغَمّٖ﴾ جا (خوا) پاداشـتی غەم و خەفەتـی هەر بە غەم
و خەفـەت دانـەوە ﴿لِّكَيۡلَا تَحۡزَنُواْ﴾ بۆ ئەوەی غەمبار نەبن ﴿عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ﴾ لەسـەر ئەوەی لە
دەسـتان چـووە ﴿وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمۡۗ﴾ وە (غەمبـار نەبن بە) ئـەوەی دووچارتان بووە ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ﴾
خواش ئاگادارە ﴿بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ بەوەی کەدەیکەن ﴿١٥٣﴾

﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم﴾ پاشان دایبەزاند بە سەرتاندا(بۆی ناردن) ﴿مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ﴾ لە پاش ئەو غەمە(ی کە
چەشتتان) ﴿أَمَنَةً﴾ ئارامیی ﴿نُّعَاسًا﴾ کە وەنەوزێك بوو ﴿يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ﴾ بەسەر دەستەیەك لە ئێوە
داهات ﴿وَطَآئِفَةٌ﴾ بەلام دەستەوتاقمێکی دیکەتان (کەباوەڕیان هێندەبەهێزنەبوو) ﴿قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾
بەڕاستی هەرخۆیان مەبەست بوو ﴿يَظُنُّونَ﴾ گومانی ﴿بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ﴾ ناڕاست و ناهەقیان بەخوادەبرد
﴿ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ﴾ وەك گومانی نەفامیێتی ﴿يَقُولُونَ﴾ ئەیان ووت ﴿هَل لَّنَا﴾ ئایا بۆمان هەیە (بە دەستمانە)
﴿مِنَ ٱلْأَمْرِ﴾ لەم کارەدا(زاڵ بوون) ﴿مِن شَىْءٍ﴾ هیچ شتێك ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ﴾ بلێ بێگومان کاروبار
﴿كُلَّهُۥ لِلَّهِ﴾ هەمووی بەدەست خوایە ﴿يُخْفُونَ﴾ دەیشارنەوە ﴿فِىٓ أَنفُسِهِم﴾ لە دەروونیاندا ﴿مَّا لَا يُبْدُونَ
لَكَ﴾ ئەوەی کە دەری نابڕن بۆت ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا﴾ دەڵێن ئەگەر بە دەست ئێمە بوایە ﴿مِنَ ٱلْأَمْرِ
شَىْءٌ﴾ لەم کارەدا شتێك (لە سەرکەوتن) ﴿مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا﴾ ئێمە لێرەدا نەدەکوژراین ﴿قُل لَّوْ كُنتُمْ﴾
بلێ ئەگەر ئێوە ﴿فِى بُيُوتِكُمْ﴾ لە ماڵەکانی خۆشتاندا بوونایە ﴿لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ﴾ هەر دەردەچوون ئەوانەی
﴿كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ﴾ کە کوژرانیان لەسەر نووسرا بوو﴿إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ﴾ بۆ جێگای کوژرانیان
(ڕاکشانیان) ﴿وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ﴾ بۆ ئەوەی خوا تاقی بکاتەوە ﴿مَا فِى صُدُورِكُمْ﴾ ئەوەی کە لە سنگتاندایە
﴿وَلِيُمَحِّصَ﴾وە بۆ ئەوەی پاڵفتە و پاکی بکاتەوە ﴿مَا فِى قُلُوبِكُمْ﴾ ئەو(بڕوایە) ی کە لە دڵتاندایە ﴿وَٱللَّهُ
عَلِيمٌۢ﴾ وە خوا زانایە ﴿بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەوەی لە سینەو دەرونەکاندایە ﴿١٥٤﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی
ئەوانەی ﴿تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ﴾ پشتیان هەڵکرد لەناوتاندا ﴿يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ﴾ لەو ڕۆژەی کە هەردوو
کۆمەڵ گەیشتن بەیەك (لە ئوحود دا) ﴿إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ بێگومان تەنها شەیتان هەڵی
خلیسکاندن ولەخشتەی بردن ﴿بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟﴾ بەهۆی هەندێ لەو گوناهانەی کەلەوەو پێش
کردبوویان﴿وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ﴾ سوێند بێ بێگومان خوا لێ یان خۆشبوو ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ چونکە بەڕاستی
خوا ﴿غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ لێبووردەی بەئارام و لەسەرخۆیە (لە تۆڵە سەندن دا) ﴿١٥٥﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾
ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ وەك ئەوانە مەبن کە بێباوەڕ بوون ﴿وَقَالُوا۟
لِإِخْوَٰنِهِمْ﴾ بە برا بێباوەڕەکانیان دەووت ﴿إِذَا ضَرَبُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ کاتێ سەفەریان بکردایە ﴿أَوْ كَانُوا۟ غُزًّى﴾
یان غەزایان بکردایە وبچوونایە بۆ جەنگ ﴿لَّوْ كَانُوا۟ عِندَنَا﴾ ئەگەر لای ئێمە(نیشتەجێ) بوونایە
﴿مَا مَاتُوا۟﴾ نە دەمردن ﴿وَمَا قُتِلُوا۟﴾ و نە دەکوژران ﴿لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ﴾تا خوا ئەوەبکات تا خوا
ئەوەبکات ﴿حَسْرَةً فِى قُلُوبِهِمْ﴾ بە داخ و مەراق لە دڵیاندا ﴿وَٱللَّهُ يُحْىِۦ﴾ وە خوا (مرۆڤ) دەژێنێ
﴿وَيُمِيتُ﴾ و دەیشی مرێنێت ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ وە خودا بینایە بەهەر کردەوەیەك کە ئێوە دەیکەن
﴿١٥٦﴾ ﴿وَلَئِن قُتِلْتُمْ﴾ سوێندبێ ئەگەر ئێوە بکوژرێن ﴿فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە ڕێ ی خوادا ﴿أَوْ مُتُّمْ﴾ یان
بمرن ﴿لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ﴾ ئەوە بەڕاستی لێبووردن و میهرەبانی لە لایەن خواوە ﴿خَيْرٌ﴾ چاکترە
﴿مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ لەوەی کە کۆی دەکەنەوە ﴿١٥٧﴾

﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ﴾ وە بێگومـان ئەگەر ئێمە پێویستمان بکردایە لەسەریان ﴿أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ﴾ کـە یەکتـری بکـوژن (واتە بـاوەڕداران بێ بـاوەڕان بکـوژن) ﴿أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم﴾ یـان لەماڵەکانتان دەربچـن ﴿مَّا فَعَلُوهُ﴾ ئەوەیان نەدەکـرد ﴿إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ﴾ کەمێکیان نەبێـت ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا﴾ وە ئەگەر بەڕاستی ئـەوان کاریان بکردایـە ﴿مَا يُوعَظُونَ بِهِ﴾ بە پێی ئـەو ئامۆژگاریيانەی دەکران ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ ئـەوە باشتـر بـوو بۆیـان ﴿وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾ وە دامەزراوتـر دەبـوون (لەسـەر ئایینەکەیـان) ﴿٦٦﴾ ﴿وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم﴾ جـا ئـەو کاتـە بێگومـان پێمـان دەبەخشـین ﴿مِّن لَّدُنَّا﴾ لەلایەن خۆمانـەوە ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاداشـتێکی گـەورە ﴿٦٧﴾ ﴿وَلَهَدَيْنَاهُمْ﴾ وە ڕێنموونیمان دەکردن ﴿صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ بۆ ڕێگای ڕاست ﴿٦٨﴾ ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ﴾ وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکات ﴿فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ﴾ جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن ﴿أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم﴾ کە خوا فەزڵ و بەهرەی (خۆی) ڕشتووە بەسەریاندا ﴿مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ﴾ لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان ﴿وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ﴾ و شەهیدان و پیاوچاکان ﴿وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا﴾ وە ئەوانـە چ هـاوڕێ و هاوەڵێکـی چاکـن ﴿٦٩﴾ ﴿ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ﴾ ئـەو فـەزڵ و بەهرەیـە تەنهـا لەلایـەن خواوەیـە ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا﴾ وە بەسـە کـە خـوا زانایـە (بەهەمـوو شـتێك) ﴿٧٠﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی کەسـانێك کە باوەڕتان هێناوە ﴿خُذُوا حِذْرَكُمْ﴾ ئاگاداریی خۆتـان وەرگـرن ﴿فَانفِرُوا ثُبَاتٍ﴾ ئەوسـا تاقـم تاقـم هێـرش بـەرن (دەرچـن بـۆ جیهـاد) ﴿أَوِ انفِرُوا جَمِيعًا﴾ یان هەموو پێکەوە هێرش بەرن (دەرچن بۆ جیهاد) ﴿٧١﴾ ﴿وَإِنَّ مِنكُمْ﴾ وە بێگومان لە ناوتاندایە ﴿لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ﴾ کەسـی وا بەڕاسـتی خـۆی دوا دەخـات ﴿فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ﴾ جـا ئەگـەر تووشـی بەسـەرهاتێکی خـراپ هاتـن ﴿قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ﴾ دەڵێـت بەڕاسـتی خـوا فـەزڵ و بەهـرەی ڕشـت بەسـەرمدا ﴿إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا﴾ کە لەگەڵیاندا ئامـادە نەبووم ﴿٧٢﴾ ﴿وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللَّهِ﴾ وە ئەگەر تووشی فەزڵ و بەهرەیەك بوون لەخواوە ﴿لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ﴾ بێگومان دەڵێت وەك لەنێـوان ئێـوە و ئـەوا هیچ دۆسـتایەتی یـەك نەبوو بێت ﴿يَا لَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ﴾ ئـەی خۆزگە لەگەڵ ئەواندا بوومایە ﴿فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ تا قازانجێکی زۆر گەورەم بکردایە ﴿٧٣﴾ ﴿فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ کەواتـە با بجەنگێـت لەڕێی خوادا ﴿الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ﴾ کەسـانێك کە ژیانی دونیـا دەفرۆشـن بەڕۆژی دوایی ﴿وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ جا هەر کەسێك بجەنگێت لەڕێی خوادا ﴿فَيُقْتَلْ﴾ ئەمجـا بکوژرێ (شـەهید ببێت) ﴿أَوْ يَغْلِبْ﴾ یان زاڵ ببێـت ﴿فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ﴾ ئەوە دواتر پێی دەدەین ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاداشتێکی گەورە ﴿٧٤﴾

﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئەوە چیتانە (بەچ بیانوویەك) جەنگ ناكەن لەپێناوی خواد ﴿وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ﴾ و لەپێناوی چەوساوەكان لەپیاوان و ئافرەتان و مندالآن ﴿الَّذِينَ يَقُولُونَ﴾ ئەوانەی كە دەڵێن ﴿رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ﴾ ئەی پەروەردگارمان ڕزگارمان كەی لەم شارە (مەبەست پێی شاری مەككەیە) ﴿الظَّالِمِ أَهْلُهَا﴾ كە خەڵكەكەی ستەمكارن ﴿وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا﴾ وە لەلایەن خۆتەوە پشتیوانێكمان بۆ بەدی بهێنە ﴿وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ﴾ وە لەلایەن خۆتەوە بەدی بهێنە بۆمان ﴿نَصِيرًا﴾ یارمەتی دەرێك ﴿٧٥﴾ ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەو كەسانەی باوەڕیان هێناوە ﴿يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لەپێناوی خوادا دەجەنگێن ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕن ﴿يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ﴾ لە پێناوی نارەوا (یان شەیتان) دا دەجەنگێن ﴿فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ﴾ كەواتە شەڕبكەن لەگەڵ دۆستەكانی شەیتاندا ﴿إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ بەڕاستی پیلانی شەیتان هەر لاواز بووە ﴿٧٦﴾ ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ﴾ ئایا سەیری ئەو كەسانەت نەكردووە كەپێیان ووترا ﴿كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ﴾ دەستان بگێرنەوە (لەجەنگ و كوشتار) ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ و نوێژ بكەن ﴿وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ و زەكات بدەن؟ ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ﴾ كەچی كاتێك جەنگیان لەسەر پێویست كرا ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ﴾ یەكسەر دەستەیەكیان لە خەڵكی دەترسان ﴿كَخَشْيَةِ اللَّهِ﴾ وەك ترسان لەخودا ﴿أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً﴾ بگرە زیاتریش دەترسان ﴿وَقَالُوا رَبَّنَا﴾ دەیان ووت ئەی پەروەردگاری ئێمە ﴿لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ﴾ بۆچی جەنگت لەسەرمان پێویست كردوە. ﴿لَوْلَا أَخَّرْتَنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ خۆزگە دوات دەخستین (لەجەنگ كردن) بۆ ماوەیەكی كەم ﴿قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ﴾ بڵێ خۆشی و لەزەتی دونیا زۆر كەمە ﴿وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ﴾ و ڕۆژی دوایی باشترە ﴿لِّمَنِ اتَّقَىٰ﴾ بۆ كەسێك لەخوا بترسێت ﴿وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾ وەستەمتان لێ ناكرێت بە(ئەندازەی) تاڵی ناوكە خورمایەك ﴿٧٧﴾ ﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا﴾ لەهەرشوێنێك بن ﴿يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ﴾ مردن پێتان دەگات ﴿وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾ بالەناو قەڵا و كۆشكی بەرزو قایمشدابن ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ﴾ وە ئەگەر (ناپاكان) خۆشی و چاكە هاتە ڕێیان ﴿يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِ اللَّهِ﴾ دەڵێن ئەمە لەلایەن خواوەیە ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ﴾ وە ئەگەر تووشی نا خۆشی و خراپەیەك هاتن ﴿يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِكَ﴾ دەڵێن ئەمە لەلایەن تۆوەیە (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ اللَّهِ﴾ بڵێ: هەمووی لەلایەن خواوەیە ﴿فَمَالِ هَٰؤُلَاءِ الْقَوْمِ﴾ ئەوە ئەو خەڵكە چی یانە؟ ﴿لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾ وەكو لە هیچ قسەیەك تێ نەگەن وایە ﴿٧٨﴾ ﴿مَّا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ﴾ هەر چاكەیەكت تووش بوو ئەوە لەخواوەیە ﴿وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ﴾ وە هەر خراپەیەكت تووش بوو ﴿فَمِن نَّفْسِكَ﴾ ئەوە لە خۆتەوەیە ﴿وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا﴾ و ئێمە تۆمان ناردووە بەپێغەمبەر بۆخەڵكی ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ وە خوا بەسە شایەتی ئەوە بدات ﴿٧٩﴾

﴿مَن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ﴾ هەر كەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بكات ﴿فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ﴾ ئەوە بەڕاستی
گوێڕایەڵی خوای كردووە ﴿وَمَن تَوَلَّىٰ﴾ هەركەسێكیش پشت هەڵبكات ﴿فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ﴾ ئەوە ئێمە
تۆمان ڕەوانە نەكردووە ﴿عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا﴾ بە چاودێر و پارێزەر بەسەریانەوە (٨٠) ﴿وَيَقُولُونَ طَاعَةٞ﴾
(دووڕووەكان) دەڵێن گوێڕایەڵین (مل كەچ و فەرمانبەرداریـن) ﴿فَإِذَا بَرَزُواْ مِنۡ عِندِكَ﴾ بەڵام كاتێك
لەلای تۆ دەرچوون ﴿بَيَّتَ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ﴾ كۆمەڵێك لەوان شەو دەكەنەوە بەپیلان گێڕان (لەموسڵمانان)
﴿غَيۡرَ ٱلَّذِي تَقُولُۖ﴾ بەپێچەوانەی قسەكانی تۆ ﴿وَٱللَّهُ يَكۡتُبُ مَا يُبَيِّتُونَۖ﴾ وەخوا دەینووسێت ئەو (پیلانانەی)
شەو كردویانە ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ كەواتە وازیان لێ بێنە ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ﴾ و پشت بەخوا ببەستە
﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ خوا بەسە پشتیوانت بێ (٨١) ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ﴾ ئەوەبۆ بیر ناكەنەوە
لەقورئان؟ ﴿وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ﴾ خۆ ئەگەر لەلایەن كەسێكی ترەوە بوایە جگەلە خوا
﴿لَوَجَدُواْ فِيهِ﴾ بێگومان دەیانبینی تیایدا ﴿ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا﴾ جیاوازیی زۆر (٨٢) ﴿وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ﴾ وە
كاتێك هەواڵێكیان پێ بگات ﴿مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ﴾ دەربارەی ئاسایش و هێمنایەتی ( نێواتان) ﴿أَوِ ٱلۡخَوۡفِ﴾
یان لەبارەی ترسەوە ﴿أَذَاعُواْ بِهِۦۖ﴾ بڵاوی دەكەنەوە ﴿وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ بەڵام ئەگەر بیانگەڕانایەتەوە
بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ﴿وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ﴾ و بۆ لای كاربەدەستانی خۆیان ﴿لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ
مِنۡهُمۡۗ﴾ ئەوە ئەوانەی ڕاستی هەواڵەكان دەردەهێنن دەزانن هەواڵەكە (ڕاستە یان درۆیە) ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ
عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ﴾ وە ئەگەر چاكەو بەزەیی خوا نەبوایە بەرامبەر بەئێوە﴿لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا
قَلِيلٗا﴾ بێگومان شوێن شەیتان دەكەوتن كەمێكتان نەبێت (٨٣) ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) لەپێناوی خوادا بجەنگێ ﴿لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ﴾تۆ تەنها ئەركی خۆت لێ داوا كراوە (یا تۆ تەنها
ئەركی خۆت لەسەرە) ﴿وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ﴾ هانی بڕوادارانیش بدە(بۆ جیهاد) ﴿عَسَى ٱللَّهُ﴾ ئومێدە
خوا ﴿أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ﴾ بەرگری هێزی بێ باوەڕان بكات ﴿وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا﴾ وە خوا
بەهێزترە﴿وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا﴾ و تۆڵەی بەتین ترە (٨٤) ﴿مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةٗ﴾ هەركەسێ تكایەكی
چاكە بكات ﴿يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٞ مِّنۡهَاۖ﴾ بەشێكی لە(پاداشتی) ئەو چاكەیە بۆ هەیە ﴿وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةٗ
سَيِّئَةٗ﴾ وە هەركەسێ تكایەكی خراپە بكات ﴿يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٞ مِّنۡهَاۗ﴾ ئەویش بەشێكی دەبێت لە(سزای)
ئەو خراپەیە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ﴾ وەخوا هەمیشە ﴿عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتٗا﴾ بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە (چاودێرە)
(٨٥) ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ﴾ هەر كاتێك سڵاویكتان لێ كرا ﴿فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ﴾ ئەوە بەچاكتر لەو سڵاوە
سڵاو بكەنەوە (لێیان) ﴿أَوۡ رُدُّوهَآۗ﴾ یان وەكو خۆی بیسەنەوە﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَسِيبًا﴾ بێگومان
خوا هەمیشە پرساو چاودێرە بەسەر هەموو شتێكدا (٨٦)

﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لەخوا ﴿لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ سوێند
بەخوا بێگومان کۆتان دەکاتەوە بۆ (لێپرسینەوەی) ئەو ڕۆژی دواییەی ﴿لَا رَيۡبَ فِيهِۗ﴾ کە هیچ گومانی
تێدا نیە ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا﴾ جا کێ لە خوا قسە(و بەڵێنی) ڕاست ترە ﴿٨٧﴾ ﴿فَمَا لَكُمۡ﴾ ئەوە
چیتانە ﴿فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيۡنِ﴾ دەربارەی دوو ڕووەکان بوونەتە دوو دەستە ﴿وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ﴾
لەکاتێکدا خوا ئەوانەی گەڕاندۆتەوە بۆ بێ باوەڕی بەهۆی کردەوەکانیانەوە ﴿أَتُرِيدُونَ﴾ ئایا دەتانەوێت
﴿أَن تَهۡدُواْ مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ﴾ ڕێنموونی کەسێك بکەن کە خوا گومڕای کردووە؟ ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ﴾ وە
هەرکەسێك خوا گومڕای بکات ﴿فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا﴾ ئەوەهەرگیز ناتوانی ڕێگای ڕاستی بۆبدۆزیتەوە ﴿٨٨﴾
﴿وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ﴾ ئەوان ئاواتە خوازن ئێوەش بێ باوەڕبن ﴿كَمَا كَفَرُواْ﴾ وەك چۆن خۆیان بێ باوەڕ بوون
﴿فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ﴾ تا ئێوەو ئەوان یەکسان بن ﴿فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ﴾ کەواتە ئەوان بە دۆست و
یارمەتی دەر هەڵمەبژێرن ﴿حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ هەتا (پەشیمان دەبنەوەو) کۆچ دەکەن لەڕێ ی
خوادا ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئەمجا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕاو پشتیان هەڵکرد ﴿فَخُذُوهُمۡ﴾ ئەوە(بەدیل) بیانگرن
﴿وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ﴾ و بیانکوژن لەهەر شوێنێك تووشیان بوون ﴿وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا
نَصِيرًا﴾ وە هیچ دۆست و یارمەتی دەرێك لەوان هەڵمەبژێرن ﴿٨٩﴾ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ﴾ جگە
لەوانەی پەیوەندی دەکەن بە کەسانێکەوە ﴿بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ﴾ کە لەنێوان ئێوەو ئەواندا پەیمان
هەیە ﴿أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ﴾ یان هاتوون بۆ لاتان لەسەر دڵیان ناڕەحەتە (حەزناکەن)
﴿أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ﴾ لەوەی کە جەنگتان لەدژ بکەن یاجەنگ لەدژی خزمەکانیان بکەن
﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ﴾ وە ئەگەر خوا بیویستایە ﴿لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ﴾ زاڵی دەکردن بەسەرتاندا ﴿فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ﴾ و
جەنگیان دژتان دەکرد ﴿فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ﴾ جا ئەگەر ئەوان کەنارگیر بوون لە ئێوە ﴿فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ﴾ و
جەنگیان لە دژتان نەدەکرد ﴿وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ﴾ و پێشنیاری ئاشتیان کرد بۆتان (مل کەچ بوون)
﴿فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا﴾ ئەوە خوا ڕێگەی نەداوون کە دەستیان بۆ بەرن و (نابێ شەڕیان
لەدژ بکەن) ﴿٩٠﴾ ﴿سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ﴾ لە مەولا کەسانێکی تر دەبینن ﴿يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ﴾ دەیانەوێت
لەئێوە ئەمین بن ﴿وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ﴾ وە لە هۆزەکەی خۆشیان ئەمین بن ﴿كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ﴾ هەر
کاتێك بانگ کرابن بۆ بێ باوەڕی و بت پەرستی ﴿أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ﴾ گەڕاونەتەوە بۆی ( واتە
بەئاشتی ڕازی نەدەبوون) ﴿فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ﴾ جا ئەگەر کەنارگیر نەبوون لێتان ﴿وَيُلۡقُوٓاْ إِلَيۡكُمُ
ٱلسَّلَمَ﴾ وە جڵەوی ئاشتیان نەدایە دەستتان ﴿وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ﴾ وە دەستیان نە کێشایەوە (لەجەنگ کردن)
﴿فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ﴾ ئەوە بەدیل بیانگرن و بیانکوژن ﴿حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡۚ﴾ لەهەر شوێنێك کە بەردەستتان
کەوتن ﴿وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ﴾ ئەوانەی (باسمان کرد) داومانەبە ئێوە ﴿عَلَيۡهِمۡ﴾ لەدژیان ﴿سُلۡطَٰنٗا
مُّبِينٗا﴾ دەسەڵاتی ئاشکرا ﴿٩١﴾

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا﴾ بۆ هیچ باوەڕدارێك ڕەوانی یە باوەڕدارێك بكوژێت ﴿إِلَّا خَطَأً﴾ مەگەر بەهەڵە نەبێت ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً﴾ وە هەر كەسێك ئیماندارێك بە هەڵە بكوژێت ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ ئەوە(لەسەریەتی) ئازادكردنی كۆیلەیەكی باوەڕدار ﴿وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰ أَهْلِهِ﴾ و (نرخی) خوێنێكیش بدات بە كەس و كاری كوژراوەكە ﴿إِلَّا أَن يَصَّدَّقُوا﴾ مەگەر بیبەخشن (لە خوێنەكە بەخێری خۆیان) ﴿فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ﴾ بەڵام ئەگەر كوژراوەكە لەگەڵێك بوو كە دوژمنتان بوون (كافری شەڕ كەر بوون) ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ وە بەڵام كوژراوەكە ئیماندار بوو ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ ئەوە (هەر لەسەریەتی) ئازادكردنی بەندەیەكی ئیماندار ﴿وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ﴾ وە ئەگەر (كوژراوە باوەڕدارەكە) لەگەڵێك بوو ﴿بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ﴾ كەلەنێوان ئێوە وئەواندا پەیمان هەبوو ﴿فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰ أَهْلِهِ﴾ ئەوا(نرخی)خوێنێك بدەنە كەسی كوژراوەكە ﴿وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ لەگەڵ ئازادكردنی كۆیلەیەكی ئیماندار ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ جا ئەو (بكوژ)ەی دەستی نەكەوت(یان نەی بوو) ﴿فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ﴾ ئەوە (لەسەریەتی) ڕۆژوو گرتنی دوو مانگ ﴿مُتَتَابِعَيْنِ﴾ لەسەریەك ﴿تَوْبَةً مِّنَ اللَّهِ﴾ (ئەم بڕیارە)لێ بووردنە لەلایەن خواوە ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ وەخوا هەمیشە زانای كاردروستە ﴿٩٢﴾ ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ وەهەر كەسێك ئیماندارێك بەدەس ئەنقەس بكوژێت ﴿فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ﴾ ئەوە تۆڵەی ئەو كەسە دۆزەخە ﴿خَالِدًا فِيهَا﴾ بە هەمیشەیی تیایدا ئەبێت ﴿وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ﴾ وخوا خەشمی لێگرتووە ﴿وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ و نەفرینی لێ كردووەو سزایەكی گەورەی بۆئامادە كردووە ﴿٩٣﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی كەسانێك كەبڕواتان هێناوە ﴿إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ كاتێك دەرچوون (بۆ جیهاد كردن) لەڕێگەی خوادا ﴿فَتَبَيَّنُوا﴾ هەموو شتێك ڕوون بكەنەوە ﴿وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ﴾ وە نەڵێن بەو كەسانەی ﴿أَلْقَىٰ إِلَيْكُمُ السَّلَامَ﴾ كە سڵاو(ی موسڵمانانە)تان لێ دەكەن ﴿لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾ تۆ بڕوادار نیت؟ ﴿تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ بەدوای شتوومەك و سامانی دونیاییدا بگەڕێن ﴿فَعِندَ اللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ﴾ ئەوە لای خوا دەسكەوتی زۆر هەیە ﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ﴾ ئێوەش لەمەو پێش هەروەها بوون (ئیمانەكەتان دەشاردەوە) ﴿فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ ئەمجا خوا منەتی نا بەسەرتاندا (بە هێز و زاڵی كردن) ﴿فَتَبَيَّنُوا﴾ دەی كەواتە هەموو شتێك ڕوون بكەنەوە ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە ئاگادارە بەوەی ئێوە دەیكەن ﴿٩٤﴾

﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ یەکسان نین ئەو باوەڕدارانەی دانیشتوون و جیهاد ناکەن ﴿غَيْرُ أُولِي
الضَّرَرِ﴾ جگە لە خاوەن عوزرەکان نەبێت (وەك نەخۆش، و کوێر، وشەل) ﴿وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾
لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێگەی خوادا ﴿بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ بەماڵ و گیانیان ﴿فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ
وَأَنفُسِهِمْ﴾ خوا فەزڵی تێکۆشەران بە ماڵ و گیانیانی داوە ﴿عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً﴾ بە سەر دانیشتوان (لە
جیهاد)دا بە پلەیەك ﴿وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ﴾ وە هەر یەك لەو دوو تاقمە خوا بەڵێنی پاداشتی زۆر چاکی
پێی داوون (کە بەهەشتە). ﴿وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ وە خوا ڕێزی تێکۆشەرانی داوە
بەسەر دانیشتووەکاندا بە پاداشتێکی گەورە ﴿٩٥﴾ ﴿دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً﴾ لەلای (خوا)وە پلەی زۆر
و لێ خۆش بوون و میهرەبانیان بۆ هەیە ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ وە خوا هەمیشە لێبوردەی میهرەبانە ﴿٩٦﴾
﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ﴾ بە ڕاستی ئەوانەی کە فریشتەکان گیانیان دەکێشن ﴿ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ﴾ لە کاتێکدا
کەستەمیان لەخۆیان دەکرد(بە کۆچ نەکردنیان) ﴿قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ﴾ (بە تەشەرەوە پێیان) دەڵێن (دەربارەی
ئایینەکەتان) لەچیدا بوون؟! ﴿قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ﴾ دەڵێن ئێمە چەوساوە بووین لەسەر زەوی
دا ﴿قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً﴾ (پێیان) دەڵێن مەگەر زەویی خوا فراوان نەبوو؟ ﴿فَتُهَاجِرُوا فِيهَا﴾ تا
کۆچتان بکردایە تیایدا ﴿فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ﴾ جا ئەوانە شوێنیان دۆزەخە ﴿وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾ ئای چ پاشە
ڕۆژێکی خراپە ﴿٩٧﴾ ﴿إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ﴾ بێجگە لەو چەوساوانەی کە لە پیاوان ﴿وَالنِّسَاءِ﴾
و ئافرەتان ﴿وَالْوِلْدَانِ﴾ و لە منداڵان ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً﴾ کە توانای هیچ چارەیەکیان نی یە (لەبەر
بێ هێزی و پیرییان) ﴿وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا﴾ وە بەهیچ شێوازێك ڕێ دەرناکەن ﴿٩٨﴾ ﴿فَأُولَٰئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ
عَنْهُمْ﴾ ئا ئەوانە ئومێد هەیە خوا لێیان خۆش بێت ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ وە خوا هەمیشە چاوپۆشیکەر
و لێ خۆشبووە ﴿٩٩﴾ ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ وە هەر کەسێك کۆچ بکات لە ڕێ ی خوادا ﴿يَجِدْ فِي
الْأَرْضِ﴾ دەستی دەکەوێت لە زەویدا ﴿مُرَاغَمًا كَثِيرًا﴾ جێگە و ڕێگەی زۆر (کە دوژمن پێی ناخۆشە)
﴿وَسَعَةً﴾ وە فراوانی (لە ڕۆزی ژیاندا) ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ﴾ وە هەرکەسێك لە ماڵی خۆی دەرچێت
﴿مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ وە کۆچ بکات بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی ﴿ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ﴾ پاشان مردن
پێی بگات ﴿فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾ ئەوە بێگومان پاداشتی ئەو کەسە کەوتۆتە سەر خوا ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا
رَّحِيمًا﴾ وە خوا هەمیشە لێ بوردەی بە بەزەیی یە ﴿١٠٠﴾ ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ﴾ هەر کاتێك سەفەرتان
کرد (و گەڕان) بەزەوی دا ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ ئەوە هیچ گوناهێکتان لەسەر نی یە ﴿أَن تَقْصُرُوا مِنَ
الصَّلَاةِ﴾ کە نوێژەکان کورت بکەنەوە ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەگەر ترسان ئەوانەی بێ باوەڕن
جەنگتان لەگەڵ بکەن ﴿إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا﴾ بە ڕاستی بێ باوەڕان هەمیشە بۆ ئێوە دوژمنێکی
ڕوون و ئاشکران ﴿١٠١﴾

﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ﴾ کاتێك تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) لەجەنگدا) لەناو بڕواداراندا بوویت ﴿فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ﴾ و پێش نوێژیت بۆ کردن ﴿فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ﴾ ئەوە با تاقمێك لەوان لەگەڵ تۆ نوێژ بکەن ﴿وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ﴾ و با چەکەکانیان پێ بێت ﴿فَإِذَا سَجَدُواْ﴾ جا کاتێك سوژدەیان برد (رکاتێکیان تەواو کرد) ﴿فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ﴾ با (بچنە دواوە) لە پشتانەوە بن (پاسەوانتان بن) ﴿وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ﴾ وە باتاقمەکەی تر بێن ﴿لَمْ يُصَلُّواْ﴾ کە نوێژیان نەکردوە (وپاسەوان بوون) ﴿فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ﴾ و لەگەڵ تۆ نوێژ بکەن ﴿وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ﴾ وەباووریای خۆیان بن ﴿وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾ و چەکەکانیشیان پێ بێت ﴿وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێ باوەڕان ئاواتە خوازن ﴿لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ﴾ کە ئێوە بێ ئاگابن لە چەکەکانتان ﴿وَأَمْتِعَتِكُمْ﴾ و شت و مەکەکانتان ﴿فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم﴾ تا پەلامارتان بدەن ﴿مَّيْلَةً وَاحِدَةً﴾ بە پەلامارێکی یەکجارەکی (بدەن بە سەرتاندا) ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ وە تاوانتان لەسەر نی یە ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ﴾ ئەگەر بەهۆی بارانەوە نارەحەت بوون ﴿أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾ یان نەخۆش بوون ﴿أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ﴾ کە چەکەکانتان دانێن ﴿وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾ بەڵام وورياییی خۆتان بکەن ﴿إِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ﴾ بەڕاستی خوا ئامادەی کردوە بۆ بێ باوەڕان ﴿عَذَابًا مُّهِينًا﴾ سزایەکی ڕیسواکەر ﴿١٠٢﴾ ﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلَوٰةَ﴾ ئەمجا کاتێك نوێژەکانتان بەجێ هێنا ﴿فَاذْكُرُواْ اللَّهَ﴾ ئەوسا یادی خوا بکەن ﴿قِيَامًا وَقُعُودًا﴾ بەپێوە و بەدانیشتنەوە ﴿وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ﴾ وە لە سەرتەنیشتان (بە پاڵکەوتنەوە) ﴿فَإِذَا اطْمَأْنَنتُمْ﴾ جا هەر کاتێك دڵ ئارام بوون (و ترس نەما) ﴿فَأَقِيمُواْ الصَّلَوٰةَ﴾ ئەو کاتە نوێژەکانتان بە ڕێك و پێکی بکەن ﴿إِنَّ الصَّلَوٰةَ﴾ بەڕاستی نوێژ ﴿كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ هەمیشە لەسەر باوەڕداران ﴿كِتَابًا مَّوْقُوتًا﴾ فەرز کراوێکی کات بۆ دیاری کراوە ﴿١٠٣﴾ ﴿وَلَا تَهِنُواْ﴾ سست مەبن ﴿فِي ابْتِغَآءِ الْقَوْمِ﴾ لە بەدوا گەڕانی دوژمنتاندا (یان لە بەدوا گەڕانی ئەو قەومە کافرانەدا) ﴿إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە ئێش و ئازارتان پێ بگات ﴿فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ﴾ بێگومان ئەوانیش ئێش و ئازاریان پێ دەگات ﴿كَمَا تَأْلَمُونَ﴾ وەك چۆن ئێوە ئێش و ئازارتان پێ دەگات ﴿وَتَرْجُونَ مِنَ اللَّهِ﴾ وە ئێوە ئومێد دەکەن لەخوا ﴿مَا لَا يَرْجُونَ﴾ ئەوەی ئەوان ئومێدی ناکەن (کە پاداشت و سەرکەوتنە) ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ وە بەڕاستی خوا هەمیشە زانای کار دروستە ﴿١٠٤﴾ ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ﴾ بێگومان ئێمە دامانبەزاندۆتە سەر تۆ ﴿الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ ئەم قورئانە بەڕاستی ﴿لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ﴾ بۆ ئەوەی بڕیار بدەی لەنێوان خەڵکیدا ﴿بِمَآ أَرَاكَ اللَّهُ﴾ بەو بڕیارەی کەخوا نیشانی داویت ﴿وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا﴾ وە بۆ ناپاکان مەبە بەپارێزەر و پشتیوان ولایەنگر ﴿١٠٥﴾

﴿وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَۖ﴾ داوای لێخۆشبوون لەخوا بکە﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ بەڕاستی خوا لێخۆش
بووی بە بەزەیی یە ﴿١٠٦﴾ ﴿وَلَا تُجَٰدِلۡ عَنِ ٱلَّذِينَ﴾ بەرگری مەکە لەوانەی ﴿يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ﴾ ناپاکی دەکەن
دەربارەی خۆیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ﴾ بێگومان خوا خۆشی ناوێت ﴿مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمٗا﴾ ئەوانەی کە
بەردەوام زۆر ناپاك و گوناهبارن ﴿١٠٧﴾ ﴿يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ (تاوانەکانی) خۆیان دەشارنەوە
لەخەڵکی (لەترساندا) ﴿وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ﴾ و نایشارنەوە لە خوا (شەرم ناکەن لە خوا) ﴿وَهُوَ
مَعَهُمۡ﴾ لەکاتێکدا خوا لەگەڵیاندایە ﴿إِذۡ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرۡضَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡلِۚ﴾ کاتێك (کە بەنهێنی) لەشەودا
تەگبیر دەکەن و قسەیەك دەکەن خوا پێی ڕازی نی یە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطًا﴾ وە خوا هەمیشە
زاناو ئاگادارە بەهەر کردەوەیەك کە ئەوان دەیکەن ﴿١٠٨﴾ ﴿هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلۡتُمۡ عَنۡهُمۡ﴾ (ئیمانداران)
بێداربن وا ئێوە بەرگریتان لەناپاکان کرد﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ لەژیانی دونیادا ﴿فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ
عَنۡهُمۡ﴾ دەی ئایا کێ بەرگریان لێ دەکات (لە سزای خوا) ﴿يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ لە ڕۆژی دوایی دا
﴿أَم مَّن يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا﴾ یان کێ کارو باریان دەگرێتە دەست ﴿١٠٩﴾ ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا﴾ وە هەرکەس
کردەوەیەکی خراپ بکات ﴿أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ﴾ یان ستەم لەخۆی بکات ﴿ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ﴾ پاشان
داوای لێ خۆش بوون لەخوا بکات ﴿يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ دەبینێت خوا لێبوردەی میهرەبانە ﴿١١٠﴾
﴿وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا﴾ وە هەرکەسێك گوناهێك (ی گەورە) بکات ﴿فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ﴾ بێگومان
(زیانی) ئەو گوناهە هەر بۆ خۆیەتی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ وەخوا هەمیشە زانای کاردرووستە ﴿١١١﴾
﴿وَمَن يَكۡسِبۡ خَطِيٓـَٔةً﴾ وە هەرکەسێك گوناهێك بکات (بەهەڵە) ﴿أَوۡ إِثۡمٗا﴾ یان گوناهێك بکات
(بەقەست) ﴿ثُمَّ يَرۡمِ بِهِۦ بَرِيٓـٔٗا﴾ پاشان (ئەو تاوانە) بخاتە سەر بێ تاوانێك ﴿فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَٰنٗا﴾ ئەوە
بێگومان خستویەتیە ئەستۆی خۆی (سزای) بوهتانێك ﴿وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا﴾ و تاوانێکی ئاشکرا ﴿١١٢﴾
﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ﴾ وە ئەگەر بەخشش و بەزەیی خوا بەسەر تەوە نەبوایە (ئەی موحەممەد
ﷺ) ﴿لَهَمَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ﴾ بێگومان دەستەیەك لەو ناپاکانە بە نیازبوون ﴿أَن يُضِلُّوكَ﴾ کە گومڕات
بکەن ﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡۖ﴾ بەڵام ئەوانە بەس خۆیان گومڕا دەکەن ﴿وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيۡءٖۚ﴾ وە
ئەوانە هیچ زیانێ ناگەیەنن بە تۆ ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ﴾ وەخوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ سەرت ﴿ٱلۡكِتَٰبَ
وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ قورئان و دانایی ﴿وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ﴾ وە ئەوەی کەنەتئەزانی فێری کردی ﴿وَكَانَ فَضۡلُ
ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا﴾ وە هەمیشە بەخششی خوا بەسەر تۆوە زۆر گەورەیە ﴿١١٣﴾

﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ﴾ هیـچ چاکەیـەك نی یـە لەزۆربەی چپەو سـرتە کردنەکانیان دا ﴿إِلَّا مَنْ
أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ﴾ مەگەر یەکێك فەرمان بکات بەماڵ بەخشین لەرێی خوادا یان فەرمانکردن بە
چاکە ﴿أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ﴾ یان چاککردنی نێوان خەڵکی ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ جا هەر کەسێك ئەوە
بکات ﴿ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ﴾ بەنیازی ڕەزامەندی خوا ﴿فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ﴾ ئەوە لە داهاتوودا پێی دەبەخشین
﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاداشـتی زۆر گەورە ﴿١١٤﴾ ﴿وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ﴾ وەهەرکەسێك دژایەتـی پێغەمبەر ﷺ
بـکات ﴿مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ﴾ پـاش ئەوەی کـە ڕێبـازی ڕاسـتی بـۆ ڕوون بوویەوە ﴿وَيَتَّبِعْ غَيْرَ
سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ وشـوێنی ڕێگایەکـی تر بکەوێت بێجگە لەڕێگای بـڕواداران ﴿نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ﴾ ڕووی
وەردەگێریـن بۆئـەو ڕێبـازەی کەهەڵـی بـژاردووە ﴿وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ﴾ و دەیخەینـە دۆزەخ ﴿وَسَاءَتْ
مَصِيرًا﴾ ئـای چ پاشـەڕۆژێکی خراپە ﴿١١٥﴾ ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ﴾ بەڕاسـتی خوا خـۆش نابێت ﴿أَن يُشْرَكَ
بِهِ﴾ لـەوەی کەهاوەڵـی بۆ دابنرێت ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ بەڵام جگە لـەوە هەرچی بێت لێ ی خۆش
دەبێت ﴿لِمَن يَشَاءُ﴾ لە هەرکەسێك کە(خـوا) بیەوێت ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ﴾ وە هەرکەسێك هاوەڵ بۆ
خـوا دابنێـت ﴿فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾ ئەوە بەڕاسـتی گومڕا بـووە بە گومڕابونێکی دوور لەڕاسـتی
﴿١١٦﴾ ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ﴾ جگە لە خوا نزاو هاوار ناکەن (ناپەرستن جگە لەخوا) ﴿إِلَّا إِنَاثًا﴾ تەنها
لەچەند (بتێکی ناولێنراوی) مێینە نەبێت ( وە لات ومەنات وعوزا) ﴿وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا﴾
وە ناپەرسـتن جگە لە شـەیتانی یاخی و سەرکەش نەبێ ﴿١١٧﴾ ﴿لَّعَنَهُ اللَّهُ﴾ کە خوا نەفرینی لێ کردووە
﴿وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ﴾ وە(شەیتان) ووتوویەتی سوێند بێت هەڵدەبژێرم (بەبەندەی خۆم) ﴿مِنْ عِبَادِكَ﴾
لەبەندەکانت دا ﴿نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ بەشـێکی دیاری کراو ﴿١١٨﴾ ﴿وَلَأُضِلَّنَّهُمْ﴾ سوێند بێت گومڕایان
دەکەم ﴿وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ﴾ و بەئاوات و خەیاڵی درۆینە سەرگەرمیان دەکەم ﴿وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ
الْأَنْعَامِ﴾ وە فەرمانیـان پـێ دەدەم جا بێگومـان ئەوانیش گوێچکەی ئاژەڵەکان دەبڕن (لەسـەردەمی
نەفامیدا هەر ووشترێك پێنج سکی بکردایە گوێیان دەبڕی ولەسەر خۆیان حەرام دەکرد) ﴿وَلَآمُرَنَّهُمْ﴾
وە فەرمانیـان پـێ دەدەم ﴿فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ﴾ ئەوسـا ئەوانیـش دروسـت کـراوی خـوا دەگـۆڕن
﴿وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ﴾ وە هەرکەسێك شەیتان بکات بەدۆستی خۆی بێجگە لەخوا
﴿فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا﴾ ئەوە بێگومان زیانی لێ کەوتووە بەزیانێکی دیارو ئاشکرا ﴿١١٩﴾ ﴿يَعِدُهُمْ
وَيُمَنِّيهِمْ﴾ (شـەیتان) بەڵێنیان پـێ دەدات و ئاوات و ئومێدیـان دەخاتەبەر ﴿وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا
غُرُورًا﴾ دڵنیابـن شـەیتان هیـچ بەڵێنێکیـان پێ نادات جگـە لەخەڵەتانـدن نەبێت ﴿١٢٠﴾ ﴿أُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ
جَهَنَّمُ﴾ ئەوانە شوێن و جێگەیان دۆزەخە ﴿وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا﴾ و هیچ شوێنی ڕاکردن و
لادانیان دەست ناکەوێت لێ ی ﴿١٢١﴾

﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ وە ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ و کردەوە چاکەکانیان کردووە
﴿سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ﴾ لە داهاتوویەکی نزیکدا دەیانخەینە بەهەشتانێك ﴿تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾
کە ڕووبارەکان بە ژێر درەختەکانیان دا دەڕۆن ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ دەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی
﴿وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا﴾ بەڵێنی خوایە و ڕاستە (بەدی دەهێنرێت) ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا﴾ وە ئایا کێ لە
خوا ڕاست بێژترە ﴿١٢٢﴾ ﴿لَيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ (بەرزی و پاداشت) نەبە ئارەزووی
ئێوەیە و نەبەئارەزووی خاوەن کتێبەکانە ﴿مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ﴾ هەر کەسێك خراپەیەك بکات
پاداشتی دەدرێتەوە ﴿وَلَا يَجِدْ لَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ وە دەستی ناکەوێت بێجگە لەخوا ﴿وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾
هیچ دۆست و یارمەتی دەرێك ﴿١٢٣﴾ ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ﴾ کەسێکیش کردەوە چاکەکان جێ
بەجێ بکات ﴿مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى﴾ لە نێر یان لە مێ ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ لە هەمان کاتدا ئەو کەسە بڕوادار
بێت ﴿فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ﴾ ئەوە ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا﴾ و بچووکترین
ستەمیان لێ ناکرێت (هێندەی توێکڵی ناوکە خورمایەك) ﴿١٢٤﴾ ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا﴾ ئایا کێ ئایینی
چاکترو جوانترە (وە کێ دیندارترە) ﴿مِمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ﴾ لە کەسێك کە ڕووی خۆی یەکلا
کردبێتەوە بۆ خوا ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ لە هەمان کاتدا ئەو کەسە چاکەکار بێت ﴿وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ
حَنِيفًا﴾ و شوێنی ئایینی ئیبراهیم کەوتبێت بەڕاستی و پاکی (کە بە ویستی خۆی لە بەتاڵ لای
داوە بۆ لای ڕاست) ﴿وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا﴾ وە خوا ئیبراهیمی هەڵبژارد بەدۆست و خۆشەویستی
خۆی ﴿١٢٥﴾ ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ تەنها بۆ خوایە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە
﴿وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطًا﴾ وە خوا بەردەوام ئاگاداری هەموو شتێکە ﴿١٢٦﴾ ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ﴾
وە (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ئافرەتان ﴿قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ﴾ بڵێ خوا
وەڵامتان دەداتەوە دەربارەیان ﴿وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ﴾ وە ئەوەی بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە ﴿فِي الْكِتَابِ﴾
لە قورئاندا ﴿فِي يَتَامَى النِّسَاءِ﴾ (وەڵامێکە) لەبارەی کچانی هەتیووەوە ﴿اللَّاتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ﴾ ئەوانەی پێ
یان نادەن ﴿مَا كُتِبَ لَهُنَّ﴾ ئەوەی نووسراوە بۆیان (واتە میراتی باوکیان) ﴿وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ﴾ وە
حەز ناکەن مارەیان بکەن (لەبەر میراتەکەشیان ناهێڵن شوو بکەن) ﴿وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْوِلْدَانِ﴾ وە لە
بارەی ئەو منداڵانەی کە بێ دەسەڵاتن ﴿وَأَنْ تَقُومُوا لِلْيَتَامَى بِالْقِسْطِ﴾ وە (خوا فەرمان دەدات) بە دادگەری
لەگەڵ هەتیوان دا بجوڵێنەوە ﴿وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ﴾ وە هەر کردەوەیەکی باش بکەن ﴿فَإِنَّ اللَّهَ
كَانَ بِهِ عَلِيمًا﴾ ئەوە بێگومان خوا بەئاگایە لێ ی ﴿١٢٧﴾

﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ﴾ وە ئەگـەر ئافرەتێـك ﴿خَافَتۡ﴾ ترسـا ﴿مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضٗا﴾ لـە گـوێ پێ نـەدان یا
پشـت هەڵكردنـی مێردەكەی ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ﴾ ئەوە هەردووكیان هیچ گوناهێكیان لەسـەر نی یە
﴿أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحٗاۚ﴾ كـە ئاشـتەوابیەكی چاك بكەن لە نێـوان خۆیاندا ﴿وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ﴾ هەر
ئاشتەوایی و یەك كەوتن چاكترە ﴿وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ﴾ هەر چەندە چروكی و ڕەزیلی تێكەڵاوی
دەرونەكان كراوە ﴿وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ﴾ وە ئەگەر چاكە كارو پارێزكاربن ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ﴾ ئەوە دڵنیابن
بەڕاسـتی خوا هەمیشە ﴿بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا﴾ بە ئاگایە لەوەی كە دەیكەن ﴿١٢٨﴾ ﴿وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ﴾
ئێـوە هەرگیـز ناتوانـن داد پەروەربن ﴿بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ لە نێـوان ژنەكانتـان دا ﴿وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ﴾ هەر چەندە
سـوور بن (هـەوڵ بدەن) ﴿فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ﴾ جا كەواتـە بەتەواوی خوار مەبنەوە (لە هاوسـەری
یەكێكیـان) ﴿فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِۚ﴾ بەو هۆیـەوە واز بهێنن لەوی تریان وەك هەڵبەسـتراو (نە ئەوەیە
مێـردی هەبێـت نەبـەڕەڵاش كرا بێت وتـەڵاق درا بێـت) ﴿وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ﴾ وەئەگەر بسـازێن و
پارێـزكار بـن ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ ئەوە بەڕاسـتی خـوا هەمیشـە لێبـوردەی میهرەبانە ﴿١٢٩﴾
﴿وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغۡنِ ٱللَّهُ كُلّٗا مِّن سَعَتِهِۦۚ﴾ وە ئەگـەر لێك جیابوونەوە پەروەردگـار هەریەكەیان (لەوی تر)
بێ نیاز و پێویسـتی بەڕەحمی خۆی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ﴾ وە خوا هەمیشـە ﴿وَٰسِعًا حَكِيمٗا﴾ بەهرە فراوان
و كاردروسـتە ﴿١٣٠﴾ ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ وە بـۆ خوایـە هەرچی لە ئاسـمانەكان و زەوی
دایـە ﴿وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا﴾ سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی ئێمـە ئامۆژگاریمان كـردوون ﴿ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾
ئەوانـەی كەنامەیـان پێـدراوە ﴿مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ لەپێش ئێـوەدا ﴿وَإِيَّاكُمۡ﴾ هەروەهـا ئێـوەش ﴿أَنِ
ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ﴾ كە لەخوا بترسن ﴿وَإِن تَكۡفُرُواْ﴾ وە ئەگەر بێ باوەڕ بن ﴿فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾
ئەوە بەڕاسـتی هەر هـی خوایە هەرچی لەئاسـمانەكان و زەوی دایە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدٗا﴾ وە خوا
هەمیشـە دەوڵەمەندو سـوپاس كراوە ﴿١٣١﴾ ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ وە تەنها بۆ خوایە موڵكی
ئەوە هەرچی لەئاسمانەكان و زەوی دایە ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ تەنها خوا بەسە پێ سپێراو و چاودێر بێت
﴿١٣٢﴾ ﴿إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ﴾ ئەگـەر خوا بیەوێـت ناتانهێڵێت و لەناوتان دەبات ﴿أَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی خەڵكینە
﴿وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ﴾ وە دەسـتەیەكی تر دەهێنێت ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا﴾ وەخوا هەردەم بەسەر ئەوەدا
بەتوانایـە ﴿١٣٣﴾ ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا﴾ هەر كەسـێك پاداشـتی دونیای دەوێـت ﴿فَعِندَ ٱللَّهِ﴾ ئەوە لای
خوایە ﴿ثَوَابُ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ﴾ پاداشـتی دونیا و دواڕۆژ ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا﴾ وە هەمیشـە خوا
بیسەری بینایە ﴿١٣٤﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێك کەباوەڕتان هێناوە ﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ﴾ بەردەوام زۆر دادگەربن
﴿شُهَدَآءَ لِلَّهِ﴾ لەبەر خوا شایەتی بدەن ﴿وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ باشایەتی یەکە دژ بەخۆشتان بێت ﴿أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ﴾
یان دژی باوك و دایك ﴿وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ﴾ و دژی خزمە نزیکەکانتان (بێت) ﴿إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا﴾ ئەگەر
(شایەتی لەسەر دراوەکە) دەوڵەمەند بێت یان هەژار (شایەتیەکە هەر بدەن) ﴿فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ﴾ چونکە
خوا بەوان لە پێشترە (و قازانجیان چاکتر دەزانێت) ﴿فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ﴾ کەواتە شوێن ئارەزوو مەکەون
﴿أَن تَعۡدِلُواْۚ﴾ بۆ ئەوەی لەهەق لانەدەن ﴿وَإِن تَلۡوُۥٓاْ أَوۡ تُعۡرِضُواْ﴾ وە ئەگەر (شایەتیەکە) پێچەوانە بدەن یان
نەیدەن و گوێی نەدەنێ ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ﴾ ئەوە بەڕاستی خوا هەمیشە ﴿بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا﴾ بەکارەکانتان
ئاگادارە ﴿١٣٥﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ ئەی کەسانێك کە باوەڕتان هێناوە بەردەوام بن لەسەر
باوەڕ بەخودا و پێغەمبەرەکەی ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ﴾ و بەو قورئانەی ناردوویەتیە خوارەوە،
بۆ پێغەمبەرەکەی ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ﴾ وە بەو کتێبانەش کەپێشتر ناردوویەتیە خوارەوە
﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ﴾ وە هەر کەسێك بێ باوەڕ بێت بەخوا ﴿وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ﴾ و بە فریشتەکانی ﴿وَكُتُبِهِۦ
وَرُسُلِهِۦ﴾ و بە کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی ﴿وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ وە بە ڕۆژی دوایی ﴿فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا﴾ ئەوە
بەڕاستی گومڕا بووە بەگومڕایی یەکی زۆر دوور (لەڕاستی) ﴿١٣٦﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بێگومان ئەوانەی
بڕوایان هێناوە ﴿ثُمَّ كَفَرُواْ﴾ پاشان بێ باوەڕ بوونەتەوە ﴿ثُمَّ ءَامَنُواْ﴾ دواتر باوەڕیان هێناوە ﴿ثُمَّ كَفَرُواْ﴾
ئەوسا بێ باوەڕبوونەتەوە ﴿ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا﴾ پاشان لە بێ بڕوایی دا زیادتر ڕۆچوون ﴿لَّمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ
لَهُمۡ﴾ خوا هەرگیز لێیان خۆش نابێت ﴿وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ سَبِيلَۢا﴾ وە ڕێنمایی یان ناکات بۆ ڕێگای ڕاست
﴿١٣٧﴾ ﴿بَشِّرِ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ﴾ موژدەبدە بەدوو ڕووەکان ﴿بِأَنَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ بەوەیکەبەڕاستی سزایەکی
بەئازاریان بۆهەیە ﴿١٣٨﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ﴾ ئەوانەی کە بێ باوەڕان بەدۆست و
خۆشەویستی خۆیان دادەنێن ﴿مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ﴾ بێجگە لە ئیمانداران ﴿أَيَبۡتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ﴾
ئایا بەتەمان سەربەرزیان لای ئەوان دەس کەوێ؟ (بۆچونێکی هەڵەیە) ﴿فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا﴾
چونکە بەڕاستی سەربەرزیو باڵا دەستی هەمووی بۆ خوایە ﴿١٣٩﴾ ﴿وَقَدۡ نَزَّلَ عَلَيۡكُمۡ﴾ وە بێگومان
خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆتان ﴿فِي ٱلۡكِتَٰبِ﴾ لە قورئاندا ﴿أَنۡ إِذَا سَمِعۡتُمۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ هەر کاتێك
بیستان ئایەتەکانی (بەڵگەکانی) خوا ﴿يُكۡفَرُ بِهَا﴾ بڕوایان پێ ناکرێت ﴿وَيُسۡتَهۡزَأُ بِهَا﴾ و گاڵتەیان پێ
دەکرێت ﴿فَلَا تَقۡعُدُواْ مَعَهُمۡ﴾ ئەوە دامەنیشن لەگەڵیاندا (لەگەڵ ئەوانەی گاڵتە بەئایەتەکانی خودا
دەکەن) ﴿حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦٓ﴾ تا دەچنە ناو باسێکی ترەوە (و باسەکە دەگۆڕن) ﴿إِنَّكُمۡ إِذٗا
مِّثۡلُهُمۡۗ﴾ بێگومان ئەگەر دانیشتن لەگەڵیاندا (و هاوبەشیان بکەن) ئەوە ئێوەش وەك ئەوانن
﴿إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ﴾ بە ڕاستی خوا کۆکەرەوەی ﴿ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ دووڕووەکان و بێ باوەڕەکانیشە
﴿فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾ بە تێکڕا لە دۆزەخدا ﴿١٤٠﴾

﴿ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ﴾ (دووڕووەکان) ئەوانـەی چاوەڕوانـی (سـەر ئەنجامی) ئێـوە دەکەن ﴿فَإِن كَانَ
لَكُمْ﴾ جـا ئەگـەر بۆ ئێوە بوو ﴿فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ سـەرکەوتن لەلای خـواوە ﴿قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾ دەڵێن
مەگـەر ئێمـە لەگـەڵ ئێـوە نەبوویـن؟ ﴿وَإِن كَانَ لِلْكَـٰفِرِينَ نَصِيبٌ﴾ بـەڵام ئەگـەر بـێ بڕوایـان
بەشـێکیان (لەسـەرکەوتن) هەبـوو ﴿قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ﴾ ئەڵێن ئایا ئێمە زاڵمان نەکردن بەسـەر
ئەوان دا ؟ ﴿وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ و ئێوەمان نەپاراست لەئیمانداران ؟ (کەواتە بەشمان بدەن) ﴿فَٱللَّهُ
يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ جـا خوا لەڕۆژی دواییدا بڕیاری یەکجاری دەدات لە نێوانتاندا ﴿وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ
لِلْكَـٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾ وە هەرگیـز خـوا (بەڵگـەی) کافران بەسـەر ئیمانداران (ی ڕاسـتەقینە) دا
سـەرناخات (لەم جیهانەدا) ودروسـت نیە باوەڕداران ملکەچ وسەر شـۆڕی بێباوەڕان بن وحوکمی
ئـەوان جـێ بەجـێ بکـەن ﴿١٤١﴾ ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ﴾ بـە ڕاسـتی دووڕووەکان ﴿يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ﴾ دەیانەوێت
خـوا بخەڵەتێنـن ﴿وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ﴾ کەچـی ( لەبەرامبـەردا) خـوا خەڵەتێنـەری ئەوانە وفـڕ وفێڵەکانیان
پووچـەڵ دەکاتەوە) ﴿وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ هەر کاتێکیش هەسـتن بۆ نوێژ ﴿قَامُوا۟ كُسَالَىٰ﴾ بە تەمەڵی
و سستی هەڵدەستن ﴿يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ﴾ ڕوپامایی بۆ خەڵکی ئەکەن ﴿وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ وە یادی خوا
ناکـەن کەمێـك نەبێـت ﴿١٤٢﴾ ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ﴾ دوودڵ ودڵەڕاوکێیانـە لـە نێوان(کوفـر وباوەڕ) دا
﴿لَآ إِلَىٰ هَـٰٓؤُلَآءِ﴾ نەلای بڕواداران ﴿وَلَآ إِلَىٰ هَـٰٓؤُلَآءِ﴾ وەنە لای بێ باوەڕان ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ﴾ وەهەر کەسێك
خوا گومڕای بکات ﴿فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا﴾ ئەوە هەرگیز ڕێگەیەکی ڕاسـتی بۆ نادۆزیتەوە (بیگەیەنێت
بەمەبەسـت) ﴿١٤٣﴾ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئـەی ئەوانـەی کـە بڕواتـان هێنـاوە ﴿لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ﴾
بـێ بـڕواکان مەکەنە دۆسـتی خۆتان ﴿مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ لەبـری ئیمانداران ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ﴾
ئایا(بـەم کارە) دەتانەوێت بیدەن بە خـوا ﴿عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا مُّبِينًا﴾ بەڵگەیەکی ڕوون لەدژی خۆتان؟
﴿١٤٤﴾ ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ﴾ (بابزانن)بەڕاسـتی دوو ڕووەکان ﴿فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ لـە خانـە و تەبەقـی
هەرە ژێرەوەی ئاگردان ﴿وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾ وە هەرگیز ڕزگار کەرێکت بۆ ئەوان دەست ناکەوێت ﴿١٤٥﴾
﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟﴾ جگـە لەوانـەی کـە تەوبە دەکـەن ﴿وَأَصْلَحُوا۟﴾ و خۆیان چـاك دەکەن ﴿وَٱعْتَصَمُوا۟
بِٱللَّهِ﴾ ودەسـت دەگـرن بە (ئاییني) خـواوە ﴿وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ﴾ و ئایینەکەیان پاك وخاوێن دەکەن
بـۆ خوا ﴿فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ جائەوانە(ی ئەو مەرجانەیان بەجێ هێنـا) لەگەڵ ئیمانداراندا دەبن
﴿وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومـان لەداهاتوودا خـوا دەیبەخشـێت بەئیمانداران ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾
پاداشـتێکی زۆر گـەورە ﴿١٤٦﴾ ﴿مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ﴾ ئایـا خـوا چ ئیشـێکی هەیـە بـە سـزادانتان
﴿إِن شَكَرْتُمْ﴾ ئەگەر سوپاسـی بکـەن ﴿وَءَامَنتُمْ﴾ وە باوەڕی پێ بێنن ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا﴾
وە خوا هەمیشە سوپاسگوزاری بەندە چاکەکانیەتی و زانایە پێیان ﴿١٤٧﴾

﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ﴾ خـوا پێـی خـۆش نـی یـە ﴿ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾ ئاشـکرا کردنـی قسـەی نابەجـێ و
خراپ ﴿إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ مەگەر کەسێك ستەمی لێکرا بێت (بۆی دروستە خراپەی ستەمکار ئاشکرا
کات) ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا﴾ وە خـوا هەمیشـە بیسـەری زانایـە ﴿١٤٨﴾ ﴿إِن تُبْدُواْ خَيْرًا﴾ ئەگـەر خێـر و
چاکـە دەرخەن (بەئاشـکرا بیکەن ) ﴿أَوْ تُخْفُوهُ﴾ یان بیشـارنەوە﴿أَوْ تَعْفُواْ عَن سُوٓءٍ﴾ یـان ببورن لەخراپە
یـەك ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ ئـەوە بێگومـان خـوا هەمیشـە لێبـوردەی بەتوانایـە ﴿١٤٩﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ
يَكْفُرُونَ﴾ بەڕاسـتی ئەوانەی بێ بـاوەڕن ﴿بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ بەخـواو پێغەمبەرەکانی ﴿وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ﴾
وەدەیانەوێـت جیـاوازی بخەنە ﴿بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ نێـوان خـوا و پێغەمبەرەکانی ﴿وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ﴾
وە دەڵێـن باوەڕ بەهەندێك (لەپێغەمبەران) دەهێنیـن ﴿وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ﴾ وە باوەر ناهێنن بەهەندێکی
تریـان ﴿وَيُرِيدُونَ﴾ و دەیانەوێـت ﴿أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾ لـەو نێوانـەدا ڕێگەیـەك بدەنەبـەر
﴿١٥٠﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا﴾ ئائەوانە بەڕاسـتی بێ بـاوەڕی تەواون﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ﴾ وە ئامادەمان
کـردووە بـۆ بێ باوەڕان ﴿عَذَابًا مُّهِينًا﴾ سـزایەکی ڕسـواکەر ﴿١٥١﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ وە ئەوانـەی بڕوایان
هێنـاوە ﴿بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ بەخـواو پێغەمبەرەکانـی ﴿وَلَمْ يُفَرِّقُواْ﴾ وە هیـچ جیـاوازی یەکیـان نەخسـتە
﴿بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ﴾ نێـوان هیچ کام لـەو پێغەمبەرانە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئا ئەوانە ﴿سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ﴾ لە
داهاتوودا خوا پاداشـتیان دەداتەوە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ وە خوا هەمیشـە لێ بووردەی میهرەبانە ﴿١٥٢﴾
﴿يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ﴾ (ئـەی موحەمـەد ﷺ) خاوەن نامـەکان داوات لێ دەکەن ﴿أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ﴾ کە
بۆیان بێنیتە خوارەوە ﴿كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ پەڕاوێك لەئاسمانەوە ﴿فَقَدْ سَأَلُواْ مُوسَىٰٓ﴾ جا بەڕاستی داوایان
کرد لە مووسـا ﴿أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ﴾ گەورەتر لەوە ﴿فَقَالُوٓاْ﴾ ووتیان ﴿أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً﴾ خوامان نیشان بدە
بەئاشکرا ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ﴾ جابروسکەیەك لێ ی دان و گرتنی ﴿بِظُلْمِهِمْ﴾ بەهۆی ستەم کردنیانەوە
﴿ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلْعِجْلَ﴾ پاشـان گوێرەکەیەکیـان کـرد بە پەرسـتراوی خۆیـان ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ﴾ پاش
ئەوەی بۆیان هات ﴿ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ بەڵگە ئاشکراکان﴿فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ﴾ ئەمجا ئێمە چاوپۆشیمان لەویش
کـرد (لـە گوێرەکـە پەرسـتییەکە یـان) ﴿وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ﴾ وە بەخشـیمان بەمووسـا ﴿سُلْطَٰنًا مُّبِينًا﴾
موعجیـزە و بەڵگـەی ئاشـکرا (تا بـاوەڕ بێنـن) ﴿١٥٣﴾ ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ﴾ وە بەرزمان کردەوە بەسـەر
سـەریانەوە (کێـوی طـور) ﴿بِمِيثَٰقِهِمْ﴾ بەهـۆی پەیماندانیانـەوە ﴿وَقُلْنَا لَهُمُ﴾ وە ووتمـان پـێ یـان
﴿ٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا﴾ بچنـە ژوورەوە لەدەرگای (قودسـەوە) بەمل کەچی وسـوژدە بردنەوە ﴿وَقُلْنَا
لَهُمْ﴾ وە ووتمان پێیان ﴿لَا تَعْدُواْ فِى ٱلسَّبْتِ﴾ دەست درێژی مەکەن لە ڕۆژی شەممماندا (بەڕاو کردنی
ماسی) ﴿وَأَخَذْنَا مِنْهُم﴾ و وەرمان گرت لێیان ﴿مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾ پەیمانێکی بەهێز و بتەو ﴿١٥٤﴾

﴿فَبِمَا نَقْضِهِم﴾ جـا بەهـۆی هەڵوەشـاندنەوەی ﴿مِّيثَـٰقَهُمْ﴾ پەیمانیـان ﴿وَكُفْرِهِم بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ وە بەهـۆی بـڕوا
نەهێنانیان بە ئایەتەکانی خوا ﴿وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ﴾ وە کوشـتنی پێغەمبەرانیان ﴿بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ بەناڕەوا (وەك زەکەریاو
یەحیـا) ﴿وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ﴾ وە بەهـۆی ئەو ووتەیەیـان: ئێمە دڵمـان داپۆشـراوە﴿بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا﴾ (نەخێر
وانیـە) بەڵکو خـودا مۆری ناوە بەسـەر دڵەکانیـان دا ﴿بِكُفْرِهِمْ﴾ بەهۆی بـاوەڕ نەهێنانیانەوە ﴿فَلَا يُؤْمِنُونَ﴾
کەواتـە بـاوەڕ ناهێنـن ﴿إِلَّا قَلِيلًا﴾ مەگـەر کەمێکیـان نەبێـت (١٥٥) ﴿وَبِكُفْرِهِمْ﴾ وە بەهـۆی بڕوانەهێنانیانـەوە
﴿وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ﴾ وە قسـەکردنیان لـەدژی مەریـەم ﴿بُهْتَـٰنًا عَظِيمًا﴾ کـە بوختانێکـی زۆر گـەورە بـوو (١٥٦)
﴿وَقَوْلِهِمْ﴾ وە بەهـۆی ئـەوەی کەووتیـان ﴿إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ﴾ بێگومـان ئێمـە مەسـیح عیسـای
کـوڕی مەریەممـان کوشـت ﴿رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ کـە پێغەمبـەری خوایـە﴿وَمَا قَتَلُوهُ﴾ لەکاتێکـدا نەشـیان کوشـتبوو
﴿وَمَا صَلَبُوهُ﴾ وە هەڵیشـیان نەواسـی بـوو ﴿وَلَـٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾ بەڵکو لێیان گـۆڕدرا ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ﴾
وە بێگومـان ئەوانـەی دووبەرەکیـان تێ کـەوت دەربارەی عیسـا﴿لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ﴾ لەگوماندان لە کوشـتنەکەیدا
﴿مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ﴾ هیـچ زانینێکیـان دەربـارەی نی یە ﴿إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ﴾ جگە لەشـوێن کەوتنـی گومان نەبێت
﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا﴾ وە بەڕاسـتی وبێگومان نەیان کوشـتبوو (١٥٧) ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ﴾ (وانی یە) بەڵکو خوا بەرزی
کـردەوە بۆلای خۆی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ وەخوا هەمیشـە زاڵی کار دروسـتە (١٥٨) ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ﴾ وە
هیـچ کەسـێك نی یـە لەنامەدار و (خاوەن کتێـب) ەکان ﴿إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ﴾ مەگەر بڕوای پێ دێنێت (بەعیسـا)
﴿قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ پێش مردنی ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ وە لەڕۆژی دوایشدا ﴿يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ (عیسا) دەبێت بەشایەت
بەسـەریانەوە (١٥٩) ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟﴾ بەهـۆی سـتەم کردنـەوە لەلایـەن جوولەکەکانەوە ﴿حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ﴾
حەرامـمـان کـرد لێیـان ﴿طَيِّبَـٰتٍ﴾ چەند خۆراکێکی پـاك و خاوێـن ﴿أُحِلَّتْ لَهُمْ﴾ کە حـەڵاڵ کرابوو بۆیان
﴿وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴾ وە بەهۆی زۆر دژایەتی کردن و بەرهەڵستی کردنیان لەڕێگەی خوا (١٦٠) ﴿وَأَخْذِهِمُ
ٱلرِّبَوٰا۟﴾ وەبەهۆی سوودوەر گرتنیانەوە﴿وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ﴾ کەبێگومان لێیان قەدەغە کرابوو ﴿وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ﴾
وە بەهـۆی سـامان و ماڵی خەڵکی خواردونیانەوە ﴿بِٱلْبَـٰطِلِ﴾ بەنـاڕەوا ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ مِنْهُمْ﴾ وە ئامادەمان
کردووە بۆ بێ بڕواکانیان ﴿عَذَابًا أَلِيمًا﴾ سزایەکی زۆر بەئازار (١٦١) ﴿لَّـٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ﴾ بەڵام دامەزراوان وشارەزایان
﴿فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ﴾ لەزانیاریـدا لـەوان (لە جوولەکـەکان) ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ و بـاوەڕدارەکان ﴿يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾
بڕوایان هەیە بەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ وەبەوەش پێش تۆ نێردراوەتە خوارەوە
﴿وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە بەجـێ هێنەرانـی نوێـژ ﴿وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ و زەکات دەران ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ و
بـاوەڕداران بەخوا ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ و بـە ڕۆژی دوایی ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ﴾ ئەوانە لـە داهاتویەکی نزیکدا پێیان
دەبەخشین ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاداشتێکی زۆر گەورە (١٦٢)

﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ بەڕاستی ئێمە نیگامان بۆ کردووی ﴿كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ﴾ وەك چۆن نیگامان کرد بۆ نووح ﴿وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ﴾ و بۆ پێغەمبەرەکانی پاش ئەو ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ﴾ وە نیگامان کرد بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب ﴿وَٱلۡأَسۡبَاطِ﴾ و نەوەکانی یەعقوب ﴿وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ﴾ وە بۆ عیساو ئەیوب و یونس و هاروون وسولەیمان ﴿وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا﴾ وە زەبوریشمان بەخشی بەداوود ﴿١٦٣﴾ ﴿وَرُسُلٗا﴾ وە پێغەمبەرانێك ﴿قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ﴾ بێگومان بەسەرهاتەکانیانمان گێڕاوەتەوە بۆت ﴿مِن قَبۡلُ﴾ لەمەو پێش ﴿وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ﴾ وە پێغەمبەرانێك بەسەرهاتەکانیانمان نەگێڕاوەتەوە بۆت ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا﴾ وە خوا قسەی کرد لەگەڵ مووسا بەقسە کردن ﴿١٦٤﴾ ﴿رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ﴾ پێغەمبەران (مان ناردووە) کە موژدەدەرن ﴿وَمُنذِرِينَ﴾ و ترسێنەرن بن ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ﴾ بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی نەبێت ﴿عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ﴾ بەڵگە بەسەر خواوە دوای (ناردنی) پێغەمبەران ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا﴾ وە خوا هەمیشە زاڵی کار دروستە ﴿١٦٥﴾ ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ﴾ بەڵام خوا شایەتی دەدات ﴿بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ﴾ بە(ڕاستیەتی) ئەو قورئانەی ناردویەتیە خوارەوە بۆت ﴿أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ﴾ بە زانینی خۆی ناردویەتیە خوارەوە ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ﴾ و فریشتەکانیش شایەتی ئەدەن ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾ وە خوا بەسە شایەت بێت ﴿١٦٦﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەبێ باوەڕبوون ﴿وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ و بەرهەڵستی ڕێگای خوایان کرد ﴿قَدۡ ضَلُّواْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا﴾ بێگومان ئەوانە گومڕابوون بە گومڕابوونێکی دوور و لەڕادە بەدەر ﴿١٦٧﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان نەهێنا وەستەمیان کرد ﴿لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ﴾ خوا لێیان خۆش نابێت ﴿وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا﴾ ڕێنموونیشیان ناکات بۆ هیچ ڕێگایەك ﴿١٦٨﴾ ﴿إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ﴾ بێجگە لەڕێگەی دۆزەخ ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ﴾ ئەمێننەوە تیایدا بەهەمیشەیی و بێ بڕانەوە ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ﴾ وە ئەوەی باسکرا ﴿عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا﴾ لای خوا ئاسانە ﴿١٦٩﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ﴾ بێگومان پێغەمبەر هێناویەتی بۆتان ﴿بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ﴾ ڕاستی و ڕەوا لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ﴾ کەواتە ئێوەش باوەڕ بهێنن چاکترە بۆتان ﴿وَإِن تَكۡفُرُواْ﴾ وە ئەگەر باوەڕ نەهێنن ﴿فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ ئەوا بێگومان هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هی خوایە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ وە خوا هەمیشە زانای دانای (کاردروستە) ﴿١٧٠﴾

﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئـەی خاوەن پەڕاوە ئاسـمانی یـەکان ﴿لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾ زیـادە ڕەوی مەکەن لەئاینەکەتـان دا ﴿وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ﴾ وە شـتێك مەڵێـن لـە بـارەی خـواوە بێجگـە لەڕاسـتی ﴿إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ﴾ بێگومان مەسیح عیسای کوڕی مەریەم ﴿رَسُولُ ٱللَّهِ﴾ تەنها پێغەمبەری خوایە ﴿وَكَلِمَتُهُۥٓ﴾ (دروستی کردوە بە)ووتەی خۆی (ببە) ﴿أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ﴾ بە(جیبریل دا) ناردی بۆ مەریەم ﴿وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ﴾ و(عیسا) گیانێکە لەلایەن خواوە بەخشراوە ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ﴾ کەواتە بڕوا بهێنن بەخواو پێغەمبەرانی ﴿وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ﴾ وە مەڵێن (خواکانمان) سیانن (الله و عیسی و مەریەم) ﴿ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ﴾ (لـەو ووتەیە) کۆتایـی بهێنن چاکترە بۆتان ﴿إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ﴾ بێگومان خوا پەرسـتراوێکی تەنهایـە ﴿سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ﴾ پاك و بێ گەردی بۆ خوا لـەوەی ڕۆڵەی هەبێت ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ هـەر هـی خوایە هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و ﴿وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ هەرچـی لەزەویدایە ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا﴾ وە خوا بەسـە چاودێربێ (و هەموو شتێکی بدرێتە دەست) ﴿١٧١﴾ ﴿لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ﴾ هەرگیز مەسـیح لاریی نی یە (ناڕازی نی یە) ﴿أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ﴾ لەوەی بەندەی خوا بێت ﴿وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ﴾ هەروەها فریشـتە نزیکەکانیش ﴿وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ﴾ وە هەر کەس بەبەندایەتـی خـوا ڕازی نەبێت ﴿وَيَسۡتَكۡبِرۡ﴾ وە خۆی بەگـەورە دابنێت ﴿فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا﴾ ئـەوە لەداهاتوودا هەموویان کۆدەکاتەوە لای خـۆی ﴿١٧٢﴾ ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ جا ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ و کردەوە چاکەکانیان کردوە ﴿فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ﴾ ئەوا پاداشتیان دەداتەوە ﴿وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ﴾ و بۆیـان زیادیـش دەکات لەبەهـرەی خـۆی ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ﴾ بـەڵام ئەوانـەی لاریی یان کرد (لەبەندایەتی ئـەو) ﴿وَٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ وە خۆیان بەگەورە زانی ﴿فَيُعَذِّبُهُمۡ﴾ ئەوە خوا سزایان دەدات ﴿عَذَابًا أَلِيمٗا﴾ بەسزایەکی بەئازار ﴿وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ وە جگە لەخوا دەسـتیان ناکەوێت ﴿وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾ هیچ دۆست و پشت گیرێك (سەرخەرێك) ﴿١٧٣﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم﴾ ئەی خەڵکینە بەڕاسـتی بۆتان هات ﴿بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ بەڵگەی ئاشکرا لەپەروەردگارتانەوە ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ﴾ وە ناردمانـە خوارەوە بۆتـان ﴿نُورٗا مُّبِينٗا﴾ ڕووناکییەکی ئاشـکراکەر (کەقورئانە) ﴿١٧٤﴾ ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ﴾ جا ئەوانەی باوەڕیان بەخوا هێناوە ﴿وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ﴾ و پشـتیان بەو بەستووە ودەسـتیان گـرت بـە ئاینەکەیانـەوە ﴿فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ﴾ ئـەوە بێگومـان دەیانخاتە نـاو بەزەیی خۆیەوە ﴿وَفَضۡلٖ﴾ و بەهرەو چاکە(ی خۆیەوە) ﴿وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا﴾ وە ڕێنماییان دەکات بۆلای خۆی کە ڕێگای ڕاستە ﴿١٧٥﴾

﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) داوای فتـوات لـێ دەكـەن ولیـێـت دەپرسـن ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ﴾ بڵێ خوا فتواتـان بـۆ دەدات ﴿فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ﴾ دەربارەی كەلالە (كەسێكە نەوەو كوڕو بـاوك و باپیری نەبێت) ﴿إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ﴾ ئەگـەر پیاوێـك مـردوو ﴿لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٌ﴾ منداڵـی نەبـوو ﴿وَلَهُۥٓ أُخۡتٌ﴾ تەنها خوشـكێكی هەبوو ﴿فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَۚ﴾ ئـەوە نیـوەی میراتـی برا مردووەكـەی دەكەوێـت ﴿وَهُوَ يَرِثُهَآ﴾ وە (ئەگەر ئافرەتـێ بمرێت و تەنهـا برایەكـی هەبێـت) ئەو (برایـە) میراتی خوشـكە مردووەكەی هەموو دەبـات ﴿إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٌۚ﴾ ئەگەر خوشـكە مردوەكەی منداڵی نەبێت ﴿فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ﴾ بەڵام گەر دوو خوشـك بوون(دوای برا مردووەكەیان) ﴿فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ﴾ ئـەوا ( دوو خوشـكەكە) دوو سـێ یەكـی میراتـی براكەیـان دەبـەن ﴿وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ﴾ وە ئەگـەر میراتگـرەكان چەند خوشـك و برایەك بوون، پیـاوان و ئافرەتان ﴿فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ﴾ ئـەوە بـۆ هـەر نێرینەیەك ئەنـدازەی بەشـی دوو مێینە هەیـە ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾ خوا بۆتـان ڕوون دەكاتەوە﴿أَن تَضِلُّواْۗ﴾ تا گومڕا نەبن ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ﴾ وەخوا بەهەموو شتێك زانایە ﴿١٧٦﴾

## سورەتی ﴿ المَائِدَة ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئـەی بـڕواداران ﴿أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ﴾ بەڵێنەكانتان بیبەنەسـەر ﴿أُحِلَّتۡ لَكُم﴾ حەڵاڵ كـراوە بۆتان ﴿بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ (گۆشـتی) ئـاژەڵ و چوارپـێ (مـەڕو بـزن و ووشـترو ڕەشـە وولاغ ) ﴿إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ بێجگەلەوەی كە دەخوێنرێتەوە بەسـەرتان دا (حەرامن) ﴿غَيۡرَ مُحِلِّي ٱلصَّيۡدِ﴾ دروسـت نی یە ڕاو بكەن ﴿وَأَنتُمۡ حُرُمٌۗ﴾ لەكاتێكـدا ئێوە لە ئیحرام دابن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ﴾ بەڕاسـتی خوا هەرچـی بوێت بڕیاری بۆ دەدات ﴿١﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ﴾ ڕێ مەگرن لەدروشـمەكانی خوا (هەڵی مەوەشـێننەوە) ﴿وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ﴾ وجەنگ مەكەن لەمانگە حەرامەكان دا ﴿وَلَا ٱلۡهَدۡيَ﴾ وە ڕێ مەگرن لـەو قوربانیانـەی بەدیاری دەهێنرێن بۆ مەككە ﴿وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ﴾ و (ڕێ مەگرن و زیـان مەدەن) لەو قوربانیانەی ملوانكەیان لەمل كراوە (دیاری كراون بۆ نەزر وقوربانی كردن) ﴿وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ﴾ وە مەشكێنن ڕێزی ئەوانەی‌نیازی‌ماڵی خوادەكەن ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ﴾ بەتەمای‌بەهرەمەندی‌ورەزامەندی‌پەروەردگاریانن ﴿وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ﴾ وە كاتێك ئیحرامتان شـكاند ئەوە(دروسـتە) ڕاو بكەن ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ﴾ باخەشـم و قینتـان لە كۆمەڵێك واتان لێنەكات ﴿أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ لەبەر ئەوەی بەرگرییان كردن لە مزگەوتی حـەرام (كەعبە) ﴿أَن تَعۡتَدُواْۘ﴾ كە دەسـت درێژی بكـەن ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ﴾ وە كۆمەكی یەكتری بكەن لەسـەر چاكـە و پارێزگـاری و لەخواترسـان ﴿وَلَا تَعَاوَنُواْ﴾ وە كۆمەكی یەكتـر مەكەن ﴿عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ﴾ لەسـەر تاوان و دەسـت درێـژی ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ﴾ و لە خـوا بترسـن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بێگومان خوا تۆڵەی بەتینە ﴿٢﴾

﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ﴾ لەسەرتان یاساغ کـراوە﴿الْمَيْتَةُ﴾ (گۆشتی) مـردارەوە بوو ﴿وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ﴾ وە خوێن
وە گۆشتی بەراز ﴿وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ و ئەو ئاژەڵەی لەکاتی سەر بڕیندا ناوی غەیری خوای لێ برابێت
﴿وَالْمُنْخَنِقَةُ﴾و ئاژەڵی خنکاو (و خنکێنراو) ﴿وَالْمَوْقُوذَةُ﴾ وە ئەوەی کەلێ ی درابێ تاگیانی دەرچوبێت
﴿وَالْمُتَرَدِّيَةُ﴾ وە ئەوەی لەبەرزی کەوتبێتە خوارەوەو مرد بێت ﴿وَالنَّطِيحَةُ﴾ وە شۆخ لێدراو (کەبەو شۆخ لێ دانە
مردبێ) ﴿وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ﴾ وە ئەوەی دڕندە لێ ی خواردبێ ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ بێجگە ئەوەی (پێش مردن) سەرتان
بڕی بێت ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ﴾ هەروەها (یاساغ کراوە لەسەرتان) ئەو ئاژەڵەی لەسەر بەرد سەربڕابێت (نصب:
چەند بەردێك بوون لە دەوری کەعبە بەپیرۆز سەیر دەکران و لەلایاندا ئاژەڵیان سەر دەبڕی) ﴿وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا
بِالْأَزْلَامِ﴾ و داواکردنی بەش بەخت(و نیاز گرتنەوە) بەتیرو پشك ( کە هەموو جۆرە یانصیب هاوشێوەکانی
دەگرێتەوە) ﴿ذَلِكُمْ فِسْقٌ﴾ (ئەنجام دانی) ئەمانە هەمووی لەفەرمان دەرچوون و تاوانە ﴿الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾
ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە ئەمڕۆ نائومێد بوون﴿مِنْ دِينِكُمْ﴾ لەئاینەکەتان ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ﴾ کەواتە لێیان مەترسن
﴿وَاخْشَوْنِ﴾ تەنها لە من بترسن ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو (کامڵ) کردوە بۆتان
﴿وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي﴾ و چاکەو بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ و ڕازی
بووم کەئیسلام ئایینتان بێت﴿فَمَنِ اضْطُرَّ﴾ جا هەرکەس ناچار بوو﴿فِي مَخْمَصَةٍ﴾ لەبرسیەتیدا ﴿غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ﴾
بێ ئەوەی نیەتی گوناە کردنی هەبێت (لەو گۆشتانە بخوات گوناهی ناگات) ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەوە
بەڕاستی خوا لێخۆش بووی بەبەزەیی یە ﴿٣﴾ ﴿يَسْأَلُونَكَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن﴿مَاذَا
أُحِلَّ لَهُمْ﴾ چی حەڵاڵ کراوە بۆیان؟ ﴿قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ﴾ بڵێ حەڵاڵ کراوە بۆتان هەموو خۆراکە پاکەکان
﴿وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ﴾ وە (نێچیری) ئەو باڵندەو تانجی و سەگە ڕاو کەرانەی کەفێری ڕاوتان کردوون
﴿تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ﴾ فێری ڕاویـان ئەکەن لەوەی خوافێری کـردوون ﴿فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ﴾ دەبخۆن
لەوانەی بۆتان دەگرن﴿وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾ و ناوی خوای لەسەر بێنن (کاتێ تانجی یەکەی تێ بەرئەدەن
وکاتێ دەیخۆن) ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ و لەخوا بترسن ﴿إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ بێگومان خوا لێپرسینەوەی خێرایە ﴿٤﴾
﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ﴾ ئەمڕۆ حەڵاڵ کراوە بۆتان خۆراکە پاکوخاوێنەکان ﴿وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ﴾ وە خۆراکی
ئەوانەی نامەیان پێ دراوە ( ئەهلی کتاب) ﴿حِلٌّ لَكُمْ﴾ حەڵاڵە بۆتان ﴿وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ﴾ وە خۆراکی ئێوەش
حەڵاڵە بۆ ئەوان ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ وە ئافرەتانی (ئازادی) داوێن پاك لەئیمانداران (حەڵاڵە بۆتان)
﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ﴾ هەروەها ئافرەتانی (ئـازادی) داوێن پاك لەنامەدارانی (گاور وجولەکە)
﴿مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ پێش ئێوە ﴿إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەگەر ئێوە مارەیی یەکانیان بدەنێ (حەڵاڵن بۆتان) ﴿مُحْصِنِينَ﴾
ئێوە دەبێ داوێن پاك بن ﴿غَيْرَ مُسَافِحِينَ﴾ داوێن پیس نەبن (بەئاشکرا) ﴿وَلَا مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ﴾ و دۆستی ژێر
بەژێرتان نەبێ (بۆ داوێن پیسی) ﴿وَمَنْ يَكْفُرْ بِالْإِيمَانِ﴾ وە ئەوەی بێ باوەڕ بێ بەئیمان و شەریعەت ﴿فَقَدْ حَبِطَ
عَمَلُهُ﴾ ئەوە بێگـومان کردەوەکانی هەڵدەوەشێتەوە ﴿وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ وە لەڕۆژی دوایی دا یەکێکە لە
خەسارۆمەندان ﴿٥﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕدارن ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ ئەگەر هەستان بۆ نوێژ كردن
﴿فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ﴾ ئەوە دەم و چاوتان بشۆن ﴿وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ﴾ هەروەها دەستەكانتان لەگەڵ
ئانیشكەكانتان ﴿وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ﴾ وە دەستی تەڕ بهێنن بەسەرتان دا ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾ وە
پێكانتان (بشۆن) لەگەڵ هەردوو قولەپێتان ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُواْ﴾ وە ئەگەر لەش گران بوون
ئەوەخۆتـان خاوێـن بكەنـەوە (خۆتان بشـۆن) ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾ وە ئەگەر نەخـۆش بوون ﴿أَوْ عَلَىٰ
سَفَرٍ﴾ یان لەسەفەردا بوون ﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ﴾ یان كەسێكتان هاتەوە لەشوێنی پێویستی
سـەرئاوكردن ﴿أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ یان جووت بوون (یاپێستان بەریەك كەوت) لەگەڵ خێزانەكانتاندا
﴿فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً﴾ و ئاوتان دەسـت نەكەوت ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ ئـەوە تەیەموم بكەن بەخۆڵێكی پاك
﴿فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ﴾ جادەسـت بهێنن بەدەم و چاوو دەسـتەكانتان دا بەو تۆز و خۆڵە
پاكـە ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾ خوا نایەوێت هیـچ جۆرە تەنگی و ناڕەحەتیەك لەسـەرتان
دابنێـت ﴿وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ﴾ بەڵكـو ئەیەوی پاكتان بكاتـەوە ﴿وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ﴾ و چاكە
و بەهـرەی خـۆی تـەواو بـكات بەسـەرتانەوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بەڵكـو سوپاسـی بكەن ﴿٦﴾
﴿وَٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ یادی چاكەو فەزڵی خوا بكەنەوە بەسـەرتانەوە. ﴿وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِى وَاثَقَكُم
بِهِۦٓ﴾ وە ئـەو پەیمانـەی كەدایمەزرانـدن پێـی ﴿إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ كاتێـك كەووتتان بیسـتمان
و گوێڕایـەڵ بوویـن ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لەخـوا بترسـن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاسـتی خوا چاك
ئاگادارە بەوەی لە سینگەكاندایە ﴿٧﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ
لِلَّهِ﴾ زۆر بەرێكوپێكـی هەسـتن بەئەنجام دانی فەرمانەكانی خوا ﴿شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ﴾ شـایەتی دەربن
بـەدادو ڕاسـتی ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ﴾ بـاڕق و كینەتان لەدەسـتەو كۆمەڵێك هانتـان نەدا ﴿عَلَىٰٓ
أَلَّا تَعْدِلُواْ﴾ لەسـەر ئەوەی ڕاسـت نەڕۆن و دادگەر نەبن ﴿ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ دادگەربن ئەوە
نزیكترە لەپارێزكاری وخواپەرستی یەوە ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وەلەخوابترسن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾
بێگومان خوائاگایە بەكردەوەكانتان ﴿٨﴾ ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ خوابەڵێنی داوە بەوانەی بڕوایان هێناوە
﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ و كـردەوەی چاكەكانیـان كـردوە ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ﴾ بۆیان هەیـە لێخۆش بوون
﴿وَأَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ و پاداشتێكی گەورە ﴿٩﴾

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە ئەوانەی بڕوایان نەهێنا ﴿وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ وە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ
دائەنا ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ ئەوانە هاوڕێی ئاگری دۆزەخـن ﴿١٠﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾
ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ یادی چاکە و بەهرەی خوا بکەنەوە
بەسەرتانەوە ﴿إِذْ هَمَّ قَوْمٌ﴾ کاتێك کۆمەڵێك نیازیان کرد ﴿أَن يَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ﴾ کەدەست
درێژ بکەن بۆتان ﴿فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ﴾ خوایش بەرگری دەست درێژی ئەوانی لێکردن ﴿وَاتَّقُوا
اللَّهَ﴾ وە لەخوا بترسن ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ وە با بڕواداران هەرپشت بەخوا ببەستن ﴿١١﴾
﴿وَلَقَدْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ سوێند بەخوا، بەڕاستی خوا پەیمانی بەهێزی وەرگرت لەنەوەی
ئیسرائیل ﴿وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ﴾ و هەڵمان بژارد لەوان ﴿اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا﴾ دوانزە چاودێر ﴿وَقَالَ
اللَّهُ﴾ وە خوا فەرمووی ﴿إِنِّي مَعَكُمْ﴾ بێگومان من لەگەڵتانم ﴿لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصَّلَاةَ﴾ سوێند
بەخوا ئەگەر بەڕ وپێکی نوێژ بەجێ بهێنن ﴿وَآتَيْتُمُ الزَّكَاةَ﴾ و زەکات بدەن ﴿وَآمَنتُم بِرُسُلِي﴾
و باوەڕ بهێنن بە نێرراوەکانم ﴿وَعَزَّرْتُمُوهُمْ﴾ وە یارمەتیان بدەن وڕێزیان بگرن ﴿وَأَقْرَضْتُمُ اللَّهَ﴾
وە قەرز بدەن بە (بەندەکانی) خوا وخێریان پێ بکەن ﴿قَرْضًا حَسَنًا﴾ بەقەرزدان و خێرێکی جوان
وچاك ﴿لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ﴾ ئەوە بێگومان گوناه و خراپە کانتان ئەسڕمەوە ﴿وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ
جَنَّاتٍ﴾ وە ئەتان خەمە بەهەشتانێك ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ کەڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا
﴿فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ﴾ ئەمجا لەپاش ئەو مەرج و پەیمانە هەرکەس لەئێوە بێ بڕوا ببێت
﴿فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾ ئەوە بێگومان ڕێگای ڕاستی وون کردوە ﴿١٢﴾ ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ﴾
ئەمجا بەهۆی (پاش گەز بوونەوەو) هەڵوەشاندنەوەیان بۆ پەیمانەکەیان ﴿لَعَنَّاهُمْ﴾ نەفرەتمان لێ
کردن ﴿وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً﴾ وەدڵەکانیانمان گێڕا بەدڵێکی ڕەق و ووشك ﴿يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ﴾
ووتە و فەرموودەی خوا لادەدەن ﴿عَن مَّوَاضِعِهِ﴾ لە شوێنەکانی خۆی ﴿وَنَسُوا حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا
بِهِ﴾ وە لەبیریان کرد بەشێکی زۆرلەوەی کەئامۆژگاری کرابوون پێی ﴿وَلَا تَزَالُ﴾ بێ کۆتایی
ودواهاتن (بەردەوام) ﴿تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَائِنَةٍ مِّنْهُمْ﴾ ئاگادار ئەبی بەسەر ناپاکی وکردەوەی ناپاکیانەوە
( وبەردەوام خەریکی فڕ وفێڵ وناپاکین) ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ﴾ مەگەر کەمێك لەوان نەبێت ( کە ئەمە
پیشەیان نی یە) ﴿فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ﴾ جا ببورە لێیان و چاو پۆشی بکە ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾
بەڕاستی خوا چاکەکەرانی خۆش دەوێت ﴿١٣﴾

﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ﴾ وە لەوانەی کەدەیان ووت ﴿إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ﴾ ئێمە گاوورین ﴿أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ﴾
بەڵێن و پەیمانی بەهێزمان لێ وەرگرتن ﴿فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ﴾ بەڵام بەشێکی گەورە
لەوەی کەئامۆژگاری کران پێی (لەسەر زمانی عیسی) لەبیریان چوو ﴿فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ
وَٱلۡبَغۡضَآءَ﴾ بەهۆی ئەوەوە دوژمنایەتی وکینەبەریمان خستە نێوانیان ﴿إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ﴾ تاڕۆژی
دوایی ﴿وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ﴾ وە لەمەودوا خوا هەواڵیان پێدەدات ﴿بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾ بەوەی
کەدەیانکرد (لەجیهان دا) ﴿١٤﴾ ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەی نامەدارەکان (ئەهلی کتاب) ﴿قَدۡ جَآءَكُمۡ
رَسُولُنَا﴾ بێگومان نێرراومان هاتووە بۆ ئێوە ﴿يُبَيِّنُ لَكُمۡ﴾ ڕوونی دەکاتەوە بۆتان ﴿كَثِيرٗا مِّمَّا
كُنتُمۡ تُخۡفُونَ﴾ زۆری لەوەی کەئێوە دەتان شاردەوە ﴿مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ لەکتێب (ی تەورات و
ئینجیل) دا ﴿وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ﴾ وەچاو پۆشی دەکات لەزۆریك لەوانە ﴿قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾
بێگومان بۆتان هاتووە لەلایەن خواوە ﴿نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ﴾ ڕووناکی یەکی گەورەو نامەیەکی
ڕوون کەرەوە ﴿١٥﴾ ﴿يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ﴾ خوا ڕێنموونی کەسێکی پێ دەکات شوێن
ڕەزامەندی ئەو بکەوێت ﴿سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ﴾ بۆڕێگەکانی ئارامی و ئاشتی ﴿وَيُخۡرِجُهُم﴾ وەدەریان
دەهێنێت ﴿مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ لەتاریکی یەکانی (بێ باوەڕیەوە) بۆ ناو ڕووناکی ( ئیمان و
ئیسلام) ﴿بِإِذۡنِهِۦ﴾ بە فەرمانی خۆی ﴿وَيَهۡدِيهِمۡ﴾ وە ڕێنموونیان دەکات ﴿إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾
بۆ ڕێگای ڕاست ﴿١٦﴾ ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی بێ باوەڕبوون ئەوانەی
کەووتیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ﴾ بەڕاستی خوا هەر مەسیحی (عیسی) کوڕی مەریەمە
﴿قُلۡ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ﴿فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا﴾ ئەوە کێ دەتوانێت ڕێی هیچ شتێك
بگرێت لەخوا ﴿إِنۡ أَرَادَ أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ﴾ ئەگەر بیەوێت مەسیحی کوڕی مەریەم
لەناو ببات ﴿وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗاۗ﴾ هەروەها دایکی و هەرچی کەسیش لەزەویی دا هەیە
﴿وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ وەهەر بۆ خوایە خاوەن دارێتی ئاسمانەکان و زەوی ومولْکی ئەون
﴿وَمَا بَيۡنَهُمَاۚ﴾ و هەرچی وا لە نێوانیاندا ﴿يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ﴾ دروست ئەکاو دایئەهێنێت هەرچی بیەوێت
﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ وەخوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە ﴿١٧﴾

﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ جوولەکە و گاوورەکان دەیان ووت ﴿نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ﴾ ئێمە کوڕان
و خۆشەویستانی خواین ﴿قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ﴾ بڵێ دەی بۆچی سزاتان دەدات بەهۆی گوناهە
کانتانەوە ﴿بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ﴾ (نەخێر ڕاست نی یە) بەڵکو ئێوە مرۆڤێکن ﴿مِّمَّنۡ خَلَقَۚ﴾ لەو مرۆڤانەی
کەخوا دروستی کردون ﴿يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ خۆش ئەبێت لەهەر کەس بیەوێت ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ﴾ و
سزای هەرکەسیش ئەدات کەبیەوێت ﴿وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ﴾ و هەر بۆ خوایە موڵکی
ئاسمانەکان و زەوی وەهەرچی والە نێوانیاندا ﴿وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ وە هەر بۆ لای ئەویشە گەڕانەوە ﴿١٨﴾
﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەی نامە دارەکـان ﴿قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا﴾ بێگومان نێرراوەکەمان هات بۆ ناوتان
﴿يُبَيِّنُ لَكُمۡ﴾ (بەرنامەی خوا) ڕوون دەکاتەوە بۆتان ﴿عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾ پاش ماوەیەك لەناردنی
پێغەمبەران ﴿أَن تَقُولُواْ﴾ لەبەر ئەوەی نەڵێن: ﴿مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ﴾ نەهات بۆ لامان هیچ مژدەدەرو
ترسێنەرێك ﴿فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ﴾ ئەوەتا بێگومان مژدە دەرو ترسێنەرتان بۆ هاتووە ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ وەخوا بەتوانا و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێکدا ﴿١٩﴾ ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ﴾ باسی
ئەو کاتە بکە کەمووسا فەرمووی بەگەلەکەی ﴿يَٰقَوۡمِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەی گەلەکەم
بیبری چاکەو بەهرەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە ﴿إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ أَنۢبِيَآءَ﴾ کاتێك کەپێغەمبەرانی تێدا
هەڵخستوون ﴿وَجَعَلَكُم مُّلُوكٗا﴾ وە چەندینی کردوون بەپادشا ومەلیك ﴿وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمۡ يُؤۡتِ أَحَدٗا﴾
وە شتێکی پێ بەخشیوون کە نەی بەخشیووە بەهیچ کەس ﴿مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ لەجیهانیان ﴿٢٠﴾
﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿ٱدۡخُلُواْ ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ﴾ بچنە ناو ئەو خاکە پیرۆزەی (پاکراوەتەوە
لەبت پەرستی کە مەبەست پێی بیت المقدسە) ﴿ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾ کەخوا بڕیاری داوە بۆتان
﴿وَلَا تَرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَارِكُمۡ﴾ وە پاشەوپاش وەرنەگەڕێنەوە لەئاینەکەتان ﴿فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ﴾ (ئەگەر
بگەڕێنەوە) ئەوە بەزیانباری و نائومێدی ئەگەڕێنەوە ﴿٢١﴾ ﴿قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ ووتیان ئەی مووسا ﴿إِنَّ
فِيهَا قَوۡمٗا جَبَّارِينَ﴾ بەڕاستی گەلێکی زۆر دارو ستەمکار لەو شارە دایە ﴿وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا﴾ وە ئێمە
هەرگیز ناچینە ناوی ﴿حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا﴾ تا ئەوان لێ ی دەرنەچن ﴿فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا﴾ ئەمجا ئەگەر
ئەوان لێی دەرچوون ﴿فَإِنَّا دَٰخِلُونَ﴾ ئەو کاتە بێگومان ئێمە تێی ئەچین ﴿٢٢﴾ ﴿قَالَ رَجُلَانِ﴾دوو پیاو
ووتیان: ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ﴾ لەوانەی لەخوا دەترسان ﴿أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا﴾ وەخوا چاکەی ئیمانی ڕشت
بوو بەسەریاندا ﴿ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ﴾ بدەن بەسەریاندا لەقاپی شارەوە بچنە ژورەوە ﴿فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ
غَٰلِبُونَۚ﴾ جا ئەگەر چوونە ناویەوە ئەوە بەڕاستی ئێوە زاڵ دەبن بەسەریاندا ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ﴾
وەپشت هەر بەخوا ببەستن ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕدارن ﴿٢٣﴾

﴿قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ ووتیان ئەی مووسا﴿ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا﴾ بەڕاستی ئێمە هەرگیز ناچینە ناو ئەوشارە
﴿مَّا دَامُواْ فِيهَا﴾ تائەوان تێیدابن ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ﴾ کەواتە بڕۆ خۆت و پەروەردگارت
لەدژیان جەنگ بکەن﴿ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾ بێگومان ئێمە لێرە دانیشتووین ﴿٢٤﴾ ﴿قَالَ﴾(مووسا)
ووتی﴿رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ﴾ ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من خاوەنی هیچ کەسێك نیم﴿ إِلَّا نَفۡسِي
وَأَخِيۖ﴾ بێجگە لەخۆم و براکەم نەبێت﴿فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ﴾ کەواتە جیایی بخەرە نێوان
ئێمەو ئەوگەلەی ﴿ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ کە لەسنووری خوا دەرچـوون ﴿٢٥﴾ ﴿قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ﴾
(خوا) فەرمووی بەڕاستی ئەو (خاکە پیرۆزەی بیت المقدس) قەدەغە کراوە لەسەریان﴿أَرۡبَعِينَ
سَنَةٗۛ﴾ ماوەی چل ساڵ ﴿يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ بەسەر گەردانی دەخولێنەوە بەسەر زەویدا ﴿فَلَا
تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ بۆیە خەم مەخۆ لەسەر ئەو گەلەی کەلە سنووری خوا دەرچوون ﴿٢٦﴾
﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بخوێنەرەوە بەسەریاندا ﴿نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ﴾ هەواڵی دوو
کوڕەکەی ئادەم کە حەق و ڕاستە ﴿إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا﴾ کاتێك هەردووکیان دوو جۆرە قوربانی یان کرد
﴿فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا﴾ ئەمجا لەیەکێکیان وەرگیرا ﴿وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ﴾ وە لەوی تریان وەرنەگیرا
﴿قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ﴾ (ئەوەیان لێی گیرا نەکرا) ووتی بێگومان دەبێ هەر بتکوژم ﴿قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ
ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ ئەویش ووتی خوا (قوربانی) تەنها لەپارێزکاران و لەخواترسان گیرا دەکات ﴿٢٧﴾
﴿لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر تۆ دەستم بۆ درێژکەی ﴿لِتَقۡتُلَنِي﴾ بۆ ئەوەی بمکوژی
﴿مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ﴾ من دەست درێژ ناکەم بۆ تۆ بۆ ئەوەی بتکوژم ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ﴾
بەڕاستی من لەخوا ئەترسم ﴿رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە ﴿٢٨﴾ ﴿إِنِّيٓ أُرِيدُ﴾
بەڕاستی من دەمەوێت ﴿أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ﴾ کە تۆ بگەڕێیتەوە (بۆلای خوا) بەگوناهی من و
خۆیشتەوە﴿فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ﴾ ئەوسا تۆ لەهاوەڵانی دۆزەخ دەبیت ﴿وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾
هەر ئەوەش پاداشتی ستەم کارانە ﴿٢٩﴾ ﴿فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ﴾ ئەمجا دەرونی(ئەو تاوانبارە) هانی دا
﴿قَتۡلَ أَخِيهِ﴾ بۆ کوشتنی براکەی ﴿فَقَتَلَهُۥ﴾ وە کوشتی ﴿فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ بەهۆی یەوە چووە ڕیزی
زیان باران وخەسارومەندان ﴿٣٠﴾ ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا﴾ پاشان خوا قەلە ڕەشێکی نارد ﴿يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾
لەزەویدا چاڵی هەڵئەکەند (بۆ قەلە ڕەشێکی مردارەوە بوو) ﴿لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ﴾ بۆ ئەوەی
نیشانی بدات کەچۆن لەشی براکەی بشارێتەوە ﴿قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ﴾ ووتی ئای داخی سەختم وتیاچوون
بۆ من ﴿أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ﴾ بۆ من دەستە پاچە بووم لەوەی وەك ئەم قەلەڕەشەبم؟
﴿فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ﴾ تا تەرم و عەورەتی براکەم بشارمەوە ﴿فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ﴾ ئەوسا چووە ڕیزی
پەشیمان بوانەوە ﴿٣١﴾

﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ﴾ هەر لەبەر ئەوە(ی كەلەو داستانەدا باسكرا) ﴿كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ پێویستمان كرد لەسەرنەوەی ئیسرائیل ﴿أَنَّهُۥ﴾ كەبێگومان بڕیار ئەمەیە ﴿مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا﴾ ئەوەی تەنیا كەسێك بكوژێت ﴿بِغَيۡرِ نَفۡسٍ﴾ لەتۆڵەی كەسێكی كوژراودا نەبێت ﴿أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ یان تۆڵەی خراپە كاری و ئاژاوە بنێتەوە لەسەر زەوی دا ﴿فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا﴾ ئەوە وەك ئەوەوایە هەموو خەڵكی كوشتبێت ﴿وَمَنۡ أَحۡيَاهَا﴾ ئەوەش بێ تاوانێك ڕزگار كات لەكوژران ﴿فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۚ﴾ ئەوە وەك ئەوەوایە هەموو ئادەمی ڕزگار كردبێت و زیندووی كردبنەوە ﴿وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ سوێند بەخوا بێگومان، پێغەمبەرەكانمان هاتن بۆلایان بەبەڵگە ڕوونەكانەوە ﴿ثُمَّ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ﴾ كەچی لەپاش ئەوە زۆرێك لەوانە ﴿فِي ٱلۡأَرۡضِ لَمُسۡرِفُونَ﴾ زیادە ڕەویان كرد لەزەویدا ﴿٣٢﴾ ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی تۆڵەی ئەوانەی ﴿يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ كە جەنگ و دوژمنایەتی ئەكەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەكەی دا ﴿وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا﴾ وە هەوڵ ئەدەن لەزەویدا خراپە بڵاوبكەنەوە ﴿أَن يُقَتَّلُوٓاْ﴾ (ئەوە تۆڵەیان) ئەوەیە بكوژرێن ﴿أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ﴾ یا هەڵبواسرێن بەدارا ﴿أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم﴾ یان دەست وقاچیان ببڕدرێت ﴿مِّنۡ خِلَٰفٍ﴾ بەپێچەوانەوە (ڕاست وچەپ) ﴿أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ یان دوور بخرێنەوە لەووڵات ﴿ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ ئەمە زەبونی و ئابڕو بردنیانە لە جیهاندا ﴿وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ لە دواڕۆژیشدا بۆیان هەیە ﴿عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ سزایەكی گەورە ﴿٣٣﴾ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ﴾ بێجگەلەوانەی تەوبەیان كردووە ﴿مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ﴾ لەپێش ئەوەی دەسەڵاتتان ببێت بەسەریاندا ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ تا بزانن ﴿أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ كەبەڕاستی خوالێ بوردەی میهرەبانە ﴿٣٤﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لەخوا بترسن ﴿وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ﴾ بگەڕێن بەدوای هەموو هۆكارێكدا كەنزیكتان بخاتەوە لەخوا ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ﴾ وەتێ بكۆشن وخەبات بكەن لەڕێگەی خوادا ﴿لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ بەئومێدی ڕزگار بونتان ﴿٣٥﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی كە لەجیهاندا بێ بڕوا بوون ﴿لَوۡ أَنَّ لَهُم﴾ ئەگەر ببنە خاوەنی ﴿مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ هەرچی لەزەویدایە هەمووی ﴿وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ﴾ ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێت ﴿لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بكڕنەوە و ڕزگاركەن لەسزای ڕۆژی دوایی وبیبەخشن بۆ ڕزگار بوونیان ﴿مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ﴾ لێ یان وەرناگیرێت ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ وە بۆیان هەیە سزایەكی بە ئازار ﴿٣٦﴾

﴿يُرِيدُونَ أَن يَخۡرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ دەیانەوێت لەئاگری دۆزەخ بێنەدەرەوە ﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنۡهَاۖ﴾
بەڵام هەرگیز دەرچوونیان لە (ئاگری دۆزەخ) نی یە ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ﴾ و سزای بەردەوامیان
بۆ هەیە (٣٧) ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ﴾ پیاو و ئافرەتی دز ﴿فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا﴾ دەستیان ببڕن ﴿جَزَآءَۢ بِمَا
كَسَبَا﴾ لەتۆڵەی ئەو دزیەی کردویانە ﴿نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ﴾ ئەمە تۆڵە و تەمێ کردنێکە لەلایەن
خواوە ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ وە خوا باڵا دەستی کار دروستە (٣٨) ﴿فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ﴾ جا هەر
کەس تۆبەی کرد لەپاش ستەمەکەی (دزیەکەی) ﴿وَأَصۡلَحَ﴾ وە کردەوەی چاکی کردو باش بوو
﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ﴾ ئەوە بێگومان خوا تۆبەکەی لێ وەردەگرێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی
خوا لێبوردەی میهرەبانە (٣٩) ﴿أَلَمۡ تَعۡلَمۡ﴾ ئایا نەت زانیوە ﴿أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ کەهەر بۆ خوایە
خاوەنێتی ئاسمانەکان و ﴿وَٱلۡأَرۡضِ﴾ زەوی ﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾ سزای هەر کەسێك دەدات کەبیەوێت
﴿وَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُۗ﴾ وە ئەبوورێت لەهەر کەس خۆی بیەوێت ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾
وەخوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانا و دەسەڵاتدارە (٤٠) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ
﴿لَا يَحۡزُنكَ﴾ خەم بارت نەکات ﴿ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾ ئەوانەی کە پێشبڕکێ دەکەن لەبێ
بڕوایی دا ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ لەوانەی بەدەم ئەڵێن بڕوامان هێناوە ﴿وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ﴾
کەچی دڵەکانیان بڕوای نەهێناوە ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ﴾ هەروەها لەوانەش کە جوولەکەن ﴿سَمَّٰعُونَ
لِلۡكَذِبِ﴾ زۆر گوێ قوڵاخن بۆ درۆ ﴿سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ﴾ زۆر گوێ لە مشتی دەستەیەکی
ترن ﴿لَمۡ يَأۡتُوكَۖ﴾ کەنەهاتون بۆلای تۆ ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ﴾ ووتەکانی (تەورات) دەگۆڕن ﴿مِنۢ بَعۡدِ
مَوَاضِعِهِۦۖ﴾ لە پاش ئەوەی خوا لەشوێنی خۆی دایناون ﴿يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا﴾ ئەڵێن ئەگەر
ئەمە(ی ئێمە)تان پێ گوترا (لەلایەن موحەممەد ﷺ) ﴿فَخُذُوهُ﴾ ئەوە وەری گرن ﴿وَإِن لَّمۡ
تُؤۡتَوۡهُ﴾ ئەگەر لەئەمە(ی ئێمە)تان پێ نەگوترا ﴿فَٱحۡذَرُواْۚ﴾ ئەوا خۆتان بپارێزن ﴿وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ
فِتۡنَتَهُۥ﴾ وەهەر کەسێك خوا بیەوێ کافرو گومڕای بکات ﴿فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ﴾ ئەوە تۆ
لەبەرامبەر خوادا هیچت پێ ناکرێت بۆی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە کەسانێکن ﴿لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ
قُلُوبَهُمۡۚ﴾ خوا نەیویستووە دڵەکانیان پاك بکاتەوە ﴿لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ﴾ لەدونیادا سەرشۆڕدەبن
﴿وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ وە لەڕۆژی دواییشدا بۆیان هەیە ﴿عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ سزایەکی زۆر گەورە (٤١)

﴿سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ﴾ ئـەو (جوولەکانـە) زۆر گـویّ قولاّخـی درۆن ( هەمیشـە گـویّ هەڵدەخەن بـۆ درۆ) ﴿أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ﴾ ماڵـی حـەرام زۆر دەخـۆن ﴿فَإِن جَآءُوكَ﴾ جـا ئەگـەر ئەوانـە هاتـن بـۆلات ﴿فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ﴾ ئـەوە (بەویسـتی خـۆت) بڕیـار بـدە لـە نێوانیانـدا ﴿أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ یـان وازیـان لـیّ بهێنـە ﴿وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ خـۆ ئەگـەر وازیـان لـیّ بهێنـی ﴿فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔا﴾ ئـەوە هیـچ زیانێکـت پـیّ ناگەیەنـن ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ﴾ وە ئەگـەر بڕیـارت دا لەنێوانیانـدا ئـەوا بـە دادوەری بڕیـار بـدە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾ چونکـە بەڕاسـتی خـوا دادگەرانـی خـۆش دەوێـت ﴿٤٢﴾ ﴿وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ﴾ وە ئەوانـە چـۆن تۆدەکـەن بـەدادوەر ﴿وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ﴾ لەکاتێکـدا تەوراتیـان لایـە ﴿فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ﴾ کـە حوکـم و بڕیاری خـوای تیایە ﴿ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ ئەمجـا لەپـاش ئـەوە (ی کەکردیتیـان بـەدادوەر) ڕوو وەر دەگێـڕن ﴿وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومـان ئەوانـە بـڕوادار نیـن ﴿٤٣﴾ ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ﴾ بێگومـان ئێمـە تەوراتمـان نـاردە خـوارەوە ﴿فِيهَا هُدًى وَنُورٌ﴾ کەڕێنموونـی و ڕووناکی تێدا بوو ﴿يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەو پێغەمبەرانە حوکمیان پیّ دەکرد ﴿أَسْلَمُوا۟﴾ کەموسڵمان و ملکەچ بوون ﴿لِلَّذِينَ هَادُوا۟﴾ بۆ ئەوانەی کە جوولەکە بوون ﴿وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ﴾ هەروەها زانا خوا ناسەکان و زانا شەرع زانەکان (حوکمیـان پیّ دەکـرد) ﴿بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ بەهۆی ئەوەی فەرمانـی پارێزگاری کتێبی خـوا (تەورات)یان پیّ کرا بـوو (لەلایەن پێغەمبەرەکانیانەوە) ﴿وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ﴾ وەشـایەتیش بوون لەسـەری ﴿فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ﴾ کەواتە ئەی (زانایانی جوولەکە) لەخەڵکی مەترسـن ﴿وَٱخْشَوْنِ﴾ بەڵکـو تەنهـا لەمن بترسـن ﴿وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى﴾ بەڵگـەو فەرمانەکانی مـن مەگۆڕنەوە (مەفرۆشـن) ﴿ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ بـە نرخێکی کەم ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ وە هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کەخـوا ناردوویەتیـە خـوارەوە ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ئـا ئەوانە بێ بـاوەڕن و موسـڵمان نین ﴿٤٤﴾ ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ﴾ لەتەوراتـدا نوسـیمان (پێویسـتمان کـرد) لەسـەریان ﴿أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ﴾ کەبێگومـان هـەر کەسـێك بەدەسـتی ئەنقەسـت کەسـێك بکوژێـت ئەکوژرێتـەوە لـە بەرامبەریـدا ﴿وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ﴾ وە چاو لەبری چاو ﴿وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ﴾ وە لووت لەبری لووت ﴿وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ﴾ وە گوێچکە لەبری گوێچکە ﴿وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ﴾ وە ددان لەبری ددان ﴿وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾ وەزامەکانیش تۆڵەیـان زامـدار کردنی دەسـت درێـژی کەرانە ﴿فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ﴾ جـا هەر کەس لەتۆڵە سـەندن خۆش بێت ئەوە ئەبێتە هۆی سـڕینەوەی گوناهی ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم﴾ وە هەر کەسـێك حوکم نـەکات ﴿بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ بەوەی کەخـودا ناردویەتیە خـوارەوە ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئەوا هەر ئەو کەسانە ستەم کاری تەواون ﴿٤٥﴾

﴿وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم﴾ ئەمجا بەدوای پێغەمبەرانی (جوولەکەدا) ڕەوانەمان کرد ﴿بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ﴾ عیسای
کوڕی مەریەم ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ باوەڕی هەیە بەئەو تەوراتەی کەلەپێش خۆیەوە هاتووە
و( ڕاستی دەردەخات وباوەڕی پێیەتی) ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ﴾ وەئینجیلمان پێ بەخشی
کەڕێنموونی و ڕووناکی تێدایە ﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ وەئەو تەوراتە بەڕاست دەزانێت
کەلە پێش ئەوەوە هاتووە ﴿وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾ وە ڕێنموونی و ئامۆژگاری یە بۆ پارێزکاران
ولەخواترسان ﴿٤٦﴾ ﴿وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ﴾ دەبا پەیڕەوانی ئینجیل حوکم بکەن ﴿بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ﴾ بەوەی
کەخوا ناردوویەتیە خوارەوە تیایدا ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ وە هەرکەس حوکم نەکات بەوەی
کەخوا ناردویەتیە خوارەوە ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ ئا ئەوانە بەتەواوی یاخین و لەفەرمانی خوا
دەرچوون ﴿٤٧﴾ ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ﴾ وە ئەم قورئانەمان ناردە خوارەوە بۆتۆ بەحەق و ڕاستی
﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ و کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانی و پشتیوانیان لێ دەکات
( پێش دەست تێخستن و گۆڕینیان لەلایەن جولەکە وگاورەکانەوە) ﴿وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾ و چاودێریانە
﴿فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ کەواتەحوکم و بڕیاربدە لەناو نامەدارەکاندا بەوەی خوا ناردویەتیە خوارەوە
﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ﴾ وە شوێن هەواو هەوەسی ئەوان مەکەوە ﴿عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾ لانەدەی لەو حوکم و
بڕیارە هەق و ڕاستەی کەبۆت هاتووە ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ﴾ دامان ناوە بۆ هەر ئوممەتێك لەئێوە
﴿شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ شەریعەت و ڕێگەیەکی ڕوون ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ وە ئەگەر خوا
بیویستایە ئێوەی ئەکرد بەیەك ئوممەت و کۆمەڵ ﴿وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ﴾ بەڵام (نەیکردوون) بۆئەوەی
تاقیتان بکاتەوە ﴿فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ﴾ لەو شەریعەت و یاسایانەی کەپێی بەخشیوون ﴿فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ﴾
کەواتە پێش برکێ بکەن بۆ ئەو شتانەی کەچاکن ﴿إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾ گەڕانەوەتان هەر بۆلای
خوایە بەگشتی ﴿فَيُنَبِّئُكُم﴾ ئەمجا هەواڵتان پێدەدا ﴿بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ بەوەی کەلەجیهاندا
جیاوازبوون تیایدا ﴿٤٨﴾ ﴿وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم﴾ وە(فەرمانمان پێ کردیت) کەحوکم بکە لەنێوانیاندا
﴿بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ بەوەی کەخوا ناردویەتیە خوارەوە ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ﴾ و شوێن حەزو ئارەزویان
نەکەویت ﴿وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ﴾ وە ووریابە لێیان لەوەی بت ترازێنن ﴿عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ﴾ لە
هەندێك لەوەی خوا ناردویەتیە خوارەوە بۆت ﴿فَإِن تَوَلَّوْا۟﴾ ئەمجا ئەگەر ئەوانە ڕویان وەرگێڕاو
سەرپێچی یان کرد ﴿فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ﴾ ئەوە بزانە و دڵنیابە خوا ئەیەوێت ﴿أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ﴾ بەهۆی
هەندێك لە تاوانەکانیانەوە سزایان بدات و تووشی زیانیان بکات ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ﴾
بێگومان زۆر لە ئادەمی یەکان سەرکەشن و لەسنووری خوا دەرچوون ﴿٤٩﴾ ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾
ئایا ئەوان داوای حوکمی نەفامی دەکەن؟ ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا﴾ ئایا کێ حوکم و بڕیاری لە هی
خوا جوان و چاکترە؟ ﴿لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ بۆکەسانێك کە بڕوای تەواویان هەیە ﴿٥٠﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە ﴿لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ﴾ جوولەکـەو گاوور
مەکەن بەپشتیوان و خۆشەویستی خۆتان ﴿بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ﴾ ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن ﴿وَمَن
يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ﴾ ئەوەتان ئەوان بکات بەپشتیوان و دۆستی خوی ﴿فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ﴾ ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەوانە
﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومـان خوا ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات ﴿٥١﴾ ﴿فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم
مَّرَضٞ﴾ بۆیـە ئەبینی ئەوانـەی دڵیان نەخۆشـی (دوو ڕوویی) تیایە ﴿يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ﴾ پێش برکێ ئەکەن
لەدۆستایەتی ئەو (جوولەکەو گاوور) انەدا ﴿يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ﴾ ئەڵێن ئەترسین ﴿أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ﴾ کەبەسەر
هاتی ناخۆشـی ڕۆژگـار دووچارمان ببێت ﴿فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ﴾ دەی نزیکە خوا سـەرکەوتن و زاڵ
کردنـی تـەواو بنێرێـت (بـۆ پێغەمبەر ﷺ) ﴿أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ﴾ یـان لەلایـەن خۆیەوە کارێکـی تر بکات
﴿فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ﴾ بەهۆی ئەوەوە وایان لێدێت لەوەی پەنهانیان کردبوو ﴿فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ﴾ لەدەروونی
خۆیانـدا پەشـیمان دەبنەوە ﴿٥٢﴾ ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەوسـا ئەوانەی بڕوایان هێنـاوە دەڵێن ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ
أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ﴾ ئایا ئەو کەسانە ئەوانەن کەسوێندیان بەخوا ئەخوارد ﴿جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ﴾ بەتوندترین سوێندیان
﴿إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ﴾ کەبەڕاستی ئەوان لەگەڵتانن ﴿حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ﴾ کردەوەکانیان پوچەڵ بوویەوە ﴿فَأَصۡبَحُواْ
خَٰسِرِينَ﴾ بەهـۆی ئەوەوە زەرەرمەنـدو ڕەنجە ڕۆبوون ﴿٥٣﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان
هێنـاوە ﴿مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ﴾ هـەر کەس لەئێـوە هەڵگەڕێتـەوە لەئاینەکەی ﴿فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ﴾
ئەوە بەزوویی خوا لەباتی ئەوان گەل و کۆمەڵێکی تر ئەهێنێت ﴿يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾ خوا ئەوانی خۆش
ئەوێت و ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێت ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بەسۆزو بەزەیین بەرانبەر بڕوا داران ﴿أَعِزَّةٍ
عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ بەهێزو توندن بەرانبەر بێ بڕوایان ﴿يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ تێ کۆشان دەکەن لەڕێی خوادا
﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ﴾ و ناترسـن لەسەرزەنشـتی سەرزەنشـت کاران ﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ﴾ ئەوەی باسـکرا
چاکەو بەهرەی خوایە ﴿يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ﴾ ئەیبەخشێت بەهەر کەس کەخۆی بیەوێت ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾
وەخـوا دەسـتەڵات فراوانی زانایـە ﴿٥٤﴾ ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ بێگومان دۆسـت و یارمەتی دەری ئێوە
تەنهـا خواو پێغەمبەرەکەیـی ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ و بڕوا دارانن ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئەوانـەی کەبەڕێك و
پێکـی نوێژەکانیان بەجێ ئەهێنـن ﴿وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ و زەکات ئەدەن ﴿وَهُمۡ رَٰكِعُونَ﴾ بەردەوام مل کەچن بۆ
فەرمانـی خوا ﴿٥٥﴾ ﴿وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ وە هـەر کەس خواو پێغەمبـەرو ئیمانداران بکات
بەپشـتیوانی خۆی ﴿فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ﴾ ئەوە بێگومان هەر کۆمەڵی خودا زاڵ و سەرکەوتوون ﴿٥٦﴾
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسـانێك کەبڕواتان هێناوە ﴿لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ﴾ دامەنێن ئەوانەی
کەئاینەکـەی ئێـوە دادەنێـن (بەشـتێکی) ﴿هُزُوٗا وَلَعِبٗا﴾ گاڵتـەو لاقرتـی پێکـراو ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾
لەوانـەی نامەیان پێ بەخشـراوە ﴿مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ لەپێش ئێوەدا ﴿وَٱلۡكُفَّارَ﴾ وە لەبێ بڕواکانیش ﴿أَوۡلِيَآءَۚ﴾
(دایان مەنێن) بەدۆست و خۆشەویستی خۆتان ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وە لەخوا بترسن ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر
ئێوە بڕوادارن ﴿٥٧﴾

﴿وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ کاتێك ئێوە بانگ دەدەن بۆ نوێژ ﴿ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا﴾ ئەو (دوو ڕووانە)
گاڵتەو لاقرتی پێ ئەکەن ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾ ئەمەش بەهۆی ئەوەوە یە کەئەوان گەلێکی نەفام
و نەزانن ٥٨ ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ بڵێ ئەی نامەدارەکان ﴿هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ﴾ ئایا هیچ ڕەخنەو ڕقێکتان
هەیە لەئێمە ﴿إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ بێجگە لەوەی کەبڕوامان هێناوە بەخوا ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾ وە بەو قورئانەی
هێنراوەتە خوارەوە بۆمان ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ﴾ وە بەوەی لەمەوپێش هێنراوەتە خوارەوە ﴿وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ
فَٰسِقُونَ﴾ بێگومان زۆربەتان سەرکەش و لەسنوور دەرچوون ٥٩ ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) بڵێ ئایا هەواڵتان بدەمێ ﴿بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ﴾ کێ شوێن و پاداشتی خراپترە لای خوا
لەوە﴿مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ﴾ ئەوە کەسێکە خوا نەفرەتی لێ کردبێت ﴿وَغَضِبَ عَلَيْهِ﴾ وخەشمی لێگرتبێت
﴿وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ﴾ وە هەندێکی لێ کردبن بەمەیموون و بەراز ﴿وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ﴾ وە بت
وتاغوتی پەرستبێت ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا﴾ ئەوانەی باسکران خراپترین شوێنیان هەیە ﴿وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ
ٱلسَّبِيلِ﴾ و گومڕاترین کەسن لەڕێگای ڕاست ٦٠ ﴿وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾ وەکاتێك دێن بۆلاتان دەڵێن
بڕوامان هێناوە ﴿وَقَد دَّخَلُوا۟ بِٱلْكُفْرِ﴾ سوێندبێ بێگومان بەبێ بڕوایی یەوە هاتوون ﴿وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا۟ بِهِۦ﴾
وەبێگومان هەر بەبێ بڕواییشەوە دەرچوون ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْتُمُونَ﴾ وە خوا زۆر چاك دەزانێ
بەوەی کەدەیان شاردەوە ٦١ ﴿وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ﴾ وەئەبینی زۆرێك لەوانە ﴿يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾
پێشبڕکێ ئەکەن لەگوناهو دەست درێژی کردن ﴿وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ﴾ و حەرام خواردندا (وەك بەرتیل)
﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ بێگومان ئەوەی کەدەیانکرد زۆر بەدو خراپ بوو ٦٢ ﴿لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ
وَٱلْأَحْبَارُ﴾ ئەوە بۆچی بەرگرییان نەکردن خواپەرست و زاناکانیان ﴿عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ﴾ لەگوفتاری
گوناهیان و﴿وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ﴾ لەحەرام خواردنیان (وەك بەرتیل) ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ﴾ بەڕاستی شتێکی
بەدبوو ئەوەی دەیانکرد ٦٣ ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ﴾ جولەکەکان وتیان ﴿يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ﴾ خوا دەستی بەستراوە
(پاکی بۆخودا) ﴿غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ﴾ یاخوا ئەوان خۆیان چنگ قوچراو و دەست بەستراوبن ﴿وَلُعِنُوا۟ بِمَا
قَالُوا۟﴾ وەنەفرینیان لێکرا بەهۆی ئەوەی کە وتیان ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾ (نەخێر وانی یە) بەڵکو
هەردوو دەستی خودا هەمیشە کراوەیە (لەم ئایەتەدا جێگیرکردن و باسکردنی سیفەتی دەست بۆ
خودا هاتووە ئێمە باوەڕمان پێیەتی بەبێ لێچواندن و شێوەکەی نازانین وتەنها خودا دەیزانێت)
﴿يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ﴾ چۆنی بیەوێت دەیبەخشێت﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم﴾ وەسوێند بەخوا زیاد دەکات
بۆ زۆر لەوان (بۆ زاناو سەرۆکەکانیان) ﴿مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەو قورئانەی هێنراوتە خوارەوە
بۆ تۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا﴾ سەرکەشی و بێ بڕوای (زیاد ئەکات بۆیان)
﴿وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ﴾ وەخستومانەتە نێوانیان ﴿ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ﴾ دوژمنایەتی و کینەو ڕقەبەری ﴿إِلَىٰ يَوْمِ
ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ تارۆژی دوایی ﴿كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ﴾ هەر جارێك ئاگرێکیان هەڵگیرساندبێت بۆ ئاژاوە
نانەوەو جەنگ ﴿أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ﴾ خوا ئەو ئاگرەی کوژاندۆتەوە ﴿وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا﴾ وە تێکۆشان
ئەکەن لە زەوی دا بۆ خراپەو تێکدان ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ خواش خراپەکارانی خۆش ناوێت ٦٤

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ آمَنُوا﴾ خۆ ئەگەر بەڕاستی نامەدارەکان ( ئەهلی کتاب لەگاور و جولەکەکان)
بڕوایـان بهێنایـە ﴿وَاتَّقَوْا﴾ و خۆیان بپاراستایە و پارێـزکار ولەخواتـرس بوونایە ﴿لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ
سَيِّئَاتِهِمْ﴾ بێگومـان گوناهـو خراپەکانیانمـان دەسـڕی یەوە لێیـان ﴿وَلَأَدْخَلْنَاهُمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ وە
دەمانخستنە ناو بەهەشتانی پڕ ناز و نیعمەت ﴿٦٥﴾ ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ﴾ وە بێگومان ئەگەر ئەو
نامەدارانە تەورات و ئینجیلیان کار پێ بکردایە ﴿وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِم﴾ هەروەها ئەو قورئانەی کەهێنراوەتە
خـوارەوە بۆیان ﴿مِّن رَّبِّهِمْ﴾ لەلایـەن پەروەردگاریانەوە ﴿لَأَكَلُوا مِن فَوْقِهِمْ﴾ بێگومـان ڕۆزی یان
دەخوارد لەلای سـەرویانەوە (لە ئاسـمانەوە) ﴿وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم﴾ وە لە ژێرپێیانەوە(لە زەوی یەوە)
﴿مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ﴾ تێیان دایە دەستەو کۆمەڵێکی ڕێك و پێك ﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ﴾ بەڵام زۆرێك لەوان
﴿سَاءَ مَا يَعْمَلُونَ﴾ ئەوەی دەیکەن زۆر بەدو خراپە ﴿٦٦﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ ﴿بَلِّغْ مَا أُنزِلَ
إِلَيْكَ﴾ ڕایگەیەنە (بەخەڵك) ئەوەی هێنراوەتە خوارەوە بۆت ﴿مِن رَّبِّكَ﴾ لەلایەن پەروەردگارتەوە
﴿وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ﴾ وە ئەگەر وانەکەی ﴿فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ﴾ ئەوە ڕاسپێریەکەی خوات ڕانەگەیاندوەو
بەجێت نەهێناوە ﴿وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ وەخواتۆ دەپارێزێت لەخەڵكی (کەبت کوژن) ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي
الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ بێگومـان خـوا ڕێنموونـی بـێ بڕوایـان نـاکات ﴿٦٧﴾ ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ﴾ (ئـەی
موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەی نامەدارەکان ( ئەی ئەهلی کتاب) ﴿لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ ئێوە لەسەر هیچ شتێك نین
﴿حَتَّىٰ تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ﴾ هەتـا بەڕێـك و ڕاسـتی پەیڕەوی تـەورات و ئینجیـل نەکەن ﴿وَمَا أُنزِلَ
إِلَيْكُم﴾ هەروەها ئەو قورئانەی کەهێنراوەتە خوارەوە بۆتان ﴿مِّن رَّبِّكُمْ﴾ لەلایەن پەروەردگارتانەوە
﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم﴾ سـوێند بەخوا زیاد ئـەکات بۆ زۆریان ﴿مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ ئـەوەی هێنراوەتە
خـوارەوە بـۆت لەلایـەن پەروەردگارتـەوە ﴿طُغْيَانًا وَكُفْرًا﴾ سەرکەشـی و بـێ باوەڕییـان (زیـاد
دەکات) ﴿فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ کەواتـە خەم مەخۆ لەسـەر کۆمەڵی بـێ بڕوایان ﴿٦٨﴾ ﴿إِنَّ الَّذِينَ
آمَنُوا﴾ بەڕاسـتی ئەوانەی بڕوایان هێنـاوە ﴿وَالَّذِينَ هَادُوا﴾ و ئەوانەی بوون بەجوولەکە ﴿وَالصَّابِئُونَ﴾
ئەسـتێرە پەرست یان فریشتە پەرسـتەکان ﴿وَالنَّصَارَىٰ﴾ وە شوێن کەوتوانی عیسی پێغەمبەر ﴿مَنْ آمَنَ
بِاللَّهِ﴾ هـەر کـەس لەوانە بڕوایان هێنـا بێت بەخوا ﴿وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ و بـە ڕۆژی دوایی ﴿وَعَمِلَ صَالِحًا﴾
و کـردەوەی چاکـی کردبێـت ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ ئـەوە نەهیچ مەترسـیەکیان لەسـەرە ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾
وە نەخەفـەت بـار ئەبن (لـەڕۆژی دوایی دا) ﴿٦٩﴾ ﴿لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ سـوێند بەخـوا پەیمانی
بەهێزمـان وەرگـرت لـە بەنـو ئیسـرائیل ﴿وَأَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ رُسُلًا﴾ و چەنـد پێغەمبەرێکمـان نـارد بۆیان
﴿كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ﴾ هـەر جارێك پێغەمبەرێکیان بۆ بهاتایە ﴿بِمَا لَا تَهْوَىٰ أَنفُسُهُمْ﴾ بە هەر فەرمانێ کە
بەدڵیان نەبوایە ﴿فَرِيقًا كَذَّبُوا﴾ دەسـتەیەکیان بەدرۆزن دائەنان ﴿وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ﴾ وە دەستەیەکیشیان
دەکوشتن ﴿٧٠﴾

﴿وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ﴾ وایان دەزانی کەتۆڵە و سزا دووچاریان نابێت ﴿فَعَمُواْ وَصَمُّواْ﴾ جا بۆیە کوێرو
کەڕبوون ( لەئاست بیستن و بینینی هەق) ﴿ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾ لە پاشان خوا تەوبەو گەڕانەوەی لێ
وەرگرتن ﴿ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡۚ﴾ ئەمجا لەپاش ئەوە زۆر بەیان کوێرو کەڕبوون (لەبیستن و
بینینی بەڵگەو ئایەتەکانی خوا) ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ﴾ وە خوا بینەرە بەهەر کردەوەیەك کەدەیکەن ﴿٧١﴾
﴿لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ﴾ سوێند بێت بێ باوەڕبوون ئەوانەی کەووتیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ﴾ بێگومان
خوا مەسیحی کوڕی مەریەمە ﴿وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ لەکاتێکدا مەسیح (کاتێك ڕەوانەکرا)
ووتی ئەی بەنو ئیسرائیل ﴿ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۖ﴾ تەنها خوا بپەرستن کە پەروەردگاری من و
ئێوەشە ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ﴾ بەڕاستی هەر کەس هاوبەش بۆخوا دابنێت ﴿فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ﴾
ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لێ حەرام کردووە ﴿وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ﴾ وە جێگا و شوێنی ئاگر دەبێت
﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ﴾ وە بۆ ئەو ستەم کارانە هیچ یارمەتی دەرێك نی یە ﴿٧٢﴾ ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ﴾
سوێند بەخوا بەڕاستی بێ باوەڕبوون ئەوانەی کەووتیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ﴾ بێگومان خوا یەکێکە
لەو سێ خوا (کەبریتین لەپەروەردگارو عیسی و دایکی) ﴿وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ﴾ (لەکاتێکدا)
هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە بێجگە لەتەنیا خوایەك ﴿وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ﴾ وە ئەگەر واز
نەهێنن لەو ووتە ناڕەواو بەدانە ﴿لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ﴾ سوێند بەخوا دووچاری ئەوانەیان ئەبێت
کەبێ باوەڕبوون ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ سزایەکی بەئازارو سەخت ﴿٧٣﴾ ﴿أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ﴾ دەی ئایا بۆ تۆبە
ناکەن و ناگەڕێنەوە بۆلای خوا؟ ﴿وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ﴾ و داوای لێبوردنی لێ ناکەن؟ ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾
لەکاتێکدا خوا لێبوردەی میهرەبانە ﴿٧٤﴾ ﴿مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ﴾ مەسیحی کوڕی مەریەم هیچ نی
یە جگە لەپێغەمبەری خوا ﴿قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ بێگومان لەپێش ئەوەوە چەندەها پێغەمبەر بوون
﴿وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ﴾ دایکیشی ئافرەتێکی زۆر ڕاست گۆیە ﴿كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ﴾ هەردووکیان خواردنیان
دەخوارد (واتە خوانین) ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ سەرنج بدە چۆن ئایەت و بەڵگەکان ڕوون
دەکەینەوە بۆیان ﴿ثُمَّ ٱنظُرۡ﴾ پاشان سەیرکە ﴿أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ﴾ چۆن لا دەدرێن لەحەق بەرەو بەتاڵ دەڕۆن ﴿٧٥﴾
﴿قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا ئێوە بێجگە لەخوا شتێك دەپەرستن؟
﴿لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ﴾ کە هیچ زەرەرو سوودێکی نی یە بۆتان ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ وە
خوا هەر خۆی بیسەری زانایە ﴿٧٦﴾ ﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەی نامەدارەکان
﴿لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾ زیادە ڕۆی مەکەن لەئاینەکەتاندا ﴿غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ﴾ جگە لەوە نەبێت کەڕاست وحەقە
﴿وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ﴾ و شوێن ئارەزووی کەسانێك مەکەون ﴿قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ﴾ کەبەڕاستی پێشتر
گومڕاو سەرلێ شێواو بوون ﴿وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا﴾ وە زۆر کەسیشیان گومڕاکرد ﴿وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾ وە
خۆشیان گومڕابوون و لایاندا لەڕێگای ڕاست ﴿٧٧﴾

﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ نەفرین کرالەوانەی بێ بڕوابوون ﴿مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ لەبەرەونەوەی ئیسرائیل ﴿عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ﴾ لەسەر زمانی داوود ﴿وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ﴾ ولەسەر زمانی عیسای کوڕی مەریەمیش ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ﴾ ئەو نەفرینەش لەبەر ئەوە بوو سەرپێچیان کرد ﴿وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ﴾ و هەمیشە دەست درێژیان دەکرد ﴿٧٨﴾ ﴿كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ﴾ ئەوانە بەرگری یەکتری یان نەدەکرد ﴿عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ﴾ لەهەر کارێکی بێزراو ناشەرعی کەدەیانکرد ﴿لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ بێگومان زۆر بەدبوو ئەوەی کەئەیانکرد ﴿٧٩﴾ ﴿تَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ﴾ ئەبینی (ئەی موحەممەد ﷺ) زۆر بەیان ﴿يَتَوَلَّوۡنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ﴾ دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿لَبِئۡسَ مَا قَدَّمَتۡ لَهُمۡ أَنفُسُهُمۡ﴾ بێگومان زۆر بەد و خراپە ئەوەی کەپێشیان خست بۆخۆیان (وکردویانە) ﴿أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾ کە هۆی خەشم و قینی خوا بوو لێیان ﴿وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ خَٰلِدُونَ﴾ وە ئەوانە لەسزای دۆزەخدا بێ بڕانەوە دەمێننەوە ﴿٨٠﴾ ﴿وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بەخوا ﴿وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ﴾ وە بە پێغەمبەرو بەو بەرنامەیەی کەنێراوەتە خوارەوە بۆ سەری ﴿مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ﴾ ئەو بێ بڕوایانەیان نەدەکرد بەدۆست و خوشەویستی خۆیان ﴿وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ﴾ بەڵام زۆر بەیان ﴿فَٰسِقُونَ﴾ لەئاین دەرچوون و یاخین لەخوا ﴿٨١﴾ ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ سوێند بێت دەبینیت (ئەی موحەممەد ﷺ) خراپترینی خەڵکی بۆ دوژمنایەتی لەگەڵ بڕواداران دا ﴿ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ﴾ جوولەکە و هاوبەش دانەرانن ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ وە سوێند بێت دەبینیت نزیکترینیان لەخۆشەویستی بۆ بڕواداران ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ﴾ ئەوانەن کەدەیان ووت بێگومان ئێمە گاوورین ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانٗا﴾ ئەوەش لەبەر ئەوەیە بێگومان لە ناویاندا قەشەو گۆشەگیرانێك هەن ﴿وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ﴾ کە بەراستی ئەوان خۆیان بەزل و گەورە دانانێن ﴿٨٢﴾ ﴿وَإِذَا سَمِعُواْ﴾ هەر کاتێك گوێیان لێ بووایە ﴿مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ ئەو قورئانەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ﴿تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ﴾ دەبینی چاوەکانیان ﴿تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ﴾ لە فرمێسك (پڕدەبێ و) دەڕژێت ﴿مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّۖ﴾ لەبەر ئەو ڕاستی یەی کە زانیویانە (و بۆیان دەرکەوتوە) ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا﴾ ئەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئەوا ئێمە باوەڕمان هێنا (بەو قورئانەی ناردووتە خوارەوە بۆ موحەممەد) ﴿فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ دەتۆش لەگەڵ شایەتی دەران ناومان بنوسە و(لەگەڵ ئەواندا بمانژمێرە) ﴿٨٣﴾

﴿وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ﴾ بۆچی دەبێ ئێمە باوەڕ نەهێنین بە خوا ﴿وَمَا جَاءَنَا مِنَ الْحَقِّ﴾ و بەوەی کە بۆمان
هاتووە لە حەق و ڕاستی ﴿وَنَطْمَعُ أَنْ يُدْخِلَنَا رَبُّنَا﴾ لە کاتێکدا ئومێدمان وابێ پەروەردگارمان بمانخاتە
﴿مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ﴾ ڕیزی پیاو چاکانەوە ﴿٨٤﴾ ﴿فَأَثَابَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا﴾ جا خوا پاداشتیان ئەداتەوە بەهۆی
ئەوەوە کە ووتیان ﴿جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ بەچەند باخێك کە ڕووبار بە ژێریاندا دەڕوات
﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ دەمێننەوە تیایدا بەهەمیشەیی ﴿وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ﴾ وە ئەوەیە پاداشتی چاکە
کاران ﴿٨٥﴾ ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ وە ئەوانەی باوەڕیان نەهێناو ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ
دەزانی ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ ئەوانەن هاوەڵانی دۆزەخ ﴿٨٦﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی
بڕواتان هێناوە ﴿لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ﴾ ئەو شتە پاك و خۆشانەی کە خوا حەڵاڵی کردوە
بۆتان یاساغی مەکەن لە خۆتان ﴿وَلَا تَعْتَدُوا﴾ و سنوور مەشکێنن ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ چونکە
بێگومان خوا سنوور شکێنەرانی خۆش ناوێت ﴿٨٧﴾ ﴿وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ﴾ بخۆن لەو ڕزق و
ڕۆزیانەی کە خوا پێی بەخشیوون ﴿حَلَالًا طَيِّبًا﴾ کە حەڵاڵ و پاکن ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنْتُمْ بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾
خۆتان بپارێزن و بترسن لەو خوایەی کە ئێوە باوەڕتان پێ یەتی ﴿٨٨﴾ ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ﴾ خوا لێتان
ناگرێت ﴿بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ﴾ ئەو سوێندانەتان کە نیازی دڵی لەگەڵدا نی یە ﴿وَلَٰكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ﴾ بەڵام
لێ تان ئەگرێت (بە گوناهبارتان دادەنێ) ﴿بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ﴾ بە(شکاندنی) سوێندێك کە بەنیازی
دڵ داتان بەستبێت ﴿فَكَفَّارَتُهُ﴾ جا کەفارەتی (سڕینەوەی شکاندنی) ئەو سوێندانە ﴿إِطْعَامُ عَشَرَةِ
مَسَاكِينَ﴾ خۆراك دانی (دە) هەژارە ﴿مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ﴾ لە خۆراکێك مام ناوەندی کە بە
منداڵ وخێزانی خۆتانی دەدەن ﴿أَوْ كِسْوَتُهُمْ﴾ یا پۆشاکی (دە) هەژار ﴿أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ یا ئازاد کردنی
بەندەیەك ﴿فَمَنْ لَمْ يَجِدْ﴾ جائەوەی دەستی نەکەوت هیچ کام لەمانە ﴿فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ﴾ ئەوە سێ
ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت ﴿ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ﴾ ئەوە(ی باسکرا) کەفارەتی سوێندەکانتانە
کاتێك کە سوێندتان خوارد(و سوێندەکەتان شکاند) ﴿وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ﴾ وە سوێندەکانتان
بپارێزن ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ﴾ بەو جۆرە خوا ئایەتەکانی خۆی بە ڕوونی باسی ئەکات بۆتان
﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئەوەی سوپاسی بکەن ﴿٨٩﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە
﴿إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ﴾ بێگومان ئارەق و قومار و ئەو بەردانەی کە کراون بە بت ﴿وَالْأَزْلَامُ﴾
و ئەو پارچە دارانەی (کە بەکارئەهێنرێن بۆ دیاریکردنی بەش و چارەنووس) ﴿رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ
الشَّيْطَانِ﴾ ئەوانە پیسن و لەکردەوەی شەیتانن ﴿فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ کەواتە دوورکەونەوە لێی
تارزگاربن ﴿٩٠﴾

﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ بێگومـان شـەیتان هـەر ئـەوەی ئـەوێ ﴿أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ﴾ کـە
دوژمنایەتـی و کینـەو ڕق بخاتە ناوتانەوە﴿فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ﴾ بەهۆی ئـارەق و قومارەوە ﴿وَيَصُدَّكُمْ
عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ وە بەرگریتـان بـکات لەیـادی خـودا و لەنوێـژ کـردن ﴿فَهَلْ أَنتُم
مُّنتَهُونَ﴾ دەی ئایـا ئێـوە وازدەهێنـن (لـەو خراپانـە)؟ ﴿٩١﴾ ﴿وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ﴾ وە فەرمانبـەر و گوێڕایەڵـی
خوابـن ﴿وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ﴾ وە فەرمانبەرو گوێڕایەڵی نێرراوە کەی بن ﴿وَٱحْذَرُوا۟﴾ و بترسـن (ئاگاداربن)
﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ﴾ ئەمجـا ئەگـەر ئێـوە ڕوو وەرگێـڕن و فەرمـان بـەری نەکـەن ﴿فَٱعْلَمُوٓا۟﴾ ئـەوا بزانـن
﴿أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا﴾ بێگومان ئەوەی کە لەسـەر نێردراوەکەی ئێمە بێت ﴿ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾ تەنها ڕاگەیاندنی
ڕوون و ئاشـکرای ئایینەکەیـە ﴿٩٢﴾ ﴿لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ نەبـووەو نـی یـە لەسـەر ئەوانـەی کەبڕوایـان
هێنـاوە ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە کردەوە چاکەکانیان کـردووە ﴿جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓا۟﴾ هیچ گوناهێك لەوەی
خواردویانـە (ئـارەق و پـارەی قومار پێـش حـەرام کردنیان) ﴿إِذَا مَا ٱتَّقَوا۟﴾ ئەگـەر خۆیان پاراسـتبێت
(لـەو چەرخەدا لەوەی کە حـەرام بووە لە سـەریان) ﴿وَّءَامَنُوا۟﴾ وە باوەڕداربووبن ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾
و کـردەوە چاکەکانیـان کردبێـت ﴿ثُمَّ ٱتَّقَوا۟﴾ پاشـان خۆیان پاراسـتبێت (لـەوەی کە حـەرام کرابێت)
﴿وَّءَامَنُوا۟﴾ و بڕواشـیان هەبوبێـت (بەوەی کە هاتبێـت لە لایەن خواوە) ﴿ثُمَّ ٱتَّقَوا۟﴾ پاشـان بەردەوام
بووبن لەسـەر خۆ پارێزی ﴿وَّأَحْسَنُوا۟﴾ و چاکەکانیشیان بەچاکی کردبێت ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾
وە خـوا ئـەو چاکەکارانـەی خـۆش دەوێـت ﴿٩٣﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە
﴿لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ﴾ سوێند بە خوا، خوا تاقیتان دەکاتەوە﴿بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلصَّيْدِ﴾ بە هەندێك نێچیر ﴿تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ
وَرِمَاحُكُمْ﴾ کە بەدەست دەیانگرن و بە ڕمەکانتان ڕاویان دەکەن﴿لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ﴾ تا خوا دەری
بخات کێ لێ ی دەترسێت بە پەنهانی ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾ ئەمجا هەرکەس دەست درێژی بکات دوای
ئـەو (هـەواڵ پێدانە) ﴿فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوە بۆی هەیە سـزایەکی بەئـازار ﴿٩٤﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی
ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَقْتُلُوا۟ ٱلصَّيْدَ﴾ نێچیر مەکوژن ﴿وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ لە کاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدان
﴿وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا﴾ وە ئەوەتان بەدەستی ئەنقەست بیکوژێت ﴿فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ﴾ ئەوە لەسەریەتی
سـەر بڕینـی وێنـەی ئـەوەی کـە کوشـتویەتی ﴿مِنَ ٱلنَّعَمِ﴾ لـە ئـاژاڵ و مـاڵات ﴿يَحْكُمُ بِهِۦ﴾ ئـەو بڕیارە
بـدەن (نێچیرەکە لـە بەرانبـەرچ ئاژەڵێکدایە) ﴿ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ دوو پیاوی موسـڵمانی چـاك لەخۆتان
﴿هَدْيًۢا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ﴾ بـە شـێوەی قوربانـی بگاتـە کەعبـە (و لـەوێ بیـکات بەقوربانـی) ﴿أَوْ كَفَّٰرَةٌ طَعَامُ
مَسَٰكِينَ﴾ یـان بە ئەندازەی نرخی قوربانیەکە خۆراك بـدات بە چەند هەژارێك ﴿أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا﴾
یـان بەقەدەر ئەو خۆراکدانە ڕۆژوو بگرێت ﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِۦ﴾ بۆ ئـەوەی بچێژێت ئۆباڵی کارەکەی
﴿عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ﴾ خوا خۆش بووە لەوەی کە تێپەڕی و بەسـەرچوو ﴿وَمَنْ عَادَ﴾ بەڵام هەرکەسـێك
بگەڕێتـەوە (بـۆ سـەر ئـەو کردەوەیـە) ﴿فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنْهُ﴾ ئـەوا خـوا تۆڵـەی بـە تینـی لـێ دەسـێنێت
﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ وەخوا زاڵە و خاوەنی تۆڵەی بەتینە ﴿٩٥﴾

﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ﴾ ڕاو(ی نێچیـر) و خواردەمەنی دەریایی حەڵاڵکراوە بۆتان ﴿مَتَٰعًا لَّكُمْ
وَلِلسَّيَّارَةِۖ﴾ تـا ئێـوە و گەشـتیارەکان سـوودی لـێ وەربگـرن ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ﴾ وڕاو(نێچیـری)
کێـوی و ووشـکایی یاسـاغ کـراوە لێتـان ﴿مَا دُمْتُمْ حُرُمًاۗ﴾ تـا لـە ئیحرامـدا بـن ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ﴾ لە
(بێفەرمانی) ئەو خوایە بترسن کە﴿إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ هەر بۆ لای ئەو کۆدەکرێنەوە (لە ڕۆژی دوایی دا) ﴿٩٦﴾
﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ﴾ خـوا کەعبـە کـە (بیت الحـرام)ە دایـنـاوە تاوەکـو (جێگای) ﴿قِيَٰمًا
لِّلنَّاسِ﴾ ڕاوەسـتانی کاروبـاری دین ودونیای خەڵکی بێـت ﴿وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَۚ﴾ وە هەروەها
مانگـە یاسـاغەکان (کـە جەنـگ تێیانـدا حەرامـە)و قوربانیـە دیـاری نەکـراوەکان و قوربانیـە دیـاری
کراوەکانیشی داناوە﴿ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئەوەش بۆ ئەوەی کە بزانن بەڕاستی خوا ﴿يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى
ٱلْأَرْضِ﴾ ئەزانێت و بە ئاگایە کە چی وا لە ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ وە بێگومان
خوا بە هەموو شـتێك زانایە ﴿٩٧﴾ ﴿ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ باش بزانن کە بەڕاسـتی خوا تۆڵەی زۆر
بـە تینە (بۆ یاخیان) ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وە بەڕاسـتی خوا لێبـووردەی میهرەبانە (بۆ تۆ بەکاران) ﴿٩٨﴾
﴿مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُۗ﴾ نێردراوەکەی خوا (موحەممەد ﷺ)هیچی لەسـەر نی یە بێجگە لە ڕاگەیاندن
نەبێـت ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ﴾ وە خـوا دەزانێـت بەوەی دەری دەخەن بەوەش دەیشـارنەوە ﴿٩٩﴾
﴿قُل لَّا يَسْتَوِى ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ پیـس و پـاك وەك یـەك نیـن ﴿وَلَوْ أَعْجَبَكَ﴾
هەرچەنـد سەرسـامت بـکات ﴿كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِۚ﴾ زۆری پیسـەکە ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ کەواتـە لەخوا بترسـن
﴿يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ ئەی خاوەنانی ژیری و هۆشمەندان ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ تا ڕزگار ببن ﴿١٠٠﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟﴾ ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە﴿لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ﴾ پرسـیار مەکـەن لـە شـتانێك ﴿إِن تُبْدَ لَكُمْ
تَسُؤْكُمْ﴾ ئەگەر ئاشـکرا بکرێن بۆتان ناخۆش و خراپ دەبێت بۆتان﴿وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا﴾ وە ئەگەر پرسیار
بکـەن دەربارەیـان ﴿حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ﴾ کاتێك قورئـان دەنێردرێتە خوارەوە، بۆتان ئاشـکرا
دەکرێـن ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَاۗ﴾ خـوا خۆش بـووە لەو پرسـیارانەی لەوە و پێش ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ وە خوا
زۆر لێبـووردەی لەسـەرخۆیە ﴿١٠١﴾ ﴿قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ﴾ بێگومـان ئـەو (جـۆرە) پرسـیارانەیان کـرد کۆمەڵێك
﴿مِّن قَبْلِكُمْ﴾ پێش ئێوە﴿ثُمَّ أَصْبَحُوا۟ بِهَا كَٰفِرِينَ﴾ پاشان بێ بڕوا بوون بەهۆی ئەو پرسیارانەوە. ﴿١٠٢﴾ ﴿مَا جَعَلَ
ٱللَّهُ﴾ خـوا دای نەنـاوە و بڕیاری نـەداوە (بۆ بتپەرسـت وهاوەڵدانەران کە حەرامی بکەن لەسـەرخۆیان
وجێـی بهێڵن بـۆ بتەکانیان وسـوودیان لـێ وەرنەگرن) ﴿مِنۢ بَحِيرَةٍ﴾ لەبەحیـرە: (ووشـترێك بوو پێنج
سـکی بکردایەو پێنجەم نێر بوایە، ئەو کاتە گوێچکەیـان لەت دەکرد و بەرەڵایان دەکرد) ﴿وَلَا سَآئِبَةٍ﴾
و سـائیبە: (ووشـترێك بوو کە دە تا دوانزە سـکی بکردایە هەموو مێینە بوایە) ﴿وَلَا وَصِيلَةٍ﴾ و وەصیلە:
(ووشـترێك بوو یەکەم و دووەم سـکی مێینە بوایە) ﴿وَلَا حَامٍ﴾ و حام: (ووشترێکی نێر بوو کە لە پشتی
ئەو دە سـك پەیدا ببوایە) ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بەڵام ئەوانەی بێ باوەڕبوون ﴿يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَۖ﴾ درۆ
بە دەم خواوە هەڵئەبەستن ﴿وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ و زۆربەیان ژیر نین (نەزانن) ﴿١٠٣﴾

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ﴾ وەکاتێك کە بووترێ پێ یان وەرن ﴿إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ بۆ لای ئەو قورئانەی کە خوا
ناردویەتیە خوارەوە ﴿وَإِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ و بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ﴿قَالُواْ حَسْبُنَا﴾ دەڵێن بەسمانە ﴿مَا وَجَدْنَا
عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ﴾ ئەو(ئاینەی) کەباوك و باپیرانمان لەسەری بوون ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ﴾ ئایا(چاویان
لێ دەکەن) ئەگەر لە حاڵێکدا باو باپیرانیشیان ﴿لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾ هیچ شتێکیان نەزانیبێ
وگومڕابووبن ﴿١٠٤﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ هۆشتان
بەخۆتانەوە بێت ﴿لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ﴾ زیانتان پێ ناگەیەنێت ئەوەی گومڕا بووە ﴿إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ﴾ ئەگەر
ئێوە لەسەر ڕێی ڕاست بن (بەرگری کردن لەخراپە بەشێکە لە ڕێنموونی وەرگرتن) ﴿إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ
جَمِيعًا﴾ هەر بۆلای خوایە گەڕانەوەی هەمووتان بە گشتی ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەمجا هەواڵتان
پێ ئەدا بەهەر کردەوەیەك کە کردووتانە ﴿١٠٥﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿شَهَٰدَةُ
بَيْنِكُمْ﴾ شایەتی بدەن لە نێوانتاندا ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ﴾ کاتێك کەمردنی هەرکامتان نزیك بوویەوە
﴿حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ﴾ لەکاتی وەسیەت کردنتاندا ﴿ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ دوو کەسی دادپەروەر لەخۆتان
(موسوڵمان بن) ﴿أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ﴾ یان دووکەسی تر جگەلە خۆتان (کافربن) ﴿إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾
ئەگەر ئێوە بەسەفەر ڕۆشتبوون بە وولاتدا ﴿فَأَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ و بەڵای مردنتان تووش هات
﴿تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ (دوو شایەتەکە) ڕاگرن لەپاش نوێژ (ی عەسر) ﴿فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ﴾ دەبێ سوێند
بخۆن بەخوا ﴿إِنِ ٱرْتَبْتُمْ﴾ ئەگەر گومانتان بوو (لە ڕاستی و پاکی یان) ﴿لَا نَشْتَرِى بِهِۦ ثَمَنًا﴾ ئێمە(سوێند
خواردنمان) بەخوا ناگۆڕینەوە بەهیچ نرخێك ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ﴾ باشایەتی بۆدراوەکە خزم و نزیکیش بێت
﴿وَلَا نَكْتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ﴾ وە شایەتی (دان بۆ) خوا ناشارینەوە ﴿إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْءَاثِمِينَ﴾ بێگومان (ئەگەر شایەتییەکەمان
شاردەوە) کەواتە بەڕاستی لە گوناهباران دەبین ﴿١٠٦﴾ ﴿فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ﴾ ئەمجا ئەگەر زانرا (پاش سوێند خواردنیان)
بەوەی ﴿أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا﴾ کەئەو دوو شایەتە درۆیان کردوەو خۆیان تاوان بارکردووە ﴿فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ
مَقَامَهُمَا﴾ ئەوە دووکەسی تر لە شوێنی ئەواندا هەڵدەستن (بەسوێند خواردن) ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَٰنِ﴾
لەوانەی کەشیاوو نزیکتربن (لەمردووەکە) لەو دووانە ﴿فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ﴾ ئەمجا هەردووکیان سوێند بخۆن
بە خوا ﴿لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا﴾ کەبەڕاستی شایەتیەکەی ئێمە ڕاستترە لە شایەتیەکەی ئەو دووانەی
پێشوو ﴿وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ﴾ وە لەڕاستی لامان نەداوە (لەسوێند خواردنەکەماندا) ﴿إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومان
(ئەگەر لابدەین) ئەوکاتە ئێمە لەستەمکاران دەبین ﴿١٠٧﴾ ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ﴾ ئەو(جۆرە شایەتی دانە) نزیکترە ﴿أَن
يَأْتُواْ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ﴾ کە شایەتەکان هەڵسن بە شایەتیەکەیان بەشێوە ڕاستەکەی ﴿أَوْ يَخَافُوٓاْ أَن تُرَدَّ أَيْمَٰنٌۢ﴾
یابترسن لە ڕەدکردنەوەی سوێندەکان (بۆخزمی نزیکی مردووەکە) ﴿بَعْدَ أَيْمَٰنِهِمْ﴾ دوای سوێند خواردنی
ئەمان (واتە بە درۆ بخرێنەوە) ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱسْمَعُواْ﴾ بترسن لە خوا و خۆتان بپارێزن و گوێڕایەڵی فەرمانی خوا
بن ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ خوا ڕێنموونی کۆمەڵی لەسنوور دەرچوو ناکات ﴿١٠٨﴾

﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ﴾ لە ڕۆژێك (بترسن) خوا هەموو پێغەمبەران کۆدەکاتەوە ﴿فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ﴾
ئەوسا پێیان دەفەرموێت چ وەڵامێکتان درایەوە؟ ﴿قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآۖ﴾ دەڵێن هیچ زانیارییەکمان نییە
﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ﴾ بێگومان تەنها تۆ ئاگاداری هەموو نهێنیەکانیت ﴿١٠٩﴾ ﴿إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ﴾
(بیر بکەرەوە) کاتێك خوا بە عیسای کوڕی مەریەمی فەرموو ﴿ٱذۡكُرۡ نِعۡمَتِي عَلَيۡكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ﴾
بیربکەرەوەلەچاکەوبەهرەی من بەسەر خۆت و دایکتەوە ﴿إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ﴾ کاتێك کە پشتیوانیم
لێ کردیت بە گیانی هەرە پیرۆز (جوبرەئیل) ﴿تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗاۖ﴾ کاتێ لەبێشکەدا
بوویت و بە گەورەییش قسەت لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد ﴿وَإِذۡ عَلَّمۡتُكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ
وَٱلۡإِنجِيلَۖ﴾ وە کاتێکیش فێری کتێب (ونووسین) و حیکمەت و تەورات و ئینجیلم کردیت ﴿وَإِذۡ
تَخۡلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ بِإِذۡنِي فَتَنفُخُ فِيهَا﴾ وەبیربکەرەوە کاتێك بەفەرمانی من لەقوڕ شتێکت
لە شێوەی باڵندە دروست دەکرد ﴿فَتَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِيۖ﴾ دەست بەجێ بەفەرمانی من ئەبوو بە باڵندە
﴿وَتُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ بِإِذۡنِيۖ﴾ وە بەفەرمانی من کوێری زکماك و بەڵەکیت چاك دەکردەوە
﴿وَإِذۡ تُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِيۖ﴾ وەکاتێ بەفەرمانی من مردووانت لە گۆڕ دەردەهێنا (بەزیندوو کراوەیی)
﴿وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ﴾ وە بیربکەرەوە کاتێك بەرگری نەوەکانی ئیسرائیلم کردلێت
(بتکوژن) ﴿إِذۡ جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ کاتێکیش موعجیزە ڕوونەکانت بۆهێنان ﴿فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
مِنۡهُمۡ﴾ جا ئەوانەیان کە بێ باوەڕبوون ووتیان ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾ بەڕاستی ئەمە هیچ نی یە
جگەلە جادوویەکی ئاشکرا نەبێت ﴿١١٠﴾ ﴿وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ﴾ وە (بیربکەرەوە) کاتێك خستمە
دڵی هاوەڵە تایبەتیەکانت ﴿أَنۡ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي﴾ کەبڕوا بێنن بە من و بە پێغەمبەرەکەم (عیسی)
﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ﴾ ئەوانیش ووتیان: ئەوا بڕوامان هێنا و تۆش شایەت بە کە
بێگومان ئێمە موسڵمانین ﴿١١١﴾ ﴿إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ﴾ کاتێك حەواریەکان ووتیان: ئەی
عیسای کوڕی مەریەم ﴿هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ﴾ ئایا پەروەردگاری تۆ دەتوانێت ﴿أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ
ٱلسَّمَآءِۖ﴾ لەئاسمانەوە خوانێکمان بۆ بنێرێتە خوارەوە ﴿قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ (عیسا) ووتی لەخوا بترسن
﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕدارن ﴿١١٢﴾ ﴿قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا﴾ (حەواریەکان) ووتیان
دەمانەوێت لێی بخۆین ﴿وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا﴾ ودڵمان ئارام بێ و دڵنیابین (کەپێغەمبەریت) ﴿وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ
صَدَقۡتَنَا﴾ وەبزانین کە بێگومان ڕاستت لەگەڵ کردوین (لەوەی کەپێت ڕاگەیاندین) ﴿وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ
ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ ئێمەش ببین بەشایەت لەسەری (بۆئەوانەی ئامادەنین) ﴿١١٣﴾

﴿قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ﴾ عیسای کوڕی مەریەم فەرمووی ﴿اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِّنَ السَّمَاءِ﴾ ئەی
خوای پەروەردگارمان لەئاسمانەوە خوانێکمان بۆ بنێرە خوارەوە ﴿تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا﴾ تا
ببێت بە جەژن بۆ ئێستامان و نەوەکانی داهاتووشمان ﴿وَآيَةً مِّنكَ﴾ وەموعجیزە و بەڵگەیەك بێت
لەلایەن تۆوە ﴿وَارْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ وە ڕزق و ڕۆزیمان پێ ببەخشە چونکە تۆ باشترینی هەموو
ڕۆزی دەرانی (١١٤) ﴿قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ﴾ خوای گەورە فەرموی: بە ڕاستی من ئەو خوانە دەنێرمە
خوارەوە بۆتان ﴿فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ﴾ ئەمجا هەر کەس لەئێوە بێ بڕوا و نا سوپاس بێت لە پاش ئەوە
﴿فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا﴾ ئەوە بێگومان سزایەکی ئەدەم ﴿لَّا أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِّنَ الْعَالَمِينَ﴾ کە سزای هیچ کەسی پێ
نادەم لەجیهانیان (١١٥) ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ﴾ وە(بیر بکەرەوە) کاتێك خوا دەفەرمووێ (لەڕۆژی
دواییدا) ئەی عیسای کوڕی مەریەم ﴿أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ﴾ ئایا تۆ ووتووتە بە خەڵکی ﴿اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ
إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ کەمن و دایکم بەدوو پەرستراو دابنێن (وبمانپەرستن) لەجیاتی خوا؟ ﴿قَالَ
سُبْحَانَكَ﴾ (عیسای) ووتی: پاك و بێگەردی بۆ تۆ ئەی خوایە ﴿مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ﴾ نابێت و
ناگونجێت بۆ من شتێك بڵێم کە بە هیچ شێوەیەك مافی من نی یە ﴿إِن كُنتُ قُلْتُهُ﴾ ئەگەر من ئەو قسەیەم
کردبێت ﴿فَقَدْ عَلِمْتَهُ﴾ ئەوە بەڕاستی تۆ ئاگات لێ یە ﴿تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي﴾ چونکە تۆ ئەوەی لە نەفسم دایە
دەیزانی ﴿وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ﴾ بەڵام من نازانم و بێ ئاگام لەوەی کە لەنەفسی تۆدایە ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّامُ
الْغُيُوبِ﴾ بەڕاستی تەنها تۆ زانای تەواوی بە هەموو نهێنی یەك (١١٦) ﴿مَا قُلْتُ لَهُمْ﴾ هیچم پێ نەوتوون
﴿إِلَّا مَا أَمَرْتَنِي بِهِ﴾ بێجگە لەوە نەبێت کە تۆ فەرمانت پێ کردووم ﴿أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ﴾ کە بەندایەتی
خوا بکەن کەپەروەردگاری من و ئێوەیشە ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ﴾ و من شایەت و چاودێر
بووم بە سەریانەوە تا لە ناویاندا بووم ﴿فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي﴾ ئەمجا کاتێك تۆ منت بردەوە (و بەرزت کردمەوە
بۆ ئاسمان) ﴿كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ﴾ هەر خۆت چاودێر بووی بەسەریانەوە ﴿وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾
وەخۆت ئاگادار و شایەتی بەسەر هەموو شتێکەوە (١١٧) ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ﴾ ئەگەر سزایان
بدەیت، ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن ﴿وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ﴾ وەئەگەر لێشیان خۆش ببی ﴿فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ
الْحَكِيمُ﴾ ئەوە بێگومان تەنها خۆتی بەدەستەڵاتی کاردروست (١١٨) ﴿قَالَ اللَّهُ﴾ خوای گەورە فەرمووی:
﴿هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ﴾ ئەمە ڕۆژێکە ڕاستبێژان ڕاستیەکەیان کەڵکیان پێدەگەیەنێ ﴿لَهُمْ
جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ بەهەشتانێکیان بۆ هەیە کە ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕۆن ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾
ئەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی ﴿رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ خوا ڕازی بووە لێیان و ئەوانیش لە خوا ڕازی
بوون ﴿ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە (١١٩) ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ هەر بۆ خوایە
خاوەنداریتی ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَمَا فِيهِنَّ﴾ و هەرچیشیان تێدایە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ وە تەنها
ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانا و دەسەڵاتدارە (١٢٠)

## سورەتی ﴿الأنعام﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشەندەی میهرەبان

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ هەموو سوپاس و ستایشێ هەربۆ ئەو خوایەی ئاسمانەکان و
زەوی دروستکردووە ﴿وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ﴾ وە تاریکی یەکان و ڕووناکی داناوە ﴿ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا
بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾ ئەمجا ئەوانەی بێ باوەڕ بوون هاوتا و هاوبەش بۆ پەروەردگاریان بڕیار دەدەن
﴿١﴾ ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ﴾ خوا ئەو زاتەیە کەئێوەی لەقوڕ دروست کردووە ﴿ثُمَّ قَضَىٰ أَجَلًا﴾
پاشان کاتێکی دیاری کردووە(بۆ مردن) ﴿وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُ﴾ وە کاتێکی دیاری کراویش
لای خوای گەورە دانراوە (بۆ قیامەت) ﴿ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ﴾ کەچی دوا ئەوەش ئێوە بەگومانن ﴿٢﴾
﴿وَهُوَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الْأَرْضِ﴾ وەتەنها ئەو خوایە (بالادەست و پەرستراوە) لەئاسمانەکان
ولەزەویدا ﴿يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ﴾ نهێنی و ئاشکراتان دەزانێ و بە هەموو کردەوەیەکیش
کەدەیکەن ئاگادارە ﴿٣﴾ ﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ آيَةٍ مِّنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ﴾ وە هەر بەڵگەو نیشانەیەك لەبەڵگە
ونیشانەکانی پەروەردگاریان بۆ بێت ﴿إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ ئەوان ڕووی لێ وەردەگێڕن ﴿٤﴾
﴿فَقَدْ كَذَّبُوا بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ﴾ بەڕاستی کاتێك قورئانیان بۆ هات بە درۆیان دانا ﴿فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ﴾
جا لەمەو پاش بۆیان دێت ﴿أَنبَاءُ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ هەواڵی ئەو شتانەی کەئەوان گاڵتەیان
پێدەکرد ﴿٥﴾ ﴿أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ﴾ ئایا نەیان دیوە (نەیان زانیوە) لەپێش ئەوانەوە چەند
گەل و نەوەمان لەناو بردووە ﴿مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ﴾ دەسەلاتمان پێدا بوون لەزەویدا ﴿مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ﴾
بەشێوەیەك کە بە ئێوەمان نەدابوو ﴿وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا﴾ و بارانی پەیتاپەیتامان بەسەردا باراندن
﴿وَجَعَلْنَا الْأَنْهَارَ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ﴾ وە جۆگەو ڕووبارەکانمان والێ کرد بوو کە بەبن باخ و کۆشکەکانیاندا
دەڕۆیشت ﴿فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ﴾ لەناو مان بردن بە هۆی گوناهەکانیانەوە ﴿وَأَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ﴾ وە لە دوای
ئەوان دروستمان کرد ﴿قَرْنًا آخَرِينَ﴾ گەل و نەوەیەکی تر ﴿٦﴾ ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَابًا﴾ وە ئەگەر نامەیەکی
نوسراومان بناردایەتەخوارەوە بۆت ﴿فِي قِرْطَاسٍ﴾ لەناو کاغەزێکدا بوایە ﴿فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ﴾ و دەستیشیان
لێ بدایە ﴿لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بێگومان ئەوانەی بێ باوەڕ بوون دەیان ووت ﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾
ئەمە تەنها جادوویەکی ئاشکرایە ﴿٧﴾ ﴿وَقَالُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ﴾ وە دەیان ووت: بۆچی فریشتەیەك
نەنێرراوەتە خوارەوە بۆسەری (بیبینین) ﴿وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا﴾ ئەگەر فریشتەیەکمان بناردایەتە خوارەوە
﴿لَّقُضِيَ الْأَمْرُ﴾ بێگومان کارتەواو دەبوو (لەناو بردنیان جێ بەجێ دەکرا) ﴿ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ﴾ پاشان
مۆڵەت نەئەدران ﴿٨﴾

﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا﴾ ئەگـەر ئەو (پێغەمبەرە) مـان بكردایە بەفریشـتەیەك ﴿لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا﴾ بێگومان
دەمانگـۆڕا بە وێنەی پیاوێك (تابیبینن وقسـەی لەگـەڵ بكەن) ﴿وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ﴾ و بێگومان
لێمان دەشـێواندن وەك چۆن خۆیان لە خۆیان دەشـێواند ﴿٩﴾ ﴿وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ سـوێندبێ
بێگومان گاڵتە كراوە بە پێغەمبەرانی پێش تۆیش ﴿فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم﴾ سەرئەنجام بۆ ئەوانەیان
گاڵتەیـان دەكرد دابـەزی و دەوری دان ﴿مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ تۆڵەی ئـەوەی گاڵتەیان پێدەكرد
(لەسـزای سـەخت) ﴿١٠﴾ ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ (ئەی موحەممـەد ﷺ) بڵێ بـڕۆن و بگەڕێن بە زەویدا
﴿ثُمَّ ٱنظُرُوا۟﴾ پاشان سەرنج بدەن ﴿كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ﴾ سەر ئەنجامی ئەوانەی بەڵگەكانی
خوایان بەدرۆ دادەنا چۆن بووە ﴿١١﴾ ﴿قُل لِّمَن مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا هی
كێ یە ئەوەی لە ئاسمانەكان و زەویدایە ﴿قُل لِّلَّهِ كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾ بڵێ تەنها بۆ خوایە كە بەزەیی و
میهرەبانی پێویستی كردوە لەسەرخۆی ﴿لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ سوێند بەخوا بێگومان كۆتان
دەكاتەوە لە ڕۆژی دوایی دا ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ كە هیچ گومان و دوودڵی تێدانی یە ﴿ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ﴾
ئەوانەی خۆیان دۆڕاندووە ﴿فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوە ئەوانن كە بڕوا ناهێنن ﴿١٢﴾ ﴿وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِى ٱلَّيْلِ
وَٱلنَّهَارِ﴾ وە هـەر بـۆ خوایە ئەوەی ئارامی گرتووە لەشـەو و ڕۆژدا ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ وە هەر ئەو
بیسـەری زانایە ﴿١٣﴾ ﴿قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا؟ بێجگە لە خوا دۆسـت
و پەرسـتراوێ تر بۆخۆم دانێم؟ ﴿فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ كەئەو بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوییە
﴿وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ﴾ ئەو خوایە ڕۆزی دەدات و ڕۆزی پێ نادرێ ﴿قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ﴾ بڵێ بەڕاسـتی من
فەرمانـم پـێ دراوە ﴿أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ﴾ كە یەكەم كەس بم مل كەچ كەم (بۆ فەرمانی خوا) ﴿وَلَا
تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ وە (فەرمانـم پێدراوە لەلایەن خـوداوە) هەرگیز لەهاوبەش دانەران مەبە ﴿١٤﴾ ﴿قُلْ
إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى﴾ پێیان بڵێ: بێگومان من دەترسم ئەگەر سەرپێچی لە فەرمانی پەروەردگارم
بكـەم ﴿عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ لـە سـزای ڕۆژێكـی گـەورە ﴿١٥﴾ ﴿مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ﴾ هەركـەس ئـەو
سـزایەی لـێ لادرێ لەو ڕۆژەدا ﴿فَقَدْ رَحِمَهُۥ﴾ ئـەوە بێگومان خوا بەزەیـی پێدا هاتۆتەوە ﴿وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ
ٱلْمُبِينُ﴾ و ئەوەیە سـەركەوتنی ئاشـكراو تەواو ﴿١٦﴾ ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ﴾ وە ئەگەر خوا دووچاری
بـەڵاو زیانێكـت بـكات ﴿فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ﴾ ئـەوە جگـە ئـەو (خوا) كـەس نی یـە بتوانـێ لایبات
﴿وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ﴾ وە ئەگـەر خێر و خۆشیەكیشـت پـێ بگەیەنێت ﴿فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەوە
خودا دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێكدا ﴿١٧﴾ ﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ﴾ وە هەر ئەوە دەست ڕۆیشتوو
زاڵە بەسەر بەندەكانیدا ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾ هەر ئەوەیش كار دروستی ئاگادارە ﴿١٨﴾

﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ: شـایەتی دانی کـێ لە هەموو شـایەتی دانێـك گەورەترە
(لەسـەر پێغەمبەرێتـی مـن) ﴿قُلِ اللَّهُ﴾ بڵێ: خوا گەورەترین ﴿شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ شـایەتە لە نێـوان من و ئێوەدا
﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا الْقُرْآنُ﴾ وە ئـەم قورئانە سـرووش (وەحی) کراوە بۆ مـن ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ﴾ بۆ ئەوەی ئێوەی
پـێ بترسـێنم و هەر کەسـێکی کـەش کە پـێ ی دەگات ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ﴾ ئایا بەڕاسـتی ئێوە شـایەتی
ئـەدەن بـە دڵنیاییەوە کە لەگەڵ خوادا ﴿آلِهَةً أُخْرَىٰ﴾ چەند پەرسـتراوێکی تـر هەبێ؟! ﴿قُل لَّا أَشْهَدُ﴾ بڵێ: من
شایەتی (وا ناڕەوا) نادەم ﴿قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ بڵێ: بێگومان هەر ئەو پەرستراوی تاك و تەنهایە ﴿وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا
تُشْرِكُونَ﴾ وە بەڕاسـتی من بەریم لەوەی کە ئێوە دەیکەنە هاوبەش بۆ خوا ﴿١٩﴾ ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ﴾ ئەوانەی کە
نامەمان پێ بەخشین (لەگاورو جولەکەکان) ﴿يَعْرِفُونَهُ﴾ ئەم پێغەمبەرە دەناسن (کە پێغەمبەری خوایە بەهۆی
باسکردنی نیشانەکانی لەتەورات و ئینجیل دا) ﴿كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمُ﴾ وەك چۆن کوڕەکانیان ئەناسن ﴿الَّذِينَ خَسِرُوا
أَنفُسَهُمْ﴾ ئەوانـەی خۆیـان دۆڕانـدو خەسـارۆمەند کـرد ﴿فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئـەوە ئەوانـن بـڕوا ناهێنـن ﴿٢٠﴾
﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ کێ ستەم کارترە لەو کەسەی درۆ هەڵبەستێ بەدەم خواوە ﴿أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ﴾ یا بێ
باوەڕ بوو بێ بە ئایەتاکانی (بەڵگەکانی) خوا ﴿إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ بەڕاسـتی ستەم کاران ڕزگاریان نابێت ﴿٢١﴾
﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ وە ڕۆژێ هەموویان کۆ دەکەینەوە (لەقیامەتدا) ﴿ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾ پاشان ئەڵێین بەوانەی
هاوەڵیـان بـۆ خـوا دانابوو ﴿أَيْنَ شُرَكَاؤُكُمُ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ کـوان ئەوهاوەڵانەی کە بـە خەیاڵی خۆتـان بەهاوەڵی
خواتـان دانابوون ﴿٢٢﴾ ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّا﴾ پاشـان بەهانەیان هیچ نەبـوو بێجگە لەوەی ﴿أَن قَالُوا وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا
مُشْرِكِينَ﴾ کە ووتیان سوێند بە خوای پەروەردگارمان ئێمە بەهیچ جۆرێك هاوبەش دانەر نەبووین بۆخوا ﴿٢٣﴾
﴿انظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ﴾ سەیرکە چۆن درۆ لە دژی خۆشیان دەکەن ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ و لێیان وون
بوون ئەو بتانەی خۆیان بە درۆ هەڵیان بەستبوون ﴿٢٤﴾ ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ﴾ وە لەو (کافرانە) کەسانێ هەیە کە
گوێت بۆ دەگرن کەقورئان دەخوێنی ﴿وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً﴾ بەڵام ئێمە (بەهۆی تاوان گوناەو هاوەڵدانانیانەوە)
چەند پەردەیەکمان داوە بەسـەر دڵەکانیانـدا ﴿أَن يَفْقَهُوهُ﴾ بۆ ئەوەی تێ ی نەگەن ﴿وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا﴾ وە کەڕی
و گـوێ گرانیمـان خسـتۆتە نـاو گوێچکەیانـەوە ﴿وَإِن يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا بِهَا﴾ وە ئەگـەر هەمـوو بەڵگە و
نیشانەیەکی ڕوون ببینن بڕوای پێ ناهێنن ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوكَ يُجَادِلُونَكَ﴾ تا ئەو ڕادەیە کاتێ بێن بۆ لات دەمە دەمێ
و بەربەرەکانیـت لەگەڵ دەکەن ﴿يَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوانەی بێ باوەڕن ئەڵێن ﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾ ئەم
قورئانەهیچ نی یە بێجگەلەئەفسانەی پێشینان ﴿٢٥﴾ ﴿وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ﴾ ئەوان بەرگری (خەڵك) ئەکەن لەو (قورئانە)
﴿وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ﴾ و خۆشـیان لێـی دوور دەکەنـەوە ﴿وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّا أَنفُسَهُمْ﴾ هیـچ کەسـیش لـە نـاو نابـەن
خۆیـان نەبـێ ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ و هەسـتیش ناکـەن (کەلەچـی خەسـارۆمەندیەکدان) ﴿٢٦﴾ ﴿وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ وُقِفُوا عَلَى
النَّارِ﴾ وە ئەگـەر بیـان بینیـت کاتێك کە لەسـەر قەراغـی دۆزەخ وە سـتێنراوون ﴿فَقَالُوا يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ﴾ کە دەڵێن
خۆزگـە دەگەڕێنراینـەوە بـۆ دونیـا ﴿وَلَا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا﴾ و بەڵگەکانـی پەروەردگارمـان بـەدرۆ نەدەزانـی
﴿وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ وە لە بڕواداران ئەبووین ﴿٢٧﴾

﴿بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ﴾ (نەخێر بەڕاستیان نی یە) بەڵکو ئەوەی کە لەوەو پێش دەیانشاردەوە
بۆیان دەرکەوتووە ﴿وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ﴾ وەئەگەر بگەڕێنرێنەوە (بۆ دونیا) بێگومان دووبارە
دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی کەلێیان قەدەغە کرابوو ﴿وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ وەبەڕاستی ئەوانە درۆزنن (٢٨)
﴿وَقَالُوٓاْ إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا﴾ وە ووتیان بەڕاستی هەر ئەم ژیانە (ی دونیا) مانە ﴿وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ﴾
وئێمە زیندوو ناکرێینەوە (٢٩) ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ﴾ وەئەگەر ئەوانە دەبینی ئەوکاتەی کەلەحزووری
پەروەردگاریاندا وەستێنراوون ﴿قَالَ أَلَيۡسَ هَٰذَا بِٱلۡحَقِّۚ﴾ (پەروەردگار) دەفەرموێ ئایا ئەمە ڕاست نییە؟
﴿قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ﴾ ئەڵێن: بەڵێ ڕاستە سوێند بە پەروەردگارمان ﴿قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ﴾ دەفەرموێ دەی
بچەژن ئەو سزایە ﴿بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ﴾ بە هۆی ئەوەی کەبڕواتان نەهێناوە (ئینکارتان دەکرد) (٣٠)
﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِۖ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە دیداری پەروەردگاریان بە درۆ دەزانی زەرەریان
کرد ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةً﴾ هەتا کاتێ لەناکاو ڕۆژی دوایی یان بەسەردا دێت ﴿قَالُواْ يَٰحَسۡرَتَنَا عَلَىٰ
مَا فَرَّطۡنَا فِيهَا﴾ ئەڵێن ئای داخ و پەشیمانی سەخت بۆ ئێمە چەند کەم تەرخەمیمان کردلە دونیادا و
لەدەستمان چوو ﴿وَهُمۡ يَحۡمِلُونَ أَوۡزَارَهُمۡ عَلَىٰ ظُهُورِهِمۡۚ﴾ لەکاتێکدا تاوانەکانیان هەڵگرتووە بەکۆڵیانەوەیە
﴿أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ﴾ ئای چەند بەدو خراپە ئەو بارەگرانەی هەڵی دەگرن (٣١) ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ
إِلَّا لَعِبٞ وَلَهۡوٞۖ﴾ وەژیانی دونیا هیچ نیە بێجگە گاڵتە و سەرقاڵیی نەبێ ﴿وَلَلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ﴾
وە بێگومان ماڵی دوا ڕۆژ چاکترە بۆئەوانەی خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی
ئایا بۆ ژیرنابن (٣٢) ﴿قَدۡ نَعۡلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحۡزُنُكَ ٱلَّذِي يَقُولُونَۖ﴾ بەڕاستی ئێمە دەزانین کەبێگومان ئەوەی
کەئەوان دەیلێن غەمبارت دەکات ﴿فَإِنَّهُمۡ لَا يُكَذِّبُونَكَ﴾ بەلام بێگومان ئەوان تۆ بەدرۆزن دانانێن
﴿وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەڵکو ئەو ستەم کارانەئایەتەکانی خوا ﴿يَجۡحَدُونَ﴾ ئینکار دەکەن (وبەدرۆی
دەزانن) (٣٣) ﴿وَلَقَدۡ كُذِّبَتۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ﴾ سوێندبەخوابێگومان پێغەمبەرانی پێش تۆش (ئەی موحەممەد
ﷺ) باوەڕیان پێ نەکراوە ﴿فَصَبَرُواْ عَلَىٰ مَا كُذِّبُواْ﴾ بەلام ئارامیان گرت لەسەر ئەو باوەڕ پێ نەکرانەیان
﴿وَأُوذُواْ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمۡ نَصۡرُنَاۚ﴾ وە ئەزیەت و ئازار دران تا یارمەتی و سەرخستنی ئێمەیان بۆ هات
﴿وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ﴾ وەفەرمانەکانی (بەڵێنەکانی) خوا بەهیچ کەسێك ناگۆڕدرێ ﴿وَلَقَدۡ جَآءَكَ مِن نَّبَإِيْ
ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ سوێند بێت بێگومان هەواڵی هەندێ لەو پێغەمبەرانەت بۆ هاتووە (٣٤) ﴿وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكَ
إِعۡرَاضُهُمۡ﴾ خۆ هەرچەند ڕوو وەرگێڕانی ئەوانە سەخت و گرانە لەسەرت ﴿فَإِنِ ٱسۡتَطَعۡتَ﴾ جا ئەگەر
توانیت ﴿أَن تَبۡتَغِيَ نَفَقٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بە ناخی زەویدا تونێلێك لێ دەیت ﴿أَوۡ سُلَّمٗا فِي ٱلسَّمَآءِ فَتَأۡتِيَهُم بِـَٔايَةٖۚ﴾ یان
پەیژەیەك بۆ ئاسمان دا نێیت بەهۆیەوە بەڵگەیەکیان بۆ بهێنی ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمۡ عَلَى ٱلۡهُدَىٰۚ﴾ وە
ئەگەر خوا بیویستایە ئەوانەی کۆدەکردەوە لەسەر ڕێنموونی و بڕوا هێنان ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾
کەواتە هەرگیز لەوانە مەبە کە نەزانن (٣٥)

﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ﴾ بەڕاستی تەنها ئەوانە وەڵامی تۆ ئەدەنەوە کە(بەدڵ) ئەبیسن ﴿وَٱلْمَوْتَىٰ
يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ﴾ مردووەکانیش (ئەوانەی باوەڕ ناهێنن) خوا زیندوویان دەکاتەوە ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾
پاشان هەر بۆلای خۆی دەگەڕێنەوە (٣٦) ﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ ووتیان بۆچی لەلایەن
پەروەردگاریەوە موعجیزەیەکی بۆ نەهاتۆتە خوارەوە ﴿قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ﴾ بڵێ بێگومان خوا بە
توانایە ﴿عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً﴾ کە بەڵگە و نیشانەیەك بهێنێتە خوارەوە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام
زۆربەیان نازانن (٣٧) ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ هیچ گەڕۆکێکی گیان لەبەرنی یە لەزەویدا ﴿وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ
بِجَنَاحَيْهِ﴾ وە هیچ باڵندەیەك نی یە کە دەفڕێ بە هەردوو باڵەکەی ﴿إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾ مەگەر ئەوانیش وەك
ئێوە ئومەتانێکن ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَٰبِ مِن شَىْءٍ﴾ هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردووە لەم کتێبەدا (لوح
المحفوظ یا قورئان دا) ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ پاشان ئەوانە (لە ڕۆژی دوایی دا) لای پەروەردگاریان
کۆدەکرێنەوە (٣٨) ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بەبەڵگەکانی ئێمە ﴿صُمٌّ وَبُكْمٌ فِى
ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ کەڕ و لاڵن لەناو تاریکستاندان ﴿مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ﴾ هەرکەس خوا بیەوێ گومڕای
دەکات ﴿وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ هەرکەسیش خوا بیەوێ دەیخاتە سەر ڕێگای ڕاست (٣٩)
﴿قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ هەواڵم پێ بدەن ئەگەر سزای خواتان بۆ
بێت ﴿أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ﴾ یان ڕۆژی دوایی یەخەتان بگرێت ﴿أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ﴾ ئایا هاوار دەکەنە هیچ
شتێك بێجگە لە خوا ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن (٤٠) ﴿بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ﴾ (نەء) بەڵکو
تەنها بانگ و هاوار لەخوا دەکەن ﴿فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ﴾ ئەمجا ئەویش ئەگەر ویستی ئەوەی
هاواری (لە دەست) ئەکەن نایهێڵێ ﴿وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ﴾ و ئەو شتانەتان لەبیر دەچێتەوە کە دەتانکردن
بە هاوبەش بۆ خوا (٤١) ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ سوێند بێت بێگومان ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بۆ
گەلانی پێش تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾ وەتووشی نەبوونی و هەژاری
وەنەخۆشی و ترس و ناڕەحەتیمان کردن ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ﴾ بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە و پەشیمانی
دەرببڕن (لاوازی وکزی بنوێنن) (٤٢) ﴿فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟﴾ دەی بۆ نەپاڕانەوە کاتێك سزای
ئێمەیان بۆهات؟ ﴿وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ بەڵام دڵیان ڕەق بووە ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾
وەشەیتان ئەو کردەوەخراپانەی بۆ ڕازاندبوونەوە کەدەیانکرد (٤٣) ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ﴾ جا
کاتێ لەبیریان چویەوە ئەوەی کە پێی ئامۆژگاری کران ﴿فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ﴾ دەرگای هەموو
شتێکمان لەسەر کردنەوە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟﴾ تاکاتێ دڵخۆش بوون بەوەی پێ یان درابوو
﴿أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾ لە ناکاودا تۆڵەمان لێ سەندن ئیتر ئەوانیش نائومێد و سەرگەردان
بوون (٤٤)

﴿فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟﴾ ئەمجا ئەو گەلەی کە ستەمیان کرد دوا بڕاو کران ﴿وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾
و هەموو سوپاس و ستایشێ هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە ﴿٤٥﴾ ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) بڵێ پێم بڵێن ﴿إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ﴾ ئەگەر خوا هەستی بیستن و بینینتان لێ بسەنێتەوە
﴿وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم﴾ مۆریش بنێ بەسەر دڵەکانتاندا ﴿مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ﴾ چ پەرستراوێك هەیە
بێجگە خوا بۆتان بهێنێتەوە ﴿ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ﴾ تەماشابکە چۆن بەڵگەکان دەگۆڕین و
چەند بارەیان دەکەینەوە ﴿ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ﴾ پاشان ئەوان پشتی تێ دەکەن و ڕوو وەردەگێڕن ﴿٤٦﴾
﴿قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ﴾ ئەی (موحەممەد ﷺ) بڵێ پێم بڵێن ﴿إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً﴾ ئەگەر سزای
خوا لە ناکاو دا یا بە ئاشکرا بێت بۆتان ﴿هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئایا لەناو دەبرێ (بە سزای
خوایی) بێجگە لە کۆمەڵی ستەم کاران نەبێت؟ ﴿٤٧﴾ ﴿وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ وە نێرراوەکانمان نەناردووە
﴿إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ مەگەر بە موژدەدەرو ترسێنەرنەبێت ﴿فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ﴾ جا هەرکەس بڕوای
هێناو کردەوەی چاکی کرد ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ ئەوە هیچ مەترسی یەکیان لەسەر نابێ
و غەمباریش نابن ﴿٤٨﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئەوانەیش بێ بڕوا بوون بە بەڵگەکانی ئێمە ﴿يَمَسُّهُمُ
ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ﴾ بە هۆی دەرچوونیان لە سنوور(ی فەرمانی خوا) سزایان لێ دەکەوێ
و دەیانگرێ ﴿٤٩﴾ ﴿قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ من پێتان ناڵێم
خەزێنەکانی خوا لای منە ﴿وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ﴾ وە شتی نهێنیش نازانم ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ﴾ وە
پێتان ناڵێم بێگومان من فریشتەم ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ﴾ شوێنی هیچ ناکەوم ئەوەنەبێت کە بۆ نیگام
کراوە ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ﴾ بڵێ ئایا کوێر و بینا یەکسانن؟ ﴿أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا بۆ
بیرناکەنەوە؟ ﴿٥٠﴾ ﴿وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ﴾ بەم قورئانە بترسێنە ئەوانەی دەترسن ﴿أَن يُحْشَرُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّهِمْ﴾
(لەوەی کە) کۆبکرێنەوە لای پەروەردگاریان ﴿لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ﴾ لە کاتێکدا بێجگە
لە خوا هیچ یارمەتیدەر و تکا کارێکیان نی یە ﴿لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بەڵکو خۆیان بپارێزن ولەخودا
بترسن ﴿٥١﴾ ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم﴾ وە ئەوانە دەرنەکەیت کە پەروەردگاریان دەپەرستن (وهاواری
لێ دەکەن) ﴿بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ﴾ بەبەیانیان و ئێوارانـدا (ڕەزامەندی) خوایان دەوێ
﴿مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ﴾ و لێپرسینەوەی هیچ شتێکیان لەسەر تۆ نی یە ﴿وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن
شَىْءٍ﴾ وە لێپرسینەوەی هیچ شتێکی تۆش لەسەر ئەوان نی یە ﴿فَتَطْرُدَهُمْ﴾ جا ئەگەر دەریانکەیت
(دور یان خەیتەوە) ﴿فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەوە لەستەمکاران دەبیت ﴿٥٢﴾

﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ﴾ وە بەوجۆرە هەندێکیانمان بەهەندێکی تریان تاقی کردەوە ﴿لِّيَقُولُوا
أَهَٰؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا﴾ بۆ ئەوەی بڵێن ئایا ئەوانە خوا ڕێزو بەهرەی پێ بە خشیوون لە ناو
ئێمەدا؟ ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ﴾ ئایا خوا لە هەموو کەس زاناتر نی یە بەوانەی شوکرانە
بژێرن؟ ﴿٥٣﴾ ﴿وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا﴾ وەکاتێ ئەوانەی کە بڕوایان هەیە بە ئایەتەکانی ئێمە
هاتن بۆلات ﴿فَقُلْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ﴾ ئەوە پێیان بڵێ سڵاوتان لێ بێت ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾
پەروەردگارتان بەزەیی و میهرەبانی لەسەر خۆی پێویست کردووە ﴿أَنَّهُ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوءًا
بِجَهَالَةٍ﴾ بێگومان هەرکەس لە ئێوە کارێکی خراپ بکات بەنەزانی ﴿ثُمَّ تَابَ مِن بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ﴾
پاشان بگەڕێتەوەو تەوبە بکات وخۆی چاك بکات ﴿فَأَنَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوە بەڕاستی خوا لێبوردەی
بەبەزەیی یە ﴿٥٤﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ﴾ ئابەو جۆرە ئایەتەکان ڕوون دەکەینەوە ﴿وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ
الْمُجْرِمِينَ﴾ بۆ ئەوەی ڕێگای تاوانباران ڕوون بێتەوە ﴿٥٥﴾ ﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ﴾ بڵێ: بێگومان من
قەدەغەم لێکراوە لەوەی کەبەندایەتی بکەم بۆ ئەوانەی ﴿تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ ئێوە هاواریان لێدەکەن
و دەیان پەرستن بێجگە لە خوا ﴿قُل لَّا أَتَّبِعُ أَهْوَاءَكُمْ﴾ بڵێ من شوێنی ئارەزووەکانی ئێوە ناکەوم
﴿قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ﴾ ئەگەر وا بکەم بێگومان من گومڕا دەبم وەلە ڕیزی ئەو کەسانەدا
نابم کە ڕێنموونیان وەرگرتووە ﴿٥٦﴾ ﴿قُلْ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي﴾ بڵێ بێگومان من لەسەر بەڵگەیەکی
ئاشکرام کە لەلایەن پەروەردگارمەوەیە ﴿وَكَذَّبْتُم بِهِ﴾ کەچی ئێوە بڕواتان پێ نەهێنا ﴿مَا عِندِي مَا
تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ﴾ ئەو (سزای)ئێوە پەلەی هاتنی دەکەن بە دەست من نی یە ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ فەرمان
ڕەوایی تەنها بۆ خوایە ﴿يَقُصُّ الْحَقَّ﴾ حەق و ڕاستی باسی دەکات ﴿وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ﴾ وە ئەو
چاکترینی بڕیاردەر و جیاکەرەوەیە ﴿٥٧﴾ ﴿قُل لَّوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ﴾ بڵێ ئەگەر لام بوایە ئەوەی
ئێوەپە لە دەکەن لە هاتنی ﴿لَقُضِيَ الْأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ ئەوا کاری نێوان من و ئێوە کۆتایی پێ دەهێنرا
﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِالظَّالِمِينَ﴾ وە خوا چاك ئاگادارە بەستەم کاران ﴿٥٨﴾ ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ﴾ وە کلیلی هەموو
نهێنی یەکان هەرلای خوایە ﴿لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ﴾ کەس نایانزانێت جگە لە (خودا) ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي
الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ وە (خوا) دەزانێ چی لە ووشکانی و دەریادا هەیە ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا﴾ وە
هەر گەڵایەك بکەوێتە خوارەوە خوا پێ ی دەزانێت ﴿وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ﴾ و هەر دانەوێڵەیەك
لە تاریکی یەکانی زەویدا بێت ﴿وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ﴾ و هەر تەڕو ووشکێك هەبێت ﴿إِلَّا فِي كِتَابٍ
مُّبِينٍ﴾ هەر هەموویان لە کتێبی ئاشکرا لە (لوح المحفوظ) دان ﴿٥٩﴾

﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ﴾ وە هەر ئەو خوایەیە کە دەتان خەوێنێت لەشەودا (لێرەدا خەو بەمانای مردن
هاتووە) ﴿وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِالنَّهَارِ﴾ وە ئەشزانێ (لە ڕۆژدا) چ کارێکتان ئەنجام داوە ﴿ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ﴾
پاشـان لە ڕۆژدا لە خەوبێدارتان دەکاتەوە ﴿لِيُقْضَىٰ أَجَلٌ مُّسَمًّى﴾ بۆ ئەوەی تەواو ببێ ماوەی دیاریکراو
(ی هەمووکەسێ) ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ﴾ ئەوسا هـەر بـۆلای ئـەوە گەڕانەوەتـان ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ
تَعْمَلُونَ﴾ پاشـان هەواڵتـان پێ دەدات بەهـەر کردەوەیەك کـە کردوتانە ﴿٦٠﴾ ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ﴾
ئەو (خوا) زاڵ و دەسـە ڵاتدارە بەسەر بەندەکانیدا ﴿وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً﴾ و فریشتانێکتان بۆ دەنێرێت
(کە چاودێر و پارێزەر و نوسەری کردەوەکانتانن) ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ﴾ تاکاتی مردنی یەکێکتان
دێت ﴿تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا﴾ نێرراوەکانمان گیانی دەکێشن ﴿وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ﴾ کەهیچ سستی و کەمتەر خەمی
یـەك ناکـەن (لەکارەکانیانـدا) ﴿٦١﴾ ﴿ثُمَّ رُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلَاهُمُ الْحَقِّ﴾ پاشـان دەگەڕێنرێنـەوە بـۆلای خـوا
کەسـەروەری ڕاسـتەقینە یانە ﴿أَلَا لَهُ الْحُكْمُ﴾ ئاگاداربن فەرمان ڕەوایی و بڕیار هەر بۆئەوە ﴿وَهُوَ أَسْرَعُ
الْحَاسِبِينَ﴾ هـەر خوایشـە لێپرسینەوەی خێراتـرە لـە هەمـوو کـەس ﴿٦٢﴾ ﴿قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَاتِ الْبَرِّ
وَالْبَحْرِ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵێ: ئایا کێ ئێوە ڕزگار دەکات لەتاریکیەکانی ووشکانی و دەریا
﴿تَدْعُونَهُ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً﴾ کە هاوار و نزای لێدەکەن بە ئاشکرا و نهێنی ﴿لَّئِنْ أَنجَانَا مِنْ هَٰذِهِ﴾ (ئەڵێن) سوێند
بە خوا ئەگەر لەم مەترسـی یە ڕزگارمان بکات ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾ ئەوە بێگومان لە سـوپاس کارانی
خوا دەبین ﴿٦٣﴾ ﴿قُلِ اللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا﴾ بڵێ: هەر خوا ئێوە ڕزگار دەکات لەو مەترسی یە ﴿وَمِن كُلِّ كَرْبٍ﴾ و لە
هەموو نارەحەتی و غەم و پەژارەیەك ﴿ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ﴾ (لەگەڵ ئەوەشـدا) پاشـان ئێوە هاوبەش بۆ خوا
بڕیـار دەدەن ﴿٦٤﴾ ﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ﴾ بڵـێ: هەر ئەو خوایە بەتوانا و دەسـتەڵاتدارە ﴿عَلَىٰ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا﴾
کەسزایەکتان بۆ بنێرێت ﴿مِّن فَوْقِكُمْ﴾ لە سەروتانەوە ﴿أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾ یان لە ژێرپێتانەوە ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ
شِيَعًا﴾ یان سـەرتان لێ بشـێوێنێ و بتان کات بەچەند دەسـتە و تاقمێکەوە ﴿وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ﴾
جا هەندێکتان بە هەندێکی ترتان سزاو ئازار بدات ﴿انظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الْآيَاتِ﴾ سەرنج بدە چۆن ئایەتەکان
دەگۆڕیـن (لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر) ﴿لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ﴾ تا ئـەوان تێبگەن و بیربکەنەوە ﴿٦٥﴾ ﴿وَكَذَّبَ
بِهِ قَوْمُكَ وَهُوَ الْحَقُّ﴾ گەلەکەت باوەڕیان بەم قورئانە نەکرد کە هەر ئەوە حەق و ڕاسـت ﴿قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم
بِوَكِيلٍ﴾ بڵـێ: مـن پارێزەر و بەرپرسـتان نیـم ﴿٦٦﴾ ﴿لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ﴾ بـۆ هەموو هەواڵێـك کاتێکی
دیاریکـراو هەیە (کە ڕاسـت و درۆی تیادا ڕوون دەبێتـەوە) ﴿وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ وە بەزوویی دەزانن ﴿٦٧﴾
﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا﴾ هەر کاتێ ئەوانەت دی قسـەی ناشایسـتە دەکەن دەربـارەی ئایەتەکانی
ئێمـە ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ ئـەوە ڕوو وەرگێڕە لێیان ﴿حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ﴾ تا دەچنە سـەر باسـێکی تر
﴿وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ﴾ وە ئەگەر شـەیتان لە بیری بردیتەوە ﴿فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَىٰ مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾
ئیتر لە پاش بیرکەوتنەوەت لەگەڵ کۆمەڵی ستەم کاران دامەنیشە ﴿٦٨﴾

﴿وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ﴾ (هەرچەندە) ئەوانەی خۆیان دەپارێزن هیچ پرسیارو
تاوانی ئەوانیان لەسەر نی یە ﴿وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بەڵام بیرخستنەوەیە تا خۆیان بپارێزن
٦٩ ﴿وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) واز بێنە لەوانەی ئاینەکەیان کردووە
بە گەمە و گاڵتەجاڕی ﴿وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ و ژیانی دونیا هەڵی خەڵەتاندون ﴿وَذَكِّرْ بِهِۦٓ﴾
وە بە قورئان ئامۆژگاریان بکە ﴿أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ﴾ بۆ ئەوەی هیچ کەس تیا نەچێ
بەهۆی ئەو (خراپانە)ی کردویەتی ﴿لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ﴾ کە جگە لە خوا هیچ دۆست
و تکاکارێکی نی یە ﴿وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ﴾ ئەگەر هەموو فیدا و بریتی یەك بدات لێ
ی وەرناگیرێ ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟﴾ ئەوانە کەسانێکن بەهۆی ئەو (خراپانە)ی کە
کردوویانە تیاچوون ﴿لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ﴾ بۆ ئەوانەیە خواردنەوەیەك لە ئاوی زۆر گەرم و بەکوڵ
﴿وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ﴾ وسزای زۆر بە ئازاریش بە هۆی ئەوەی کەبێ بڕوابوون ٧٠ ﴿قُلْ
أَنَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بڵێ ئایا بێجگە لەخوا هاوار بکەین (و بپەرستین) ﴿مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا﴾ شتێك
کەنەسوودمان پێ دەگەیەنێت و نە زیان ﴿وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا﴾ وە بەرەو دوا بگەڕێینەوە (پاشگەزبینەوە
لە ئاینەکەمان) ﴿بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ﴾ لە پاش ئەوەی کە خوا ڕێنموونی کردین (بۆ ڕێگای
ڕاست)؟ ﴿كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ﴾ بەوێنەی ئەوکەسەی کە شەیتانەکان سەریان لێ شێواندبێ
﴿فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ﴾ لەزەوی دا سەرگەردان بێ ﴿لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى﴾ و چەند هاوڕێ یەکی
هەبێ بانگی کەن بۆ ڕێگای ڕاست ﴿ٱئْتِنَا﴾ (بڵێن) وەرە بۆلای ئێمە (کەچی بەگوێیان نەکات)
﴿قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ﴾ بڵێ بەڕاستی هەر ڕێنموونی خوا ڕێ نموونی ڕاستە ﴿وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ
ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ و فەرمانمان پێدراوە کە مل کەچ و گوێڕایەڵ بین بۆ پەروەردگاری جیهانیان ٧١ ﴿وَأَنْ
أَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ﴾ وە(فەرمانمان پێدراوە) کە بەڕێکی نوێژ بەجێ بێنن و لەو (پەروەردگارە)
بترسین ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ وە هەمووتان هەر بۆلای ئەو زاتە کۆ دەکرێنەوە(لەڕۆژی دواییدا)
٧٢ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾ وەهەر ئەو خوایە کەئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە
بەحەق و ڕاستی ﴿وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ﴾ وە هەر ڕۆژێ بەشتێك بفەرمووێ ببە ئەویش دەست بەجێ
دەبێ ﴿قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ﴾ فەرمان و ووتەی ئەو ڕاستە ﴿وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ﴾ هەر بۆئەوە موڵك
و خاوەنیەتی لەو ڕۆژەدا کەفوو دەکرێت بە (صور) کەڕەنادا ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ زانا و ئاگایە
بەهەموو نهێنی و ئاشکرایەك ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾ و هەر ئەوە کاردروست و بە ئاگا ٧٣

﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ آزَرَ﴾ وە(بیربکەرەوە) کاتێك کە ئیبراهیم ووتی بە ئازەری باوکی ﴿أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا
آلِهَةً﴾ ئایا تـۆ بتانێـك دەکەیتە پەرسـتراوی خـۆت؟ ﴿إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ بەڕاسـتی من
تـۆو گەلەکـەت لە گومڕایی یەکی تەواو و ئاشـکرادا دەبینم ﴿٧٤﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ﴾ بەو شـێوەیە
نیشـانی ئیبراهیـم مـان دا ﴿مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ دەسـەلاّت و خاوەنێتی (خـوا بۆ) ئاسـمانەکان و
زەوی ﴿وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ﴾ بـۆ ئـەوەی لەڕیـزی بـاوەڕدارە ڕاسـتەقینەکاندا بێـت ﴿٧٥﴾ ﴿فَلَمَّا جَنَّ
عَلَيْهِ اللَّيْلُ﴾ کاتێ شـەوی بەسـەردا هـات ﴿رَأَىٰ كَوْكَبًا﴾ ئەسـتێرەیەکی بینـی ﴿قَالَ هَٰذَا رَبِّي﴾ ووتی ئەمە
پەروەردگـاری منـە ﴿فَلَمَّا أَفَلَ﴾ بـەلاّم کاتـێ ئاوابوو ﴿قَالَ لَا أُحِبُّ الْآفِلِينَ﴾ ووتـی من هەرچـی ئاوا
بـێ خۆشـم نـاوێ ﴿٧٦﴾ ﴿فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا﴾ ئەمجا کاتێ مانگـی بینی هەڵهـات ﴿قَالَ هَٰذَا رَبِّي﴾ ووتی
ئەمـە پەروەردگاری منـە ﴿فَلَمَّا أَفَلَ﴾ بەلاّم کاتێ کە ئاوابوو ﴿قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي﴾ ووتی سـوێند بەخوا
ئەگـەر پەروەردگارم ڕێنموونیم نەکات ﴿لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ﴾ بێگومـان لەکۆمەڵی گومڕایان
دەبـم ﴿٧٧﴾ ﴿فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً﴾ ئەمجـا کاتـێ خـۆری بینـی هەڵهـات ﴿قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَا أَكْبَرُ﴾
ووتـی ئەمـە پەروەردگـاری منـە ئەمە گەورەتـرە (لـەوان) ﴿فَلَمَّا أَفَلَتْ﴾ جا کاتـێ خۆریش ئـاوا بوو
﴿قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾ ووتی ئەی گەلەکەم بەڕاستی من بەریم لە هەرشتێ کەئێوە دەیکەن
بەهاوبەش بۆ خوا ﴿٧٨﴾ ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي﴾ بەڕاسـتی من ڕووی خۆم وەرئەگێڕم بۆلای زاتێك
﴿فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ کە ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە ﴿حَنِيفًا﴾ جگە لەخوا ڕووم لەهیچی
تـر ناکـەم ﴿وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ وە بێگومان من لەهاوبـەش پەیداکەران نیم ﴿٧٩﴾ ﴿وَحَاجَّهُ قَوْمُهُ﴾
(بـەلاّم ئیبراهیـم) گەلەکـەی دەمەقاڵێیـان لەگەڵدا کـرد ﴿قَالَ أَتُحَاجُّونِّي فِي اللَّهِ وَقَدْ هَدَانِ﴾ فەرمووی ئایا
ئێـوە دەمەدەمـێ و موجادەلەم لەگەڵدا دەکـەن؟ لەبارەی خواوە کە بەڕاسـتی ڕێنموونی منی کردووە
﴿وَلَا أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِ﴾ مـن ناترسـم لـەوەی کە ئێـوە دەیکەن بەهاوبـەش بۆ خـوا (چونکە زیان
ناگەیەنـن) ﴿إِلَّا أَن يَشَاءَ رَبِّي شَيْئًا﴾ مەگـەر شـتێك کەپەروەردگارم بیـەوێ بیکات ﴿وَسِعَ رَبِّي كُلَّ
شَيْءٍ عِلْمًا﴾ زانسـت و ئاگاداری پەروەردگارم هەموو شـتێکی گرتۆتـەوە ﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا
بـۆ بیرناکەنـەوە ﴿٨٠﴾ ﴿وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ﴾ وە من چۆن دەترسـم لـەو بتانەی کە ئێـوە کردووتانە
بەهاوبـەش بۆ خـوا ﴿وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِاللَّهِ﴾ کەئێوە ناترسـن بێگومـان بتانێکتان کردۆتە
هاوبەش بۆ خوا ﴿مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا﴾ کە هیچ بەڵگەیەك نەنێرراوە بۆتان (کە ئەوان بپەرستن)
﴿فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالْأَمْنِ﴾ دەی کەواتەکام لەم دوو دەسـتەیە شایسـتە ترە بە نەترسان (و ئارامی)
﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە هیچ دەزانن ﴿٨١﴾

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانـەی کـە بڕوایـان هێنـاوە ﴿وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ﴾ و بڕواکەیـان تێکـەڵ بەسـتەم
(هـاوەڵ دانـان) نەکردووە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾ هێمنی و ئاسـایش تەنها بـۆ ئەوانەیە هەر
ئەوانـەش ڕێنموون کـراوون ﴿٨٢﴾ ﴿وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ ئەو (بەڵگانـە) بەڵگەی ئێمە بوون
کـە دابوومـان بە ئیبراهیـم ﴿عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ﴾ لەبەرانبەر گەلەکەیەوە ﴿نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ﴾ هەرکەسـێك
بمانەوێت پلەوپایەی بەرز دەکەینەوە ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ﴾ بەڕاسـتی پەروەردگارت کاردروسـتی
زانایـە ﴿٨٣﴾ ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ﴾ وە ئیسـحاق و (لەئیسـحاقیش) یەعقوبمـان پـێ بەخشـی
﴿كُلًّا هَدَيۡنَاۚ﴾ ڕێنموونیـی هەموویانمـان کـرد ﴿وَنُوحًا هَدَيۡنَا مِن قَبۡلُۖ﴾ وە لـەوەو پێش ڕێنموونیـی
نووحیشـمان کـرد ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَۚ﴾ ولەنەوەکانـی نـووح
داوودو سـولەیمان و ئەیووب و یوسف و مووسـاو هاروونمان (ڕێنموونیی کرد) ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ ئـا بەو چەشـنە پاداشـتی چاکـەکاران دەدەینـەوە ﴿٨٤﴾ ﴿وَزَكَرِيَّا وَيَحۡيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلۡيَاسَۖ﴾
وە زەکەریـا و یەحیا و عیسـا و ئیلیاس ﴿كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ هەریەك لەمانە لـە چاکەکاران بوون ﴿٨٥﴾
﴿وَإِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطٗاۚ﴾ وە ئیسـماعیل و یەسـەع و یونس و لووط ﴿وَكُلّٗا فَضَّلۡنَا عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾
هەریەکـە لەمانـە ڕێزماندراون بەسـەر هەموو خەڵکیـدا ﴿٨٦﴾ ﴿وَمِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡ وَإِخۡوَٰنِهِمۡۖ﴾ هەروەها
هەنـدێ لەبـاوك و نـەوەو و براکانیـان ﴿وَٱجۡتَبَيۡنَٰهُمۡ وَهَدَيۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ هەڵمـان بـژاردوون و
ڕێنموونیمـان کـردوون بـۆ ڕێگـەی ڕاسـت ﴿٨٧﴾ ﴿ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن﴾ ئـەوە ڕێنموونی خوایە
ڕێنموونـی هەربەندەیەکی پێدەکات ﴿يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۚ﴾ لەبەندەکانی کە خۆی بیەوێ ﴿وَلَوۡ أَشۡرَكُواْ لَحَبِطَ
عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ وە ئەگـەر هاوبەشـیان ڕەوابدایـە بـۆ خوا بێگومـان ئەو چاکانـەی کردبوویان
هەمـووی بێ پاداشـت دەردەچوو ﴿٨٨﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە کە سـانێکن ﴿ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ
وَٱلنُّبُوَّةَۚ﴾ پەیام و زانین و حوکمڕانی و پێغەمبەرێتیمان پێ بەخشیوون ﴿فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ﴾ جا ئەگەر
ئەوانە (قوڕەیش) بڕوای پێ نەهێنن ﴿فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ﴾ ئەوە بێگومان بەدەسـتەیەکی
ترمان سـپاردووە (چاودێری بکەن و) بێ بـڕواش نابن پێ ی ﴿٨٩﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ﴾ ئەوانە (ئەو
پێغەمبەرانـەی باس کران) کەسـانێك بوون خـوا ڕێنموونیی کـردن ﴿فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ﴾ دەی پەیڕەوی
ڕێگـە وڕێبـازی ئـەوان بکە (ئـەی موحەممـەد ﷺ) ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ﴾ (ئـەی موحەممەد ﷺ)
بڵێ داوای هیچ کرێ و پاداشـتێکتان لێناکەم لەسـەری ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئەم قورئانە تەنها
ئامۆژگاری یە بۆ هەموو جیهانیان ﴿٩٠﴾

﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾ وەك پێویست خوایان نەناسی و ڕێزیان نەگرت ﴿إِذۡ قَالُواْ﴾ کاتێ ووتیان ﴿مَآ
أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖۗ﴾ خوا هیچ شتێکی نەناردۆتە خوارەوە بۆ هیچ ئادەمی یەك ﴿قُلۡ مَنۡ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ
ٱلَّذِي﴾ بڵێ ئەی کێ ئەو کتێبەی ناردە خوارەوە ﴿جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ﴾ کە مووسا هێنای ﴿نُورٗا وَهُدٗى لِّلنَّاسِۖ﴾
(ئەو کتێبە) ڕووناکی و ڕێنموونیی بوو بۆ خەڵك (پێش دەستکاری کردنی لەلایەن جولەلەکەکانەوە)
﴿تَجۡعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ﴾ ئێوە ئەو (کتێبە) دەکەنە چەند پەڕە و کاغەزێك ﴿تُبۡدُونَهَا وَتُخۡفُونَ كَثِيرٗاۖ﴾ بەشێکی
(کە قازانجتانە) ئاشکرای دەکەن و زۆریشی (کەزیانی خۆتانە) دەیشارنەوە ﴿وَعُلِّمۡتُم مَّا لَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ﴾
شتانێك فێر کراوون کەئێوە نەتان دەزانی ﴿أَنتُمۡ وَلَآ ءَابَآؤُكُمۡۖ﴾ نەخۆتان و نە باو و باپیرانتان ﴿قُلِ ٱللَّهُۖ﴾
بڵێ هەرخوا (کتێبی بۆ مووسا ناردووە) ﴿ثُمَّ ذَرۡهُمۡ فِي خَوۡضِهِمۡ يَلۡعَبُونَ﴾ پاشان لێیان گەڕێ لەناو بەتاڵی
خۆیاندا گاڵتەو یاری بکەن و ڕۆبچن. ﴿٩١﴾ ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ﴾ ئەم قورئانە ئێمە ناردوومانەتەخوارەوە
﴿مُبَارَكٞ﴾ پیرۆز و فەڕدارە ﴿مُّصَدِّقُ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ﴾ ئەو کتێبانەش پێش ئەو هاتوون بەڕاستیان دادەنێت
(پێش ئەوەی گاور وجولەکەکان بیشێوێنن) ﴿وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَاۚ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی
دانیشتوانی مەککە ودەوروبەری ئاگادار کەیتەوەو بیانترسێنی ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ﴾
جا ئەوانەی بڕوایان بە دواڕۆژ هەبێ بڕوا بەو (قورئانە) دێنن ﴿وَهُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ يُحَافِظُونَ﴾ ئەوان
پارێزەرن بۆ نوێژەکانیان و بەچاکی لەکاتی خۆیاندا دەیانکەن ﴿٩٢﴾ ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾
کێ لەوکەسەستەم کارترەکەدرۆ هەڵبەستێ بەدەم خواوە ﴿أَوۡ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ﴾ یان بڵێ نیگا وسرووشم
بۆکراوە ﴿وَلَمۡ يُوحَ إِلَيۡهِ شَيۡءٞ﴾ بەڵام هیچ نیگا و سرووشێکیشی بۆ نەکرابێ ﴿وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثۡلَ
مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۗ﴾ هەروەها کەسێ کە بڵێ منیش وێنەی ئەو قورئانەی خوا دایبەزاندووەدادەبەزێنم
﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ خۆزگە ستەمکارانت دەبینی کاتێ ﴿فِي غَمَرَٰتِ ٱلۡمَوۡتِ﴾ وان لە نارەحەتی و
سەختی سەرە مەرگدا ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ﴾ و فریشتەکان دەستیان بۆ دەبەن (بۆ گیان کێشانیان)
﴿أَخۡرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُۖ﴾ (پێیان دەڵێن) خۆتان دەربازکەن (لەم نارەحەتی گیان کێشانە ئەگەر ڕاست دەکەن)
﴿ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ﴾ ئەمڕۆ پاداشتی ڕیسواکەر دەدرێنەوە ﴿بِمَا كُنتُمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ﴾
بەهۆی ئەوەی کەقسەی ناڕاستان هەڵئەبەست بەدەم خواوە ﴿وَكُنتُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهِۦ تَسۡتَكۡبِرُونَ﴾ و خۆتان
بەگەورە دەزانی لەبەرانبەر ئایەتەکانی خوادا ﴿٩٣﴾ ﴿وَلَقَدۡ جِئۡتُمُونَا فُرَٰدَىٰ﴾ سوێند بێت بێگومان ئێوە بە
تەنیا و یەك یەك گەڕانەوە بۆ لامان ﴿كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾ هەر وەکو یەکەم جار دروستمان کردن
﴿وَتَرَكۡتُم مَّا خَوَّلۡنَٰكُمۡ وَرَآءَ ظُهُورِكُمۡۖ﴾ و ئەوەی پێمان دابوون بەجێتان هێشت لەدوای خۆتان (لەماڵ
وسەروەت وسامان) ﴿وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمۡ﴾ وە نابینین لەگەڵتاندا ﴿شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ أَنَّهُمۡ فِيكُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْۚ﴾
ئەو تکاکارانەی کە لاتان وابوو هاوبەشی خوان لە تکا کردن بۆتان ﴿لَقَد تَّقَطَّعَ بَيۡنَكُمۡ﴾ سوێند بە خوا
بێگومان پچڕا پەیوەستی نێوانتان ﴿وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ﴾ وە ئەوەی بە پشتیوانی خۆتان دادەنا
وون بوو لێتان ﴿٩٤﴾

﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ﴾ بەڕاستی خوا لەتکەری دانەوێڵە و ناوکە تۆوە (کاتێك کە دەڕوێنرێت لە زەویدا)
﴿يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ﴾ زینـدوو دەرئەهێنـێ لـە مـردوو ﴿وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ﴾ وە (خـوا) دەرهێنەری
مردوانـە لـە زیندوو ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ ئەوەیـە خـوای ئێـوە دەی کەواتە ئێوە چۆن (لەپەرستنی
ئەو خوایە) لا دەدرێن؟ ﴿٩٥﴾ ﴿فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ﴾ (خوا) بەدی هێنەری شـەبەق و ڕووناکی ڕۆژ بوونەوەیە
﴿وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا﴾ و شـەوی کردووە بەکات و هۆی ئارامگرتن ﴿وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا﴾ و خۆر و
مانگی کردۆتە هۆی حساب دیاریکردن و زانینی کات ﴿ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾ ئەوەش ئەندازە گرتنی
خوای بەدەسـەڵاتی زانایـە ﴿٩٦﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ﴾ وە هەر خوایە کەئەستێرەی داناوە بۆتان
﴿لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ بـۆ ئـەوەی ڕێیـان پێدەرکـەن لـە تاریکیەکانـی وشکانی و دەریـادا
﴿قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بەڕاستی ئایەتەکانمان ڕوون کردۆتەوە بۆ کۆمەڵێ کەبزانن و تێ بگەن
﴿٩٧﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾ وە ئـەو خوایـە زاتێکـە کە ئێوەی دروسـت کـردوە لەیەك کەس
کـە (ئادەم)ە ﴿فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ﴾ ئەمجا (لە پشـتی باوکتانا) نیشـتەجێ کران (دواتریـش لەمنداڵدانی
دایکتانـدا) دانـران بە شـێوەی کاتیی ﴿قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ بـە ڕاسـتی ئایەتەکانمان ڕوون
کردۆتـەوە بۆ کەسـانێ بـەووردی بیر بکەنـەوە ﴿٩٨﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ﴾ وە ئەو خوایـە زاتێکە ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ
مَآءً﴾ کـە بارانـی لە ئاسـمانەوە بارانـدووە ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ﴾ جا بـە هۆی ئـەو (بارانەوە)
هەمـوو جۆرە چەکەرەیەکمان ڕواند ﴿فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا﴾ ئەمجا ڕووەکی سـەوزمان لێ ڕواندووە
﴿نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾ وە لـەو (ڕووەکە سـەوزە) دانەوێڵەی لەسـەریەك کەڵەکە بوومـان دەرهێناوە
(وەك گوڵی جۆ و گەنم) ﴿وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ﴾ وە لە دار خورما لە چەند پەلێکی هێشـووی
شۆڕەوە بوو دەردەهێنین ﴿وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ﴾ وە (دەڕوێنین بەو بارانە) باخاتی زۆر لە ترێ ی هەمە جۆر
﴿وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ﴾ و زەیتون و بنە هەناری ﴿مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ﴾ هاو وێنە و لەیەکتر جیا جیا(لەتامدا)
﴿ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ﴾ سـەرنجی بەرهەمەکەی بدەن ﴿إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ﴾ کاتێك بەر دەگرێت و پێ دەگات
﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان لەم سەرنجدانەدا چەند بەڵگەی گەورە هەیە (لەسەر گەورەی
دەسەڵاتی خودا) بۆ کەسانێك کە بڕوا دەهێنن ﴿٩٩﴾ ﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ﴾ هاوبەشانێکیان بڕیارداوە بۆ
خوا کە جنۆکەن ﴿وَخَلَقَهُمْ﴾ لە کاتێکدا خودا ئەو (جنۆکانەی) دروست کردووە ﴿وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ
عِلْمٍ﴾ بـەدرۆ و بوختـان چەند کوڕ و کچیان ڕەوادا وە بۆ خوا بەبێ زانیاری ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ﴾
پـاك و بـێ گەردی بۆ خوا لەوەی کە ئەوبێ بڕوایانە بڕیاری ئەدەن بۆ خوا ﴿١٠٠﴾ ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾
(خـوا) داهێنـەری ئاسـمانەکان و زەوی یـە لـە نەبـوون ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ﴾ چـۆن
منداڵـی دەبـێ کە ژن و هاوسـەری نەبووە ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ خۆی هەموو شـتێکی دروسـتکردووە
﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ و ئەو بە هەموو شتێ زانا و بە ئاگایە ﴿١٠١﴾

﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ هەر ئەو خوایەیە کە پەروەردگاری ئێوەیە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی
ڕاستەقینە نی یە جگە لە ئەو ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ دروست کەری هەموو شتێکە ﴿فَٱعْبُدُوهُ﴾
کەواتە ئەو بپەرستن ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ وە ئەو خوایە چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە
﴿١٠٢﴾ ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ چاوەکان پەی پێ نابەن و ناتوانن ببینن ﴿وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ﴾
بەڵام ئەو هێزی بینین و چاوەکان دەبینێت ﴿وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ و ئەو بە ئاگای ورد بینە ﴿١٠٣﴾
﴿قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ﴾ بەڕاستی لەلایەن پەروەردگارتانەوە چەندین بەڵگەی ڕوونتان
بۆ هاتووە ﴿فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ﴾ ئەمجا هەر کەس بیر لەڕاستی دەکاتەوەو دەیبینێ ئەوە (سوودی)
بۆ خۆیەتی ﴿وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا﴾ هەر کەسیش بیر ناکاتەوە و کوێر بووە ئەوە (زیانی) هەر بۆ خۆیەتی
﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ﴾ وە من چاودێر و پارێزەرنیم بە سەرتانەوە (بەس ڕاگەیەنەرم) ﴿١٠٤﴾
﴿وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ﴾ ئاوا جۆر و شێوەی بەڵگەکان دەگۆڕین ﴿وَلِيَقُولُوا۟ دَرَسْتَ﴾ دەبا هەر بڵێن
خوێندووتە وپێتووتراوە ﴿وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ وە بۆ ئەوەی چاك ڕوونی بکەینەوە بۆ کۆمەڵێك
کەتێدەگەن و شارەزان ﴿١٠٥﴾ ﴿ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ شوێنی ئەوە بکەوە کە لەلایەن پەروەردگارتەوە
وەحیت بۆ کراوە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ شایستەی پەرستن نیە بێجگە لەو (خوا) ﴿وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾
وە ڕوو وەرگێڕە لەهاوبەش بڕیاردەران ﴿١٠٦﴾ ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟﴾ وە ئەگەر خوا بیویستایە
هاوەڵیان دا نەدەنا ﴿وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ و تۆمان نەدەکرد بەچاو دێرو پارێزەر بەسەریانەوە ﴿وَمَآ
أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ﴾ و تۆ زۆردارو دەسەڵاتدار نیت بەسەریانەوە ﴿١٠٧﴾ ﴿وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ﴾ (موسڵمانان) جنێوو قسەی ناشرین مەڵێن بەوبت و پەرستراوانەی کەئەوان هاواریان لێ
دەکەن و دەیانپەرستن بێجگە لەخوا ﴿فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بەو هۆیەوە ئەوانیش قسەی نەشیاو بڵێن
بەخوا ﴿كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ﴾ بەو شێوەیە ڕازاندومانەتەوە بۆ هەموو ئوممەتێك کردەوەکەیان
﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ﴾ پاشان گەڕانەوەیان هەر بۆلای پەروەردگاریانە ﴿فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾
ئەمجا هەواڵیان پێ دەدات بەو کردەوانەی ئەنجامیان دەدا ﴿١٠٨﴾ ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ﴾ وە بەهێزترین
سوێندیان بەخوا دەخوارد ﴿لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا﴾ سوێند بەخوا ئەگەر موعجیزەیەکیان بۆ بێت
(لەوانەی کەخۆیان داوایان دەکرد) بێگومان بڕوا دەهێنن پێ ی ﴿قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ بڵێ بەڕاستی
موعجیزەکان هەر لای خوایە ﴿وَمَا يُشْعِرُكُمْ﴾ وە ئێوە نازانن ئەی بڕواداران ﴿أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا
يُؤْمِنُونَ﴾ ئەگەر ئەو بەڵگانەش بێتەکایەوە هەر بڕوا ناهێنن ﴿١٠٩﴾ ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ﴾ وە(کاتی
هاتنی موعجیزەکان بەهۆی بێ بڕواییانەوە) دڵ و چاویان وەردەگێڕین و لادەدەین (لە باوەڕ هێنان)
﴿كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ هەر وەك لە سەرەتاوە بڕوایان بەقورئان نەهێنا ﴿وَنَذَرُهُمْ﴾ وەلێیان
دەگەڕێین ﴿فِي طُغْيَٰنِهِمْ﴾ لەسەر کەشی خۆیاندا بن ﴿يَعْمَهُونَ﴾ (دەبا) هەر سەرگەردان بن ﴿١١٠﴾

﴿وَلَوْ أَنَّنَا﴾ وە بێگومان ئەگەر ئێمە ﴿نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةَ﴾ فریشتەمان بۆ لای ئەو (بێباوەڕ) انە بناردایە ﴿وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَىٰ﴾ و مردووەکان قسەیان لەگەڵ بکردنایە ﴿وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ و هەموو شتێکمان بۆ کۆبکردنایەتەوە ﴿قُبُلًا﴾ ڕوو بەڕوو بەپێش چاویانەوە (یان کۆمەڵ کۆمەڵ) ﴿مَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا﴾ بڕوایان نەدەهێنا ﴿إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ﴾ مەگەر خوا بیویستایە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن و بێ ئاگان ﴿١١١﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا﴾ هەر بەو شێوە بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنێکمان داناوە ﴿شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ﴾ لەشەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە ﴿يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾ کەبەنهێنی بەیەکتری ڕادەگەیەنن ﴿زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا﴾ ووتەی ڕازاوە و بریقەدار بۆ فریودانیان ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ﴾ وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوەیان نەدەکرد ﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ دە لێیان گەڕێ بەخۆیان و ئەو درۆیانەی کەهەڵی دەبەستن ﴿١١٢﴾ ﴿وَلِتَصْغَىٰ إِلَيْهِ﴾ وە بۆ ئەوەی گوێگری بۆ ئەو (ووتە بریقەدارو ڕازاوەی بۆ یەکتری دەکەن) ﴿أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ﴾ دڵی ئەو کەسانەی بڕوایان نی یە بەڕۆژی دوایی ﴿وَلِيَرْضَوْهُ﴾ بۆ ئەوەی ڕازی ببن پێ ی ﴿وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ﴾ وەتا ئەنجامی بدەن ئەو گوناهانەی ئەنجامی ئەدەن ﴿١١٣﴾ ﴿أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا﴾ جا ئایا جگە لەخوا دادوەرێکی تر بۆ خۆم بڕیار بدەم؟ ﴿وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ﴾ لەکاتێکدا (خوا) ئەو زاتەیە کەناردویەتیە خوارەوە بۆ ئێوە ﴿الْكِتَابَ مُفَصَّلًا﴾ ئەم قورئانە کەڕوون کەرەوەی هەموو باسێکە بەدرێژی ﴿وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ﴾ ئەوانەش کە نامەمان پێ بەخشین ﴿يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ﴾ چاك دەزانن بێگومان ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوە بەحەق و ڕاستی نێرراوە ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ﴾ کەواتە هەرگیز لەگوماندارن مەبە ﴿١١٤﴾ ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ﴾ وە فەرمان و ووتەی پەروەردگارت تەواو بووەو بەئەنجام گەیشت ﴿صِدْقًا وَعَدْلًا﴾ بەڕاستی و دروستی ﴿لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ﴾ کەهیچ کەس ناتوانێ بڕیارو ووتەکانی بگۆڕێ ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ هەر خوا بیسەری زانایە ﴿١١٥﴾ ﴿وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ﴾ وە ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی زۆربەی ئەوانە بیت لەسەر زەویدان ﴿يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لەڕێگەی خوا گومڕات دەکەن ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ﴾ ئەوان هەر شوێنی گومان کەوتوون ﴿وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ﴾ وە هەمیشە درۆو گۆترە کاری دەکەن ﴿١١٦﴾ ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ﴾ بێگومان هەر پەروەردگارت چاك دەزانێت ﴿مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِ﴾ کێ گومڕا بووە و لای داوە لەڕێگای ئەو ﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ وە هەر ئەو زاناترە بەوانەی ڕێبازی ڕاستیان گرتووە ﴿١١٧﴾ ﴿فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾ دەبخۆن لەو (سەربڕاو)ەی کەناوی خوای لەسەر هێنراوە ﴿إِن كُنتُم بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بەئایەتەکانی خوا بڕوادارن ﴿١١٨﴾

﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا﴾ بۆچی ئێوە ناخۆن؟ ﴿مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾ لە (گۆشتی) ئەو (ئاژەڵان)ەی
کەناوی خوای لەسەر هێنراوە (لەکاتی سەربڕینی دا) ﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ﴾ کەبێگومان خوا
بۆتانی ڕوون کردۆتەوە ئەوەی حەرامی کردوە لەسەرتان ﴿إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ﴾ جگە لەوەی کەناچار
دەبن بۆی (بیخۆن لەو خواردنانەی کە حەرامن) ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا لَيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِمْ﴾ بەڕاستی زۆر کەس
خەڵکی گومڕا دەکەن بە هەوا و ئارەزوی خۆیان ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بەبێ هیچ زانیاری یەك (کە لەخواوە
وەرگیرا بێت) ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ﴾ بێگومان پەروەردگارت دەست درێژ کاران و سەرکەشان
چاك دەناسێ ﴿١١٩﴾ ﴿وَذَرُوا ظَاهِرَ الْإِثْمِ وَبَاطِنَهُ﴾ لەگوناهی ئاشکراو نهێنی واز بێنن ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْسِبُونَ
الْإِثْمَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەگوناه دەکەن بە دەستی ئەنقەست ﴿سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا يَقْتَرِفُونَ﴾
بەزوویی تۆڵەیان لێ دەسەنرێت بەهۆی ئەو تاوانانەی دەیانکرد ﴿١٢٠﴾ ﴿وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ
يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾ لەو (سەربڕاوە) مەخۆن کەناوی خوای لەسەر نەهێنراوە (لەکاتی سەربڕیندا)
﴿وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ﴾ بێگومان (خواردنی) ئەوە تاوان و لەسنوور دەرچوونە ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ﴾
وە بێگومان شەیتانەکان بەنهێنی شت بەدۆستانیان دەڵێن ﴿لِيُجَادِلُوكُمْ﴾ بۆ ئەوەی موجادەلە و دەمە
دەمێتان لەگەڵ بکەن ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ جائەگەر بەگوێیان بکەن ئەوە بێگومان لەهاوبەش
دانەران دەبن ﴿١٢١﴾ ﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ﴾ ئایا کەسێك کەمردوو بێت (واتە بێ بڕوا بێت) و ئێمە
زیندوومان کردەوە (هیدایەتماندا) ﴿وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ﴾ و ڕووناکیەکمان بۆ فەراهەم هێنا
(کەقورئانە) بە هۆی ئەوەوە لەناو خەڵکیدا دەگەڕێ و دەڕوات ﴿كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ﴾ ئایا وەك ئەوە
وایە کە لەناو تاریکستانێکدا بێت ﴿لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا﴾ کە بەهیچ جۆرێ دەرچوونی نیە لێی ﴿كَذَٰلِكَ
زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بەو شێوەیە ڕازێنراوەتەوە بۆ بێبڕوایان ئەو کردەوە (خراپانەی) دەیان
کرد ﴿١٢٢﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا﴾ بەو شێوەیە لە هەموو شارێکدا گەورەترینی
تاوانباریمان کرد (بەدەسەڵاتدار) ﴿لِيَمْكُرُوا فِيهَا﴾ بۆ ئەوەی پیلان و فێڵ بکەن لەو شارانەدا
﴿وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ وە فێڵ وپیلان ناکەن (لە کەس) بێجگە لەخۆیان ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾
بەڵام ئەوان هەستی پێ ناکەن ﴿١٢٣﴾ ﴿وَإِذَا جَاءَتْهُمْ آيَةٌ﴾ وە کاتێك ئایەتێکیان بۆ بێت ﴿قَالُوا لَنْ نُؤْمِنَ﴾
دەڵێن ئێمە هەرگیز باوەڕ ناهێنین ﴿حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ﴾ هەتا وێنەی ئەوەی بەپێغەمبەرانی
خوا دراوە بەئێمەش نەدرێت ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾ خوا چاك دەزانێت پەیام و پێغەمبەرایەتی
خۆی بۆ کوێ دەنێرێت (و کێ شیاو ترە بۆ ئەو کارە) ﴿سَيُصِيبُ الَّذِينَ أَجْرَمُوا﴾ بەزوویی ئەوانەی
تاوانیان کردووە دووچاریان دەبێت ﴿صَغَارٌ عِنْدَ اللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ سووکی وڕیسوایی لای
خوا وسزای سەخت ﴿بِمَا كَانُوا يَمْكُرُونَ﴾ بەهۆی ئەو پیلان وفێڵانەوەی کەدەیانکرد
(لە بڕواداران) ﴿١٢٤﴾

﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ﴾ جا هەرکەسێك خوا بیەوێت ڕێنموونی بکات ﴿يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ
لِلْإِسْلَٰمِ﴾ سینگی فراوان دەکات بۆ ئیسلام (وبڕواهێنان) ﴿وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ﴾ وەهەر کەس خوا بیەوێت
گومڕای کات (لەبەر نەشیاویی وسەرکەشی خۆی) ﴿يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا﴾ سنگی زۆر تەنگ
دەکات ﴿كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ وەك ئەوەی (بیەوێت) بەرز ببێتەوە بەرەو ئاسمان (چونکە مرۆڤ
تا بەرەو ئاسمان بەرز ببێتەوە هەست بە تەنگە نەفەسی دەکات وبەناڕەحەت هەناسەی بۆ دەدرێت)
﴿كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ﴾ بەوجۆرە خواپیسی وناپاکی دادەنێت ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ لەسەر ئەوانەی
کەبڕوا ناهێنن ﴿١٢٥﴾ ﴿وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا﴾ ئەم ئیسلامە ڕێگای پەروەردگارتە کەڕێك و ڕاستە
﴿قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ﴾ بێگومان بەڕوونی ئایەتەکانمان باسکردووە ﴿لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ﴾ بۆ کۆمەڵێك
کەبیربکەنەوە ﴿١٢٦﴾ ﴿لَهُمْ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ بۆ ئەوانەیە لای پەروەردگاریان ماڵی ئاشتی کە (بەهەشتە)
﴿وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ تەنها ئەویش دۆستیانە بەهۆی ئەو کردەوە چاکانەی دەیان کرد ﴿١٢٧﴾
﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ وە ڕۆژێك (خوا) تێکڕا کۆیان دەکاتەوە (دەفەرموێت) ﴿يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ﴾ ئەی
دەستەو کۆمەڵی جنۆکە. ﴿قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ﴾ بێگومان ئێوە زۆر کەستان لەئادەمیەکان
گومڕا کرد ﴿وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ﴾ وە دۆستەکانیان لەئادەمی دەڵێن ﴿رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ﴾
ئەی پەروەردگارمان هەندێکمان سوودو کەڵکمان لەهەندێکمان وەرگرت. ﴿وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ
لَنَا﴾ وە بەو کاتەو مۆڵەتە گەیشتین کەبۆت دیاری کرد بووین. ﴿قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ﴾ خوا فەرمووی
ئاگر شوێنتانە. ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ﴾ بەهەمیشەیی و بێ بڕانەوە دەمێننەوە تیایدا ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾ جگە لەو
کاتەی کەخوا بیەوێ ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت کار دروستی زانایە ﴿١٢٨﴾
﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّى بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا﴾ بەو شێوەیە هەندێك لەستەمکاران دەکەین بەدۆست و پشتیوانی
هەندێکی تریان ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ بەهۆی ئەو کردەوانەوەی ئەنجامیان دەدا ﴿١٢٩﴾
﴿يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ﴾ ئەی دەستەو کۆمەڵی جنۆکەو ئادەمی ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ﴾ ئایا
پێغەمبەرانتان لەخۆتان بۆ نەهات ﴿يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِى﴾ کەئایەتەکانی منتان بۆ بخوێننەوە
﴿وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا﴾ وە لەگەیشتن و دووچار بوونی ئەم ڕۆژەیان نەترساندن ﴿قَالُوا۟
شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا﴾ دەڵێن (ڕاستەو) شایەتی لەسەر خۆمان دەدەین ﴿وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ بەڵام
ژیانی دونیاخەڵەتاندینی ﴿وَشَهِدُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ و شایەتیان لەسەر خۆیان دا ﴿أَنَّهُمْ كَانُوا۟
كَٰفِرِينَ﴾ کەبێگومان ئەوان بێ بڕوا بوون ﴿١٣٠﴾

﴿ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ﴾ ئەوەی باسکرا لەبەر ئەوەیە کەپەروەردگارت
لەناو بەری (خەڵکی) شارو گوندەکان نەبووە و زوڵم و ستەمی لێ نەکردوون ﴿وَأَهْلُهَا
غَافِلُونَ﴾ لەکاتێکدا خەڵکی ئەو شارو گوندانە بێ ئاگابووبن ﴿١٣١﴾ ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُوا﴾
بۆ هەر یەکێك (لەجنۆکەو ئادەمی) چەند پلە و پایە هەیە لەبەرانبەر کردەوەکانیاندا
﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾ وە پەروەردگارت لەوەی کەدەیکەن (ئەو ستەم کارانە) بێ
ئاگا نییە ﴿١٣٢﴾ ﴿وَرَبُّكَ الْغَنِيُّ ذُو الرَّحْمَةِ﴾ هەر پەروەردگاری تۆ بێ نیازە و خاوەنی میهرەبانی
یە ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ﴾ ئەگەر بیەوێت لەناوتان دەبات ﴿وَيَسْتَخْلِفْ مِن بَعْدِكُم مَّا
يَشَاءُ﴾ وە کێی بوێت دوای ئێوە دەیکاتە جێنشین(ی ئێوە) ﴿كَمَا أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ
آخَرِينَ﴾ وەك چۆن ئێوەی لەنەوەی کۆمەڵێکی تر بەدی هێنا ﴿١٣٣﴾ ﴿إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَآتٍ﴾ بێگومان
هەر بەڵێنێکتان پێ دەدرێ هەر دێت ﴿وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ و ئێوە لەدەس خوا دەرناچن ﴿١٣٤﴾ ﴿قُلْ يَا قَوْمِ
اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەی گەلەکەم لەسەر ڕێبازی خۆتان ئەوەی
لەدەستان دێت بیکەن ﴿إِنِّي عَامِلٌ﴾ بێگومان منیش کارو کردەوەی خۆم دەکەم ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ
مَن تَكُونُ لَهُ عَاقِبَةُ الدَّارِ﴾ جا لەمەو پاش دەزانن سەرئەنجامی ئەو دونیا بۆکێ دەبێت ﴿إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ
الظَّالِمُونَ﴾ بێگومان (بێ باوەڕان و) ستەم کاران ڕزگاریان نابێت ﴿١٣٥﴾ ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ﴾ وە بڕیاریاندا
بۆ خوالەوەی کە (خوا) دروستی کردو دای هێنا ﴿مِنَ الْحَرْثِ وَالْأَنْعَامِ نَصِيبًا﴾ بەشێك لە کشتو کاڵ
و ئاژەڵ و ماڵات ﴿فَقَالُوا هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ﴾ جا بەگومانی خۆیان ووتیان ئەمە بۆ خوایە ﴿وَهَٰذَا
لِشُرَكَائِنَا﴾ وە ئەوەش بۆ هاوبەشەکانمان (بتەکانمانە) ﴿فَمَا كَانَ لِشُرَكَائِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى اللَّهِ﴾
جائەوەی بۆ هاوبەشەکانیانە ئەوە بەخوا ناگات ﴿وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَائِهِمْ﴾ وە ئەوەش بۆ
خوایە ئەوە دەگات بەهاوبەشەکانیان (واتە: خوانایەوێت و ئەیداتەوە بەسەریاندا) ﴿سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾
ئای چ خراپە ئەوەی بڕیاری دەدەن ﴿١٣٦﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَادِهِمْ
شُرَكَاؤُهُمْ﴾ ئا بەو شێوەیە شەیتانەکان کوشتنی ڕۆڵەکانیان بۆ زۆر لەهاوەڵ دانەرەکان
ڕازاندەوە ﴿لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ﴾ بۆ ئەوەی لەناویان بەرن (بەکوشتنی کەسانی
بێ تاوان)وە بۆ ئەوەی ئاینەکەیان لێ بشێوێنن ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا فَعَلُوهُ﴾ وە ئەگەر خوا بیویستایە
ئەوەیان نەدەکرد ﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ کەواتە لێیان گەڕێ با لەگەڵ ئەو درۆو دەلەسەیەی
کە هەڵی دەبەستن ( بێ ئاگا و گومڕا بن) ﴿١٣٧﴾

﴿وَقَالُواْ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ﴾ وە (بە گومانی خۆیان)دەیان ووت ئەمانە ئاژەڵ ومالأت وکشتوکاڵێکن
کەقەدەغـە کـراون ﴿لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ﴾ نابـێ لێیان بخـوات کەسـانێك نەبێ خۆمـان بمانەوێت
﴿بِزَعْمِهِمْ﴾ بەگومانـی خۆیـان ﴿وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا﴾ مالأتێکیـش پشـتیان قەدەغـە کرابـوو (نابێ
باریـان لـێ بنـرێ یا سـواریان ببـن) ﴿وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا﴾ هەروەها ئـاژەڵ و مالأت
هەیـە (لەکاتی سـەربڕین دا) ناوی خوایان لەسـەر نەدەبـرد ﴿ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ﴾ بەدرۆ هەڵبەسـتن بەدەم
خـواوە ﴿سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ لەمـەولا خـوا تۆڵەی ئەو درۆ هەڵبەسـتنەیان لێ دەسـتەنێت
﴿١٣٨﴾ ﴿وَقَالُواْ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ وە دەیـان ووت ئـەوەی لەسـکی ئـەم ئـاژەڵ و مالأتانـە دایـە
﴿خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا﴾ تایبەتـە بەنێرینەکانمانـەوە (پیاوەکانمـان) ﴿وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا﴾ وە قەدەغـە
کـراوە لەسـەر ژنەکانمـان ﴿وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ﴾ وە ئەگـەر مردارەوە بـوو بوون ئەوا
هەموو تیایدا هاوبەشـو بەشـدارن ﴿سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ﴾ بەزوویی خوا سزای ئەم پێناسـە (نەفامانە)
یـان دەداتـەوە ﴿إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومـان خـوا کار دروسـتی زانایـە ﴿١٣٩﴾ ﴿قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ
أَوْلَٰدَهُمْ﴾ بەڕاسـتی زیانباربـوون ئەوانـەی ڕۆڵەکانـی خۆیـان کوشـت ﴿سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بەنەفامی
ونەزانـی ﴿وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ﴾ و ئەوەی کەخوا پێی بەخشـیبوون لەخۆیان قەدەغەکرد ﴿ٱفْتِرَآءً عَلَى
ٱللَّهِ﴾ بەدەسـت هەڵبەسـت و درۆ بـەدەم خـواوە ﴿قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـە
گومـڕا بـوون و ڕێنموونی کـراو نەبوون ﴿١٤٠﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ﴾ وە تەنها خوایـە کەبەدی هێناوە
باخاتی ﴿مَّعْرُوشَٰتٍ﴾ کەپرو هەرزاڵە بۆ کراو(یا ساق بەرز) ﴿وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ﴾ وە کەپرو هەرزاڵە
بـۆ نەکراو(سـاق کـورت) ﴿وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ﴾ وە دار خورمـاو کشـتوکاڵی ﴿مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ﴾ جیـاواز
لەخـواردن و تامـدا (بـەدی هێنـاوە) ﴿وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ﴾ زەیتـون و هەناریشـی (بـەدی هێنـاوە)
﴿مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ﴾ لەیـەك چوو (لەوێنـەو دیمەندا)و لەیەك نەچـوو (لەتامدا) ﴿كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ
إِذَآ أَثْمَرَ﴾ بخـۆن لەبەروبوومـی کاتێـك هاتەبـەر ﴿وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ﴾ وە لـەڕۆژی دروێنـەو
چنینیدا مافەکەی (زەکاتەکەی) لێ بدەن ﴿وَلَا تُسْرِفُوٓاْ﴾ و زیادە ڕۆی مەکەن ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ﴾
بێگومـان خـوا زیادەڕۆیانـی خـۆش ناوێـت ﴿١٤١﴾ ﴿وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا﴾ لەئـاژەڵ و مالأتیش
هەندێکـی بارهەڵگـرەو هەندێکـی بۆ کوڵك و خوری (کەڕاخەرو فەرشـی لێ دروسـت دەکرێت)
﴿كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ لـەوەی کەخـوا پێ ی بەخشـیوون بخۆن ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾
وە شـوێنی هەنگاوەکانـی شـەیتان مەکـەون ﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ چونکە بێگومان شـەیتان
دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە. ﴿١٤٢﴾

﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ﴾ (خوا) هەشت جۆر ئاژەڵ و ماڵاتی (دروست کردووە) ﴿مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ﴾ لەمەڕ
دووان (مەڕ و بەران) ﴿وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ﴾ و لەبزن دووان (بزن و سابرێن) ﴿قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ﴾ (ئەی
موحەممەد ﷺ) بڵێ: ئایا خوا ئەو دوو نێرەی حەرام کردووە؟ ﴿أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ یا ئەو دوو مێ یە؟
﴿أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ یا ئەو بێچوانەی کە لەسکی ئەو دوو (جۆرە ئاژەڵە) مێینەدایە
﴿نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن هەواڵم بدەنێ بەزانیاریەك (لەخواوە) ﴿١٤٣﴾
﴿وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ﴾ وە لەحوشتر دووان و لەڕەشەوڵاخ دووان (نێرو مێیەك)
﴿قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا خوا ئەو دوو نێرەی حەرام کردووە
یان ئەو دوو مێ یە؟ ﴿أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ یا ئەو بێچوانەی کە لەسکی ئەو دوو (جۆرە
ووڵاخە) مێینەدایە ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا﴾ یان ئێوە ئامادەو شایەت بوون ئەو
کاتە کەخوا فەرمانی پێکردن (بەم قەدەغەکردنە) ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ کەواتە
کێ لەو کەسە ستەم کار ترە کەدرۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستێت ﴿لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ﴾ بۆ ئەوەی خەڵکی
گومڕا بکات ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بەبێ هیچ زانیاری یەك ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی خوا
ڕێنموونیی کۆمەڵی ستەم کاران ناکات ﴿١٤٤﴾ ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ﴾ (ئەی
موحەممەد ﷺ) بڵێ نابینم لەوەی کە ( وەحی ) وسرووشم بۆ کراوە هیچ خۆراکێك حەرام بێت بۆ
کەسێك کە بیخوات ﴿إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا﴾ جگە لە مردارەوە بوو یان خوێنێکی ڕژێنراو
نەبێت ﴿أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ﴾ یا گۆشتی بەراز چونکە بێگومان ئەوەش پیس ( وحەرامە)
﴿أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾ یان سەربڕاوێك (کاتی سەربڕین) ناوی غەیری خوای لەسەر هێنرابێت
﴿فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ﴾ جا هەر کەس ناچار بوو (کەئەو حەرامانە بخوات لەبەر برسیەتی وخواردنی
حەڵاڵی دەست نەکەوت ) با زیاد لەپێویست نەخوات ﴿وَلَا عَادٍ﴾ و مەبەستی سنوور بەزاندن نەبێت
﴿فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان پەروەردگارت لێبوردەی میهرەبانە ﴿١٤٥﴾ ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟
حَرَّمْنَا﴾ تەنها لەسەر ئەوانەی بوونە جوولەکە حەراممان کرد ﴿كُلَّ ذِى ظُفُرٍ﴾ هەموو
چرنوکدارێك (باڵدار بێت یا ئاژەڵ) ﴿وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ﴾ وە لە(گۆشتی)
ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزنیش پیو وبەزەکانیمان لێ حەرام کردن ﴿إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ﴾ مەگەر ئەوەی
کەبەسەر پشتیانەوە بێت ﴿أَوِ ٱلْحَوَايَآ﴾ یا ئەوەی بەڕیخۆڵەکانیانەوە بێت ﴿أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ﴾ یا تێکەڵ
بووبێت و لکا بێت بەئێسکەوە ﴿ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ﴾ بەهۆی سەرکەشیانەوە ئەو تۆڵە و سزامان
دان ﴿وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾ وە بێگومان ئێمە ڕاست گۆین ﴿١٤٦﴾

﴿فَإِن كَذَّبُوكَ﴾ ئەمجا ئەگەر باوەڕیان پێ نەکردی ﴿فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَاسِعَةٍ﴾ ئەوا (پێیان) بڵێ
پەروەردگارتان خاوەنی میهرەبانی فراوانە ﴿وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ وە سزاو تۆڵەی ئەو
(خوا کەهات) لەهۆزی تاوانباران ناگێڕدرێتەوە ﴿١٤٧﴾ ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟﴾ ئەوانەی کەهاوبەشیان
بۆ خوا دانا بوو لەمەو دوا دەڵێن: ﴿لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا﴾ ئەگەر خوا بیویستایە ئێمەو
باوو باپیرانمان هاوبەشمان (بۆخوا) دانەدەنا ﴿وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ﴾ وە هیچ شتێکمان حەرام نەدەکرد
﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەمانیش درۆیان کرد ﴿حَتَّىٰ
ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا﴾ هەتا سزاو تۆڵەی ئێمەیان چەشت ﴿قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ)
بڵێ ئایا هیچ زانیاریەکتان لایە ﴿فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ﴾ تا دەری بخەن بۆمان و دەری بیرن ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا
ٱلظَّنَّ﴾ ئێوە شوێنی هیچ شتێك ناکەون بێجگە لەگومان نەبێت ﴿وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ﴾ و ئێوە
هەر لەخۆتانەوە بەگۆترە شت دەڵێن ﴿١٤٨﴾ ﴿قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ﴾ بڵێ دەی کەواتە بەڵگەی بەهێز
و(دەسەڵات) هەر بۆ خوایە ﴿فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ جا ئەگەر(خوا) بیویستایە هەر هەمووتانی
دەخستە سەر ڕێی ڕاست ﴿١٤٩﴾ ﴿قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ﴾(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەو شایەتانەتان
بێنن ﴿يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا﴾ کە شایەتی دەدەن کە خوا ئەمەی حەرام کردووە ﴿فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ
مَعَهُمْ﴾ جا ئەگەر (بە درۆ) شایەتییان دا تۆ لەگەڵیاندا شایەتی مەدە ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟
بِـَٔايَٰتِنَا﴾ وە شوێن هەواو هەوەس وئارەزواتی ئەوانە مەکەوە کەباوەڕیان نەهێنا بەئایەتەکانی
ئێمە ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ وە شوێن ئەوانەش مەکەوە کەبڕوایان نی یە بەڕۆژی دوایی
﴿وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾ ئەوانەش کەهاوبەش و هاوتا بۆ پەروەردگاریان بڕیار دەدەن ﴿١٥٠﴾
﴿قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ وەرن بابیخوێنمەوە (بۆتان) ﴿مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾
ئەوەی پەروەردگارتان ( حەرام ) و یاساغی کردووە لەسەرتان ﴿أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ (فەرمانیداوە
کەوا) هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەش بۆی ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾ و لەگەڵ باوك و دایکدا ئاکار چاك
و ڕەفتار جوانبن ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ﴾ و منداڵەکانتان مەکوژن لەبەر هەژاری و نەبوونی
﴿نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾ ئێمە ڕۆزی ئێوەو ئەوانیش دەدەین ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ﴾ وە نزیکی گوناهو
کردەوە زۆر بەدەکان مەکەونەوە ﴿مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ ئەوەی کە بە ئاشکرا دەکرێ لەو (خراپانە)
ئەوەش پەنهان دەکرێ ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ وە ئەو کەسە مەکوژن کە خوا
کوشتنی حەرام کردووە مەگەر هەق بێ (بکوژرێتەوە لەتۆڵەدا) ﴿ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ﴾ خوا ئەمانەی
بەئێوە ڕاسپاردوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بۆ ئەوەی تێ بگەن (و ژیری خۆتان بەکاربهێنن) ﴿١٥١﴾

﴿وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ﴾ وە نزیکی ماڵی هەتیوان مەکەونەوە ﴿إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ مەگەر بەو شێوەی
کەجوانترو چاکتر بێت (بۆ ئەوان) ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُ﴾ تا باڵغ دەبێت و دەگاتە هێزی خۆی ﴿وَأَوْفُوا الْكَيْلَ
وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ﴾ وە پێوانەو کێشانە بێ زیادو کەم ئەنجام بدەن بەدادگەری ﴿لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا
وُسْعَهَا﴾ داوای هیچ ئەرك و فەرمانێك لەکەس ناکەین بەئەندازەی توانای خۆی نەبێت ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ
فَاعْدِلُوا﴾ وەکاتێك (بۆشایەتی دان و شتی تر) قسەتان کرد دادوەرو ڕاست بن ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ﴾
با (لەدژی) خزمی نزیکی خۆشتان بێت ﴿وَبِعَهْدِ اللَّهِ أَوْفُوا﴾ وەبەڵێن و پەیمانی خوا بەچاکی ببەنەسەر
﴿ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ﴾ خوا ئەوشتانەی بەئێوە ڕاسپاردوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە (١٥٢)
﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا﴾ (فەرمانی داوە کە) بێگومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کەڕاست و دروستە
﴿فَاتَّبِعُوهُ﴾ کەواتە شوێنی بکەون ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ﴾ و شوێنی کوێرە ڕێگا وڕێچکەکانی تر مەکەون
﴿فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ﴾ چونکە دوورتان دەخەنەوەو لاتان دەدەن لەڕێگەی خوا ﴿ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ﴾
خوا ئەو شتانەی بەئێوە ڕاسپاردوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بۆ ئەوەی پارێزکار و لە خواترس بن (١٥٣)
﴿ثُمَّ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾ لەپاش ئەوە تەوراتمان بەخشی بەمووسا ﴿تَمَامًا عَلَى الَّذِي أَحْسَنَ﴾ بۆ
تەواو کردنی چاکەو بەهرەمان بەرانبەر کەسێك کەبەچاکی پێی هەڵساوە ﴿وَتَفْصِيلًا لِكُلِّ شَيْءٍ﴾
وەڕوون کەرەوەی هەموو شتێك بێ ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً﴾ وە ڕێنیشاندەرو ڕێنموونیی و میهرەبانی بێ
﴿لَعَلَّهُمْ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ﴾ بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنن بەگەیشتنیان بەحوزوری پەروەردگاریان (لە ڕۆژی
دواییدا) (١٥٤) ﴿وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ﴾ وە ئەم قورئانە پیرۆزە بەفەڕ وپیتەمان ناردۆتە خوارەوە
﴿فَاتَّبِعُوهُ﴾ کەواتە ئێوەش شوێنی بکەون ﴿وَاتَّقُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ و خۆتان بپارێزن و (پارێزکاربن)
تا ڕەحمتان پێ بکرێت (١٥٥) ﴿أَنْ تَقُولُوا﴾ لەبەر ئەوەی نەڵێن ﴿إِنَّمَا أُنْزِلَ الْكِتَابُ عَلَىٰ طَائِفَتَيْنِ﴾ بێگومان
کتێب تەنها بۆ سەر دوو کۆمەڵی (گاوورو جوولەکە) نێراوەتە خوارەوە ﴿مِنْ قَبْلِنَا﴾ لەپێش
ئێمەدا ﴿وَإِنْ كُنَّا عَنْ دِرَاسَتِهِمْ لَغَافِلِينَ﴾ کەبەڕاستی ئێمە لەخوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی کتێبەکانیان
بێ ئاگابووین (١٥٦) ﴿أَوْ تَقُولُوا﴾ وە بۆ ئەوەی نەڵێن ﴿لَوْ أَنَّا أُنْزِلَ عَلَيْنَا الْكِتَابُ﴾ بەڕاستی ئەگەر
کتێبی ئاسمانی بۆ ئێمەش بهاتبایە ﴿لَكُنَّا أَهْدَىٰ مِنْهُمْ﴾ ئەوە ئێمە لەوان ڕێنموون تر دەبووین
﴿فَقَدْ جَاءَكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ﴾ ئێوە بێگومان بەڵگەو نیشانە (قورئان)ی ڕوونتان لە پەروەردگارتانەوە
بۆ هاتووە ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ کەڕێنموونیی و میهرەبانیەکی گەورەیە ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ كَذَّبَ بِآيَاتِ اللَّهِ﴾
کەواتە کێ ستەم کار ترە لەو کەسەی بێ باوەڕ بێت بەئایەتەکانی خواو بەدرۆی بزانێت ﴿وَصَدَفَ عَنْهَا﴾
وە ڕوویان لێ وەرگێڕێت ﴿سَنَجْزِي الَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ آيَاتِنَا﴾ لەمەو دوا بەزوویی تۆڵە دەسێنین لەوانەی
سەرپێچی دەکەن لە ئایەتەکانی ئێمە ﴿سُوءَ الْعَذَابِ﴾ بەسزایەکی بەدو سەخت ﴿بِمَا كَانُوا يَصْدِفُونَ﴾
بەهۆی ئەو لادانەوە کەدەیانکرد (١٥٧)

﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئاخـۆ ئـەوان چاوەڕوانی چ شـتێك دەكەن بێجگە لـەوەی مەلائیكە(ی
گیان كێشـان) یان بـۆ بێت ﴿أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ﴾ یـان پەروەردگارت بێت (ئـەی موحەممەد ﷺ) ﴿أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ
ءَايَٰتِ رَبِّكَ﴾ یـان هەندێك لەموعجیزەو نیشـانە ئاشـكراكانی پەروەردگارت بـەدی بێت ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ
ءَايَٰتِ رَبِّكَ﴾ ئـەو ڕۆژەی هەندێك لەنیشـانەو بەڵگە ڕوونەكانـی پەروەدگارت بەدی دێت ﴿لَا يَنفَعُ نَفۡسًا
إِيمَٰنُهَا﴾ باوەڕهێنان سـوود ناگەیەنێت بەهیچ كەس ﴿لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ﴾ كەپێشـتر بـڕوای نەهێنا بێت
﴿أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرٗاۗ﴾ یـان هیـچ خێروچاكەیەكـی نەكردبێـت لەگـەڵ ئیمانەكەیـدا ﴿قُلِ ٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا
مُنتَظِرُونَ﴾ بڵـێ: چـاوەڕوان بـن (هەڕەشـەیە) ئێمـەش چاوەڕوانـی دەكەین ﴿١٥٨﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ﴾
بەراسـتی ئەوانـەی ئاینەكەیـان بەش بـەش كـرد ﴿وَكَانُواْ شِيَعٗا﴾ و بوون بەچەنـد دەسـتەو تاقمێكەوە
﴿لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ﴾ تـۆ لەهیچ شـتێكدا لەئەوان نیت ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ﴾ بێگومـان كاری ئەوان تەنها
بـۆ لای خـوا دەگەڕێتەوە ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ پاشـان خـوا هەواڵیان پـێ دەدا بەهـەر كردەوەیەك
كەكردویانە ﴿١٥٩﴾ ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ﴾ هەر كەسـێك چاكە بـكات ﴿فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ﴾ ئەوە (لەڕۆژی دوایی
دا) دە ئەوەنـدەی چاكەكـەی پاداشـتی بـۆ هەیـە ﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ﴾ وە هـەر كەسـێك خراپـە بكات
﴿فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا﴾ ئـەوە تۆڵـەی لێ ناسـێنرێ تەنهـا بەوێنەی خۆی نەبـێ ﴿وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ و ئەوانە
سـتەمیان لـێ ناكرێـت ﴿١٦٠﴾ ﴿قُلۡ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ﴾ (ئەی موحەممـەد ﷺ) بڵێ بێگومان مـن پەروەردگارم
ڕێنموونیـی كـردووم ﴿إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ بۆ ڕێگای ڕاسـت ﴿دِينٗا قِيَمٗا﴾ ئاینێكی زۆر ڕاسـت و پاك
(كەهیچ لاریەكی تیا نی یە) ﴿مِّلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۚ﴾ ئایینی ئەو ئیبراهیمەیە كە لەهەموو ئایینە ناڕاسـتەكان
لایداوە بۆ پەرسـتنی خـوا بەتەنها ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ وە بە هیچ جۆرێك لـە هاوبەش پەیداكەران
نەبـووە ﴿١٦١﴾ ﴿قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵێ بێگومان نوێـژو (بەندایەتی) و قوربانی
﴿وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي﴾ و ژیـان و مردنم ﴿لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ هەر بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە ﴿١٦٢﴾
﴿لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ﴾ هیچ هاوبەشـێكی نی یە ﴿وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ﴾ و هـەر بەوە فەرمانم پێ دراوە ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾
وە مـن یەكەمـی نـاو هەمـوو موسـڵمانان و فەرمانبەردارانم (بۆ خـودا) ﴿١٦٣﴾ ﴿قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِي رَبّٗا﴾ (ئەی
موحەممـەد ﷺ) بڵـێ: ئایـا بێجگە لەخوا پەرسـتراوێكی تر بۆ خـۆم هەڵبژێرم ﴿وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖۚ﴾
لەكاتێكدا ئەو پەروەردگاری هەموو شـتێكە ﴿وَلَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٍ إِلَّا عَلَيۡهَاۚ﴾ و هەر كەسـێك هەر گوناهو
خراپەیەك بكات تەنها لەسەر خۆیەتی ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ﴾ وە هیچ كەسێكی گوناهكار گوناهی
كەسـێكی تـر هەڵناگرێـت ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ﴾ پاشـان گەڕانەوەتان هـەر بـۆلای پەروەردگارتانە
﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ﴾ ئەمجـا هەواڵتـان پـێ ئەدا بـەوەی كەئێوە تیایدا جیـاواز بوون ﴿١٦٤﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي
جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ وە خوا ئەو زاتەیە كە ئێوەی كردووە بەجێنشینانی زەوی (كۆمەڵ لەدوای كۆمەڵ
دێـن) ﴿وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ﴾ چەنـد پلـە هەندێكتانی بـەرز كردۆتەوە بەسـەر هەندێكی ترتاندا
﴿لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ﴾ بۆ ئەوەی تاقیتان بكاتەوە لەوەدا كەپێی بەخشیوون ﴿إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بەڕاستی
پەروەردگارت تۆڵە سـەندنی خێرایە (بۆ بەدكاران) ﴿وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمُۢ﴾ وە بەڕاسـتی ئەو لێبوردەی
میهرەبانە (بۆ چاكەكاران) ﴿١٦٥﴾

## سورەتی ﴿ الأعراف ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓمٓصٓ﴾ بە(ئەلیف، لام، میم، صاد) دەخوێنرێتەوە، خوا زاناترە بەماناو مەبەست پێی، بۆ
زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿١﴾ ﴿كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ (ئەم قورئانە)
نامەیەکە نێرراوەتە خوارەوەبۆ تۆ(ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿فَلَا يَكُن فِى صَدْرِكَ حَرَجٌ مِّنْهُ﴾ کەواتە دڵ
تەنگ مەبە(بەپەیڕەو نەکەرانی) ﴿لِتُنذِرَ بِهِۦ﴾ بۆ ئەوەی (ئەوان)بەم قورئانە بترسێنی ﴿وَذِكْرَىٰ
لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ و بیرخستنەوەو ئامۆژگاریش بێ بۆ بڕواداران ﴿٢﴾ ﴿ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾ پەیڕەوی ئەوە
بکەن کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە دابەزێنراوەتە خوارەوە بۆتان ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ﴾ وە بێجگە
لەئەو (خودا) شوێن هیچ پەرستراوانێکی تر مەکەون و مەیکەن بە پشتیوانی خۆتان ﴿قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾
ئێوە زۆر کەم بیر دەکەنەوە ﴿٣﴾ ﴿وَكَم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا﴾ وە چەندەها شار و گوندمان وێران کرد
﴿فَجَآءَهَا بَأْسُنَا بَيَٰتًا﴾ و سزای ئێمەیان بۆ هات لەشەودا ﴿أَوْ هُمْ قَآئِلُونَ﴾ یان ئەوان لەخەو و پشووی
نیوەڕۆدا بوون. ﴿٤﴾ ﴿فَمَا كَانَ دَعْوَىٰهُمْ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَآ﴾ جا کاتێك سزای ئێمەیان بۆهات هاوارو نزایان
هیچ نەبوو ﴿إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ بێجگە لەوەی کەدەیان ووت: بەڕاستی ئێمە ستەم کاربووین. ﴿٥﴾
﴿فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی پرسیار دەکەین لەوانەی کەپێغەمبەرانیان بۆ نێردرا
(کە چۆن پێشوازییان لێکردن) ﴿وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ وە بێگومان پرسیاریش دەکەین لەپێغەمبەران(کە
چۆن وەڵام درانەوە). ﴿٦﴾ ﴿فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ﴾ جا سوێند بەخوا بەڕاستی (ئەوەی کردوویانە)بۆیان
دەگێڕینەوە لەڕووی زانیاریەوە ﴿وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ﴾ وەئێمە هیچ کاتێك بێ ئاگا نەبووین (لێیان) ﴿٧﴾
﴿وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ﴾ کێشانەی ڕاست (بۆ کردەوەکانتان) لەو ڕۆژە دا دەبێت و گومانی تێدا نی یە
﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ جاهەر کەس کێشراو(ی چاك) ەکانی قورس بێت ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ ئەوە
ئەوانەن ڕزگارو گەیشتوو بەئامانج ﴿٨﴾ ﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ وە هەرکەس کێشراوی( چاکەکانی )
سووك بێت ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم﴾ ئەوانە کەسانێکن کەخۆیانیان دۆڕاندووەو زەرەر
مەندبوون ﴿بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ﴾ بەهۆی ئەوەی کەستەمیان کرد بەرانبەر بەڵگەو نیشانەکانی
ئێمە (و بەدرۆیان دانا) ﴿٩﴾ ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئێوەمان نیشتەجێ
و جێگیر کرد لەزەویدا ﴿وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ﴾ و جۆرەها هۆی ژیانمان تێیدا بۆ ڕەخساندن
﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ (بەڵام) ئێوە زۆر کەم سوپاس گوزارن ﴿١٠﴾ ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ﴾ سوێند
بێت بێگومان ئێوەمان بەدی هێنا و پاشان شکڵ و شێوەمان کێشان ﴿ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾
پاشان ووتمان بەفریشتەکان سوژدە ببەن بۆ ئادەم ﴿فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ﴾ هەموویان یەکسەر سوژدەیان
برد بێجگە لەئیبلیس (لەشەیتان) ﴿لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ کە لەسوژدە بەران نەبوو ﴿١١﴾

﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ﴾ (خـوا) فەرمـووی چـی بەرگـری کـردی کەسـوژدە نەبەیـت کاتێـك
فەرمانم پێکردی ﴿قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ﴾ (شەیتان) ووتی: من لە (ئادەم) چاکترم ﴿خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾
چونکـە منـت لـە ئاگـر دروسـت کـردووەو ئـەوت لەقـوڕ دروسـت کـردووە ﴿١٢﴾ ﴿قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا﴾
(خـوا) فەرمووی: (لە بەهەشـت) بـڕۆرە خوارەوە ﴿فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا﴾ چونکـە بۆت نی یە لەو
(بەهەشـتە)دا خۆت بەگەورەو زل بزانی ﴿فَاخْرُجْ﴾ یەکسەر دەرچۆ ﴿إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ﴾ بەڕاستی تۆ لەبێ
نـرخ و ڕیسـوایانی ﴿١٣﴾ ﴿قَالَ أَنظِرْنِي﴾ ووتـی مۆڵەتم بـدە (مەممرێنە) ﴿إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ تا ئـەو ڕۆژەی
زینـدوو دەکرێنـەوە ﴿١٤﴾ ﴿قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ﴾ (خـواش) فەرمـووی: بێگومان تۆ لەمۆڵـەت دراوانیت
﴿١٥﴾ ﴿قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ﴾ ووتی ئەی پەروەردگـار بەهۆی ئەوەوە کە گومڕات کردم بێگومان
بۆیان (ئادەم و نەوەکانی) دادەنیشـم ﴿صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ لەڕێگە ڕاستەکەی تۆدا ﴿١٦﴾ ﴿ثُمَّ لَآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ
أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ﴾ ئەمجـا سـوێندبێ بێگومان بۆیـان دەچم لەپێشـیانەوە و لەدوایانەوە ﴿وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن
شَمَائِلِهِمْ﴾ وە لـەلای ڕاستیان و لـەلای چەپیانـەوە ﴿وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ﴾ ئەوسـا نابینـی زۆربەیان
سـوپاس گوزاربـن ﴿١٧﴾ ﴿قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا﴾ (خـوا) فەرمووی: دەرچۆ تێیدا بـە لۆمەکراوی و
دەرکراوی ﴿لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ﴾ سوێندبێ بێگومان هەرکەس شوێنی تۆ کەوتبێت لەوان ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ
أَجْمَعِينَ﴾ ئـەوە بێگومـان دۆزەخ پـڕ دەکـەم لەئێـوە هەمووتـان ﴿١٨﴾ ﴿وَيَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾
وە(ووتمـان) ئەی ئادەم تۆو هاوسـەرەکەت نیشـتەجێ ی بەهەشـت بن ﴿فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ بخۆن
لەهەرچـی کەویسـت و حەزتان لێ بـوو ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ﴾ بەڵام نزیکی ئـەو درەختە مەکەونەوە
﴿فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ ئەگینـا لەسـتەم کاران دەبـن ﴿١٩﴾ ﴿فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ﴾ ئەمجـا شـەیتان خەیـاڵ و
خەتەرە و وەسوەسـەی خراپی خسـتە دڵیان ﴿لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْآتِهِمَا﴾ بۆ ئەوەی دەربخات
بۆیان ئەو عەیب و عەورەتەی کەشـاردبوویەوە لێیان (و بەدەرەوە نەبووە) ﴿وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ
الشَّجَرَةِ﴾ وە پێـی ووتـن: پەروەردگارتـان (لەبەر هیچ هۆیـەك) بەرگری ئەو درەختـەی لێ نەکردون
﴿إِلَّا أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ﴾ مەگەر لەبەر ئەوەی کەنەبنە دوو فریشتە ﴿أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ﴾ یان (لەبەهەشتدا)
بمێننـەوە بەهەمیشـەیی ﴿٢٠﴾ ﴿وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ﴾ وە سـوێندی بـۆ خـواردن ووتـی بێگومان
مـن لـە ئامۆژگاریکەرانی دڵسـۆزی ئێـوەم ﴿٢١﴾ ﴿فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ﴾ سـەرئەنجام بەخەڵەتانـدن هانی دان
﴿فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ﴾ جا کاتێك (لەبەروبوومی) ئەو درەختەیان چەشت ﴿بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا﴾ هەردووکیان
عەیب و عەورەتیان دەرکەوت ﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ﴾ وە دەسـتیان کرد بەداپۆشینی خۆیان
بەگەڵای (درەختانی) بەهەشـت ﴿وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا﴾ وە پەروەردگاریـان بانگی هەردووکیانی کرد ﴿أَلَمْ
أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ﴾ ئایا ئەو درەختەم قەدەغە نەکرد لێتان ﴿وَأَقُل لَّكُمَا﴾ وە ئایا پێم نەووتن ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ
لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ کە بێگومان شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە ﴿٢٢﴾

﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا﴾ هەردووكیان ووتیان ئەی پەروەردگارمان ئێمە ستەممان لەخۆمان كرد
﴿وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا﴾ جا ئەگەر لێمان نەبوری و میهرەبانیمان لەگەڵ نەكەیت ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ
ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لەزیانباران دەبین ﴿٢٣﴾ ﴿قَالَ ٱهۡبِطُواْ﴾ (خوا) فەرمووی بڕۆنە
خوارەوە(لەبەهەشت) ﴿بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ﴾ هەندێكتان دوژمنی هەندێكی ترتانن ﴿وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ
مُسۡتَقَرّٞ﴾ وە بۆتان هەیە لەزەویدا نیشتەجێ بوون ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ﴾ و هۆی ڕابواردن و ژیان تا ماوەیەك
﴿٢٤﴾ ﴿قَالَ فِيهَا تَحۡيَوۡنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ﴾ (خوا) فەرمووی: لەزەوی دا دەژین و لەویشدا دەمرن ﴿وَمِنۡهَا
تُخۡرَجُونَ﴾ و هەر لەویش دەردەهێنرێن (و زیندوو دەكرێنەوە) ﴿٢٥﴾ ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾ ئەی نەوەی ئادەم
﴿قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا﴾ بێگومان پۆشاكمان بۆ ناردوون ﴿يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ﴾ كەعەیب وعەورەتتان
دادەپۆشێ وە پۆشاكی جوان و ڕازاوەیش(مان بۆ ناردوون) ﴿وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ﴾ بەڵام پۆشاكی
ترسان لەخوا و پارێزكاری چاكترو باشترە ﴿ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەوەی باسكرا هەندێكە لەبەڵگەو
نیشانەكانی خوا ﴿لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوەی بیربكەنەوەو ئامۆژگاری وەرگرن ﴿٢٦﴾ ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ
ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ ئەی نەوەی ئادەم با شەیتان فریوتان نەدات و نەتانخەڵەتێنێ ﴿كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ﴾
هەرچۆنێ باوك و دایكتانی لەبەهەشت دەركرد ﴿يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا﴾ لەحاڵێكدا پۆشاكەكەیانی
لێ داكەندن ﴿لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ﴾ بۆ ئەوەی عەیب و عەورەتیان (دەربخات و) نیشانیان بدات ﴿إِنَّهُۥ
يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ﴾ بەڕاستی شەیتان خۆی و دەستەكەی دەتانبینن ﴿مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ﴾ لەجێگایەكەوە
كەئێوە ئەوان نابینن ﴿إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە شەیتانەكانمان گێڕاوە ﴿أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾
بەدۆست وخۆشەویست بۆ ئەوانەی كەبڕوا ناهێنن ﴿٢٧﴾ ﴿وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ﴾ وە كاتێك كردەوەیەكی
زۆر بەدو ناشیرینیان دەكرد (كە بەڕووتی تەواف كردن نموونەیەكیەتی) ﴿قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا﴾
دەیان ووت: لە باوو باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە ﴿وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ﴾ وە خوا فەرمانی ئەو (كردەوە)ی پێ
داووین ﴿قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بێگومان خوا فەرمان نادا بەكردەوەی
بەدو خراپ ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ ئایا بەدەم خواوە شتێك دەڵێن كەنایزانن و بێ ئاگان لێی؟ ﴿٢٨﴾
﴿قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ﴾ بڵێ پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە ﴿وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾
وە لەكاتی هەموو نوێژێكدا ڕاست ڕوو بكەنە خوا ﴿وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ﴾ و دڵسۆزانە
هاواری لێ بكەن و بیپەرستن ﴿كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ﴾ هەرچۆنێ لە یەكەم جارەوە (خوا) دروستی
كردون بەو شێوەیە دەگەڕێنەوە (بۆ لای خوا) ﴿٢٩﴾ ﴿فَرِيقًا هَدَىٰ﴾ دەستەیەكی ڕێنموونی كردوە
﴿وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۚ﴾ دەستەیەكیش گومڕایی بەسەریاندا چەسپا ﴿إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ﴾
بەڕاستی ئەوانە شەیتانەكانیان كرد ﴿أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بەدۆست و پشتیوانی خۆیان لەجیاتی خوا
﴿وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ﴾ وە وا گومان دەبەن كەڕێ نموونیی كراوون ﴿٣٠﴾

﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ ئەی نەوەی ئادەم، پۆشاکی جوان و ڕازاوەتان بپۆشن
لەکاتی هەموو نوێژ (چوونە مزگەوتیکتاندا) ﴿وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ﴾ وە بخۆن و بخۆنەوە
(لەوەی کە خوا حەلاڵی کردووە بۆتان) و زیادە ڕۆی مەکەن ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ بێگومان
خوا زیادەڕۆیانی خۆش ناوێت ﴿٣١﴾ ﴿قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ کێ
ڕازاندنەوە وجوانی و (نازونیعمەتە) خواییەکانی حەرام کردووە ﴿ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ﴾ کەخوا بۆ
بەندەکانی دروستی کردووە﴿وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ﴾ هەروەها ڕۆزی وخۆراکە پاك و خۆشەکان
(کێ حەرامی کردوون) ﴿قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەوانە بۆ
بڕوادارانە لەژیانی دونیادا (بێ بڕوایانیش لەپەنای ئەواندا بەشداری دەکەن) ﴿خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾
(بەڵام) لەڕۆژی دوایی دا تایبەتە بەبڕوادارانەوە ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾بەم شێوەیە ئایەتەکانمان
باس دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە ﴿لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾ بۆ گەل و کۆمەڵێك کە دەزانن و تێ دەگەن ﴿٣٢﴾
﴿قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ﴾ بڵێ بێگومان پەروەردگارم تەنها ئەو کردەوانەی حەرام کردوە کەزۆر بەدو
خراپن ﴿مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ﴾ ئەوانەی کە ئاشکران و ئەوانەش نهێنین ﴿وَٱلۡإِثۡمَ﴾ وە گوناهی (حەرام
کردووە) ﴿وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ وە دەست درێژی بەناهەق ﴿وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا﴾ وە(حەرامی کردوە)
شتێك بکەنە هاوبەش بۆخوا ﴿لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا﴾ کەبەڵگەی بۆ نەهاتووە ﴿وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾
وە (حەرامی کردووە) کەبەدەم خواوە شتانێك بڵێن کەنایزانن ﴿٣٣﴾ ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٞۖ﴾ وە بۆ هەموو
ئوممەتێ کاتێکی دیاری کراو هەیە (بۆ مردن و سزادانیان) ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ﴾ ئەمجا کاتێك ماوە(ی
مردن یا سزا) کەیان هات ﴿لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ﴾ ساتێك دواناکەون ﴿وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ﴾ و پێشیش ناکەون
﴿٣٤﴾ ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ﴾ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر بۆتان هات﴿رُسُلٞ مِّنكُمۡ﴾پێغەمبەرانێك لەخۆتان
﴿يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي﴾ئایەتەکانی منیان بۆ دەخوێندنەوە ﴿فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ﴾ جا هەر کەس خۆی پاراست(لە
نافەرمانی خوا) و کردەوەی چاکی کرد ﴿فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ئەوە مەترسی یان لەسەر نیە
وخەم و خەفەتیش ناخۆن ﴿٣٥﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ وە ئەوانەش کە بێ بڕوا بوون بەئایەتەکانی ئێمە
﴿وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ﴾ و خۆیان بەزل دەزانی لەبەرانبەر ئەو ئایەتانەدا ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ ئەوانە
هاوەڵانی ئاگرن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە بەهەمیشەیی تیایا دەمێننەوە ﴿٣٦﴾ ﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ
كَذِبًا﴾ جا کێ لەوە ستەمکار ترە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵبەستێ ﴿أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ﴾ یان
بێ بڕوا بێت بەئایەتەکانی خوا ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِۖ﴾ ئەوانە ئەو بەشەی بۆیان نوسراوە دوو
چاریان دەبێت ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا﴾ هەتا ئەو کاتەی نێردراوەکانمان (بۆ گیان کێشان) دێن بۆیان
﴿يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ﴾ دەیانمرێنن و(گیانیان دەکێشن) ﴿قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ﴾ پێیان دەڵێن
ئەوانەی لەجیاتی خوا ئێوە هاوارو نزاتان لێ ئەکردن لەکوێن ﴿قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا﴾ (لەوەڵامدا) دەڵێن
دیار نین و وون بوون لێمان ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ وە شایەتی دەدەن لەسەر خۆیان ﴿أَنَّهُمۡ كَانُواْ
كَٰفِرِينَ﴾ کە بێگومان ئەوانە لە دونیادا بێ بڕوا بوون ﴿٣٧﴾

﴿قَالَ ادْخُلُوا فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ فِي النَّارِ﴾ (خوا پێیانی) فەرمووە ئێوە لەگەڵ ئەو
ئوممەتانەی کەلە پێش ئێوەوە بوون لەجنۆکەو ئادەمیزاد بچنە ئاگری دۆزەخەوە ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ
أُخْتَهَا﴾ هەر جارێك دەستەیەك دەچنە ناویەوە نەفرین لەهاوبیرانی دەکات ﴿حَتَّىٰ إِذَا ادَّارَكُوا فِيهَا جَمِيعًا﴾
هەتا هەموو دەگەن بەیەك و کۆدەبنەوە یەك دەگرن ﴿قَالَتْ أُخْرَاهُمْ لِأُولَاهُمْ﴾ دواییەکانیان (کەشوێن
کەوتوو بوون) دەربارەی پێشوەکانیان (کەپێشەوا بوون) دەڵێن ﴿رَبَّنَا هَٰؤُلَاءِ أَضَلُّونَا﴾ ئەی پەروەردگارمان
ئەوانە ئێمەیان گومڕا کرد ﴿فَآتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ النَّارِ﴾ دە تۆش لەئاگردا دووقات سزایان بدە
﴿قَالَ﴾ (پەروەردگار) دەفەرموێ ﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ﴾ بۆ هەرکامتان (سزا) دوو بەرامبەرە ﴿وَلَٰكِن لَّا
تَعْلَمُونَ﴾ بەڵام ئێوە نازانن و بێ ئاگان ﴿٣٨﴾ ﴿وَقَالَتْ أُولَاهُمْ لِأُخْرَاهُمْ﴾ سەرۆك و چاو لێکراوەکان بە شوێن
کەوتووەکانیان دەڵێن ﴿فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ﴾ ئێوەش هیچ زیادە ڕێزێکتان بەسەر ئێمەدا نییە
﴿فَذُوقُوا الْعَذَابَ﴾ دە ئێوەش سزا بچەژن ﴿بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ بەهۆی ئەو (خراپانەوەی) دەتان
کرد ﴿٣٩﴾ ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ بەڕاستی ئەوانەی بێ بڕوا بوون بەئایەتەکانی ئێمە ﴿وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا﴾
وە خۆیان بەگەورەو زل دادەنا لە بەرامبەریاندا ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ﴾ ئەوانە دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ
ناکرێتەوە ﴿وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ﴾ و ناچنە بەهەشتەوە ﴿حَتَّىٰ يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾ هەتا حوشتر نەچێت
بەکونی دەرزی درومانداا ( ئەمەش مەرجێکە هەرگیز نایەتە دی) ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ﴾ ئا بەو جۆرە
تۆڵە لە تاوانباران دەسێنین ﴿٤٠﴾ ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ﴾ ئەوانەی لەدۆزەخدا فەرش و ڕاخەریان (لە ئاگرە)
﴿وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾ وە لەلای سەروشیانەوە لێفەو داپۆشەریان (لەئاگرە) ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ ئا بەو
جۆرە تۆڵە لەستەمکاران دەستێنین ﴿٤١﴾ ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ وە ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە
و کردەوەی چاکیشیان کردووە ﴿لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ داوالەهیچ کەس ناکەین زیادلەتوانای خۆی
﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ﴾ ئا ئەوانە هاوەڵانی بەهەشتن ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەوان هەمیشەیین تێیدا ﴿٤٢﴾
﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم﴾ ئەوەی لەدڵیاندا بوو بێت دامان ڕنی ﴿مِّنْ غِلٍّ﴾ لەکینە و ڕق (دەربارەی یەکتری)
﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ﴾ ڕووبارەکان دەڕۆن بەژێر (کۆشك وباخەکان)یاندا ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي
هَدَانَا لِهَٰذَا﴾ وە دەڵێن سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەڕێنموونیی کردین بۆ ئەم ڕێگایە ﴿وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ﴾ کە
ئێمە هەرگیز ڕێبازی ڕاست شارەزا نەدەبووین ﴿لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ﴾ ئەگەر خوا ڕێنموونی نەکردینایە
﴿لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ﴾ سوێند بەخوا بێگومان نێرراوەکانی پەروەردگارمان ڕاستیان هێنا
﴿وَنُودُوا أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ﴾ وە بانگیان لێ دەکرێت بەمەی کەئەو بەهەشتە ﴿أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ
تَعْمَلُونَ﴾ پێتان بەخشرا بەهۆی ئەو کردەوە (چاکانەی کە) دەتان کرد ﴿٤٣﴾

﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ﴾ وە بەهەشتیەکان بانگ دەکەن ﴿أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ﴾ لەدۆزەخیەکان ﴿أَن قَدۡ وَجَدۡنَا
مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا﴾ بێگومان ئێمە ئەوەی کەپەروەردگارمان بەڵێنی پێداین ڕاست بوو پێی گەیشتین
﴿فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ﴾ جا ئایا ئێوەش ئەوەی کەپەروەردگارتان بەڵێنی پێدان ڕاست بوو پێی
گەیشتن؟ ﴿قَالُواْ نَعَمۡۚ﴾ دەڵێن بەڵێ ﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ﴾ پاشان جارچیەك جاری دەدا لەنێوانیاندا
﴿أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ کەنەفرینی خوا لەسەر ستەمکاران بێت ﴿٤٤﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾
ئەوانەی بەرهەڵستی لە ڕێی خوا دەکەن ﴿وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا﴾ و دەیان ویست ئەو(ڕێگایە) بەخوارو
نارێك نیشان بدەن ﴿وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان بێ بڕوا بوون بەڕۆژی دوایی ﴿٤٥﴾ ﴿وَبَيۡنَهُمَا
حِجَابٞۚ﴾ و لەنێوانیاندا پەردەو جیاکەرەوەیەك هەیە ﴿وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ﴾ بەسەر ئەعرافەوە (کەبەرزاییەکە
لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا) پیاوانێك هەن ﴿يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ﴾ هەر یەکە لەبەهەشتی
ودۆزەخیەکان دەناسنەوە بەهۆی نیشانە (وشێوەی تایبەت)ی یانەوە ﴿وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ﴾
جا بەهەشتیەکان بانگ دەکەن و دەڵێن: سەلامتان لێ بێت ﴿لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ﴾ نەچوونەتە
ناویەوە بەلام ئومێدیان هەیەو بەتەمان بچنەناوی ﴿٤٦﴾ ﴿وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ﴾ هەر کاتێك ڕوویان لادرێ
و وەرگێڕدرێ ﴿تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾ بەرەو لای دۆزەخیەکان ﴿قَالُواْ رَبَّنَا﴾ دەڵێن ئەی پەروەردگارمان
﴿لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ مەمانخەنە ڕیزی گەلی ستەم کاران ﴿٤٧﴾ ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا﴾ وە
ئەوانەی وان بەسەر ئەعرافەوە پیاوانێك بانگ دەکەن ﴿يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ﴾ کەبەنیشانەی تایبەتی
یان دا دەیان ناسن ﴿قَالُواْ﴾ دەڵێن ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ﴾ کۆمەڵەکەتان سوودی پێ نەگەیاندن
﴿وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ﴾ هەروەها خۆبەزل زانین و لەخۆبایی بوونتان بەکەڵکتان نەهات ﴿٤٨﴾
﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ﴾ ئایا ئەوانە(هەژارە باوەڕدارەکان) هەر ئەوانە نین کەئێوە (لەدونیادا) سوێندتان
دەخوارد ﴿لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ﴾ کەخوا بەر میهرەبانی خۆیان ناخات ﴿ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ﴾ (خوا
بەهەژارە باوەڕدارەکان ئەڵێ) بچنە بەهەشت هیچ مەترسیەکتان لەسەر نی یە ﴿وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ﴾ و ئێوە
خەم ناخۆن ﴿٤٩﴾ ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ﴾ وە دۆزەخیەکان بانگ و هاوار لەبەهەشتیەکان دەکەن
﴿أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ﴾ (دەڵێن) هەندێ ئاومان پێ ببەخشن ﴿أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ﴾ یان هەندێ لەو ڕۆزیەی
کەخوا پێ ی بەخشیوون ﴿قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ (لەوەڵامیاندا) دەڵێن: خوا هەردووکی
لەسەر بێ بڕوایان حەرام کردووە ﴿٥٠﴾ ﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ﴾ ئەوانەی کەئاینەکەی خۆیان کردبووە
﴿لَهۡوٗا وَلَعِبٗا﴾ سەرقاڵی بێ سوود و گاڵتە جاڕی ﴿وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ﴾ وە ژیانی دونیا هەڵیخەڵەتاندن
﴿فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ﴾ بۆیە ئەمڕۆ ئەوان لەبیرخۆمان دەبەینەوە ﴿كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا﴾ هەرچۆنێك
ئەوان دیداری ئەم ڕۆژەیان لەبیری خۆیان بردبۆوە ﴿وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ﴾ وە (لەبەرئەوەی)
ئایەتەکانی ئێمەیان ئینکار دەکرد (دانیان پێدا نەدەهێنا) ﴿٥١﴾

﴿وَلَقَدۡ جِئۡنَٰهُم بِكِتَٰبٍ﴾ سـوێند بەخوا بێگومان ئێمـە كتێبێكمان بۆهێناون ﴿فَصَّلۡنَٰهُ عَلَىٰ عِلۡمٍ﴾ لەڕووی زانستەوە بەڕوونی شیمان كردۆتەوە ﴿هُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ كەڕێنموونـی و میهرەبانی یە بۆ كەسانێك بڕوا دەهێنن ﴿٥٢﴾ ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأۡوِيلَهُۥۚ﴾ ئایا چاوەڕوانی چی دەكەن بێجگە لە سەرئەنجامی هەڕەشـەكانی ئەو (قورئانە)؟ ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي تَأۡوِيلُهُۥ﴾ ئەو ڕۆژەی كە سـەرئەنجامی (هەڕەشـەكانی) بەدی دێـت ﴿يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبۡلُ﴾ ئەوانـەی لـەوەو پێش لەبیریـان كردبـوو دەڵێن ﴿قَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّ﴾ بەڕاسـتی نێرراوەكانـی پەروەردگارمـان بەڕاسـتیەوە هاتـن ﴿فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشۡفَعُواْ لَنَآ﴾ جـا ئایـا (ئەمـڕۆ) تـكا كارانێـك بـۆ ئێمە هەیـە تكامـان بۆ بكـەن ﴿أَوۡ نُرَدُّ فَنَعۡمَلَ غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ﴾ یا بگەڕێنرێینەوە بۆ دونیا تا كردەوەی چاك بكەین نەك ئەوەی دەمان كرد ﴿قَدۡ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ بێگومان خۆیانیـان دۆڕانـد ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ ئـەوەی هەڵیـان دەبەسـت وون بـوو لێیـان ﴿٥٣﴾ ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي﴾ بەڕاسـتی پەروەردگـار تـان ئـەو خوایەیـە ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾ كـە ئاسـمانەكان و زەوی لەشـەش ڕۆژدا دروسـت كـردووە ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ﴾ پاشـان (خـوا) بەرز بووەوە سـەر عەرش و قەراری گرت (ئێمە ئیمانمان پێ یەتی بەڵام شـێوەكەی نازانین پرسـیار كرا لە ئیمامی مالیك دەربارەی (اسـتواء) فەرمووی وەسـتانەكە حەقیقەتـەو چۆنێتیەكەی نەزانراوەو پرسـیاركردن دەربارەی بیدعـەتـە وباوەڕبوون پێ ی واجبە) ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ﴾ بە(تاریكایی) شەو (ڕۆشنایی) ڕۆژ دادەپۆشێت (بەپێچەوانەشەوە) ﴿يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا﴾ (ڕۆژ بەشوێن شەوەوەیە بەخێرایی) وشـەو بەشـوێن ڕۆژەوەیـە بەخێرایی ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ﴾ خـۆرو مانگ و ئەسـتێرەكانیش ﴿مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓۗ﴾ ژێـر بـار كـراوون بەفەرمانـی خـۆی ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ﴾ بێداربـن كەبـەدی هێنـان و فەرمانـدان هەر بـۆ خوایە ﴿تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ پاك و بێگـەردە (لەهەموو كـەم و كوڕی یـەك) خـوای پەروەردگـاری هەمـوو جیهانیـان ﴿٥٤﴾ ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ﴾ لەپەروەردگارتـان بپاڕێنـەوە بەزەلیلی(و كڕوزانەوە) و بەنهێنی ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ﴾ بێگومان خوا دەسـت درێژی كارانـی خـۆش ناوێـت ﴿٥٥﴾ ﴿وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا﴾ خراپـەكاری مەكـەن لەزەویـدا پـاش ئـەوەی كەخـوا چاكی كردووە ﴿وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ﴾ وە هـاوار و نزا بەرن بۆ خوا بەتـرس و ئومێدەوە ﴿إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بەڕاستی میهرەبانی خوا لەچاكەكارانەوە نزیكە ﴿٥٦﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ﴾ وە ئەو(خـوا) زاتێكـە بایەكان دەنێرێـت ﴿بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦۖ﴾ بەموژدەدەر پێـش (بارانی) ڕەحمەتی پەروەردگـار ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابٗا ثِقَالٗا﴾ هەتا كاتێ هەوری قورس(ی باراناوی) هەڵدەگرن ﴿سُقۡنَٰهُ لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ﴾ دەینێریـن بۆ وولاتێكی مردوو (وشـكی بێ گیا) ﴿فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ﴾ جا بەو (هەورە) بـاران دەبارێنین ﴿فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ﴾ بەهۆی ئەوەوە هەمـوو بەرووبومێك دەردەهێنین (لە زەویدا) ﴿كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ هەربەووێنەیەمردووەكانلەزەوی دەردەهێنین (وزیندوویان دەكەینەوە) ﴿لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾ تا ئێوە بیربكەنەوە ﴿٥٧﴾

﴿وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ﴾ زەوی وخاکی پاك و بەپیت ﴿يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ﴾ رووەك و شینایيەكەی بەفەرمانی
پەروەردگاری دەڕوێت ﴿وَٱلَّذِي خَبُثَ﴾ وە ئەوەی پیس و بیٚ خێرە ﴿لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗاۚ﴾ دڕك و داڵ نەبیٚ
لیٚ ی ناڕوێت و دەرنایەت ﴿كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ ئا بەو جۆرە ئایەتەكانی خۆمان باس دەكەین
﴿لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ﴾ بۆ گەلێك كە سوپاسگوزاربن ﴿٥٨﴾ ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ﴾ سوێند بەخوا
بێگومان ئێمەنوحمان ڕەوانە كرد بۆ لای گەلەكەی ﴿فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ ووتی: ئەی گەلەكەم
تەنها خوا بپەرستن ﴿مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾ ئێوە هیچ پەرستراوێكتان نی یە بێجگە لەو (خوا) ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ
عَلَيۡكُمۡ﴾ بەڕاستی من دەترسم (دووچاری) ئێوە بیٚ ﴿عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ سزای ڕۆژێكی گەورە
(كە ڕۆژی دوایی یە) ﴿٥٩﴾ ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ﴾ كاربەدەست و دەسەلاٚتدارانی گەلەكەی ووتیان
﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆ لە گومڕاییەكی ئاشكرادا دەبینین ﴿٦٠﴾ ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ﴾
فەرمووی: ئەی گەلەكەم هیچ گومڕایی یەك لەمندا نی یە ﴿وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بەڵكو
من نێرراوم لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ﴿٦١﴾ ﴿أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي﴾ پەیامەكانی پەروەردگارم
ڕادەگەیەنم پێتان ﴿وَأَنصَحُ لَكُمۡ﴾ وە ئامۆژگاریتان دەكەم ﴿وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ و ئەوەی من
لەلایەن خواوە دەیزانم ئێوە نایزانن ﴿٦٢﴾ ﴿أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ ئایا سەرتان سوڕماوە
لەهاتنی پەیام و یادخەرەوەیەك لەلایەن پەوەردگارتانەوە ﴿عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ﴾ بۆ پیاوێك لەخۆتان
(كەنوحە) ﴿لِيُنذِرَكُمۡ وَلِتَتَّقُواْ﴾ بۆ ئەوەی ئاگادارتان كاتەوەو بتانترسێنێت و خۆتان بپارێزن
(لەنا فەرمانی خوا) ﴿وَلَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ بۆ ئەوەی ڕەحمتان پیٚ بكرێت ﴿٦٣﴾ ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيۡنَٰهُ﴾ دوای
ئەوە بڕوایان پیٚ نەهێنا ئێمەش (نووح)مان ڕزگار كرد ﴿وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ﴾ هەروەها ئەوانەش
لە گەڵیدا بوون لەكەشتیەكەدا ﴿وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ﴾ پاشان ئەوانەی بڕوایان نەبوو بە
ئایەتەكانمان نوقممان كردن و خنكاندمانن ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانە كوٚمەڵی (دڵ)
كوێران بوون ﴿٦٤﴾ ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ﴾ وە ناردمان بۆ لای گەلی عاد براكەیان كە هوود(پێغەمبەرە)
﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ فەرمووی: ئەی گەلەكەم بەتەنها خوا بپەرستن ﴿مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ﴾ هیچ
پەرستراوێكتان نی یە بێجگە لەو ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە پارێزكار نابن ولەخودا ناترسن؟! ﴿٦٥﴾
﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ﴾ ئەو كاربەدەست و دەسەلاٚتدارانەی كە بیٚ بڕوابوون لە گەلەكەی
ووتیان ﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٖ﴾ بە ڕاستی ئێمە تۆ لە گێلی و نەفامیدا دەبینین ﴿وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾
وە بە ڕاستی وا گومان دەبەین كە تۆ لەدرۆزنان بیت ﴿٦٦﴾ ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي سَفَاهَةٞ﴾ فەرمووی ئەی
گەلەكەم هیچ گێلی و نەفامی یەك لە مندا نی یە﴿وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بەڵكو من نێرراوێكم
لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانیانەوە ﴿٦٧﴾

﴿أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي﴾ پەیامەکانی پەروەردگارم بەئێوە ڕادەگەیەنم ﴿وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ﴾ وە من بۆ ئێوە
ئامۆژگاریکەرێکی دەست پاك و ئەمینم ﴿٦٨﴾ ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ ئایا سەرتان سوڕماوە
لەهاتنی (نیگاو) ئامۆژگاری لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ﴾ بۆ پیاوێك
لەخۆتان تا بتانترسێنێت ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ﴾ وە بیری (چاکەکانی خوا) بکەنەوە کاتێ ئێوەی کرد
﴿خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ﴾ بەجێنشین لەپاش گەلی نووح ﴿وَزَادَكُمْ فِي ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً﴾ وە لەش
وقەلافەتی ئێوەی لەوان گەورەتر دروست کرد ﴿فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ﴾ کەواتە بیری چاکەو بەهرەکانی
خوا بکەنەوە ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بۆ ئەوەی ڕزگارتان ببێت ﴿٦٩﴾ ﴿قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ ٱللَّهَ وَحْدَهُۥ﴾ ووتیان
ئایا بۆ ئەوە هاتووی بۆ ناومان کە بەتەنها خوا بپەرستین ﴿وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا﴾ وە وازبێنین
لەوەی باوك و باپیرانمان دەیانپەرستن ﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ﴾ کەواتە ئەو (سزایە)ی کەبەڵێنت پێ داوین
بۆمان بێنە دی ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست دەکەیت و لەڕاست گۆیانی ﴿٧٠﴾ ﴿قَالَ قَدْ وَقَعَ
عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾ فەرمووی: بێگومان لەلایەن پەروەردگارتانەوە تووشتان بووە ﴿رِجْسٌ
وَغَضَبٌ﴾ سزاو خەشم و توڕەیی ﴿أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسْمَآءٍ﴾ ئایا دەمە قاڵێم لەگەڵدا دەکەن دەربارەی
چەند ناوێك ﴿سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم﴾ کەئێوەو باوو باپیرانتان ناوتانە لەبتانێك ﴿مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن
سُلْطَٰنٍ﴾ کەخوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەریان نەناردۆتە خوارەوە ﴿فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ﴾
جا کەواتە چاوەڕوانی بکەن منیش لەگەڵتان لەچاوەڕوانانم ﴿٧١﴾ ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا﴾
ئەوسا ئەوو ئەوانەش لەگەڵی بوون (وباوەڕیان پێ هێنا بوو) بەمیهرەبانیەك لەلایەن خۆمانەوە ڕزگارمان
کردن ﴿وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانەشمان لەڕیشە هێنا ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ۖ وَمَا كَانُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ کەئایەتەکانی
ئێمەیان بەدرۆ دادەناو باوەڕدار نەبوون ﴿٧٢﴾ ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا﴾ وە بۆ گەلی سەمودیش
صالحی برایانمان نارد ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ فەرمووی: ئەی گەلەکەم خوا بەتەنها بپەرستن
﴿مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾ جگە لەو پەرستراوێکی ترتان نی یە ﴿قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بێگومان
موعجیزەیەکی ڕوونتان لەپەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە ﴿هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً﴾ ئەمە حوشتری
خوایە کە موعجیزەیەکە بۆ ئێوە ﴿فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِيٓ أَرْضِ ٱللَّهِ﴾ جا لێ ی گەڕێن با بخوا و بلەوەڕێت
لەزەوی خوادا ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ﴾ و ئازاری مەدەن و دەستی بۆ مەبەن بەخراپە ﴿فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ
أَلِيمٌ﴾ (ئەگەر وابکەن) تووشی سزایەکی سەخت و بەئازار دەبن ﴿٧٣﴾

﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ﴾ بیـر بکەنەوە لەو کاتەی کەخوا ئێوەی گێڕا ﴿خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ﴾ بەجێنشـین لەپـاش هۆزی عـاد ﴿وَبَوَّأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لەزەویدا دایمەزراندن و نیشـتەجێی کردن ﴿تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورٗا﴾ لەدەشـتەکانیدا کۆشـکی بـەرز دروسـت دەکـەن ﴿وَتَنۡحِتُونَ ٱلۡجِبَالَ بُيُوتٗاۖ﴾ وە لەشـاخەکانی دا، ماڵ و خانوو دائەتاشن ﴿فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ﴾ دەبیربکەنەوە لەچاکە گەورەکانی خوا (وسوپاسی بکەن) ﴿وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ﴾ و خراپەکاری مەکەن لەوڵاتدا (و مەبن بەخراپەکار و گێرە شـێوێن) ﴿٧٤﴾ ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ﴾ دەسـەڵاتدارە لووت بەرزەکانی گەلەکـەی ووتیـان ﴿لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ﴾ بەوانـەی لاوازو ژێـر دەسـتەکرا بـوون ﴿لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ﴾ ئەوانـەی بڕوایان هێنا بوو لەناویاندا ﴿أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ﴾ ئایا دەزانن کەصالح ڕەوانە کـراوە لەلایـەن پەوەردگاریەوە ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ﴾ ووتیان بێگومـان ئێمە بڕوادارین بەوەی کەصالح پێی ڕەوانە کراوە ﴿٧٥﴾ ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ﴾ ئەوانەی خۆیان بەزل دەزانی ووتیان ﴿إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ بەڕاسـتی ئێمـە بـێ باوەڕین بـەوەی کەئێـوە بڕواتان پـێ هێناوە ﴿٧٦﴾ ﴿فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ﴾ ئەمجـا حوشـترەکەیان سـەربڕی ﴿وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ﴾ وە سەرکەشـییان کـرد لەفەرمانـی پەروەدگاریـان ﴿وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ﴾ وە ووتیـان: ئـەی صالـح ﴿ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ﴾ ئـەو بەڵێنی (سـزا) ی بەئێمـە دەدەیـت بۆمـان بێنـەدی ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ ئەگـەر تـۆ لەپێغەمبەرانـی ﴿٧٧﴾ ﴿فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ﴾ بەهـۆی ئـەوەوە بومـە لەرزەیەکـی بەتیـن لێـی دان ﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾ ئیتـر هەموویـان لەمـاڵ وخانووەکانیان دا بوون بە(لاشـەی) بێ گیان و بـێ جوڵە ﴿٧٨﴾ ﴿فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ﴾ جـا صالـح ڕووی لـێ وەرگێـڕان(و وازی لـێ هێنـان) ﴿وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَالَةَ رَبِّي﴾ وە فەرمووی ئەی گەلەکەم سوێند بەخوا بەڕاستی پەیامی پەروەردگارم پێ ڕاگەیاندن ﴿وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ﴾ وە ئامۆژگاریم کردن و دڵسۆز بوم بۆتان ﴿وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ بەڵام ئێوە ئامۆژگارو دڵسۆزانتان خۆشـناویت ﴿٧٩﴾ ﴿وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ﴾ وە لوطـمان نارد، کاتێـك بەگەلەکەی ووت ﴿أَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ﴾ چۆن ئێوە ئەو کارە زۆر بەدو خراپە دەکەن کە (نێر بازیە) ﴿مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ هیچ کەس لەجیهاندا پێشـتان نەکەوتوە لەو (کارەپیسـە)دا ﴿٨٠﴾ ﴿إِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهۡوَةٗ﴾ بەڕاسـتی ئێوە بەپیاوان ئارەزوتان دەشـکێنن؟ ﴿مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ﴾ لەجیاتی ئافرەتان؟ ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ﴾ بەڵکو ئێوە دەستەیەکی زیادە ڕۆن ﴿٨١﴾

﴿وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ﴾ وە وەڵامی گەلەکەی هیچ نەبوو ﴿إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ﴾ بێجگە لەوەی کەووتیان ﴿أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ﴾ لەشار و وولاتەکەتان (لووط و ئیمانداره‌کان) دەربکەن ﴿إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانە کەسانێکن کەخۆیان پاك و تەمیز ڕادەگرن ﴿٨٢﴾ ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ﴾ ئەمجا ئێمە خۆی وشوێنکەوتوانیمان ڕزگار کرد ﴿إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ جگە لەخێزانەکەی کە لەتیاچووان بوو ﴿٨٣﴾ ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا﴾ جا بارانێکمان بەسەرا باراندن (بەرد بارانمان کردن) ﴿فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ جا سەیر کە سەرئەنجامی تاوان باران چۆن بوو (وچیان لێ هات) ﴿٨٤﴾ ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾ وە بۆ گەلی مەدیەنیش شووعەیبی برایانمان نارد ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ فەرمووی ئەی گەلەکەم بەتەنها خوا بپەرستن ﴿مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾ هیچ پەرستراوێکتان نی یە بێجگە لەو ﴿قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بێگومان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەو موعجیزەیەکی ڕوون و ئاشکراتان بۆ هاتووە ﴿فَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ﴾ کەواتە لە پێوانە و کێشانەتان دا ڕێك و ڕاست بن ﴿وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ﴾ و لەشت و مەکی خەڵکی کەم مەکەنەوە (بەدزی) ﴿وَلَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا﴾ وە لەزەویدا خراپەکاری مەکەن لەپاش چاکردنی ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەوەی باسکرا چاکترە بۆتان ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ئیماندارن ﴿٨٥﴾ ﴿وَلَا تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٍ﴾ وە لەسەر هەموو ڕێگایەك دامەنیشن (ڕێگە مەگرن) ﴿تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ هەڕەشە بکەن و بەرهەڵستی ڕێگەی خوا بکەن ﴿مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ﴾ لەو کەسەی باوەڕی پێ هێنابێ ﴿وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ و بتانەوێت ڕێگای خوا بەلاری وچەوتی بخەنەڕوو ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا﴾ وە بیری ئەو کاتە بکەنەوەکە ئێوە کەم بوون ﴿فَكَثَّرَكُمْ﴾ پاشان خوا زۆری کردن ﴿وَٱنظُرُواْ﴾ دەی سەرنج بدەن ﴿كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ سەرئەنجامی خراپەکاران چۆن بوو (وچیان لێ هات) ﴿٨٦﴾ ﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ﴾ وە ئەگەر کۆمەڵێك لەئێوە ﴿ءَامَنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ﴾ باوەڕیان هێنا بێت بەو پەیامەی بەمندا نێردراوە ﴿وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ﴾ وە کۆمەڵێکی ترتان باوەڕیان نەهێنا بێت ﴿فَٱصْبِرُواْ﴾ ئەوە ئارام بگرن ﴿حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا﴾ هەتا خوا بڕیار دەدات لەنێوانماندا ﴿وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾ وە ئەو (خوا) باشترینی بڕیاردەرانە ﴿٨٧﴾

﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ﴾ ئەوکاربەدەست ودەسەڵاتدارانەی کەخۆیان بەگەورە دائەنا لەناو
گەلەکەی (شوعەیب) دا ووتیان ﴿لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ﴾ ئەی شوعەیب بێگومان دەرت دەکەین.
﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ﴾ وە ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە لەگەڵ تۆدا ﴿مِن قَرۡيَتِنَآ﴾ لە شارە کەمان ﴿أَوۡ لَتَعُودُنَّ
فِي مِلَّتِنَاۚ﴾ یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ئاینی ئێمە ﴿قَالَ﴾ (شوعەیب) فەرمووی: ﴿أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ﴾ ئەگەر
حەزیش نەکەین و پێشمان ناخۆش بێت ﴿٨٨﴾ ﴿قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ بێگومان درۆیەکی گەورەمان
بۆ خوا هەڵبەستوە. ﴿إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم﴾ ئەگەر بگەڕێینەوە ناو ئایینەکەتان (کە بت پەرستی یە)
﴿بَعۡدَ إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ﴾ پاش ئەوەی کەخوا ڕزگاری کردین لێ ی ﴿وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ﴾ ڕەوانیە
بۆمان بگەڕێینەوە بۆ ناو ئەو (بت پەرستی یە) ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ﴾ مەگەر خوای پەروەردگارمان
بیەوێت. ﴿وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ﴾ زانست و ئاگاداری پەروەردگارمان هەموو شتێکی گر تۆتەوە. ﴿عَلَى
ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ﴾ تەنها پشتمان بە خوا بەستووە ﴿رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا﴾ (ووتیان): ئەی پەروەردگارمان،
لەنێوان ئێمە و گەلەکەماندا حوکم و بڕیار بدە ﴿بِٱلۡحَقِّ﴾ بەهەق ﴿وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ﴾ تۆ باشترینی
بڕیار دەرانی ﴿٨٩﴾ ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ﴾ دەستەو ئەشرافی هۆزەکەی کە بێ بڕوا بوون ووتیان
﴿لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا﴾ سوێند بە خوا ئەگەر ئێوە شوێن شوعەیب بکەون ﴿إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ﴾ بەڕاستی
ئەو کاتە زیان لێکەوتوان خۆتانن ﴿٩٠﴾ ﴿فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ﴾ جا بەهۆی ئەوە وە بومەلەرزەیەکی توند
لێی دان ﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾ هەموویان لەماڵەکانیاندا لەناوچوون (بێ گیان و جووڵە کەوتن)
﴿٩١﴾ ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا﴾ ئەوانەی کە شوعەیبیان بەدرۆزانی (باوەڕیان پێ نەهێنا) ﴿كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ
فِيهَاۚ﴾ (وا تیا چوون) وەك هەر لەو ماڵا نەدا نە بووبن (وتییدا نەژیابن) ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا﴾
ئەوانەی کە شوعەیبیان بە درۆزانی (باوەڕیان پێ نەهێنا) ﴿كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ هەر ئەوان خەسارۆمەند
بوون ﴿٩٢﴾ ﴿فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ﴾ ئیتر (شوعەیب) ڕووی لێ وەرگێڕان ﴿وَقَالَ يَٰقَوۡمِ﴾ فەرمووی پێیان:
ئەی گەلەکەم ﴿لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی من پەیامی پەروەردگارم بە
ئێوە گەیاند ﴿وَنَصَحۡتُ لَكُمۡۖ﴾ و ئامۆژگاریم کردن ﴿فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ﴾ جا چۆن
بۆ هۆزی بێ بڕواو کافر غەم و خەفەت بخۆم ﴿٩٣﴾ ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ﴾ ئێمە بۆ هەر گوندو
شارێك پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردبێت ﴿إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا﴾ دانیشتوانیمان تووش کردووە ﴿بِٱلۡبَأۡسَآءِ
وَٱلضَّرَّآءِ﴾ بەنەبوونی و کەم دەرامەتی (بەزیان و نەخۆشی) ﴿لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ﴾ تا لە پەروەردگار
بپاڕێنەوە و پەشیمان ببنەوە ﴿٩٤﴾ ﴿ثُمَّ بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ﴾ لەدواییدا خراپە و ناخۆشیەکەمان
گۆڕی بەچاکە و خۆشی ﴿حَتَّىٰ عَفَواْ﴾ هەتا زۆر بوون و گەشەیان کرد لەماڵ و سەروەتدا. ﴿وَّقَالُواْ﴾ وە
ووتیان: ﴿قَدۡ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ﴾ بێگومان باو و باپیرانمان تووشی زیان و ناخۆشی و نەخۆشی
بوون ﴿فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ﴾ جا لەناکاودا سزامان گرتنی ﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ لەکاتێکدا کە هەستیان
نەدەکرد ﴿٩٥﴾

﴿وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ﴾ وە ئەگەر دانیشتوانی شـار و گوندەکان ﴿ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ﴾ باوەڕیـان بهێنایە و خۆیان
بپاڕاسـتایە (لە قەدەغە کراوەکانی خوا) ﴿لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ بەڕاسـتی دەرگای
بەرەکاتی ئاسمان و زەویمان بۆ دەکردنەوە ﴿وَلَٰكِن كَذَّبُواْ﴾ بەڵام بڕوایان نەهێنا (بەپێغەمبەرەکەیان)
﴿فَأَخَذۡنَٰهُم﴾ ئەمجا ئێمەش ئەوانمان گرت و سزامان دان ﴿بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ بەهۆی ئەو خراپانەوەی
دەیـان کـرد ﴿٩٦﴾ ﴿أَفَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ﴾ ئایا خەڵکی ئەو شـار و گوندانە ترسـیان نەبوو ﴿أَن يَأۡتِيَهُم بَأۡسُنَا
بَيَٰتٗا﴾ لـەوەی سـزای ئێمەیـان بۆبێـت لـە شـەودا ﴿وَهُمۡ نَآئِمُونَ﴾ کاتێـك ئـەوان خەوتـوون ﴿٩٧﴾
﴿أَوَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ﴾ وە ئایاخەڵکـی ئـەو شـار و گوندانە ترسـیان نەبـوو ﴿أَن يَأۡتِيَهُم بَأۡسُنَا﴾ لەوەی
کەسـزای ئێمەیـان بـۆ بێت ﴿ضُحٗى وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ﴾ لە چێشـتەنگاودا لەکاتێکدا یـاری و گاڵتە دەکەن
﴿٩٨﴾ ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ﴾ جـا ئایـا لـە پیلانی خـوا نەترسـان و بـێ باك بـوون ﴿فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ﴾
دەی کـەس لەپیلانـی خـوا دڵنیـا نابێـت ﴿إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ جگـە لەکەسـانی زەرەرمەنـد نەبێت
﴿٩٩﴾ ﴿أَوَلَمۡ يَهۡدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡأَرۡضَ﴾ ئایـا ڕوون نەبۆتـەوە بۆ ئەوانـەی زەوییان بە میرات بـۆ دەمێنێتەوە
﴿مِنۢ بَعۡدِ أَهۡلِهَآ﴾ دوای (تیـا چوونـی) خاوەنـە پێشـوەکانیان ﴿أَن لَّوۡ نَشَآءُ﴾ ئەگـەر بمانەوێـت
﴿أَصَبۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡۚ﴾ بەهـۆی گوناهەکانیانـەوە دووچـاری بەڵایـان دەکەیـن. ﴿وَنَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ وە
مـۆر دەنێین بەسـەر دڵیـان دا ﴿فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ﴾ ئیتر ئـەوان (هیچ پەند وئامۆژگارییەك) نابیسـتن ﴿١٠٠﴾
﴿تِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰ﴾ ئـەو شـار و گوندانانـەی ( کە وێرانمـان کـردن) ﴿نَقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآئِهَاۚ﴾ هەندێك لە
هەواڵەکانی دەگێڕینەوە بۆت ﴿وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاسـتی پێغەمبەرانیان
بۆهات بەبەڵگەو نیشانەی ڕوونەوە ﴿فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ﴾ بەڵام باوەڕیان نەهێنا ﴿بِمَا كَذَّبُواْ مِن قَبۡلُۚ﴾
بەوەی کەلەپێش دا بەدرۆیان دەزانی ﴿كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ ئا بەو جۆرە خوا مۆر دەنێت
بەسـەر دڵـی بێ بـاوەڕان دا ﴿١٠١﴾ ﴿وَمَا وَجَدۡنَا لِأَكۡثَرِهِم مِّنۡ عَهۡدٖۖ﴾ زۆربـەی ئەوانمان نـەدی خاوەنی هیچ
پەیمانێـك بن ﴿وَإِن وَجَدۡنَآ أَكۡثَرَهُمۡ لَفَٰسِقِينَ﴾ بەڕاسـتی زۆربەیانمان دی سـەرپێچی کـەر(و تاوانبار)
بوون ﴿١٠٢﴾ ﴿ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ﴾ پاشان دوای ئەوانەی (کەباسمان کردن) مووسامان نارد ﴿بِـَٔايَٰتِنَآ
إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ﴾ بـە بەڵگـەو موعجیزەکانمانـەوە بـۆ لای فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی ﴿فَظَلَمُواْ
بِهَاۖ﴾ بەڵام ئەوان بەنیشـانەکان (بێ بڕوا بوون) و سـتەمیان کرد ﴿فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾
جـا بڕوانـە و سـەرنج بـدە کەسـەرەنجامی لـە فەرمـان دەرچـووان و خراپـەکاران چـۆن بـوو ﴿١٠٣﴾
﴿وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرۡعَوۡنُ﴾ مووسـا فەرمـووی : ئەی فیرعەون ﴿إِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بەڕاسـتی من
پێغەمبەرێکم لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ﴿١٠٤﴾

﴿حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ﴾ وا شیاوە و(سوورم) کە هیچ شتێك نەڵێم. ﴿عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ﴾ بە ناوی خواوە
جگە لە هەق و ڕاستی ﴿قَدۡ جِئۡتُكُم بِبَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ بە ڕاستی لەلایەن پەروەردگارتانەوە
بەڵگەی ڕوون و ئاشکرام بۆ هێناون. ﴿فَأَرۡسِلۡ مَعِيَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ کەواتە بەنو ئیسرائیل لەگەڵ من بنێرە
(بەرەڵایان کە، لە کۆیلەیی و چەوسانەوەت) (١٠٥) ﴿قَالَ﴾ (فیرعەون) ووتی: ﴿إِن كُنتَ جِئۡتَ بِـَٔايَةٖ فَأۡتِ
بِهَآ﴾ ئەگەر بەڵگە و موعجیزە یەکت هێناوە (ئەی موسی) ئەوە نیشانی بدە ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾
ئەگەر تۆ لە ڕاست بێژانی (١٠٦) ﴿فَأَلۡقَىٰ عَصَاهُ﴾ ئەمجا مووسا گۆچانەکەی فڕێدا. ﴿فَإِذَا هِيَ ثُعۡبَانٞ
مُّبِينٞ﴾ یەکسەر گۆچانەکە بوو بەمارێکی گەورەی ئاشکرا (١٠٧) ﴿وَنَزَعَ يَدَهُۥ﴾ دەستی (لە باخەڵ یەوە
یان لە بن هەنگڵ یەوە) دەرهێنا ﴿فَإِذَا هِيَ بَيۡضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ﴾ لە پڕ ئەو (دەستە) سپی و پرشنگداربوو
بۆ بینەران (١٠٨) ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ﴾ هەندیك لە کاربەدەست ودەسەڵاتدارانی گەلەکەی
فیرعەون ووتیان: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٞ﴾ بە ڕاستی ئەم (مووسایە) جادووگەرێکی زۆر زانە (١٠٩)
﴿يُرِيدُ أَن يُخۡرِجَكُم مِّنۡ أَرۡضِكُمۡۖ﴾ دەیەوێت لە خاك و وولاتی خۆتان دەرتان کات ﴿فَمَاذَا تَأۡمُرُونَ﴾ جا
ئێوە فەرمان و ڕاتان چیە (لەم بارەیەوە) (١١٠) ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەوانیش ووتیان: ﴿أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ﴾ کاری (مووسا)
وبراکەی دوا بخە ﴿وَأَرۡسِلۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ﴾ کەسانێکی کۆکەرەوە بنێرە بۆئەو شارانە(ی جادووگەری
لێ یە) (١١١) ﴿يَأۡتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ﴾ هەموو جادووگەرێکی شارەزات بۆ دەهێنن (١١٢) ﴿وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ
فِرۡعَوۡنَ﴾ جادووگەران هاتن بۆ لای فیرعەون ﴿قَالُوٓاْ﴾ ووتیان: ﴿إِنَّ لَنَا لَأَجۡرًا﴾ بێگومان ئێمە پاداشت
و خەڵاتی گەورەمان دەبێت ﴿إِن كُنَّا نَحۡنُ ٱلۡغَٰلِبِينَ﴾ ئەگەر ئێمە سەرکەوتین (بەسەر مووسا دا)؟
(١١٣) ﴿قَالَ نَعَمۡ﴾ (فیرعەون) ووتی: بەڵێ پاداشتی گەورەتان دەبێ: ﴿وَإِنَّكُمۡ لَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ﴾ وبێگومان
ئێوە لەنزیکانی (خۆم) دەبن (١١٤) ﴿قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ (جادووگەرەکان) ووتیان ئەی مووسا ﴿إِمَّآ أَن
تُلۡقِيَ﴾ یاتۆ (ئەوەی پێتە) فڕێ ی دە ﴿وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحۡنُ ٱلۡمُلۡقِينَ﴾ یان ئێمە دەیهاوێژین و فڕێی
دەدەین (١١٥) ﴿قَالَ أَلۡقُواْۖ﴾ (مووسا) ووتی: ئێوە بیهاوێژن (ئەوەی پێتانە) ﴿فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ﴾ ئەمجا کاتێ
(ئەوەی پێیان بوو لە جادوو) فڕێ یان دا ﴿سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ﴾ چاوبەستیان لە خەڵك کرد
﴿وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ﴾ وترسێکی گەورەیان خستە دڵیانەوە ﴿وَجَآءُو بِسِحۡرٍ عَظِيمٖ﴾ وە جادوویەکی
گەورەیان نواند (١١٦) ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ﴾ وەحیمان کرد بۆ مووسا ﴿أَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ﴾ کە گۆچانەکەت
فڕێ بدە ﴿فَإِذَا هِيَ تَلۡقَفُ مَا يَأۡفِكُونَ﴾ ئیتر یەکسەر ئەو (گۆچانە بوو بەمارو) هەرچی جادووی درۆینەیان
کردبوو هەڵی لووشی (١١٧) ﴿فَوَقَعَ ٱلۡحَقُّ﴾ ئیتر ڕاستی دەرکەوت و ڕوون بوویەوە ﴿وَبَطَلَ مَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ﴾ ئەوانیش هەرچی (سیحر) یان کردبوو پووچەڵ بوویەوە (١١٨) ﴿فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ﴾ هەر لەوێدا
(فیرعەون و شوێنکەوتوانی) ژێر خران و دۆڕان ﴿وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ﴾ و بە ڕسوایی گەڕانەوە (١١٩) ﴿وَأُلۡقِيَ
ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ﴾ وە جادووگەران هەموویان سووژدەیان برد (بۆ پەروەردگاریان) (١٢٠)

﴿قَالُوٓاْ﴾ (ساحیرەکان) ووتیان: ﴿ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئێمە بڕوامان هێنا بەپەروەردگاری جیهانیان
(١٢١) ﴿رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ کە پەروەردگاری مووسا و هاروونە (١٢٢) ﴿قَالَ فِرۡعَوۡنُ﴾ فیرعەون ووتی:
﴿ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ﴾ پێش ئەوەی ئیزنتان بدەم باوەڕتان پێ هێنا! ﴿إِنَّ هَٰذَا﴾ بەڕاستی
ئەمە ﴿لَمَكۡرٞ مَّكَرۡتُمُوهُ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾ فێڵ و پیلانێکە (ئێوەو مووسا) نەخشەتان بۆ کێشاوە لەم شارەدا.
﴿لِتُخۡرِجُواْ مِنۡهَآ أَهۡلَهَاۖ﴾ تا دانیشتوانەکەی لێ دەربکەن. ﴿فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ﴾ جا لە دواییدا دەزانن (چیتان لێ
دەکەم) (١٢٣) ﴿لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم﴾ سوێند بێت دەست و قاچتان ببڕم ﴿مِّنۡ خِلَٰفٖ﴾ بەپێچەوانەوە
(چەپ و ڕاست) ﴿ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ ئەمجا سوێند بێ گشتان هەڵدەواسم (١٢٤) ﴿قَالُوٓاْ﴾ ووتیان:
(بەفیرعەون) ﴿إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾ ئێمە دڵنیاین کە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە (١٢٥)
﴿وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ﴾ تۆ هیچ ڕەخنەیەکت لەئێمە نی یە ﴿إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا﴾ جگەلەوەی کە ئێمە باوەڕمان
بەبەڵگە و نیشانەکانی پەروەردگارمان هێناوە ﴿لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ﴾ کاتێ بۆ مان هات ﴿رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا﴾
ئەی پەروەردگارمان ئارامیمان بەسەردا بڕێژە ﴿وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ﴾ و بە موسوڵمانیەتی بمان مرێنە (١٢٦)
﴿وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ﴾ هەندێك لە دەسەڵاتداران و کاربەدەستانی گەلی فیرعەون ووتیان ﴿أَتَذَرُ مُوسَىٰ
وَقَوۡمَهُۥ﴾ ئایا وازلەمووساوهۆزەکەی دەهێنی ﴿لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بۆئەوەی لەووڵاتدا (خاکی میسردا)
خراپەکاری بکەن ﴿وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ﴾ و دەست لەخۆت و پەرستراوەکانت هەڵبگرن ﴿قَالَ﴾ (فیرعەون)
ووتی: ﴿سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ﴾ لەمەودوا کوڕەکانیان دەکوژین ﴿وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ﴾ وئافرەتانیان دەهێڵینەوە
بەزیندوویی (بۆ خزمەت کردن). ﴿وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ﴾ وە بێگومان ئێمە دەسەڵاتدارین بەسەریاندا (١٢٧)
﴿قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ﴾ مووسا بەگەلەکەی ووت ﴿ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ﴾ داوای یارمەتی لە خوا بکەن و
خۆ ڕاگر بن. ﴿إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ﴾ بێگومان هەموو زەوی موڵکی خوایە. ﴿يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ﴾
دەیدا بەهەرکەس لەبەندە (شیاوە)کانی کەخۆی بیەوێت ﴿وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ و سەرئەنجامی
چاك بۆ خواناسانە (١٢٨) ﴿قَالُوٓاْ﴾ (گەلەکەی) ووتیان: ﴿أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا﴾ پێش هاتنی تۆ بۆ
ناومان ئازار دراین ﴿وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ﴾ هەروەها پاش هاتنی تۆ بۆ ناومان (بەپێغەمبەرایەتی)
﴿قَالَ﴾ (مووسا) فەرمووی: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ﴾ بەڵکو پەروەردگارتان دوژمنەکەتان
لەناو بەرێت ﴿وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ و ئێوە بکات بەجێنشین(ی دوژمنەکانتان) لەسەر زەوی
﴿فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ﴾ جا تەماشا دەکات ئێوە چۆن کار دەکەن (١٢٩) ﴿وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ﴾
سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە دارودەستەی فیرعەونمان سزادا ﴿بِٱلسِّنِينَ﴾ بە ووشکە ساڵی وقات
وقڕی ﴿وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ و کەم بوونەوەی بەرو بوومی میوە و کشتوکاڵەکانیان ﴿لَعَلَّهُمۡ
يَذَّكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوەی بیر بکەنەوەو (پەند وەربگرن) (١٣٠)

﴿فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ﴾ جـا کاتـێ چاکەیان بۆ بهاتایە(لە سـەروەت و بەروبووم) ﴿قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ﴾ دەیان
ووت: ئەمە هەر هی ئێمەیە (شایستەی ئێمەیە) ﴿وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ﴾ بەڵام کاتێ تووشی بەڵاو خراپە
بوونایە ﴿يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ﴾ (دەیان ووت) بەهۆی شـوومی مووسا و شوێن کەوتووانیەوەیە
﴿أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾ بێداربـن بێگومـان ئەو (ناخۆشـیانە)ی بەلایانەوە شـووم و خراپە لەلایەن
خواوەیە(نـەك مووسـا و ئیمانـداران) ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بـەڵام زۆربەیـان بـێ ئاگـان
ونازانـن ﴿١٣١﴾ ﴿وَقَالُواْ﴾ دەیـان ووت (بـە مووسـا) ﴿مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ﴾ هـەر موعجیزەیەکمـان بـۆ
بهێنـی ﴿لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا﴾ بۆ ئەوەی جادوومـان لێ بکەی پێ ی ﴿فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾ ئەوە ئێمە باوەڕت
پـێ ناهێنیـن ﴿١٣٢﴾ ﴿فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ﴾ ئەوسـا ئێمـەش ناردمانـە سـەریان ﴿ٱلطُّوفَانَ﴾ لافاو ﴿وَٱلۡجَرَادَ﴾
وکوللـە ﴿وَٱلۡقُمَّلَ﴾ وئەسـپێ ﴿وَٱلضَّفَادِعَ﴾ جۆرەهـا بـۆق ﴿وَٱلدَّمَ﴾ و خوێـن ﴿ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ﴾
کەچەنـد بەڵگـەو موعجیزەیەکی ڕوون بـوون ﴿فَٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ کەچی خۆیان بە گـەورە زانی (لەوەی
کـە بـڕوا بهێنن) ﴿وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ﴾ بێگومان ئەوانە گەلێکـی تاوانبار بوون ﴿١٣٣﴾ ﴿وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ
ٱلرِّجۡزُ﴾ کاتێکیـش ئـەو سـزاو بەڵایـان بەسـەردا هـات ﴿قَالُواْ﴾ ووتیـان: ﴿يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ ئەی
مووسا لە پەروەردگارت بپاڕێرەوە بۆمان ﴿بِمَا عَهِدَ عِندَكَۖ﴾ وەك بەڵێنی بەتۆ داوە ﴿لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا
ٱلرِّجۡزَ﴾ سـوێندبێ گەر ئەم بەڵاو سـزایەمان لەسـەر لابـەری ﴿لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ﴾ بێگومان بـاوەڕت پێ
دێنیـن ﴿وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ و بەنـو ئیسـرائیلت لەگەڵـدا دەنێریـن ﴿١٣٤﴾ ﴿فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ
ٱلرِّجۡزَ﴾ بـەڵام کاتێـك سـزاکەمان لەسـەریان لابـرد ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ﴾ تاگەیشـتنە مـاوەی دیـاری
کـراو (بۆ تیاچوونیان) ﴿إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ﴾ دەسـت بەجـێ پەیمانەکەیان هەڵوەشـاندەوە ﴿١٣٥﴾ ﴿فَٱنتَقَمۡنَا
مِنۡهُمۡ﴾ جـا تۆڵەمان لێ سـەندن ﴿فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ﴾ وە لە دەریـادا خنکاندمانن ﴿بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾
لەبـەر ئـەوەی ئـەوان باوەڕیـان بـە نیشـانەکانی ئێمـە نەبـوو ﴿وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ﴾ وهەمیشـە لـێ یـان
بـێ ئاگا بوون ﴿١٣٦﴾ ﴿وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ﴾ ئیتر (لەجێگای گەلی فیرعەون) ئەو گەلەمان نیشـتەجێ کرد
﴿كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا﴾ کە هەمیشە دەچەوسێنرانەوە لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای
ئـەو وولاتـەدا ﴿ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ﴾ کەپیت و بەرەکەتمـان تێ خسـت بوو ﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾
و بەڵێنـی هەرەجوانـی پەروەردگـارت بەتـەواوی هاتـەدی ﴿عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ بـۆ نـەوی ئیسـرائیل
﴿بِمَا صَبَرُواْۖ﴾ بەهـۆی ئارامگـری یانـەوە (لەسـەر ناڕەحەتـی یـەکان) ﴿وَدَمَّرۡنَا﴾ وە ڕووخاندمان
وتێکمان دا ﴿مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ﴾ ئەو کۆشـك و تەلارانەی فیرعەون و گەلەکەی دروسـتیان
کردبوو ﴿وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ﴾ هەروەها ئەو (مێوە و ڕەز وباخانەی) کە کەپریان بۆ کرد بوو ﴿١٣٧﴾

﴿وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ﴾ ئەمجا نەوەی ئیسرائیلمان لەو دەریا پەڕاندەوە( فیرعەون و گەلەکەیمان
تێدا خنکاند) ﴿فَأَتَوْا عَلَىٰ قَوْمٍ﴾ ئەمجا تووشی خەڵکانێك بوون ﴿يَعْكُفُونَ عَلَىٰ أَصْنَامٍ لَّهُمْ﴾ بەردەوام
خەریکی پەرستنی بتەکانیان بوون ﴿قَالُوا يَا مُوسَى﴾ (جوولەکەکانیش) ووتیان: ئەی مووسا ﴿اجْعَل لَّنَا
إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ﴾ هەروەك ئەو پەرستراوانەی ئەوان تۆیش پەرستراوێکمان بۆ دابنێ ﴿قَالَ﴾
مووسا فەرمووی: ﴿إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ بەڕاستی ئێوە هۆزێکی نەفامن ﴿١٣٨﴾ ﴿إِنَّ هَٰؤُلَاءِ﴾ بێگومان
ئەوانە ﴿مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ﴾ ئەو (بت پەرستی یەی) ئەوانی لەسەرە لە ناودەچێ ﴿وَبَاطِلٌ مَّا كَانُوا
يَعْمَلُونَ﴾ وە هەرچی دەکەن بەتاڵ و هەڵوەشاوەیە ﴿١٣٩﴾ ﴿قَالَ﴾ (مووسا) فەرمووی: ﴿أَغَيْرَ اللَّهِ
أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا﴾ ئایا جگە لە خوا داوای پەرستراوێکی ترتان بۆ بکەم ؟ ﴿وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾
کە(ئەو خوایە) ڕێزی داوون بەسەر جیهانیاندا ﴿١٤٠﴾ ﴿وَإِذْ أَنجَيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ﴾ وە (بیربکەنەوە) لەو
وەختەی رزگارمان کردن لە دەست و پەیوەندەکەی فیرعەون ﴿يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ﴾ کە
ئەشکەنجە و ئازاری سەختیان دەدان ﴿يُقَتِّلُونَ أَبْنَاءَكُمْ﴾ کوڕانی ئێوەیان دەکوشت ﴿وَيَسْتَحْيُونَ
نِسَاءَكُمْ﴾ و ئافرەتانی ئێوەیان دەهێشتەوە (بۆ خزمەتی خۆیان) ﴿وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ
عَظِيمٌ﴾ وە لەو (ئازاردانە)تاندا تاقی کردنەوەیەکی گەورە بوو لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿١٤١﴾
﴿وَوَاعَدْنَا مُوسَىٰ﴾ وە بەڵێنمان بە مووسا دا ﴿ثَلَاثِينَ لَيْلَةً﴾ سی شەو ﴿وَأَتْمَمْنَاهَا بِعَشْرٍ﴾ بەدە شەوی
تر ماوەکەمان تەواو کرد ﴿فَتَمَّ مِيقَاتُ رَبِّهِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾ ئەوسا وەختی دیداری پەروەردگاری بوو
بە چل شەوی تەواو ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَارُونَ﴾ مووسا بە هاروونی برای ووت ﴿اخْلُفْنِي فِي قَوْمِي﴾ تۆ
لە ناو گەلەکەمدا جێنشینم بە ﴿وَأَصْلِحْ﴾ و کاری چاك بکە ﴿وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ الْمُفْسِدِينَ﴾ و شوێنی
ڕێبازی خراپەکاران مەکەوە ﴿١٤٢﴾ ﴿وَلَمَّا جَاءَ مُوسَىٰ لِمِيقَاتِنَا﴾ جا کاتێ مووسا هات بۆ کات و شوێنی
دیاری کراومان(بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵمان) ﴿وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ﴾ و پەروەردگار ووتووێژی لەگەڵدا
کرد ﴿قَالَ رَبِّ﴾ ووتی: ئەی پەروەردگارم ﴿أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ﴾ خۆتم نیشان بدە تا بت بینم ﴿قَالَ
لَن تَرَانِي﴾ (پەروەردگار) فەرمووی: تۆ (لە دونیادا) من نابینی ﴿وَلَٰكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ﴾ بەڵام سەیری
(لای) شاخەکە بکە ﴿فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ﴾ جا ئەگەر ئەو شاخە لە شوێنی خۆی دا نەجوڵا ﴿فَسَوْفَ
تَرَانِي﴾ ئەوە دوای کەمێك تۆش دەمبینی ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُ لِلْجَبَلِ﴾ جا کاتێك پەروەردگاری خۆی
دەرخست بۆ شاخەکە ﴿جَعَلَهُ دَكًّا﴾ شاخەکەی وورد و هان کرد(و لەگەڵ زەویدا تەختی کرد)
﴿وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾ و مووساش بەبێ هۆشی کەوت بەڕوودا ﴿فَلَمَّا أَفَاقَ﴾ جا وەختێ هۆشی بەخۆیدا
هاتەوە (چاك بوویەوە) ﴿قَالَ سُبْحَانَكَ﴾ فەرمووی: پاکی و بێ گەردی بۆ تۆ (ئەی پەروەردگار)
﴿تُبْتُ إِلَيْكَ﴾ بە پەشیمانی گەڕامەوە بۆ لات ﴿وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ وە من یەکەمی بڕوا دارنم ﴿١٤٣﴾

﴿قَالَ﴾ (پەروەردگار) فەرمووی: ﴿يَٰمُوسَىٰٓ﴾ ئەی مووسا ﴿إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بێگومان من تۆم هەڵبـژاردوە بەسـەر هە موو خەڵكـی دا ﴿بِرِسَٰلَٰتِي﴾ بەپەیامەکانم ﴿وَبِكَلَٰمِي﴾ و قسـەکردنم (لەگەڵت ڕاستەوخۆ) ﴿فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ﴾ کەواتـە ئـەوەی پێـم بەخشـیوی تونـد دەسـتی پێـوە بگـرە ﴿وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ وە لە سـوپاس گوزاران بە ﴿١٤٤﴾ ﴿وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ﴾ و لەو پارچە تەختانەدا بۆمان نووسـی ﴿مِن كُلِّ شَيۡءٖ﴾ لە هەموو جۆرە باسێك ﴿مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ﴾ پەند و ئامۆژگاری و باسـی هەموو شـتێك بەڕوونی (کە پێویسـتیان پێ ی بێت) ﴿فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ﴾ کەواتە (مووسا) بەتوندی بیانگرە و ئاگاداریان بە ﴿وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ﴾ وە فەرمان بە گەلەکەت بکە ﴿يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ﴾ تا دەسـت بگرن و ڕەفتـار بکـەن بـە جوانتـر و چاکترینیـان ﴿سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ بەزوویی جێ و شـوێن لەسـنوور دەرچوانتـان نیشـان دەدەم ﴿١٤٥﴾ ﴿سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ﴾ لایـان ئـەدەم لـە بەڵگـە و نیشـانە و ئایەتەکانـم ﴿ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەوانەی کە خۆیان بە گەورە دادەنێن لەسەر زەویدا ﴿بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ بەناهەق و نـاڕەوا ﴿وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ﴾ ئەوانـە ئەگـەر هەمـوو ئایـەت و موعجیزەیـەك ببینـن ﴿لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا﴾ باوەڕیپـێ ناهێنـن ﴿وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ﴾ وە ئەگـەر ئایینـی ڕاسـت و دروسـت ببینـن ﴿لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا﴾ نایکـەن بـە ڕێبـازو ئایینـی خۆیـان ﴿وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ﴾ وە ئەگەر ڕێگـەی گومڕایـی و ئایینی چـەوت ببینـن ﴿يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ﴾ دەیکەن بە ئایین و ڕێبـاز بۆ خۆیان ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ هەمـوو ئەمانە لەبەر ئەوەیە کە بەڵگەو نیشـانەکانی ئێمەیـان بەدرۆ دەزانی ﴿وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ﴾ وە هەمیشـە بـێ ئاگا بـوون لێیان ﴿١٤٦﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ وە کەسـانێك کـە بەڵگەو نیشـانەکانی ئێمەیـان بـە درۆزانـی ﴿وَلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ هەروەهـا دیـداری ڕۆژی دواییـان (بـە درۆ زانـی) ﴿حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡۚ﴾ کارو کـردەوەی (چاکیـان) بـە هیـچ دەرچـوو (پوچـەڵ بوویـەوە) ﴿هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ ئایا جگە لەو (خراپانە)ی کە دەیان کرد سزا دەدرێن؟ ﴿١٤٧﴾ ﴿وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾ وە هۆزی مووسا پاش (ڕۆیشتنی) مووسا دروستیان کرد ﴿مِنۡ حُلِيِّهِمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا﴾ لە خشڵ و زێڕەکانیان پەیکەری گوێرەکەیەك ﴿لَّهُۥ خُوَارٌۚ﴾ کە قوڕەی (وەك گوێرەکەی) هەبوو ﴿أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمۡ﴾ ئایـا ئەوانـە نەیانبینی کە بێگومان ئەو (گوێرەکەیە) قسـەیان لەگەڵدا ناکات ﴿وَلَا يَهۡدِيهِمۡ سَبِيلًاۘ﴾ و هیچ ڕێبازێکیشـیان نیشـان نـادات ﴿ٱتَّخَذُوهُ﴾ کردیان بە (پەرسـتراو) ﴿وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ﴾ و ئەوانە ستەمکاربوون ﴿١٤٨﴾ ﴿وَلَمَّا سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ﴾ وە کاتـێ لـە دەسـتیان دەرچـوو (زۆر پەشـیمان بوونەوە) ﴿وَرَأَوۡاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ ضَلُّواْ﴾ وە تێگەیشـتن و بینیـان کـە بێگومـان گومڕابـوون ﴿قَالُواْ﴾ ووتیـان: ﴿لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا﴾ سـوێند بـە خـوا ئەگـەر پەروەردگارمـان بەزەیـی پێمانـدا نەیەتـەوە ﴿وَيَغۡفِرۡ لَنَا﴾ وە لـە گوناهەکانمـان خـۆش نەبێـت ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ ئەوەبەڕاسـتی ئێمـە لـە زیان لـێ کەوتوان دەبین ﴿١٤٩﴾

﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ﴾ جا کاتێ مووسا گەڕایەوە ناو هۆزەکەی ﴿غَضْبَٰنَ أَسِفًا﴾ بەڕق و توڕەییەکی
زۆرەوە ﴿قَالَ﴾ (مووسا) ووتی (بە گوێرەکە پەرستەکان) ﴿بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِى مِنۢ بَعْدِىٓ﴾ لە دوای من چ
جێنشینێکی بەد فەڕو خراپ بوون ﴿أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ﴾ ئایا پەلەتان کرد لە فەرمانی پەروەردگارتان؟
﴿وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ﴾ (مووسا) تەختەکانی (تەوراتی) فڕێ دا ﴿وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ﴾ وە (قژی) سەری
(هاروونی) برای گرت و بەرەو خۆی ڕایکێشا ﴿قَالَ﴾ (هارون) ووتی: ﴿ٱبْنَ أُمَّ﴾ ئەی کوڕی دایکم
﴿إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى﴾ بەڕاستی ئەم گەلە لاوازیان کردم ﴿وَكَادُوا۟ يَقْتُلُونَنِى﴾ نزیك بوو بم کوژن
﴿فَلَا تُشْمِتْ بِىَ ٱلْأَعْدَآءَ﴾ کەواتە دوژمنانم پێ دڵخۆش مەکە ﴿وَلَا تَجْعَلْنِى مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ و لەگەڵ
هۆزی ستەم کاراندا دامەنێ (١٥٠) ﴿قَالَ﴾ (مووسا) فەرمووی: ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى﴾ ئەی پەروەردگارم
لە خۆم و براکەم خۆش بە ﴿وَأَدْخِلْنَا فِى رَحْمَتِكَ﴾ وە بمانخەرە ناو بەزەیی و میهرەبانی خۆتەوە
﴿وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ تۆ میهرەبان ترینی هەموو میهرەبانانیت (١٥١) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ﴾ بەڕاستی ئەو
کەسانەی کە گوێرەکە پەرست بوون ﴿سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ﴾ لەمەو دوا دەکەونەبەر ڕق و خەشمی
پەروەردگاریان ﴿وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ هەروەها ڕسوایی و زەلیلی لە ژیانی دونیادا. ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى
ٱلْمُفْتَرِينَ﴾ هەر بەو جۆرە سزای درۆ هەڵبەستان دەدەین (١٥٢) ﴿وَٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ وە ئەوانەی
گوناهیان کرد ﴿ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِهَا﴾ پاشان دوای ئەوە تەوبەیان کرد ﴿وَءَامَنُوٓا۟﴾ و باوەڕیان هێنا
﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا﴾ بێگومان پەروەردگارت پاش ئەو (باوەڕهێنان و تۆبە کردنە) ﴿لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾
لێبووردەی میهرەبانە (١٥٣) ﴿وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلْغَضَبُ﴾ جا کاتێ مووسا توڕەیی یەکەی نیشتەوە
﴿أَخَذَ ٱلْأَلْوَاحَ﴾ تەختەکانی (تەوراتی) هەڵگرتەوە ﴿وَفِى نُسْخَتِهَا﴾ و لە ڕەنووس و نووسراوی ئەو
(تەختانە)دا ﴿هُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ ڕێنموونی و بەزەیی گەورە هەبوو ﴿لِّلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ﴾ بۆ کەسانێك
کە لە پەروەردگاریان دەترسن (١٥٤) ﴿وَٱخْتَارَ مُوسَىٰ قَوْمَهُۥ﴾ وە مووسا لە گەلەکەی خۆی هەڵی بژارد
﴿سَبْعِينَ رَجُلًا﴾ حەفتا پیاو ﴿لِّمِيقَٰتِنَا﴾ بۆ کات و شوێنی دیاری کراو لەگەڵ ئێمە (بۆ ئەوەی لە کێوی
طور تەوبە بکەن لە تاوانی گوێرەکە پەرستیەکەیان، جا کاتێك هاتنە ئەوێ ووتیان بە مووسا بروات
پێ ناهێنین تا خوا نەبینین تۆ خۆت قسەت لەگەڵ کرد با ئێمەش ببینین) ﴿فَلَمَّآ أَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ﴾ (خوا
سزای دان وبومەلەرزەی بۆ ناردن) جا کاتێك کە بوومەلەرزەکە دایگرتن ﴿قَالَ﴾ (مووسا) فەرمووی:
﴿رَبِّ لَوْ شِئْتَ﴾ ئەی پەروەردگارم گەر بتویستایە ﴿أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّٰىَ﴾ لەمەو پێش ئەوان و منیشت
لەناو دەبرد ﴿أَتُهْلِكُنَا﴾ ئایا تۆ هەموومان لەناو دەبەیت ﴿بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ﴾ بەهۆی ئەوەی کە گێل
ونەفامەکانمان ئەنجامیان داوە ﴿إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ﴾ ئەمە تەنها تاقی کردنەوەیەکی خۆتە ﴿تُضِلُّ بِهَا مَن
تَشَآءُ﴾ هەر کەسێکت بوێت بەو هۆیەوە گومڕای دەکەیت ﴿وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ﴾ وە هەر کەسێکت بوێ
ڕێنموونی دەکەیت ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا﴾ هەر تۆ پشتیوان و (پەرستراومانی) ﴿فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا﴾ کەواتە لێمان
خۆش ببەو ڕەحمان پێ بکە ﴿وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْغَٰفِرِينَ﴾ چونکە باشترین لێ بوردە هەر تۆی (١٥٥)

﴿وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ﴾ (خوایە) لەم دونیادا چاکەمان بۆ بنووسە ﴿وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ هەروەها
لەڕۆژی دوایشدا ﴿إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَۚ﴾ بەڕاستی ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە ﴿قَالَ﴾ (پەروەردگار)
فەرمووی: ﴿عَذَابِيٓ﴾ سزاو ئازارم ﴿أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ﴾ دووچاری هەرکەسی دەکەم کەبمەوێ
﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ﴾ وە بەزەیی و ڕەحمەتیشم هەموو شتێکی گرتۆتەوە ﴿فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ﴾
جا لەدوایی دا ئەو (بەزەیی یەم) دەنووسم بۆ ئەوانەی ﴿يَتَّقُونَ﴾ پارێزکار و لەخوا ترسن
﴿وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ و زەکات دەدەن ﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەوانەش کە بڕوا بەبەڵگەو
نیشانەکانی ئێمە دێنن ﴿١٥٦﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ﴾ (ئەم ڕەحمەتەی پەروەردگار)
بۆ ئەوانەیە کە شوێن پێغەمبەرﷺ کەوتوون کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارە و (لەلایەن
پەروەردگارەوە هاتووە) ﴿ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ﴾ ئەو کەسە (پێغەمبەرێکە ئەهلی کتاب
سیفەتی دەزانن) چونکە بە نووسراویی لایانە ﴿فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ﴾ لە تەورات و ئینجیل دا
﴿يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ کە فەرمانیان پێ دەکات بە چاکە ﴿وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ و ڕێگرییان لێ
دەکات لە خراپە ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ شتە خاوێن و پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ
ٱلۡخَبَٰٓئِثَ﴾ وە شتە پیسەکانیان لێ حەرام (قەدەغە) دەکات ﴿وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ﴾ و بارە قورس
وگرانەکانیان لەسەر لادەبات و ﴿وَٱلۡأَغۡلَٰلَ﴾ ئەو کۆت و زنجیرانەش ﴿ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ کە
بەسەریانەوە بوون ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ﴾ ئەمجا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەو(پێغەمبەرە) هێنابێت
﴿وَعَزَّرُوهُ﴾ و ڕێزو قەدریان بۆ دانابێت ﴿وَنَصَرُوهُ﴾ یارمەتیان دابێت و پشتیوانیان لێ کردبێت
﴿وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ﴾ و پەیڕەوی ئەو نوورەیان کردبێت (کە قورئانە) ﴿ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾ کە لەگەڵیدا
نێرراوەتە خوارەوە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ ئەوان هەموو(کە باسکران) لە ڕزگار بووانن ﴿١٥٧﴾
﴿قُلۡ﴾ (ئەی مەحەممەد ﷺ) بڵێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا﴾
بەڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان ﴿ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ ئەو (خوایەی)
کەتەنها بۆ ئەوە، موڵکی هەموو ئاسمانەکان و زەوی ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست
نییە جگە لەئەو ﴿يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ﴾ دەژێنێت و دەمرێنێت ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ کەواتە بڕوا بەخواو
پێغەمبەرەکەی بهێنن ﴿ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ﴾ کە نێراوێکی نەخوێندەوارە ﴿ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ﴾ ئەویش
باوەڕی بەخوا ﴿وَكَلِمَٰتِهِۦ﴾ و بەووتەکانی هەیە ﴿وَٱتَّبِعُوهُ﴾ ئێوەش شوێنی بکەون و پەیڕەوی بکەن
﴿لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾ تا بکەونە سەر ڕێگای ڕاست ﴿١٥٨﴾ ﴿وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ﴾ وەلەهۆزەکەی مووسادا
﴿أُمَّةٞ﴾ تاقمێکی گەورە هەن ﴿يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ﴾ کەڕێنموونی خەڵکی دەکەن بەحەق وڕاستی
﴿وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ﴾ و هەر بەحەقیش دادوەری دەکەن ﴿١٥٩﴾

﴿وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ﴾ ئەوان (جوولەکە)مان کرد بە دوانزە تیرە و تایفەوە ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ
إِلَىٰ مُوسَىٰٓ﴾ وە وەحیمان بۆ مووسا کرد ﴿إِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰهُ قَوۡمُهُۥٓ﴾ کاتێك کە هۆزەکەی داوای ئاویان لێ
کرد (لە تینواندا) ﴿أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَۖ﴾ کە بە گۆچانەکەت بدە لەبەردەکە ﴿فَٱنۢبَجَسَتۡ مِنۡهُ﴾ ئیتر
دەست بەجێ لێی هەڵقولا ﴿ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ﴾ دوازدە کانی ﴿قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ مَّشۡرَبَهُمۡۚ﴾ بێگومان
هەر تیرە و تایفەیەك جێگای ئاو خواردنی خۆی دەزانی ﴿وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ﴾ وەهەورمان کرد
بە سێبەر بە سەریانەوە ﴿وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ﴾ و گەزۆ و باڵندەی (شیلاقە)مان بۆ ناردن
﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ﴾ لەورزق و ڕۆزیە پاکانە بخۆن کە پێمان داوون ﴿وَمَا ظَلَمُونَا﴾
وە ئەوانە (بەو تاوانانە) هیچ ستەمێکیان لە ئێمە نەکرد ﴿وَلَٰكِن﴾ بەڵکو ﴿كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾
هەر ستەمیان لە خۆیان دەکرد ﴿١٦٠﴾ ﴿وَإِذۡ قِيلَ لَهُمُ﴾ (بیربکەرەوە) کاتێ بەوان ووترا ﴿ٱسۡكُنُواْ
هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ﴾ لەناو ئەو شارەدا (بيت المقدس) نیشتە جێ ببن ﴿وَكُلُواْ مِنۡهَا حَيۡثُ شِئۡتُمۡ﴾ لە
(خواردەنەکانی) ئەوێ بخۆن لە هەر لایەك حەزتان کرد ﴿وَقُولُواْ حِطَّةٞ﴾ و بڵێن: (داوای) ئێمە
سڕینەوەی گوناهەکانمانە ﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا﴾ و لە دەروازەی (شارەوە) بەسوژدە بردنەوە
بڕۆنە ژوورەوە ﴿نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطِيٓـَٰٔتِكُمۡۚ﴾ ئەوسا لە خراپەو تاوانەکانتان دەبووریێن و خۆش دەبین
﴿سَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ لەئایندەدا (پاداشتی) چاکەکاران زیاد دەکەین ﴿١٦١﴾ ﴿فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ
مِنۡهُمۡ﴾ کەچی ئەوانەیان کەستەمیان کرد گۆڕییان ﴿قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ﴾ ئەو (ووتەی) کە
پێیان ووترا بوو بەووتەیەکی تر ﴿فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِجۡزٗا﴾ ئێمەش (دوای ئەوە) سزایەکمان ناردە سەریان
﴿مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لە ئاسمانەوە ﴿بِمَا كَانُواْ يَظۡلِمُونَ﴾ بە هۆی ئەوەوە کە بەردەوام ستەمیان دەکرد ﴿١٦٢﴾
﴿وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ﴾ وە پرسیاریان لێ بکە دەربارەی ئەو شارەی ﴿ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ﴾
کە لە نزیك دەریا(ی سور) بوو ﴿إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ﴾ کە لە ڕۆژی شەممەدا دەست درێژی
یان دەکرد ( بەوەی ڕاوە ماسیان دەکرد لەکاتێکدا خوای گەورە لەو ڕۆژەدا ڕاوە ماسی لێ قەدەغە
کردبوون ) ﴿إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا﴾ چونکە لە ڕۆژی شەممەکەیاندا ماسیە گەورەکان
دەهاتن ودەردەکەوتن بە سەر ئاوەوە ( خوای گەورو بەمە تاقی کردنەوە) ﴿وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ﴾ وە ڕۆژێك
کە شەممە نەبوایە ﴿لَا تَأۡتِيهِمۡۚ﴾ ماسیە گەورەکان نەدەهات بۆیان ﴿كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم﴾ ئا بەو جۆرە
تاقیمان کردنەوە ﴿بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ﴾ چونکە لە فەرمانی خوا دەردەچوون وسەر پێچییان
دەکرد ( بەوەی فێڵیان کرد، دەچوون لە ڕۆژی هەینیدا تۆڕەکانیان دادەنا ، وڕۆژی یەك شەممەش
هەڵیان دەگرتەوە بەمەش فەرمانەکەی خوایان شکاند) ﴿١٦٣﴾

﴿وَإِذۡ قَالَتۡ أُمَّةٞ مِّنۡهُمۡ﴾ کاتێ تاقمێ لەوان (بەتاقمێکی تریانی) ووت ﴿لِمَ تَعِظُونَ قَوۡمًا﴾ بۆچی ئامۆژگاری کۆمەڵێك دەکەن ﴿ٱللَّهُ مُهۡلِكُهُمۡ﴾ کەخوا لەناویان دەبات ﴿أَوۡ مُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗاۖ﴾ یان بە سزایەکی سەخت سزایان دەدات ﴿قَالُواْ مَعۡذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمۡ﴾ ووتیان: تا لای پەروەردگارتان بەهانەو عوزر بێ (و تاوانبار نەبین لە سەر بێ دەنگیمان) ﴿وَلَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ﴾ و بەڵکو ئەوان لەخوا بترسن ﴿١٦٤﴾ ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ﴾ ئەمجا کاتێ ئەوەی پێی ئامۆژگاری کرابوون لەبیریان چوو ﴿أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ﴾ ئەوانەی بەرگرییان دەکرد لە خراپە وتاوان رزگارمان کردن ﴿وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ ئەوانەش کە ستەمیان کرد سزامان دان ﴿بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ﴾ بەسزایەکی زۆر خراپ ﴿بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ﴾ بەهۆی دەرچوونیان لە فەرمانی خوا ﴿١٦٥﴾ ﴿فَلَمَّا عَتَوۡاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنۡهُ﴾ جاکاتێك یاخی بوون لە ئەوەی قەدەغە کرابوون لێ ی ﴿قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ﴾ ئەوسا پێمان ووتن: ببنە چەند مەیموونێکی دوورخراوەی بێ نرخ ﴿١٦٦﴾ ﴿وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكَ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ) بیربکەرەوە) کاتێ پەروەردگارت ڕایگەیاندو دای بە گوێچکەیاندا ﴿لَيَبۡعَثَنَّ عَلَيۡهِمۡ﴾ سوێندبێ بێگومان دەینێرێ بۆیان ﴿إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ تا ڕۆژی دوایی ﴿مَن يَسُومُهُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِۗ﴾ کەسانێ کە سزای توند و بەدیان پێ بچێژێ ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت تۆڵەی خێرایە ﴿وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بەڕاستی لێ خۆش بوو و میهرەبانیشە ﴿١٦٧﴾ ﴿وَقَطَّعۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُمَمٗاۖ﴾ وە ئەوانمان لەسەر زەوی دابە چەند کۆمەڵێك دابەش کرد ﴿مِّنۡهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾ هەندێکیان چاکەکارن ﴿وَمِنۡهُمۡ دُونَ ذَٰلِكَۖ﴾ وە هەندێکیشیان وەك ئەوان نەبوون (بێ باوەڕ بوون) ﴿وَبَلَوۡنَٰهُم بِٱلۡحَسَنَٰتِ﴾ وە تاقیمان کردنەوە بەچەندەها چاکەو خۆشی ﴿وَٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ و بەچەندەها خراپە و ناخۆشی ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ بەئومێدی ئەوەی بگەڕێنەوە (بۆ لای خوا) ﴿١٦٨﴾ ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٞ﴾ دوای ئەوان جێ نشینانێکی خراپ هاتنە جێگەیان ﴿وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ کە میراتگری تەورات بوون ﴿يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ﴾ کە هەر بۆماڵ وسامانی (حەرامی) ئەم دونیایە هەوڵیان ئەدا ئەوەشیان هەڵبژارد ﴿وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا﴾ وە دەیانووت بێگومان ئێمە عەفو دەکرێین ﴿وَإِن يَأۡتِهِمۡ﴾ لەکاتێکدا ئەگەر بۆیان بێت ﴿عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُۚ﴾ کاڵایەکی وەك ئەوی تر ئەگەر چی خراپیش بوایە وەریان دەگرت ﴿أَلَمۡ يُؤۡخَذۡ عَلَيۡهِم﴾ ئایا لێیان وەرنەگیراوە و پێویست نە کراوە لەسەریان ﴿مِّيثَٰقُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ پەیمان لە تەوراتدا ﴿أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ کە بەدەم خواوە هیچ نەڵێن ﴿إِلَّا ٱلۡحَقَّ﴾ بێجگە لە ڕاستی نەبێت ﴿وَدَرَسُواْ مَا فِيهِۗ﴾ ئەوەی لە تەوراتدا هەبوو خوێندویانەتەوە ﴿وَٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ﴾ وە ڕۆژی دوایی و (دەست کەوتی ئەو ڕۆژە) ﴿خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ﴾ چاکتر و باشترە بۆ ئەوانەی ﴿يَتَّقُونَۚ﴾ کە خۆ پارێزو لە خواترسن ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ ئایا هێشتا ژیر نابن؟ ﴿١٦٩﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ﴾ وە ئەوانەی بەتوندی دەست دەگرن بەتەوراتەوە (و پەیڕەویان دەکرد پێش هاتنی ئیسلام) ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نوێژەکانیان بەجێ دەهێنن ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ﴾ بێگومان ئێمە وونی ناکەین ﴿أَجۡرَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ﴾ پاداشتی چاکەکاران ﴿١٧٠﴾

﴿وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ﴾ (بهێنەوە بیریان) کاتێك کە کێو(ی طور) مان بەرزکردەوە بەسەریاندا
﴿كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ﴾ وەکو هەورێك (سێبەرێك) بوو ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ﴾ وە لایان وابوو کە دەکەوێت
بە سەر یاندا ﴿خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ﴾ (پێمان ووتن) ئەوەی کە پێمان داوون بەتوندی بیگرن ﴿وَٱذْكُرُواْ
مَا فِيهِ﴾ وە ئەوەی تێدایە (لە ئامۆژگاری و حوکم) بەردەوام لە بیرتان بێت ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەڵکو
ببنە پارێزکار و لەخواترس (١٧١) ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ﴾ وە کاتێ کە پەروەردگارت وەری گرت (دەری هێنا)
﴿مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ﴾ لە پشتی ئادەمی یەکان ﴿ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ وەچە و نەوەکانیان ﴿وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾
وەکردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ (پێی ووتن) ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم ؟
﴿قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآ﴾ (لە وەڵامدا) ووتیان: بەڵێ شایەتیمان دا ﴿أَن تَقُولُواْ﴾ تا نەڵێن ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لە
ڕۆژی دوایی دا ﴿إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە بێ ئاگا بووین لەمە (کەخوا پەروەردگارمانە)
(١٧٢) ﴿أَوْ تَقُولُوٓاْ﴾ یا نەوەکو بڵێن: ﴿إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا﴾ بێگومان باوو باپیرانمان هاوبەشیان بڕیار داوە
﴿مِن قَبْلُ﴾ لەپێش (ئێمەوە) ﴿وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ﴾ وەئێمەش وەچە و نەوەی دوای ئەوان بووین
﴿أَفَتُهْلِكُنَا﴾ دەی ئایا لەناومان دەبەیت ﴿بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾ بەوەی کە بێ فەڕو خراپەکاران
کردوویانە (١٧٣) ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ﴾ ئا بەو جۆرە نیشانەکانی خوا ڕوون دەکەینەوە ﴿وَلَعَلَّهُمْ
يَرْجِعُونَ﴾ بەڵکو (بەرەو هەق) بگەڕێنەوە (١٧٤) ﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ) بخوێنەرەوە
بەسەریاندا ﴿نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا﴾ هەواڵی ئەو کەسەی کە نیشانەکانی خۆمان پێ بەخشی ﴿فَٱنسَلَخَ
مِنْهَا﴾ کەچی خۆی لێ دارنی (و دەرچوو لە فەرمانی خوا) ﴿فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ ئەمجاشەیتان دوای
کەوت ﴿فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە بو بەیەکێك لە گومڕایان (١٧٥) ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا﴾
ئەگەر بمان ویستایە بەو ئایەتانە پلەیمان بەرز دەکردەوە ﴿وَلَٰكِنَّهُۥٓ﴾ بەلاّم ئەو ﴿أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾
خۆی نوساند بە زەوی یەوە ﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ﴾ و دوای ئارەزووی خۆی کەوت ﴿فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ﴾
نموونەی ئەو وەك ئەو سەگەیە ﴿إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ﴾ ئەگەر لێی بدەیت و دەریکەیت (مۆڕەت لێ
دەکات و) زمانت لێ دەردێنێ ﴿أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث﴾ وە ئەگەر وازیشی لێ بهێنێ هەر زمان دەردەهێنێ
﴿ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ﴾ ئەو(سیفەتانە) نموونەی ئەو کەسانەیە ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ کە نیشانەکانی
ئێمەیان بەدرۆ دانا ﴿فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ﴾ دەی ئەو داستان و چیرۆکانە باس بکە ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾
تا بچنەوە بەخۆیاندا و بیر بکەنەوە (١٧٦) ﴿سَآءَ﴾ بەدو خراپە ﴿مَثَلًا ٱلْقَوْمُ ٱلَّذِينَ﴾ وێنە و (چیرۆکی) ئەو
کەسانەی ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ کە نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دانا ﴿وَأَنفُسَهُمْ كَانُواْ يَظْلِمُونَ﴾ ئەوانە هەمیشە
ستەمیان لە خۆیان دەکرد (١٧٧) ﴿مَن يَهْدِ ٱللَّهُ﴾ هەر کەس خوا ڕێنموونی بکات ﴿فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِى﴾
هەر ئەو ڕێنموونی کراوە ﴿وَمَن يُضْلِلْ﴾ هەر کەسیش (خوا بەهۆی کردەوەکانیەوە) گومڕای بکات
﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ هەر ئەوانە زیان لێ کەوتوو ڕەنجەڕۆن (١٧٨)

﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا﴾ وە سوێند بەخوا بەڕاستی دروستمان کردووە﴿لِجَهَنَّمَ﴾ بۆ دۆزەخ ﴿كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ﴾
زۆرێك لە جنۆكە و ئادەمی ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا﴾ دڵیان هەیە بەڵام پێی تێناگەن (لە ڕاستی)
﴿وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا﴾ و چاویان هەیە (هەقی) پێ نابینن ﴿وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ و گوێیان هەیە
(هەقی پێ) نابیستن ﴿أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ﴾ ئەوانە وەك ئاژەڵ (وچوار پێ) وان﴿بَلْ هُمْ أَضَلُّ﴾ بگرە خراپتر
و گومڕا ترن (لە ئاژەڵ) ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ هەر ئەوانەن بێ ئاگایان ﴿١٧٩﴾ ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ﴾
هەر بۆ خوایە جوانترین و چاکترینی ناوەکان ﴿فَادْعُوهُ بِهَا﴾ جا ئێوەش بەو ناوانە بانگ و هاواری لێ
بکەن ﴿وَذَرُوا الَّذِينَ﴾ واز بهێنن و نرخ دامەنێن بۆ ئەوانەی ﴿يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ﴾ کەلەناوەکانی (خوا)
دا گۆڕان و لادان دەکەن (دەیکەنە ناو بۆ بتەکانیان) ﴿سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بەزوویی تۆڵەی ئەوەی
دەیانکرد لێیان دەسەنرێت ﴿١٨٠﴾ ﴿وَمِمَّنْ خَلَقْنَا أُمَّةٌ﴾ وە لەوانەی کە دروستمان کردووە کۆمەڵێك هەیە
﴿يَهْدُونَ بِالْحَقِّ﴾ ڕێنموونی خەڵك دەکەن بە (ئاینی) ڕاست ﴿وَبِهِ يَعْدِلُونَ﴾ و داد وەریشی پێ دەکەن
﴿١٨١﴾ ﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ وە ئەوانەی کە نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دانا ﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم﴾ وورده
وورده(پلە بە پلە) نزیکیان دەکەینەوە لە تیاچوون ﴿مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەجۆرێك کە خۆیشیان
بەخۆیان نازانن ﴿١٨٢﴾ ﴿وَأُمْلِي لَهُمْ﴾ ماوەیەك مۆڵەتیان دەدەم ﴿إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ﴾ بەڕاستی پیلانی من زۆر
پتەو و بەهێزە ﴿١٨٣﴾ ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا﴾ئایا ئەوان بیریان نەکردۆتەوە ﴿مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ﴾ کەهاوڕێ
کەیان موحەممەد ﷺ هەرگیز تووشی شێتی نەبووە ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەو تەنها تر سێنەرێکی
ئاشکرایە (بۆ ئێوە) ﴿١٨٤﴾ ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا﴾ ئایا ئەوانە ناڕوانن؟ ﴿فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لەو موڵکە
گەورەو فراوانەی لەئاسمانەکان و زەوی دا هەیە ﴿وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ﴾ وە لەو شتانەی خوای گەورە
دروستی کردوون ﴿وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ﴾ وەلەوانەیە نزیك بوبێتەوە﴿أَجَلُهُمْ﴾ کۆتایی (ژیان)یان
﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ﴾ جا بەچ قسەیەك لە پاش قورئان بڕوا دێنن ﴿١٨٥﴾ ﴿مَن يُضْلِلِ اللَّهُ﴾ هەر کەس
خوا گومڕای بکات (بەتاوانی کردەوەی خراپی) ﴿فَلَا هَادِيَ لَهُ﴾ ئەو هیچ ڕێنموونی کەرێکی بۆ نییە
﴿وَيَذَرُهُمْ﴾ (خوا) وازیان لێ دێنێت﴿فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ لە گومڕایی و یاخی بوونی خۆیاندا گێژ
بخۆن ﴿١٨٦﴾ ﴿يَسْأَلُونَكَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن ﴿عَنِ السَّاعَةِ﴾ لەبارەی ڕۆژی دوایی
یەوە ﴿أَيَّانَ مُرْسَاهَا﴾ کەی دەبێت ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي﴾ بڵێ: زانینی ئەوە تەنها لای پەروەردگارمە
﴿لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا﴾ هیچ کەس (ناتوانێت) کاتەکەی ئاشکرا بکات ﴿إِلَّا هُوَ﴾ جگە لەپەروەردگار
نەبێت ﴿ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ (هاتنی قیامەت) بۆ ئاسمانەکان و زەویش گران و قورسە
﴿لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً﴾ نایەت بەسەرتاندا (ڕوونادات) لەناکاودا نەبێت ﴿يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ﴾ لە تۆ دەپرسن وەك
ئەوەی کە تۆ ﴿حَفِيٌّ عَنْهَا﴾ لە (هاتنی) ڕۆژی دوایی ئاگاداربی ﴿قُلْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ﴿إِنَّمَا
عِلْمُهَا﴾ بێگومان زانینی (هاتنی) ئەو ڕۆژە ﴿عِندَ اللَّهِ﴾ تەنها لای خوایە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾
بەڵام زۆرێك لە خەڵکی نایزانن ﴿١٨٧﴾

﴿قُل﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بلـێ: ﴿لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا﴾ مـن خاوەنی هیچ سـوودو زیانێك
نیـم بۆخـۆم ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ﴾ مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ ﴿وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ﴾ ئەگەر من غەیب و شتە
نادیارەکانم بزانیایە ﴿لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ﴾ خێرو خۆشـی زۆرم بەدەست دەهێنا ﴿وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ﴾
وەهیـچ خراپـەو زیانێکـم پـێ نـە دەگەیـی ﴿إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ﴾ مـن تەنهـا ترسـێنەرو مـژدەدەرم
﴿لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بـۆ خەڵکانێـك کـە بـاوەڕ دەهێنـن (١٨٨) ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم﴾ (خوا) ئـەو زاتەیە کـە ئێوەی
دروسـت کـردوە ﴿مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ﴾ لەیـەك کـەس (کـە ئادەمـە) ﴿وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا﴾ هـەر لـە خـۆی
هاوسـەری بەدی هێنا ﴿لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَاۖ﴾ تا لەلای بحەسێتەوە (ئارام بگرێ) ﴿فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا﴾ جا کاتێك
(پیاوەکـە) لەگەڵ هاوسـەرەکەی جووت بوو (دروسـت بوو) ﴿حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفٗا﴾ باری سـووکی
هەڵگرت (سـکی پڕبوو) ﴿فَمَرَّتۡ بِهِۦۖ﴾ ئەمجا لەسـەر ئەم (سـك پڕیە) ماوەیەك تێپەڕی ﴿فَلَمَّآ أَثۡقَلَت﴾
جـا کاتێـك (سـکەکەی) قـورس بـوو ﴿دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا﴾ (ژن و مێردەکە) هـەردوو لە خـوا پاڕانەوە
﴿لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَٰلِحٗا﴾ سوێند بێ ئەگەر تۆ منداڵێکی چاك و تەواومان پێ بدەیت ﴿لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾
بێگومـان لە سـوپاس گوزاران دەبین (١٨٩) ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا﴾ بەڵام کاتێـك ( نەوەکانی ئادەم وحەوا
پـاش خۆیـان) پەروەردگـار منداڵێکـی چاکـی پێدان ﴿جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ﴾ چەنـد هاوبەشـێکیان بۆخوا
دانـا ( وەك ئـەوەی بتپەرستەکان دەیانکـرد) ﴿فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ﴾ لـەوەی کەپێـی دابـوون ﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا
يُشۡرِكُونَ﴾ خـوا لـەوە بـەرزو بڵند ترە کە هاوبەشـی بـۆ دابنێن (١٩٠) ﴿أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا﴾ ئایا شـتانێك
دەکەن بە هاوبەشـی خوا کە ناتوانن هیچ شـتێك دروسـت بکەن ﴿وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ﴾ لە کاتێکدا خۆشـیان
دروسـت کـراون (١٩١) ﴿وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ نَصۡرٗا﴾ وە(ئـەو بـت و پەرستراوانە) ناتوانـن هیـچ یارمەتی
یەکیـان بدەن ﴿وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ﴾ هەروەهـا ناتوانن یارمەتی خۆیشـیان بدەن (١٩٢) ﴿وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى
ٱلۡهُدَىٰ﴾ وە ئەگـەر ئێـوە ئـەوان (بتـەکان) بانگ بکەن بـۆ ڕێی ڕاسـت ﴿لَا يَتَّبِعُوكُمۡۚ﴾ شـوێنتان ناکەون
﴿سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡ أَدَعَوۡتُمُوهُمۡ﴾ بـۆ ئێوە یەکسـانە چ بانگیـان بکـەن ﴿أَمۡ أَنتُمۡ صَٰمِتُونَ﴾ یـان بـێ دەنـگ بـن (
سوودتان پێ ناگەیەنن) (١٩٣) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی ﴿تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ کە ئێوە هاوارو داوایان
لـێ دەکەن جگە لە خوا ﴿عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ﴾ ئەوانیش چەند بەندەیەکن وەك خۆتان ﴿فَٱدۡعُوهُمۡ﴾ دەی
بانـگ وهاواریان لێ بکـەن ﴿فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ﴾ با وەڵامتان بدەنەوە (ویستەکانتان بـە جێ بهێنن)
﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگـەر ئێـوە ڕاسـت گـۆن، (١٩٤) ﴿أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ﴾ ئایا ئەوانـە (هیچ نەبێ
وەك خۆتان) قاچیان هەیە کە پێ ی بڕۆن بەڕێدا ﴿أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ﴾ یان دەسـتیان هەیە کەدەسـتی
پـێ بوەشـێنن ﴿أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ﴾ یـان چاویـان هەیـە کەپـێ ی ببینـن ﴿أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ
بِهَاۗ﴾ یان گوێیان هەیە کەپێ ی ببیسـتن ﴿قُلِ﴾ (ئەی موحەممـەد ﷺ) بڵێ: ﴿ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ﴾ بانگی
هاوبەشەکانتان بکەن ﴿ثُمَّ كِيدُونِ﴾ پاشان نەخشەوپیلانم بۆدانێن ﴿فَلَا تُنظِرُونِ﴾ ومۆڵەتیشم مەدەن (١٩٥)

﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ﴾ بەڕاستی پشتیوان و دۆستی من هەر خوایە ﴿ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ﴾ ئەو (خوایەی)
کەقورئانی ناردە خوارەوە ﴿وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وە هەر ئەویش پشتیوانی چاکەکاران دەکات
﴿١٩٦﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ وە ئەوانەی ئێوە جگە لە خوا هانایان بۆ دەبەن ﴿لَا يَسۡتَطِيعُونَ
نَصۡرَكُمۡ﴾ ناتوانن یارمەتی تان بدەن ﴿وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ﴾ ناشتوانن یارمەتی خۆیان بدەن
﴿١٩٧﴾ ﴿وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ﴾ وە ئەگەر بانگیان بکەن بۆ ڕێگای ڕاست ﴿لَا يَسۡمَعُواْۖ﴾ ئەوان نابیستن
﴿وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ﴾ وە وادەزانی بۆ تۆ دەڕوانن ﴿وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان هیچ نابینن ﴿١٩٨﴾
﴿خُذِ ٱلۡعَفۡوَ﴾ دەست بگرە بە لێبوردەیی یەوە (چاوو پۆشی بکە) ﴿وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ﴾ فەرمانیش
بدە بە چاکە و چاکە کردن ﴿وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ و ڕوو وەرگێڕە لە نەفامان و نەزانان (وازیان لێ
بهێنە) ﴿١٩٩﴾ ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ﴾ وە ئەگەر خەتەرەو خەیاڵ و وەسوەسەیەکت بۆ هات لە
لایەنی شەیتانەوە﴿فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ﴾ یەکسەر پەنا بگرە بەخوا﴿إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی هەر ئەو
بیسەری زانایە ﴿٢٠٠﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی خواناس و پارێزکار بوون ﴿إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ
مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ کاتێك خەتەرو وەس وەسەیەکیان لەشەیتانەوە پێ بگات ﴿تَذَكَّرُواْ﴾ یادی خوا
دەکەن و خوایان بیر دەکەوێتەوە﴿فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ﴾ جا کتوپڕ بەرچاویان ڕۆشن دەبێتەوە (ڕاستی
دەدۆزنەوە) ﴿٢٠١﴾ ﴿وَإِخۡوَٰنُهُمۡ يَمُدُّونَهُمۡ فِي ٱلۡغَيِّ﴾ وە برا (شەیتانە)کانیان یارمەتییان دەدەن لە گومڕایی
بووندا ﴿ثُمَّ لَا يُقۡصِرُونَ﴾ پاشان کۆتایی ناهێنن و واز ناهێنن(بۆ گومڕا کردنیان) ﴿٢٠٢﴾ ﴿وَإِذَا لَمۡ
تَأۡتِهِم﴾ وە هەر کاتێك (وەحی دوا بکەوێت) ئایەتێکیان بۆ نەهێنی ﴿بِـَٔايَةٖ قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَاۚ﴾ دەیان
ووت: بۆچی لەخۆتەوە ڕێکی ناخەیت (بۆ خۆت هەڵی نابەستی) ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) بڵێ: بێگومان من هەر شوێنی ئەوە دەکەوم ﴿مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّيۚ﴾ کە لەلایەن پەروەردگارمەوە
وەحیم بۆ دەکرێت ﴿هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ﴾ ئەم (قورئانە) بەرچاو ڕۆشنی و بەڵگەیە لەلایەن
پەروەردگارتانەوە﴿وَهُدٗى﴾ و ڕێنموونی و نیشاندەرە﴿وَرَحۡمَةٞ﴾ و میهرەبانی و بەزەیی خوایە
﴿لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بۆ گەل و هۆزێك کە باوەڕ دێنن ﴿٢٠٣﴾ ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ﴾ وە کاتێك کە قورئان
خوێندرا﴿فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ﴾ دەبێ گوێ ی لێ بگرن ﴿وَأَنصِتُواْ﴾ و بێ دەنگیش بن ﴿لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾
بۆ ئەوەی خوا میهرەبانیتان لە گەڵدا بکات ﴿٢٠٤﴾ ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ﴾ وە لە (دڵ و) دەروونت دا یادی
پەروەردگارت بکە﴿تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ﴾ بە پاڕانەوەو ترس و بیمەوە﴿وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ﴾ بەبێ ئەوەی
دەنگ بەرزبکەیتەوە ﴿بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ﴾ لە بەرەبەیانی و دەماو دەمی ئێوارانداا﴿وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ﴾
وە لە بێ ئاگایان مەبە ﴿٢٠٥﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ﴾ بە ڕاستی ئەو فریشتانەی کە لای پەروەردگارتن
﴿لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ﴾ خۆ بە زل نازانن ﴿عَنۡ عِبَادَتِهِۦ﴾ لە پەرستنی ئەو(خوا) ﴿وَيُسَبِّحُونَهُۥ﴾ و هەمیشە
ستایشی دەکەن (کڕنووشی بۆ دەبەن) ﴿وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ۩﴾ و تەنها سوژدە بۆ ئەو دەبەن. ﴿٢٠٦﴾

# سورەتی ﴿ الأنفال ﴾

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ يَسْأَلُونَكَ ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن ﴿ عَنِ الْأَنفَالِ ﴾ سەبارەت بە دەسکەوتەکان(ی
جەنگی بەدر) ﴿ قُلِ ﴾ تۆش بڵێ: ﴿ الْأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ ﴾ ئەو دەست کەوتانە هەر بۆ خوا و پێغەمبەرن
ﷺ ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ ﴾ کەواتە خۆتان بپارێزن و لە خوا بترسن ﴿ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ ﴾ وە پەیوەندی
نێوان خۆتان چاك بکەنەوە ﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﴾ و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بن ﴿ إِن كُنتُم
مُّؤْمِنِينَ ﴾ ئەگەرئێوە بڕوادارن (١) ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ ﴾ بێگومان بڕواداران تەنها کەسانێکن
﴿ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ ﴾ کاتێك کە باسی خوا کرا و ناوی هێنرا ﴿ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾ دڵیان دەترسێت و ترسی لێ
دەنیشێت ﴿ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ ﴾ کاتێکیش ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا ﴿ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا ﴾
بڕوایان (پێی) زیاد دەبێت ﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ و هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن (٢)
﴿ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ ﴾ ئەوانەن کە بەڕاستی نوێژەکانیان بەجێ دەهێنن ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾
وە لەو ڕزق و ڕۆزیەی پێمان داوون (لە پێناوی خوادا) دەیبەخشن (٣) ﴿ أُولَٰئِكَ هُمُ ﴾ هەر ئەوانەن
﴿ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ﴾ بڕوادارانی ڕاستەقینە ﴿ لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ پلەی بەرزیان بۆ هەیە لای
پەروەردگاریان ﴿ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ و لێ خۆش بوونی (تاوانەکانیان) و ڕۆزی پەسەندو چاك
(یان بۆ هەیە) (٤) ﴿ كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِن بَيْتِكَ ﴾ هەر چۆنێك کە پەروەردگارت لە ماڵەکەت (لەشاری
مەینە) دەریهێنایت (بۆ جەنگی بەدر) ﴿ بِالْحَقِّ ﴾ بەهەق و ڕاستی ﴿ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ لەکاتێکدا
بێگومان دەستەیەك لەبڕواداران ﴿ لَكَارِهُونَ ﴾ بێزاربوون و پێیان ناخۆش بوو (٥) ﴿ يُجَادِلُونَكَ فِي الْحَقِّ ﴾
دەمەقاڵێت لەگەڵدا دەکەن لە (شتی) هەق و ڕاستدا ﴿ بَعْدَمَا تَبَيَّنَ ﴾ دوای ئەوەش کە بۆیان ڕوون
بۆتەوە (کە ڕاستە هێشتا جەنگیان لا گرانە) ﴿ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى الْمَوْتِ ﴾ وەك ئەوەی بە توندی بەرەو
مردن ببرێن ﴿ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴾ و بەچاوی خۆیان (مردن) ببینن (٦) ﴿ وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللَّهُ ﴾ (بیری ئەو کاتە
بکەنەوە) کەخوا بەڵێنی بەئێوەدا ﴿ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ ﴾ دەست کەوتی یەکێك لەو دوو کۆمەڵە (کاروانە
بازرگانییەکە یان سەرکەوتن بە سەریاندا) ﴿ أَنَّهَا لَكُمْ ﴾ بەڕاستی دەبێتە هی ئێوە ﴿ وَتَوَدُّونَ ﴾ وە ئێوە
ئەوەتان پێ خۆشە ﴿ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ ﴾ کە ئەو دەستکەوتە بێ چەکە، (کاروانە بازرگانیەکە)
﴿ تَكُونُ لَكُمْ ﴾ بۆ ئێوە بێت ﴿ وَيُرِيدُ اللَّهُ أَن يُحِقَّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ ﴾ بەڵام خوا دەیەوێت ووتەکانی خۆی
بەڕاست دەرچێ (حەق سەرکەوێ) ﴿ وَيَقْطَعَ دَابِرَ الْكَافِرِينَ ﴾ و ڕەگ و ڕیشەی بێ باوەڕان لەبن بێنێ
(٧) ﴿ لِيُحِقَّ الْحَقَّ ﴾ تا هەق جێگیر بکات ﴿ وَيُبْطِلَ الْبَاطِلَ ﴾ و ناحەقیش لەناو بەرێ و پوچەڵێ بکاتەوە
﴿ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ ﴾ با تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێت (٨)

﴿إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێك (لە بەدر دا) هاناتان بۆ پەروەردگارتان دەبرد ﴿فَٱسۡتَجَابَ
لَكُمۡ﴾ خواش هات بەهاناتانەوە ﴿أَنِّي مُمِدُّكُم﴾ ووتی من دەنێرم بۆ یارمەتیان ﴿بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾
هەزار فریشتە ﴿مُرۡدِفِينَ﴾ بە دوای یەکدا (دێنە خواری) ﴿٩﴾ ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ﴾ وەخوا
ئەوەی تەنها بۆ شادی و موژدە نارد ﴿وَلِتَطۡمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمۡۚ﴾ تا دڵەکانتان پێ ی ئارام بگرێت ﴿وَمَا
ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ﴾ وە سەر کەوتنیش تەنها لای خواوەیەو بەس ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا
بەدەستەڵاتی کار بەجێ یە ﴿١٠﴾ ﴿إِذۡ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێ (خوا) وەنەوزی بەسەرتاندا
هێنا ﴿أَمَنَةٗ مِّنۡهُ﴾ (بووە هۆی) دڵنیایی ئێوە لە لایەن (پەروەردگار) خۆیەوە ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيۡكُم مِّنَ
ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ بارانیشی لە ئاسمانەوە بۆ باراندن ﴿لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ﴾ تا پاکتان بکاتەوە پێی ﴿وَيُذۡهِبَ عَنكُمۡ
رِجۡزَ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ و پیسی شەیتان (دوو دڵی و گومان) لەئێوە دوور بخاتەوە ﴿وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ﴾
و پەیوەندی دڵەکانتان پتەو بکات ﴿وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلۡأَقۡدَامَ﴾ وە بەو (بارانی) پێکانتان دامەزراو و جێگیر
بکات ﴿١١﴾ ﴿إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ﴾ (بێنەوە بیر) کاتێك کە پەروەردگارت نیگای نارد ﴿إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ بۆ
فریشتەکان ﴿أَنِّي مَعَكُمۡ﴾ (کە بە پێغەمبەر وباوەڕداران ڕابگەیەنن) کە بێگومان من (خوای گەورە)
لەگەڵتانم ﴿فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ﴾ دەی دڵی کەسانێك قایم و دامەزراو کەن کە باوەڕیان هێناوە
﴿سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ﴾ بە زوویی ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەو کەسانەی کە بێ باوەڕ بوون
﴿فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ﴾ جا ئێوەش لەسەرووی گەردنیان بدەن (واتە سەریان) ﴿وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ﴾
وە لە هەموو سەر پەنجەکانیان بدەن (واتە لە هەموو لاشەیان بدەن لەسەرەوە تا خوارەوە) ﴿١٢﴾ ﴿ذَٰلِكَ﴾
ئەوە ﴿بِأَنَّهُمۡ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ﴾ لەبەر ئەوەی کە بەڕاستی ئەوانە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان کرد
﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ هەر کەسێکیش دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ
ٱلۡعِقَابِ﴾ ئەوە بێگومان تۆڵە و سزای خوا زۆر سەخت وبەتینە ﴿١٣﴾ ﴿ذَٰلِكُمۡ فَذُوقُوهُ﴾ (حوکم و
سزای ئێوە) ئەوەیە دەی بیچەژن ﴿وَأَنَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ وە بەڕاستی بۆ بێ بڕوایان سزای
ئاگری دۆزەخ هەیە ﴿١٤﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ زَحۡفٗا﴾ کاتێك (لەجەنگ دا) ڕووبەڕووی زۆرێك لەبێ باوەڕان بوونەوە ﴿فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ﴾
قەت پشتیان تێ مەکەن و هەڵمەیەن ﴿١٥﴾ ﴿وَمَن يُوَلِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ دُبُرَهُۥٓ﴾ وە هەر کەس لەو ڕۆژەدا پشتیان تێ
بکات و هەڵبێت ﴿إِلَّا مُتَحَرِّفٗا لِّقِتَالٍ﴾ مەگەر (مەبەستی ئەوەبێت) بۆ هێرش کردن بگەڕێتەوە سەریان
﴿أَوۡ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٖ﴾ یان بڕوات بۆ لای کۆمەڵێکی تر (و یارمەتیان بدات) ﴿فَقَدۡ بَآءَ بِغَضَبٖ مِّنَ
ٱللَّهِ﴾ ئەوە بێگومان بەرق و خەشمی خواوە دەگەڕێتەوە ﴿وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ﴾ وە جێگای دۆزەخ دەبێت
﴿وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ کە جێگایەکی زۆر خراپ و بەدە ﴿١٦﴾

﴿فَلَمۡ تَقۡتُلُوهُمۡ﴾ دە كەواتە ئێوە ئەوانتان نەكوشت ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمۡۚ﴾ بەڵكو خوا ئەوانی كوشت
﴿وَمَا رَمَيۡتَ إِذۡ رَمَيۡتَ﴾ وەكاتێ كە (مشتێ خۆڵ و زیخت ڕووبەكافران) هاوێشت بەتەنها تۆ نەتهاوێشت
﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾ بەڵكو خوا هاوێشتی (و لێیدان) ﴿وَلِيُبۡلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بۆ ئەوەی خوا بڕواداران تاقی
بكاتەوە﴿مِنۡهُ بَلَآءً حَسَنًاۚ﴾ لەلایەن خۆیەوە بەتاقی كردنەوەیەكی چاك ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾
بەڕاستی خوا بیسەری زانایە ﴿١٧﴾ ﴿ذَٰلِكُمۡ﴾ (سەر ئەنجامی باوەڕداران و كافران) ئەوە بوو
(كەڕووی دا) ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيۡدِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ وە بەڕاستی خوا پیلانی بێ بڕوایان پوچەڵ دەكاتەوە
﴿١٨﴾ ﴿إِن تَسۡتَفۡتِحُواْ﴾ ئەگەر ئێوە ئەی (بێباوەڕان) داوای یارمەتی و سەركەوتن دەكەن ﴿فَقَدۡ جَآءَكُمُ
ٱلۡفَتۡحُۖ﴾ئەوە بەڕاستی سەركەوتنتان بۆ هات (گاڵتەیان پێ دەكات) ﴿وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ﴾
ئەگەر كۆتایی بهێنن (لەدوژمنایەتی پێغەمبەریان كۆتای بهێنن بە بت پەرستی) ئەوە چاكترە بۆتان
﴿وَإِن تَعُودُواْ نَعُدۡ﴾ وەئەگەر بگەڕێنەوە (بۆ سەر دژایەتی یان بت پەرستی) ئەوە ئێمەش دەگەڕێینەوە (بۆ
سەر خستی باوەڕداران) ﴿وَلَن تُغۡنِيَ عَنكُمۡ فِئَتُكُمۡ شَيۡـًٔا﴾هەر گیز دەستەو كۆمەڵەكەتان هیچ سوودێكتان
پێ ناگەیەنن ﴿وَلَوۡ كَثُرَتۡ﴾ هەر چەند زۆریش بن ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ وەبێگومان خوا لەگەڵ
بڕواداران دایە ﴿١٩﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾
گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی بن ﴿وَلَا تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ﴾ وپشتی تێمەكەن﴿وَأَنتُمۡ تَسۡمَعُونَ﴾ لەكاتێكدا ئێوە
تێدەگەن و دەبیستن ﴿٢٠﴾ ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعۡنَا﴾ وەكو ئەوانە مەبن كە(بەسەر زارەكی) ووتیان
:بیستمان ﴿وَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ﴾ لەكاتێكدا كە ئەوانە هیچ نابیستن و تێناگەن ﴿٢١﴾ ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ﴾
بەڕاستی خراپترینی هەموو گیان لەبەران لە لای خوا ﴿ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ ئەو
كەڕولاڵانەن ( مەبەست پێ بێباوەڕانە) كە بیرناكەنەوە و ژیر نابن ﴿٢٢﴾ ﴿وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ﴾ وە ئەگەر خوا
بیزانیایە ﴿فِيهِمۡ خَيۡرٗا﴾ چاكەیەك لەو (بێباوەڕانەدا) هەیە ﴿لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ﴾ بێگومان وای لێ دەكردن
ببیستن﴿وَلَوۡ أَسۡمَعَهُمۡ﴾ ئەگەر خوا (فەرمانی خۆی) پێ ببیستنایە ﴿لَتَوَلَّواْ﴾ هەر ڕوویان وەردەگێڕا
﴿وَّهُم مُّعۡرِضُونَ﴾ وە ئەوان هەر گوێ پێ نەدەرن ﴿٢٣﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەو كەسانەی
بڕواتان هێناوە ﴿ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ﴾ وەڵامی خوا و پێغەمبەر بدەنەوە ﴿إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ﴾
كاتێك كە بانگتان دەكەن بۆ لای ئەو (ئایینەی) كەزیندووتان دەكاتەوە﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ بشزانن ﴿أَنَّ
ٱللَّهَ﴾ بەڕاستی (ویستی) خوا ﴿يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ﴾ دەبێتە بەربەست لەنێوان ئادەمی و دڵیدا
(واتە ئەو پەڕی دەستەڵاتی هەیە بەسەر دڵی بەندەكانیدا) ﴿وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ﴾ وە بەڕاستی هەر
لای ئەو كۆ دەكرێنەوە (لەڕۆژی دوایی دا) ﴿٢٤﴾ ﴿وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ﴾ وەخۆتان بپارێزن لەئاشوب و بەڵایەك
﴿لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ﴾ كە تووشی ستەم كارانتان نابێت بە تایبەتی (هەمووتان
دەگرێتەوە) ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ وە بشزانن ﴿أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ كە بەڕاستی تۆڵە و سزای خوا زۆر
سەختە ﴿٢٥﴾

﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ﴾ بیـر بکەنـەوە ﴿إِذۡ أَنتُمۡ﴾ کاتێك کە ئێـوە ﴿قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ کـەم و لاوازکراو
و ژێـر دەسـتە بـوون لـە زەوی (مەککـە)دا ﴿تَخَافُونَ﴾ دەترسـان ﴿أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ﴾ کەخەڵکـی
بتـان فرێنـن وبـدەن بەسـەرتاندا ﴿فَـَٔاوَىٰكُمۡ﴾ ئەمجا خـوا پەنـای دان ﴿وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ﴾ وە بەیارمەتی
خـۆی پشـتیوانی کـردن ﴿وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ وە ڕزق و ڕۆزی لـە شـتە پـاك (و حەڵاڵـە) کان پـێ
بەخشـین ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ بـۆ ئـەوەی سـوپاس گـوزاری خوا بـن ﴿٢٦﴾ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی
ئـەو کەسـانەی باوەڕتـان هێنـاوە ﴿لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ﴾ ناپاکی مەکـەن لەگەڵ خـوا و پێغەمبەر ﷺ دا
﴿وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ﴾ وە ناپاکـی مەکـەن لـە سـپاردەکانی نـاو خۆتـان ﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ لەکاتێکـدا
کـە ئێـوە دەزانـن (ناپاکـی یـە) ﴿٢٧﴾ ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ وە بزانـن ﴿أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ﴾ بەڕاسـتی ماڵ و
منداڵتـان ﴿فِتۡنَةٞ﴾ هـۆی تاقی کردنـەوەی (ئێـوەن) ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ﴾ وە بەڕاسـتی لای
خـوا پاداشـتی زۆر گـەورە هەیـە ﴿٢٨﴾ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئـەی ئەو کەسـانەی کـە باوەڕتـان هێناوە
﴿إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ ئەگـەر ئێوە خواناس بن و خۆتان بپارێزن ﴿يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا﴾ هۆی جیاکەرەوەی
(ڕاسـت و ناڕاسـت) تان بۆ فەراهەم دێنێت ﴿وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ﴾ و لە گوناهەکانتان دەبورێ
﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ﴾ و لێتـان خـۆش دەبێت ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ وە خوا خاوەن بەهرە و چاکەی زۆر
گەورەیـە ﴿٢٩﴾ ﴿وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وە(بیـر بکەرەوە) کاتێك ئەوانەی بێ باوەڕ بوون پیلانیان لە
دژت دەگێڕا ﴿لِيُثۡبِتُوكَ﴾ تا بەندو کۆتت بکەن ﴿أَوۡ يَقۡتُلُوكَ﴾ یان بتکوژن ﴿أَوۡ يُخۡرِجُوكَۚ﴾ یان (لە مەککە)
دەرت بکـەن ﴿وَيَمۡكُرُونَ﴾ وە ئەوانـە (بەردەوام) پیـلان دەگێڕن و فڕو فێـڵ دەکەن ﴿وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ﴾ وە
خوایـش لەبەرامبـەر ئەوانـدا پیلان دەگێڕێت بۆ پووچـەڵ کردنەوەی پیلان و فـڕ و فێڵەکانیان ﴿وَٱللَّهُ
خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ﴾ وە خـوا چاکترینـی پیـلان گێڕانە (بەرامبەر پیـلان گێڕان) ﴿٣٠﴾ ﴿وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا﴾
وە کاتێـك کـە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسـەردا دەخوێنرێتـەوە ﴿قَالُواْ قَدۡ سَمِعۡنَا﴾ دەڵێن :بیسـتمان (واتە
گرنگ نی یە) ﴿لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ﴾ ئەگەر بمان ویسـتایە وێنەی ئەو ئایەتانەمان دەووت ﴿إِنۡ هَٰذَآ
إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ئەمـە هیچ نی یە جگە لە ئەفسـانەی پێشـینان ﴿٣١﴾ ﴿وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ﴾ (بیر بکەرەوە)
کاتێـك (کـە بێ بـاوەڕەکان) دەیان ووت ئەی پەروەردگـار ﴿إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ﴾ ئەگەر
ئـەم قورئانـە ڕاسـتەو لەلایـەن تـۆوە هاتـووە ﴿فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ﴾ دەی بـەرد بەسـەرماندا ببارێنـە
﴿مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لـە ئاسـمانەوە ﴿أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ یـان سـزای سـەختی پڕ ئازارمـان بـۆ بنێرە ﴿٣٢﴾
﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمۡ﴾ وە بەڕاسـتی خـوا سـزایان نـادات ﴿وَأَنتَ فِيهِمۡۚ﴾ لەکاتێـك دا تـۆ (ئـەی
موحەممـەد ﷺ) لەناویانـدا بێت ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمۡ﴾ هەروەها خوا تووشـی سـزایان ناکات
﴿وَهُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ﴾ لە کاتێکدا ئەوان داوای لێبوردن بکەن لە خودا ﴿٣٣﴾

﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا چۆن سـزایان نـادات؟! ﴿وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ لە کاتێکدا
ئـەوان بەرگری (موسـوڵمانان) دەکەن لە چوون بۆ مزگەوتی بەڕێـزو پیرۆزی (کەعبە) ﴿وَمَا كَانُوٓاْ
أَوْلِيَآءَهُۥٓ﴾ لەکاتێکـدا ئەوان خۆشەویسـت و سـەر پەرشـتیاری ئـەو (مزگەوتـە) نین ﴿إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا
ٱلْمُتَّقُونَ﴾ بەڕاسـتی سـەر پەرشـتیار و خۆشەویسـتی ئـەو (مزگەوتـە) خـوا ناسـان و پارێزکارانن
﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن ٣٤ ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ﴾ وەنوێژی ئەوان
(بت پەرستەکان) لەماڵی خوادا هیچ نی یە ﴿إِلَّا مُكَآءً﴾ جگە لە فیکە کردن ﴿وَتَصْدِيَةً﴾ و چەپڵە
لێدان نەبێت ﴿فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ﴾ کەواتە بچەژن سزای سەخت (لە بەدردا) ﴿بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾
بە هۆی بڕوا نەهێنانتانەوە ٣٥ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاسـتی ئەوانەی کەبێ باوەڕن ﴿يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ﴾
مـاڵ و سـامانیان خـەرج دەکەن ﴿لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بـۆ ئەوەی بەر هەڵسـتی ڕێگـەی خوا بکەن
﴿فَسَيُنفِقُونَهَا﴾ جا لە مەودوا (ماڵ و سـامانیان) بەخت دەکەن و دەیبەخشـن ﴿ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً﴾
لەپاشان دەبێت بەداخ و پەژارە بۆیان ﴿ثُمَّ يُغْلَبُونَ﴾ پاشان ژێر دەکەون ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ وە ئەوانەی
کەبـێ بـاوەڕن ﴿إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴾ هـەر لـەدۆزەخ دا کـۆ دەکرێنـەوە ٣٦ ﴿لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ
مِنَ ٱلطَّيِّبِ﴾ بۆ ئەوەی خوا دەستەی ناپاك لە دەستەی پاك جیا بکاتەوە ﴿وَيَجْعَلَ ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾
و ناپاکەکانیـش لەسـەر یـەك هەڵچنێـت ﴿فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا﴾ ئەمجـا هەمـووی پێکەوە کـۆ بکاتەوە
﴿فَيَجْعَلَهُۥ فِي جَهَنَّمَ﴾ و بیخاتـە دۆزەخـەوە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ هەر ئەوانە زیانبار و خەسـارۆ
مەنـدی تـەواون ٣٧ ﴿قُل﴾ (ئەی موحەممـەد ﷺ) بڵێ: ﴿لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ بە ئەوانـەی کە بێ باوەڕ
بـوون ﴿إِن يَنتَهُواْ﴾ ئەگـەر کۆتایی بهێنن (بەبـێ بڕوایی یەکەیان) ﴿يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ﴾ بەڕاسـتی
(خـوا) دەبورێـت لەهەرچـی لـەوەو پێـش کردوویانـە ﴿وَإِن يَعُودُواْ﴾ بەڵام ئەگـەر بگەڕێنەوە (سـەر
کـردەوەی پێشـوویان) ﴿فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئەوە بەڕاسـتی باوو یاسـای پێشـینە (خراپە)
کان چـی بوو (بۆ ئەمانیش دووبـارە دەبێتەوە) ٣٨ ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ﴾ (بـاوەڕداران) جەنگ بکەن لەگەڵ
بێ باوەڕاندا ﴿حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ هەتا ئاژاوە(بێ باوەڕی و بت پەرستی) نامێنێت ﴿وَيَكُونَ ٱلدِّينُ
كُلُّهُۥ لِلَّهِ﴾ و ئاییـن و ملکەچـی هەمووی بۆ خوا دەبێت ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ﴾ جا ئەگەر کۆتایی یان هێنا
﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ﴾ ئەوەبەڕاسـتی خـوا ﴿بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بەهەر کردەوەیەك کە (بێ بـاوەڕان) دەیکەن
بینایـە ٣٩ ﴿وَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ وە ئەگـەر ڕوویـان وەرگێڕاو پشـتیان هەڵکرد ﴿فَٱعْلَمُوٓاْ﴾ ئـەوە بزانن ﴿أَنَّ ٱللَّهَ
مَوْلَىٰكُمْ﴾ بەڕاسـتی خوا پشـتیوان و یارمەتی دەرتانە ﴿نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ﴾ ئەو (خوا) باشـترین پشـتیوانە
﴿وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ﴾ وە باشترین یاریدەدەر و سەرخەرتانە ٤٠

﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ وەبزانـن ﴿أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ﴾ بێگومـان هەر چیەكتان لەغەنیمەت(دەسـكەوت) و گرت
﴿فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ﴾ ئـەوە بەڕاسـتی پێنـج یەكی ئەو(دەسـكەوتە) بۆ خوا ﴿وَلِلرَّسُولِ﴾ و بـۆ پێغەمبەر ﷺ
﴿وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ و بۆ خزمانی (پێغەمبەر ﷺ) ﴿وَٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ و بۆ هەتیوان ﴿وَٱلۡمَسَٰكِينِ﴾ و بۆ هەژاران
﴿وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ و بۆ ڕێبوارانە ﴿إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕتان هێناوە بەخوا ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا﴾
وە بـەوەی ناردوومانەتـە خوارەوە ﴿عَلَىٰ عَبۡدِنَا﴾ بۆسـەر بەندەكەمـان (كەموحەممـەد پێغەمبەرە ﷺ)
﴿يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ﴾ لەڕۆژی جیاكردنەوەدا (واتە جەنگی بەدر) ﴿يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ﴾ لەو ڕۆژەی كەدوو
كۆمەڵ بەیەك گەیشتن (دژ بەیەك جەنگان) ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ وە خوا بەسەر هەموو شتێكدا
دەسـەڵاتدارە (٤١) ﴿إِذۡ أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ وەكاتێـك ئێوە لای خواری (شـیوەكەی) نزیك (مەدینە)دا
بـوون ﴿وَهُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلۡقُصۡوَىٰ﴾ و ئەوانیـش لەلای سـەروی (شـیوەكەی) دوورتر (لەمەدینـە)دا بوون
﴿وَٱلرَّكۡبُ﴾ كاروانەكەش ﴿أَسۡفَلَ مِنكُمۡۚ﴾ لەخوارتری ئێوە بوو ﴿وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ﴾ وە ئەگەر بەڵێنتان
بەیەكتر بدایە ﴿لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ﴾ بێگومان جیاواز دەبوون ﴿فِي ٱلۡمِيعَٰدِ﴾ لەبەڵێنەكەدا (جەنگتان نەدەكرد)
﴿وَلَٰكِن﴾ بەڵام ﴿لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا﴾ (كۆی كردونەتەوە) بۆ ئەوەی خوا كارێك بەدی بێنێت ﴿كَانَ
مَفۡعُولٗا﴾ هـەر بـەدی دێت ﴿لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ﴾ بۆ ئـەوەی لەناو بچێت ئەو كەسـەی (بەلای خواوە)
لەناو چووە ﴿عَنۢ بَيِّنَةٖ﴾ لەڕووی بەڵگەوە ﴿وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ﴾ وەبۆ ئەوەی بژی ئەوەی (بەلای
خـواوە) دەژی لـەڕووی بەڵگـەوە ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ وە بەڕاسـتی خـوا بیسـەری زانایـە (٤٢)
﴿إِذۡ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ﴾ (بیربكەرەوە) كاتێ كەخوا ئەو (بێ بڕوای)انەی نیشان دەدایت ﴿فِي مَنَامِكَ قَلِيلٗاۖ﴾
لەخەوتـدا كـەم بـوون ﴿وَلَوۡ أَرَىٰكَهُمۡ كَثِيرٗا﴾ خـۆ ئەگـەر (خـوا ژمـارەی) ئەوانەی بەزۆر نیشـان
بدایتایە ﴿لَّفَشِلۡتُمۡ﴾ ئەوە بێگومان دەترسـان و دەشكان ﴿وَلَتَنَٰزَعۡتُمۡ﴾ وە جیاواز دەبوون ﴿فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾
لەبڕیاری جەنگدا ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَۚ﴾ بەڵام خوا پاراستنی ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ﴾ بەڕاستی ئەو (خوا) زانایە
﴿بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بـە ئـەوەی لەناو دڵاندایـە (٤٣) ﴿وَإِذۡ يُرِيكُمُوهُمۡ﴾ (بیربكەنـەوە) كاتێك خوا ئەوانی
نیشـان دان ﴿إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ﴾ كاتێ ڕووبەڕوو بوونـەوە ﴿فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا﴾ لەبەرچاوتان بەكەم دەبینران
﴿وَيُقَلِّلُكُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ﴾ ئێوەشی لەبەر چاوی ئەوان بەكەم نیشان دا ﴿لِيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا﴾ بۆ ئەوەی خوا
كارێـك بەدی بهێنێت ﴿كَانَ مَفۡعُولٗاۗ﴾ هەر بـەدی دێت ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ وە هەموو كارەكان
هەر بۆلای خوا دەگێڕێنرێنەوە (٤٤) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی كەباوەڕتان هێناوە ﴿إِذَا لَقِيتُمۡ
فِئَةٗ﴾ كاتـێ (لەجەنگدا) لەگـەڵ كۆمەڵێكدا ڕووبـەڕوو بوونەوە ﴿فَٱثۡبُتُواْ﴾ خۆ گربـن (هەڵنەیەن)
﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا﴾ و یادی خوا زۆر بكەن ﴿لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ بۆ ئەوەی سەركەوتووبن (٤٥)

﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ (ئەی باوەڕداران) گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بکەن ﴿وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ﴾
وە جیاوازمەبن و دووبەرەکی مەکەن بەهۆیەوە بشکێن و لاوازببن ﴿وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ﴾ و هێزتان بڕوا و
نەمێنێت ﴿وَٱصۡبِرُوٓاْۚ﴾ وەخۆڕاگربن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆگراندایە ﴿٤٦﴾ ﴿وَلَا تَكُونُواْ
كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ﴾ وەك ئەوانە ( بت پەرستەکان) مەبن دەرچوون ﴿مِن دِيَٰرِهِم﴾ لەماڵ و وڵاتی خۆیان
﴿بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ بەفیزو ڕووپامایی بۆ خەڵك کردن ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ وەبەرگری (خەڵکیان)
دەکرد لەڕێگەی خوا ﴿وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ﴾ وە خوا بەهەموو ئەو کارانەی دەیکەن ئاگادارە ﴿٤٧﴾
﴿وَإِذۡ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ (بیربکەرەوە) کاتێك کەشەیتان کردەوەکانیانی ( بۆ بت پەرستەکان)
ڕازاندنەوە ﴿وَقَالَ﴾ وە ووتی: ﴿لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ ئەمڕۆ هیچ کەس بەسەرتاندا زاڵنابێ
﴿وَإِنِّي جَارٞ لَّكُمۡۖ﴾ و بێگومان من پەنادەر (و پارێزەر)ی ئێوەم ﴿فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلۡفِئَتَانِ﴾ ئەمجا کاتێك
هەردوو دەستەکە ڕوو بەڕووی یەکتر بوونەوە ﴿نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ﴾ (شەیتان) پاشەو پاش بەدوای
خۆی دا گەڕایەوە ﴿وَقَالَ﴾ و ووتی: ﴿إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكُمۡ﴾ بەڕاستی من بەریم لەئێوە ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا
تَرَوۡنَ﴾ چونکە بەڕاستی ئەوەی من دەبینم ئێوە نایبینن ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ﴾ بەڕاستی من لەخوا دەترسم
﴿وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ و خوا زۆر تۆڵەی بەتین و سەختە ﴿٤٨﴾ ﴿إِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ﴾ (بیربکەرەوە) کاتێ
دووڕووەکان ﴿وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ و ئەوانەی نەخۆشی لەدڵیاندابوو دەیان ووت ﴿غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ
دِينُهُمۡۗ﴾ ئەوانە (موسوڵمانەکان) ئاینەکەیان فریوی داوون ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ﴾ هەرکەسێ پشت
بەخوا ببەستێت ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ ئەوە بەڕاستی خوا بە دەسەڵاتی کار دروستە ﴿٤٩﴾ ﴿وَلَوۡ
تَرَىٰٓ﴾ وە ئەگەر دەتبینی ﴿إِذۡ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ کاتێك فریشتەکان گیانی بێ باوەڕان
دەکێشن ﴿يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ﴾ لەدەموچاوو پاشیان دەدەن ﴿وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ﴾ و (پێیان
دەڵێن) بچەژن سزای ئاگری سوتێنەر ﴿٥٠﴾ ﴿ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ﴾ ئەو (ئازار و سزایە) بەهۆی
ئەوەوەیە دەستی خۆتان پێشی خستووە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ﴾ وە بەڕاستی خوا بە هیچ شێوەیەك
ستەمکار نی یە بۆ بەندەکانی ﴿٥١﴾ ﴿كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ﴾ (ئەم بێ باوەڕانە باوو نەریتیان) هەر وەکو باو
و نەریتی دەستەی فیرعەون ﴿وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ﴾ و ئەوانەیە لەپێش ئەوانەوە بوون ﴿كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾
کە بێ بڕوا بوون بە نیشانەکانی خوا ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۚ﴾ ئیتر (سزای) خوایش گرتنی بەهۆی
گوناهەکانیانەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بەڕاستی خوا بەتوانای تۆڵە بەتینە ﴿٥٢﴾

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمۡ يَكُ مُغَيِّرٗا نِّعۡمَةً﴾ ئـەوە بەهـۆی ئەوەوەیە کەبەڕاسـتی خوا هیـچ نیعمەتێـك ناگۆڕێ
﴿أَنۡعَمَهَا عَلَىٰ قَوۡمٍ﴾ کە بەخشیبێتی بەهەر گەل و هۆزێك ﴿حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ﴾ هەتا ئەوەی لەخۆیاندایە
نەیگۆڕن ( واتە ئیمانەکەیان بگۆڕن بۆ بێ باوەڕی) ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾ وە بەڕاسـتی خوا بیسـەری
زانایـە (٥٣) ﴿كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ﴾ (ئـەم کـردەوەی ئەمـان) وەکـو بـاوو نەریتی دەسـتەی
فیرعـەون وئەوانـەی لەپێش ئەوان بوون وایە ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ بەڵگەکانـی پەروەردگاریان بەدرۆ
زانـی ﴿فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ﴾ ئێمەش لەناومان بردن بەهۆی گوناهەکانیانەوە ﴿وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَۚ﴾ وە
دەست و پێوەندەکەی فیرعەونمان خنکاند ﴿وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ﴾ چونکە هەموویان ستەم کار بوون (٥٤)
﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی بەدترینی گیان لەبەران (کەسانێکن) بەلای خواوە ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾
ئەوانـەن بـێ باوەڕبوون ﴿فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ لەبـەر ئەوەی ئەوان بـاوەڕ ناهێنن (٥٥) ﴿ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ﴾
ئەوانـەی کەپەیمانـت لەگەڵیان بەسـت ﴿ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ﴾ لەپاش ئەوە پەیمانەکەیان دەشـکاند
﴿فِي كُلِّ مَرَّةٖ﴾ لەهەمـوو جارێکـدا ﴿وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ﴾ و ئـەوان خۆیـان ناپارێزن ولە خودا ناترسـن
(٥٦) ﴿فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ﴾ جـا ئەگەر تووشـی ئەوانـە بوویت (زاڵبوویت بەسـەریاندا) لـە جەنگ دا
﴿فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ﴾ (سـزاو کوشـتن و بڕینێکیان پێ بکە) کەببێتە هۆی ترس لەدڵی ئەو دوژمنانەی
لەپشـتیانەوەن ﴿لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ﴾ بەڵکو ئەوان بیربکەنەوە (٥٧) ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةٗ﴾ وە ئەگەر
بەڕاسـتی مەترسیت کرد لەناپاکی دەسـتەیەك (کەپەیمانەکەیان بشکێنن) ﴿فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ﴾ ئەو
کاتە (پەیمانەکە) فڕێ بدەرەوە بۆیان بەڕێك وپێکی تا بەرامبەر بن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾ بەڕاستی
خـوا ناپاکانـی خـۆش ناوێـت (٥٨) ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ﴾ وە باگومان نەبـەن ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْۚ﴾ ئەوانەی
بێ باوەڕ بوون پێشـکەوتوون ﴿إِنَّهُمۡ لَا يُعۡجِزُونَ﴾ بێگومان ئەوانە خوا دەسـتە پاچە ناکەن (لە دەسـتی
دەرناچـن) (٥٩) ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم﴾ (ئـەی ئیمانـداران) ئامـادەی بکەن بۆیـان ﴿مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ﴾ ئەوەی
لەتواناتاندا هەیە لەهێز ﴿وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ﴾ وە لەئەسـپی دابەسـتراو ﴿تُرۡهِبُونَ بِهِۦ﴾ تا بترسێنن پێی
﴿عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ﴾ دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان ﴿وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ﴾ وە کەسانێکی تریش بێجگە
لەوان ﴿لَا تَعۡلَمُونَهُمُ﴾ ئێوە نایانناسن ﴿ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ﴾ خوا دەیانناسێت ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ﴾ وە هەرشتێك
ببەخشـن ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەڕێـی خوادا ﴿يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ﴾ (پاداشـەکەی) بەتـەواوی دەدرێتەوە پێتان
﴿وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ﴾ وە ئێوە هیچ ستەمتان لێ ناکرێت (٦٠) ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا﴾ وە ئەگەر ئەوانە مەیلی
ئاشتیان هەبوو تۆش (ئەی موحەممەد ﷺ) مەیلی ئەوە بکە ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ﴾ وە پشت بەخوا ببەستە
﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ بەڕاستی هەر ئەو زاتە بیسەری زانایە (٦١)

﴿وَإِن يُرِيدُوٓاْ﴾ وە ئەگەر ویستیان ﴿أَن يَخۡدَعُوكَ﴾ فێڵت لێ بکەن ﴿فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ﴾ ئەوە بەڕاستی خوات
بەسە (پشت و پەنات بێت) ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ﴾ خوا ئەو زاتەیە کەبەهێزی کردیت بەیارمەتی
خۆی ﴿وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ وە بەبڕواداران (٦٢) ﴿وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ﴾ وە هۆگری خستە نێوان دڵەکانیان
﴿لَوۡ أَنفَقۡتَ﴾ ئەگەر بتبەخشیایە ﴿مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ هەرچی لەزەویدا هەیە ﴿مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ﴾
هۆگریت نەدەخستە نێوان دڵەکانیانەوە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ﴾ بەڵام خوا هۆگری خستە نێوانیان
﴿إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ بەڕاستی هەر ئەو زاڵی کاردروستە (٦٣) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ ﴿حَسۡبُكَ
ٱللَّهُ﴾ خوات بەسە ﴿وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ هەروەها ئەو بڕوادارانەش کەشوێنت کەوتوون (٦٤)
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ ﴿حَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِۚ﴾ هانی بڕواداران بدە لەسەر جەنگ
کردن (لەگەڵ دوژمناندا) ﴿إِن يَكُن مِّنكُمۡ﴾ ئەگەر لەئێوەدا ببێت ﴿عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ﴾ بیست کەسی
خۆڕاگر ﴿يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ﴾ زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەسی (بێ باوەڕ) دا ﴿وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ﴾
وە ئەگەر سەد کەس لەئێوە هەبێت ﴿يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا﴾ زاڵ دەبن بەسەر هەزار کەس دا ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ﴾ لەئەوانەی بێ باوەڕن ﴿بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ﴾ بەهۆی ئەوەی بەڕاستی ئەوانە کۆمەڵێکن
نافامن (٦٥) ﴿ٱلۡـَٰٔنَ﴾ ئێستا ﴿خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ﴾ خوا فەرمانەکەی سووك کرد لەسەرتان ﴿وَعَلِمَ أَنَّ
فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ﴾ وەزانی کەلاوازیتان تێدایە ﴿فَإِن يَكُن مِّنكُم﴾ جا ئەگەر لەئێوەدا ببێت ﴿مِّاْئَةٞ
صَابِرَةٞ﴾ سەد کەسی خۆڕاگر ﴿يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ﴾ زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەس(ی بێ باوەڕ)
دا ﴿وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ﴾ وەئەگەر هەزار کەس لەئێوە هەبن ﴿يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ﴾ زاڵدەبن بەسەر
دوو هەزار کەس دا ﴿بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ﴾ بەفەرمانی خوا ﴿وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ وەخوا لەگەڵ خۆگراندایە
(٦٦) ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ﴾ بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوا نی یە ﴿أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ﴾ کە دیلی (لە دوژمنان)
هەبێت و ڕایان بگرێت ﴿حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ هەتا کوشتاری زۆریان لێ نەکات ودەسەڵاتی
نەچەسپێت لەزەویدا ﴿تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا﴾ ئایائێوە ماڵی دونیاتان دەوێت(بە وەرگرتنی فیدیە)؟
﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ﴾ (لەکاتێکدا) خوای گەورە (پاداشتی) ڕۆژی دوایی دەوێت (بۆ ئێوە) ﴿وَٱللَّهُ
عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ وە خوا بەتوانا و زاڵی کار دروستە (٦٧) ﴿لَّوۡلَا كِتَٰبٞ﴾ ئەگەر نووسراو (و بڕیار)ێك
﴿مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ﴾ لەلایەن خواوە پێش نەکەوتایە (کە حەڵاڵ بوونی دەستکەوت و غەنیمەتی جەنگە)
﴿لَمَسَّكُمۡ فِيمَآ أَخَذۡتُمۡ﴾ بێگومان لەبەر ئەو (فیدیە)ی کە وەرتان گرت (لەبەرامبەر ئازادکردنی دیلەکاندا)
تووشتان دەبوو ﴿عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ سزایەکی گەورە (٦٨) ﴿فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمۡتُمۡ﴾ کەواتە بخۆن لەوەی کە
بە غەنیمەت گرتان ﴿حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ﴾ حەڵاڵ و پاکە ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ﴾ وە لە خوا بترسن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾
بەڕاستی خوا لێ بوردەی میهرەبانە (٦٩)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ ﴿قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم﴾ بڵێ بەوانەی کە لەژێر دەستتان دان ﴿مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ﴾
لەدیلەکان ﴿إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ﴾ ئەگەر خوا بزانێت ﴿فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا﴾ لەدڵەکانتاندا چاکەیەك هەیە ﴿يُؤۡتِكُمۡ
خَيۡرٗا﴾ پێتان دەبەخشێت چاکتر ﴿مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ﴾ لەو (فیدیە)ی لێتان وەرگیراوە ﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ﴾
وە لێتان دەبورێت ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ وە خوا لێ بووردەی میهرەبانە ﴿٧٠﴾ ﴿وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ﴾ وەئەگەر
(ئەو دیلانە) بیانەوێت ناپاکیت لەگەڵدا بکەن ﴿فَقَدۡ خَانُواْ ٱللَّهَ﴾ ئەوە بێگومان ناپاکیان لەگەڵ خوادا کرد
﴿مِن قَبۡلُ﴾ لەپێش (ئەمەدا) ﴿فَأَمۡكَنَ مِنۡهُمۡۗ﴾ خواش (تۆی) زاڵ کرد بەسەریاندا ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾
وەخوا زانای دانایە ﴿٧١﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێنا ﴿وَهَاجَرُواْ﴾ و کۆچیان
کرد ﴿وَجَٰهَدُواْ﴾ و تێکۆشان ﴿بِأَمۡوَٰلِهِمۡ﴾ بەماڵیان ﴿وَأَنفُسِهِمۡ﴾ و بەگیانیان ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەڕێگای
خوادا ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ﴾ وە ئەوانەی (کۆچەرەکانیان) گرتە خۆیان و کۆمەکیان کردن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ
بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ﴾ ئەوانە پشتیوان و دۆستی یەکترین ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ﴾ وە ئەوانەی کەبڕوایان
هێناوەو کۆچیان نەکردووە ﴿مَا لَكُم﴾ بۆ ئێوە نی یە ﴿مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ﴾ هیچ جۆرە دۆستایەتیەکیان
بکەن ﴿حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ﴾ هەتا کۆچ نەکەن ﴿وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ﴾ وەئەگەر داوای یارمەتیان لێ کردن ﴿فِي ٱلدِّينِ
فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ﴾ لە(پارێزگاری) ئایین ئەوە پێویستە لەسەرتان یارمەتی دانیان ﴿إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ﴾ مەگەر
لەدژی گەلێك ﴿بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞۗ﴾ لەنێوان ئێوەو ئەواندا پەیمان هەبێت (نابێت یارمەتیان بدەن)
﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ وەخوا بینایە بەوەی کەدەیکەن ﴿٧٢﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وە ئەوانەی کە بێ بڕوان
﴿بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ﴾ هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن ﴿إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ﴾
ئەگەر ئەو(پشتیوانی یە) نەکەن لەزەویدا ئاژاوەو فەسادو بەد خویەکی گەورە بەرپا دەبێت ﴿٧٣﴾
﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ وەئەوانەی کەبڕوایان هێنا ﴿وَهَاجَرُواْ﴾ وکۆچیان کرد ﴿وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ و تێکۆشان
لەڕێگەی خوادا ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ﴾ ئەوانەش(کۆچەرەکان) یان گرتە خۆیان و کۆمەکیان کردن
﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ﴾ بەڕاستی هەر ئەوانەن بڕوادارانی ڕاستەقینە ﴿لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ﴾ بۆ ئەوانەیە
لێ بووردن ﴿وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾ و ڕۆزیەکی چاك و بەنرخ ﴿٧٤﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ﴾ وە ئەوانەی لەدواییدا
بڕوایان هێنا ﴿وَهَاجَرُواْ﴾ و کۆچیان کرد ﴿وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ﴾ و لەگەڵ ئێوەدا تێکۆشان ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ
مِنكُمۡۚ﴾ ئا ئەوانە لەئێوەن ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ﴾ وە ئەوانەی خزمی یەکترن ﴿بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ﴾ هەندێکیان
(بۆ میرات گرتن) شایستە ترن بەهەندێکی تریان ﴿فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ﴾ لەکتێبی خوادا (لە قورئان یا لە لوح
المحفوظ) دا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ﴾ بەڕاستی خوا بەهەموو شتێك زانایە ﴿٧٥﴾

# سورەتی ﴿ التَّوۡبَةِ ﴾

﴿بَرَآءَةٞ﴾ ئەمـە بـەری بوونێکی گـەورەو گرنگە ﴿مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ﴾ لەلایـەن خـواو پێغەمبەرەکەیەوە
﴿إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم﴾ بـۆ ئەوانەی کەپەیمانتان لەگەڵ بەسـتوون ﴿مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ لە هاوبەش دانەران ﴿١﴾
﴿فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ کەواتـە (ئەی بـێ بڕواکان) لەزەویدا بگەڕێـن ﴿أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ﴾ ماوەی چوار مانگ
﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ﴾ وە بزانـن بێگومـان ئێـوە ﴿غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ﴾ لەدەسـتی خـوا دەرناچـن ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخۡزِي
ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ وە بەڕاسـتی خـوا ڕیسـواکەری بـێ بڕوایانـە ﴿٢﴾ ﴿وَأَذَٰنٞ﴾ هەروەهـا ئەمـە ڕاگەیاندنێکە
﴿مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ﴾ لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە ﴿إِلَى ٱلنَّاسِ﴾ بۆ گشت خەڵکی ﴿يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ﴾
لـەڕۆژی حەجـی گەورەدا ﴿أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥۚ﴾ بەڕاسـتی خـواو پێغەمبەرەکـەی بەرین
لەهاوبەش دانەرەکان ﴿فَإِن تُبۡتُمۡ﴾ جا ئەگەر پەشیمان ببنەوە ﴿فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ﴾ ئەوە چاکترە بۆتان ﴿وَإِن
تَوَلَّيۡتُمۡ﴾ وە ئەگەر پشتی تێ بکەن ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ﴾ ئەوە بزانن بێگومان ئێوە ﴿غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِۗ﴾ لە دەستی
خوادەرناچن ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ مژدەش بدە بەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە ﴿بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ بەسزایەکی
ئـازاردەر ﴿٣﴾ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم﴾ بێجگـە لەوانـەی کەپەیمانتـان لەگەڵ بەسـتوون ﴿مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ لە
هاوبەش دانەرەکان ﴿ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا﴾ پاشان هیچ کەم و کوڕییان لێ نەکردن ﴿وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا﴾
وە پشـتیوانی هیچ کەسێکیان نەکردووە لەدژتان ﴿فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ﴾ ئەوە ئێوەش پەیمانەکەیان بۆ
تەواو بکەن (لەگەڵیان دا بیبەنەسەر) ﴿إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡۚ﴾ تاماوەی دیاری کراویان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾
بەڕاسـتی خـوا پارێـزکاران ولەخواترسـانی خـۆش دەوێـت ﴿٤﴾ ﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ﴾ ئەمجـا
کاتێك مانگە حەرامەکان (ذو القعدة ، ذو الحجة، محرم، رجب) تەواو بوون ﴿فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ ئەوە
هاوبەش دانەرەکان بکوژن ﴿حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ﴾ لە هەر شوێنێك دەستان کەوتن ﴿وَخُذُوهُمۡ﴾ وە (بەدیل)
بیانگرن ﴿وَٱحۡصُرُوهُمۡ﴾ وە بەرگریان بکەن لە دەرچوون ﴿وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ﴾ وە بۆیان دانیشن لە
هەموو جێگایەکی چاوەڕوانی دا ﴿فَإِن تَابُواْ﴾ جا ئەگەر پەشـیمان بوونەوە ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ و نوێژیان
کـرد ﴿وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ و زەکاتیان دا ﴿فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ﴾ ئەوە ڕێیان بەرەڵاکەن ووازیان لێ بهێنن ﴿إِنَّ
ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بەڕاسـتی خوا لێ بووردەی میهرەبانە ﴿٥﴾ ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ﴾ وە ئەگەر
کەسـێك لـە هاوبەش دانەرەکان داوای هاوسـێ یەتـی و پەنادانی لێ کردیـت ﴿فَأَجِرۡهُ﴾ ئەوە پەنای
بـدە ﴿حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ بـۆ ئەوەی ووتەی خـوای گەورە (قورئان) ببیسـتێت ﴿ثُمَّ أَبۡلِغۡهُ مَأۡمَنَهُۥۚ﴾
لـە پاشـان بیگەیەنـە جێگـای هێمنی خـۆی ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ﴾ ئەوە لەبـەر ئەوەیە کـە بێگومـان ئەوانە
﴿قَوۡمٞ لَّا يَعۡلَمُونَ﴾ دەستە و کۆمەڵێکن هیچ نازانن ﴿٦﴾

﴿كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ﴾ چۆن عەهـد و پەیمـان دەبێت بۆ هاوبەش دانـەرەکان ﴿عِندَ اللَّهِ وَعِندَ
رَسُولِهِ﴾ لای خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ ﴿إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ﴾ بێجگـە لەوانـەی کەپەیمانتـان
لەگەڵبەسـتن ﴿عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ لای مزگەوتـی حـەرام (کـە کەعبـەی پیـرۆزە) ﴿فَمَا اسْتَقَامُوا
لَكُمْ﴾ جاچەنـد ئەوانـە ڕێك و ڕاسـت بـوون لەگەڵتان ﴿فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ﴾ ئێوەش ڕێك و ڕاسـت
بن لەگەڵیان ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ بەڕاسـتی خوا خۆ پارێزەران وخواناسانی خۆش دەوێت ﴿٧﴾
﴿كَيْفَ﴾ چـۆن (پەیمان دەبەنە سـەر) ﴿وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ﴾ لەکاتێکدا ئەگەر زاڵ ببن بەسـەرتاندا
﴿لَا يَرْقُبُوا فِيكُمْ﴾ لەبـەر چـاو ناگـرن دەربـارەی ئێـوە ﴿إِلًّا وَلَا ذِمَّةً﴾ هیـچ خزمایەتـی و سـوێند
و بەڵێنێك ﴿يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ﴾ بەووتـەی دەمیان ڕازیتان دەکەن ﴿وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ﴾ بەڵام دڵەکانیان
دژتانـن و ڕقیان لێتان دەبێتەوە ﴿وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ﴾ ئا ئەوانە زۆربەیان سـنوورەکانی خودا دەبەزێنن
﴿٨﴾ ﴿اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ بەڵگـە و ئایەتەکانـی خوایـان گۆڕییـەوە ﴿ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ بەنرخێکـی زۆر کـەم
﴿فَصَدُّوا عَن سَبِيلِهِ﴾ ئەمجا بەرگرییان لەڕێگەی خوا کرد ﴿إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بەڕاسـتی
زۆر خـراپ بـوو ئـەوەی ئـەوان دەیانکرد ﴿٩﴾ ﴿لَا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ﴾ لەبـەر چاو ناگـرن دەربارەی هیچ
بڕوادارێـك ﴿إِلًّا وَلَا ذِمَّةً﴾ هیـچ خزمایەتـی و سـوێندو بەڵێنێـك ﴿وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُعْتَدُونَ﴾ وە هەر
ئەوانـە دەسـت درێـژی کـەرن ﴿١٠﴾ ﴿فَإِن تَابُوا﴾ ئەمجـا ئەگەر پەشـیمان بوونـەوە ﴿وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ﴾
و نوێژیـان بەجێ هێنـا ﴿وَآتَوُا الزَّكَاةَ﴾ و زەکاتیاندا ﴿فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ﴾ ئـەوە براتانن لەئاییندا
﴿وَنُفَصِّلُ الْآيَاتِ﴾ وە ئێمـە بەڵگـەکان ڕوون دەکەینەوە ﴿لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بـۆ گەلێك کەدەیزانن
﴿١١﴾ ﴿وَإِن نَّكَثُوا أَيْمَانَهُم﴾ بەڵام ئەگەر سـوێندو پەیمانەکەیان هەڵوەشـاندەوە ﴿مِّن بَعْدِ عَهْدِهِمْ﴾
پـاش بەسـتنی پەیمانەکەیـان ﴿وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ﴾ وە تەشـەرو تانەیانـدا لەئایینەکەتان ﴿فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ
الْكُفْرِ﴾ ئـەوە بجەنگـن لـەدژی پێشـەوایانی بـێ بـاوەڕ ﴿إِنَّهُمْ لَا أَيْمَانَ لَهُمْ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـە
هیـچ جـۆرە پەیمانێکیـان نی یـە ﴿لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ﴾ بەڵکو کۆتایـی بێنن (بەبێ بـاوەڕی) ﴿١٢﴾ ﴿أَلَا
تُقَاتِلُونَ قَوْمًا﴾ ئایـا ئێـوە جەنـگ ناکـەن لەگـەڵ گەلێکـدا ﴿نَّكَثُوا أَيْمَانَهُمْ﴾ کەپەیمانەکەیـان
هەڵوەشـاندەوە (پەیمانی حودەیبیبە) ﴿وَهَمُّوا بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ﴾ و نیازی دەرکردنی پێغەمبەرﷺ یان
کـرد ﴿وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ هەر ئەوانیش لەیەکەم جارەوە دەسـتیان کـرد بەجەنگ لەگەڵ ئێوەدا
﴿أَتَخْشَوْنَهُمْ﴾ ئایا لێیان دەترسن ﴿فَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ﴾ (لەکاتێکدا) هەر خوا شایستەترە کە لێی بترسن
﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن ﴿١٣﴾

﴿قَٰتِلُوهُمۡ﴾ (ئەی باوەڕداران) بیان کوژن ﴿يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ﴾ خوا بەدەستی ئێوە سزایان دەدات
﴿وَيُخۡزِهِمۡ﴾ و ڕیسوایان دەکات ﴿وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ﴾ و سەرتان دەخات بەسەریاندا ﴿وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ
مُّؤۡمِنِينَ﴾ و (خوا) سینەو دڵی کۆمەڵی بڕوادار خۆش دەکات ﴿١٤﴾ ﴿وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡۗ﴾ و ڕق
و خەشمی دڵەکانیان دادەمرکێنێ و ناهێڵێت ﴿وَيَتُوبُ ٱللَّهُ﴾ وە خوای گەورە تەوبە وەردەگرێ ﴿عَلَىٰ
مَن يَشَآءُۗ﴾ لە هەر کەسێك کەبیەوێت ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زانای دانایە ﴿١٥﴾ ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تُتۡرَكُواْ﴾
ئایا گومانتان وابوو کەوازتان لێ دەهێنرێت ﴿وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ﴾ لەکاتێکدا هێشتا خوا ئاشکرای نەکردووە
﴿ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ﴾ ئەوانەی تێکۆشان لەئێوە ( لە پێناو خوادا) ﴿وَلَمۡ يَتَّخِذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ وە نەیان
کردووەو هەڵیان نەبژاردووە جگە لەخوا ﴿وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ و پێغەمبەرەکەی و موسوڵمانان
﴿وَلِيجَةٗۚ﴾ بە هاوڕاز و جێی نهێنیان (دڵسۆزیان) ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ وە خوا ئاگایە بەهەرچی
کەئێوە دەیکەن ﴿١٦﴾ ﴿مَا كَانَ لِلۡمُشۡرِكِينَ﴾ نابێت هاوبەش دانەران ﴿أَن يَعۡمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ﴾ مزگەوتەکانی خوا
ئاوەدان بکەنەوە (و سەرپەرشتیان بکەن) ﴿شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلۡكُفۡرِۚ﴾ لەکاتێکدا خۆیان شاهیدن
لەسەر خۆیان کە بێباوەڕن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ﴾ ئەوانە کردەوەکانیان هەڵوەشاوەتەوە ﴿وَفِي ٱلنَّارِ
هُمۡ خَٰلِدُونَ﴾ وە ئەوانە لەناو ئاگردا هەمیشەیین ﴿١٧﴾ ﴿إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی مزگەوتەکانی
خوا ئاوەدان دەکاتەوە ﴿مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ کەسێك کەبڕوای هێنابێت بەخوا ﴿وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ و بەڕۆژی
دوایی ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ و نوێژەکانی بەجێ هێنابێت ﴿وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾ و زەکاتی دابێت ﴿وَلَمۡ يَخۡشَ إِلَّا
ٱللَّهَۖ﴾ و لە کەس نەترسا بێت بێجگە لەخوا ﴿فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ﴾ جا بەڵکو ئەوانە ﴿أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾
لەو کەسانە بن کە ڕێنموونیی کراون ﴿١٨﴾ ﴿أَجَعَلۡتُمۡ سِقَايَةَ ٱلۡحَآجِّ﴾ (ئەی بێباوەڕان) ئایا پێتان وایە ئاودان
بەحاجییان ﴿وَعِمَارَةَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ و (سەرپەرشتی و) ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی حەرام
(کەعبەی پیرۆز) ﴿كَمَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ وەکو کەسێکە کەباوەڕی هێنا بێت بەخوا ﴿وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾
و بەڕۆژی دوایی ﴿وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ و تێکۆشا بێت لە ڕێی خوادا ؟ ﴿لَا يَسۡتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِۗ﴾ چوون
یەك نین بەلای خوداوە (و یەکسان نین) ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە خوا ڕێنموونی کۆمەڵی
ستەمکاران ناکات ﴿١٩﴾ ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ﴾ ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە و کۆچیان کردووە
﴿وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ و تێکۆشاون لەڕێگای خوادا ﴿بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ﴾ بەماڵیان و بەگیانیان ﴿أَعۡظَمُ
دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ﴾ پلەیان بەرزترە لای خوا ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ﴾ وەهەر ئەوانە سەرکەوتوون (لە دونیا و
دوا ڕۆژدا) ﴿٢٠﴾

﴿يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم﴾ پەروەردگاریـان موژدەیان دەداتێ ﴿بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَانٍ﴾ بەمیهرەبانی و ڕەزامەندی لەلایـەن خۆیەوە ﴿وَجَنَّاتٍ لَّهُمْ﴾ هەروەها بەهەشـتانێکیان بۆ هەیـە ﴿فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ﴾ نازو نیعمەتی بـەردەوام و هەمیشـەیی تێدایـە ﴿٢١﴾ ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ دەمێننـەوە تیایدا بەهەمیشـەیی ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ بەڕاسـتی خـوا پاداشـتی هـەرە گـەورەی لایـە ﴿٢٢﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئـەی ئەوانەی کەبڕواتـان هێنـاوە ﴿لَا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ﴾ بـاوك و براکانتـان دامەنێـن (هەڵمەبژێـرن) ﴿أَوْلِيَاءَ﴾ بەدۆسـت و خۆشەویسـت ﴿إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ﴾ ئەگـەر بێ باوەڕییـان لەباوەڕ لا خۆشەویسـترو چاکتربـوو ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ﴾ وە هـەر کـەس لەئێـوە ئەوانـە بکات بەدۆسـتی خـۆی ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ئـەوە هـەر ئەوانـە سـتەم کارن ﴿٢٣﴾ ﴿قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ: ئەگـەر باوکانتـان ﴿وَأَبْنَاؤُكُمْ﴾ وکوڕەکانتـان ﴿وَإِخْوَانُكُمْ﴾ وبراکانتـان ﴿وَأَزْوَاجُكُمْ﴾ وهاوسـەرەکانتان ﴿وَعَشِيرَتُكُمْ﴾ وخـزم وعەشـرەتتان ﴿وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا﴾ ومـاڵ و دارایـی یـەك (بـە زەحمـەت) پەیداتـان کـردووە ﴿وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا﴾ و بازرگانیـەك کەدەترسـن بـرەوی نەبێـت (بـێ بازاڕبێـت) ﴿وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا﴾ و خانـوو بەرەیـەك کەپێـی ڕازین ﴿أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ خۆشەویسـت ترە لاتان لەخـواو پێغەمبەرەکەی ﴿وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ﴾ و تێکۆشـان لەڕێگەکەیـدا ﴿فَتَرَبَّصُوا﴾ ئـەوە چـاوەڕوان بکـەن ﴿حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ﴾ هەتـا خـوا فەرمـان (و تۆڵـە)ی خـۆی دێنێـت (بۆتـان) ﴿وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ وە خـوا ڕێنموونـی کەسـانی تێپـەڕ لەسـنوور ناکات ﴿٢٤﴾ ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاسـتی خوا سـەری خسـتن ﴿فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ﴾ لـەزۆر جێگـاو شـوێندا ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ﴾ و لـەڕۆژی حونەینیشـدا (یارمەتـی دان) ﴿إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ﴾ کەبـەزۆری خۆتانـدا دەنازیـن ﴿فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا﴾ بەڵام ( ئەو زۆریە)هیـچ سـوودێکی نەبـوو بۆتـان ﴿وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ﴾ و زەویتان لەسـەر تەنـگ بوویەوە ﴿بِمَا رَحُبَتْ﴾ بەو فراوانیەی کەهەیەتی ﴿ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾ پاشان پشتتان کردە دوژمن و هەڵهاتن ﴿٢٥﴾ ﴿ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ﴾ لەپاش ئەوە خوا ئارامی خۆی نارد ﴿عَلَىٰ رَسُولِهِ﴾ بۆ سەر پێغەمبەرەکەی ﴿وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆ سەر بڕواداران ﴿وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا﴾ وە سەربازانێکی (لەئاسمانەوە) ناردە خوارەوە کەئێـوە نەتاندەبینیـن ﴿وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وەسـزای بـێ بڕواکانیشـی دا (بەکوشـتن و برینـداری و بەدیل گرتن) ﴿وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ﴾ ئەوەش سزای بێ باوەڕانە ﴿٢٦﴾

﴿ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ﴾ پاشـان خوا خۆش دەبێت ﴿مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ﴾ لەپاش ئەوە ﴿عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ﴾ لە هەر
کەسێك کـە بیەوێت ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ وە خوا لـێ بـوردەی میهرەبانە ﴿٢٧﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾
ئەی ئەوانەی کەبڕواتان هێناوە ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ﴾ بێگومان هاوبەش دانەران پیسـن ﴿فَلَا يَقۡرَبُواْ
ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ﴾ کەواتە با نزیکی مزگەوتی حەرام نەکەونەوە ﴿بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ﴾ پاش ئەم ساڵەیان
(ئەو ساڵەی فەتحی مەککە کرا) ﴿وَإِنۡ خِفۡتُمۡ عَيۡلَةٗ﴾ وەئەگەر لەنەبوونی ترسان ﴿فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ﴾
ئەوە لەمەو پاش خوا دەوڵەمەندتان دەکات ﴿مِن فَضۡلِهِۦٓ إِن شَآءَۚ﴾ لە چاکە و فەزڵ و بەهرەی خۆی
ئەگـەر ویسـتی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ بەڕاسـتی خـوا زانـای کاردروسـتە ﴿٢٨﴾ ﴿قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ﴾
جەنـگ بکـەن لەگـەڵ ئەوانـەی ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ کەبڕوا ناهێنـن بەخـوا ﴿وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾
وە بـەڕۆژی دوایـی ﴿وَلَا يُحَرِّمُونَ﴾ وە بەحەرامـی دانانێن ﴿مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ ئـەوەی کە خوا
و پێغەمبەرەکـەی حەرامیـان کـردووە ﴿وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ﴾ وە ملکەچ ناکەن بۆ ئایینی ڕاسـت
و دروست (ئاینی ئیسلام) ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ لە ئەوانەی کتێبیان پێ بەخشراوە ( مەبەست
پێـی گـاور وجولەکەکانە) ﴿حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ﴾ هەتا باج و سـەرانە دەدەن (بەدەوڵەتی ئیسـلامی)
﴿عَن يَدٖ﴾ بەدەسـتی خۆیان و بەملکەچی ﴿وَهُمۡ صَٰغِرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان سەرشۆڕو ڕیسوان ﴿٢٩﴾
﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ﴾ جوولەکـەکان ووتیان ﴿عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ﴾ عوزەیر کوڕی خوایە ﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى﴾
و گاوورەکانیـش ووتیـان ﴿ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ﴾ مەسـیح کـوڕی خوایـە ﴿ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ﴾
ئـەوە ووتـەی ئەوانـە بەدەمـی خۆیـان دەیڵێـن ﴿يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ﴾ وەك ووتـەی ئەوانـە دەڵێنـەوە
﴿كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ﴾ کەپێشتر بێ بڕوا بوون ﴿قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ﴾ خوا لەناویان بەرێت ﴿أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ﴾
چـۆن درۆ دەکـەن و لەهەق و ڕاسـتی لادەدەن ﴿٣٠﴾ ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ﴾ زانا و قەشـەکانیان
کـردوە ﴿أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بەپەروەردگـار لەجیاتـی خـوا ﴿وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ﴾ هەروەهـا
مەسـیحی کـوڕی مەریەمیش (یان کردوە بە خـوا) ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ﴾ لە کاتێکدا فەرمانیـان پێ نەدراوە
﴿إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ﴾ بێجگـە لـەوەی کەیـەك خـوا بپەرسـتن ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ﴾ کـە هیـچ
پەرسـتراوێکی ڕاسـت نـی یـە بێجگـە لەئـەو ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ﴾ پـاك و بێگـەردی بـۆ ئەو (خـوا) یەی
﴿عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ لەوەی دەیکەنە هاوبەشی ﴿٣١﴾

﴿يُرِيدُونَ أَن يُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ﴾ دەیانەوێـت ڕووناکـی (ئایینـی) خوا بکوژێننـەوە﴿بِأَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ بەفووی
دەمیـان ﴿وَيَأۡبَى ٱللَّهُ﴾ وە خـوا نایەوێت و ناهێڵێت ﴿إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ﴾ و هەر ڕووناکی خۆی ( کە ئاینی
پیرۆزی ئیسـلامە) تەواو دەکات سەری دەخات ( بەسەر تەواوی بێباوەڕاندا) ﴿وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾
هـەر چەنـدە بـێ بـاوەڕان پـێ یـان ناخـۆش بێـت ﴿٣٢﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ﴾ خـوا زاتێکـە
کەپێغەمبەرەکەی ناردووە ﴿بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ﴾ بە ڕێنموونی و ئایینی ڕاست ﴿لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ
كُلِّهِۦ﴾ بـۆ ئـەوەی زاڵی بکات بەسـەر هەموو ئایینەکاندا بە گشـتی ﴿وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾ هەر
چەنـدە بت پەرسـتان پێـان ناخۆش بێت ﴿٣٣﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئـەی ئەوانـەی کەبڕواتان هێناوە
﴿إِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ﴾ بەڕاسـتی زۆر لەزاناو قەشەکانی (جوولەکەو گاوور) ﴿لَيَأۡكُلُونَ
أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ﴾ سـامان وماڵـی خەڵکـی دەخـۆن بەناهـەق ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۗ﴾ وبەرگری
(خەڵـك) دەکـەن لەڕێگەی خوا ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ﴾ وە ئەوانـەی ئاڵتون و زیوو
سـەریەك دەنێن و کۆدەکەنەوە ﴿وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾و نایبەخشـن و زەکاتەکەی دەرناکەن لە
پێناو خودا ﴿فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ ئەوە موژدەیان پێ بدە بەسـزایەکی ئازاردەر ﴿٣٤﴾ ﴿يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا﴾
لـە ڕۆژێکـدا سـوور دەکرێتـەوە ﴿فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾ لەئاگـری دۆزەخ دا ﴿فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ﴾
ئەوسـا بەو (ئاڵتون و زیوە سـوورەوە بووە) داخ دەکرێت ڕوویان ﴿وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡۖ﴾و تەنیشتیان
و پشتیان ﴿هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ﴾(پێیان دەووترێت) ئەمە ئەو (سامانەیە)کۆتان دەکردەوە بۆ خۆتان
﴿فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡنِزُونَ﴾ دەبچێژن (تۆڵەی) ئەوەی کۆتان دەکردەوە ﴿٣٥﴾ ﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ﴾
بەڕاسـتی ژمارەی مانگەکان (ی سـاڵ) لای خـوا ﴿ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا﴾ دوانزە مانگە ﴿فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾
لە (لوح المحفوظ) وا دانراوە ﴿يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ لەڕۆژێکەوە (خوا) ئاسمانەکان و زەوی
دروست کردووە ﴿مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ﴾ چوار لەو مانگانە گەورەو بەڕێزن (شەڕیان تێدا قەدەغەکراوە)
﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ﴾ ئـەوە ئایینـی ڕێـك و ڕاسـتە﴿فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ﴾ کەواتـە لەو چوار
مانگـەدا سـتەم مەکـەن لەخۆتـان ( وکوشـتاریان تێـدا مەکـەن) ﴿وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ﴾
وە بجەنگـن لـەدژی تەواوی بت پەرسـتان بەتێکڕا ﴿كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗۚ﴾ هـەروەك ئەوان دژی
ئێـوە دەجەنگـن بـە تێکـڕا و (بـێ جیـاوازی) ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ ئـەوەش بشـزانن ﴿أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾
کە بێگومان خوا لەگەڵ پارێزکاران وخواناساندایە (بە چاودێری و پاراستن) ﴿٣٦﴾

﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ﴾ بەڕاستی دواخستن و گۆڕینی (مانگە حەرامەکان) ﴿زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ﴾
ڕۆچوونە لە بێ باوەڕیی دا ﴿يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێ باوەڕانی پێ گومڕا دەکرێت ﴿يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا﴾
(دواخستنەکە) ساڵێك حەڵاڵی دەکەن ﴿وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا﴾ و ساڵێك حەرامی دەکەن ﴿لِّيُوَاطِـُٔواْ
عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ﴾ بۆ ئەوەی ڕێك بین لەگەڵ ژمارەی ئەو چوار مانگەی کەخوا ڕێزداری کردوون
(جەنگی تێیاندا حەرام کردووە) ﴿فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ﴾ سەر ئەنجام ئەوەی خوا حەرامی کردبوو
حەڵاڵی دەکەن ﴿زُيِّنَ لَهُمۡ﴾ جوان کراوە بۆیان ﴿سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ﴾ کردەوە ناشیرینەکانیان ﴿وَٱللَّهُ لَا
يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ خواش ڕێنموونی کەسانی بێ باوەڕ ناکات ﴿٣٧﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾
ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە﴿مَا لَكُمۡ﴾ ئێوە چیتانە ﴿إِذَا قِيلَ لَكُمُ﴾ کاتێك پێتان بووترێت
﴿ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ دەرچن(بۆ جیهاد) لەڕێی خوادا ﴿ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ لەشوێنی خۆتان
ناجولێن (خۆتان دوا دەخەن) ﴿أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ﴾ ئایا ئێوە ڕازین بەم ژیانەی
دونیا لەبری پاشەڕۆژ ﴿فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ دەی کامەیە خۆشی و شادیی ئەم ژیانەی دونیا
﴿فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ لەبەرامبەری خۆشی پاشە ڕۆژدا زۆر کەمە ﴿٣٨﴾ ﴿إِلَّا تَنفِرُواْ﴾ ئەگەر نەڕۆن
و دەرنەچن (بۆ جیهادکردن) ﴿يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا﴾ (خوا) سزاتان دەدا بەسزایەکی سەخت
و ئازاردەر ﴿وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ﴾ وەلەبری ئێوە گەلێکی تر دەهێنێت (جیاواز لەئێوە) ﴿وَلَا تَضُرُّوهُ
شَيۡـٔٗاۗ﴾ و ئێوە هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنن ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ وە خوا بەتوانایە بەسەر هەموو
شتێك دا ﴿٣٩﴾ ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ﴾ ئەگەر ئێوە یارمەتی ئەو (پێغەمبەر ﷺ) نەدەن ﴿فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ﴾ ئەوە
بێگومان خوا یارمەتی داوە ﴿إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ کاتێك بێ بڕوایان دەریان کرد لەمەککە
﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ﴾ پێغەمبەر یەکێك بوو لەو دوو کەسە ﴿إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ﴾ کاتێك ئەو دووانە (پێغەمبەر و ئەبو
بەکر) لەئەشکەوتی (ثور) دابوون ﴿إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ﴾ ئەو کاتە بەهاوەڵەکەی (بە ئەبوبەکری صدیقی)
ووت ﴿لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ﴾ خەم مەخۆ بێگومان خوا لەگەڵمانە ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ﴾ ئەمجا
خوا ئارامی و ئاسایشی بۆ ناردە خوارەوە ﴿وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ لَّمۡ تَرَوۡهَا﴾ وە یارمەتی دا بە سەربازانێك
کە نەتاندەبینین ﴿وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ووتەی بێ باوەڕانی گێڕا ﴿ٱلسُّفۡلَىٰۗ﴾ بەژێر کەوتوو
﴿وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ﴾ و ووتەی خوا ﴿هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ﴾ هەر بەرز و بڵندە ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زاڵی
باڵادەستی کاردروستە ﴿٤٠﴾

﴿ٱنفِرُواْ خِفَافًا﴾ بڕۆن و دەرچن (بۆ جیهاد) چ سووك بن (لەش ساغ و دەوڵەمەند و دەسەڵاتداربن)
﴿وَثِقَالًا﴾ چ قورس و گران بن (نەخۆش و هەژاربن) ﴿وَجَٰهِدُواْ﴾ و تێبكۆشن ﴿بِأَمۡوَٰلِكُمۡ
وَأَنفُسِكُمۡ﴾ بەماڵ و گیانتان ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ لەڕێگەی خوادا ﴿ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ ئەوەتان چاكترە بۆتان
﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بزانن ﴿٤١﴾ ﴿لَوۡ كَانَ عَرَضٗا قَرِيبٗا﴾ ئەگەر دەست كەوتێكی نزیك
﴿وَسَفَرٗا قَاصِدٗا﴾ و سەفەرێكی ئاسان بوایە ﴿لَّٱتَّبَعُوكَ﴾ ئەوا شوێنت دەكەوتن (دەردەچوون
لەگەڵتا) ﴿وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ﴾ بەڵام (بڕینی) ڕێگەی دوورو دژوار(ی جەنگی تەبوك)
بۆ ئەوان ناڕەحەتە ﴿وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ﴾ وە بێگومان (پاش گەڕانەوەتان لەتەبووك) سوێند
دەخۆن بەخوا ﴿لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا﴾ ئەگەر بمانتوانیایە ﴿لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ﴾ لەگەڵتان دەردەچووین
(بۆ جیهاد) ﴿يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ﴾ ئەوانە خۆیان دەفەوتێنن ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ وە خوا دەزانێ
بەڕاستی ئەو(دوو ڕووانە) درۆزنن ﴿٤٢﴾ ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) خوا لێت ببورێت
﴿لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ﴾ لەبەرچی مۆڵەتی ئەو ( دوو ڕوانەت) دا ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ﴾ هەتا بۆت دەركەوێت
﴿ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ﴾ ئەوانەی كەڕاستیان كرد ﴿وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ وە درۆزنەكان بناسیت ﴿٤٣﴾
﴿لَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) مۆڵەتت لێ وەرناگرن ( بۆ ئەوەی خۆیان دوا بخەن لە
جیهادكردن) ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ ئەوانەی كە بڕوایان هێناوە بەخوا ﴿وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ و بەڕۆژی
دوایی ﴿أَن يُجَٰهِدُواْ﴾ كەتێبكۆشن ﴿بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۗ﴾ بەماڵ و گیانیان ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ﴾ وە
خوا ئاگاو زانایە بەخۆ پارێزەران ﴿٤٤﴾ ﴿إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانە مۆڵەتت لێ وەردەگرن
( كە نەیەن بۆ جیهاد كردن) ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ كە بڕوایان نی یە بەخوا و بە ڕۆژی
دوایی ﴿وَٱرۡتَابَتۡ قُلُوبُهُمۡ﴾ و دڵەكانیان لە گومان و دوو دڵی دایە ﴿فَهُمۡ فِي رَيۡبِهِمۡ يَتَرَدَّدُونَ﴾
بۆیە ئەوانە لە گومان و دوودڵی خۆیاندا سەرگەردانن ﴿٤٥﴾ ﴿وَلَوۡ أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ﴾ ئەگەر بیان ویستایە
دەربچن ( بۆ جیهادكردن) ﴿لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةٗ﴾ ئەوە هۆو كەرەستەی پێویستیان بۆ ئامادە دەكرد
(لەچەك و وولاخ وتفاقی جەنگ) ﴿وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ﴾ بەڵام خوا دەرچوونی ئەوانی پێ ناخۆش
بوو ﴿فَثَبَّطَهُمۡ﴾ بۆیە (خوا) خاوی كردنەوە (لەدەرچوون بۆ جیهاد) ﴿وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ﴾ پێیان ووترا
دانیشن ﴿مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ﴾ لەگەڵجێ ماواندا ﴿٤٦﴾ ﴿لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم﴾ ئەگەر لەگەڵتاندا دەرچوونایە
﴿مَّا زَادُوكُمۡ إِلَّا خَبَالٗا﴾ هیچ شتێكیان بۆ زیاد نەدەكردن بێجگە لە تێكدان و خراپەكاری نەبێت
﴿وَلَأَوۡضَعُواْ خِلَٰلَكُمۡ﴾ و نێوان ئێوەیان تێكدەدا (بەدوو زمانی و هاتو هوت) ﴿يَبۡغُونَكُمُ ٱلۡفِتۡنَةَ﴾
ئاژاوەیان بۆ دەنانەوە ﴿وَفِيكُمۡ سَمَّٰعُونَ لَهُمۡۗ﴾ وە لەناو ئێوەدا خەڵكانێك هەن چاك گوێیان لێ
دەگرن ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە خوا بەئاگا و زانایە بەستەم كاران ﴿٤٧﴾

﴿لَقَدِ ٱبۡتَغَوُاْ ٱلۡفِتۡنَةَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی دەستیان دابوویە ئاژاوە (و بشێوی) ﴿مِن قَبۡلُ﴾ لەمەو پێش ﴿وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلۡأُمُورَ﴾ و جۆرەها فەرمان و پیلانیان بۆ (لاوازکردن) ت بەکارهێنا﴿حَتَّىٰ جَآءَ ٱلۡحَقُّ﴾ هەتا ڕاستی هات ﴿وَظَهَرَ أَمۡرُ ٱللَّهِ﴾ وە کارو فەرمانی خوا سەرکەوت ﴿وَهُمۡ كَٰرِهُونَ﴾ کە ئەوان پێیان ناخۆش بوو ﴿٤٨﴾ ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ﴾ وە هەندێ کەس لەوانە دەڵێن ﴿ٱئۡذَن لِّي﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) ڕوخسەتم بدە (با نەیەم بۆ جیهادکردن) ﴿وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ﴾ و تووشی گوناهو خراپەم مەکە ﴿أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْۗ﴾ ئاگاداربن (لەئێستەوە) کەوتوونەتە ناو گوناهو خراپەوە﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ و بێگومان دۆزەخ دەوری بێ باوەڕانی داوە ﴿٤٩﴾ ﴿إِن تُصِبۡكَ حَسَنَةٞ﴾ ئەگەر بەهرەو چاکە و سەرکەوتن بێتەڕێگات ﴿تَسُؤۡهُمۡۖ﴾ ناڕەحەت و غەمبار دەبن ﴿وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ﴾ وە ئەگەر ناڕەحەتی و تێشکانت تووش بێت ﴿يَقُولُواْ﴾ (بەکەشخەوە) دەڵێن ﴿قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا﴾ بەڕاستی ئێمە کاری خۆمان کرد ﴿مِن قَبۡلُ﴾ لەمەو پێش ﴿وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ﴾ جا ڕوو وەردەگێڕن بەخۆشحاڵی و شادمانی یەوە ﴿٥٠﴾ ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ هیچمان تووش نابێت ﴿إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا﴾ جگە لەوەی کەخوا نوسیویەتی بۆمان ﴿هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ﴾ خوا پشتیوانی ئێمەیە ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ وە بڕواداران با تەنها پشت بەخوا ببەستن ﴿٥١﴾ ﴿قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ﴾ (پێیان) بڵێ: ئایا چاوەڕوانی چی دەکەن بۆ ئێمە ﴿إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ﴾ بێجگەلە یەکێك لەدوو شتە زۆر چاکە کە(سەرکەوتن یان شەهید بوون لە پێناو خوادا) ﴿وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ﴾ ئێمەش چاوەڕوانین بۆ ئێوە ﴿أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ﴾ کەخوا دووچارتان بکات ﴿بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ﴾ بەسزایەك لەلایەن خۆیەوە ﴿أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ﴾ یان بەدەستی ئێمە ﴿فَتَرَبَّصُوٓاْ﴾ کەواتە چاوەڕوانی بکەن ﴿إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ﴾ بێگومان ئێمە لەگەڵ ئێوەدا چاوەڕوانین ﴿٥٢﴾ ﴿قُلۡ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ﴿أَنفِقُواْ طَوۡعًا﴾ ماڵ ببەخشن بەخۆشی خۆتان ﴿أَوۡ كَرۡهٗا﴾ یان بەزۆر و ناچاری ﴿لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمۡ﴾ هەرگیز لێتان وەرناگیرێت ﴿إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ﴾ چونکە بەڕاستی ئێوە کۆمەڵێکی لەسنوور دەرچوو بوون ﴿٥٣﴾ ﴿وَمَا مَنَعَهُمۡ﴾ وە هیچ شتێك بەرگری ئەوانەی نەکردووە ﴿أَن تُقۡبَلَ مِنۡهُمۡ﴾ کە گیرا بکرێت لێ یان ﴿نَفَقَٰتُهُمۡ﴾ ئەوەی کە بەخشییان ﴿إِلَّآ أَنَّهُمۡ كَفَرُواْ﴾ بێجگە لەوەی کە بێگومان ئەوانە بێ باوەڕبوون ﴿بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ﴾ بەخوا و پێغەمبەرەکەی ﴿وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نایەن بۆ نوێژکردن ﴿إِلَّا وَهُمۡ كُسَالَىٰ﴾ بەتەمەڵی نەبێت ﴿وَلَا يُنفِقُونَ﴾ وە(هیچێك) نابەخشن ﴿إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ﴾ ئیللا پێیان ناخۆشە و ناچارن ﴿٥٤﴾

﴿فَلَا تُعْجِبْكَ﴾ جا با سەرنجت ڕانەکێشێت (سەرسامت نەکات) ﴿أَمْوَالُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ﴾ (زۆری) ماڵ و
دارایی و منداڵیان ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ﴾ بێگومان خوا دەیەوێت ﴿لِيُعَذِّبَهُم﴾ سزایان بدات ﴿بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا﴾ بەهۆی ئەو (ماڵ و منداڵەوە) لەم ژیانی دونیایەدا ﴿وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ﴾ وە بەسەختی گیانیان
دەربچێت ﴿وَهُمْ كَٰفِرُونَ﴾ لەکاتێکدا کەئەوان بێ باوەڕن (٥٥) ﴿وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ﴾ وە سوێند دەخۆن
بەخوا ﴿إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ﴾ کەبەڕاستی ئەوان لەئێوەن (لە باوەڕدارانن) ﴿وَمَا هُم مِّنكُمْ﴾ کەچی لەئێوە نین
﴿وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ﴾ بەڵکو ئەوانە کۆمەڵێکن زۆر دەترسن (زراویان چووە) (٥٦) ﴿لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا﴾
ئەگەر پەنایەکیان دەست کەوێت ﴿أَوْ مَغَٰرَٰتٍ﴾ یان ئەشکەوتانێك ﴿أَوْ مُدَّخَلًا﴾ یان کون و قوشبن
و نەفەقێك ﴿لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ﴾ پەنای بۆ دەبەن و(ڕووی تێدەکەن) ﴿وَهُمْ يَجْمَحُونَ﴾ لەکاتێکدا زۆر بەپەلە
ڕادەکەن (یا هیچ شتێك جڵەویان ناگرێت) (٥٧) ﴿وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ﴾ وەهەندێ کەس لەوانە ڕەخنەو
توانجت لێ دەگرن ﴿فِى ٱلصَّدَقَٰتِ﴾ لەدابەش کردنی خێرەکاندا ﴿فَإِنْ أُعْطُوا۟ مِنْهَا﴾ خۆ ئەگەر لەو خێر
و سەدەقەیان پێ بدرێت ﴿رَضُوا۟﴾ ڕازی دەبن ﴿وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا۟ مِنْهَآ﴾ وە ئەگەر پێیان نەدرێ لێی ﴿إِذَا هُمْ
يَسْخَطُونَ﴾ ئەو کاتە ئەوان تووڕەو ناڕازی دەبن (٥٨) ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟﴾ وە بەڕاستی ئەگەر ئەوانە ڕازی
بوونایە ﴿مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ بەوەی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پێی دابوون ﴿وَقَالُوا۟﴾ وەبیان ووتایە
﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ﴾ خوامان بەسە ﴿سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ﴾ لەمەو پاش خوا پێمان دەبەخشێت ﴿مِن فَضْلِهِۦ﴾
لە فەزڵ ومیهرەبانی خۆی ﴿وَرَسُولُهُۥٓ﴾ هەروەها پێغەمبەرەکەشی (بەشمان دەدا) ﴿إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ
رَٰغِبُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە بەسۆزو پەرۆشین بۆ لای خوا (٥٩) ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ﴾ بەڕاستی (زەکات)
دان تەنها (بۆ ئەم کومەڵانەیە کە خوای گەورو باسی کردوون) ئەوانیش ﴿لِلْفُقَرَآءِ﴾ بۆ بێنەوایان
﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾ وە بۆ هەژاران ﴿وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا﴾ و وە بۆ کرێکارانێك کەبەسەریەوەن (کۆی دەکەنەوە)
﴿وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ﴾ وە ئەوانەی دڵیان دا ئەهێنرێت (بۆ خۆشویستنی ئیسلام) ﴿وَفِى ٱلرِّقَابِ﴾ وە بۆ
ئازاد کردنی بەندەو کۆیلەکان ﴿وَٱلْغَٰرِمِينَ﴾ وە بۆ قەرزاران ﴿وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وە بۆ جەنگاوەرانی ڕێی
خودا ﴿وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ و بۆ ڕێبوارانی پەککەوتە ﴿فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ئەمە پێویست کراوەوفەرزکراوە
لەلایەن خواوە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زانای کاردروستە (٦٠) ﴿وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ﴾ وە لەو ناپاکانەدا
کەسانێك هەیە ﴿يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ﴾ کە ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدەن ﴿وَيَقُولُونَ﴾ و دەڵێن ﴿هُوَ أُذُنٌ﴾
ئەو خۆش باوەڕو گوێ گرە بۆ هەموو شت ﴿قُلْ﴾ تۆش بڵێ ﴿أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ﴾ گوێ گری چاکەیە
(کە قازانجە) بۆتان ﴿يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ﴾ باوەڕی هەیە بەخوا ﴿وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ و باوەڕی بەئیمانداران
هەیە ﴿وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ﴾ و میهرەبانی یە بۆ ئەوانەی ﴿ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ﴾ بڕوایان هێناوە لە ئێوە
﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ وە ئەوانەی کە ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن ﴿لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾
سزایەکی ئازاردەریان بۆ هەیە (٦١)

﴿يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ﴾ (ناپاكان) بەخوا سویندتان بۆ دەخۆن ﴿لِيُرۡضُوكُمۡ﴾ بۆ ئەوەی لێیان ڕازی بن ﴿وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ﴾ وە خواو پێغەمبەرەکەی ﴿أَحَقُّ أَن يُرۡضُوهُ﴾ شایستە ترە بەوەی کەڕازی بکەن ﴿إِن كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئەوانە بڕوادارن ﴿٦٢﴾ ﴿أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ﴾ ئایا ئەوانە نازانن ﴿أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ بێگومان هەرکەس دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ﴿فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ﴾ ئەوە بێگومان (تۆڵەی) ئەو کەسە ئاگری دۆزەخە ﴿خَٰلِدٗا فِيهَاۚ﴾ بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێنێتەوە ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡخِزۡيُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ ئەوەیە ڕیسوایی و زەبوونی زۆر گەورە ﴿٦٣﴾ ﴿يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ﴾ دوو ڕووەکان مەترسی دەکەن ﴿أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ﴾ لەوەی کە سورەتێك دەربارەیان بنێرڕێتە خوارەوە ﴿تُنَبِّئُهُم﴾ کە هەواڵیان لەسەربدات ﴿بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ﴾ بەوەی کەلە دڵیان دایە ﴿قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: گاڵتە و لاقرتی بکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ﴾ بەڕاستی خوا دەرخەرو ئاشکراکاری ئەوەیە کەمەترسی لێ دەکەن ﴿٦٤﴾ ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ﴾ سوێندبێ ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت ﴿لَيَقُولُنَّ﴾ بەڕاستی دەڵێن ﴿إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ﴾ دڵنیابن ئێمە هەر دەمەتەقێ و گاڵتە دەکەین ﴿قُلۡ﴾ تۆش بڵێ: ﴿أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ﴾ ئایا بەخواو بەڵگەکانی ﴿وَرَسُولِهِۦ﴾ و پێغەمبەرەکەی ﴿كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ ئێوە گاڵتەو لاقرتیتان دەکەن؟ ﴿٦٥﴾ ﴿لَا تَعۡتَذِرُواْ﴾ بەهانە مەهێننەوە ﴿قَدۡ كَفَرۡتُم﴾ بەڕاستی ئێوە بێ بڕوا بوونەوە ﴿بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ﴾ پاش بڕوا هێنانتان ﴿إِن نَّعۡفُ﴾ ئەگەر ببورین و چاوپۆشی بکەین ﴿عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ﴾ لەکۆمەڵ و تاقمێکتان (بەهۆی گەڕانەوەتانەوە) ﴿نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ﴾ سزای کۆمەڵ و تاقمێکی تر دەدەین ﴿بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ﴾ لەبەرئەوەی بێگومان ئەوانە تاوانبار بوون ﴿٦٦﴾ ﴿ٱلۡمُنَٰفِقُونَ﴾ پیاوانی دووڕوو ﴿وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ﴾ و ئافرەتانی دوو ڕوو ﴿بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ﴾ هەندێکیان پشتیوانی هەندێکیانن ﴿يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ﴾ فەرمان دەکەن بە خراپە ﴿وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ و بەرگری دەکەن لە چاکە ﴿وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ﴾ و دەستیان دەقوچن (وخێر ناکەن) ﴿نَسُواْ ٱللَّهَ﴾ خوایان لەبیر چۆتەوە ﴿فَنَسِيَهُمۡۚ﴾ بۆیە خواش لەبیری کردوون و وازی لێ هێناون ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ﴾ بەڕاستی دووڕووەکان هەر ئەوانن ﴿ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ کەدەرچوون لەسنوور ﴿٦٧﴾ ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ﴾ خوا بەڵێنی داوە بە پیاوو ئافرەتە دووڕووەکان ﴿وَٱلۡكُفَّارَ﴾ و بەبێ باوەڕانیش ﴿نَارَ جَهَنَّمَ﴾ بە ئاگری دۆزەخ ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ دەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی ﴿هِيَ حَسۡبُهُمۡۚ﴾ ئاگری دۆزەخیان بەسە ﴿وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ﴾ و خوا نەفرینی لێ کردوون ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ﴾ و سزای هەمیشەییان بۆ هەیە ﴿٦٨﴾

﴿ كَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ ﴾ (ئێوه ئەی دووڕووەکان) وەك ئەوانەن لەپێش ئێوەدا بوون ﴿ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنكُمۡ قُوَّةٗ ﴾
ئەوانە زۆر بەهێز تر بوون لەئێوه ﴿ وَأَكۡثَرَ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا ﴾ و ماڵ و سامان و منداڵیشیان زۆرتر بوو (لەئێوه)
﴿ فَٱسۡتَمۡتَعُواْ بِخَلَٰقِهِمۡ ﴾ ئەمجا ئەوان شادمان بوون بەشی خۆیان ڕایان بوارد ﴿ فَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِخَلَٰقِكُمۡ ﴾
وەئێوەش ڕاتان بوارد و شادمان بوون بەبەشەکەی خۆتان ﴿ كَمَا ٱسۡتَمۡتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُم ﴾ هەرچۆنێك
ئەوانەی لەپێش ئێوه شادمان بوون ﴿ بِخَلَٰقِهِمۡ ﴾ بە بەشی خۆیان ﴿ وَخُضۡتُمۡ ﴾ وە ئێوه ڕۆچوون لەناهەق
و بەتاڵدا ﴿ كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْۚ ﴾ بەوێنەی ڕۆچوونی ئەوان ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ ﴾ ئەوانە کردەوەکانیان
پوچەڵ و بێسوود بوو ﴿ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ ﴾ لەدونیاو ڕۆژی دواییشدا ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾ وە
هەر ئەوانەن زەرەرمەندو ڕەنجەڕۆن ﴿٦٩﴾ ﴿ أَلَمۡ يَأۡتِهِمۡ ﴾ ئایا نەهاتووە بۆیان و پێ یان نەگەیشتووە
﴿ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾ هەواڵی ئەوانەی کەلەپێش ئەمانەوە بوون ﴿ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ ﴾ لەگەلی نووح
وعاد ﴿ وَثَمُودَ ﴾ و سەموود (هۆزی صالح) ﴿ وَقَوۡمِ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾ وە گەلی ئیبراهیم ﴿ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ ﴾
و خەڵکی مەدیەن ﴿ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِۚ ﴾ و شارەکانی ژێرو زەبەر کراو (هۆزی لووط) ﴿ أَتَتۡهُمۡ رُسُلُهُم ﴾
پێغەمبەرەکانیان هاتن بۆ ناویان ﴿ بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ ﴾ بەبەڵگە ڕوونەکانەوە ﴿ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ ﴾ جا خوا
ستەمی لێ نەکردن ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾ بەڵکو ئەوانە خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد
﴿٧٠﴾ ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ ﴾ پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار ﴿ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ ﴾ هەندێکیان پشتوان
و یارمەتی دەرو خۆشەویستی هەندێکی تریانن ﴿ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾ فەرمان دەدەن بەچاکە
﴿ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾ و بەرگری دەکەن لەخراپە ﴿ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ و بەرێك و پێکی نوێژ جێ بەجێ
دەکەن ﴿ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ و زەکات(ی سامانیان) دەدەن ﴿ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ ﴾ وە گوێڕایەڵی
خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ ﴾ ئەوانە لەداهاتوودا خوا ڕەحمیان پێدەکات
﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾ بەڕاستی خوا بەدەسەڵاتی کار دروستە ﴿٧١﴾ ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ﴾ خوا بەڵێنی داوە
﴿ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ﴾ بە پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار ﴿ جَنَّٰتٖ ﴾ بە بەهەشتانێك ﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا
ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾ کەڕووبارەکان دەڕۆن بەژێریاندا ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ تێیدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿ وَمَسَٰكِنَ
طَيِّبَةٗ ﴾ و (بەڵێنی پێ داوون) بەچەند کۆشکی چاك و ڕازاوە ﴿ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ﴾ لە بەهەشتانێکی
هەمیشەیی دا ﴿ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ ﴾ و ڕەزامەندیش لەلایەن خواوە کە گەورەترە (لە هەموو
شتێك) ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ هەر ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە ﴿٧٢﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ ﴿جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ﴾ جیهـاد بکـە دژی بـێ بـاوەڕان ﴿وَٱلْمُنَٰفِقِينَ﴾
ودووڕوەکان ﴿وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾ وە توندو تیژ بەلەدژیان ﴿وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ﴾ شـوێنی حەوانەوەی ئەوانە
دۆزەخـە ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ کـە دوارِۆژو چـارە نوسـێکی خراپـە ﴿٧٣﴾ ﴿يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ﴾ (دووڕووەکان)
سـوێند دەخـۆن بەخوا ﴿مَا قَالُواْ﴾ (ئـەو ووتانـەی دراوەتە پاڵیـان) نەیـان ووتووە ﴿وَلَقَدْ قَالُواْ كَلِمَةَ
ٱلْكُفْرِ﴾ سوێندبەخوابێگومان ووتەی بێ باوەڕیيان ووتووە ﴿وَكَفَرُواْ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ﴾ وەبێ بڕوابوونەتەوە
لەپاش موسـوڵمان بوونیان ﴿وَهَمُّواْ بِمَا لَمْ يَنَالُواْ﴾ و نیازی شـتێکیان بوو بەڵام بۆیان نەکرا (کوشـتنی
پێغەمبـەر ﷺ کاتـی گەڕانـەوەی لەتەبـووك) ﴿وَمَا نَقَمُوٓاْ﴾ وە هیـچ ڕەخنەو ڕقێکیـان نەبوو ﴿إِلَّآ أَنْ
أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ تەنها لەبەر ئەوە نەبێت کە خواو پێغەمبەرەکەی (وبڕوادارانیان) دەوڵەمەند کردوە
﴿مِن فَضْلِهِۦ﴾ لە فەزڵ و بەهرەی خۆی ﴿فَإِن يَتُوبُواْ﴾ ئەمجا ئەگەر ئەوان بگەڕێنەوە وپەشیمان ببنەوە
﴿يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ ئەوە چاکترە بۆیان ﴿وَإِن يَتَوَلَّوْاْ﴾ وە ئەگەر ڕوو وەر گێڕن و (نەگەڕێنەوە) ﴿يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ﴾
ئەوە خوا سزایان دەدات ﴿عَذَابًا أَلِيمًا﴾ بەسزایەکی سەخت ﴿فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ لەدونیاو پاشەڕۆژدا
﴿وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وە لەزەوی دا نی یە بۆ ئەوان ﴿مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ هیچ دۆست و یارمەتی دەرێك ﴿٧٤﴾
﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَٰهَدَ ٱللَّهَ﴾ وەلەناپاکان کەسانێك هەن کەپەیمانیان داوە بەخوا ﴿لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ﴾ سوێند
بەخوا ئەگەر خوا لە فەزڵ و بەهرەی خۆی پێمان ببەخشێت ﴿لَنَصَّدَّقَنَّ﴾ ئەوە بێگومان خێر وچاکە
دەکەین ﴿وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وە بێگومان لە چاکەکاران دەبین ﴿٧٥﴾ ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ﴾
کەچـی کاتێـك خوا لە فەزڵ و بەهرەی خۆی پێی بەخشـین ﴿بَخِلُواْ بِهِۦ﴾ ڕژدی و چروکیان تێداکرد
﴿وَتَوَلَّواْ﴾ و پشتیان هەڵکرد ﴿وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوانە ڕوو وەر گێڕن ﴿٧٦﴾ ﴿فَأَعْقَبَهُمْ﴾ ئەمجا
خـواش سـەرئەنجامی ئەوانی گێـڕا ﴿نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ﴾ بەدوو ڕوویـی لەدڵیاندا ﴿إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ﴾ هەتا
ئـەو ڕۆژەی بەدیداری (خوا) دەگەن ﴿بِمَآ أَخْلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ﴾ بەهۆی نەبرد نەسـەری ئەو بەڵێنەی
کەدابوویـان بەخـوا ﴿وَبِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ﴾ و بەهـۆی ئـەوە شـەوە درۆیان دەکـرد ﴿٧٧﴾ ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ﴾
ئایـا نەیـان زانیـوە ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ﴾ کەبێگومـان خـوا ئاگـادارە ﴿سِرَّهُمْ﴾ بەنهێنـی ﴿وَنَجْوَىٰهُمْ﴾
و چپەیان ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾ بەڕاستی خوا ئەوپەڕی ڕادە ئاگاو زانایە بەشاراوەو پەنهانەکان ﴿٧٨﴾
﴿ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ﴾ ئەو کەسـانەی کەتانەو تەشەر دەدەن ﴿ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ﴾ لەو
باوەڕدارانەی جگەلە زەکات ماڵ و سامانیان دەبەخشن ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ﴾ وە(تانە وتەشەر
دەدەن) لەوانـەی کەتەنهـا کەمێکیان هەیـە بەزەحمەت پەیدایان کردووە ﴿فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ﴾ ئەوسـا
هەر گاڵتەشـیان پێ دەکەن ﴿سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ﴾ خوا گاڵتە بـەوان دەکات ( لەبەرامبەر گاڵتەی ئەواندا)
﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ و سزای سەخت بۆ ئەوانە ﴿٧٩﴾

﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) داوای لێبوردونیـان بـۆ بکەیت ﴿أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾ یـان داوای
لێبوردونیان بۆ نەکەیت (یەکسانە) ﴿إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾ ئەگەر داوای لێبوردونیان بۆ بکەیت ﴿سَبۡعِينَ مَرَّةٗ﴾
حەفتا جـار ﴿فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ﴾ ئەوە خوا هەرگیز لێیـان نابورێت ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەش ﴿بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ﴾
بەهـۆی ئەوەیە بێگومان ئەوانـە بێ باوەڕ بوون ﴿بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ﴾ بەخواو پێغەمبەرەکەی ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي
ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ وە خـوا ڕێنموونیـی خەڵکانی دەرچوو لەئایین نـاکات ﴿٨٠﴾ ﴿فَرِحَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ﴾ (ئەو دوو
ڕووانـەی) دواکەوتن لە جیهاد کردن و (لەمەدینـەدا مابوونەوە) دڵ خۆش بوون ﴿بِمَقۡعَدِهِمۡ خِلَٰفَ رَسُولِ
ٱللَّهِ﴾ بەدانیشتن و بەجێمانیان لە پێغەمبەری خوا (لەجەنگی تەبوك دا) ﴿وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ﴾ وە پێیان
ناخـۆش بوو کەجیهاد بکەن و تێبکۆشـن ﴿بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ﴾ بەمـاڵ و گیانیان ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەڕێی
خـوادا ﴿وَقَالُواْ﴾ (بەئیماندارانیـان) دەووت ﴿لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلۡحَرِّۗ﴾ لەم (وەرزە) گەرمایـەدا دەرمەچن بۆ
جیهـاد ﴿قُلۡ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ: ﴿نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّٗاۚ﴾ ئاگـری دۆزەخ زۆر گەرم تـرە (لەم
گەرمایـە) ﴿لَّوۡ كَانُواْ يَفۡقَهُونَ﴾ ئەگـەر ئەوانـە تـێ بگـەن و بزانـن ﴿٨١﴾ ﴿فَلۡيَضۡحَكُواْ قَلِيلٗا﴾ دەی با کـەم پێ
بکەنن ﴿وَلۡيَبۡكُواْ كَثِيرٗا﴾ و زۆر بگرین ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ (ئەو سـزایە) تۆڵەو پاداشـتی ئەو
کردەوانەیـە کەدەیان کرد ﴿٨٢﴾ ﴿فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ﴾ ئەوسـا ئەگەر خوا تۆی گەڕانـدەوە (ئەی موحەممەد
ﷺ لەتەبوك) ﴿إِلَىٰ طَآئِفَةٖ مِّنۡهُمۡ﴾ بۆلای کۆمەڵێك لەو بەجێ ماوانە ﴿فَٱسۡتَـٔۡذَنُوكَ لِلۡخُرُوجِ﴾ و داوایان
لـێ کردیت بـۆ دەرچوون (بـۆ غەزایەکی تر) ﴿فَقُل﴾ تـۆش بڵـێ: ﴿لَّن تَخۡرُجُواْ مَعِيَ أَبَدٗا﴾ هەرگیز ئێوە
لەگەڵ مندا دەرناچن بۆ جیهاد ﴿وَلَن تُقَٰتِلُواْ مَعِيَ عَدُوًّاۖ﴾ و هەرگیز ئێوە لەگەڵ مندا جەنگ ناکەن لەگەڵ
هیـچ دوژمنێکـدا ﴿إِنَّكُمۡ رَضِيتُم﴾ چونکـە بێگومان ئێـوە ڕازی بوون ﴿بِٱلۡقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾ بەدانیشـتن
لەیەکـەم جـاردا ﴿فَٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡخَٰلِفِينَ﴾ کەواتـە هـەر دانیشـن لەگـەڵ بەجـێ ماوانـدا ﴿٨٣﴾ ﴿وَلَا تُصَلِّ﴾
وە (ئـەی موحەممـەد ﷺ) تۆ نوێژ مەکە ﴿عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ﴾ لەسـەر هیچ کەس لەوانە کەمرد ﴿أَبَدٗا﴾
هەتا هەتایە ﴿وَلَا تَقُمۡ عَلَىٰ قَبۡرِهِۦٓۖ﴾ وە ڕامەوەستە لەسەر گۆڕەکەی ﴿إِنَّهُمۡ كَفَرُواْ﴾ بێگومان ئەوانە بێ باوەڕ
بـوون ﴿بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ بەخـوا و پێغەمبەرەکـەی ﴿وَمَاتُواْ﴾ و مـردن ﴿وَهُمۡ فَٰسِقُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوانە
بـەردەوام سنوورشـکێن بـوون ﴿٨٤﴾ ﴿وَلَا تُعۡجِبۡكَ﴾ وە(ئـەی موحەممەد ﷺ) باسـەرت سـوڕنەهێنێت
﴿أَمۡوَٰلُهُمۡ وَأَوۡلَٰدُهُمۡۚ﴾ مـاڵ و منداڵـی زۆریـان ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ﴾ بەڕاسـتی خـوا دەیەوێت ﴿أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا﴾
بەوە(مـاڵ و منـداڵ) سـزایان بـدات ﴿فِي ٱلدُّنۡيَا﴾ لەدونیادا ﴿وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ﴾ وە گیانیـان دەربچێت
﴿وَهُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوانە بێ باوەڕن ﴿٨٥﴾ ﴿وَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ﴾ و هەر کاتێك سورەتێك بنێردرێتە
خـوارەوە ﴿أَنۡ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ﴾ بەمەی کەباوەڕ بەخوا بێنن ﴿وَجَٰهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ﴾ و جیهاد و تێکۆشـان بکەن
لەگـەڵ پێغەمبەرەکەیدا ﴿ٱسۡتَـٔۡذَنَكَ﴾ مۆڵەتت لێ وەردەگرن ﴿أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ مِنۡهُمۡ﴾ ئەوانەیان کەخاوەن
دەسـەڵات و سـامانن ﴿وَقَالُواْ ذَرۡنَا﴾ و دەڵێـن لێمان گـەڕێ و وازمان لـێ بێنە ﴿نَكُن مَّعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ﴾
با لەگەڵ دانیشتووەکاندا بین (وەك ئافرەت و منداڵ وپەککەوتە) ﴿٨٦﴾

﴿رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ﴾ ڕازی بوون بەوەی کەلەگەڵ بەجێ هێڵراوان دا بن ( وەك ئافرەت و منداڵ و پەککەوتەکانان) ﴿وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ وە مۆر نراوە بەسەر دڵیاندا ﴿فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾ بۆیە ئەوان هیچ تێناگەن و نازانن ﴿٨٧﴾ ﴿لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ﴾ بەڵام پێغەمبەر ﷺ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾ و ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە لەگەڵیدا ﴿جَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ تێکۆشان بەماڵ و گیانیان ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ﴾ هەموو خێر و خۆشی هەر بۆ ئەوانە ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ وە هەر ئەوانە سەرفرازن ﴿٨٨﴾ ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ﴾ خوا بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ کەڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ بەهەمیشەیی تیا دەمێننەوە ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە ﴿٨٩﴾ ﴿وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ﴾ بیانوگران لەعەرەبە دەشتەکییەکان هاتن (بۆ لای پێغەمبەر ﷺ) ﴿لِيُؤْذَنَ لَهُمْ﴾ بۆ ئەوەی ڕێگەیان پێ بدرێت (نەڕۆن بۆ جیهاد) ﴿وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ﴾ وە دانیشتن ئەوانەی ﴿كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ کەدرۆیان کرد لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەی ﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ﴾ بێگومان ئەوانەیان کە بێ بڕوا بوون لە داهاتودا دوو چاریان دەبێت ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ سزایەکی سەختی ئازاردەر ﴿٩٠﴾ ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ﴾ (گوناهێك) لەسەر بێ هێز و پەککەوتە ونەخۆشەکان نی یە ﴿وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ﴾ ئەوانەش کەهیچیان نی یە خەرجی بکەن (بۆ پێویستی جیهاد) هیچ گوناهێکیان لەسەر نی یە (کەنەڕۆشتوون بۆ جیهاد) ﴿إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ کاتێك کە دڵسۆز و ڕاست بن بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی ﴿مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ﴾ هیچ ڕێگەیەك نی یە بۆ (تاوانبار کردنی) ئەو چاکەکارانە ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وە خوا لێخۆش بووی میهرەبانە ﴿٩١﴾ ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ﴾ وە تاوان لەسەر ئەو کەسانەش نی یە ﴿إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ﴾ کەهاتنە لات (ئەی موحەممەد ﷺ) بۆ ئەوەی (وڵاخیان بۆ دابین کەیت و) سواریان کەیت ﴿قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ﴾ ووتت وڵاخم دەست ناکەوێت سوارتان بکەم (بۆ جیهاد کردن) ﴿تَوَلَّواْ﴾ ئەوانیش گەڕانەوە ﴿وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ﴾ لەکاتێکدا چاویان فرمێسکی دەڕشت ﴿حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ﴾ لەداخ و خەفەتدا کەهیچیان نەبوو خەرجی بکەن (بۆ پێداویستی جیهاد) ﴿٩٢﴾ ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ﴾ تەنها ڕێگە (بۆ تاوانبارکردن) ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ﴾ لەسەر ئەوانەیە ﴿يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ﴾ داوای مۆڵەت لێ دەکەن لەکاتێکدا دەوڵەمەندیشن (و توانای ڕۆیشتن بۆ جیهادیان هەیە) ﴿رَضُواْ﴾ ڕازی بوون ﴿بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ﴾ بەوەی کە لەگەڵ بەجێ ماوەکاندا بن (لە جیهاد وەك ئافرەت و منداڵ و نەخۆش) ﴿وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ وە خوا مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا ﴿فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەهۆیەوە هیچ نازانن ﴿٩٣﴾

﴿يَعۡتَذِرُونَ إِلَيۡكُمۡ﴾ عـوزر و بەهانەتـان بـۆ دەهێننـەوە ﴿إِذَا رَجَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡۚ﴾ کاتێـك (لەجیهـاد
وغـەزا) گەڕانـەوە بۆلایـان ﴿قُل لَّا تَعۡتَذِرُواْ﴾ بڵـێ بەهانـە و عـوزر مەهێننـەوە ﴿لَن نُّؤۡمِنَ لَكُمۡ﴾
ئێمـە هەرگیـز باوەڕتـان پـێ ناکەیـن ﴿قَدۡ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنۡ أَخۡبَارِكُمۡۚ﴾ چونکـە بەڕاسـتی خـوا ئاگاداری
کردوویـن لـە هەواڵەکانتـان (کـە ئێـوە ناپـاك و دووڕوون) ﴿وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ﴾ وە لـە
داهاتـوودا خـوا و پێغەمبەرەکـەی کردەوەکانتـان دەبینـن ﴿ثُمَّ تُرَدُّونَ﴾ پاشـان (لـەڕۆژی دوایـی دا)
دەگەڕێنرێنـەوە ﴿إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ بـۆ لای زانـای هەمـوو نهێنـی و ئاشـکراکان (کـە خـوای
گەورەیـە) ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ ئەمجـا هەواڵتـان پـێ دەدا بەوەی لـە دونیـادا دەتان کرد
﴿٩٤﴾ ﴿سَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ﴾ بەزوویـی سـوێندتان بۆدەخـۆن بەخـوا ﴿إِذَا ٱنقَلَبۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ﴾ کاتێـك
گەڕانـەوە بۆلایـان ﴿لِتُعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ﴾ بـۆ ئـەوەی چاوپۆشـیان لـێ بکـەن و سەرزەنشـتیان نەکـەن
﴿فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ﴾ ئێـوەش ڕوویـان لـێ وەرگێـڕن ﴿إِنَّهُمۡ رِجۡسٞۖ﴾ بەڕاسـتی ئـەو (دووڕوو) انە پیس
(ونەگریسـن) ﴿وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ﴾ وە جێگایـان دۆزەخـە (لـە ڕۆژی دوایـی دا) ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ
يَكۡسِبُونَ﴾ تۆڵەیـان لـێ دەسـەنرێت بەهـۆی ئـەو تـاوان وخراپـەی لەدونیـادا دەیـان کـرد ﴿٩٥﴾
﴿يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ﴾ (بـە درۆ) سـوێندتان بۆ دەخۆن ﴿لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ﴾ بۆ ئـەوەی لێیان ڕازی بن ﴿فَإِن
تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ﴾ جا ئەگەر ئێوەش لێیان ڕازی بن ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ﴾ ئەوە بێگومان خوا ڕازی نابێت
﴿عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ لەکەسـانی دەرچوو لەسـنوور (تاوانبار) ﴿٩٦﴾ ﴿ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا﴾ عەرەبە
دەشـتەکییەکان بـێ بڕوایـی و دوو ڕوویی یـان بەهێز ترە ﴿وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ﴾ و شایسـتەترن کە نەزانن
﴿حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ئەو سـنوورانەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە ﴿عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ﴾ بۆ سەر پێغەمبەرەکەی
ﷺ ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ وە خـوا زانـای کاردروسـتە ﴿٩٧﴾ ﴿وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن﴾ وە لـەو عەرەبـە
دەشـتەکییانەدا هەندێـك هەیە ﴿يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغۡرَمٗا﴾ ئـەوەی لێ ی وەردەگیرێت و دەی بەخشـێت
بەبـاج و سـەرانەی دادەنێـت ﴿وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَۚ﴾ وە چاوەڕوانـی دەکەن بەسـەر هاتـی خراپتان
بەسەردا بێت ﴿عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۗ﴾ بەڵاو بەسەر هاتی خراپ بە سەر خۆیاندا بێت ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾
خـواش بیسـەری زانایـە ﴿٩٨﴾ ﴿وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن﴾ وە هەندێکـی تـر لـەو عەرەبـە دەشـتەکییانە هەیـە
﴿يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ کـە باوەڕیان بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە ﴿وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ﴾ وە وای
دادەنێت ئەوەی دەی بەخشێت هۆی نزیك بوونەوەیە ﴿عِندَ ٱللَّهِ﴾ لەخوا ﴿وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِۚ﴾ وە دوعا
کردنـی پێغەمبەر ﷺ ﴿أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ﴾ بێداربن بێگومان ئەوە هـۆی نزیك بوونەوەیانە لەخوداوە
﴿سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ﴾ لە ئاینـدەدا خوا دەیانخاتە ناو میهرەبانـی و ڕەحمەتی خۆیەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ
غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە ﴿٩٩﴾

﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ﴾ وە پێشکەوتووە یەکەمەکان ( ئەوانەی لەسەرەتاوە باوەڕیان هێنا)﴿مِنَ
الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ﴾ لەکۆچەران و یاریدەدەران ﴿وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ﴾ ئەوانەش زۆر بە
چاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون ﴿رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ﴾ خوا لێیان ڕازییە
﴿وَرَضُوا عَنْهُ﴾ ئەوانیش لەخوا ڕازین ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ﴾ وە (خوا) بەهەشتانێکی بۆ ئامادە
کردوون ﴿تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ﴾ کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾
تێیدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی و بێ بڕانەوە ﴿ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی
گەورە ﴿١٠٠﴾ ﴿وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الْأَعْرَابِ﴾ و لەو عەرەبە دەشتەکییانەی کە لە دەورو بەرتان
دان ﴿مُنَافِقُونَ﴾ ناپاکانێك هەن ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ﴾ هەندێك لەخەڵکی مەدینەش ﴿مَرَدُوا عَلَى
النِّفَاقِ﴾ لەسەر ناپاکی ڕاهاتوون و خۆیان بۆ تەرخان کردووە ﴿لَا تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ﴾ تۆ (ئەی
موحەممەد ﷺ) نایانناسیت ئێمە چاك دەیا نناسین ﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ﴾ لە ئایندەدا دووجار سزایان
دەدەین ﴿ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ دواتریش دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سزایەکی گەورە (دۆزەخ)
﴿١٠١﴾ ﴿وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ﴾ وە کەسانێکی تر هەن دانیان ناوە بەگوناهەکانیاندا﴿خَلَطُوا عَمَلًا
صَالِحًا﴾ کردەوەی چاکیان تێکەڵ کردووە ﴿وَآخَرَ سَيِّئًا﴾ لەگەڵ کردەوەی تری خراپدا
﴿عَسَى اللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ ئومێد وایە خوا تۆبەیان لێ وەرگرێت ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا لێ
بووردەی میهرەبانە ﴿١٠٢﴾ ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ﴾ وەربگرە لەماڵ و داراییان ( زەکات و سەدەقە)
تا بەهۆیەوە پاکیان بکەیتەوە (لە گوناە و تاوان) ﴿وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ و (دڵیان) پوخت و خاوێن دەکەیت
بەو ماڵ بەخشینە ﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْ﴾ و دوعا و نزای خێریان بۆبکە ﴿إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ﴾ بەڕاستی دوعای
تۆ ئارامی و دڵ خۆشی یە بۆ ئەوان ﴿وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ وەخوا بیسەری زانایە ﴿١٠٣﴾ ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوا﴾
ئایا نەیان زانیوە ﴿أَنَّ اللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ﴾ کە بێگومان هەر خوا تەوبە و پەشیمانی لە
بەندەکانی وەردەگرێت ﴿وَيَأْخُذُ الصَّدَقَاتِ﴾ وە هەر ئەو خێر وبەخشینەکان وەردەگرێت﴿وَأَنَّ
اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ وە بەڕاستی هەر خوایە وەرگری تەوبە یە و میهرەبانە ( لەگەڵ بەندەکانیدا)
﴿١٠٤﴾ ﴿وَقُلِ اعْمَلُوا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ بەوانە) بڵێ :کارو کردەوە بکەن ﴿فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ
وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ جا بێگومان خوا و پێغەمبەرەکەی و بڕواداران کردەوەکانتان دەبینن ﴿وَسَتُرَدُّونَ﴾
لەپاشان دەگەڕێنرێنەوە ﴿إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ بۆلای (خوای) زانا بە هەموو نهێنی و ئاشکراکان
﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەمجا هەواڵتان دەداتێ بەهەرچی کە ئێوە لە دونیادا دەتان کرد ﴿١٠٥﴾
﴿وَآخَرُونَ مُرْجَوْنَ﴾ (لە بەجێ ماوەکان دا) کەسانێکی تر هەبوون کە دواخران ﴿لِأَمْرِ اللَّهِ﴾ بۆ فەرمان
و بڕیاری خوا ﴿إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ﴾ یان سزایان دەدات ﴿وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ﴾ یان پەشیمانیان لێ وەردەگرێت
﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زانای کار دروستە ﴿١٠٦﴾

﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا﴾ وە(لەناپاکان) ئەوانەی مزگەوتێکیان دروست کرد ﴿ضِرَارٗا﴾ بۆ زیان
گەیاندن(بە موسڵمانان) ﴿وَكُفۡرٗا﴾ و خوانەناسی ﴿وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ و جیاوازی خستنە
نێوان ئیمانداران ﴿وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ﴾ و بۆ چاوەڕوانی کردنی کەسانێ ﴿حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ کە
دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەیان کردوە ﴿مِن قَبۡلُۚ﴾ لەوەو پێش ﴿وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ﴾
بێگومان (ئەو دوو ڕووانە) سوێند دەخۆن (دەڵێن) تەنها چاکەمان ویستووە ﴿وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ﴾ بەڵام
خوا شایەتی دەدات ﴿إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ کە بەڕاستی ئەوانە درۆزنن (١٠٧) ﴿لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ﴾ هەرگیز
نوێژی تێدانەکەی (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ﴾ بێگومان مزگەوتێك کە لەسەر
بناغەی تەقوا و لە خوا ترسان دامەزرا بێت ﴿مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ﴾ لە یەکەم ڕۆژەوە (یەکەم ڕۆژ هاتنت
بۆ شاری مەدینە) ﴿أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ﴾ شایستەترە کە نوێژی تێدا بکەیت ﴿فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ﴾
پیاوانێکی تێدایە پێیان خۆشە ﴿أَن يَتَطَهَّرُواْۚ﴾ کە خۆیان خاوێن و پاك بکەنەوە (لەژەنگ وژاری
سەردەمی نەفامی) ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ﴾ خوایش ئەوانەی خۆش دەوێت کە دەیانەوێت خۆیان
پاك بکەنەوە (١٠٨) ﴿أَفَمَنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ﴾ جا ئایا کەسێك بناغەی مزگەوتەکەی دامەزراند بێت
﴿عَلَىٰ تَقۡوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٍ خَيۡرٌ﴾ لەسەر خواناسی و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا چاکترە
﴿أَم مَّنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ﴾ یان کەسێك بناغەی مزگەوتەکەی دامەزراند بێت ﴿عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٖ﴾
لەسەر لێواری کەندەڵانێکی فشەڵ و ڕووخەك ﴿فَٱنۡهَارَ بِهِۦ فِي نَارِ جَهَنَّمَۗ﴾ جا بەخۆیەوە بڕوخێتە ناو
ئاگری دۆزەخەوە ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە خوا ڕێنموونیی کەسانی ستەمکار ناکات (١٠٩)
﴿لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي﴾ بەردەوام ئەو دروست کراوەیان ﴿بَنَوۡاْ﴾ کە دروستیان کرد ﴿رِيبَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡ﴾
هۆی بێ ئارامی و گومانە لە دڵیاندا (واتە هەرگیز لە دڵیان دەرناچێت) ﴿إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ﴾
مەگەر دڵیان پارچە پارچە بکرێت (و بمرن) ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زانای کار دروستە (١١٠)
﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ﴾ بەڕاستی خوا کڕیویەتی ﴿مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ لە باوەڕداران ﴿أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم﴾ گیان
وماڵیان ﴿بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ﴾ بەوەی کە بەهەشتیان دەداتێ لە بریتیدا ﴿يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ (ئەو
بڕوادارانە) دەجەنگن لە ڕێی خوادا ﴿فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ﴾ ئەمجا (بێ باوەڕان) دەکوژن و (خۆشیان)
دەکوژرێن (شەهید دەبن) ﴿وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا﴾ ئەمە بەڵێنێکی ڕاستە (و خوا بڕیاری داوە) لەسەرخۆی
﴿فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ﴾ لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا ﴿وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ﴾ جا کێ بە
بەڵێن و پەیمانی خۆی وەفادارترە ﴿مِنَ ٱللَّهِۚ﴾ وەك خوای گەورە؟ ﴿فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي﴾ کەواتە
مژدە بەخشن و شادمان بن بەو فرۆشتنەتان ﴿بَايَعۡتُم بِهِۦۚ﴾ کە مامەڵەتان پێوە کرد ﴿وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ
ٱلۡعَظِيمُ﴾ (بە ڕاستی) هەر ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی زۆر گەورە (١١١)

﴿ٱلتَّـٰٓئِبُونَ﴾ (موجاهیدانی ڕێگای خوا، ئەمانە سیفەتیانە) تۆبەکارن ﴿ٱلۡعَـٰبِدُونَ﴾ خواپەرستن
﴿ٱلۡحَـٰمِدُونَ ٱلسَّـٰٓئِحُونَ﴾ سوپاسگوزار وگەشتیارن (کۆچەرن لەپێناو خوادا) ﴿ٱلرَّٰكِعُونَ
ٱلسَّـٰجِدُونَ﴾ کـڕنوش و سـوژدە بەرن (نوێژ خوێنن) ﴿ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ فەرمـان دەرن بەچاکە
و ﴿وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ بەرگـری کەرن لـە خراپە ﴿وَٱلۡحَـٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ﴾ پـاریـزەران بۆ
سنوورەکانی خودا ﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ جا (ئەی موحەممەد ﷺ) موژدە بدە بەو باوەڕدارانەی (ئەو
سیفاتانەیان تێدایە) ﴿١١٢﴾ ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ڕەوا وشایستە نی یە بۆ پێغەمبەر وباوەڕداران
﴿أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ﴾ کە داوای لێبووردن بکەن بۆ هاوبەش دانەران ﴿وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي
قُرۡبَىٰ﴾ با خزمی نزیکیشیان بن ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ﴾ لە پاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەوتووە
﴿أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾ کە بێگومان ئەو (هاوبەش دانەرانە) هاوەڵ وپێڕی دۆزەخن ﴿١١٣﴾ ﴿وَمَا
كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ﴾ وە داوای لێ خۆش بوونی ئیبراهیم بۆ باوکی ﴿إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ﴾ تەنها
لەبەرواده و بەڵێنێك بوو ﴿وَعَدَهَآ إِيَّاهُ﴾ کە بە باوکی دابوو (کە داوای لێ بوردنی بۆ بکات) ﴿فَلَمَّا
تَبَيَّنَ لَهُۥٓ﴾ جا کاتێك بۆی ڕوون بوویەوە ﴿أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ﴾ کە بێگومان باوکی دوژمنی خوایە ﴿تَبَرَّأَ
مِنۡهُۚ﴾ خۆی لێ بەری کرد ﴿إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ﴾ بەڕاستی ئیبراهیم زۆر لە خوا ترس و لەسەر
خۆ بوو ﴿١١٤﴾ ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا﴾ وە خودا هیچ گەل وهۆزێك گومڕا ناکات ﴿بَعۡدَ إِذۡ
هَدَىٰهُمۡ﴾ دوای ئەوەی ڕێنموونیی کردوون ﴿حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَۚ﴾ هەتا بۆیان ڕوون نەکاتەوە
ئەوەی پێویستە خۆیانی لێ بپارێزن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خوا زانا و ئاگادارە بەهەموو
شتێك ﴿١١٥﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ بێگومان هەر بۆ خوایە پادشایەتی ومولکی هەموو
ئاسمانەکان و زەوی ﴿يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۚ﴾ (خوا) دەژێنێت و دەشمرێنێت ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾
وە بێجگە لەخوا بۆ ئێوە نیە ﴿مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴾ هیچ دۆست و فریادڕەس و یارمەتی دەرێك ﴿١١٦﴾
﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ﴾ بێگومان خوا تەوبەی وەرگرت لە پێغەمبەر ﷺ ﴿وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ
ٱلَّذِينَ﴾ و لەو کۆچەر و یاری دەدەرانەی ﴿ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ﴾ کە شوێنی (پێغەمبەر ﷺ) کەوتن
لە کاتی سەختی و ناڕەحەتیدا (مەبەست پێی جەنگی تەبوکە) ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ﴾
پاش ئەوەی نزیك بوو دڵی کۆمەڵێکیان لە هەق لابدات ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ پاشان خوا تەوبەی لێ
وەرگرتن ﴿إِنَّهُۥ بِهِمۡ﴾ بە ڕاستی خوا لەگەڵیان ﴿رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ دڵسۆز و میهرەبانە ﴿١١٧﴾

﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ﴾ هەروەها (خوا تەوبەی وەرگرت) لەو سێ کەسەش کە دواخران (خوا
دەربارەیان بڕیاری نەدابوو) ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ﴾ هەتا ئەو کاتەی لێیان تەسك بوویەوە ﴿ٱلۡأَرۡضُ
بِمَا رَحُبَتۡ﴾ زەوی بەو فراوانیەی کەهەیەتی ﴿وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ﴾ و بێزاربوون لەگیانی خۆشیان
﴿وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ﴾ و زانیان هیچ پەناگەیەك نی یە ﴿مِنَ ٱللَّهِ﴾ لە (سزای) خوا ﴿إِلَّآ إِلَيۡهِ﴾ مەگەر
پەنایی خۆی نەبێت ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ﴾ پاشان پەشیمانی لێ وەرگرتن (بە دابەزاندنی چەند ئایەتێك)
﴿لِيَتُوبُوٓاْ﴾ بۆ ئەوەی تۆبە بکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە تۆبە وەرگری میهرەبانە
١١٨ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن لە(تۆڵەی) خوا
﴿وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ وەلەگەڵ ڕاست گۆیاندابن ولەڕیزی ئەواندابن ١١٩ ﴿مَا كَانَ لِأَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ﴾
نەدەبوو خەڵکی مەدینە ﴿وَمَنۡ حَوۡلَهُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ﴾ و ئەو عەرەبە دەشتەکیانەی بەدەوور و بەریاندان
﴿أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ﴾ لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ بمێنن و دوابکەون ( لەجیهادکردن) ﴿وَلَا
يَرۡغَبُواْ بِأَنفُسِهِمۡ عَن نَّفۡسِهِۦۚ﴾ و گیانی خۆیان لە گیانی پێغەمبەر ﷺ خۆشتربوێت ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ﴾ ئەوە
لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوان ﴿لَا يُصِيبُهُمۡ﴾ دووچاریان نابێت ﴿ظَمَأٞ وَلَا نَصَبٞ﴾ هیچ تینوویەتی
و ماندوو بوون ﴿وَلَا مَخۡمَصَةٞ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ و برسێتی یەك لەڕێی خوادا ﴿وَلَا يَطَـُٔونَ مَوۡطِئٗا﴾ هەروەها
پێ ناخەنە هیچ شوێنێك (لەخاکی کافران) ﴿يَغِيظُ ٱلۡكُفَّارَ﴾ کە ڕقی کافرانی پێ هەڵسێ و تووڕەیان
کات ﴿وَلَا يَنَالُونَ مِنۡ عَدُوّٖ نَّيۡلًا﴾ وە هیچ زیانێك لە دوژمن نادەن (دیل کردن و کوشتنیان یا گرتنی
ماڵ و سامانیان) ﴿إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ﴾ ئیلا بەم کردەوانە بۆیان دەنوسرێت ﴿عَمَلٞ صَٰلِحٌۚ﴾ کردەوەیەکی
چاك ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بێگومان خوای گەورە ﴿لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ پاداشتی چاکە کاران وون ناکات
١٢٠ ﴿وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةٗ﴾ وە هیچ شتێك (لەڕێگەی خودا) نابەخشن ﴿صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةٗ﴾ بچووك
بێت یان گەورە (کەم بێت یان زۆر) ﴿وَلَا يَقۡطَعُونَ وَادِيًا﴾ و هیچ دۆڵ وشیوێك نابڕن ﴿إِلَّا كُتِبَ لَهُمۡ﴾
ئیلا بۆیان دەنووسرێت ﴿لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ﴾ بۆ ئەوەی خوا پاداشتیان بداتەوە ﴿أَحۡسَنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾
بەچاکترین پاداشتی ئەوەی کە دەیانکرد ١٢١ ﴿وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ وە نەدەبوو باوەڕداران
﴿لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗۚ﴾ تێکڕا هەموو دەرچن و بڕۆن (بۆجیهاد) ﴿فَلَوۡلَا نَفَرَ﴾ ئەگەر دەربچوونایە
﴿مِن كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٞ﴾ لە هەموو کۆمەڵێکیان چەند کەسێك ﴿لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ﴾ بۆ ئەوەی
لە ئاینەکەیان تێبگەن و شارەزابن ﴿وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ﴾ بۆ ئەوەی گەل و هۆزەکەیان (شارەزا بکەن
لەوەی کە فێری بوون) بیشیان ترسێنن ( لەئاگری دۆزەخ) ﴿إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ﴾ کاتێك گەڕانەوە
(لەجیهاد کردن) بۆلایان ﴿لَعَلَّهُمۡ يَحۡذَرُونَ﴾ بۆ ئەوەی ئەوانیش (شارەزابن ) وبێدار ببنەوە
( لەنەزانی ) ١٢٢

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئـەی ئەوانـەی كـە ئیمانتـان هێنـاوە ﴿قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ﴾ بجەنگن لـەدژی ئەوانەی
﴿يَلُونَكُم﴾ كە نزیكن لێتانەوە ﴿مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ﴾ لە بێ بڕوایان ﴿وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗ﴾ وە با بێ باوەڕان
لە ئێوەدا توند و تیژی ببینن ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ وبزانن ﴿أَنَّ ٱللَّهَ﴾ بێگومان خودا ﴿مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ لەگەڵ پارێزكاران
و لەخـوا ترسـاندایە ﴿١٢٣﴾ ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ﴾ وە كاتێك سـورەتێك (لەقورئـان) بنێردرێتە خوارەوە
﴿فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ﴾ (دوو ڕووەكان) هـی وایـان هەیـە دەڵێـت ﴿أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ﴾ كام لە ئێوە
بـاوەڕی بەم (سـورەتە) زیادی كـرد ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ جا ئەوانەی كـە باوەڕیان هێناوە ﴿فَزَادَتۡهُمۡ
إِيمَٰنٗا﴾ ئەمـە ئیمانیان زیـاد دەكات (و بەهێزتر دەبێت) ﴿وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾ وە ئەوان مژدە بەخشـن
و خۆش حاڵن ﴿١٢٤﴾ ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ﴾ بەڵام ئەوانەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ﴾ لەنێو دڵیاندانەخۆشی (و ناپاكی) هەیە
(وەك دوو ڕووەكان) ﴿فَزَادَتۡهُمۡ﴾ ئەوە سورەتە كە بۆیان زیاد دەكات ﴿رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ﴾ سەرەڕای پیسی
و ناپاكی خۆیان پیسی و ناپاكی تر ﴿وَمَاتُواْ﴾ ئەو(ناپاكانە) دەمرن ﴿وَهُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ لە كاتێكدا كە
بێ بڕوان ﴿١٢٥﴾ ﴿أَوَلَا يَرَوۡنَ﴾ ئایا ئەوانە نازانن و نابینن ﴿أَنَّهُمۡ يُفۡتَنُونَ﴾ بێگومان ئەوان تاقی دەكرێنەوە
﴿فِي كُلِّ عَامٖ﴾ لەهەموو ساڵێكدا ﴿مَّرَّةً أَوۡ مَرَّتَيۡنِ﴾ جارێك یان دووجار ﴿ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ﴾ پاشان
ئـەوان ناگەڕێنەوە و تۆبەناكـەن ﴿وَلَا هُمۡ يَذَّكَّرُونَ﴾ و پەند وەرناگرن ﴿١٢٦﴾ ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ﴾
وە كاتێك سورەتێك بنێردرێتە خوارەوە ﴿نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ﴾ (ئەو دووڕوانە) دەڕوانن بۆ یەكتری
﴿هَلۡ يَرَىٰكُم مِّنۡ أَحَدٖ﴾ (دەڵێـن) ئایا هیچ كەس دەتان بینێت؟ ﴿ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ﴾ پاشـان (بە دزییەوە)
دەگەڕێنـەوە ﴿صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم﴾ خـوا دڵیانـی وەرگێـڕا (لـە بڕواهێنـان) ﴿بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ﴾
چونكـە بەڕاستی ئەوانـە كۆمەڵێكن هیـچ تێ ناگەن ﴿١٢٧﴾ ﴿لَقَدۡ جَآءَكُمۡ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاسـتی
بۆتـان هاتـووە ﴿رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ﴾ پێغەمبەرێك لـە خۆتان ﴿عَزِيزٌ عَلَيۡهِ﴾ قـورس و گرانە بەلایەوە
﴿مَا عَنِتُّمۡ﴾ ناڕەحەتـی و ناخۆشـی ئێوە ﴿حَرِيصٌ عَلَيۡكُم﴾ زۆر سـوورە لەسـەر (باوەڕهێنان)تان
﴿بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ بـۆ بـڕواداران زۆر دڵسـۆز و میهرەبانـە ﴿١٢٨﴾ ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ جـا ئەگـەر
ڕوویـان وەرگێـڕاو گوێیـان پێ نەدایت ﴿فَقُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُ﴾ ئەوسـا بڵـێ من تەنها خوام بەسـە ﴿لَآ إِلَٰهَ
إِلَّا هُوَۖ﴾ كە هیچ پەرستراوێكی ڕاست نی یە جگە لە ئەو ﴿عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ﴾ تەنها پشت بەو دەبەستم
﴿وَهُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ ئەویش پەروەردگاری عەرشی گەورەیە ﴿١٢٩﴾

## سورەتی ﴿يُونُس﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿الر﴾ بە (ئەلیف ، لام ، ڕا و) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای
سورەتی (البقره) بکە ﴿تِلْكَ آيَاتُ﴾ ئەمە ئایەتەکانی ﴿الْكِتَابِ الْحَكِيمِ﴾ قورئانی نەگۆڕاوی پڕ حیکمەتە
(١) ﴿أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا﴾ ئایا بەلای خەڵکەوە سەیرە ﴿أَنْ أَوْحَيْنَا﴾ کە ئێمە نیگامان کردوە ﴿إِلَىٰ رَجُلٍ مِنْهُمْ﴾
بۆ پیاوێك لەخۆیان ﴿أَنْ أَنْذِرِ النَّاسَ﴾ (پێمان ووتووە) کەئادەمی بترسێنە ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ وە موژدە
بدە بەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿أَنَّ لَهُمْ﴾ کە بێگومان بۆیان هەیە ﴿قَدَمَ صِدْقٍ﴾ پلە و پایەی بەرز ﴿عِنْدَ
رَبِّهِمْ﴾ لای پەروەردگاریان ﴿قَالَ الْكَافِرُونَ﴾ بەڵام بێ باوەڕان ووتیان ﴿إِنَّ هَٰذَا لَسَاحِرٌ مُبِينٌ﴾ بێگومان
ئەم (پیاوە) جادووبازێکی ئاشکرایە (٢) ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي﴾ بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە ئەو زاتەیە
﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ لەشەش ڕۆژدا
﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ﴾ پاشان بەرزبویەوە سەرعەرش وقەراری گرت(باوەڕمان پێیەتی بەڵام چۆنیەتیکەی
نازانین) ﴿يُدَبِّرُ الْأَمْرَ﴾ (خوا) هەموو کاروبارەکان هەڵدەسوڕێنێت ﴿مَا مِنْ شَفِيعٍ﴾ هیچ تکا کارێك نی
یە (بۆ کەس) ﴿إِلَّا مِنْ بَعْدِ إِذْنِهِ﴾ مەگەر لەپاش ڕێگەدانی ئەو (خوا) نەبێت ﴿ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ ئەوزاتە
پەروەردگاری ئێوەیە ﴿فَاعْبُدُوهُ﴾ کەواتە هەر ئەو بپەرستن ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە بیرناکەنەوە (٣)
﴿إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾ گەڕانەوەی هەمووتان هەر بۆلای ئەوە ﴿وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا﴾ بەڵێنی خوا حەق وڕاستە
﴿إِنَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ﴾ بێگومان خوا لەسەرەتاوە دروستکراوان دروست دەکات ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُ﴾ دوای
(مردنیان) دووبارە دروستیان دەکاتەوە ﴿لِيَجْزِيَ الَّذِينَ﴾ بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوانە بداتەوە ﴿آمَنُوا وَعَمِلُوا
الصَّالِحَاتِ﴾ کە بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوە ﴿بِالْقِسْطِ﴾ بە دادگەرانە ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾
وە ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوە ﴿لَهُمْ شَرَابٌ مِنْ حَمِيمٍ﴾ تایبەت بەوانە خواردنەوەی کوڵاو کوڵی زۆر گەرم
﴿وَعَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە سزای سەختی ئازاردەر ﴿بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ﴾ لەبەر ئەوەی لەدونیادا بێ باوەڕبوون (٤)
﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ﴾ خوا زاتێکە کە خۆری گێڕاوە ﴿ضِيَاءً﴾ بە تیشك ﴿وَالْقَمَرَ نُورًا﴾ مانگیشی گێڕاوە
بەڕووناکی ﴿وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ﴾ بۆ (گەڕانی) مانگ چەند قۆناغێکی دیاری کردوە ﴿لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ
وَالْحِسَابَ﴾ بۆ ئەوەی ژمارەی ساڵەکان و حیسابی (مانگ و ڕۆژی) پێ بزانن ﴿مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَٰلِكَ﴾ خوا
ئەوانەی دروست نەکردوە ﴿إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ بەحەق و ڕاستی نەبێت ﴿يُفَصِّلُ الْآيَاتِ﴾ ئایەتەکان شی دەکاتەوە
﴿لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بۆ کۆمەڵێك کە زانان و تێدەگەن (٥) ﴿إِنَّ فِي اخْتِلَافِ﴾ بێگومان لە جیاوازی
﴿اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ شەو و ڕۆژدا ﴿وَمَا خَلَقَ اللَّهُ﴾ و هەرچی خوا دروستی کردوە ﴿فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾
لە ئاسمانەکان و زەویدا ﴿لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَّقُونَ﴾ چەند نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی کە خۆیان
دەپارێزن و لە خوا دەترسن (٦)

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی ﴿لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا﴾ بەهیوای دیداری ئێمە نین (لە دوارۆژدا)
﴿وَرَضُواْ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ وڕازی بوون بەژیانی دونیا ﴿وَٱطْمَأَنُّواْ بِهَا﴾ ودڵنیا بوون پێی ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَٰتِنَا
غَٰفِلُونَ﴾ وە ئەوانەی بێ ئاگان لە ئایەتەکانی ئێمە ﴿٧﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ﴾ ئەوانە جێگایان دۆزەخە
﴿بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ لەبەر ئەو کردەوانەی کە (لەدونیادا) دەیان کرد ﴿٨﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾
بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ و کردەوە چاکەکانیان کردوە ﴿يَهْدِيهِمْ
رَبُّهُم﴾ پەروەردگاریان ڕێنموونیان دەکات ﴿بِإِيمَٰنِهِمْ﴾ بەهۆی باوەڕەکەیانەوە ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ
ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ڕوبارەکان دێن و دەچن بەژێریان دا ﴿فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ لە باخ وبەهەشتانی پڕ نازو نیعمەت
دا ﴿٩﴾ ﴿دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ﴾ دوعایان تێیدا (ئەوەیە کەدەڵێن) پاکو بێگەردی بۆتۆ ئەی
پەروەردگارمان ﴿وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ﴾ سڵاو کردن لێیان لەو (بەهەشتەدا)بەووشەی سەلامە ﴿وَءَاخِرُ
دَعْوَىٰهُمْ﴾ وە دواهەمین دوعایان (ئەوەیەکە دەڵێن) ﴿أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بێگومان سوپاس
و ستایش هەر بۆ خوایە کە پەروەردگاری هەموو جیهانە ﴿١٠﴾ ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ﴾ وەئەگەر
خوا پەلەی بکردایە (لە قوبوڵ کردنی دوعای) شەڕو خراپەدا بۆ خەڵکی ﴿ٱسْتِعْجَالَهُم بِٱلْخَيْرِ﴾ وەك
پەلەکردنی (لەقوبوڵ کردنی دوعای) خێر وخۆشی ﴿لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ﴾ ئەوە ماوەکەیان دوایی
پێ دەهێنرا ( وکاتی مردونیان دەهات) ﴿فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ﴾ بۆیە مۆڵەتی ئەوانە دەدەین ﴿لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا﴾
بەهیوای دیداری ئێمە نین (لەڕۆژی دوایی دا) ﴿فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ لە نێو گومڕایی و سەرکەشیی
خۆیان دا بسوڕێنەوە و بتلێنەوە ﴿١١﴾ ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ﴾ وەکاتێك ئادەمی زیانێکی لێ بکەوێت
﴿دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا﴾ بەڕاکشان یان بەدانیشتن یان بەپێوە لێمان دەپاڕێتەوە ﴿فَلَمَّا كَشَفْنَا
عَنْهُ ضُرَّهُۥ﴾ ئەمجا کاتێك زەرەرو زیانەکەمان لەسەر لابردو نەمان هێشت ﴿مَرَّ﴾ دەڕوات (دەچێتە
سەر حاڵی پێشووی و دەگەڕێتەوە سەر کاری ناپەسەندی) ﴿كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ﴾ وەك هاوار و دوعای
نەکردبێت لێمان نەپاڕابێتەوە ﴿إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ﴾ بۆ لابردنی زیانێك کە دووچاری بووبوو ﴿كَذَٰلِكَ زُيِّنَ﴾
بەو جۆرە ڕازێنراوەتەوە ﴿لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ بۆ زیادە ڕەۆیان ئەو کردەوانەی کە دەیان
کرد ﴿١٢﴾ ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی لەناومان برد ﴿ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ چەند گەل و نەتەوە
لەپێش ئێوەدا ﴿لَمَّا ظَلَمُواْ﴾ کاتێك ناهەقیان کرد ﴿وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ لەکاتێکدا کەپێغەمبەرانیان
بەبەڵگەی ڕوونەوە بۆ هات ﴿وَمَا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ﴾ هەر باوەڕیان نەهێنا ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾
ئا بەو جۆرە تۆڵە لە کۆمەڵی تاوانباران دەستێنین ﴿١٣﴾ ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ﴾ لەپاشان ئێوەمان کرد
بەجێگر و جێنشین ﴿فِي ٱلْأَرْضِ﴾ لەزەویدا ﴿مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ لەپاش ئەوان ﴿لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾
بۆ ئەوەی سەرنج بدەین ئێوە چۆن ڕەفتار وکردەوە دەکەن ﴿١٤﴾

﴿وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ﴾ وە کاتێك بخوێنرێتەوە بەسەریاندا ﴿ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٖ﴾ ئایەتە روونەکانی ئێمە ﴿قَالَ
ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا﴾ ئەوانەی بەتەمای دیداری ئێمە نین (لەدوارۆژ دا) دەڵێن ﴿ٱئۡتِ بِقُرۡءَانٍ غَيۡرِ
هَٰذَآ﴾ قورئانێکی تر جگەلەم قورئانە بێنە ﴿أَوۡ بَدِّلۡهُۚ﴾ یان بیگۆڕە ﴿قُلۡ مَا يَكُونُ لِيٓ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) پێیان بڵێ بۆ من نی یە ﴿أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِٕ نَفۡسِيٓۖ﴾ کەلەلایەن خۆمەوە بیگۆڕم ﴿إِنۡ أَتَّبِعُ﴾ من شوێن
هیچ شتێ ناکەوم ﴿إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۖ﴾ جگەلەوەی وەحی و سرووش دەکرێت بۆم ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ﴾ بەڕاستی
من دەترسم ﴿إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي﴾ ئەگەر سەرپێچی پەروەردگارم بکەم ﴿عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ لەسزای
ڕۆژێکی گەورە (کە ڕۆژی دوایی یە) ﴿١٥﴾ ﴿قُل لَّوۡ شَآءَ ٱللَّهُ﴾ (پێیان) بڵێ ئەگەر خوا بیویستایە ﴿مَا
تَلَوۡتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەم قورئانەم نەدەخوێندەوە بۆتان ﴿وَلَآ أَدۡرَىٰكُم بِهِۦۖ﴾ وە لەو (قورئان) ئاگادارم
نەدەکردن ﴿فَقَدۡ لَبِثۡتُ فِيكُمۡ﴾ چونکە بێگومان من مامەوە لەناوتاندا ﴿عُمُرٗا مِّن قَبۡلِهِۦٓۚ﴾ ماوەی
تەمەنێکی درێژ پێش هاتنی ئەم قورئانە ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە بۆ ژیر نابن و بیرناکەنەوە؟ ﴿١٦﴾
﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ﴾ جا کێ ستەمکارترە ﴿مِمَّنِ﴾ لەو کەسەی ﴿ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ درۆ بەدەم خواوە
هەڵبەستێ ﴿أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ﴾ یائایەتەکانی قورئان بەدرۆ دابنێت ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ بەڕاستی
تاوان باران ڕزگاریان نابێت ﴿١٧﴾ ﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانە بێجگەلەخوا شتانێك دەپەرستن
﴿مَا لَا يَضُرُّهُمۡ﴾ کە نەزیانیان پێ دەگەیەنن ﴿وَلَا يَنفَعُهُمۡ﴾ نەسوود و قازانج ﴿وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ﴾
وە دەڵێن ئەو بتانە ﴿شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ﴾ تکا کارمانن لای خوا ﴿قُلۡ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ
بەوانە) بڵێ ئایا ئێوە هەواڵ دەدەن بەخوا ﴿بِمَا لَا يَعۡلَمُ﴾ بەشتێك کەبێ ئاگایەلێ ی ﴿فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي
ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ لەئاسمانەکان و زەویدا ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ خوا پاك و بێگەرد و بڵندە لەوەی
کە دەیکەنە هاوبەشی ﴿١٨﴾ ﴿وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ﴾ خەڵکی لەرابوردودا ﴿إِلَّآ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ هەریەك ئوممەت
بوون(بڕوا دار بوون بەخوا) ﴿فَٱخۡتَلَفُواْۚ﴾ ئەمجا جیاواز بوون ﴿وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ﴾ وە ئەگەر بڕیارێك
پێشتر نەدرایە ﴿مِن رَّبِّكَ﴾ لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡ﴾ ئەوا بڕیار دەدرا لەنێوانیاندا
﴿فِيمَا فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ﴾ لەوەی کە تێیدا جیاواز بوون ﴿١٩﴾ ﴿وَيَقُولُونَ﴾ وە ئەوانە دەڵێن ﴿لَوۡلَآ أُنزِلَ
عَلَيۡهِ﴾ با بهێنرایەتە خوارەوە بۆی ﴿ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ﴾ بەڵگەو نیشانەیەك لەلایەن پەروەردگاریەوە
﴿فَقُلۡ إِنَّمَا ٱلۡغَيۡبُ﴾ تۆش بڵێ بێگومان (زانینی) نهێنی و پەنهانی ﴿لِلَّهِ﴾ تایبەت بە خوایە
﴿فَٱنتَظِرُوٓاْ﴾ کەواتە چاوەڕوانی بکەن ﴿إِنِّي مَعَكُم﴾ بەڕاستی منیش لەگەڵ ئێوەدا ﴿مِّنَ
ٱلۡمُنتَظِرِينَ﴾ یەکێکم لە چاوەڕوانکەران ﴿٢٠﴾

﴿وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ﴾ وە کاتێك کە نیعمەت و ڕەحمەتی خۆمان دەدەین بەخەڵکی و تامی ئەو
نیعمتەیان پێدەچێژین ﴿مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ﴾ لەپاش زیان و ناخۆشیەك کەلێیان کەوتووە ﴿إِذَا لَهُم
مَّكۡرٞ﴾ دەست بەجێ ئەوان پیلان دەگێڕن ﴿فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ﴾ دەربارەی بەڵگە و ئایەتەکانی ئێمە ﴿قُلِ
ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ خوا خێراترە لە پیلان کردندا (لە بەرامبەر پیلانی ئەواندا)
﴿إِنَّ رُسُلَنَا﴾ بێگومان فریشتە و چاودێرەکانمان ﴿يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ﴾ هەر پیلان و فڕو فێڵێك (ئەو
بێ باوەڕانە )دەیکەن دەینوسن ﴿٢١﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ﴾ خوا زاتێکە هاتو چۆتان پێ دەکات ﴿فِي
ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ﴾ لەووشکایی و لەدەریادا ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ﴾ هەتا کاتێك ئێوە ﴿فِي ٱلۡفُلۡكِ﴾ لەکەشتی دان
﴿وَجَرَيۡنَ بِهِم﴾ (کەشتیەکان) دەیان گێڕێت ﴿بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ﴾ بەهۆی شنە بایەکی خۆشەوە﴿وَفَرِحُواْ بِهَا﴾
و خۆش حاڵ دەبن پێی ﴿جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ﴾ (لەپڕ) ڕەشە بایەکی زۆر بەهێز لەو (کەشتییانە) هەڵکات
﴿وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ﴾ وشەپۆلیان بۆ بێت ﴿مِن كُلِّ مَكَانٖ﴾ لەهەموو لایەکەوە ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ﴾ وە دڵنیا بوون
لەوەی کە ئەوان ﴿أُحِيطَ بِهِمۡ﴾ دەورە دراون (و لەناو دەچن) ﴿دَعَوُاْ ٱللَّهَ﴾ هاوار دەکەنە خوا ی گەورە
﴿مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ زۆر بەدڵسۆزی وگەردنی بۆ کەچ دەکەن ﴿لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا﴾ (و دەڵێن) سوێند بەخوا
ئەگەر ڕزگارمان بکەیت ﴿مِنۡ هَٰذِهِۦ﴾ لەم سەختی ونارەحەتیە ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ بێگومان ئێمە لە
سوپاسگوزاران دەبین (بۆتۆ ئەی خوایە) ﴿٢٢﴾ ﴿فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ﴾ ئەمجا کاتێك خوا ڕزگاری کردن ( لەو
نارەحەتیە) ﴿إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ﴾ کوتوپڕ دەست دەکەنەوە بە خراپەکاری و بێ باوەڕی ﴿فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لەزەویدا
﴿بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ﴾ بە ناڕەوا ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی ئادەمی یە (خراپەکارەکان) ﴿إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ﴾ لەڕاستیدا ستەم
و ناحەقی یەکانتان ﴿عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ﴾ زیانی هەر بۆ خۆتانە ﴿مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ لەزەتی ژیانی دونیاش
بێ نرخە ﴿ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ﴾ پاشان گەڕانەوەتان هەر بۆلای ئێمەیە ﴿فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ ئەمجا
هەواڵتان پێ دەدەین بەوەی کە (لەدونیادا) دەتان کرد ﴿٢٣﴾ ﴿إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ بێگومان وێنەی
ژیانی دونیا ﴿كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ وەك بارانێك وایە لەئاسمانەوە باراندومانە ﴿فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ
ٱلۡأَرۡضِ﴾ جا بەهۆی ئەو (بارانەوە ڕووەکی زۆر ڕواوە و) سەوزی و ڕووەکی زەوی تێکەڵ بەیەك بوون
وبە یەکدا چوون ﴿مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ﴾ لەوەی کە خەڵکی و ئاژەڵیش دەیخۆن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ﴾ هەتا
کاتێك﴿أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ﴾ زەوی (بەسەوزی و ڕووەك) ڕەونەق و جوانی خۆی وەردەگرێت
و خۆی دەڕازێنێتەوە ﴿وَظَنَّ أَهۡلُهَآ﴾ دانیشتوان و خەڵکی ئەو (زەویە) وا دەزانن ﴿أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ﴾
کەبە ڕاستی ئەوان بەتوانان بەسەر(دروێنە کردن)یدا ﴿أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا﴾ (لەناکاوێکدا) فەرمانی ئێمە بێت
بۆ ئەو (زەوی و کشتوکاڵە) ﴿لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا﴾ لەشەو یان لەڕۆژدا ﴿فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا﴾ ئەمجا وەك دروێنە
کراوی لێ بکەین ( وهیچیان بۆ نەمێنێتەوە) ﴿كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِۚ﴾ وەك لەوەو پێش هەر نەبوو بێت
﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ﴾ ئابەو جۆرە ڕوونی دەکەینەوە ﴿ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ ئایەت و بەڵگەو نیشانەکانمان ﴿لِقَوۡمٖ
يَتَفَكَّرُونَ﴾ بۆ گەلێ کە بیربکەنەوە ﴿٢٤﴾ ﴿وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ﴾ وە خوا (خەڵك) بانگ دەکات ﴿إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ﴾
بۆ ماڵی ئاشتی و ئارامی (بەهەشت) ﴿وَيَهۡدِي مَن﴾ وە ڕێنموونیی هەر کەسێك دەکات ﴿يَشَآءُ﴾ کە
بیەوێت ﴿إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ بۆ ڕێگەی ڕاست ﴿٢٥﴾

﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ﴾ بۆ ئەوانەی چاکەیان کردوە ﴿ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ پاداشتی چاکتر(بەهەشت) و زیاتریان
هەیە (کەبینینی خوایە) ﴿وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ﴾ دەم و چاویان دایناگرێت (لێی نانیشێت) ﴿قَتَرٌ
وَلَا ذِلَّةٌ﴾ هیچ ڕەشی وتەپ و تۆزو ڕیسواییەك﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە﴿أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ﴾ هاوڕێی بەهەشتن
﴿هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە لەو(بەهەشتە)دان بەهەمیشەیی ﴿٢٦﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ﴾ ئەوانەش ﴿كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾
کەکردەوەی خراپیان کردووە﴿جَزَآءُ سَيِّئَةٍۭ﴾ تۆڵەی هەر خراپەیەك ﴿بِمِثْلِهَا﴾ بەئەندازەی ئەو
(خراپەیە تۆڵەی لێ دەسێندرێ) ﴿وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ﴾ وە ڕیسوایی دایان دەگرێت ﴿مَّا لَهُم﴾ بۆیان نییە
﴿مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ﴾ هیچ پەنادەرێك لە(سزای) خودا ﴿كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ﴾ (بەڕادەیەك ڕوویان
ڕەش بووە) دەڵێی دەم و چاوویان داپۆشراوە ﴿قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًا﴾ بە چەند بەشێك لەشەوە زەنگ
﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ ئەوانەی(کەباس کران) هاوڕێی ئاگری دۆزەخن ﴿هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ئەوان تێیدا
دەمێننەوە بەهەمیشەیی.﴿٢٧﴾ ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ باسی بکە بۆیان) ئەو ڕۆژەی
هەموویان کۆدەکەینەوە ﴿ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ﴾ ئەمجا دەڵێین بەوانەی ﴿أَشْرَكُواْ﴾ هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار داوە
﴿مَكَانَكُمْ﴾ لەشوێنی خۆتاندا نەجوڵێن (ڕاوەستن) ﴿أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْ﴾ خۆتان و بت و پەرستراوەکانتان
﴿فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ﴾ ئەمجا لێکیان جیادەکەینەوە ﴿وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم﴾ پەرستراوەکانیان دەڵێن ﴿مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا
تَعْبُدُونَ﴾ ئێوە ئێمەتان نەدەپەرست ﴿٢٨﴾ ﴿فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا﴾ جا خوا بەسە کە شاهید بێت ﴿بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾
لەنێوان ئێمە و ئێوەدا﴿إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَٰفِلِينَ﴾ بێگومان ئێمە بێ ئاگابووین لەبەندایەتی کردنتان
بۆ ئێمە ﴿٢٩﴾ ﴿هُنَالِكَ تَبْلُواْ﴾ لەوێدا دەردەکەوێت﴿كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ﴾ هەموو کەسێك چی پێش
خۆی خستووە ﴿وَرُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ وە هەموو دەگەڕێنرێنەوە بۆلای خوا ﴿مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ﴾ کە کۆمەکی کەر
وپەروەردگاری حەق و ڕاستیانە﴿وَضَلَّ عَنْهُم﴾ وەلێیان وون دەبێت ﴿مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ ئەو (پەرستراوە
درۆیانەی) هەڵیان بەستبوون ﴿٣٠﴾ ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا کێ ڕزق و ڕۆزیتان
دەدات ﴿مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ لەئاسمان (بە باران) و لەزەویەوە (بە ڕووەك) ﴿أَمَّن يَمْلِكُ﴾ یان کێ
خاوەنی (دروستکەری) ﴿ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ﴾ گوێ و چاوانە ﴿وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ﴾ وە کێ زیندوو
لە مردوو دەردەهێنێت ﴿وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ﴾ وە مردوو لەزیندوو دەردەهێنێت ﴿وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾
هەروەها کێ کارەکان هەڵدەسوڕێنێ ﴿فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ﴾ بێگومان یەکسەر دەڵێن خوا ﴿فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾
کەواتە (ئەی موحەممەد ﷺ) پێیان بڵێ دەی بۆ خۆتان ناپارێزن (لەسزای خوا)؟ ﴿٣١﴾ ﴿فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ﴾
هەر ئەو خوایە ﴿رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ﴾ پەروەردگاری ڕاستی ئێوەیە ﴿فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ﴾ دەی لەپاش ڕاستی هیچ
هەیە ﴿إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ﴾ جگە لەگومڕایی ﴿فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ﴾دەی چۆن لەڕێگەی ڕاست لادەدرێن؟! ﴿٣٢﴾
﴿كَذَٰلِكَ حَقَّتْ﴾ بەو جۆرە چەسپاوە ﴿كَلِمَتُ رَبِّكَ﴾ بڕیاری پەروەردگارت ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ﴾ لەسەر ئەوانەی
﴿فَسَقُوٓاْ﴾ لەسنوور لایان داوە ﴿أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان ئەوانە بڕوا ناهێنن ﴿٣٣﴾

﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ لەوانەی کردوتانە بەهاوبەشی خوا ﴿مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ﴾ کەسێك
هەیە شتێك لەنەبوونەوە دروست بکات ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ ئەمجا (لەپاش مردنی) دووبارەی بکاتەوە ﴿قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟
ٱلْخَلْقَ﴾ بڵێ خوا لە نەبوو شت دروست دەکات ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ ئەمجا (لە پاش مردنی) دروستی دەکاتەوە
﴿فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ دەی چۆن لە ڕاستی لا دەدرێن ﴿٣٤﴾ ﴿قُلْ هَلْ﴾ بڵێ ئایا ﴿مِن شُرَكَآئِكُم﴾ لە ناو پەرستراوەکانتاندا
﴿مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ﴾ کەسێ هەیە ڕێنموونیی بکات بۆ ڕێگای ڕاست ﴿قُلِ ٱللَّهُ﴾ بڵێ خوا ﴿يَهْدِى لِلْحَقِّ﴾ ڕێنموونیی
دەکات بۆ ڕێگای ڕاست ﴿أَفَمَن يَهْدِىٓ﴾ جا ئایا کەسێك کە ڕێنموونیی دەکات ﴿إِلَى ٱلْحَقِّ﴾ بۆ ڕاستە ڕێ ﴿أَحَقُّ أَن
يُتَّبَعَ﴾ شایانترە بەوەی پەیڕەوی بکرێت وشوێنی بکەویت ﴿أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ﴾ یان کەسێك ڕێبازی ڕاست شارەزا
نابێ ﴿إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ﴾ مەگەر شارەزا بکرێت ﴿فَمَا لَكُمْ﴾ ئەوە چیتانە ﴿كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ چۆن ئەو بڕیار دەدەن؟ ﴿٣٥﴾
﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ﴾ وە زۆربەیان شوێن هیچ ناکەون ﴿إِلَّا ظَنًّا﴾ جگە لە گومان ﴿إِنَّ ٱلظَّنَّ﴾ بەڕاستی گومان
﴿لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا﴾ لە ئاست حەقدا هیچ سوودێك (بەخاوەنەکەی) ناگەیەنێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا
﴿عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ زانایە بەوەی کە دەیکەن ﴿٣٦﴾ ﴿وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ﴾ ڕەوانی یەو ناگونجێت ئەم قورئانە
﴿أَن يُفْتَرَىٰ﴾ هەڵبەسترا بێ ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ (لەلایەن کەسێکەوە) جگە لەخوا ﴿وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى﴾ بەڵکو
بەڕاست دانەری ئەو (کتێبانەی) ﴿بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ پێش خۆیەتی (پێش دەستکاری کردنیان) ﴿وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾
وە ڕوون کەرەوەی کتێبە ئاسمانیەکانە ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ (ئەم قورئانە)هیچ گومانی تێدانی یە ﴿مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾
لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە هاتووە ﴿٣٧﴾ ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ﴾ یان دەڵێن (موحەممەد ﷺ) خۆی ئەم قورئانەی
هەڵبەستووە بەدەم خواوە ﴿قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ﴾ بەوانە بڵێ سورەتێك بهێنن ﴿مِّثْلِهِۦ﴾ وەك ئەو ﴿وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم﴾
و هەر کەسێك کەدەتوانن بانگی بکەن ﴿مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بێجگە لەخوا ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن ﴿٣٨﴾
﴿بَلْ﴾ (ئەوە وازلێ بێنە) بەڵکو ﴿كَذَّبُوا۟ بِمَا﴾ ئەوانە بڕوایان بەقورئان نەهێناو بە درۆیان دانا ﴿لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ﴾
کە هیچ زانیارییان دەربارەی نەبوو ﴿وَلَمَّا﴾ کە هێشتا ﴿يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ﴾ سەرئەنجامی (سزاو تۆڵەی)
قورئانیان بۆ نەهاتووە ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ﴾ بە هەمان شێوە (پەیامی پێغەمبەرانیان) بەدرۆ زانی ئەوانەی
﴿مِن قَبْلِهِمْ﴾ لەپێش ئەمانەوە بوون ﴿فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ﴾ ئەمجا سەرنج بدە کە چۆن بوو ﴿عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ دواڕۆژ
و ئاکامی ستەم کاران ﴿٣٩﴾ ﴿وَمِنْهُم مَّن﴾ لەوانیشدا کەسی وا هەیە ﴿يُؤْمِنُ بِهِۦ﴾ کەبڕوا بەقورئان دەهێنێت
﴿وَمِنْهُم مَّن﴾ کەسی واشیان هەیە ﴿لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ﴾ کەبڕوای پێ ناهێنێت ﴿وَرَبُّكَ أَعْلَمُ﴾ وە پەروەردگارت
لەهەموو کەس زاناترە ﴿بِٱلْمُفْسِدِينَ﴾ بە خراپەکاران ﴿٤٠﴾ ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ﴾ ئەگەر بڕوایان پێ نەهێنای ﴿فَقُل لِّى عَمَلِى﴾
ئەوە پێیان بڵێ (پاداشتی) کردەوەی خۆم بۆ خۆم ﴿وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ﴾ و (پاداشتی) کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان
﴿أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ﴾ ئێوە بەرین (بەرپرسیارنین) ﴿مِمَّآ أَعْمَلُ﴾ لەوەی من دەیکەم ﴿وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ منیش
بەریم (بەرپرسیارنیم) لەوەی ئێوە دەیکەن ﴿٤١﴾ ﴿وَمِنْهُم مَّن﴾ (کافران) کەسی وایان هەیە ﴿يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ﴾
گوێت لێ دەگرن (کەقورئان دەخوێنیت) ﴿أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ﴾ جا ئایا تۆ گوفتارت بەکەڕان دەژنەوێنی؟
﴿وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ﴾ ئەگەر چی ئەو کەڕانە هیچیش تێنەگەن ﴿٤٢﴾

﴿وَمِنۡهُم مَّن﴾ وە هـی وایـان هەیـە ﴿يَنظُرُ إِلَيۡكَۚ﴾ دەڕوانێـت بـۆت ﴿أَفَأَنتَ تَهۡدِي ٱلۡعُمۡيَ﴾ دەی ئایـا تـۆ
ڕێنموونیـی ئـەو کوێرانـە دەکەیـت (مەبەسـت پێی بـێ باوەڕانـە کە کوێرن لـە ئاسـت بینینی هەق
وڕاسـتیدا) ﴿وَلَوۡ كَانُواْ لَا يُبۡصِرُونَ﴾ ئەگـەر چی ئـەو کوێرانە نابیناش بن؟ ﴿٤٣﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بەڕاسـتی خوا ﴿لَا
يَظۡلِمُ ٱلنَّاسَ شَيۡـٔٗا﴾ هیـچ سـتەم لەخەڵکی ناکات ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ﴾ بەڵکـو خەڵکی ﴿أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾
خۆیـان سـتەم لەخۆیـان دەکـەن ﴿٤٤﴾ ﴿وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ﴾ وە (بیریـان بخەنـەوە) ئـەو ڕۆژەی کە(خـوا)
هەموویـان کـۆ دەکاتـەوە ﴿كَأَن لَّمۡ يَلۡبَثُوٓاْ﴾ دەڵێـی لـە دونیـادا نەماونەتـەوە﴿إِلَّا سَاعَةٗ﴾ سـاتێکی کـەم
نەبێت ﴿مِّنَ ٱلنَّهَارِ﴾ لە ڕۆژێك ﴿يَتَعَارَفُونَ بَيۡنَهُمۡۚ﴾ خۆیان بەیەکتر دەناسـێنن ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاسـتی
زەرەرمەنـد بـوون ئەوانەی ﴿كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ﴾ کـە بڕوایان نەهێنا بـە (زیندووبونـەوەو) دیداری خوا
﴿وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ﴾ وەئەوانە ڕێنموون وەرگرنەبوون ﴿٤٥﴾ ﴿وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ﴾ بەڕاستی ئەگەر نیشانت بدەین
﴿بَعۡضَ﴾ هەندێك ﴿ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ﴾ لەوەی بەڵێنمان داوە پێیان (زاڵبوونت بەسەریاندا) ﴿أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ یان
تۆ بمرێنین (پێش بەدی هاتنی) ﴿فَإِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ﴾ ئەوە گەڕانەوەیان هەر بۆلای ئێمەیە ﴿ثُمَّ ٱللَّهُ﴾ پاشان
خوا ﴿شَهِيدٌ﴾ شـایەتە ﴿عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ﴾ لەسـەر ئەو کردەوانەی کە دەیکەن (لەپاش تۆ) ﴿٤٦﴾ ﴿وَلِكُلِّ
أُمَّةٖ رَّسُولٞۖ﴾ وە بۆ هەموو گەلێك پێغەمبەرێك هەبووە ﴿فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمۡ﴾ جا کاتێك پێغەمبەرەکەیان
(لەقیامەتدا) هات بۆلایان ﴿قُضِيَ بَيۡنَهُم﴾ بڕیار دەدرێت لەنێوانیاندا ﴿بِٱلۡقِسۡطِ﴾ بەدادگەریی و ڕاستی
﴿وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ وە ئەوان هیچ ستەمیان لێ ناکرێت ﴿٤٧﴾ ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ﴾ دەڵێن کەی دەبێت ﴿هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ﴾
ئەو بەڵێن و هەڕەشـەیە ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن ﴿٤٨﴾ ﴿قُل﴾ (ئەی موحەممەدﷺ)
بڵـێ ﴿لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي﴾ بەدەسـتم نـی یـە بـۆ خـودی خـۆم ﴿ضَرّٗا وَلَا نَفۡعًا﴾ هیـچ زیـان و سـوودێك
﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ﴾ مەگەر ئەوەی خوا بیەوێت ﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌۚ﴾ بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك کاتێکی دیاری
کـراو هەیە ﴿إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ﴾ ئەگەر کاتەکەیان هات ﴿فَلَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ﴾ ئەوا نەسـاتێك دوا دەکەون
﴿وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ﴾ نەپێشـیش دەکەون ﴿٤٩﴾ ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ﴾ تۆ بڵێ (بەوانە)پێم بڵێن ﴿إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُهُۥ﴾ ئەگەر
سـزای خواتان بۆهات ﴿بَيَٰتًا أَوۡ نَهَارٗا﴾ لەشـەودا یان لەڕۆژدا ﴿مَّاذَا يَسۡتَعۡجِلُ مِنۡهُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ ئایا تاوانباران
بۆچی (سزایەك) پەلە دەکەن ﴿٥٠﴾ ﴿أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ﴾ ئایا پاش ئەوەی ڕووی داو بەدی هات ﴿ءَامَنتُم بِهِۦٓۚ﴾
ئێوە بڕوای پێ دێنن؟!! ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ﴾ ئا ئێستا (بڕوای پێ دێنن)؟ ﴿وَقَدۡ كُنتُم بِهِۦ تَسۡتَعۡجِلُونَ﴾ خۆ بەڕاستی ئێوە
پەلەی هاتنی (ئەو سـزا) یەتان دەکرد ﴿٥١﴾ ﴿ثُمَّ قِيلَ﴾ ئەمجا پێیان دەووترێت ﴿لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ بەوانەی
کە سـتەمیان کردوە ﴿ذُوقُواْ عَذَابَ﴾ بچەژن سزای ﴿ٱلۡخُلۡدِ﴾ هەمیشەیی ﴿هَلۡ تُجۡزَوۡنَ﴾ ئایا ئێوە تۆڵەتان
لێ دەسـەندرێت ﴿إِلَّا بِمَا﴾ مەگەر بەهۆی ئەو (کارانەوە) نەبێت ﴿كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ﴾ کەخۆتان دەتان
کرد ﴿٥٢﴾ ﴿وَيَسۡتَنۢبِـُٔونَكَ﴾ (ئەی موحەممەدﷺ) لێت دەپرسن ﴿أَحَقٌّ هُوَۖ﴾ ئایا ئەو سزایە ڕاستە (بەدی
دێـت)؟ ﴿قُلۡ إِي وَرَبِّيٓ﴾ پێیـان بڵـێ بەڵێ سـوێند بەپەروەردگـارم ﴿إِنَّهُۥ لَحَقّٞۖ﴾ بێگومان ئەوە ڕاسـتە
﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ﴾ وە ئێوە ناتوانن خۆتانی لێ قوتار بکەن ﴿٥٣﴾

﴿وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ﴾ ئەگەر هی هەرکەسێك بێت ﴿ظَلَمَتْ﴾ کە ستەمی کردووە (لەدونیادا) یان
بێ باوەڕ بوو بێت ﴿مَا فِي الْأَرْضِ﴾ هەرچی لە زەویدایە ﴿لَافْتَدَتْ بِهِ﴾ لەبریتی خۆی دەیدات
(تەنها بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێت) ﴿وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ﴾ وە (بێ باوەڕان) پەشیمانی خۆیان دەشارنەوە
(لەو ڕۆژەدا) ﴿لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ﴾ کاتێك کە ئەو سزایە دەبینن ﴿وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ﴾ جا بڕیار
دەدرێت لە نێوانیاندا بەدادوەری ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ و ئەوانە هیچ ستەمیان لێ ناکرێت ﴿٥٤﴾
﴿أَلَا إِنَّ لِلَّهِ﴾ ئاگاداربن بەڕاستی مولکی خوایە ﴿مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ ئەوەی لە ئاسمانەکان
و زەویدایە ﴿أَلَا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ﴾ ئاگاداربن بەڕاستی بەڵێنی (هەڕەشەی) خوا ﴿حَقٌّ﴾ ڕاستە
﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن ﴿٥٥﴾ ﴿هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ ئەو (خوایە) دەژێنێت
ودەمرێنێت ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ و هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنرێنەوە (لەڕۆژی دواییدا) ﴿٥٦﴾ ﴿يَا أَيُّهَا
النَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿قَدْ جَاءَتْكُم﴾ بێگومان بۆتان هاتووە ﴿مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ ئامۆژگاری
(قورئان) لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿وَشِفَاءٌ لِّمَا فِي الصُّدُورِ﴾ وە شیفا و چارەیە بۆ ئەوەی لە ناو دڵ
و دەروونتان دایە ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ وە ڕێنموونیی و میهرەبانیە ﴿لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆ بڕواداران ﴿٥٧﴾ ﴿قُلْ بِفَضْلِ
اللَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ هەر بەهۆی چاکەو ﴿وَبِرَحْمَتِهِ﴾ و میهرەبانی خواوەیە
﴿فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا﴾ جا کەواتە بابەوە دڵخۆش بن ﴿هُوَ خَيْرٌ﴾ ئەوە چاکترە (بۆیان) ﴿مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾
لەوەی کۆی دەکەنەوە (لەشتی ئەم دونیایە) ﴿٥٨﴾ ﴿قُلْ أَرَأَيْتُم﴾ بڵێ (بەو بێ بڕوایانە) پێم بڵێن
﴿مَّا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ ئەوەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە ﴿لَكُم مِّن رِّزْقٍ﴾ بۆتان لە ڕزق و ڕۆزی
﴿فَجَعَلْتُم مِّنْهُ﴾ هەندێکیتان کردووە ﴿حَرَامًا وَحَلَالًا﴾ بە حەرام و (هەندێکی)بە حەلاڵ ﴿قُلْ آللَّهُ﴾ بڵێ
ئایا خوا ﴿أَذِنَ لَكُمْ﴾ مۆڵەتی (ئەوەی) پێ داوون ( لەخۆتانەوە شتانێك حەلاڵ و شتانێکیش
حەرام بکەن) ﴿أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ﴾ یان درۆ دەکەن بەناوی خواوە ﴿٥٩﴾ ﴿وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ﴾ وە گومانی ئەوانە
چیە ﴿يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ﴾ کە درۆ هەڵئەبەستن بەناوی خواوە ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا
﴿إِنَّ اللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا ﴿لَذُو فَضْلٍ﴾ خاوەنی چاکەو فەزڵ و بەهرەیە ﴿عَلَى النَّاسِ﴾ بەسەر خەڵکی یەوە
﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی ﴿لَا يَشْكُرُونَ﴾ سوپاسی ( ئەو چاکەو بەهرانە) ناکەن ﴿٦٠﴾
﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆ لە هەر مەبەست و کارێکدابیت ﴿وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ﴾
وە هەرچی لە قورئان بخوێنی ﴿وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ﴾ و (ئێوە) هەر کردەوەیەك بکەن ﴿إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ﴾
بێگومان ئێمە بەسەرتانەوە ﴿شُهُودًا﴾ شایەتین و ئاگادارین ﴿إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ﴾ کاتێك دەڕۆنە ناویەوە
و پێوەی خەریکن ﴿وَمَا يَعْزُبُ﴾ وە وون نابێت ﴿عَن رَّبِّكَ﴾ لەپەروەردگارت ﴿مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ﴾ بەئەندازەی
گەردیلەیەك ﴿فِي الْأَرْضِ﴾ نە لەزەوی ﴿وَلَا فِي السَّمَاءِ﴾ و نە لەئاسماندا ﴿وَلَا أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ﴾
وە نەبچوکتر لەو گەردیلەیە ﴿وَلَا أَكْبَرَ﴾ و نە گەورەتر لەو(گەردیلەیە) ﴿إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ مەگەر
ئەوەتا لە ناو پەڕاوێکی ئاشکرادا (کەمەبەست پێی لوح المحفوظ)ە ﴿٦١﴾

﴿أَلَآ إِنَّ﴾ ئاگادار بن بێگومان ﴿أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ﴾ دۆستانی خوا ﴿لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ ترسیان لەسەر
نیە ﴿وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ خەفەتیش ناخۆن ﴿٦٢﴾ ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿وَكَانُواْ
يَتَّقُونَ﴾ وەهەمیشە خۆیان دەپارێزن و لەخوا دەترسن ﴿٦٣﴾ ﴿لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ﴾ هەر بۆ ئەوانە
مزگێنی وموژدە ﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ لەژیانی دونیادا ﴿وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ﴾ و لە دوارۆژیشدا ﴿لَا تَبۡدِيلَ﴾
گۆڕان نییە ﴿لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ﴾ بۆ ووتە (و بەڵێنە) کانی خوا ﴿ذَٰلِكَ هُوَ﴾ هەر ئەوەیە ﴿ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾
سەرکەوتنی زۆر گەورە ﴿٦٤﴾ ﴿وَلَا يَحۡزُنكَ﴾ باخەمبارت نەکات ﴿قَوۡلُهُمۡۘ﴾ ووتەی ئەوانە ﴿إِنَّ
ٱلۡعِزَّةَ﴾ چونکە بەڕاستی هێز و دەسەڵات ﴿لِلَّهِ جَمِيعًاۚ﴾ هەمووی بۆ خوایە ﴿هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾
خوایش بیسەری زانایە ﴿٦٥﴾ ﴿أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ﴾ ئاگادار بن بەڕاستی هەر بۆ خوایە ﴿مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ هەر
چی لە ئاسمانەکان ﴿وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ هەرچیش لە زەوی دایە ﴿وَمَا يَتَّبِعُ﴾ پەیڕەویان نەکردووە
﴿ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی بێجگە لەخوادەپەرستن ﴿شُرَكَآءَۚ﴾ پەرستراوانێ (هاوبەشانێ
بۆ خوا) ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ﴾ ئەوانە تەنها شوێن گومان کەوتوون ﴿وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ﴾
وە ئەوانە تەنها درۆدەکەن (بەگومان و گۆترە شت دەڵێن) ﴿٦٦﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِي﴾ ئەو خوایە زاتێکە
﴿جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ﴾ شەوی بۆ داناون ﴿لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ﴾ تا تییدا بحەسێنەوە ﴿وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ﴾ ڕۆژیشی
داناوە بە ڕووناککەرەوە (کەمایەی ژیان و گوزەرانتان بێت) ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەوەدا (کە
باس کرا) ﴿لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ﴾ چەند بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ کەسانێك کە دەبیستن و ژیرن ﴿٦٧﴾
﴿قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ﴾ ئەوانە دەڵێن خوا منداڵی بۆ خۆی هەڵبژاردوە!! ﴿سُبۡحَٰنَهُۥۖ﴾ پاکی و بێگەردی
بۆ خوا ﴿هُوَ ٱلۡغَنِيُّۖ﴾ ئەو بێ نیازە ﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ تەنها ئەو خاوەنیانە هەرچی وا لە ئاسمانەکان
﴿وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ وهەرچی والە زەویدا ﴿إِنۡ عِندَكُم مِّن سُلۡطَٰنِۭ بِهَٰذَآۚ﴾ هیچ بەڵگەیەکتان لانیە بەمەی
کە دەیڵێن. ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ ئایا شتێك دەڵێن بە دەم خواوە کە نایزانن و بێ ئاگان لێی ﴿٦٨﴾
﴿قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بەڕاستی ئەوانەی ﴿يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾ کە درۆ هەڵ
دەبەستن بە ناوی خواوە ﴿لَا يُفۡلِحُونَ﴾ (هەرگیز) ڕزگارنابن ﴿٦٩﴾ ﴿مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا﴾ (چونکە) بەهرە
و ڕابواردنێکی کەم لە دونیادا (بەسەر دەبەن) ﴿ثُمَّ إِلَيۡنَا﴾ پاشان بۆ لای ئێمەیە ﴿مَرۡجِعُهُمۡ﴾ گەڕانەوەیان
﴿ثُمَّ نُذِيقُهُمُ﴾ ئەمجا پێیان دەچێژین ﴿ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ﴾ سزای زۆر توند ﴿بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ﴾
بەهۆی ئەوەی کە بڕوایان نەهێنا (تامردن) ﴿٧٠﴾

﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) دەنگوباس و هەواڵی نووح (علیه السلام) یان بۆ بخوێنەرەوە
﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ﴾ کاتێك بە گەلەکەی ووت ﴿يَا قَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكُم﴾ ئەگەر
بەلاتانەوە قورس و گرانە ﴿مَّقَامِي﴾ مانەوەم لەناوتانـدا ﴿وَتَذْكِيرِي بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ و ئامۆژگاری کردنم
(بۆتان) بەئایەتەکانی خوا ﴿فَعَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْتُ﴾ ئەوامن پشتم بەخوا بەستووە ﴿فَأَجْمِعُوا أَمْرَكُمْ﴾ ئێوەش
کارو بڕیاری خۆتـان کۆکەنەوە ﴿وَشُرَكَاءَكُمْ﴾ لەگەڵ هاوبەشەکانتان دا ﴿ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً﴾
ئەمجا باکارو بڕیارەکانتان شاراوە نەبێت بە لاتانەوە (بەڵکو ئاشکرا بێت) ﴿ثُمَّ اقْضُوا إِلَيَّ﴾ پاشان پەلامارم
بدەن ﴿وَلَا تُنظِرُونِ﴾ و ماوەم مەدەن (٧١) ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ﴾ جا ئەگەر سەرپێچیتان کردم (پشتم تێ دەکەن)
﴿فَمَا سَأَلْتُكُم﴾ ئەوە من داوام نەکردووە لێتان ﴿مِّنْ أَجْرٍ﴾ هیچ پاداشتێك ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ﴾ پاداشتی
من هەر لەسەر خوایە ﴿وَأُمِرْتُ﴾ وە فەرمانم پێ دراوە ﴿أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ کە لە فەرمانبەردارانی
خودا و موسوڵمانان بم (٧٢) ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ ئەمجا بەدرۆیان زانی ﴿فَنَجَّيْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ﴾ ئەوسا ئێمەش ئەو
(نووح) و ئەوانەش کەلەگەڵی بوون ڕزگارمان کردن ﴿فِي الْفُلْكِ﴾ لەکەشتیەکەدا ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ﴾
وە کردمانن ﴿خَلَائِفَ﴾ بەجێ نشینانی (ئەوان لەزەویدا) ﴿وَأَغْرَقْنَا الَّذِينَ﴾ ئەوانەشمان ژێر ئاو خست ﴿كَذَّبُوا
بِآيَاتِنَا﴾ کەبڕوایان بەئایەتەکانی ئێمە نەهێنا ﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ﴾ ئەمجا سەرنج بدە و بڕوانە بزانە چۆن
بوو ﴿عَاقِبَةُ الْمُنذَرِينَ﴾ دوارۆژ و ئاکامی ترسێنراوان (٧٣) ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِن بَعْدِهِ﴾ ئەمجا لەدوای نووح
ناردمان ﴿رُسُلًا﴾ پێغەمبەرانێك ﴿إِلَىٰ قَوْمِهِمْ﴾ بۆ ناو گەلەکانیان ﴿فَجَاءُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ ئەوانیش هاتن
بۆ لایان بەبەڵگە ڕوونەکانەوە ﴿فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا﴾ کەچی ئەوان بڕوایان نەهێنا ﴿بِمَا كَذَّبُوا بِهِ مِن قَبْلُ﴾
بەوەی کەلە ڕابردوودا بڕوایان پێنەهێنا بوو ﴿كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ﴾ بەو جۆرە مۆر دەنێین ﴿عَلَىٰ قُلُوبِ﴾ بەسەر
دڵی ﴿الْمُعْتَدِينَ﴾ دەست درێژ کاراندا (تاتێبگەن) (٧٤) ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا﴾ پاشان ناردمان ﴿مِن بَعْدِهِم﴾ لەپاش
ئەو نێرراوانە ﴿مُّوسَىٰ وَهَارُونَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ﴾ مووسا و هاروون بۆلای فیرعەون ﴿وَمَلَئِهِ﴾ و وە بۆ لای
دەستە و تاقمەکەی ﴿بِآيَاتِنَا﴾ بە بەڵگە و موعجیزەکانمانەوە ﴿فَاسْتَكْبَرُوا﴾ بەڵام ئەوان خۆیان
بە گەورە زانی ﴿وَكَانُوا قَوْمًا مُّجْرِمِينَ﴾ و ئەوان هۆزێکی تاوان باربوون (٧٥) ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمُ﴾ جا کاتێك
بۆیان هات ﴿الْحَقُّ مِنْ عِندِنَا﴾ هەق و ڕاستی لەلایەن ئێمەوە ﴿قَالُوا إِنَّ هَٰذَا﴾ ووتیان بێگومان ئەمە
﴿لَسِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ جادوویەکی ڕوون و دیارە! (٧٦) ﴿قَالَ مُوسَىٰ﴾ مووسا ووتی (پێیان) ﴿أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ﴾ ئایا
ئێوە بەم هەق و ڕاستیە دەڵێن (جادووە) ﴿لَمَّا جَاءَكُمْ﴾ کاتێك بۆتان هاتووە ﴿أَسِحْرٌ هَٰذَا﴾ ئایا ئەوە جادووە
﴿وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُونَ﴾ کە جادووبازان ڕزگاریان نابێت (٧٧) ﴿قَالُوا أَجِئْتَنَا﴾ ووتیان ئایا هاتووی بۆلامان
﴿لِتَلْفِتَنَا﴾ بۆ ئەوەی لامان دەی ﴿عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا﴾ لەوەی باوو باپیرانمان لەسەری بوون ﴿وَتَكُونَ
لَكُمَا﴾ تا بۆ هەر دووکتان (مووسا و هاروون) بێت ﴿الْكِبْرِيَاءُ﴾ گەورەیی (وسەرۆکایەتی بەنو ئیسرائیل)
﴿فِي الْأَرْضِ﴾ لەزەویدا ﴿وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ﴾ وە ئێمە هەگیز باوەڕتان پێ ناکەین (٧٨)

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ﴾ فیرعەون ووتی (بەکۆمەڵەکەی) ﴿ائْتُونِي بِكُلِّ﴾ بۆم بێنن و (کۆی بکەنەوە) هەموو
﴿سَاحِرٍ عَلِيمٍ﴾ جادوو گەرێکی زۆر زانا و لێزان ﴿٧٩﴾ ﴿فَلَمَّا جَاءَ السَّحَرَةُ﴾ جا کاتێك جادوو گەرەکان
هاتن ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ﴾ مووسا پێی ووتن: ﴿أَلْقُوا مَا أَنتُم مُّلْقُونَ﴾ ئەوەی دەتانەوێ بیهاوێژن
(فڕێی دەن) ﴿٨٠﴾ ﴿فَلَمَّا أَلْقَوْا﴾ ئەمجا کاتێك (جا دووەکانیان) فڕێ دا ﴿قَالَ مُوسَىٰ﴾ مووسا ووتی
﴿مَا جِئْتُم بِهِ السِّحْرُ﴾ هەرچی ئێوە هێناوتانە جادووە ﴿إِنَّ اللَّهَ سَيُبْطِلُهُ﴾ بێگومان خوا بەزوویی
پوچەڵی دەکاتەوە ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُصْلِحُ﴾ چونکە بەڕاستی خوا چاکی ناکات ﴿عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ﴾
کردەوەی خراپەکاران ﴿٨١﴾ ﴿وَيُحِقُّ اللَّهُ الْحَقَّ﴾ خوا حەق و ڕاستی سەردەخات (دەیچەسپێنێت)
﴿بِكَلِمَاتِهِ﴾ بەفەرمان و بەڵێنەکانی ﴿وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ﴾ با تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێت
﴿٨٢﴾ ﴿فَمَا آمَنَ﴾ جا (لەسەرەتاوە) بڕوای نەهێنا ﴿لِمُوسَىٰ﴾ بەمووسا ﴿إِلَّا ذُرِّيَّةٌ﴾ چەند کەسێك
نەبێت ﴿مِّن قَوْمِهِ﴾ لە گەلەکەی ﴿عَلَىٰ خَوْفٍ﴾ بەهۆی ترس و بیمیان ﴿مِّن فِرْعَوْنَ﴾ لە فیرعەون
﴿وَمَلَئِهِمْ﴾ و کاربەدەست و گەورەکانیان ﴿أَن يَفْتِنَهُمْ﴾ نەوەك بیانگێڕێتەوە بۆ بێ دینی ﴿وَإِنَّ فِرْعَوْنَ﴾
بەڕاستی فیرعەون ﴿لَعَالٍ فِي الْأَرْضِ﴾ خۆبە زل زان و زاڵ بوو لە زەوی (میسر)دا ﴿وَإِنَّهُ لَمِنَ الْمُسْرِفِينَ﴾
وە بەڕاستی لە سنوور بەزێنان بوو ﴿٨٣﴾ ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ﴾ وە مووسا ووتی ﴿يَا قَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿إِن
كُنتُمْ﴾ گەر ئێوە ﴿آمَنتُم بِاللَّهِ﴾ بڕواتان بەخوا هێناوە ﴿فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا﴾ ئەوە تەنها پشت بەخوا ببەستن
﴿إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ﴾ ئەگەر ئێوە فەرمانبەر و مل کەچن ﴿٨٤﴾ ﴿فَقَالُوا﴾ ئەوانیش (باوەڕدارەکان) ووتیان
﴿عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا﴾ تەنها پشتمان بەخوا بەستووە ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً﴾ ئەی پەروەردگارمان مەمانگێڕە بە
جێگەی ئەشکەنجە وئازار ﴿لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ بۆ گەلی ستەمکاران ﴿٨٥﴾ ﴿وَنَجِّنَا﴾ وە ڕزگارمان بکە
﴿بِرَحْمَتِكَ﴾ بەبەزەیی خۆت ﴿مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ لەدەست کۆمەڵی بێ بڕوایان ﴿٨٦﴾ ﴿وَأَوْحَيْنَا﴾
وەنیگامان کرد ﴿إِلَىٰ مُوسَىٰ﴾ بۆ مووسا ﴿وَأَخِيهِ﴾ و براکەی (هاروون) ﴿أَن تَبَوَّآ﴾ کە پێکی بێنن و ئامادەی
بکەن ﴿لِقَوْمِكُمَا﴾ بۆ گەلەکەتان ﴿بِمِصْرَ بُيُوتًا﴾ چەند خانوویەك لەمیسردا (کەتێیدا بحەوێنەوە)
﴿وَاجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً﴾ وە خانووەکانتان بکەن بە قیبلە (واتە بیکەن بەجێگای پەرستنی خودا) ﴿وَأَقِيمُوا
الصَّلَاةَ﴾ و بەڕێکو پێکی نوێژ بەجێ بێنن ﴿وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ مژدەش بدە بەبڕواداران (بەبەهەشت
و سەرکەوتن) ﴿٨٧﴾ ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ﴾ و مووسا ووتی ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ﴾ ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ
﴿آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُ﴾ بەخشیووتە بەفیرعەون و کۆمەڵەکەی ﴿زِينَةً وَأَمْوَالًا﴾ هۆکاری ڕازانەوە و
جوانی و ماڵ و سامانی زۆر ﴿فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ لەژیانی دونیادا ﴿رَبَّنَا لِيُضِلُّوا﴾ ئەی پەروەردگارمان
بۆ ئەوەی خەڵك گومڕا بکەن ﴿عَن سَبِيلِكَ﴾ لەڕێگای تۆ ﴿رَبَّنَا اطْمِسْ﴾ ئەی پەروەردگارمان لە
ناوی بەرە و مەیهێڵە ﴿عَلَىٰ أَمْوَالِهِمْ﴾ ماڵ و سامانیان ﴿وَاشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ دڵەکانیان ڕەق وڕەش بکە
﴿فَلَا يُؤْمِنُوا﴾ چونکە بڕوا ناهێنن ﴿حَتَّىٰ يَرَوُا﴾ هەتا نەبینن (بەچاوی خۆیان) ﴿الْعَذَابَ الْأَلِيمَ﴾ سزای
سەختی ئازاردەر ﴿٨٨﴾

﴿قَالَ قَدْ﴾ (خوای گـەورە) فەرمووی بیگومـان ﴿أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا﴾ داوای هەردووکـتان وەرگیرا
﴿فَٱسْتَقِيمَا﴾ جـا خـۆ ڕاگر و بەردەوام بن (لەسـەر ئایینی خوا) ﴿وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ﴾ وە مەکەونە شـوێن
ڕێگای ﴿ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئەوانەی کەنازانن ﴿٨٩﴾ ﴿وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ﴾ ئەمجا نەوەی ئیسرائیلمان
لـە دەریاکـە (دەریای سـوور) پەڕانـدووە ﴿فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ﴾ ئەمجا فیرعەون و لەشکرەکەی
شـوێنیان کەوتـن ﴿بَغْيًا وَعَدْوًا﴾ بـە ستەم و دەسـت درێـژی کـردن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ﴾ هەتـا ئـەو کاتـەی
﴿أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ﴾ خەریـك بوو (فیرعەون) بخنکێ ﴿قَالَ ءَامَنتُ﴾ ئەوسـا ووتی بـڕوام هێنا ﴿أَنَّهُۥ لَآ
إِلَٰهَ﴾ کە هیچ پەرسـتراوێکی ڕاسـت نی یە ﴿إِلَّا ٱلَّذِىٓ﴾ جگە لەئەو (خوایە) نەبێت ﴿ءَامَنَتْ بِهِۦ﴾ کە
بڕوایـان پـێ هێناوە ﴿بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ نەوەی ئیسـرائیل ﴿وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ وە منیش لە موسـڵمانانم ﴿٩٠﴾
﴿ءَآلْـَٰٔنَ﴾ ئێستا (باوەڕ دێنێت؟) ﴿وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ﴾ کە بێگومان لەوەو پێش سەرپێچیت کرد ﴿وَكُنتَ
مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ وەتـۆ لەخراپـەکاران و تێکدەران بوویت ﴿٩١﴾ ﴿فَٱلْيَوْمَ﴾ بـەڵام ئەمڕۆ ﴿نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ﴾
لاشـەکەت (لـە دەریا) ڕزگـار دەکەین ﴿لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً﴾ بۆ ئـەوەی ببی بەپەنـد بۆ ئەوەی
لـەدوای تـۆ دێـت ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ وە بـەڕاسـتی زۆرێـك لـەخەڵکـی ﴿عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ﴾
بێ ئاگان لە بەڵگە و نیشـانەکانی ئێمە ﴿٩٢﴾ ﴿وَلَقَدْ بَوَّأْنَا﴾ سـوێند بەخوا بێگومان نیشـتە جێمان کردن
﴿بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ نەوەی ئیسرائیل ﴿مُبَوَّأَ صِدْقٍ﴾ لەشوێنێکی چاك و شایستەدا ﴿وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾
و ڕۆزی چاك و پاکمان پێ دان ﴿فَمَا ٱخْتَلَفُوا۟﴾ جا ڕاجیاو دووبەرەك نەبوون ﴿حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ﴾ هەتا
زانین و شـارەزایی (تەورات) یان بۆ هات ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ بەڕاسـتی پەروەردگارت ﴿يَقْضِى بَيْنَهُمْ﴾ بڕیار
دەدات لەنێوانیاندا ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لـەڕۆژی دوایدا ﴿فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ لەوەی ئەوان تێیدا ڕاجیا بوون
﴿٩٣﴾ ﴿فَإِن كُنتَ﴾ جائەگـەر تۆ ﴿فِى شَكٍّ﴾ لە گوماندای ﴿مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ﴾ لـەوەی کە ناردومانەتە خوارەوە
بـۆت ﴿فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوە پرسـیار لەوانـە بکە ﴿يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ کە کتێبی ئاسـمانی شـارەزان
و دەیخوێننەوە ﴿مِن قَبْلِكَ﴾ لەپێش تۆ ﴿لَقَدْ جَآءَكَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی بۆت هاتووە ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾
هـەق و ڕاسـتی لەپەروەردگارتـەوە ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ کەواتـە لەدەسـتەی گومانـداران مەبە ﴿٩٤﴾
﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ﴾ و لەوانـەش مەبـە ﴿كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کـە نیشـانەکانی خوایـان بـە درۆزانـی
(و باوەڕیان پێ نەهێنان) ﴿فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ (ئەگەر وابکەیت) ئەوە دەچیتە ڕیزی زەرەرمەندانەوە ﴿٩٥﴾
﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـەی ﴿حَقَّتْ عَلَيْهِمْ﴾ دەرچووە و چەسـپاوە بۆیان ﴿كَلِمَتُ رَبِّكَ﴾ بڕیاری
پەروەردگـارت ﴿لَا يُؤْمِنُونَ﴾ بـڕوا ناهێنـن ﴿٩٦﴾ ﴿وَلَوْ جَآءَتْهُمْ﴾ (بـڕوا ناهێنـن) هەرچەند بۆیـان بێت
﴿كُلُّ ءَايَةٍ﴾ هەمـوو بەڵگـەو نیشـانەیەك ﴿حَتَّىٰ يَرَوُا۟﴾ هەتـا نەبینـن (بە چـاوی خۆیان) ﴿ٱلْعَذَابَ
ٱلْأَلِيمَ﴾ سزای سەختی ئازاردەر ﴿٩٧﴾

﴿فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ﴾ (خەڵكی) هیچ شار و گوندێك (لەوانەی كە هەڕەشەیان لێكرا) وباوەڕیان هێنا (كاتی بینین و دابەزینی سزا ی پەروەردگار) ﴿فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ﴾ باوەڕەكەیان هیچ سوودی پێ نەگەیاندن ﴿إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ﴾ جگەلە گەلی یونس (علیه السلام) نەبێت ﴿لَمَّآ ءَامَنُواْ﴾ كاتێك هەموو بڕوایان هێنا وتەوبەیان كرد ( كە دڵ نیابوون سزای پەروەردگار دابەزیوە بۆ سەریان) ﴿كَشَفْنَا عَنْهُمْ﴾ لامان برد لەسەریان ﴿عَذَابَ ٱلْخِزْىِ﴾ سزای سەرشۆڕی و ڕیسوایی ﴿فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ لە ژیانی دونیادا ﴿وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾ و بەهرە و خۆشیمان پێدان تا ماوەیەك (تاكاتی مردنیان) ﴿٩٨﴾ ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ﴾ وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ﴿لَءَامَنَ﴾ بڕوای دەهێنا ﴿مَن فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەو (خەڵكەی) والەزەویدان ﴿كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾ هەموو بە تێكڕا ﴿أَفَأَنتَ﴾ دەی ئایا تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ﴾ زۆر لەخەڵكی دەكەیت ﴿حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ هەتا ببنە بڕوادار ﴿٩٩﴾ ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ﴾ وە بۆ هیچ كەسێك نی یە ﴿أَن تُؤْمِنَ﴾ كەبڕوا بێنێ ﴿إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ مەگەر بە ویستی خوا نەبێت ﴿وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ﴾ وە پیسی (وبێ باوەڕی) دەخاتە ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ﴾ سەر ئەوانەی ﴿لَا يَعْقِلُونَ﴾ كەتێ ناگەن و بیرناكەنەوە ﴿١٠٠﴾ ﴿قُلِ ٱنظُرُواْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: سەرنج بدەن ﴿مَاذَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ چی لەئاسمانەكان و زەویدایە ﴿وَمَا تُغْنِى ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ﴾ كەچی نیشانە و ترسێنەرەكان هیچ سوود ناگەیەنن ﴿عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ بەكەسانێك بڕوانەهێنن ﴿١٠١﴾ ﴿فَهَلْ يَنتَظِرُونَ﴾ دەی چاوەڕوانی چی دەكەن ﴿إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ﴾ بێجگە لە ڕووداوێك وەك ڕووداوەكانی ئەوانەی ﴿خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْ﴾ كە لە پێشیانەوە ڕابوردن ﴿قُلْ فَٱنتَظِرُوٓاْ﴾ بڵێ دەی چاوەڕوان بكەن ﴿إِنِّى مَعَكُم﴾ بەڕاستی منیش لەگەڵ ئێوەدا ﴿مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ﴾ لە چاوەڕوانانم ﴿١٠٢﴾ ﴿ثُمَّ نُنَجِّى﴾ پاشان ئێمە ڕزگاری دەكەین (لە كاتی ناڕەحەتیدا) ﴿رُسُلَنَا﴾ پێغەمبەرانمان (﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ و ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئابەو شێوە ﴿حَقًّا عَلَيْنَا﴾ پێویستە لەسەرمان ﴿نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئیمان داران ڕزگار بكەین ﴿١٠٣﴾ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ بڵێ ئەی خەڵكینە ﴿إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ﴾ ئەگەر ئێوە لەگوماندان ﴿مِّن دِينِى﴾ لە (ڕاستی) ئاینەكەم ﴿فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوە من ناپەرستم ئەوانەی ﴿تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ كە ئێوە دەی پەرستن بێجگە لەخوا ﴿وَلَٰكِنْ﴾ بەڵكو ﴿أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى﴾ ئەو خوایەدەپەرستم ﴿يَتَوَفَّىٰكُمْ﴾ كەئێوە دەمرێنێ ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ﴾ وە من فەرمانم پێ كراوە كە ﴿مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ لەبڕواداران بم ﴿١٠٤﴾ ﴿وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ﴾ وە ڕووت ڕێك و ڕاست بكە ﴿لِلدِّينِ حَنِيفًا﴾ بۆ ئایینێك كەڕاستە ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ وە بەهیچ جۆرێك لەهاوبەش دانەران مەبە ﴿١٠٥﴾ ﴿وَلَا تَدْعُ﴾ هاوارمەكە (مەپەرستە) ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بێجگە لەخوا ﴿مَا لَا يَنفَعُكَ﴾ شتێ نەسوودت پێ دەگەیەنێت ﴿وَلَا يَضُرُّكَ﴾ و نەزیانت لێ دەدات ﴿فَإِن فَعَلْتَ﴾ جا ئەگەر وات كرد ﴿فَإِنَّكَ إِذًا﴾ ئەوە بێگومان ئەوكاتە تۆ ﴿مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ لەستەمكارانی ﴿١٠٦﴾

﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ﴾ وە ئەگـەر خـوا بە تۆ بگەیەنێـت ﴿بِضُرٍّ﴾ زیانێك ﴿فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ﴾ هیچ لادەرێـك نی یە بۆ ئەو
(زیانـە) ﴿إِلَّا هُوَ﴾ بێجگـە لە خوا ﴿وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ﴾ وە ئەگەر خێر و خۆشـیەکی بوێـت بۆت ﴿فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ﴾ ئەوە
هیـچ بەرگـری کەرێـك نیە بـۆ چاکەی خـوا ﴿يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ بەهرەمەنـدی دەکات ئەو کەسـەی خـۆی بیەوێت
﴿مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ لـە بەندەکانـی ﴿وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ وە هـەر ئـەو لـێ بـوردەی بەبەزەییـە ﴿١٠٧﴾ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ (ئـەی
موحەممـەد ﷺ) بڵـێ ئـەی خەڵکینـە ﴿قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ﴾ بەڕاسـتی (قورئانـی) حەقتـان بـۆ هاتـووە ﴿مِن رَّبِّكُمْ﴾
لەلایـەن پەروەردگارتانـەوە ﴿فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ﴾ جـا هـەر کەسـێك ڕێنموونـی وەرگرتبێـت ﴿فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ﴾ ئەوە
بێگومـان (قازانجـی) ڕێنموونیەکـەی بـۆ خۆیەتـی ﴿وَمَن ضَلَّ﴾ هـەر کەسـیش گومـڕا بووبێـت ﴿فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾
ئـەوە بێگومـان (زیانـی) گومڕابوونەکەی بـۆ خۆیەتی ﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم﴾ وە مـن لە ئێوە ﴿بِوَكِيلٍ﴾ بەر پرسـیارنیم ﴿١٠٨﴾
﴿وَٱتَّبِعْ﴾ شـوێن ئەوە بکەوە ﴿مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ﴾ کە سـرووش وەحی کراوە بۆت ﴿وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ﴾ وە بە ئارام و خۆگر بە هەتا
﴿يَحْكُمَ ٱللَّهُ﴾ خـوا بڕیاری دەدات (لە نێوانی تۆ و ئەوانـدا) ﴿وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾ وە ئەو (خوایە) چاکتربنی هەموو
دادوەر و بڕیاردەرانە ﴿١٠٩﴾

## سورەتی ﴿هُودٍ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓر﴾ بە(ئەلیف، لام، ڕا) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بەماناکەی، بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة)
بکـە ﴿كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ﴾ ئەمە کتێبێکـە بتەو داڕێـژراوە ﴿ءَايَٰتُهُۥ﴾ ئایەتەکانی ﴿ثُمَّ فُصِّلَتْ﴾ پاشـان ڕوون کراونەتەوە﴿مِن
لَّدُنْ﴾ لەلایەن ﴿حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾ (خوای) کاردروسـتی زاناوە ﴿١﴾ ﴿أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ﴾ بۆ ئەوەی هیچ شـتێك نەپەرسـتن ﴿إِلَّا ٱللَّهَ﴾
بێجگـە لەخـوا﴿إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ﴾ بەڕاسـتی مـن لەلایـەن ئەو (خـوا)وە بۆ ئێـوە ﴿نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ﴾ ترسـێنەر و مـوژدەدەرم ﴿٢﴾
﴿وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی داوای لێبوردن بکەن لەپەروەردگارتان﴿ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ﴾ پاشان تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە
بۆلای﴿يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا﴾دەتـان ژێنـێ بەژیانێکی چاك و خۆش﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ تاماوەی دیاری کـراو (بۆتان) ﴿وَيُؤْتِ
كُلَّ﴾ وە دەبەخشێت بەهەموو ﴿ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ﴾ خاوەن چاکە و بەهرەیەك (پاداشتی) چاکە و بەهرەی خۆی ﴿وَإِن تَوَلَّوْاْ﴾
وە ئەگەر ڕوو وەرگێڕن و سـەرپێچی بکەن﴿فَإِنِّىٓ أَخَافُ﴾ ئەوە بەڕاسـتی من مەترسـی دەکـەم ﴿عَلَيْكُمْ﴾ یەخەتان بگرێ
﴿عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ﴾ سـزای ڕۆژێکی گەورە(کە ڕۆژی دوایيە) ﴿٣﴾ ﴿إِلَى ٱللَّهِ﴾ هەر بۆلای خوایە ﴿مَرْجِعُكُمْ﴾ گەڕانەوەتان
﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ وە ئەو (خوایە) دەسـەڵات دارە بەسەر هەموو شتێکدا ﴿٤﴾ ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ﴾ ئاگادار بن بێگومان ئەوان
﴿يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ﴾ سـنگیان دەپێچنەوە (لەسـەر کینە و دژایەتی) ﴿لِيَسْتَخْفُواْ مِنْهُ﴾ بۆ ئەوەی خۆیان بشـارنەوە لە خوا
﴿أَلَا حِينَ﴾ بێداربن کاتێك﴿يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ﴾ ئەوانە خۆیان دادەپۆشن بەپۆشاکەکانیان(بۆ ئەوەی پیلانەکانیان دەرنەکەون)
﴿يَعْلَمُ﴾ (خوا) دەزانێت ﴿مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ بەوەی دەیشارنەوەو ئەوەی ئاشکرای دەکەن ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ﴾ بێگومان
ئەو (خوایە) بە ئاگا و زانایە ﴿بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەو ( نهێنیانەی) لە سینە و دڵەکاندایە ﴿٥﴾

﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ﴾ هیـچ گیان لەبەرێك نی یە ﴿فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لەزەوی دا ﴿إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ﴾ ئیلا لەسـەر خوایە ﴿رِزۡقُهَا﴾ ڕزق و ڕۆزیەکەی ﴿وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا﴾ وە(خوا) دەزانێ شـوێنی مانەوەی ﴿وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ﴾ وە شـوێنی لـێ دەرچوونـی ﴿كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾ هەمووی نوسـراوە لەکتێبـی ڕوون کەرەوە(لوح المحفـوظ)دا ﴿٦﴾ ﴿وَهُوَ﴾ ئـەو (خوایـە) زاتێکـە ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ کـە ئاسـمانەکان وزەوی دروسـت کـردوە ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾ لـە شـەش ڕۆژدا ﴿وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ﴾ و عەرشـەکەی لەسـەر ئـاو بـوو ﴿لِيَبۡلُوَكُمۡ﴾ بۆ ئـەوەی تاقیتـان بکاتـەوە ﴿أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ﴾ کامتان کـردەوەی چاکتر (دەکەن) ﴿وَلَئِن قُلۡتَ﴾ سـوێندبێ ئەگەر بڵێیت (بەوانە) ﴿إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ﴾ بەڕاستی ئێوە زیندوو دەکرێنـەوە ﴿مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ﴾ لەپاش مردن ﴿لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ بێگومان ئەوانەی کە بێ بڕوان دەڵێن ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾ ئەمە هیچ نی یە بێجگە لە جادوویەکی ڕوون و دیارنەبێت ﴿٧﴾ ﴿وَلَئِنۡ أَخَّرۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ﴾ وە سـوێند بەخـوا ئەگـەر ئـەو سـزایان دوا بخەیـن ﴿إِلَىٰٓ أُمَّةٖ مَّعۡدُودَةٖ﴾ تاماوەیەکـی کەمی دیـاری کـراو ﴿لَّيَقُولُنَّ مَا يَحۡبِسُهُۥٓۗ﴾ ئـەوە بەڕاسـتی دەڵێـن چی ئـەو سـزای ڕاگرتووە (بۆچـی بۆمان نایەت) ﴿أَلَا يَوۡمَ يَأۡتِيهِمۡ﴾ بێدار بن ڕۆژێ ئەو سـزایەیان بۆ دێت ﴿لَيۡسَ مَصۡرُوفًا عَنۡهُمۡ﴾ لێیان لا نادرێ ﴿وَحَاقَ بِهِم﴾ وە دەوریـان دەدات ﴿مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ ئەوەی کە ئەوانـە گاڵتەو لاقرتییان پێ دەکـرد ﴿٨﴾ ﴿وَلَئِنۡ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ﴾ سـوێند بەخـوا ئەگـەر ئێمـە بچێژین بە ئادەمـی ﴿مِنَّا رَحۡمَةٗ﴾ چاکە و فـەزڵ و بەهرەیـەك لای خۆمانەوە ﴿ثُمَّ نَزَعۡنَٰهَا مِنۡهُ﴾ پاشـان ئـەو (چاکەو بەهرەیەی) لـێ بگرینەوە ﴿إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٞ كَفُورٞ﴾ بێگومـان ئـەو زۆر نائومێـد و سـپڵەیە (لـەو کاتـەدا کوفـری نیعمتەکانی خوا دەکات) ﴿٩﴾ ﴿وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ﴾ سـوێند بەخـوا ئەگەر پێی بچێژیـن بیدەینێ ﴿نَعۡمَآءَ بَعۡدَ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ﴾ بەهرەو چاکە دوای ئەو سـەختی و ناڕەحتیانەی تووشـی بووە ﴿لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّيٓۚ﴾ بێگومان دەڵێت گشـت سـەختی و زیانەکانم لە مل بوویەوە (بەرۆکی بەردام) ﴿إِنَّهُۥ لَفَرِحٞ فَخُورٌ﴾ بێگومان (لەوکاتـەدا) زۆر دڵخـۆش و لـوت بـەرزو خـۆ بـەزل زانـە ﴿١٠﴾ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ﴾ جگـە لەوانـەی کە بائارام و خۆگر بوون ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ و کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێنا ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم﴾ ئەوانە بۆیـان هەیـە ﴿مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ﴾ لێبوردن و پاداشـتی گەورە ﴿١١﴾ ﴿فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ﴾ ئایا تـۆ وازهێنەری ﴿بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ﴾ لـە (ڕاگەیاندنـی) هەندێـك لەوەی نیگا ت بۆ کـراوە ﴿وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ﴾ و دڵ تەنـگ دەبـی پێی ﴿أَن يَقُولُواْ﴾ لەبەر ئەوەی کەدەڵێـن ﴿لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ﴾ بۆچی گەنج و خەزێنەی بۆ نانێردرێتـە خـوارەوە﴿أَوۡ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ﴾ یان بۆچی فریشـتەیەکی لە گەڵـدا نەهاتووە﴿إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٞۚ﴾ بێگومـان تـۆ تەنها ترسـێنەری ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٌ﴾ و خـوا بۆ هەموو شـتێك سەرپەرشـتیکارو چاودێرە ﴿١٢﴾

﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ﴾ یـان ئەوانە دەڵێن پێغەمبەر ﷺ ئەو (قورئانە)ی هەڵبەستووە ﴿قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ
مِّثۡلِهِۦ﴾ بڵـێ دەی ئێوەش دە سـورەتی وەکو ئەو(قورئانە) بێنن ﴿مُفۡتَرَيَٰتٖ﴾ هەڵبەستراوبن ﴿وَٱدۡعُواْ مَنِ
ٱسۡتَطَعۡتُم﴾ وەبانـگ بکـەن (بـۆ پشـتیوانیتان) هەرکـەس دەتوانـن ﴿مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بێجگـە لەخـوا
﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن (١٣) ﴿فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ﴾ جا ئەگەر وەڵامیان نەدانەوە
﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ﴾ ئـەوە بزانن کەبێگومان ئەم (قورئانە) نێردراوەتە خوارەوە﴿بِعِلۡمِ ٱللَّهِ﴾ بەئاگاداری
وزانینـی خـوا ﴿وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ﴾ هەروەهـا بزانـن هیچ پەرسـتراوێکی ڕاسـت نـی یە بێجگـە لەئەو
﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ دەی ئایـا ئێـوە مـل کەچ و موسـڵمانن؟ (١٤) ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ﴾ هەرکـەس دەیەوێت
﴿ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا﴾ ژیانی دونیا و ڕازاوە و جوانی ئەو﴿نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا﴾ ئێمە (بەرهەمی)
کردەوەکانیـان بەتەواوی پێ دەدەین تیایـدا﴿وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ﴾ وە ئەوان لەم ژیانەدا کەم و کوڕی
یان لەگەڵ ناکرێت (١٥) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ﴾ ئەوانە کەسانێکن بۆیان نی یە ﴿فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ﴾
لـەڕۆژی دواییـدا جگە لەئاگر ﴿وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا﴾ وە ئـەوەی کردیان تێیدا پوچ و بـێ بەرهەم بووە
﴿وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ وە هەرچیان کرد بەردەوام بوو بەهیچ (١٦) ﴿أَفَمَن كَانَ﴾ جا ئایا کەسـێك ﴿عَلَىٰ
بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ بەڵگەیەکی ئاشکرای بێ لەلایەن پەروەردگاریەوە ﴿وَيَتۡلُوهُ شَاهِدٞ مِّنۡهُ﴾ و شایەتێك لای
ئەوەوە بۆی بخوێنێتەوە﴿وَمِن قَبۡلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ﴾ وە لەپێش ئەم (شایەتیەی خۆیەوە) پەڕاوی مووساش
(شایەتە بۆی) ﴿إِمَامٗا وَرَحۡمَةًۚ﴾ کەپەیڕەو پێشەواو میهرەبانیە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۚ﴾ ئەوانە بڕوایان هەیە
بەو (شـایەتە کەقورئانە) ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ﴾ وە هەرکەس باوەڕی پێی نەبێت ﴿مِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ﴾ لەو کۆمەڵ
و تاقمانـە (ئەوانەی کۆبونەوە لەسـەر دژایەتی ئیسـلام) ﴿فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥۚ﴾ ئەوە ئاگـر جێگایەتی ﴿فَلَا
تَكُ فِي مِرۡيَةٖ مِّنۡهُۚ﴾ کەواتـە هیـچ جۆرە گومـان و دوو دڵیەکت نەبێـت لەو(قورئانە) ﴿إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾
بەڕاسـتی ئەو قورئانە ڕاسـتە لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتـووە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بەڵام
زۆرێـك لەخەڵکـی بڕواناهێنـن (١٧) ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ﴾ وەئایا کێ سـتەمکارترە لەو کەسـەی ﴿ٱفۡتَرَىٰ
عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًاۚ﴾ کەدرۆ هەڵبەسـتێ بەدەم خـواوە؟ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُعۡرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمۡ﴾ ئەوانە دەبرێنە حوزوری
پەروەردگاریـان (ووتەکانیـان دەخرێتـە ڕوو) ﴿وَيَقُولُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ﴾ وە شـایەتەکان (لەپێغەمبـەران
وفریشـتەکان) دەڵێن ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ﴾ ئا ئەوانـە ئەو کەسـانەن ﴿كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ﴾ (لەدونیادا) درۆیان
هەڵدەبەسـت بـەدەم پەروەردگاریانـەوە ﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ﴾ بێداربـن نەفرینی خـوا ﴿عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بۆ
سـتەمکارانە (١٨) ﴿ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانـەی بەرهەڵسـتی ڕێگـەی خـوا دەکـەن ﴿وَيَبۡغُونَهَا
عِوَجٗا﴾ و دەیانـەوێ بـەلارو چەوتـی نیشـاندەن ﴿وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾ لەکاتێکـدا ئـەوان بـەڕۆژی دوایی
﴿هُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ بێ بڕوان (١٩)

﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ﴾ ئەو (نەفرین لێ کراو)انە ناتوانن (لەدەستی خوا) خۆیان قوتار بکەن
﴿فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لەولات و زەویدا ﴿وَمَا كَانَ لَهُم﴾ و نییانە ﴿مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ﴾ بێجگە لەخوا هیچ
پشتیوان و دۆستێك ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمُ﴾ بۆیان دووقات دەکرێتەوە ﴿ٱلۡعَذَابُۚ﴾ سزا ﴿مَا كَانُواْ يَسۡتَطِيعُونَ
ٱلسَّمۡعَ﴾ توانای بیستنی (ئەو قورئانە)یان نەبوو ﴿وَمَا كَانُواْ يُبۡصِرُونَ﴾ (هەقیشیان)نەدەبینی ﴿٢٠﴾
﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە کەسانێکن ﴿خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ کەخۆیان دۆڕاند ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم﴾ وە لێیان
ون بوو ﴿مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ ئەو درۆو دەلەسانەی لەدونیادا دەیان کرد ﴿٢١﴾ ﴿لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ﴾ بەڕاستی
و بێگومان ئەوانە ﴿فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا ﴿هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ﴾ زەرەرمەند ترین کەس خۆیانن
﴿٢٢﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ و کردەوە چاکەکانیان
بەجێ هێناوە ﴿وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ﴾ و گەردن کەچ و دڵ ئارام بوون بۆ (فەرمانەکانی) پەروەردگاریان
﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ﴾ ئەوانە هاوەڵانی بەهەشتن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ تێیدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿٢٣﴾
﴿مَثَلُ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ﴾ وێنەی ئەو دوو دەستەیە ﴿كَٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡأَصَمِّ وَٱلۡبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ﴾ وەك کوێر و کەڕ و بیسەر
و بیناوان ﴿هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ﴾ ئایا ئەودوو دەستەیە یەکسانن ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دە بۆ بیرناکەنەوە ﴿٢٤﴾
﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا﴾ سوێند بە خوا بێگومان ناردمان ﴿نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ﴾ نووح بۆ لای گەلەکەی ﴿إِنِّي
لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ﴾ (پێی ووتن) دڵنیابن من ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆتان ﴿٢٥﴾ ﴿أَن لَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ﴾ کەجگە
لەخوا نەپەرستن ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ﴾ (چونکە) بەڕاستی من دەترسم یەختان بگرێ ﴿عَذَابَ يَوۡمٍ
أَلِيمٖ﴾ سزای ڕۆژێکی سەخت و بەئازار ﴿٢٦﴾ ﴿فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ﴾ جا کاربەدەست ودەسەڵاتدارەکان
ووتیان ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی کەبڕوایان نەهێنا بوو ﴿مِن قَوۡمِهِۦ﴾ لە گەلەکەی (نووح) ﴿مَا نَرَىٰكَ﴾
ئێمە تۆ نابینین ﴿إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا﴾ جگە لەئادەمی یەکی وەك خۆمان ﴿وَمَا نَرَىٰكَ﴾ وە نابینین تۆ ﴿ٱتَّبَعَكَ﴾
هیچ کەسێك شوێنت کەوتبێت ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ﴾ جگە لەوانەی ﴿هُمۡ أَرَاذِلُنَا﴾ کە هەژار و پەستەکانمانن
﴿بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ﴾ بێ ئاوەزا و ساویلکەن (ڕواڵەت بینن) ﴿وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ﴾ وە نابینن ئێوە ﴿عَلَيۡنَا مِن
فَضۡلِۭ﴾ هیچ شتێکتان لە ئێمە زیادبێ ﴿بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ﴾ بەڵکو بەدرۆزنتان دەزانین ﴿٢٧﴾ ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ﴾
(نووح) ووتی ئەی گەلەکەم ﴿أَرَءَيۡتُمۡ﴾ هەواڵم بدەنێ ﴿إِن كُنتُ﴾ ئەگەر من ﴿عَلَىٰ بَيِّنَةٖ﴾ بەڵگەی
ئاشکرام هەبێت ﴿مِّن رَّبِّي﴾ لەلای پەروەردگارمەوە ﴿وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ﴾ و ڕەحمەتێکی پێ بەخشیبێم
﴿مِّنۡ عِندِهِۦ﴾ لەلایەن خۆیەوە ﴿فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ﴾ بەڵام ئەوە لەئێوە شاردرابێتەوە ﴿أَنُلۡزِمُكُمُوهَا﴾ ئایا بەزۆر
پابەندتان بکەین پێیەوە ﴿وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ﴾ لە کاتێکدا ئێوە حەزی لێ ناکەن و پێتان ناخۆشە ﴿٢٨﴾

﴿وَيَٰقَوْمِ﴾ وە ئـەی گەلەکەم ﴿لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًا﴾ لەسـەر ئەم (گەیاندنـی پەیامە) داوای هیچ ماڵ و
سامانێکتان لێ ناکەم ﴿إِنْ أَجْرِىَ﴾ پاداشتی من ﴿إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ﴾ هەر لەسەر خوایە ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾
وە من ئەوانە دەرناکەم بڕوایان هێناوە ﴿إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ﴾ بەڕاسـتی ئەوانە بەدیداری پەروەردگاریان
دەگـەن (لەڕۆژی دواییدا) ﴿وَلَٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ﴾ بەڵام من ئێوە دەبینـم ﴿قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾ کە کۆمەڵێکی نەزانن
۝٢٩ ﴿وَيَٰقَوْمِ مَن يَنصُرُنِى﴾ ئـەی گەلەکەم کـێ یارمەتیـم دەدات ﴿مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ﴾ لەبەرانبەر خوادا
ئەگەر ئەوانە بتارێنم(و دەریان بکەم) ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا بۆ بیرناکەنەوە؟ ۝٣٠ ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ﴾
من پێتان ناڵێم ﴿عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ﴾ خەزێنەکانی خوا لای منە ﴿وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ﴾ و ناشڵێم غەیب و شتە
نادیارەکان دەزانم ﴿وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ﴾ هەروەها ناڵێم من فریشتەم ﴿وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ﴾ بەوانەش ناڵێم
﴿تَزْدَرِىٓ أَعْيُنُكُمْ﴾ کە لەبەر چاوی ئێوە سـووك و بێ ڕێزن ﴿لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًا﴾ خوا هیچ چاکەیەکیان
ناداتـێ ﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ﴾ خـوا چـاك دەزانـێ ﴿بِمَا فِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ بـەوەی لەدەروونـی ئەواندایـە ﴿إِنِّىٓ إِذًا لَّمِنَ
ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاسـتی من ئەوکاتە ( ئەگەر ئەو هەژارانە دەربکەم) لەسـتەم کاران دەبم ۝٣١ ﴿قَالُواْ يَٰنُوحُ﴾
ووتیـان ئـەی نـووح ﴿قَدْ جَٰدَلْتَنَا﴾ بێگومـان دەمەقاڵێـت کـرد لەگەڵمانـدا ﴿فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا﴾ زۆریش
دەمەقاڵێـت کرد لەگەڵماندا ﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ﴾ دەی ئەوەی بەڵێنمان پێ دەدەیت (لەسـزا) بۆمان بهێنە
﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەگەر تۆ لەڕاست گۆیانیت ۝٣٢ ﴿قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ﴾ ووتی بێگومان
خـوا بۆتـان دەهێنێت ﴿إِن شَآءَ﴾ ئەگـەر بیەوێـت ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ وە ئێوە ناتوانن (لەسـزای خوا)
خۆتان قوتار بکەن ۝٣٣ ﴿وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ﴾ وە ئامۆژگاری من سوودتان پێ ناگەیەنێت ﴿إِنْ أَرَدتُّ﴾ گەر
بمەوێـت ﴿أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ﴾ ئامۆژگاریتان بکەم ﴿إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ﴾ ئەگەر خوا بیەوێت ﴿أَن يُغْوِيَكُمْ﴾
گومراتان بکات ﴿هُوَ رَبُّكُمْ﴾ ئەو پەروەردگارتانە ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ وە هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنەوە
۝٣٤ ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ﴾ یـا ئەوانـە دەڵێـن موحەممەد ﷺ ئـەم (قورئانەی) بەناوی خواوە هەڵبەستووە
﴿قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ﴾ بڵێ ئەگەر من هەڵم بەستبێت ﴿فَعَلَىَّ إِجْرَامِى﴾ ئەوە گوناهو تاوانەکەی تەنها لەسەر
خۆمە ﴿وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ﴾ وە منیش بەریم لەتاوانی ئێوە ۝٣٥ ﴿وَأُوحِىَ إِلَىٰ نُوحٍ﴾ وەحی کرا بۆ نووح
(علیـه السـلام) ﴿أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ﴾ کـەوا کەسـی تر بـڕوا ناهێنێـت ﴿مِن قَوْمِكَ﴾ لەگەلەکەت ﴿إِلَّا مَن قَدْ
ءَامَنَ﴾ بێجگـە لـەوەی پێشـتر بـڕوای هێنـاوە ﴿فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾ کەواتـە ناڕەحـەت
وغەمبـار مەبـە بـەوەی ئـەوان دەیکـەن ۝٣٦ ﴿وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ﴾ وە کەشـتیەکەش دروسـت بکـە
﴿بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا﴾ بـە پێـش چـاو و چاودێـری وفەرمـان و نیگـای ئێمە (لەم ئایەتەدا باسـی سـیفەتی
-چـاو، عیـن - هاتـووە بۆ خـوای گـەورە، بڕوامـان پێیەتی بەبـێ هیـچ لێچوانـدن ولێکدانەوەیەك
، شـێوەکەی نازانیـن وە تەنهـا خـوا خـۆی دەزانێـت) ﴿وَلَا تُخَٰطِبْنِى﴾ وە هیـچ قسـەم لەگەڵـدا مەکـە
﴿فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ﴾ لـە بارەی ئەوانەی سـتەمیان کردووە ( وبێ بـاوەڕ بوون) ﴿إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ﴾ چونکە
بێگومان ئەوانە دەخنکێنرێن ۝٣٧

﴿وَيَصۡنَعُ ٱلۡفُلۡكَ﴾ وە دەستی کرد بەدروست کردنی کەشتیەکە ﴿وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ﴾ هەر کاتێك تێ پەڕینایە
بەلایدا ﴿مَلَأٞ مِّن قَوۡمِهِۦ﴾ کۆمەڵێ لەگەلەکەی ﴿سَخِرُواْ مِنۡهُۚ﴾ گاڵتەیان پێ دەکرد ﴿قَالَ إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا﴾
(نووح) دەیووت ئەگەر ئێوە ئێستە گاڵتەو لاقرتی بەئێمە دەکەن ﴿فَإِنَّا نَسۡخَرُ مِنكُمۡ﴾ ئەوە بێگومان
ئێمەش لاقرتی بەئێوە دەکەین ﴿كَمَا تَسۡخَرُونَ﴾ هەر چۆن ئێوە لاقرتی بەئێمە دەکەن ﴿٣٨﴾
﴿فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ﴾ جا لەمەوپاش دەزانن ﴿مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ﴾ کێ سزای بۆ دێت ﴿يُخۡزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ
مُّقِيمٌ﴾ سەر شۆڕی دەکات (لەدونیاداو لەقیامەتیشدا) سزای هەمیشەیی بەسەردادێت ﴿٣٩﴾ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا﴾
(نووح) (کەشتیەکەی دروست کرد) هەتا کاتێك ﴿جَآءَ أَمۡرُنَا﴾ فەرمانی ئێمە هات (بۆ لەناوبردنیان)
﴿وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ﴾ و تەنورەکە ئاوی لێ هەڵ قولا ﴿قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا﴾ ووتمان (بەنووح) لەو (کەشتیە)دا
هەڵی بگرە ﴿مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ﴾ لەهەموو نێرو مێیەك دووان ﴿وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن﴾ ژن و منداڵەکانیشت
هەڵبگرە ئەوەیان نەبێت ﴿سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ﴾ بڕیاری خوای لەسەر دراوە (بەخنکاندن) ﴿وَمَنۡ ءَامَنَۚ﴾
هەر ئەوانەش (هەڵ بگرە کە) بڕوایان هێنا (لەگەلەکەت) ﴿وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ﴾ وە خەڵکێکی
کەم نەبێت بڕوایان نەهێنا لەگەڵی دا ﴿٤٠﴾ ﴿وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا﴾ (نووح) ووتی هەمووتان سواربن لەو
(کەشتیە)دا ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ﴾ بەناوی خواوە لەکاتی ڕۆیشتن و وەستانی دا ﴿إِنَّ رَبِّي﴾
بەڕاستی پەروەردگارم ﴿لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ زۆر لێ بوردەی میهرەبانە ﴿٤١﴾ ﴿وَهِيَ تَجۡرِي بِهِمۡ﴾ کەشتییەکە
دەیبردن ﴿فِي مَوۡجٖ كَٱلۡجِبَالِ﴾ بەناو شەپۆلی وەك کێوو شاخ دا ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبۡنَهُۥ﴾ نووحیش علیه
السلام کوڕەکەی بانگ کرد (کەناوی کەنعان بوو) ﴿وَكَانَ فِي مَعۡزِلٖ﴾ کە لەشوێنێکی کەناردا بوو
﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا﴾ (ووتی) ئەی کوڕی خۆشەویستم لەگەڵمان دا سواربە ﴿وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ و
لەگەڵ بێ بڕوایان مەبە ﴿٤٢﴾ ﴿قَالَ سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٖ﴾ (کوڕەکەی) ووتی پەنا بۆ شاخێك دەبەم ﴿يَعۡصِمُنِي مِنَ
ٱلۡمَآءِۚ﴾ کە بمپارێزێت لەم لافاوە ﴿قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلۡيَوۡمَ﴾ (نووح) ووتی ئەمڕۆ هیچ پارێزەرێك (پەنادەرێك)
نیە ﴿مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ﴾ لەفەرمانی خوا (کەخنکاندنە) ﴿إِلَّا مَن رَّحِمَۚ﴾ مەگەر کەسێك خوا ڕەحمی پێ بکات
(و باوەڕدار بێت) ﴿وَحَالَ بَيۡنَهُمَا ٱلۡمَوۡجُ﴾ لەوکاتەدا شەپۆلی لافاو کەوتە نێوانیان ﴿فَكَانَ مِنَ ٱلۡمُغۡرَقِينَ﴾
جا ئەو (کوڕە خنکاو) لەخنکاوان بوو ﴿٤٣﴾ ﴿وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ﴾ ئەوسا ووترا ئەی زەوی ﴿ٱبۡلَعِي مَآءَكِ﴾
ئاوەکەت هەڵمژە ﴿وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي﴾ و ئەی ئاسمان باران مەبارێنە ﴿وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ﴾ ئیتر لافاوەکە ڕۆچوو
بەناخی زەوی دا ﴿وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ﴾ کارەکە (خنکانیان) تەواو کرا ﴿وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ﴾ و (کەشتیەکە)
وەستا بەسەر (کێوی) جوودیەوە ﴿وَقِيلَ بُعۡدٗا﴾ ووترا دووری لەڕەحمی خوا ﴿لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بۆ گەلی
ستەمکاران ﴿٤٤﴾ ﴿وَنَادَىٰ نُوحٞ رَّبَّهُۥ﴾ نووح هاواری کردە پەروەردگاری ﴿فَقَالَ رَبِّ﴾ ووتی ئەی پەروەردگارم
﴿إِنَّ ٱبۡنِي﴾ بەڕاستی کوڕەکەم ﴿مِنۡ أَهۡلِي﴾ لە کەس و کاری منە ﴿وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ﴾ و بێگومان بەڵێنی
تۆش ڕاستە ﴿وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ﴾ وە تۆش دادوەرترینی هەموو فەرمان ڕەوایانی ﴿٤٥﴾

﴿قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ﴾ (خـوا) فەرمووی ئەی نووح بەڕاسـتی ئەو (کەنعان) ﴿لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ﴾ لەکەس و کاری
تۆ نی یە ﴿إِنَّهُۥ عَمَلٌ﴾ بێگومان ئەو (کوڕە) کردەوەی ﴿غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ﴾ خراپ و ناپەسـەند بوو ﴿فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ﴾
جـا کەواتە داوای شـتێکم لێ مەکـە ﴿مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ﴾ کەزانیاریت دەربـارەی نی یە ﴿إِنِّيٓ أَعِظُكَ﴾
بەڕاسـتی مـن ئامۆژگاریـت دەکـەم ﴿أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ تـا لەنەفامان نەبیـت ﴿٤٦﴾ ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ﴾
(نـووح) ووتـی پەروەردگـارم بەڕاسـتی من ﴿أَعُوذُ بِكَ﴾ پەنـات پێ دەگرم (لـەوەی) ﴿أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا﴾
داوای شـتێکت لـێ بکـەم ﴿لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ﴾ کەنایزانم ﴿وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ﴾ وە ئەگـەر نەبوریت لێم
وڕەحمم پێ نەکەی ﴿أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ لەزیان لێکەوتوان دەبم ﴿٤٧﴾ ﴿قِيلَ يَٰنُوحُ﴾ ووترا ئەی نووح
﴿ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا﴾ دابەزە(لەکەشـتیەکە) بەهێمنـی و بێـوەی لەلایـەن ئێمـەوە ﴿وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ﴾
وە بەپیت و فەڕی زۆر بەسـەرخۆتەوە ﴿وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ﴾ وەبەسەر گەلانێك کەپەیدا ئەبن لەوانەی
کـە لەگـەڵ تۆ دان (یا بەسـەر ئەو خەڵکانـەی لەگەڵ تۆدان) ﴿وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ﴾ چەنـد نەتەوەو گەل
دواتر دێن خۆشـی و نازو نیعمەتیان پێ دەدەین ﴿ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا﴾ پاشـان لەلایـەن ئێمەوە دووچاریان
دەبێـت ﴿عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ سـزای سـەختی ئـازاردەر ﴿٤٨﴾ ﴿تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ﴾ ئەمانـە(ی باسـکران)
لەهەواڵـە گرنگـە نادیارەکانـە ﴿نُوحِيهَآ إِلَيۡكَۖ﴾ بەنیگا بۆمـان ناردی ﴿مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ﴾
نەتـۆ و نەگەلەکـەت نەتـان دەزانیـن ﴿مِن قَبۡلِ هَٰذَاۖ﴾ لەپێـش ئـەم (نیگـای ئێمـە) ﴿فَٱصۡبِرۡۖ﴾ کەواتـە
خۆڕاگربـە ﴿إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ بەڕاسـتی سـەرئەنجام بۆ لەخوا ترسـانە ﴿٤٩﴾ ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ﴾
وە بۆلای (گەلی) عادهوودی برایانمان نارد ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ ووتی ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن
﴿مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۖ﴾ هیچ پەرسـتراوێکتان نی یـە جگە لە ئەو ﴿إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُفۡتَرُونَ﴾ ئێوە تەنها درۆ
هەڵئەبەسـتن ﴿٥٠﴾ ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئـەی گەلەکەم ﴿لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ﴾ لەسـەر ئەم (گەیاندنـی پەیامە) داوای
هیچ پاداشـتێکتان لێ ناکەم ﴿إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِي﴾ پاداشـتی من هەر لەسەر ئەو (خوا)یە ﴿فَطَرَنِيٓۚ﴾
کەدروسـتی کـردوم ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا ژیـر نابن ﴿٥١﴾ ﴿وَيَٰقَوۡمِ﴾ وە ئـەی گەلەکەم ﴿ٱسۡتَغۡفِرُواْ
رَبَّكُمۡ﴾ داوای لێبـوردن لەپەروەردگارتـان بکـەن ﴿ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ﴾ دواتـر بگەڕێنـەوە بـۆلای ئـەو
﴿يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم﴾ (ئەگەر وابکەن خوا) لەئاسمانەوە (باران) دەبارێنێت بەسەرتاندا ﴿مِّدۡرَارٗا﴾
بەلێزەمە ﴿وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً﴾ و هێزی تر زیاد دەکات ﴿إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ﴾ بۆ هێزەکەتان ﴿وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ﴾
وەڕوو وەرمەگێـڕن (لەبانگەوازەکەم) بەتـاوان باری ﴿٥٢﴾ ﴿قَالُواْ يَٰهُودُ﴾ ووتیان ئەی هوود ﴿مَا جِئۡتَنَا
بِبَيِّنَةٖ﴾ تـۆ هیـچ بەڵگەیەکـی ڕوونت بـۆ نەهێناویـن ﴿وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا﴾ بۆیـە ئێمەش واز
لەپەرسـتراوەکان (خواکان) مان ناهێنین ﴿عَن قَوۡلِكَ﴾ لەبەر قسـەی تۆ ﴿وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾ وە ئێمە
باوەڕت پێ ناکەین ﴿٥٣﴾

﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا﴾ ئێمە تەنها (ئەوە بەتۆ) دەڵێین ﴿ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا﴾ هەندێك لەپەرستراوەكانمان
تووشیان كردووی ﴿بِسُوٓءٖۗ﴾ بەشێتی ﴿قَالَ إِنِّيٓ﴾ ووتی بەڕاستی من ﴿أُشۡهِدُ ٱللَّهَ﴾ خوا دەكەم بەشایەت
﴿وَٱشۡهَدُوٓاْ﴾ و ئێوەش شایەت بن ﴿أَنِّي بَرِيٓءٞ﴾ كەبەڕاستی من بەریم و دوورم ﴿مِّمَّا تُشۡرِكُونَ﴾ لەوەی
كەئێوە دەیكەنە هاوبەش بۆخوا (٥٤) ﴿مِن دُونِهِۦۖ﴾ جگە لەخوا ﴿فَكِيدُونِي جَمِيعٗا﴾ جا هەمووتان پیلانم
لێ بگێڕن ﴿ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ﴾ لەپاشان مۆڵەتیشم مەدەن(و لێم مەوەستن) (٥٥) ﴿إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ﴾
بەڕاستی من پشتم بەخوا بەستووە ﴿رَبِّي وَرَبِّكُمۚ﴾ كەپەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە
﴿مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ﴾ هیچ گیان لەبەرێك نیە لەژێر ڕكێفی خوای گەورەدا نەبێت (بگری
پێشە سەریەتی) ﴿إِنَّ رَبِّي﴾ بەڕاستی پەروەردگارم ﴿عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ لەسەر ڕێگەیەكی ڕاستە
(٥٦) ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئەوسا ئەگەر ئێوە ڕوو وەرگێڕن ﴿فَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُم﴾ ئەوە بێگومان من پێم ڕاگەیاندون
﴿مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦٓ إِلَيۡكُمۡۚ﴾ ئەوەی بەمندا نێردراوە بۆتان ﴿وَيَسۡتَخۡلِفُ رَبِّي قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ﴾ وە پەروەردگارم
كۆمەڵێكی تر لەشوێنی ئێوە دادەنێ ﴿وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيۡـًٔاۚ﴾ ئێوەش هیچ زیانێك بەخوا ناگەیەنن
﴿إِنَّ رَبِّي﴾ بەڕاستی پەروەردگارم ﴿عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَفِيظٞ﴾ بەسەر هەموو شتێكدا چاودێرو پارێزەرە (٥٧)
﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا﴾ وە كاتێك فەرمانی ئێمە هات (بۆ لەناوبردنیان) ﴿نَجَّيۡنَا هُودٗا﴾ هوودمان ڕزگار
كرد ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾ ئەوانەش باوەڕیان هێنابوو لەگەڵی ﴿بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا﴾ بەمیهرەبانی خۆمان
﴿وَنَجَّيۡنَٰهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ﴾ وە ئەوانمان لەسزایەكی توندو بەهێز ڕزگار كرد (٥٨) ﴿وَتِلۡكَ عَادٞۖ﴾ ئەوەش
گەلی عاد بوو ﴿جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ باوەڕیان نەهێنا بە بەڵگەو موعجیزەكانی پەروەردگاریان
﴿وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ﴾ و سەرپێچی نێرراوەكانی خوایان كرد ﴿وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ﴾ و شوێن فەرمانی هەموو
﴿جَبَّارٍ عَنِيدٖ﴾ زۆردارێكی سەركەش كەوتن (٥٩) ﴿وَأُتۡبِعُواْ﴾ بەشوێنیاندا نێررا ﴿فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ﴾
نەفرین لەم دونیایەدا ﴿وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾ و لەڕۆژی دواییشدا ﴿أَلَآ إِنَّ عَادٗا﴾ بێدار بن بەڕاستی گەلی
عاد ﴿كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ﴾ بڕوایان بەپەروەردگاریان نەهێنا ﴿أَلَا بُعۡدٗا﴾ بێداربن دووری و لەناوچوون
﴿لِّعَادٖ قَوۡمِ هُودٖ﴾ بۆ عادی گەلی هوود (٦٠) ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ﴾ بۆ گەلی سەموودیش ناردمان ﴿أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ﴾
صالح پێغەمبەر علیه السلام ی برایان ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ﴾ ووتی ئەی گەلەكەم ﴿ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ خوا بپەرستن
﴿مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ﴾ هیچ پەرستراوێكتان نیە بێجگە لە ئەو ﴿هُوَ أَنشَأَكُم﴾ ئەو دروستی كردوون
﴿مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ لەزەویدا ﴿وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا﴾ و كردونی بەئاوەدان كەرەوە تێیدا ﴿فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ﴾ كەواتە
داوای لێبوردنی لێ بكەن ﴿ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ﴾ پاشان بگەڕێنەوە بۆلای ﴿إِنَّ رَبِّي﴾ بەڕاستی پەروەردگارم
﴿قَرِيبٞ مُّجِيبٞ﴾ زۆر نزیكی دوعا وەرگرە (٦١) ﴿قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ﴾ ووتیان ئەی صالح ﴿قَدۡ كُنتَ فِينَا﴾ بەڕاستی
تۆ لەناوماندا ﴿مَرۡجُوّٗا قَبۡلَ هَٰذَآۖ﴾ جێی ئومێد بووی پێش ئەمە ﴿أَتَنۡهَىٰنَآ أَن نَّعۡبُدَ﴾ ئایا بەرگریمان دەكەی
لەپەرستنی ﴿مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا﴾ ئەوەی كەباو و باپیرانمان پەرستوویانە ﴿وَإِنَّنَا لَفِي شَكّٖ﴾ و بەڕاستی ئێمە
لە گوماندایین ﴿مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ﴾ لەوەی تۆ بانگمان دەكەیت بۆلای و دوو دڵین (٦٢)

﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ﴾ صالـح ووتی ئـەی گەلەکەم ﴿أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ﴾ پێم بڵێـن ئەگەر من ﴿عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي﴾
بەڵگەیەکـی ئاشـکرام هەبـێ لەلایـەن پەروەردگارمـەوە ﴿وَءَاتَىٰنِي مِنۡهُ رَحۡمَةً﴾ وە لەلایـەن خۆیەوە
پێغەمبەرێتـی پـێ بەخشـیبم ﴿فَمَن يَنصُرُنِي﴾ جـا کـێ یارمەتیـم دەدات ﴿مِنَ ٱللَّهِ﴾ لەبەرامبـەر خـوادا
﴿إِنۡ عَصَيۡتُهُۥ﴾ ئەگـەر سـەرپێچی ئەو بکـەم ﴿فَمَا تَزِيدُونَنِي﴾ کەواتە ئێـوە هیچ بۆمن زیـاد ناکەن ﴿غَيۡرَ
تَخۡسِيرٖ﴾ زەرەرو زیـان نەبێـت ﴿٦٣﴾ ﴿وَيَٰقَوۡمِ﴾ ئـەی گەلەکـەم ﴿هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ﴾ ئەمـە ووشـترەکەی
خوایە ﴿لَكُمۡ ءَايَةٗ﴾ کەموعجیزەیەکی ڕوونە بۆ ئێوە (لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتیەکەم) ﴿فَذَرُوهَا﴾
جائێوەش وازی لێ بێنن ﴿تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِ﴾ بالەزەوی خوا بخوات (بلەوەڕێت) ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ﴾
بەخراپـە دەسـتی بـۆ مەبـەن ﴿فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ﴾ ئەگینا سـزایەکی بـە زوویـی تووشـتان دەبێت ﴿٦٤﴾
﴿فَعَقَرُوهَا﴾ کەچی ئەوان ووشترەکەیان سەربڕی ﴿فَقَالَ﴾ جا (صالح) ووتی ﴿تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ﴾
ڕابوێرن لەماڵی خۆتاندا ﴿ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖ﴾ سێ ڕۆژ ﴿ذَٰلِكَ وَعۡدٌ﴾ ئەوە بەڵێنێکە ﴿غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ﴾ درۆ نییە
﴿٦٥﴾ ﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا﴾ جا کاتێك فەرمانمان هات (بۆ لەناو بردنیان) ﴿نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا﴾ صالح مان ڕزگار کرد
﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾ ئەوانەش بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا ﴿بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا﴾ بەبەزەییەك لەلایەن خۆمانەوە
﴿وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍ﴾ لە سەرشـۆڕی و ڕیسـوایی ئـەو ڕۆژە (پەنامان دان) ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ﴾
بەڕاسـتی پەروەردگـارت هـەر خۆی بەتوانـاو بەدەسـەڵاتە ﴿٦٦﴾ ﴿وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ﴾ ئەوانەش
کەسـتەمیان کـرد شـریخەیەك گرتنـی ﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾ ئیتـر لەنـاو ماڵەکانیانـدا
کەوتـن بـەڕووداو جووڵەیان لێ بـڕا (مردن) ﴿٦٧﴾ ﴿كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ﴾ وەك ئـەوەی لەوێدا نەبووبن
﴿أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ﴾ بێدار بن بەڕاسـتی گەلی سـەموود ﴿كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ﴾ بێ بڕوابوون بەپەروەردگاریان
﴿أَلَا بُعۡدٗا لِّثَمُودَ﴾ بێداربـن دووری و لەناوچـوون بۆ گەلی سـەموود ﴿٦٨﴾ ﴿وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ﴾ سـوێند
بەخـوا بێگومـان نێرراوەکانمـان هاتـن ﴿إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ﴾ بـۆلای ئیبراهیـم بەمـژدەوە ﴿قَالُواْ سَلَٰمٗاۖ﴾
ووتیـان سـەلامی خـوات لێ بێـت ﴿قَالَ سَلَٰمٞۖ﴾ (ئەویش) ووتی سـەلامی خـوا لەئێوەش ﴿فَمَا لَبِثَ﴾
ئەمجـا ئەوەنـدەی نەبـرد ﴿أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ﴾ (ئیبراهیـم) خێـرا گوێرەکەیەکی بـرژاوی هێنـا بۆیان
﴿٦٩﴾ ﴿فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ﴾ جـا کاتێـك بینـی دەسـتیان ﴿لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ﴾ درێژ ناکەن بۆی(و لـێ ی ناخۆن)
﴿نَكِرَهُمۡ﴾ نائاسـایی هاتنـە بەرچـاوی ﴿وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ﴾ و لەدەروونـی خۆیـدا مەترسـی
لـێ کردن (کەنیـازی خراپیان هەبێت) ﴿قَالُواْ لَا تَخَفۡ﴾ ووتیان مەترسـە ﴿إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ﴾ بەڕاسـتی ئێمە
نێرراویـن ﴿إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ﴾ بۆ سـەر گەلی لـووط ﴿٧٠﴾ ﴿وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ﴾ لەوکاتەدا خێزانەکەی وەسـتابوو
﴿فَضَحِكَتۡ﴾ و پێکەنی ﴿فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ﴾ ئێمەش مژدەمان پێ دا بەئیسـحاق ﴿وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ﴾
وە لەپاش ئیسحاق (مژدەمان پێدا) بەیەعقوب (کەکوڕی ئیسحاقە) ﴿٧١﴾

﴿قَالَتْ يَا وَيْلَتَىٰ﴾ (خێزانی ئیبراهیم) ووتی وەیرۆ (وای) ﴿أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ﴾ چۆن منداڵم دەبێت کەمن
پیرە ژنێکم ﴿وَهَٰذَا بَعْلِي شَيْخًا﴾ ئەوەش مێردەکەمە کە پیربووە ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ﴾ بەڕاستی ئەمە
شتێکی سەیرە ﴿٧٢﴾ ﴿قَالُوا أَتَعْجَبِينَ﴾ (فریشتەکان) ووتیان تۆ سەرت سوڕدەمێنێت؟ ﴿مِنْ أَمْرِ اللَّهِ﴾
لەکار و فەرمانی خوا ﴿رَحْمَتُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ﴾ ڕەحمەت و بەرەکەتی زۆری خواتان لەسەربێت
﴿أَهْلَ الْبَيْتِ﴾ ئەی ئال و بەیتی ئیبراهیم ﴿إِنَّهُ حَمِيدٌ مَجِيدٌ﴾ بەڕاستی خوا سوپاس کراوی چاکە فراوانە
﴿٧٣﴾ ﴿فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ الرَّوْعُ﴾ ئەمجا کاتێك ترس و بیمی ئیبراهیم لاچوو نەما ﴿وَجَاءَتْهُ الْبُشْرَىٰ﴾
وە مژدەکەشی بۆ هات ﴿يُجَادِلُنَا فِي قَوْمِ لُوطٍ﴾ لەبارەی گەلەکەی لووط گفتوگۆی لەگەڵ دەکردین ﴿٧٤﴾
﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ﴾ (چونکە) بەڕاستی ئیبراهیم ﴿لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُنِيبٌ﴾ لەسەرخۆو دڵنەرم و ڕوو لەخوابوو ﴿٧٥﴾
﴿يَا إِبْرَاهِيمُ﴾ ئەی ئیبراهیم ﴿أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا﴾ وازبهێنە لەم کارە ﴿إِنَّهُ قَدْ جَاءَ﴾ بەڕاستی بێگومان
دەرچووە (بۆ ئەوکارە) ﴿أَمْرُ رَبِّكَ﴾ فەرمانی پەروەردگارت ﴿وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ﴾ وە بەڕاستی بۆ ئەوانە دێت
﴿عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ﴾ سزایەکی نەگەڕاوە ﴿٧٦﴾ ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ﴾ کاتێك کەهاتن ﴿رُسُلُنَا لُوطًا﴾ فریشتەکانمان
بۆلای لووط ﴿سِيءَ بِهِمْ﴾ هاتنیانی پێ ناخۆش بوو ﴿وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا﴾ وە دڵگران بوو پێیان ﴿وَقَالَ هَٰذَا
يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾ وە ووتی ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی سەختە ﴿٧٧﴾ ﴿وَجَاءَهُ قَوْمُهُ﴾ وە گەلەکەی هاتن بۆلای ﴿يُهْرَعُونَ
إِلَيْهِ﴾ پەلەیان دەکرد (لەهاتن) بۆ لای ﴿وَمِنْ قَبْلُ﴾ لەکاتێکدا ئەوان لەوەو پێش ﴿كَانُوا يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ﴾
هەمیشە کردەوە بەدەکانیان ئەنجام دەدا (کە نێربازی بوو) ﴿قَالَ يَا قَوْمِ﴾ ووتی ئەی گەلەکەم
﴿هَٰؤُلَاءِ بَنَاتِي﴾ ئەوانە کچەکانی منن (مەبەستی کچەکانی هۆزەکەی بوو) ﴿هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ﴾ ئەوانە
پاك وحەڵاڵن بۆتان ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ دەی لەخوا بترسن ﴿وَلَا تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي﴾ و سەرشۆڕم مەکەن لەوەی
دەتانەوێت بەرامبەر میوانەکانم بیکەن ﴿أَلَيْسَ مِنْكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ﴾ ئاخۆ پیاوێکی ژیرو تێگەیشتووتان
تێدا نی یە ﴿٧٨﴾ ﴿قَالُوا لَقَدْ﴾ ووتیان سوێندبێت بێگومان ﴿عَلِمْتَ﴾ تۆ دەزانیت ﴿مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ﴾
ئێمە هیچ هەق (و ئارەزوو) یکمان لەکچەکانتدا نیە ﴿وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ﴾ وە بەڕاستی تۆ دەزانی
ئێمە چیمان دەوێت ﴿٧٩﴾ ﴿قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً﴾ ووتی ئای خۆزگە لەبەرانبەر ئێوەدا هێزێکم ببوایە
﴿أَوْ آوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾ یان پەنایەکی قایم ببوایە پەنام پێ ببردایە (بەرگریم دەکردن) ﴿٨٠﴾ ﴿قَالُوا
يَا لُوطُ﴾ (فریشتەکان) ووتیان ئەی لووط ﴿إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ﴾ بەڕاستی ئێمە نێرراوی پەروەردگاری تۆین
﴿لَنْ يَصِلُوا إِلَيْكَ﴾ هەرگیز ناگەنەلای تۆ ﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِنَ اللَّيْلِ﴾ جا تۆ وماڵ ومنداڵت و ئەوەی
باوەڕی پێ هێناویت لەبەشێکی شەودا بڕۆن (وئەم شارە بەجێ بهێڵن) ﴿وَلَا يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ﴾
وە هیچ کەس لەئێوە لانەکاتەوە بەدوای خۆیدا ﴿إِلَّا امْرَأَتَكَ﴾ جگە لەژنەکەت ﴿إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ﴾
بەڕاستی ئەو تووشی دەبێت ئەوەی کەتووشی ئەوان (گەلەکەت) دەبێت (چونکە بێ باوەڕ بوو) ﴿إِنَّ
مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ﴾ بێگومان وەختی لەناو بردنیان بەرەبەیانە ﴿أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ﴾ ئایا بەرەبەیان نزیك
نییە ﴿٨١﴾

﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا﴾ جا کە فەرمانی ئێمە هات (بۆ لەناوبردنیان) ﴿جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا﴾ ئەو (شوێنە)مان سەرو ژێر کرد ﴿وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا﴾ و باراندمان بەسەریاندا ﴿حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ﴾ ووردەزیخی گڵیین ﴿مَّنضُودٍ﴾ بەدوای یەکداو بێ بچڕان (دەباری) ﴿٨٢﴾ ﴿مُّسَوَّمَةً﴾ هەمووئەو (ووردەزیخانە) دیاری کرابوون ﴿عِندَ رَبِّكَ﴾ لای پەروەردگارتەوە ﴿وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾ وە ئەو (سزایە) دوور نی یە لەستەم کارانەوە ﴿٨٣﴾ ﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ﴾ وە (ناردمان) بۆ (خەڵکی) مەدیەنیش ﴿أَخَاهُمۡ شُعَيۡبًا﴾ شوعەیبی برایان ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ﴾ ووتی ئەی گەلەکەم ﴿ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ خوا بپەرستن ﴿مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥ﴾ هیچ پەرستراوێکتان نی یە بێجگە ئەو ﴿وَلَا تَنقُصُواْ﴾ وە کەم و کوڕی مەکەن ﴿ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ﴾ لەپێوانە و کێشانەدا ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰكُم﴾ بەڕاستی من دەتان بینم ﴿بِخَيۡرٍ﴾ بەماڵ و سامانی زۆرەوە ﴿وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ﴾ وە بەڕاستی من دەترسم لێتان ﴿عَذَابَ يَوۡمٍ مُّحِيطٍ﴾ سزایەك کە گەمارۆتان بدات و لێی رزگار نەبن ﴿٨٤﴾ ﴿وَيَٰقَوۡمِ﴾ جا ئەی گەلەکەم ﴿أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِ﴾ پێوانەو کێشانە ڕاست و دروست ئەنجام بدەن ﴿وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ﴾ وە کەم و کوڕی مەکەن لەشت ومەکی خەڵکیدا ﴿وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ﴾ و خراپە کاری مەکەن (یاخراپە بڵاومەکەنەوە) لەزەویدا ﴿٨٥﴾ ﴿بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيۡرٌ لَّكُمۡ﴾ ئەوەی خوا دەیهێڵێتەوە (لەقازانجی حەڵاڵ) چاکترە بۆتان ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن ﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٍ﴾ و من پارێزەر نیم بەسەرتانەوە ﴿٨٦﴾ ﴿قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ﴾ ووتیان ئەی شوعەیب ﴿أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ﴾ ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێ دەدات ﴿أَن نَّتۡرُكَ﴾ کەئێمە وازبێنین ﴿مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ﴾ لەوەی باوو باپیرانمان پەرستوویانە ﴿أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْ﴾ یان وازبێنین لەوەی بەویستی خۆمان لەماڵ و سامانماندا دەیکەین ﴿إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ﴾ بەڕاستی تۆ پەلەنەکەری لێ زان و هۆشمەندیت ﴿٨٧﴾ ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ﴾ ووتی ئەی گەلەکەم ﴿أَرَءَيۡتُمۡ﴾ هەواڵم بدەنێ ﴿إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي﴾ ئەگەر من بەڵگەیەکی ڕوونم لەلایەن پەروەردگارمەوە پێ بێت ﴿وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنًا﴾ وەڕۆزیەکی زۆرو باشی پێدابم لەلایەن خۆیەوە (چ مەبەستێکم هەیە درۆ بکەم) ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ﴾ وە من هەرگیز نامەوێت پێچەوانەی ئێوە بکەم ﴿إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُ﴾ لەو (کارەی) بەرگری ئێوەی لێ دەکەم (خۆم بیکەم) ﴿إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُ﴾ من هیچ مەبەستێکم نی یە بێجگە لەچاککردن وچاکسازی نەبێت ئەوەندەی بتوانم ولەتوانامدا بێت ﴿وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ سەرکەوتنیشیم تەنها بە(پشتیوانی) خوایە ﴿عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ﴾ پشتم هەر بەو بەستووە ﴿وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ﴾ هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە ﴿٨٨﴾

﴿وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ﴾ ئەی گەلەکەم دژایەتیتان لەگەڵم نەبێتە هۆی ئەوەی ﴿أَن يُصِيبَكُم
مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ﴾ تووشتان ببێت وێنەی ئەو(سزایە)ی تووشی ﴿قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ﴾ گەلی
نووح یان گەلی هوود یان گەلی صاڵح بوو ﴿وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ﴾ خۆ گەلەکەی لووط دوور
نی یە لێتانەوە (چییان بەسەر هات) (٨٩) ﴿وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ﴾ وە داوای لێبوردنیش لەپەروەردگارتان
بکەن ﴿ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ﴾ پاشان بگەڕێنەوە بۆلای ﴿إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم
میهرەبانی دڵسۆزە (٩٠) ﴿قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ﴾ ووتیان ئەی شوعەیب ﴿مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا﴾ ئێمە تێناگەین
لەزۆرێك ﴿مِّمَّا تَقُولُ﴾ لەوەی تۆ دەیڵێیت ﴿وَإِنَّا﴾ بەڕاستی ئێمە ﴿لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗاۖ﴾ تۆ بە لاواز دەبینین
لەناوماندا ﴿وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ﴾ خۆ ئەگەر (لەبەر) خزمەکانت نەبوایە ﴿لَرَجَمۡنَٰكَۖ﴾ دڵنیابە بەرد بارانمان
دەکردی ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ﴾ (چونکە) تۆ خۆت هیچ دەسەڵاتێکت نی یە لەبەرامبەر ئێمەدا (٩١)
﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ﴾ ووتی ئەی گەلەکەم ﴿أَرَهۡطِيٓ أَعَزُّ عَلَيۡكُم﴾ ئایا خزمەکانم بەدەسەڵات ترن لەبەرامبەر
ئێوەدا ﴿مِّنَ ٱللَّهِ﴾ لەخوا ﴿وَٱتَّخَذۡتُمُوهُ وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ﴾ لەکاتێکدا فەرمانی ئەو (خوا)تان پشت
گوێ خستووە ﴿إِنَّ رَبِّي﴾ بەڕاستی پەروەردگارم ﴿بِمَا تَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ﴾ ئاگادارە بەهەرچی ئێوە
دەیکەن (٩٢) ﴿وَيَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ﴾ کردەوە بکەن لەسەر بارو حاڵەتی
خۆتان ﴿إِنِّي عَٰمِلٞۖ﴾ بەڕاستی منیش کارو کردەوە دەکەم ﴿سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ﴾ لەمەودوا دەزانن
﴿مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ﴾ کێ سزای بۆ دێت ﴿يُخۡزِيهِ﴾ ڕیسواو سەر شۆڕی دەکات ﴿وَمَنۡ هُوَ كَٰذِبٞۖ﴾ وەکێش
درۆزنە ﴿وَٱرۡتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمۡ رَقِيبٞ﴾ جا چاوەڕوانی بکەن بەڕاستی منیش لەگەڵتان چاوەڕوانم (٩٣)
﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا﴾ کاتێك فەرمانی ئێمە هات (بۆ لەناوبردنیان) ﴿نَجَّيۡنَا شُعَيۡبٗا﴾ شوعەیبمان ڕزگار کرد
﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾ وئەوانەش بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا ﴿بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا﴾ بەبەزەیی لەلایەن خۆمانەوە
﴿وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ﴾ وە ئەوانەی ستەمیان کرد بوو ناڵەو شریخە کە (نەعرەتەکە) گرتنی
﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾ ئیتر هەموویان لەماڵ و جێگاکانیاندا دەمەو ڕووکەوتن و جووڵەیان
نەما (مردن) (٩٤) ﴿كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ﴾ (وایان لێهات) وەك هەر تێیدا نەبووبن ﴿أَلَا بُعۡدٗا لِّمَدۡيَنَ﴾ بێداربن
دووری و تیاچوون بۆ خەڵکی مەدیەن ﴿كَمَا بَعِدَتۡ ثَمُودُ﴾ وەك چۆن گەلی سەموود تیاچوون
و دوور بوون لەڕەحمی خوا (٩٥) ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا﴾ سوێند بەخوا بێگومان ناردمان ﴿مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ مووسا
بەموعجیزەکانمانەوە ﴿وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ﴾ وە بەڕابەرو بەڵگەی ڕوونەوە (٩٦) ﴿إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ﴾ بۆ لای
فیرعەون و دەست وپێوەندەکەی ﴿فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ فِرۡعَوۡنَۖ﴾ بەڵام ئەوان شوێن فەرمانی فیرعەون کەوتن
﴿وَمَآ أَمۡرُ فِرۡعَوۡنَ بِرَشِيدٖ﴾ لەکاتێکدا فەرمانی فیرعەون ڕاست و ڕەوانەبوو (٩٧)

﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ﴾ پێش گەلەکەی دەکەوێت ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا ﴿فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ﴾ ئەمجا
هەموویان دەباتە ناو ئاگری دۆزەخ ﴿وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ﴾ ئای چەند خراپە ئەو شوێنەی ئەوانی
بۆ دەبرێت ﴿٩٨﴾ ﴿وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِۦ لَعْنَةً﴾ وە لەم (دونیا)دا نەفرینیان بەشوێندا نێرراوە ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾
هەروەها لەڕۆژی دواییشدا ﴿بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ﴾ ئای چەند خراپە ئەو بەخشراوەی پێیان بەخشرا
﴿٩٩﴾ ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ﴾ ئەوەی (باسکرا بۆت چەند هەواڵێکە) لە هەواڵی شارەکانی ڕابوردوو
﴿نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ﴾ دەیگێڕینەوە بۆت (لەم سورەتەدا) ﴿مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ﴾ هەندێکیان ماون
وهەندێکی تریان نەماون (وێران بوون) ﴿١٠٠﴾ ﴿وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ﴾ وە ئێمە ستەممان لێ نەکردن
﴿وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ﴾ بەڵکو خۆیان ستەمیان کرد لەخۆیان ﴿فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ﴾ جا هیچ سوودێکی
پێ نەگەیاندن ﴿ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى﴾ ئەو پەرستراوانەیان ﴿يَدْعُونَ﴾ کەدەیان پەرستن و هاواریان لێ دەکردن
﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ لەجیاتی خوا ﴿مِن شَىْءٍ﴾ بە هیچ شتێك (سودیان پێ نەگەیاندن) ﴿لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾
کاتێ فەرمانی پەروەردگارت هات (بۆ لەناو بردنیان) ﴿وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ﴾ ئەو (بت)انە هیچیان
زیاد نەکرد بۆ ئەوانە(ی دەیان پەرستن) بێجگە زیان و لەناوچوون نەبێت ﴿١٠١﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ﴾ ئا بەو
شێوەیە سزادانی پەروەردگارت ﴿إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ﴾ کاتێك خەڵکی شارەکان سزا دەدات ﴿وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ﴾
لە کاتێکدا ستەمکاربوون ﴿إِنَّ أَخْذَهُۥٓ﴾ بەڕاستی تۆڵە سەندنی ئەو ﴿أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ ئازار دەر و بەتینە ﴿١٠٢﴾
﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً﴾ بەڕاستی لەودا (باسکرا) پەندو ئامۆژگاری هەیە ﴿لِّمَنْ خَافَ﴾ بۆ کەسێك بترسێت
﴿عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ لەسزای دوا ڕۆژ ﴿ذَٰلِكَ يَوْمٌ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە ﴿مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ﴾ کەئادەمی بۆ
کۆدەکرێتەوە ﴿وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ﴾ و ئەوە ڕۆژێکی دیارو بەرچاوە (هەموان ئامادەن تێیدا) ﴿١٠٣﴾
﴿وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ﴾ وە ئێمە دوای ناخەین ﴿إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ﴾ مەگەر بۆ کاتێکی دیارو بەرچاو نەبێت ﴿١٠٤﴾
﴿يَوْمَ يَأْتِ﴾ ئەو ڕۆژە کەدێت ﴿لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ﴾ هیچ کەس قسە ناکات ﴿إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾ مەگەر بەمۆڵەتی خوا
﴿فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ﴾ ئەوسا لەناویاندا هەیە بێ بەخت (وچارە ڕەش)و هەیە بەختەوەر(وئاسوودە)
﴿١٠٥﴾ ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟﴾ جا ئەوانەی بێ بەخت وچارە ڕەش بوون ﴿فَفِى ٱلنَّارِ﴾ ئەوە لەناو ئاگردان
﴿لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ﴾ لەناو ئەو (ئاگرە)دا هەر ئاخ وئۆف و هەنیسکیانە ﴿١٠٦﴾ ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ تیایدا
دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾ تا ئاسمانەکان و زەوی بمێنێت (مەبەست پێی
ئاسمان وزەویە لە قیامەتدا کە ئەوانیش هەر دەمێنن) ﴿إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ﴾ مەگەر ئەو کەسەی
پەروەردگارت بیەوێت (ورزگاری بکات) ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾
ئەوەی کەبیەوێت دەیکات ﴿١٠٧﴾ ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ﴾ بەڵام ئەوانەی ﴿سُعِدُوا۟﴾ کەبەختەوەر وئاسوودەکراون
﴿فَفِى ٱلْجَنَّةِ﴾ ئەوە لەبەهەشت دان ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ بەهەمیشەیی دەمێننەوە تیایدا ﴿مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ
وَٱلْأَرْضُ﴾ تا ئاسمان و زەوی بمێنێت ﴿إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ﴾ مەگەر ئەو کەسەی پەروەردگارت بیەوێت
﴿عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾ ئەوە بەخشینێکە بێ بڕانەوە ﴿١٠٨﴾

﴿فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ﴾ کەواتـە هیـچ جـۆرە گومـان و دودڵیەکت نەبێـت ﴿مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰؤُلَاءِ﴾ لە(ناڕاسـتی) ئەوەی ئەوانە دەیپەرستن ﴿مَا يَعْبُدُونَ﴾ تەنها ئەوە دەپەرستن ﴿إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ آبَاؤُهُم﴾ کەباوو باپیرانیان دەیـان پەرسـتن ﴿مِّن قَبْلُ﴾ لـەوەو پێـش ﴿وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ﴾ بەڕاسـتی ئێمـە پێیـان دەدەیـن بەتەواوی ﴿نَصِيبَهُمْ﴾ بەشـی خۆیان(لەسـزا) ﴿غَيْرَ مَنقُوصٍ﴾ بەبێ لێ کەمکردنەوە(پڕاوپڕ) ﴿١٠٩﴾ ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە بەخشیمان ﴿مُوسَى الْكِتَابَ﴾ بەمووسا پەڕاوی (تەورات) ﴿فَاخْتُلِفَ فِيهِ﴾ ئەمجا جیاوازی تێداکرا ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ﴾ ئەگەر لەبەر بڕیارێك نەبوایە کەپێشـتر دراوە ﴿مِن رَّبِّكَ﴾ لەلایەنـی پەروەردگارتـەوە ﴿لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾ دادوەری دەکرا لەنێوانیاندا ﴿وَإِنَّهُمْ﴾ و بەڕاسـتی ئەوانە ﴿لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ لەگومـان و دوو دڵیـدان لەو (قورئانە) ﴿١١٠﴾ ﴿وَإِنَّ كُلًّا﴾ بێگومـان هەموو (ئەوانەی جیاوازن) ﴿لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ﴾ پەروەردگارت (پاداشتی) کردەوەکانیان بەتەواوی پێ دەدات ﴿إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ بەڕاسـتی ئـەو ئاگادارە بەهەر کردەوەیـەك کەدەیکەن ﴿١١١﴾ ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ﴾ کەواتە ڕاسـت بە بەو شـێوەی فەرمانت پێدراوە ﴿وَمَن تَابَ مَعَكَ﴾ وە ئەوانەش تۆبەیان کردوە لەگەڵ تـۆدا(و گەڕاونەتەوە) ﴿وَلَا تَطْغَوْا﴾ زیـادە ڕەوی مەکەن ﴿إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بەڕاسـتی ئەو(خوا) بینایە بەهەر کردەوەیەك کەدەیکەن ﴿١١٢﴾ ﴿وَلَا تَرْكَنُوا﴾ پاڵ مەدەن ﴿إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ بەوانەوە کەستەمیان کـردوە ﴿فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ چونکە دووچـاری ئاگـری دۆزەخ دەبن ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ و بێجگـە لەخـوا هیـچ پشـتیوانێکتان نابێ ﴿ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ پاشـانیش یارمەتـی نادرێن ﴿١١٣﴾ ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ﴾ وە نوێـژ ئەنجـام بدە ﴿طَرَفَيِ النَّهَارِ﴾ لەم سـەرو ئەوسـەری ڕۆژدا ( لەبەیانیـان و ئێواراندا) ﴿وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ﴾ و لـە بەشـێك لەشـەودا ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ﴾ چونکـە بەڕاسـتی (کـردەوە) چاکـەکان ﴿يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ (کردەوە) خراپەکان لادەبەن ودەیانسـڕنەوە﴿ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّاكِرِينَ﴾ ئەوە پەند و ئامۆژگـاری یـە بۆ پەند وەرگـران ﴿١١٤﴾ ﴿وَاصْبِرْ﴾ وە خۆڕاگـر بە ﴿فَإِنَّ اللَّهَ﴾ چونکە بەڕاسـتی خوا ﴿لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ پاداشـتی چاکە کاران وون نـاکات ﴿١١٥﴾ ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ﴾ دەی بابوایە لەنـاو ئـەو ئوممەتانـەی ﴿مِن قَبْلِكُمْ﴾ کەلـە پێـش ئێوە دابـوون ﴿أُولُو بَقِيَّةٍ﴾ کەسـانی خـاوەن ئایین و ژیری ﴿يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ﴾ کەبەرگریان بکردایە لەخراپەکاری لەزەویدا ﴿إِلَّا قَلِيلًا﴾ مەگەر کەمێـك ﴿مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ﴾ لەوانـەی ڕزگارمان کردن لـەو گەلانەدا ﴿وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ﴾ وە ئەوانەی کەستەمیان کرد شوێنی ژیان خۆشی و ڕابواردن کەوتن ﴿وَكَانُوا مُجْرِمِينَ﴾ و بەردەوام بوون لە خراپەکاری ﴿١١٦﴾ ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ﴾ هەرگیز پەروەردگارت بەسـتەم خەڵکی شـارو گونـدەکان لەنـاو نابات (واتـە خوای گـەورە ستەمکار نیە) ﴿وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ لـە کاتێکدا دانیشتوانی (ئەو شارانە) موصلح و چاکەکاربووبن ﴿١١٧﴾

﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ﴾ گەر پەروەردگارت بیویستایە ﴿لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ﴾ گشت خەڵکی دەکرد ﴿أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾
بە (پەیڕەوی) یەك ئایین ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ بەڵام ئەوان بەردەوام جیاوازدەبن (١١٨) ﴿إِلَّا مَن رَّحِمَ
رَبُّكَ﴾ مەگەر کەسێك پەروەردگارت میهرەبانی لەگەڵ کردبێت ﴿وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ وە هەر لەبەر
ئەوەش دروستی کردوون ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ﴾ بڕیاری پەروەردگارت دەرچوو (کۆتایی هات)
﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ﴾ کە سوێند بەخوا دۆزەخ پڕ دەکەم ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ لە جنۆکە و لە ئادەمی
هەموو پێکەوە (١١٩) ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ﴾ هەمووت بۆ دەگێڕینەوە ﴿مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ﴾ لە هەواڵی پێغەمبەران
(علیهم السلام) ﴿مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ﴾ بۆ ئەوە کەدڵی تۆی پێ دامەزراو بکەین ﴿وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ﴾
وە لەم (سورەتە)دا حەق و ڕاستیت بۆ هاتووە ﴿وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ وە ئامۆژگاری و پەندیشی
تیایە بۆ بڕواداران (١٢٠) ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ﴾ وە بڵێ بەوانەی ﴿لَا يُؤْمِنُونَ﴾ کەبڕوا ناهێنن ﴿ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ﴾
ئێوە کار وکردەوە بکەن لەسەر ئەو شێوەی خۆتان (کە ئەوەتان لەسەری) ﴿إِنَّا عَٰمِلُونَ﴾ بێگومان
ئێمەش کردەوە دەکەین(بەگوێرەی ئەوەی کە خودا فەرمانی پێ کردووین) (١٢١) ﴿وَٱنتَظِرُوٓا۟
إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ ئەوسا چاوەڕوانی بکەن (بۆ بەسەرهاتی خراپ) بەڕاستی ئێمەش چاوەڕوانین (١٢٢)
﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ وە تەنها بۆ خوایە (زانینی) نهێنی ئاسمانەکان وزەوی وتەنها هەر
ئەویش پێی ئاگادارە ﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ﴾ هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنرێتەوە ﴿ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ﴾ هەموو کار
و بارێك ﴿فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾ کەواتە ئەو بپەرستەو هەرپشت بەو ببەستە ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾
وە بێگومان پەروەردگارت بێ ئاگا نیە لەهەر کردەوەیەك ئێوە دەیکەن. (١٢٣)

## سورەتی ﴿ يُوسُف ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓر﴾ بە (ئەلیف ، لام ، ڕا) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای
سورەتی (البقرە) بکە ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ﴾ ئەمانە نیشانەکانی کتێبی ئاشکران (١) ﴿إِنَّآ
أَنزَلْنَٰهُ﴾ بەڕاستی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە ﴿قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾ قورئانێك بە عەرەبی ﴿لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾
بۆ ئەوەی ژیربن و لێ ی تێ بگەن (٢) ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ﴾ ئێمە دەگێڕینەوە بۆ تۆ ﴿أَحْسَنَ
ٱلْقَصَصِ﴾ جوان ترین چیرۆك و بەسەرهات ﴿بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ﴾ لە ڕێگای ئەم قورئانەوە
نیگامان کردووە بۆت ﴿وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ﴾ هەر چەندە تۆ لەپێش (هاتنی) ئەم قورئانەدا ﴿لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ﴾
لەم بەسەرهاتە بێ ئاگا بوویت (٣) ﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ﴾ (بیریان خەرەوە) کاتێك یوسف بە باوکی
ووت ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّى رَأَيْتُ﴾ ئەی بابە گیان بە ڕاستی من لە خەومدا دیم ﴿أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا﴾ یازدە ئەستێرە
﴿وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ و مانگ و ڕۆژ ﴿رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ﴾ دیمن سوژدەیان بۆ دەبردم (٤)

﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ﴾ ووتـی ئـەی کـوڕی شـیرینم ﴿لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ﴾ خەوەکـەت مەگێـڕەرەوە ﴿عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ﴾
بـۆ براکانت ﴿فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ﴾ نەوەك بەهۆیەوە فێڵ و پیلانێکت لێ بگێڕن ﴿إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ﴾ بەڕاسـتی
شـەیتان ﴿لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ دوژمنێکی ئاشـکرایە بۆ ئادەمی (٥) ﴿وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ﴾ ئابەو شـێوەیە
هەڵـت دەبژێرێـت (بـۆ پێغەمبەرایەتـی) ﴿رَبُّكَ﴾ پەروەردگـارت ﴿وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ﴾
وە فێـری لێکدانـەوەی خەونەکانیشـت دەکات ﴿وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ﴾ وە نیعمـەت و بەهـرەی خـۆی
تەواو دەکات بـۆت ﴿وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ﴾ وە بۆ بنەماڵەی یەعقوبیش ﴿كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ﴾ هەر چونێك
تـەواوی کـرد بۆ هـەردوو باپیرەت ﴿مِن قَبۡلُ﴾ لەپێشـدا ﴿إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَۚ﴾ کەئیبراهیم و ئیسـحاقن
﴿إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ بەڕاسـتی پەروەردگـارت زانای کاردروسـتە (٦) ﴿لَّقَدۡ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخۡوَتِهِۦٓ﴾
سـوێند بەخوا بەڕاستی لەبەسەر هاتی یوسف و براکانی دا ﴿ءَايَٰتٞ لِّلسَّآئِلِينَ﴾ پەندو ئامۆژگاری هەیە
بۆ پرسـیارکەران (٧) ﴿إِذۡ قَالُواْ﴾ کاتێك (براکانی یوسـف) ووتیان ﴿لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ﴾ بێگومان یوسـف
و براکەی ﴿أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا﴾ خۆشەویسترن لە ئێمە بەلای باوکمانەوە ﴿وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ﴾ لەکاتێکدا ئێمە
کۆمەڵێکی بەهێز و توانایین ﴿إِنَّ أَبَانَا﴾ بەڕاسـتی باوکمـان ﴿لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ﴾ لە هەڵەیەکی ڕوون و
ئاشـکرادایە (٨) ﴿ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ﴾ (هەندێکیان ووتیان) یوسف بکوژن ﴿أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا﴾ یافرێی بدەنە
زەوی یەکـی دوور ﴿يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ﴾ (ئـەو کاتە) سـەرنجی باوکتـان تەنیا بۆلای ئێـوە دەبێت
﴿وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ﴾ و لـەدوای ئـەوەوە دەبـن بەکۆمەڵێکی چاکـەکار (بەتۆبەکردن) (٩)
﴿قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ﴾ قسەکەرێك لەوان ووتی ﴿لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ﴾ یوسف مەکوژن ﴿وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ﴾
بەڵکـو فرێـی بدەنە بنی بیرێکـەوە ﴿يَلۡتَقِطۡهُ بَعۡضُ ٱلسَّيَّارَةِ﴾ هەندێك لە کاروانیـەکان (دەی دۆزنەوە)
وهەڵی دەگرن ﴿إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ﴾ ئەگەر ئێوە (کارەکە) هەر دەکەن (١٠) ﴿قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ﴾
(پاش کێشـانی نەخشـە وپیلانەکەیـان) ووتیان ئەی باوکـی بەڕێزمان لەبەرچی تۆ لە یوسـف لێمان
دڵنیانیـت و(بەگومانیـت لێمان) ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ﴾ لەکاتێکدا کەئێمە دڵسـۆزو خەمخۆرین بۆی (١١)
﴿أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا﴾ سبەینێ لەگەڵمان بینێرە(بۆدەرودەشت) ﴿يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ﴾ (بەئارەزووی خۆی)خواردن
بخـوات و یاری بکات ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ و بێـگومـان ئێمە پارێزگاری دەکەین (١٢) ﴿قَالَ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ﴾
(باوکیان) ووتی بەڕاستی دڵتەنگ و خەمباردەبم ﴿أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ﴾ کەئێوە یوسف بەرن (لەگەڵ خۆتان)
﴿وَأَخَافُ أَن يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ﴾ وە دەترسـم کـە ئێوە لێـی بێ ئاگابن وگـورگ بیخوات
(١٣) ﴿قَالُواْ لَئِنۡ أَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ﴾ ووتیـان چـۆن گـورگ دەیخـوات ؟! ﴿وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ﴾ لەکاتێکـدا ئێمە
کۆمەڵێکـی بەهێزین ﴿إِنَّآ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ﴾ بەڕاسـتی ئەو کاتـە ئێمە زەرەر مەندیـن (ڕوو زەردی تۆ
دەبین) (١٤)

﴿فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهِۦ﴾ ئەمجا کاتێك یوسفیان برد لەگەڵ خۆیان ﴿وَأَجْمَعُوٓا۟ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ﴾
وە هەموو بڕیاریاندا بیخەنە بنی بیرەکەوە ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ﴾ وە ئێمە وەحی و سرووشمان بۆ (یوسف)
کرد ﴿لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا﴾ سوێند بەخوا هەواڵی ئەم کارەیان پێ دەدەیت (کەپێیان کردی)
﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان هەست ناکەن ﴿١٥﴾ ﴿وَجَآءُوٓ أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ﴾ جا ئێوارە
درەنگانێك (براکانی یوسف) بەگریانەوە هاتنەوە بۆلای باوکیان ﴿١٦﴾ ﴿قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ﴾ ووتیان ئەی
باوکی ئێمە ﴿إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕۆیشتین پێشبڕکێمان دەکرد ﴿وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا﴾
و یوسفمان لای شتومەکەکانمان بەجێ هێشت ﴿فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ﴾ بۆیە گورگ خواردی ﴿وَمَآ أَنتَ
بِمُؤْمِنٍ لَّنَا﴾ وە تۆ قەت باوەڕ بەئێمە ناکەیت ﴿وَلَوْ كُنَّا صَٰدِقِينَ﴾ هەرچەند ئێمە ڕاستگۆش
بین. ﴿١٧﴾ ﴿وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍ﴾ (براکانی) کراسەکەی (یوسف)یان هێنایەوە کە خوێنی
درۆینەی پێوە بوو ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا﴾ (باوکیان) ووتی بەڵکو دڵ و دەروونی خۆتان
ئەم کارە(ناپەسەندە)ی بۆ ئاسان و جوان کردوون ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾ (ووتی جا ئارام دەگرم) بەئارام
گرتنێکی چاك و پەسەند ﴿وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ خواش یارمەتی دەرمە لەسەر ئەوەی
باسی دەکەن ﴿١٨﴾ ﴿وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ﴾ جا کاروانێك هات ﴿فَأَرْسَلُوا۟ وَارِدَهُمْ﴾ و ئاو هێنەرەکەیان نارد
(بۆ ئاو) ﴿فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ﴾ ئەویش دۆڵچەکەی داهێلا بۆ ناو بیرەکە ﴿قَالَ يَٰبُشْرَىٰ﴾ (کە دۆڵچەکەی
هێنایە سەرەوە) ووتی ئەی خەڵکینە موژدە بێ ﴿هَٰذَا غُلَٰمٌ﴾ ئەمە کوڕێکە ﴿وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةً﴾ وە ئەوان
(یوسف)یان شاردەوە کردیانە کاڵای بازرگانی ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ وە خوا زانایە بەوەی
ئەوانە دەیکەن ﴿١٩﴾ ﴿وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ﴾ و فرۆشتیان بەنرخێکی کەم ﴿دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ﴾ کە چەند
دەرهەمێك بوو ﴿وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ﴾ و ئەوان بێ نیاز بوون لێی (چونکە دەترسان ڕازیان
دەرکەوێت) ﴿٢٠﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ﴾ وە ئەو کەسەی لە میسر یوسفی کڕی
ووتی بە ژنەکەی ﴿أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ﴾ ڕێزی لێ بگرە (شوێنی حەوا نەوەی چاکی بۆ ئامادە بکە)
﴿عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ﴾ بەڵکو سوودمان پێ بگەیەنێت ﴿أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا﴾ یان بیکەین بەکوڕی خۆمان
﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئابەم جۆرە یوسفمان جێ گیر کرد(و پلەو پایەمان پێدا)
لە زەوی (میسر)دا ﴿وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ﴾ (ئەمەمان کرد) تا فێری خەو لێکدانەوەی بکەین
﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ﴾ وە خوا بەسەر کاری خۆیدا زاڵ و بەدەسەلاتە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام
زۆربەی خەڵکی نازانن ﴿٢١﴾ ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ﴾ وە کاتێك بوو بەپیاو و پێ گەیی ﴿ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا﴾
فەرمان ڕەوایی و زانیاریمان پێدا ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ وە ئابەم جۆرە پاداشتی چاکەکاران
دەدەینەوە ﴿٢٢﴾

﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ﴾ ئەو ئافرەتەی یوسف لەماڵیدا بوو دەست تێکەڵاوی (وخیانەتی)
لەیوسف ویست ﴿وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ﴾ و هەموو دەرگاکانی داخست ﴿وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ﴾ ووتی دەی وەرە
پێشەوە بۆ ئەوەی بۆت ئامادەکراوە ﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ﴾ (یوسف) ووتی من پەنا دەگرم بەخوا ﴿إِنَّهُۥ رَبِّيٓ﴾
بەڕاستی ئەو(خوا) پەروەردگاری منە ﴿أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ﴾ ڕێزی لێ گرتووم ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾
بەڕاستی ستەم کاران ڕزگاریان نابێت ﴿٢٣﴾ ﴿وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئەو ژنە
بەتەواوی نیازی (تێکەڵی ژن و مێردی) یوسفی کرد، یوسفیش نیازی ئەو ژنەی دەکرد بەخەتەرەی
نەفسی بەشەری ﴿لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ﴾ ئەگەر ئەو بەڵگە ڕوونەی پەروەردگاری نەدیبایە
﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئا بەو جۆرە (بەڵگەمان نیشانی یوسف دا) ﴿لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ﴾ بۆ ئەوەی
خراپەو داوێن پیسی لێ دوور بخەینەوە﴿إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ چونکە بەڕاستی ئەو(یوسف)
لەبەندە پاك وهەڵبژاردەکانی ئێمەیە ﴿٢٤﴾ ﴿وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ﴾ (یوسف و ئافرەتەکە) هەر دووکیان بەڕاکردن
گەشتنە لای دەرگاکە (یوسف بۆ خۆ ڕزگارکردن و ژنەکەی (عزیزی میصر) یش بۆ ئەوەی بگات بە
یوسف ( بۆ بەجێهێنانی مەبەستی خۆی) ﴿وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ﴾ (ئافرەتەکە) کراسەکەی (یوسفی)
دڕاند لەدواوە﴿وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا﴾ جا هەردووکیان تووشی مێردی (ئافرەتەکە) بوون ﴿لَدَا ٱلۡبَابِۚ﴾ لەبەردەم
دەرگاکە (ی دەرەوە) دا ﴿قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا﴾ (ئافرەتەکە بۆ ئەوەی خۆی لەو تاوانە بەدوور
بگرێت وخیانەتەکەی دەرنەکەوێت) بەپەلە ووتی: سزای ئەو کەسە چیە کە ویستبێتی خراپە (داوێن
پیسی) لەگەڵ خێزانەکەتدا بکات ﴿إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ جگە لەوەی بەند بکرێت یان سزایەکی
سەخت بدرێت ﴿٢٥﴾ ﴿قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ﴾ (یوسف)ووتی ئەو (ژنە) داوێن پیسی لەمن وویست
﴿وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ﴾ ئەوسا شایەتێك لەکەس و کاری ئەو (ئافرەتە) شایەتی دا ﴿إِن كَانَ
قَمِيصُهُۥ﴾ (ووتی) ئەگەر کراسەکەی (یوسف) ﴿قُدَّ مِن قُبُلٖ﴾ لە پێشەوە دڕێنرا بێت ﴿فَصَدَقَتۡ﴾
ئەوە ئافرەتەکە ڕاست دەکات ﴿وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ وە (یوسف) لە درۆزنان (خراپەکارانە) ﴿٢٦﴾
﴿وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ﴾ وە ئەگەر کراسەکە ٢ ی ﴿قُدَّ مِن دُبُرٖ﴾ لەدواوە دڕێنرا بێت ﴿فَكَذَبَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾
ئەوە ئافرەتەکە درۆ دەکات و (یوسف) لەڕاست گۆیانە. ﴿٢٧﴾ ﴿فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ﴾ ئەمجا کاتێك (عەزیز)
بینی کراسەکەی یوسف ﴿قُدَّ مِن دُبُرٖ﴾ لەدواوە دڕاوە﴿قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ﴾ ووتی بەڕاستی ئەمە لەفڕو
فێڵی ئێوەی (ئافرەتانە) ﴿إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ﴾ بەڕاستی فڕوفێڵی ئێوە زۆر گەورەیە ﴿٢٨﴾ ﴿يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ
هَٰذَاۚ﴾ (عەزیز ووتی) یوسف وازبێنە لەم کارەو باسی مەکە ﴿وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ﴾ و (ژنەکە) تۆش بۆ
گوناهەکەت داوای لێبوردن بکە ﴿إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ﴾ چونکە بەڕاستی تۆ لەپێڕی تاوانبارانی
﴿٢٩﴾ ﴿وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾ (دەستەیەك) لەژنانی شار ( پاش ئەوەی هەواڵەکەیان بیست بەتەشەرەوە)
ووتیان ﴿ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ﴾ ژنەکەی عەزیز(ی میصر) ﴿تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦۖ﴾ دەیەوێت (هەوڵ دەدا)
لەگەڵ غولامەکەی داوێن پیسی بکات ﴿قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ﴾ بەڕاستی خۆشەویستی (ئەو غولامە)
چووەتە ناو پەردەی دڵی ﴿إِنَّا لَنَرَىٰهَا﴾ بەڕاستی ئێمە ئەو (ژنە) دەبینین ﴿فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ لە گومراییەکی
ڕوون دایە ﴿٣٠﴾

﴿فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ﴾ جـا کاتێـك ژنەکـە (ی عەزیـز) تانەو تەشـەری ئەوانی بیسـت ﴿أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ﴾
ناردی بەدوایاندا ﴿وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً﴾ ئامادەی کرد بۆیان شـوێنی (خۆشـی دانیشـتن و) شان دادان
﴿وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا﴾ و هەریـەك لـەوان چەقۆیەکـی پێدان (بۆ میوەلـەت کردن) ﴿وَقَالَتِ ٱخْرُجْ
عَلَيْهِنَّ﴾ ئەوسـا ووتی (بەیوسـف) وەرە بۆ ناویان (بابتبینن) ﴿فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ﴾ هەر کە ئەو (یوسـف)
یان بینی حەپەسـان (لەجوانی ئەودا) ﴿وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ﴾ و هەموویان (لەکاتی میوە لەتکردندا) دەسـتی
خۆیانیـان بـڕی ﴿وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ﴾ ووتیـان پاکـی وبێگـەردی بـۆ خـوا ﴿مَا هَٰذَا بَشَرًا﴾ ئەمـە ئادەمـی نییە
﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾ ئەمـە تەنهـا فریشـتەیەکی بـەرزو بەرێـزە ﴿٣١﴾ ﴿قَالَتْ﴾ (ژنەکـە) ووتـی پێیـان
﴿فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى﴾ ئەمە ئەو کەسـەیە کە ﴿لُمْتُنَّنِى فِيهِ﴾ ئێوە سەرزەنشتی منتان دەکرد لەسەری ﴿وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ
عَن نَّفْسِهِۦ﴾ وە سـوێند بەخـوا بێگومان ویسـتم دەسـتم لەگەڵ تێکـەڵ کات ﴿فَٱسْتَعْصَمَ﴾ بـەڵام ئەو
خـۆی گرتووە (نەیکرد) ﴿وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ﴾ وە سـوێند بەخـوا ئەگەر ئەوەی فەرمانـی پێ دەکەم
نەیـکات ﴿لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴾ ئـەوە بێگومـان بەنـد دەکرێـت و لەڕیسـوایان دەبێـت ﴿٣٢﴾
﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ﴾ (یوسـف) ووتی ئـەی پەروەردگارم بەندکردنم لا خۆشـترە ﴿مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ﴾
لـەوەی کەئەوانـە داوای دەکـەن لێـم (کە بیکـەم) ﴿وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ﴾ وە ئەگەر پیلانی ئـەو ژنانەم
لـێ لانـەدەی ﴿أَصْبُ إِلَيْهِنَّ﴾ لەوانەیـە دڵـم بۆلایـان بـڕوا (حەزیـان لـێ بکـەم) ﴿وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾
پاشـان لەنەفامـان دەبم و دەچمـە ڕیزیانەوە ﴿٣٣﴾ ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ ئەوسـا پەروەردگاری دوعاکەی
لـێ وەرگـرت ﴿فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ﴾ و پیلانەکـەی ئـەو (ژنانـە) ی لـێ لادا ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾
بەڕاسـتی هـەر خـوا بیسـەری زانایـە ﴿٣٤﴾ ﴿ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْءَايَٰتِ﴾ ئەمجـا بۆیـان دەرکـەوت
و پێیـان چـاك بـوو پاش ئـەوەی ئـەو هەمـوو بەڵگەیـان (لـێ) بینـی ﴿لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ﴾ تاماوەیەك
بەنـدی بکـەن ﴿٣٥﴾ ﴿وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ﴾ ئەوسـا دوو کـوڕی لاو (خزمەتـکار) لەگەڵـی چوونـە
بەندیخانـە ﴿قَالَ أَحَدُهُمَآ﴾ یەکێکیان ووتی (بەیوسـف) ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ﴾ بەڕاسـتی لەخەومدا خۆمم دی
﴿أَعْصِرُ خَمْرًا﴾ ترێم دەگوشی کەدەبێ بەعەرەق ﴿وَقَالَ ٱلْءَاخَرُ﴾ وەئەوی تریان ووتی ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ﴾ بێگومان
لەخەودا خۆمم دی ﴿أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِى خُبْزًا﴾ نانم هەڵدەگرت بەسەر سەرمەوە ﴿تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُ﴾ باڵندە
لێی دەخوارد ﴿نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓ﴾ لێکدانەوەی ئەو (خەو)ەمان پێ بڵێ ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ بەڕاستی
ئێمە تۆ لەچاکەکاران دەبینین (کەچاك خەو لەیەك دەدەیتەوە و پەرژینی دەکەیت) ﴿٣٦﴾ ﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ
تُرْزَقَانِهِۦٓ﴾ (یوسـف) ووتـی : (سـبەینێ) هیـچ خۆراکێکتـان پـێ نادرێـت کـە بیخـۆن ﴿إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا
بِتَأْوِيلِهِۦ﴾ بەهـەر دووکتـان دەڵێم چی وچیتان بـۆ دەهێنن ﴿قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا﴾ پێش ئـەوەی بگاتە لاتان
﴿ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ﴾ ئەمـەش لەو بەهرانەیە کەپەروەردگارم فێری کردوم ﴿إِنِّى تَرَكْتُ﴾ بەڕاسـتی من
وازم هێنـاوە ﴿مِلَّةَ قَوْمٍ﴾ لەئاینی گەلێـك ﴿لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ کەبڕوایان بە خوا نەهێنا ﴿وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ
كَٰفِرُونَ﴾ وە ئەوان بێ بڕواش بوون بە ڕۆژی دوایی ﴿٣٧﴾

﴿وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ﴾ وە شـوێنی ئاینـی باوو باپیرانم کەوتـووم ﴿إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ﴾ کە (ئاینی)
ئیبراهیـم و ئیسـحاق و یەعقوبـە ﴿مَا كَانَ لَنَآ﴾ شایسـتە و شـیاونی یـە بۆمـان (بۆ شـوێنکەوتوانی
ئیبراهیم) ﴿أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ﴾ کەهیچ شـتێك بکەیـن بەهاوبەش بۆ خوا ﴿ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا﴾
ئەمـەش چاکـەو بەهـرەی خوایە بەسـەر ئێمەوە ﴿وَعَلَى ٱلنَّاسِ﴾ وە بەسـەر خەڵکیشـەوە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ
ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ﴾ بـەڵام زۆربـەی خەڵکـی سوپاسـی خـوا ناکـەن (٣٨) ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ﴾ ئـەی
دوو هاوڕێکـەی بەندینخانـەم ﴿ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ﴾ ئایـا چەنـد خوایەکـی جیاجیـا باشـترن
﴿أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾ یان خوایەکی تاکی بەدەسەڵات (٣٩) ﴿مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ﴾ ئێوە بێجگە لەخوا
هیچ شتێك ناپەرستن ﴿إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم﴾ جگەلەچەندناوێك نەبێت کەئێوەوباوو
باپیراتـان ناوتان ناوون (خودا) ﴿مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ﴾ خوا هیچ بەڵگەیەکی دەربارەیان نەناردۆتە
خوارەوە (کە ئەوانە بپەرستن) ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ بێگومان بڕیار تەنها بۆ خوایە ﴿أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ﴾
فەرمانی داوە بێجگە لەو هیچ شـتێك نەپەرسـتن ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾ ئەوەیە ئاینی ڕاسـتی دامەزراوی
نەگۆڕاو ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بـەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن (٤٠) ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ﴾ ئەی
دوو هاوڕێکەی بەندینخانەم ﴿أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ﴾ یەکێکتان عارەق دەرخواردی گەورەکەی
(پاشا) دەدات ﴿وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ﴾ بەڵام ئەوی ترتان (دەکوژرێت و) هەڵدەواسرێت ﴿فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ
مِن رَّأۡسِهِۦۚ﴾ ئەوسا باڵندە لەسەر (و دەم چاو)ی دەخوات ﴿قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ﴾ ئەو کارەی
کەئێـوە دەربارەی پرسـیار دەکەن (لەلایـەن خوداوە) بڕیاری لەسـەر دراوە (وناگۆڕێت) (٤١) ﴿وَقَالَ
لِلَّذِي ظَنَّ﴾ و(یوسـف) ووتی بەوەی کەدەیزانی ﴿أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا﴾ ڕزگـاری دەبێت لەدوو بەندکراوەکە
﴿ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ﴾ باسـم بکـە لای گـەورەو پادشـاکەت (کـە بەناهـەق گیـراوم) ﴿فَأَنسَىٰهُ
ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ بـەڵام شـەیتان لەبیری بردەوە ﴿ذِكۡرَ رَبِّهِۦ﴾ کەباسـی (یوسـف) بکات لای پادشـاکەی
﴿فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ﴾ بۆیـە مـاوەی چەنـد سـاڵێك (یوسـف) لەبەندیخانـەدا مایـەوە (٤٢)
﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ﴾ وە پادشـا (خەوێکی بینی) ووتی ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ﴾ بێگومان من لەخەومدا
حـەوت مانگـای قەڵەوم بینـی ﴿يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ﴾ کەحەوت (مانگا)ی لـەڕ ولاواز دەیخواردن
﴿وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ﴾ وە حـەوت گوڵـە دانەوێڵـەی سـەوزو حەوتـی تری وشکم بینی
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ﴾ ئـەی کاربەدەسـت ودونیا دیـدان ﴿أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ﴾ ئـەم خـەوەم بـۆ لێـك بدەنـەوە
﴿إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ﴾ ئەگەر ئێوە مانای خەو دەکەن و دەزانن خەو پەرژێن بکەن (٤٣)

﴿قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ﴾ ووتیان خەوی تێکەڵ و پێکەڵ (و پڕوپوچە) ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ ٱلْأَحْلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ﴾
و ئێمەش لێکدانەوەی خەوی تێکەڵ و پێکەڵ نازانین (٤٤) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ﴾
ئەوسا ئەوەیان کەڕزگاری بوو لەدوو (بەندکراو)ەکە لەپاش چەند ساڵێك بیری کەوتەوە ووتی
﴿أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ﴾ من بۆتان لێکدەدەمەوە مانای ئەو خەوە ﴿فَأَرْسِلُونِ﴾ جا (فەرموو) بمنێرن
(بەدوای یوسف دا کە لەبەندینخانەدایە) (٤٥) ﴿يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ﴾ (هات ووتی) یوسف ئەی
هاوڕێی ڕاستگۆ ﴿أَفْتِنَا فِى سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ﴾ مانای ئەو خەوەمان پێ بڵێ
چی یە ؟ حەوت مانگای قەڵەو کەحەوت مانگای لەڕو لاواز بیانخوات ﴿وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ
وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ﴾ هەروەها حەوت گوڵی دانەوێڵەی سەوزو حەوت گوڵی ووشك ﴿لَّعَلِّىٓ أَرْجِعُ إِلَى
ٱلنَّاسِ﴾ تا من بگەڕێمەوە بۆلای خەڵکی ﴿لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ بۆ ئەوەی ئەوان ئەوە بزانن (٤٦)
﴿قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا﴾ (یوسف) ووتی حەوت ساڵ کشتوکاڵ دەکەن بەدوای یەکداو
بەبەردەوامی ﴿فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِى سُنۢبُلِهِۦٓ﴾ جائەوەی کەدروێنەتان کرد بیهێڵنەوە لەگوڵەکەیدا
﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ﴾ کەمێك نەبێت لەوەی کەدەیخۆن (٤٧) ﴿ثُمَّ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ﴾ ئەمجا
لەپاش ئەو (حەوت ساڵە) حەوت ساڵی تردێت کەسەخت وقات و قڕییە ﴿يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ
لَهُنَّ﴾ هەرچیتان پاشە کەوت کردووە بۆ ئەم (حەوت ساڵە سەختە) دەیخۆن ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ﴾
مەگەر کەمێك لەوەی قایم هەڵی دەگرن (بۆ بنە تۆو وناشتنەوەی ساڵێکی تر) (٤٨) ﴿ثُمَّ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ
عَامٌ﴾ پاشان دوای ئەو (حەوت ساڵە سەختە) ساڵێك دێت ﴿فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾ خەڵکی تێیدا
(ڕزگار دەکرێن) بارانیان بۆ دەبارێنرێت و تێیدا دۆشاو(ی میوەهات) دەگرن (٤٩) ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ﴾ پاشا
ووتی ﴿ٱئْتُونِى بِهِۦ﴾ ئەو (پیاوە) م بۆ بێنن ﴿فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ﴾ جا کاتێك نێردراوەکە(ی پاشا) هاتە لای
یوسف ﴿قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ (یوسف) ووتی بگەڕێرەوە بۆلای گەورەکەت (پادشاکەت) ﴿فَسْـَٔلْهُ﴾
و پرسیاری لێ بکە ﴿مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ﴾ هۆی چی بوو کەئەو ژنانە دەستی خۆیانیان
بڕی ﴿إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگارم بەپیلانی ئەو (ژن) انە ئاگادارو زانایە (٥٠)
﴿قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ﴾ ووتی (بەژنەکان) مەبەستان چی بوو کاتێك ویستتان
یوسف بخەڵەتێنن و کاری خراپی پێ بکەن ﴿قُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ﴾ (ئافرەتەکان) ووتیان پاك و بێگەردی بۆ
خوا ﴿مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ﴾ ئێمە هیچ خراپەیەکمان لێ نەدیوە ﴿قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ﴾ ژنەکەی عەزیز ووتی
﴿ٱلْـَٰٔنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ﴾ ئائێستا حەق و ڕاستی دەرکەوت ﴿أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ﴾ من دەمویست (یوسف)
دەستم لەگەڵ تێکەڵ کات ﴿وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ و بێگومان ئەو لەڕاست گۆیانە (٥١) ﴿ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ
أَنِّى﴾ (یوسف ووتی) ئەوە بۆ ئەوەی (پادشا) بزانی بەڕاستی من ﴿لَمْ أَخُنْهُ بِٱلْغَيْبِ﴾ بەپەنهانی ناپاکی
وخیانەتم نەکردووە لێی ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى كَيْدَ ٱلْخَآئِنِينَ﴾ وە بەڕاستی خواش پیلانی ناپاکان ناگەیەنێتە
ئەنجام (٥٢)

﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ﴾ وە (یوسف وتی) من هەرگیز پاکانە بۆ خۆم ناکەم ﴿إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾
(چونکە) بەڕاستی نەفس زۆر فەرمان دەرە بەخراپە ﴿إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ﴾ بێجگە ئەو نەفسەی پەروەردگارم
ڕەحمی پێ کردبێت ﴿إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم لێبوردەی میهرەبانە (٥٣)
﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ﴾ جا پادشا وتی (بەژێردەستەکانی) ﴿ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ﴾ ئەو یوسفەم بۆ بێنن ﴿أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ﴾
دەیکەمە (کەسێکی) تایبەت بەخۆم ﴿فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ﴾ جا کاتێ کە(پادشا) قسەی لەگەڵ کرد ﴿قَالَ إِنَّكَ﴾
وتی بەڕاستی تۆ ﴿ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ﴾ ئەمڕۆ لای ئێمە خاوەنی پلەو پایە و باوەڕپێکراوی (٥٤)
﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾ (یوسف) فەرمووی (بەپادشا) لەسەر خەزنە و دارایی
زەوی (میسر) دابمنێ بەڕاستی من پارێزەرێکی شارەزام (٥٥) ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ﴾ ئا بەو جۆرە
یوسفمان پایەدارو جێگیر کرد ﴿فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لەخاك (ی میسر)دا ﴿يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ﴾ لەهەر
شوێنێك(ی میسردا) بیویستایە دەژیا ﴿نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ﴾ هەر کەسمان بوێ بەرمیهرەبانی
خۆمانی دەخەین (لەدونیادا) ﴿وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ و پاداشتی چاکە کاران وون ناکەین (٥٦)
﴿وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ﴾ وە بەڕاستی پاداشتی ڕۆژی دوایی چاکترە ﴿لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بۆ ئەو کەسانەی
بڕوایان هێناوە ﴿وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ و بەهەمیشەیی خۆپارێز بوون (لە هاوبەش بڕیاردان و تاوان)
(٥٧) ﴿وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ﴾ وە (لە کاتی گرانیدا) براکانی یوسف هاتن (بۆ میسر) ﴿فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ﴾ ئەوسا
چوونە لای (یوسف) ﴿فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾ دەست بەجێ (یوسف) ئەوانی ناسی یەوە بەڵام
ئەوان ئەمیان نەناسی یەوە (٥٨) ﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ﴾ جا کاتێك کە ڕێکی خستن وئەوەی کە ویستیان
پێی دان ﴿قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ﴾ ووتی برایەکی باوکیتان هەیە بۆم بێنن ﴿أَلَا تَرَوۡنَ أَنِّيٓ﴾ ئایا نابینن
کەمن ﴿أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ﴾ پێوانەم تێرو تەواوە (بۆ کڕیارەکان) ﴿وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ﴾ وەمن خانە خوێی
چاکم (٥٩) ﴿فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ﴾ جا ئەگەر ئەو (برایەتان)م بۆ نەهێنن ﴿فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ﴾ ئەوە
پێوانە(ی دانەوێڵە)تان لای من نیەو نزیك (ئەم وولاتەش) مەکەونەوە (٦٠) ﴿قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ﴾ ووتیان
هەوڵ و تەقەلا دەدەین لەگەڵ باوکی دا ﴿وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ﴾ و دڵنیابە ئێمە ئەو کارە دەکەین (٦١) ﴿وَقَالَ
لِفِتۡيَٰنِهِ﴾ وە (یوسف) ووتی بە بەردەست و خزمەتکارەکانی ﴿ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ﴾ دراوەکانیان کە
داویانە (بە دزی یەوە) بیخەنە ناو بارەکانیان ﴿لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ﴾ بەڵکو بیناسنەوە ﴿إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ﴾
کاتێك کە گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ تا (ببێتە هۆی ئەوەی) بگەڕێنەوە
و بێنەوە (جارێکی تر) (٦٢) ﴿فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ﴾ ئەمجا کاتێکگەڕانەوە بۆ لای باوکیان ﴿قَالُواْ
يَٰٓأَبَانَا﴾ ووتیان ئەی باوکی بەڕێزمان ﴿مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ﴾ (بۆ ساڵی داهاتوو) پێوانەمان لێ قەدەغە
کراوە (شتمان پێنافرۆشن ئەگەر بنیامین نەنێریت لەگەڵماندا) ﴿فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ﴾
جا کەواتە براکەمان لەگەڵماندا بنێرە پێوانەش دەکەین (دانەوێڵە دەکڕین) ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾
و دڵنیابە ئاگاداریشی دەکەین (٦٣)

﴿قَالَ﴾ (یەعقوب) ووتی (پێیان) ﴿هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ﴾ ئایا دڵنیابم لێتان دەربارەی ﴿إِلَّا كَمَا أَمِنتُكُمْ
عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ﴾ هەروەك پێشتر دڵنیا بووم لێتان دەرباری (یوسفی) برای ﴿فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا﴾ کەواتە
خوا چاکترین پارێزەرە ﴿وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ وە ئەو بەزەیی دارترینی هەموو بەزەیی دارانە ﴿٦٤﴾ ﴿وَلَمَّا
فَتَحُوا۟ مَتَٰعَهُمْ﴾ جا کاتێك بارەکانیان کردەوە ﴿وَجَدُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ﴾ بینی یان دەسمایەکەیان بۆ
گەڕێنراوەتەوە ﴿قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا﴾ ووتیان ئەی باوکی بەڕێزمان ﴿مَا نَبْغِى﴾ چیمان دەوێت ﴿هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا﴾
ئەمە دراوەکەمانە ﴿رُدَّتْ إِلَيْنَا﴾ بۆمان نێردراوەتەوە ﴿وَنَمِيرُ أَهْلَنَا﴾ بژێویش بۆ خاو خێزانمان دەهێنین
﴿وَنَحْفَظُ أَخَانَا﴾ و براکەشمان دەپارێزین ﴿وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ﴾ و باری ووشترێکیش (دانەوێڵە)
زیاد دەهێنین ﴿ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾ ئەم (بارەش) پێوانەیەکی کەمە (و بە ئاسانی دەمان دەنێ) ﴿٦٥﴾
﴿قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ﴾ (یەعقوب) ووتی هەرگیز ناینێرم لەگەڵتان ﴿حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ﴾ هەتا
بەڵێنێکی بتەوم پێ نەدەن لەلایەن خواوە (تا سوێندم بۆ نەخۆن بەخوا) ﴿لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ﴾ کەبێگومان
(بە بێوەی) ئەی هێننەوە بۆم ﴿إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ﴾ مەگەر دەور بدرێن وچارتان نەمێنێت ﴿فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ
مَوْثِقَهُمْ﴾ ئەمجا کاتێك پەیمانیان پێدا (سوێندیان خوارد) ﴿قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ (یەعقوب)
ووتی خوا ئاگادار و چاودێرە سەبارەت بەوەی کەدەیڵێین ﴿٦٦﴾ ﴿وَقَالَ يَٰبَنِىَّ﴾ وە ووتی ئەی کوڕەکانم
﴿لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ﴾ هەمووتان لەدەرگایەکەوەمەچنەژوورەوە ﴿وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ﴾ بەڵکو
لەچەند دەرگایەکی جیاجیاوە بچنە ژوورەوە ﴿وَمَآ أُغْنِى عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾ وە من هیچ سوودتان
پێ ناگەیەنم لەبەرانبەر (پێشهاتی) خوادا ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ هەموو حوکم و بڕیارێك تەنها بۆ خوایە
﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ پشت هەر بەو دەبەستم ﴿وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ﴾ و خۆسپێرانیش با خۆیان
هەر بەو بسپێرن ﴿٦٧﴾ ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا۟﴾ جا کاتێك چوونە ژوورەوە ﴿مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم﴾ لەو شوێنەوەی
کە باوکیان فەرمانی پێ دابوون ﴿مَّا كَانَ يُغْنِى عَنْهُم﴾ ئەو(چوونە بەو جۆرە) هیچ سوودی پێ نەگەیاندن
﴿مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾ لە بەرامبەر (قەدەری) خوادا ﴿إِلَّا حَاجَةً﴾ بەڵکو ئەوە مەبەستیەك بوو ﴿فِى نَفْسِ
يَعْقُوبَ﴾ لە دەروونی یەعقوبدا بوو ﴿قَضَىٰهَا﴾ (بەم شێوە) ئەنجامی دا ﴿وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ﴾ وە بەڕاستی
یەعقوب خاوەنی زانست و زانیاری بوو ﴿لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ﴾ چونکە ئێمە فێرمان کرد بوو ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ
ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن ﴿٦٨﴾ ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ کاتێکیش کە چوونە
ژوورەوە بۆ لای یوسف ﴿ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ﴾ (یوسف) براکەی بردە پەنا خۆیەوە ﴿قَالَ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ﴾
ووتی بەڕاستی من براکەی تۆم ﴿فَلَا تَبْتَئِسْ﴾ کەواتە هیچ غەمبار مەبە ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ بەوەی
کە ئەوان دەیکەن (لەگەڵت) ﴿٦٩﴾

﴿فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ﴾ جا کاتێك کەرێکی خستن و ئەوەی ویستیان پێی دان ﴿جَعَلَ
ٱلسِّقَايَةَ﴾ ئاوخۆری (پێوانەکەی) مەلیکی خستە ﴿فِي رَحْلِ أَخِيهِ﴾ ناو باری براکەی ﴿ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ﴾
پاشان جارچی یەك جاڕی دا ﴿أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ﴾ ئەی کاروانەکە ﴿إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ﴾ بەڕاستی
ئێوە دزن ﴿٧٠﴾ ﴿قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم﴾ ڕوویان تێکردن و ووتیان ﴿مَّاذَا تَفْقِدُونَ﴾ چیتان گوم
کردوە؟ ﴿٧١﴾ ﴿قَالُوا۟﴾ ووتیان ﴿نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ﴾ ئاوخۆرەکەی (پێوانەکەی) پادشامان دیارنیە
﴿وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ﴾ هەر کەسێك بیهێنێتەوە باری ووشترێك (خۆراکی) دەدرێتێ ﴿وَأَنَا۠ بِهِۦ
زَعِيمٌ﴾ وەمنیش دەستەبەری ئەو (بارە) دەبم ﴿٧٢﴾ ﴿قَالُوا۟﴾ ووتیان ﴿تَٱللَّهِ﴾ سوێند بەخوا ﴿لَقَدْ
عَلِمْتُم﴾ بەڕاستی ئێوە دەزانن ﴿مَّا جِئْنَا﴾ کەئێمە نەهاتووین ﴿لِنُفْسِدَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ بۆ ئەوەی خراپە
بکەین لەوولاتدا ﴿وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ﴾ وەئێمە پێشتر دز نەبووین ﴿٧٣﴾ ﴿قَالُوا۟﴾ ووتیان ﴿فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ﴾ دەی
ئایا تۆڵەی ئەودزەچیە ﴿إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ﴾ ئەگەر ئێوە درۆزن بوون ﴿٧٤﴾ ﴿قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ﴾ ووتیان
تۆڵەی ئەوەیە ﴿مَن وُجِدَ فِي رَحْلِهِۦ﴾ لەباری هەرکەسێکدا دۆزرایەوە ﴿فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ﴾ هەر ئەوکەسە
خۆی تۆڵەی بێت (واتە : ئەوەی دزیەکەی کردووە ئەبێتە عەبد و کۆیلەی ئەوەی دزیەکەی لێ کراوە)
﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئا بەو جۆرە تۆڵە لەستەمکاران دەسێنین ﴿٧٥﴾ ﴿فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ﴾ ئەوسا (یوسف)
دەستی کرد بەبشکنینی جەواڵەکانیان (بارەکانیان) ﴿قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ﴾ لەپێش بشکنینی جەواڵی
(بینامین) برای (دایك و باوکی یوسف) ﴿ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا﴾ لەپاشان (ئاو خۆر - پێوانەکەی) دەری هێنا
﴿مِن وِعَآءِ أَخِيهِ﴾ لە جەواڵی براکەیدا ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئا بەو جۆرە ﴿كِدْنَا لِيُوسُفَ﴾ پیلانمان نیشانی یوسف دا
﴿مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ﴾ ئەو نەیدەتوانی براکەی بگرێت ﴿فِي دِينِ ٱلْمَلِكِ﴾ بەپێی ئاینی و یاسایی پادشا
(بەڵکو بەپێ ی ئەو قسە بوو براکانی خۆیان کردیان) ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ مەگەر (کاتێك) کە خوا
بیەوێت ﴿نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ﴾ هەر کەسێك بمانەوێت پلەی بەرز دەکەینەوە ﴿وَفَوْقَ كُلِّ﴾ و لەسەر
هەموو ﴿ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ خاوەن زانستێکەوە زاناتر هەیە (مەبەست پێ خودایە) ﴿٧٦﴾ ﴿قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ﴾
ووتیان ئەگەر ئەو (بنیامین) دزیبێتی ﴿فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ﴾ ئەوە بێگومان براکەشی پێشتر دزی
کردووە (واتە یوسفیش دز بووە) ﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِۦ﴾ بەڵام یوسف (پێناخۆشبوونی خۆی)
بەم (تۆمەتە) لەدەرونی خۆیدا شاردەوە ﴿وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ﴾ دەری نەبڕی بۆ ئەوان ﴿قَالَ أَنتُمْ﴾ (تەنها)
ووتی ئێوە ﴿شَرٌّ مَّكَانًا﴾ لەوان خراپترن ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ﴾ خواش چاك دەزانێ بەوەی
کەئێوە دەیڵێن ﴿٧٧﴾ ﴿قَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ﴾ ووتیان ئەی عەزیز (پادشا) ﴿إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا﴾ بەڕاستی
ئەو باوکێکی زۆر پیری بەتەمەنی هەیە ﴿فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ﴾ جایەکێك لە ئێمە لە جیاتی ئەو بگرە
﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆ لەچاکەکاران دەبینین ﴿٧٨﴾

﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ﴾ (یوسف) ووتی پەنا بەخوا ﴿أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ﴾ لەوەی کە هیچ
کەسێ بگرین بێجگە لەوەی کە ئاو خۆر (پێوانە) کەمان لا دۆزیوەتەوە (کەدزرا بوو) ﴿إِنَّآ
إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ﴾ بەڕاستی ئەگەر وا بکەین ئێمە لەستەم کاران دەبین ﴿٧٩﴾ ﴿فَلَمَّا ٱسۡتَيۡـَٔسُواْ مِنۡهُ﴾
جا کاتێك بێ هیوا بوون لەوەی (وەزیر بەرەڵای بکات) ﴿خَلَصُواْ نَجِيّٗاۖ﴾ چوونە کەنارێك بەچپە
ڕاوێژیان دەکرد ﴿قَالَ كَبِيرُهُمۡ﴾ برا گەورەکەیان ووتی ﴿أَلَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ﴾ ئەی نازانن ﴿أَنَّ أَبَاكُمۡ﴾
کە بێگومان باوکتان ﴿قَدۡ أَخَذَ عَلَيۡكُم مَّوۡثِقٗا مِّنَ ٱللَّهِ﴾ سوێند و پەیمانێکی بەناوی خواوە لێ وەرگرتن
﴿وَمِن قَبۡلُ مَا فَرَّطتُمۡ فِي يُوسُفَۖ﴾ پێشتریش (لەو بەڵێنەی پێتان دابوو) دەربارەی یوسف کەمتەرخەمیتان
کرد ﴿فَلَنۡ أَبۡرَحَ ٱلۡأَرۡضَ﴾ کەواتە من ئەم زەویە بەجێ نایەڵم ﴿حَتَّىٰ يَأۡذَنَ لِيٓ أَبِيٓ﴾ هەتا باوکم
مۆڵەتی (گەڕانەوەم) پێ نەدات ﴿أَوۡ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ لِيۖ﴾ یان خوا بڕیارم بۆ نەدات ﴿وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ﴾ هەرئەویش
باشترینی دادوەرانە ﴿٨٠﴾ ﴿ٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمۡ﴾ ئێوە بگەڕێنەوە بۆ لای باوکتان ﴿فَقُولُواْ يَٰٓأَبَانَآ﴾ وپێی بڵێن
ئەی باوکی خۆمان ﴿إِنَّ ٱبۡنَكَ سَرَقَ﴾ بەڕاستی کوڕەکەت دزی کرد ﴿وَمَا شَهِدۡنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمۡنَا﴾ وئێمەش
بێجگە لەوەی دەمانزانی شایەتیمان نەداوە ﴿وَمَا كُنَّا لِلۡغَيۡبِ حَٰفِظِينَ﴾ خۆ ئێمە ئاگاداری شاراوە
ونهێنی یەکان نەبووین ﴿٨١﴾ ﴿وَسۡـَٔلِ ٱلۡقَرۡيَةَ ٱلَّتِي﴾ (خۆ ئەگەر بڕوا ناکەیت) لەخەڵکی ئەو شارەش بپرسە
﴿كُنَّا فِيهَا﴾ کەئێمەی لێ بووین ﴿وَٱلۡعِيرَ ٱلَّتِيٓ أَقۡبَلۡنَا فِيهَاۖ﴾ ولەو کاروانەش (بپرسە) لەگەڵیدا گەڕاینەوە
﴿وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾ وەبەڕاستی ئێمە ڕاست گۆین ﴿٨٢﴾ ﴿قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ﴾ (یەعقوب
علیه السلام) ووتی وانی یە بەڵکو نەفسی خۆتان کارێکی بۆ جوان (و ئاسان) کردون ﴿فَصَبۡرٞ
جَمِيلٌۖ﴾ بۆیە چارم دان بەخۆدا گرتنە بەجوانی ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ﴾ بەو ئومێدەی خوا
هەموویان ( یوسف و بونیامینیش) م بۆ بهێنێتەوە ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ بەڕاستی هەر ئەو زانای
کاردروستە ﴿٨٣﴾ ﴿وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ﴾ ئەوسا ڕوی لێ وەرگێڕان ﴿وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ ووتی ئاخ و
داخ بۆ یوسف ﴿وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ﴾ وە هەردوو چاوی سپی (و کوێر) بوون لەداخ وخەفەتدا
﴿فَهُوَ كَظِيمٞ﴾ چونکە هەر داخ و خەفەتی خۆی دەخواردەوە ﴿٨٤﴾ ﴿قَالُواْ تَٱللَّهِ﴾ ووتیان سوێند
بەخوا ﴿تَفۡتَؤُاْ تَذۡكُرُ يُوسُفَ﴾ وازناهێنی هەربیری یوسف دەکەیتەوە ﴿حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا﴾ هەتا پەکت
دەکەوێت بەنەخۆشی وخەفەت خواردن ﴿أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَٰلِكِينَ﴾ یان دەمریت و دەچیتە ڕیزی
لەناوچوان ﴿٨٥﴾ ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ووتی من سکاڵا و دەردی دڵ و خەفەت و
پەژارەم هەر لای خوادەکەم ﴿وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ وە من لەلایەن خواوە شتانێك دەزانم
کە ئێوە نایزانن ﴿٨٦﴾

﴿يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ﴾ (یەعقوب ووتی) ئەی کوڕەکانم بڕۆن ﴿فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ﴾ جا بگەڕێن و
هەواڵی یوسف و براکەی بزانن ﴿وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ﴾ نائومێدیش مەبن لەبەزەیی و میهرەبانی
خوا ﴿إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی نائومێد نابێت لەڕەحم و میهرەبانی خوا ﴿إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ
ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ جگە لەوانەی کەبێ بڕوان ﴿٨٧﴾ ﴿فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ﴾ جا کاتێك کە چوونە لای ئەو
(یوسف) ووتیان ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ﴾ ئەی عەزیز (پادشا) ﴿مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ﴾ زیان و برسێتی تووشی
خۆمان و ماڵ و منداڵمان بووە ﴿وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ﴾ و دراوێکی کەممان هێناوە (بۆ کڕینی
خۆراك) ﴿فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ﴾ تۆش پێوانەکەمان بە تەواوی بدەرێ ﴿وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ﴾ خێریشمان
پێ بکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ﴾ بەڕاستی خواپاداشتی خێرەوەمەندان دەداتەوە ﴿٨٨﴾ ﴿قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم
مَّا فَعَلۡتُم﴾ ووتی ئێوە دەزانن چیتان کرد ﴿بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ﴾ بەیوسف و براکەی ﴿إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ﴾
لەوکاتەدا کەئێوە نەزان بوون ﴿٨٩﴾ ﴿قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ﴾ ووتیان بەڕاست تۆ یوسفیت؟ ﴿قَالَ أَنَا۠
يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ﴾ ووتی (پێیان) من یوسفم و ئەمەش برامە ﴿قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ﴾ بەڕاستی خوا
منەتی نابەسەرماندا ﴿إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ﴾ بەڕاستی هەرکەس خۆی بپارێزێت ولەخوا بترسێت
ودان بەخۆیدا بگرێت ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ ئەوسا بەڕاستی خوا پاداشتی چاکەکاران
وون ناکات ﴿٩٠﴾ ﴿قَالُواْ تَٱللَّهِ﴾ ووتیان (بەیوسف) سوێند بەخوا ﴿لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا﴾ بەڕاستی
خوا تۆی هەڵبژارد بەسەر ئێمەدا ﴿وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە لە خەتاکاران بووین ﴿٩١﴾
﴿قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ﴾ (یوسف) ووتی ئەمڕۆ هیچ سەرزەنشت و تەشەرێکتان لەسەر نییە
(لەلایەن منەوە) ﴿يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ﴾ خوالێتان خۆش بێت ﴿وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ وەئەو (خوا) لەهەموو
میهرەبانان میهرەبانترە ﴿٩٢﴾ ﴿ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا﴾ ئەم کراسەی من ببەن ﴿فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي﴾ و بیدەن
بەسەر دەم و چاوی باوکم دا ﴿يَأۡتِ بَصِيرٗا﴾ (دەست بەجێ) چاوی چاك دەبێتەوە ﴿وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ
أَجۡمَعِينَ﴾ ئەوسا هەموو کەس و کارتان بێنن بۆ (ئەم وڵاتەی) من ﴿٩٣﴾ ﴿وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ﴾ جا کاتێك
کاروانەکە (لەمیسر) دەرچوو ﴿قَالَ أَبُوهُمۡ﴾ باوکیان ووتی ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ﴾ بەڕاستی من
بۆنی یوسف هەست پێ دەکەم ﴿لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ﴾ ئەگەر بەخەڵەفاو و بێ عەقڵم دانەنێن ﴿٩٤﴾ ﴿قَالُواْ
تَٱللَّهِ﴾ ووتیان سوێند بەخوا ﴿إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ﴾ تۆ هەر لەسەر هەڵەکەی کۆنی خۆتی ﴿٩٥﴾

﴿فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ﴾ جـا کاتێـك مـژدە دەرەکە هات ﴿أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ﴾ ئەو (کراسـە)ی دابەسـەر
دەم و چاویـدا ﴿فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗا﴾ یەکسـەر بینایی گەڕایەوە (کەپێشـتر نابینا بوو بوو) ﴿قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ﴾
(یەعقـوب) ووتـی من بەئێوەم نـەووت؟ ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ دڵنیابن مـن لەلایەن خواوە
شـتانێك دەزانـم ئێوە نایزانن ﴿٩٦﴾ ﴿قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا﴾ ووتیان ئـەی بابە ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَآ﴾ داوای لێ خۆش
بوونـی گوناهەکانمان بـۆ بکە (لای پەروەردگار) ﴿إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ﴾ بەڕاسـتی ئێمـە گوناهباربووین
﴿٩٧﴾ ﴿قَالَ سَوۡفَ﴾ (یەعقـوب) ووتـی پێیـان دواتـر ﴿أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ﴾ داوای لێبوردنتـان بـۆ دەکەم
لەپەروەردگـارم ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاسـتی هـەر ئـەو لێبـوردەی میهرەبانە ﴿٩٨﴾ ﴿فَلَمَّا دَخَلُواْ
عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ جـا کاتێك چوونە لای یوسـف (لەوڵاتی میسـر) ﴿ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ﴾ دایـك و باوکی بردە
نزیکـی خۆی (و دەسـتی کـردە ملیـان) ﴿وَقَالَ ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ﴾ و فەرمووی پێیان وەرنە میسـر ﴿إِن شَآءَ
ٱللَّهُ ءَامِنِينَ﴾ ئەگـەر خـوا بیەوێـت ئـارام دەبـن (هیـچ زیانێکتـان تووش نایـەت) ﴿٩٩﴾ ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى
ٱلۡعَرۡشِ﴾ وە بـاوك و دایکی لەسـەر تەخت (ی حوکمڕانی خـۆی) دانا ﴿وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ﴾ وە هەموو
کەوتـن بـەڕوودا بـۆی بەسـوژدە بردنەوە ﴿وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ﴾ (یوسـف) ووتی ئـەی باوکی خۆشەویستم
﴿هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ﴾ ئەمـە لێکدانـەوەی خەوەکەم بـوو ﴿مِن قَبۡلُ﴾ کەلەمەو پێـش (بینیم) ﴿قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي
حَقّٗاۖ﴾ بێگومـان پەروەردگارم بەڕاسـتی گێڕا ﴿وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ﴾ وە بەڕاسـتی خوا چاکـەی لەگەڵ کردم
﴿إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ﴾ کاتـێ لـە زینـدان دەری هێنـام ﴿وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ﴾ وە ئێوەشـی لـە لادێ
وبیابانەوە هێنا (بۆ ناوشـار) ﴿مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ دوای ئەوەی شـەیتان ناخۆشی و ناکۆکی خستە
﴿بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ﴾ نێوان من و براکانم ﴿إِنَّ رَبِّي﴾ بەڕاستی پەروەردگارم ﴿لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ﴾ میهرەبانە
بەرامبـەر ئەوەی بیەوێت ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ بەڕاسـتی هەر ئەو زانای کاردروسـتە ﴿١٠٠﴾ ﴿رَبِّ قَدۡ
ءَاتَيۡتَنِي﴾ ئەی پەروەردگارم بەڕاستی پێت بەخشیووم ﴿مِنَ ٱلۡمُلۡكِ﴾ هەندێك لەدەسەڵات و پاشایەتی
﴿وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ﴾ وە هەندێکیـش لـە لێکدانـەوەی خەونـت فێر کردوم ﴿فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەی دروستکەری ئاسمانەکان وزەوی ﴿أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ تۆ پشتیوان و یارمەتی
دەری منی لەدونیا و لەڕۆژی دوایی دا ﴿تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا﴾ بە موسوڵمانێتی بممرێنە ﴿وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ﴾
و بمخـەرە ڕیـزی پیـاو چاکانەوە (لـەدوا ڕۆژدا) ﴿١٠١﴾ ﴿ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ﴾ ئەوەی (کـە باس کرا) لە
هەواڵەنەزانـراو و پەنهانەکانـە ﴿نُوحِيهِ إِلَيۡكَۖ﴾ کـە بـە وەحـی بـۆت دەنێریـن (ئـەی موحەممەد ﷺ)
﴿وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ﴾ تـۆ لای ئـەوان (براکانی یوسـف) نەبوویت ﴿إِذۡ أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ﴾ کاتـێ کەهەموو
بڕیاری خۆیان دا (بەنهێنی) ﴿وَهُمۡ يَمۡكُرُونَ﴾ و پیلانیان داڕشت ﴿١٠٢﴾ ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾
وەزۆربەی خەڵکی هەرچەند تۆ سووربیت (لەسەر باوەڕ هێنانیان) باوەڕ ناهێنن ﴿١٠٣﴾

﴿وَمَا تَسۡـَٔلُهُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۚ﴾ (ئەی موحەممەدﷺ) تۆ داوای هیچ پاداشتێك لەوانە ناكەیت
لەسەر (گەیاندنی) ئەو (قورئانە) ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئەو قورئانە هەر پەند و ئامۆژگاریە
بۆ جیهانیان ﴿١٠٤﴾ ﴿وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ﴾ وە زۆر بەڵگەو نیشانە هەیە ﴿فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ لەئاسمانەكان
و زەویدا ﴿يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا﴾ بە لایاندا دەڕۆن ﴿وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ﴾ بەڵام ئەوان ڕوویان لێ وەردەگێڕن
﴿١٠٥﴾ ﴿وَمَا يُؤۡمِنُ أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ﴾ جا زۆربەیان باوەڕناهێنن بەخوا ﴿إِلَّا وَهُم مُّشۡرِكُونَ﴾ مەگەر ئەوان
لەوكاتەدا هاوبەش بڕیار دەرن بۆ خوا ﴿١٠٦﴾ ﴿أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأۡتِيَهُمۡ﴾ جا ئایا ئەوانە ناترسن یەخەیان
بگرێت ﴿غَٰشِيَةٞ مِّنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ﴾ سزایەكی داپۆشەری خوا ﴿أَوۡ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ﴾ یان لەناكاودا
ڕۆژی دواییان بەسەردا بێت ﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ لە كاتێكدا ئەوان هەستی پێی نەكەن ﴿١٠٧﴾ ﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ
سَبِيلِيٓ﴾ بڵێ ئەمە ڕێگای منە ﴿أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ﴾ بانگی (خەڵكی) دەكەم بۆلای خوا ﴿عَلَىٰ بَصِيرَةٍ﴾
لەسەر بەڵگەی ڕوون وچاوڕۆشنی ﴿أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ﴾ من و ئەوانەش شوێنم كەوتوون ﴿وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ﴾
وخواش پاك و بێگەردە ﴿وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ وە من هیچ كات لەهاوبەش دانەران نیم ﴿١٠٨﴾
﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ﴾ وە ئێمە پێش تۆ (پێغەمبەرمان) نەناردووە ﴿إِلَّا رِجَالٗا﴾ جگە لەپیاوانێك ﴿نُّوحِيٓ
إِلَيۡهِم﴾ كەنیگامان بۆ دەكردن ﴿مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ﴾ لەخەڵكی شار و گوندەكان ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾
دەی ئایا ئەو (بێ بڕوایانە) نەگەڕاون بەسەر زەویدا ﴿فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ﴾ تا سەرنج بدەن چۆن
بووە ﴿عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۗ﴾ سەرئەنجامی ئەوانەی كە لەپێش ئەمانەوە بوون ﴿وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ﴾
وە بێگومان ژیانی ڕۆژی دوایی چاكترە ﴿لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ﴾ بۆ ئەوانەی خۆیان پاراستووە ولەخواترس
بوون (لەدونیادا) ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئێوە ژیرنابن و تێ ناگەن ﴿١٠٩﴾ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ﴾ هەتا كاتێ
پێغەمبەرەكانیان نائومێد بوون (لەسەركەوتن) ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ﴾ وە گەلەكەیان وایان
زانی كە (پێغەمبەران) درۆیان لەگەڵدا كردون ﴿جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا﴾ (لەو كاتەدا) سەركەوتن و یارمەتی
ئێمەیان بۆ هات ﴿فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُۖ﴾ جا ئەوانەی دەمانویست ڕزگاركران ﴿وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا﴾ سزاشمان
ناگەڕێنرێتەوە ﴿عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ لە گەل و هۆزی تاوانبار ﴿١١٠﴾ ﴿لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ﴾ سوێندبێت
بێگومان لەداستانی (پێغەمبەراندا علیهم السلام) ﴿عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ﴾ پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ
خاوەن بیر وهۆشان ﴿مَا كَانَ حَدِيثٗا يُفۡتَرَىٰ﴾ ئەم (قورئانە) چیرۆك و قسەیەك نی یە هەڵبەسترابێت
﴿وَلَٰكِن تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ﴾ بەڵكو بەڕاست دانەر و پشتگیری ئەو (كتێبانە)یە كە لەپێش خۆیەوە
(هاتوون پێش دەستكاری كردنیان لەلایەن جولەكە و گاورەكانەوە) ﴿وَتَفۡصِيلَ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ هەروەها
ڕوون كەرەوەی هەموو شتێكە ﴿وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ﴾ وە ڕێنموونی و میهرەبانیە ﴿لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بۆ ئەوانەی
كەبڕوا دێنن ﴿١١١﴾

# سورەتی ﴿ الرَّعۡدِ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓمٓرۚ﴾ بە(ئەلیف، لام، ڕا) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی، بۆزانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرە) بکە ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ﴾ ئەمانە ئایەتەکانی کتێبی(ئاسمانین) ﴿وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ وە ئەوەی نێرراوەتە خوارەوە بۆتۆ ﴿مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ﴾ لەلایەن پەروەردگارتەوە حەق وڕاستە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناهێنن ﴿١﴾ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي﴾ ئەو خوایەی ﴿رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ ئاسمانەکانی بەرزکردۆتەوە ﴿بِغَيۡرِ عَمَدٖ﴾ بەبێ هیچ پایەوستونێك ﴿تَرَوۡنَهَاۖ﴾ وەك دەیبینن ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ﴾ پاشان بەرزبوەوە بۆ سەرعەرش و قەراری گرت (بەو شێوەی شایستەی خوابێت کەئێمەچونێتیەکەی نازانین) ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ﴾ وەخۆرومانگی ڕام هێناوە (بۆخزمەتکردنی خەڵکی) ﴿كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ﴾ هەر یەکەیان دەگەڕێ تاکاتی دیاری کراو ﴿يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ﴾ هەموو کاروبارێك هەڵدەسوڕێنێ ﴿يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ و ئایەتەکان ڕوون دەکاتەوە (بۆتان) ﴿لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ﴾ هەتا لە (زیندوو بوونەوە و) گەیشتن بەخزمەت پەروەردگارتان دڵنیابن ﴿٢﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ﴾ (خوا) ئەو زاتەیە کە زەوی ڕاخستووە (بەپانی و درێژی) ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۡهَٰرٗاۖ﴾ و چەندها چیا و ڕووباری تێدا داناوە (دروست کردووە) ﴿وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ وەلە هەموو جۆرە میوەیەك ﴿جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ﴾ جوتێك نێر و مێ تێدا دروست کردووە ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَۚ﴾ شەو دەدات بەسەر ڕۆژدا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەوانەدا ﴿لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڵگە و نیشانە هەیە بۆ ئەو کەسانەی کەبیردەکەنەوە ﴿٣﴾ ﴿وَفِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ وە لەزەویدا ﴿قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ﴾ چەند پارچەی لە پاڵ یەکتریدا هەن ﴿وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ﴾ هەروەها باخاتی ترێ و ڕەز ﴿وَزَرۡعٞ﴾ و کشتوکاڵ ﴿وَنَخِيلٞ﴾ و(باخاتی) دارخورمای ﴿صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ﴾ دوو قەد(ی یەك بنج) و یەك قەد ﴿يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ﴾ هەموویان بەیەك ئاو ئاودەدرێن ﴿وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ﴾ کەچی فەزڵی هەندێکیمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا ﴿فِي ٱلۡأُكُلِۚ﴾ لەخواردندا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەوانەدا ﴿لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ چەند نیشانەی ڕوون هەیە بۆ ئەوانەی تێ دەگەن و بیردەکەنەوە ﴿٤﴾ ﴿وَإِن تَعۡجَبۡ﴾ جا ئەگەر تۆ سەرت سوڕ بمێنێ ﴿فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ﴾ ئەوە قسەی ئەوانە جێی سەر سوڕمانە کەدەڵێن ﴿أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا﴾ ئایا کاتێك (کەمردین و) بوینەوە بەخاك ﴿أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ﴾ ئایا ئێمە سەر لە نوێ دروست ئەکرێینەوە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە کەسانێکن ﴿كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ﴾ کە بێ باوەڕ بوون بە پەروەردگاریان ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ﴾ جا ئەوانە کۆت و زنجیر لە گەردنیاندایە ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ وە ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ کە بەهەمیشەیی دەمێننەوە تێیدا ﴿٥﴾

﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ﴾ بەپەلـە داوای سـزات لێ دەکەن ﴿قَبْلَ الْحَسَنَةِ﴾ پێـش چاکەو بەزەیی ﴿وَقَدْ
خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ الْمَثُلَاتُ﴾ کـە بێگومان لەپێش ئەمانەوە زۆر هەبوون تۆڵەیان لێ سـەنراوە ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ﴾
و بەڕاسـتی پەروەردگارت ﴿لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ﴾ خاوەنـی لێ بوردنە بـۆ خەڵکی ﴿عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ﴾ گەرچی
ستەمکاریش بن ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ﴾ هەروەها بەڕاسـتی پەروەردگارت ﴿لَشَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ تۆڵەسـێنێکی توند
وتیـژە (٦) ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە ئەوانـەی کـە بـێ باوەڕ بـوون دەیـان ووت ﴿لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ﴾ ئەوە
بـۆ نەنێردراوەتـە خوارەوە بـۆی ﴿آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ﴾ موعجیزەیـەك لەلایـەن پەروەردگاریەوە ﴿إِنَّمَا أَنتَ
مُنذِرٌ﴾ ئەی موحەممەد ﷺ تۆ هەر ترسێنەری ﴿وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ﴾ و بۆ هەموو گەلێك ڕێنیشاندەرێك
هەیـە (٧) ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ﴾ خـوا دەزانێ هەموو مێینەیەك (لـە منداڵدانیدا) چی هەڵگرتووە
(کـوڕ یـان کـچ) ﴿وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ﴾ وە هەروەهـا دەزانێـت منداڵدانەکان چـی لـێ کەمدەبێتەوە ﴿وَمَا
تَزْدَادُ﴾ و چـی زیاد دەکات ﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ وە هەموو شـتێك لای ئـەو (خوا) ئەندازەی
(دیـاری کـراوی خۆی) هەیـە (٨) ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ (خـوا) زانایـە بەهەموو دیـار و نادیارێك
﴿الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ﴾ گـەورە و بـەرزە وبڵنـدە (٩) ﴿سَوَاءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ﴾ یەکسـانە (بۆ خـوا)
ئەوەتان بەنهێنی قسە بکات ﴿وَمَن جَهَرَ بِهِ﴾ وە ئەوەتان بەئاشکرا (قسە) بکات ﴿وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ﴾
و ئەوەی کەلەشـەودا خۆی دەشـارێتەوە ﴿وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ﴾ ئەوەی کەلە ڕۆژدا دەردەکەوێت (١٠) ﴿لَهُ
مُعَقِّبَاتٌ﴾ بۆ ئەو (ئادەمی) هەیە چەند فریشـتەیەك کە بەدوای یەکدا دێن ﴿مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ﴾
لەپێش و لەدوایەوە ﴿يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ﴾ بەفەرمانی خوادەی پارێزن لەزیان ﴿إِنَّ اللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا
﴿لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ﴾ (بارو حاڵی) هیچ گەلێك ناگۆڕێت ﴿حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ هەتا ئەوان خۆیان (بارو
حاڵی) خۆیان نەگۆڕن ﴿وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ﴾ وەکاتێك خوا بیەوێت ﴿بِقَوْمٍ سُوءًا﴾ گەل وهۆزێك تووشی بەلا
وسـزا بکات ﴿فَلَا مَرَدَّ لَهُ﴾ هیچ شتێك ناتوانێت ڕێگری لێ بکات ﴿وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ﴾ و جگە
لەو (خوا) هیچ یارمەتی دەر و پشـتیوانێکیان نی یـە (١١) ﴿هُوَ الَّذِي﴾ (خوا) ئەو زاتەیە ﴿يُرِيكُمُ الْبَرْقَ﴾
بروسـکەتان نیشـان دەدات ﴿خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ کەهـۆی ترسـاندن و هیـوا وئومێدتانـە ﴿وَيُنشِئُ السَّحَابَ
الثِّقَالَ﴾ هەروەهـا هـەوری قـورس (بەئـاوی بـاران) بـەدی دەهێنێـت (١٢) ﴿وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ﴾
وە هەورە گرمە سوپاس و ستایشی ئەو (خوا) دەکات ﴿وَالْمَلَائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ﴾ هەروەها فریشتەکانیش
لە هەیبەت و ترسـی ئەو (ستایشـی دەکەن) ﴿وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ﴾ وە (پەروەردگار) هەورە بروسـکەکان
دەنێرێت ﴿فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَاءُ﴾ و دەیدات لە هەرکەسێ کەبیەوێت ﴿وَهُمْ يُجَادِلُونَ فِي اللَّهِ﴾ لە کاتێکدا
ئەوانە دەمە دەمێ (وموجادەلە) دەکەن دەربارەی خوا ﴿وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ﴾ و ئەو (خوا) هێز و توانای
زۆر بەتینە (١٣)

﴿لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۚ﴾ نـزاو پاڕانـەوەی هەقیـش هەر بـۆ (خوایـە) ﴿وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ ئەوانـەش دەلاڵێنەوە
و نـزا لای غەیری خـوا دەکەن ﴿لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ﴾ هیچ وەڵامێکیـان نادەنەوە (نایـەن بەهاواریانەوە)
﴿إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ﴾ مەگەر وەك کەسێك (کەتینووی بێت لەدوورەوە) هەردوو مشتی خۆی بۆلای
ئاوێـك درێـژ کردبێ ﴿لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦۚ﴾ بۆ ئـەوەی (ئاو) بگاتە دەمی بـەڵام نایگاتێ ﴿وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ
إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ﴾ نـزاو دوعـای بـێ بڕوایـان (لەبتەکانیـان) هیچ نیە جگـە لەگومڕایی و سـەر لێ شـێوان
﴿١٤﴾ ﴿وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ﴾ سـوژدە بـۆ خوا دەبـات ﴿مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ هەرچی لەئاسـمانەکان و زەویدایە
﴿طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا﴾ بیانـەوێ و نەیانـەوێ ﴿وَظِلَٰلُهُم بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ۩﴾ هەروەهـا سـێبەرەکانیان لەبەیانیـان و
ئێواراندا(سوژدە دەبەن) ﴿١٥﴾ ﴿قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ کێ پەروەردگاری
ئاسـمانەکان و زەوی یـە ﴿قُلِ ٱللَّهُۚ﴾ بڵـێ خـوا ﴿قُلۡ﴾ جا بڵـێ ﴿أَفَٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ﴾ دەی ئێوە بێجگە
لەو(خـوا) پشـتیوانانێکتان هەڵـبژاردووە (بـۆ خۆتـان) ﴿لَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ نَفۡعٗا وَلَا ضَرّٗاۚ﴾ کەخاوەنـی
هیـچ سـوود و زیانێـك نین بۆ خۆشـیان ﴿قُلۡ﴾ بڵێ ﴿هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ﴾ ئایا کوێر و چاو سـاغ
یەکسـانن؟ ﴿أَمۡ هَلۡ تَسۡتَوِي ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُۗ﴾ یـان ئایـا تاریکیـەکان و ڕووناکـی وەك یـەك وان؟ ﴿أَمۡ جَعَلُواْ لِلَّهِ
شُرَكَآءَ﴾ نەخێـر ئەوانە چەند هاوبەشـێکیان بۆ خوا داناوە؟ ﴿خَلَقُواْ كَخَلۡقِهِۦ﴾(گوایە) وەك دروسـتکراوانی
خوایان دروسـت کردبێت؟ ﴿فَتَشَٰبَهَ ٱلۡخَلۡقُ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ ئەوسا دروسـت کراوەکەیان لێ شێواوە!! ﴿قُلِ ٱللَّهُ﴾
بڵێ خوا ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ دروسـت کاری هەموو شتێکە ﴿وَهُوَ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّٰرُ﴾ و هەر ئەویشە تاك و تەنیای
زاڵە بەسـەر هەموو شتێکدا ﴿١٦﴾ ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ بارانی لەئاسمانەوە باراندووە ﴿فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا﴾
جا هەر شـیو و دۆڵێك بە ئەندازەی خۆی لافاوی هەڵدەسـێت ﴿فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ﴾ ئەوسا لافاوەکە هەڵی
دەگرێـت ﴿زَبَدٗا رَّابِيٗاۖ﴾ کەفێکـی بەرزبـووە (بـە لافاوەکـەوە) ﴿وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيۡهِ فِي ٱلنَّارِ﴾ هەروەهـا لـەو
(کانزایانـەش پەیدادەبـێ) کە ئاگری بۆ تاودەدەن (دەیتوێننەوە) ﴿ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ﴾ بەمەبەسـتی دروسـت
کردنی خشـڵ (زێڕ وزیوو)﴿أَوۡ مَتَٰعٖ﴾ یان شـتوومەکی تر (وەك قـاپ و قاچاغ) ﴿زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥۚ﴾ کەفێك
وەکـو ئـەو (کەفی لافـاوە پەیدا دەبێ) ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئـا بەو جۆرە ﴿يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَۚ﴾ خـوا نموونەی
حەق و بەتاڵ دێنێتەوە﴿فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ﴾ جا کەفەکە دەڕوات و لە ناو دەچێ ﴿وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ﴾
بەڵام ئەوەی کە سوود ئەگەیەنێت بەخەڵکی ﴿فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ لەزەویدا دەمێنێتەوە ﴿كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ
ٱلۡأَمۡثَالَ﴾ ئابـەو جـۆرە خـوا نموونـەکان دەهێنێتـەوە ﴿١٧﴾ ﴿لِلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ﴾ بـۆ ئەوانـەی وەڵامـی
بانگەوازی پەروەردگاریان دایەوە ﴿ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ (پاداشـتی) هەرە چاك (بەهەشـت) هەیە ﴿وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ
لَهُۥ﴾ ئەوانەش وەڵامی بانگەوازی (پەروەردگار)یان نەدایەوە ﴿لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ ئەگەر هەرچی
وا لـە زەویـدا هەمووی هـی ئەوان بـێ ﴿وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ﴾ ئەوەندەی تریشـی لەگـەڵ بێت ﴿لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦٓۚ﴾
دەیـدەن لـە بریتـی و بەدەلـی سـزای ڕۆژی دوایـی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ﴾ ئەوانە بۆیـان هەیە ﴿سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ﴾
لێپرسـینەوەیەکی سـەخت وخراپ ﴿وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ﴾ و جێگایان دۆزەخە ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ﴾ ئای کەچەند
شوێنێکی بەد و خراپە ﴿١٨﴾

﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ﴾ جا ئایا کەسێك کە بزانێت ( ژێری بخاتە کار) ﴿أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ بەڕاستی ئەوەی نێرراوەتە
خوار بۆ تۆ ﴿مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ﴾ لەلایەن پەروەردگارتەوە حەق وڕاستە ﴿كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ﴾ وەك ئەو کەسەیە
کە کوێربێت (ژێری خۆی نەخاتە کار و بێ باوەڕ بێت) ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ بێگومان هەر
ئەوانە بیر دەکەنەوە کە خاوەنی ژیرین ﴿١٩﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی کە پەیمانی خوا دەبەنە
سەر ﴿وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ﴾ وە بەڵێن ناشکێنن و هەڵی ناوەشێننەوە ﴿٢٠﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ﴾ وە ئەوانەی کە
پەیوەندی خزمایەتی بەجێ دەهێنن ﴿مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ بەوەی خوا فەرمانی داوە کەپەیوەست
بکرێت لەگەڵیاندا (وەك بەسەرکردنەوەی خزمان) ﴿وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ﴾ وە لە پەروەردگاریان دەترسن
﴿وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ﴾ وە لەخراپە و سەختی لێپرسینەوە دەترسن ﴿٢١﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ﴾ وە ئەوانەن کە
دانیان بەخۆیاندا گرت ﴿ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ﴾ بەمەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگاریان ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾
وە نوێژیان بەجێ هێناوە ﴿وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ﴾ وە لەو ڕۆزیەی پێمان داوون بەخشیوویانە ﴿سِرّٗا
وَعَلَانِيَةٗ﴾ بەنهێنی و بەئاشکرا ﴿وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ﴾ وە بەچاکە بەرگری لەخراپە دەکەن (بەچاکە
خراپەکانیان دەسڕنەوە و لای دەبەن) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ﴾ سەر ئەنجامی چاکی ئەو دونیا هەر بۆ
ئەوانە ﴿٢٢﴾ ﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٖ﴾ بەهەشتانێك جێگای مانەوەی هەمیشەیی یە ﴿يَدۡخُلُونَهَا﴾ کە ئەوان دەچنە ناویەوە
﴿وَمَن صَلَحَ﴾ هەروەها ئەوانەش کە چاك بوون ﴿مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ﴾ لەباو و باپیرانیان ﴿وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ﴾
وهاوسەرانیان و وەچە و نەوەکانیان ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ فریشتەکانیش ﴿يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ﴾ دەچنە
ژوورەوە بۆ لایان لە هەموو دەرگایەکەوە ﴿٢٣﴾ ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم﴾ (پێیان دەڵێن) سەلامتان لێ بێ ﴿بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ﴾
چونکە ئارامتان گرت (لە دونیادا) ﴿فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ﴾ جا چەند سەر ئەنجامێکی چاکتان بوو ﴿٢٤﴾
﴿وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ﴾ بەڵام ئەوانەی کە پەیمانی خوا هەڵ دەوەشێننەوە ﴿مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ لەپاش
بەستن و گرێ دانی ﴿وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ ئەو پەیوەندی خزمایەتیەی کە خوا فەرمانی
پێ داوە بەجێی ناهێنن و ئەیبچڕێنن ﴿وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ و خراپەکاری دەکەن لەزەویدا ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ
ٱللَّعۡنَةُ﴾ هەر بۆ ئەوانە نەفرین و دووریی لەبەزەیی خوا ﴿وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾ هەوەها بۆ ئەوانە سەرئەنجامی
خراپ ﴿٢٥﴾ ﴿ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ﴾ خوا ڕزق و ڕۆزی فراوان دەکات ﴿لِمَن يَشَآءُ﴾ بۆ هەرکەسێك خۆی
بیەوێت ﴿وَيَقۡدِرُۚ﴾ وەکەمی دەکات (بۆ هەرکەسێك بیەوێت) ﴿وَفَرِحُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ وە ئەوانە دڵخۆش
بوون بەژیانی دونیا ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا﴾ لەکاتێکدا ژیانی دونیا هیچ نیە ﴿فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ لەچاو ڕۆژی دواییدا
﴿إِلَّا مَتَٰعٞ﴾ جگە لە ڕابواردنێکی چەند ساتێکی کەم نەبێت ﴿٢٦﴾ ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانە کەبێ بڕوا
بوون دەڵێن ﴿لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ﴾ بۆچی نەنێررا بۆی ﴿ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ﴾ موعجیزەیەك لەلایەن پەروەردگاریەوە
﴿قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بەڕاستی خوا ﴿يُضِلُّ مَن يَشَآءُ﴾ هەر کەسی بوێت گومڕای
دەکات (کەشیاوی گومڕاکردنە) ﴿وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ﴾ وە ڕێنموونی هەر کەسێك دەکات کە بۆلای
خۆی گەڕابێتەوە ﴿٢٧﴾ ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە ﴿وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم﴾ ودڵیان ئارام دەبێت
﴿بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ﴾ بەیادی خوا ﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾ ئاگاداربن کەهەر بە یادی خوا ﴿تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾ دڵەکان ئارام
دەگرن ﴿٢٨﴾

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ و كردەوە چاكەكانیان كردووە ﴿طُوبَىٰ لَهُمۡ﴾
خۆش بەختی بۆ ئەوانە ﴿وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ﴾ لەگەڵ سەرەنجامی چاك ﴿٢٩﴾ ﴿كَذَٰلِكَ أَرۡسَلۡنَٰكَ﴾ هەر بە شێوەی
(پێغەمبەرانی تر) تۆمان ڕەوانە كردوە ﴿فِيٓ أُمَّةٖ﴾ لەناو گەل و ئوممەتێكدا ﴿قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهَآ أُمَمٞ﴾
كە لەپێش ئەوانەوە گەل و ئوممەتی تر هاتوون و چوون ﴿لِّتَتۡلُوَاْ عَلَيۡهِمُ ٱلَّذِيٓ﴾ بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە
بەسەریاندا ئەوەی ﴿أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ نیگامان كردووە بۆت ﴿وَهُمۡ يَكۡفُرُونَ بِٱلرَّحۡمَٰنِۚ﴾ لەكاتێكدا ئەوانە
بڕواناهێنن بەخوای میهرەبان ﴿قُلۡ هُوَ رَبِّي﴾ بڵێ ئەو پەروەردگاری منە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێكی
بەهەق نی یە بێجگە لە ئەو ﴿عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ﴾ پشتم هەر بەو بەستووە ﴿وَإِلَيۡهِ مَتَابِ﴾ گەڕانەوەشم
هەر بۆلای ئەوە ﴿٣٠﴾ ﴿وَلَوۡ أَنَّ قُرۡءَانٗا﴾ بەڕاستی ئەگەر قورئانێك (بەخوێندنەوەی) ﴿سُيِّرَتۡ بِهِ ٱلۡجِبَالُ﴾
چیاكانی پێ ببرایە (بۆ شوێنێكی تر) ﴿أَوۡ قُطِّعَتۡ بِهِ ٱلۡأَرۡضُ﴾ یان زەوی پێ لەت لەت بكرایە ﴿أَوۡ كُلِّمَ بِهِ
ٱلۡمَوۡتَىٰۗ﴾ یان لەگەڵ مردوواندا قسەی بكردایە (ئەمجا باوەڕ ناهێنن) ﴿بَل لِّلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ جَمِيعًاۗ﴾ بەڵام هەموو
كاروبارەكان بەدەست خوان ﴿أَفَلَمۡ يَاْيۡـَٔسِ﴾ دەی ئایا بێ هیوا نەبوون (ونەیان زانیوە) ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾
ئەوانەی كەبڕوایان هێناوە ﴿أَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ﴾ كەئەگەر خوا بیویستایە ﴿لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۗ﴾ هەموو
خەڵكی دەخستە سەر ڕێگەی ڕاست ﴿وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وە ئەوانەی كەبێ باوەڕ بوون هەمیشە
﴿تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ﴾ بەڵای سەختیان تووش دەبێت بەهۆی ئەوەی كردوویانە ﴿أَوۡ تَحُلُّ قَرِيبٗا مِّن
دَارِهِمۡ﴾ یان ئەو (بەڵایە) لە نزیك ماڵەكانیانەوە ڕوودەدات ﴿حَتَّىٰ يَأۡتِيَ وَعۡدُ ٱللَّهِۚ﴾ هەتا بەڵێنی خوا
دێتە دی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ﴾ بەڕاستی خوا بەڵێنی خۆی بەدی دەهێنێت ﴿٣١﴾ ﴿وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ﴾
سوێند بەخوا بێگومان گاڵتە وسووكایەتی كرا ﴿بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ﴾ بە پێغەمبەرانی زۆر لەپێش تۆوە
﴿فَأَمۡلَيۡتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ منیش (ماوەیەك) مۆڵەتم دا بەوانەی بێ باوەر بوون ﴿ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ﴾ پاشان
ئەوانم گرت (تۆڵەم لێ سەندن) ﴿فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ﴾ جا چۆن بوو تۆڵەی من (دەربارەیان) ﴿٣٢﴾
﴿أَفَمَنۡ هُوَ قَآئِمٌ﴾ دەی ئەو (خوایە)ی چاودێرە ﴿عَلَىٰ كُلِّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۗ﴾ بەسەر هەموو كەسەوە هەرچی
كردووە (وەك بتانێكە ئاگای لە هیچ نی یە) ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ﴾ ئەوانە هاوبەشانێكیان بۆ خوا بڕیار
داوە ﴿قُلۡ سَمُّوهُمۡۚ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ناوی ئەو (بت و هاوبەشانەم) بۆ بڵێن ﴿أَمۡ تُنَبِّـُٔونَهُۥ﴾
یان ئێوە هەواڵ دەدەن بەخوا ﴿بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بەوەی كە(بەخەیاڵی ئێوە) نایزانێت لەزەویدا
﴿أَم بِظَٰهِرٖ مِّنَ ٱلۡقَوۡلِۗ﴾ یان قسەی ڕوت و (بێ مانا) دەكەن ﴿بَلۡ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكۡرُهُمۡ﴾ (نەخێر خوا
هاوبەشی نی یە) بەڵكو ئەوانەی بێ باوەڕ بوون فێڵ و پیلانی خۆیان بۆ ڕازێنرایەوە ﴿وَصُدُّواْ عَنِ
ٱلسَّبِيلِۗ﴾ وە قەدەغە كران لەڕێگەی ڕاست ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ﴾ هەر كەسیش خوا گومڕای بكات
﴿فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ﴾ ئەوە هیچ ڕێ نیشاندەرێكی بۆ نی یە ﴿٣٣﴾ ﴿لَّهُمۡ عَذَابٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ ئەوانە لە ژیانی
دونیادا سزایان بۆ هەیە ﴿وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَقُّۖ﴾ وە بەڕاستی سزای ڕۆژی دوایی سەخت ترو گران ترە
﴿وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ﴾ وە بێگومان هیچ پارێزەرێك نی یە بۆ ئەوان لە (سزای) خوا ﴿٣٤﴾

﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ وێنـەی ئـەو بەهەشـتەی کەبەڵێـن دراوە بـە پارێزکاران و لەخواترسـان
﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ڕوبارەکان دەڕۆن بەژێر باخەکانیدا ﴿أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا﴾ میوە وسێبەرەکانی
(بەهەشت) هەمیشـەیین ﴿تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟﴾ ئەو(بەهەشتە) ئاکامی ئەوانەیە کە خۆیان پاراست
(لە دونیادا) ولەخواترسـان ﴿وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ﴾ و ئاکامی بێ باوەڕانیش هەر ئاگرە (٣٥) ﴿وَٱلَّذِينَ
ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەوانـەش کتێبمـان پێ دابوون ﴿يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ شـاد دەبن بـەوەی نێرراوەتە
خـوارەوە بۆت ﴿وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن﴾ و هەنـدێ لە گرۆ و تاقمەکان هەن ﴿يُنكِرُ بَعْضَهُۥ﴾ هەندێك لەوە
ئینـکار دەکـەن ﴿قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ﴾ بڵێ مـن تەنها فەرمانم بـەوە پێدراوە ﴿أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ﴾ کە خوا بپەرسـتم
﴿وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ﴾ و هیـچ هاوبەشـێکی بـۆ دانەنێم ﴿إِلَيْهِ أَدْعُوا۟ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ﴾ هەر بۆلای خـوا (خەڵکی)
بانـگ ئەکەم گەڕانەوەشـم تەنها بـۆلای ئەو(خوایە) (٣٦) ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ﴾ بەو شـێوە ئەو(قورئانە)مان
ناردۆتەخوارەوە(بـۆ تۆ) ﴿حُكْمًا عَرَبِيًّا﴾ کە فەرمانێکی عەرەبییە ﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم﴾ سـوێند بەخوا
بەڕاسـتی ئەگـەر تۆ شـوێنی ئارەزوەکانـی ئەوانە بکەوی ﴿بَعْدَ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ لـەدوای ئەو وەحی و
شارەزاییەی کە هاتووە بۆت ﴿مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ﴾ هیچ پارێزەرێکت نابێت لە(سزای) خوا (٣٧)
﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان پێش تۆ پێغەمبەرانێکمان ناردووە ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ﴾
و پێمـان دان ﴿أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً﴾ هاوسـەر و نـەوە و وەچە ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ﴾ وە بۆ هیـچ پێغەمبەرێك نەبووە
﴿أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ﴾ (پێش تۆ) نیشـانەیەك (موعجیزەیەك) بێنێ ﴿إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ مەگەر بەئیزنی خوا نەبێت
﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ﴾ بۆهەموو کارێك وەختێکی تایبەتی هەیە کەنووسراوە (٣٨) ﴿يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ﴾
ئـەوەی خـوا بیـەوێ دەیسـڕێتەوەو (ئـەوەش بیـەوێ) دەیهێڵێتەوە ﴿وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ﴾ سـەرچاوەی
کتێبـەکان لای ئـەو (خوایە کە لـوح المحفوظ)ە (٣٩) ﴿وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ﴾ جا ئەگەر نیشـانت دەین ﴿بَعْضَ
ٱلَّذِى﴾ هەندێـك لەو ﴿نَعِدُهُمْ﴾ هەڕەشـانەی لێمان کردون ﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ یـان (پێش ئەوە) بتمرێنین
﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ﴾ بێگومان تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسـەرە﴿وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ﴾ و لێپرسـینەوەش لەسەر
ئێمەیـە (٤٠) ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟﴾ ئایا (بێباوەڕان) سـەرنجیان نـەداوە ﴿أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا﴾ کەئێمە
زەوی کـەم دەکەینـەوە لـە هەمـوو لایەکانـی یـەوە﴿وَٱللَّهُ يَحْكُمُ﴾ و خوا (بەویسـتی خـۆی) بڕیار
دەدات ﴿لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ﴾ کـەس ناتوانێ بڕیاری ئەو (خوا) بگۆڕێ (یا هەڵوەشـێنێتەوە) ﴿وَهُوَ سَرِيعُ
ٱلْحِسَابِ﴾ و ئەو (خوا) لێپرسـینەوەی خێرایـە (٤١) ﴿وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ وە بێگومان ئەوانەی پێش
ئەمانیش فێڵ و پیلانیان گێڕا ﴿فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا﴾ بەڵام هەموو پیلان و (نەخشەیەکی سەرکەوتوو) بۆ
خوایە (لەبەرامبەر نەخشـە وپیلانی ئەواندا) ﴿يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ﴾ (خوا) دەزانێت هەموو کەس چی
دەکات ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ﴾ و لەمـەو دواش بێ باوەڕان دەزانن ﴿لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ﴾ سـەرئەنجامی (هەر
دوو جیهان) بۆ کێ دەبێت (٤٢)

﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕ بوون پێت دەڵێن ﴿لَسْتَ مُرْسَلًا﴾ تۆ ڕەوانەکراو
(وپێغەمبەری خوا) نیت ﴿قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ﴾ تۆش (ئەی موحەممەد ﷺ پێیان) بڵێ خوا بەسە ﴿شَهِيدًۢا
بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ شایەت بێت لەنێوان من و ئێوەدا ﴿وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ﴾ هەروەها ئەو کەسەش
کەشارەزایی کتێبی (ئاسمانی) لایە ﴿٤٣﴾

## سورەتی ﴿إِبْرَٰهِيمَ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓر﴾ بە(ئەلیف لام ڕا) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی، بۆزانیاری زیاتر سەیری سەرەتای
سورەتی (البقرە) بکە ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ﴾ ئەمە پەڕاوێکە ناردومانەتە خوارەوە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد
ﷺ) ﴿لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ﴾ بۆ ئەوەی خەڵکی ڕزگار بکەیت ﴿مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ لەتاریکی یەکانەوە بۆ
ڕووناکی (لەتاریکی بێ باوەڕیەوە بۆ ڕووناکی باوەڕ وئیمان) ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِمْ﴾ بەئیزنی پەروەردگاریان
﴿إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾ (ڕێنموونیان بکەیت) بۆ ڕێگای (خوای) بەدەسەڵات وزاڵی سوپاس
کراو ﴿١﴾ ﴿ٱللَّهِ ٱلَّذِى﴾ ئەو خوایەی ﴿لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ کە هەرچی لەئاسمانەکان
وزەویدایە هی ئەوە ﴿وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ﴾ و هاوار و وای بۆ بێ باوەڕان ﴿مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ لە سزایەکی
سەخت ﴿٢﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ﴾ ئەوانەی کە ژیانی دونیایان لا خۆشترە
لە ژیانی ڕۆژی دوایی ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وقەدەغەی (خەڵکی) دەکەن لەڕێگای خوا
﴿وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ دەیانەوێت ئەو (ڕێگای خوا) لارو چەوت نیشان دەن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ﴾
ئەوانە لەگومڕاییەکی دوور(لە ڕاستی)دان ﴿٣﴾ ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ﴾ وە هیچ پێغەمبەرێکمان
ڕەوانە نەکردووە ﴿إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ﴾ بەزمانی گەلەکەی خۆی نەبێت ﴿لِيُبَيِّنَ لَهُمْ﴾ بۆ ئەوەی
(ئایینەکەیان) بۆ ڕوون بکاتەوە ﴿فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ﴾ ئەوسا خوا هەرکەسی ویستبێت گومڕای کردووە
(بەهۆی سەرکەشی خۆیەوە) ﴿وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ هەرکەسێکیشی ویستبێ ڕێنموونی کردووە
﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ هەر ئەویش زاڵ وبەدەسەلاّتی کاردروستە ﴿٤﴾ ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ﴾ سوێند
بەخوا بەڕاستی موسامان نارد ﴿بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ بەموعجیزەکانمانەوە ﴿أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ﴾ (فەرمانمان
پێدا) کە گەلەکەت ڕزگار بکە ﴿مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ لەتاریکیەکانی (بێ باوەڕیەوە) بۆ ڕووناکی
(باوەڕ و ئیمان) ﴿وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ﴾ ڕۆژە (پیرۆزە) کانی خودایان بەبیر بهێنەرەوە (یا فەزڵەکانی
خوایان بیر بخەرەوە) ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ﴾ بەڕاستی لەو (بیرخستنەوە)دا پەند و بەڵگەی زۆر
هەیە ﴿لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بۆ هەموو خۆڕاگرێکی سوپاس گوزار ﴿٥﴾

﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ﴾ (بیریان بخەرەوە) کاتێك مووسا بەگەلەکەی ووت ﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ
عَلَيۡكُمۡ﴾ بیری ئەو فەزڵ و بەهرە وچاکەی خودا بکەنەوە کە بەسەرتانەوەیە ﴿إِذۡ أَنجَىٰكُم﴾
(ئەویش ئەوە بوو) کاتێك کەڕزگاری کردن ﴿مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ﴾ لە دارو دەستەکەی فیرعەون
﴿يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ﴾ کەسزای خراپیان پێ دەچەشتن (بەهەمیشەیی) ﴿وَيُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ﴾
وکوڕانی ئێوەیان سەردەبڕی ﴿وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ﴾ و ئافرەتانی ئێوەیان بەزیندوویی دەهێشتەوە
(بۆ خزمەت کاری) ﴿وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ﴾ لەوەتاندا تاقی کردنەوەیەکی گەورە بوو
لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿٦﴾ ﴿وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ﴾ (بیریان بخەرەوە) کاتێك کە پەروەردگارتان
ڕای گەیاند ﴿لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ﴾ سوێندبێ بێگومان ئەگەر ئێوە سوپاسی (چاکەی) من
بکەن بۆتان زیاد دەکەم ﴿وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٞ﴾ بەلاّم بێگومان ئەگەر نا سوپاسی بکەن ئەوە
بەڕاستی سزای من زۆربەتینە ﴿٧﴾ ﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ﴾ مووسا فەرمووی ﴿إِن تَكۡفُرُوٓاْ أَنتُمۡ﴾ ئەگەر ئێوە
ناسوپاسی (نیعمەتەکانی خوا) بکەن ﴿وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ و هەموو ئەو کەسانەش لەزەویدان
﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ ئەوە بەڕاستی خوا بێ نیازی سوپاس کراوە ﴿٨﴾ ﴿أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ﴾ ئایا بۆتان نەهاتووە
﴿نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ هەواڵی ئەو گەلانەی کە لەپێش ئێوەدا بوون ﴿قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ﴾ وەك
گەلی نووح و عاد و سەموود ﴿وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ﴾ هەروەها ئەوانەی کە لەپاش ئەوان بوون
وهاتن ﴿لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُۚ﴾ بێجگە لەخوا هیچ کەس نایانزانێت ﴿جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾
پێغەمبەرەکانیان بۆهات بە موعجیزە وبەڵگەی ئاشکراوە ﴿فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ ئەمجا
ئەوان دەست و پەنجەی خۆیان گەست لە ڕق و قین دا ﴿وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا﴾ و ووتیان بەڕاستی
ئێمە بێ باوەڕین ﴿بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ﴾ بەو(پەیامە)ی کە بەئێوەدا نێردراوە ﴿وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ﴾ وە بەڕاستی
ئێمە لەگوماندایین ﴿مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ﴾ لەوەی ئێوە بانگمان دەکەن بۆلای و دوو دڵین ﴿٩﴾
﴿قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ﴾ پێغەمبەرەکانیان ووتیان (پێیان) ﴿أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ﴾ ئایا لە (بوونی) خوادا گومان
هەیە ﴿فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە ﴿يَدۡعُوكُمۡ﴾ بانگتان دەکات
﴿لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ﴾ بۆ ئەوەی لەگوناهەکانتان خۆش بێت ﴿وَيُؤَخِّرَكُمۡ﴾ و دواتان بخات
﴿إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ﴾ بۆ کاتێکی دیاری کراو ﴿قَالُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ﴾ ووتیان ئێوەش ﴿إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا﴾ هەر ئادەمیەکی
وەك ئێمەن ﴿تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا﴾ دەتانەوێت بەرگری ئێمە بکەن و لامان دەن ﴿عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا﴾
لە(پەرستنی) ئەوەی کە باوو باپیرانمان دەیان پەرست ﴿فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ﴾ دەی نیشانە
وبەڵگەیەکی ڕوونمان بۆ بێنن (ئەگەر ڕاست دەکەن پێغەمبەرن) ﴿١٠﴾

﴿قَالَتۡ لَهُمۡ رُسُلُهُمۡ﴾ پێغەمبەرەکانیان پێیان ووتن ﴿إِن نَّحۡنُ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ﴾ ئێمە هەر ئادەمیەکین وەکو ئێوە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ﴾ بەڵام خوا ﴿يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ﴾ منەت دەنێت بەسەر هەرکام لەبەندەکانیدا کەبیەوێت (دەیکاتە پێغەمبەر) ﴿وَمَا كَانَ لَنَآ﴾ وە ئێمە هەرگیز ناتوانین ﴿أَن نَّأۡتِيَكُم بِسُلۡطَٰنٍ﴾ موعجیزە و بەڵگەیەکتان بۆ بێنین ﴿إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ﴾ مەگەر بەئیزنی خوا نەبێت ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ وە باوەڕداران پشت هەر بەخوا ببەستن ﴿١١﴾ ﴿وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ﴾ وە ئایا بۆچی پشت بەخوا نەبەستین ﴿وَقَدۡ هَدَىٰنَا سُبُلَنَاۚ﴾ کە بێگومان ئەو (زاتە) ڕێگای ڕاستی نیشان داوین؟ ﴿وَلَنَصۡبِرَنَّ﴾ وە بەڕاستی دان بەخۆماندا دەگرین ﴿عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ﴾ لەسەر هەر ئازارێك كە بمان دەن ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ﴾ دەبا خۆسپێران پشت هەر بەخوا ببەستن ﴿١٢﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێ بڕواکان ووتیان ﴿لِرُسُلِهِمۡ﴾ بەپێغەمبەرەکانیان ﴿لَنُخۡرِجَنَّكُم مِّنۡ أَرۡضِنَآ﴾ بەڕاستی لەخاك و وڵاتەکەمان دەرتان دەکەین ﴿أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۖ﴾ یان بەڕاستی دەبێ بگەڕێنەوە ناو ئاینەکەی ئێمە ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ رَبُّهُمۡ﴾ جا پەروەردگاریان نیگای بۆ (پێغەمبەران) کرد ﴿لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ کە بێگومان ستەمکاران لەناو دەبەین ﴿١٣﴾ ﴿وَلَنُسۡكِنَنَّكُمُ﴾ و بێگومان ئێوە نیشتەجێ دەکەین ﴿ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ﴾ لەو خاکەدا پاش (تیاچوونی) ئەوان ﴿ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَافَ مَقَامِي﴾ ئەوەش بۆ کەسانێکە لەوەستانی بەردەم من دەترسن (لەقیامەتدا) ﴿وَخَافَ وَعِيدِ﴾ وە(پێشتر) ترسابێت لەهەڕەشە (ی من) ﴿١٤﴾ ﴿وَٱسۡتَفۡتَحُواْ﴾ وە (پێغەمەران) داوای سەرکەوتن و زاڵ بونیان کرد (لەخوا) ﴿وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ﴾ و هەموو ملهوڕو یاخییەك بێ هیوا بوون ﴿١٥﴾ ﴿مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ﴾ لەدوای (تیاچوونی جێگای) ئەو دۆزەخە ﴿وَيُسۡقَىٰ مِن مَّآءٖ صَدِيدٖ﴾ و لە کێم و زووخاو ئاو دەدرێت (دەکرێت بەگەروویاندا) ﴿١٦﴾ ﴿يَتَجَرَّعُهُۥ﴾ کە قوم قوم (زۆر بە قیزەوە) دەیخواتەوە ﴿وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ﴾ بەڵام ناتوانێ قوتی بدات ﴿وَيَأۡتِيهِ ٱلۡمَوۡتُ﴾ و مردنی بۆ دێت ﴿مِن كُلِّ مَكَانٖ﴾ لەهەموو لایەکەوە ﴿وَمَا هُوَ بِمَيِّتٖۖ﴾ و کەچی ناشمرێت ﴿وَمِن وَرَآئِهِۦ﴾ و لەدوای ئەوەش ﴿عَذَابٌ غَلِيظٞ﴾ سزای سەخت (دەدرێت) ﴿١٧﴾ ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ﴾ ئەوانەی بێ بڕوابوون بەپەروەردگاریان نموونەی ﴿أَعۡمَٰلُهُمۡ كَرَمَادٍ﴾ کردەوەکانیان وەك خۆڵەمێشێك وایە ﴿ٱشۡتَدَّتۡ بِهِ ٱلرِّيحُ﴾ بەتوندی با لێی هەڵکردبێت ﴿فِي يَوۡمٍ عَاصِفٖۖ﴾ لە ڕۆژێکی ڕەشەبای سەختدا ﴿لَّا يَقۡدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَىٰ شَيۡءٖۚ﴾ ئەوان هیچیان دەست ناکەوێت لەوەی کەلە دونیادا کردویانە ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ﴾ ئا ئەوەیە گومڕابوونی دوور لە ڕاستی ﴿١٨﴾

﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئایا نەتان زانیوە ( نەتانبینیوە) کە بێگومان خوا ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ﴾
ئاسمانەکان و زەوی بەهەق و ڕاستی دروست کردوە ﴿إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ﴾ ئەگەر بیەوێت ئێوە لا
دەبات و ناتان هێڵێت ﴿وَيَأۡتِ بِخَلۡقٖ جَدِيدٖ﴾ وە (لە جێ ی ئێوە) دروست کراوێکی تر دەهێنێت
(١٩) ﴿وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٖ﴾ ئەوەش بۆ خوا گران و زەحمەت نی یە (٢٠) ﴿وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعٗا﴾
وهەموویان (لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە) بۆ خوا دەردەکەون و ئاشکرا ئەبن ﴿فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ﴾
ئەمجا (لەڕۆژی دواییدا) بێ دەسەڵاتەکان دەڵێن ﴿لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ﴾ بە زۆر دارو خۆ بەزل زانەکان
﴿إِنَّا كُنَّا﴾ بەڕاستی ئێمە لە دونیادا ﴿لَكُمۡ تَبَعٗا﴾ شوێن کەوتووی ئێوە بووین ﴿فَهَلۡ أَنتُم﴾ ئاخۆ
ئێوە ﴿مُّغۡنُونَ عَنَّا﴾ بەرگری دەکەن لە ئێمە ﴿مِنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ﴾ هەندێك لە سزای خوا
﴿قَالُواْ﴾ (ئەوانیش) دەڵێن ﴿لَوۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيۡنَٰكُمۡۖ﴾ ئەگەر خوا ئێمەی ڕێنموونی بکردایە ئێمەش
ئێوەمان ڕێنموونی دەکرد ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ﴾ یەکسانە بۆمان ﴿أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا﴾ هاوار و ناڵە بکەین
یان ئارام بگرین ﴿مَا لَنَا مِن مَّحِيصٖ﴾ ڕزگار بوونمان نی یە (لە سزای خوا) (٢١) ﴿وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾
جا شەیتان دەڵێت ﴿لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ﴾ کاتێك کە کار تەواو دەبێت ( ولێپرسینەوەیان کۆتایی دێت)
﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ﴾ بێگومان خوا بەڵێنی پێدان ﴿وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ﴾ بە بەڵێنێکی هەق و ڕاست ﴿وَوَعَدتُّكُمۡ
فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ﴾ و منیش بەڵێنم پێدان بەڵام درۆم کرد لەگەڵتاندا ﴿وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم﴾ وەمن نەم
بوو بەسەرتاندا ﴿مِّن سُلۡطَٰنٍ﴾ هیچ زۆر و دەسەڵاتێك ﴿إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ﴾ تەنها ئەوە نەبێت کە بانگم
کردن (بۆ گومڕایی) ﴿فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ﴾ ئیتر ئێوەش بەدەنگمەوە هاتن (و بەگوێتان کردم) ﴿فَلَا تَلُومُونِي﴾
کەواتە لۆمەی من مەکەن ﴿وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ﴾ بەڵکو لۆمەی خۆتان بکەن ﴿مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ﴾
بەڕاستی من ناتوانم بێم بە هاواری ئێوەوە ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّ﴾ و ئێوەش ناتوانن بێن بەهاواری منەوە
﴿إِنِّي كَفَرۡتُ﴾ بەڕاستی من بڕوام نەبوو ﴿بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ﴾ بەوەی کە پێشتر (لە دونیادا)
منتان کرد بوو بە هاوبەش بۆ خوا ﴿إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی ستەم کاران ﴿لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ سزای
سەختیان بۆ هەیە (٢٢) ﴿وَأُدۡخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوە
چاکەکانیان کردووە دەخرێنە ﴿جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ ناو بەهەشتانێك کە ڕوبارەکان دێن
و دەچن بە ژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡۖ﴾ بە هەمیشە تیایدا دەمێننەوە بە ئیزنی پەروەردگاریان
﴿تَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٌ﴾ بەخێرهاتنیان لەو (بەهەشتە)دا بەووتەی سەلامە (٢٣) ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾ ئایا نەت زانیوە؟
﴿كَيۡفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا﴾ خوا چۆن نموونەی هێناوەتەوە ﴿كَلِمَةٗ طَيِّبَةٗ كَشَجَرَةٖ طَيِّبَةٍ﴾ کە ووتەی چاك
و ڕاست (لا إله إلا الله) وەك درەختێکی چاك و بەسوودوایە ﴿أَصۡلُهَا ثَابِتٞ﴾ ڕەگی قایم (لە زەویدا)
دا کۆتابێت ﴿وَفَرۡعُهَا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ و لق و پۆپەکانیشی (بەرز بوو بێتەوە) بە ئاسماندا (٢٤)

﴿تُؤۡتِيٓ أُكُلَهَا﴾ ئـەو (درەختـە) میـوە و بەربگرێـت ﴿كُلَّ حِينِۭ بِإِذۡنِ رَبِّهَاۗ﴾ هەمـوو کاتێـك بەئیزنـی
پەروەردگـاری ﴿وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ﴾ وە خوا ئەو نموونانـە دەهێنێتەوە ﴿لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ﴾
بـۆ خەڵکـی بـۆ ئـەوەی بیربکەنـەوە ﴿٢٥﴾ ﴿وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٖ﴾ وە نموونـەی ووتەی خـراپ و پیس
و(بـێ باوەڕی) ﴿كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ﴾ وەکـو درەختێکی خـراپ و پیس وایە ﴿ٱجۡتُثَّتۡ مِن فَوۡقِ ٱلۡأَرۡضِ﴾
هەڵکەنرابێت لەسەر زەوی (و ڕەگی نەبێت) ﴿مَا لَهَا مِن قَرَارٖ﴾ هەر خۆی نەگرێت ﴿٢٦﴾ ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ﴾ ئەوانـەی کەبڕوایـان هێناوە خـوا دامەزراویان دەکات ﴿بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ﴾ بە ووتـەی بەڕێ وجێ
(کـە شـایەتومانە) ﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ لەژیانـی دونیـادا و لـەڕۆژی دوایشـدا ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ
ٱلظَّٰلِمِينَۚ﴾ وەخواستەم کارانیش گومڕادەکات ﴿وَيَفۡعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾ وەخواهەرچی بیەوێت دەیکات ﴿٢٧﴾
﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ﴾ ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە ﴿بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا﴾ لە جیاتی (سوپاسی) بەهرە
وچاکـەی خـوا بێ باوەڕ وسـپڵە بوون ﴿وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ﴾ و گەلەکەیان بـەرەو هەڵدێر برد ﴿٢٨﴾
﴿جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَاۖ﴾ ئەویـش دۆزەخە کەدەچنە نـاوی ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ﴾ کە جێگایەکی زۆر خراپە ﴿٢٩﴾
﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا﴾ (بـێ بـاوەڕان) چەنـد هاوتایان بۆخـوا بڕیاردا ﴿لِّيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِهِۦۗ﴾ بـۆ ئەوەی
(خەڵك) گومڕابکەن لەڕێگەی خوا ﴿قُلۡ تَمَتَّعُواْ﴾ ئەی (موحەممەد ﷺ) بڵێ بەوانە ڕابوێرن (لە دونیادا
بـۆ کوێ دەچـن؟) ﴿فَإِنَّ مَصِيرَكُمۡ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ چونکە بێگومان چارەنوسـتان هـەر دۆزەخ دەبێت ﴿٣٠﴾
﴿قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵێ بەوبەندانـەم کەبڕوایان هێناوە ﴿يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾
بەڕێکی نوێژەکان بکەن ﴿وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ﴾ و لەوەی پێمان داوون ببەخشن ﴿سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ﴾ بەنهێنی
و ئاشـکرا ﴿مِّن قَبۡلِ﴾ لەپێـش ئـەوەی ﴿أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ﴾ کـە ڕۆژێـك بێـت ﴿لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ﴾ نەکڕین
وفرۆشتنی تێدایەو نەدۆستایەتی ﴿٣١﴾ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ خوا ئەو زاتەیە کەئاسمانەکان
و زەوی دروسـت کـردووە ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ و لەئاسـمانەوە بارانـی بارانـدوە ﴿فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ
ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ و هەمـوو بەروبوم (و دانەوێڵە) یەکی پێ ڕواندووە ﴿رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ﴾ کە ڕزق وڕۆزیە بۆ ئێوە
﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ﴾ هەروەها کەشـتی بـۆ ڕام هێناون (و خسـتویەتیە خزمەتتانەوە) ﴿لِتَجۡرِيَ فِي ٱلۡبَحۡرِ
بِأَمۡرِهِۦۖ﴾ بـۆ ئـەوەی بڕوات بەنـاو دەریادا بەفەرمانـی خـوا ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡهَٰرَ﴾ و ڕووبارەکانی بۆ
ڕام هێنـاون (ولـە خزمەتاندایە) ﴿٣٢﴾ ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ﴾ وە هەروەها ڕامی هێناوە بۆتان و (لەخزمەتاندایە)
﴿ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ دَآئِبَيۡنِۖ﴾ ڕۆژ و مانگ بەهەمیشـەیی ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ وە شـەو و ڕۆژیشی
بۆ رام هێناون ﴿٣٣﴾

﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ﴾ وە لەهەمـوو ئەو شـتانە کەداواتـان کردووە پێ ی بەخشـیوون ﴿وَإِن
تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ﴾ خـۆ ئەگەر بەهرە و نیعمەتەکانـی خوا بژمێرن ﴿لَا تُحْصُوهَا﴾ بۆتان ناژمێردرێن ﴿إِنَّ
الْإِنسَانَ﴾ بەڕاستی ئادەمی (بێ بڕوا) ﴿لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ زۆر ستەم کار و سپڵەیە (بەرامبەر نیعمەتەکانی
خـودا) ٣٤ ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ﴾ (بیریـان بخـەرەوە) کاتێـك ئیبراهیـم ووتـی ئـەی پەروەردگـارم
﴿اجْعَلْ هَٰذَا الْبَلَدَ آمِنًا﴾ ئـەم شـارە (مەککـە) بکـە بەشـارێکی ئـارام و ئاسـایش ﴿وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ﴾
وە خـۆم و کوڕەکانـم بپارێـزە و دوورخـەرەوە ﴿أَن نَّعْبُدَ الْأَصْنَامَ﴾ لـەوەی بتـەکان بپەرسـتین ٣٥
﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ﴾ ئەی پەروەردگارم بێگومان ئەو بتانە ﴿أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ﴾ زۆر لەخەڵکیان گومڕا
کـردوە (و لایـان دان لەڕێگەی ڕاسـت) ﴿فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي﴾ جا هەرکەسێك (لەڕۆڵەکانم) شـوێن
مـن کەوت ئـەوە بێگومان لەمنە ﴿وَمَنْ عَصَانِي﴾ هەرکەسـیش سـەرپێچی کردم ﴿فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾
ئـەوە بێگومـان تـۆ لێبـوردەی میهرەبانـی ٣٦ ﴿رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي﴾ ئـەی پەروەردگارمان من
هەندێـك لەڕۆڵەکانـم نیشـتەجێ کرد ﴿بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ﴾ لە شـیوێکی بێ کشـتوکاڵ دا ﴿عِندَ بَيْتِكَ
الْمُحَرَّمِ﴾ لای ماڵـە پیـرۆز و ڕێزگیراوەکـەت ﴿رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ ئـەی پەروەردگارمـان هەتـا
بـە چاکـی نوێـژ بەجـێ بێنـن وئەنجامـی بـدەن ﴿فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ﴾ بەڵکـو دڵـی خەڵکانێـك وا
لێبکەیـت ﴿تَهْوِي إِلَيْهِمْ﴾ سـۆزی ومەیلیـان ببێـت بۆلایـان ﴿وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ﴾ و لەهەمـوو بەر
و میوەیەکیـش ڕۆزیـان بـدە ﴿لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾ بەڵکو شـوکرانە بژێربـن ٣٧ ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ﴾ ئەی
پەروەردگارمان بەڕاسـتی تـۆ دەزانی ﴿مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ﴾ بە هەرچی دەیشـارینەوە و هەرچی دەری
دەبڕیـن ﴿وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى اللَّهِ مِن شَيْءٍ﴾ وە هیـچ شـتێ لای خـوا شـاراوە نـی یە ﴿فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ﴾
نەلـەزەوی و نەلەئاسـماندا ٣٨ ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي﴾ هەمـوو سـوپاس و ستایشـێك بـۆ ئـەو خوایـەی
﴿وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ﴾ کە ئیسـماعیل وئیسـحاقی پێ بەخشـیم بەپیری ﴿إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ
الدُّعَاءِ﴾ بەڕاسـتی پەروەردگارم بیسەری دوعا و پاڕانەوەیە ٣٩ ﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي﴾
ئـەی پەروەردگـارم من و ڕۆڵەکانـم وا لێبکەی بەچاکـی نوێژەکان بەجـێ بێنین ﴿رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ﴾
ئـەی پەروەردگارمـان پاڕانـەوە و نزاکـەم وەرگـرە ٤٠ ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئـەی
پەروەردگارمـان لەمـن و باوکم و دایکـم و هەموو بڕواداران ببـورەو خۆش ببە ﴿يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ﴾
لە ڕۆژێکدا کە لێپرسینەوە دەکرێت وبەرپا ئەبێت ٤١ ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا﴾ وا مەزانە خوا بێ ئاگایە
﴿عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ﴾ لـەو( زوڵـم و سـتەمەی) کەسـتەم کاران دەیکـەن ﴿إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ﴾
بێگومـان ئـەو دوایـان دەخـات بـۆ ڕۆژێـك ﴿تَشْخَصُ فِيهِ الْأَبْصَارُ﴾ کەچـاوەکان تێیـدا ئەبڵـەق دەبن
(و ناینوقێن لە ترسا) ٤٢

﴿مُهْطِعِينَ﴾ بەخێرایی دەڕۆن (بەدەم بانگ کەریانەوە) ﴿مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ﴾ سەریان بەرزکردۆتەوە(بۆ
ئاسمان) ﴿لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ﴾ پێڵوی چاویان ناتروکێنن ﴿وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ﴾ و دڵیان خاڵی
یە (لەتێگەشتن) (٤٣) ﴿وَأَنذِرِ النَّاسَ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ) خەڵکی ئاگاداربکە و بترسێنە
﴿يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ﴾ لەو ڕۆژەی کە سزایان بۆ دێت ﴿فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ ئەمجا ئەوانەی کەستەمیان
کردووە دەڵێن ﴿رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ ئەی پەروەردگارمان بۆ ماوەیەکی کەم دوامان بخە
﴿نُّجِبْ دَعْوَتَكَ﴾ تا وەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوە ﴿وَنَتَّبِعِ الرُّسُلَ﴾ و شوێنی پێغەمبەران بکەوین
﴿أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ﴾ ئەی ئێوە نەبوون پێشتر سوێندتان خوارد ﴿مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ﴾
کە هەرگیز لە ناوناچن (٤٤) ﴿وَسَكَنتُمْ فِي مَسَاكِنِ الَّذِينَ﴾ هەر لەجێ و شوێنی ئەوانە نیشتەجێ بوون
﴿ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ﴾ کەستەمیان لەخۆیان کرد ﴿وَتَبَيَّنَ لَكُمْ﴾ و بەڕوونی بۆتان دەرکەوت ﴿كَيْفَ فَعَلْنَا
بِهِمْ﴾ کە چیمان بەسەر هێنان ﴿وَضَرَبْنَا لَكُمُ الْأَمْثَالَ﴾ نموونەی زۆریشمان بۆتان هێنایەوە (٤٥) ﴿وَقَدْ
مَكَرُوا مَكْرَهُمْ﴾ بێگومان ئەو (بێ باوەڕانە) پیلانی گەورەی خۆیانیان گێڕا (دژی پێغەمبەرەکانیان)
﴿وَعِندَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ﴾ خوای گەورە ئاگادارە بە پیلانەکانیان ﴿وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ﴾ وە هەر چەندە
پیلانەکەیان ﴿لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ﴾ شاخەکانی پێ بترازێت (و لەبن بێت) (٤٦) ﴿فَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ﴾
جا وا گومان مەبە بەخوا ﴿مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ﴾ ئەو بەڵێنەی داویەتی بەپێغەمبەرانی بەدی
ناهێنێت ونایهێنێتە جێ ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ﴾ بەڕاستی خوا بەدەسەڵاتی خاوەن تۆڵەیە (٤٧)
﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ﴾ لەڕۆژێکدا کە ئەم زەوی یە دەگۆڕێت ﴿غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ﴾ بەزەوی یەکی تر
وئاسمانەکانیش (دەگۆڕێن بە ئاسمانی تر) ﴿وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾ ئەوسا هەموو (لەگۆڕەکانیان
دێنە دەرەوە) دەردەکەون بۆ خودای تەنهای زاڵ وبەدەسەڵات بەسەر هەموو شتێکدا (٤٨)
﴿وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ﴾ و لەو ڕۆژەدا تاوان باران دەبینی ﴿مُّقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ﴾ لە کۆت و زنجیردا
پێکەوە بەستراون (٤٩) ﴿سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ﴾ پۆشاکیان قەترانی ڕەشە ﴿وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ النَّارُ﴾ و دەم و
چاویشیان ئاگر دایپۆشیوە (٥٠) ﴿لِيَجْزِيَ اللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ بۆ ئەوەی خوا تۆڵەو پاداشتی هەموو
کەسێك بدات بە گوێرەی ئەوەی کەکردویەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ بەڕاستی خوا (موحاسەکردن)
ولێپرسینەوەی خێرایە (٥١) ﴿هَٰذَا بَلَاغٌ لِّلنَّاسِ﴾ ئەم (قورئانە) ڕاگەیاندن وجاڕێکە بۆ هەموو خەڵك
﴿وَلِيُنذَرُوا بِهِ﴾ وە هەتا پێی بێدار بکرێنەوە ﴿وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ وە بۆ ئەوەی بزانن بێگومان
ئەو(خوا) پەرستراوێکی تاك و تەنهایە ﴿وَلِيَذَّكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ و تا خاوەن ژیرییەکان بیربکەنەوە و
پەند وەربگرن (٥٢)

# سورەتی ﴿ الحِجر ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓرۚ﴾ بە(ئەلیف، لام، ڕا) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی، بۆ زانیاری زیاتر سەیری
سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ﴾ ئەمانە ئایەت و نیشانەکانی
قورئانی ڕوون کەرەوە وئاشکران (١) ﴿رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی کەبێ باوەڕ بوون
(لە ئایندەیەکی نزیکدا) زۆر جار ئاوات دەخوازن ﴿لَوۡ كَانُواْ مُسۡلِمِينَ﴾ کاشکای موسوڵمان
بوونایە. (٢) ﴿ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ﴾ لێیان گەڕێ بابخۆن و ڕابوێرن ﴿وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ﴾ وئومێد
وهیوا بێ ئاگایان بکات ﴿فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾ جا بێگومان لەمەو دوا دەزانن (چۆن سزایان دەدەین)
(٣) ﴿وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ﴾ (خەڵکی) هیچ شارێکمان لەناو نەبردووە ﴿إِلَّا وَلَهَا كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ﴾
مەگەر کاتی دیاری کراو بۆ لەناو چوونیان هەبووە (٤) ﴿مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ﴾ وەهیچ ئوممەتێك
پێش ناکەوێت ﴿أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ﴾ لەکاتی لەناوبردنی خۆی هەروەها دواش ناکەوێ (٥)
﴿وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي﴾ (بێ باوەڕان) ووتیان ئەی ئەو کەسەی ﴿نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ﴾ کە قورئان نێرراوەتە
خوار بۆ سەرت ﴿إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ﴾ بەڕاستی تۆ شێتیت (٦) ﴿لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا بِٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ دەی بۆ فریشتەمان
بۆ ناهێنی (شایەتی بدات تۆ پێغەمبەری) ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەگەر تۆ لەڕاست گۆیانیت
(٧) ﴿مَا نُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ﴾ ئێمە فریشتە نانێرینە خوارەوە مەگەر بەڕاست و ڕەوا نەبێت
﴿وَمَا كَانُوٓاْ إِذٗا مُّنظَرِينَ﴾ وە ئەو کاتەش ئەوانە مۆڵەت نادرێن (٨) ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ﴾ بێگومان
هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ و بەڕاستی هەر ئێمەش دەی پارێزین (٩)
﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ﴾ سوێندبێت بێگومان ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانمان ناردووە ﴿فِي شِيَعِ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾
لەناو هۆزو کۆمەڵە پێشووەکاندا (١٠) ﴿وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ﴾ هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتووە
﴿إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ ئیللا گاڵتە ولاقرتییان پێ کردووە (١١) ﴿كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾
ئا بەو جۆرە ئێمە ئەو (قورئانە) دەخەینە ناو دڵی تاوان بارانەوە (١٢) ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ﴾ کەچی ئەوان
باوەڕی پێ ناهێنن ﴿وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ کە بێگومان باوو ڕێبازی پێشووەکانیش هەر وابووە (١٣)
﴿وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم﴾ ئەگەر بۆمان بکردنایەتەوە ﴿بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ دەرگایەك لەئاسمانەوە ﴿فَظَلُّواْ فِيهِ
يَعۡرُجُونَ﴾ و ئەوان پیایدا بڕۆشتنایەتە سەرەوە (١٤) ﴿لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا﴾ ئەوسا دەیان ووت
بێگومان ئێمە چاوبەستمان لێکراوە ﴿بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ﴾ بەڵکو ئێمە کۆمەڵێکین جادوومان لێ
کراوە (١٥)

﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا﴾ سـوێند بەخوا بێگومان ئێمە دروسـتمان کردووە ﴿فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا﴾ چەند بورجێك
لەئاسـماندا ﴿وَزَيَّنَّـٰهَا لِلنَّـٰظِرِينَ﴾ و ئەو(ئاسـمانە)مان ڕازاندۆتەوە بۆ سـەرەنج دەران و تەماشاکەران
﴿١٦﴾ ﴿وَحَفِظْنَـٰهَا﴾ و ئەو(ئاسمانە)مان پاراسـتووە ﴿مِن كُلِّ شَيْطَـٰنٍ رَّجِيمٍ﴾ لەهەموو شەیتانێکی دەرکراو
لەبەزەیی خوا ﴿١٧﴾ ﴿إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ﴾ مەگەر ئەوانەی کەبەدزیەوە گویْ دەگرن ﴿فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ﴾
یەکسەر گڕوئاگرێکی دیار دوای دەکەوێت (وڕاوی دەنیْ) ﴿١٨﴾ ﴿وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَـٰهَا﴾ زەویشمان ڕاخستووە
﴿وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ﴾ وچەند کێوو شـاخی دامەزراومان تێدا داناوە ﴿وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا﴾ و ڕواندوومانە تیایدا
﴿مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ﴾ لەهەمـوو ڕووەك و درەختێـك بەڕێـك و پێکـی ﴿١٩﴾ ﴿وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَـٰيِشَ﴾
وە لەو(زەویـە)دا هۆکارەکانـی ژیانمـان بـۆ ئێـوە ڕەخسـاندوە ﴿وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ﴾ هەروەهـا بـۆ
ئەوانـەش کەئێـوە ڕزق وڕۆزیان نادەن ﴿٢٠﴾ ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ﴾ وە هیچ شـتێك نییە مەگەر
خەزێنەکانـی لای ئێمەیـە ﴿وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ﴾ و نـای نێریـن و نایدەیـن بەئەنـدازەی دیـاری
کـراو نەبێـت ﴿٢١﴾ ﴿وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ﴾ وە بـا ( هـەوا) مان نـاردووە کە پیتێنـەری دارو درەخت بێت
﴿فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ ئەمجـا لەئاسـمانەوە بارانمـان بارانـدووە ﴿فَأَسْقَيْنَـٰكُمُوهُ﴾ وەئێوەمان پـیْ تێراو
کـردووە ﴿وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَـٰزِنِينَ﴾ لەکاتێکدا ئێوە نەتان دەتوانـی ئەو(ئاوە) خەزن بکەن ﴿٢٢﴾ ﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ
وَنُمِيتُ﴾ بێگومان هەر ئێمە دەژێنین ودەشـمرێنین ﴿وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ﴾ هەر ئێمەش میراتگری هەموانین
﴿٢٣﴾ ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ﴾ سـوێند بەخـوا ئێمـە ئاگاداریـن بەوانـەی لەپێش ئێـوەوە بـوون
﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ﴾ و سوێند بەخوا بێگومان ئەوانەش دەناسین کەپاش ئێوە دێن ﴿٢٤﴾ ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ
يَحْشُرُهُمْ﴾ بێگومـان هـەر پەروەردگـارت هەموویان کـۆ دەکاتەوە ﴿إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاسـتی هەر
خۆی کاردروسـتی زانایە ﴿٢٥﴾ ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ﴾ سـوێندبێت بێگومان ئێمە ئادەمیمان دروست کرد
﴿مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ لە قوڕێکی ڕەشـی ترشـاوی ڕەق ﴿٢٦﴾ ﴿وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ﴾ جنۆکەشمان
پێشـتر دروسـت کرد ﴿مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ﴾ لە ئاگرێکی بەتین ﴿٢٧﴾ ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ﴾ (بیریان بخەرەوە)
کاتێك پەروەردگارت بەفریشـتەکانی فەرموو ﴿إِنِّي خَـٰلِقٌۢ بَشَرًا﴾ بەڕاستی من بەشەرێك دروست دەکەم
﴿مِّن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ لە قوڕێکی ڕەشی ترشاوی ڕەق ﴿٢٨﴾ ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ﴾ هەر کاتێك ڕێك وپێکم
کـرد ﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ و فـوم بە بەریدا کـرد لە ڕۆحێك کە خۆم دروسـتم کردووە (مەبەسـت
لەدانە پاڵی ڕۆح بۆلای خوا ڕێزو تەشـریفە) ﴿فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَـٰجِدِينَ﴾ دەبیْ یەکسەر سوژدەی بۆ بەرن ﴿٢٩﴾
﴿فَسَجَدَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ﴾ جا فریشـتەکان هەموو تێکڕا سـوژدەیان برد (بۆی) ﴿٣٠﴾ ﴿إِلَّآ إِبْلِيسَ
أَبَىٰٓ﴾ ئیبلیس (شەیتان) نەبێت کە سەرپێچی کرد ﴿أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّـٰجِدِينَ﴾ لەوەی کەلەگەڵ سوژدەبەراندا
بێت ﴿٣١﴾

﴿قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ﴾ (خـوا) فەرمـووی ئـەی ئیبلیس بۆ چـی تۆ ﴿أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ لەگەڵ سـوژدە
بەرانـدا نەبوویـت؟! (٣٢) ﴿قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ﴾ (ئیبلیـس) ووتی: من هیچ کاتێ سـوژدە نابەم بۆ
بەشـەرێك ﴿خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ﴾ کەدروسـتت کـردووە لـە قوڕێکی ڕەشـی ترشـاوی
ڕەق (٣٣) ﴿قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا﴾ (خـوا پێی) فەرموو دەلەوێ (بەهەشـت) بڕۆدەرەوە﴿فَإِنَّكَ رَجِيمٞ﴾ چونکە
بەڕاسـتی تۆ لەبەزەیی من دەرکراوی (٣٤) ﴿وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ وە بەڕاسـتی نەفرینت لەسـەرە
تـاڕۆژی دوایـی (٣٥) ﴿قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾ ووتـی ئـەی پەروەردگـارم دەی مۆڵەتـم بـدە
تـاڕۆژێ (مردووان) زینـدوو دەکرێنـەوە (٣٦) ﴿قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ﴾ (خوا) فەرمووی ئەوە بەڕاسـتی
تـۆ لەمۆڵـەت دراوانـی (٣٧) ﴿إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ﴾ تـاڕۆژێ کەکاتـی دیاری کـراوە (٣٨) ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ
أَغۡوَيۡتَنِي﴾ ووتـی ئـەی پەروەردگـارم لەبەر ئـەوەی گومڕات کـردم ﴿لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بێگومان
خۆشـی (دونیا)یـان لەزەویدا بۆ دەڕازێنمـەوە ﴿وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ وە بەڕاسـتی هەموویان گومڕا
دەکـەم (٣٩) ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ بەندە دڵسـۆزەکانت نەبێت (٤٠) ﴿قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ﴾
(خوا) فەرمووی ئەمە ڕێگای هەق و ڕاستە بەرەو من (٤١) ﴿إِنَّ عِبَادِي﴾ بەڕاستی بەندەکانی من ﴿لَيۡسَ
لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ﴾ تۆ هیچ دەسـەڵاتت نیە بەسـەریاندا ﴿إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ﴾ جگە لەو گومڕایانەی
کەشـوێنت کەوتـوون (٤٢) ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ وە بێگومـان دۆزەخ جێگـای هەموویانـە (٤٣)
﴿لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ﴾ (دۆزەخ) حەوت دەرگای هەیە ﴿لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ﴾ هەر دەرگایەکیشیان
لەوانـە دابـەش کـراوە بـۆ چەنـد بەشـێك (٤٤) ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ﴾ بەڕاسـتی خۆپاریـزو لـە
خواترسـان لەناو باخـات و کانیاودان (٤٥) ﴿ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ﴾ (پێیان دەووترێـت) بچنە ناویانەوە
بەهێمنـی و ئاسـوودەیی (٤٦) ﴿وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ﴾ هـەر ڕق و کینەیـەك لەدڵیانـدا بووبێـت
دەرمـان هێناوە ﴿إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ﴾ برای یەکترن بەرامبەر یەکترن لەسـەر کورسـی دانیشـتوون
(٤٧) ﴿لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ﴾ لەوێدا ماندوو بوونیان تووش نایەت ﴿وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ﴾ و هەرگیز
لـەو (بەهەشـتە) دەرناکرێـن (٤٨) ﴿نَبِّئۡ عِبَادِيٓ﴾ هـەواڵ بـدە بەبەندەکانـم ﴿أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ کـە
بەڕاستی هەر من لێبوردەی میهرەبانم (٤٩) ﴿وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ﴾ وبێگومان هەر سزای منە
سزای سەخت (٥٠) ﴿وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ وە هەواڵیان پێ بدە دەربارەی میوانەکانی ئیبراهیم (٥١)

﴿إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا﴾ کاتێك چوونە ژوورەوە بۆلای ووتیان سەلامت لێ بێت ﴿قَالَ
إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ﴾ (ئیبراهیم) ووتی بەڕاستی ئێمە لێتان دەترسین (٥٢) ﴿قَالُوا۟ لَا تَوْجَلْ﴾ ووتیان(پێی)
مەترسە ﴿إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَـٰمٍ عَلِيمٍ﴾ بەڕاستی ئێمە مژدەت دەدەینێ بە(لەدایك بوونی) کوڕێکی زانا
(٥٣) ﴿قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِى﴾ ووتی ئایا مزگێنیم پێ دەدەن ﴿عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِىَ ٱلْكِبَرُ﴾ لەکاتێکدا کەپیر بووم
﴿فَبِمَ تُبَشِّرُونَ﴾ ئیتر چی مژدەیەکم دەدەنێ (٥٤) ﴿قَالُوا۟ بَشَّرْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ﴾ ووتیان ئەو مژدەی داومانە
پێت ڕاستە (و دێتە دی) ﴿فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَـٰنِطِينَ﴾ جا لە نائومێدان مەبە (٥٥) ﴿قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ
رَبِّهِۦٓ﴾ ووتی جا کێ لەمیهرەبانی پەروەردگاری نائومێد دەبێت ﴿إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ﴾ گومڕایان نەبێت (٥٦)
﴿قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ (ئیبراهیم) فەرمووی ئەی ڕەوانەکراوان (ی خوا) چ کارێکی
گرنگتان هەیە (٥٧) ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ﴾ وتیان بەڕاستی ئێمە نێردراوین بۆ سەر گەلێکی
تاوانبار (لەناویان بەرین) (٥٨) ﴿إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ جگە لەماڵ و منداڵی لووط
کە بێگومان هەموویان ڕزگار دەکەین (٥٩) ﴿إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ﴾ ژنەکەی نەبێت
کەبێگومان بڕیارمانداوە ئەو لە ڕیزی تیاچواندا بێت (٦٠) ﴿فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ جا کاتێك
نێردراوەکان هاتن بۆ لای خاو خێزانی لووط (٦١) ﴿قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ﴾ (لووط) ووتی بەڕاستی
ئێوە دەستەیەکی نەناسراون (٦٢) ﴿قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَـٰكَ﴾ ووتیان بەڵکو ئێمە بۆمان هێناوی ﴿بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ
يَمْتَرُونَ﴾ ئەو(سزای) کەئەوان تێیدا دوودڵ بوون (٦٣) ﴿وَأَتَيْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ﴾ وە ئێمە ڕاستیمان بۆ تۆ هێناوە
﴿وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ﴾ بێگومان ئێمە ڕاست گۆین (٦٤) ﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ﴾ جا کەواتە لەبەشێکی
شەودا شەوڕەوی بە (شوێنکەوتووان و) خاوخێزانت بکە (لە شار دەرچۆ) ﴿وَٱتَّبِعْ أَدْبَـٰرَهُمْ﴾ و خۆت
دوایان بکەوە ﴿وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ﴾ هیچ کامتان لانەکەنەوە ﴿وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ﴾ و بڕۆن بۆ ئەو
شوێنەی کەفەرمانتان پێدراوە (٦٥) ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ﴾ ئەم کارەمان بەنیگا بە لووط ڕاگەیاند
﴿أَنَّ دَابِرَ هَـٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ﴾ کەبێگومان لەبەرەبەیاندا ئەوانە دوا بڕاو دەبن(هەموویان لەناو
دەچن) (٦٦) ﴿وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ جا خەڵکی (نێربازی) شارەکە هاتن (بەرەو ماڵی
لووط) ومژدەیان بەیەکتری دەدا (٦٧) ﴿قَالَ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى﴾ (لووط) ووتی دڵنیابن ئەمانە میوانی منن
﴿فَلَا تَفْضَحُونِ﴾ دەی ئابڕوم مەبەن (٦٨) ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ﴾ و لە خوا بترسن و شەرمەزار و ڕیسوام
مەکەن (٦٩) ﴿قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ ووتیان ئێمە پێمان نەووتیت نابێ بەرگری لە کەس بکەیت
(نابێ کەس توخنت بکەویت) (٧٠)

﴿قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ﴾ (لـووط) فەرمـووی ئائەوانـە کچانـی منـن (مارەیان کـەن) ﴿إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ﴾ ئەگەر
ئێـوە (ئـەوکارە) ئەنجـام دەدەن ﴿٧١﴾ ﴿لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ﴾ سـوێند بەتەمەن و ژیانی تۆ (ئـەی موحەممەد ﷺ)
بەڕاسـتی ئەوانە ﴿لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾ لەسـەر خۆشـی خۆیانـدا سـەر گەردانن ﴿٧٢﴾ ﴿فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ
مُشۡرِقِينَ﴾ جـا لەکاتـی خـۆر هەڵهاتندا شـریخەیەکی بەهێـز گرتنـی ﴿٧٣﴾ ﴿فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا﴾ ئەمجا
ئەو (شـارە)مان سـەروژێر کـرد ﴿وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ﴾ و گڵی بەردینمان بەسـەردا باراندن
﴿٧٤﴾ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ﴾ بەڕاسـتی لەمـەدا بەڵگـەی زۆر هەیـە بـۆ ئەوانـەی بیردەکەنـەوە ﴿٧٥﴾
﴿وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ﴾ وە بێگومـان ئەو (شـارە وێران کراوە) لەسـەر ڕێگای سـەرەکی (کاروانەکان)
دایـە ﴿٧٦﴾ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بەڕاسـتی لـەوەدا بەڵگـەی گرنـگ هەیـە بـۆ بڕواداران ﴿٧٧﴾
﴿وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ﴾ بەڕاسـتی خاوەن باخاتە زۆر پڕەکانیش (قەومی شـوعەیب) لەسـتەم
کاران بـوون ﴿٧٨﴾ ﴿فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ﴾ جـا تۆڵەمـان لـێ سـەندن ﴿وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٖ مُّبِينٖ﴾ جـا بەڕاسـتی ئـەم
دووانە لەسـەر ڕێگایەکی ئاشـکرادان ﴿٧٩﴾ ﴿وَلَقَدۡ كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡحِجۡرِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ سـوێند بەخـوا بێگومان
خەڵکـی حیجریـش (گەلەکـەی صالـح) بڕوایـان بـە پێغەمبەرەکانیان نەکـرد ﴿٨٠﴾ ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُمۡ ءَايَٰتِنَا﴾
بەڵگـەو نیشـانەکانی خۆمانمـان پێـدان ﴿فَكَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ﴾ بـەڵام ئـەوان ڕوویـان لـێ وەرگێڕا ﴿٨١﴾
﴿وَكَانُواْ يَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ﴾ ئەوانە لەشـاخەکاندا دەیانتاشـی ﴿بُيُوتًا ءَامِنِينَ﴾ خانـووی زۆری (قاییمی)
بـێ تـرس و بیـم ﴿٨٢﴾ ﴿فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُصۡبِحِينَ﴾ ئەمجـا دەنـگ و پیاهەڵشـاخانێکی بەهێـز گرتنی
لەبەرەبەیاندا ﴿٨٣﴾ ﴿فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ جا هەرچیان کردبوو (خانوو لەچیاکاندا) هیچ سوودی
پـێ نەگەیانـدن ﴿٨٤﴾ ﴿وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ وە ئێمـە ئاسـمانەکان و زەویمان دروسـت نەکردوە
﴿وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ﴾ ئەوەش لەنێوانیاندا یە بەهەق و ڕاستی نەبێت ﴿وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ﴾ وە بێگومان
ڕۆژی دوایـی دێـت ﴿فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ﴾ تـۆش بەجوانی چاوپۆشـی بکـە لێیان ﴿٨٥﴾ ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ
ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ بەڕاستی هەر پەروەردگارت بەدی هێنەری زانایە ﴿٨٦﴾ ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي﴾
سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی حـەوت ئایەتـی دووبـارە کراوەمان پێ بەخشـیت (مەبەسـت لە سـورەتی
الفاتحـە یـە کە چەنـد جارێك لـە نوێـژدا دووبـارە دەبێتـەوە) ﴿وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ﴾ هەروەهـا قورئانی
گـەورەش ﴿٨٧﴾ ﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) چاوت مەبـڕە ئەو نـازو نیعمەتی
(دونیـا) کەداومانە بـە ﴿أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ﴾ کۆمەڵێك لەو بێ باوەڕانـە ﴿وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ﴾ و خەمیان بۆ مەخۆ
﴿وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ وە باڵـی بەزەیـی ڕاخە بۆ بـڕواداران ﴿٨٨﴾ ﴿وَقُلۡ إِنِّيٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلۡمُبِينُ﴾ وە بڵێ
بەڕاستی من ترسێنەرێکی ڕوون و ئاشکرام (دەتان ترسێنم لە سزایەك) ﴿٨٩﴾ ﴿كَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَى ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ﴾
وێنەی ئەو (سزایە)ی ناردمان بۆ دابەش کەران (مەبەست پێ جولەکە و گاورەکانە کە باوەڕیان دەکرد
بەهەندێکی قورئان وبێ باوەڕیش بوون بەهەندێکی تری) ﴿٩٠﴾

﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلۡقُرۡءَانَ عِضِينَ﴾ ئەوانەی کەقورئانیان کردە چەند بەشـەوە (باوەڕداربوون بەهەندێکی
وکافریـش بوون بـەوەی تری) ﴿٩١﴾ ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسۡـَٔلَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ جا سـوێند بە پەروەردگارت پرسـیار
لەهەموویـان دەکەیـن ﴿٩٢﴾ ﴿عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ لـەوەی کەدەیانکـرد (لەدونیـادا) ﴿٩٣﴾ ﴿فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ﴾
جـا هـەر فەرمانێکت پێ دەدرێـت بەئاشـکرا ڕای گەیەنە ﴿وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾و گـوێ بەهاوبەش
دانـەران مـەدە ﴿٩٤﴾ ﴿إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ﴾ بەڕاسـتی ئێمـە تـۆ دەپارێزیـن لەشـەڕ وپیلانـی ئـەو
کەسـانەی گاڵتـە ولاقرتی دەکەن بـە ئاینەکـەت ﴿٩٥﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يَجۡعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۚ﴾ ئەوانەی لەگەڵ
خوادا پەرسـتراوێکی تر دادەنێن ﴿فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾ جا دواتر دەزانن (چۆن سزایان دەدەین) ﴿٩٦﴾ ﴿وَلَقَدۡ
نَعۡلَمُ﴾ سـوێند بەخوا بێگومان ئێمە دەزانین ﴿أَنَّكَ يَضِيقُ صَدۡرُكَ بِمَا يَقُولُونَ﴾ کەبەڕاسـتی تۆ دڵت تەنگ
دەبـێ بـەوەی ئەوانە دەیڵێـن ﴿٩٧﴾ ﴿فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ﴾ کەواتە تەسـبیحاتی پەروەردگـارت بکە ﴿وَكُن مِّنَ
ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ و لەسـوژدە بەران بە ﴿٩٨﴾ ﴿وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ﴾ وە پەروەردگارت بپەرسـتە﴿حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ﴾
هەتا مردن یەخەت پێ دەگرێت ﴿٩٩﴾

## سورەتی ﴿ ٱلنَّحۡلِ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشیندەی میهرەبان

﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ﴾ ئـەوا فەرمانـی خوا(بـە سـزادانیان)هات بۆیـە پەلـە مەکـەن (لەهاتنـی)
﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ پـاك و بێگـەردی بـۆ خـوا لەهەر شـتێك ئەوانـە دەیکەن بەهاوبەشـی ﴿١﴾
﴿يُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنۡ أَمۡرِهِۦ﴾فریشـتە دەنێرێتەخوارەوە بەوەحی بەفەرمانی خۆی ﴿عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ
عِبَادِهِۦٓ﴾ بـۆ هـەر کەسـێك لەبەندەکانـی کەخـۆی بیەوێت ﴿أَنۡ أَنذِرُوٓاْ﴾ بـەوەی کەخەڵکی بترسـێنن
﴿أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ﴾ کەبەڕاسـتی بێجگـە لەمـن هیـچ پەرسـتراوێکی تـر نـی یـە کەواتـە هەر
لەمن بترسـن ﴿٢﴾ ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ﴾ (خوا) ئاسـمانەکان و زەوی بەهەق دروسـت کرد
﴿تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ بـەرزو بڵنـدە لە هەرچـی ئەوانە دەیکەنە هاوبەشـی ﴿٣﴾ ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٖ﴾
(خوای گەورە) ئادەمی دروست کرد لە دڵۆپە ئاوێك ﴿فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ﴾ کەچی بۆتە دوژمنێکی
ئاشـکرای (بەرنامەکـەی خـودا) ﴿٤﴾ ﴿وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۖ لَكُمۡ﴾ ئاژەڵیشـی بۆ ئێوە دروسـت کردووە
﴿فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ﴾ کـە (هـۆی) گەرمایـی و کەڵکیـان تێدایە ﴿وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ﴾ وە لە(گۆشـتی)
ئـەوان دەخـۆن ﴿٥﴾ ﴿وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ﴾ وە بـۆ ئێوە هەیـە لەو (ئاژەڵانـەدا دیمەنی) جوانـی و ڕازاوە
﴿حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ﴾ کاتێ دەیان هێننەوە لە لەوەڕگا و کاتێکیش دەیان بەن بۆ لەوەڕگا ﴿٦﴾

﴿وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٍ﴾ وە(هەندێ لەو ماڵاتانە) بارەکانتان هەڵدەگرن (ودەیبەن) بۆ شار وجێگایە ﴿لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِۚ﴾ کەئێوە پێی نەدەگەیشتن مەگەر زۆر بەنارەحەت نەبێت ﴿إِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر بەسۆزو بەبەزەیی یە (بۆ ئادەمی) ﴿٧﴾ ﴿وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ﴾ وە ئەسپ و ماین و ئێسترو گوێ درێژ(ی بۆ دروست کردون) ﴿لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ﴾ لەبەر ئەوەی سواریان بن و هۆی ڕازانەوەش بن بۆ ئێوە ﴿وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ وە (خوا) شتی وا دروست دەکات کە (ئێستا) ئێوە نایزانن ﴿٨﴾ ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ﴾ ڕێگای ڕاست نیشاندان (بەبەندەکان) تەنها بۆ خوایە ﴿وَمِنۡهَا جَآئِرٞۚ﴾ وە هەندێك لەڕێگاکان لارو نارێکە ﴿وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ وە ئەگەر (خوا) بیویستایە هەمووتانی ڕێنموونی دەکرد ﴿٩﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ﴾ ئەو (خوا) زاتێکە کە لەئاسمانەوە بارانی بۆ باراندون ﴿لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ﴾ ئاو خواردنەوەتان لەو (بارانە)یە ﴿وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ﴾ و هۆی سەوز بوونی ڕوەکیشە کەمەڕ و ماڵاتی لێ دەلەوەڕێنن ﴿١٠﴾ ﴿يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ﴾ بەو (ئاوە خوا) بۆتان دەڕوێنێت کشتوکاڵ ﴿وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ﴾ و زەیتوون و دار خورما مێو و ڕەز ﴿وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ﴾و هەموو بەرو میوەیەك ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڕاستی لەوەدا (باس کرا) بەڵگەیەکی ڕوون هەیە بۆ ئەوکەسانەی بیردەکەنەوە ﴿١١﴾ ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ وە ڕامی هێناوە بۆتان شەوو ڕۆژ (لەخزمەتی ئێوەدایە) ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ﴾ و خۆرو مانگ ﴿وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ﴾ هەروەها ئەستێرەکانیش ڕام هێنراوون بەفەرمانی خوا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ بەڕاستی لەوەدا (باس کرا) بەڵگەی زۆر هەیە بۆ ئەوانە کەژیرن و تێدەگەن ﴿١٢﴾ ﴿وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ وە (ڕامی هێناوە) بۆتان ئەوەی دروستی کردووە لەزەویدا وبڵاوی کردوەتەوە ﴿مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ﴾ کەڕەنگ وجۆریان جیاوازە﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەوەدا باسکرا﴿لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ﴾ نیشانەیەکی ڕوون هەیە بۆ ئەوانەی کەئامۆژگاری وەردەگرن ﴿١٣﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا﴾ وە ئەو (خوایە) زاتێکە کەدەریای ڕام هێناوە بۆ ئەوەی گۆشتی تازەی لێ بخۆن (مەبەست ماسی وهاوشێوەکانیەتی)﴿وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ﴾ وە بۆ ئەوەی خشڵیشی لێ دەربهێنن کەدەی پۆشن (بۆ خۆ ڕازاندنەوە وەك دوڕ وسەدەف و مرواری) ﴿وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ﴾ و کەشتیەکان دەبینی ئاوی دەریاکە لەت دەکەن ﴿وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ وە بۆ ئەوەی هەندێك لەفەزڵ و ڕۆزی خوا بەدەس بێنن وبۆ ئەوەی سوپاسی خواش بکەن ﴿١٤﴾

﴿وَأَلْقَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ﴾ وە (خـوا) لەزەویدا چەند شـاخێکی دامەزراوی داناوە ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾ بۆ
ئـەوەی ئێوە نەلەرزێنێت وبتوانن لەسـەری بژیـن ﴿وَأَنْهَٰرًا﴾ وەچەم و ڕووبـاری (تیاداناوە) ﴿وَسُبُلًا
لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ هەروەهـا ڕێگـای زۆر(ی بـەدی هێنـاوە) بـۆ ئـەوەی ئێـوە ڕێ ی پـێ دەركەن ﴿١٥﴾
﴿وَعَلَٰمَٰتٍ ۚ وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾ هەروەها نیشانەی زۆری داناوەو بەئەستێرەش خەڵكی ڕێ دەرئەكەن
(لەشـەودا) ﴿١٦﴾ ﴿أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ۗ﴾ جا ئایا زاتێك (ئەمانە) دروسـت دەكات وەك كەسێك وایە
كە هیچ دروست نەكات ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ ئەوە بۆ بیرناكەنەوە؟ ﴿١٧﴾ ﴿وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ﴾
وە ئەگـەر (بتانەوێت) نیعمەكاتـی خوا بژمێرن ناتوانن بیان ژمێرن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاسـتی
خـوا لێبـوردەی میهرەبانە ﴿١٨﴾ ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ﴾ وە خوا دەزانێ چی دە شـاردنەوە ﴿وَمَا تُعْلِنُونَ﴾
و چـی ئاشـكرا دەكەن ﴿١٩﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانـەش هاواریان لێ دەكـەن بێجگەلە خوا
﴿لَا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾ هیچ شتێك دروست ناكەن بەڵكو خۆیان دروست كراون ﴿٢٠﴾ ﴿أَمْوَٰتٌ غَيْرُ
أَحْيَآءٍ ۖ﴾ مـردووی بـێ گیانـن ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ (ئـەو بتانـە) هەسـت ناكەن كـەی (خۆیان
وخەڵكـی) زینـدوو دەكرێنـەوە ﴿٢١﴾ ﴿إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۚ﴾ خـوای ئێـوە خوایەكـی تـاك و تەنیایـە
﴿فَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ جـا ئەوانـەی كەبـڕوا ناهێنـن بـەڕۆژی دوایـی ﴿قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم
مُّسْتَكْبِرُونَ﴾ دڵەكانیـان بـێ باوەڕەو هەمیشـە خۆیان بەزل دەزانن ﴿٢٢﴾ ﴿لَا جَرَمَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ﴾ ڕاسـتە
بێگومـان خوا دەزانێـت ﴿مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ﴾ بەئەوەی دەی شـارنەوەو ئەوەی ئاشـكرای دەكەن
﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْتَكْبِرِينَ﴾ بەڕاسـتی خـوا خـۆ بـەزل زانانـی خـۆش ناوێـت ﴿٢٣﴾ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُم
مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ﴾ وە كاتێـك بەوانـە بوترێـت ئایـا پەروەردگارتـان چـی ناردۆتـە خـوارەوە
﴿قَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ دەڵێـن حیكایـەت وئەفسـانەی پـڕو پوچـی پێشـووەكان ﴿٢٤﴾ ﴿لِيَحْمِلُوٓا۟
أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً﴾ بـۆ ئەوەی باری گوناهی خۆیان بەتەواوی هەڵبگرن﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لەڕۆژی دوایدا
﴿وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم﴾ لەگـەڵ هەندێـك لەبـاری گوناهـی ئەوانـەی كە ئەمـان گومڕایـان دەكردن
﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ﴾ بەبـێ زانیـاری ﴿أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ﴾ بێداربـن زۆر بەدە ئـەوەی كەهەڵیدەگـرن (و دەیگرنە
ئەسـتۆ) ﴿٢٥﴾ ﴿قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـەش كـە لەپێش ئەمانەوە بـوون پیلانیـان گێڕا
﴿فَأَتَى ٱللَّهُ بُنْيَٰنَهُم مِّنَ ٱلْقَوَاعِدِ﴾ جـا خـوا كـۆشـك و خانووەكـانیانـی لەبـن و بنـاغـەوە دەرهێنـا
﴿فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ﴾ ئەوسـا سـەربانەكانیان لەسـەریانەوە ڕوخـا بەسـەریاندا ﴿وَأَتَىٰهُمُ
ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ﴾ لەلایەكەوە سزایان بۆ هات كەهەستیان پێ نەدەكرد ﴿٢٦﴾

﴿ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُخْزِيهِمْ﴾ پاشـان لەڕۆژی دواییدا ڕیسـوا و سەرشۆڕیان دەکات ﴿وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ
ٱلَّذِينَ﴾ و(خـوا پێیان)دەفەرموێـت لەکوێـن ئەو هاوبەشـانەی ﴿كُنتُمْ تُشَٰٓقُّونَ فِيهِمْ﴾ کەئێـوە لەبەر
ئـەوان ململانێـی (پێغەمبـەرەکان و بڕواداران)تـان دەکرد دەربارەیـان ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ﴾ ئەوانەی
زانیاریـان پـێ درا بـوو دەڵێن ﴿إِنَّ ٱلْخِزْيَ ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ﴾ بەڕاسـتی ڕیسـوایی و بەدبەختـی ئەمڕۆ ﴿عَلَى
ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بـۆ بـێ باوەڕانـە ﴿٢٧﴾ ﴿ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئەوانـەی کەفریشـتەکان گیانیـان دەکێشـن
﴿ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمْ﴾ لـە کاتێکدا سـتەم کار بـوون لەخۆیان ﴿فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ﴾ جالەو کاتـەدا مل کەچ دەبن
﴿مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍ﴾ (و ئەڵێن) ئێمە هیچ خراپەیەکمان نەکردووە ﴿بَلَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾
بەڵـێ (خراپەتـان کـردووە) بێگومان خـوا ئاگادارە بـەو کردەوانـەی کەئێـوە دەتانکرد ﴿٢٨﴾ ﴿فَٱدْخُلُوٓا۟
أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ﴾ کەواتە لەدەرگاکانی دۆزەخەوە بڕۆنە ژوورەوە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ تێیدا بمێننەوە بەهەمیشەیی
و (هەتاهەتایی) ﴿فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ ئای جێگەی خۆبەگەورەزانان چەندناخۆش و خراپە ﴿٢٩﴾
﴿وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟﴾ وە ووتـرا بەوانەی کەخۆیان پاراسـت (لە بـێ بڕوایی) ﴿مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوا۟ خَيْرًا﴾
ئـەوە پەروەردگارتـان چـی ناردۆتـە خـوارەوە؟ دەڵێـن خێـرو چاکـە ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا
حَسَنَةٌ﴾ بـۆ ئەوانـەی کە لەم دونیایـەدا چاکەیان کردووە چاکە هەیـە ﴿وَلَدَارُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ﴾ و بێگومان
جێگای ڕۆژی دوایی چاکترە ﴿وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ و چ خۆشـماڵ و شوێنی پارێزکاران ولەخواترسان
﴿٣٠﴾ ﴿جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا﴾ بەهەشـتانێك جێگـای مانـەوەی هەمیشـەیین کەئـەوان دەچنەنـاوی
﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ڕوبارەکانی دەڕۆن بەژێر (قەسرو درەختەکان)یاندا ﴿لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ﴾
لەو بەهەشتانەدایە ئەوەی بیانەوێ بۆیان ئامادەیە ﴿كَذَٰلِكَ يَجْزِي ٱللَّهُ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ ئابەو جۆرە خوا پاداشتی
خـۆ پارێزەران وخواناسـان دەداتـەوە ﴿٣١﴾ ﴿ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ﴾ ئەوانەی کەفریشـتەکانی
(گیـان کێشـان) گیانیـان دەکێشـن بەپاکی ﴿يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ﴾ (فریشـتەکان) دەڵێـن سـەلامتان لـێ
بێـت ﴿ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بچنـە بەهەشـتەوە بەهـۆی ئـەوەی کەدەتانکرد(لەدونیـادا) ﴿٣٢﴾
﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئایـا (ئـەو بـێ باوەڕانە) چـاوەڕێ ی چـی ئەکەن جگـە لەوەی
فریشـتەکان بۆتـان بێـن و(گیانیـان بکێشـن) ﴿أَوْ يَأْتِيَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ یـان فەرمانـی پەروەردگـارت بێـت
(بـۆ سـزادانیان) ﴿كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ ئەوانـەی پێش ئەمانیـش هـەر وەکـو ئەمانیـان کـرد
﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ﴾ و خواسـتەمی لـێ نەکـردن ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵکـو خۆیـان سـتەمیان
لەخۆیـان دەکـرد ﴿٣٣﴾ ﴿فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟﴾ لەئاکامـدا تۆڵـەی ئـەو خراپانانەیـان تـووش بـوو
کەکردبوویـان ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ وە ئەو (سـزا)ی کەئەوان گاڵتەیان پـێ دەکرد دەوری دان
و هاتەسەریان ﴿٣٤﴾

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ﴾ وە ئەوانـەی هاوبەشـیان دانـاوە بـۆ خـوا دەڵـێـن ﴿لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئەگـەر خـوا بیویسـتایە ﴿مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ﴾ بێجگـە ئـەو (خـوا) هیـچ شـتێکمان نەدەپەرسـت ﴿نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا﴾ نەئێمەو نەباو و باپیرانمان ﴿وَلَا حَرَّمۡنَا﴾ وە حەرامـمان نەدەکرد ﴿مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ﴾ هیچ شتێك بەبێ فەرمانی ئەو ﴿كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ پێشینانی ئەمانیش هەر بەو جۆرەیان دەکرد ﴿فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ﴾ ئایا پێغەمبەران هیچیان لەسەرە بێجگە لەڕاگەیاندنێکی ﴿ٱلۡمُبِينُ﴾ ئاشکرای ((ئاینی یەکتاپەرسـتی) ﴿٣٥﴾ ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا﴾ سـوێند بەخـوا لەناو هەموو گـەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمـان ناردووە ﴿أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾ (کە فەرمـان دەکەن بەخەڵکی) بەوەی تەنها خوا بپەرسـتن و دوورکەونەوە لە (پەرسـتنی) هەرپەرستراوێکی تر ﴿فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ﴾ جا خوا هەندێکی لەو (ئوممەتانە) ڕێنموونی کرد ﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ﴾ و هەندێکیشیان (لەبەر خراپیـان) گومڕایـی یەخەی گرتن ﴿فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ﴾ دەی بەزەویدا بگەڕێن و تەماشـاکەن ﴿كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ سـەر ئەنجامـی بێ بـاوەڕان چۆن بوو ﴿٣٦﴾ ﴿إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ﴾ هەر چەند زۆر سووربی لەسەر ڕێنموونی ئەوانە (بێ سوودە) ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّۖ﴾ چونکە بەڕاسـتی خـوا ڕێنموونی کەسێك ناکات کـە (بیەوێ) گومڕای بـکات ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ هیچ پشتیوانێکیشیان نی یە ﴿٣٧﴾ ﴿وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ﴾ وە ئەوانە زۆر توند سوێندیان دەخوارد بەخوا ﴿لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ﴾ (دەیان ووت) هەرکەس بمرێت خوا زیندووی ناکاتەوە ﴿بَلَىٰ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا﴾ بەڵێ (زینـدووی دەکاتەوە) بەڵێنێکی هەق و ڕاسـتی خوایە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن ﴿٣٨﴾ ﴿لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ﴾ بۆئەوەی ڕوونی بکاتەوە بۆخەڵکی ئەوەی تیایـدا جیـاوازن ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ وەتا ئەوانەش کە بێ بـاوەڕ بوون بزانن ﴿أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰذِبِينَ﴾ کەبەڕاسـتی ئـەوان درۆزن بـوون ﴿٣٩﴾ ﴿إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ﴾ بەڕاسـتی کاتێـك (زیندووکردنـەوە وبەدیهێنانی هەرشـتێکمان) بوێت ﴿أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ (ئەمەیە) کەپێی دەڵێین ببە ئەویش یەکسـەر دەبێـت ﴿٤٠﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ﴾ وە ئەوانـەی لەڕێـی خـوادا کۆچیان کـرد ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ﴾ دوای ئـەوەی سـتەمیان لێ کرا ﴿لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ﴾ بێـگومان لەدونیادا نیشـتەجێ یـان دەکەین زۆر بەچاکی ﴿وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ وە بەڕاسـتی پاداشتی ڕۆژی دوایی گەورەترە ئەگەر بیان زانیایە ﴿٤١﴾ ﴿ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ئەوانە کەسانێك بوون دانیان بەخۆیاندا گرت و تەنها پشتیان بەپەروەردگاریان دەبەست ﴿٤٢﴾

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ﴾ وە ڕەوانەمان نەکردووە لەپێش تۆ ﴿إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ﴾ بێجگە لە پیاوانێ
کە نیگامان بۆ ناردوون ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ﴾ دەی پرسیار بکەن لەزانایان ﴿إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾
ئەگەر ئێوە نازانن ﴿٤٣﴾ ﴿بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ﴾ لەگەڵ چەندین بەڵگەو پەڕاوی ئاسمانی ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ
ٱلذِّكۡرَ﴾ وقورئانیشمان بۆ تۆ نارد ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ﴾ بۆ ئەوەی ڕوونی بکەیتەوە بۆ خەڵکی
ئەوەی بۆیان نێردراوەتە خوارەوە ﴿وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڵکو بیربکەنەوەو تێ بگەن ﴿٤٤﴾ ﴿أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ
ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ دەی ئایا ئەوانەی کەپیلان وخراپەیان کردووە بێ باکن و ناترسن لەوەی ﴿أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ
ٱلۡأَرۡضَ﴾ کەخوا بیان بات بەناخی زەویدا ﴿أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ﴾ یان سزایان بۆ بێت ﴿مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ﴾
لەشوێنێکەوە کەهەستی پێ ناکەن ﴿٤٥﴾ ﴿أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ﴾ یان (سزا) بیان گرێت لەکاتی گەڕان
و هاتوچۆدا ﴿فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ﴾ ئیتر ناتوانن خۆیان قوتارکەن ﴿٤٦﴾ ﴿أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ﴾ یان لەکاتێکدا
دەترسن (لەسزادان) لەناویان دەبات ﴿فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگارتان زۆر دڵسۆز
ومیهرەبانە ﴿٤٧﴾ ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ﴾ ئایا ئەوانە نابینن و سەرنج نادەن کە هەرچی خوا دروستی
کردووە ﴿يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَٰلُهُۥ﴾ سێبەرەکانیان دەگۆڕێت ﴿عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ﴾ بەلای ڕاست و چەپیاندا
﴿سُجَّدٗا لِّلَّهِ وَهُمۡ دَٰخِرُونَ﴾ بەمل کەچیەوە سوژدە بۆ خوا دەبن ﴿٤٨﴾ ﴿وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ
هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە هەر بۆ خوا سوژدە دەبەن ﴿مِن دَآبَّةٖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ﴾
لەگیان لەبەران و فریشتەکان لەهەمان کاتدا خۆشیان بەگەورە دانانێن ﴿٤٩﴾ ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ﴾
لە پەروەردگاریان دەترسن کەلەلای سەروویانەوەیە ﴿وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ۩﴾ و هەر فەرمانێکیان
پێ بکرێت دەیکەن ﴿٥٠﴾ ﴿وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ﴾ خوا فەرمووی دوو پەرستراو بۆ خۆتان
دامەنێن ﴿إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ﴾ بێگومان پەرستراو(ی ئێوە) تەنها یەکێکە (کەخوای گەورە وباڵادەستە)
﴿فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ﴾ کەواتە هەر لەمن بترسن ﴿٥١﴾ ﴿وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ وە تەنها موڵکی خوایە
ئەوەی لەئاسمانەکان و لەزەویدایە ﴿وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ﴾ وە گوێڕایەڵی بەردەوام هەر بۆ ئەوە ﴿أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ
تَتَّقُونَ﴾ دەی ئایا لەغەیری خوا دەترسن؟ ﴿٥٢﴾ ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ﴾ وە هەر چاکە و بەهرەیەکتان
هەبێت ئەوە هەمووی لەخواوەیە ﴿ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ﴾ پاشان کاتێك دووچاری زیان و ناڕەحەتیەك بین
﴿فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ﴾ ئەوە پەناو هاوار هەر بۆلای ئەو دەبەن ﴿٥٣﴾ ﴿ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ﴾ لەپاشان کاتێك
ناڕەحەتیەکەی لەسەر لابردن ﴿إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم﴾ کتوپڕ دەستەیەك لە ئێوە ﴿بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ﴾ هاوبەش
بڕیار دەدەن بۆ پەروەردگاریان ( وەدەگەڕێنەوە سەر بێ باوەڕی) ﴿٥٤﴾

﴿لِيَكْفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ﴾ (لێیان گەڕێ) با بێباوەڕ وسپڵە بن بەرامبەر ئەوەی پێمان بەخشین
﴿فَتَمَتَّعُواْ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ وە (لەدونیادا) ڕابوێرن جا لەمەو دوا دەزانن (چییان لێ دەکەین) ﴿٥٥﴾
﴿وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ﴾ وە (بت پەرستان) بۆ ئەو (بت)انەی کەهیچ نازانن دادەنێن ﴿نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَٰهُمْ﴾
بەشێك لەوەی کەئێمە پێمان بەخشیوون (لەخواردن و خواردنەوە) ﴿تَٱللَّهِ لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ
تَفْتَرُونَ﴾ سوێند بەخوا پرسیارتان لێ دەکرێت لەسەر ئەو درۆو بوختانەی کەهەڵتان دەبەست ﴿٥٦﴾
﴿وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ﴾ ئەو (بت پەرستانە) کچان بۆ خوا دادەنێن (و دەڵێن فریشتەکان کچی خودان)
﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ﴾ پاك و بێگەردی بۆ خواو بۆ خۆشیان چییان پێ خۆشە (دایدەنێن کە
حەزیان لە کوڕە) ﴿٥٧﴾ ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ﴾ هەرکاتێ یەکێك لەوانە مزگێنی کچی پێ بدرێت
﴿ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ ڕوی ڕەش دائەگەڕێت و بۆ خۆی پیش دەخواتەوە ﴿٥٨﴾ ﴿يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ﴾
خۆی دەشارێتەوە لەخەڵکی ﴿مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ﴾ لەبەر ئەو مژدە خراپەی پێی دراوە (بەگومانی
خۆی) ﴿أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ﴾ ئایا (ئەو کچە) بیهێڵێتەوە بەسەرشۆڕ(ی بەخێوی بکات) ﴿أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ﴾
یان زیندە بەچاڵی کات ﴿أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ بێداربن ئای چەند خراپە ئەو بڕیارەی دەیدەن! ﴿٥٩﴾
﴿لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ﴾ بۆ ئەوانە هەیە کە بڕوایان بەڕۆژی دوایی نی یە ﴿مَثَلُ ٱلسَّوْءِ﴾ نموونەی خراپ
﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ نموونەی هەرە بەرزیش هەر بۆ خوایە ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ وە هەر ئەو (خوا)
زاڵی بەدەسەلاتی کاردروستە ﴿٦٠﴾ ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ﴾ وە ئەگەر خوا خەڵکی سزا بدایە ﴿بِظُلْمِهِم﴾
بەهۆی ستەم (و بێ بڕوایی) یانەوە ﴿مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ﴾ هیچ گیان لەبەرێ (مرۆڤ) ێکی لەسەر
(زەویدا) نەدەهێشت ﴿وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ بەڵام دوایان دەخات تا کاتی دیاری کراو (بۆیان)
﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ﴾ جا کاتێك کاتی دیاری کراویان هات (ڕۆژیان تەواو بوو) ﴿لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً﴾ هیچ
کات و ساتێك دواناکەون ﴿وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ و پێشیش ناکەون ﴿٦١﴾ ﴿وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ﴾ وە ئەوان
شتێ بۆ خوا دادەنێن کەخۆیان حەزی لێ ناکەن ﴿وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ ٱلْكَذِبَ﴾ وە زمانیان بەدرۆ دەڵێ
﴿أَنَّ لَهُمُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ کەبێگومان پاداشتی زۆر چاك هەر بۆ ئەوانە ﴿لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ﴾ ڕاستە
و گومانی تێدا نی یە (پاداشتی) ئەوانە هەر ئاگری (دۆزەخ)ە و زوو بەپەلە دەبرێن (بۆی) ﴿٦٢﴾
﴿تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەرانمان ناردووە بۆ سەر گەلانی پێش تۆ
﴿فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ جاشەیتان کردەوە (خراپەکان) یانی بۆ ڕازاندنەوە ﴿فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ﴾
بۆیە ئەمڕۆ (شەیتان) پشتیوانیانە ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە بۆ ئەوانە سزای سەختی بەئازار هەیە ﴿٦٣﴾
﴿وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ وە ئێمە قورئانمان نەناردۆتە خوارەوە بۆت ﴿إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ﴾ مەگەر بۆ ئەوەی
ڕوونی بکەیتەوە بۆ خەڵکی ﴿ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ﴾ ئەوەی کەتیایدا جیاواز بوون ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ
يُؤْمِنُونَ﴾ وە تارێنموونی و میهرەبانیش بێت بۆ کەسانێ کەباوەڕ دێنن ﴿٦٤﴾

﴿وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ وە خوا لەئاسمانەوە بارانی باراندووە ﴿فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ﴾ جا بەو (بارانە)
زەوی زیندوو کردەوە دوای ئەوەی کەمرد بوو ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەمەدا ﴿لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ نیشانە
و بەڵگەیەکی ڕوون هەیە بۆ کەسانێك کە(ڕاستی) دەبیستن ﴿٦٥﴾ ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً﴾ وە بەڕاستی
لەئاژەڵ و ماڵاتیشدا بۆ ئێوە پەند و ئامۆژگاری هەیە ﴿نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ﴾ لەوەی لەناو سکی
دایە بەئێوەی دەنۆشین ﴿مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ﴾ لەنێوان سڕوان (پیسی) و خوێندا
شیرێکی پاکی بێ خەوشتان پێ دەنوشێت ﴿٦٦﴾ ﴿وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ﴾ وە لەبەرو بوومەکانی
دار خورما و ڕەزەکانیش ﴿تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا﴾ (خواردنەوەی) سەر خۆشکەری لێ دروست دەکەن
﴿وَرِزْقًا حَسَنًا﴾ وەڕۆزی و بژێوی پاك و چاکیشی (لێ دروست دەکەن وەك مێوژ و دۆشاو) ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ
لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بەڕاستی لەوەدا نیشانە هەیە بۆ کەسانێك کەتێدەگەن ﴿٦٧﴾ ﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ﴾
وە پەروەردگارت سرووش (ئیلهامی) کرد بۆ هەنگ ﴿أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا﴾ کە لەچیاکاندا خانوو
(بۆ خۆت) ساز بدە ﴿وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ﴾ و لە(کونی) دارو درەختەکان لەو (شوێن)انەی
کەخەڵکی دروستی دەکەن (بۆی) ﴿٦٨﴾ ﴿ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ پاشان لەهەموو بەرو بوومێك بمژە
﴿فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا﴾ ئەوسا ئەو ڕێگایانەی پەروەردگارت بگرە بەر بەمل کەچی ﴿يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا﴾
لەسکی ئەو (هەنگانەوە) دێتە دەر ﴿شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ﴾ خواردنەوەیەك (هەنگوین) کەڕەنگەکانی
جیاوازە ﴿فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ﴾ کەشیفای تێدایە بۆ خەڵکی ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بێگومان
لەوەدا نیشانەی گەورە هەیە بۆ کەسانێك کەبیر دەکەنەوە ﴿٦٩﴾ ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمْ﴾ بێگومان
خوا ئێوەی دروست کردووەو پاشان دەتان مرێنێت ﴿وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ﴾ وە هەندێك
لەئێوە (زۆر پیر دەبێ تا) دەگەڕێنرێتەوە بۆ لاواز ترینی تەمەن ﴿لِكَىْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔا﴾ بۆ ئەوەی
لەپاش زانین هیچ شتێك نەزانێت (هەموو شتێکی لەبیر بچێتەوە) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی
خوا زانای بەتوانایە ﴿٧٠﴾ ﴿وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ﴾ وە خوا فەزڵی هەندێکتانی داوە
بەسەر هەندێکتاندا لە(پێدانی) ڕزق و ڕۆزی دا ﴿فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُوا۟ بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ﴾
جائەوانەی کەفەزڵی خودایان بەسەرەوەیە وڕزق وڕۆزیان زۆرە بەشی بەندەکانی لێ نادەن
﴿فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ﴾ تابەهۆی ئەوەوە ئەوان(بەندەکان و) ئەمان یەکسان بن تێیدا ﴿أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾
دەی ئایا ئەوانە ئینکاری چاکەو نیعمەتەکانی خوا دەکەن؟ ﴿٧١﴾ ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا﴾
وە خوا لەڕەگەزی خۆتان هاوسەری بۆ بەدی هێناون ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً﴾
وە لەژن و هاوسەرەکانتان کوڕو نەوەی بۆ فەراهەم هێناون ﴿وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ وە ڕزق وڕۆزی
پاك و خۆشی پێدا وون ﴿أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ﴾ دەی ئایا ئەوان هەر بە ناهەق و بەتاڵ باوەڕ دێنن
﴿وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ﴾ وە بەچاکەو نیعمەتەکانی بێ باوەڕ و سپڵەن ﴿٧٢﴾

﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا﴾ ئـەوان لەجیاتـی خوا شـتانێ دەپەرسـتن ﴿لَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ رِزۡقٗا﴾ کەخاوەنی هیچ
ڕزق و ڕۆزیەکـی ئـەوان نیـن ﴿مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ شَيۡـٔٗا﴾ نەلـە ئاسـمانەکان و نـە لەزەویـدا ﴿وَلَا
يَسۡتَطِيعُونَ﴾ و ناشـتوانن (ڕۆزیـان بـدەن) ﴿٧٣﴾ ﴿فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَۚ﴾ کەواتـە وێنـە بـۆ خـوا مەهێننەوە
﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ بەڕاسـتی خوا دەزانێت و ئێوە نازانن ﴿٧٤﴾ ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبۡدٗا مَّمۡلُوكٗا﴾
خوا نموونەی هێناوەتەوە بەبەندەیەکی خاوەن دار ﴿لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ﴾ کەتوانای بەسەر هیچ شتێکدا نیە
﴿وَمَن رَّزَقۡنَٰهُ مِنَّا رِزۡقًا حَسَنٗا﴾ لەگەڵ کەسـێکی (باوەڕدار) کەڕزق و ڕۆزی چاکمان پێ دابێت لەلایەن
خۆمانـەوە ﴿فَهُوَ يُنفِقُ مِنۡهُ سِرّٗا وَجَهۡرًاۖ﴾ ئەویـش لەو (ڕۆزیە)ی ببەخشـێت بەنهێنی و ئاشـکرا ﴿هَلۡ
يَسۡتَوُۥنَۚ﴾ ئایا ئەو دووانە یەکسانن ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ﴾ سوپاس و ستایش بۆ خوا ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾
بـەلام زۆربەیـان نازانـن ﴿٧٥﴾ ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا رَّجُلَيۡنِ﴾ وە هەروەها خوا نموونـەی هێناوەتەوە بەدوو
پیاو ﴿أَحَدُهُمَآ أَبۡكَمُ لَا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ﴾ یەکێکیان لاڵی زگماکی یە کەتوانای بەسەر هیچ شتێکدا نییە
﴿وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوۡلَىٰهُ﴾ و ئەو (پیاوە) ئەرك و بارە بەسەر خاوەنەکەیەوە ﴿أَيۡنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأۡتِ بِخَيۡرٍ﴾ بەرەو
هەرشوێنێك بینێرێ هیچ خێرو چاکەیەك ناهێنێتەوە ﴿هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ وَمَن يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ﴾ ئایا ئەو کەسە
یەکسانە لەگەڵ کەسێك فەرمان بەداد گەری بدات ﴿وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ و ئەو (کەسە) لەسەر
ڕێگەیەکی ڕاسـت بێت ﴿٧٦﴾ ﴿وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ وە هەر بـۆ خوایە نهێنی و پەنهانیەکانی
ئاسـمانەکان و زەوی ﴿وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ﴾ وە هاتنـی ڕۆژی دوایـش (بـەلای خـواوە) ﴿إِلَّا كَلَمۡحِ
ٱلۡبَصَرِ أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُۚ﴾ هـەر وەکـو چـاو تروکانێك وایە یـان نزیك تر لـەوەش ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ
قَدِيرٞ﴾ بەڕاسـتی خـوا بەسـەر هەمـوو شـتێکدا بەتوانایـە ﴿٧٧﴾ ﴿وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ﴾
خـوا ئـەو خوایە یـە کە ئێوەی لەسـکی دایکتـان دەرهێنـاوە ﴿لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا﴾ کە هیچتـان نەدەزانی
﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ﴾ وە (خـوا) گوێ و چاو و دڵی پێدان ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾
بـۆ ئـەوەی سوپاسـی (خـوا) بکـەن ﴿٧٨﴾ ﴿أَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ﴾ ئایا ئـەوان سـەرنجی باڵندەیان نـەداوە؟
﴿مُسَخَّرَٰتٖ فِي جَوِّ ٱلسَّمَآءِ﴾ کەچۆن لەهەوای ئاسـماندا ڕام هێنراون ﴿مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُۚ﴾ بێجگـە لەخوا
کێ ڕایان دەگرێت (بەو ئاسـمانەوە) ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بەڕاسـتی لەو (ڕاگیرکردنە) دا
چەند نیشـانە و بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی باوەڕدێنن ﴿٧٩﴾

﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا﴾ وە خوا ماڵەکانتانی کردووە بەجێی دانیشتن و حەوانەوە ﴿وَجَعَلَ لَكُم
مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا﴾ وە لەپێستی ئاژەڵیش دەوارو ڕەشماڵی بۆ فەراهەم هێناون ﴿تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ
ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ﴾ (هەڵدەدرێت و دەگوێزرێتەوە) بە ئاسانی لەڕۆژی کۆچ و بارکردنتانداو
لەڕۆژی مانەوەونیشتەجێ بونتاندا ﴿وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا﴾ وە(سازاندویەتی بۆتان)لەخوری و کوڵکی
(ئەو ئاژەڵانە) ﴿وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا﴾ وە لە مووەکانیان شتومەکی ناوماڵ کەکەڵکی لێ وەردەگرن
﴿إِلَىٰ حِينٖ﴾ تا ماوەیەك ﴿٨٠﴾ ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا﴾ وە خوا لەوەی کەدروستی کردوە
سێبەری زۆری ڕەخساندووە بۆتان ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا﴾ وە لەچیاکاندا پەناگا
وئەشکەوتی بۆ بەدی هێناون ﴿وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ﴾ وە سازیداوە بۆتان جل
وپۆشاکێك کەدەتان پارێزێ لەگەرما ﴿وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡ﴾ هەروەها جل وپۆشاکێك کە لەکاتی
جەنگدا دەتان پارێزێت (لەدوژمنان) ﴿كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئا بەو جۆرە چاکەو نیعمەتەکانی
خۆی تەواو دەکات بەسەرتانەوە ﴿لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ﴾ بۆ ئەوەی مل کەچ و موسوڵمان بن ﴿٨١﴾
﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ﴾ ئەوسا ئەگەر ئەوان ڕوویان وەرگێڕا ئەوە بێگومان ئەوەی لەسەر
تۆیە تەنها ﴿ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ ڕاگەیاندنی ئاشکرای (ئاینەکەتە) ﴿٨٢﴾ ﴿يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ﴾ ئەوانە
بەهرەکانی خوا دەناسن (و دەزانن) ﴿ثُمَّ يُنكِرُونَهَا﴾ پاشان ئینکاری دەکەن ﴿وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾
وە زۆربەی ئەوانە هەر بێ باوەڕن ﴿٨٣﴾ ﴿وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدٗا﴾ وە ڕۆژێك دێ ئێمە
لەهەر ئوممەتێك شایەتێك (پێغەمبەرێك) یان بۆ دەنێرین ﴿ثُمَّ لَا يُؤۡذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوسا
مۆڵەت نادرێت بەوانەی باوەڕیان نەهێناوە ﴿وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ﴾ بیانوشیان لێ وەرناگیرێت
﴿٨٤﴾ ﴿وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ﴾ وە کاتێ ئەوانەی ستەمیان کردوە وسزای دۆزەخ دەبینن
﴿فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾ نەسزاکەیان لەسەر سووك دەکرێت نەمۆڵەتیش دەدرێن ﴿٨٥﴾
﴿وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ شُرَكَآءَهُمۡ﴾ وە کاتێك ئەوانەی کەهاوبەشیان داناوە پەرستراوەکانیان
دەبینن ﴿قَالُواْ﴾ دەڵێن ﴿رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان ئەوانە پەرستراوەکانمانن
﴿ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَۖ﴾ کە ئێمە هاوارمان لێ ئەکردن لەجیاتی تۆ ﴿فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ إِنَّكُمۡ﴾
ئەمجا ئەو (پەرستراوانە) وتەیان ئاڕاستە دەکەن (و دەڵێن) بەڕاستی ئێوە ﴿لَكَٰذِبُونَ﴾ درۆزنن
﴿٨٦﴾ ﴿وَأَلۡقَوۡاْ إِلَى ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَۖ﴾ وە لەو ڕۆژەدا هەموو گوێڕایەڵی و ملکەچی ئەنوێنن بۆ خوا
﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ وە وون دەبێت لێیان ئەو درۆیانەی کەهەڵیان دەبەست
(لەدونیادا) ﴿٨٧﴾

﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانـەی کە بێ بـاوەڕ بوون و بەرگری خەڵکیشیان کردووە
لەڕێگـەی خوا ﴿زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ﴾ جگە لە سـزا کەی خۆیان سـزایان بۆ زیـاد دەکەین ﴿بِمَا
كَانُواْ يُفْسِدُونَ﴾ لەبـەر ئـەوەی کەخراپەکاریان دەکـرد ﴿٨٨﴾ ﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِى كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا﴾ وە ئەو
ڕۆژەی کەئێمە لە هەر ئوممەتێك شـایەتێك (پێغەمبەرێك) دەنێرین ﴿عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ بۆسەریان
لەخۆیان (کەشایەتیان لێ بدات) ﴿وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ وە تۆش دەهێنین (ئەی موحەممەد
ﷺ) بەشـایەت لەسـەر ئەوانـە﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ وە ئێمـە قورئانمـان ناردۆتـە خـوارەوە بـۆت
﴿تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ﴾ کەڕوون کەرەوەیەبۆهەموو شتێك﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾ وەڕێنموونی
ومیهرەبانی و مژدەیە بۆ موسڵمانان ﴿٨٩﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ﴾ بەڕاستی خوا فەرمان دەدات
بەدادگەری و بەچاکە ﴿وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾و بە بەخشین بەخزم و خوێش ﴿وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ
وَٱلْبَغْىِ﴾ وە (خوا) بەرگری دەکات لەداوێن پیسی و خراپە و دەست درێژی ﴿يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾
ئامۆژگاریتـان دەکات بـۆ ئـەوەی پەنـد وەرگـرن و بیربکەنـەوە ﴿٩٠﴾ ﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ﴾
وە بەڵێنی خوا بەجێ بێنن کاتێ کەبەڵێن دەدەن ﴿وَلَا تَنقُضُواْ ٱلْأَيْمَٰنَ﴾ و بەڵێن وپەیمانەکانتان مەشکێنن
﴿بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾ لەپاش بەستن ودووپاتکردنەوەیـان ﴿وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا﴾ لەکاتێکدا
خواتان کردووە بەشـایەت و چاودێر بەسـەر خۆتانەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ بەڕاسـتی هەرچی
دەکەن خوا دەیزانێت ﴿٩١﴾ ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ غَزْلَهَا﴾ وەك ئەو (ئافرەتە) مەبن کەڕیسەکەی کردەوە
بەخوری ﴿مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثًا﴾ لەپاش بادان و ڕستن و شەتەك دانی ﴿تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ﴾
سوێندو پەیمانەکانتان دەکەن بەهۆی ناپاکی و فڕو فێڵ لەنێوانتاندا﴿أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِىَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ﴾ لەبەر
ئەوەی دەسـتەو کۆمەڵێك زۆرترو بەهێز ترە لەدەسـتەو کۆمەڵێکی تر ﴿إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ﴾ خوا بەوە
تاقیتان دەکاتەوە﴿وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ وە سـوێند بەخوا لەڕۆژی دواییدا بۆتان ڕوون دەکاتەوە
﴿مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ ئـەوەی کەئێـوە تیایـدا جیـاواز بـوون ﴿٩٢﴾ ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾
وە ئەگـەر خـوا بیویسـتایە ئێـوەی دەکـرد بەیـەك ئوممـەت﴿وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ﴾ بـەڵام (خـوا) هەر
کەسێکی بوێت گومڕای دەکات (بەهۆی سەرکەشی خۆیەوە) ﴿وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ هەر کەسێکیشی
بوێت ڕێنموونی دەکات ﴿وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ وە سوێند بەخوا پرسیارتان لێ دەکرێت لەوەی
کەدەتانکرد ﴿٩٣﴾

﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ﴾ وە سوێند و پەیمانتان مەکەن بەهۆی ﴿دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ﴾ غەدرو ناپاکی
لەنێوان یەکتردا ﴿فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا﴾ تا پێ لەپاش جێگیر بوونی (لەسەر باوەڕ) هەڵنەخلیسکێ
﴿وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ﴾ و سزاو ناڕەحەتی نەچەژن ﴿بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بەهۆی بەرهەڵستی
کردنتان لەڕێبازی خوا ﴿وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ (ئەگەر وابن) سزای زۆر گەورەتان بۆ دەبێت ﴿٩٤﴾
﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ﴾ وە بەڵێن و پەیمانی خوا بەنرخێکی کەم مەگۆڕنەوە ﴿إِنَّمَا
عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ بەڕاستی ئەوەی کەلای خوا هەیە چاکترە بۆتان ﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر
ئێوە بزانن ﴿٩٥﴾ ﴿مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖۗ﴾ (چونکە) هەرچی لای ئێوەیە تەواو دەبێت ئەفەوتێت
ونامێنێت بەلاّم ئەوەی لای خوایە هەر دەمێنێت ﴿وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم﴾ سوێند بەخوا
ئەوانەی کە بەئارام بوون پاداشتیان دەدەینەوە ﴿بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ بەپاداشتی چاکتر لە
کردەوەکانیان ﴿٩٦﴾ ﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ﴾ هەرکەس لەنێر یان لەمێ کردەوەی چاکی
کردبێت وبیکات ﴿وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ﴾ و بڕواداریش بوو بێت ئەوە سوێند بەخوا
بەژیانێکی خۆش دەیان ژیەنین ﴿وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ﴾ و سوێند بێ پاداشتیان بدەینەوە بەچاکتر
﴿مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ لەوەی کەئەوان دەیانکرد ﴿٩٧﴾ ﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ (ئەی موحەممەدﷺ)
کاتێك ویستت قورئان بخوێنی ﴿فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ پەنا بگرە بەخوا لەشەیتانی نەفرین
لێکراو و دەرکراو لەبەزەیی خوا ﴿٩٨﴾ ﴿إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ﴾ بەڕاستی ئەو(شەیتان) دەسەلاّتی نی
یە ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەسەر ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوە ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾ وتەنها پشت
بە پەروەردگاریان دەبەستن ﴿٩٩﴾ ﴿إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ﴾ تەنها دەسەلاّتی بەسەر ئەوانەدا هەیە
﴿يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ﴾ کە ئەو(شەیتان) دەکەنە دۆست پشتیوانی خۆیان و ئەوانەی بەهۆی
ئەوەوە بوونەتە هاوەڵدانەر ﴿١٠٠﴾ ﴿وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةٗ مَّكَانَ ءَايَةٖ﴾ هەر کاتێك ئایەتێك لەجێی ئایەتێکی
تردا دابەزێنین ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ﴾ وە خوا چاکتر دەزانێ چی دەنێرێتە خوارەوە ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ
مُفۡتَرِۭۚ﴾ دەڵێن تۆ لە خۆتەوە درۆ هەڵدەبەستی بەناوی خواوە ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ (وانیە) بەڵکو
زۆر بەیان هیچ نازانن ﴿١٠١﴾ ﴿قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ﴾ بڵێ جوبرەئیل دایبەزاندوە ﴿مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ﴾ لەلایەن
پەروەردگارتەوە بەڕاستی ﴿لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ تا ئەوانەی باوەڕیان هێناوەدامەزراویان بکات
﴿وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ﴾ و ڕێنموونی و موژدەش بێت بۆموسوڵمانان ﴿١٠٢﴾

﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە دەزانین کەئەو (بێ باوەڕانە) دەڵێن
﴿إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ﴾ هەر ئادەمی یە (ئەم قورئانەی) فێری (موحەممەد) دەکات (مەبەستیان
کابرایەکی ڕۆمی بوو) ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ﴾ کەچی زمانی ئەو کەسەی ئەوەی
دەدەنەپاڵ عەجەمی یە ﴿وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ﴾ و ئەم (قورئانە)ش بەزمانی عەرەبی پاراو و ڕوون
( دابەزیوە) ﴿١٠٣﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەبڕوایان بەئایەتەکانی خوا
نی یە ﴿لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ خوای گەورە ڕێنموونیان ناکات، وسزای سەختی بۆ
ئامادەکردوون ﴿١٠٤﴾ ﴿إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ﴾ بێگومان تەنها ئەوانە درۆهەڵدەبەستن بەناوی
خواوە ﴿لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کەباوەڕیان بەئایەتەکانی خوا نی یە ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ﴾
وهەر خۆیان درۆزنن ﴿١٠٥﴾ ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ﴾ ئەو کەسەی بێ باوەڕ بێ بەخوا لەپاشان
باوەڕهێنانی ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ﴾ مەگەر کەسێك زۆری لێ کرا بێت ﴿وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ﴾ و دڵیشی
دامەزراو ئارام بێت بەباوەڕ ﴿وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا﴾ بەڵام کەسێ دڵی خۆش و شادمان
بێت بەبێ باوەڕی ﴿فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ئەوە بەر خەشم و قینی خوا کەوتوون ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ
عَظِيمٌ﴾ و سزای گەورەیان دەبێ ﴿١٠٦﴾ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ﴾ ئەم (هەڕەشەیە) لەبەر ئەوەیە بەڕاستی ئەوانە
﴿ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ ژیانی دونیا یان لا خۆشەویستر بوو لەژیانی ڕۆژی دوایی
﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ وبەڕاستی خوا ڕێنموونی کەسانی بێ باوەڕ ناکات ﴿١٠٧﴾
﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە کەسانێکن ﴿طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ ﴿وَسَمْعِهِمْ
وَأَبْصَٰرِهِمْ﴾ و بەسەر گوێ و چاویاندا ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ﴾ وە هەر ئەوانەن بێ ئاگایان ﴿١٠٨﴾
﴿لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ ڕاستە و بێگومان ئەوانە لەڕۆژی دواییدا ﴿هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ هەر ئەوان
زەرەرمەندن ﴿١٠٩﴾ ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟﴾ پاشان بەڕاستی پەروەردگارت بۆ ئەوانەی کۆچیان
کردوە ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟﴾ لەپاش ئەوەی سزا دران پاشان جیهاد و تێ کۆشانیان کرد
﴿وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا﴾ و بەئارام بوون بێگومان پەروەردگارت لەدوای ئەوە ﴿لَغَفُورٌ
رَّحِيمٌ﴾ لێ بوردەی میهرەبانە (بۆیان) ﴿١١٠﴾

﴿يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ﴾ لەڕۆژێکـدا کەهەمـوو کەسـێك دێـت ﴿تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا﴾ بەرگـری لەخۆی
دەکات ﴿وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ﴾ وە هەموو کەسێك هەرچی کردبێت پاداشتی تەواوی وەردەگرێ
﴿وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ و ئەوان ستەمیان لێ ناکرێت ﴿١١١﴾ ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا قَرۡيَةٗ﴾ خوا نموونەی هێناوەتەوە
بە(خەڵکی) گوند و شـارێك ﴿كَانَتۡ ءَامِنَةٗ مُّطۡمَئِنَّةٗ﴾ کە هێمن و دڵنیا بوون ﴿يَأۡتِيهَا رِزۡقُهَا رَغَدٗا﴾
رزق و ڕۆزی زۆری بۆ دەهات ﴿مِّن كُلِّ مَكَانٖ﴾ لەهەموو شوێنێکەوە ﴿فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ﴾ کەچی
بەرانبەر چاکە و نیعمەتەکانی خوا ناسـوپاس و سـپڵە بوون ﴿فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ﴾ جا خوا بەو هۆیەوە کردی
بەبەر (خەڵکە کە)یدا ﴿لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ﴾ پۆشاکی برسێتی و ترس و بیم ﴿بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾
لەبەر ئەو کردەوانەی کەدەیانکرد ﴿١١٢﴾ ﴿وَلَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡهُمۡ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەرێکیان
لەخۆیان بۆهات ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ کەچی باوەڕیان پێ نەهێنا ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ﴾ جا سزا گرتنی
لەکاتێکدا ستەم کاربوون ﴿١١٣﴾ ﴿فَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ جا لەو بژێویەی خوا پێ ی بەخشیوون بخۆن
﴿حَلَٰلٗا طَيِّبٗا﴾ کەحـەڵاڵ و پاکـە ﴿وَٱشۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ﴾ و سوپاسـی چاکـەو نیعمەتـی خـوا بکەن
﴿إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ﴾ ئەگەر ئێوە هەر ئەو دەپەرستن ﴿١١٤﴾ ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةَ﴾ بێگومان
(خـوا) ئـەوەی حەرامـی کـردووە لەسـەرتان تەنهـا مـردارەوە بـوو ﴿وَٱلدَّمَ وَلَحۡمَ ٱلۡخِنزِيرِ﴾ وخوێن
وگۆشـتی بـەراز ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾ و ئـەوەی (کەسـەربڕاوەو) ناوی غەیـری خوای لـێ هێنراوە
﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ﴾ بەڵام هەر کەسێك ناچار بوو(لەو حەرامانە بخوات) بێ دەست درێژی
و زیـادەڕۆی ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ ئـەوە بێگومـان خـوا لـێ بـوردەی میهرەبانە ﴿١١٥﴾ ﴿وَلَا تَقُولُواْ﴾
وە لەخۆتانـەوە نەڵێـن ﴿لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ﴾ ئـەوەی کەبەزمانتانـدا دێـت بـەدرۆ ﴿هَٰذَا
حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ﴾ ئەوە حەڵاڵە و ئەوە حەرامە ﴿لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾ بۆ ئەوەی درۆ هەڵبەستن
بـەدەم خـواوە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـەی درۆ هەڵدەبەستن بەنـاوی خـواوە
﴿لَا يُفۡلِحُونَ﴾ ڕزگـار نابـن ﴿١١٦﴾ ﴿مَتَٰعٞ قَلِيلٞ﴾ (لە دونیـادا) ڕابورادنێکی کەم (یـان دەبێ) ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ﴾ (لەدوا ڕۆژدا) سـزای سـەختیان بۆ هەیە ﴿١١٧﴾ ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ﴾ وە لەسـەر ئەوانەی کەجوولەکە
بوون ﴿حَرَّمۡنَا مَا قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ﴾ حەراممان کرد (لێیان) ئەوەی کەباسمان کردوە بۆت ﴿مِن قَبۡلُ﴾ لەپێش
(دابەزینـی ئـەم ئایەتـە) ﴿وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ﴾ وە ئێمە سـتەممان لـێ نەکردن ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾
بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان دەکرد ﴿١١٨﴾

﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ﴾ پاشان بەڕاستی پەروەردگارت بۆ ئەوانەی ﴿عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ﴾ خراپەیان
کردووە بەنەفامی ﴿ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ پاشان دوای ئەوە گەڕاونەتەوەو تۆبەیان کردووە ﴿وَأَصْلَحُوٓا۟﴾
وکرداری خۆیان چاك کردووە ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت ﴿مِنۢ بَعْدِهَا﴾ لە پاش ئەوانە
﴿لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ لێبوردەی میهرەبانە ﴿١١٩﴾ ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ﴾ بەڕاستی ئیبراهیم ﴿كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ﴾ (بۆ
خۆی) ئوممەتێك بوو گوێڕایەڵ وفەرمانبەردار بۆ خوا ﴿حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ لا دەربوو لەهەموو
ئاینێکی ناهەق و هەرگیز لەهاوبەش دانەران نەبووە ﴿١٢٠﴾ ﴿شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ﴾ شوکرانە بژێری (خوا)
بووە لەبەرامبەر نازو نیعمەتەکانیدا ﴿ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ئەویش هەڵی بژارد و ڕێگەی
ڕاستی نیشان دا (کەئیسلامە) ﴿١٢١﴾ ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ وە ئێمە لە دونیادا نیعمەت و بەهرەی چاکمان
پێ بەخشی ﴿وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وە بەڕاستی ئەو لەڕۆژی دوایشدا لەڕیزی چاکاندایە ﴿١٢٢﴾
﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ پاشان نیگامان بۆ کردیت ﴿أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ﴾ کەپەیڕەوی ئایینی ئیبراهیم بکە
﴿حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ چونکە پاك و ڕاست بوو بەهیچ جۆرێ لەهاوبەش دانەران نەبوو
﴿١٢٣﴾ ﴿إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ﴾ بێگومان (ڕێز گرتنی) ڕۆژانی شەممە تەنها لەسەر ئەوانە دانرا ﴿ٱخْتَلَفُوا۟
فِيهِ﴾ کەجیاواز بوون تیایدا ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ﴾ وە بەڕاستی پەروەردگارت ﴿لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ دادوەری
دەکات لەنێوانیاندا ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا ﴿فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ لەوەی کەئەوان تیایدا
جیاواز بوون ﴿١٢٤﴾ ﴿ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ﴾ (خەڵکی) بانگ بکە بۆ ڕێبازی پەروەردگارت ﴿بِٱلْحِكْمَةِ
وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ﴾ بە دانایی وبە ئامۆژگاری جوان و چاك و شیرین ﴿وَجَٰدِلْهُم﴾ وە لەگەڵیان بدوێ
(موجادەلە بکە) ﴿بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾ بەچاکترین شێوە ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ﴾ بێگومان پەروەردگارت خۆی
چاك دەزانێ ﴿بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ بەوانەی گومڕا بوون ولایاندا وە لەڕێگاکەی ﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ﴾
وە هەر خۆشی زانایە بەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن ﴿١٢٥﴾ ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ﴾ وە ئەگەر تۆڵەتان سەندەوە
﴿فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ﴾ ئەوە بەئەندازەی ئەو ستەمەی دژتان کراوە تۆڵە بکەنەوە ﴿وَلَئِن
صَبَرْتُمْ﴾ وە ئەگەر ئارام بگرن ﴿لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ﴾ ئەوە باشترە بۆ ئارام گران ﴿١٢٦﴾ ﴿وَٱصْبِرْ﴾ وە (ئەی
موحەممەد ﷺ) دان بەخۆتدا بگرە ﴿وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ ئارام گرتنەکەشت هەر بە(یارمەتی) خوایە
﴿وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ﴾ و خەفەتیان بۆ مەخۆ ﴿وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ﴾ و بەو فێڵ و پیلانانەش دەیکەن دڵ
تەنگ مەبە ﴿١٢٧﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟﴾ بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان پاراستووە (لە تاوان)
﴿وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾ هەروەها لەگەڵ ئەوانەشدایە کە خێرخواز وچاکەکارن ﴿١٢٨﴾

# سورەتی ﴿ الإِسۡرَاءِ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ﴾ پاك و بێگەردی بۆ ئەوزاتەی كە شەوڕەوی كرد ﴿بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا﴾ بە بەندەی خۆی
لە شەوێكدا ﴿مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ لە مزگەوتی حەرامەوە (لەشاری مەككە) ﴿إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا﴾
بۆ مزگەوتی (الاقصى) لە (بيت المقدس) ﴿ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ﴾ كە دەورو بەریمان پیرۆز و فەڕدار
كردووە ﴿لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ﴾ بۆ ئەوەی هێندێك لە بەڵگەو نیشانە ڕوونەكانی خۆمانی نیشان بدەین
﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ بەڕاستی هەر ئەو بیسەری بینایە (١) ﴿وَءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ﴾ وە تەوراتیشمان
بەخشی بە مووسا ﴿وَجَعَلۡنَٰهُ هُدٗى لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ وە ئەو(تەوراتە)مان كردە هۆی ڕێنموونی بۆ نەوەی
ئیسرائیل ﴿أَلَّا تَتَّخِذُواْ مِن دُونِي وَكِيلٗا﴾ (پێمان ووتن) كە بێجگە لە من كەس مەكەنە پشتیوانی
خۆتان (٢) ﴿ذُرِّيَّةَ مَنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٍۚ﴾ (ئەی) نەوەی ئەو كەسانەی كەلەگەڵ نووح (لە كەشتیدا)
هەڵمان گرتن ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَبۡدٗا شَكُورٗا﴾ بەڕاستی نووح بەندە یەكی زۆر سوپاس گوزار بوو (٣)
﴿وَقَضَيۡنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ﴾ نەوەكانی ئیسرائیلمان ئاگادار كردو هەواڵمان پێدان لەنامەكەیاندا
﴿لَتُفۡسِدُنَّ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَّتَيۡنِ﴾ كە سوێند بەخوا ئێوە خراپەكاری دەكەن لەزەوی دا دووجار ﴿وَلَتَعۡلُنَّ
عُلُوّٗا كَبِيرٗا﴾ و بێگومان بەرز دەبنەوەو زاڵ دەبن (بەسەر خەڵكی دا) بەبەرز بونەوەیەكی زۆر گەورە
(٤) ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ أُولَىٰهُمَا﴾ جا كاتێك یەكەمین بەڵێن (لەو دووانە) هات (كەبەڵێنتان پێدراوە)
﴿بَعَثۡنَا عَلَيۡكُمۡ عِبَادٗا لَّنَآ﴾ دەینێرینە سەرتان چەند بەندەیەكی خۆمان ﴿أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ﴾ كە خاوەنی
دەست وەشاندنێكی بەتینن لەجەنگ دا ﴿فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِۚ﴾ ئەمجا ئەوانە دەگەڕێن بەناو
وولاتەكەتاندا ﴿وَكَانَ وَعۡدٗا مَّفۡعُولٗا﴾ وە ئەوە بەڵێنێكی بەدی هێنراو بوو (٥) ﴿ثُمَّ رَدَدۡنَا لَكُمُ ٱلۡكَرَّةَ
عَلَيۡهِمۡ﴾ لەپاشان جارێكی تر ئێوە بەسەریاندا زاڵ دەكەینەوە ﴿وَأَمۡدَدۡنَٰكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ﴾ وە دارایی
وكوڕی زۆرتان پێ دەبەخشین ﴿وَجَعَلۡنَٰكُمۡ أَكۡثَرَ نَفِيرًا﴾ وە لەشكر و كەستان (لە جاری پێشوو)
زۆرتر دەكەین (٦) ﴿إِنۡ أَحۡسَنتُمۡ أَحۡسَنتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡۖ﴾ ئەگەر ئێوە چاكە بكەن ئەوا چاكە بۆ خۆتان دەكەن
﴿وَإِنۡ أَسَأۡتُمۡ فَلَهَاۚ﴾ وە ئەگەر خراپەش بكەن ئەوا (سزاكەی) هەر بۆ خۆتانە ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾
جا كاتێ بەڵێنی (سزا و تۆڵەی) دووهەم هات ﴿لِيَسُـُٔواْ وُجُوهَكُمۡ﴾ بۆ ئەوەی پەژارە و خەفەت
بەڕوخسارتانەوە دەركەوێت ﴿وَلِيَدۡخُلُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ﴾ وە بۆ ئەوەی بچنەوە ناو مزگەوتی ئەقصاوە
﴿كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾ هەرچۆنێك لەجاری یەكەمدا چوونە ناویەوە ﴿وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوۡاْ تَتۡبِيرًا﴾
وە بۆئەوەی وێرانی بكەن بەوێران كردنێكی گەورە (٧)

﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ﴾ ئومێد وایە پەروەردگارتان ڕەحمتان پێ بکات (ئەگەر بگەڕێنەوە بۆلای خوا)
﴿وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا﴾ ئەگەر بگەڕێنەوە (بۆسەر تاوان) ئێمەش دەگەڕێینەوە (بۆ سزادانتان) ﴿وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ
حَصِيرًا﴾ وە دۆزەخمان کرد بە بەندیخانە بۆ بێ باوەڕان ﴿٨﴾ ﴿إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي﴾ بەڕاستی ئەم قورئانە
ڕێنموونی دەکات ﴿لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾ بۆ ڕێبازو بەرنامەیەك کەڕاست ترینە ﴿وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ﴾ و موژدەش
دەدات بەو باوەڕدارانەی ﴿يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ﴾ کە کردەوە چاکەکان دەکەن ﴿أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا﴾ کە بەڕاستی
پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە ﴿٩﴾ ﴿وَأَنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ وە بەڕاستی ئەوانەی کەباوەڕیان نیە ﴿بِالْآخِرَةِ﴾ بەڕۆژی
دوایی ﴿أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ سزایەکی سەختمان بۆئامادەکردون ﴿١٠﴾ ﴿وَيَدْعُ الْإِنسَانُ بِالشَّرِّ﴾ وە ئادەمی نزاو
هاوار بۆشەڕ و خراپە دەکات ﴿دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ﴾ (هەروەکو) داوا و نزاکردنی بۆخێرو چاکە ﴿وَكَانَ الْإِنسَانُ عَجُولًا﴾
وە ئادەمی هەمیشە هەر پەلەیەتی ﴿١١﴾ ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ﴾ شەو و ڕۆژمان کرد بەدوو نیشانەی (گەورەی
دەسەلاتی خودا) ﴿فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ﴾ ئەمجا نیشانەی شەومان تاریك کرد (یا سڕییەوە) ﴿وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً﴾
و بەڵگەو نیشانەی ڕۆژمان ڕووناك کردەوە ﴿لِّتَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بۆ ئەوەی بەشوێن ڕۆزی پەروەردگارتاندا
بگەڕێن ﴿وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾ وە بۆئەوەی ژمارەی ساڵەکان و حیسابی (مانگ و شەوو ڕۆژەکان)
بزانن ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا﴾ وە ئێمە هەموو شتێکمان بەڕوون و ڕەوانی باس کردووە (بۆتان) ﴿١٢﴾
﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ﴾ وە هەموو مرۆڤێك (لەڕۆژی دواییدا) کردەوەی خۆیمان کردۆتە گەردنیەوە
(چاکە بێت یا خراپە) ﴿وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ وە لەڕۆژی دواییدا بۆی دەردەهێنن ﴿كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا﴾
نامەیەك کە بەکراوەیی ( و هەموو کردەوەکانی تێدا نوسراوە) ودەیبینێت ﴿١٣﴾ ﴿اقْرَأْ كِتَابَكَ﴾ (پێ ی دەووترێت)
نامەکەت بخوێنەرەوە ﴿كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾ ئەمڕۆ خۆت بەسیت کە موحاسەبەی خۆت بکەیت
﴿١٤﴾ ﴿مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ﴾ هەرکەس ڕێنموونی وهیدایەتی وەرگرتبێت ئەوە بێگومان ڕێنمونی
وهیدایەتەکەی (سوود و قازانجەکەی) هەر بۆ خۆی دەبێت ﴿وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾ و هەرکەسیش گومڕا
بوو بێت ئەوە بێگومان (زیان وسزاکەی) هەر بۆ خۆی دەبێت ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ وە هیچ کەسێکی گوناهکار
گوناهی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێت ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ﴾ ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین ﴿حَتَّىٰ نَبْعَثَ
رَسُولًا﴾ هەتا پێغەمبەر نەنێرین (بۆیان) ﴿١٥﴾ ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا﴾ وە کاتێك بمانەوێت ﴿أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً﴾ (دانیشتوانی)
شار و گوندێك لەناو ببەین ﴿أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا﴾ فەرمان دەدەین (بەگوێڕایەڵی وکردەوەی چاك) بە دەوڵەمەندە
خراپەکارو زۆردارەکانی ﴿فَفَسَقُوا فِيهَا﴾ کەچی ئەوان یاخی دەبن و لەفەرمان دەردەچن ﴿فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ﴾
جا بڕیاری (سزادان) پێویست دەبێت بۆ(دانیشتوانی) ئەو شار و گوندانە ﴿فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا﴾ جا ئەوسا وێرانیان
دەکەین بەوێران کردنێکی تەواو ﴿١٦﴾ ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا﴾ وە زۆر (گەل و میللەت)مان لەناو برد ﴿مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ
نُوحٍ﴾ لە چەرخەکانی پاش نووح ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ﴾ پەروەردگارت بەسە بە گوناهی بەندەکانی
﴿خَبِيرًا بَصِيرًا﴾ کە ئاگادار و بینایە ﴿١٧﴾

﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ﴾ هەر كەسێك تەنها ژیانی دونیای بوێت ﴿عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا﴾ لەم (دونیا)دا زوو پێ
ی دەدەین ﴿مَا نَشَاءُ لِمَن نُّرِيدُ﴾ ئەوەی بمانەوێ بۆ هەر كەسێك ﴿ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ﴾ لە پاشان دۆزەخمان
بۆ سازداوە ﴿يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا﴾ دەچێتە ناوی بە لۆمەكراوی و دەركراوی لەمیهرەبانی خوا ﴿١٨﴾
﴿وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ﴾ هەر كەسێكیش مەبەستی ڕۆژی دوایی بوو بێت ﴿وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا﴾ وە هەوڵی
بۆ بدات بەو جۆرەی شایستەی ئەوە ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ و باوەڕداریش بێت ﴿فَأُولَٰئِكَ كَانَ سَعْيُهُم
مَّشْكُورًا﴾ ئائەوانە كردەوە و تێكۆشانەكەیان وەرگیراوە (لای پەروەردگاریان) ﴿١٩﴾ ﴿كُلًّا نُّمِدُّ﴾
دەبەخشین بەهەمووان ﴿هَٰؤُلَاءِ وَهَٰؤُلَاءِ﴾ ئەوانە (كەهەر دونیایان دەوێت) و ئەوانەش (كە ڕۆژی
دواییان دەوێ) ﴿مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ﴾ لە بەخششی پەروەردگارت (لەم دونیایەدا) ﴿وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ
مَحْظُورًا﴾ بێگومان ڕۆزی وبەخشراوی پەروەردگارت هەرگیز قەدەغە كراو نەبووە ﴿٢٠﴾ ﴿انظُرْ
كَيْفَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) سەرنج بدە چۆن ﴿فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ (لەدونیادا) فەزڵی
هەندێكیانمان داوە بەسەر هەندێكیاندا ﴿وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا﴾ وە بێگومان پلەكان
لە ڕۆژی دواییدا گەورەترە و فەزڵەكانیش گەورەترن ﴿٢١﴾ ﴿لَّا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ﴾ (ئەی ئادەمی)
لەگەڵ خوادا پەرستراوێكی تر مەپەرستە ﴿فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا﴾ ئەگینا دەبێتە لۆمەكراوێكی
سووك و ڕسوا ﴿٢٢﴾ ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ﴾ وە پەروەردگارت بڕیاری داوە ﴿أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ﴾ كەهیچ
شتێك نەپەرستن بێجگە لە ئەو ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ وە لەگەڵ دایك و باوكتان چاكە بكەن ﴿إِمَّا
يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا﴾ ئەگەر یەكێكیان (باوكت و دایكت) یان هەردووكیان لای تۆ
پیربوون ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ﴾ قسەی ناخۆشیان پێ مەڵێ تەنانەت ئۆفیش ﴿وَلَا تَنْهَرْهُمَا﴾ وەتێیان
مەخوڕە و پێیاندا هەڵمەشاخێ ﴿وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا﴾ (بەڵكو) ووتەی نەرم و شیرینیان (لەگەڵدا)
بەكاربێنە ﴿٢٣﴾ ﴿وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ﴾ باڵی خۆ بەكەم زانین و میهرەبانیتیان بۆ ڕابخە
﴿وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا﴾ بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بكە ﴿كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾ هەرچۆنێك
ئەوان منیان پەروەردە كرد بەمنداڵی ﴿٢٤﴾ ﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ﴾ پەروەردگارتان چاك دەزانێت
بەهەرچی لەدڵ و دەروونتاندا هەیە ﴿إِن تَكُونُوا صَالِحِينَ﴾ ئەگەر ئێوە چاك بن و نیازی چاكەتان
ببێت ﴿فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّابِينَ غَفُورًا﴾ ئەوا بێگومان ئەو (خوایە) لێ بوردەیە بۆ تۆبەكاران ﴿٢٥﴾
﴿وَآتِ ذَا الْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ﴾ وەمافی خزمانت بدە ﴿وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ﴾ (هەروەها مافی) هەژارو
ڕێبواریش ﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا﴾ زیادە ڕەویش مەكەن ﴿٢٦﴾ ﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ﴾ بەڕاستی زیادەڕەوان
﴿كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ﴾ دۆست وبرای شەیتانەكانن ﴿وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا﴾ شەیتانیش بەرانبەر
(ناز و نیعمەتەكانی) پەروەردگاری هەمیشە سپڵەیە ﴿٢٧﴾

﴿وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ﴾ وە ئەگەر ڕووت وەرگێڕا لەوانە (لەبەر نەداری) ﴿ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا﴾
چاوەڕوانی بەخششی و ڕۆزیەك بوویت لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا﴾ ئەوە قسەی
جوان و نەرمیان لەگەڵدا بکە (٢٨) ﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ﴾ وە دەستت مەکە کۆت بەگەردنتدا
( واتە دەست قووچاوو مەبە لەخێرکردندا) ﴿وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ﴾ وکراوە وبەرەڵاشی مەکە
بەتەواوی (هەرچیت هەیە بیدەی بەخەڵکی) ﴿فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا﴾ تا نەبیتە کەسێکی لۆمەکراوی
هیچ بەدەستەوە نەماو (٢٩) ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت ﴿يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ﴾ ڕزق و ڕۆزی فراوان
دەکات ﴿لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ بۆ هەر کەسێك کەبیەوێت و وەتەنگی دەکات بۆهەرکەسێ بیەوێت
﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا﴾ بەڕاستی ئەو هەمیشە ئاگا و بینایە بەبەندەکانی (٣٠) ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُمْ﴾
وە ڕۆڵەکانتان مەکوژن ﴿خَشْيَةَ إِمْلَـٰقٍ﴾ لەترسی هەژاری و نەداری ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ﴾ ئێمە ڕۆزی
ئەوانیش و ئێوەش دەدەین ﴿إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا﴾ بەڕاستی کوشتنی ئەوانە (ئەو منداڵانەتان)
هەڵەو تاوانێکی گەورەیە (٣١) ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ﴾ و نزیکی زیناش مەکەونەوە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً﴾
بەڕاستی ئەوە کردەوەیەکی زۆر ناشرین ﴿وَسَآءَ سَبِيلًا﴾ و ڕێگەیەکی پیس و خراپە (٣٢) ﴿وَلَا
تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ﴾ وە کەسێك مەکوژن ﴿ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ کەخوا کوشتنی ئەوی حەرام کردوە
مەگەر بە (هۆیەکی) ڕاست و ڕەوا نەبێت ( وەك ئەگەر هاتوو کەسێکی کوشتبوو، یان لەئاین
پاشگەز ببوەوە، یان شووی کردبوو یان ژنی هێنابوو زینایان کرد) ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا﴾ جا هەر کەسێك
بەناهەق و ستەم لێ کراوی کوژرا ﴿فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَـٰنًا﴾ ئەوە دەسەڵاتمان داوە بەخاوەنەکەی
(بەسەر بکوژەکەدا) ﴿فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ﴾ جا با خاوەنەکەی زیادەڕۆیی نەکات لە تۆڵەسەندنەوەدا
(ئەگەر عەفووی کرد پاش ئەوە نەچێت تۆڵەی لێ بسەنێتەوە، وە ئەگەر کوشتیشیەوە بە جوانترین
شێوە بیکوژێتەوە وڕازی بێت بە بڕیاری خودا هەرچۆنێك بێت) ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا﴾ چونکە
بەڕاستی ئەو (خاوەنە) یارمەتی دراوە (٣٣) ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ﴾ وە نزیکی ماڵی هەتیو مەکەونەوە
﴿إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾ مەگەر بەچاکترین شێوە نەبێت (کە بریتی یە لە پاراستن و بەرهەم هێنانی) ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ
أَشُدَّهُۥ﴾ هەتا (هەتیوەکە) دەگاتە کەماڵی ژیری و لێزانی ﴿وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ﴾ وەفا بکەن بە بەڵێن
وپەیمانەکانتان ﴿إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا﴾ بەڕاستی (خاوەن) بەڵێن و پەیمان لێپرسراوە بەرامبەر بەڵێنەکانی
(٣٤) ﴿وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ﴾ وە کاتێك کە پێوانە دەکەن (بۆ خەڵکی) بەڕێك و پێکی پێوانە بکەن
﴿وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ﴾ و کێشانەش بکەن بەتەرازوی ڕاست ودروست ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ ئەمە
(بۆ ئێوە) چاکترو ئاکامیشی باشترە ( لە دونیا و قیامەتیشدا) (٣٥) ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ﴾ وە شوێن
شتێك مەکەوە کەزانیاریت دەربارەی نی یە ﴿إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ﴾ بەڕاستی گوێ و چاو و دڵ
﴿كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾ هەموو ئەوانە (خاوەنەکانیان) بەرپرسیارن لێیان (٣٦) ﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ
مَرَحًا﴾ وە مەڕۆ بەزەویدا بەفیز زلی وشانازیەوە ﴿إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ﴾ (چونکە) بەڕاستی تۆ نەدەتوانی
زەوی کون کەیت ﴿وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا﴾ وە نەدەگەیتە شاخەکان لەدرێژیدا (٣٧) ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ﴾
هەموو ئەوەی باسکرا خراپەکانی ﴿عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا﴾ لای پەروەردگارت نابەجێ و بێزراوە (٣٨)

﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ﴾ ئـەوە (ی کـەبـاس کـرا) هەندێکـە لـەو دانـایـی وحیکمـەتـەی کـە
پەروەردگـارت نیگـای کـردووە بـۆت ﴿وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ وە هـیـچ پـەرسـتراوێکی تـر لە گەڵ
خـوادا مەپەرستە ﴿فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ﴾ ئەگینا فـڕێ دەدرێیتە نـاو دۆزەخەوە﴿مَلُومًا مَّدۡحُورًا﴾ بـە لۆمەکراوی
ودوورخـراوەی لەبەزەیـی خـوا (٣٩) ﴿أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم بِٱلۡبَنِينَ﴾ ئایـا پەروەردگارتـان ڕەگـەزی کـوڕی
تایبەتـی کـردووە بە ئێوەوە﴿وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًاۚ﴾ لـە فریشتەکانیشـی دا کچانی بۆخـۆی هەڵبژاردووە
﴿إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمًا﴾ بەڕاسـتی ئێوەووتەیەکـی زۆرگـەورە (ونابەجـێ) دەڵێـن (٤٠) ﴿وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا فِي هَٰذَا
ٱلۡقُرۡءَانِ﴾ وە سـوێند بەخـوا بێگومـان (مەبەستەکانمان) بەچەنـد جـۆر هێناوە لـەم قورئانەدا ﴿لِيَذَّكَّرُواْ﴾
بـۆ ئـەوەی بیربکەنـەوە و ئامۆژگـاری وەرگـرن ﴿وَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا نُفُورًا﴾ بـەڵام (خوانەناسـان) هـەر
دوورکەوتنەوەیـان زیاتـر دەبێـت (بـەو باسـکردنە) (٤١) ﴿قُل لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ)
بڵـێ ئەگـەر لەگـەڵ خـوادا پەرستراوانێکی تـر ببوایـە﴿كَمَا يَقُولُونَ﴾ وەك ئـەو (بـت پەرسـتان) دەڵێـن
﴿إِذًا لَّٱبۡتَغَوۡاْ﴾ ئـەو کاتـە دەگـەڕان بـە دوای ﴿إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلًا﴾ ڕێگایەکـدا بـۆلای خاوەنـی عـەرش
(کـە خوایـە) (٤٢) ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ﴾ پـاك و بـێ گـەرد و بـەرز و بڵنـدە ئـەو (خوایـە) ﴿عَمَّا يَقُولُونَ﴾ لەوەی
ئـەو (بـت پەرسـتانە) دەیڵێـن (دەربـارەی خـوا) ﴿عُلُوًّا كَبِيرًا﴾ زۆر بـەرز وبڵنـد تـرە (٤٣) ﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ
ٱلسَّبۡعُ﴾ هـەر حـەوت ئاسـمانەکان تەسـبیحاتی خـودا دەکـەن ﴿وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ﴾ و زەوی و هەرچـی
لـە ناویاندایـە ﴿وَإِن مِّن شَيۡءٍ﴾ وە هیـچ شـتێك نیـە ﴿إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ﴾ کـە تەسـبیحات و سـوپاس
وستایشـی ئـەو نـەکات ﴿وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ﴾ بـەڵام ئێـوە تـێ ناگـەن لـە تەسـبیحاتەکەیان
﴿إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ بەڕاسـتی خـوا هەمیشـە بەئـارام ولەسـەرخۆ ولێبوردەیـە (٤٤) ﴿وَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾
وە (ئـەی موحەممـەد ﷺ) کاتێـك قورئـان دەخوێنیـت (بەسـەریاندا) ﴿جَعَلۡنَا بَيۡنَكَ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ﴾ دادەنێیـن
لەنێـوان تـۆو ئەوانەدا ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾ کە باوەڕیـان بەڕۆژی دوایی نیـە ﴿حِجَابًا مَّسۡتُورًا﴾ پەردەیەکی
نادیار(داپۆشـەر) (٤٥) ﴿وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ وە دەیدەیـن بەسـەر دڵیانـدا﴿أَكِنَّةً﴾ چەنـد پەردەیەکـی
زۆر ئەسـتوور﴿أَن يَفۡقَهُوهُ﴾ بـۆ ئـەوەی لەقورئـان تـێ نەگەن﴿وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرًاۚ﴾ و گوێشـیان کـەڕ دەکەین
(تانەبیسـتن) ﴿وَإِذَا ذَكَرۡتَ رَبَّكَ﴾ وە هـەر کاتێـك نـاوی پەروەردگـارت دەبەیت (لای ئـەو بـێ باوەڕانەدا)
﴿فِي ٱلۡقُرۡءَانِ وَحۡدَهُۥ﴾ لـە قورئانـدا بەتـاك و تەنیایـی ﴿وَلَّوۡاْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِمۡ نُفُورًا﴾ بـە بێـزاری پشـتت تـێ دەکـەن
(٤٦) ﴿نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ﴾ ئێمـە چـاك دەزانیـن بۆچـی ئـەوان گـوێ دەگـرن ﴿إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ﴾
کاتێـك گـوێ دەگرن لەتـۆ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) ﴿وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ﴾ هەروەها کاتێـك پێکەوە چپـە دەکەن
﴿إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ کاتێ سـتەم کارەکان دەڵێن ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسۡحُورًا﴾ ئێوە تەنها شـوێنی پیاوێکی
جادولێکراو دەکەون (٤٧) ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ﴾ سـەرنج بدە چـۆن ﴿ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ﴾ نموونەی جۆرا وجۆرت
بۆدێننـەوە ﴿فَضَلُّواْ﴾ سـەرئەنجام گومـڕا بـوون ﴿فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلًا﴾ ئیتـر ناتوانـن ڕێگـای ڕاسـت
بدۆزنـەوە (٤٨) ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا﴾ دەشـڵێن ئایا کاتێ بووینە ئێسـك پروسـکێکی ڕزیـو و پتورکاو
﴿أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقًا جَدِيدًا﴾ ئایا (جارێکی تر) زیندوو دەکرێینەوە و دەبینەوە بەدروسکراوێکی نوێ (٤٩)

﴿قُلْ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) پێیـان بڵـێ ﴿كُونُواْ حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا﴾ ئێوە ببـن بەبەرد یابەئاسـن (٥٠) ﴿أَوْ
خَلْقًا مِّمَّا﴾ یان هەر درسـت کراوێکی ترلەوەی ﴿يَكْبُرُ فِي صُدُورِكُمْ﴾ لە مێشـك و دڵتاندا گەورەیە
﴿فَسَيَقُولُونَ﴾ جابێگومان ئەوانە دەڵێن ﴿مَن يُعِيدُنَا﴾ کێ زیندوومان دەکاتەوە ﴿قُلِ الَّذِي﴾ بڵێ ئەو زاتە
(زیندووتان دەکاتەوە) ﴿فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ کە یەکەم جار دروستی کردوون ﴿فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ﴾
جـا (بەلاقرتیـەوە) سـەرت بـۆ دەلەقێنـن ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ﴾ و دەڵێـن ئەوەکـەی دەبێـت ﴿قُلْ عَسَىٰ أَن
يَكُونَ قَرِيبًا﴾ بڵـێ لەوانەیـە ئەو (ڕۆژە هاتنی) نزیك بێت (٥١) ﴿يَوْمَ يَدْعُوكُمْ﴾ ئـەو ڕۆژەی کە بانگتان
دەکەن (لە گۆڕەکانتانەوە) ﴿فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ﴾ جائێوەش دەست بەجێ دێن بەدەم بانگ کردنەکەوە بە
سوپاس و سەناکردنەوە ﴿وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ﴾ و وا دەزانن نەماونەتەوە (لە دونیادا) ﴿إِلَّا قَلِيلًا﴾ ماوەیەکی
کـەم نەبێـت (٥٢) ﴿وَقُل لِّعِبَادِي﴾ وە (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ بەبەندەکانـم ﴿يَقُولُواْ الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾
قسـەیەك بکـەن کـە جوانتر و باشـترینی قسـە بێـت ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ﴾ بەڕاسـتی شـەیتان ﴿يَنزَغُ بَيْنَهُمْ﴾
ناکۆکـی و ئـاژاوە دەخاتـە نێوانیـان ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلْإِنسَانِ﴾ بەڕاسـتی شـەیتان هەمیشـە بۆئادەمـی
﴿عَدُوًّا مُّبِينًا﴾ دووژمنێکـی ڕون و ئاشـکرایە (٥٣) ﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ﴾ پەروەردگارتـان زاناترە بەئێوە
﴿إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ﴾ ئەگـەر بیەوێ ڕەحمتـان پێ دەکات ﴿أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ﴾ یان ئەگەر بیەوێ سـزاتان
دەدات ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ﴾ وە ئێمـە تۆمان نەناردووە ﴿عَلَيْهِمْ وَكِيلًا﴾ بەچاودێر وپارێزەر بەسـەریانەوە
(٥٤) ﴿وَرَبُّكَ أَعْلَمُ﴾ وە پەروەردگـارت زاناتـرە ﴿بِمَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ بەهـەر چی لە ئاسـمانەکان
ولـە زەوی دایە ﴿وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ﴾ وە سـوێند بەخوا بێگومان فەزڵی هەنـدێ لەپێغەمبەرانمان
داوە ﴿عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ بەسـەر هەندێکـی تریانـدا ﴿وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾ و زەبورمـان بەخشـی بـە داوود (٥٥)
﴿قُلِ ادْعُواْ الَّذِينَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ (بێ باوەڕان) هاوار بکەن لە ئەوانەی ﴿زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ﴾
کە ئێوە بە خواتان دەزانین بێجگە لەخوا ﴿فَلَا يَمْلِكُونَ﴾ جا ئەوانە دەسـەڵاتیان نیە ﴿كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ﴾
بەڵاو زیانتان لەسـەر لابەن ﴿وَلَا تَحْوِيلًا﴾ وە(دەسەڵاتی) گۆڕانیشیان نی یە (٥٦) ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ﴾
ئەوانەی کە ئەو (نەفامانە) هاواریان لێ دەکەن ﴿يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ﴾ ئەوانە بەدوای هۆکارێکدا
دەگەڕێـن کـە نزیکیـان کاتەوە لـە پەروەدگاریان ﴿أَيُّهُمْ أَقْرَبُ﴾ کامیـان نزیك ترە (لە خـواوە و پلەو
پایـەی بەرزتـرە). ﴿وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ﴾ وە بەهیـوا و ئومێـدو ڕەحمـی ئـەون ﴿وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ﴾ و لـە
سزایشی دەترسن ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ﴾ بەڕاستی سزای پەروەردگارت ﴿كَانَ مَحْذُورًا﴾ هەمیشە مەترسی
لێکـراوە وخۆلێپارێـزراوە (٥٧) ﴿وَإِن مِّن قَرْيَةٍ﴾ وە (خەڵکی) هیچ شـاروگوندێکمان ﴿إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا﴾
کـە ئێمـە لـە ناویان ببەیـن ﴿قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ پێش (هاتنـی) ڕۆژی دوایی ﴿أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا﴾
یـان سـزایان بدەیـن بـە سـزایەکی سـەخت ﴿كَانَ ذَٰلِكَ﴾ ئیلـلا ئـەو (سـزادانە یـان لەنـاو بردنـە)
﴿فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا﴾ لە (لوح المحفوظ) دا نوسراوە (٥٨)

﴿وَمَا مَنَعَنَآ﴾ وە هیچ شتێك بەرگری ئێمەی نەكردووە ﴿أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَٰتِ﴾ كە ئەو موعجیزانە
بنێرین ﴿إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ﴾ جگە لەوەی كە پێشینەكان بە درۆیان دەزانی ﴿وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ﴾
ناردمان بۆ(هۆزی) سەموود ئەو حوشترەی ﴿مُبْصِرَةً﴾ كە (موعجیزەیەكی) ئاشكرا بوو
﴿فَظَلَمُوا۟ بِهَا﴾ كەچی (باوەڕیان نەهێنا و) ستەمیان لێكرد و(سەریان بڕی) ﴿وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَٰتِ﴾
وە ئێمە موعجیزەكان نانێرین ﴿إِلَّا تَخْوِيفًا﴾ مەگەر بۆ ترساندنی (ئەو گەلە نەبێت) ﴿٥٩﴾ ﴿وَإِذْ قُلْنَا لَكَ﴾
(بیربكەرەوە) كاتێ پێمان ووتی ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت ﴿أَحَاطَ بِٱلنَّاسِ﴾ دەوری
هەموو خەڵكی داوە (دەسەڵاتی هەیەبەسەریاندا) ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَٰكَ﴾ وە ئەو خەو بینینەی
كەپیشانی تۆماندا (لەوشەو ڕەویەدا) ﴿إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ﴾ هەرلەبەر تاقی كردنەوەی خەڵكی بوو
﴿وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ﴾ هەروەها ئەو درەختە نەفرین لێ كراوەش ﴿فِى ٱلْقُرْءَانِ﴾ كە لەقورئاندا باسمان
كردووە ﴿وَنُخَوِّفُهُمْ﴾ وە ئێمە (بەو جۆرە بەڵگانە) ئەوانە دەترسێنین ﴿فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَٰنًا كَبِيرًا﴾
كەچی ئەو (ترساندنە) هیچیان بۆ زیاد ناكات جگە لە یاخی بوون و سەركەشی نەبێت ﴿٦٠﴾
﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ وە باسی ئەوكاتەبكە كەئێمە بەفریشتەكانمان ووت ﴿ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾
سوژدەبەرن بۆئادەم ﴿فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ﴾ ئەوانیش یەكسەر هەموویان سوژدەیان برد بێجگە لە ئیبلیس
(شەیتان نەبێت) ﴿قَالَ ءَأَسْجُدُ﴾ ووتی ئایامن سوژدەبەرم ﴿لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا﴾ بۆ كەسێك كە لەقوڕ
دروستت كردووە ﴿٦١﴾ ﴿قَالَ أَرَءَيْتَكَ﴾ (ئیبلیس) ووتی پێم بڵێ و هەواڵم بدەرێ ﴿هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ
عَلَىَّ﴾ لەبارەی ئەمەوە كەڕێزی ئەوت داوە بەسەرمندا؟! ﴿لَئِنْ أَخَّرْتَنِ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر دوام
بخەیت ﴿إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ تارۆژی دوایی (نەمرم) ﴿لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ﴾ بەڕاستی زاڵ ئەبم بەسەر
نەوەكانیدا (بەگومڕاكردن) ﴿إِلَّا قَلِيلًا﴾ كەمێك لەوان نەبێت (كە بەندە تایبەتیەكانی خوان) ﴿٦٢﴾
﴿قَالَ ٱذْهَبْ﴾ (خوا بەشەیتانی) فەرموو بڕۆ ﴿فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ﴾ سا هەر كەس لەوان شوێنی تۆ كەوت
﴿فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ﴾ ئەوە بەڕاستی تۆڵەی هەمووتان دۆزەخە ﴿جَزَآءً مَّوْفُورًا﴾ كە تۆڵەیەكی پڕبەپڕە ﴿٦٣﴾
﴿وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم﴾ وە هەركەس لەوانە كە دەتوانی گومڕای بكە ﴿بِصَوْتِكَ﴾ بەدەنگت
وسەدای (ناهەقت) ﴿وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم﴾ و بدە بەسەریاندا و تێ یان خوڕە ﴿بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ﴾ بەسوار
وپیادەی لەشكرەكەتەوە ﴿وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ﴾ وە هاوبەشییان بكە لەماڵ و سامان و منداڵیاندا
﴿وَعِدْهُمْ﴾ بەڵێنیشیان پێ بدە ﴿وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ بەڵام شەیتان بەڵێنیان پێ نادات ﴿إِلَّا غُرُورًا﴾
بەخەڵەتاندن نەبێت ﴿٦٤﴾ ﴿إِنَّ عِبَادِى﴾ بێگومان بەندەكانی من ﴿لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ﴾ دەسەڵاتت
بەسەریاندا نی یە (و ناتوانی گومڕایان بكەیت) ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا﴾ وە پەروەردگارت بەسە
پارێزەرو چاودێر بێت ﴿٦٥﴾ ﴿رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى﴾ پەروەردگارتان ئەو زاتەیە ﴿يُزْجِى لَكُمُ ٱلْفُلْكَ فِى ٱلْبَحْرِ﴾
كە كەشتی لە دەریادا هاتوچۆ پێدەكات بۆ ئێوە ﴿لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦٓ﴾ بۆ ئەوەی بگەڕێن بەدوای
هەندێكبەهرە و ڕۆزی ئەودا ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ بەڕاستی ئەو (خوایە) هەمیشەیی میهرەبان
وبە بەزەیی یە بەرامبەر بە ئێوە ﴿٦٦﴾

﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلۡبَحۡرِ﴾ جا کاتێك لەدەریادا تووشی بەڵاو زیان بێن ﴿ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُۖ﴾ هەموو
ئەو (پەرستراوانە)ی هاواریان لێ دەکەن وون دەبن بێجگە لەخوا ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰكُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ﴾ کە چی کاتێك
کە (خوا) ڕزگارتان دەکات و دەگەنە ووشکانی ﴿أَعۡرَضۡتُمۡۚ﴾ ڕوو وەردەگێڕن (لەخودا) ﴿وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ
كَفُورًا﴾ (چونکە) ئادەمی هەمیشە سپڵەو ناسوپاسە ﴿٦٧﴾ ﴿أَفَأَمِنتُمۡ﴾ جا ئایا ئێوە ناترسن و بێباکن
﴿أَن يَخۡسِفَ بِكُمۡ جَانِبَ ٱلۡبَرِّ﴾ لەوەی کە لە ووشکاییدا (بوومەلەرزە) بتانبات بەناخی زەویدا؟ ﴿أَوۡ يُرۡسِلَ
عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗا﴾ یا (ناترسن لەوەی) بای توندتان بنێرێتە سەر بەوورده زیخەوە ﴿ثُمَّ لَا تَجِدُواْ لَكُمۡ
وَكِيلًا﴾ پاشان پارێزەرێکیشتان دەست نەکەوێت ﴿٦٨﴾ ﴿أَمۡ أَمِنتُمۡ﴾ ئەی ئایا دڵنیا و بێباکن ﴿أَن
يُعِيدَكُمۡ فِيهِ﴾ لەوەی بتان گێڕێتەوە ناو دەریا ﴿تَارَةً أُخۡرَىٰ﴾ جارێکی تر ﴿فَيُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەمجا بینێرێتە
سەرتان ﴿قَاصِفٗا مِّنَ ٱلرِّيحِ﴾ بایەکی توندو تیژی وێرانکەر ﴿فَيُغۡرِقَكُم بِمَا كَفَرۡتُمۡ﴾ ئەوسا لەدەریاکەدا نقومتان
بکات لەبەر ئەو بێ باوەڕ و سپڵە بوونەتان ﴿ثُمَّ لَا تَجِدُواْ﴾ پاشان دەستتان ناکەوێت ﴿لَكُمۡ عَلَيۡنَا بِهِۦ
تَبِيعٗا﴾ هیچ کەسێك کە داوای تۆڵەی ئێوە لە ئێمە بکات ﴿٦٩﴾ ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ سوێند بەخوا
بێگومان ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت ﴿وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ﴾ و لە ووشکانی و لەدەریادا هەڵمان
گرتن (بەسواری و گەڕانمانن) ﴿وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ و ڕۆزی پاك و خاوێنمان پێ داون
﴿وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ كَثِيرٖ﴾ وەفەزڵمان داون بەسەر زۆرێك ﴿مِّمَّنۡ خَلَقۡنَا تَفۡضِيلٗا﴾ لەو شتانەی کەدروستمان
کردون بەفەزڵێکی گەورە ﴿٧٠﴾ ﴿يَوۡمَ نَدۡعُواْ كُلَّ أُنَاسِۭ﴾ (بیریان بخەنەوە) ئەو ڕۆژەی کە ئێمە هەموو
ئادەمیەك بانگ دەکەین ﴿بِإِمَٰمِهِمۡۖ﴾ بەناوی پێغەمبەرەکەیانەوە (بەناوی پەیامەکەیانەوە) ﴿فَمَنۡ أُوتِيَ
كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ﴾ جا هەر کەسێك نامەی کردەوەکەی بدرێت بەدەستی ڕاستیەوە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يَقۡرَءُونَ
كِتَٰبَهُمۡ﴾ ئائەوانە نامەکەیان دەخوێننەوە ﴿وَلَا يُظۡلَمُونَ﴾ وەستەمیان لێ ناکرێت ﴿فَتِيلٗا﴾ بەئەندازەی
ئەو تاڵە باریکەی بەدەوری ناوکی خورمادایە ﴿٧١﴾ ﴿وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعۡمَىٰ﴾ بەڵام هەر کەسێك لەم
(دونیایە)دا کوێر بووبێت (وڕێگەی ڕاستی نەبینابێت) ﴿فَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ أَعۡمَىٰ﴾ ئەوە ئەو کەسە لەڕۆژی
دوایشدا کوێرە ﴿وَأَضَلُّ سَبِيلٗا﴾ بگرە لە کوێریش گومڕاترە ﴿٧٢﴾ ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَفۡتِنُونَكَ﴾ وە بەڕاستی
نزیك بوو ئەوانە لات دەن ﴿عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ لەوەی کە نیگامان کرد بۆت ﴿لِتَفۡتَرِيَ عَلَيۡنَا غَيۡرَهُۥۖ﴾
بۆ ئەوەی جگەلە قورئان شتێك بەدەم ئێمەوە هەڵبەستیت ﴿وَإِذٗا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلٗا﴾ (ئەگەر گوێڕایەڵیان
بوویتایە) ئەوە لەو کاتەدا دەیان کردیت بەدۆست و خۆشەویستی خۆیان و (گومڕایان دەکردیت) ﴿٧٣﴾
﴿وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ﴾ خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان دامەزراونە کردایە ﴿لَقَدۡ كِدتَّ﴾ بەڕاستی نزیك بوو تۆ
﴿تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا﴾ کەمێك بەلایاندا بچی ﴿٧٤﴾ ﴿إِذٗا لَّأَذَقۡنَٰكَ﴾ جا بێگومان ئەوکاتە پێمان دەچەشتی
﴿ضِعۡفَ ٱلۡحَيَوٰةِ﴾ دوو بەرانبەر (سزای) ژیان ﴿وَضِعۡفَ ٱلۡمَمَاتِ﴾ دوو بەرانبەر (سزای) مردن
﴿ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ﴾ پاشان دەستت نەدەکەوت ﴿عَلَيۡنَا نَصِيرٗا﴾ یارمەتی دەرێك بەرانبەر بەئێمە (کە بەرگری
ئەو سزایەت لێ بکات) ﴿٧٥﴾

﴿وَإِن كَادُواْ﴾ وە بەڕاستی نزیك بوو ئەو (بێ باوەڕ)انە ﴿لَيَسْتَفِزُّونَكَ﴾ (بەپیلان و دوژمنایەتی) نارەحەتت بکەن ﴿مِنَ ٱلْأَرْضِ﴾ لەخاکی مەککە ﴿لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا﴾ بۆ ئەوەی دەرت بکەن لێ ی ﴿وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَافَكَ﴾ جا ئەوکاتە ئەوانە نەدەمانەوە لەپاش تۆ ﴿إِلَّا قَلِيلًا﴾ کاتێکی کەم نەبێت (خوا لەناوی دەبردن) ﴿٧٦﴾ ﴿سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا﴾ ڕێگا ونەریتێکە لە (ئێمەوە) بۆ ئەوانەی کە ناردومانن. ﴿قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا﴾ لە پێغەمبەرانمان پێش تۆ ﴿وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا﴾ باوو یاسای ئێمەش گۆڕانی بەسەردا نایەت ﴿٧٧﴾ ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) نوێژ بەجێ بهێنە ﴿لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ﴾ لەکاتی لادانی خۆر (لەناوەڕاستی ئاسمان) ﴿إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ﴾ هەتا (هاتنی) تاریکی شەو ﴿وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ﴾ هەروەها نوێژی بەیانی (بەجێ بێنە) ﴿إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ﴾ بەڕاستی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی ﴿كَانَ مَشْهُودًا﴾ هەمیشە دەبینرێت (لەلایەن فریشتەکانی شەو وڕۆژەوە) ﴿٧٨﴾ ﴿وَمِنَ ٱلَّيْلِ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ) لە بەشێکی شەودا ﴿فَتَهَجَّدْ بِهِۦ﴾ هەستە شەو نوێژ بکە بەقورئان خوێندن تێیدا ﴿نَافِلَةً لَّكَ﴾ ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ﴾ ئومێدەواربە پەروەردگارت بتگەیەنێتە ﴿مَقَامًا مَّحْمُودًا﴾ پلەو جێگایەکی پەسەندکراو (کە شەفاعەتی گەورەیە بۆ خەڵکی لەقیامەتدا) ﴿٧٩﴾ ﴿وَقُل رَّبِّ﴾ وە بڵێ ئەی پەروەردگارم ﴿أَدْخِلْنِى مُدْخَلَ صِدْقٍ﴾ (لەهەر کارێکدا بووم) ڕاست وچاك پێم ئەنجام بدە ﴿وَأَخْرِجْنِى مُخْرَجَ صِدْقٍ﴾ ڕاست و چاکیش پێم کۆتایی بێنە ﴿وَٱجْعَل لِّى مِن لَّدُنكَ﴾ وە لەلایەن خۆتەوە بۆم بسازێنە ﴿سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا﴾ دەسەڵاتێکی یارمەتی دەر (کە زاڵ بم بەسەر هەموو کۆسپێکدا) ﴿٨٠﴾ ﴿وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ﴾ وە بڵێ ئاینی ڕاست هات ﴿وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ﴾ وە ئاینی ناحەق و بەتاڵ نەما و ڕۆشت ﴿إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾ بەڕاستی بەتاڵ هەمیشە لە ناوچووە ﴿٨١﴾ ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ﴾ وە لەم قورئانەدا دەنێرینە خوارەوە ﴿مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەوەی کە هۆی شیفا و میهرەبانی یە بۆبڕوا داران ﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾ بەڵام (هاتنی ئەم قورئانە) بۆستەم کاران هیچ زیادناکات جگە لەخەسارۆمەندی نەبێت ﴿٨٢﴾ ﴿وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ﴾ وە کاتێك چاکە ونیعمەتی خۆمان بڕێژین بەسەر ئادەمی (بێ باوەڕدا) ﴿أَعْرَضَ﴾ ڕووو وەردەگێڕێت (لە زیکری ویادی ئێمە) ﴿وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ﴾ ودوور دەکەوێتەوە ﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ﴾ وە کاتێك ناخۆشی و زیانی لێ بکەوێت ﴿كَانَ يَـُٔوسًا﴾ زۆر نائومێد دەبێت ﴿٨٣﴾ ﴿قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ هەمووکەس کار دەکات ﴿عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ﴾ لەسەر سرووشت و(ڕێبازی)خۆی ﴿فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ﴾ جا پەروەردگارتان زاناترە بەو کەسەی ﴿أَهْدَىٰ سَبِيلًا﴾ کە ڕێبازەکەی ڕاسترە ﴿٨٤﴾ ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن لەبارەی ڕۆحەوە (کەچی یە) ﴿قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى﴾ بڵێ ڕۆح لەکارو فەرمانی تایبەت بە پەروەردگارمە ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ وە ئێوە تەنها کەمێك لە زانیاریتان پێ بەخشراوە ﴿٨٥﴾ ﴿وَلَئِن شِئْنَا﴾ وە سوێند بەخوا ئەگەر بمانەوێت ﴿لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ بێگومان ئەو (قورئانەی)نیگامان کردووە بۆت نایهێڵین (لە دڵ و پەڕەکاندا) ﴿ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ﴾ لە پاشان دەست ناکەوێت ﴿بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا﴾ لە بەرانبەر ئێمەدا کەسێك کە بەرگریت لێ بکات ﴿٨٦﴾

﴿إِلَّا رَحۡمَةً مِّن رَّبِّكَۚ﴾ مەگەر میهرەبانییەك لەلایەن پەروەردگارتەوە نەبێت ﴿إِنَّ فَضۡلَهُۥ كَانَ عَلَيۡكَ كَبِيرًا﴾
بەڕاستی فەزڵ و چاكەی ئەو بەسەرتەوە گەورەیە (٨٧) ﴿قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) بڵێ سوێند بەخوا ئەگەر ئادەمی و جنۆكە هەموو كۆببنەوە ﴿عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ﴾ بۆ ئەوەی
وێنەی ئەم قورئانە بێنن ﴿لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ﴾ ناتوانن وێنەی ئەو بێنن ﴿وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا﴾
هەرچەندە پشتیوانی یەكتریش بن (٨٨) ﴿وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا لِلنَّاسِ﴾ وە سوێند بەخوا ئێمە هێناومانەتەوە بۆ
خەڵكی ﴿فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ﴾ لەم قورئانەدا ﴿مِن كُلِّ مَثَلٖ﴾ لەهەموو جۆرە نموونەیەك ﴿فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ﴾
كەچی زۆربەی خەڵكی نایانەوێت ﴿إِلَّا كُفُورٗا﴾ جگە لە سپڵەیی و بێ باوەڕی نەبێت (٨٩)
﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ﴾ ووتیان هەرگیز باوەڕت پێ ناهێنین ﴿حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا﴾ هەتا
لەم زەویەدا كانیاوێكمان بۆ هەڵنەقوڵێنی (٩٠) ﴿أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ وَعِنَبٖ﴾ یان باخێكت
ببێت لە دارخورما وترێ ﴿فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا﴾ و چەند ڕووبارێك هەڵقوڵێنیت لە نێوان
درەختەكانیدا بەخوڕ بڕوات (٩١) ﴿أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ﴾ یان ئاسمان بڕوخێنی ﴿كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا﴾
بەسەرماندا هەرچۆن لافت لێداوە كە بەپارچە پارچە دەكرێت ﴿أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ یان خوا و
فریشتەكان بێنی ﴿قَبِيلًا﴾ ڕوو بەڕوو (بیان بینین). (٩٢) ﴿أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ﴾ یان كۆشك و ماڵێكت ببێت
﴿مِّن زُخۡرُفٍ﴾ ڕازاوە بەنەخش و نیگار ﴿أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ یان بەرزببیتەوە بۆ ئاسمان ﴿وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ﴾
وە هەرگیز باوەڕ ناهێنین بەبەرز بونەوەكەشت ﴿حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥ﴾ هەتا پەیامێكمان
بۆ نەهێنیتە خوارەوە خۆمان بیخوێنینەوە ﴿قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ پاكی
وبێگەردی بۆپەروەردگارم ﴿هَلۡ كُنتُ﴾ ئایا من (شتێكی ترم) ﴿إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا﴾ جگە لەئادەمیەكی
نێرراو و پێغەمبەر (واتە من دەسەڵاتی ئەو شتانەم نیە بەڵكو من تەنها مرۆڤێكم و خودا كردوومی بە
پێغەمبەر) (٩٣) ﴿وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ﴾ هیچ شتێك بەرگری خەڵكی نەكرد ﴿أَن يُؤۡمِنُوٓاْ﴾ لەوەی كەباوەڕ بێنن
﴿إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰٓ﴾ كاتێك كەڕێنموونی و ئاینی حەقیان بۆ هات ﴿إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ﴾ بێجگە لەوەی دەیان
ووت ﴿أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا رَّسُولٗا﴾ چۆن خوا ئادەمیەك بە پێغەمبەر دەنێرێت (٩٤) ﴿قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ
مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ﴾ بڵێ ئەگەر لەزەوی دا فریشتە هەبوایە وبە دڵنیاییەوە (تیایدا) بگەڕانایە
(بە وێنەی ئادەمی) ﴿لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ بێگومان لە ئاسمانەوە دەمان ناردەخوارەوە بۆیان ﴿مَلَكٗا
رَّسُولٗا﴾ فریشتەیەكی پێغەمبەر (٩٥) ﴿قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا﴾ بڵێ پێیان خوا بەسە كە شاهید بێت ﴿بَيۡنِي
وَبَيۡنَكُمۡۚ﴾ لە نێوان من و ئێوەدا ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە بەئاگادار و بینایە
بە بەندەكانی (٩٦)

﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ﴾ هـەر کەس خواڕێنموونی بکات ﴿فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ﴾ هەر ئەو کەسـە ڕێنموونی کراوە (بەڕاسـتی)
﴿وَمَن يُضْلِلْ﴾ و هـەر کەسیش خـوا گومـڕای بکات ﴿فَلَن تَجِدَ لَهُمْ﴾ ئـەوە هەرگیز دەسـتت ناکەوێـت بۆیان
﴿أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ﴾ بێجگـە لەخـوا دۆسـت و یارمەتـی دەرانێـك ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ وە لـەڕۆژی دواییـدا
حەشـریان دەکەیـن ﴿عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ﴾ بەسـەر ڕوومـەت و دەم و چاویانـدا ﴿عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا﴾ کـە کوێرو لاڵ
وکـەڕن ﴿مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ﴾ شـوێنی نیشـتەجێیان دۆزەخـە ﴿كُلَّمَا خَبَتْ﴾ هـەر جارێـك (دۆزەخ) بڵێسـەی
بنیشێتەوە (دامرێتەوە) ﴿زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا﴾ بڵێسەی ئاگرەکەیان بۆ زیاد دەکەین ﴿٩٧﴾ ﴿ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم﴾ ئەوە تۆڵەی
ئەوانەیە ﴿بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ چونکە بێگومان باوەڕیان نەهێنا بەئایەتەکانی ئێمە ﴿وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا﴾ و دەیان ووت
ئایا ئەگەر ئێمە بووینە ﴿عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا﴾ ئێسـك و پروسـکی پارەپارەی ڕزیو ﴿أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا﴾ ئایا
ئێمە جارێکی تر زیندوو دەکرێینەوە بەدروست کردنێکی تازە ﴿٩٨﴾ ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى﴾ ئایا ئەوانە نەیانزانیوە
بێگومـان ئەو خوایەی ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ کە ئاسـمانەکان و زەوی دروسـت کردووە ﴿قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ
مِثْلَهُمْ﴾ دەسـەڵات دارو بەتوانایە کەوێنەی ئەوانە دروسـت بکاتەوە ﴿وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا﴾ وە کات و ماوەیەکی
دیـاری کردووە بۆیـان ﴿لَّا رَيْبَ فِيهِ﴾ کە گومانی تێدانیە ﴿فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا﴾ بەڵام ستەمکاران هیچیان
ناوێـت بێ بـاوەڕی نەبێـت ﴿٩٩﴾ ﴿قُل لَّوْ أَنتُمْ﴾ بڵێ ئەگەر ئێـوە ﴿تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ﴾ خاوەنـی خەزێنەکانی
چاکـە و نیعمەتەکانـی پەروەردگـارم بـن ﴿إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ﴾ ئەوکاتـە دەتانگرێتـەوە (لەبەخشـین) ﴿خَشْيَةَ
ٱلْإِنفَاقِ﴾ لـە ترسـی خەرج بوون و تەواو بـوون ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا﴾ وە ئادەمی هەمیشـە ڕژدە و چروکە ﴿١٠٠﴾
﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ﴾ وە سـوێند بەخوا بەڕاستی بەخشیمان بەمووسـا ﴿تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ نۆ موعجیزەی ڕوون
وئاشکرا ﴿فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) دەی پرسیار لەنەوەی ئیسرائیل بکە (سەبارەت بەڕوداوی
مووسـا و فیرعـەون) ﴿إِذْ جَآءَهُمْ﴾ کاتـێ (مووسـا) هاتە لایـان ﴿فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ﴾ ئەمجا فیرعـەون پێی ووت
﴿إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا﴾ بەڕاسـتی ئـەی مووسـا مـن واگومـان دەبـەم کە تـۆ جادو لـێ کـراو بیت ﴿١٠١﴾
﴿قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ﴾ (مووسا علیه السلام) فەرمووی سوێندبەخوا بێگومان تۆ دەزانی ﴿مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ هیچ کەس
ئـەم موعجیزانەی نەناردۆتـە خوارەوە ﴿إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ﴾ جگە لەپەروەردگاری ئاسـمانەکان
وزەوی نەبێت کە ڕوونکەرەوەن (بۆ خەڵکی) ﴿وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ﴾ وە بەڕاسـتی من دڵنیام کە تۆ ﴿يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا﴾
ئـەی فیرعـەون لـە نـاو دەچیـت ﴿١٠٢﴾ ﴿فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ﴾ جـا فیرعـەون ویسـتی کـەوا (مووسـا
وکۆمەڵەکەی) دەرکات لەزەوی (میسر)دا ﴿فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا﴾ ئیتر ئێمەش فیرعەون و ئەوانەی لەگەڵی
بوون هەموویانمان خنکاند لە دەریادا ﴿١٠٣﴾ ﴿وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ ئەوسا لەپاش خنکاندنیان ووتمان ﴿لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾
بەنەوەی ئیسـرائیل ﴿ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ﴾ نیشـتە جـێ بن لەو زەویەی (کە فیرعەون ویسـتی دەرتـان کات لێ ی)
﴿فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ جـا کاتێـك بەڵێنـی ڕۆژی دوایـی هـات ﴿جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا﴾ ئەوسـا هەمووتـان پێکـەوە
(بۆ دادگای خوا) دێنین ﴿١٠٤﴾

﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ﴾ وە ئـەم (قورئانە)مـان بەهـەق ناردۆتە خوارەوە﴿وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَۗ﴾ وە بەحەق و ڕاسـتیش هاتووەتە
خـوارەوە﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ﴾ وە تۆمـان ڕەوانـە نەکـردووە ﴿إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ بەمـوژدە دەرو ترسـێنەر نەبێـت ١٠٥
﴿وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ﴾ وە قورئانمـان بـەش بـەش بۆت نـاردووە ﴿لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بۆ ئـەوەی بیخوێنیتەوە بەسـەر
خەڵکیـدا ﴿عَلَىٰ مُكۡثٖ﴾ بە لەسـەر خۆیـی و هێواشـی ﴿وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا﴾ وە ئـەم (قورئانە)مان بەو شـێوە دابەزاند
١٠٦ ﴿قُلۡ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) پێیـان) بڵـێ باوەڕبێنـن بـەم (قورئانە) ﴿أَوۡ لَا تُؤۡمِنُوٓاْۚ﴾ یـان باوەڕی
پـێ نەهێنـن﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـەی کـە زانیارییـان پـێ بەخشـراوە ﴿مِن قَبۡلِهِۦٓ﴾ لەپێـش ئـەم
(قورئانـە)دا ﴿إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ﴾ کاتێـك (قورئان) بخوێنرێتەوە بەسـەریاندا ﴿يَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِۤ سُجَّدٗا﴾ بەچەسـپانی
دەکـەون بـەڕودا بەسـوژدە بـردن ١٠٧ ﴿وَيَقُولُونَ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ﴾ وە دەڵێـن پـاك و بێگـەردی بـۆ پەروەردگارمـان
﴿إِن كَانَ وَعۡدُ رَبِّنَا لَمَفۡعُولٗا﴾ بەڕاسـتی هەمیشـە بەڵێنـی پەروەردگارمـان بـەدی دێـت ١٠٨ ﴿وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ
يَبۡكُونَ﴾ وە دەکەون بەسەر ڕوودا ودەگرین ﴿وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعٗا۩﴾ و (قورئان) هەمیشە ملکەچیان بۆ زیاد دەکات
١٠٩ ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ﴾ بڵـێ نـزا و هـاوار لەخـوا بکەن ﴿أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ﴾ یـان هاوار لـە ڕەحمان بکەن (یەکسـانە)
﴿أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ﴾ بەهـەر کامیان نزاو هاوار داوای لـێ بکەن ﴿فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ چونکە هەر بۆ خوایە هەموو
نـاوە زۆر جوانـەکان ﴿وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ﴾ لەنوێژکردنتـدا دەنگ بەرزمەکـەرەوە ﴿وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا﴾ و بەنهێنیش
مەیکـە ﴿وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا﴾ لەو نێوانەدا ڕێگایەك هەڵبژێرە ( بەشـێوەیەك خـۆت گوێت لەخۆت بێت) ١١٠
﴿وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ وە (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵێ هەموو سـوپاس و سـتایش هەر بـۆ خوایە ﴿ٱلَّذِي لَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا﴾
زاتێـك کەهیچ منداڵێکـی بۆ خۆی بڕیار نەداوە ﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٞ﴾ و هیچ هاوبەشـێکی نەبووە ﴿فِي ٱلۡمُلۡكِ﴾لە
موڵك و پادشایەتیدا ﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلِيّٞ﴾ هیچ دۆست و یارمەتی دەرێکی نەبووە ﴿مِّنَ ٱلذُّلِّۖ﴾ لەبەر بێ دەسەڵاتی
﴿وَكَبِّرۡهُ تَكۡبِيرَۢا﴾ (کەواتە) خوا زۆر بە گەورە بگرە ١١١

## سورەتی ﴿ ٱلۡكَهۡفِ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ﴾ هەمـوو سـوپاس و سـتایش بۆ ئەو خوایـەی ﴿أَنزَلَ﴾ کە ناردوویەتیـە خوارەوە ﴿عَلَىٰ عَبۡدِهِ
ٱلۡكِتَٰبَ﴾ قورئـان بۆ سـەر بەندکـەی خۆی (موحەممـەد ﷺ) ﴿وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ﴾ و هیچ جـورە لاریەکی تێدا
دانەنـاوە ١ ﴿قَيِّمٗا﴾ (کتێبێکـی) ڕاسـت و پایـەدارە ﴿لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا﴾ بۆ ئەوەی بە سـزایەکی زۆر بەتین
بترسـێنێت (ئەوانەی کەباوەڕی پـێ ناهێنن) ﴿مِّن لَّدُنۡهُ﴾ لەلایەن خۆیەوە﴿وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ و مژدەش بدات
بـەو باوەڕ دارانـەی﴿ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ کە کردەوە چاکـەکان ئەنجام دەدەن ﴿أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا﴾
بەمەی کە پاداشتێکی چاکیان بۆ هەیە ٢ ﴿مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدٗا﴾ لەو (بەهەشتە)دا بێ بڕانەوە دەمێننەوە ٣ ﴿وَيُنذِرَ
ٱلَّذِينَ﴾ وە (بۆ ئەوەی) کەسانێك بترسێنێت ﴿قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا﴾ کە دەیان ووت خوا ڕۆڵەی بۆ خۆی بڕیار
داوە ٤

﴿مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ﴾ نەخۆیان زانابوون پێی ﴿وَلَا لِآبَآئِهِمْ﴾ نەباوو باپیرانیان ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً﴾ چ قسەیەکی (بوختانێکی) گەورەیە ﴿تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ﴾ کە لەدەمیان دەردەچێت ﴿إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا﴾ جگە لەدرۆ هیچ شتێکی تر نالێن ﴿٥﴾ ﴿فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ﴾ جا لەوانەیە خۆت لە ناوبەری ﴿عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ﴾ لەبەر کردەوەی ئەوان ﴿إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا﴾ ئەگەر ئیمان نەهێنن ﴿بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا﴾ بەم قورئانە لەداخ و خەفەتدا (بمریت) ﴿٦﴾ ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ﴾ بەڕاستی ئێمە هەرچی وابەسەر زەوی یەوە کردوومانە ﴿زِينَةً لَّهَا﴾ بەزینەت و جوانی بۆ زەوی ﴿لِنَبْلُوَهُمْ﴾ بۆ ئەوەی خەڵکی تاقی بکەینەوە ﴿أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ کامیان کردەوەی جوانترو چاکترە؟ ﴿٧﴾ ﴿وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا﴾ وە بەڕاستی ئەوەی وابەسەر زەوییەوە ئێمە هەمووی دەکەین ﴿صَعِيدًا جُرُزًا﴾ بە زەویەکی تەختی ووشك و برنگ ﴿٨﴾ ﴿أَمْ حَسِبْتَ﴾ ئایا وات زانی ﴿أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ﴾ کە هاوەڵانی ئەشکەوت و تابلۆ (ئەو بەردەی ناویانی تیا نوسرا بوو) ﴿كَانُوا مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا﴾ ئەوان لەناو نیشانەکانی ئێمەدا شتێکی سەر سوڕهێنەر بوو؟ ﴿٩﴾ ﴿إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ﴾ کاتێ کۆمەڵە گەنجێك پەنایان بردەبەر ئەشکەوتەکە ﴿فَقَالُوا رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً﴾ ووتیان ئەی پەروەردگارمان لەلایەن خۆتەوە ڕەحمەتێکمان پێ ببەخشە ﴿وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾ وە فەراهەم بێنە بۆمان لەم کارەی کەواین تیایدا ڕێی ڕاست و ڕزگاری ﴿١٠﴾ ﴿فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ﴾ جا ئێمەش (دوعاکەیانمان گیرا کردو) پەردەمان هێنا بەسەر گوێیاندا ﴿فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا﴾ لەو ئەشکەوتەدا چەندساڵ (خەومان لێ خستن) ﴿١١﴾ ﴿ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ﴾ لەپاشان خەبەرمان کردنەوە ﴿لِنَعْلَمَ﴾ بۆئەوەی دەر بخەین ﴿أَيُّ ٱلْحِزْبَيْنِ﴾ لەودوو تاقمە کامیان ﴿أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا أَمَدًا﴾ چاکتر ماوەی خەوی خۆیان دەژمێرن (لە ئەشکەوتەکەدا) ﴿١٢﴾ ﴿نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ﴾ ئێمە بۆت دەگێڕینەوە ﴿نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ﴾ هەواڵی ئەوان بەڕێك و ڕاستی ﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ﴾ بەڕاستی ئەوانە کۆمەڵە لاوێك بوون ﴿ءَامَنُوا بِرَبِّهِمْ﴾ باوەڕیان هێنابوو بەپەروەردگاریان ﴿وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى﴾ ئێمەش ڕێنموونیمان زیاد کردن ﴿١٣﴾ ﴿وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ و دڵیانمان بەهێز کرد (لەسەر ئەو باوەڕە) ﴿إِذْ قَامُوا﴾ لەکاتێکدا هەستان و ڕاپەڕین ﴿فَقَالُوا رَبُّنَا﴾ ووتیان پەروەردگاری ئێمە ﴿رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی یە ﴿لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا﴾ ئێمە هەرگیز بێجگە لەو پەرستراوێکی تر ناپەرستین ﴿لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا﴾ (ئەگەر جگە لەخوا شتێ تر بپەرستین) سوێند بەخوا ئەوکاتە درۆمان ووتووە ﴿١٤﴾ ﴿هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا﴾ ئائەوانە گەلەکەی ئێمەن ﴿ٱتَّخَذُوا مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً﴾ بێجگە لەخوا پەرستراوی تریان بۆخۆیان بڕیار داوە ﴿لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم﴾ دەی با بۆیان بیهێننەوە ﴿بِسُلْطَٰنٍۭ بَيِّنٍ﴾ بەڵگەو نیشانەی ڕوون و ئاشکرا ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ﴾ دەی کێ ستەم کارترە لەو کەسەی ﴿ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ کە درۆ هەڵبەستێ بەدەم خوداوە ﴿١٥﴾

﴿وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ﴾ (ئـەی هاوەڵانـی ئەشـكەوت) كاتێـك ئێـوە دوورە پەرێزیتـان گرت لـەوان (لەو
بـێ باوەڕانـە) ﴿وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ و لـەو (پەرسـتراو) انـەش بێجگـە لـە خـودا دەیـان پەرسـتن
﴿فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ﴾ دەی كەوایە پەنا بەرنە ئەشـكەوتەكە ﴿يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ﴾ پەروەردگارتان
بـڵاوی دەكاتەوە بۆتـان بەزەیی ورەحمەتی خۆی ﴿وَيُهَيِّئۡ لَكُم﴾ و بۆتـان فەراهەم دەهێنێت ﴿مِّنۡ أَمۡرِكُم
مِّرۡفَقٗا﴾ لـەم كارەتانـدا هۆی گـوزەران و ژیانتـان ﴿١٦﴾ ﴿وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت﴾ خۆر دەبینـی كاتێك
كەهەڵدێت ﴿تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ﴾ لەلای ڕاستی ئەشكەوتەكەیان دەدات ﴿وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ﴾
كاتێكیش ئاوا دەبێت لای دەدا لێیان ﴿ذَاتَ ٱلشِّمَالِ﴾ بەلای چەپدا ﴿وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ﴾ لەكاتێكدا ئەوان
لە ناو بۆشـایی فراوانی ئەشـكەوتەكەدان ﴿ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ﴾ ئەوە هەندێكە لە بەڵگە و نیشانەكانی
خوا ﴿مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ﴾ هەر كەسێ خوا ڕێنموونی بكات ﴿فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ﴾ تەنها ئەو كەسە ڕێنموونی كراوە
﴿وَمَن يُضۡلِلۡ﴾ و هـەر كەسـیش گومـڕا بـكات ﴿فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا﴾ ئەوە دەسـتت ناكەوێ بۆی
هیچ پشـتیوان و ڕێ نیشـاندەرێك ﴿١٧﴾ ﴿وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا﴾ (ئەگەر بیان بینیـت) وا دەزانیت بەخەبەرن
﴿وَهُمۡ رُقُودٞۚ﴾ كـە چـی خەوتـوون ﴿وَنُقَلِّبُهُمۡ﴾ وە ئـەو (خەوتـوو)انە ئەم دیـو و دیویان پـێ دەكەین
(بۆ ئەوەی لاشـەیان تێك نەچێت) ﴿ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ﴾ بەلای ڕاست و بە لای چەپدا ﴿وَكَلۡبُهُم
بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ﴾ و سەگەكەیان هەردوو دەستی درێژ كرد بوو ﴿بِٱلۡوَصِيدِۚ﴾ لەبەر دەرگای ئەشكەوتەكەدا
﴿لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ ئەگـەر سـەیرێكت بكردنایـە ﴿لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ فِرَارٗا﴾ بێگومان بە ڕاكـردن بەرەو دوا
دەگەڕایتەوە ﴿وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا﴾ و پڕ بە دڵ لێیان دەترسایت ﴿١٨﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ﴾ ئابەو شێوە
(لـە خەو) خەبەرمانكردنەوە ﴿لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ﴾ بۆ ئەوەی پرسـیار لـە یەكتری بكەن ﴿قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ﴾
یەكێكیـان ووتـی ﴿كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ﴾ چەندە ماونەتـەوە (بە خەوتوویـی) ﴿قَالُواْ﴾ (هەندێكیـان) ووتیان
﴿لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ﴾ ڕۆژێك یا كەمتر لە ڕۆژێك ماوینەتەوە ﴿قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ﴾ (هەندێكی
تریـان) ووتیـان پـەروەردگـارتـان زاناتـرە بەمـاوەی مانەوەتـان ﴿فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ﴾
دە یەكێكتان بەم دراوە (زیوە) تان بنێرن ﴿إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ﴾ بۆ ناو شار ﴿فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا﴾ با سەیر كات
كـێ (لـە خەڵكی شـار) خۆراكی پاكتـرە ﴿فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ﴾ ئەوە با لـەوە خۆراكتان بـۆ بهێنێت
﴿وَلۡيَتَلَطَّفۡ﴾ بـا نـەرم و نیان و لەسـەرخۆ بێت لە هەڵسـوكەوتیدا (تـا نەناسـرێتەوە) ﴿وَلَا يُشۡعِرَنَّ
بِكُمۡ أَحَدًا﴾ و كـەس لەئێـوە ئاگادار نەكات ﴿١٩﴾ ﴿إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ﴾ چونكـە بێگومان ئەگەر
ئـەوان پێتان بزانن ﴿يَرۡجُمُوكُمۡ﴾ بەرد بارانتـان دەكەن ﴿أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ فِي مِلَّتِهِمۡ﴾ یان دەتان گێڕنەوە
بۆناو ئایینەكەی خۆیان ﴿وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا﴾ ئەو كاتە ئێوە هەرگیز ڕزگارتان نابێت ﴿٢٠﴾

﴿وَكَذَلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ﴾ (پاش سەدان ساڵ) ئا بەو شێوە خەڵكمان ئاگادار كرد بەسەریاندا
﴿لِيَعْلَمُوا أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ بۆ ئەوەی بزانن كەبێگومان بەڵێنی خواراستە ﴿وَأَنَّ السَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَا﴾
وەدڵنیابن كەڕۆژی دوایی گومانی تێدانیە ﴿إِذْ يَتَنَازَعُونَ بَيْنَهُمْ﴾ (خەڵكی مان ئاگاداركرد
بەسەریاندا) لەكاتێكدا ئەو خەڵكە كێشەیان بوو لەنێوان خۆیاندا ﴿أَمْرَهُمْ﴾ دەربارەیان
﴿فَقَالُوا ابْنُوا عَلَيْهِمْ بُنْيَانًا﴾ جا (هەندێكیان) وتیان چەند خانوویەكیان بەسەرەوە دروست بكەن
﴿رَبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ﴾ پەروەردگاریان ئاگادارترە پێیان ﴿قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ﴾ ئەوانەی كەزاڵ
بوون بەسەر كار و باری ئەوكۆمەڵەدا وتیان ﴿لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِمْ مَسْجِدًا﴾ بێگومان مزگەوتێكیان
بەسەرەوە دروست دەكەین ﴿٢١﴾ ﴿سَيَقُولُونَ ثَلَاثَةٌ رَابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ ئەوسا هەندێكیان دەڵێن (ئەو لاوانە)
سێ كەسن و چوارەمیان سەگەكەیانە ﴿وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ وەهەندێكی تریان
دەڵێن پێنج كەسن و شەشەمیان سەگەكەیانە ﴿رَجْمًا بِالْغَيْبِ﴾ ئەمانە قسەی بێ بەڵگەن (تفەنگ
بە تاریكە شەوەو دەنێن) ﴿وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ هەندێكی تریان دەڵێن ئەوانە حەوت
كەسن هەشتەمەكەیان سەگەكەیانە ﴿قُلْ رَبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِمْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ پەروەردگارم
زاناترە بەژمارەیان ﴿مَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ كەمێك نەبێت لەخەڵكی كەس ژمارەیان نازانێت
﴿فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ﴾ كەواتە (ئەی موحەممەد ﷺ) لەبارەیانەوە دەمەقاڵێ مەكە ﴿إِلَّا مِرَاءً ظَاهِرًا﴾ جگەلە
دەمەقاڵەیەكی ئاشكرا و ئاسان (تەنها ئەوە بڵێ كە لە قورئاندا بۆت هاتووە) ﴿وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِمْ مِنْهُمْ أَحَدًا﴾
وە لەبارەیانەوە پرسیار لەكەسیان (خاوەن نامەكان) مەكە ﴿٢٢﴾ ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ﴾ بۆ (كردنی) هیچ
شتێك مەڵێ ﴿إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ غَدًا﴾ بێگومان من سبەینێ ئەو شتە دەكەم ﴿٢٣﴾ ﴿إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ﴾ مەگەر
(لەگەڵی دا بڵێیت) ئەگەر خوا بیەوێت ﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ هەر كاتێ (إن شاء الله) ت لەبیرچوو
كەی بیرت هاتەوە بیڵێ ﴿وَقُلْ عَسَى أَنْ يَهْدِيَنِ رَبِّي﴾ بڵێ ئومێدەوارم پەروەردگارم ڕێنموونیم بكات
﴿لِأَقْرَبَ مِنْ هَذَا رَشَدًا﴾ بۆ ڕێگایەكی نزیكتر (لە ڕاستی) لەمە ﴿٢٤﴾ ﴿وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ﴾ (ئەو كۆمەڵە
لاوە) مانەوە لە ناو ئەشكەوتەكەیاندا (بە خەوتوویی) ﴿ثَلَاثَ مِائَةٍ سِنِينَ﴾ ماوەی سێ سەد ساڵ
(بە ساڵی هەتاوی) ﴿وَازْدَادُوا تِسْعًا﴾ نۆ ساڵی تریشیان زیادكرد (ئەگەر بەساڵی مانگی عەرەبی حیساب
بكرێت) ﴿٢٥﴾ ﴿قُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا﴾ بڵێ خوا زاناترە بەماوەی مانەوەیان ﴿لَهُ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾
تەنها بۆ خوایە زانینی نهێنی ئاسمانەكان و زەوی ﴿أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ﴾ ئای (خودا) چ بینا و بیسەرە
﴿مَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَلِيٍّ﴾ بێجگە لە (خوا) هیچ پشتیوانێكیان بۆنیە ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾
كەسیش ناكات بە هاوبەشی خۆی لە فەرمانی دا ﴿٢٦﴾ ﴿وَاتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ﴾ بخوێنەرەوە ئەوەی كە
وەحیت بۆكراوە ﴿مِنْ كِتَابِ رَبِّكَ﴾ لە قورئانی پەروەردگارت ﴿لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ﴾ كەس نیە
بتوانێت وتەكانی ئەو بگۆڕێت ﴿وَلَنْ تَجِدَ مِنْ دُونِهِ مُلْتَحَدًا﴾ هەرگیز پەنایەكت دەست ناكەوێت
بێجگە لە خوا پەنای بۆ بەریت ﴿٢٧﴾

﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ﴾ خـۆت ڕاگرە لەگەڵ ئەوانەی ﴿يَدۡعُونَ رَبَّهُم﴾ لەپەروەردگاریان دەپاڕێنەوە
ویادی ئەو دەکەن (و دەیپەرستن) ﴿بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ﴾ بەیانیان و ئێواران ﴿يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ﴾ کەمەبەستیان
ڕەزامەنـدی خوایـە ﴿وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ﴾ چاوەکانـت لـەوان لامـەدە و وەرمەگێـڕە (بۆ کەسـانی بێ
بـاوەڕی دەوڵەمەنـد) ﴿تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ کـە جوانـی و ڕازاوەیـی ژیانـی ئـەم دونیـای دەوێت
﴿وَلَا تُطِعۡ مَنۡ﴾ و بەگوێی کەسێك مەکە ﴿أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا﴾ کە دڵیمان لە یادی خۆمان بێ ئاگا کردوە
﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ﴾ و شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە ﴿وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا﴾ هەموو کارەکانی خراپ و
لەسـنوور دەرچووە (٢٨) ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ﴾ بڵێ حەق (ئەم قورئانـە) ﴿مِن رَّبِّكُمۡۖ﴾ لەلایەن پەروەردگارتانەوە
هاتووە ﴿فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن﴾ جا هەرکەسـێ دەیەوێت با باوەڕبێنێ ﴿وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ﴾ و هەرکەسـیش
دەیەوێـت بـا بـێ بـاوەڕ بێـت (ئەمەش جۆرێکـە لە هەڕەشـە وسەرزەنشـت) ﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ﴾
بـە ڕاسـتی ئێمـە ئامادەمان کردووە بۆ سـتەمکاران (بێ بـاوەڕان) ﴿نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ﴾ ئاگرێك کە
بڵێسـەکەی (وەکـو ڕەشـماڵ) دەوریـان دەدات ﴿وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ﴾ وە ئەگـەر (لە تینوانا) هـاواری ئاو
بکـەن ﴿يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ﴾ ئاوێکیـان بۆ دەهێنرێ وەك مسـی تواوە (یا وەك چڵـك و چەپەڵی ڕۆن و
زەیت وایە) ﴿يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ﴾ روو دەم و چاوەکان دەبرژێنێ ﴿بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ﴾ ئای چ خواردنەوەیەکی
پیس و خراپـە ﴿وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا﴾ و ئـای چ شـوێن و جێگایەکـی خراپـە (٢٩) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾
بەڕاسـتی ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوە﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ و کـردوەی چاکەیان کردووە ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ
أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا﴾ بێگومـان ئێمـە پاداشـتی ئەوانـە وون ناکەین کە کـردەوەی چاکیـان کردوە (٣٠)
﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ﴾ بـۆ ئەوانـە هەیـە ﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٖ﴾ بەهەشـتانێکی هەمیشـەیی ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ کـە
ڕووبارەکان بە ژێریاندا دێن و دەچن ﴿يُحَلَّوۡنَ فِيهَا﴾ دەڕازێنرێنەوە لەو (بەهەشتانە)دا ﴿مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ﴾
بـە بازنـی زۆری ئاڵتـون ﴿وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا﴾ وە پۆشـاکی سـەوز دەپۆشـن ﴿مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ﴾ لە
ئاوریشـمی تەنك و ئەسـتور ﴿مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۚ﴾ پاڵ دەدەنەوە لەو (بەهەشـتە) دا بە سـەر کورسی
وپاڵپشـتەکانەوە ﴿نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقٗا﴾ ئـای چەند پاداشـتێکی چاکـە و جێگایەکی خۆشـە (٣١)
﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بۆیان بگێڕەرەوە نموونەی ﴿رَّجُلَيۡنِ﴾ ئەو دوو پیاوە ﴿جَعَلۡنَا
لِأَحَدِهِمَا﴾دابوومـان بـە یەکێکیـان (کـە بـێ باوەڕ بـوو) ﴿جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ﴾ دوو بـاخ لە هەمـوو جۆرە
ترێیـەك ﴿وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ﴾ بـە دار خورمـا دەوری هـەردوو باخەکەمـان دابـوو ﴿وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا﴾
لەنێوان ئەو دوو باخەدا کشـتوکاڵمان فەراهـەم هێنابوو (بۆی) (٣٢) ﴿كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا﴾هەردوو
باخەکـە بەری چاکیان گرتبوو﴿وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ﴾ هیچیان لێ خەسـار نەبوو بوو ﴿وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا﴾
و لـە نێـوان ئەو دوو باخەدا کانیاوێکمـان هەڵقوڵاندبوو (بۆ ئاودانیـان) (٣٣) ﴿وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ﴾ هەروەها
(خاوەنی ئەودووباخە)ماڵ وسامانی زۆری هەبوو (لەئاڵتون وزیووشتی تر) ﴿فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ﴾
جـا بـە هـاوڕێ (ئیمانـدارە هەژارە) کـەی ووت لـە کاتێکـدا کە قسـەی لەگەڵـدا دەکرد ﴿أَنَا۠ أَكۡثَرُ
مِنكَ مَالٗا﴾ من ماڵ و سامانم لە تۆ زۆرترە ﴿وَأَعَزُّ نَفَرٗا﴾ کوڕ و کاڵ و خزمەتکاریشم زیاترە (٣٤)

﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ﴾ (بێ باوەڕەکەیـان) چـووە ناو باخەکەیـەوە ﴿وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾ لە کاتێکدا کە سـتەم
کاربـوو لە خـۆی ﴿قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا﴾ ووتی باوەڕ ناکەم هەرگیز ئـەم باخەم لەناو بچێت ﴿٣٥﴾
﴿وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً﴾ باوەڕیـش ناکـەم ڕۆژی دوایی بێت و ڕوو بدات ﴿وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى﴾ سـوێند
بێ خۆ ئەگەر (پاش مردن) بمگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم ﴿لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا﴾ بێگومان باشـتر
لـەم باخەم دەسـت دەکەوێ ﴿٣٦﴾ ﴿قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ﴾ هـاوڕێ (ئیمانداره) کـەی پێی ووت ﴿وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ﴾
لـە کاتێکـدا کە گفتوگـۆی لەگەڵـدا دەکرد ﴿أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ﴾ ئایـا تۆ بـێ باوەڕیت بەو
زاتـەی کە تـۆی لەخاك دروسـت کردووە ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾ پاشـان لە دڵۆپـە ئاوێك ﴿ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا﴾
پاشـان کردویتـی بـە پیـاو ﴿٣٧﴾ ﴿لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى﴾ بەڵام مـن هـەر (دەڵێم) ئـەو خـوا پەروەردگارمە
﴿وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا﴾ و هیـچ کەسـیش ناکـەم بـە هاوبەشـی پەروەردگـارم ﴿٣٨﴾ ﴿وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ﴾
وە باکاتـێ چوویتە ناو باخەکەتەوە ﴿قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾ بتووتایـە هەرچی خوا بیەوێ (هەر ئەوە دەبێت)
﴿لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ هەموو توانایەکیش هەر بەدەس خوایە ﴿إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ﴾ ئەگەر تۆ من دەبینی لەتۆ
کەمتریـش. ﴿مَالًا وَوَلَدًا﴾ ماڵ و دارایـی و منداڵم هەیە ﴿٣٩﴾ ﴿فَعَسَىٰ رَبِّىٓ﴾ ئومێدم وایە کە پەروەردگارم
﴿أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ﴾ چاکتـر لـە باخەکـەی تۆم پێ بـدات ﴿وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ و بەڵا و
بروسـکەیەکیش لـە ئاسـمانەوە بنێرێـت بۆباخەکەی تـۆ ﴿فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا﴾ جا (باخەکـەت) ببێت
بەزەویەکی ووشـکی ساف و خلیسك ﴿٤٠﴾ ﴿أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا﴾ یان ئاوەکەی ڕۆبچێ بە ناخی زەویدا
﴿فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا﴾ ئیتر هەرگیز نەتوانی بیدۆزیتەوە ﴿٤١﴾ ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ﴾ سامان و بەروبوومەکەی
لەناوبرا (بە هەورە بروسـکە سوتا و نەما) ﴿فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ﴾ ئەمجا کابراش لە داخا دەسەکانی
دەپروانـد ودەیدان بەیەکدا ﴿عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا﴾ لەسـەر ئـەو ماڵەی کە خەرجی کرد بـوو (لەباخەکەیدا)
﴿وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾ لە کاتێکدا (کەپری) باخەکەی هەموو کەوتوون بەسەر یەکدا ﴿وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى﴾
(جا لەپاشە ڕۆژدا) دەڵێت : خۆزگە ﴿لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا﴾ کەسم نەکردایە بەهاوەڵی پەروەردگارم ﴿٤٢﴾
﴿وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ﴾ کەسانێك نەبوو یارمەتی بدەن و بێن بەهانایەوە ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بێجگە لە خوا
﴿وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا﴾ خۆیشـی سـەرکەوتوو نەبـوو ﴿٤٣﴾ ﴿هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ﴾ لـەو شـوێنانەدا پشـتیوانی
تایبەتـی خوای ڕاسـت و حەقە ﴿هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا﴾ هـەر ئەویش چاکترین پاداشـت ئەداتەوە ﴿وَخَيْرٌ عُقْبًا﴾
وسەرئەنجامی باشیش (بەئیمانداران) دەدات ﴿٤٤﴾ ﴿وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ)
بهێنـەرەوە بۆ ئەو (بێ باوەڕ) انە نموونەی ژیانـی دونیا ﴿كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ وەك بارانێك وایە لە
ئاسمانەوە دەیبارێنین ﴿فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ﴾ ئەوسا جۆرەها ڕواوی زەویی (پێ دەڕوێت و) دەڕۆن
بەنـاو یەکـدا ﴿فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ﴾ ئەمجـا دەبێتە پـوش و پەلاش و بـا پرش و بـڵاوی دەکاتەوە
﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا﴾ وە خوا هەمیشە بە توانا و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێکدا ﴿٤٥﴾

﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ماڵ و کوڕ و کاڵ جوانی و زینەتی ژیانی دونیان ﴿وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ﴾
کردەوە چاکەکان کە (پاداشتیان) دەمێنێتەوە ﴿خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا﴾ پاداشتیان چاکترە لای پەروەردگارت
﴿وَخَيْرٌ أَمَلًا﴾ و زیاتر جێگەی ئومێدن (لەماڵی دونیا) ﴿٤٦﴾ ﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ﴾ وە (یادیان خەرەوە)
ڕۆژێ کە شاخەکان دەخەینە ڕێ ﴿وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً﴾ و ڕووی زەوی بە ڕوونی و تەختی دەبینی
﴿وَحَشَرْنَٰهُمْ﴾ و هەموو (خەڵکی) کۆ دەکەینەوە ﴿فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا﴾ و هیچ کەسیان بەجێ ناهێڵین
﴿٤٧﴾ ﴿وَعُرِضُوا۟ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا﴾ و هەموو (ئادەمی) لەبەردەم پەروەردگارتدا ڕیز دەکرێن ﴿لَّقَدْ جِئْتُمُونَا﴾
سوێند بە خوا دێنەوە بۆ لامان ﴿كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ﴾ هەر بەو شێوەیەی کە یەکەم جار دروستمان کردن
(بە ڕووتی و بێ بەرگی) ﴿بَلْ زَعَمْتُمْ﴾ بەڵام ئێوە گومانتان وابوو ﴿أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا﴾ کە ئێمە کاتێك
دانانێین بۆ (لێپرسینەوە) تان ﴿٤٨﴾ ﴿وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ﴾ نامەی کردەوەکان دابەش دەکرێت (دەدرێتە دەستی
ڕاست چاکان و دەستی چەپی تاوانباران) ﴿فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ ئەمجا تاوانباران دەبینیت ﴿مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ﴾
زۆر دەترسن لەو (هەموو تاوان و خراپە)ی کە تێیدایە ﴿وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا﴾ و دەڵێن ئای هاوار بۆ ئێمە
﴿مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەم نامە و دەفتەرە چییە؟ ﴿لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا﴾ هیچ کردەوەیەکی
بچووك و گەورەی بەجێ نەهێشتووە و تۆماری کردووە ﴿وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا﴾ هەر کردەوەیەکیان
کردبێت (تیایدا) ئامادەیە ﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ و پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات ﴿٤٩﴾ ﴿وَإِذْ قُلْنَا
لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾ (بیریان بهێنەرەوە) کاتێك بە فریشتەکانمان ووت سوژدە بەرن بۆ ئادەم
﴿فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ﴾ ئەوانیش هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس (شەیتان) نەبێت ﴿كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ﴾
کە لە پێری جنۆکەکان بوو ﴿فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ﴾ بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ
وَذُرِّيَّتَهُۥٓ﴾ دەی ئایا ئێوە (ئەی ئادەمیزادەکان) ئەوو نەوەی دەکەنە ﴿أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى﴾ دۆست و پشتیوانی
خۆتان لە جیاتی من ﴿وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوان دوژمنی ئێوەن ﴿بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا﴾ ئای
چ گۆڕینەوەیەکی خراپە بۆ ستەمکاران ﴿٥٠﴾ ﴿مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ من ئەوان (شەیتان
و نەوەی)م ئامادەی دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی نەکردووە ﴿وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ﴾ هەروەها لە
(کاتی) دروست کردنی خۆشیاندا (ئامادەم نەکردوون) ﴿وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا﴾ وە من هەرگیز
گومڕاکەرانم نەکردووە بە یارمەتی دەری خۆم ﴿٥١﴾ ﴿وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ﴾ ڕۆژێك
دەبێت کە خوا دەفەرموێ بانگی ئەو بتانە بکەن کە لاتان وابوو هاوبەشی منن (با یارمەتیتان بدەن)
﴿فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ﴾ ئەوانیش بانگیان دەکەن بەڵام وەڵامیان نادەنەوە (و نایەن بە هاواریانەوە)
﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا﴾ وە ئێمە لە نێوانیاندا شیوێکی پڕ ئازارمان داناوە ﴿٥٢﴾ ﴿وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ﴾
وە تاوانباران ئاگری دۆزەخ دەبینن ﴿فَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا﴾ و هەموو دەزانن و دڵنیان کە دەچنە ناوی
وتێی دەکەون ﴿وَلَمْ يَجِدُوا۟ عَنْهَا مَصْرِفًا﴾ و ڕێگایەکیان دەست ناکەوێ بۆ گەڕانەوە لەو (ئاگرە) ﴿٥٣﴾

﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا هێناومانەتەوە ﴿لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ﴾
هەموو جۆرە نموونەیەك بۆ خەڵكی ﴿وَكَانَ الْإِنسَانُ﴾ بەڵام هەمیشە ئادەمی ﴿أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا﴾
لە هەموو شتێ زیاتر موجادەلە ودەماقاڵێ دەكات (٥٤) ﴿وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَىٰ﴾
هیچ شتێك ڕێگری لە خەڵك نەكردووە كە باوەڕبهێنن كاتێك هیدایەت و ڕێنموونیان بۆهات
﴿وَيَسْتَغْفِرُوا رَبَّهُمْ﴾ و داوای لێ بوردن بكەن لە پەروەردگاریان ﴿إِلَّا أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ الْأَوَّلِينَ﴾ جگە
لەوەی وەك ئوممەتانی پێشینانیان لێ بێت و(سزای خودا لە ناویان ببات) ﴿أَوْ يَأْتِيَهُمُ الْعَذَابُ قُبُلًا﴾
یان سزا ڕوو بە ڕوویان بێتەوە (بە چاوی خۆیان ببینن) (٥٥) ﴿وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ﴾ ئێمە پێغەمبەرانمان
ناردووە ﴿إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ تەنها موژدە دەر و ترسێنەر بن ﴿وَيُجَادِلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالْبَاطِلِ﴾
ئەوانەی كە بێباوەڕن بەناهەق و بەتاڵ دەمەقاڵێ دەكەن ﴿لِيُدْحِضُوا بِهِ الْحَقَّ﴾ بۆ ئەوەی (ئایینی) ڕاستی
پێ لە ناو بەرن ﴿وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَمَا أُنذِرُوا هُزُوًا﴾ ئایەتەكانی من (كە قورئانە) و ئەو هەڕەشانەی پێی
ترسێنراون بە گاڵتەیان دەزانین (٥٦) ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ﴾ كێ ستەمكارترە لەو كەسەی كە
ئامۆژگاری كرا بێت بە ئایەتەكانی پەروەردگاری ﴿فَأَعْرَضَ عَنْهَا﴾ بەڵام ئەو گوێ ی پێ نەداو ﴿وَنَسِيَ
مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ﴾ و ئەو تاوانانەی كە كردویەتی لە بیری خۆی بباتەوە ﴿إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً﴾ بەڕاستی
ئێمە چەند پەردەیەكی ئەستورمان داوە بەسەر دڵیاندا ﴿أَن يَفْقَهُوهُ﴾ تا تێنەگەن (لە ئایەتەكانی ئێمە)
﴿وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا﴾ وەقورسی و كەڕیمان خستۆتە گوێیانەوە (تاڕاستی نەبیستن) ﴿وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى الْهُدَىٰ﴾
جا ئەگەر بانگیان بكەیت بۆ سەر ڕێگای ڕاست ﴿فَلَن يَهْتَدُوا إِذًا أَبَدًا﴾ ئەوانە هەرگیز هیدایەت وەرناگرن
(٥٧) ﴿وَرَبُّكَ الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ﴾ پەروەردگارت لێ بووردەی خاوەن بەزەییە ﴿لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا﴾
ئەگەر تۆڵەیان لێ بسەنێ بەهۆی ئەو (تاوانانەوە)ی كە كردوویانە ﴿لَعَجَّلَ لَهُمُ الْعَذَابَ﴾ بێگومان بە
پەلە سزای سەختی بۆ دەناردن ﴿بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ﴾ بەڵام بۆ (سزادانی) ئەوان كاتێكی دیاری كراو هەیە
﴿لَّن يَجِدُوا مِن دُونِهِ مَوْئِلًا﴾ بێجگە لەو (خوایە) هیچ پەنایەكیان دەست ناكەوێ (لەو سزایە) (٥٨)
﴿وَتِلْكَ الْقُرَىٰ أَهْلَكْنَاهُمْ﴾ و ئەو هەموو شار و گوندانەمان بەرباد و وێران كرد ﴿لَمَّا ظَلَمُوا﴾ كاتێك
(دانیشتوانیان) ستەمیان كرد ﴿وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا﴾ و بۆ لەناو برد نیشیان كاتێكی دیاری كراومان
دانا بوو (٥٩) ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَاهُ﴾ (باسی ئەو كاتە بكە) كە مووسا بەلاوە بەردەستەكەی خۆی ووت
﴿لَا أَبْرَحُ حَتَّىٰ أَبْلُغَ﴾ من هەر دەڕۆم هەتا دە گەمە ﴿مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ﴾ شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو دەریاكە
﴿أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا﴾ یان ماوەیەكی دوور و درێژ دەڕۆم (٦٠) ﴿فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا﴾ جا كاتێ گەیشتنە ئەو
شوێنەی دوو دەریاكە بەیەك دە گەن ﴿نَسِيَا حُوتَهُمَا﴾ ماسی یەكەیان لەبیر چوو (كە وەك توێشوو بۆ
سەفەرەكەیان پێیان بوو) ﴿فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا﴾ جا (ماسیەكە خۆی فڕێ داو) ڕێگەی خۆی
گرتە بەر لەناو دەریاكەدا و (ئاوەكە) لەت دەبوو وەك خۆی لێ نەدەهاتەوە (٦١)

﴿فَلَمَّا جَاوَزَا﴾ جا کاتێ تێپەڕین (لەو شوێنە) ﴿قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا﴾ (مووسا) فەرمووی بەلاوە
بەردەستەکەی خواردنەکەمان بۆ بێنە ﴿لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی لەم
سەفەرەماندا دووچاری ماندوویی و زەحمەت بووین ﴿٦٢﴾ ﴿قَالَ أَرَءَيْتَ﴾ (لاوەکە) ووتی لە بیرتە
﴿إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ﴾ کاتێ چووینە پەنا بەردە گەورەکە (بۆ پشوودان) ﴿فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ﴾ جا بەڕاستی
من (لەوێ) ماسیەکەم لە بیر چوو ﴿وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ﴾ هیچ شتێ ئەو (ماسیەکە)ی لەبیر نەبردمەوە ﴿إِلَّا
ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ﴾ کە باسی بکەم بۆت بێجگە لە شەیتان ﴿وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا﴾ (ماسییەکە زیندوو
بویەوە و) بەشێوەیەکی سەیر ڕێگای خۆی لە دەریاکە گرتەبەر ﴿٦٣﴾ ﴿قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ﴾ (مووسا) ووتی
ئێمەش ئەوەمان دەویست ﴿فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا﴾ ئەمجا بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە ﴿قَصَصًا﴾ بە سەرنج
دان ﴿٦٤﴾ ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ﴾ جا بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان دی ﴿ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾ کە لەلایەن
خۆمانەوە ڕەحمەتمان پێدابوو ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ﴾ شارەزاشمان کردبوو ﴿مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ لە زانیاری تایبەتی
خۆمان ﴿٦٥﴾ ﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ﴾ مووسا بەو (بەندە صالّحە)ی ووت ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ﴾ ئایا (هاوڕێیەتیت بکەم و)
شوێنت بکەوم ﴿عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ﴾ بۆ ئەوەی فێرم بکەیت ﴿مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾ لەو زانیارییە ڕاستەی فێری
بوویت ﴿٦٦﴾ ﴿قَالَ إِنَّكَ﴾ ووتی (بە مووسا) بە ڕاستی تۆ ﴿لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا﴾ هەرگیز ناتوانی لەگەڵ
مندا خۆت بگری ﴿٦٧﴾ ﴿وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ﴾ تۆ چۆن خۆت دەگری لەسەر ﴿مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا﴾ شتێ کەلە
ڕازو نهێنی ئەو ئاگادار نیت ﴿٦٨﴾ ﴿قَالَ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا﴾ (مووسا) ووتی ئەگەر خوا بیەوێ
بەخۆڕاگر دەمبینی ﴿وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا﴾ و سەرپێچی لە هیچ فەرمانێکت ناکەم ﴿٦٩﴾ ﴿قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى﴾
ووتی (بە مووسا) جا ئەگەر شوێنم کەوتی ﴿فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ﴾ ئەوە پرسیاری هیچ شتێکم لێ مەکە
﴿حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا﴾ هەتا خۆم دەربارەی قسەت بۆ دەکەم (لەنهێنییەکەی ئاگادارت دەکەم) ﴿٧٠﴾
﴿فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِى ٱلسَّفِينَةِ﴾ ئەمجا پێکەوە هەردووکیان ڕۆیشتن هەتا سواری کەشتییەك بوون
﴿خَرَقَهَا﴾ (پیاو چاکەکە) کەشتیەکەی کون کرد ﴿قَالَ أَخَرَقْتَهَا﴾ (مووسا) ووتی کەشتییەکەت کون تێ کرد
﴿لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا﴾ بۆ ئەوەی سەرنشینەکانی (لە دەریادا) نوقم بکەیت ﴿لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا﴾ سوێند بەخوا
بەڕاستی کارێکی زۆر خراپ و ناشایستەت کرد ﴿٧١﴾ ﴿قَالَ أَلَمْ أَقُلْ﴾ (بەندە چاکەکە) ووتی ئایا من نەم ووت
﴿إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا﴾ تۆ هەرگیز ناتوانی خۆت بگری لەگەڵ مندا ﴿٧٢﴾ ﴿قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِى بِمَا نَسِيتُ﴾
(مووسا) ووتی لێم ببورە لەبەر ئەوەی (ئەو مەرجەی دامان نابوو) لەبیرم چوو ﴿وَلَا تُرْهِقْنِى مِنْ أَمْرِى
عُسْرًا﴾ ئەم زانیاری فێربوونەم لەسەر قورس مەکە ﴿٧٣﴾ ﴿فَٱنطَلَقَا﴾ ئەمجا پێکەوە هەردووکیان ڕۆیشتن
﴿حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا﴾ هەتا گەشتن بە تازە لاوێك ﴿فَقَتَلَهُۥ﴾ یەکسەر (پیاو چاکەکە) ئەو(تازە لاوەی) کوشت
﴿قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ﴾ (مووسا) ووتی کەسێکی پاکی بێ گوناهت هەروا کوشت ﴿بِغَيْرِ نَفْسٍ﴾ بێ
ئەوەی کەسێکی کوشتبێ ﴿لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی زۆر خراپ و ناڕەوات
کرد ﴿٧٤﴾

﴿قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكَ﴾ (بەندە چاكەكە) ووتی (بە مووسا) پێم نەووتیت ﴿إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا﴾ بێگومان
تۆ هەرگیز ناتوانی خۆت بگری لەگەڵ مندا (٧٥) ﴿قَالَ إِن سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۭ بَعۡدَهَا﴾ (مووسا) ووتی ئەگەر
دوای ئەم جارە پرسیاری هەرشتێكم لێ كردی (ڕەخنەم لێ گرتیت) ﴿فَلَا تُصَٰحِبۡنِيۖ﴾ ئیتر هاوڕێیەتیم مەكە
﴿قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا﴾ چونكە بەڕاستی لەلایەن منەوە بیانووت هەیە (لەوەی وازم لێ بێنیت) (٧٦)
﴿فَٱنطَلَقَا﴾ ئەمجا پێكەوە هەردووكیان ڕۆیشتن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهۡلَ قَرۡيَةٍ﴾ هەتا گەشتنە لای خەڵكی شارێك
(لەو كاتەدا برسیان بوو) ﴿ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا﴾ داوای خۆراكیان كرد لەخەڵكی شارەكە ﴿فَأَبَوۡاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا﴾
ئەوانیش (خەڵكی شارەكە) میوانداریان لێ نەكردن ﴿فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارٗا﴾ ئەمجا بینیان دیوارێك لەودا (لەو شارەدا)
﴿يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ﴾ نزیك بوو بكەوێت ﴿فَأَقَامَهُۥۖ﴾ (بەندە چاكەكە) دیوارەكەی ڕاستی كردەوە وهەڵیچنیەوە
﴿قَالَ لَوۡ شِئۡتَ﴾ (مووسا) ووتی ئەگەر بتویستایە ﴿لَتَّخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرٗا﴾ كرێیەكت لەسەری وەردەگرت (٧٧)
﴿قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيۡنِي وَبَيۡنِكَۚ﴾ ووتی ئا لێرەدا كاتی جیا بوونەوەی من و تۆیە ﴿سَأُنَبِّئُكَ بِتَأۡوِيلِ﴾ ئاگادارت دەكەم
لەحیكمەتی ﴿مَا لَمۡ تَسۡتَطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرًا﴾ ئەو شتانەی كە تۆ نەتتوانی خۆت بگری لەسەر (ڕوودان) یان (٧٨) ﴿أَمَّا
ٱلسَّفِينَةُ﴾ هۆی (كوون كردنی) كەشتییەكە (ئەوە بوو) ﴿فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ﴾ (ئەو كەشتییە) هی چەند كەسێكی
هەژار بوو ﴿يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ﴾ ئیشیان دەكرد (بەو كەشتییە) لەو دەریایەدا ﴿فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا﴾ بۆیە ویستم
(بە كون كردنی) عەیب داری بكەم (تا پاشا دەستی بەسەردا نەگرێت) ﴿وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٞ﴾ چونكە لەپێشیانەوە
پاشایەك هەبوو ﴿يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا﴾ دەستی دەگرت بەسەر هەموو كەشتیەكی (چاك) دا (٧٩) ﴿وَأَمَّا ٱلۡغُلَٰمُ﴾
وە تازە لاوەكەش (كە كوشتم) ﴿فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ﴾ ئەوە باوك و دایكی ئیماندار بوون ﴿فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا﴾
جا ئێمەش ترساین (خۆشەویستی ئەولاوە) پاڵیان پێوە بنێت ﴿طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا﴾ بۆ سەركەشی و بێ باوەڕی (٨٠)
﴿فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا رَبُّهُمَا﴾ جا (بەو كارە) ویستمان پەروەردگاریان (لەبری ئەوا) بۆیان بگۆڕێت ﴿خَيۡرٗا
مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ﴾ (بەمنداڵێكی) چاكتر لەو پاكتر لە گوناهـ ﴿وَأَقۡرَبَ رُحۡمٗا﴾ بەسۆزو بەزەیی تر بێ بۆیان (٨١)
﴿وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ﴾ وەهۆی (چاككردنەوەی) دیوارەكەش چونكە هی دوو منداڵی هەتیو
بوو ﴿فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾ لە شارەكەدا ﴿وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا﴾ لەژێریدا گەنجینەیەك هەبوو كەهی ئەو دوو
منداڵە بوو ﴿وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا﴾ وە باوكی ئەودوو منداڵە چاك و خواناس بوو ﴿فَأَرَادَ رَبُّكَ﴾ لەبەرئەوە
پەروەردگارت ویستی ﴿أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا﴾ هەردووكیان گەورەو بەهێز بین ﴿وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا﴾ پاشان
گەنجینەكەیان دەربێنن ﴿رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ﴾ ئەمە ڕەحمەتێك بوو لەلایەن پەروەردگارتەوە (لەبەر باوكیان)
﴿وَمَا فَعَلۡتُهُۥ عَنۡ أَمۡرِيۚ﴾ ئەو (شتانەی) كردم لە خۆمەوە نەبوو ﴿ذَٰلِكَ تَأۡوِيلُ﴾ ئەوە نهێنی و هۆی ئەو كردەوانە
بوو ﴿مَا لَمۡ تَسۡطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرٗا﴾ كە تۆ توانای خۆ گرتنت نەبوو لەسەر (كردن) یان (٨٢) ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَن ذِي ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ﴾
هەروەها پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی (ذو القرنين) ﴿قُلۡ سَأَتۡلُواْ عَلَيۡكُم مِّنۡهُ ذِكۡرًا﴾ (لە وەڵامیاندا) بڵێ لە
بارەیەوە هەندێك باس دەكەم بۆتان (٨٣)

﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ بەڕاستی ئێمە هێز و دەسەڵاتمان پێ دا لە زەویدا ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾ وە هۆكاری هەموو
شتێكمان پێ دابوو (كە پاشایەتی پێویستی بوو) (٨٤) ﴿فَأَتْبَعَ سَبَبًا﴾ ئەویش كەڵكی لە هۆكارەكان وەردەگرت (بۆ
گەشتن بە مەبەست) (٨٥) ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ﴾ (خۆی و لەشكرەكە ڕۆیشت) تا ئەوكاتەی گەیشتە شوێنی
ئاوا بوونی خۆر ﴿وَجَدَهَا تَغْرُبُ﴾ (لەو شوێنەدا) وا دیار بوو خۆرئاوا دەبێ ﴿فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾ لە كانیاوێكدا كە قوڕە
ڕەشەی بە دەوردایە ﴿وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا﴾ جا لەو جێگادا ڕێی كەوت لەگەلێكی (بێ باوەڕ) ﴿قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ﴾ پێمان
وت ئەی (ذو القرنین) ﴿إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ﴾ یا سزایان بدە (بە كوشتن گەر باوەڕیان نەهێنا) ﴿وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا﴾ یان
چاكەیان لەگەڵدا بكە (گەر باوەڕیان هێنا) (٨٦) ﴿قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ﴾ (ذو القرنین) وتی ئەوەی ستەم بكات (باوەڕ
نەهێنێ) ﴿فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ﴾ ئەوە بێگومان ئێمە سزای ئەدەین (بە كوشتن) ﴿ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ﴾ پاشان دەگەڕێنرێتەوە
بۆ لای پەروەردگاری ﴿فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا﴾ ئەویش سزای دەدات بە سزایەكی سەخت كە وێنەی نەبینراوە (٨٧)
﴿وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ بەڵام ئەوەی باوەڕ بێنێ و كردەوەی چاكیش بكات ﴿فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ﴾ ئەوە پاداشتی هەرە چاك
(لە دواڕۆژدا) بۆ ئەوە ﴿وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا﴾ و كارو فەرمانی خۆمانی بۆ سووك و ئاسان دەكەین (٨٨) ﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا﴾
پاشان گەڕایەوە بۆ ڕۆژهەڵات، وئەو هۆكارانەی گرتەبەر كە خوای گەورە پێی دابوو (٨٩) ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ﴾ هەتا
كاتێ گەیشتە شوێنی هەڵاتنی خۆر ﴿وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ﴾ بینی خۆر هەڵدێت لەسەر گەل و نەتەوەیەك ﴿لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن
دُونِهَا سِتْرًا﴾ كەهیچ پەردەو پەنایەكمان بۆ دانەنابوون (لەخۆر بیانشارێتەوە) (٩٠) ﴿كَذَٰلِكَ﴾ هەر بەو شێوە بوو
(بەسەرهاتی ذو القرنین) ﴿وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا﴾ بێگومان ئێمە بەوەی هەیبوو (لەبیریدا بوو) ئاگادار بووین (٩١) ﴿ثُمَّ
أَتْبَعَ سَبَبًا﴾ پاشان (ذو القرنین) ڕۆیشت، وە ئەو هۆكار و ڕێگایانەی گرتەبەر كە (خوای گەورە پێی دابوو) (٩٢) ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ
بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ﴾ هەتا گەیشتە نێوانی دووبەربەست (نێوان دووچیا) ﴿وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا﴾ لەنزیك ئەودووبەربەستەدا گەلێكی دی
﴿لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا﴾ لەهیچ وتەیەك تێ نەدەگەیشتن (بەزمانی خۆیان نەبێت) (٩٣) ﴿قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ﴾ وتیان
ئەی (ذو القرنین) ﴿إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ﴾ بەڕاستی (یأجوج و مأجوج) ﴿مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ لەم خاكەدا خراپەكارن
﴿فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا﴾ ئاخۆ خەرجێكت پێ بدەین ﴿عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا﴾ بۆ ئەوەی بەربەستێ لەنێوان ئێمەو
ئەواندا دروست بكەیت (٩٤) ﴿قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ﴾ وتی ئەو سامان و دەسەڵاتەی پەروەردگارم پێی داوم
چاكترە (لەوەی ئێوە باسی دەكەن) ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ﴾ جا ئێوە بە هێز و بازوو یارمەتیم بدەن ﴿أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا﴾
لەنێوان ئێوەو ئەواندا بەربەستێك دروست ئەكەم (٩٥) ﴿ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ﴾ پارچە ئاسنم بۆ بێنن (لەسەر یەك دایبنێن)
﴿حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ﴾ هەتا نێوانی هەردوو كێوەكەی پڕ كردو ڕێكی یەك بوون ﴿قَالَ ٱنفُخُوا۟﴾ وتی: (بەموشەدەمە)
فوو بكەن (لەو ئاگرەی لە ژێریدا كرا بوویەوە) ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا﴾ هەتا كاتێ ئەو (پارچە ئاسنانە)ی كرد بەئاگر
﴿قَالَ﴾ (ذو القرنین) وتی ﴿ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا﴾ مسی تواوەم بۆ بێنن بیكەم بەسەریدا (٩٦) ﴿فَمَا ٱسْطَٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ﴾ ئەمجا
(یأجوج و مأجوج) نەیان دەتوانی سەركەون بەسەریدا (بەهۆی بەرزی و ساف و لوسی یەوە ﴿وَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا﴾
وە نەیان دەتوانی كونی تێبكەن (لەبەر ڕەقی و ئەستووری) (٩٧)

﴿قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي﴾ (ذو القرنین) ووتی ئەم (دروست کردنە) ڕەحمەتێکە لە لایەن پەروەردگارمەوە
﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي﴾ جا هەرکات بەڵێنی پەروەردگارم هات (بەدەرچوونی یأجوج و مأجوج) ﴿جَعَلَهُ دَكَّاءَ﴾ دەیکاتە
زەویەکی تەخت ﴿وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا﴾ وە بێگومان بەڵێنی پەروەردگارم هەق و ڕاستە (٩٨) ﴿وَتَرَكْنَا﴾ واز (لەخەڵکی)
دێنین ﴿بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ﴾ لەو ڕۆژەدا دێن و دەچن بەناو یەکتردا (وەکو شەپۆلی دەریا) ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ﴾
و فوو دەکرێ بەشەیپور دا ﴿فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا﴾ ئەوسا هەموویان کۆ دەکەینەوە سەراپا (کەسیان لێ جێ نامێنێت) (٩٩)
﴿وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَافِرِينَ﴾ وە لەو ڕۆژەدا دۆزەخ نیشانی کافران دەدەین ﴿عَرْضًا﴾ بەنیشان دانێکی تەواو (١٠٠)
﴿الَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ﴾ ئەوانەی کە(لەم دونیایەدا) چاویان ﴿فِي غِطَاءٍ عَن ذِكْرِي﴾ پەردەی بەسەردا هاتبوو لەیادی من
﴿وَكَانُوا لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا﴾ وە ئەوانە نەیان دەتوانی (قورئان) ببیستن (١٠١) ﴿أَفَحَسِبَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئایا ئەوانەی
بێ باوەڕن وا گومان دەبەن (سوودی هەبێ بۆیان) ﴿أَن يَتَّخِذُوا عِبَادِي﴾ کە بەندەکانم (وەك فریشتە و عیسا) بکەن
﴿مِن دُونِي أَوْلِيَاءَ﴾ بە یار و یاوەر و پەرستراو جگە لە من ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ﴾ بەڕاستی ئێمە دۆزەخمان ئامادە
کردووە ﴿لِلْكَافِرِينَ نُزُلًا﴾ بەجێگا و شوێن (میوانداری) بۆ بێ باوەڕان (١٠٢) ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم﴾ بڵێ ئایا هەواڵتان بدەینێ
﴿بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا﴾ بە خەسارەتمەندترین (کەس) لەکاروکردەوەکانیاندا (١٠٣) ﴿الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ﴾ (ئەوانە) ئەو
کەسانەن کە کردەوەو کۆششیان بەفیڕۆ چوو ﴿فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ لەژیانی دونیادا ﴿وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ﴾ واشیان گومان دەبرد
بەڕاستی ئەوان ﴿يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾ کارێکی زۆر چاك دەکەن (١٠٤) ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوانە کەسانێکن بێ باوەڕ بوون
﴿بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ﴾ بەنیشانەکانی پەروردگاریان و گەیشتن بەخزمەتی (لەدوا ڕۆژدا) ﴿فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ﴾ لەبەر
ئەوە کردەوەکانیان پوچەڵ و بێ پاداشت دەرچوو ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾ کەواتە لەڕۆژی دوایی دا هیچ نرخ
و ڕێزێکیان بۆ دانانێین (١٠٥) ﴿ذَٰلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ﴾ ئەوە تۆڵەو سزایان دۆزەخە ﴿بِمَا كَفَرُوا﴾ لەبەر ئەوە بێ باوەڕبوون
﴿وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُوًا﴾ و گاڵتەیان دەکرد بەنیشانەکان و پێغەمبەرانی ئێمە (١٠٦) ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بەڕاستی
ئەوانە کەئیمان و باوڕیان هێناوە ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ وەکردەوەی چاکیان کردووە ﴿كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا﴾
بەهەشتەکانی فیردەوس جێگای (میوانداری) ئەوانە (١٠٧) ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ بەبەردەوامی تێیدا دەمێننەوە
﴿لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا﴾ داوای گواستنەوە ناکەن لەو(بەهەشتە)دا (١٠٨) ﴿قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ
ئەگەر(ئاوی) دەریاکان ببوایە ﴿مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي﴾ بەمرەکەب بۆ (نوسینی) زانیاری پەروەردگارم ﴿لَنَفِدَ الْبَحْرُ﴾
بێگومان (ئاوی) دەریاکان تەواو دەبوون ﴿قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي﴾ پێش ئەوەی زانیاری پەروەردگارم تەواو ببێت
﴿وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا﴾ ئەگەر چەند ئەوەندەی دەریاکانیش بێنین (بیکەین بە مرەکەب زانیاری خوا تەواو نابێت)
(١٠٩) ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ بڵێ (بەو بێ باوەڕانە) بێگومان منیش تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە ﴿يُوحَىٰ إِلَيَّ﴾ بەڵام وەحیم
بۆ دێت ﴿أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە پەروەردگارێکی تاك و تەنیایە ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ﴾ جا
هەر کەس بەتەمایە بەخزمەت پەروەردگاری بگات (لەقیامەتدا) ﴿فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا﴾ ئەوە با کردەوەی چاك بکات
﴿وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ وە لەپەرستنی پەروەردگاری دا کەس نەکات بەهاوبەشی (١١٠)

## سورەتی ﴿مَرۡيَمَ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿كٓهيعٓصٓ﴾ بـە (كاف، هـا، یا، عەین، صـاد) دەخوێنرێتەوە خـوا زاناترە بە ماناكـەی، بۆزانیاری
زیاتـر سـەیری سـەرەتای سـورەتی (البقـرە) بكـە (١) ﴿ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ﴾ (ئەمـەی دەخوێنرێتـەوە
بەسـەرتدا) باس ویادی بەزەیـی پەروەردگارتە ﴿عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ﴾ بە بەندەی خـۆی كەزەكەریایە (٢)
﴿إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ﴾ لەكاتێكدا پاڕایـەوە لەپەروەردگاری ﴿نِدَآءً خَفِيّٗا﴾ بەپاڕانەوەیەكی نهێنی و پەنامەكی
(٣) ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي﴾ ووتـی ئـەی پەروەردگـارم بەڕاستی مـن ﴿وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي﴾ ئێسكم لاواز بـووە
﴿وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا﴾ لەبەر پیری سەرم (بەمووی سپی) گڕی گرتووە ( ئەمە جۆرێكە لەڕەوانبێژی
زمانـی عەرەبـی بەكاردێت بەمەبەسـتی ئەوەی كە مووی سـپی لەكاتـی پیریدا گڕی بـەرداوە لە موو
ڕەشەكانی سەردەمی گەنجێتی) ﴿وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا﴾ پەروەردگارم هەرگیز لەپاڕانەوەم لێت
بێ هیوا نەبووم (٤) ﴿وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ﴾ بەڕاسـتی من دەترسم كەس و كارەكەم (لەئاینی خوا لادەن)
﴿مِن وَرَآءِي﴾ لەپاش (مردنی) خۆم (چونكە كەسێكیان تێدانیە جێگری من بێت) ﴿وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي
عَاقِرٗا﴾ وخێزانەكەشـم نەزۆكـە (مندالّی نابێت) ﴿فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا﴾ سـا تۆ لەلایـەن خۆتەوە
منالّێكـی چاكـم پـێ ببەخشـە (٥) ﴿يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ﴾ میراتگـری (پێغەمبەرێتـی) مـن
وبنەمالّـەی یەعقـوب بـێ ﴿وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا﴾ ئـەی پەروەردگـارم واشـی لـێ بكە كەخـۆت لێی
ڕازی بیت (٦) ﴿يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ﴾ (خـوای گەورە فەرمووی) ئەی زەكەریا بەڕاسـتی موژدەت
دەدەینـێ ﴿بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ﴾ بەمندالّێ كەناوی یەحیایە ﴿لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا﴾ پێشـتر كەسـمان
بـەو نـاوە نەنـاوە (٧) ﴿قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ﴾ ووتـی ئـەی پەروەردگارم چـۆن مندالّـم دەبێ
﴿وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا﴾ لەكاتێكـدا خێزانـم نەزۆكـە ﴿وَقَدۡ بَلَغۡتُ مِنَ ٱلۡكِبَرِ عِتِيّٗا﴾ بێگومـان
خۆشـم لـە پیریدا گەیشـتوومەتە ئـەو پەڕی پیـری (٨) ﴿قَالَ كَذَٰلِكَ﴾ ووتـی (بڕیار)بـەو جۆرەیە
﴿قَالَ رَبُّكَ﴾ پەروەردگاریشـت فەرموویەتی ﴿هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞ﴾ ئەو (كارە) بەلای منەوە زۆر ئاسـانە
﴿وَقَدۡ خَلَقۡتُكَ مِن قَبۡلُ﴾ بێگومان پێشتریش تۆم دروست كردووە ﴿وَلَمۡ تَكُ شَيۡـٔٗا﴾ كەشتێك نەبوویت
(پێش ئـەو دروسـتكردنە) (٩) ﴿قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۖ﴾ (زەكەریـا) ووتـی ئـەی پەروەردگـارم
نیشـانەیەكم بۆ دابنـێ (كاتێ ئەو مژدە هاتە دی) ﴿قَالَ ءَايَتُكَ﴾ (خوای گەورە) فەرمووی نیشـانەی
تـۆ ئەوەیە (لەسـەر بوونی ئەو كوڕە) ﴿أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ﴾ ناتوانیت گفتوگـۆ لەگەلّ خەلّكدا بكەیت
﴿ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا﴾ سـێ شـەو لەسەر یەك (بە ڕۆژەكانیەوە هەر چەندە) ساغیت و لالّ نیت (١٠) ﴿فَخَرَجَ
عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ﴾ پاشـان زەكەریا لە پەرستگاكەی هاتە دەر بۆ ناو گەلەكەی ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ﴾ جا
بەئیشارەت پێی ووتن ﴿أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا﴾ كە بەیانیان و ئێواران تەسبیحاتی خوا بكەن (١١)

﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ﴾ (خـوا دەفەرمویـت بـە یەحیـا پـاش گـەورە بوونـی) ئـەی یەحیـا تـەورات
بەتووندو گرنـگ بگرە ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا﴾ تێگەیشتنی تەورات (یـا حیکمەت و ژیری) مان پێبەخشـی
لەتەمەنـی منالّیـدا ﴿١٢﴾ ﴿وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ﴾ لەگـەلّ دلّسـۆزی و پـاك و خاوێنـی لەلایـەن خۆمانـەوە
﴿وَكَانَ تَقِيّٗا﴾ وە ئەو(یەحیـا) لەخوا ترس و پارێزکار بوو ﴿١٣﴾ ﴿وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ﴾ هەلّسـو کەوتی لە گەلّ دایك
و باوکیـدا جـوان بـوو ﴿وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا﴾ خـۆ بەزل زان و سـەر پێچی کـەر نەبوو (لەفەرمانـی خوا) ﴿١٤﴾
﴿وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ﴾ سـەلامی خـوای لەسـەر بێت لـەو ڕۆژەی لەدایك بـوو ﴿وَيَوۡمَ يَمُوتُ﴾ وە لەو ڕۆژەی
کـە وەفـات دەکات ﴿وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا﴾ وە لـەو ڕۆژەی کەزینـدوو دەکرێتـەوە ﴿١٥﴾ ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ﴾
(ئـەی موحەممـەد ﷺ) باسـی بەسـەرهاتی مەریەم بکـە لە قورئانـدا ﴿إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا﴾ ئـەو کاتەی کە
کەنارگیری کرد لە کەس و کاری ﴿مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا﴾ لە شوێنێکی ڕۆژهەلّاتی (مزگەوتی قودس دا خوا پەرستی
دەکـرد) ﴿١٦﴾ ﴿فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا﴾ ئەمجـا پەردەیەکـی دانـا لە نێوان خـۆی و ئەوان (کـەس و کاری)دا
﴿فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا﴾ ئێمەیـش جوبرەئیلمـان نـارد بـۆلای ﴿فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا﴾ وەکـو بەشـەرێکی تەواو
خۆی پیشـانی (مەریـەم)دا ﴿١٧﴾ ﴿قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ﴾ (مەریەم) ووتی من پەنا دەگـرم بەخوای میهرەبان
لـە تـۆ ﴿إِن كُنتَ تَقِيّٗا﴾ ئەگەر تۆ لە خوا ترسـیت (وازم لێ بێنە و زیانم پـێ مەگەیەنە) ﴿١٨﴾ ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ
رَبِّكِ﴾ جوبرەئیـل ووتـی (ترسـت نەبێ) مـن نێـردراوی پەروەردگارتـم ﴿لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا﴾ بۆ ئەوەی
منالّێکی پاك و خاوێنت پێ ببەخشم ﴿١٩﴾ ﴿قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ﴾ (مەریەم) ووتی من چۆن منالّم دەبێت!!
﴿وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ﴾ کـە هیچ بەشـەرێك (لێم نەکەوتـووە) ڕەفاقەتـی نەکـردوم (بەحەلّالّی) ﴿وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا﴾
وە داوێـن پیسـیش نەبـووم ﴿٢٠﴾ ﴿قَالَ كَذَٰلِكِ﴾ (جوبرەئیـل) ووتـی کارەکە بەو جـۆرە یە (کـە پێم ووتی)
﴿قَالَ رَبُّكِ﴾ پەروەردگارت فەرموویەتی ﴿هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ﴾ ئەو کارە لای من زۆر ئاسانە ﴿وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ﴾
و بـۆ ئـەوەی بیکەین بەموعجیزەو نیشـانەیەك بـۆ خەلّکـی ﴿وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ﴾ و ڕەحمەتێکـی تایبەتیش لەلایەن
ئێمـەوە ﴿وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا﴾ ئـەوە کارێکـی بڕیاردراوە(لەلایـەن خـواوە) ﴿٢١﴾ ﴿فَحَمَلَتۡهُ﴾ جـا (مەریـەم)
سـکی پـڕ بـوو بـەو (کۆرپەلـەوە) ﴿فَٱنتَبَذَتۡ بِهِۦ مَكَانٗا قَصِيّٗا﴾ ئەمجـا بـە (سـکەکە) وە دوور کەوتـەوە بـۆ
شـوێنێکی دوور (لە کەس و کاری) ﴿٢٢﴾ ﴿فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ﴾ ئەوسـا ئێشـی پێش ژانی منالّ بوون ناچاری
کـردو بـردی ﴿إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ﴾ بـۆ لای قـەدی دار خورمایەك (تا لە کاتـی منالّ بوومەنەکەیـدا خۆی پێوە
بگرێـت و پالّـی پێوە بـدات) ﴿قَالَتۡ يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا﴾ (مەریـەم) ووتی ئـای خۆزگە پێش ئـەم (ڕوداوە)
بمردمایـە ﴿وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا﴾ و مـن شـتێکی لەبیرچـووەی باس نەکـراو بوومایە ﴿٢٣﴾ ﴿فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ﴾
ئەمجـا (جوبرەئیـل) بانگـی مەریەمی کرد لەژێـری (دار خورماکە) وە﴿أَلَّا تَحۡزَنِي﴾(ووتـی) خەفەت مەخۆ و
غەمبـار مەبـە﴿قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا﴾ بێگومـان پەروەردگـارت لەخوارتـەوە جۆگەیـەك ئاوی بـۆ فەراهەم
هێنـاوی ﴿٢٤﴾ ﴿وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ﴾ قەدی ئەو دار خورمایەش بۆ لای خۆت ڕاوەشـێنە ﴿تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا
جَنِيّٗا﴾ خورمای تازە پێ گەییووت بەسەردا دەبارێت ﴿٢٥﴾

﴿فَكُلِي وَٱشْرَبِي﴾ ئەمجـا (لەو خورما) بخـۆ و (لەو ئاوەش) بخۆرەوە ﴿وَقَرِّي عَيْنًا﴾ چاوو دڵ ڕۆشـنبە
﴿فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا﴾ جـا ئەگـەر هـەر کەسـێکت بینـی (پرسـیاری ئـەم منداڵـەی لـێ کـردی)
﴿فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا﴾ بە (ئیشارەت)پێی بڵێ بەڕاستی من قسە نەکردنم لەسە خۆم نەزر کردووە
بـۆ (خوای) میهرەبـان ﴿فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾ لەبەرئەوە ئەمڕۆ قسـە لەگەڵ هیچ کەسـێکدا ناکەم ﴿٢٦﴾
﴿فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا﴾ جـا بـەو (منداڵـەوە) هاتەوە بـۆ لای کـەس و کارەکەی ﴿تَحْمِلُهُۥ﴾ ئـەو (منداڵەی)
گرتبوو بە باوەشیەوە ﴿قَالُوا۟ يَٰمَرْيَمُ﴾ (خزمەکانی) ووتیان ئەی مەریەم ﴿لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا﴾ بەڕاستی
شـتێکی زۆر خراپ و ئابڕو بەرت کردووە ﴿٢٧﴾ ﴿يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ﴾ ئەی ئەوەی وەك خوشـکی هاروون
وایـت (لـە تەقوا و خواناسـیدا) ﴿مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ﴾ نەباوکـت پیاوێکی خـراپ و داوێن پیس
بـووە ﴿وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا﴾ نـە دایکت داوێن پیس و زیناکار بـووە ﴿٢٨﴾ ﴿فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ﴾ جا(مەریەم)
ئیشـارەتی بۆ ئەو (منداڵە) کرد ﴿قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ﴾ (خزمەکانی) ووتیان چۆن قسە بکەین ﴿مَن كَانَ فِي
ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا﴾ لەگـەڵ منداڵێکـدا کـە لـە بێشـکەدایە ﴿٢٩﴾ ﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ﴾ (منداڵەکە هاتە قسـەو) ووتی
بەڕاسـتی مـن بەندەی خوام ﴿ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ پـەڕاوی ئینجیلم پـێ دەدات ﴿وَجَعَلَنِي نَبِيًّا﴾ و دەمکات
بـە پێغەمبـەر ﴿٣٠﴾ ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ﴾ وە پیـرۆز و فـەرداری کردووم لە هـەر جێگایەکدا بم
﴿وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ﴾ و فەرمانـی پێـداوم بە نوێژ کردن و بـە زەکات دان ﴿مَا دُمْتُ حَيًّا﴾ هەتا لە
ژیانـدام و زینـدووم ﴿٣١﴾ ﴿وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي﴾ و (کردومی) بـە ڕۆڵەیەکی چاکەکارو گوێرایـەڵ بۆ دایکم
﴿وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا﴾ نـەی کـردووم بە ملهوڕێکی بەد ڕەفتار ﴿٣٢﴾ ﴿وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ﴾ سـڵاوی خوام
لەسـەر بێـت ﴿يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ﴾ ئەو ڕۆژەی کە لـە دایك بووم وە ئـەو ڕۆژەی کە دەمرم ﴿وَيَوْمَ
أُبْعَثُ حَيًّا﴾ وە ئـەو ڕۆژەی کـە زینـدوو دەکرێمەوە ﴿٣٣﴾ ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ ئەوە (کـە باس کرا)
عیسـای کـوڕی مەریەمـە ﴿قَوْلَ ٱلْحَقِّ﴾ کـە ووتەیەکی ڕاسـتە (دەربارەی عیسـا) ﴿ٱلَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾
کـە ئەوان (گاوور و جوولەکـەکان) تێیدا دوو دڵن ﴿٣٤﴾ ﴿مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ﴾ ناگونجێ و شـایەن
نـی یـە بۆ خـوا منداڵی هەبێت ﴿سُبْحَٰنَهُۥٓ﴾ پـاك و بێگەردی بـۆ خوا ﴿إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا﴾ هەرکاتـێ بیەوێ
کارێـك ببـێ ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ﴾ ئـەوە بێگومـان تەنها پێـی دەڵـێ ﴿كُن فَيَكُونُ﴾ ببە، یەکسـەر دەبێت ﴿٣٥﴾
﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ﴾ بێگومـان خـوا پەروەردگاری من و ئێوەشـە ﴿فَٱعْبُدُوهُ﴾ کەواتە هەر ئەو بپەرسـتن
﴿هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ ئەمەیـە ڕێگـا و ڕێبـازی ڕاسـت و دروسـت ﴿٣٦﴾ ﴿فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ﴾
بەڵام دەسـتەو تاقمی (گاوور و جوولەکە) کان لە نێو خۆیاندا ڕایان جیاواز بوو (لە بارەی عیسـاوە)
﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ جا سـزاو لەناو چوون بۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون ﴿مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ لە بینینی
ڕۆژە زۆر گەورەکە (کە ڕۆژی دوایی یە) ﴿٣٧﴾ ﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ﴾ ئای کە چەندە بیسـەر و بینەرن (ئەو
بـێ باوەڕانـە) ﴿يَوْمَ يَأْتُونَنَا﴾ لەڕۆژێکدا کە دێنـەوە بۆ لامان (لە قیامەتـدا) ﴿لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلْيَوْمَ﴾ بەڵام
ستەمکاران ئەمڕۆ (لە دونیادا) ﴿فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ لە گومڕاییەکی ئاشکرادان ﴿٣٨﴾

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) ئەو(ستەمکار)انە لـەڕۆژی داخ و خەفـەت بترسێنە ﴿إِذْ قُضِىَ
ٱلْأَمْرُ﴾ کاتـێ کارو بـاری (خەڵکـی) کۆتایی پـێ دەهێنرێ ﴿وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ﴾ لـە کاتێکدا ئەوانـە غافڵن ﴿وَهُمْ لَا
يُؤْمِنُونَ﴾ و باوەڕیش ناهێنـن (بـەڕۆژی دوایـی) (٣٩) ﴿إِنَّا نَحْنُ﴾ بەڕاستی هـەر ئێمـە ﴿نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا﴾
دەبینـە میراتگـری زەوی و ئـەوەی لەسـەریەتی ﴿وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾ وە هەر بـۆ لای ئێمـە دەگەڕێنەوە (٤٠) ﴿وَٱذْكُرْ
فِى ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ﴾ وە (ئـەی موحەممـەد ﷺ) لـە قورئانـدا باسـی ئیبراهیـم بکە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا﴾ بەڕاسـتی
ئـەو (ئیبراهیـم) زۆر ڕاستگۆ و پێغەمبەر بـوو (٤١) ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ﴾ کاتێ بە باوکـی ووت ﴿يَٰٓأَبَتِ﴾ ئەی باوکی
خۆشەویستـم ﴿لِمَ تَعْبُدُ﴾ بۆ دەپەرستی ﴿مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ﴾ شـتێ کە نابیسـتێ و نابینێ ﴿وَلَا يُغْنِى عَنكَ شَيْـًٔا﴾
وە هیچ سـوودێکت پێ ناگەیەنێ (٤٢) ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّى قَدْ جَآءَنِى مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم بەڕاستی دڵنیابە
زانسـت و زانیارێکـم بۆ هاتووە ﴿مَا لَمْ يَأْتِكَ﴾ کە بۆ تـۆ نەهاتووە (وپێت نەدراوە) ﴿فَٱتَّبِعْنِىٓ﴾ کەواتە شـوێنم
کـەوە و گوێڕایەڵیـم بکـە ﴿أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا﴾ ڕێنموونیـت دەکـەم بـۆ ڕێبـازی ڕاسـت (٤٣) ﴿يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ
ٱلشَّيْطَٰنَ﴾ ئـەی باوکـی خۆشەویسـتم شـەیتان مەپەرسـتە ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ﴾ بەڕاسـتی شـەیتان ﴿كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ
عَصِيًّا﴾ هەمیشـە سـەرپێچی کـەر و یاخـی یـە لـە خـوای میهرەبـان (٤٤) ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّىٓ أَخَافُ﴾ ئـەی باوکـی
خۆشەویسـتم بەڕاسـتی دەترسـم (گـەر بەکافـری بمـری) ﴿أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ﴾ تووشـی سـزایەك ببـی ﴿مِّنَ
ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ لە لایەن خوای میهرەبانەوە ﴿فَتَكُونَ لِلشَّيْطَٰنِ وَلِيًّا﴾ ئیتر ببیتە هاوڕێ و هاودەمی شەیتان (لەدۆزەخدا)
(٤٥) ﴿قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِى﴾ (باوکـی) ووتـی تـۆ واز لـە پەرستراوەکانی مـن دێنـی (ونایانپەرسـتی)؟!
﴿يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ﴾ ئـەی ئیبراهیـم ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ﴾ سـوێندبێ ئەگـەر واز نەهێنـی (لەقسـە ووتـن بـە
پەرسـتراوەکانم) دڵنیـا بـە بـەرد بارانت دەکـەم ﴿وَٱهْجُرْنِى مَلِيًّا﴾ (دەی) بـڕۆ ماوەیەکـی زۆر دوورکەوەرەوە
لێـم (٤٦) ﴿قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ﴾ (ئیبراهیم) فەرمووی سـەلامەت لێ بێت ﴿سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّىٓ﴾ لـە مەودوا داوای لێ
بوردنـت بۆ دەکەم لە پەروەردگارم ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِى حَفِيًّا﴾ (چونکە) بەڕاسـتی ئـەو (پەروەردگار) لەگەڵمدا
میهرەبانـە (و دوعـام گیـرا دەکات) (٤٧) ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ﴾ وە دووره پەرێـز دەبـم لـە ئێـوەو ئەو شـتانەش
دەیپەرسـتن ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ جگە لـە خوا ﴿وَأَدْعُوا۟ رَبِّى﴾ تەنهـا پەروردگارم دەپەرسـتم ﴿عَسَىٰٓ﴾ ئومێدەوارم
﴿أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّى شَقِيًّا﴾ لـە پەرسـتن و نـزای پەروەردگـارم دا بێ هیـوا و نائومێد نەبم (وەکـو ئێوە) (٤٨)
﴿فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ﴾ جا کاتێ (ئیبراهیم) دوورکەوتەوە لێیان (لە گەلە بت پەرسـتەکەی) ﴿وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾
ولـەو شـتانەش ئـەوان دەیـان پەرسـت جگـە لـە خـوای گـەورە ﴿وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ ئێمـە ئیسـحاق
و(لـە ئیسـحاقیش) یەعقوبمـان پـێ بەخشـی ﴿وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا﴾ و هەریەك لەوانیشـمان کرد بـە پێغەمبەر (٤٩)
﴿وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا﴾ لـە ڕەحمەتـی خۆمان ئەوانمـان بەهرەمەند کرد ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا﴾ باسـی
چاکـەی ئەوانمان خسـتە سـەر زمانـی (ئادەمیزادەکان) (٥٠) ﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ﴾ لە قورئاندا باسـی موسـا
بکە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا﴾ بەڕاسـتی ئەو (کەسـێکی) هەڵبژاردە بوو (بێ گەردبوو لە ناتەواوی) ﴿وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا﴾
و نێرراو و پێغەمبەر بوو (بۆ خەڵکی) (٥١)

﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ﴾ وە ئێمە ئەومان بانگ کرد ﴿مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ﴾ لەلای ڕاستی کێوی طورەوە ﴿وَقَرَّبۡنَٰهُ
نَجِيّٗا﴾ وە ئەو(مووسا)مان نزیک کردەوە تا قسەی لەگەڵ بکەین (٥٢) ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ﴾ وە لەبەزەیی
و بەخشندەیی خۆمان بەخشیمان بەو (مووسا) ﴿أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا﴾ هاروونی برای کە پێغەمبەر بوو (٥٣)
﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ﴾ وە لە قورئاندا باسی ئیسماعیل بکە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ﴾ بێگومان ئەو لە پەیمان
و بەڵێنەکانیدا ڕاست گۆ بوو ﴿وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا﴾ و ئەو نێرراوو پێغەمبەری خوا بوو (٥٤) ﴿وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ﴾
وە هەمیشە فەرمانی دەدا بە خێزان و کەس و کاری ﴿بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ﴾ بە نوێژ کردن و زەکات دان
﴿وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا﴾ وە هەمیشە لای پەروەردگاری جێگەی ڕەزامەندی بوو (٥٥) ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ﴾
وە باسی ئیدریس بکە لە قورئاندا ﴿إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا﴾ بەڕاستی ئەو زۆر ڕاست گۆ و پێغەمبەر بوو
(٥٦) ﴿وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾ و پایە و پلەیمان بڵند و بەرز کردەوە (٥٧) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم﴾ ئەوانەی
(کە باس کران) کەسانێکن کە خوا نیعمەت و چاکەی خۆی ڕشت بەسەریاندا ﴿مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ﴾
لەو پێغەمبەرانەی کە لە نەوەی ئادەمن (وەك ئیدریس) ﴿وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ﴾ وە لە (نەوەی) ئەوانەیش
(کە لە کەشتییەکەدا) لەگەڵ نووح دا هەڵمان گرتن (وەك ئیبراهیم) ﴿وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ وە لە نەوەی
ئیبراهیم و یەعقوب (وەك ئیسماعیل و یوسف) ﴿وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ﴾ وە ئەوانەی هیدایەتمان داون هەڵمان
بژاردوون ﴿إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ ئا ئەوانە هەر کاتێ ئایەتەکانی خوای بە بەزەییان بۆ بخوێنرێتەوە
﴿خَرُّواْۤ سُجَّدٗا وَبُكِيّٗا۩﴾ دەست بەجێ دەکەون بە ڕوودا بەسوژدە و گریانەوە (٥٨) ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ﴾
ئەمجا لە پاش ئەوان کەسانێك (لە نەوەکانیان) بوونە جێنشینیان ﴿أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ کە نوێژیان دەفەوتاند
﴿وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ﴾ و شوێن هەواو ئارەزوو کەوتن ﴿فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا﴾ جا ئەوانە لە داهاتوودا تووشی
(سزای) گومڕاییان دەبن (٥٩) ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ﴾ جگە لەوەی کە تۆبەی کردبێت و باوەڕی هێنابێت
﴿وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾ و کارو کردەوەی چاکی کردبێت ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە
﴿وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا﴾ و هیچ ستەمێکیان لێ ناکرێت (لەپاداشتی کردەوە چاکەکانیان کەم ناکرێتەوە) (٦٠)
﴿جَنَّٰتِ عَدۡنٍ﴾ بەهەشتانی جێی مانەوەی هەمیشەیی یە ﴿ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ کەخوای میهرەبان بەڵێنی داوە ﴿عِبَادَهُۥ
بِٱلۡغَيۡبِۚ﴾ بە بەندەکانی کەنادیارو پەنهانە وبەچاو نەیانبینیوە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا﴾ بەڕاستی خوا بەڵێنی بەدی دێت
(٦١) ﴿لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا﴾ (بەهەشتییەکان) لە بەهەشتدا هیچ ووتە و قسەیەکی بێ سوود نابیستن ﴿إِلَّا سَلَٰمٗاۖ﴾
تەنها سەلام کردن دەبیستن ﴿وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا﴾ لەوێدا ڕزق و ڕۆزی ئامادەیە بۆیان ﴿بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا﴾ بە بەیانیان
و ئێواراندا (٦٢) ﴿تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ﴾ ئەو بەهەشتەی باسی کرا ﴿ٱلَّتِي نُورِثُ﴾ ئەوەیە کەدەیبەخشین ﴿مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ
تَقِيّٗا﴾ بەو کەسانەی کە(لە دونیادا) پارێزکار و لەخوا ترس بوون لە بەندەکانمان (٦٣) ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمۡرِ رَبِّكَۖ﴾
ئێمە (فریشتەکان) لە ئاسمانەوە دانابەزین بە فەرمانی پەروەردگارت نەبێ ﴿لَهُۥ مَا بَيۡنَ أَيۡدِينَا وَمَا خَلۡفَنَا﴾ تەنها
بۆ خوایە (و خوا دەزانێ) هەموو کاروباری داهاتوو ڕابووردوو ﴿وَمَا بَيۡنَ ذَٰلِكَۚ﴾ و ئێستا مان ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ
نَسِيّٗا﴾ وە پەروەردگارت (کردەوەی بەندەکانی) لەبیر نەکردووە (٦٤)

﴿رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا﴾ کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانیاندایە
﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦ﴾ کەواتە بیپەرستە و زۆر خۆگر بە لە پەرستنیدا ﴿هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا﴾
ئایا ئاگاداریت وێنەی ئەو(خوایەکی تر) هەبێت ﴿٦٥﴾ ﴿وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ﴾ ئادەمی(بێ بڕوا) دەڵێ
﴿أَءِذَا مَا مِتُّ﴾ ئایا کە مردم ﴿لَسَوۡفَ أُخۡرَجُ حَيًّا﴾ لە داهاتوودا بە زیندوویی (لە گۆڕ) دەردەهێنرێم ﴿٦٦﴾
﴿أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ﴾ ئەوە ئادەمیزاد بۆ بیرناکاتەوە ﴿أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ﴾ کە بێگومان ئێمە لە سەرەتاوە
ئەومان دروست کردووە ﴿وَلَمۡ يَكُ شَيۡـٔٗا﴾ کە ئەو شتێك نەبوو ﴿٦٧﴾ ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَحۡشُرَنَّهُمۡ﴾ ئەمجا سوێند
بە پەروەردگارت ئەو (بێ بڕوایانە) کۆ دەکەینەوە (لە ڕۆژی دواییدا) ﴿وَٱلشَّيَٰطِينَ﴾ (لەگەڵ)
ئەو شەیتانانەی (کە گومڕایان کردن) ﴿ثُمَّ لَنُحۡضِرَنَّهُمۡ﴾ پاشان بەڕاستی هەموویان ئامادە دەکەین
﴿حَوۡلَ جَهَنَّمَ جِثِيّٗا﴾ بەدەوری دۆزەخدا بەسەر ئەژنۆیاندا کەوتوون (لەبەر ترسناکی ئەو ڕۆژە) ﴿٦٨﴾
﴿ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ﴾ پاشان بێگومان دەری دێنین (و دەیخەینە دۆزەخەوە) ﴿مِن كُلِّ شِيعَةٍ﴾ لە هەر پێڕو
دەستەیەك ﴿أَيُّهُمۡ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ عِتِيّٗا﴾ کامەیان تاوانبارتر (یاخی تر) بووە لە بەرانبەر خوای میهرەباندا
﴿٦٩﴾ ﴿ثُمَّ لَنَحۡنُ أَعۡلَمُ﴾ ئەمجا بێگومان ئێمە زاناترین ﴿بِٱلَّذِينَ هُمۡ أَوۡلَىٰ بِهَا صِلِيّٗا﴾ بەوانەی کە شیاوترن
بخرێنە دۆزەخ و بسوتێن پێی ﴿٧٠﴾ ﴿وَإِن مِّنكُمۡ﴾ کەس نییە لە ئێوە ﴿إِلَّا وَارِدُهَاۚ﴾ نەڕوات و تێنەپەڕێت
بەسەر دۆزەخدا ﴿كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا﴾ (ئەو تێپەڕینە) بڕیارێکی بڕاوەیە لە پەروەردگارتەوە ﴿٧١﴾
﴿ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ﴾ دواتر ئەوانە ڕزگار دەکەین کە پارێزکار ولەخواترس بوون ﴿وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا
جِثِيّٗا﴾ و ستەم کاران لەسەرچۆك لەناو (دۆزەخ) دا دەهێڵینەوە ﴿٧٢﴾ ﴿وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ﴾
هەر کاتێ ئایەتە ڕوون و ئاشکراکانی ئێمە بەسەریاندا بخوێنرایەتەوە ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی
بێ بڕوا بوون دەیان ووت ﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ بەوانەی ئیمانیان هێنا بوو ﴿أَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ خَيۡرٞ مَّقَامٗا﴾
کام لەم دوو کۆمەڵە جێ و شوێنی (خانوو بەرەی) خۆشترە ﴿وَأَحۡسَنُ نَدِيّٗا﴾ و کۆڕو
مەجلیسی چاکترە ﴿٧٣﴾ ﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم﴾ وەپێش ئەمان چەندینمان لەناو برد ﴿مِّن قَرۡنٍ﴾ لەگەلە
(بێ باوەڕەکان) ﴿هُمۡ أَحۡسَنُ أَثَٰثٗا وَرِءۡيٗا﴾ کەل و پەلی ناومال ولاشە وقیافەتیشیان لەمان جوانتر بوو ﴿٧٤﴾
﴿قُلۡ مَن كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بلّێ ئەوەی لە گومڕایی دایە ﴿فَلۡيَمۡدُدۡ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَدًّاۚ﴾
باخوای میهرەبان مولّەتی پێ بدات و تەمەنی درێژ بکات (تازیاتر تاوان بکەن) ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ﴾
هەتا کاتێ ئەو هەڕەشانەی کراوە لێیان دەبینن (دێتە دی) ﴿إِمَّا ٱلۡعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ﴾ (ئەوەش)یان
سزایە (لە دنیادا)یان (هاتنی) ڕۆژی دواییە ﴿فَسَيَعۡلَمُونَ﴾ جا لە داهاتوودا دەزانن ﴿مَنۡ هُوَ شَرّٞ مَّكَانٗا﴾
کێ جێگاو شوێنی (خانوو بەرەی) خراپ و ناخۆشە ﴿وَأَضۡعَفُ جُندٗا﴾ وەکێ سەرباز و لەشکری
بێ هێزترە (کافران یان باوەڕداران) ﴿٧٥﴾ ﴿وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗىۗ﴾ ئەوانەی لەسەر ڕێبازی
هیدایەت بوون خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات ﴿وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ﴾ ئەو کردەوە چاکانەی لە
(ڕۆژی دواییدا) دەمێننەوە ﴿خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا﴾ لای پەروەردگارت پاداشتی چاکترە ﴿وَخَيۡرٞ مَّرَدًّا﴾
وئاکامیشی باشترە ﴿٧٦﴾

﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى﴾ ئایـا ئەو کەسـەت دیـوە ﴿كَفَرَ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ بێ باوەڕ بـوو بە نیشـانە و ئایەتەکانی ئێمە
﴿وَقَالَ﴾ ووتی ﴿لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا﴾ (لە ڕۆژی دواییشـدا) ماڵ و کوڕم پێ دەدرێ ٧٧ ﴿أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ﴾
ئایـا بەنهێنیـەکان ئاگـادارە ﴿أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا﴾ یـا بەڵێنی لە خـوای میهرەبـان وەرگرتووە ٧٨
﴿كَلَّا﴾ نەخێـر (وانیـە) ﴿سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ﴾ لەمەوپـاش ئـەوەی دەیڵـێ دەینوسـین (لەسـەری)
﴿وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا﴾ مـاوەی سـزای بۆ درێژ دەکەینەوە ٧٩ ﴿وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ﴾ ئـەوەی ئەو دەیڵێ
(لەماڵ و منداڵ) بەمیرات لێ ی وەردەگرینەوە ﴿وَيَأْتِينَا فَرْدًا﴾ (لە ڕۆژی دواییدا) بەتەنها دێتەوە لامان ٨٠
﴿وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانە بێجگە لە خوا بڕیاریان داوە بۆ خۆیان ﴿ءَالِهَةً﴾ چەند پەرسـتراوێك
﴿لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا﴾ بـۆ ئـەوەی ئـەو پەرسـتراوانە ببنـە یارمەتـی دەر (و تـکا کار) بۆیـان ٨١ ﴿كَلَّا﴾
نەخێـر (وانیـە) ﴿سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ﴾ بەڵکو پەرسـتراوەکان (لە قیامەت دا) ئینکاری پەرسـتنەکەی
ئـەوان دەکەن ﴿وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾ وە دەبنە دژیان و بەرپەرچیـان دەدەنەوە ٨٢ ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نەتدیوە
(سەرنجت نەداوە) ﴿أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ﴾ کە بێگومان ئێمە شەیتانەکانمان زاڵ کردووە ﴿عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾
بەسـەر بـێ بـاوەڕان دا ﴿تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾ چـاك هانیـان دەدەن (بۆ کوفر و تـاوان) ٨٣ ﴿فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ﴾
جا (ئەی موحەممەد ﷺ) پەلەیان لێ مەکە ﴿إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ بێگومان ئێمە بەژماردنێکی ورد (ڕۆژانی
تەمەنیـان) دەژمێرین ٨٤ ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ باسـی ئـەو ڕۆژە بکە کە پارێزکاران ولەخواترسـان کۆ
دەکەینەوە ﴿إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا﴾ دەستە دەستە و کۆمەڵ کۆمەڵ بەڕێز وحورمەتەوە دەیانبەبن بۆ لای خوای
میهرەبان ٨٥ ﴿وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ تاوانباریش دەدەینە بەر ﴿إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾ بۆ دۆزەخ بە تینویەتی (بەوێنەی
گەلـە ئـاژەڵ) ٨٦ ﴿لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ﴾ دەسـەڵاتی تکاو لاڵەیـان نی یە ﴿إِلَّا مَنِ﴾ جگە لەو کەسـەی
﴿ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا﴾ بەڵێنـی لـە خـوای میهرەبـان وەرگرتـووە (وەك پێغەمبەران و شـەهیدان) ٨٧
﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا﴾ (گـاوور وجوولەکـەکان) دەیـان ووت خـوا منداڵـی بۆخـۆی دانـاوە
٨٨ ﴿لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا﴾ سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی شـتێکی زۆر نابەجـێ و سـەیر دەڵێـن ٨٩
﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ﴾ نزیکە ئاسمانەکان ﴿يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ﴾ لەت لەت و پارە پارە ببن لەبەر ئەو (قسەیە)
﴿وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ﴾ و (نزیکـە) زەویش شـەق بەرێـت و بقڵیشـێ ﴿وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا﴾ و (نزیکە) چیاکان
بـە یـەك جار بڕوخێـن ٩٠ ﴿أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا﴾ لەبەر ئـەوەی (بێ بـاوەڕان) منداڵ دەدەنـە پاڵ خوای
میهرەبـان ٩١ ﴿وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ﴾ بـۆ خوای میهرەبان شـیاو نیە ﴿أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا﴾ کـە منداڵی هەبێ ٩٢
﴿إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ هەمـوو ئەوانـەی لـە ئاسـمانەکان و زەویدان ﴿إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا﴾
بەبەندەیـی دێنـە لای خـوای میهرەبـان (هیچ کەسـێ لەوانە نیـە بەندەی خـوای میهرەبـان نەبێ) ٩٣
﴿لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا﴾ سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی هەموویانی سـەرژمێری کردووە بـە ژماردن ٩٤
﴿وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا﴾ هـەر هەموویـان بـە تـاك و تەنها دێنـەوە بـۆ لای (خوا) لـە ڕۆژی
قیامەتدا ٩٥

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوە ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ و کردەوە چاکەکانیشیان
کردووە ﴿سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا﴾ بێگومان خوای میهرەبان خۆشەویستیان دەکات (لەدڵی باوەڕداراندا)
٩٦ ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ﴾ جا بەڕاستی ئێمە قورئانمان لەسەر زمانی تۆ ئاسان کردووە ﴿لِتُبَشِّرَ بِهِ
ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ تا مژدەی پێ بدەیت بەپارێزکاران و لەخواترسان ﴿وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوۡمٗا لُّدّٗا﴾ ئەو کەسانەشی
پێ بترسێنێت کەبە سەختی دژایەتیت دەکەن ٩٧ ﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ﴾ گەل و کۆمەڵی زۆرمان پێش
ئەمان (لەبەر خراپیان) لەناوبرد ﴿هَلۡ تُحِسُّ مِنۡهُم مِّنۡ أَحَدٍ﴾ ئایا هەست ئەکەیت بەهیچ کەسێك لەوانە مابێت؟
﴿أَوۡ تَسۡمَعُ لَهُمۡ رِكۡزَۢا﴾ یان هیچ وورتە و سرتەیەکیان دەبیستیت ٩٨

## سورەتی ﴿طه﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿طه﴾ بە (طا، ها) دەخوێنرێتەوە، خوا زاناترە بە ماناکەی بۆزانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی
(البقرة) بکە ١ ﴿مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ قورئانمان نەناردۆتە خوارەوە بۆ سەر تۆ ﴿لِتَشۡقَىٰٓ﴾ بۆ ئەوەی
دوو چاری ناڕەحەتی غەم و پەژارە ببیت ٢ ﴿إِلَّا تَذۡكِرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰ﴾ تەنها ئامۆژگاری و بیر خستنەوەیە
بۆ ئەو کەسەی (لەخوا) دەترسێ ٣ ﴿تَنزِيلٗا مِّمَّنۡ﴾ (ئەم قورئانە) بەبەش بەش نێردراوەتە خوارەوە لەلایەن
زاتێکەوە ﴿خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلۡعُلَى﴾ کەزەوی و ئاسمانە بەرزو بڵندەکانی دروست کردووە ٤ ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾
کە (خوای) میهرەبانە ﴿عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ کە بەرز بووە سەر عەرش و قەراری گرت (بەو شێوەی شیاوی
بێت ئێمە چۆنیەتییەکەی نازانین) ٥ ﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ تەنها موڵکی خوایە ئەوەی لەئاسمانەکان
وئەوەی لەزەویدایە ﴿وَمَا بَيۡنَهُمَا وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ﴾ وەئەوەی لەنێوانیاندایەو ئەوەی لەژێر خاکدایە ٦
﴿وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ﴾ ئەگەر تۆ بە ئاشکرا قسە بکەیت ﴿فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى﴾ ئەوە بەڕاستی ئەو (خوا)
نهێنی و لەنهێنی شاراوەتریش دەزانێ ٧ ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ﴾ خوا (ئەو زاتەیە) کە هیچ پەرستراوێکی
تری بەهەق و ڕاستی نی یە جگە لەئەو ﴿لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ تەنها بۆ ئەوە ناوە هەرە جوانەکان ٨
﴿وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) ئایا هەواڵ و دەنگوباسی مووسا پێغەمبەرت پێ گەیشتووە
٩ ﴿إِذۡ رَءَا نَارٗا﴾ کاتێ ئاگرێکی بینی (لەگەڕانەوەیدا بۆ میصر لەشەوێکی سارددا) ﴿فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ﴾
جا (مووسا) ووتی بەخێزانەکەی لێرە بمێننەوە ﴿إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا﴾ بەڕاستی من ئاگرێکم بەدی کردووە
﴿لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ﴾ (ئەڕۆم بۆ لای) بەڵکو لەو ئاگرە چڵۆسکێکتان بۆ بێنم (خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە)
﴿أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى﴾ یان لای ئەو ئاگرە ڕێگا نیشان دەرێکم دەست کەوێ ١٠ ﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا﴾ جا کە گەشتە لای
(ئاگرەکە) ﴿نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ بانگی لێ کرا: ئەی مووسا ١١ ﴿إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ﴾ بەڕاستی من پەروەردگاری تۆم
﴿فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ﴾ دەی پێڵاوەکانت داکەنە (لەبەر ڕێزی شوێنەکە) ﴿إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى﴾ چونکە
بێگومان تۆ لەشیوی پیرۆزو بەفەڕی (طووا) دایت ١٢

﴿وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ﴾ مـن تـۆم هەڵبـژاردووە (بـۆ پێغەمبەرایەتـی) ﴿فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ﴾ کەواتـە گـوێ بگـرە
بـۆ ئـەوەی نیگـا دەکـرێ (بـۆت) ﴿١٣﴾ ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ﴾ بەڕاستـی هـەر مـن خـوام ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠﴾ هیـچ
پەرستراوێکی ڕاست نییـە جگە لـە مـن ﴿فَٱعۡبُدۡنِي﴾ کەواتە من بپەرستە ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾
بـە چاکـی نوێـژ بەجێ بێنـە تامنـت بێتـەوە یـاد ﴿١٤﴾ ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ﴾ بێگومـان ڕۆژی دوایی دێت
﴿أَكَادُ أُخۡفِيهَا﴾ نزیك بوو (کاتی هاتنی لەخۆیشم) بشارمەوە، (چاجـای لەفریشتەوپێغەمبەران، کەواتە
زانینی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی تەنها پەروەردگار دەیزانێت) ﴿لِتُجۡزَىٰ﴾ بۆ ئەوەی پاداشت بدرێتەوە ﴿كُلُّ
نَفۡسِۭ﴾ هەمـوو کەسـێك ﴿بِمَا تَسۡعَىٰ﴾ بـە گوێـرەی ئەو کـردەوەی کە دەیـکات ﴿١٥﴾ ﴿فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنۡهَا﴾
جا بـاڕێگری نەکات لێ ی ﴿مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا﴾ ئەو کەسەی باوەڕی نی یە بەو (قیامەتە) ﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ﴾
و شـوێن هـەوا و ئـارەزووی خـۆی کەوتـووە ﴿فَتَرۡدَىٰ﴾ ئەوسـا تیـا دەچێـت ﴿١٦﴾ ﴿وَمَا تِلۡكَ بِيَمِينِكَ
يَٰمُوسَىٰ﴾ (خـوا فەرمووی) ئەی مووسـا ئەوە چیە بەدەستی ڕاستەوە ﴿١٧﴾ ﴿قَالَ هِيَ عَصَايَ﴾ (مووسـا)
فەرمـووی ئەوە گۆچانەکەمە ﴿أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيۡهَا﴾ خۆم دەدەم بەسـەریدا (کاتی ڕۆیشـتن) ﴿وَأَهُشُّ بِهَا
عَلَىٰ غَنَمِي﴾ گەڵای درەختی پێ دەوەرێنم بۆ مەڕەکانم ﴿وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخۡرَىٰ﴾ وە چەند کارو پێویستی
تـری پـێ دەکـەم ﴿١٨﴾ ﴿قَالَ أَلۡقِهَا يَٰمُوسَىٰ﴾ (خـوا) فەرمـووی ئەی مووسـا گۆچانەکـەت فـڕێ بدە ﴿١٩﴾
﴿فَأَلۡقَىٰهَا﴾ جـا ئەویـش فڕێـی دا ﴿فَإِذَا هِيَ حَيَّةٞ تَسۡعَىٰ﴾ دەسـت بەجـێ گۆچانەکـە بـووە بـە مارێـك
بەخێرایی دەڕۆیشت (مووسا ترسا) ﴿٢٠﴾ ﴿قَالَ﴾ (خوای گەورە) فەرمووی ﴿خُذۡهَا وَلَا تَخَفۡ﴾ بیگرەو
مەترسـە ﴿سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلۡأُولَىٰ﴾ دڵنیابـە دەی گێڕینەوە بۆ شـێوەکەی یەکەم جـاری (دەیکەینەوە
بەگۆچان) ﴿٢١﴾ ﴿وَٱضۡمُمۡ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ﴾ دەسـتت بخەرە بن باڵـت (پاشـان دەری بێنە) ﴿تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ﴾
کـە دەردێت سـپییە (وەك کافور دەدرەوشـێتەوە) ﴿مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ﴾ بـێ ئەوەی بەڵەکی و نەخۆشـی بێت
﴿ءَايَةً أُخۡرَىٰ﴾ (ئەمـەش) موعجیزەیەکی ترە (جگە لـە گۆچانەکەت) ﴿٢٢﴾ ﴿لِنُرِيَكَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا ٱلۡكُبۡرَى﴾ بۆ
ئەوەی هەندێ لەموعجیزەو بەڵگە گەورەکانی خۆمانت پیشـان بدەین ﴿٢٣﴾ ﴿ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ﴾ بڕۆ بۆ
لای فیرعـەون ﴿إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ چونکـە بەڕاسـتی لەسـنوور دەرچووە ویاخی بـووە ﴿٢٤﴾ ﴿قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي
صَدۡرِي﴾ (مووسـا) ووتـی پەروەردگـارم سـنگم (دڵ و دەرونـم) فـراوان بکـە ﴿٢٥﴾ ﴿وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي﴾
وە ئیش و کارم بۆ ئاسان بکە ﴿٢٦﴾ ﴿وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي﴾ و گرێی زمانیشم بەرەڵا بکە ﴿٢٧﴾ ﴿يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي﴾
بـۆ ئەوەی لە قسـەکانم تێبگـەن ﴿٢٨﴾ ﴿وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي﴾ وە لەخزم و کەسـی خۆم کەسـێك بکەرە
پشـتیوانم ﴿٢٩﴾ ﴿هَٰرُونَ أَخِي﴾ کـە هاروونـی برامـە ﴿٣٠﴾ ﴿ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي﴾ پشـتمی پـێ قایـم و بەهێز بکە
﴿٣١﴾ ﴿وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي﴾ بیکـەرە هاوبەشـم لەکارەکەمـدا (گەیاندنـی پەیامـی خـوا) ﴿٣٢﴾ ﴿كَيۡ نُسَبِّحَكَ
كَثِيرٗا﴾ بـۆ ئـەوەی زۆرستایشـت بکەین ﴿٣٣﴾ ﴿وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا﴾ وە یاد و زیکـری زۆرت بکەین ﴿٣٤﴾ ﴿إِنَّكَ
كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا﴾ بەڕاسـتی تۆ بینای بە (هەموو شتێکی) ئێمە ﴿٣٥﴾ ﴿قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ (خوای
گـەورە) فەرمـووی بەڕاسـتی ئـەوەی داوات کـرد پێـت درا ئـەی مووسـا ﴿٣٦﴾ ﴿وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَيۡكَ مَرَّةً
أُخۡرَىٰٓ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە جارێکی تر منەتمان ناوەتە سەرت ﴿٣٧﴾

﴿إِذۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ﴾ كاتێ ئێمە ئاگاداری دایكتمان كرد ﴿مَا يُوحَىٰٓ﴾ ئەوەی پێویست بوو ئاگادار بكرێت ﴿٣٨﴾
﴿أَنِ ٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلتَّابُوتِ﴾ كە ئەو (مووسای شیرەخۆرە) بخەرە ناو سندوقێكەوە ﴿فَٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ﴾ ئەمجا فڕێی دەرە
دەریاوە ﴿فَلۡيُلۡقِهِ ٱلۡيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ﴾ جا بادەریاش بیباتە كەناری ئاوەكە ﴿يَأۡخُذۡهُ عَدُوّٞ لِّي وَعَدُوّٞ لَّهُۥۚ﴾ (لە ئاكامدا) دوژمنی
من و دوژمنی ئەو (كەفیرعەونە) بگرێتەوە ﴿وَأَلۡقَيۡتُ عَلَيۡكَ مَحَبَّةٗ مِّنِّي﴾ لەلایەن خۆمەوە جۆرە خۆشەویستییەكم
پێدایت ﴿وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ﴾ بۆ ئەوەی پەروەردە بكرێیت لە پێش چاوی خۆم (بە چاودێری و پارێزگاری خۆم) ﴿٣٩﴾
﴿إِذۡ تَمۡشِيٓ أُخۡتُكَ﴾ (لەبیرت بێ) كاتێ كە خوشكەكەت دەڕۆیشت ﴿فَتَقُولُ﴾ و دەیووت (بە فیرعەون و دەستەكەی
كە مووسا دەگریا و شیری هیچ ئافرەتێكی نەدەخوارد) ﴿هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ مَن يَكۡفُلُهُۥۖ﴾ كەسێكتان نیشان بدەم كە بەخێوی
كات وبیگرێتە ئەستۆ ﴿فَرَجَعۡنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ﴾ بەو هۆیەوە تۆمان گێڕایەوە بۆ لای دایكت ﴿كَيۡ تَقَرَّ عَيۡنُهَا وَلَا تَحۡزَنَۚ﴾ تا چاو
ودڵی گەش بێتەوەو خەفەت نەخوات ﴿وَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا﴾ وە كەسێكت كوشت (لە تاقمی فیرعەون) ﴿فَنَجَّيۡنَٰكَ مِنَ ٱلۡغَمِّ﴾
بەڵام ئێمە ڕزگارمان كردی لەو غەم وپەژارەیە ﴿وَفَتَنَّٰكَ فُتُونٗاۚ﴾ وە دووچاری چەندەها تاقی كردنەوەمان كردی
﴿فَلَبِثۡتَ سِنِينَ﴾ ئەمجا چەند ساڵێك مایتەوە ﴿فِيٓ أَهۡلِ مَدۡيَنَ﴾ لەناو خەڵكی مەدیەندا ﴿ثُمَّ جِئۡتَ عَلَىٰ قَدَرٖ يَٰمُوسَىٰ﴾ پاشان
ئەی مووسا لە كاتی دیاری كراودا (بۆ پێغەمبەرایەتی) هاتوویتە ئێرە ﴿٤٠﴾ ﴿وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي﴾ وە تۆم هەڵبژارد بۆ
خۆم (تاكو پێغەمبەر بیت و پەیامی من ڕاگەیەنیت) ﴿٤١﴾ ﴿ٱذۡهَبۡ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِي﴾ بڕۆ خۆت و براكەت بە بەڵگە
و موعجیزەكانمەوە ﴿وَلَا تَنِيَا فِي ذِكۡرِي﴾ سستی نەكەن لە زیكر و یادی مندا ﴿٤٢﴾ ﴿ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ﴾ هەردووكتان
بڕۆن بۆلای فیرعەون ﴿إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ چونكە بەڕاستی لەسنوور دەرچووە و یاخی بووە ﴿٤٣﴾ ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا﴾
جا قسەی لەگەڵ بكەن بە نەرم و نیانی ﴿لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ﴾ بەڵكو بیربكاتەوە یا بترسێ (لە سزای خوا) ﴿٤٤﴾ ﴿قَالَا
رَبَّنَآ﴾ هەردووكیان ووتیان ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنَّنَا نَخَافُ﴾ بەڕاستی ئێمە دەترسین ﴿أَن يَفۡرُطَ عَلَيۡنَآ﴾
دەس درێژی بكاتە سەرمان پێش ئەوەی ئێمە هیچ بڵێین ﴿أَوۡ أَن يَطۡغَىٰ﴾ یان زیاتر یاخی و سەركەش ببێت ﴿٤٥﴾
﴿قَالَ لَا تَخَافَآۖ﴾ (خوا) فەرمووی مەترسن ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ﴾ بەڕاستی من لەگەڵتانام ﴿أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ﴾ دەبیستم و دەبینم ﴿٤٦﴾
﴿فَأۡتِيَاهُ فَقُولَآ﴾ كەوابوو بچنە لای و (پێی) بڵێن ﴿إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ﴾ بێگومان ئێمە هەردووك نێرراوی پەروەردگاری
تۆین (بۆ سەر تۆ) ﴿فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ جا واز لە بەنی ئیسرائیل بهێنە (با بێن) لەگەڵ ئێمەدا ﴿وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡۖ﴾
وە ئازار و سزایان مەدە ﴿قَدۡ جِئۡنَٰكَ بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكَۖ﴾ بەڕاستی ئێمە لە لایەن پەروەردگارتەوە بەڵگەو موعجیزەمان بۆ هێناوی
﴿وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلۡهُدَىٰٓ﴾ سڵاویش لەسەر كەسێك بێت كە شوێن ڕێگای ڕاستی دەكەوێ ﴿٤٧﴾ ﴿إِنَّا قَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡنَآ﴾
بەڕاستی ئێمە نیگامان بۆ كراوە ﴿أَنَّ ٱلۡعَذَابَ﴾ كە بێگومان سزا ﴿عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ بۆ كەسێكە (پێغەمبەران) بەدرۆ
دەزانێ و ڕوو وەردەگێڕێت (وباوەڕ ناهێنێ) ﴿٤٨﴾ ﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ﴾ (فیرعەون) ووتی باشە مووسا پەروەردگاری
هەردووكتان كێ یە؟ ﴿٤٩﴾ ﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ﴾ (مووسا) فەرمووی پەروەردگاری ئێمە ئەو زاتەیە كەهەموو
شتێكی بەشێوەیەكی ڕێك وپێك وجوان دروستكردووە ﴿ثُمَّ هَدَىٰ﴾ پاشان ڕێنموونیشی كردووە (بۆ كاری خۆی) ﴿٥٠﴾
﴿قَالَ فَمَا بَالُ ٱلۡقُرُونِ ٱلۡأُولَىٰ﴾ (فیرعەون) ووتی ئەی خەڵكانی سەردەمە پێشووەكان حاڵیان چییەو چۆنە (لە پاشی
مردنیان) ﴿٥١﴾

﴿قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي﴾ (مووسا) فەرمووی زانیاری ئەوە لای پەروەردگارمە ﴿فِي كِتَٰبٍ﴾ لە پەراوێکدایە
﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾ پەروەردگارم هیچی لێ وون نابێ و هیچی لەبیر ناچێ ﴿٥٢﴾ ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا﴾
(پەروەردگارم) زاتێکە کە زەوی بۆ کردونەتە شوێنی حەسانەوە (وەکو بێشکە) ﴿وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾
وە لەناوییدا چەندەها ڕێگای بۆ فەراهەم هێناون ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ وە لەئاسمانەوە باران دەبارێنێ
(بۆتان) ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ﴾ جا بەو بارانەی ڕواندومانە ﴿أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ﴾ زۆر جوتی جۆراو جۆر لەڕووەك
(کە جیاوازن لە تام و بۆن و ڕەنگ و شێوەدا) ﴿٥٣﴾ ﴿كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَٰمَكُمْ﴾ (ئەی مرۆڤەکان) بخۆن و ئاژەڵ
ومالاتەکانیشتان بلەوەڕێنن ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەوەدا (کە باسکرا) ﴿لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِي ٱلنُّهَىٰ﴾ بەڵگە و نیشانەی
زۆر هەیە بۆ ئەوانەی خاوەنی ژیرین ﴿٥٤﴾ ﴿مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ﴾ لەم زەویە دروستمان کردون ﴿وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ﴾
دووبارە دەتانگێڕینەوە ناو زەوی (بەمردوویی) ﴿وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ﴾ جارێکی تر لەو زەوییە دەرتان
دێنینەوە (بەزیندوویی بۆ لێپرسینەوە) ﴿٥٥﴾ ﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە هەموو
بەڵگەو نیشانەکانی خۆمان نیشان فیرعەون دا ﴿فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ﴾ کەچی باوەڕی نەهێناو سەرپێچی کرد ﴿٥٦﴾
﴿قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا﴾ (فیرعەون) ووتی هاتوویت بۆ ناومان بۆ ئەوەی دەرمان کەیت ﴿مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾
لەخاکەکەمان بەجادوو گەریەکەت ئەی مووسا ﴿٥٧﴾ ﴿فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ﴾ سوێندبێ جادویەکت بۆ (بەکار)
بێنین ﴿مِّثْلِهِۦ﴾ وەك ئەو (جادووەی خۆت) ﴿فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا﴾ جا شوێن و کاتێك لە نێوان ئێمە
و خۆتدا دابنێ ﴿لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ﴾ نە ئێمە و نەتۆ خۆمانی لێ نەبوێرین ﴿مَكَانًا سُوًى﴾ (با) جێگایەکی
تەخت بێ ﴿٥٨﴾ ﴿قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ﴾ (مووسا) فەرمووی کاتی دیارکراوتان ڕۆژی خۆڕازاندنەوە
(ڕۆژی جەژن) بێت ﴿وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى﴾ بەمەرجێ لە کاتی چێشتەنگاودا خەڵکی کۆبکرێنەوە ﴿٥٩﴾
﴿فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ﴾ ئەمجا فیرعەون ڕۆیشت لەو جێگایە ﴿فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ﴾ وهەمووجادوو گەرەکانی کۆکردەوە
﴿ثُمَّ أَتَىٰ﴾ پاشان هات (بۆ شوێنی دیاری کراو) ﴿٦٠﴾ ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ﴾ مووسا بە جادوو گەرانی ووت
﴿وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ هاوار بۆ ئێوە درۆ بەدەم خواوە نەکەن ﴿فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ﴾ ئەگینا بەسزایەك
لەناوتان دەبات ﴿وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ﴾ بەڕاستی هەر کەسێ درۆ هەڵبەستێ بەدەم خواوە ڕەنجە ڕۆ دەبێت
﴿٦١﴾ ﴿فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ﴾ ئەمجا (جادوو گەرەکان) سەبارەت بەکارەکەیان لە نێوانیان دا جیاوازی پەیدا
بوو ﴿وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ﴾ و بەنهێنی چرپەیان دەکرد ﴿٦٢﴾ ﴿قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ﴾ ووتیان بەڕاستی ئەمانە دوو
جادووگەرن ﴿يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم﴾ دەیانەوێ دەرتان پەڕێنن ﴿مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا﴾ لە خاك و وولاتەکەتان
بە جادووەکەیان ﴿وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ﴾ وە ڕێباز و نەریتە هەرە باشەکەتان لەناو بەرن ﴿٦٣﴾ ﴿فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ﴾
جا کەواتە هەموو جادوو و پیلانێکتان کۆبکەنەوە ﴿ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا﴾ پاشان بە یەك ڕیز بێنە (گۆڕەپانەوە)
﴿وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ﴾ بەڕاستی هەرکەسێ ئەمڕۆ سەرکەوێ ڕزگاری دەبێ و سەرفرازە ﴿٦٤﴾

﴿قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ (ساحیرەکان) ووتیان ئەی مووسا ﴿إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ﴾ یاتۆ (چادووەکەت) فڕێ بدە ﴿وَإِمَّآ
أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ﴾ یا ئێمە لەسەرەتاوە فڕێ ی دەدەین ٦٥ ﴿قَالَ بَلۡ أَلۡقُواْۖ﴾ (مووسا) فەرمووی نەخێر
ئێوە (لەپێشەوە) فڕێ ی بدەن ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ﴾ (ئەوانیش فڕێیاندا) جا لەناکاودا گوریس و دار
دەستەکانیان ﴿يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ﴾ وەها هاتە پێش چاوی (مووسا) بەهۆی جادووەکەیانەوە
کەبەڕاستی دەجولێن و دەڕۆن ٦٦ ﴿فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ﴾ جا مووسا لەدڵی خۆیدا کەمێ ترسا ٦٧
﴿قُلۡنَا لَا تَخَفۡ﴾ ووتمان پێی مەترسەو بێ باك بە ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾ بێگومان هەر تۆ سەرکەوتوو دەبی ٦٨
﴿وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ﴾ ئەوەی لەدەستی ڕاستتدایە (کەگۆچانەکەتە) فڕێی بدە ﴿تَلۡقَفۡ مَا صَنَعُوٓاْۖ﴾ هەرچی
(جادوو) ئەوان کردوویانە قوتی دەدات (هەڵی دەلوشێ) ﴿إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيۡدُ سَٰحِرٖۖ﴾ بێگومان ئەوەی ئەوانە
کردوویانە تەنها فڕوفێڵی جادوو بازە ﴿وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ﴾ جادوو بازیش سەرکەوتوو نابێ لەهەر
کوێ وەهاتبێ (هەرچی بکات) ٦٩ ﴿فَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدٗا﴾ ئەوسا جادووگەرەکان خران بەڕوودا بەسوژدە
بردنەوە (بۆ خوا) ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ﴾ ووتیان بڕوامان هێنا بەپەروەردگاری هاروون و مووسا ٧٠
﴿قَالَ﴾ (فیرعەون) ووتی پێیان ﴿ءَامَنتُمۡ لَهُۥ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ﴾ ئایا ئێوە بڕواتان پێ هێنا پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم
﴿إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي﴾ بێگومان ئەو مووسا گەورەتانە ﴿عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحۡرَۖ﴾ کەفێری جادووی کردوون
﴿فَلَأُقَطِّعَنَّ﴾ جا سوێند بێت دەیبڕم (دەیقرتێنم) ﴿أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ﴾ دەست و قاچتان بەپێچەوانەوە
(ڕاست و چەپ) ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ﴾ وەبێگومان بەقەدی دارخورمادا هەڵتان دەواسم (دەتانکەم
بە دارا) ﴿وَلَتَعۡلَمُنَّ﴾ (ئەوسا) بەڕاستی دەزانن ﴿أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ﴾ کاممان (من یان خواکەی مووسا)
سزامان سەخترو بەردەوام ترە ٧١ ﴿قَالُواْ لَن نُّؤۡثِرَكَ﴾ (ساحیرەکان) ووتیان ئێمە هەرگیز تۆ هەڵنابژێرین
﴿عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ بەسەر ئەو نیشانەو موعجیزانەدا کەبۆمان هاتووە ﴿وَٱلَّذِي فَطَرَنَاۖ﴾ (وە تۆ هەڵنابژێرین
بەسەر) ئەو خوایەی کە لەنەبوون ئێمەی دروست کردووە ﴿فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ﴾ جا هەر چیت لەدەست
دێت بیکە ﴿إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ﴾ بێگومان تۆ تەنها لەم ژیانی دونیا دەست دەڕواو بڕیار دەدەیت ٧٢
﴿إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا﴾ بەڕاستی ئێمە باوەڕمان هێنا بەپەروەردگارمان ﴿لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا﴾ بۆ ئەوەی لەتاوانەکانمان
خۆش ببێت ﴿وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِۗ﴾ هەروەها لەو جادووەش کە بەزۆر پێت دەکردین ﴿وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ﴾
وەخوای گەورە (پاداشتی) چاکترەو بەردەوامترە ٧٣ ﴿إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ﴾ بەڕاستی هەر کەسێ بگەڕێتەوە لای
پەروەردگاری ﴿مُجۡرِمٗا﴾ بەتاوانباری ﴿فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ﴾ ئەوە بێگومان دۆزەخ جێگایەتی ﴿لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ﴾
نەدەمرێ تێیدا نەدەژی (بەئاسوودەیی) ٧٤ ﴿وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا﴾ وە ئەو کەسەی بەباوەڕداری بگەڕێتەوە
لای (خوای گەورە) ﴿قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەڕاستی کردەوەی چاکیشی کردبێ ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ﴾
ئائەوانە پلەو پایەی بەرزو بڵندیان هەیە ٧٥ ﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٖ﴾ کە بەهەشتانێکە جێگای مانەوەی هەمەمیشەییە
﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ ڕووبارەکان دەڕۆن بە ژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ بێ بڕانەوە دەمێننەوە تێیدا ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ
مَن تَزَكَّىٰ﴾ ئەوە پاداشتی کەسێکە خۆی پاك و خاوێن ڕابگرێ (لە کوفر و تاوان) ٧٦

﴿وَلَقَدۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ﴾ بەڕاستی نیگامان نارد بۆ مووسا ﴿أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي﴾ کە بەندەکانم بە شەو
ببە (و لە میصر دەرچن) ﴿فَٱضۡرِبۡ لَهُمۡ طَرِيقٗا فِي ٱلۡبَحۡرِ يَبَسٗا﴾ ڕێگەیەکی ووشکیان لە دەریای (سوور)
دا بۆ بکەرەوە ﴿لَّا تَخَٰفُ دَرَكٗا﴾ مەترسە (فیرعەون) پێت بگات ﴿وَلَا تَخۡشَىٰ﴾ وە مەترسە (لەخنکان
لەدەریادا) ﴿٧٧﴾ ﴿فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ بِجُنُودِهِۦ﴾ ئەمجا فیرعەون بە سەربازەکانیەوە شوێنیان کەوتن
﴿فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ﴾ جا لە ناکاو دەریا ئەوانی (لەناو شەپۆلی خۆیدا) داپۆشی چ
داپۆشینێك ﴿٧٨﴾ ﴿وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ﴾ فیرعەون گەلەکەی خۆی گومڕا کرد ﴿وَمَا هَدَىٰ﴾ و ڕێنموونیی
نەکردن ﴿٧٩﴾ ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل ﴿قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ﴾ بەڕاستی ڕزگارمان کردن
لەدوژمنەکەتان ﴿وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ﴾ وە بەڵێنمان پێدان ﴿جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ﴾ (بەهاتنی موسا بۆ) لای ڕاستی
کێوی طور ﴿وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ﴾ و بۆمان ناردن ﴿ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ﴾ گەزۆ و شێلاقە (باڵندەیەکە گۆشتی لە
هەموو باڵندەیەك خۆشترە) ﴿٨٠﴾ ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ﴾ بخۆن لەو ڕۆزیە پاکانەی پێمان داون
﴿وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ﴾ و زیادە ڕۆی تێدا مەکەن ﴿فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ﴾ ئەگینا خەشم و قاری من دەتانگرێتەوە
﴿وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي﴾ جا هەر کەسێك قار و خەشمی من دایگرێ ﴿فَقَدۡ هَوَىٰ﴾ ئەوە بێگومان تیاچووەو
هەڵدێراوە ﴿٨١﴾ ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ﴾ وە بەڕاستی من زۆر لێبووردوم لەو کەسەی تەوبەی کردبێ
﴿وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾ و باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێت ﴿ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ﴾ پاشان بەردەوام
بوبێ لەسەر ئەو ڕێبازە ﴿٨٢﴾ ﴿وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ (خوا فەرمووی) ئەی مووسا بۆ چی
پێش گەلەکەت کەوتی (بۆ گەیشتن بە کێوی طور) ﴿٨٣﴾ ﴿قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي﴾ (مووسا) فەرمووی
گەلەکەم ئەوانەن بە دوامەوەن ﴿وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ﴾ بۆیە بەپەلە هاتم بۆ لات ئەی پەروەردگارم
﴿لِتَرۡضَىٰ﴾ بۆ ئەوەی لێم ڕازی بیت ﴿٨٤﴾ ﴿قَالَ﴾ (خوای گەورە) فەرمووی ﴿فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ﴾
جا بەڕاستی ئێمە قەومەکەتمان تاقی کردەوە ﴿مِنۢ بَعۡدِكَ﴾ لەپاش (هاتنی) تۆ ﴿وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ﴾
وە سامیری گومڕای کردن ﴿٨٥﴾ ﴿فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ﴾ ئەمجا (پاش وەرگرتنی تەورات) مووسا گەڕایەوە
بۆ لای گەلەکەی ﴿غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ﴾ بە توورەیی و قار و خەشمەوە ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ﴾ ووتی ئەی گەلەکەم
﴿أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ﴾ ئایا پەروەردگارتان بەڵێنی پێ نەدان ﴿وَعۡدًا حَسَنًاۚ﴾ بە بەڵێنی چاك ﴿أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ﴾
بۆچی من زۆرم پێ چوو ﴿أَمۡ أَرَدتُّمۡ﴾ یان هەر ویستتان ﴿أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ تورەیی
وخەشم لەلایەن پەروەردگارتانەوە یەختان بگرێت ﴿فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي﴾ بۆیە بەڵێنی منتان شکاند
﴿٨٦﴾ ﴿قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ﴾ ووتیان ئێمە بەڵێنەکەی تۆمان نەشکاند ﴿بِمَلۡكِنَا﴾ بەویست و دەسەڵاتی
خۆمان ﴿وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا﴾ بەڵکو ئێمە چەند کۆڵ و باری درابوو بەکۆڵماندا ﴿مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ﴾
لەخشڵی قیبتییەکان ﴿فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ﴾ جا فڕێماندایە (ناو ئاگرەوە) هەروەها سامیریش
فڕێی دا ﴿٨٧﴾

﴿فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا﴾ ئیتر (سامیری لەو خشڵە تواوانە) پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ دروست کردن
﴿لَّهُۥ خُوَارٌ﴾ بۆڕەیەکی هەبوو (وەك بۆڕەی گوێرەکە) ﴿فَقَالُوا۟﴾ ئەمجا ووتیان ﴿هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ
مُوسَىٰ﴾ ئەمە خوای ئێوەو خوای مووساشە ﴿فَنَسِىَ﴾ ئەوە (مووسا) لەبیری چووە (دەگەڕێ بەشوێن
خوادا) ﴿٨٨﴾ ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ﴾ ئایا ئەوان نازانن (نابینن) ﴿أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا﴾ (ئەو گوێرەکەیە) وەڵامی
هیچ ووتەیەکیان ناداتەوە ﴿وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا﴾ وەخاوەنی هیچ زیان و قازانجێك نییە بۆیان
﴿٨٩﴾ ﴿وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی هاروون پێی ووتن ﴿مِن قَبْلُ﴾ لەوەو پێش
﴿يَٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ﴾ بێگومان ئێوە بەم (گوێرەکەیە) تاقی کرانەوە (گومڕا بوون)
﴿وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە خوای میهرەبانە ﴿فَٱتَّبِعُونِى﴾ کەواتە شوێنی من
بکەون ﴿وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى﴾ گوێڕایەڵی فەرمانی من بن ﴿٩٠﴾ ﴿قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ﴾ ووتیان هەرگیز واز
ناهێنین و بەدەوریدا دێین و دەیپەرستین ﴿حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ﴾ هەتا مووسا دەگەڕێتەوە بۆ لامان
﴿٩١﴾ ﴿قَالَ يَٰهَٰرُونُ﴾ (مووسا) ووتی ئەی هارون ﴿مَا مَنَعَكَ﴾ چ شتێك بەرگری کردیت ﴿إِذْ رَأَيْتَهُمْ
ضَلُّوٓا۟﴾ کاتێ بینیت ئەمانە گومڕا بوون ﴿٩٢﴾ ﴿أَلَّا تَتَّبِعَنِ﴾ (لەوەی) کەشوێن من بکەوی ﴿أَفَعَصَيْتَ
أَمْرِى﴾ ئایا سەرپێچی فەرمانی منت کرد؟ ﴿٩٣﴾ ﴿قَالَ يَبْنَؤُمَّ﴾ (هاروون) فەرمووی ئەی کوڕی دایکم
﴿لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ﴾ موی ڕیش و سەرم مەگرە و ڕایمەکێشە ﴿إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ﴾ بەڕاستی ترسام
کە (هاتیتەوە پێم) بڵێیت ﴿فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ تۆ جیاوازیت خستە نێوان بەنی ئیسرائیلیەکانەوە ﴿وَلَمْ
تَرْقُبْ قَوْلِى﴾ و چاوەڕوانی فەرمانی منت نەکرد ﴿٩٤﴾ ﴿قَالَ﴾ (مووسا) ووتی ﴿فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِىُّ﴾
ئەی سامری تۆ ئەم کارە ترسناکە چی بوو کردت؟ ﴿٩٥﴾ ﴿قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ﴾ (سامیری)
ووتی من شتێکم زانی ئەوان نەیانزانی (یامن شتێکم بینی ئەوان نەیان بینی) ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ
ٱلرَّسُولِ﴾ ئەمجا من مشتێکم لەشوێن پێی (وولاخەکەی) جوبرەئیل هەڵگرت ﴿فَنَبَذْتُهَا﴾ وە
پرژاندم (بەخشڵە تواوەکەدا) ﴿وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى﴾ بەو جۆرە نەفسم ئەو کارەی بۆ جوان و
شیرین کردم ﴿٩٦﴾ ﴿قَالَ فَٱذْهَبْ﴾ (مووسا) ووتی دەبڕۆ ﴿فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ﴾ ئەوسا بێگومان
تاماوی لەم ژیانەدا (هەر کەس لێت نزیك بویەوە) دەبێ بڵێیت: ﴿لَا مِسَاسَ﴾ نزیکم مەکەوەرەوە،
ودەستم لێ مەدە ﴿وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ﴾ وەبێگومان بەڵێنێکیشت هەیە (لەڕۆژی دواییدا) هەرگیز
ڕزگار نابیت لێی ﴿وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ﴾ وەسەیری پەرستراوەکەشت کە ﴿ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا﴾
کەبەردەوام دەتپەرست ﴿لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ﴾ دڵنیابە چاك دەیسوتێنین ﴿ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ﴾ پاشان بێگومان
(خۆڵەمێشەکەش) پرژو بڵاو دەکەینەوە بەدەریادا ﴿نَسْفًا﴾ بەپرژو بڵاوێکی وەها (کە شوێنەواریشی
نەمێنێت) ﴿٩٧﴾ ﴿إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ﴾ پەرستراوی (ڕاستەقینەی) ئێوە تەنها خوایە ﴿ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾
کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە ئەو نەبێت ﴿وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا﴾ زانیاری ئەو هەموو شتێکی
گرتۆتەوە ﴿٩٨﴾

﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيۡكَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) ئا بەو جۆرە دەیگێڕینەوە بۆت ﴿مِنۡ أَنۢبَآءِ مَا قَدۡ سَبَقَ﴾ هەندێك
لەبەسەرهات و هەواڵی ئەو (گەلانەی) ڕابوردون ﴿وَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ﴾ بێگومان پێمان داویت ﴿مِن لَّدُنَّا
ذِكۡرٗا﴾ لەلایەن خۆمانەوە قورئان ﴿٩٩﴾ ﴿مَّنۡ أَعۡرَضَ عَنۡهُ﴾ هەر کەسێ پشتی تێ بکات ﴿فَإِنَّهُۥ يَحۡمِلُ﴾
ئەوە بەڕاستی هەڵیدەگرێ ﴿يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا ﴿وِزۡرًا﴾ بارێکی قورس (لەتاوان) ﴿١٠٠﴾
﴿خَٰلِدِينَ فِيهِۖ﴾ بێ بڕانەوە تێیدا دەمێننەوە ﴿وَسَآءَ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ حِمۡلٗا﴾ چ بارێکی خراپ و بێفەڕیان بەکۆڵەوەیە
لەڕۆژی دواییدا ﴿١٠١﴾ ﴿يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ﴾ ئەو ڕۆژەی کە فوو دەکرێ بەشەیپوردا (بۆ جاری دووەم)
﴿وَنَحۡشُرُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ ئەوسا تاوان باران کۆدەکەینەوە ﴿يَوۡمَئِذٖ زُرۡقٗا﴾ لەو ڕۆژەدا لەش و چاویان شین هەڵگەڕاوە
﴿١٠٢﴾ ﴿يَتَخَٰفَتُونَ بَيۡنَهُمۡ﴾ بەچرپەوە لەنێوان خۆیاندا دەڵێن ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرٗا﴾ ئێوە تەنها دە (شەوو ڕۆژ لەدونیادا)
ماونەتەوە ﴿١٠٣﴾ ﴿نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَ﴾ ئێمە چاك دەزانین بەوەی ئەوان دەیڵێن ﴿إِذۡ يَقُولُ أَمۡثَلُهُمۡ طَرِيقَةً﴾ کاتێ
(ئەوەیان) کە ژیرتریانە و نزیك تریانە لەڕاستییەوە دەڵێ ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡمٗا﴾ ئێوە تەنها یەك ڕۆژ ماونەتەوە
﴿١٠٤﴾ ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡجِبَالِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بەشاخەکان ﴿فَقُلۡ يَنسِفُهَا
رَبِّي نَسۡفٗا﴾ تۆش بڵێ پەروەردگار لەبێخیان دێنێ و وردو خاشیان دەکات ئەمجا باپرژو بڵاویان دەکاتەوە ﴿١٠٥﴾
﴿فَيَذَرُهَا قَاعٗا صَفۡصَفٗا﴾ ئەمجا ڕێك و ساف بێ ئاوو گژو گیاو دەیهێڵێتەوە ﴿١٠٦﴾ ﴿لَّا تَرَىٰ فِيهَا﴾ نابینی تێیدا
﴿عِوَجٗا وَلَآ أَمۡتٗا﴾ هیچ جۆرە لاری و بەرزی و نزمییەك ﴿١٠٧﴾ ﴿يَوۡمَئِذٖ﴾ لەو ڕۆژەدا ﴿يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِيَ﴾ هەموو
دەکەونە شوێن جاڕدەری (کۆکردنەوە) ﴿لَا عِوَجَ لَهُۥۖ﴾ لارە جڵەوی ناکەن لەفەرمانی ﴿وَخَشَعَتِ ٱلۡأَصۡوَاتُ لِلرَّحۡمَٰنِ﴾
لەترسی خوای میهرەبان هەموو دەنگەکان نزم دەبن ﴿فَلَا تَسۡمَعُ إِلَّا هَمۡسٗا﴾ چپەچپ نەبێ شتێك نابیستی ﴿١٠٨﴾
﴿يَوۡمَئِذٖ﴾ ئا لەو ڕۆژەدا ﴿لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ﴾ تکا کردن سوودی نیە ﴿إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ مەگەر کەسێ خوای
میهرەبان ڕێگای بدات ﴿وَرَضِيَ لَهُۥ قَوۡلٗا﴾ و لەووتەکەشی ڕازی بێ ﴿١٠٩﴾ ﴿يَعۡلَمُ﴾ (خوا) دەزانێ و ئاگادارە
﴿مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ﴾ بەهەموو ئەو شتانەی لەپێشیانەوەیە (لەقیامەتدا چاوەڕێیانە) ﴿وَمَا خَلۡفَهُمۡ﴾ وە بەهەموو
ئەو شتانە لەپاشیانەوەیە (لە دونیادا کردوویانە) ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا﴾ بەلام ئەوان دەربارەی خوا هەموو
شتێك نازانن ﴿١١٠﴾ ﴿وَعَنَتِ ٱلۡوُجُوهُ﴾ هەموو دەم و چاوەکان (لەڕۆژی قیامەتدا) مل کەچ و فەرمانبەردارن ﴿لِلۡحَيِّ
ٱلۡقَيُّومِۖ﴾ بۆ (خوای) هەمیشە زیندوو و ڕاگری بوونەوەرە ﴿وَقَدۡ خَابَ﴾ بێگومان زەرەرمەند بووە ﴿مَنۡ حَمَلَ
ظُلۡمٗا﴾ ئەوەی کەباری ستەمی هەڵگرتبێ ﴿١١١﴾ ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوەش کردەوە چاکەکانی کردبێت
﴿وَهُوَ مُؤۡمِنٞ﴾ باوەڕداریش بوو بێت ﴿فَلَا يَخَافُ ظُلۡمٗا﴾ ئەوە نەلە ستەم دەترسێ (لێی بکرێ) ﴿وَلَا هَضۡمٗا﴾
نەلە کەم کردنەوەی پاداشتی (دەترسێ) ﴿١١٢﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ﴾ ئابەو جۆرە ﴿أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا﴾ قورئانێکی عەرەبیمان
دابەزاندووە ﴿وَصَرَّفۡنَا فِيهِ مِنَ ٱلۡوَعِيدِ﴾ بە چەند جۆر و شێواز هەڕەشەمان لەودا باسکردووە ﴿لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ﴾
بۆ ئەوەی لە خوا بترسن و خۆیان بپارێزن (لە تاوان) ﴿أَوۡ يُحۡدِثُ لَهُمۡ ذِكۡرٗا﴾ یان ببێت بەهۆی بیدارکردنەوەیان
لەغەفڵەت وبێ ئاگایی (بەهۆی قورئانەوە) ﴿١١٣﴾

﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ﴾ ئەمجا بەرزو بڵندە ئەو خوایە ﴿ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّ﴾ کەدەسەلاّت داریکی (پادشایەکی) حەق و ڕاستە
﴿وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ﴾ پەلـە مەکە لە(خوێندنـی) قورئاندا ﴿مِن قَبۡلِ﴾ لەپێش ئەوەی ﴿أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥ﴾
وەحـی کردنەکەی بۆت تەواو بێت ﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا﴾ وەبڵێ ئـەی پەروەردگارم زانسـت و زانیاریم زیاد
بکە ﴿١١٤﴾ ﴿وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە پێشتر پەیمان و بەڵێنمان لەئادەم وەرگرت
(لەدرەختی قەدەغەکراو نەخوات) ﴿فَنَسِيَ﴾ بەلاّم کاری پێ نەکرد (لەبیری چوو) ﴿وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا﴾ وە ئێمە
لەودا لێبڕانمان نەدی (کە بیەوێت بێ فەرمانی خودا بکات) ﴿١١٥﴾ ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ (باسی) ئەو کاتە بکە
بەفریشـتەکانمان ووت: ﴿ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ﴾ سـوژدە بەرن بۆ ئادەم ﴿فَسَجَدُوٓاْ﴾ ئەوانیش هەموو سوژدەیان برد
﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ﴾ جگە لەشەیتان کەسەرپێچی کرد (و سوژدەی نەبرد) ﴿١١٦﴾ ﴿فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ﴾ ئەمجا ووتمان ئەی ئادەم
﴿إِنَّ هَٰذَا﴾ بەڕاسـتی ئەم (ئیبلیسە) ﴿عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ﴾ دوژمنی تۆو هاوسەرەکەتە ﴿فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ﴾
کەواتـە (ئاگاداربن) لە بەهەشـت دەرتان نەکات ﴿فَتَشۡقَىٰٓ﴾ چونکە دوو چاری ناخۆشـی و زەحمەت دەبیت
﴿١١٧﴾ ﴿إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا﴾ بێگومـان تـۆ لەو(بەهەشـتە)دا برسـیت نابـێ ﴿وَلَا تَعۡرَىٰ﴾ وڕووت و قـوت
نابـی ﴿١١٨﴾ ﴿وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا﴾ وبێگومـان لەوێـدا تینـووت نابێـت ﴿وَلَا تَضۡحَىٰ﴾ وە هەتـاوی (خـۆر) لێـت
نـادات (ئـازارت پـێ ناگەیەنـێ) ﴿١١٩﴾ ﴿فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ ئەمجا شـەیتان نیـازی خراپی خسـتە دڵیەوە
﴿قَالَ﴾ ووتـی ﴿يَٰٓـَٔادَمُ﴾ ئـەی ئادەم ﴿هَلۡ أَدُلُّكَ﴾ ئایـا نیشـانت بـدەم ﴿عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ﴾ دەرەختـی نەمـری
(هـەر کـەس لێ ی بخـوات هەرگیـز نامـرێ) ﴿وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ﴾ و موڵك و دەسـەلاّتێ هەر دوایـی نەیەت ﴿١٢٠﴾
﴿فَأَكَلَا مِنۡهَا﴾ ئەمجـا هەردووکیـان لـەو (بەروبوومـی درەختـە) یان خـوارد ﴿فَبَدَتۡ﴾ بەو هۆیـەوە (جل
وبەرگیـان دامالّـدراو) دەرکـەوت ﴿لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا﴾ عەیـب و عەورەتیـان ﴿وَطَفِقَا﴾ وەدەسـتیان کـرد
﴿يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ﴾ بە داپۆشـینی لەشـیان بەگەڵای (درەختەکانی) بەهەشت ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ﴾
وەئادەم سـەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد ﴿فَغَوَىٰ﴾ ئیتر لەڕێگای ڕاسـت لای دا ﴿١٢١﴾ ﴿ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ﴾
پاشـان پەروەردگـاری هەڵبـژارد (بـۆ پێغەمبەرێتـی) ﴿فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ﴾ وتەوبـەی لـێ قبـووڵ کـردو
ڕێنموونـی کـرد ﴿١٢٢﴾ ﴿قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا﴾ (خـوا) فەرمـووی هەردووکتـان بڕۆنە خـوارەوە لەوێ (لەبەهەشـت)
﴿جَمِيعَۢا﴾ بەیەکـەوە ﴿بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ﴾ (نەوەکانتان) دەبنـە دوژمنی یەکتری ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى﴾
جـا ئەگـەر (بەپێغەمبەرانـدا) پەیامتـان بـۆ هـات لەلایـەن منـەوە ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ﴾ ئەوسـا ئەوەی شـوێنی
ڕێنموونـی من بکـەوێ ﴿فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ﴾ ئەوە (لەدونیادا) گومڕا نابێ و (لەڕۆژی دوایشـدا) تووشـی
ناخۆشـی و زەحمەت نابـێ ﴿١٢٣﴾ ﴿وَمَنۡ أَعۡرَضَ﴾ وە هەرکەسـێ ڕوو وەرگێـڕێ ﴿عَن ذِكۡرِي﴾ لەڕێبازو یادی
مـن ﴿فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا﴾ ئـەوە بێگومـان ئـەو کەسـە گوزەرانێکـی سـەخت و تەنگـی دەبێت (لەگـۆڕدا)
﴿وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ و لـەڕۆژی دواییشـدا حەشـری دەکەیـن ﴿أَعۡمَىٰ﴾ بەکوێـری ﴿١٢٤﴾ ﴿قَالَ رَبِّ﴾ دەڵـێ ئەی
پەروەردگـارم ﴿لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ﴾ بۆچـی بە کوێری حەشـرت کردم ﴿وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا﴾ خۆ من (لـە دونیادا)
چاو ساغ و بینا بووم ﴿١٢٥﴾

﴿قَالَ كَذَٰلِكَ﴾ (خـوا) دەفەرمـویٚ هەر بەو شـێوەی ﴿أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا﴾ ئایەتەکانـی ئێمەت بۆ هـات و لەبیری خۆت
بـردەوە(و کوێـر بوویـت لەئاسـتیدا) ﴿وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ﴾ بەهەمـان شـێوە تـۆش ئەمـڕۆ گوێت پـێ نادرێـت و لەبیر
دەکرێیت ﴿١٢٦﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ﴾ وەهەر بەو جۆرە تۆڵە دەستێنین لەوەی زیادەڕۆی کردبێت ﴿وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ﴾
و بـاوەڕی نەهێنابـێ بەئایەتەکانـی پەروردگـاری ﴿وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ وە سـزای ڕۆژی دوایـی ﴿أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ﴾ بەتیـن تـرو
بـەردەوام تـرە (لەسـزای دونیا) ﴿١٢٧﴾ ﴿أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ﴾ دەی ئایا (خـوا) بۆی ڕوون نەکردوونەتـەوە ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا﴾ چەندمان
لـە نـاو برد ﴿قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ﴾ لەگەل و نـەوەی چەرخەکانی پێش ئەمان ﴿يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ﴾ کە(ئـەم بێ باوەڕانە)
دەگەڕێـن و هـات و چـۆ دەکـەن بەجـێ و شـوێنەکانیاندا ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ﴾ بەڕاسـتی لـەوەدا (کەباسـکرا) ﴿لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى
ٱلنُّهَىٰ﴾ چەنـد بەڵگـە و نیشـانەی هەیـە بـۆ ئەو کەسـانەی کەژیـرن ﴿١٢٨﴾ ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ﴾ ئەگـەر لەبـەر بەڵێـن و بڕیارێك
نەبوایـە ﴿سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ﴾ لەپەروەردگارتـەوە پێشـتر دراوە(بـۆ لەناوبردنیـان) ﴿لَكَانَ لِزَامًا﴾ بێگومـان (لەنـاو بردنی
بـێ بـاوەڕان) پێویسـت دەبـوو ﴿وَأَجَلٌ مُّسَمًّى﴾ ئەگەر مـاوەی دیـاری کراویش نەبوایـە (کەقیامەتـە) ﴿١٢٩﴾ ﴿فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا
يَقُولُونَ﴾ کەواتە(ئەی موحەممەدﷺ) ئارام بگرە لەسەر ئەوەی ئەوانە دەیڵێن ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾ بەحەمدو سوپاس وستایشی
پەروەردگارت تەسـبیحاتی خودا بکە ﴿قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ﴾ لەپێش هەڵاتنی خۆر ﴿وَقَبْلَ غُرُوبِهَا﴾ و لەپێش ئاوا بوونیـدا
﴿وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ﴾ و لەهەنـدێ کات و سـاتەکانی شـەودا خـوا بپەرسـتە و نوێـژ بکـە ﴿وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ﴾ وەلـە
سـەرەتاو کۆتایـی ڕۆژدا ﴿لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ﴾ بـۆ ئـەوەی (پاداشـتێ بدرێتـەوە) کەپێـی ڕازی بیـت ﴿١٣٠﴾ ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ﴾
تـۆ چاوەکانـت مەبـڕە ﴿إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ﴾ ئـەو نـازو نیعمەتانـەی داومانـە ﴿أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾ بەتاقـم و دەسـتەیەك لـەوان
(لەبێبـاوەڕان) ﴿زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ (چونکـە ئـەوە) زینەت و جوانی ئـەم ژیانی دونیایە ﴿لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ بـۆ ئەوەیە تاقییان
بکەینـەوە تیایـدا ﴿وَرِزْقُ رَبِّكَ﴾ دڵنیابـە ڕزق و ڕۆزی پەروەردگـارت (لـەدوا ڕۆژدا) ﴿خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ﴾ چاکتـرو بەردەوامترە
﴿١٣١﴾ ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) فەرمـان بـدە بەئەندامانـی خێزانەکـەت ﴿بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ بەنوێژ کردن،
وە خۆیشـت خۆڕاگـرو بـەردەوام بـە لەسـەر بەجـێ هێنانـی ﴿لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا﴾ ئێمـە داوای ڕۆزیـت لـێ ناکەین ﴿نَّحْنُ
نَرْزُقُكَ﴾ بەڵکـو ئێمـە ڕزق و ڕۆزی تـۆ دەدەین ﴿وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ وسـەرەنجامی چـاك بۆ پارێزکاران و خواناسـانە ﴿١٣٢﴾
﴿وَقَالُوا۟﴾ (بـێ بـاوەڕان) ووتیـان ﴿لَوْلَا يَأْتِينَا﴾ (ئەگـەر ڕاسـتە پێغەمبـەرە) دەی بـۆ بۆمـان ناهێنێ ﴿بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ﴾
بەڵگـەو موعجیزەیـەك لەلایـەن پەروەردگاریـەوە ﴿أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ﴾ ئایـا ئـەوان بەڵگـەی ئاشـکرایان بـۆ نەهاتـووە
﴿مَا فِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ﴾ کـە لەپـەڕاوە پێشـووەکاندا هەبـوو (وەك تـەورات و ئینجیـل) ﴿١٣٣﴾ ﴿وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم﴾ ئەگـەر
ئێمـە ئەوانمان لەناو ببردایە ﴿بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ﴾ بەسـزایەك پێش (ناردنی پێغەمبـەر ﷺ) ﴿لَقَالُوا۟ رَبَّنَا﴾ بێگومان (لەدوا
ڕۆژدا) دەیـان ووت ئـەی پەروەردگارمان ﴿لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا﴾ بۆچـی (لەدونیادا) پێغەمبەرێکـت بۆ نەناردین
﴿فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ﴾ تاشـوێنی بەرنامـەو ئایەتەکانـی تـۆ بکەوتینایـە ﴿مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ﴾ پێـش ئـەوەی سەرشـۆڕ و
ڕیسـوا ببیـن ﴿١٣٤﴾ ﴿قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ: هەمـوو چاوەڕوانیـن (چ لایەکمـان سـەردەکەوین)
﴿فَتَرَبَّصُوا۟﴾ دە ئێـوەش چـاوەڕوان بن ﴿فَسَتَعْلَمُونَ﴾ ئەوسـا لە ئایندەدا دەزانن ﴿مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِىِّ﴾ چ کەسـێك
خاوەنی ڕێگای ڕاستە ﴿وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ﴾ وە چ کەسێك هیدایەتی خوای وەرگرتووە ﴿١٣٥﴾

## سورەتی ﴿ ٱلۡأَنۢبِيَآءِ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ﴾ لێپرسینەوەی خەڵکی نزیك بۆتەوە ﴿وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ﴾ بەڵام ئەوان
لە بێ ئاگایی و غەفڵەتدا ﴿مُّعۡرِضُونَ﴾ پشت تێکەر و ڕوو وەرگێڕن (لە ئایینی خوا) ﴿١﴾
﴿مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ﴾ هەر پەیامێکی تازەیان لە پەروەردگاریانەوە بۆ بێت (کە قورئانە)
﴿إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ﴾ ئەوان دەیبیستن و گاڵتەی پێ دەکەن ﴿٢﴾ ﴿لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡۗ﴾ دڵەکانیان
بێ ئاگایە ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَى﴾ زۆر بە نهێنی چپەیان دەکرد ﴿ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ ئەوانەی کە ستەمیان کرد
﴿هَلۡ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡۖ﴾ (دەڵێن) ئایا ئەم (پێغەمبەر)ەش هەربەشەرێك نییە وەك ئێوە ﴿أَفَتَأۡتُونَ
ٱلسِّحۡرَ﴾ دەی ئایا ئێوە دەڕۆن بە دوای جادوودا ﴿وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ﴾ لە کاتێکدا ئێوە دەبینن (دەزانن ئەوەی
موحەممەد ﷺ دەیڵێ سیحرە) ﴿٣﴾ ﴿قَالَ﴾ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی ﴿رَبِّي يَعۡلَمُ ٱلۡقَوۡلَ﴾ پەروەردگارم
بە هەموو قسەیەك (چرپە یەك) دەزانێت ﴿فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ لە ئاسمان بێت یا لە زەوی
﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ ئەو زاتە بیسەری زانایە ﴿٤﴾ ﴿بَلۡ قَالُوٓاْ﴾ ئەوانە وتیان: نەخێر (ئەوەی موحەممەد
هێناویەتی نیگانییە) بەڵکو ﴿أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمِۭ﴾ چەند خەو بینینێکی تێکەڵ و پێکەڵی (موحەممەدە
خۆیەتی) ﴿بَلِ ٱفۡتَرَىٰهُ﴾ نا بەڵکو موحەممەد خۆی ئەم (قورئانە)ی هەڵبەستووە ﴿بَلۡ هُوَ شَاعِرٞ﴾
نابەڵکو ئەو (موحەممەدە) شاعیرە ﴿فَلۡيَأۡتِنَا بِـَٔايَةٖ﴾ دەبانیشانە و موعجیزەیەکمان بۆ بێنێ ﴿كَمَآ أُرۡسِلَ
ٱلۡأَوَّلُونَ﴾ وەك (ئەو موعجیزانەی) پێغەمبەرانی پێشووی پێ نێردرابوون ﴿٥﴾ ﴿مَآ ءَامَنَتۡ﴾ بڕوایان
نەهێنا ﴿قَبۡلَهُم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآۖ﴾ (خەڵکی) هیچ شار و گوندێك پێش ئەمان کەلەناومان بردوون
﴿أَفَهُمۡ يُؤۡمِنُونَ﴾ دەی ئایا ئەمان باوەڕ دێنن؟ ﴿٦﴾ ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا﴾ نەمان ناردووە ﴿قَبۡلَكَ﴾ پێش تۆ (ئەی
موحەممەد ﷺ) ﴿إِلَّا رِجَالٗا﴾ جگە لە پیاوانێك ﴿نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ﴾ کە نیگا و سرووشمان بۆ کردوون
﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ﴾ دەی پرسیار بکە لە خاوەنی کتێبەکانی (پێشوو لە زانایانی گاوور و جوولەکە)
﴿إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە نازانن ﴿٧﴾ ﴿وَمَا جَعَلۡنَٰهُمۡ جَسَدٗا﴾ ئێمە ئەو پێغەمبەرانەمان نەکردۆتە
پەیکەرێك ﴿لَّا يَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ﴾ کە خواردن نەخۆن ﴿وَمَا كَانُواْ خَٰلِدِينَ﴾ وە ئەوان هەمیشەیی و نەمر
نەبوون ﴿٨﴾ ﴿ثُمَّ صَدَقۡنَٰهُمُ ٱلۡوَعۡدَ﴾ پاشان بەڵێنێك کە پێمان دابوون بەجێمان هێنا ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُمۡ وَمَن نَّشَآءُ﴾
جا ئەوانە و هەرکەسێکمان دەویست (لە باوەڕداران) ڕزگارمان کردن ﴿وَأَهۡلَكۡنَا ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾
وە زیادەڕۆیانمان لەناوبرد ﴿٩﴾ ﴿لَقَدۡ أَنزَلۡنَآ﴾ سوێند بەخوا ناردومانەتە خوارەوە ﴿إِلَيۡكُمۡ كِتَٰبٗا﴾
کتێبێك بۆ ئێوە ﴿فِيهِ ذِكۡرُكُمۡۚ﴾ کە سەربەرزی و ناوبانگی ئێوەی تێدایە ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا بۆ
بیر ناکەنەوە ﴿١٠﴾

﴿وَكَمۡ قَصَمۡنَا مِن قَرۡيَةٖ﴾ چەندەها شارو گوندمان تێك شكاند (ولەناومان بردن) ﴿كَانَتۡ ظَالِمَةٗ﴾ كە(خەڵكەكەی)
ستەمكار بوون ﴿وَأَنشَأۡنَا بَعۡدَهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ﴾ وەپاش ئەوان گەل و تاقمی ترمان (لەجێیان) بەدی هێنا ﴿١١﴾ ﴿فَلَمَّآ أَحَسُّواْ
بَأۡسَنَآ﴾ جا كاتێك (بێ باوەڕان) هەستیان كرد بەسزاو تۆڵەی ئێمە ﴿إِذَا هُم﴾ دەست بەجێ ئەوان ﴿مِّنۡهَا يَرۡكُضُونَ﴾
لەو شارانە بەخێرایی ڕایان دەكرد ﴿١٢﴾ ﴿لَا تَرۡكُضُواْ وَٱرۡجِعُوٓاْ﴾ (فریشتەكان بەگاڵتەوە پێیان دەڵێن) ڕامەكەن
وبگەڕێنەوە ﴿إِلَىٰ مَآ أُتۡرِفۡتُمۡ فِيهِ﴾ بۆلای ئەو نازو نیعمەتانەی كە ڕۆچوو بوون تێیدا ﴿وَمَسَٰكِنِكُمۡ﴾ وە(بگەڕێنەوە)
بۆ سەر خانووماڵەكانتان ﴿لَعَلَّكُمۡ تُسۡـَٔلُونَ﴾ بەڵكو پرسیارتان لێ بكرێت(لەوەی بەسەرتان هاتووە) ﴿١٣﴾ ﴿قَالُواْ
يَٰوَيۡلَنَآ﴾ (لەگەڵ هەڵهاتندا) دەیان ووت: هاوار بۆ ئێمە ﴿إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ بێگومان ئێمە ستەمكار بووین ﴿١٤﴾
﴿فَمَا زَالَت﴾ ئیتر بەردەوام ﴿تِّلۡكَ دَعۡوَىٰهُمۡ﴾ ئەمە هاواریان بوو (هاوار بۆ ئێمە) ﴿حَتَّىٰ جَعَلۡنَٰهُمۡ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ﴾
هەتا هەموویانمان دروێنە و خامۆش كرد (ولەناومان بردن) ﴿١٥﴾ ﴿وَمَا خَلَقۡنَا﴾ئێمە دروستمان نەكردووە
﴿ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ﴾ ئاسمان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندایە بەگاڵتەو بەبێ هودە ﴿١٦﴾ ﴿لَوۡ أَرَدۡنَآ﴾ ئەگەر
بمان وویستایە ﴿أَن نَّتَّخِذَ لَهۡوٗا﴾ سەرقاڵی بۆ خۆمان هەڵبژێرین (وەك هاوسەرو منداڵ) ﴿لَّٱتَّخَذۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾
لەلایەن خۆمانەوە هەڵمان دەبژارد ﴿١٧﴾ ﴿بَلۡ نَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَى ٱلۡبَٰطِلِ﴾ (واز لەوە بێنە) بەڵكو حەق دەدەین بەسەر بەتاڵ
و ناحەقدا ﴿فَيَدۡمَغُهُۥ﴾ بەهۆیەوە (بەتاڵ) مێشكی دەپژێ و تێكدەشكێ ﴿فَإِذَا هُوَ زَاهِقٞ﴾ ئەمجا دەست بەجێ بەتاڵ
دەفەوتێ و لەناو دەچێت ﴿وَلَكُمُ ٱلۡوَيۡلُ﴾ هاوار (وسزای بەتین) بۆ ئێوە ﴿مِمَّا تَصِفُونَ﴾ لەبەر ئەوەی كە دەیڵێن و بڕیاری
دەدەن بۆ خوا (لەهاوسەرو منداڵ) ﴿١٨﴾ ﴿وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ تەنها بۆ خوایە ئەوەی لەئاسمانەكان وزەویدایە
﴿وَمَنۡ عِندَهُۥ﴾ وە ئەو (فریشتانە) ی كە لای خوان ﴿لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ﴾ هەرگیز لەپەرستنی ئەو خۆیان بەزل
نازانن ﴿وَلَا يَسۡتَحۡسِرُونَ﴾ هەرگیزیش ماندوو نابن ﴿١٩﴾ ﴿يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ شەوو ڕۆژ تەسبیحات و ستایشی
(خودا دەكەن) ﴿لَا يَفۡتُرُونَ﴾ ماندوونابن و سارد نابنەوە ﴿٢٠﴾ ﴿أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ﴾ ئایا ئەوانە هەڵیان بژاردووە (وبڕیاریان داوە)
﴿ءَالِهَةٗ مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ چەند پەرستراو و (خوایەك) لەزەوی دا (بۆ خۆیان) ﴿هُمۡ يُنشِرُونَ﴾ (كە دەسەڵاتی
ئەوەیان نیە مردوو زیندوو بكەنەوە) وخۆیان كۆدەكرێنەوە وزیندوو دەكرێنەوە ﴿٢١﴾ ﴿لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ﴾ ئەگەر
لەهەردووكیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند پەرستراوێك هەبوایە ﴿إِلَّا ٱللَّهُ﴾ جگە لەخوا ﴿لَفَسَدَتَا﴾ بێگومان
(ئاسمان و زەوی) هەر دوو كاول وێران دەبوون ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ﴾ دەی پاك و بێگەردی بۆ خوای
پەروەردگاری عەرش ﴿عَمَّا يَصِفُونَ﴾ لەوەی بێ باوەڕان ڕەوای دەدەن (بۆ خوا) ﴿٢٢﴾ ﴿لَا يُسۡـَٔلُ﴾ (خوا) پرسیاری
لێ ناكرێت (ڕەخنەی لێ ناگیرێت) ﴿عَمَّا يَفۡعَلُ﴾ لەهەر كارێك كەدەیكات ﴿وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ﴾ بەڵكو ئەوان (ئادەمیزاد)
پرسیاریان لێ دەكرێت ﴿٢٣﴾ ﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ﴾ ئایا ئەوانە هەڵیان بژاردووە (وبڕیاریان داوە) ﴿مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ﴾
چەند پەرستراوێك جگە لەخوا ﴿قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ﴾ (پێیان) بڵێ بەڵگەتان بێنن (لەسەر ئەوەی بڕیارتان داوە)
﴿هَٰذَا ذِكۡرُ مَن مَّعِيَ﴾ ئەمە قسەی ئەم قورئانەیە(خوا ناردویەتی) بۆ من ﴿وَذِكۡرُ مَن قَبۡلِي﴾ وەقسەی ئەو (پەیام وپەڕاوانەشە)
لەپێش منەوە هاتوون(وەك تەورات و ئینجیل لەهیچیاندا بوونی چەند پەرستراوێك بڕیار نەدراوە) ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ﴾
بەڵام زۆربەی زۆریان ﴿لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡحَقَّ﴾ حەق و ڕاستی نازانن ﴿فَهُم مُّعۡرِضُونَ﴾ لەبەر ئەوە پشتی تێدەكەن و ڕووی لێ
وەردەگێڕن ﴿٢٤﴾

﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا﴾ وەئێمە نەمان ناردووە ﴿مِن قَبْلِكَ﴾ پێش تۆ ﴿مِن رَّسُولٍ﴾ هیچ پێغەمبەرێك ﴿إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ﴾
مەگەر نیگامان بۆ ناردووە ﴿أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠﴾ (بەوەی کە) بێگومان جگە لەمن هیچ پەرستراوێکی ڕاست
نی یە ﴿فَٱعْبُدُونِ﴾ کەواتە تەنها من بپەرستن ﴿٢٥﴾ ﴿وَقَالُوا۟﴾ (وەبێ باوەڕان) ووتیان ﴿ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا﴾
خوای میهرەبان مندالّی بۆ خۆی بڕیارداوە (کە فریشتەکانن) ﴿سُبْحَٰنَهُۥ﴾ پاك و بێگەردە خوا (لەم شتانە)
﴿بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ﴾ بەڵکو ئەوانە (ئەوفریشتانە) بەندەی ڕێز گیراو (ی خوا) ن ﴿٢٦﴾ ﴿لَا يَسْبِقُونَهُۥ﴾ لە خوا
پێش ناکەون ﴿بِٱلْقَوْلِ﴾ بەقسەو ووتەیان ﴿وَهُم بِأَمْرِهِۦ﴾ وەئەوان بەفەرمانی خوا ﴿يَعْمَلُونَ﴾ کار دەکەن ﴿٢٧﴾
﴿يَعْلَمُ﴾ (خوا) دەزانێت وئاگادارە ﴿مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾ بە ئەوەی لەدونیا لەبەر دەستیاندایە ﴿وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ وە
بە ئەوەی لەڕۆژی دواییدا بۆیان ئامادەکراوە ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ﴾ وە (فریشتەکان) تکا ناکەن ﴿إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ﴾
تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت (خوا) ڕازی بێت (تکای بۆ بکرێت) ﴿وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ﴾ وە ئەوان (فریشتەکان)
لەترس وهەیبەتی خوا ﴿مُشْفِقُونَ﴾ زۆر دەترسن ﴿٢٨﴾ ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ﴾ وە هەرکام لەوانە (لەو فریشتانە) بڵێ
﴿إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ﴾ بێگومان منیش پەرستراوم جگە لەخوا ﴿فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ﴾ ئەو بە(ئاگری) دۆزەخ
تۆڵەی لێ دەسەنین ﴿كَذَٰلِكَ﴾ هەربەوجۆرە ﴿نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە(تۆڵەیان
لێ دەکەینەوە) ﴿٢٩﴾ ﴿أَوَلَمْ يَرَ﴾ ئایا نەیان دی (نەیان زانیوە) ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ ئەوانە بێ بڕوا بوون
﴿أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ کەئاسمانەکان و زەوی ﴿كَانَتَا رَتْقًا﴾ هەردووکیان پێکەوە لکابوون (ویەك
پارچە بوون) ﴿فَفَتَقْنَٰهُمَا﴾ ئەمجا لەیەکترمان جیاکردنەوە ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ﴾ وە فەراهەممان هێنا لەئاو
ودروستمان کردووە ﴿كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ﴾ هەموو شتێکی زیندوو ﴿أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ دەی ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن؟
﴿٣٠﴾ ﴿وَجَعَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وەدروستمان کردووە (ودامان ناوە) لەزەویدا ﴿رَوَٰسِىَ﴾ چەند شاخی دامەزراو
﴿أَن تَمِيدَ بِهِمْ﴾ بۆ ئەوە جووڵە جوڵ نەکات بەوانەی(بەسەر پشتیوەن) ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا﴾ وە سازاندومانە لە زەوی
(یان لە شاخەکان) دا ﴿فِجَاجًا سُبُلًا﴾ دۆڵ و ڕێگاوبانی زۆر ﴿لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ تا ئەوان شارەزا بن و پێویستی
خۆیان دابین بکەن ﴿٣١﴾ ﴿وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ﴾ وە ئاسمانمان کردووە ﴿سَقْفًا مَّحْفُوظًا﴾ بەسەقفێکی (سەرێکی)
پارێزراو ﴿وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا﴾ بەڵام ئەوانە سەبارەت بە ئایەتەکانی ئاسمان ﴿مُعْرِضُونَ﴾ پشت تێکەرو ڕوو
وەرگێر بوون ﴿٣٢﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى﴾ وە هەر ئەو (خوا) یە ﴿خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ کە شەو و ڕۆژی دروست کردووە
﴿وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ وە خۆر و مانگیش(ی دروست کردووە) ﴿كُلٌّ﴾ هەریەك لەوان ﴿فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾
لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە ﴿٣٣﴾ ﴿وَمَا جَعَلْنَا﴾ بڕیارمان نەداوە ﴿لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ بۆ هیچ کەسێك لەپێش
تۆوە ﴿ٱلْخُلْدَ﴾ مانەوەی هەمیشەیی (نەمری) ﴿أَفَإِي۟ن مِّتَّ﴾ ئەمجا ئەگەر تۆ بمری ﴿فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ﴾
(دوا مردنی تۆ) ئایا ئەوان ژیانیان بەردەوام دەبێ و نامرن؟ (نەخێر) ﴿٣٤﴾ ﴿كُلُّ نَفْسٍ﴾ هەموو کەسێك
﴿ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ مردن دەچێژێت (ودەمرێت) ﴿وَنَبْلُوكُم﴾ وە ئێمە تاقیتان دەکەینەوە ﴿بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ﴾ بەخراپە
وناخۆشی وە بە چاکە و خۆشی ﴿فِتْنَةً﴾ تادەرکەوێت (چاك و خراپ) ﴿وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ وەهەر بۆ لای ئێمە
دەگەڕێنەوە ﴿٣٥﴾

﴿وَإِذَا رَءَاكَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) کاتێ تۆ دەبینن ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ ئەوانەی کە بێ باوەڕن ﴿إِن
يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا﴾ جگە لە گاڵتەو لاقرتی کردن بە تۆ هیچی تر ناکەن ﴿أَهَٰذَا ٱلَّذِي﴾ (بەسەرسامیەکەوە
دەڵێن) ئا ئەمە ئەو کەسەیە ﴿يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ﴾ (بەخراپی) باسی بتەکانتان دەکات ﴿وَهُم بِذِكْرِ
ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ لەکاتێکدا خۆیان بەباسکردنی (قورئان) وزیکری خوای میهرەبان ﴿هُمْ كَٰفِرُونَ﴾
بێ بڕوان ﴿٣٦﴾ ﴿خُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ مِنْ عَجَلٍ﴾ (سرووشتی) ئینسان وایە لەسەر پەلەکردن بەدی هێنراوە
﴿سَأُوْرِيكُمْ ءَايَٰتِي﴾ بەزوویی تۆڵەی خۆمتان نیشان دەدەم ﴿فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ﴾ کەواتە پەلە مەکەن ﴿٣٧﴾
﴿وَيَقُولُونَ﴾ وە (بت پەرستان بە گاڵتەوە) دەڵێن ﴿مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ﴾ ئەم بەڵێنی (تۆڵەیە) کەی دێت
﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن ﴿٣٨﴾ ﴿لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەگەر ئەوانەی کە کافرن
بیانزانیایە (چ سزایەکی سەخت لەبەر دەمیاندایە) ﴿حِينَ لَا يَكُفُّونَ﴾ کاتێ ناتوانن دووری
بخەنەوە ﴿عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ﴾ بڵێسەی ئاگر لەدەم وچاو و پشتیان ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾
وەئەوان یارمەتی نادرێن ﴿٣٩﴾ ﴿بَلْ تَأْتِيهِم بَغْتَةً﴾ بەڵکو لەناکاودا تووشیان دێت ﴿فَتَبْهَتُهُمْ﴾
وسەرسامیان دەکات (بەشێوەیەك) ﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ نەدەتوانن ﴿رَدَّهَا﴾ بیگێڕنەوە (بەرگری
بکەن) ﴿وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ وەنەمۆڵەتیشیان دەدرێت(تەوبە بکەن) ﴿٤٠﴾ ﴿وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ﴾ سوێند
بەخوا بێگومان گاڵتەو لاقرتی کراوە ﴿بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ بەپێغەمبەرانی پێش تۆش ﴿فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ﴾
ئەمجا دەوری ئەوانەی دا ﴿سَخِرُواْ مِنْهُم﴾ لەوان کە گاڵتەیان دەکرد (بەپێغەمبەران) ﴿مَّا كَانُواْ بِهِۦ
يَسْتَهْزِءُونَ﴾ ئەو سزایەی ئەوان گاڵتەیان پێ دەکرد ﴿٤١﴾ ﴿قُلْ﴾ بڵێ (بە گاڵتە کەران) ﴿مَن يَكْلَؤُكُم﴾
کێ (دەتوانێت) ئێوە بپارێزێت ﴿بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ بەشەوو بەرۆژ ﴿مِنَ ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ لە (سزای) خوای
میهرەبان ﴿بَلْ هُمْ﴾ بەڵکو ئەوانە ﴿عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ﴾ بەردەوام پشت هەڵئەکەن لەیاد
وزیکری پەروەردگاریان ﴿٤٢﴾ ﴿أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ﴾ ئاخۆ (ئەو بێ باوەڕانە) چەند پەرستراوێکیان هەیە
﴿تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا﴾ جگەلەئێمە ڕێگری (سزا) یان لێ بکات ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ (ئەوپەرستراوانە) ناتوانن
﴿نَصْرَ أَنفُسِهِمْ﴾ یارمەتی خۆیان بدەن ﴿وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ﴾ وە لەلایەن ئێمەشەوە پەنا نادرێن ﴿٤٣﴾
﴿بَلْ مَتَّعْنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ﴾ بەڵکو ئێمە ئەوان و باو و باپیرانیانمان ژیاندووە بە خۆشی (ناز و نیعمەتی
دونیامان پێدابوون) ﴿حَتَّىٰ طَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ﴾ تاتەمەنی زۆریان بەسەر برد ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ﴾ دەی ئایا
ئەوانە (قوڕەیشیەکان) سەرنج نادەن ﴿أَنَّا نَأْتِي ٱلْأَرْضَ﴾ کە بێگومان ئێمە (وردە وردە) دێینە خاك
و وڵاتی (ئەوان) ﴿نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ﴾ لە هەموو لایەکی یەوە کەمی دەکەینەوە (بەڕزگار کردن
لەلایەن موسڵمانانەوە) ﴿أَفَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾ دەی ئایا ئەوان زاڵ و سەرکەوتوون (یائێمە)؟ ﴿٤٤﴾

﴿قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ: بێگومـان من تەنهـا ئێوە بێـدار دەکەمـەوە (دەتان
ترسـێنم) ﴿بِٱلْوَحْيِ﴾ بەنیگـا و وەحـی ﴿وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ﴾ وە کـەڕەکان بانگەوازی(حـەق)
نابیسـتن ﴿إِذَا مَا يُنذَرُونَ﴾ کاتێـك کە دەترسـێنرێن ﴿٤٥﴾ ﴿وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ﴾ سـوێند بەخـوا ئەگەر دوو
چاریـان ببێـت ﴿نَفْحَةٌ﴾ کەمێـك ﴿مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ﴾ لە سـزای پەروەردگـارت ﴿لَيَقُولُنَّ﴾ بێگومان
ئـەوان دەڵێن ﴿يَٰوَيْلَنَآ﴾ هـاوارو تیاچوون بۆ ئێمە ﴿إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ بەڕاسـتی ئێمە (هەموومان)
سـتەمکار بوویـن ﴿٤٦﴾ ﴿وَنَضَعُ﴾ وەئێمـە دادەنێیـن ﴿ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ﴾ تەرازووەکانـی دادپـەروەری
(کەکردەوەی پێ دەکێشـرێت) ﴿لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لـەڕۆژی قیامەتدا ﴿فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا﴾ ئەمجا هیچ
کەس کەمترین ستەمی لێ ناکرێت ﴿وَإِن كَانَ مِثْقَالَ﴾ با قورسی (کردەوەکەی) ﴿حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ﴾
بەقـەدەر تۆوی خەرتەلەیەکیـش بێت ﴿أَتَيْنَا بِهَا﴾ ئێمە دەیهێنین ﴿وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾ وە بەسـە کەئێمە
ژمێریاری (کردەوەی بەندەکان) بین ﴿٤٧﴾ ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاستی
تەورات (کەجیا کەرەوەی حەق و بەتاڵە) بەخشـیمانە مووسـا وهاروون، ﴿وَضِيَآءً وَذِكْرًا﴾ وەڕوون
کـەرەوە و یاد خەرەوەشـە ﴿لِّلْمُتَّقِينَ﴾ بـۆ پارێـزکاران و لە خواترسـان ﴿٤٨﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ﴾ ئەوانەی
کەدەترسـن ﴿رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ﴾ لە پەروەردگاریـان بەنادیاری وپەنهانی ﴿وَهُم﴾ وەئەوان (کەسـانێکن)
﴿مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشْفِقُونَ﴾ لە ڕۆژی دوایی زۆر دەترسن ﴿٤٩﴾ ﴿وَهَٰذَا﴾ وەئەم (قورئانە) ﴿ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ﴾
یـاد خەرەوەیەکـی بەفـەڕ وپیـرۆزە ﴿أَنزَلْنَٰهُ﴾ ناردومانەتـە خـوارەوە ﴿أَفَأَنتُمْ﴾ دەی ئایـا ئێـوە ﴿لَهُۥ
مُنكِرُونَ﴾ دانی پێدا نانێن(باوەڕی پێ ناکەن) ﴿٥٠﴾ ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاسـتی بەخشـیمان
﴿إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ﴾ بـە ئیبراهیـم ڕێنموونـی وشـارەزایی ﴿مِن قَبْلُ﴾ لەپێشـدا ﴿وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ﴾
وەئێمـە لـە (شـیاوی) ئـەو ئاگـادار بوویـن ﴿٥١﴾ ﴿إِذْ قَالَ﴾ کاتێـك ووتـی ﴿لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ﴾ بـە باوکی
وگەلەکەی ﴿مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ﴾ ئا ئەم پەیکەر و بتانە چیین﴿أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ﴾ کە ئێوە دەیان پەرسـتن
(بەلایانـەوە ماونەتـەوە)؟ ﴿٥٢﴾ ﴿قَالُوا۟﴾ (گەلەکەی) ووتیان ﴿وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا﴾بـاوو باپیرانمان دیوە ﴿لَهَا
عَٰبِدِينَ﴾ئەمانەیان پەرسـتووە ﴿٥٣﴾ ﴿قَالَ﴾ (ئیبراهیم) ووتی ﴿لَقَدْ كُنتُمْ﴾ بەڕاستی ئێوە﴿أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ﴾
خۆتـان و باوو باپیرانتان﴿فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾لە گومڕاییەکی ئاشـکرادان ﴿٥٤﴾ ﴿قَالُوٓا۟﴾ (لە وەڵامدا) ووتیان
﴿أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ﴾ ئایا ڕاسـتی و حەقت بۆ هێناوین ﴿أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ﴾ یا تۆ گاڵتەمان پێ دەکەیت ﴿٥٥﴾
﴿قَالَ بَل رَّبُّكُمْ﴾ (ئیبراهیـم) ووتی (حەقـم هێناوە) بەڵکو پەروەردگـاری ئێوە ﴿رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾
پەروەردگـاری ئاسـمانەکان و زەوییـە ﴿ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ﴾ هـەر ئەویش بـەدی هێناون ﴿وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم﴾
وە بێگومان من لەسـەر ئەوانە (کەباسـم کرد) ﴿مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ لە شـاهید وبەئاگایانم ﴿٥٦﴾ ﴿وَتَٱللَّهِ﴾
سـوێند بـە خـوا ﴿لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم﴾ پیـلان دادەنێـم بـۆ (لەنـاو بردنـی) بتەکانتـان ﴿بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟
مُدْبِرِينَ﴾ دوای ئەوەی پشتان تێکردن (بەجێتان هێشتن) ﴿٥٧﴾

﴿فَجَعَلَهُمْ جُذَاذًا﴾ ئەمجا ئیبراهیم هەموو بتەکانی وورد کرد ﴿إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ﴾ جگە لە بتە زلەکەیان
نەبێت ﴿لَعَلَّهُمْ﴾ بە ئومێدی ئەوەی ﴿إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ﴾ بگەڕێنەوە بۆلای ئەو (بۆ لای ئیبراهیم ئەویش
ڕاستیان پێ بڵێ، بەڵکو باوەڕبێنن) ﴿٥٨﴾ ﴿قَالُوا﴾ (بت پەرستان) ووتیان ﴿مَن فَعَلَ هَٰذَا﴾ کێ ئەمەی کردووە
﴿بِآلِهَتِنَا﴾ بە خواکانمان (بەبتەکانمان) ﴿إِنَّهُ﴾ بە ڕاستی ئەو کەسە ﴿لَمِنَ الظَّالِمِينَ﴾ لەستەمکارانە
(دەبێ سزا بدرێت) ﴿٥٩﴾ ﴿قَالُوا﴾ (چەند کەسێك) ووتیان ﴿سَمِعْنَا فَتًى﴾ گوێمان لە لاوێك بوو
﴿يَذْكُرُهُمْ﴾ باسی ئەوانی (بتەکانی بە خراپە) دەکرد ﴿يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ﴾ پێی دەڵێن ئیبراهیم ﴿٦٠﴾
﴿قَالُوا﴾ (کۆمەڵێ لە گەلەکەی) ووتیان ﴿فَأْتُوا بِهِ﴾ کەواتە بیهێنن ﴿عَلَىٰ أَعْيُنِ النَّاسِ﴾ لە پێش چاوی
خەڵك (بیوەستێنن) ﴿لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ﴾ بەڵکو (ئەوانەی دەیناسنەوە) شایەتی لەسەر بدەن ﴿٦١﴾
﴿قَالُوا﴾ ووتیان ﴿أَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا﴾ ئایا تۆ ئەمەت کردووە ﴿بِآلِهَتِنَا﴾ بە خواکانمان (بەبتەکانمان)
﴿يَا إِبْرَاهِيمُ﴾ ئەی ئیبراهیم ﴿٦٢﴾ ﴿قَالَ﴾ (ئیبراهیم) ووتی ﴿بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾ نەخێر بەڵکو ئەم بتە
گەورەیان ئەوەی کردووە ﴿فَاسْأَلُوهُمْ﴾ دە پرسیار لەوانە (بتە شکاوەکان) بکەن ﴿إِن كَانُوا يَنطِقُونَ﴾
ئەگەر ئەوانە قسە دەکەن ﴿٦٣﴾ ﴿فَرَجَعُوا إِلَىٰ أَنفُسِهِمْ﴾ ئەمجا گەڕانەوە بۆ لای یەکتری (سەریان کرد
بەیەکدا) ﴿فَقَالُوا﴾ جا (لەناو خۆیاندا هەندێکیان) ووتیان ﴿إِنَّكُمْ﴾ بەڕاستی ئێوە ﴿أَنتُمُ الظَّالِمُونَ﴾
هەر خۆتان ستەمکارن ﴿٦٤﴾ ﴿ثُمَّ نُكِسُوا عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ﴾ پاشان سەر بەرەو خوار کرانەوە (گەڕانەوە بۆ سەر
سەختی و نەفامییەکەیان) ﴿لَقَدْ عَلِمْتَ﴾ بەڕاستی تۆ دەتزانی ﴿مَا هَٰؤُلَاءِ يَنطِقُونَ﴾ ئەو بتانە قسە ناکەن
(ئەی ئیبراهیم) ﴿٦٥﴾ ﴿قَالَ﴾ (ئیبراهیم) ووتی ﴿أَفَتَعْبُدُونَ﴾ دەی ئێوە دەپەرستن؟ ﴿مِن دُونِ اللَّهِ مَا﴾
جگە لەخوا شتانێك ﴿لَا يَنفَعُكُمْ شَيْئًا﴾ کە هیچ قازانج و سوودێکتان پێ ناگەیەنن ﴿وَلَا
يَضُرُّكُمْ﴾ وە هیچ زیانێکیشتان لێ نادەن ﴿٦٦﴾ ﴿أُفٍّ لَّكُمْ﴾ ئۆف بۆ ئێوە ﴿وَلِمَا تَعْبُدُونَ﴾ بۆ ئەو
بتانەش کە دەیپەرستن ﴿مِن دُونِ اللَّهِ﴾ لە جیاتی خوا ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ دەی ئایا ژیر نابن (بیر وهۆشتان
ناخەنە کار) ﴿٦٧﴾ ﴿قَالُوا﴾ (هەندێ لە بت پەرستان) ووتیان ﴿حَرِّقُوهُ﴾ (ئیبراهیم) چاك بسووتێنن
﴿وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ﴾ ویارمەتی خواکانتان (بتەکانتان) بدەن وسەریان بخەن ﴿إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ﴾ ئەگەر ئێوە
ئەو کارە دەکەن ﴿٦٨﴾ ﴿قُلْنَا﴾ (کە ئیبراهیمیان خستە ئاگرەوە) ووتمان ﴿يَا نَارُ﴾ ئەی ئاگر ﴿كُونِي بَرْدًا
وَسَلَامًا﴾ سارد بەرەوەو بێ زیانبە ﴿عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ﴾ لەسەر ئیبراهیم ﴿٦٩﴾ ﴿وَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا﴾ ئەوان
ویستیان پیلان بگێڕن لە ئیبراهیم (بە سووتان لەناوی بەرن) ﴿فَجَعَلْنَاهُمُ﴾ بەڵام ئێمە ئەوانمان کردە
﴿الْأَخْسَرِينَ﴾ زەرەرمەندترین (دۆڕاوترین) کەس ﴿٧٠﴾ ﴿وَنَجَّيْنَاهُ وَلُوطًا﴾ وە ئیبراهیم ولووطمان
ڕزگار کرد ﴿إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي﴾ و (ناردمانن) بۆ ئەو زەویە (بۆ وولاتی شام) ﴿بَارَكْنَا فِيهَا لِلْعَالَمِينَ﴾
کە پیت و فەڕمان تێ خستبوو ﴿٧١﴾ ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ﴾ وە بەخشیمان بە ئیبراهیم ﴿إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً﴾
ئیسحاق و (بە ئیسحاقیش) یەعقوب، بە زیاد (لە داواکەی ئیبراهیم کە داوای منداڵێکی کرد)
﴿وَكُلًّا جَعَلْنَا﴾ وە هەموویانمان کرد ﴿صَالِحِينَ﴾ بە پیاوی چاك ﴿٧٢﴾

﴿وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً﴾ وە ئەوانمـان کـرد بە پێشـەوا ﴿يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا﴾ بـە فەرمانی ئێمـە ڕێنموونـی (خەڵکیان)
دەکـرد ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ﴾ وە نیگامان کرد بۆیان ﴿فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ بـە ئەنجامدانی کاری چاك ﴿وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾
وە بـە نوێـژ کـردن ﴿وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ﴾ و زەکات دان ﴿وَكَانُواْ لَنَا﴾ وە ئـەوان هـەر بـۆ ئێمـە ﴿عَٰبِدِينَ﴾
عیبادەتیان دەکرد ﴿٧٣﴾ ﴿وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ بەخشـیمان بە لـوط پێغەمبەرێتی و زانیاری ﴿وَنَجَّيْنَٰهُ﴾
وە ڕزگارمـان کـرد ﴿مِنَ ٱلْقَرْيَةِ﴾ لە(دەسـت خەڵکی) ئەو شـارەی (سـەدوم) ﴿ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ﴾
کـە (خەڵکەکـەی) کـردەوەی پیـس و دزێویـان دەکـرد (نێربازییـان دەکـرد) ﴿إِنَّهُمْ كَانُواْ﴾ بەڕاسـتی ئەوانە
﴿قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ﴾ گەلێکـی خراپـی لـە فەرمـان دەرچـوو بـوون ﴿٧٤﴾ ﴿وَأَدْخَلْنَٰهُ فِى رَحْمَتِنَآ﴾ وە لووطمـان
خستەناوڕەحمەت و میهرەبانـی خۆمانـەوە ﴿إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ بەڕاسـتی لـوط لـە چاکـەکاران بوو ﴿٧٥﴾
﴿وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ﴾ وەپێشـتر نـوح پێغەمبـەر ﷺ هـاواری (لـە ئێمـە) کـرد ﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ﴾ ئەمجا
ئێمـەش وەڵامماندایـەوە وبەدەنگیـەوە هاتیـن ﴿فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ﴾ خـۆی و (ئیماندارانـی) خێزانەکەیمـان
ڕزگـار کرد ﴿مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ﴾ لـە تەنگانـە زۆر گەورەکە (لە لافـاو و خنکان) ﴿٧٦﴾ ﴿وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ
ٱلَّذِينَ﴾ وە یارمەتیمـان دا لە دژی ئەو گەلەی ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ کـە بەڵگەو ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دەزانی
﴿إِنَّهُمْ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـە ﴿كَانُواْ قَوْمَ سَوْءٍ﴾ گەلێـك بـوون ڕۆچـوون لـە خراپـەدا ﴿فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ﴾
لەبـەر ئـەوە هەموویانمـان خنکان (لـە تۆفانەکـەدا) ﴿٧٧﴾ ﴿وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ﴾ (باسـی) داوودو سـولەیمان بکە
﴿إِذْ يَحْكُمَانِ﴾ کاتـێ بڕیاریان دەرکرد ﴿فِى ٱلْحَرْثِ﴾ دەربارەی ئەو کشـتوکاڵەی ﴿إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ﴾
کـە بەشـەو ئاژەڵی کەسـانێك تێیدا لەوەڕابـوون (زیانیان لێ دابـوو) ﴿وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ﴾ وە ئێمـە بۆ دادوەری
بڕیارەکەیـان ﴿شَٰهِدِينَ﴾ ئامادە (ئاگـادار) بوویـن ﴿٧٨﴾ ﴿فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ﴾ ئەوسـا ئێمـە ئـەوە مـان فێـری
سـولەیمان کرد (سـولەیمان ووتی: ئاژەڵە زیان خۆرەکە بدرێتە دەست خاوەن کشـتوکاڵەکە، کەڵك لەشیر
وبەرهەمیان وەربگرێت، وە کشتوکاڵەکەش بدرێتە دەست خاوەن ئاژەڵەکە بەروبوومەکەی بخۆن و خزمەتی
بکـەن تـا وەك پێش زیان لێکەوتنەکەی لێ دێتەوە، پاشـان هەریەك لەئاژەڵ وکشـتوکاڵەکە بگەڕێنرێنەوە بۆ
خاوەنەکانیـان) ﴿وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ وە بـە هەر یەك لـەو دووانـە (داوود و سـولەیمان) پێغەمبەرێتی
(ودادوەری) و زانستمان پێدان ﴿وَسَخَّرْنَا﴾ وە ڕاممان هێنا ﴿مَعَ دَاوُۥدَ﴾ لە گەڵ داوودا ﴿ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ﴾
چیـاکان و باڵندەکـە تەسـبیحاتی خوایـان دەکـرد ﴿وَكُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ وە هەر ئێمـە ئەوەمان کرد (بـۆ داوود)
﴿٧٩﴾ ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ﴾ وە داوودمـان فێـری دروسـتکردنی پۆشـاکی زرێـی (جەنگـی) کـرد
بـۆ ئێـوە ﴿لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ﴾ تابتـان پارێزێـت لەکاتـی شـەڕو کوشـتارتاندا ﴿فَهَلْ أَنتُمْ﴾ دەی ئایـا ئێوە
﴿شَٰكِرُونَ﴾ سـوپاس گوزارن (بۆ خوا لەسەر ئەم نیعمەتانە) ﴿٨٠﴾ ﴿وَلِسُلَيْمَٰنَ﴾ وە (ڕاممان هێنا) بۆ سولەیمان
﴿ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً﴾ بای توند (ڕەشەبا) ﴿تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ﴾ بەفەرمانی سولەیمان دەڕۆشت ﴿إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾ بۆ ئەو وولات
و زەوییـەی ﴿ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا﴾ کـە پڕ پیت و بەرەکەتمان کرد بـوو ﴿وَكُنَّا﴾ وە ئێمـە ﴿بِكُلِّ شَىْءٍ﴾ بە هەموو
شتێك ﴿عَٰلِمِينَ﴾ ئاگاداربووین ﴿٨١﴾

﴿وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن﴾ وە هەندێ لە شەیتانەکان (مان ڕام هێنابوو) ﴿يَغُوصُونَ لَهُۥ﴾ دەچوونە ژێری دەریا بۆ
سولەیمان (تا گەوهەرو مرواری بۆ دەربهێنن) ﴿وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ وە جگە لەوە کاری تریشیان دەکرد
(بۆی وەك کۆشـك دروسـتکردن) ﴿وَكُنَّا لَهُمْ حَٰفِظِينَ﴾ بە ڕاسـتی ئێمەش چاودێر (وپارێزەر)ی ئەوان
بووین ﴿٨٢﴾ ﴿وَأَيُّوبَ﴾ وە (باسی) ئەیووب (بکە) ﴿إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ﴾ کاتێك هاواری لە پەروەردگاری کرد
(لە دوای ناسـاغی ماوەیەکی زۆر) ﴿أَنِّى﴾ بە ڕاسـتی من ﴿مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ﴾ زیان و ئازار و نەخۆشی دووچارم
بووە ﴿وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ و تۆش میهرەبانترینی میهرەبانانی ﴿٨٣﴾ ﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ﴾ جا ئێمەش هاوار
و نزاکەیمان گیرا کرد ﴿فَكَشَفْنَا﴾ و لامان برد ﴿مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ﴾ ئەو زیان و ئازار و نەخۆشییەی کە هەیبوو
﴿وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ﴾ وە هەموو ماڵ و منداڵیمان پێ بەخشیەوە (کە پێشتر مردبوون) ﴿وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ﴾ و ئەوەندەی
تریش لەگەڵیاندا ﴿رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾ ئەوە ڕەحمەتێکی تایبەت بوو لە ئێمەوە ﴿وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ﴾ وە بیرخەرەوە
و ئامۆژگاری بوو بۆ خوا پەرسـتان ﴿٨٤﴾ ﴿وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ﴾ وە (باسـی) ئیسماعیل و ئیدریس
وذەلکیفل (بکە) ﴿كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ هەموویان لە ئارام گران بوون ﴿٨٥﴾ ﴿وَأَدْخَلْنَٰهُمْ﴾ وە ئێمە ئەوانمان خستە
﴿فِى رَحْمَتِنَآ﴾ نـاو ڕەحمەتـی خۆمـان (کـە بەهەشـتە) ﴿إِنَّهُم﴾ بێگومـان ئەوانـە ﴿مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾
لـە چاکەکـەکاران بـوون ﴿٨٦﴾ ﴿وَذَا ٱلنُّونِ﴾ وە (باسـی) زەننون (یونس بکە کـە پێغەمبـەری خەڵکی نەینەوا
بوو) ﴿إِذ ذَّهَبَ﴾ کاتێك ڕۆیشـت ﴿مُغَٰضِبًا﴾ بە تووڕەیی (گەلەکەی بەجێ هێشـت) ﴿فَظَنَّ﴾ وای دەزانی
﴿أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ﴾ ئێمە تەنگانەی بەسەردا ناهێنین وهەروا وازی لێ دەهێنین ﴿فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ (خوای
گەورە تاقیکردوە وفڕێدرایە ناو دەریا ونەهەنگێك قووتی دا) جا لە تاریکیەکاندا (تاریکی شەو و دەریا و ناو
سکی نەهەنگ) هاواری کرد ﴿أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ﴾ (ئەی خوایە) بەڕاستی هیچ پەرستراوێکی بەهەق وڕاستی
نییـە جگـە لە تـۆ ﴿سُبْحَٰنَكَ﴾ پاکی و بێگـەردی بۆ تۆیـە ﴿إِنِّى كُنتُ﴾ بێگومان من ﴿مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾
لـە سـتەمکاران بووم (لەبەر ئـەوەی ئارامم نەگـرت و وازم لە گەلەکەم هێنـا) ﴿٨٧﴾ ﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ﴾ ئێمەش
نـزا و هـاواری ئەومـان گیراکـرد ﴿وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ﴾ و لـەو غـەم وخەفەتـە ڕزگارمـان کرد ﴿وَكَذَٰلِكَ﴾
هـەر بەو شـێوەیە ﴿نُـۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئیماندارانیش ڕزگار دەکەین ﴿٨٨﴾ ﴿وَزَكَرِيَّآ﴾ وە (باسـی) زەکەریا
(بکـە) ﴿إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ﴾ کاتێك هاواری لە پەروەردگاری کرد ﴿رَبِّ﴾ ئەی پەروەردگارم ﴿لَا تَذَرْنِى فَرْدًا﴾
بـە تەنهـا مەمهێڵـەرەوە (منداڵێکـم پێ ببەخشـە) ﴿وَأَنتَ﴾ وە تـۆ ﴿خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ﴾ چاکتریـن میراتگرانی ﴿٨٩﴾
﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ﴾ ئێمـەش دوعـای ئەومان وەڵام دایـەوە ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ﴾ و یەحیامان پێ بەخشـی
﴿وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ﴾ و خیزانەکەشیمان بۆ چاك کردەوە (لە نەزۆکی) ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟﴾ بێگومان ئەوانەی
(باسـکران لـە پێغەمبەران) ﴿يُسَٰرِعُونَ﴾ پێش برکێیان دەکرد ﴿فِى ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ لـە (ئەنجامدانی) هەموو
خێر و چاکەیەکدا ﴿وَيَدْعُونَنَا﴾ و هاواریان لە ئێمە دەکرد ﴿رَغَبًا وَرَهَبًا﴾ بە ئومێدی (بەهەشت) ولە ترسی
(دۆزەخ) ﴿وَكَانُوا۟﴾ وە ئەوان ﴿لَنَا خَٰشِعِينَ﴾ ملکەچ بوون بۆ ئێمە (ودەترسن لێمان) ﴿٩٠﴾

﴿وَٱلَّتِيٓ﴾ وە(باسی) ئەو ئافرەتە (مەریەمی کچی عیمران بکە) ﴿أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا﴾ کەداوێنی خۆی
پاراست ﴿فَنَفَخۡنَا فِيهَا﴾ ئەمجا فوومان پێداکرد (بەهۆی جوبرەئیلەوە) ﴿مِن رُّوحِنَا﴾ لەو ڕۆحەی
کەهی خۆمان بوو ﴿وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ﴾ وە ئەو (مەریەم) و کوڕەکەیمان کرد ﴿ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾
بە موعجیزەیەك بۆ جیهانیان (٩١) ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦٓ﴾ بەڕاستی ئا ئەمەیە ﴿أُمَّتُكُمۡ﴾ ئایینی ئێوە
﴿أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ کەیەك ئایینە (ئایینی هەموو پێغەمبەرانە) ﴿وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ﴾ ومنیش پەروەردگارتانم
﴿فَٱعۡبُدُونِ﴾ کەواتە تەنها من بپەرستن (٩٢) ﴿وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ﴾ بەڵام خەڵکی
جیاوازیان کەوتە نێوان و سەرپێچی پێغەمبەرەکانیان کرد، زۆربەیان بوون بەچەند کۆمەڵ
گرۆهێکەوە (هەستان دەستیانکرد بە پەرستنی بت وهەواو ئارزووی خۆیان) ﴿كُلٌّ﴾ (بەڵام)
هەموویان ﴿إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ﴾ تەنها بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە (٩٣) ﴿فَمَن﴾ ئەمجا هەر کەس
﴿يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ (هەرچەند) لەکردەوە چاکەکان بکات ﴿وَهُوَ مُؤۡمِنٞ﴾ (بەو مەرجەی)
باوەڕداریش بێت ﴿فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ﴾ ئەوە (پاداشتی) کۆششەکەی وون نابێت و بەفیڕۆ ناڕوات
﴿وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە بۆ (کردەوەکانی) ئەو نووسەرین (٩٤) ﴿وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ﴾
وە حەرامە قەدەغەیەو ناشێت بۆ خەڵکی ئەو گوند وشارانەی ﴿أَهۡلَكۡنَٰهَآ﴾ کە کاولمان کردن
ولەناومان بردن ﴿أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ﴾ کەجارێکی تر بگەڕێنەوە (بۆ دونیا) (٩٥) ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا﴾ (ژیان
درێژەی دەبێت) تا ئەو کاتەی ﴿فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ﴾ (بەربەستەکەی) یەئجوج و مەئجوج
دەکرێتەوە ﴿وَهُم﴾ ئەوانیش ﴿مِّن كُلِّ حَدَبٖ﴾ لەهەموو بەرزاییەکەوە ﴿يَنسِلُونَ﴾ بەپەلە
(وبەخێرایی) دێنە خوارەوە (٩٦) ﴿وَٱقۡتَرَبَ﴾ وەنزیك بۆتەوە ﴿ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ﴾ بەڵێنی ڕاست (هاتنی
قیامەت) ﴿فَإِذَا﴾ جا لەناکاودا ﴿هِيَ شَٰخِصَةٌ﴾ ئەبڵەق و زەق دەبێ ﴿أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ چاوی
ئەوانەی بێ بڕوا بوون ﴿يَٰوَيۡلَنَا﴾ (دەڵێن) هاوارو مەرگ بۆ ئێمە ﴿قَدۡ كُنَّا﴾ بێگومان ئێمە لەدونیادا
﴿فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا﴾ لەبێ ئاگاییەك(ی تەواو)دا بووین لە ئەمە ﴿بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ نەخێر بەڵکو
ئێمە ستەمکار بووین (٩٧) ﴿إِنَّكُمۡ﴾ بەڕاستی ئێوە ﴿وَمَا تَعۡبُدُونَ﴾ وئەوانەش دەتانپەرستن
﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ جگە لەخوا ﴿حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾ (دەبنە) سووتەمەنی (وهەڵگیرسێنەری) دۆزەخ
﴿أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ﴾ ئێوە (و ئەوان) دەچنە ناوییەوە (٩٨) ﴿لَوۡ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ ئەگەر ئا ئەوانە (بتەکان)
﴿ءَالِهَةٗ﴾ خوا بوونایە ﴿مَّا وَرَدُوهَاۖ﴾ نەدەچوونە ناو ئەو (ئاگری دۆزەخ)ەوە ﴿وَكُلّٞ﴾ وە هەموو
(بت وبت پەرستان) ﴿فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە (٩٩) ﴿لَهُمۡ﴾ بۆ ئەو (دۆزەخیانە)هەیە
﴿فِيهَا﴾ لەدۆزەخ دا ﴿زَفِيرٞ﴾ هەناسەی سارد هەڵکێشان ﴿وَهُمۡ فِيهَا﴾ وەئەوان لەوێدا (لەدۆزەخدا)
﴿لَا يَسۡمَعُونَ﴾ هیچ نابیستن (١٠٠) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بێگومان ئەوانەی ﴿سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا﴾ لەلایەن ئێمەوە
پێشتر بڕیار دراوە بۆیان ﴿ٱلۡحُسۡنَىٰٓ﴾ کە بەختەوەربن (وچاکە بهێنرێتە ڕێیان) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە
﴿عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ﴾ لەدۆزەخ دوور دەخرێنەوە (١٠١)

﴿لَا يَسۡمَعُونَ﴾ (ئـەوان) نابیسـتن ﴿حَسِيسَهَاۖ﴾ دەنگـی (بڵێسـەو قرچـەی) ئاگـری دۆزەخ ﴿وَهُمۡ﴾
وەئـەوان ﴿فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ﴾ لەنـاو ئـەو (نـازو نیعمەتـە) ی دڵیـان حـەزی لێیەتـی ﴿خَٰلِدُونَ﴾
بەهەمیشـەیی وبـێ بڕانـەوە دەمێننـەوە ﴿١٠٢﴾ ﴿لَا يَحۡزُنُهُمُ﴾ غەمباریـان نـاکات ﴿ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ﴾ ترسـە
هـەرە گەورەکـە (لەقیامەتدا) ﴿وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ و فریشـتەکانیش پێشـوازیان لـێ دەکەن (لەبەر
دەرگاکانـی بەهەشـتدا) ﴿هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي﴾ (وپێیـان دەڵێـن) ئەمـە ئـەو ڕۆژیـە ﴿كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾
کە بەڵێنتان پێ درابوو ﴿١٠٣﴾ ﴿يَوۡمَ﴾ (بێنەوە بیریان) ئەو ڕۆژەی ﴿نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ﴾ کەئاسمانەکان دەپێچینەوە
﴿كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ﴾ وەك پێچانـەوە لـول کردنـی تۆمـاری کتێـب وپەتروکێـك ﴿كَمَا بَدَأۡنَآ
أَوَّلَ خَلۡقٖ﴾ وەك یەکـەم جـار چۆن دروسـتمان کـرد (بـەڕوت و قووتی) ﴿نُّعِيدُهُۥۚ﴾ (پـاش مردنیش) ئەو
(دروسـت کردنـە) دووبارە دەکەینـەوە ﴿وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ﴾ ئەوە بەڵێنێکـە (جێ بەجێ کردنی) لەسـەر ئێمەیە
﴿إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ بێگومـان ئێمـە (ئـەو بەڵێنـە) بـەدی دەهێنیـن ﴿١٠٤﴾ ﴿وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا﴾ سـوێند بەخـوا
بێگومـان ئێمـە نووسـیوومانە ﴿فِي ٱلزَّبُورِ﴾ لەزەبـووردا ﴿مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ﴾ لەدوای نووسـینی لە(لوح
المحفـوظ) دا ﴿أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ﴾ بەڕاسـتی سـەر زەوی (بەهەشـت) ﴿يَرِثُهَا﴾ دەبنـە خاوەنـی وبەمیراتـی
دەیبـەن ﴿عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾ بەنـدە چاك و پاکەکانـم ﴿١٠٥﴾ ﴿إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغٗا﴾ بێگومـان لەمەدا
(لـەوەی لـەم سـورەتەدا باسـکرا ) بەسـە کەپەنـد وئامۆژگـاری بێـت ﴿لِّقَوۡمٍ عَٰبِدِينَ﴾ بـۆ گەلی خوا
پەرسـتان ﴿١٠٦﴾ ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ وە (ئـەی موحەممـەد ﷺ) تۆمـان تەنهـا بـۆ ئـەوە
نـاردووە کەڕەحمـەت بیت بۆ جیهانیـان ﴿١٠٧﴾ ﴿قُلۡ﴾ بڵێ ﴿إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ بێگومان تەنها شـتێك کەنیگا
کـراوە بـۆ من ﴿أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ﴾ (ئەمەیە) کە بەڕاسـتی پەرسـتراوی ئێوە خوای تـاك و تەنهایە
﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ دەی ئایـا ئێـوە ملکـەچ دەبـن؟ ﴿١٠٨﴾ ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ جـا ئەگـەر ڕوویـان وەرگێـڕا
﴿فَقُلۡ ءَاذَنتُكُمۡ﴾ ئـەوە بڵـێ هەمووتانم ئاگادار کرد ﴿عَلَىٰ سَوَآءٖۖ﴾ بە یەکسـانی ﴿وَإِنۡ أَدۡرِيٓ﴾ و ناشـزانم
﴿أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٞ﴾ نزیکـە یـادوورە (هاتنـی) ﴿مَّا تُوعَدُونَ﴾ ئـەو هەڕەشـەی لێتـان دەکرێـت ﴿١٠٩﴾ ﴿إِنَّهُۥ
يَعۡلَمُ﴾ بەڕاسـتی خوا دەزانێ ﴿ٱلۡجَهۡرَ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ﴾ بە ووتە و قسـەی ئاشـکرا ﴿وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡتُمُونَ﴾ وە
دەشـزانێت بەوقسـەی دەیشـارنەوە ﴿١١٠﴾ ﴿وَإِنۡ أَدۡرِي﴾ وەمن نازانم (مۆڵـەت دانتان) ﴿لَعَلَّهُۥ فِتۡنَةٞ لَّكُمۡ﴾
لەوانەیە تاقیکردنەوە بێت بۆ ئێوە ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ﴾ (بیەوێت) تاماوەیەك (وازتان لێ بهێنێت) کەڕابوێرن
﴿١١١﴾ ﴿قَٰلَ﴾ (پێغەمبـەر ﷺ) فەرمـووی ﴿رَبِّ ٱحۡكُم بِٱلۡحَقِّۗ﴾ ئـەی پەروەردگارم بەدادگەرانـە بڕیاربدە (لە
نێوان من و ئەم بێ باوەڕانەدا) ﴿وَرَبُّنَا﴾ وە پەروەردگاری ئێمە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ﴾ میهرەبانی یارمەتی
لێ داواکراوە ﴿عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ لە بەرانبەر (ئەو قسە نابە جێیانەی) ئێوە دەیڵێن و هەڵیدەبەستن ﴿١١٢﴾

## سورەتی ﴿ الحَجّ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ به‌ناوی خوای به‌خشنده‌ی میهره‌بان
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئه‌ی خه‌ڵكینه ﴿ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ﴾ بترسن له‌(سزای) په‌روه‌ردگارتان ﴿إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ﴾ چونكه
به‌ڕاستی بوومه‌له‌رزه‌ی قیامه‌ت هه‌ستان ﴿شَيۡءٌ عَظِيمٞ﴾ شتێكی زۆر گه‌وره‌یه‌، كاره‌ساتێكی سامناكه
١ ﴿يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا﴾ له‌و ڕۆژه‌دا ئێوه ئه‌و (بوومه‌له‌رزه) ده‌بینن ﴿تَذۡهَلُ﴾ بێ ئاگا ده‌بێ (له‌ترسی ئه‌و ڕۆژه)
﴿كُلُّ مُرۡضِعَةٍ﴾ هه‌موو ئافره‌تێكی شیرده‌ر (كاتێ كه‌مه‌كی له‌ده‌می منداڵه‌كه‌یدایه) ﴿عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ﴾ له‌ئه‌و
(منداڵه)ی شیری پێ داوه ﴿وَتَضَعُ﴾ وه‌فڕێی ده‌دات و له‌ باری ده‌چێت ﴿كُلُّ ذَاتِ﴾ هه‌موو دووگیانێك
(مێینه‌یه‌كی سك پڕ) ﴿حَمۡلٍ حَمۡلَهَا﴾ سكه‌كه‌ی (كۆرپه‌كه‌ی) ﴿وَتَرَى ٱلنَّاسَ﴾ خه‌ڵكی ده‌بینی ﴿سُكَٰرَىٰ﴾
(وه‌ك) سه‌رخۆشن ﴿وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ﴾ به‌ڵام سه‌رخۆشیش نین ﴿وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ﴾ به‌ڵكو سزای
سه‌خت و به‌تینی خوا (وای لێ كردون) ٢ ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن﴾ له‌مرۆڤه‌كاندا كه‌سی وا هه‌یه (نه‌ضری
كوڕی حارث) ﴿يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ﴾ موجاده‌له ده‌كات ده‌رباره‌ی خوا (و سیفه‌ته‌كانی) ﴿بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾ به‌بێ هیچ
زانیاری و زانستێك ﴿وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ﴾ وه شوێنی هه‌موو شه‌یتانێكی سه‌ركه‌ش ده‌كه‌وێت ٣
﴿كُتِبَ عَلَيۡهِ﴾ له‌سه‌ری نوسراوه (بڕیار دراوه) ﴿أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ﴾ كه بێگومان هه‌ركه‌سێك خۆشی بوێت
(وشوێنی بكه‌وێت) ﴿فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ﴾ ئه‌وه به‌ڕاستی گومڕای ده‌كات ﴿وَيَهۡدِيهِ﴾ وه ڕێنموونی ده‌كات
﴿إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾ بۆ سزای ئاگری هه‌ڵگیرساوی دۆزه‌خ ٤ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئه‌ی خه‌ڵكینه ﴿إِن كُنتُمۡ﴾
ئه‌گه‌ر ئێوه ﴿فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ﴾ له‌گوماندان ده‌رباره‌ی زیندووبوونه‌وه ﴿فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم﴾ ئه‌وسا (بزانن)
به‌ڕاستی ئێمه ئێوه‌مان دروست كردووه ﴿مِّن تُرَابٖ﴾ له خاك (خۆڵ) ﴿ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ﴾ پاشان (نه‌وه‌كان)
له‌نوتفه‌یه‌ك (دروست ده‌بن) ﴿ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ﴾ دواتر (ده‌بێته) پارچه خوێنێكی مه‌ییو ﴿ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ﴾ دوای ئه‌وه
(ده‌بێته) پارچه گۆشتێك ﴿مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ﴾ شكڵ و شێوه كێشراو و شكڵ و شێوه نه‌كێشراو ﴿لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ﴾
بۆ ئه‌وه‌ی ڕوونی بكه‌ینه‌وه بۆ ئێوه ﴿وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ﴾ وه له‌منداڵداندا ده‌یهێڵینه‌وه (ڕایده‌گرین) ﴿مَا نَشَآءُ﴾
ئه‌و (بێچوو)ه‌ی بمانه‌وێت (له‌بار نه‌چێت) ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾ تاكاتێكی دیاری كراو ﴿ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا﴾ پاشان
(له‌سكی دایكتان) ده‌رتان ده‌هێنین به‌ساوایی ﴿ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ﴾ پاشان گه‌وره ده‌بن تاده‌گه‌نه ته‌واوی
هێزو تواناتان ﴿وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ﴾ وه‌(له‌م ته‌مه‌نه‌دا) هه‌ندێكتان ده‌مرێنرێت ﴿وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ﴾ وه هه‌ندێكتان
ده‌گه‌یه‌نرێنه ﴿إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ﴾ ئه‌و په‌ڕی پیری، بێ كه‌ڵكترینی ته‌مه‌ن ﴿لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ﴾ بۆ ئه‌وه‌ی نه‌زانێ و
له‌بیری نه‌مێنێت ﴿مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ﴾ هه‌رچی كه ده‌یزانی ﴿وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ﴾ وه‌زه‌وی ده‌بینی (له‌زستاندا)
﴿هَامِدَةٗ﴾ خامۆشه ووشك و بێ گیایه ﴿فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ﴾ جا كاتێك بارانمان به‌سه‌ردا باراند ﴿ٱهۡتَزَّتۡ﴾
زه‌وی (ڕووه‌كی لێ ده‌ڕوێت و) ده‌جوڵێت ﴿وَرَبَتۡ﴾ زه‌وی هه‌ڵ ده‌دات (به‌رز ده‌بێت) ﴿وَأَنۢبَتَتۡ﴾ و(زه‌وی)
ده‌ڕوێنێ ﴿مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ﴾ له‌هه‌موو جۆره (گیا و گوڵێكی) جوان ٥

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ﴾ ئه‌وه‌ی (باس کرا) له‌به‌ر ئه‌وه‌یه دڵنیابن ﴿ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾ که‌خوا حه‌ق و ڕاسته ﴿وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾
وه بێگومان مردووه‌کان زیند وو ده‌کاته‌وه ﴿وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ و بێگومان ئه‌و (خوایه) توانای به‌سه‌ر
هه‌موو شتێکدا هه‌یه ﴿٦﴾ ﴿وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ﴾ وه‌به‌ڕاستی قیامه‌ت ﴿ءَاتِيَةٞ﴾ دێت (وبه‌ڕپا ده‌بێت) ﴿لَّا رَيۡبَ فِيهَا﴾ گومانی
تێدا نی یه ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ﴾ ودڵنیاش بن خوا ﴿يَبۡعَثُ﴾ زیندو وی ده‌کاته‌وه ﴿مَن فِي ٱلۡقُبُورِ﴾ هه‌موو ئه‌وکه‌سانه‌ی له‌ناو
گۆڕه‌کاندا (مردوون) ﴿٧﴾ ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن﴾ وه له‌نا و خه‌ڵکدا که‌سی واهه‌یه ﴿يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ﴾ موجاده‌له ده‌کات
ده‌رباره‌ی خوا ﴿بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى﴾ به‌بێ هیچ زانیاری و شاره‌زاییه‌ك (به‌ڵگه‌یه‌ك) ﴿وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ﴾ وه به‌بێ
کتێبێکی ڕوونکه‌ره‌وه(له‌لایه‌ن خواوه) ﴿٨﴾ ﴿ثَانِيَ عِطۡفِهِۦ﴾ (که‌سێکه) ڕوو وه‌رده‌گێڕێت (وحه‌ق وه‌رناگرێت)
﴿لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ﴾ بۆ ئه‌وه‌ی خه‌ڵك له‌ڕێگه‌ی خوا لادا ﴿لَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ﴾ ئه‌و که‌سه له‌دونیادا سه‌رشۆڕ
ده‌بێت ﴿وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ وه له قیامه‌تیشدا پێی ده‌چێژین ﴿عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ﴾ سزای سوتێنه‌ر ﴿٩﴾ ﴿ذَٰلِكَ﴾ (پێی
ده‌ووترێت) ئه‌و سزایه (که باس کرا) ﴿بِمَا قَدَّمَتۡ يَدَاكَ﴾ به‌هۆی ئه‌و (گوناهانه‌وه‌یه) که‌به‌ده‌ستی خۆت پێشت
خستووه ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ﴾ وه‌بێگومان خوا ﴿لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ﴾ سته‌م کار نی یه ﴿لِّلۡعَبِيدِ﴾ به‌به‌نده‌کانی ﴿١٠﴾ ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن﴾ وه له‌ناو خه‌ڵکدا که‌سی واهه‌یه ﴿يَعۡبُدُ ٱللَّهَ﴾ خوا ده‌په‌رستێ ﴿عَلَىٰ حَرۡفٖۖ﴾ له قه‌راغدا، (له‌نێوانێکدا)
﴿فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ﴾ جا ئه‌گه‌ر تووشی خێر و خۆشی بوو ﴿ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ﴾ دڵخۆش ده‌بێ پێی (به‌رده‌وام ده‌بێ
له‌خواپه‌رستی دا) ﴿وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ﴾ وه‌ئه‌گه‌ر تووشی تاقیکردنه‌وه‌و به‌ڵا بوو ﴿ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ﴾ به‌ره‌و دوا
هه‌ڵده‌گه‌ڕێته‌وه پاش گه‌ز ده‌بێته‌وه له‌ئاین ﴿خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ﴾ زه‌ره‌ر مه‌ندی دونیا و قیامه‌ت بووه ﴿ذَٰلِكَ
هُوَ﴾ ته‌نها ئه‌وه‌یه ﴿ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ﴾ زیانباری و خه‌ساره‌ت مه‌ندی ڕوون و ئاشکرا ﴿١١﴾ ﴿يَدۡعُواْ﴾ ئه‌و ده‌پاڕێته‌وه
(وده‌په‌رستێ) ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ جگه‌له خوا ﴿مَا لَا يَضُرُّهُۥ﴾ شتێك نه‌زیانی پێده‌گه‌یه‌نێت ﴿وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ﴾
وه نه سوود و قازانجیشی پێده‌گه‌یه‌نێت ﴿ذَٰلِكَ هُوَ﴾ ته‌نها ئه‌وه‌یه ﴿ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ﴾ له‌ڕێ لادانی (گومڕایی)
زۆر دوور له‌ڕاستی ﴿١٢﴾ ﴿يَدۡعُواْ﴾ ئه‌و هاوارده‌کات، وده‌په‌رستێت ﴿لَمَن ضَرُّهُۥٓ﴾ (له) که‌سێك که‌زیانی
﴿أَقۡرَبُ مِن نَّفۡعِهِۦۚ﴾ له‌سوودی نزیکتره ﴿لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ﴾ ئای چ پشتیوانێکی خراپه ﴿وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ﴾ وه‌چ هاوڕێ
و هاوده‌مێکی خراپه ﴿١٣﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ به‌ڕاستی خوا ﴿يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئه‌وانه‌ی که‌باوه‌ڕیان
هێناوه و کردەوه چاکه‌کانیان کردووه ده‌یانخاته ﴿جَنَّٰتٖ﴾ باخه‌کانی به‌هه‌شته‌وه ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ﴾
که ڕووباره‌کان ده‌ڕۆن به‌ژێریاندا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بێگومان خوا ﴿يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ ئه‌وه‌ی بیه‌وێت ده‌یکات ﴿١٤﴾
﴿مَن كَانَ يَظُنُّ﴾ هه‌رکه‌س واگومان ده‌بات (له بێ بڕوایان) ﴿أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ﴾ که هه‌رگیز خوا ئه‌و (پێغه‌مبه‌ره ﷺ)
یارمه‌تی نادات و سه‌ری ناخات ﴿فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ له دونیا و دوارۆژدا ﴿فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ ده‌با په‌تێك
به‌سه‌ره‌وه (به به‌رزییه‌وه) هه‌ڵواسێت ( و ملی پێدا بکات) ﴿ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ﴾ پاشان هه‌ناسه‌ی ببڕێ (تا ده‌خنکێت)
﴿فَلۡيَنظُرۡ﴾ ئه‌وسا ببینێ (سه‌رنج بدا و بیر کاته‌وه) ﴿هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ﴾ ئایا به‌م کاره ئه‌و ڕق وتوڕه‌ییه‌ی
(له دڵیدایه) لایده‌بات (ونایهێڵێت) ﴿١٥﴾

﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ﴾ ئابەم شێوە ئەو (قورئانە)مان ناردۆتە خوارەوە﴿ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ کە ئایەتەکانی ڕون
وئاشکران ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ﴾ وە بێگومان خوا ﴿يَهْدِى مَن يُرِيدُ﴾ هەرکەسێك خۆی بیەوێت هیدایەتی
دەدات. (١٦) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بەڕاستی کەسانێك کەبڕوایان هێناوە﴿وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟﴾ و کەسانێك کەبوون
بەجوولەکە ﴿وَٱلصَّٰبِـِٔينَ﴾ و ئەستێرە (یا فریشتە) پەرستەکان ﴿وَٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ و گاوورەکان (نەسرانیەکان)
﴿وَٱلْمَجُوسَ﴾ و ئاگر پەرستەکان (زەردەشتی یەکان) ﴿وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟﴾ و ئەوانەی هاوبەشیان بۆ
خوا دانا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بێگومان خوا ﴿يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ﴾ بڕیار دەدا لەنێوانیاندا (جیایان دەکاتەوە لەیەکتر
کۆمەڵێك بۆ بەهەشت وکۆمەڵێکی تریان بۆ دۆزەخ) ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾
بەڕاستی خوا﴿عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارە. (١٧) ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ئایا نەتدی
﴿أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ﴾ کە بەڕاستی سوژدە بۆ خوا دەبات ﴿مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەوەی
لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەویدایە ﴿وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ﴾ هەروەها ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان
﴿وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ﴾ و چیاکان و درەخت و گیان لەبەران﴿وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ زۆرێکیش
لە خەڵکی (هەموو ئەمانەی باسکران بۆ خوا سوژدە دەبەن) ﴿وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ﴾ وە زۆرێکیش
سزای بۆ بڕیاردرا (لە سەری چەسپا) ﴿وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ﴾ وە هەر کەسێك خوا بێ ڕێز و ڕیسوای بکات
﴿فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ﴾ ئەوە کەس ڕێزی لێ ناگرێت﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا ﴿يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩﴾ هەر
شتێکی بوێت دەیکات (١٨) ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ﴾ ئەمانە دوو کۆمەڵی دژ بەیەکن ﴿ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ﴾
دەمەقاڵێ و کێشەیانە دەربارەی پەروەردگاریان ﴿فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ جا ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون
﴿قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ﴾ لە (ڕۆژی دواییدا) پۆشاکیان بۆ دەبڕدرێت (پڕ بە بەریان) لە ئاگر ﴿يُصَبُّ
مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ﴾ بەسەریاندا دەڕژێنرێت ﴿ٱلْحَمِيمُ﴾ ئاوی زۆر گەرم (١٩) ﴿يُصْهَرُ بِهِۦ﴾ دەتوێنرێتەوە
بەو (ئاوە گەرمە) ﴿مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ﴾ ئەوەی لە ناو سك و پێستەکاندایە (٢٠) ﴿وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ﴾
بۆیان ئامادەیە گورزی ئاسنی (٢١) ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟﴾ هەرکاتێك بیانەوێت﴿أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا﴾ کە بێنە دەرەوە
لەو(دۆزەخ)ە ﴿مِنْ غَمٍّ﴾ لەبەر زۆر ناڕەحەتی ﴿أُعِيدُوا۟ فِيهَا﴾ دەگێڕێنرێنەوە بۆ ناوی ﴿وَذُوقُوا۟ عَذَابَ
ٱلْحَرِيقِ﴾ وە(پێیان دەووترێت) بچێژن سزای سوتێنەر (٢٢) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا ﴿يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە دەیانخاتە
﴿جَنَّٰتٍ﴾ بەهەشتانێك ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕۆن ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا﴾
(ئەوان) دەڕازێنرێنەوە لەو (بەهەشتانە) دا ﴿مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا﴾ بە بازنی ئاڵتون و مرواری
﴿وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾ وە پۆشاکیان لە بەهەشتدا ئاوریشمە (٢٣)

﴿وَهُدُوٓاْ﴾ ئەو (بەهەشتیانە) ڕێنموونی کراون ﴿إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾ بۆ ئەو ووتەی کەڕاست وجوانە
(ووتـەی لا الە إلا اللە) ﴿وَهُدُوٓاْ﴾ هەروەها ڕێنموونی کراون ﴿إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ﴾ بۆ ڕێگای (خوای)
سـوپاس کـراو ﴿٢٤﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێگومان ئەوانەی بێ بـاوەڕ بوون ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وە
ڕێگری (موسـڵمانان) دەکەن لە ڕێگای خوا ﴿وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ وە لە (ڕۆشـتن بۆ) مزگەوتی حەرام
(بۆ کەعبە) ﴿ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ﴾ کە ئەوێمان داناوە (بۆ خوا پەرسـتی) ﴿لِلنَّاسِ سَوَآءً﴾ بۆ هەموو خەڵکی
یەکسـانە ﴿ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِ﴾ چ ئەوانـەی لەوێدان یـان لە دورەوە بۆی دێـن ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ﴾ وە هەر
کەس بیەوێت لەوێ (لە مزگەوتی حەرام) ﴿بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ﴾ مەیلی لە هەق لادان زوڵم وستەم بکات
﴿نُّذِقْهُ﴾ پێی دەچێژین ﴿مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ سزای ئازاردەر ﴿٢٥﴾ ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَٰهِيمَ﴾ (بیریان بخەرەوە)
کاتێـك دیاریمان کرد بـۆ ئیبراهیم (علیە السـلام) ﴿مَكَانَ ٱلْبَيْتِ﴾ جێگای کەعبە ﴿أَن لَّا تُشْرِكْ بِى
شَيْـًٔا﴾ (پێمـان ووت) هیچ شـتێك مەکەرە هاوبەشـم ﴿وَطَهِّرْ بَيْتِىَ﴾ و ماڵەکـەم (مزگەوتی حەرام)
پـاك بکەرەوە ﴿لِلطَّآئِفِينَ﴾ بۆ تەواف کـەران ﴿وَٱلْقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ و بۆ نوێژگەران (بەپێوە)
وکوڕنوش و سوژدە بەران ﴿٢٦﴾ ﴿وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ﴾ وە جاڕبدە بەناو خەڵکیدا ﴿بِٱلْحَجِّ﴾ بۆ حەج کردن
﴿يَأْتُوكَ رِجَالًا﴾ دێن بۆ لات (بۆ حەج) بە پیادە. ﴿وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ﴾ و بەسـوار هەموو ووشـترێکی
لاواز (لەبـەر ئـەوەی) ﴿يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ کـە لـە هەمـوو ڕێگایەکـی دوورەوە دێـن ﴿٢٧﴾
﴿لِّيَشْهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمْ﴾ تـا ئامـادەی جۆرەهـا سـوود و قازانجـی خۆیـان ببـن ﴿وَيَذْكُرُواْ ٱسْمَ ٱللَّهِ﴾
وە نـاوی خوا ببـەن (کاتێك قوربانی سـەر دەبڕن) ﴿فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ﴾ لە ڕۆژانێکـی دیاری کراودا
﴿عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ لەسـەر ئـەو ئاژەڵانـەی خـوا پێـی داوون ﴿فَكُلُواْ مِنْهَا﴾ جـا
لـەو (گۆشـتی قوربانیانـە) بخـۆن ﴿وَأَطْعِمُواْ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ﴾ وە بیـدەن بە نـەداران و هـەژاران ﴿٢٨﴾
﴿ثُمَّ لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ﴾ دوای (سـەر بڕینی قوربانی) چڵك و پیسـی (موو ونینۆك) لابەن بە خۆیانەوە
﴿وَلْيُوفُواْ نُذُورَهُمْ﴾ وە نەزرەکانیـان جێبەجـێ بکـەن ﴿وَلْيَطَّوَّفُواْ﴾ و تـەواف (ی ئیفاضـە) بکـەن
﴿بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ بە دەوری ماڵی دێرین و بەڕێزدا (بەدەوری کەعبەدا) ﴿٢٩﴾ ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەمەی (پێشوو
باسـی حەج بـوو) ﴿وَمَن يُعَظِّمْ﴾ جا هەر کـەس بپارێزێـت و بە گـەورەی بگرێت ﴿حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ﴾
سـنوورەکانی خـوا ﴿فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ﴾ ئـەوە بـۆ خـۆی چاکتـرە ﴿عِندَ رَبِّهِۦ﴾ لای پەروەردگـاری
﴿وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ﴾ وە گۆشـتی ئـاژەڵ (مـەڕ، بـزن، مانگـا، وشـتر) بـۆ ئێـوە حـەڵاڵ کـراوە
﴿إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ جگـە لەوانەی بۆتان باس دەکرێت (وەك مـردارەوە بوو، یان بۆغەیری خودا
سـەربڕراو) ﴿فَٱجْتَنِبُواْ﴾ کەواتە خۆتـان دوور بخەنەوە ﴿ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ﴾ لەو پیسـیە کە بتەکانە
﴿وَٱجْتَنِبُواْ قَوْلَ ٱلزُّورِ﴾ هەروەها خۆتان بپارێزن لەقسەی درۆو ناڕەوا ﴿٣٠﴾

﴿حُنَفَآءَ لِلَّهِ﴾ گەردن کەچ بن بۆ خوا (خۆتان لە هەموو بیرو باوەڕێکی لار دووربگرن) ﴿غَيْرَ مُشْرِكِينَ
بِهِۦ﴾ هاوبەش بڕیاردەر مەبن بۆ خوا ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ﴾ جا هەرکەس هاوبەش بۆ خوا دابنێت
﴿فَكَأَنَّمَا﴾ ئەوە وەك ئەوە وایە ﴿خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لە ئاسمان کەوتبێتە خوارەوە ﴿فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ﴾ ئەمجا باڵندە
(لە هەوادا) بە پەلە بیفڕێنێت (وپارچە پارچەی بکات) ﴿أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ﴾ یا بایەکی توند بیبات
﴿فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ بۆ جێگایەکی زۆر دوور (چۆڵەوانی) ﴿٣١﴾ ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەمە (کە باسکرا نموونەی هاوبەش
دانان بوو بۆ خوا) ﴿وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ﴾ وە هەر کەس دروشمەکانی (ئایینی) خوا بەگەورە ڕاگرێت
﴿فَإِنَّهَا﴾ جا بەڕاستی ئەو کارە ﴿مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ﴾ لە خوا ترسی دڵەکانیانەوەیە (وتەقواکارن) ﴿٣٢﴾
﴿لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ﴾ بۆ ئێوە لەو (ئاژەڵانە)دا چەند سوود وەرگرتنێك هەیە (وەك سوار بوون،
خواردنی شیریان) ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ (جگە لەمانەیش دەتوانن سوودیان لێ ببینن بەشێوەیەك زیانیان پێ
نەگات) تاکاتی دیاری کراو (بۆ سەربڕینیان) ﴿ثُمَّ مَحِلُّهَآ﴾ کە شوێنی (سەربڕینی) ئەوانە ﴿إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾
کاتێکە دەگەنە ماڵی دێرینی (کەعبە) ﴿٣٣﴾ ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ﴾ وە بۆ هەموو ئوممەتێك ﴿جَعَلْنَا مَنسَكًا﴾
قوربانی کردنمان داناوە ﴿لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ﴾ بۆ ئەوەی ناوی خوا بیەن ﴿عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ﴾
(کاتی سەربڕین) لەسەر ئەو ئاژەڵانەی خوا پێی داون ﴿فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ جا خوای ئێوە پەرستراوێکی
تەنهایە ﴿فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟﴾ کەواتە تەنها ملکەچی ئەو بن ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ﴾ وە مژدە بدە بەملکەچان و خۆ
بەکەم زانان ﴿٣٤﴾ ﴿ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ﴾ ئەوانەی هەرکاتێك ناوی خوا برا ﴿وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵەکانیان
دەترسێ (دەلەرزێت) ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ﴾ وە ئارام گرن لەسەر ئەوەی تووشیان دەبێ (لەناخۆشی)
﴿وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ وە بەجێ هێنەرانی نوێژەکانیان ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ وە لەو ڕزق ڕۆزییەی
پێمان داون دەبەخشن ﴿٣٥﴾ ﴿وَٱلْبُدْنَ﴾ ئەو ووشترە گەورە و قەڵەوانە (دەبرێن لەبیت الحرام سەردەبڕێن)
﴿جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ﴾ ئێمە کردومانەتە دروشمی خوا بۆ ئێوە ﴿لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ﴾ بۆ ئێوە لەواندا خێر
وچاکە هەیە ﴿فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا﴾ کەواتە (کاتی کردنیان بەقوربانی) ناوی خوایان لەسەر بهێنن ﴿صَوَآفَّ﴾
لە کاتێکدا لەسەر سێ پەل وەستاون و دەستی چەپیان بەسراوەتەوە (لەبەر ئەوەی وشتر بە پێوە سەر دەبڕدرێت)
﴿فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا﴾ جا کاتێك کەوتنە سەر زەوی بە تەنیشتدا (کاتێك گیانیان دەرچوو) ﴿فَكُلُوا۟ مِنْهَا﴾ ئەوە
لە گۆشتەکەیان بخۆن ﴿وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ﴾ وە بیدەن بە هەژاران و سواڵکەران ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ﴾ ئا بەو
جۆرە ئەو ماڵاتانەمان بۆ ئێوە ڕامهێناوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ تا سوپاس گوزاربن بۆ خوا ﴿٣٦﴾ ﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ﴾
هەگیز ناگات بە خوا ﴿لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا﴾ نە گۆشتی ئەو (قوربانیانە) نەخوێنیان ﴿وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ﴾
بەڵام ئەوەی بە خوا دەگات تەقوا و پارێزکاری ئێوەیە ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ﴾ ئا بەو جۆرە ئەو ماڵاتانەی
بۆ ئێوە ڕامهێناوە ﴿لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ﴾ بۆ ئەوەی خوا بە گەورە بگرن (یادی بکەن) ﴿عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ﴾ لەسەر
ئەوەی ڕێنموونی کردوون (بۆ سەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام) ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ وەمژدە بدە بەچاکە کاران
﴿٣٧﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ﴾ بەڕاستی خوا بەرگری وپشتیوانی دەکات ﴿عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ لەوانەی کە بڕوایان هێناوە
﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ﴾ بێگومان خوا خۆشی ناوێ ﴿كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ﴾ هەموو خیانەتکار و بێ باوەڕ
وکافرێك ﴿٣٨﴾

﴿أُذِنَ﴾ ڕێگە درا (بەجەنگ و جیهاد کردن) ﴿لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ﴾ بە ئەو (موسڵمانانەی) شەڕیان لەگەڵدا
دەکرێت ﴿بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ﴾ لەبەر ئەوەی کە بەڕاستی ستەمیان لێ کراوە ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ﴾ وە بێگومان خوا
﴿عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ بۆ سەرخستنیان بە توانایە (٣٩) ﴿ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ﴾ ئەوانەی کە دەرکران ﴿مِن دِيَٰرِهِم
بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ لە ماڵ و وڵاتیان بە ناهەق ﴿إِلَّآ أَن يَقُولُواْ﴾ تەنها (گوناهیان ئەوە بوو) کە دەیان ووت
﴿رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾ پەروەردگارمان خوایە ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ﴾ وە ئەگەر خوا خەڵکی لە ناو نەبردایە
﴿بَعْضَهُم بِبَعْضٍ﴾ هەندێکیان بە هەندێکی تریان ﴿لَّهُدِّمَتْ﴾ بێگومان دەڕوخێنرا (وێران دەکرا)
﴿صَوَٰمِعُ﴾ دێر (خەڵوەتگە) ﴿وَبِيَعٌ﴾ و کلیسا ﴿وَصَلَوَٰتٌ﴾ و کەنیسە ﴿وَمَسَٰجِدُ﴾ مزگەوتەکان
﴿يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴾ کە یادی خوا لەو (پەرستگایانە)دا زۆر دەکرا ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن﴾ وە
بێگومان خوا یارمەتی کەسانێك ئەدات (وسەریان دەخات) ﴿يَنصُرُهُۥٓ﴾ کە یارمەتی (دینی) خوا
دەدەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بە ڕاستی خوا ﴿لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ بەهێز وباڵادەست و بەتوانایە (٤٠) ﴿ٱلَّذِينَ إِن
مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەوانەی ئەگەر دەسەڵاتمان پێدان لە زەویدا ﴿أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بە چاکی نوێژ
بەجێ دەهێنن ﴿وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە زەکات دەدەن ﴿وَأَمَرُواْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ و فەرمان دەدەن بە چاکە
﴿وَنَهَوْاْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ و بەرگری دەکەن لە خراپە ﴿وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ و سەرئەنجامی هەموو کارەکان
تەنهابەدەست خوایە (٤١) ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ﴾ وە ئەگەر (بێ باوەڕان) تۆبە درۆزن دەزانن وباوەڕت پێ ناکەن
﴿فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ﴾ ئەوە بێگومان پێش ئەوانیش (گەلانی تر) باوەڕیان نەکرد (بە پێغەمبەرەکانیان)
﴿قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ﴾ (وەك) گەلی نووح و عاد و سەموود (٤٢) ﴿وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ﴾ وە گەلی
ئیبراهیم و گەلی لووط (٤٣) ﴿وَأَصْحَٰبُ مَدْيَنَ﴾ هەروەها یارانی مەدیەن (هۆزی شوعەیب) ﴿وَكُذِّبَ
مُوسَىٰ﴾ وە مووساش بە درۆزن دانرا ﴿فَأَمْلَيْتُ لِلْكَٰفِرِينَ﴾ ئەمجا (بۆ ماوەیەك) مۆڵەتی بێ باوەڕانمدا
﴿ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ﴾ دواتر تۆڵەم لێ سەندن وگرتمن ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ جا چۆن بوو بە گژا چوونی
ئێمە (لەوان) (٤٤) ﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا﴾ ئەمجا چەندەها شار و دێهاتمان وێران کرد ﴿وَهِىَ
ظَالِمَةٌ﴾ کە (خەڵکەکەی) ستەمکار بوون ﴿فَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾ ئەو(شارانە دیواری خانووەکانی)
کەوتبوون بەسەر سەربانەکانیاندا ﴿وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ﴾ وە چەندەها بیر بێ خاوەن بوون (لە کار کەوتبوون)
﴿وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ﴾ وە چەندەها کۆشکی بەرز و بڵند (بێ خاوەن بوون) (٤٥) ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ دەی
ئایا ئەوانە بە زەوی دا نەگەڕاون ﴿فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ﴾ تا دڵیان هەبێت ﴿يَعْقِلُونَ بِهَآ﴾ بیری پێ بکەنەوە
(لەو وێران بوونە) ﴿أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ یان گوێیان هەبێت گوێی پێ بگرن (بۆ ڕاستی) ﴿فَإِنَّهَا
لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ لەڕاستی دا چاوەکان کوێر نابن ﴿وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ﴾ بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن
﴿ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ﴾ کەلە سینەکاندان (٤٦)

﴿وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ﴾ وە ئـەوان (قورەیـش بە گاڵتەوە) بەپەلە داوای سـزات لێ دەکەن ﴿وَلَن يُخۡلِفَ
ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥۚ﴾ لەکاتێکـدا هەرگیز خوا پێچەوانـەی بەڵێنی خۆی ناکات ﴿وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ﴾ و بێگومان
ڕۆژێـك لای پەروەردگـارت ﴿كَأَلۡفِ سَنَةٖ﴾ وەك هەزار سـاڵ وایە ﴿مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ لەو سـاڵانەی
ئێوە دەیژمێرن (٤٧) ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَمۡلَيۡتُ لَهَا﴾ وە(خەڵکی) چەندەها شار و گوند (هەبوون) مۆڵەتم
دان ﴿وَهِيَ ظَالِمَةٞ﴾ کـە سـتەمکار بـوون ﴿ثُمَّ أَخَذۡتُهَا﴾ لەپاشـان تۆڵـەم لێ سـەندن (ولەنـاوم بردن)
﴿وَإِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ﴾ وە هەر بۆلای من دەگەڕێنەوە (٤٨) ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ بڵێ ئەی خەڵکینە ﴿إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمۡ﴾
بێگومان من بۆ ئێوە تەنها ﴿نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾ ترسێنەرێکی ئاشکرام. (٤٩) ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەمجا ئەو کەسانەی
بڕوایان هێناو ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە کردەوە چاکەکانیان کرد ﴿لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾ لێخۆشبوون
و ڕۆزییەکـی بەنـرخ وفراوانیان بـۆ ئامادەیـە (٥٠) ﴿وَٱلَّذِينَ سَعَوۡاْ فِيٓ ءَايَٰتِنَا﴾ وە ئەوانـەی هەوڵیان داوە
بۆ (دژایەتی) ئایەتەکانی ئێمە ﴿مُعَٰجِزِينَ﴾ ناتواناو دەستەپاچەن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾ ئەوانەهاوەڵی
دۆزەخن (٥١) ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ﴾ وە ئێمە لەپێش تۆ نەمان ناردووە ﴿مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ﴾ هیچ ڕەوانەکراو
یـان پێغەمبەرێـك ﴿إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ﴾ مەگەر هـەر کاتێك (پەڕاوی خـودای) خوێندبێتـەوە بۆ گەلەکەی
﴿أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ﴾ شـەیتان گومـان و وەسوەسـەی دەخستە نـاو خوێنراوەکەیەوە (تـا خەڵك
بـاوەڕی پـێ نەهێنن) ﴿فَيَنسَخُ ٱللَّهُ﴾ ئەمجا خـوا لایدەبات (پوچەڵـی دەکاتەوە) ﴿مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾
ئەوەی شـەیتان داوێتی بە گوێی خەڵکدا (لە وەسوەسـە ودڵەڕاوکێ و دوودڵی) ﴿ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ﴾
پاشـان خوا ئایەتەکانی خۆی دەچەسـپێنێ ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ وە خوا زانای کاردروسـتە (٥٢) ﴿لِّيَجۡعَلَ
مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ لەبـەر ئەوەی ئەو گومانانەی شـەیتان دەیخاتە(دڵـەکان خوا) دەیکاتە ﴿فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ﴾
(هۆی) تاقیکردنەوە بۆ ئەوانەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡۗ﴾ نەخۆشی لە دڵیاندایە و (ئەوانەی)
دڵیـان ڕەقـە ﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە بەڕاسـتی سـتەمکاران ﴿لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ﴾ لـە دژایەتـی یەکـی زۆر
دوور(لە ڕاستی) دان (٥٣) ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ﴾ وە بۆ ئەوە بزانن ئەو کەسانەی ﴿أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ﴾ کە زانیاریان
پێ دراوە ﴿أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ بێگومان ئەم (قورئان)ە ڕاستیەکە لە لایەن پەروەردگارتەوە ﴿فَيُؤۡمِنُواْ
بِهِۦ﴾ تا باوەڕی پێ بێنن(وبەردەوام بن لەسـەری) ﴿فَتُخۡبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمۡۗ﴾ وە دڵەکانیان ملکەچ و بەئارام
ببـێ بۆ ئـەو (خـوا) ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ﴾ وە بێگومان خـوا هیدایەتدەری ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەو کەسـانەیە کە
باوەڕیان هێناوە ﴿إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ بۆ سـەر ڕێگای ڕاست (٥٤) ﴿وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەردەوام
ئەو کەسانەی بێ باوەڕن ﴿فِي مِرۡيَةٖ مِّنۡهُ﴾ لە گوماندان دەربارەی قورئان ﴿حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةً﴾ هەتا
لەنـاکاودا ڕۆژی دوایی یەخەیان دەگرێت ﴿أَوۡ يَأۡتِيَهُمۡ﴾ یا یەخەیان دەگرێت (ودێت بۆیان) ﴿عَذَابُ
يَوۡمٍ عَقِيمٍ﴾سزای ڕۆژێکی نەزۆك و بێ خێر (کە ڕۆژی قیامەتە) (٥٥)

﴿ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ﴾ ده‌سه‌ڵات و پاشایه‌تی له‌و ڕۆژه‌دا ته‌نها بۆ خوایه ﴿يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡۚ﴾ له‌نێوانیاندا
دادوه‌ری ده‌كات ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئه‌مجا ئه‌و كه‌سانه‌ی باوه‌ڕیان هێناوه‌و
كرده‌وه چاكه‌كانیان كردووه ﴿فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ له به‌هه‌شتانی پڕ نازو نیعمه‌ت دان ﴿٥٦﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ﴾ وه ئه‌و كه‌سانه‌ی بێ باوه‌ڕ بوون ﴿وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ وه ئایه‌ته‌كانی ئێمه‌یان به‌درۆ ده‌زانی
﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ﴾ بۆ ئه‌وانه هه‌یه ﴿عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ سزای ڕیسواكه‌ر ﴿٥٧﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾
وه ئه‌و كه‌سانه‌ی كۆچیان كردووه ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ له‌ڕێگای خوادا ﴿ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ﴾ پاشان
كوژران(شه‌هید بوون) یان مردن ﴿لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ﴾ بێگومان خوا ڕزق وڕۆزیه‌كی
چاكیان ده‌داتێ ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ﴾ وه بێگومان خوا ﴿لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ چاكترینی ڕۆزی ده‌رانه ﴿٥٨﴾
﴿لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥۗ﴾ سوێند به‌خوا، خوا ئه‌وانه ده‌خاته جێگایه‌ك كه‌پێی ڕازی ده‌بن
﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ﴾ وه بێگومان خوا زانای له‌سه‌ر خۆیه ﴿٥٩﴾ ﴿ذَٰلِكَۖ﴾ ئه‌مه‌ی (باسمان كرد بۆت)
﴿وَمَنۡ عَاقَبَ﴾ وه هه‌ر كه‌سێك تۆڵه‌ی خۆی بسێنێت (له‌ده‌س درێژی كه‌ر) ﴿بِمِثۡلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ﴾
به‌وێنه‌ی ئه‌و سته‌مه‌ی لێی كراوه ﴿ثُمَّ بُغِيَ عَلَيۡهِ﴾ له‌دوای ئه‌وه جارێكی تر ده‌ست درێژی بكرێته سه‌ر
﴿لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُۚ﴾ ئه‌وه بێگومان خوا یارمه‌تی ده‌دات (سه‌ری ده‌خات) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ﴾
به‌ڕاستی خوا چاوپۆشی كه‌ری لێبورده‌یه ﴿٦٠﴾ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئه‌م (سه‌رخستنه‌ی خوا) له‌به‌ر
ئه‌وه‌یه به‌ڕاستی خوا ﴿يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ﴾ (ئه‌وه‌نده به‌ده‌سه‌ڵاته) شه‌و ده‌باته ناو ڕۆژه‌وه (كاتێك
شه‌و درێژ تر بێت له‌ڕۆژ) ﴿وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ﴾ وه‌ڕۆژ ده‌باته ناو شه‌وه‌وه ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ
بَصِيرٞ﴾ وه بێگومان خوا بیسه‌ری بینایه ﴿٦١﴾ ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئه‌مه ﴿بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾ له‌به‌ر ئه‌وه‌یه
به‌ڕاستی هه‌ر خوا هه‌ق و ڕاسته ﴿وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ وه‌بێگومان ئه‌وه‌ی جگه له‌خوا هاواری
لێ ده‌كه‌ن (وده‌یپه‌رستن) ﴿هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ﴾ هه‌ر ئه‌و به‌تاڵ و ناڕاسته ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ﴾ وبه‌ڕاستی خوا
﴿هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ﴾ هه‌ر خۆی به‌رزو بڵندو گه‌وره‌یه ﴿٦٢﴾ ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾ ئایا نابینی ﴿أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ﴾
كه‌به‌ڕاستی خوا باراندویه‌تی ﴿مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ له ئاسمانه‌وه باران ﴿فَتُصۡبِحُ ٱلۡأَرۡضُ مُخۡضَرَّةًۚ﴾
(به‌هۆی ئه‌و بارانه‌وه) زه‌وی سه‌وز ده‌بێت (به‌ڕوه‌ك) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ﴾ بێگومان خوا
وردبینی ئاگایه (به هه‌موو شتێك) ﴿٦٣﴾ ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ هه‌ر بۆ خوایه ئه‌وه‌ی له ئاسمانه‌كانه
﴿وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ و ئه‌وه‌یشی له زه‌ویدایه ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ﴾ وه به‌ڕاستی خوا ﴿لَهُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ﴾
هه‌ر خۆی بێ نیاز و ده‌وڵه‌مه‌نده وشایسته‌ی سوپاسه ﴿٦٤﴾

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ﴾ ئایا نابینی (نازانی) بەڕاستی خوا ﴿سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ﴾ ڕامی هێناوە بۆتان
وخستویەتیە خزمەتتانەوە هەموو ئەو شتانەی لەزەویدایە ﴿وَالْفُلْكَ تَجْرِي﴾ وەکەشتی (ڕام
هێناوە بۆتان) ودەڕوات ﴿فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ﴾ بەناو دەریادا بەفەرمانی ئەو (بەفەرمانی خوا)
﴿وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ﴾ وەئاسمانی ڕاگیر کردووە ﴿أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ﴾ تا نەکەوێت بەسەر زەویدا
﴿إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾ مەگەر بەفەرمانی ئەو نەبێت ﴿إِنَّ اللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا ﴿بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾
دڵسۆز و میهرەبانە بەرانبەر بەخەڵکی ﴿٦٥﴾ ﴿وَهُوَ الَّذِي أَحْيَاكُمْ﴾ وە ئەو (خوا) زاتێکە کەژیانی
پێ بەخشیوون (لەسەرەتای دروسکردنتانەوە) ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ دواتر دەتانمرێنێت
پاشان زیندووتان دەکاتەوە ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ﴾ بێگومان خەڵکی زۆر ناسوپاس و سپڵەن ﴿٦٦﴾
﴿لِّكُلِّ أُمَّةٍ﴾ بۆ هەموو ئوممەتێك ﴿جَعَلْنَا مَنسَكًا﴾ شەریعەت و بەرنامەیەکمان داناوە
﴿هُمْ نَاسِكُوهُ﴾ ئەوان کاریان پێ کردووە ﴿فَلَا يُنَازِعُنَّكَ فِي الْأَمْرِ﴾ کەواتە نابێت (خاوەن
ئایینەکانی تر) لەکاری ئاییندا کێشە و ئاژاوەت لەگەڵدا دروست کەن ﴿وَادْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ وەتۆ خەڵك
بانگ بکە بۆ لای پەروەردگارت ﴿إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ﴾ بێگومان تۆ لەسەر ئایینێکی ڕاستی ﴿٦٧﴾
﴿وَإِن جَادَلُوكَ﴾ جا ئەگەر دەمەقاڵێ وموجادەلەیان لەگەڵدا کردیت ﴿فَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ تۆش
بڵێ خوا خۆی چاك دەزانێ بەو کردەوانەی کە ئێوە دەیکەن ﴿٦٨﴾ ﴿اللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ﴾ خوا دادوەری
دەکات لەنێوانتاندا ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا ﴿فِيمَا كُنتُمْ﴾ لەو شتانەی کەئێوە ﴿فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾
تێیدا جیاوازن ﴿٦٩﴾ ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ﴾ ئایا نازانی ﴿أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ﴾ بەڕاستی خوادەزانێ ﴿مَا فِي السَّمَاءِ
وَالْأَرْضِ﴾ بەهەموو ئەو شتانەی لە ئاسمان و زەویدایە ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ﴾ بێگومان ئەوەی
باسکرا لەکتێب لە (لوح المحفوظ) دایە ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بەڕاستی ئەم (زانیارییەی باسکرا)
بەلای خواوە ئاسانە ﴿٧٠﴾ ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا﴾ ئەوان جگە لەخوا شتێك دەپەرستن ﴿لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ
سُلْطَانًا﴾ (خوا) هیچ بەڵگەیەکی نەناردۆتە خوارەوە لەسەری ﴿وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ﴾ وە بێگومان
خۆشیان هیچ زانیاریان دەربارەی ئەو (پەرستراوە) نیە ﴿وَمَا لِلظَّالِمِينَ﴾ وەبۆ ستەم کاران نیە
﴿مِن نَّصِيرٍ﴾ هیچ یارمەتی دەرێك ﴿٧١﴾ ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ وەکاتێ بخوێنرێتەوە بۆیان ﴿آيَاتُنَا
بَيِّنَاتٍ﴾ نیشانە ڕوونەکانی ئێمە ﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لەدەم و چاوی ئەو کەسانەی بێ باوەڕن
دەبینی ﴿الْمُنكَرَ﴾ ڕووگرژی و توڕەیی ﴿يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِالَّذِينَ﴾ نزیکە پەلامار (وهێرش) بەرن بۆ
ئەو کەسانەی ﴿يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾ کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێنێتەوە ﴿قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم﴾ (ئەی
موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا هەواڵتان بدەمێ ﴿بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ﴾ بەخراپتر لەو (ڕوگرژی و توڕەییەی)
ئێوە چی یە ﴿النَّارُ﴾ ئاگری دۆزەخە ﴿وَعَدَهَا اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ کەخوای گەورە بەڵێنی داوە بەو
کەسانەی کە بێ باوەڕن ﴿وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ چ جێگە و ئاکامێکی خراپە (کە پێ ی دەگەن) ﴿٧٢﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئـەی خەڵكینە ﴿ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ﴾ نموونەیەك هێنراوەتەوە جا گوێی بۆ بگرن
﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ﴾ بێگومـان ئەوانـەی هاواریـان لـێ دەكەن ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ لـە جیاتی خوا ﴿لَن
يَخۡلُقُواْ ذُبَابًا﴾ هەرگیز ناتوانن مێشێك دروست بكەن ﴿وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ﴾ هەرچەند هەمووشیان بۆی
كۆببنەوە ﴿وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا﴾ وە ئەگەر مێشیش شتێكیان لـێ بفڕێنێ ﴿لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ﴾
ناتوانـن لێـی بسێننەوە ﴿ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ﴾ داواكار و داوا لێ كراو لاواز و بێ دەسەڵاتن ﴿٧٣﴾
﴿مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓۚ﴾ ئەوانـە بـەو شێوە پێویستە خوا بناسن نەیان ناسیوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾
بێگومـان خـوا بە توانـای بەدەسەڵاتە ﴿٧٤﴾ ﴿ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا﴾ خـوا لە فریشتەكاندا
نێـرداو هەڵدەبژێرێـت ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ﴾ هەروەهـا لـە خەڵكیش دا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ﴾ بەڕاستـی
خـوا بیسـەری بینایـە ﴿٧٥﴾ ﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۚ﴾ خـوا ئاگادارە بـەوەی لـە بەردەمیاندایە
(رووی داوە) و بـەوەی لە دوایانەوەیە (دواتر ڕوودەدات) ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ و هەموو كارەكان
هـەر بۆ لای خـوا دەگەڕێتەوە ﴿٧٦﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی كـە باوەڕتان هێناوە ﴿ٱرۡكَعُواْ
وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ﴾ كوڕنـوش و سـوژدە بـەرن و پەروەردگارتان بپەرستن ﴿وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ
لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ۩﴾ وە كاری چاك بكەن بۆ ئەوەی ڕزگاربن ﴿٧٧﴾ ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ﴾ جیهاد
و تێكۆشـان بكەن لە پێناوی خوادا بەو شێوەیەی شایستە وشیاویەتی ﴿هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ﴾ ئەو (خوا)
ئێـوەی هەڵبـژاردوە (بۆ هەڵگرتنی ئـەم ئاینە) ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ﴾ وە لـە ئاینـدا هیچ
كارێكی قورس و گرانی لەسـەر دانەناون ﴿مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ﴾ ئەمـە ئاینی ئیبراهیمی باوە گەورەتانە
﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا﴾ ئەو (خوا) پێشتر ئێوەی بە موسڵمان ناوناوە وەلەم قورئانەشدا
﴿لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ﴾ تا پێغەمبەر ببێت بە شاهید لەسەر ئێوە ﴿وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِۚ﴾ وە ئێوەش
ببنـە شـاهیـد لەسـەر خـەڵـكی ﴿فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ كەواتە بـە چاكـی نوێژەكانتان بكەن
وزەكات بدەن ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ﴾ وە تەنها پشت بە خوا ببەستن ﴿هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ﴾ چونكە هەر ئەو پشتیوانتانە
﴿فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ﴾ ئای چەند پشتیوان و یارمەتی دەرێكی چاكە ﴿٧٨﴾

## سورەتی ﴿ المؤمنون ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ بەڕاستی باوەڕداران ڕزگار دەبن (سەر دەکەون) (١) ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ﴾
ئەوکەسانەی کەلە نوێژەکانیاندا ﴿خَٰشِعُونَ﴾ لەخواترسن (گەردن کەچن بۆخوا) (٢) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ﴾
وە ئەوانەی ﴿عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ﴾ لەشتی بێ هوودە خۆیان دوور دەگرن (٣) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ﴾ وە ئەوانەی
﴿لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ﴾ کەزەکاتی (سامانیان) دەردەکەن (٤) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ﴾ وەئەوانەی ﴿لِفُرُوجِهِمۡ
حَٰفِظُونَ﴾ کەپارێزەری داوێنیان (لەشەروالّ پیسی) (٥) ﴿إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ﴾ مەگەر بۆ خێزانی
خۆیان ﴿أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ﴾ یابۆ کەنیزەکێك کەبووبن بەخاوەنیان ﴿فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ﴾ ئەوە بەڕاستی
ئەوانە سەرزەنشت ناکرێن (٦) ﴿فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ﴾ ئەمجا هەرکەسێ نیازی جگەلەو (دووجۆرە
ئافرەتە) بکات (و ئارەزووی خۆی تێربکات) ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ﴾ ئەوسا ئەوانە دەست درێژی
کەرن (٧) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ﴾ وە ئەوانەی کەپارێزەری سپاردەو پەیمانەکانیانن (٨)
﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ﴾ وەئەوانەی کەبەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان (٩) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ﴾
هەر ئەوانەن میرات گران (١٠) ﴿ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ﴾ ئەوانەی کەدەبنە خاوەنی فیردەوس ومیراتگری
(بەهەشت) ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوان لەبەهەشتدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی (١١) ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ﴾
سوێند بەخوا بەڕاستی مرۆڤمان دروست کرد ﴿مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ﴾ لەخۆلاسەو پاڵفتەیە لەقوڕ (١٢)
﴿ثُمَّ جَعَلۡنَٰهُ نُطۡفَةٗ﴾ لەپاشان ئەومان کرد بەنوتفەیەك ﴿فِي قَرَارٖ مَّكِينٖ﴾ لەئارامگایەکی قایم (منالّدانی
دایك)دا (١٣) ﴿ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةٗ﴾ دواتر نوتفەکەمان کرد بەخوێنی مەیيو ﴿فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةٗ﴾
ئەمجا خوێنە مەییوەکەشمان کرد بەپارچە گۆشتێکی جووا و ﴿فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمٗا﴾ ئەمجا پارچە
گۆشتەکەشمان کرد بەئێسقان ﴿فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمٗا﴾ ئەمجا بەگۆشت (پەیکەرە) ئێسکەکەمان
داپۆشی ﴿ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَۚ﴾ پاشان ئەومان کرد بەدروست کراوێکی تر ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ﴾ جا گەورە
وپیرۆزە ئەو خوایەی ﴿أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ﴾ کەچاکترینی بەدی هێنەرانە (١٤) ﴿ثُمَّ إِنَّكُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ﴾
پاشان بەڕاستی ئێوە لەدوای ئەوە هەمووتان دەمرن (١٥) ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تُبۡعَثُونَ﴾ لە پاشان
بێگومان ئێوە لەڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێنەوە (١٦) ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی
لەسەری ئێوەوە دروستمان کردوە ﴿سَبۡعَ طَرَآئِقَ﴾ حەوت نهۆم ئاسمان ﴿وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ﴾
وە ئێمە لە دروست کراوەکان بێ ئاگانین (١٧)

﴿وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٍ﴾ وە لە ئاسمانەوە بە ئەندازە(ی پێویست) بارانمان باراند ﴿فَأَسۡكَنَّٰهُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾
ئەمجا ئەو (ئاوە)مان لە زەوی دا هێڵایەوە (ڕاگرت) ﴿وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابِۭ بِهِۦ﴾ وە بێگومان ئێمە بەسەر لەناوبردنی
ئـەو (ئـاوە)دا. ﴿لَقَٰدِرُونَ﴾ بەتواناین ﴿١٨﴾ ﴿فَأَنشَأۡنَا لَكُم بِهِۦ﴾ ئەمجا بـە هۆی ئەو (بارانـە)وە بەدیمان هێناوە
(ڕواندومانـە) بۆتـان ﴿جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ﴾ چەند باخـی خورما و تریێ ﴿لَّكُمۡ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٞ﴾ بـۆ ئێوە هەیە
لەو باخانەدا میوەی زۆر ﴿وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ﴾ وە لە هەندێکیان دەخۆن (بەشێوەی بژێوی وەك مێوژ و خورما)
﴿١٩﴾ ﴿وَشَجَرَةٗ تَخۡرُجُ مِن طُورِ سَيۡنَآءَ﴾ هەروەها (ڕواندومانە)جۆرە دارێك (زەیتون) کەلە طوری سـینا دەڕوێت
﴿تَنۢبُتُ بِٱلدُّهۡنِ وَصِبۡغٖ لِّلۡأٓكِلِينَ﴾ کە ڕۆن و پێخۆرێك دە گرێت بۆ ئەوانەی دەیخۆن ﴿٢٠﴾ ﴿وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗ﴾
وە بەڕاستـی بـۆ ئێـوە لە مـاڵات و ئاژەڵدا پەنـد هەیە ﴿نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا﴾ پێتان دەنۆشـین ئەو (شـیر)ەی
لـە ناو سـکیاندایە ﴿وَلَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٞ﴾ وە بـۆ ئێوە لەو (ئاژەڵانەدا) سـوود و کەڵکێکـی زۆر هەیە ﴿وَمِنۡهَا
تَأۡكُلُونَ﴾ و لێشـیان دەخـۆن ﴿٢١﴾ ﴿وَعَلَيۡهَا وَعَلَى ٱلۡفُلۡكِ تُحۡمَلُونَ﴾ وە لەسـەر (پشـتی هەنـدێ لـە) ئەوان و لەسـەر
(پشـتی) کەشـتییەکانیش سـوار دەکریـن ﴿٢٢﴾ ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ﴾ سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی ئێمـە
نوحمـان نـارد بـۆ لای هۆزەکـەی ﴿فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ جا پێـی ووتن ئـەی هۆزەکەم خوا بپەرسـتن
﴿مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾ ئێـوە جگە لەو پەرستراوێکی ترتان نی یە ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ دەی ئایـا خۆتان ناپارێزن
﴿٢٣﴾ ﴿فَقَالَ﴾ جـا ووتیـان ﴿ٱلۡمَلَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ﴾ ئـەو دەسـەڵاتدار و ناودارانـەی کـە بێ بـاوەڕ بوون لە
هۆزەکـەی (نـووح) ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ﴾ ئـەم (نووحـە) تەنهـا کەسـێکە وەك ئێوە ﴿يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيۡكُمۡ﴾
دەیەوێـت خۆی بکاتە گەورە بەسـەرتانەوە ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ﴾ ئەگەر خوا بیویسـتایە (پێغەمبەرێك
بنێری) فریشـتەی دەنارده خوارەوە ﴿مَّا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا﴾ ئێمە شـتی وامان نەبیسـتووە ﴿فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ لە
بـاوو باپیـرە پێشـووەکانمانەوە ﴿٢٤﴾ ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا رَجُلُۢ﴾ ئەم (نووحە) هـەر پیاوێکە ﴿بِهِۦ جِنَّةٞ﴾ شـێتی لەگەڵدایە
﴿فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٖ﴾ جا تاماوەیەك چاوەڕوانی بکەن (بەڵکو چاك بێتەوە) ﴿٢٥﴾ ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي﴾ (نووح) ووتی
ئەی پەروەرد گارم یارمەتیم بدە (سەرم بخە) ﴿بِمَا كَذَّبُونِ﴾ لەبەر ئەوەی باوەڕم پێ ناهێنن ﴿٢٦﴾ ﴿فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ﴾
ئەمجا ئێمە نیگامان بۆ کرد ﴿أَنِ ٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ﴾ کە کەشـتیەکە دروسـت بکە ﴿بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا﴾ بە پێش چاو و
چاودێری وفەرمان و نیگای ئێمە (لەم ئایەتەدا باسی سیفەتی –چاو، عین – هاتووە بۆ خوای گەورە، بڕوامان
پێیەتـی بەبـێ هیچ لێچوانـدن ولێکدانەوەیەك ، شـێوەکەی نازانیـن وە تەنها خوا خـۆی دەزانێت) ﴿فَإِذَا جَآءَ
أَمۡرُنَا﴾ ئەمجـا کاتـێ فەرمانـی ئێمە (بـۆ لەناوبردنی ئـەوان) هات ﴿وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ﴾ و ئـاو لە تەنـورەوە هەڵقوڵا
(نیشـانەی دەسـپێکردنی توفانەکەیـە) ﴿فَٱسۡلُكۡ فِيهَا﴾ تـۆش بیخـەرە نـاو کەشـتی یەکـەوە (سـواری کـە)
﴿مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ﴾ لـە هەمـوو جـۆرە (ئاژەڵێك)جوتێـك (نێـر ومێ یـەك) ﴿وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ
ٱلۡقَوۡلُ مِنۡهُمۡ﴾ هەروەها (سـوار بکـە ئەندامانی)خێزانەکەت جگە لەوانەیان کە بڕیاری لـە ناو چوونیان دراوە
(کـە کوڕەکـەی و هاوسـەرەکەی بوون) ﴿وَلَا تُخَٰطِبۡنِي﴾ وقسەشـم لە گەڵدا مەکـە ﴿فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ﴾ لەبارەی
ئەوانەی کەستەمیان کردوە (و باوەڕیان نەهێنا) ﴿إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ﴾ چونکە بێگومان ئەوانە دەخنکێنرێن ﴿٢٧﴾

﴿فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ﴾ ئەمجا کاتێ تۆو ئەو کەسانەی لە گەڵت دان سواری کەشتی یەکە بوون
﴿فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى﴾ (ئەی نووح) بڵێ سوپاس بۆ خوایەکی ئەوتۆ ﴿نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ کە ئێمەی ڕزگار کرد
لە دەست گەلی زاڵمان (٢٨) ﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا﴾ وە بڵێ ئەی پەروەردگارم دامبەزێنە (لە کەشتی یەکە) لە
جێگایەکی پیرۆز و بەفەڕدا (کە کێوی جوودی یە لە کوردستانی تورکیا) ﴿وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ﴾ وە تۆ (خوایە)
چاکترینی دابەزێنەرانی (٢٩) ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ﴾ بەڕاستی لەم (بەسەرهاتەی نووح دا) پەند ونیشانەی زۆر هەیە
(بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند) ﴿وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە تاقیکەرەوەین (بۆ هەموو خەڵك) (٣٠) ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ
بَعْدِهِمْ﴾ پاشان لەدوای ئەوان بەدیمان هێنا ﴿قَرْنًا ءَاخَرِينَ﴾ گەل و نەوەیەکی تر (٣١) ﴿فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ﴾
ئەمجا لە ناو ئەواندا پێغەمبەرێکمان لە خۆیان نارد ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ﴾ (پێی ووتن) تەنها خوا بپەرستن ﴿مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ
غَيْرُهُۥٓ﴾ جگە لەو (خوایە) پەرستراوێکی ترتان نی یە ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ دەی ئایا خۆتان ناپارێزن (لە خوا ناترسن)
(٣٢) ﴿وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ﴾ دەسەڵاتداران وناوادارانی (هوود علیه السلام) ووتیان ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ﴾
ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناو بێ باوەڕ بوون بە دیداری ڕۆژی دوایی ﴿وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾
وە لە ژیانی دونیادا ناز و نیعمەتمان پێ دابوون ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ (ووتیان) ئەمە هەر مرۆڤێکە وەك ئێوە
﴿يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ﴾ لەوەی ئێوە دەیخۆن (ئەویش) دەخوات ﴿وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ﴾ وە لەوەی ئێوە
دەیخۆنەوە (ئەویش) دەخواتەوە (٣٣) ﴿وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی بەشەرێکی
وەك خۆتان بکەن ﴿إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ﴾ بێگومان ئەو کاتە ئێوە لە زیان باران دەبن (٣٤) ﴿أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ﴾
ئایا ئەو (هوود علیه السلام) بەڵێن بە ئێوە دەدات کەبەڕاستی کاتێ مردن ﴿وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا﴾ وە بوون
بەخاك و ئێسك (ی ڕزیوو) ﴿أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ﴾ بێگومان ئێوە (لە گۆڕ) دەر دەهێنرێن (زیندوو دەکرێنەوە) (٣٥)
﴿هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ﴾ زۆر دوورە، ئەستەمە ﴿لِمَا تُوعَدُونَ﴾ ئەو بەڵێنەی بە ئێوە دراوە (گوایە زیندوو دەکرێنەوە)
(٣٦) ﴿إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا﴾ ژیان (یەکی تر) نی یە تەنها ژیانی ئەم دونیایەمان نەبێ ﴿نَمُوتُ وَنَحْيَا﴾ دەمرین
ودەژین (نەوە لە دوای نەوە) ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ وە ئێمە زیندوو ناکرێینەوە (٣٧) ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ﴾ ئەوە (کە
دەڵێ پێغەمبەرم) تەنها پیاوێکە ﴿ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ درۆ دەکات بە دەم خواوە ﴿وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ﴾ وە ئێمە
هەرگیز باوەڕی پێ ناکەین (٣٨) ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى﴾ (هوود علیه السلام) ووتی ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدە
(و تۆڵەیان لێ بسەنە) ﴿بِمَا كَذَّبُونِ﴾ بەهۆی ئەوەی کە باوەڕم پێ ناهێنن (٣٩) ﴿قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ﴾ (خوا) فەرمووی
لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ﴿لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ﴾ بێگومان پەشیمان دەبنەوە (٤٠) ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ﴾ ئەمجا
شریخە و دەنگێکی زۆ بەهێز (دای بەسەریاندا) هەموویانی گرت کە هەقیان بوو ﴿فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً﴾ وئەوانمان
کرد بە (وێنەی) پوش و کەفی (سەر لافاو) ﴿فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ جا دووری (لە ڕەحمەتی خوا) بۆ گەلی
ستەمکاران (٤١) ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ دواتر لە پاش ئەوان بەدیمان هێنا ﴿قُرُونًا ءَاخَرِينَ﴾ چەند گەل
وئوممەتێکی تر (٤٢)

﴿مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا﴾ هیچ ئوممەتیٚ لە ماوەی دیاری کراو (بۆ مردن) یان نە پێش دەکەون ﴿وَمَا
يَسْتَأْخِرُونَ﴾ نەدواش دەکەون ﴿٤٣﴾ ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا﴾ لەپاشان پێغەمبەرانی خۆمان یەك لەدوای یەك نارد
﴿كُلَّ مَا جَاءَ أُمَّةً رَسُولُهَا﴾ هەر کاتیٚ ئوممەتێك لەخۆیان پێغەمبەریکیان بۆ بهاتایە ﴿كَذَّبُوهُ﴾ باوەڕیان پیٚ
نەدەهێنا ﴿فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُمْ بَعْضًا﴾ جا ئێمەش ئەم ئوممەتە (بیٚ باوەڕانەمان) یەك بە دوای یەکدا (لەناوبرد)
﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ﴾ وە(باسی) ئەوانمان کردە ڕووداو وچەند بەسەرهاتێك (کەخەڵکی لەنێوان خۆیان باسی
بکەن) ﴿فَبُعْدًا لِقَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئەمجادووری (لەڕەحمی خوا) بۆ گەلیٚ باوەڕ ناهێنن ﴿٤٤﴾ ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَارُونَ﴾
لەپاشان مووسا و هاروونی برایمان نارد ﴿بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾ بەنیشانەکانمان و بەڵگەی ئاشکراوە ﴿٤٥﴾
﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ﴾ بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەکەی ﴿فَاسْتَكْبَرُوا﴾ بەڵام خۆیان بە گەورە دانا (باوەڕیان
نەهێنا) ﴿وَكَانُوا قَوْمًا عَالِينَ﴾ وە ئەوان گەلێکی دەسەڵاتدار بوون بەسەر خەڵکیدا ﴿٤٦﴾ ﴿فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا﴾
ئەمجا وتیان ئایا ئێمە بەدوو کەسی وەك خۆمان باوەڕ بێنین. ﴿وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ﴾ لەکاتێکدا گەلەکەیان
(بەنی ئیسرائیل) ئێمە دەپەرستن (گەردن کەچن بۆ ئێمە) ﴿٤٧﴾ ﴿فَكَذَّبُوهُمَا﴾ لەبەر ئەوە باوەڕیان پیٚ
نەهێنان ﴿فَكَانُوا مِنَ الْمُهْلَكِينَ﴾ ئەمانیش (وەك گەلانی تر) لەناو بران ﴿٤٨﴾ ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾ سوێند
بەخوا بێگومان ئێمە تەوراتمان بەخشی بەمووسا ﴿لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ تا (بەنی ئیسرائیل) ڕێنموون بین ﴿٤٩﴾
﴿وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً﴾ هەروەها عیسای کوڕی مەریەم و دایکیمان کرد بەبەڵگەو موعجیزەیەك
﴿وَآوَيْنَاهُمَا إِلَىٰ رَبْوَةٍ﴾ و هەر دووکیان (عیسا و دایکی)مان دانا لەشوێنێکی بڵند (بیت المقدس) ﴿ذَاتِ
قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ کەخاوەنی (هەموو هۆیەکی) حەسانەوەو کانیاوە ﴿٥٠﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ﴾ ئەی نێر راوانی خودا
﴿كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ لەخۆراکی پاك (حەڵاڵ) بخۆن ﴿وَاعْمَلُوا صَالِحًا﴾ وە کردەوەی چاك بکەن ﴿إِنِّي بِمَا
تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ (چونکە) بەڕاستی من بەوەی ئێوە دەیکەن ئاگادارم ﴿٥١﴾ ﴿وَإِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ﴾ وەبێگومان
هەر ئەمەیە ئاین و دینی ئێوە (ئەی پێغەمبەران دەستی پێوە بگرن) ﴿أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ کەیەك ئایین و بەرنامەیە
﴿وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ﴾ وەمنیش پەروردگارتانم کەواتە خۆتان بپارێزن (لەتۆڵەم) ﴿٥٢﴾ ﴿فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ زُبُرًا﴾
(شوێنکەو توانیان) ئاینەکەیان (کەیەك ئایین بوو) پارچە پارچە کرد لەنێوان خۆیاندا بەچەند پارچەیەك
﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾ جا هەر کۆمەڵ و دەستەیەکیان دڵخۆشن بەو (بەشە ئایینەی) کەهەیانە ﴿٥٣﴾
﴿فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ﴾ کەوا بوو وازیان لیٚ بێنە لەو بیٚ ئاگایی و گومڕایی یەی دایپۆشیون ﴿حَتَّىٰ حِينٍ﴾ (بابژین)
تاماوەیەك ﴿٥٤﴾ ﴿أَيَحْسَبُونَ﴾ ئایا ئەوانە وادەزانن ﴿أَنَّمَا نُمِدُّهُمْ بِهِ﴾ ئەوەی پێیان دەبەخشین ﴿مِنْ مَالٍ وَبَنِينَ﴾
لەسامان و منداڵان ﴿٥٥﴾ ﴿نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ﴾ (بەهۆی شیاویانەوە) پەلەمان کردووە بۆیان لەخێر
وخۆشیەکاندا ﴿بَلْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ (نەخێر وانی یە) بەڵکو ئەوانە هەست ناکەن (کە بۆ تاقی کردنەوەیانە) ﴿٥٦﴾
﴿إِنَّ الَّذِينَ هُمْ مِنْ خَشْيَةِ رَبِّهِمْ مُشْفِقُونَ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەی لەترسی (سزای) پەروەردگاریان هەمیشە دەترسن
﴿٥٧﴾ ﴿وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ﴾ وە ئەو کەسانەش کە بەئایەتەکانی پەروەردگاریان باوەڕ دێنن ﴿٥٨﴾
﴿وَالَّذِينَ هُمْ بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ﴾ وە ئەو کەسانەش کەهاوبەش بۆ پەروەردگاریان دانانێن ﴿٥٩﴾

﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ﴾ وە ئەو کەسانەی کەدەیبەخشن ئەوەی (لەزەکات و خێر دەبێ) بیبەخشن ﴿وَّقُلُوبُهُمۡ
وَجِلَةٌ﴾ لەکاتێکدا دڵیان دەترسێ (دەلەرزێ) ﴿أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ﴾ لەبەر ئەوەی دڵنیان بۆ لای پەروەردگاریان
دەگەڕێنەوە ﴿٦٠﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾ ئا ئەوانە (کە خاوەنی ئەو سیفەتانە بوون باسکران) پەلە دەکەن
لە ئەنجامدانی چاکەکاندا ﴿وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ﴾ وە ئەوان بۆ چاکە کردن لەپێشن ﴿٦١﴾ ﴿وَلَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ﴾
وە ئێمە ئەرك ناخەینە سەر هیچ کەس بەقەدەر توانای خۆی نەبێ ﴿وَلَدَيۡنَا كِتَٰبٞ يَنطِقُ بِٱلۡحَقِّ﴾ وە کتێبێکمان
لەلایە (کردەوەی هەموو بەندەکانی تێدایە) کەبەڕاست و دروستی دەدوێ ﴿وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ وەهیچ ستەمێك
لەوان ناکرێ ﴿٦٢﴾ ﴿بَلۡ قُلُوبُهُمۡ﴾ بەڵام (بێ بڕوایان) دڵەکانیان ﴿فِي غَمۡرَةٖ مِّنۡ هَٰذَا﴾ لەبێ ئاگایی و نەزانی دایە لەم
(کتێب و نامەی کردەوە) ﴿وَلَهُمۡ أَعۡمَٰلٞ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ﴾ وە ئەوان چەند کردەوەی خراپی تریان هەیە جیاوازە
لە کردەوەی باوەڕداران ﴿هُمۡ لَهَا عَٰمِلُونَ﴾ کە ئەوان هەمیشە ئەنجام دەریانن ﴿٦٣﴾ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ﴾ هەتا ئەو کاتەی
﴿أَخَذۡنَا مُتۡرَفِيهِم بِٱلۡعَذَابِ﴾ کەسزا بەسەر گەورەو خۆش گوزەرانەکانیاندا دێنین (لەدونیادا) ﴿إِذَا هُمۡ يَجۡـَٔرُونَ﴾
لەناکاودا ئەوان دەس دەکەن بە هاوار و پاڕانەوە ﴿٦٤﴾ ﴿لَا تَجۡـَٔرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ﴾ (پێ یان دەوترێ) ئەمڕۆ هاوار مەکەن
﴿إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ﴾ بەڕاستی ئێوە لەلایەن ئێمەوە یارمەتی نادرێن ﴿٦٥﴾ ﴿قَدۡ كَانَتۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ بێگومان
(پێشتر) ئایەتەکانی من دەخوێنرایەوە بەسەرتاندا ﴿فَكُنتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ تَنكِصُونَ﴾ بەڵام ئێوە بەدوای
خۆتاندا پاشەوپاش دەگەڕانەوە ﴿٦٦﴾ ﴿مُسۡتَكۡبِرِينَ بِهِۦ﴾ لەبەرامبەر ئەو (قورئانە)دا خۆتان بەگەورە دەزانی
﴿سَٰمِرٗا تَهۡجُرُونَ﴾ شەوگارتان دەبردە سەر بەگاڵتە کردن و قسەی ناشرین ووتن (بەئایەتەکانی ئێمە) ﴿٦٧﴾
﴿أَفَلَمۡ يَدَّبَّرُواْ ٱلۡقَوۡلَ﴾ دەی ئایا ئەوان (قورەیش) بیریان لەم قورئانە نەکردۆتەوە ﴿أَمۡ جَآءَهُم﴾ یاشتێکیان
بۆهاتووە ﴿مَّا لَمۡ يَأۡتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ کە بۆ باو و باپیرە پێشینەکانیان نەهاتووە ﴿٦٨﴾ ﴿أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ﴾
یاپێغەمبەرەکەیان نەناسیووە ﴿فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾ بەو هۆیەوە ئەوان دان بەپێغەمبەرایەتیەکەیدا نانێن ﴿٦٩﴾
﴿أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢۚ﴾ یادەڵێن ئەو (پێغەمبەرە) شێتە ﴿بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ﴾ (نەخێر وانی یە) بەڵکو حەق
وڕاستی بۆ هێناون ﴿وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان بوغزێنەری حەق و ڕاستین (ڕقیان لێیەتی)
﴿٧٠﴾ ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾ وە ئەگەر حەق و ڕاستی شوێن هەوا و ئارەزوی ئەوان بکەوتایە ﴿لَفَسَدَتِ
ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ﴾ ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەی تیایاندایە دەشێوان و تێك دەچوون
بەسەر یەکدا ﴿بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ﴾ بەڵکو ئێمە قورئانێکمان بۆ هێناون کەهۆی یادخستنەوە( و سەربەرزی)
یە بۆ ئەوان ﴿فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ﴾ بەڵام ئەوان لەبیر خستنەوە(و سەربەرزی) خۆیان پشتێکەرن ﴿٧١﴾
﴿أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا﴾ یا داوای پارە و خەرج لەوان دەکەیت (لەبەرانبەر بانگەوازەکەت دا بۆیە باوەڕ
ناهێنن) ﴿فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ﴾ ئەو بەخشش و ڕۆزی پەروەردگارت چاکترە (بۆ تۆ ئەی موحەممەد ﷺ)
﴿وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ وە خوا چاکترینی ڕۆزی دەرانە ﴿٧٢﴾ ﴿وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ﴾ وە بەڕاستی تۆئەوان بانگ دەکەیت
﴿إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ بۆ ڕێگای ڕاست ﴿٧٣﴾ ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾ وە بێگومان کەسانێ کەباوەڕیان
نیە بەڕۆژی دوایی ﴿عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ﴾ لەم ڕێگا ڕاستە لادەرن ﴿٧٤﴾

﴿وَلَوۡ رَحِمۡنَٰهُمۡ﴾ وە ئەگەر ڕەحم بەوان (بت پەرستانی قورەیش) بکەین ﴿وَكَشَفۡنَا مَا بِهِم مِّن ضُرّٖ﴾ وەئەو
ناخۆشی و بەلاّیەی لەسەریان بوو لایبەین و هەڵیگرین (کەبریتی بوو لەبرسێتی بۆماوەی حەوت
ساڵ) ﴿لَّلَجُّواْ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾ (نەك بیر ناکەنەوە) بێگومان لەسەرکەشی خۆیان دا ڕۆدەچن
وبەسەر گەردانی دەمێننەوە ﴿٧٥﴾ ﴿وَلَقَدۡ أَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡعَذَابِ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ئەوانمان تووشی
سزا و ئازار کرد (تاهۆش بکەنەوە) ﴿فَمَا ٱسۡتَكَانُواْ لِرَبِّهِمۡ﴾ بەلاّم ئەوان (لەبەرانبەر) پەروەردگاریاندا
نەخۆیان بەکەم زانی (ملکەچ بوون بۆی) ﴿وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾ وە نە هانا و نزایان (بۆخوا) دەبەن لەکاتی
ناڕەحەتی دا ﴿٧٦﴾ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا﴾ (بەردەوام بوون لەسەر حاڵی خۆیان) تاکاتێ دەرگایەکمان
بۆ کردنەوە ﴿ذَا عَذَابٖ شَدِيدٍ﴾ کەسزایەکی زۆر سەختی هەبوو ﴿إِذَا هُمۡ فِيهِ مُبۡلِسُونَ﴾ ئیتر کتوپڕ
لەوێدا بێ ئومێد بوون ﴿٧٧﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ﴾ وە ئەو (خوا) زاتێکە دروستی
کردووە بۆ ئێوە گوێ و چاوو دڵ ﴿قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ﴾ سوپاسی ئەو ناکەن زۆر کەم نەبێ ﴿٧٨﴾ ﴿وَهُوَ
ٱلَّذِي ذَرَأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ وە ئەو (خوا) زاتێکە ئێوەی (دروست کردوەو) بلاّوی کردونەتەوە بەزەویدا
﴿وَإِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ﴾ وەهەر لای ئەویش کۆدەکرێنەوە (لەڕۆژی دواییدا) ﴿٧٩﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾
وەئەو (خوا) زاتێکە دەژێنێ و دەمرێنێ ﴿وَلَهُ ٱخۡتِلَٰفُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ﴾ وەجیاوازی شەوو ڕۆژیش
هەربەدەست ئەوە ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە بیر ناکەنەوە؟ ﴿٨٠﴾ ﴿بَلۡ قَالُواْ مِثۡلَ مَا قَالَ ٱلۡأَوَّلُونَ﴾
(نەخێر بیر ناکەنەوە) بەڵکو ئەوان هەر ئەوەیان دەووت کە پێشووەکانیان دەیان ووت ﴿٨١﴾ ﴿قَالُوٓاْ
أَءِذَا مِتۡنَا﴾ دەیان ووت ئایا کاتێ کەمردیین ﴿وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا﴾ وبووین بەخۆڵ و ئێسکی (ڕزیوو)
﴿أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ﴾ ئایا ئێمە (جارێکی تر) زیندوو دەکرێینەوە ﴿٨٢﴾ ﴿لَقَدۡ وُعِدۡنَا نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا﴾
سوێند بەخوا بێگومان ئەم بەڵێنە بەئێمە و باوو باپیرانمان درابوو ﴿مِن قَبۡلُ﴾ لەمەو پێش ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ
أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ئەم (بەڵێنانە) هیچ نیە جگە لەئەفسانەی (قسەی پڕو پوچی) پێشووەکان ﴿٨٣﴾
﴿قُل لِّمَنِ ٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهَآ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ زەوی و ئەوەی لەناویدایە هی کێ یە؟
﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە شت دەزانن ﴿٨٤﴾ ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ﴾ بێگومان دەڵێن (هەمووی)
هی خوایە ﴿قُلۡ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ بڵێ دەی ئایا بیر ناکەنەوە ﴿٨٥﴾ ﴿قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبۡعِ﴾ بڵێ ئەی
کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمان ﴿وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ و پەروەردگاری عەرشی گەورەیە ﴿٨٦﴾
﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ﴾ بێگومان دەڵێن (هەمووی) هی خوایە ﴿قُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ بڵێ دەی ئایا خۆتان
ناپارێزن (لەخوا ناترسن) ﴿٨٧﴾ ﴿قُلۡ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ بڵێ کێ فەرمان ڕەوایی هەموو شتێکی
بەدەستە ﴿وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ﴾ وە پەنای (هەموو لایەك) دەدات و کەس لەو پەنا نادرێت ﴿إِن
كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە شت دەزانن ﴿٨٨﴾ ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ﴾ بێگومان دەڵێن (هەموو ئەوانە) هی
خوان ﴿قُلۡ فَأَنَّىٰ تُسۡحَرُونَ﴾ بڵێ کەواتە ئێوە چۆن سیحر و جادووتان لێ کراوە (کە ئاینی خوا بەناحەق
دەزانن لەگەڵ دان نانتان بەهەموو ڕاستی یەکانیدا) ﴿٨٩﴾

﴿بَلْ أَتَيْنَاهُم بِالْحَقِّ﴾ (نەخێـر وانی یە) بەڵکو ئێمە ڕاسـتیمان بۆ هێناون ﴿وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ وە بێگومان ئەوان
درۆزنـن ﴿٩٠﴾ ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ﴾ خـوا هیـچ ڕۆڵەیەکـی بۆ خـۆی بڕیار نـەداوە ﴿وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ﴾ وە
هیـچ پەرسـتراوێکی تـری لەگەڵـدا نەبـووە ﴿إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ﴾ (ئەگـەر پەرسـتراوی تـری لەگەڵدا
بوایـە) ئەوکاتـە هـەر پەرسـتراوێك چـی دروسـت کـردووە (بۆ خـۆی) دەبـرد ﴿وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ وە
هەندێکیـان زاڵ دەبـوون بەسـەر هەندێکـی تریانـدا ﴿سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ خـوا پـاك وبێگـەردە لەوەی
ئـەوان دەیڵێن ﴿٩١﴾ ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ (خـوا) زانای هەموو نهێنی وئاشـکراکانە ﴿فَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ وە
بـەرزو بڵنـدە لـەوەی کەئـەوان (بـت پەرسـتان) دەیکەنە هاوبەشـی ﴿٩٢﴾ ﴿قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي﴾ (ئـەی موحەممەد
ﷺ) بڵـێ ئـەی پەروەردگـارم ئەگـەر هەرنیشـانم دەدەیـت ﴿مَا يُوعَدُونَ﴾ ئـەو سـزایەی کەبـەوان بەڵێـن
دراوە ﴿٩٣﴾ ﴿رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي﴾ ئـەی پەروەردگـارم مەمخـەرە ﴿فِي الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ ڕیـزی گەلـی سـتەمکارانەوە
﴿٩٤﴾ ﴿وَإِنَّا عَلَىٰ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَادِرُونَ﴾ وە بەڕاسـتی ئێمـە بەتوانایـن ئـەو بەڵێنـەی (سـزای) بەوانمـان
داوە نیشـانت بدەیـن ﴿٩٥﴾ ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ﴾ بـە جوانتریـن و چاکتریـن شـێوە بەرگـری بکـە
لەخراپـە ﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾ ئێمـە ئاگادارتریـن بـەوەی ئـەوان دەیڵێـن (بەخـۆت و ئاینەکـەت) ﴿٩٦﴾
﴿وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ﴾ وە بڵـێ ئەی پەروەردگارم پەنا دەگرم بە تۆ ﴿مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ﴾ لەخەتەرە و(پاڵنەرو)
وەسوەسـەی شەیتانەکان ﴿٩٧﴾ ﴿وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ﴾ وە پەنات پێ دەگرم لەوەی (شەیتانەکان) ئامادەبن
لام (سـەرم لێ بشـێوێنن) ﴿٩٨﴾ ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ﴾ (بێ بڕوایان وەك خۆیان دەمێننەوە) هەتا کاتێ
مـردن دێـت بۆ هـەر کامیان ﴿قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ﴾ ئەوسـا دەڵێ ئـەی پەروەردگـارم بمگێڕەرەوە (بـۆ دونیا) ﴿٩٩﴾
﴿لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ﴾ بەڵکو کردەوەی چاك بکەم (لە بری ئەوەی نەمکردوە) لەو تەمەنەی لە دەستم
چـوو ﴿كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا﴾ نەخێـر بێگومـان ئەمەی (کەدەیڵێـت) تەنها قسـەیەکە ئەو دەیڵـێ (ئەگەر
بگەڕێتەوە بۆ دونیا هەروەك جاران دەبێت) ﴿وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ﴾ و لەپێشیانەوە بەرزەخێك (بەربەستێك) هەیە
﴿إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە ﴿١٠٠﴾ ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ﴾ ئەمجا کاتێ فوو دەکرێ بە شەیپوردا
﴿فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ﴾ لەو ڕۆژەدا هیچ خزمایەتیەك نامێنێ لە نێوانیاندا ﴿وَلَا يَتَسَاءَلُونَ﴾ وە پرسیاری یەکتری
ناکەن ﴿١٠١﴾ ﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ﴾ ئەمجا هەر کەسێ کێشراوە (چاکە)کانی قورس بێت ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾
ئەوە ئەوانە ڕزگارو سـەرکەوتوون ﴿١٠٢﴾ ﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ﴾ وە کەسـێ کێشـراوە (چاکە)کانی سـووك بێت
﴿فَأُولَٰئِكَ الَّذِينَ﴾ ئەوانـە کەسـانێکن ﴿خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ﴾ زیانیان لە خۆیـان داوە، خۆیـان دۆڕاندووە ﴿فِي جَهَنَّمَ
خَالِدُونَ﴾ لـە دۆزەخ دان بـێ بڕانـەوە ﴿١٠٣﴾ ﴿تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ﴾ (ئاگـری دۆزەخ) دەم و چاویـان دەسـوتێنێ
﴿وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ﴾ و هەموویان لە ئاگری دۆزەخ دا لێویان هەڵقرچاوە و دانەکانیان دەرکەوتووە ﴿١٠٤﴾

﴿أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ (پێیان دەوترێت) ئایا ئایەتەکانی من لەدونیادا بەسەرتاندا نەدەخوێنرایەوە؟
﴿فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ کەچی ئێوە بەدرۆتان دەزانی و ئیمانتان پێ نەدەهێنا ﴿١٠٥﴾ ﴿قَالُوا۟ رَبَّنَا﴾ (لەوەڵامدا)
دەڵێـن ئەی پەروەردگاری ئێمە ﴿غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا﴾ بەدی و خراپی خۆمان زاڵ بوو بوو بەسـەرماندا
﴿وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ﴾ وە ئێمە کەسـانێکی گومڕابوویـن ﴿١٠٦﴾ ﴿رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا﴾ ئەی پەروەدگارمان
لەم (دۆزەخە) دەرمان بێنە ﴿فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ﴾ جا ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە (بۆ بێ باوەڕی)
ئـەوە بەڕاسـتی ئێمە سـتەمکارین ﴿١٠٧﴾ ﴿قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾ وە (خـوا) دەفەرموێ: بە ڕیسـوایی
بمێننەوە لەدۆزەخدا و هیچ قسەیەکم لەگەڵدا مەکەن (إخسأ: بۆ سەگ بەکاردێ کاتێ دەری دەکەیت
و پێـی دەڵێیـت چغـە) ﴿١٠٨﴾ ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِى﴾ بێگومـان لەدونیـادا کۆمەڵێـك لەبەندەکانـی من
﴿يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا﴾ دەیانووت ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە ﴿فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا﴾ دەی لێمان
خۆشبە و ڕەحممان پێ بکە ﴿وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ چونکە تۆ چاکترینی میهرەبانانی ﴿١٠٩﴾ ﴿فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ
سِخْرِيًّا﴾ کەچی ئێوە گاڵتەتان بەوان دەکرد ﴿حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِى﴾ تا (ئەو گاڵتە کردنەتان بە) ئەوان یادی
منـی لەبیربردنەوە ﴿وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ﴾ وە ئێوە هەمیشـە بـەوان پێدەکەنین ﴿١١٠﴾ ﴿إِنِّى جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ﴾
بێگومان ئەمڕۆ پاداشـتم داونەتەوە ﴿بِمَا صَبَرُوٓا۟﴾ بەهۆی خۆ گرییانەوە ﴿أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾ بەڕاسـتی
هەر ئەوانن سـەرکەوتوو ﴿١١١﴾ ﴿قَٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ﴾ (خوا) دەفەرموێ: چەند سـاڵ لەسەر
زەوی دا مانەوە؟ ﴿١١٢﴾ ﴿قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ (لە وەڵامدا) دەڵێن ڕۆژێك یا کەمتر لەڕۆژێك ماینەوە
﴿فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ﴾ لەو (فریشـت)انە بپرسـە کەژمێریارن ﴿١١٣﴾ ﴿قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا﴾ (خـوا) فەرمووی
نەماونەتـەوە ماوەیەکـی کەم نەبێت ﴿لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر بەڕاسـتی ئێـوە دەتانزانی؟ ﴿١١٤﴾
﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا﴾ ئایـا ئێـوە گومانتـان وابـووە کەبێگومـان ئێوەمـان بەبێ هودە دروسـت
کردووە ﴿وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾ وە بێگومان ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە ﴿١١٥﴾ ﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ﴾
جا بەرزو بڵندی بۆ خوای پاشـای ڕاسـت و ڕەوا ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرسـتراوێك نی یە جگە لەو
﴿رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ﴾ کەپەروەردگاری عەرشی بەڕێزو بەرزە ﴿١١٦﴾ ﴿وَمَن يَدْعُ﴾ هەر کەس بپەرستێ
﴿مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ پەرسـتراوێکی تـر لەگـەڵ خـوادا ﴿لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ﴾ کەهیـچ بەڵگەیەکـی نەبێ
لەسـەر ئەو (پەرستنە) ﴿فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ﴾ ئەوە بەڕاستی لێپرسینەوەی تەنها لای پەروەردگاریەتی
﴿إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ بێگومـان کافران ڕزگار نابن ﴿١١٧﴾ ﴿وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ)
بڵـێ ئەی پەروەردگارم لێم خۆش بـەو ڕەحمم پێ بکە ﴿وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ وە تۆ (خوایە) چاکترینی
میهرەبانانی ﴿١١٨﴾

## سورەتی ﴿النُّورِ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَٰهَا﴾ ئەمە سورەتێکە ئێمە ناردومانەتە خوارەوە ﴿وَفَرَضْنَٰهَا﴾ و فەرزمان کردووە (گوێڕایەڵی
بڕیارەکانی) ﴿وَأَنزَلْنَا فِيهَآ﴾ وە لەو (سورەتە) دا هێناومانەتە خوارەوە ﴿ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ ئایەتە ڕوونەکان
﴿لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوەی ئێوە بیر بکەنەوە (١) ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى﴾ ژن و پیاوی زیناکەر ﴿فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ
جَلْدَةٍ﴾ هەریەکێکیان سەد دار(شەلاق)یان لێ بدەن ﴿وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ﴾ وە بەزەیی هاتنەوەتان پێیاندا (ژن
و پیاوی زیناکەر) نەتان گرێ ﴿فِى دِينِ ٱللَّهِ﴾ لە (جێ بەجێ کردنی) فەرمانی خوا ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ﴾ ئەگەر ئێوە
باوەڕتان هەیە ﴿بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ بەخواو بەڕۆژی دوایی ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا﴾ وە با ئامادەی بینینی سزادانی ئەو
دووانە بن ﴿طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ کۆمەڵێك لەباوەڕداران (٢) ﴿ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً﴾ پیاوی زیناکەر مارە
ناکات تەنها ئافرەتی زیناکەر و ئافرەتی موشریك نەبێ ﴿وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ﴾ وە ئافرەتی زیناکەر
مارەی ناکات پیاوی زیناکەر یا پیاوی موشریك نەبێ ﴿وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەو (مارەکردن و شووکردن
بەزیناکەر)ە یاساغ کراوە لەسەر ئیمانداران (٣) ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ﴾ وە ئەوانەی کەبوهتانی (زینا) دەکەن
بۆ ئافرەتانی داوێن پاك ﴿ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ﴾ لەپاشان چوار شایەت ناهێنن (لەسەر ڕاستی بوهتانەکەیان)
﴿فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً﴾ ئەوە هەشتا دار (شەلاق)یان لێ بدەن ﴿وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا﴾ ئیتر هەرگیز شایەتیان
لێ وەرمەگرن ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ وە ئەوانە لەسنوور دەرچوون (٤) ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ جگە
لەوانەی کە دوای ئەوە تەوبە دەکەن ﴿وَأَصْلَحُوا۟﴾ و کردەوەیان چاك دەکەن ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوسا
بەڕاستی خوا لێخۆش بووی بەبەزەیی یە (٥) ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ﴾ ئەو (پیاوانەی) بوهتان بۆ خێزانەکانیان
دەکەن ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ﴾ وە بێجگە لەخۆیان هیچ شایەتێکیان نی یە ﴿فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ﴾ ئەوە
شایەتی دانی هەریەك لەوانە (بەم جۆرەیە) ﴿أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ کە چوار سوێند بەخوا بخوات
کەبێگومان ئەو لەڕاستگۆیانە (کەدەڵێت خێزانەکەم بینیوە زینای کردووە) (٦) ﴿وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ﴾
وە لەپێنجەم جاردا بڵێ نەفرینی خوا لەسەر ئەوبێ ﴿إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ ئەگەر درۆزن بێ (٧) ﴿وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ﴾
ئەو ئافرەتەش (کەتاوان بار کراوە لەلایەن مێردەکەیەوە) سزای (زینای) لەسەر لادەبات ﴿أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ
شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ بەمەی کەچوار جار سوێند بەخوا بخوات کەبێگومان مێردەکەی لەدرۆزنانە (درۆ
دەکات) (٨) ﴿وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ وە لەپێنجەم جاردا (بڵێت) خەشمی خوای لەسەر بێ
ئەگەر مێردەکەی لەڕاست گۆیان بێت (٩) ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ﴾ وە ئەگەر بەهرەو بەزەیی خوا نەبوایە
بەسەرتانەوە(هەر کام لەو پیاو و ئافرەتەی باسکران درۆزن بن خوا دەری دەخست و سزای دەدا لەدونیادا)
﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ﴾ وە بێگومان خوا گیراکەری پەشیمانی و کار دروستە (١٠)

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ﴾ بێگومـان کەسـانێ کـە ئـەو بوهتانەیان (بـۆ عائیشـەی خێزانـی پێغەمبەر ﷺ)
هەڵبەسـت ﴿عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ﴾ دەستەیەك بوون لەخۆتان (ومونافیقیشیان تێدا بوو) ﴿لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ﴾
وا مەزانـن ئـەو (بوهتانە)شـەڕو خراپـە بۆتـان ﴿بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ﴾ (وانـی یە)بەڵكو خێـرو چاكەیە بۆتان
﴿لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم﴾ بۆهـەر یـەك لەوانـە هەیە ﴿مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ﴾ لەتـاوان بـەو ئەنـدازەی هەوڵی داوە
(لەو بوهتانەدا) ﴿وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ﴾ وە ئەو كەسـەیان كەبەشـی گەورەی بوهتانەكەی گرتە ئەسـتۆ
(كەعەبدوڵـڵای كوڕی ئوبەی بوو) ﴿لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ (لەڕۆژی دواییدا) بۆ ئەوە سـزای هەرە گەورە
﴿١١﴾ ﴿لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ﴾ دەبـوا كاتـێ ئـەو بوهتانەتـان بیسـت ﴿ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا﴾ پیـاوان
وئافرەتانـی ئیمانـدار گومانـی چاكیان بەخۆیـان ببردایە ﴿وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ﴾ وەبیـان ووتایە ئەمە
بوهتانێكـی ئاشـكراو ڕوونـە ﴿١٢﴾ ﴿لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ﴾ دە بۆچـی ئـەو بوهتـان كەرانـە چـوار
شایەتیان لەسەری نەهێنا ﴿فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ﴾ ئەمجا ئەگەر شایەتەكانیان نەهێنا ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ
ٱلۡكَٰذِبُونَ﴾ كەواتـە هـەر ئەوانـەن لای خـوا درۆزن ﴿١٣﴾ ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ﴾ وە ئەگـەر بەهرە
وڕەحمەتی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە ﴿فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ لەدونیا و ڕۆژی دوایی دا ﴿لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ﴾
دوو چارتان دەبوو لەبەر ڕۆچوونتان لەو بوهتانەدا (بۆ عائیشـە) ﴿فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ سـزایەكی گەورە
﴿١٤﴾ ﴿إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ﴾ كاتـێ ئەم بوهتانەتان بەدەماو دەم لە یەكترەوە وەردەگرت ﴿وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم﴾
وە بەزمانتـان شـتێك دەڵێـن ﴿مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ﴾ كـە زانیاریتـان دەربـارەی نەبـوو ﴿وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا﴾
واتـان دەزانـی شـتێكی سـووك و ئاسـانە ﴿وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ﴾ لەكاتێكـدا لای خـوا زۆر گەورەیە ﴿١٥﴾
﴿وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم﴾ بۆچـی كاتـێ ئەمەتان بیسـت نەتـان ووت ﴿مَّا يَكُونُ لَنَآ﴾ بۆ ئێمە شـیاو نی یە
﴿أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا﴾ قسـە(و بوهتانی)ی وا بكەین ﴿سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ﴾ پاك و بێگەردی بۆ تۆخوایە،
ئەمـە بوهتانێكـی زۆر گەورەیـە ﴿١٦﴾ ﴿يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ﴾ خـوا ئامۆژگاریتـان دەكات ﴿أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا﴾
كە هەرگیز نەگەڕێنەوە بۆ وێنەی ئەوەی ڕووی دا ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن ﴿١٧﴾ ﴿وَيُبَيِّنُ
ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ﴾ وە خوا ئایەتەكانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەكاتەوە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زانای
كار دروسـتە ﴿١٨﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ﴾ بەڕاسـتی ئەوانەی پێیان خۆشـە ﴿أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ﴾ زینا (كرداری
ناشـیرین) بڵاوبێتـەوە ﴿فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ لەنـاو خەڵكی ئیمانداردا ﴿لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ سـزای سـەخیان
بـۆ هەیـە ﴿فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ﴾ لەدونیـاو ڕۆژی دوایـی دا ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ وە خـوا دەزانـێ
وئێـوە نازانـن ﴿١٩﴾ ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ﴾ ئەگەر بەهرەو بەزەیی خوا نەبوایە بەسـەرتانەوە
(دووچاری سـزا دەبوون بەهۆی ئەو بوهتانەوەكە كرا بۆ عائیشـە) ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ وەبێگومان
خوا بەسۆزی میهرەبانە ﴿٢٠﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ بەدوای هەنگاوەکانی
شەیتان دا مەڕۆن ﴿وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ وە هەر کەس شوێن هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێ
﴿فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾ چونکە بەڕاستی شەیتان فەرمان دەکات بەکاری زۆر ناشیرین
(زینا)و خراپە ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ﴾ ئەگەر بەهرەو میهرەبانی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە
﴿مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا﴾ هەرگیز کەسێ لەئێوە پوخت و پاك نەدەبۆ وە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ﴾ بەلاّم
خوا هەر کەسی بوێ (شیاوبێ) پاکی دەکاتەوە ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ وە خوا بیسەری زانایە. ﴿٢١﴾ ﴿وَلَا
يَأْتَلِ﴾ باسوێند نەخۆن ﴿أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ﴾ ئەوانەتان کەخاوەنی چاکە وسەروەت و سامانن
﴿أَن يُؤْتُوٓا۟﴾ کەیارمەتی نەدەن ﴿أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بەخزمان وهەژاران و کۆچەران
لەپێناوی خوادا ﴿وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟﴾ دەبا لیّ بووردەبن و چاوپۆشی بکەن ﴿أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾
ئایا پێتان خۆش نیە خوا لیّتان خۆش ببیّ ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وە خوا لیّخۆش بوو و میهرەبانە. ﴿٢٢﴾ ﴿إِنَّ
ٱلَّذِينَ﴾ بێگومان ئەوانەی ﴿يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ بوهتانی زینا دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن
پاکی بێ ئاگای ئیماندار ﴿لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ نەفرینیان لێکراوە لەدونیا و ئاخیرەت دا ﴿وَلَهُمْ
عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ وەبۆیان هەیە سزای زۆر گەورە ﴿٢٣﴾ ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ﴾ ڕۆژێك (دێ) شایەتی ئەدات
لەسەریان ﴿أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم﴾ زمانیان و دەست و قاچەکانیان ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ بەوکردەوانەی
کە کردوویانە ﴿٢٤﴾ ﴿يَوْمَئِذٍ﴾ لەو ڕۆژەدا ﴿يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلْحَقَّ﴾ خواپاداشتی تەواوی کاروکردەوەیان
بەڕاستی ودادگەرانەوە دەداتەوە ﴿وَيَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ٱلْمُبِينُ﴾ وە ئەوکاتە دەزانن بەڕاستی هەر خوا هەقی
ئاشکراو دیارە(بۆخۆی وسیفات وکرداری) ﴿٢٥﴾ ﴿ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ﴾ (واڕاستە) ئافرەتانی ناپاك بۆ
پیاوانی ناپاك ﴿وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَٰتِ﴾ وە پیاوە پیسەکان بۆ ئافرەتە پیسەکان ﴿وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ﴾
وە ئافرەتە پاکەکان بۆ پیاوە پاکەکان ﴿وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ﴾ وە پیاوە پاکەکان بۆ ئافرەتە پاکەکان
﴿أُو۟لَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ﴾ ئەوپاکانە بەری کراون لەو (تۆمەتانە)ی ناپاکان دەیلّێن ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾
بۆ ئەو پاك و چاکانەیە لێبووردن و ڕۆزی چاك و پیرۆز (بەهەشت) ﴿٢٦﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی
ئەوکەسانەی بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ﴾ مەچنە هیچ مالّێك جگەلەمالّەکانی خۆتان ﴿حَتَّىٰ
تَسْتَأْنِسُوا۟﴾ هەتا پرس دەکەن(بەخاوەنەکانیان) ﴿وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا﴾ وە (دوای ئەوەی مولّەت دران)
سەلام بکەن لە خاوەن مالّەکە ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەوە چاکترە بۆتان ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوەی پەندو
ئامۆژگاری وەرگرن ﴿٢٧﴾

﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا﴾ ئەمجا ئەگەر کەستان نەدی تیایدا ﴿فَلَا تَدْخُلُوهَا﴾ ئەوە مەچنە ژورەوە بۆ ئەو ماڵە
﴿حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾ هەتا مۆڵەت نەدرێن ﴿وَإِن قِيلَ لَكُمُ﴾ وە ئەگەر پێتان وترا ﴿ارْجِعُوا فَارْجِعُوا﴾
بگەڕێنەوە ئەبێ بگەڕێنەوە ﴿هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ﴾ ئەوە چاکتر و پاکترە بۆتان ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾
وە خوا زانایە بەهەموو ئەو کردەوانەی دەیکەن ﴿٢٨﴾ ﴿لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە
(گوناهبار نابن) ﴿أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا﴾ کەبچنە ئەو ماڵانەی ﴿غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ﴾ کەسی تێدا
نیشتەجێ نی یە و کەل و پەلی خۆتانی تیا بێت (وەك ئوتێل) ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ﴾ وە خوا دەزانێ ﴿مَا تُبْدُونَ
وَمَا تَكْتُمُونَ﴾ بەوەی ئاشکرای دەکەن و بەوەیشی دەیشارنەوە ﴿٢٩﴾ ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) بڵێ بەپیاوانی ئیماندار ﴿يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ﴾ چاوی خۆیان (لەسەیر کردنی نامەحرەم) داخەن
و بپارێزن ﴿وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾ وە عەورەتیان (لەداوێن پیسی) بپارێزن ﴿ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ﴾ ئەوە چاکتر
و پاکترە بۆ ئەوان ﴿إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ بێگومان خوا ئاگایە بەهەموو کردەوەیەك کەدەیکەن
﴿٣٠﴾ ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ﴾ وە بڵێ بە ئافرەتانی ئیمانداریش ﴿يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ﴾ چاویان داخەن
وبپارێزن (لەسەریر کردنی نامەحرەم) ﴿وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾ وە عەورەتیان بپارێزن (لەداوێن پیسی)
﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ وە جوانی خۆیان دەرنەخەن ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ جگە لەوەی بەدەرەوەیە و دیارە
لەجوانی (وەك دەم و چاویان و دەستیان) ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ وە با سەرپۆشەکانیان بدەن
بەسینگ و بەرۆکیاندا ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ وە جوانی خۆیان دەرنەخەن (زیاد لەوەی دەردەکەوێت)
﴿إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ﴾ بۆ مێردەکانیان نەبێت یا باوکیان ﴿أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ یاباوکی مێردەکانیان
﴿أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ یا کوڕەکانیان یا کوڕی مێردەکانیان ﴿أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ﴾ یا براکانیان
یا کوڕی براکانیان ﴿أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ﴾ یا کوڕی خوشکەکانیان ﴿أَوْ نِسَائِهِنَّ﴾ یا ئافرەتانی (ئیماندار)
﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ﴾ یا کەنیزەکەکانیان ﴿أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ﴾ یا ئەو شوێن کەوتەو
پیاوانەی کەبێ نیازن لەئافرەت (وەك خزمەت کارو پیر و نەخۆش کەئارەزووی ژن و مێردایەتیان نییە)
﴿أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ﴾ یا ئەو منداڵە کوڕانەی کەئاگایان لە لەش و(عەورەتی)
ئافرەتان نەبێت (باڵغ نەبووبن) ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ﴾ (ئافرەتان لەکاتی ڕۆشتن دا) قاچیان نەدەن
بەزەوی دا ﴿لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾ (تا دەنگی خرخاڵ و پاوانەکانیان بێت و) بزانرێت بەو
جوانییەی پێیان کەشاردویانەتەوە ﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا﴾ هەموتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا
﴿أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ﴾ ئەی ئیمان دارەکان ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ تا ڕزگار و سەرکەوتوو بن ﴿٣١﴾

﴿وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ﴾ ژن مارە بیرن بۆ پیاوانی بێ ژن و ژنانی بێ مێردیش بدەن بەشوو (مێرد) ﴿وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ
وَإِمَآئِكُمْ﴾ هەروەها ئەوانەی ئیمان دار و چاکن لەکۆیلەکان (ژنیان بۆ بێنن) و کەنیزەکەکان (یش بدەن بەشوو) ﴿إِن
يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ﴾ ئەگەر ئەوان هەژارو کەم دەست بن ﴿يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾ خوا لەبەخشندەی و بەهرەی خۆی دەوڵەمەندو
بـێ نیازیـان دەکات ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ وە خوا (بەهـەرە) فراوان و زانـا و دانایە ﴿٣٢﴾ ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا﴾ وە
دەبـێ ئەوانـەی کەتوانای (ئەرکی) ژن هێنانیان نیە پاکژ خۆیـان ڕاگرن ﴿حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾ هەتا خوا بەبەهرە(و
ڕۆزی) خـۆی بـێ نیازیـان دەکات ﴿وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ وە ئەوانەی داوای نوسـراو دەکەن (بۆ کڕینـەوەی خۆیـان)
﴿مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ﴾ لەبەنـدەو کەنیزەکەکانتـان ﴿فَكَاتِبُوهُمْ﴾ ئـەوە نوسـراویان لەگەڵدا بنوسـن (بۆ کڕینـەوەو ئازاد
بوونـی خۆیـان) ﴿إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا﴾ ئەگەر خێرتان لەواندا بـەدی دەکرد (کەبریتی یە لەتوانای دانـی ئەو پارەی ئەبێ
بیـدات بەخاوەنەکـەی بۆ ئـازاد بوونی) ﴿وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ﴾ وە لەو ماڵـەی کەخوا بەئێـوەی داوە پێیان بدەن
﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ﴾ وە کەنیزەکەکانتـان زۆر لـێ مەکـن (ناچاریـان مەکەن) ﴿عَلَى ٱلْبِغَآءِ﴾ لەسـەر زینـا کـردن ﴿إِنْ أَرَدْنَ
تَحَصُّنًا﴾ ئەگەر ئەیانویسـت داوێن پاك بن ﴿لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ تا ماڵ وسـامانی ژیانی دونیاتان دەست کەوێت
﴿وَمَن يُكْرِههُّنَّ﴾ جـا هەرکـەس ناچاریـان بـکات (زۆریان لـێ بـکات) ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ﴾ ئەمجا بەڕاسـتی خوا
دوای ئـەو زۆر لـێ کردنەیـان ﴿غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ لێبـووردەی میهرەبانە (بەو کەنیزەکانـە کە بەزۆر زینایان پـێ کراوە) ﴿٣٣﴾
﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاسـتی ئێمە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ ئێوە ﴿ءَايَـٰتٍ مُّبَيِّنَـٰتٍ﴾ چەند ئایەتێکی ڕوون
کەرەوە ﴿وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ﴾ وەچەند نموونەو بەسەرهاتی ئەو گەلانەی لەپێش ئێوەوە بوون ﴿وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾
هەروەهـا پەنـدو ئامۆژگـاری بـۆ پارێـزکاران ولەخـوا ترسـان ﴿٣٤﴾ ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ خـوا نـورو ڕوناکی یەو
ڕووناککەرەوەی ئاسـمانەکان و زەوی یە ﴿مَثَلُ نُورِهِۦ﴾ وێنەی ڕووناککردنەوەی خوا ﴿كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ﴾ وەك
تاقێـك وایـە چرایەکی تێدا بێـت ﴿ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ﴾ ئەو چرایەش لەناو شوشـەیەکدا بێت ﴿ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ﴾
ئەو شوشـەیەش وەك ئەسـتێرەیەکی گەش و پرشـنگدار بێت ﴿يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَـٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ﴾ (ئەو چرایە) دائەگیرسـێ
بە(ڕۆنـی) درەختێکـی زەیتونی بەفەڕو بەرەکەت ﴿لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ﴾ کـە نەڕۆژهەڵاتی بێ نەڕۆژ ئاوایی بێ (سـێبەر
نایگـرێ نەکاتـی هەڵهاتنی خۆر نەکاتی ئاوابوونی) ﴿يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ﴾ (ڕۆنەکـەی ئەوەند پاك بێت) نزیکە ڕۆنەکەی
داگیرسـێ ﴿وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ﴾ با ئاگریشـی بەر نەکەوێ ﴿نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ﴾ ڕووناکی لەسـەر ڕوناکـی (ڕووناکی زەیت و
ڕووناکی ئاگر) ﴿يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ خوا هەرکەسـی بوێت ڕێنموونیی دەکات بۆلای ڕووناکی (ئایینی) خۆی
﴿وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَـٰلَ لِلنَّاسِ﴾ وە خـوا چەندین نموونـە دەهێنێتەوە بۆ خەلکی ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ وە خوا زانا و ئاگادارە
بەهەموو شتێك ﴿٣٥﴾ ﴿فِى بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ﴾ لەمزگەوتانێکدا خوا مۆڵەتی داوە ﴿أَن تُرْفَعَ﴾ کە بەگەورەو پاك ڕاگیرێ (بەرزو
بڵنـد دروسـت کرێـت) ﴿وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ﴾ زیکـرو یـادی خوای تێـدا بکـرێ ﴿يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ﴾ لەو
(مزگەوتانە)دا تەسبیحاتی خوا دەکەن بەبەیانیان و ئێواراندا ﴿٣٦﴾

﴿رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ﴾ پیاوانێك كـە بازرگانـی و كڕیـن و فرۆشـتن بـێ ئاگایـان نـاكات ﴿عَن ذِكْرِ
اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ﴾ لەیـادی خـواو نوێـژ كـردن و زەكات دان ﴿يَخَافُونَ يَوْمًا﴾ لەڕۆژێـك دەترسـن
(ڕۆژی قیامـەت) ﴿تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ﴾ دڵ و چـاوەكان تیایـدا (دەگۆڕێـن و) ئـاوەژوو دەبـن ﴿٣٧﴾
﴿لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا﴾ تـا خوا پاداشـتیان بداتـەوە بەپاداشـتی چاكترینی ئـەوەی كردویانە ﴿وَيَزِيدَهُم
مِّن فَضْلِهِ﴾ وە (بێجگە لەپاداشـتەكەیان) لەبەهرەی خۆیەوە زیادەشـیان دەداتێ ﴿وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ﴾ وە خوا
ڕزق و ڕۆزی (پاداشـت) دەدا بەهـەر كـەس بیەوێ ﴿بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بەبێ ژمار، بێ سـنوور ﴿٣٨﴾ ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾
وە ئەوانەی كەبێ بڕوان ﴿أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ﴾ كردەوە (چاكە) كانیان وەك سەرابێك وایە (سەراب تیشكێكە كاتێ
زۆر گەرمـا لەبیابانـدا وەك ئـاو دێتە پێـش چـاو) ﴿بِقِيعَةٍ﴾ لەبیابانێكدا (بریسـكە بداتەوە) ﴿يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ
مَاءً﴾ (كەسـێكی) زۆر تینـوو بەئـاوی دەزانـێ (لـەدوورەوە) ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءَهُ﴾ (بەپەلـە دەڕوات بـۆی) كاتێ
دەگاتـە لای ﴿لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا﴾ هیـچ بـەدی نـاكات ﴿وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ﴾ (لەقیامەت كافـر) دەبینێ خـوا ئامادەیە
لەلایـدا ﴿فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ﴾ ئەمجـا خـوا بـە تـەواوی پاداشـتی (كردەوەكانـی) دەداتـێ ﴿وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾
وە خـوا بـە پەلەو چەسـپانە لەلێپرسینەوەدا ﴿٣٩﴾ ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ﴾ یا (كـردەوەی بێ بڕوایـان) وەك چەند
تاریكییـەك وایـە لەنـاو دەریایەكـی قوڵدا ﴿يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ﴾ كەشـەپۆل لەسەرشـەپۆل دایپۆشـابێت
﴿مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ﴾ لەسەر ئەو (شەپۆلە) یشـەوە هەورێكی ڕەشی (باراناوی) بێت ﴿ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ﴾
تاریكیەكان نیشـتبنە سـەر یەكتـری ﴿إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا﴾ ئەگەر دەسـتی دەربێنێ نزیكە دەسـتی خۆی
نەبینێـت (لەبـەر تاریكـی) ﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا﴾ جـا هەر كـەس خوا نـووری (ئیمانـی) پێ نەبەخشـیێ
﴿فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ ئـەوەی ڕووناكی بێت نییەتی ﴿٤٠﴾ ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایـا نابینی (نازانی) ﴿أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضِ﴾ بێگومـان هەموونەوانـەی لەئاسـمانەكان و زەوی دان تەسـبیحاتی خـوا دەكـەن ﴿وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ﴾
هەروەها باڵندەكان كاتێ باڵیان كردۆتەوە (بەئاسماندان تەسبیحاتی خوا دەكەن) ﴿كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ﴾
هـەر یـەك لەمانە نوێـژ (دوعا) و تەسـبیحاتی خۆی دەزانـێ ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ وە خوا بـەوەی دەیكەن زانا
وئاگـادارە ﴿٤١﴾ ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ تەنها بۆ خوایە خاوەنیەتی ئاسـمانەكان و زەوی ﴿وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾
وگەڕانەوەش هەر بۆلای خوایە ﴿٤٢﴾ ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نازانی (نابینی) ﴿أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا﴾ كەخوا پەڵەهەورەكان
دەبـات (بەئاسـماندا) بـە هێواشـی ﴿ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ﴾ پاشـان ئەو (پەڵـە هەور)انـە پەیوەسـت دەكات بەیەكەوە
﴿ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا﴾ دواتـر دەیـان خاتـە سـەر یەكتـری ﴿فَتَرَى الْوَدْقَ﴾ ئەمجـا دەبینـی دڵۆپـە بـاران ﴿يَخْرُجُ مِنْ
خِلَالِهِ﴾ لەنێـو هەورەكـەوە دەبـارێ ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِن بَرَدٍ﴾ وە لە ئاسـمانەوە لە هـەورەكان كەوەك
كێـون تـەرزە دەبارێنێ ﴿فَيُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ﴾ ئەمجا تووشـی زیان دەبێ بـەم (تەرزەیە) هەر كەسـێ خوا بیەوێت
﴿وَيَصْرِفُهُ عَن مَّن يَشَاءُ﴾ وە لای دەدات لـە هەر كەسـێ كەخۆی بیـەوێ ﴿يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ﴾ نزیكە
ڕووناكی و شەوقی چەخماخە(ی هەورە) كە(بینای) چاوەكان ببات ﴿٤٣﴾

﴿يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ خوا شەوو ڕۆژ دەگۆڕێت (بەکورت و درێژ کردنیان یا بەرۆژ بوونەوەو شەو
داهاتن) ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەمەدا ﴿لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ﴾ پەندێك هەیە بۆ خاوەن ژیریی یەكان (٤٤)
﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ﴾ وەخـوا هەموو زیندەوەرێكی لەئاو دروسـت كردووە ﴿فَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰ بَطْنِهِۦ﴾
ئەمجا هەنـدێ لەوانـە لەسـەر سـكی دەڕوات ﴿وَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰ رِجْلَيْنِ﴾ وە هەندێكی تریان لەسـەر
دووقـاچ دەڕوات ﴿وَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ﴾ وە هەشیانە لەسـەر چـوار پـێ دەڕوات ﴿يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾
خوا هەرچی بوێ دروستی دەكات ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو
شـتێكدا هەیە (٤٥) ﴿لَّقَدْ أَنزَلْنَآ﴾ سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی ئێمە ناردومانەتـە خوارەوە ﴿ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ﴾
چەنـد ئایەتێكـی ڕوون كەرەوە ﴿وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ وخواش هەر كەسـی بـوێ ڕێنموونیی دەكات
﴿إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بـۆ ڕێگـای ڕاسـت (٤٦) ﴿وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا﴾ وە ئەوانـە دەڵێـن بڕوامـان هێنـاوە
﴿بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا﴾ بەخـواو بەپێغەمبـەرو گوێڕایەڵیمـان كـردووە ﴿ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم﴾ پاشـان
كۆمەڵێـك لـەوان پشـتی تـێ دەكـەن ﴿مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ لەپـاش ئـەوەی (ووتیـان بڕوامـان هێنـاوە)
﴿وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ وە ئەوانـە (لەڕاسـتیدا) ئیمانـدار نیـن (٤٧) ﴿وَإِذَا دُعُوٓا۟﴾ وە كاتـێ بانـگ بكرێـن
﴿إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ بۆ لای (شـەریعەتی) خواو پێغەمبەر ﷺ ﴿لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ﴾ بۆ ئەوەی حوكم بكات
لەنێوانیاندا ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ﴾ یەكسـەر كۆمەڵێك لەوانە ڕوو وەردەگێڕن (٤٨) ﴿وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ﴾
بەڵام ئەگەر (لەحوكم دانەكەدا) حەقەكە بۆ ئەوان بێت ﴿يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ﴾ دێن بۆ لای (حوكمەكە)
بەو پەڕی ملكەچی یەوە (٤٩) ﴿أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئایا دڵەكانیان نەخۆشی تێدایە ﴿أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟﴾ یا لەگوماندا
بوون ﴿أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ﴾ یان دەترسـن خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ ستەمیان لێ بكەن
﴿بَلْ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ (نەخێـر هیـچ لەوانە نی یـە) بەڵكو ئەوانە هەر خۆیان سـتەمكارن (٥٠) ﴿إِنَّمَا كَانَ
قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ قسـەی ئیمانـداران تەنهـا ئەمەیـە ﴿إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ كاتـێ بانـگ بكرێـن بۆ لای
(بەرنامـەی) خـواو پێغەمبەرەكـەی ﷺ ﴿لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ﴾ بۆ ئـەوەی بڕیاربـدات لەنێوانیاندا ﴿أَن يَقُولُوا۟
سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ كەدەڵێن بیستمان و گوێڕایەڵین ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ وە هەر ئەوانەن ڕزگاربووان
(٥١) ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ جـا هـەر كـەس گوێڕایەڵـی خـواو پێغەمبەرەكـەی بـكات ﴿وَيَخْشَ ٱللَّهَ
وَيَتَّقْهِ﴾ وە لەخـوا بترسـێ و خۆی لە(سـەرپێچی) خوا بپارێزێ ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾ ئەوە بەڕاسـتی
هـەر ئەوانـە سـەركەوتوون (٥٢) ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ﴾ (دوو ڕووەكان) سـوێندیان دەخـوارد بەخـوا ﴿جَهْدَ
أَيْمَٰنِهِمْ﴾ بـە ئـەو پـەڕی سـوێند خواردنیـان ﴿لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ﴾ كەئەگـەر فەرمانیـان پـێ بدەیـت
(بـە دەرچـوون بۆ غەزا) بێگومـان دەردەچن ﴿قُل لَّا تُقْسِمُوا۟﴾ بڵێ: سـوێند مەخۆن ﴿طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ﴾
ملكەچـی و گوێڕایەڵـی ئێـوە زانـراوە (قسـەتان پێچەوانـەی كردارتانە) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بەڕاسـتی خوا
﴿خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ ئاگادارە بەو كردەوانەی دەیكەن (٥٣)

﴿قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۖ﴾ بڵـێ فەرمانبەرداری خواو فەرمانبـەرداری پێغەمبەر ﷺ بن ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾
ئەمجـا ئەگەر پشـتیان هەڵکرد ﴿فَإِنَّمَا عَلَيۡهِ مَا حُمِّلَ﴾ ئەوە ئـەو (پێغەمبەر ﷺ) تەنها بەرپرسـیارە لەوەی
دراوە بەسـەریدا (کـە گەیاندنی پەیامی خوایـە) ﴿وَعَلَيۡكُم مَّا حُمِّلۡتُمۡۖ﴾ وە ئێوەش بەرپرسـن لەوەی
دراوە بەسـەرتاندا (کـە باوەڕهێنانـە) ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْۚ﴾ وە ئەگەر گوێڕایەڵـی پێغەمبەر ﷺ بکەن،
ئەوە هیدایەت وەردەگرن ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ﴾ وە پێغەمبەر هیچی لەسەر نی یە ﴿إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ بێجگە
لەگەیاندنـی ڕوون و ئاشـکرا(ی پەیامی خوا) ﴿٥٤﴾ ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ﴾ خـوا بەڵێنی داوە بەو
کەسـانەتان کەباوەڕیان هێناوە ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە کـردەوەی چاکەکانیان کردووە ﴿لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ
فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ کەبێگومان دەیانکاتە جێ نیشینی (خەڵکی تر) لەزەویدا ﴿كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾
هەروەك ئەوانی (ئیماندارانی) پێش ئەمانی کردە جێ نشـین ﴿وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ﴾ وە ئاینەکەیان
بۆ دەچەسپێنێ ﴿ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ﴾ ئەو (ئاینە)ی کەخوا پێی ڕازی بووە بۆیان ﴿وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ
أَمۡنٗاۚ﴾ وە تـرس وبیمیـان بـۆ دەگـۆڕێ بەئاسـایش و ئارامـی ﴿يَعۡبُدُونَنِي﴾ (لەوکاتـەدا ئیتـر) هەر من
دەپەرسـتن و ﴿لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ﴾ هیچ هاوبەشیەکم بۆ بڕیار نادەن ﴿وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ﴾ وە هەر کەس
بـێ بـڕوا بێ دوا ئـەوە (بەدی هاتنـی بەڵێنـەکان) ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ ئەوە بەڕاسـتی هـەر ئەوانەن
دەرچـوو لەڕێگـەی خـوا ﴿٥٥﴾ ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وەنوێـژ بەجـێ بێنـن ﴿وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ و زەکات بدەن
﴿وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ و گوێڕایەڵـی پێغەمبـەر ﷺ بکـەن ﴿لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ تـا خوا ڕەحمتـان پێ بکات
﴿٥٦﴾ ﴿لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئـەو کەسـانەی بـێ بـاوەڕن وانەزانـن ﴿مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ لەتۆڵـەی خوا
ڕزگاریـان دەبـێ لەزەویـدا ﴿وَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ﴾ و ئـەوان جێگایـان ئاگـرە ﴿وَلَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ ئـای چ
سەرئەنجامێکی بەدوخراپە ﴿٥٧﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ﴿لِيَسۡتَـٔۡذِنكُمُ﴾
دەبـێ مۆڵەتتـان لـێ وەربگـرن ﴿ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ﴾ ئەوکەسـانەی بەنـدەی ئێـوەن (بەندەکانتـان)
﴿وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ﴾ هەروەهـا منداڵەکانتـان کەهێشـتا باڵـغ نەبـوون ﴿ثَلَٰثَ مَرَّٰتٖۚ﴾ لەسـێ کاتـدا
(بـۆ چوونـە ژوری نوسـتنی ژن و مێـرد) ﴿مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ﴾ لەپێش نوێـژی بەیانـی ﴿وَحِينَ
تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ﴾ وە کاتێ پۆشـاکتان دادەنێن (لادەبەن لەبەرتان دا) لەکاتی نیوەڕواندا ﴿وَمِنۢ
بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ﴾ و لەپاش نوێژی عیشا (خەوتنان) ﴿ثَلَٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡۚ﴾ ئەم سێ کاتە کاتی خۆدەرخستنە
بۆتان دروسـتە ﴿لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ وَلَا عَلَيۡهِمۡ جُنَاحُۢ بَعۡدَهُنَّۚ﴾ دوا ئەم سـێ کاتە (بێ موڵەت وەرگرتن) نەبۆ ئێوەو
نەبـۆ ئەوان هیـچ گوناهێك نی یە (موڵەت وەرنەگرن) ﴿طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم﴾ (چونکە) ئەوان زۆر بەدەورو
بەرتاندا دێن (بۆخزمەت کردنتان) ﴿بَعۡضُكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ﴾ ئێوە لەگەڵ یەکتردا تێکەڵن ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ﴾
ئابەو جۆرە خوا ڕوونی دەکاتەوە ﴿لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۗ﴾ ئایەتەکانی بۆ ئێوە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ وەخوا زانای
کاردروستە ﴿٥٨﴾

﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَـٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ﴾ وەکاتێ کەمنداڵەکانتان باڵغ بوون ﴿فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟﴾ ئەوسا دەبێ مۆڵەت وەربگرن ﴿كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ وەکو چۆن کەسانی پێش ئەمان مۆڵەتیان وەردەگرت (لەهەموو کاتێکدا) ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ﴾ ئابەم جۆرە خوا ڕوونی دەکاتەوە ﴿لَكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ﴾ ئایەتەکانی بۆ ئێوە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ وەخوا زانای دانایە ﴿٥٩﴾ ﴿وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ وەئافرەتانی پیرو لەکار کەوتوو ﴿ٱلَّـٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا﴾ ئەو ئافرەتانەی ئومێدی شوکردنیان نەماوە ﴿فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ﴾ هیچ گوناهێکیان لەسەر نی یە ﴿أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ﴾ کە(هەندێك لە) پۆشاکەکانیان لابەرن ﴿غَيْرَ مُتَبَرِّجَـٰتٍۭ بِزِينَةٍ ۖ﴾ بەڵام زینەت و جوانیان دەرنەخەن ﴿وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ﴾ خۆ ئەگەر لاینەبەن و پۆشتە بن ﴿خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ﴾ ئەوە چاکترە بۆیان ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ وە خوا بیسەری زانایە ﴿٦٠﴾ ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ﴾ کوێر گوناهی لەسەر نی یە ﴿وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ﴾ و شەل گوناهی لەسەر نی یە ﴿وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ﴾ هەروەها نەخۆش گوناهی لەسەر نی یە (ئەم جۆرە کەسانە گوناە نی یە بۆیان نان خواردن لەگەڵ کەسانی ساغدا) ﴿وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ﴾ وە بۆ ئێوەش گوناە نییە ﴿أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ﴾ کە لەماڵەکانی خۆتان نان بخۆن (ماڵی منداڵ و خێزانەکانتان هەر بەماڵی خۆتان دادەنرێ) ﴿أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ﴾ یا (نان بخۆن لە)ماڵی باوکانتان ﴿أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَـٰتِكُمْ﴾ یا ماڵی دایکانتان ﴿أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ﴾ یا ماڵی براکانتان ﴿أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ﴾ یا ماڵی خوشکەکانتان ﴿أَوْ بُيُوتِ أَعْمَـٰمِكُمْ﴾ یا ماڵی مامەکانتان ﴿أَوْ بُيُوتِ عَمَّـٰتِكُمْ﴾ یا ماڵە پورەکانتان (خوشکانی باوك) ﴿أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ﴾ یا ماڵی خاڵەکانتان ﴿أَوْ بُيُوتِ خَـٰلَـٰتِكُمْ﴾ یا ماڵی پورەکانتان (خوشکانی دایك) ﴿أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ﴾ یا ئەو ماڵانەی کەکلیلەکانیان بەئێوەیە ﴿أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ﴾ یا ماڵی برادەرو هاوڕێتان ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ هیچ گوناهتان لەسەر نییە ﴿أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ﴾ بەکۆمەڵ یا بەتەنیا نان بخۆن ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا﴾ جا کاتێ چوونە (هەر ماڵێك لە) ماڵان ﴿فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ﴾ ئەوە سەلام لەیەکتر بکەن (لەوانەی کەوەك خۆتان وان) ﴿تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ بەسەلام کردنێك لەلایەن خواوە (هاتووە) ﴿مُبَـٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ﴾ سەلامێکی جوان وچاك و پاك ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ﴾ ئابەو شێوە خوا ڕوونی دەکاتەوە ﴿لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ﴾ ئایەتەکانی بۆ ئێوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بەڵکو ژیریتان بخەنە کارو بیربکەنەوە ﴿٦١﴾

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی ئیمانداران تەنها ئەوانەن ﴿ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ کەبڕوایان بەخواو
پێغەمبەرەکەی هێناوە ﴿وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ﴾ وە هەر کاتێك لەگەڵ ئەو (پێغەمبەر ﷺ) دابن ﴿عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ﴾
لەکارێکی گرنگدا کەکۆیان دەکاتەوە (وەك غەزاو جومعەو جەژن) ﴿لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ﴾ ناڕۆن
بە هیچ لایەکدا هەتا مۆڵەت لەپێغەمبەر ﷺ وەرنەگرن ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ﴾ بێگومان ئەوانەی
مۆڵەتت لێ وەردەگرن ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ ئەوانە کەسانێکن کەبڕوایان هەیە
بەخواو پێغەمبەرەکەی ﴿فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ﴾ جا هەر کاتێ ئەوانە داوای مۆڵەتیان لێ کردیت ﴿لِبَعْضِ
شَأْنِهِمْ﴾ بۆ هەندێ ئیش و کاری تایبەتی خۆیان ﴿فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ﴾ ئەوە هەر کامیان خۆت
ویستت مۆڵەتی بدە ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ﴾ وە داوای لێبووردنیان بۆ بکە لەخوا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾
بەڕاستی خوا لێبووردەی میهرەبانە ﴿٦٢﴾ ﴿لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ﴾ بانگ کردنی پێغەمبەر ﷺ
لەناو خۆتاندا دامەنێن (نابێ) ﴿كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا﴾ وەك بانگ کردنی خۆتان لەیەکتری (دەبێت
بەڕێزەوە بانگ بکرێت وەك ئەی پێغەمبەر یارسول الله ﷺ) ﴿قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی خوا
دەزانێ و ئاگادارە بەوانەی ﴿يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا﴾ لەئێوە (بەبێ مۆڵەت) لەپەنای خەڵکی ترەوە
دەردەچن بەدزییەوە ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ﴾ جا باترسن ئەوانەی ﴿يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ﴾ کەپێچەوانەی
فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دەکەن ﴿أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ﴾ کە (لەدونیادا) بەڵاو تاقیکردنەوەیەکیان تووش ببێت
﴿أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ یا سزایەکی سەختیان تووش ببێ (لەدوا ڕۆژدا) ﴿٦٣﴾ ﴿أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ﴾ بێداربنەوە
بەڕاستی تەنها بۆ خوایە ﴿مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدایە ﴿قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ
عَلَيْهِ﴾ بێگومان خوا ئاگادارە بەتەواوی ئەو شتانەی ئێوەی لەسەرن، وە بەو (کارانەیشی کە دەیکەن)
﴿وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ﴾ ئەو ڕۆژەش کەدەگەڕێنرێنەوە لای خوا ﴿فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟﴾ ئەوسا ئاگاداریان
دەکاتەوە بەو کردەوانەی کردوویانە ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ﴾ وە خوا بەهەموو شتێك ئاگادارە ﴿٦٤﴾

## سورەتی ﴿ٱلْفُرْقَانِ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى﴾ گەورەو پیرۆزە ئەو زاتەی ﴿نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ﴾ کەفورقان (قورئان)ی بۆ سەر
بەندەی خۆی ناردۆتە خوارەوە ﴿لِيَكُونَ لِلْعَـٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾ تا ترسێنەر بێت بۆ هەموو جیهانیان ﴿١﴾
﴿ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەو زاتەی کەدەسەڵات و موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هی ئەوە
﴿وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا﴾ و هیچ منداڵی بۆ خۆی بڕیارنەداوە ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ﴾ و کەس هاوبەشی
نییە لە فەرمانڕەوایی و موڵك وداریدا ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ وە هەموو شتێکی دروست کردووە
﴿فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا﴾ وە ئەندازەی بۆ دیاری کرد (لە هەموو ڕوویەکەوە) بەچاکی ﴿٢﴾

﴿وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً﴾ بێجگە لەخوا چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان بڕیار داوە ﴿لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا﴾
کەهیچ شتێك دروست ناکەن ﴿وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ﴾ بەڵکو خۆشیان دروست کراون ﴿وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ﴾
دەسەڵاتیان نی یە بۆ خۆیان ﴿ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا﴾ نەزیان نەسوودو قازاج (بگەیەنن) ﴿وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا
وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا﴾ هەروەها مردن و ژیان و زیندوو بوونەوەی خۆیان بەدەس نییە ﴿٣﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوٓاْ﴾ ئەوانەی کەبێ بڕوا بوون دەیان ووت ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ﴾ بێگومان ئەم(قورئانە) هیچ نییە
جگە لەدرۆیەکی گەورە کەموحەممەد ﷺ هەڵی بەستووە ﴿وَأَعَانَهُۥ عَلَيۡهِ قَوۡمٌ ءَاخَرُونَۖ﴾ وە کەسانی تر
بۆ ئەو (هەڵبەستنە) یارمەتییان داوە ﴿فَقَدۡ جَآءُو ظُلۡمٗا وَزُورٗا﴾ ئەوە بەڕاستی ئەوانە ستەم و بوهتانێکی
گەورەیان کردوە ﴿٤﴾ ﴿وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ وە(بێ بڕوایان) دەیان ووت (ئەم قورئانە) بەسەرهات
و داستانی پێشووەکانە ﴿ٱكۡتَتَبَهَا﴾ (موحەممەد ﷺ) داوای کردووە بۆی بنوسن ﴿فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ﴾
ئەمجا دەخوێندرێتەوە بەسەریدا ﴿بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا﴾ بەبەیانیان و ئێوارانـدا ﴿٥﴾ ﴿قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي﴾
(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ زاتێ ناردویەتی یە خوارەوە ﴿يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ کە هەموو
نهێنی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێت ﴿إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ بەڕاستی ئەو (خوا) لێبووردەی
میهرەبانە ﴿٦﴾ ﴿وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ﴾ (بێ بڕوایان) دەیان ووت ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە ﴿يَأۡكُلُ
ٱلطَّعَامَ﴾ خواردن دەخوات ﴿وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ﴾ وە بەبازاڕدا دەڕوات﴿لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٌ﴾ بۆچی
فریشتەیەك نەنێرراوەتە خوارەوە بۆ لای ﴿فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا﴾ بۆ ئەوەی لەگەڵیدا ترسێنەر بێ ﴿٧﴾
﴿أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ﴾ یا گەنجینەیەکی (لەئاسمانەوە) بۆ فڕێ بدرایە﴿أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٞ يَأۡكُلُ مِنۡهَاۚ﴾
یا باخێکی ببوایە لێی بخواردایە ﴿وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ وە ستەمکاران (بێ بڕوایان) دەیان ووت
(بەئیمانداران) ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا﴾ ئێوە تەنها شوێن پیاوێکی جادوو لێکراو کەوتوون
﴿٨﴾ ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَٰلَ﴾ سەیرکە چۆن نموونەی (پووچ) بۆ تۆ دێننەوە ﴿فَضَلُّواْ﴾
بەو هۆیەوە گومڕا بوون ﴿فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا﴾ ئیتر ناتوانن ڕێگای حەق و ڕاستی بدۆزنەوە ﴿٩﴾
﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ﴾ گەورە و پیرۆزە ئەو زاتەی ئەگەر بیەوێ (لەدونیادا) ﴿جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ﴾
چاکتر لەوە(ی بێ بڕوایان دەڵێن) بۆت ساز دەدات ﴿جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ باخاتێك
کە ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕوات ﴿وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا﴾ وە چەند کۆشکت بۆ فەراهەم دێنێ ﴿١٠﴾
﴿بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ﴾ (ڕاست ناکەن وانیە) بەڵکو ئەوانە باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نیە ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن
كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ﴾ وە ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ کەسێ باوەڕی بەڕۆژی دوایی نەبێ ﴿سَعِيرًا﴾ ئاگری
هەڵگیرساو ﴿١١﴾

﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾ کاتێ (ئەم ئاگرە) لەدوورەوە ئەوان دەبینێت ﴿سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا﴾ نرکە
ونالەی گڕ وبلێسەی دەبیسن (کە نیشانەی ڕق و قینی زۆریەتی لێیان) ﴿١٢﴾ ﴿وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا﴾
وەکاتێ فڕێ دەدرێنە جێگایەکی تەنگ لەدۆزەخدا ﴿مُّقَرَّنِينَ﴾ بەجووت کراوی دەست و قاچ
وملیان لەکۆت و زنجیردا (یا لەشیان بەکۆت و زنجیر پێکەوە بەستراوە) ﴿دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا﴾ لەوێدا
داوای تیاچوون و مردن دەکەن ﴿١٣﴾ ﴿لَّا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا﴾ ئەمڕۆ داوای تەنیا مردنێك مەکەن
﴿وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا﴾ بەڵکو داوای مردنی زۆر بکەن ﴿١٤﴾ ﴿قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾ بڵێ ئایا ئەمە چاکترە ﴿أَمْ
جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ﴾ یا ئەو بەهەشتە هەمیشەییەی کەبەڵێن دراوە بەپارێزکاران ولەخواترسان
﴿كَانَتْ لَهُمْ جَزَاءً وَمَصِيرًا﴾ کەپاداشت و سەرئەنجام و ئاکامیانە ﴿١٥﴾ ﴿لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ﴾ لەو (بەهەشتە)
دا هەرچیان بوێ هەیە ﴿خَالِدِينَ﴾ بەهەمیشەیی و بێ بڕانەوە ﴿كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْئُولًا﴾ ئەوە
بەڵێنێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە ئەو لێ ی بەرپرسیارە ﴿١٦﴾ ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ﴾ وە لەو ڕۆژەدا خوا ئەو
(بت پەرست) انە کۆدەکاتەوە ﴿وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ لەگەڵ ئەو پەرستراوانەی کەپەرستوونیان
جگە لەخوا ﴿فَيَقُولُ أَأَنتُمْ﴾ ئەمجا خوا (بە پەرستراوەکان) دەڵێ ئایا ئێوە ﴿أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي هَٰؤُلَاءِ﴾
ئەو بەندانەی منتان گومڕا کرد ﴿أَمْ هُمْ ضَلُّوا السَّبِيلَ﴾ یا خۆیان ڕێگای (ڕاستیان) ونکردو گومڕا بوون
﴿١٧﴾ ﴿قَالُوا سُبْحَانَكَ﴾ (پەرستراوەکان) دەڵێن پاك و بێگەردی بۆ تۆ ﴿مَا كَانَ يَنبَغِي لَنَا﴾ بۆ ئێمە شایستە
نەبووە ﴿أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ کەبێجگە لەتۆ پەرستراوێك بۆ خۆمان دا بنێین ﴿وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ
وَآبَاءَهُمْ﴾ بەڵام نازو نیعمەتت دا بەئەوان و باوو باپیرانیان ﴿حَتَّىٰ نَسُوا الذِّكْرَ﴾ هەتا (وایان
لێهات) یادی تۆیان لەبیر چوو ﴿وَكَانُوا قَوْمًا بُورًا﴾ وە ئەوانە کۆمەڵێکی تیاچووی بێ خێر بوون ﴿١٨﴾
﴿فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ﴾ (خوا بەبت پەرستەکان دەڵێ) جا بێگومان پەرستراوەکانتان ئێوەیان
بەدرۆ خستەوە لەو قسانەی کەدەتان کرد ﴿فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا نَصْرًا﴾ ئەمجا نەدەتوانن (سزای
خوا) لەخۆتان لادەن نەدەتوانن یارمەتی (خوا) بەدەس بێنن ﴿وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ﴾ وە هەر کەس
لەئێوە ستەم بکات (هاوەڵ بۆ خوا دابنێ) ﴿نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا﴾ سزایەکی گەورەی پێ دەچەژێین ﴿١٩﴾
﴿وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ ئێمە پێش تۆ هەرکام لەپێغەمبەرانمان نارد بێت ﴿إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ
الطَّعَامَ﴾ بێگومان ئەوان خواردنیان خواردووە ﴿وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ﴾ و بە بازاڕدا ڕۆشتوون
﴿وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً﴾ وە ئێمە هەندێك لەئێوەمان کردە هۆی تاقیکردنەوەی هەندێکی
ترتان ﴿أَتَصْبِرُونَ﴾ ئایا خۆ دەگرن ﴿وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا﴾ وە پەروەردگارت بینایە (بەهەموو
شتێك) ﴿٢٠﴾

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا﴾ وە ئەوانـەی کـە بەهیـوای دیـداری ئیمەنیـن (لـەڕۆژی دوایـی دا) دەڵێن
﴿لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئـەوە بـۆ فریشـتە نانێردرێتـە خـوارەوە بـۆ سـەرمان ﴿أَوۡ نَرَىٰ رَبَّنَاۗ﴾ یاخـود
پەروەردگارمان نابینین ﴿لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاسـتی ئەوانە لەدەرونی خۆیاندا
خۆیان بەگەورە دەزانی ﴿وَعَتَوۡ عُتُوّٗا كَبِيرٗا﴾ وە سەرکەشییەکی گەورەیان کرد. (٢١) ﴿يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ﴾
ئـەورۆژەی فریشـتەکان دەبینن(کاتـی مردن یاقیامـەت) ﴿لَا بُشۡرَىٰ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُجۡرِمِينَ﴾ لـەو ڕۆژەدا هیچ
مژدەیـەك بۆتاوانباران نی یە ﴿وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا﴾ وە دەڵێن (پەنامان بـدەن) بەپەنادانی پارێزراو (٢٢)
﴿وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ﴾ هاتین هەر کردەوەیەکیانکرد بوو ﴿فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا﴾ هەموویمان وەکو
تۆزی پرش وبلاولێ کرد (٢٣) ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ﴾ بەهەشـتی یـەکان لەو ڕۆژەدا ﴿خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا﴾
لەچاکترین جێگادان ﴿وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا﴾ وە لەباشـترین شوێنی حەسانەوە(ی نیوەڕوان)دان (٢٤) ﴿وَيَوۡمَ
تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ﴾ وە ڕۆژێ ئاسـمان لەت دەبێ لەگەڵ هەورێکی سـپی(هەموو ئاسمان دەگرێتەوە)
﴿وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا﴾ وە فریشـتەکان دەنێردرێنـە خـوارەوە کۆمـەڵ کۆمـەڵ. (٢٥) ﴿ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ
لِلرَّحۡمَٰنِۚ﴾ لـەو ڕۆژەدا فەرمانڕەوایەتی تەنها بـۆ خوای میهرەبانە ﴿وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا﴾ ئەو
ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر سەختە لەسەر بێ باوەڕان (٢٦) ﴿وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ﴾ وە ڕۆژێکە کەستەمکار
قـەپ دەکات بەهـەر دوو دەسـتی خۆیدا ﴿يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي﴾ و دەڵـێ خۆزگە ﴿ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا﴾
لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێگای ڕاستم بگرتایەتەبەر (٢٧) ﴿يَٰوَيۡلَتَىٰ﴾ ئای تیاچوون بۆ من ﴿لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا
خَلِيلٗا﴾ خۆزگـە فـلان کەسـم نەکردایە بەهـاوەڵ و خۆشەویسـتی خۆم. (٢٨) ﴿لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ﴾
بەڕاسـتی ئەو(کەسـەی کردم بەهاوەڵ) منی لەقورئان وێڵ کـرد ﴿بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ﴾ دوا ئەوەی قورئانم پێ
گەیشـت(و باوەڕم پێ هێنا) ﴿وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا﴾ وە شـەیتان هەمیشـە پشت تێکەرو پشت
بـەردەرە بۆ ئادەمیـزاد (٢٩) ﴿وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ﴾ وە پێغەمبەر(ﷺ) ووتی ئەی پەروەردگارم ﴿إِنَّ قَوۡمِي﴾
بەڕاستی قەومەکەم (قورەیش) ﴿ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا﴾ ئەم قورئانەیان واز لێهێناوەو گوێی پێ
نـادەن (٣٠) ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ﴾ ئا بـەو جۆرە (موحەممەد ﷺ) کەدژایەتـی تۆ دەکرێ) دامان
نـاوە بۆ هەمـوو پێغەمبەرێـك ﴿عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَۗ﴾ دوژمنێـك لەتاوانباران ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا وَنَصِيرٗا﴾
بەسـە پەروەردگـارت ڕێنموونی کەرو یارمەتی دەرت بـێ (٣١) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وە ئەوانەی بێ بڕوا
بـوون دەیان ووت ﴿لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ﴾ بۆچی (موحەممـەد ﷺ) هەموو قورئانی بەیەك
جاربـۆ دانەبەزێنـراوە ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئابەوجۆرە(دامانبەزاندووە) ﴿لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ﴾ بـۆ ئەوەی دڵی تۆ
(ئـەی موحەممـەد ﷺ) بـەو قورئانە دامـەزراوو بەهێز بکەیـن ﴿وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا﴾ وە(بـەو بۆنەیەوە)
ئایەتانی خۆمم بۆ ناردن بەرەبەرە (٣٢)

﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ﴾ هەر نموونەو مەسەلێکت بۆ بێنن (لە ڕەخنەو پێشنیارە نابەجێکانیان) ﴿إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا﴾ ئێمە وەڵامەکەیمان بۆ تۆ هێناوە بەڕاستی و جوانترین ڕوون کردنەوە ﴿٣٣﴾
﴿الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ﴾ ئەو کەسانەی کەبەسەر ڕوخسارياندا دەبرێن (ڕادەکێشرێن) بۆ دۆزەخ ﴿أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَكَانًا﴾ ئەوانە خراپترین جێگایان بۆ هەیە ﴿وَأَضَلُّ سَبِيلًا﴾ وە ڕێگاشیان وون کردووە (گومڕاترن) ﴿٣٤﴾ ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی تەوراتمان دا بەمووسا
﴿وَجَعَلْنَا مَعَهُ أَخَاهُ هَارُونَ وَزِيرًا﴾ وە هاروونی برایشیمان کردە یاریدەدەری ﴿٣٥﴾ ﴿فَقُلْنَا اذْهَبَا﴾
ئەمجا وتمان هەردووکتان بڕۆن ﴿إِلَى الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ بۆ سەر ئەو گەلەی کەباوەڕیان بەئایەتەکانی ئێمە نی یە و بەدرۆی دەزانن ﴿فَدَمَّرْنَاهُمْ تَدْمِيرًا﴾ ئەوسا لەناومان بردن بە لەناوبردنێکی زۆر خراپ ﴿٣٦﴾ ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا الرُّسُلَ﴾ گەلی نووحیش کاتێ پێغەمبەرانیان بە درۆزانی
﴿أَغْرَقْنَاهُمْ﴾ (لەئاوی لافاودا) نوقممان کردن ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ لِلنَّاسِ آيَةً﴾ وە کردنمانن بەپەندو عیبرەت بۆ خەڵك ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ﴾ وە ئامادەمان کردووە بۆ ستەمکاران ﴿عَذَابًا أَلِيمًا﴾ سزای سەخت ﴿٣٧﴾
﴿وَعَادًا وَثَمُودَ وَأَصْحَابَ الرَّسِّ﴾ و گەلی عادو سەموودو خاوەنی چاڵ و بیرەکان ﴿وَقُرُونًا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا﴾
وەزۆر گەلی تر کە لەنێوانیان دا بوون (لەناومان بردن) ﴿٣٨﴾ ﴿وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ الْأَمْثَالَ﴾ وەبۆ هەموویان چەندین نموونەمان هێنایەوە (بەڵام بیریان نەکردەوە) ﴿وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا﴾ وە هەموویانمان لەناوبرد بە لەناوبردنێکی خراپ ﴿٣٩﴾ ﴿وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى الْقَرْيَةِ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوان (قورەیش) تێپەڕبوون بەئەو شارەدا (سەدوم) ﴿الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ﴾ کەبارانی شەڕ (بەرد)ی بەسەردا بارێنرابوو ﴿أَفَلَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَهَا﴾ ئایا ئەوان ئەو (شارەبەردباران کراوە)یان نەبینیوە ﴿بَلْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ نُشُورًا﴾
(وانی یە بینیویانە) بەڵکو ئەوان بەتەمای زیندوو بوونەوە نین ﴿٤٠﴾ ﴿وَإِذَا رَأَوْكَ﴾ وە(ئەی موحەممەد ﷺ) کاتێ تۆ ببینن ﴿إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا﴾ بەس گاڵتەت پێ دەکەن ﴿أَهَٰذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ رَسُولًا﴾
و (دەڵێن) ئائەمەیە خوا ناردویەتی بەپێغەمبەر ﴿٤١﴾ ﴿إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ آلِهَتِنَا﴾ (وەدەڵێن) نزیك بوو لە پەرستراوەکانمان لامان بدات ﴿لَوْلَا أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا﴾ ئەگەر لەسەر (پەرستنی)یان خۆگر نەبووینایە ﴿وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ لە داهاتوودا دەزانن ﴿حِينَ يَرَوْنَ الْعَذَابَ﴾ کاتێ سزا(ی خوا) دەبینن
﴿مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ کێ (گومڕاترە) ڕێگای وون کردووە ﴿٤٢﴾ ﴿أَرَأَيْتَ﴾ ئایا دیت ﴿مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ﴾
ئەو کەسەی هەواو ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی ﴿أَفَأَنتَ﴾ ئایا تۆ ﴿تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا﴾
ئەبیتە پارێزەر بۆ ئەو (کەشوێنی ئارەزوی نەکەوێت)؟ ﴿٤٣﴾

﴿أَمْ تَحْسَبُ﴾ ئایا وا دەزانی ﴿أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ﴾ زۆربەی ئەوانە دەبیستن یا تێدەگەن
﴿إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ﴾ ئەوانە هەر وەك ئاژەڵن ﴿بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ بەڵكو ئەوان گومڕا تریشن ﴿٤٤﴾
﴿أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ ئایا نابینی پەروەردگارت ﴿كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ﴾ چۆن سێبەری درێژکردۆتەوە (لەبانگی
بەیانیانەو تا خۆر هەڵاتن) ﴿وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا﴾ ئەگەر بیویستایە ڕای دەگرت بەوەستاوی
(سێبەرەكە بەردەوام دەبوو) ﴿ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ﴾ لەپاشان خۆرمان كردە ﴿عَلَيْهِ دَلِيلًا﴾ بەڵگە لەسەر
ئەو (سێبەرە چونكە ئەگەر خۆر نەبێت سێبەر ناناسرێت) ﴿٤٥﴾ ﴿ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا﴾ پاشان ئەو سێبەرە
بۆلای خۆمان دەبەینەوە ﴿قَبْضًا يَسِيرًا﴾ بەشێنەیی و كەمە كەمە نایهێڵین ﴿٤٦﴾ ﴿وَهُوَ الَّذِي﴾ ئەو (خوا)
زاتێكە ﴿جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا﴾ كەشەوی بۆ كردون بەداپۆشەر (پۆشاك) ﴿وَالنَّوْمَ سُبَاتًا﴾ وە خەوتنی
بۆ كردوون بەهۆی مت بوون ﴿وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا﴾ وە ڕۆژی بۆ هەستان (لەخەو بۆ كارو ڕسق
پەیدا كردن) داناوە ﴿٤٧﴾ ﴿وَهُوَ الَّذِي﴾ وە ئەو(خوا) زاتێكە ﴿أَرْسَلَ الرِّيَاحَ﴾ باكان دەنێرێ ﴿بُشْرًا بَيْنَ
يَدَيْ رَحْمَتِهِ﴾ بەمزدەدەر پێش ڕەحمەتی خۆی (باران بارین) ﴿وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ﴾ وە لەئاسمانەوە
باراندومانە ﴿مَاءً طَهُورًا﴾ ئاوێكی پاكۆكەر (پاك و خاوێن) ﴿٤٨﴾ ﴿لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا﴾ تا زەوی
مردووی پێ دەبوژێنینەوە ﴿وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا﴾ وە ئاوی دەدەین بەو (بارانە) لەوانەی دروستمان
كردوون ﴿أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا﴾ ئاژەڵ و خەڵكانێكی زۆر ﴿٤٩﴾ ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ﴾ سوێند بەخوا
بەڕاستی ئێمە بەچەند جۆر ئەم (ئیشانە)مان گۆڕی لەنێوانیاندا ﴿لِيَذَّكَّرُوا﴾ تا بیربكەنەوە ﴿فَأَبَىٰ
أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا﴾ بەڵام زۆربەی خەڵك جگەلە سپڵەیی (بێ باوەڕی) هیچیان ناوێت
﴿٥٠﴾ ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا﴾ ئەگەر بمان ویستایە بێگومان دەمان نارد ﴿فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَذِيرًا﴾ لەهەموو
شارو شارۆچكەیەكدا ترسێنەرێك ﴿٥١﴾ ﴿فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ﴾ كەواتە تۆ بەگوێی بێباوەڕان مەكە
﴿وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا﴾ بە(بەڵگەكانی) ئەم قورئانە بەربەرەكانی یەكی گەورەیان لەگەڵدا بكە
﴿٥٢﴾ ﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ﴾ ئەو (خوا) زاتێكە دوو دەریا (ئاو) ی بەڕەڵا كردووە لەپاڵ یەكدا ﴿هَٰذَا
عَذْبٌ فُرَاتٌ﴾ ئەمەیان شیرین و سازگارە (ئاوی ڕوبارو كانیاوە) ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ ئەوی تریان زۆر
سوێرو تاڵ و تفتە (ئاوی دەریاكانە) ﴿وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا﴾ وە لەنێوان ئەو دوو (ئاو)ەدا بەربەستێكی
داناوە ﴿وَحِجْرًا مَحْجُورًا﴾ و بەرگری كەرێكی ئەستور (تائەو دوو ئاوە تێكەڵ بەیەك نەبن) ﴿٥٣﴾
﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا﴾ ئەو (خوا) زاتێكە لەئاو(ی مرۆڤ) ئادەمیزادی دروست كردووە ﴿فَجَعَلَهُ
نَسَبًا وَصِهْرًا﴾ ئەمجا ئەو (ئاوە)ی كردۆتە هۆی ڕەچەڵەك (پشت كە بەرێگەی نێرینە دەگەن بەمرۆڤ
وەك كوڕ) و خزم (كە بەرێگەی ئافرەت دەگەنەوە بەمرۆڤ وەك كچە زاو خوشكەزا) ﴿وَكَانَ رَبُّكَ
قَدِيرًا﴾ وە پەروەردگارت هەمیشە بە دەسەڵات و توانایە ﴿٥٤﴾ ﴿وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا﴾ ئەوانە جگە لەخوا
شتانێك دەپەرستن ﴿لَا يَنْفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ﴾ كە نەسوود نەزیان بەوان ناگەیەنن ﴿وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِ
ظَهِيرًا﴾ وە بێ بڕوایان بەردەوام دژی پەروەردگاریان پشتیوانی یەكترین (بۆ تاوان و خراپە) ﴿٥٥﴾

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ﴾ ئێمە تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە﴿إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ کەمژدە دەرو ترسێنەر بی
﴿٥٦﴾ ﴿قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ من لەسەر گەیاندنی ئیسلام هیچ
کرێ و پاداشتێك لەئێوە داوا ناکەم ﴿إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا﴾ بەلاّم هەر کەس ویستی
ڕێگەی پەروردگاری بگرێ (با بیگرێ) ﴿٥٧﴾ ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ﴾ پشت ببەستە بە(خوای) زیندوو
﴿ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ﴾ کەزاتێکە هەرگیز نامرێت ﴿وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦ﴾ تەسبیحات بکە بەستایشی
ئەو﴿وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا﴾ بەسە (بۆ تۆ) کەخوا ئاگادارە بەگوناهی بەندەکانی ﴿٥٨﴾
﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ ئەو (خوایە)ی کەئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە﴿وَمَا بَيۡنَهُمَا﴾
وەئەوەش لەنێوانیان دایە﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾ لەشەش ڕۆژدا﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾ لەپاشانیش بەرز
بوویەوە بۆ سەر عەرش و قەراری گرت (باوەڕمان پێیەتی بەبێ ئەوەی شێوەکەی بزانین) ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ
فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا﴾ ئەو خوای میهرەبانە کەواتە پرسیار لەزاتێ بکە کە بەهەموو شت زاناو ئاگایە ﴿٥٩﴾
﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ﴾ وە کاتێ بەوان بوترێ ﴿ٱسۡجُدُواْ لِلرَّحۡمَٰنِ﴾ سوژدە ببەن بۆخوای میهرەبان ﴿قَالُواْ
وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ دەڵێن ڕەحمان کێیە (ئێمە نایناسین) ﴿أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا﴾ ئایا سوژدە ببەین بۆ ئەو (زاتەی)
کەتۆ فەرمانمان پێ دەدەیت ﴿وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا۩﴾ وە(بەم داوای سوژدە بردنە) دورکەوتنەوەیان (لەڕێگای
ڕاست) زیاتر دەبێت ﴿٦٠﴾ ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي﴾ پاك وبێگەرد وپیرۆزە ئەو (خوایەی) ﴿جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا﴾ کە
لەئاسماندا چەند خولگە (بورج)ی دروست کردووە﴿وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجٗا﴾ ودایناوە لەئاسماندا خۆرێکی
پڕشنگدار ﴿وَقَمَرٗا مُّنِيرٗا﴾ ومانگێکی ڕووناك کەرەوە(بۆ زەوی) ﴿٦١﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي﴾ وەئەو (خوایە) زاتێکە
﴿جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةٗ﴾ کەشەوو ڕۆژی لەجێی یەکتر داناوە (بەدوای یەکتردا دێن و شوێنی
یەکتر دەگرنەوە) ﴿لِّمَنۡ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ﴾ بۆ ئەو کەسەی بیەوێ بیربکاتەوە (لەدروسکراوەکانی خوا)
﴿أَوۡ أَرَادَ شُكُورٗا﴾ یا بیەوێ شوکرانە بژێری خوا بکات ﴿٦٢﴾ ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ﴾ بەندە تایبەتی یەکانی
خوای میهرەبان کەسانێکن ﴿يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا﴾ بەویقارو نەرمی دەڕۆن بەسەر زەوی دا (بێ
لوت بەرزی و کەشخەو فیز کردن) ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ﴾ وەکاتێ نەزان و نەفامەکان (بەووتەی
ناشیرن) لەگەڵیان بدوێن ﴿قَالُواْ سَلَٰمٗا﴾ ووتەیەك دەڵێن پێیان گوناە نەبێت ﴿٦٣﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ﴾
وە کەسانێکن لەشەودا بۆ پەروەردگاریان ﴿سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا﴾ سوژدە بەرن و شەو نوێژ دەکەن ﴿٦٤﴾
﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا﴾ وە کەسانێکن کەدەڵێن ئەی پەروەردگارمان ﴿ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ﴾
سزای دۆزەخمان لێ لادە ﴿إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾ بەڕاستی سزای ئەو (دۆزەخە) لانەچووی
بەردەوامە ﴿٦٥﴾ ﴿إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا﴾ بەڕاستی دۆزەخ جێگەو شوێن مانەوەیەکی زۆر خراپە
﴿٦٦﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ﴾ وە کەسانێکن کاتێ ماڵ و سامان خەرج دەکەن (بۆ خۆیان و خێزانیان)
﴿لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ﴾ نەزیادە ڕۆی و نەڕەزیلی و دەست نوقاوی (تێدا) ناکەن ﴿وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا﴾
(بەڵکو) مام ناوەندیە لەونێوانەدا ﴿٦٧﴾

﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ﴾ وه‌ که‌سانێکن که‌له‌ گه‌ڵ خوادا ناپه‌رستن ﴿إِلَٰهًا آخَرَ﴾ هیچ په‌رستراوێکی تر ﴿وَلَا يَقْتُلُونَ﴾ و ناکوژن ﴿النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ﴾ هیچ که‌سێ که‌خوا کوشتنی ئه‌وی یاساغ(حه‌رام) کردووه‌ ﴿إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ به‌هه‌ق و ڕه‌وا نه‌بێ ﴿وَلَا يَزْنُونَ﴾ وه‌ زیناو داوێن پیسی ناکه‌ن ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ وه‌ هه‌ر که‌س ئه‌و تاوانانه‌ بکات (که‌باسکران) ﴿يَلْقَ أَثَامًا﴾ تووشی تۆڵه‌که‌ی دێت ﴿٦٨﴾ ﴿يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ﴾ سزای بۆ چه‌ند باره‌ده‌کرێته‌وه‌ ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ له‌ڕۆژی قیامه‌تدا ﴿وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا﴾ وه‌بێ بڕانه‌وه‌به‌بێ ڕێزو ڕیسوایی له‌دۆزه‌خ داده‌مێنێته‌وه‌ ﴿٦٩﴾ ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ﴾ بێجگه‌له‌که‌سێ ته‌وبه‌ی کردبێ و باوه‌ڕی هێنابێ ﴿وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا﴾ کارو کرده‌وه‌ی چاکیشی کردبێت ﴿فَأُولَٰئِكَ﴾ ئا ئه‌وانه‌ ﴿يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ﴾ خوا خراپه‌ و تاوانه‌کانیان ده‌گۆڕێت به‌چاکه‌ ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ وه‌خوا هه‌میشه‌ لێبورده‌ی به‌به‌زه‌یی یه‌ ﴿٧٠﴾ ﴿وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَالِحًا﴾ وه‌ هه‌ر که‌س ته‌وبه‌ی کردو کرده‌وه‌ی چاکی کرد ﴿فَإِنَّهُ يَتُوبُ إِلَى اللَّهِ﴾ ئه‌وه‌ به‌ڕاستی ئه‌و که‌سه‌ ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ لای خوا ﴿مَتَابًا﴾ به‌ گه‌ڕانه‌وه‌یه‌کی ته‌واو ﴿٧١﴾ ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ﴾ وه‌ (به‌نده‌کانی خوا) که‌سانێکن که‌شایه‌تی درۆ ناده‌ن ﴿وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ﴾ و کاتێ تێپه‌ڕ بن به‌لای شتی بێ سوددا (ئه‌نجام بدرێت له‌لایه‌ن نه‌فامانه‌وه‌) ﴿مَرُّوا كِرَامًا﴾ تێپه‌ڕ ده‌که‌ن به‌ڕێزه‌وه‌ (پێ گوێدانه‌ نه‌فامان) ﴿٧٢﴾ ﴿وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا﴾ وه‌ که‌سانێکن کاتێ ئامۆژگاری بکرێن ﴿بِآيَاتِ رَبِّهِمْ﴾ به‌ئایه‌ته‌کانی په‌روه‌ردگاریان ﴿لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا﴾ ناکه‌ون به‌سه‌ریاندا ﴿صُمًّا وَعُمْيَانًا﴾ به‌ که‌ڕی و کوێری ﴿٧٣﴾ ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا﴾ وه‌ که‌سانێکن که‌ده‌ڵێن ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان ببه‌خشه‌ پێمان ﴿مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا﴾ له‌ هاوسه‌ران و نه‌وه‌کانمان (منداڵه‌کانمان) ﴿قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ ئه‌وه‌ی چاوانی پێ گه‌ش بێ هۆی دڵخۆشی بێت ﴿وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ وه‌ بمانکه‌ به‌ پێشه‌وای پارێزکاران و له‌خوا ترسان ﴿٧٤﴾ ﴿أُولَٰئِكَ﴾ ئه‌وانه‌ (که‌ ئه‌و سیفه‌تانه‌یان تیایه‌) ﴿يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا﴾ پاداشت ده‌درێنه‌وه‌ به‌پله‌ و کۆشکی به‌رز له‌ به‌هه‌شتدا به‌هۆی ئارام گرتنیان ﴿وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا﴾ وه‌ له‌و شوێنه‌دا سڵاویان لێ ده‌کرێ (له‌لایه‌ن فریشته‌کانه‌وه‌ زۆر به‌گه‌رمی) ﴿٧٥﴾ ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ بێ بڕانه‌وه‌ تیایدا ده‌مێننه‌وه‌ ﴿حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾ چه‌ن جێگا وشوێن ومانه‌وه‌یه‌کی جوان و خۆشه‌ ﴿٧٦﴾ ﴿قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي﴾ (ئه‌ی موحه‌ممه‌د ﷺ) بڵێ خه‌ڵکینه‌ په‌روه‌ردگار گوێتان پێ نادات و هیچ بایه‌خێکتان نی یه‌ لای ﴿لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ﴾ ئه‌گه‌ر دوعا و نزاتان نه‌بێ (له‌کاتی ته‌نگی و ناڕه‌حه‌تیدا) ﴿فَقَدْ كَذَّبْتُمْ﴾ که‌چی (زۆربه‌تان) ئایینی خواتان به‌درۆ ده‌زانی (بڕواتان نه‌هێنا) ﴿فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾ جادڵنیابن تۆڵه‌که‌ی یه‌خه‌تان ده‌گرێ و لێتان جیا نابێته‌وه‌ ﴿٧٧﴾

## سوره‌تی ﴿ الشُّعَرَاءِ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿طسٓمٓ﴾ بە (طا، سین، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی، بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی
(البقرە) بکە ﴿١﴾ ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ﴾ ئەم (سورەتە) لەئایەتەکانی قورئانی ڕوونکەرەوەیە ﴿٢﴾ ﴿لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ﴾
خەریکە خۆت لەناو دەبەی (دەکوژی) بەخەفەت ﴿أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ﴾ لەبەر ئەوەی ئەوان (خەڵکی مەککە) باوەڕ ناهێنن
﴿٣﴾ ﴿إِن نَّشَأْ﴾ ئەگەر بمانەوێت ﴿نُنَزِّلْ عَلَيْهِم﴾ دێنینە خوارەوە بۆیان ﴿مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً﴾ نیشانەو بەڵگەیەك لەئاسمانەوە
﴿فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ﴾ کەبەردەوام گەرد نیانی بۆ دانەوێنن (ناچاریان بکات باوەڕ بێنن) ﴿٤﴾ ﴿وَمَا يَأْتِيهِم﴾ هەر
بێت بۆیان ﴿مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ﴾ پەیامێکی تازە دابەزێنراو (کەقورئانە) لەخوای میهرەبانەوە ﴿إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ﴾
ئەوان بەردەوام پشت تێکەرو ڕوو وەرگێڕن لێی ﴿٥﴾ ﴿فَقَدْ كَذَّبُوا۟﴾ جا بێگومان ئەوانە بەدرۆیان زانی و باوەڕیان پێ
نەکرد (ئەوەی ناردبومان) ﴿فَسَيَأْتِيهِمْ﴾ جا بەزوویی بۆیان دێت ﴿أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ هەواڵەکانی ئەوەی ئەوان
گاڵتەو لاقرتییان پێ دەکرد ﴿٦﴾ ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا سەیری زەوی ناکەن ﴿كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا﴾ چەندمان ڕواندووە تیایدا
﴿مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾ لەهەموو جۆرێکی چاکی بەکەڵك ﴿٧﴾ ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً﴾ بەڕاستی لەڕواندنی ئەو هەموو ڕووەوەدا
بەڵگەی گەورە هەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەڵام زۆر بەیان بڕوادارنین و باوەڕ ناهێنن ﴿٨﴾ ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ﴾ بێگومان
پەروەردگارت ﴿لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ تەنها ئەو خاوەن دەسەڵاتی بەزەیی دارە ﴿٩﴾ ﴿وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ﴾ (باس بکە) ئەو
کاتەی پەروەردگارت بانگی مووسای کرد ﴿أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ کە (بەپێغەمبەری) بڕۆ بۆ لای ئەو گەلە ستەمکارە
﴿١٠﴾ ﴿قَوْمَ فِرْعَوْنَ﴾ کە گەلەکەی فیرعەونە ﴿أَلَا يَتَّقُونَ﴾ ئایا ئەوان ناترسن (بێ فەرمانی خوادەکەن) ﴿١١﴾ ﴿قَالَ رَبِّ﴾
(مووسا) ووتی ئەی پەروەردگارم ﴿إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴾ بەڕاستی من دەترسم بڕوام پێ نەکەن ﴿١٢﴾ ﴿وَيَضِيقُ صَدْرِى﴾
وەسینگم (دڵم) تەنگ بێ ﴿وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى﴾ وە(دەترسم) بەچاکی قسەم بۆ نەکرێ و زمانم بەر نەبێ (لەو گرێیەی
هەیەتی) ﴿فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ﴾ کەواتە (خوایە جوبرەئیل) بنێرە بۆ لای هاروون (و بیکە بەپێغەمبەر بۆ ئەوەی یارمەتیم
بدات) ﴿١٣﴾ ﴿وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ﴾ وەئەوان (گەلی فیرعەون) تۆڵەی تاوانێکیان لەسەرمە ﴿فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ﴾ بۆیە دەترسم
کەبمکوژن (لەجیاتی ئەو کوژراوە) ﴿١٤﴾ ﴿قَالَ كَلَّا﴾ (خوا) فەرمووی نەخێر (ئەوەی باست کرد هیچی روونادات)
﴿فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ کەواتە هەردووکتان بەموعجیزەکانمانەوە بڕۆن (بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی) ﴿إِنَّا مَعَكُم
مُّسْتَمِعُونَ﴾ ئێمە لەگەڵتان گوێ دەگرین ﴿١٥﴾ ﴿فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ﴾ ئەوسا برۆنە لای فیرعەون و هەردووکتان بڵێن
﴿إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە پێغەمبەری پەروەردگاری جیهانیانین ﴿١٦﴾ ﴿أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ (نێراوین)
کەتۆ بەنو ئیسرائیل (لەژێر دەستەیی خۆت) بەڕەڵا کەیت لەگەڵ ئێمەدا (بڕۆین بۆ شام) ﴿١٧﴾ ﴿قَالَ﴾ (فیرعەون) ووتی
﴿أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا﴾ ئایا ئێمە پێمان نەگەیاندی لەناو (ماڵی) خۆماندا بەمنداڵی ﴿وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ﴾ وە
تۆ چەند ساڵێك لەتەمەنت لەناو ئێمەدا نەمایتەوە ﴿١٨﴾ ﴿وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ﴾ وە ئەو کردەوە (خراپە) شت کرد
کەکردت (کەکوشتنی قیبتی یەك بوو) ﴿وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ وە تۆ لەوانەی سپڵەو ناشوکرن ﴿١٩﴾

﴿قَالَ فَعَلْتُهَآ﴾ (مووسا) ووتی ئەوکارەم کرد (ئەو پیاوەم کوشت) ﴿إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ کاتێ کەمن
لەڕیزی نەزانانـدا بـووم (٢٠) ﴿فَفَرَرْتُ مِنكُمْ﴾ ئەمجا رام کـردو هەڵهاتم لەئێوە ﴿لَمَّا خِفْتُكُمْ﴾ کاتێك
ترسام لێتان (تۆڵەم لێ بسەنن) ﴿فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا﴾ ئەوسا پەروەردگارم حیکمەتی (پێغەمبەریەتی)
پێ بەخشیم ﴿وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ منی خستە ریزی پێغەمبەرانەوە (کردمی بەپێغەمبەر) (٢١) ﴿وَتِلْكَ
نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ﴾ وە ئەو (بەخێو کردنە) کە تۆ دەیکەیت بەمنەت بەسەرمەوە ﴿أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾
بەهۆی ئەوەوە بووە کەتۆ نەوەی ئیسرائیلت کردبووە کۆیلە و ژێردەستەی خۆت (لەترسا دایکی
مووسا مووسای بەخێو نەکرد) (٢٢) ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ (ئەمجا) فیرعەون ووتی پەروەردگاری
جیهانیان کێ یە (٢٣) ﴿قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ﴾ (مووسا) ووتی پەروەردگاری ئاسمانەکان
وزەوی و هەرچی لەنێوانیان دایە ﴿إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە دڵنیان (٢٤) ﴿قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ﴾ (فیرعەون)
ووتی بەوانەی بەدەوری دا بوون (لەشوێنکەوتوانی) ﴿أَلَا تَسْتَمِعُونَ﴾ ئایا گوێتان لێیە (چی دەڵێ)
(٢٥) ﴿قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ (مووسا) ووتی پەرەوەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باوك وباپیرە
پێشووەکانتانە (٢٦) ﴿قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ﴾ (فیرعەون) ووتی بەڕاستی ئەو پێغەمبەرە
کەنێرراوە بۆ ئێوە ﴿لَمَجْنُونٌ﴾ شێتە (٢٧) ﴿قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ﴾ (مووسا) ووتی
پەروەردگاری رۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوایەو ئەوەی لەنێوانیادایە ﴿إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بیربکەنەوە
وژیربن (٢٨) ﴿قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى﴾ (فیرعەون) ووتی سوێندبێ ئەگەر پەرستراوێ تر جگە لەمن
دابنێیت ﴿لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ﴾ بێگومان دەتخەمە ریزی بەندکراوەکانەوەو زیندانیت دەکەم (٢٩)
﴿قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ﴾ (مووسا) ووتی ئایا هەر زیندانیم دەکەیت ئەگەر شتێکی (موعجیزەیەکی)
ڕوون و ئاشکرات بۆ بێنم (کەڕاستە پێغەمبەرم) (٣٠) ﴿قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ﴾ (فیرعەون) ووتی دەی ئەو شتە
بێنە (بینوێنە) ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەگەر تۆ لەڕاست گۆیانی (٣١) ﴿فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ﴾ ئەمجا
مووسا گۆچانەکەی فڕێدا ﴿فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ﴾ دەست بەجێ بوو بەئەژدیهایەکی دیارو ئاشکرا
(٣٢) ﴿وَنَزَعَ يَدَهُۥ﴾ وە دەستی دەرهێنا (لەبن باڵیدا) ﴿فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ﴾ یەکسەر دەستی سپی
وپرشنگدار بوو بۆ بینەران (٣٣) ﴿قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ﴾ (فیرعەون) ووتی بەو پیاوە گەورانەی لەدەورەی
بوون ﴿إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان ئەمە جادووگەرێکی زۆر زانایە (٣٤) ﴿يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم﴾
دەیەوێ دەرتان بکات ﴿مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ﴾ لەووڵات و خاکی خۆتان بەجادووەکەی ﴿فَمَاذَا
تَأْمُرُونَ﴾ جافەرمانی چی دەدەن (لەدژی بیکەم) (٣٥) ﴿قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ﴾ ووتیان جارێ مووساوبراکەی وازی
لێ بێنە (دوایانخە) ﴿وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ﴾ سەربازەکانت کۆ بکەرەوە وبیانێرە بۆ هەموو شارەکان (٣٦)
﴿يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ﴾ تاهەموو جادووگەرێکی زۆر زانت بۆ بهێنن (٣٧) ﴿فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ﴾ ئەمجا
ئەو جادووگەرانە کۆکرانەوە ﴿لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ لەکات و ڕۆژی دیاری کراودا (٣٨) ﴿وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ
أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ﴾ و بەخەڵکیش وترا ئێوەش کۆدەبنەوە؟ (٣٩)

﴿لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ السَّحَرَةَ﴾ تا شوێن جادووگەران بکەوین ﴿إِن كَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ﴾ ئەگەر ئەوان زاڵ و سەرکەوتوو بوون
(٤٠) ﴿فَلَمَّا جَاءَ السَّحَرَةُ﴾ ئەمجـا کاتێ جادووگەرەکان هاتن ﴿قَالُوا لِفِرْعَوْنَ﴾ ووتیان بەفیرعەون ﴿أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا﴾ ئایا
بەڕاستی پاداشتمان هەیە ﴿إِن كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ﴾ ئەگەر ئێمە زاڵ و سەرکەوتوو بین (٤١) ﴿قَالَ نَعَمْ﴾ (فیرعەون)
ووتـی بەڵـێ ﴿وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴾ وەبێگومـان ئێـوە ئـەو کاتـە لەنزیکانـی خـۆم دەبـن (٤٢) ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ﴾
مووسـا بەسـاحیرەکانی ووت ﴿أَلْقُوا مَا أَنتُم مُّلْقُونَ﴾ بیهاوێـژن ئـەوەی ئێـوە هاوێژەریانـن (لەجـادوو) (٤٣)
﴿فَأَلْقَوْا حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ﴾ ئەوانیش گوریس و حەبل و دار دەستەکانیان فڕیدا ﴿وَقَالُوا بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ﴾ وە ووتیان
سـوێند بەگەورەیـی فیرعـەون ﴿إِنَّا لَنَحْنُ الْغَالِبُونَ﴾ بەڕاسـتی هـەر ئێمـە زاڵ و سـەرکەتووین (٤٤) ﴿فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ
عَصَاهُ﴾ ئەمجا مووسـا داردەستەکەی فڕیـدا (و بوو بەمارێکی گـەورە) ﴿فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ﴾ جا کوت
و پڕ ئـەو (مارە گەورە) هەرچـی جادوویان کردبـوو هەڵی لوشـی (٤٥) ﴿فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ﴾ ئەمجا جادوو
گـەرەکان خـران (کەوتـن) بـەڕوودا بەسـوژدە بردنەوە (بۆ خـوا) (٤٦) ﴿قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ووتیـان ئەوا
باوەڕمـان هێنـا بەپەروەردگـاری جیهانیـان (٤٧) ﴿رَبِّ مُوسَىٰ وَهَارُونَ﴾ کەپەروەردگـاری مووسـا و هاروونە (٤٨)
﴿قَالَ آمَنتُمْ لَهُ﴾ (فیرعـەون) ووتـی ئایـا باوەڕتـان پـێ هێنـا ﴿قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ﴾ پێش ئـەوەی مۆڵەتتـان بدەم
﴿إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُمُ السِّحْرَ﴾ بەڕاسـتی ئەو (مووسـا) جادوو گەرە گەورەکەتانەکە فێری جادووی کردون
﴿فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ جـا بێگومان لەمـەودوا دەزانن (چیتان لێ دەکەم) ﴿لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ﴾ بەڕاسـتی
دەسـت و قاچتان ڕاسـت و چەپ دەبـڕم ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ وە بێگومـان هەمووتان هەڵ دەواسـم (بەدارا)
(٤٩) ﴿قَالُوا لَا ضَيْرَ﴾ (جادووگـەرەکان) ووتیـان هیـچ زیانی نـی یە (بۆ ئێمە ئـەوەی تۆ ئەتـەوێ بیکەی) ﴿إِنَّا
إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾ (چونکـە) بەڕاسـتی ئێمـە گەڕانەوەمـان بـۆ لای پەروەردگارمانـە (٥٠) ﴿إِنَّا نَطْمَعُ﴾ بەڕاسـتی
ئێمـە بەتەمایـن و ئومێـد دەکەیـن ﴿أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَايَانَا﴾ کەپەروەردگارمان لـە گوناهو تاوانەکانمـان ببورێ
﴿أَن كُنَّا أَوَّلَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ چونکـە ئێمـە یەکەمـی بـاوەڕداران بوویـن (لەگەڵەکەمانـدا) (٥١) ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ﴾
وەحیمـان نـارد بـۆ مووسـا ﴿أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي﴾ کەبەشـەو بەنـدە (باوەڕداره)کانـم ببـە(و میصـر بەجـێ بێڵـن)
﴿إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾ بێگومـان (فیرعـەون و کۆمەڵەکـەی) دواتـان دەکـەون (٥٢) ﴿فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ﴾
ئەوسا فیرعـەون پیاوانـی کۆ کـەرەوەی نـارد بەشـارەکاندا (بۆکۆکردنەوەی لەشکرو هێـز) (٥٣) ﴿إِنَّ هَٰؤُلَاءِ
لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ﴾ (فیرعەون ووتی) بەڕاسـتی ئەوانە (مووسا و شوێن کەوتوانی) کۆمەڵێکی کەمی بێ نرخن (٥٤)
﴿وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَائِظُونَ﴾ وە بەڕاسـتی ئەوانـە ڕقی ئێمە هەڵدەسـێنن (بەووتـارو کرداریان) (٥٥) ﴿وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ﴾
وە بێگومـان ئێمـە کۆمەڵێکیـن بێـدار و ئاگاداریـن (بەپیلانەکانیـان) (٥٦) ﴿فَأَخْرَجْنَاهُم مِّن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ ئەمجـا
ئـەوان (فیرعـەون و کۆمەڵەکەی)مان دەرکـرد لە باخات و کانیـاوەکان (٥٧) ﴿وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ﴾ وە (دەرمان
کردن) لەو هەموو گەنج و غەزنە و کۆشکە زۆر جوان و چاکانە (٥٨) ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئا بەو جۆرە (لەناومان بردن)
﴿وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ نەوەکانـی یەعقـوب (جوولەکە)مان لەجێگایـان دانا (٥٩) ﴿فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ﴾ ئەمجا
(فیرعەون و لەشکرەکەی) کاتێ خۆر هەڵهاتن شوێنیان کەوتن (٦٠)

﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ﴾ ئەمجا کاتێ دوو کۆمەڵەکە چاویان بەیەکتر کەوت ﴿قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ﴾
هاوەڵەکانی مووسا وتیان ﴿إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ﴾ بێگومان ئێمە گیراوین، (پێمان دەگەن) ﴿٦١﴾ ﴿قَالَ كَلَّآۖ﴾
(مووسا) وتی نەخێر پێتان ناگەن ﴿إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ﴾ بێگومان من پەروردگارم لەگەڵە دڵنیابن
ڕێگای (ڕزگار بوونم) نیشان دەدات ﴿٦٢﴾ ﴿فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ﴾ ئەمجا سرووشمان کرد بۆ مووسا
﴿أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ﴾ کە بە گۆچانەکەت بدە لەدەریاکە ﴿فَٱنفَلَقَ﴾ (ئەویش لێیداو) جا دەریاکە
لەت بوو ﴿فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ کە هەر لەتێکی وەك شاخێکی زۆر گەورە وابوو ﴿٦٣﴾ ﴿وَأَزۡلَفۡنَا
ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ﴾ وە ئەوانی تر (فیرعەون و لەشکرەکەی)مان نزیك کردەوە لەوێ (لەدەریاکە) ﴿٦٤﴾
﴿وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ﴾ جا مووساو هەموو ئەوانەی لەگەڵی بوون رزگارمان کردن ﴿٦٥﴾
﴿ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ﴾ پاشان ئەوانی ترمان نوقم کرد (لەدەریادا) ﴿٦٦﴾ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ﴾ بەڕاستی
لەوەدا (کەباسکرا) بەڵگەیەکی گەورە هەیە (لەسەر دەسەڵاتی خوا) ﴿وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ﴾
بەڵام زۆربەیان باوەڕیان نەهێنا ﴿٦٧﴾ ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت زاڵ
وبە بەزەیی یە ﴿٦٨﴾ ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بخوێنەرەوە بەسەریاندا هەواڵی
ئیبراهیم ﴿٦٩﴾ ﴿إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ﴾ کاتێ وتی بەباوکی و گەلەکەی ﴿مَا تَعۡبُدُونَ﴾ چی دەپەرستن ﴿٧٠﴾
﴿قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا﴾ وتیان بتانێك دەپەرستین ﴿فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ﴾ ئەمجا بەردەوام بەندایەتیان
دەکەین ﴿٧١﴾ ﴿قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ﴾ (ئیبراهیم) وتی ئایا ئەوانە گوێیان لێتانە ﴿إِذۡ تَدۡعُونَ﴾ کاتێك
هاوار ونزایان لێ دەکەن ﴿٧٢﴾ ﴿أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ﴾ یا ئایا ئەوان سوود یازیانتان پێ دەگەیەنن ﴿٧٣﴾
﴿قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا﴾ وتیان (نەخێر هیچیان پێ ناکرێ) بەڵکو ئێمە باوو باپیرانمان دیوە ﴿كَذَٰلِكَ
يَفۡعَلُونَ﴾ ئابەو شێوە(ی ئێمە) یان کردووە ﴿٧٤﴾ ﴿قَالَ أَفَرَءَيۡتُم مَّا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ﴾ وتی ئایا ئێوە دەزانن
چی دەپەرستن ﴿٧٥﴾ ﴿أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلۡأَقۡدَمُونَ﴾ ئێوەو باوو باپیرە پێشووەکانتان ﴿٧٦﴾ ﴿فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ﴾
جا بەڕاستی هەموو ئەوانە دوژمنی منن ﴿إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ جگە لەپەروەردگاری جیهانیان ﴿٧٧﴾
﴿ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ﴾ کە ئەو منی دروست کردووە پاشان هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات ﴿٧٨﴾
﴿وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ﴾ وە هەر ئەو زاتە خۆراکم پێدەدات و تێراوم دەکات ﴿٧٩﴾ ﴿وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ
يَشۡفِينِ﴾ وە کاتێ نەخۆش بکەوم هەر ئەو شیفام دەدات (چاکم دەکاتەوە) ﴿٨٠﴾ ﴿وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ
يُحۡيِينِ﴾ وە زاتێکە کەمن دەمرێنێ و پاشان زیندووم دەکاتەوە ﴿٨١﴾ ﴿وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ﴾ وە (پەروەردگارم)
زاتێکە بەتەمام و ئومێد دەکەم ﴿أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ﴾ لە ڕۆژی پاداشت دا (قیامەتدا) ببورێ
لەهەڵەکانم و بیانسڕێتەوە ﴿٨٢﴾ ﴿رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا﴾ ئەی پەروەردگارم دانایم پێ ببەخشە ﴿وَأَلۡحِقۡنِي
بِٱلصَّٰلِحِينَ﴾ بمبەرە ڕیزی پیاوچاکانەوە ﴿٨٣﴾

﴿وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ وە باس کردنم بەچاکە لەناوگەلە داهاتووەکاندا پێ ببەخشە ﴿٨٤﴾
﴿وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ﴾ وە بم گێڕی لەوەرگرانی بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت ﴿٨٥﴾ ﴿وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ﴾
وە لەباوکم خۆش ببە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ بەڕاستی ئەو لەگومڕایانە ﴿٨٦﴾ ﴿وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ يُبۡعَثُونَ﴾
وە شەرمەزارو ڕیسوام مەکە لەڕۆژێکدا کە(خەڵکی) زیندوو دەکرێنەوە ﴿٨٧﴾ ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ﴾
ڕۆژێ کەماڵ و سامان و منداڵ و نەوە سوود ناگەیەنن ﴿٨٨﴾ ﴿إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ﴾ بێجگە
لەکەسێ بێتە خزمەتی خوا بەدڵێکی ساغ و پاك و خاوێنەوە ﴿٨٩﴾ ﴿وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ وە (لەڕۆژی
دواییدا) بەهەشت نزیك دەخرێتەوە بۆ پارێزکاران و لەخوا ترسان ﴿٩٠﴾ ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ﴾
دۆزەخیش دەردەخرێت (و ئاشکرا دەکرێ) بۆ گومڕایان ﴿٩١﴾ ﴿وَقِيلَ لَهُمۡ﴾ وە پێیان دەوترێت
﴿أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ﴾ کوان ئەوانەی کەئێوە دەتان پەرستن ﴿٩٢﴾ ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ لەجیاتی خوا ﴿هَلۡ يَنصُرُونَكُمۡ
أَوۡ يَنتَصِرُونَ﴾ ئایا یارمەتیتان دەدەن یا یارمەتی خۆیان دەدەن ﴿٩٣﴾ ﴿فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ﴾ ئەمجا
هەموو ئەوانە (پەرستراوان) و گومڕایان سەر بەرو خوار فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە ﴿٩٤﴾ ﴿وَجُنُودُ إِبۡلِيسَ
أَجۡمَعُونَ﴾ هەروەها هەموو سەربازانی شەیتان ﴿٩٥﴾ ﴿قَالُواْ وَهُمۡ فِيهَا يَخۡتَصِمُونَ﴾ (بت پەرستان) لەکاتێکدا
لەدۆزەخ دا شەڕە قسەو ئاژاوەیانە (لەگەڵ پەرستراوەکانیان دا) دەڵێن ﴿٩٦﴾ ﴿تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٖ
مُّبِينٍ﴾ سوێند بەخوا ئێمە لەگومڕایی یەکی ئاشکرادا بووین ﴿٩٧﴾ ﴿إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ کاتێك ئێوەمان
دەبردە ریزی پەروەردگاری جیهانیانەوە ﴿٩٨﴾ ﴿وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ کەس ئێمەی گومڕانەکردتاوانباران
نەبێت ﴿٩٩﴾ ﴿فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ﴾ وەهیچ تکاکاری بۆ ئێمە نی یە ﴿١٠٠﴾ ﴿وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٖ﴾ وە هیچ هاوڕێیەکی
دڵسۆزمان نیە ﴿١٠١﴾ ﴿فَلَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ﴾ خۆزگە جارێکی تر بگەڕاینایەتەوە (بۆ دونیا) ﴿فَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾
ئەوسا لەباوەڕداران دەبووین ﴿١٠٢﴾ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ﴾ بەڕاستی لەوەدا (باسکرا) پەندو بەڵگە هەیە
﴿وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ بەڵام زۆربەیان باوەڕدار نەبوون ﴿١٠٣﴾ ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەر
پەروەردگارت زاڵ و میهرەبانە ﴿١٠٤﴾ ﴿كَذَّبَتۡ قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ گەلی نوح پێغەمبەرانیان بەدرۆزن دانا
(بڕوایان پێ نەکردن) ﴿١٠٥﴾ ﴿إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ نُوحٌ﴾ کاتێ کەنوحی برایان پێی ووتن ﴿أَلَا تَتَّقُونَ﴾ ئایا
ناترسن لەخوا (خۆتان ناپارێزن) ﴿١٠٦﴾ ﴿إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ﴾ بێگومان من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆئێوە
﴿١٠٧﴾ ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لەخوا بترسن و گوێڕایەڵی من بکەن ﴿١٠٨﴾ ﴿وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍ﴾
وە من داوای هیچ کرێیەکتان لێ ناکەم لەسەر ئەو (ڕێنموونیی کردنەتان) ﴿إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾
(چونکە) پاداشتی من تەنها لەسەر پەروەردگاری جیهانیانە ﴿١٠٩﴾ ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە
لەخوا بترسن و گوێ رایەڵی من بکەن ﴿١١٠﴾ ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ﴾ ووتیان ئایا (چۆن) باوەڕ بەتۆ بێنین
﴿وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوانەی شوێنت کەوتون پەسترین کەسن (هەژارو داماو
ونەفامن) ﴿١١١﴾

﴿قَالَ وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ (نووح علیه السـلام) ووتی من چوزانم ئەوانەچی کردەوەیەك دەکەن
﴿١١٢﴾ ﴿إِنۡ حِسَابُهُمۡ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّيۖ﴾ پرسینەوەیان تەنها لەسەر پەروەردگارمە ﴿لَوۡ تَشۡعُرُونَ﴾ ئەگەر ئێوە هەست
بکەن (بزانن) ﴿١١٣﴾ ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ و من دەر کەری باوەڕداران نیم ﴿١١٤﴾ ﴿إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾
من تەنیا ترسێنەرێکی ڕوون کەرەوەم ﴿١١٥﴾ ﴿قَالُواْ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰنُوحُ﴾ ووتیان ئەی نووح ئەگەر کۆتایی
نەهێنی (لەم کاری بانگەوازەت) ﴿لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ﴾ بێگومان لەبەرد باران کراوان دەبی ﴿١١٦﴾
﴿قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوۡمِي كَذَّبُونِ﴾ (نووح) ووتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان گەلەکەم بڕوایان پێ نەکردم
﴿١١٧﴾ ﴿فَٱفۡتَحۡ بَيۡنِي وَبَيۡنَهُمۡ فَتۡحٗا﴾ کەواتە لەنێوان من و ئەواندا حوکم بدە بەحوکمی دانێکی یەکجاری
﴿وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ و من و ئەو باوڕدارانەی لەگەڵمدان ڕزگار بکە ﴿١١٨﴾ ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ﴾
ئێمەش نووح و ئەو کەسانەی لەگەڵی بوو ڕزگارمان کردن (لەخنکان) ﴿فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾ لەو
کەشتی یەی کەپڕ کراو بوو (لەمرۆڤ و هەموو جۆرە گیاندارێك) ﴿١١٩﴾ ﴿ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا بَعۡدُ ٱلۡبَاقِينَ﴾ لەپاشان
لەدوا (ڕزگار کردنی ئیمانداران) ئەوانەی کەمانەوە نوقممان کردن (لە ئاوی تۆفانەکەدا) ﴿١٢٠﴾
﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ﴾ بەڕاستی لەوەدا (باسکرا) بەڵگەیەکی گەورەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ بەڵام
زۆربەیان باوەڕدار نەبوون ﴿١٢١﴾ ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ وە بەڕاستی هەر پەروەردگارت زاڵی
بەبەزەییە ﴿١٢٢﴾ ﴿كَذَّبَتۡ عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ گەلی عاد پێغەمبەرانی (خوا)یان بە درۆزن دانا (باوەڕیان پێ
نەکردن) ﴿١٢٣﴾ ﴿إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ هُودٌ﴾ کاتێ هوود (علیه السلام) ی برایان پێی ووتن ﴿أَلَا تَتَّقُونَ﴾ ئایا
خۆتان ناپارێزن (لەسزای خوا) ﴿١٢٤﴾ ﴿إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ﴾ بێگومان من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوە ﴿١٢٥﴾
﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لەخوا بترسن و گوێ ڕایەڵی من بگەن ﴿١٢٦﴾ ﴿وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ﴾
وە من هیچ کرێیەك لەئێوە داوا ناکەم لەسەر ئەم (گەیاندنی بانگەوازە) ﴿إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾
پاداشتی من تەنها لای پەروردگاری جیهانیانە ﴿١٢٧﴾ ﴿أَتَبۡنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةٗ تَعۡبَثُونَ﴾ ئایا ئێوە لەهەموو
شوێنێکی بەرز(ی سەرەرێگا) بورجێك دوست دەکەن بەبێ هوودە ﴿١٢٨﴾ ﴿وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ﴾ وە چەند
کۆشك و قەڵای بەهێز (کارگە) دروست دەکەن ﴿لَعَلَّكُمۡ تَخۡلُدُونَ﴾ بەو ئومێدەی هەر بمێننەوەو
نەمرن ﴿١٢٩﴾ ﴿وَإِذَا بَطَشۡتُم﴾ وە هەر کاتێ دەست بوە شێنن ﴿بَطَشۡتُمۡ جَبَّارِينَ﴾ ستەمکارانە دەس دەوە
شێنن ﴿١٣٠﴾ ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە (لەسزای خوا) خۆتان بپارێزن و گوێ ڕایەڵی من بکەن ﴿١٣١﴾
﴿وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِيٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعۡلَمُونَ﴾ وە لە (سزای) ئەو خوایە بترسن وخۆتان بپارێزن کەخۆتان دەزانن
چی پێ بەخشیون ﴿١٣٢﴾ ﴿أَمَدَّكُم بِأَنۡعَٰمٖ وَبَنِينَ﴾ ئاژەڵ و ماڵات و منداڵ و ﴿١٣٣﴾ ﴿وَجَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ﴾ باخ و کانیاوی
زۆری پێ داون ﴿١٣٤﴾ ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ﴾ بەڕاستی من دەترسم دووچارتان بێ ﴿عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ سزای
ڕۆژێکی زۆر گەورە(ی دژوارو پڕ لەسزا) ﴿١٣٥﴾ ﴿قَالُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ﴾ ووتیان (بەهوود علیه السلام) لای
ئێمە یەکسانە ﴿أَوَعَظۡتَ أَمۡ لَمۡ تَكُن مِّنَ ٱلۡوَٰعِظِينَ﴾ ئامۆژگاری بکەیت یا ئامۆژگاری نەکەیت ﴿١٣٦﴾

﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا خُلُقُ الْأَوَّلِينَ﴾ ئەمە(ی تۆ هێناوتە) تەنها درۆو دەلەسەی پێشینانە (١٣٧) ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾
وە ئێمە سزا نادرێین (١٣٨) ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَاهُمْ﴾ ئیتر باوەڕیان پێ نەهێنا بۆیە ئێمەش لەناومان بردن
﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ بێگومان لەوەدا (باسكرا) نیشانەی گەورە هەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾
بەڵام زۆر بەیان باوەڕدار نەبوون (١٣٩) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەر پەروەردگارت
بەدەسەڵات و بەبەزەیی یە (١٤٠) ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ الْمُرْسَلِينَ﴾ گەلی سەموود پێغەمبەرانیان بەدرۆزن زانی (١٤١)
﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ﴾ كاتێ صالح (علیه السلام) ی برایان پێی ووتن ﴿أَلَا تَتَّقُونَ﴾ ئایا (لەسزای خوا)
خۆتان ناپارێزن (١٤٢) ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بەڕاستی من پێغەمبەرێكی ئەمینم بۆتان (١٤٣) ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾
دەی لەخوا بترسن و گوێ ڕایەڵی من بكەن (١٤٤) ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ و من هیچ كرێ و پاداشتێك
لەسەر ئەم (پێغەمبەرێتی یە) لەئێوە داوا ناكەم ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ كرێ و پاداشتی من تەنها
لای پەروەردگاری جیهانیانە (١٤٥) ﴿أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ﴾ (وا دەزانن) وازتان لێ دەهێنرێ لەدونیادا
بەهێمنی (دەژین) (١٤٦) ﴿فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ لەناو باخات و كانیاوی زۆردا (١٤٧) ﴿وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا
هَضِيمٌ﴾ وە لەناو كشتوكاڵی زۆرو باخاتی دار خورمای میوە گەییودا (١٤٨) ﴿وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا
فَارِهِينَ﴾ وە لەچیاكان دا خانوو دادەتاشن زۆر بەلێزانانە (١٤٩) ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ كەواتە لە(سزای) خوا
بترسن و گوێ ڕایەڵی من بكەن (١٥٠) ﴿وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ﴾ وە گوێ ڕایەڵی زیادە ڕەوان مەكەن (١٥١)
﴿الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ﴾ ئەوانەی خراپەكاری دەكەن لەزەوی دا ﴿وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ وە كردەوەی چاك
ناكەن (١٥٢) ﴿قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ﴾ ووتیان (بەصالح علیه السلام) تۆ تەنها یەكێكی لە جادوو
لێكراوان (١٥٣) ﴿مَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ تۆ تەنها مرۆڤێكی وەك ئێمە ﴿فَأْتِ بِآيَةٍ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾
دەی ئایەت و موعجیزەیەكمان بۆ بێنە ئەگەر لەڕاست گۆیانی (١٥٤) ﴿قَالَ هَٰذِهِ نَاقَةٌ﴾ (صالح علیه
السلام) ووتی ئەم وشترە مێینە (موعجیزە)یە ﴿لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ ئاو خواردنەوە ڕۆژێك بۆ
ئەوە و ڕۆژێكیش بۆ ئێوەیە (١٥٥) ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ﴾ دەستی بۆ مەبەن بەخراپە ﴿فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾
ئەگینا سزای تۆڵەی ڕۆژێكی گەورە تووشتان دێت (١٥٦) ﴿فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا نَادِمِينَ﴾ كەچی ئەوان
سەریان بڕی ئەوسا پەشیمان بوونەوە (لەترسی تۆڵەی خوا) (١٥٧) ﴿فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ﴾ ئەمجا سزای
(خراپەكەیان) ئەوانی گرت ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەڕاستی لەمەدا (باسكرا)
نیشانەیەكی گەورە هەیە بەڵام زۆر بەیان باوەڕدار نەبوون (١٥٨) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان
پەروەردگارت زاڵ وبەدەسەڵات و بە بەزەیی یە (١٥٩)

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ﴾ گەلی لووط پێغەمبەرانیان بەدرۆزن دانا ﴿١٦٠﴾ ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾
کاتێ لووطی برایان (علیه السلام) ووتی پێیان ئایا ئێوه لەخوا ناترسن خۆنا پارێزن ﴿١٦١﴾
﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بەڕاستی من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوه ﴿١٦٢﴾ ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە
لەخوا بترسن و گوێ ڕایەڵی من بکەن ﴿١٦٣﴾ ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ وه من هیچ پاداشتێك لەسەر
(پێغەمبەر یێتیکەم) لەئێوه داوا ناکەم ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ پاداشتی من تەنها لای پەروەردگای
جیهانیانە. ﴿١٦٤﴾ ﴿أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ﴾ ئایا لەناو (هەموو خەڵکی) جیهانیاندا ئێوه نێر بازی دەکەن
﴿١٦٥﴾ ﴿وَتَذَرُونَ﴾ وه وازدێنن ﴿مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ﴾ لەو هاوسەرانەتان کەپەروەردگارتان بۆی
دروست کردون ﴿بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾ نەخێر بەڵکو ئێوه کۆمەڵێکن دەرچوو لەسنوری ئارەزوو ﴿١٦٦﴾
﴿قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا لُوطُ﴾ ووتیان: بەڕاستی ئەی لووط ئەگەر واز نەهێنی (لەم کارەت) ﴿لَتَكُونَنَّ مِنَ
الْمُخْرَجِينَ﴾ بێگومان لەدەرکراوان دەبیت (لەم خاکە) ﴿١٦٧﴾ ﴿قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُمْ مِنَ الْقَالِينَ﴾ (لووط)
ووتی بێگومان من زۆر قەڵس و بێزارم لەو کردەوەتان (نێربازی) ﴿١٦٨﴾ ﴿رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ﴾
ئەی پەروەردگارم خۆم و ماڵ و خێزانم ڕزگار بکە لە(تۆڵەی) ئەو کردەوەی ئەوان دەیکەن ﴿١٦٩﴾
﴿فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ﴾ ئەمجا ئێمەش لووط و هەموو خێزانەکەیمان ڕزگار کرد ﴿١٧٠﴾ ﴿إِلَّا عَجُوزًا فِي
الْغَابِرِينَ﴾ بێجگە لەپیرە ژنێ (خێزانی لووط) کە لەجێماوان و(تیاچوان) بوو ﴿١٧١﴾ ﴿ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ﴾
پاشان ئەوانی ترمان لەناو برد ﴿١٧٢﴾ ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَرًا﴾ وه بارانێکمان (لەبەرد) بەسەریاندا باراند
﴿فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنْذَرِينَ﴾ ئەمجا ئای چ خراپ بوو بارانی ترسێنراوەکان ﴿١٧٣﴾ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ بەڕاستی
لەمەدا (باسکرا) پەندێکی گەورە هەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ بەڵام زۆربەیان باوەڕدار نەبوون
﴿١٧٤﴾ ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان پەروەردگارت زاڵ و میهرەبانە ﴿١٧٥﴾ ﴿كَذَّبَ أَصْحَابُ لْئَيْكَةِ
الْمُرْسَلِينَ﴾ خاوەنی باخاتە چڕو پڕەکانیش پێغەمبەرانیان بەدرۆزن دانا ﴿١٧٦﴾ ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾
کاتێ شوعەیب علیه السلام پێی ووتن: ئایا خۆتان ناپارێزن و لەخوا ناترسن ﴿١٧٧﴾ ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾
بەڕاستی من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوه ﴿١٧٨﴾ ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەوابوو لەخوا بترسن و گوێڕایەڵی
من بکەن ﴿١٧٩﴾ ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ وه من هیچ کرێ و پاداشتێ لەئێوه داوا ناکەم لەسەر
پێغەمبەرایەتیەکەم ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ پاداشتی من تەنها لای پەروەردگای جیهانیانە ﴿١٨٠﴾
﴿أَوْفُوا الْكَيْلَ﴾ ڕێك وڕاست پێوانە بکەن ﴿وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ﴾ وه لەزیان دەران مەبن (لەپێوانەدا
ناتەواو بپێون) ﴿١٨١﴾ ﴿وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ﴾ وه بەتەرازوویەکی ڕاست و ڕێك کێشانە بکەن ﴿١٨٢﴾
﴿وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ﴾ و کەم و کوڕی مەکەن لەشتەکانی خەڵکیدا (هیچ مافێکیان ژێر پێ
مەخەن) ﴿وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ وه ڕۆمەچن لەزەویدا بەخراپەکاریتان ﴿١٨٣﴾

﴿وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِي﴾ وە بترسن لەو زاتەی ﴿خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ كە ئێوەو خەڵكانی پێشوویشی دروست
كردووە ﴿١٨٤﴾ ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ﴾ ووتیان تۆ تەنها لەجادوو لێ كراوانی ﴿١٨٥﴾ ﴿وَمَآ أَنتَ
إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ وە تۆ تەنها مرۆڤێكی وەك ئێمەی ﴿وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ و بەڕاستی ئێمە
واگومانت پێ دەبەین لەدرۆزنان بیت ﴿١٨٦﴾ ﴿فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ دەی چەند پارچەیەك
لەئاسمان بخەرە خوارەوە بەسەرماندا ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەگەر تۆ لەڕاست گۆیانی ﴿١٨٧﴾
﴿قَالَ رَبِّيٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ (شوعەیب) ووتی پەروەردگارم چاك دەزانێ بەهەر كردەوەیەك
كەدەیكەن ﴿١٨٨﴾ ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ ئەمجا شوعەیبیان بەدرۆزن زانی ﴿فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ﴾ بەو هۆیەوە
سزای ڕۆژی سێبەر(ی هەور) گرتنی ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ بەڕاستی ئەو سزایە سزای
ڕۆژێكی زۆر گەورە بوو ﴿١٨٩﴾ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً﴾ بێگومان لەمەدا (باسكرا) بەڵگەیەكی بەهێز
هەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەڵام زۆربەیان باوەڕدار نەبوون ﴿١٩٠﴾ ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾
وە بەڕاستی پەروەردگارت هەر ئەوە زاڵ و بەبەزەیی ﴿١٩١﴾ ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ و بەڕاستی ئەم
(قورئان)ە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە ﴿١٩٢﴾ ﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ﴾ جوبرەئیلی ئەمین هێنایە
خوارەوە ﴿١٩٣﴾ ﴿عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ﴾ بۆ سەردڵی تۆ بۆ ئەوەی لەترسێنەران بی ﴿١٩٤﴾ ﴿بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ
مُّبِينٍ﴾ بەزمانێكی عەرەبی ڕوون و پاراو ﴿١٩٥﴾ ﴿وَإِنَّهُۥ لَفِي زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ وە بەڕاستی (باسی قورئان)
لەكتێبی پێغەمبەرە پێشووەكاندا هەیە ﴿١٩٦﴾ ﴿أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً﴾ ئایا ئەمە بەڵگەیەكی ڕوون نەبوو
بۆیان (بۆ كافرانی قوڕەیش) ﴿أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُاْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ كەزانایانی بەنی ئیسرائیل ئەو (دەنگ
و باسی قورئان)ە دەزانن ﴿١٩٧﴾ ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ﴾ ئەگەر ئێمە ئەو (قورئانە)مان بناردایەتە
خوارەوە بۆ سەر كەسێكی عەجەمی ﴿١٩٨﴾ ﴿فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم﴾ ئەمجا بیخوێندایەتەوەبەسەریاندا
(بەسەر بێ باوەڕانی مەككەدا) ﴿مَّا كَانُواْ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ﴾ باوەڕیان پێ نەدەهێنا ﴿١٩٩﴾ ﴿كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ
فِي قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ ئا بەو جۆرە ئەو (قورئان)مان خستۆتە ناو دڵی تاوانبارانەوە ﴿٢٠٠﴾ ﴿لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾
كەچی هەر باوەڕی پێ ناهێنن ﴿حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾ هەتا سزای سەخت بەچاوی خۆیان دەبینن
(جا باوەڕ دێنن) ﴿٢٠١﴾ ﴿فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ ئەویش لە ناكاودا دێت بۆیان كەئەوان هەستی
پێ ناكەن ﴿٢٠٢﴾ ﴿فَيَقُولُواْ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ﴾ ئەوسا ئەڵێن ئا خۆ مۆڵەتمان پێ دەدرێت ﴿٢٠٣﴾ ﴿أَفَبِعَذَابِنَا
يَسْتَعْجِلُونَ﴾ دەی ئایا ئەوان پەلەی سزای ئێمەیانە ﴿٢٠٤﴾ ﴿أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ﴾ تۆ پێم بڵێ ئەگەر
چەند ساڵێ بەخۆشی بیان ژێنین ﴿٢٠٥﴾ ﴿ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ﴾ لە پاشان ئەو سزایەی كەلێی
ترسێنرا بوون بێت بۆیان ﴿٢٠٦﴾

﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم﴾ سـووديان پێ ناگەیەنـێ ﴿مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ﴾ ئەو هەموو خۆشـی و ڕابواردنەی بەوان
درابـوو (٢٠٧) ﴿وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ﴾ هیـچ شـارو گوندێکمـان لەنـاو نەبـردووە ﴿إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ﴾ دڵنیابە
ترسـێنەرانێکی هەبووە (٢٠٨) ﴿ذِكۡرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە، وە ئێمە سـتەمکار نەبووین
(لەسـزادانیاندا) (٢٠٩) ﴿وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ﴾ شـەیتانەکان ئـەو (قورئانە)یـان نەهێناوەتە خوارەوە (٢١٠)
﴿وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ﴾ نەشـیاوی ئەوەن و نەدەشتوانن (٢١١) ﴿إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ﴾ بەڕاستی
شـەیتانەکان لەگوێ گرتن(ی هەواڵی ئاسمان) بەرگری کراون (٢١٢) ﴿فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ کەواتە
هیـچ پەرسـتراوێکی تر نەپەرسـتی لەگەڵ خـوادا ﴿فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ﴾ ئەگینا لەسـزا دراوان دەبی
(٢١٣) ﴿وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ﴾ خـزم و کەسـە زۆر نزیکەکانـت بترسـێنە (٢١٤) ﴿وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ﴾ و باڵی
بەزەیـی و نـەرم و نیانیت ڕاخـە ﴿لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بۆ ئەو باوەڕدارانەی کەشـوێنت کەوتوون
(٢١٥) ﴿فَإِنۡ عَصَوۡكَ﴾ ئەمجـا ئەگـەر سـەرپێچیان کـردی ﴿فَقُلۡ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ ئەوسـا پێیـان بڵـێ:
بەڕاسـتی مـن بەریـم لـەوەی ئێوە دەیکـەن (٢١٦) ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ﴾ وە پشـت بەو خوایە ببەسـتە
کـەزاڵ و بەبەزەیـی یە (٢١٧) ﴿ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ﴾ ئەو (خوایە) کە دەتبینێ کاتێ بەتەنیا نوێژ دەکەی (٢١٨)
﴿وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ وە (دەبینـێ) نوێژ کردنت لەنـاو نوێژگەراندا (کەپێش نوێژییان بۆ دەکەیت) (٢١٩)
﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ بەڕاستی تەنها ئەوە بیسەری ئاگادار (٢٢٠) ﴿هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ﴾ هەواڵتان
بدەمێ شـەیتانەکان دادەبەزنە سەرکێ؟ (٢٢١) ﴿تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ﴾ دادەبەزنە سەر هەموو (کەسێکی)
زۆر درۆزنـی زۆر تاوانبـار (٢٢٢) ﴿يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ﴾ باش گوێ دەگرن (بۆ شـەیتانەکان)
وە زۆربەیـان درۆزنـن (لەو هەواڵانـەدا دەیدەن بەخەڵکـی) (٢٢٣) ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلۡغَاوُۥنَ﴾ (پێغەمبەر
ﷺ) شـاعیر نـی یـە) شـاعیرەکان تەنها گومـڕاکان شـوێنیان دەکـەون (٢٢٤) ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّهُمۡ﴾ ئایـا نابینی
کەئەوانە ﴿فِي كُلِّ وَادٖ يَهِيمُونَ﴾ بەهەموو دۆڵ و شیوێکدا بەسەر لێشێواوی دەڕۆن (شیعر دەڵێن) (٢٢٥)
﴿وَأَنَّهُمۡ يَقُولُونَ مَا لَا يَفۡعَلُونَ﴾ وە بەڕاسـتی ئەوانـە شـتێ دەڵێن کەخۆیـان نایکەن (٢٢٦) ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ جگـە لەوانەیـان بڕوایان هێنـاوەو کردەوە چاکەکانیـان کردووە ﴿وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا﴾
وە یـادو زیکـری خوایان زۆر کـردووە ﴿وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْۗ﴾ وە تۆڵەیان سـەندووە لەپاش ئەوە
ستەمیان لێ کراوە ﴿وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ﴾ وە ئەوانەی سـتەمیان کردووە لەمـەودوا دەزانن ﴿أَيَّ مُنقَلَبٖ
يَنقَلِبُونَ﴾ کەچۆن گەڕانەوەیەك دەگەڕێنەوە(بۆ لای خوا دوای مردن) (٢٢٧)

## سورەتی ﴿ ٱلنَّمۡلِ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿طسٓۚ﴾ بـە (طـا، سـین) دەخوێنرێتەوە خـوا زاناترە بە ماناکەی بۆزانیاری زیاتر سـەیری سـەرەتای سـورەتی (البقرة) بکە ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ﴾ ئەمە ئایەتەکانی قورئان و کتێبی ئاشکرایە ﴿١﴾ ﴿هُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ (هـۆی) ڕێنموونیـی و مژدەدانـە بـۆ بـڕواداران ﴿٢﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ ئەوانـەی کەنوێـژ بەجـێ دێنـن و زەکات دەدەن ﴿وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ﴾ وە ئەوانـەی بڕوای بتەویـان بەڕۆژی دوایی هەیە ﴿٣﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾ بەڕاسـتی ئەوانەی باوەڕ ناهێنن بەڕۆژی دوایی ﴿زَيَّنَّا لَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ کـردەوە (خراپە)کانیانمان ڕازاندووەتەوە بۆیان ﴿فَهُمۡ يَعۡمَهُونَ﴾ بۆیە ئەوان بەسـەرگەردانی دەسوڕێنەوە ﴿٤﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ﴾ ئەوانە کەسانێکن سزای بەدیان بۆ هەیە ﴿وَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ﴾ وە ئەوانـە لـەڕۆژی دوایـی دا زەرەرمەندتریـن کەسـن ﴿٥﴾ ﴿وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ بەڕاسـتی تـۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) قورئانت پێـدەدرێ (فێر دەکرێ ی) ﴿مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ عَلِيمٍ﴾ لەلایەن خوای کار دروستی زاناوە ﴿٦﴾ ﴿إِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهۡلِهِۦٓ﴾ (بیریان خەرەوە) کاتێ مووسا بەخێزانەکەی ووت ﴿إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا﴾ بێگومان من ئاگرێ بەدیدەکەم ﴿سَـَٔاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ﴾ (ئێوە لێرەدا بن) من دەڕۆم بۆ لای ئەو ئاگرە بەزووی هەواڵێکتان بۆ دێنم ﴿أَوۡ ءَاتِيكُم بِشِهَابٖ قَبَسٖ لَّعَلَّكُمۡ﴾ یا گڕو بزوسـکێ (لەو ئاگرە) تان بۆ دێنم تا ئێوە ﴿تَصۡطَلُونَ﴾ خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە ﴿٧﴾ ﴿فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِيَ﴾ ئەمجا کاتێ (مووسا علیه السلام) گەیشتە لای ئاگرەکە بانگی لێ کرا ﴿أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا﴾ کە پیرۆز بووە ئەو کەسەی لەناو ئاگرەکە (ڕووناکی کە) دایەو ئەوەش بەدەوری دایە ﴿وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ وە پاك و بێگەردە خوای پەوەردگاری جیهانیان ﴿٨﴾ ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ ئەی مووسـا بەڕاستی ئەوەی (بانگی کـردی) منـم خوای بەدەسـەڵاتی کار دروسـت ﴿٩﴾ ﴿وَأَلۡقِ عَصَاكَۚ﴾ دە گۆچانەکەت فـڕێ دە (ئەویش فڕێی دا) ﴿فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ﴾ ئەمجا کاتێ بینی وەك تیرەمار دەجوڵێ ﴿وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ﴾ (مووسا) هەڵهات و ئاوڕی نەدایەوە. ﴿يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفۡ﴾ (خودا فەرمووی) ئەی مووسـا مەترسـە ﴿إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ بێگومان پێغەمبەران لای من ناترسـن ﴿١٠﴾ ﴿إِلَّا مَن ظَلَمَ﴾ بێجگە لەکەسـێ کەستەمی کردبێ ﴿ثُمَّ بَدَّلَ حُسۡنَۢا بَعۡدَ سُوٓءٖ﴾ پاشان خراپەکەی گۆڕیبێ بەچاکە ﴿فَإِنِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ ئەوە بەڕاستی من لێبوردەی بەبەزەیم ﴿١١﴾ ﴿وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ﴾ وە دەسـتت بکە بەباخەڵتدا ﴿تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖۖ﴾ (کە دەرت هێنا) بەسپێتی و پرشنگداری دێتە دەرەوە بەبێ بەڵەکی ﴿فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ﴾ (ئەمە دوو موعجیزەیە) لەنـۆ موعجیـزە بـۆ فیرعـەون و گەلەکەی ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـە گەلێکی لەسـنوور دەرچوون ﴿١٢﴾ ﴿فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ﴾ ئەمجا کاتێ موعجیزە ئاشکراو ڕوونەکانی ئێمەیان بۆ هات ﴿قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾ ووتیان ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە ﴿١٣﴾

﴿وَجَحَدُواْ بِهَا﴾ ئەو موعجیزانەیان دان پێدا نەدەنا وئینكاریان دەكرد ﴿وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ﴾ كەچی لەدڵی
خۆیان دا بەڕاستیان دەزانی ﴿ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ لەبەر ستەمكاری و خۆ بە زل زانینیان (ئینكاریان دەكرد)
﴿فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ ئەمجا سەرنج بدە سەر ئەنجامی خراپەكاران چۆن بوو ﴿١٤﴾ ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا
دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ عِلْمًا﴾ سوێند بە خوا زانستمان بە داوود و سولەیمان بەخشی ﴿وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى﴾
هەردووكیان ووتیان: هەموو سوپاس و سەنایە بۆ ئەو خوایەی ﴿فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾
كە ڕێزی داوین بەسەر زۆر لە بەندە باوەڕدارەكانیدا ﴿١٥﴾ ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ﴾ وە سولەیمان بووە
میراتگری داوود (لە پێغەمبەریتی و پاشایەتی و زانیاری دا) ﴿وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ (سولەیمان) ووتی
ئەی خەڵكینە ﴿عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ﴾ فێری زمانی باڵندەكان كراوین ﴿وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ﴾ وە لە هەموو
شتێكمان پێ دراوە ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ﴾ بەڕاستی ئەمە (بە من دراوە) فەزڵ و چاكەیەكی
ئاشكرایە ﴿١٦﴾ ﴿وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ﴾ وە كۆ كرایەوە بۆ سولەیمان هەموو سەربازەكانی ﴿مِنَ ٱلْجِنِّ
وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ﴾ لە جنۆكەو ئادەمی و باڵندەكان ﴿فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾ ئەمجا ئەوان (لە پێش و دواكەوتن)
بەرگیری دەكران (و بەڕیز دەڕۆشتن) ﴿١٧﴾ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْاْ﴾ هەتا كاتێ گەشتنە ﴿عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ﴾ سەر شیوی
مێروولە (شوێنێك بوو مێروولەی زۆر بوو) ﴿قَالَتْ نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ﴾ مێروولەیەك ووتی: ئەی
مێروولەكان ﴿ٱدْخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمْ﴾ بڕۆنە ناو ماڵەكانی خۆتان (كونەكانتان) ﴿لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ﴾
با سولەیمان و لەشكرەكەی نەتان پلیشێنن(لە ژێر پێیاندا) ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ لە كاتێكدا ئەوان
هەست ناكەن ﴿١٨﴾ ﴿فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا﴾ ئەمجا (سولەیمان بەسەر سوڕمانەوە) زەردەخەنەی كرد
لەقسەی ئەو مێرولە ﴿وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ﴾ و ووتی ئەی پەروەردگارم وام ڕابێنە ﴿أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ
عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ﴾ كە سوپاسی ئەو چاكە و نیعمەتانەت بكەم كە ڕشتووتە بەسەر من و دایك باوكمدا
﴿وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ﴾ وە (ڕام بێنە) كە كار و كردەوەی چاكە بكەم كە تۆ پێی ڕازی بێت
﴿وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وە بە بەزەیی خۆت بمخەرە ریزی بەندە چاكەكانت ﴿١٩﴾ ﴿وَتَفَقَّدَ
ٱلطَّيْرَ﴾ جا(سولەیمان) چاوی بەباڵندەكان دا گێڕا ﴿فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ﴾ ووتی ئەوە چی یە بۆ
پەپوو سلێمانە نابینم ﴿أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ﴾ یاخود لە ئامادەنەبوانە؟ (خۆی دزیوەتەوە) ﴿٢٠﴾ ﴿لَأُعَذِّبَنَّهُۥ
عَذَابًا شَدِيدًا﴾ سوێند بە خوا سزایەكی بەتینی دەدەم ﴿أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ﴾ یا سەری دەبڕم ﴿أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَٰنٍ
مُّبِينٍ﴾ یا بەڵگەیەكی ڕوونم بۆ دێنێت (لەسەر ئامادە نەبوونی). ﴿٢١﴾ ﴿فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ﴾ ئەمجا
(پەپوو) ماوەیەكی كورت مایەوە ﴿فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ﴾ جا (هاتەوە و بەسولەیمانی) ووت
ئاگادار بووم لە شتێك كە تۆ ئاگادار نیت لێی ﴿وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾ لە(ووڵاتی) سەبەئەوە
هەواڵێكی ڕاستەقینەم بۆ هێناوی ﴿٢٢﴾

﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ﴾ بەڕاستی من دیم ئافرەتێك پادشای ئەوانە (بەناوی بەلقیس) ﴿وَأُوتِيَتۡ
مِن كُلِّ شَيۡءٖ﴾ کەهەموو شتێکی (پادشایەتی) پێ دراوە ﴿وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ﴾ و تەختێکی (پادشایەتی)
زۆر گەورەی هەیە ﴿٢٣﴾ ﴿وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا﴾ خۆی و گەلەکەیم دی ﴿يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾
لەجیاتی خوا سوژدە بۆ ڕۆژ دەبەن ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ و شەیتان کردەوە (خراپە)کانیانی بۆ
ڕازاندبوونەوە ﴿فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ بەو هۆیەوە بەرگری کردون لەڕێگەی ڕاست ﴿فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ﴾
بۆیە ئەوان ڕێگای ڕاست نادۆزنەوە ﴿٢٤﴾ ﴿أَلَّا يَسۡجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي﴾ بۆ ئەوەی سوژدە نەبەن بۆ ئەو خوایەی
﴿يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ کەئەوەی شاراوە بێت لەئاسمانەکان و زەویدا دەری دەخات
(دەردێنێ) ﴿وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ﴾ ئەوەش دەی شارنەوەو ئەوەی دەری دەخەن دەی زانێ ﴿٢٥﴾
﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ خوایە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لەئەو ﴿رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ۩﴾
پەروەردگاری عەرشی هەرە گەورەیە ﴿٢٦﴾ ﴿قَالَ سَنَنظُرُ﴾ (سولەیمان بەپەپووەکەی) ووت ئێمە
لێ کۆڵینەوە دەکەین (سەیر دەکەین) ﴿أَصَدَقۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ (تا بزانین) ڕاست دەکەیت
(لەو هەواڵەدا) یا لە درۆزنانیت ﴿٢٧﴾ ﴿ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا﴾ ئەم نامەیەی منیان بۆ بەرە ﴿فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ ثُمَّ تَوَلَّ
عَنۡهُمۡ﴾ و فڕێ ی دە بۆیان پاشان دوور کەوەرەوە لێیان ﴿فَٱنظُرۡ مَاذَا يَرۡجِعُونَ﴾ ئەمجا سەرنج بدە چ
وەڵامێك دەگەڕێننەوە ﴿٢٨﴾ ﴿قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ﴾ (بەلقیس) ووتی ئەی پیاو ماقوڵ و سەرۆکەکان ﴿إِنِّيٓ
أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ﴾ بەڕاستی من نامەیەکی گرنگم بۆ هاوێژراوە ﴿٢٩﴾ ﴿إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ﴾ کەبێگومان لە
سولەیمانەوە (هاتووە). ﴿وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەڕاستی ئەو (نامە دەست پێ دەکات): بەناوی
خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿٣٠﴾ ﴿أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ﴾ خۆتان بەگەورە مەزانن بەسەرمداو
بەموسڵمانی (گەردن کەچی) وەرن بۆ لام ﴿٣١﴾ ﴿قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ﴾ (بەلقیس) ووتی ئەی سەرۆك
وئەشرافەکان ﴿أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي﴾ دەربارەی ئەم کارەم ڕای خۆتانم پێ بڵێن ﴿مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا﴾ چونکە
من هیچ بڕیارێك نادەم ﴿حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ﴾ هەتا ئێوە ئامادە نەبن (و ڕاوێژتان پێ نەکەم) ﴿٣٢﴾ ﴿قَالُواْ
نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ﴾ ووتیان: ئێمە خاوەنی هێزین (چەك و سەرباز) ﴿وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ﴾ وە (لەجەنگدا)
خاوەنی ئازایەتیەکی زۆرین ﴿وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ﴾ وە فەرمان وبڕیاریش بەدەستی تۆیە ﴿فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ﴾
کەواتە سەرنج بدە (بیربکەرەوە) چ فەرمانێك دەدەیت ﴿٣٣﴾ ﴿قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ﴾ ووتی بەڕاستی
پادشایان ﴿إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا﴾ هەر کاتێ (بەزۆر) چوونە شارێکەوە خراپ و وێرانی دەکەن
﴿وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗ﴾ وە دەسەڵات دارەکانی ئەو (شارە) ڕیسواو سەرشۆڕ دەکەن ﴿وَكَذَٰلِكَ
يَفۡعَلُونَ﴾ وە (کاتێ زاڵ بوون) هەر بەو جۆرە دەکەن ﴿٣٤﴾ ﴿وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ﴾ جا من دیارییەکی
بەنرخ و گەورەیان بۆ دەنێرم ﴿فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ ئەمجا چاوەڕوان دەکەم کەنێردراوەکان بەچی
یەوە دەگەڕێنەوە ﴿٣٥﴾

﴿فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ﴾ ئەمجا كاتێك (نێراوەكە) هاتە لای سولەیمان ﴿قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ﴾ (سولەیمان)
وتی: ئێوە ماڵ و سامان بەمن دەدەن؟! ﴿فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ﴾ دەی ئەوەی خوا بەمنی داوە ﴿خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم﴾
چاكترە لەوەی داویەتی بەئێوە ﴿بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ﴾ بەڵكو ئێوە بەدیارییەكەتان دڵخۆش دەبن ﴿٣٦﴾
﴿ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ فَلَنَأۡتِيَنَّهُم﴾ (بە دیارییەكەوە) بگەڕێرەوە بۆلایان سوێند بەخوا بۆیان دێین ﴿بِجُنُودٖ لَّا قِبَلَ لَهُم
بِهَا﴾ بە لەشكرێكەوە كەتوانای ڕوو بەڕوو بوونەوەیان نی یە لەگەڵیدا ﴿وَلَنُخۡرِجَنَّهُم مِّنۡهَآ أَذِلَّةٗ﴾ وە سوێند بەخوا
بەزەلیلی و ژێردەستی لەووڵاتەكەیان دەریان دەكەین ﴿وَهُمۡ صَٰغِرُونَ﴾ لەكاتێكدا ئەوان ڕیسواو سەرشۆڕن
﴿٣٧﴾ ﴿قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ﴾ (سولەیمان) وتی ئەی دەستەی پیاوماقوڵ و ئەشرافەكان ﴿أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا﴾
كامتان تەختە (پادشایی یە) كەیم بۆ دێنن ﴿قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ﴾ پێش ئەوەی بە ملكەچی بێن بۆلام ﴿٣٨﴾
﴿قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ﴾ جنۆكەیەكی گەورەی بەهێز لە جنۆكەكان وتی ﴿أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ﴾ من ئەو (تەختەییت) بۆ دێنم
﴿قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ﴾ پێش ئەوەی لەجێگەی خۆت هەستیت ﴿وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ﴾ وە بێگومان من بەتوانام
بەسەر ئەو (هێنانەدا) و دەسپاكیشم ﴿٣٩﴾ ﴿قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەوەی زانستی لەكتێبی (ئاسمانی) لا بوو
وتی ﴿أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَۚ﴾ من بۆت دێنم پێش ئەوەی چاوت بتروكێنیت ﴿فَلَمَّا رَءَاهُ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ﴾
(تەختەكەی هێنا) جا كاتێك سولەیمان تەختەتەكەی (بەڵقیسی) لای خۆیدا بینی ﴿قَالَ هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي﴾ وتی
ئەمەلەفەزلی پەروەردگارمەوەیە ﴿لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُۖ﴾ بۆئەوەی تاقیم بكاتەوەئایاشوكری (ئەم نیعمەتە) دەكەم
یان پێ نەزان و سپڵە دەبم ﴿وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ﴾ وە هەر كەسێ سوپاسی خوا بكات ئەوە بێگومان سوپاس
بۆ خۆی دەكات (چونكە سوپاكردنی خوای گەورە نیعمەتەكانی پێ زیاد دەبێت) ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيّٞ كَرِيمٞ﴾
وە هەر كەسیش ناسوپاسی بكات (زیانی بۆ خۆیەتی) چونكە بێگومان پەروەردگارم دەوڵەمەند و بێ نیازە ﴿٤٠﴾
﴿قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرۡشَهَا﴾ (سولەیمان) وتی تەختەكەی بگۆڕن ﴿نَنظُرۡ أَتَهۡتَدِيٓ﴾ سەرنج دەین (بزانین) دەیناسێتەوە
(كە تەختەكەی خۆیەتی) ﴿أَمۡ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهۡتَدُونَ﴾ یان نایناسێتەوە ﴿٤١﴾ ﴿فَلَمَّا جَآءَتۡ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِۖ﴾ ئەمجا
كاتێك (بەڵقیس) هات پێی وترا تەختەكەی تۆ وەك ئەمە وابوو ﴿قَالَتۡ كَأَنَّهُۥ هُوَۚ﴾ (بەڵقیس) وتی وەك
ئەو وایە (ئەڵێی ئەوە) ﴿وَأُوتِينَا ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهَا﴾ (سولەیمان) وتی: پێش ئەم (بەڵقیسە) زانستمان پێ درابوو
﴿وَكُنَّا مُسۡلِمِينَ﴾ وە ئێمە ملكەچ موسڵمان بووین ﴿٤٢﴾ ﴿وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعۡبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ﴾ وە ئەوەی بێجگە لەخوا
دەی پەرست بەرگری كرد (لەباوەڕ هێنان بەخوا) ﴿إِنَّهَا كَانَتۡ مِن قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ﴾ بێگومان ئەو (بەڵقیس) لەگەڵی
كافران بوو ﴿٤٣﴾ ﴿قِيلَ لَهَا ٱدۡخُلِي ٱلصَّرۡحَۖ﴾ وترا بە (بەڵقیس) بچۆرە ناو كۆشكەكەوە ﴿فَلَمَّا رَأَتۡهُ حَسِبَتۡهُ لُجَّةٗ﴾
ئەمجا كاتێك كەبینی بەدەریای زانی ﴿وَكَشَفَتۡ عَن سَاقَيۡهَاۚ﴾ وە هەر دوو قاچی هەڵكرد (بۆ ئەوەی تەڕ نەبێت)
﴿قَالَ إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ مِّن قَوَارِيرَۗ﴾ (سولەیمان) پێی ووت ئەوە (تۆ بە دەریای دەزانی) كۆشكێكە لەشوشە
﴿قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي﴾ (بەڵقیس) وتی ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من ستەمم لە خۆم كردو
﴿وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ لەگەڵ سولەیمان دا منیش ملكەچ بووم بۆ پەروەردگاری جیهانیان ﴿٤٤﴾

﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحًا﴾ سوێند بەخوا ناردمان بۆ گەلی سەموود صالح پێغەمبەری برایان
(علیە السلام) ﴿أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ (پێی ووتن) کەخوا بپەرستن ﴿فَإِذَا هُمۡ فَرِيقَانِ يَخۡتَصِمُونَ﴾ کەچی
ئەوان بوونە دوو کۆمەڵی دژ بەیەك ﴿٤٥﴾ ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ لِمَ تَسۡتَعۡجِلُونَ﴾ ووتی ئەی گەلەکەم بۆچی پەلە دەکەن
﴿بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِۖ﴾ (بەهاتنی) سزاو تۆڵە پێش (هاتنی) ڕەحمەت و چاکە ﴿لَوۡلَا تَسۡتَغۡفِرُونَ ٱللَّهَ﴾
بۆچی (ناگەڕێنەوە) داوای لێخۆشبوون ناکەن لەخوا ﴿لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ تا ڕەحمتان پێ بکرێت
﴿٤٦﴾ ﴿قَالُواْ ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَۚ﴾ ووتیان ئێمە تووشی شومی و نەگبەتی بووین بەهۆی تۆو ئەوانەی
لەگەڵ تۆدان (باوەڕداران) ﴿قَالَ طَٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِۖ﴾ (صالح) ووتی هۆی ئەو نەگبەتی یەی ئێوە لەلای
خوایە (کەبێ باوەڕیتانە) ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ﴾ نەخێر بەڵکو ئێوە گەلێکن تاقی دەکرێنەوە ﴿٤٧﴾
﴿وَكَانَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾ لەو شارە (ی صالح)دا ﴿تِسۡعَةُ رَهۡطٖ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ﴾ نۆ کەس
هەبوون لەزەویدا خراپەکارییان دەکرد بەهیچ جۆر چاکەیان نەدەکرد ﴿٤٨﴾ ﴿قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ﴾ ووتیان
(بەیەکتری) سوێند بخۆن بەخوا ﴿لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥ﴾ کەبەشەودا هێرش دەکەینە سەر ماڵ و خێزانی
(صالح و هەموویان لەناو دەبەین) ﴿ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ﴾ لەپاشان دەڵێین بەکەس و کاری (صالح)
﴿مَا شَهِدۡنَا مَهۡلِكَ أَهۡلِهِۦ﴾ ئێمە ئاگامان لەکوشتن و تیاچوونی خێزانی ئەو نی یە ﴿وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾
وبێگومان ڕاستیش دەکەین ﴿٤٩﴾ ﴿وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا﴾ ئەوان پیلانی نەخشەیان داڕشت بەپیلاندانێکی
خراپ (بۆ کوشتنی صالح) ﴿وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا﴾ ئێمەش (لەبەرامبەر پیلانی ئەواندا) پیلانمان گێڕا
(بۆ لەناو بردنیان) بە پیلانگێڕانێکی بەهێز ﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان هەستیان نەدەکرد
﴿٥٠﴾ ﴿فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ﴾ ئەمجا سەرنج بدە سەر ئەنجامی پیلانی ئەوان چی لێهات
﴿أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ چۆن ئێمە ئەوان و گەلەکەیانمان هەموو پێکەوە لەناو برد ﴿٥١﴾
﴿فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ﴾ ئەمجا ئەوە (جێ) خانووەکانیانە ﴿خَاوِيَةَۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْۚ﴾ چۆڵ و خاڵی یە لەبەر
ئەوەی ستەمیان کرد ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ﴾ بەڕاستی لەو بەسەرهاتەدا پەندو ئامۆژگاری وبەڵگە هەیە
﴿لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾ بۆ کۆمەڵێك کە دەزانن (چیمان بەسەر ئەوانە هێناوە) ﴿٥٢﴾ ﴿وَأَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ وە ئەو کەسانەمان ڕزگار کرد کەبڕوایان هێنابوو و لەخوا دەترسان ﴿٥٣﴾
﴿وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ﴾ وە باسی لووط بکە کاتێ ووتی بەگەلەکەی ﴿أَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ﴾ ئایا ئێوە
ئەو کارە زۆر خراپ و ناشیرینە دەکەن ﴿وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ﴾ کەئێوە دەبینن و دەزانن (چەند پیس
وناشیرینە) ﴿٥٤﴾ ﴿أَئِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهۡوَةٗ مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ﴾ چۆن!! ئایا بەڕاستی ئێوە دەچنە لای
پیاوان لەجیاتی ئافرەتان بۆ بەجێ هێنانی ئارەزوو (ەکانتان)؟ ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ﴾ دیارە ئێوە
گەل و کۆمەڵێکی نەفام و نەزانن ﴿٥٥﴾

﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ﴾ ئەمجا وەڵامی گەلەکەی هیچ نەبوو ﴿إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ﴾ جگە لەوەی کەووتیان
﴿أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ﴾ لـووط و کەسوکار و(شـوێن کەوتوانـی) لەشـارەکەتان دەرکـەن
﴿إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ بەڕاستی ئەوان کەسانێکن خۆیان پاك ڕادەگرن (لەم کردەوەی ئێمە) ﴿٥٦﴾
﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ﴾ ئەمجا ئێمە لووط و خێزانەکەیمان ڕزگار کرد جگە لەهاوسەرەکەی
﴿قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ کەبڕیارمان دا ئەو(هاوسەرەکەی) لەجێماوان بێت لەسزادا ﴿٥٧﴾ ﴿وَأَمْطَرْنَا
عَلَيْهِم مَّطَرًا﴾ وەبارانێکمان (لەبەرد) بەسەریان دا باراند ﴿فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ﴾ ئای چ خراپ
بوو بارانی ترسێنراوەکان ﴿٥٨﴾ ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ هەموو سوپاس و ستایش
بۆ خوا ﴿وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ﴾ وە سەلام و درود لەسەر ئەو بەندانەی خوا هەڵیبژاردون
(بۆ پێغەمبەرایەتی) ﴿ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ ئایا خوا باشترە یا ئەو بتانەی دەیکەنە هاوبەشی خوا ﴿٥٩﴾ ﴿أَمَّنْ
خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ ئایا زاتێك کەئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾
لەئاسمانەوە بارانی بۆ باراندون ﴿فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ﴾ ئەمجا بەو(بارانە) چەند باخچەیەکی
خاوەن جوانیمان ڕواند ﴿مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُواْ شَجَرَهَآ﴾ کە ئێوە نەتان دەتوانی درەخت و ڕواوی
ئەو(باخچە) بڕوێنن ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ ئایا هیچ پەرستراوی تر لە گەڵ خوادا هەیە ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾
(نەخێر نی یە) بەڵام ئەوانە گەلێکن لادەدەن لەڕێگای ڕاست ﴿٦٠﴾ ﴿أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا﴾ ئایا زاتێ
کەزەوی کردوەتە جێگای ئارامی و نیشتەجێ بوون ﴿وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا﴾ وە لەناو(زەوی)دا چەند
ڕوباری بەدی هێناوە ﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ﴾ وە چەند چیای گەورەی بۆ زەوی داناوە ﴿وَجَعَلَ بَيْنَ
ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا﴾ وە لە نێوان دوو ئاودا (شیرین و سوێر) بەربەستی داناوە(بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبن)
﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ ئایا هیچ پەرستراوی تر هەیە لەگەڵ خوادا ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ نەخێر نی یە
بەڵام زۆربەیان نازانن ﴿٦١﴾ ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ﴾ ئایا زاتێ کەدێت بەهاواری ناچار و داماوەوە
کاتێك هاواری لێ دەکات ﴿وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ﴾ وە ناخۆشی و بەڵاکان لادەبات ﴿وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ
ٱلْأَرْضِ﴾ وە دەتان کاتە جێنشینی گەلانی تری سەر زەوی ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ ئایا پەرستراوێکی تر هەیە
لەگەڵ خوادا (نەخێر نییە) ﴿قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ بەڵام زۆر کەم بیر دەکەنەوە ﴿٦٢﴾ ﴿أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى
ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ ئایا زاتێ کە ڕێنموونیی ئێوە دەکات (بە ئەستێرە و شتی تر) لەتاریکی یەکانی
ووشکانی و دەریادا (لەشەودا) ﴿وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ﴾ و زاتێك کە (با) دەنێرێت
بە موژدەدەر پێش بارانی ڕەحمەتی ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ ئایا هیچ پەرستراوێکی تر هەیە لەگەڵ خوادا
﴿تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ خوا بەرز و بڵندترە لەوەی بت پەرستان دەیکەنە هاوبەشی ﴿٦٣﴾

﴿أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ ئایا زاتێ کە لەسەرەتاوە بونەوەر بەدی دێنێت پاشان (دوای مردنی) جارێکی
تر دروستی دەکاتەوە ﴿وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ وەزاتێ کە لەئاسمان و زەوی یەوە ڕزق و ڕۆزیتان
دەدات ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ ئایا هیچ پەرستراوی تر هەیە لەگەڵ خوادا (نەخێر نی یە) ﴿قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ
إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بەڵگەتان بێنن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن (٦٤) ﴿قُل
لَّا يَعْلَمُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ﴾ بڵێ کەسانێ کە لە ئاسمانەکان و زەوی دان غەیب نازانن ﴿إِلَّا ٱللَّهُ﴾
بێجگە لەخوا (تەنها ئەو دەیزانێ) ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ و ئەوان هەست ناکەن چ کاتێ زیندوو
دەکرێنەوە (٦٥) ﴿بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾ بەڵکو زانیاری ئەوان دەربارەی ڕۆژی دوایی کورتە وبڕ
ناکات (زانیاریەکی وایان نی یە) ﴿بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّنْهَا﴾ بەڵکو لەبارەی (ڕۆژی دوای)یەوە ئەوان
لەگومان و دوودڵیدان ﴿بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ﴾ بەڵکو ئەوان لەو بارەیەوە کوێرن (٦٦) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾
ئەوانەی بێ باوەڕ بوون دەیان ووت ﴿أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَآ﴾ ئایا کاتێ ئێمەو باوو باپیرانمان بووین
بەخاك ﴿أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ﴾ ئایا ئێمە دەر دەرهێنرێن (لەگۆڕەکانمان و زیندوو دەبینەوە) (٦٧) ﴿لَقَدْ
وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمەو باوو باپیرانمان لەمەو پێش بەڵێنی ئەم
(زیندوو کردنەوە)مان پێ درا بوو ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئەم (هەڕەشەی موحەممەد ﷺ)
لێمان دەکات) تەنها درۆ و دەلەسەی گەلە پێشووەکانە (کەنوسراوەتەوە) (٦٨) ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾
(ئەی موحەممەد ﷺ) پێیان) بڵێ بڕۆن بگەڕێن بەزەوی و وڵاتان دا ﴿فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ
ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ ئەمجا سەرنج بدەن بزانن سەرئەنجامی تاوانباران چۆن بووە (چییان بەسەر هاتووە)
(٦٩) ﴿وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ﴾ خەفەت مەخۆ بۆ ئەوانە (کەبڕوا ناهێنن) ﴿وَلَا تَكُن فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ﴾
و سینگ و دڵت تەنگ نەبێ لەو پیلان و خراپانەی دەیکەن (دژبەتۆ) (٧٠) ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ﴾
دەڵێن ئەم بەڵێنەی (سزای پێمان دەدەن) کەی دێت ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن (٧١)
﴿قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ لەوانەیە زۆر لێتانەوە نزیك بوو بێتەوە
﴿بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ﴾ هەندێ لەو سزای بەپەلە داوای هاتنی دەکەن (٧٢) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾
وەبەڕاستی پەروەردگارت خاوەن فەزڵ و چاکەیە بەسەرخەڵکەوە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ﴾
بەلام زۆر بەیان سوپاس(ی پەروەردگار) ناکەن (٧٣) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ﴾ وە بەڕاستی پەوەردگارت
ئاگادارەو دەزانێت ﴿مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ بەو (دوژمنایەتی و کینەی) لە دەرونیاندا دەیشارنەوە
وبەوەش دەری دەبڕن (نایشارنەوە) (٧٤) ﴿وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ وە هیچ شتێکی نادیار نییە
لەئاسمان و زەوی دا ﴿إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ مەگەر لەکتێبی ڕوون (لوح المحفوظ) دایە (٧٥) ﴿إِنَّ هَٰذَا
ٱلْقُرْءَانَ﴾ بەڕاستی ئەم قورئانە ﴿يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ دەیگێڕێتەوە بۆ نەوەی ئیسرائیل ﴿أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ
فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ زۆربەی ئەو مەسەلانەی کە ئەوان تێیدا جیاوازن (٧٦)

﴿وإنه لهدى ورحمة للمؤمنين﴾ وە بەڕاستی ئـەم (قورئانـە) ڕێنموونـی میهرەبانـی یـە بـۆ ئیمانـداران
﴿٧٧﴾ ﴿إن ربك يقضي بينهم بحكمه﴾ بەڕاستی پەروەردگارت دادوەری دەکات لەنێوانیان دا بەبڕیاری خۆی
﴿وهو العزيز العليم﴾ وە خـوا بەدەسـەڵاتی زانایـە ﴿٧٨﴾ ﴿فتوكل على الله﴾ کـەوا بـوو پشـت هەر بەخوا ببەستە
﴿إنك على الحق المبين﴾ بەڕاستی تـۆ لەسـەر ئاینێکـی ڕاسـت و ڕوونـی ﴿٧٩﴾ ﴿إنك لا تسمع الموتى﴾ بەڕاستی تۆ
ناتوانی(بانگـەوازت) بەمـردووەکان ببیسـتێنیت ﴿ولا تسمع الصم الدعاء﴾ وە ناتوانـی بانگـەوازت بەوانـەی
کـەڕن بژنەوێنـی ﴿إذا ولوا مدبرين﴾ کاتـێ پشـت هەڵدەکـەن و دەڕۆن ﴿٨٠﴾ ﴿وما أنت بهادي العمي عن ضلالتهم﴾
وە تـۆ ناتوانـی کوێـران ڕزگار کەیـت لە گومراییەکەیان (ڕێنموونیـان بکەیت) ﴿إن تسمع إلا من يؤمن بآياتنا﴾
تۆ تەنها (ڕێنموونیت) بەکەسێ دەژنەوێنی کەبڕوا بەئایەت و نیشانەکانی ئێمە دێنێ ﴿فهم مسلمون﴾ چونکە
ئەوانـە هەمیشـە ملکەچـن (بۆ هـەق) ﴿٨١﴾ ﴿وإذا وقع القول عليهم﴾ وە کاتێ ئـەو بەڵێنی (سـزایەی پێیان دراوە)
بەسـەریاندا هـات ﴿أخرجنا لهم دابة من الأرض﴾ (کەمێك پێش ڕوودانی قیامـەت) گیان لەبەرێـك لەزەوی
دەردە هێنیـن بۆیـان ﴿تكلمهم﴾ قسـەیان لەگەڵـدا دەکات ﴿أن الناس كانوا بآياتنا لا يوقنون﴾ (دەڵـێ) بەڕاستی
ئـەم خەڵکە باوەڕی ڕاسـتەقینەیان نەهێنا بەئایەتەکانـی ئێمە ﴿٨٢﴾ ﴿ويوم نحشر من كل أمة فوجا﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) باسـی) ئـەو ڕۆژە بکـە لەهەمـوو میللەتێـك پۆلێکـی زۆر کۆدەکەینـەوە ﴿ممن يكذب بآياتنا﴾ لەوانەی
ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانی ﴿فهم يوزعون﴾ ئەمجا ئەوان (لەپێش و دواکەوتن) بەرگری دەکرێن (بەڕیز
دەڕۆن) ﴿٨٣﴾ ﴿حتى إذا جاءو﴾ هەتا کاتێ دێن (بۆ شـوێنی کۆکردنەوەیان) ﴿قال أكذبتم بآياتي ولم تحيطوا بها علما﴾
(خـوا) ئەفەرموێ ئایا ئێوە ئایەتەکانی منتان بەدرۆ دەزانی (باوەڕتـان پـێ نەهێنا) لەکاتێکدا هیچ زانیاریەکتان
دەربارەیـان نەبـوو ﴿أماذا كنتم تعملون﴾ یـان ئێـوە چیتان دەکـرد (لەدونیـا) ﴿٨٤﴾ ﴿ووقع القول عليهم بما ظلموا﴾
وە بڕیـاری (سـزادانیان) بەسـەرا دەسـەپێ بەهۆی سـتەمکاری یانـەوە ﴿فهم لا ينطقون﴾ ئەمجا ئـەوان هیچ
قسـە ناکەن ﴿٨٥﴾ ﴿ألم يروا﴾ ئایا (بێ بڕوایان) نەیان زانیوەو نابینن ﴿أنا جعلنا الليل ليسكنوا فيه﴾ ئێمە شـەومان
سـازاندووە بـۆ ئـەوەی ئـەوان ئارامی تیا بگـرن ﴿والنهار مبصرا﴾ وە ڕۆژمـان ڕووناك کـردووە (ئیش و کاری
تیادەکـەن) ﴿إن في ذلك لآيات لقوم يؤمنون﴾ بەڕاسـتی لەمەدا چەند بەڵگەو نیشـانە هەیە بۆ کەسـانێ باوەڕ دێنن
(بەخـوا) ﴿٨٦﴾ ﴿ويوم ينفخ في الصور﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) باسـی) ئـەو ڕۆژە بکە فـوو دەکرێ بەشـەیپووردا
﴿ففزع من في السماوات ومن في الأرض﴾ جـا هەرچـی کـەس لەئاسـمانەکان و زەوی دایـە دەترسـێ وڕادەچڵەکێ
(هەموو دەمرن) ﴿إلا من شاء الله﴾ جگە لەو کەسانەی خوا بیەوێ (بەئارام بن و نەمرن) ﴿وكل أتوه داخرين﴾
وە هەموو بەملکەچی و سەر شۆڕی دێنەوە لای خوا ﴿٨٧﴾ ﴿وترى الجبال تحسبها جامدة﴾ وە ئەو کێوو چیانە دەبینی
وا دەزانـی دامەزراون (لەشـوێنی خۆیـان دا) ﴿وهي تمر مر السحاب﴾ (کاتێ فووکرا بەشـەیپوردا) چیاکان وەکو
ڕۆشتنی هەور دەڕۆن ﴿صنع الله الذي أتقن كل شيء﴾ ئەمە دروسـت کراوی ئەو خوایە کەهەموو شـتێکی بەو
پەڕی ڕێك و پێکی دروسـت کـردووە ﴿إنه خبير بما تفعلون﴾ بەڕاسـتی خوا ئاگادارە بەهـەر کردەوەیەك ئێوە
دەیکەن ﴿٨٨﴾

﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ﴾ هەركـەس كردەوەی چاكی كردبێت ﴿فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا﴾ (لەڕۆژی دواییدا) پاداشـتی چاكتری لەو (كردەوە)ی بۆ هەیە ﴿وَهُم مِّن فَزَعٖ يَوۡمَئِذٍ ءَامِنُونَ﴾ وە ئەوانە دڵنیان لەترس و داچڵەكانی گەورەی ئەو ڕۆژە ﴿٨٩﴾ ﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ﴾ وە هەركەس خراپەی كردبێت ﴿فَكُبَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ﴾ (لەو ڕۆژەدا) بەسەر ڕوومەت ودەم و چاویاندا دەخرێنە ناو ئاگر(ی دۆزەخ) ﴿هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ ئایا سـزا دەدرێن جگە لەوەی دەتانكرد ﴿٩٠﴾ ﴿إِنَّمَآ أُمِرۡتُ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ) بێگومـان من فەرمانم پـێ دراوە ﴿أَنۡ أَعۡبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلۡبَلۡدَةِ﴾ كەتەنهـا پەروەردگـاری ئـەم شـارە (مەككە) بپەرستم ﴿ٱلَّذِي حَرَّمَهَا﴾ ئەو (خوایـە)ی (ڕێز شـكاندی) ئەم شـارەی حەرام كردووە ﴿وَلَهُۥ كُلُّ شَيۡءٖۖ﴾ و هەموو شـتێك تەنها هی ئـەو (خوایە) ﴿وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ وە فەرمانم پێ دراوە لەموسڵمانان بم ﴿٩١﴾ ﴿وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ﴾ وە (فەرمانم پێ دراوە كە)قورئان بخوێنم (بەسەر خەڵكـی دا) ﴿فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ﴾ جـا هەر كەس هیدایەتی وەرگرت ئـەو بێگومان تەنها بۆ خۆی هیدایـەت وەردەگرێ (قازانجەكەی بۆ خۆیەتی) ﴿وَمَن ضَلَّ﴾ هەركەسـیش گومـڕا بێت (زیانی بۆ خۆیەتی) ﴿فَقُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ﴾ وە بڵـێ: بەڕاسـتی مـن تەنها یەكێكـم لەترسـێنەران ﴿٩٢﴾ ﴿وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ وە بڵێ هەموو سـوپاس بۆ خوایە ﴿سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ﴾ ئەو (خوایە) بەزوویی ئایەت و نیشانەكانی نیشانی ئێوە دادەت ئێوەش دەیانناسـن (كەئایەتی خوان) ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ وە پەروەردگارت بێ ئاگا نییە لەوەی كەئێوە دەیكەن ﴿٩٣﴾

## سورەتی ﴿ٱلۡقَصَصِ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿طسٓمٓ﴾ بە(طا،سین، میم) دەخوێنرێتەوە خوازاناترە بە ماناكەی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرتای سورەتی (البقـرة) بكـە ﴿١﴾ ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ﴾ ئـەم (ئایەتانـە) ئایەتەكانـی قورئانـی ڕوون و ئاشـكران ﴿٢﴾ ﴿نَتۡلُواْ عَلَيۡكَ﴾ دەیخوێنینەوە بەسەرتا(ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرۡعَوۡنَ بِٱلۡحَقِّ﴾ هەندێ لەهەواڵی مووسـا و فیرعـەون بەڕاسـتی و دروسـتی ﴿لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بـۆ ئەوانـەی بـڕوا دێنن ﴿٣﴾ ﴿إِنَّ فِرۡعَوۡنَ عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بەڕاستی فیرعەون زاڵ و(ملهوڕ و یاخی) بوو لەزەوی (میصر)دا ﴿وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا﴾ وە خەڵكەكەی (میصـری) كـرد بەچەند بەش و كۆمەڵـێك ﴿يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ﴾ كۆمەڵێكیانی لاوازو ژێر دەسـتە دەكرد ﴿يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡۚ﴾ كوڕانی ئەوانی سەر دەبڕی و ئافرەتانیانی بەزیندوویی دەهێشتەوە (دەیكردنە خزمەتـكارو كەنیـزەك) ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ بەڕاسـتی ئـەو (فیرعـەون) لەخراپـەكاران بـوو ﴿٤﴾ ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ﴾ وە ئێمە دەمانەوێ (بەچاكەی خۆمان) منەت بنێین ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بەسەر ئەوانەی كـەلاواز و ژێـر دەسـت كرا بوون لەووڵاتـی (میصـر)دا ﴿وَنَجۡعَلَهُمۡ أَئِمَّةٗ وَنَجۡعَلَهُمُ ٱلۡوَٰرِثِينَ﴾ وە بیان كەینە پێشەواو بیان كەینە میرات بەران(ی كەلەپوری فیرعەون و و شوێن كەوتوانی) ﴿٥﴾

﴿وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ وە دەسـەڵات داریـان بکەیـن لـەو زەویـەدا ﴿وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا﴾
وەنیشانی فیرعەون وهامان ولەشکری هەردووکیان بدەین ﴿مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ﴾ لە(بەنو ئیسرائیلی
یەکانـەوە) ئـەوەی خۆیان لێ دەپاراسـت ﴿٦﴾ ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ﴾ بەدایکی مووسـامان ڕاگەیاند
(ئیلهامان بۆ کرد) ﴿أَنْ أَرْضِعِيهِ﴾ کە شـیر بدە بەمووسا ﴿فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ﴾ ئەمجا هەرکاتێ ترست لێی
هەبوو ﴿فَأَلْقِيهِ فِي ٱلْيَمِّ﴾ ئەوکاتە بیخەرە ڕووبار(ی نیلە)وە ﴿وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِيٓ﴾ مەترسـە (لێ ی)
وخەفەتیش مەخۆ (بۆی) ﴿إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ﴾ بەڕاستی ئێمە دەیگێڕینەوە بۆلات ﴿وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾
وە دەیکەین بەیەکێ لەپێغەمبەران ﴿٧﴾ ﴿فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ﴾ (دایکی مووسای خستە ئاوی نیلەوە)
ئەمجـا دارو دەسـتەی فیرعەون (پێیان زانی و) هەڵیـان گرتەوە ﴿لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾ بۆ ئەوەی
ببـێ بەدوژمـن و هۆی خەفـەت بۆیان ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا﴾ بەڕاسـتی فیرعـەون وهامان
ولەشـکر و سـەربازەکانیان ﴿كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ﴾ تاوانبـارو هەڵەبـوون ﴿٨﴾ ﴿وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ﴾
(ویسـتیان مووسـا بکوژن ئاسـیەی) ژنی فیرعەون ووتی ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ﴾ مایەی چاو
ودڵ ڕۆشنی یە بۆ من و بۆ تۆش (فیرعەون) مەیکوژن ﴿عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ﴾ بەڵکو سوودو کەڵکمان پێ
بگەیەنێ ﴿أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا﴾ یا بیکەین بەکوڕی خۆمان ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان هەستیان
نەدەکـرد (ئەم منداڵە ئەبێتە هۆی تیاچوونیان) ﴿٩﴾ ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا﴾ جا دڵی دایکی مووسـا
خاڵـی بـوو (لەهەموو شـت جگـە لەمنداڵەکەی) ﴿إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ﴾ نزیـك بـوو (نهێنی) ئەو
منداڵـە ئاشـکرابکات ﴿لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا﴾ ئەگەر دڵیمان نەبەسـتایەتەوە (وە بەهێزمان نەکردایە)
﴿لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بـۆ ئـەوەی لەبـڕواداران بـێ ﴿١٠﴾ ﴿وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ﴾ (دایکـی مووسـا)
ووتی بەخوشـکەکەی (مووسـا) بەشـوێنیدا بـڕۆ ﴿فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ﴾ ئەمجا لە دورەوە مووسـای
بینی و پێی زانی ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان (فیرعەون و کۆمەڵەکەی) هەستیان نەدەکرد ﴿١١﴾
﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ﴾ وە ئێمە پێشتر (شیری) شیردەرەکانمان حەرام کرد لەمووسا (مەمکی
کەسـیانی نەدەمژی) ﴿فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ﴾ ئەمجا خوشـکەکەی (مووسـا) ووتی پێیان ئایا
ماڵێکتان نیشـان دەم ﴿يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ﴾ کەئەو منداڵە بۆ ئێوە بەخێو بکەن(و شـیری بدەنێ) ﴿وَهُمْ
لَهُۥ نَٰصِحُونَ﴾ و دڵسـۆز بـن بۆی ﴿١٢﴾ ﴿فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ﴾ ئەمجا مووسـا مـان گێڕایەوە بـۆلای دایکی
﴿كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ﴾ بۆ ئەوەی چاوی پێ ڕوون بێتەوەو خەفەت نەخوات ﴿وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ
حَقٌّ﴾ وە بۆئـەوەی بزانێت کەبەڵێنی خوا ڕاسـت و هەقە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆر
بەیان نازانن ﴿١٣﴾

﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسۡتَوَىٰٓ﴾ کاتێ مووسا گەشتە ئەوپەڕی پێگەیشتنی لەش و ژیری تێرو تەواو بوو
﴿ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ﴾ دانایی و زانستمان پێدا ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ هەربەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران
دەدەینەوە ﴿١٤﴾ ﴿وَدَخَلَ ٱلۡمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفۡلَةٖ مِّنۡ أَهۡلِهَا﴾ وە (مووسا) ڕۆشتە ناو شار بێ ئەوەی خەڵکی شار
ئاگایان لێ بێ ﴿فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيۡنِ يَقۡتَتِلَانِ﴾ جا لەو شارەدا دوو پیاوی دی لەگەڵ یەکتر شەڕیان دەکرد
﴿هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنۡ عَدُوِّهِۦۖ﴾ ئەمەیان لەتایفەی خۆی بوو ئەوی تریشیان لەدوژمنانی بوو ﴿فَٱسۡتَغَٰثَهُ
ٱلَّذِي مِن شِيعَتِهِۦ﴾ ئەمجا ئەوەیان کە لەتایفەی خۆی بوو داوای یارمەتی لێ کرد ﴿عَلَى ٱلَّذِي مِنۡ عَدُوِّهِۦ﴾
لەدژی ئەوەی کە لە(تاقمی) دوژمنەکەی بوو ﴿فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيۡهِۖ﴾ ئەمجا مووساش بۆکزێکی
لێدا و ئەو (قیبتی یە)ی کوشت ﴿قَالَ هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ﴾ (مووسا) ووتی ئەم (کوشتنە) لەکردەوەی
شەیتانە ﴿إِنَّهُۥ عَدُوّٞ مُّضِلّٞ مُّبِينٞ﴾ بەڕاستی ئەو (شەیتان) دوژمنێکی گومڕاکەری ڕوون و ئاشکرایە
﴿١٥﴾ ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي﴾ ووتی ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من ستەمم لەخۆم کرد ﴿فَٱغۡفِرۡ لِي فَغَفَرَ
لَهُۥٓۚ﴾ دەی لێم خۆشبە جا ئەویش (خودا) لێ ی خۆش بوو ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بێگومان تەنها
ئەو لێبوردەی بەبەزەیی یە ﴿١٦﴾ ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ﴾ (مووسا) ووتی ئەی پەروەردگارم بەهەقی چاکە
ونیعمەتت لەسەرم (ئەو هێزو توانایەیە کە پێتداوم) ﴿فَلَنۡ أَكُونَ ظَهِيرٗا لِّلۡمُجۡرِمِينَ﴾ بڕیاربێ هەرگیز نەبم
بەپشتیوانی تاوانباران ﴿١٧﴾ ﴿فَأَصۡبَحَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُ﴾ بەهۆی ئەو (کوشتنە)وە لەشاردا بەترسەوە
چاوەڕوانی دەکر (فیرعەونیەکانی چ هەڵوێستێکیان دەبێ) ﴿فَإِذَا ٱلَّذِي ٱسۡتَنصَرَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ يَسۡتَصۡرِخُهُۥۚ﴾
لەناکاودا ئەو (بەنی ئیسرائیلی یەی) دوێنێ داوای یارمەتی کرد لەو (مووسا لەگەڵ یەکێکی
تردا شەڕیەتی) هانای بۆ مووسا هێنا فریاری کەوێت ﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِيّٞ مُّبِينٞ﴾ مووسا بەو
(بەنو ئیسرائیلی یە)ی ووت بەڕاستی تۆ کەسێکی گومڕای ئاشکرای ﴿١٨﴾ ﴿فَلَمَّآ أَنۡ أَرَادَ﴾ ئەمجا کاتێ
کە(مووسا) ویستی ﴿أَن يَبۡطِشَ بِٱلَّذِي هُوَ عَدُوّٞ لَّهُمَا﴾ بەتوندی بدات لەو پیاوەی دووژمنی هەردووکیانە
﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقۡتُلَنِي﴾ ووتی ئەی مووسا ئایا دەتەوێ بم کوژی ﴿كَمَا قَتَلۡتَ نَفۡسَۢا بِٱلۡأَمۡسِۖ﴾
هەروەکو دوێنێ کەسێکت کوشت ﴿إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ تۆ هەر دەتەوێ زۆر دارو
ملهوڕ بیت لەزەوی دا ﴿وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ﴾ وە ناتەوێ لەپیاو چاکان (ڕێکخەران) بیت ﴿١٩﴾
﴿وَجَآءَ رَجُلٞ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡعَىٰ﴾ ئەمجا پیاوێك لەو پەڕی شارەوە بەپەلە هات (بۆ لای مووسا)
﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ﴾ ووتی ئەی مووسا (ئاگاداربە) کاربەدەست وسەرگەورەکان ﴿يَأۡتَمِرُونَ
بِكَ لِيَقۡتُلُوكَ﴾ کۆبوونەتەوە لەبارەی تۆوە (قسە دەکەن) بۆ ئەوەی بتکوژن ﴿فَٱخۡرُجۡ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾
کەواتە دەرچۆ لەشار (بانەت گرن) بێگومان من دڵسۆزتم ﴿٢٠﴾ ﴿فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُۖ﴾ ئەویش لەشار
دەرچوو بەترسەوە چاوەڕوانی دەکرد (پێی بزانن و بیگرن) ﴿قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (مووسا)
ووتی ئەی پەروەردگارم ڕزگارم بکە لەم کۆمەڵە ستەمکارە ﴿٢١﴾

﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ﴾ لەکاتێکدا بەرەو شاری مەدیەن دەڕۆشت ﴿قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي﴾ ووتی ئومێد دەکەم پەروەردگارم ڕێنمونیم بکات ﴿سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾ بۆ ڕێگای ڕاست و حەق ﴿٢٢﴾ ﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ﴾ وکاتێ گەیشتە سەر ئاوەکەی مەدیەن ﴿وَجَدَ عَلَيْهِ﴾ بینی لەسەر ئەو ئاوە ﴿أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ﴾ کۆمەڵێك لەخەڵکی (ئاژەڵ و ماڵات) ئاو دەدەن ﴿وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ﴾ وە لەنزیك ئەو (خەڵك)انەوە دوو ئافرەتی بینی ﴿تَذُودَانِ﴾ بەرگری دەکەن لەئاژەڵەکەیان (لەوەی بێتە سەر ئاوەکە) ﴿قَالَ مَا خَطْبُكُمَا﴾ (مووسا) ووتی ئێوە مەبەستتان چی یە؟ (ناهێڵن ئاژەڵەکەتان ئاو بخوات) ﴿قَالَتَا لَا نَسْقِي﴾ ووتیان ئێمە (ئاژەڵەکەمان) ئاو نادەین ﴿حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ﴾ هەتا شوانەکان (وئاژەڵەکانیان لەسەر ئاوەکە) نەگەڕێنەوە ﴿وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾ وە باوکمان پیرێکی گەورەو بەتەمەنە ﴿٢٣﴾ ﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا﴾ ئەمجا (مووسا) مەڕەکانی بۆ ئاودان ﴿ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ﴾ لەپاشان (مووسا) چووبۆ ژێر سێبەرێك ﴿فَقَالَ رَبِّ﴾ جا ووتی ئەی پەروەردگارم ﴿إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾ بەڕاستی من هەژارم (پێویستم هەیە) بەهەر خێرو ڕۆزییەك بۆم بنێری ﴿٢٤﴾ ﴿فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا﴾ ئەمجا یەکێك لەدوو کچەکە هات بۆ لای مووسا ﴿تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ﴾ بەشەرمەوە دەڕۆشت لەڕێگادا ﴿قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ﴾ ووتی بەڕاستی باوکم (شوعەیب) بانگت دەکات ﴿لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾ بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوەت بداتەوە کەمەڕەکانت بۆ ئێمە ئاودا (مووساش لەگەڵی ڕۆشت) ﴿فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ﴾ ئەمجا کاتی مووسا هات بۆ لای (باوکی کچەکە) و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە ﴿قَالَ لَا تَخَفْ﴾ (شوعەیب علیه السلام) ووتی مەترسە ﴿نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ ڕزگارت بووە لەو گەلە ستەمکارە ﴿٢٥﴾ ﴿قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَـٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ﴾ یەکێ لەو دوو (کچە بەباوکی) ووت ئەی باوە گیان بەکرێ ی بگرە (بۆ شوانی) ﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ﴾ چونکە بەڕاستی چاکترین کەسە کە بەکرێی بگری ﴿ٱلْقَوِيُّ ٱلْأَمِينُ﴾ بەهێز و ئەمینە (دەس و داوێن پاکە) ﴿٢٦﴾ ﴿قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ﴾ (شوعەیب) ووتی بەڕاستی من دەمەوێ ﴿أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَيَّ هَـٰتَيْنِ﴾ کە یەکێك لەم دوو کچەم لەتۆ مارەکەم ﴿عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِي ثَمَـٰنِيَ حِجَجٍ﴾ بەو مەرجەی هەشت ساڵ ڕەنجبەریم بۆ بکەیت ﴿فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا﴾ ئەمجا ئەگەر دەساڵت تەواو کرد ﴿فَمِنْ عِندِكَ﴾ ئەوە لە(پیاوەتی) خۆتەوەیە ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ﴾ و من نامەوێ قورسی بکەم لەسەرت ﴿سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئەگەر خوا بیەوێ بێگومان دەمبینی ﴿مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ لەپیاو چاکان دەبم ﴿٢٧﴾ ﴿قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ﴾ (مووسا) ووتی ئەوەی ووتت پێم (بڕیار بێت) لەنێوان من و تۆدا ﴿أَيَّمَا ٱلْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ﴾ هەرکام لەو دوو ماوە (٨ یا ١٠ ساڵ) یەم تەواو کرد ﴿فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَيَّ﴾ نابێ ستەمم لێ بکرێ ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ وە خوا لەسەر ئەوەی کەدەیڵێین شایەت و چاودێرە ﴿٢٨﴾

﴿فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلۡأَجَلَ﴾ ئەمجا کاتێك مووسا ماوەی شوانی یەکەی تەواو کرد ﴿وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ﴾
لەگەڵ خێزانەکەی بەشەو ڕۆشتن (لە مەدیەنەوە بۆ میصر) ﴿ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارٗاۖ﴾ لە دورەوە لای
ڕاستی کێوی طور ئاگرو ڕووناکی یەکی بینی ﴿قَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ﴾ (مووسا) ووتی بەخێزانەکەی ئێوە
(لێرەدا) بمێننەوە ﴿إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا﴾ بەڕاستی من ئاگرێکم بەدی کرد (بینی) ﴿لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ﴾
بەڵکو هەواڵێکی (ڕێگاتان) بۆ بێنم لای ئەو (ئاگرە) ﴿أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ﴾
یان چڵوسکێکی ئاگرتان بۆ بێنم بەڵکو خۆتانی پێ گەرم کەنەوە ﴿٢٩﴾ ﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ﴾ ئەمجا کاتێ
هاتە نزیکی ئەو (ئاگرە) بانگی لێ کرا ﴿مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ﴾ لەکەناری لای ڕاستی شیوەکەوە ﴿فِي
ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ﴾ لەو پارچە زەوی یە بەفەڕو پیرۆزەی نزیك درەختەکەوە ﴿أَن يَٰمُوسَىٰٓ﴾
(بانگی لێ کرا) کەئەی مووسا ﴿إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بەڕاستی من خوایەکم پەروەردگاری
جیهانیانم ﴿٣٠﴾ ﴿وَأَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۚ﴾ (وە بانگی کرا) کەگۆچانەکەت فڕێدە ﴿فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ﴾
ئەمجا کاتێ مووسا ئەو (گۆچانە)ی بینی وەك تیرەمار دەجووڵێ بە پەلە ﴿وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ﴾ پشتی
تێ کرد و ڕایکرد و نەگەڕایەوە سەری ﴿يَٰمُوسَىٰٓ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡۖ﴾ (خوا فەرمووی) ئەی مووسا وەرە
پێش و مەترسە ﴿إِنَّكَ مِنَ ٱلۡأٓمِنِينَ﴾ بەڕاستی تۆ لەو کەسانەی بێ باك و بێ ترسن ﴿٣١﴾ ﴿ٱسۡلُكۡ يَدَكَ فِي
جَيۡبِكَ﴾ دەستت بخەرە ناو باخەڵ (و ژێر باڵت) ﴿تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖ﴾ (کاتێ دەری دێنی) دێتە
دەرەوە بەسپێتی و تیشك دەداتەوە بێ ئەوەی بەڵەکی و نەخۆشی بێت ﴿وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ﴾
دەستت بلکێنە بەخۆتەوە (و بیخەرە سەردڵت) بۆ (نەهێشتنی) ترس و بیم ﴿فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ﴾
ئا ئەم دووانە (گۆچانەکەت و دەستت) دوو موعجیزەن لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ
وَمَلَإِيْهِۦٓۚ﴾ (نێرراوە) بۆ فیرعەون و دارو دەستەکەی ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانە
کۆمەڵێکی لەسنوور دەرچوون ﴿٣٢﴾ ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلۡتُ مِنۡهُمۡ نَفۡسٗا﴾ (مووسا) ووتی ئەی پەروەردگارم
بێگومان من یەکێکم لەوان کوشتووە ﴿فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ﴾ لەبەر ئەوە دەترسم کەبم کوژن (لەجیاتی
ئەو کوژراوە) ﴿٣٣﴾ ﴿وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا﴾ وە هاروونی برام لەمن زمانی پاراوترە ﴿فَأَرۡسِلۡهُ
مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓۖ﴾ جا ئەوم لەگەڵدا بنێرە پشتیوانم بێت ووتەکانم بسەلمێنێ ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴾
بەڕاستی من دەترسم کە بە درۆزنم دابنێن (باوەڕم پێ نەهێنن) ﴿٣٤﴾ ﴿قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ﴾ (خوا)
فەرمووی بێگومان ئێمە بە براکەت تۆ بەهێزت دەکەین ﴿وَنَجۡعَلُ لَكُمَا سُلۡطَٰنٗا﴾ وە دەسەلاتێك
بەهەردووکتان دەدەین ﴿فَلَا يَصِلُونَ إِلَيۡكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآۚ﴾ ئەوسا بەهۆی ئایەتەکانی ئێمەوە دەستیان
بەئێوە ناگات ﴿أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ﴾ تەنها ئێوە (مووسا و هاروون) و ئەوەی شوێنتان دەکەوێ
سەردەکەوون ﴿٣٥﴾

﴿فَلَمَّا جَاءَهُم مُّوسَىٰ بِآيَاتِنَا بَيِّنَاتٍ﴾ ئەمجا کاتێك کەمووسا موعجیزە ڕوونەکانی ئێمەی بۆ هێنان
﴿قَالُوا مَا هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى﴾ ئەوان ووتیان ئەمە (تۆ هێناوتە مووسا) تەنها جادوویەکی دەست هەڵبەستە
﴿وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ﴾ ئێمە ئەمەمان نەبیستووە لەباوو باپیرە پێشوەکانمان ﴿٣٦﴾
﴿وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّي أَعْلَمُ﴾ مووسا ووتی پەروەردگارم زاناترە ﴿بِمَن جَاءَ بِالْهُدَىٰ مِنْ عِندِهِ﴾ بەو کەسەی
کەڕێنموونیی لای ئەوەوە هێناوە ﴿وَمَن تَكُونُ لَهُ عَاقِبَةُ الدَّارِ﴾ وە (زاناترە) بەو کەسەی سەرنجام
ودوا ڕۆژی چاکی دەبێت ﴿إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ بەڕاستی ئەو (خوا) ستەمکاران ڕزگار ناکات ﴿٣٧﴾
﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ﴾ فیرعەون ووتی: ئەی کاربەدەست ودەسەلاَتداران ﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ
غَيْرِي﴾ وا نازانم جگە لەخۆم هیچ پەرستراوێکی ترتان هەبێ ﴿فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ﴾ جا
(بۆ زیاتر دڵنیابوون) ئەی هامان کورەی ئاگر تاودەو خشتی سورەوە کراوی لێ دروست بکە بۆم
﴿فَاجْعَل لِّي صَرْحًا﴾ ئەمجا (لەوخشتە) کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە ﴿لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَىٰ إِلَٰهِ مُوسَىٰ﴾
(بەگاڵتەوە ووتی) بەڵکو سەیری خواکەی مووسا بکەم و ببینم ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾
وبەڕاستی وا دەزانم ئەو (مووسا) لەدرۆزنانە ﴿٣٨﴾ ﴿وَاسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُ﴾ ئەو (فیرعەون)و لەشکرو
سەربازەکانی خۆیان بەزل زانی ﴿فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ لەووڵات و زەوی (میصر)دا بەناڕەوا
﴿وَظَنُّوا أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ﴾ وە گومانیان وابوو کەزیندوو ناکرێنەوەو ناگەڕێنرێنەوە بۆلای ئێمە ﴿٣٩﴾
﴿فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ﴾ جا تۆڵەمان لەئەو (فیرعەون)و لەشکرو سەربازەکانی سەندو
تورمان دانە ناو دەریای سوورەوە ﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ﴾ ئەمجا سەرنج بدە (ئەی
موحەممەد ﷺ) سەرئەنجامی ستەمکاران چۆن بوو ﴿٤٠﴾ ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ﴾
ئەوانمان کردە پێشە وایانێك کە(خەڵك) بانگ دەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ
لَا يُنصَرُونَ﴾ وە لەڕۆژی دواییشدا یارمەتی نادرێن ﴿٤١﴾ ﴿وَأَتْبَعْنَاهُمْ فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً﴾ لەم
دونیایەدا نەفرینمان نارد بەدوایاندا ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ هُم مِّنَ الْمَقْبُوحِينَ﴾ وە لەڕۆژی قیامەتیشدا
ئەوانە لەبێزراو و دورخراوەکانن ﴿٤٢﴾ ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان تەوراتمان
بەخشی بەمووسا ﴿مِن بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الْأُولَىٰ﴾ لەپاش ئەوەی خەڵکی چەرخە پێشوەکانمان
لەناوبرد ﴿بَصَائِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً﴾ تا بەرچاو ڕوونی و ڕێنموونیی و ڕەحمەت بێ بۆ خەڵکی
﴿لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە بیربکەنەوەو ئامۆژگاری وەرگرن ﴿٤٣﴾

﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ﴾ تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) لەلای خۆر ئاوای (شاخی طور) نەبوویت
﴿إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ﴾ کاتێك کە فەرمانی پێغەمبەرایەتمان دا بەمووسا ﴿وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾
وە تۆ لەئامادە بووانی (ئەو ڕووداوە) نەبوویت ﴿٤٤﴾ ﴿وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا﴾ بەڵام ئێمە چەند چین و
سەردەممان دروست کرد (لەپاش مووسا) ﴿فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ﴾ ئەمجا ماوەیەکی دوورو درێژیان
بەسەردا تێپەڕی ﴿وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِيٓ أَهْلِ مَدْيَنَ﴾ وە تۆ لەناو خەڵکی مەدیەندا نیشتەجێ نەبوویت
﴿تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا﴾ کەئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنیتەوە ﴿وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ﴾ بەڵام هەر
ئێمە بووین پێغەمبەرمان نارد ﴿٤٥﴾ ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا﴾ وە تۆ لای کێوی طور نەبوویت
کاتی بانگ(ی مووسا)مان کرد ﴿وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾ بەڵام ئەوە بەزەییەکە لە پەروەردگارتەوە
(بەتۆی داوە) ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ بۆ ئەوەی گەلێك بترسێنی کەپێش تۆ هیچ
ترسێنەرێکیان بۆ نەهاتووە ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بەڵکو بیربکەنەوەو پەند وەرگرن ﴿٤٦﴾ ﴿وَلَوْلَآ أَن
تُصِيبَهُم﴾ وەئەگەر (پێش ناردنی پێغەمبەر) تووشیان ببوایە ﴿مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ بەڵایەك
بەهۆی ئەو (خراپانەوەی) کەکردوویانە ﴿فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا﴾ جا دەیان ووت ئەی
پەروەردگاری ئێمە بۆچی پێغەمبەرێکت بۆ نەناردین ﴿فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ﴾ بۆ ئەوەی شوێن ئایەتەکانت
بکەوتینایە ﴿وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ وە لەبڕواداران بووینایە ﴿٤٧﴾ ﴿فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا﴾ ئەمجا
کاتێ ڕاستیان بۆهات لەلایەن ئێمەوە ﴿قَالُوا۟ لَوْلَآ أُوتِيَ﴾ ووتیان بۆچی بەو (موحەممەد ﷺ) نەدراوە
﴿مِثْلَ مَآ أُوتِيَ مُوسَىٰٓ﴾ وێنەی ئەوەی بەمووسا دراوە ﴿أَوَلَمْ يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ﴾ ئایا ئەوان
پێشتر بێ بڕوانەبوون بەوەی درابوو بەمووسا ﴿قَالُوا۟ سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا﴾ دەیان ووت (قورئان و تەورات)
دوو سیحر و جادوون پشتگیری یەکتر دەکەن ﴿وَقَالُوٓا۟ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ﴾ وە دەیانووت بێگومان ئێمە
بێ باوەڕین بەهەموویان (بە قورئان و تەورات) ﴿٤٨﴾ ﴿قُلْ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) بڵێ دەی ئێوە کتێبێك لەلایەن خواوەبێنن ﴿هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ﴾ کەئەو (کتێبە) ڕاست تر بێت
لەو دووانە (قورئان و تەورات) من شوێنی دەکەوم ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن ﴿٤٩﴾
﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكَ﴾ ئەمجا ئەگەر بەگوێیان نەکردی (و وەڵامیان نەدایتەوە) ﴿فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ
أَهْوَآءَهُمْ﴾ ئەوە بزانە کەتەنها شوێن هەواو ئارەزوی خۆیان دەکەون ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ﴾
وە کێ لەو کەسە گومڕاترە کەشوێن ئارەزووی خۆی بکەوێت ﴿بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ﴾ بێ ڕێنموونیی
لەلایەن خواوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومان خوا ڕێنموونیی گەلی ستەمکار
ناکات ﴿٥٠﴾

﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ﴾ سوێند بەخوا (ئایەتەکانی) قورئانمان بەشوێن یەکدا بۆ ناردن ﴿لَعَلَّهُمْ
يَتَذَكَّرُونَ﴾ تا پەند وەرگرن و بیربکەنەوە ﴿٥١﴾ ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ﴾ ئەو کەسانەی
لەپێشدا کتێبی ئاسمانیمان پێ دابوون ﴿هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانە بڕوا دێنن بەقورئان ﴿٥٢﴾ ﴿وَإِذَا يُتْلَىٰ
عَلَيْهِمْ﴾ وە کاتێ (قورئان) بخوێنرێتەوە بەسەریان دا ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ﴾ دەڵێن باوەڕمان پێ هێناوە
﴿إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ﴾ بێگومان ئەم (قورئانە) ڕاستەو لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتووە ﴿إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ
مُسْلِمِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە لەپێش (هاتنی) قورئان دا موسڵمان بووین ﴿٥٣﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ﴾ ئەوانە
دووجار پاداشتیان پێ دەدرێ ﴿بِمَا صَبَرُواْ﴾ لەبەر ئەوەی خۆیان گرت و بەئارام بوون ﴿وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ
ٱلسَّيِّئَةَ﴾ بەچاکە بەرگری خراپەدەکەن ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ وە لەو ڕزق و ڕۆزی یەی پێمان داون
دەبەخشن ﴿٥٤﴾ ﴿وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُواْ عَنْهُ﴾ وە کاتێ قسەی ناپەسەند و هیچ و پوچ ببیستن پشتی
تێ دەکەن ﴿وَقَالُواْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ﴾ وە دەڵێن (بەنەفامان ئەنجامی) کردەوەکانمان بۆ خۆمانەو
(ئەنجامی) کردەوەکانی ئێوەش بۆ خۆتانە ﴿سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ سەلامتان لێ بێ ئێمە
هاوڕێیەتی نەفامانمان ناوێ ﴿٥٥﴾ ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ﴾ بەڕاستی (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆ ناتوانی
ئەو کەسەی خۆشت بوێ ڕێنموونی بکەیت ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ بەڵام خوا هەرکەسی
بوێ هیدایەتی دەدات ﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ﴾ و ئەو(خوایە) زاناترە بەوانەی ڕێنموونی وەرگرن ﴿٥٦﴾
﴿وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ﴾ وە(بێ باوەڕان) دەڵێن ئەگەر ئێمە شوێنی ڕێنموونی (ئەو ئایینە) بکەوین
کە بەتۆیە ﴿نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ﴾ دەفڕێندرێین لەخاك و وولاتماندا (ودەردەکرێین ومالْ وسامانمان
بەتاڵانی دەبرێت) ﴿أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا﴾ (جا خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە ودەفەرموێت)
ئایا ئێمە ئەوانمان جێگیر نەکردووە لەشارێکی پڕ ئەمن وئاسایشی (وەك شاری مەککە کە هەموو
کوشت وبڕ وخراپەکاریەکی تێدا قەدەغە وحەرامکراوە) ﴿يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ﴾ کۆدەکرێتەوەو
دەبرێ بۆ ئەوێ (شاری مەککە) هەموو جۆرە بەروبوومێك ﴿رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا﴾ بەڕۆزی دان لەلایەن
ئێمەوە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن و تێ ناگەن ﴿٥٧﴾ ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ﴾
وە(خەڵکی) زۆر شار و دێهاتمان لەناو برد ﴿بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا﴾ لەبەر خۆشگوزانیان یاخی بوون
(و سوپاسی چاکەکانی خوایان نەکرد) ﴿فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ﴾ جا ئەوە جێ و شوێنەکانیانە (وێران
کراوە) ﴿لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا﴾ لەپاش (تیا چوونی) ئەوان بۆ ماوەیەکی کەم نەبێ (لەلایەن
ڕێبوارانەوە) کەسی تیا نیشتەجێ نەبووە ﴿وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ﴾ وە ئێمە بووینە میراتگریان ﴿٥٨﴾
﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ﴾ وە پەروەردگارت هیچ شار و گوندێکی وێران نەکردووە ﴿حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ
أُمِّهَا رَسُولًا﴾ هەتا لەشارە گەورەکەیاندا پێغەمبەرێکی نەناردبێت ﴿يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا﴾ کە ئایەتەکانی
ئێمەیان بەسەردا بخوێنێتەوە ﴿وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ﴾ وە ئێمە وێران کەری هیچ گوند و شارێك
نەبووین ﴿إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ﴾ مەگەر کاتێ خەڵکەکەی ستەمکار بووبن ﴿٥٩﴾

﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ﴾ وە هەرچی بەئێوە دراوە ﴿فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتُهَاۚ﴾ ئەوە هۆی خۆشی و ڕابواردنی
ژیانی ئەم دونیا و جوانییەتی ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓۚ﴾ وە ئەو (پاداشـتە)ی لای خوایە باشترو نەبڕاوەیە
﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا ژیر نابن ﴿٦٠﴾ ﴿أَفَمَن وَعَدۡنَٰهُ وَعۡدًا حَسَنٗا﴾ ئایا کەسێ کەبەڵێنمان پێ داوە بەبەڵێنی
چـاك ﴿فَهُوَ لَٰقِيهِ﴾ ئەو کەسـە دەگـات بـەو (بەڵێنـە کەبەهەشـتە) ﴿كَمَن مَّتَّعۡنَٰهُ﴾ وەکو کەسـێك وایە
خۆشـی و ڕابواردنمان پێداوە ﴿مَتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ بەخۆشـی و لەزەتی ژیانی دونیا ﴿ثُمَّ هُوَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مِنَ
ٱلۡمُحۡضَرِينَ﴾ لەپاشـان لەڕۆژی دوایی دا لەئامادەکراوان دەبێ (بۆ سـزادان) ﴿٦١﴾ ﴿وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ﴾
(ئەی موحەممەد ﷺ) باسـی ئەو ڕۆژە بکە کە(خوا) بانگی ئەو (بت پەرسـت)انە دەکات و (پێیان)
دەفەرمـوێ ﴿أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ﴾ لەکوێـن ئـەو هاوبەشـانەی کەئێـوە بەخەیاڵـی خۆتـان
بەهاوبەشـی منتـان دەزانیـن ﴿٦٢﴾ ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ﴾ ئەوانـەی (سـەرۆکەکانی گومڕایی) کە
بڕیاری سزادان بەسەریان داچەسپا دەڵێن ﴿رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغۡوَيۡنَآ﴾ ئەی پەروەردگارمان ئا ئەوانەن کە
ئێمە گومڕامان کردن ﴿أَغۡوَيۡنَٰهُمۡ كَمَا غَوَيۡنَاۖ﴾ گومڕامان کردن هەروەکو خۆمان گومڕا بووین ﴿تَبَرَّأۡنَآ
إِلَيۡكَۖ﴾ ئێمـە بەری بوویـن (لەوانە بەری بوونەکەمان) لای تۆ دەکەین ﴿مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعۡبُدُونَ﴾ ئەوانە
ئێمەیان نەدەپەرست ﴿٦٣﴾ ﴿وَقِيلَ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ﴾ وە(پێیان) دەوترێ هاوار بکەن لەوبتانەی کەداتان نابوو
بەهاوبەشـی خـوا ﴿فَدَعَوۡهُمۡ فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ﴾ ئەوانیش هاواریـان لێ دەکەن بـەڵام وەڵامیان نادەنەوە
﴿وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۚ﴾ لەوکاتـەدا سـزا(ی دۆزەخ) دەبینـن ﴿لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ يَهۡتَدُونَ﴾ (ئـاوات دەخـوازن کـە)
خۆزگە تەنها ڕێگای ڕاستیان بدایەتەبەر ﴿٦٤﴾ ﴿وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ﴾ وە ڕۆژێ کە(خوا) بانگیان دەکات
و (پێیان) دەفەرموێ ﴿مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ چیتان وەڵامی پێغەمبەران دایەوە؟ ﴿٦٥﴾ ﴿فَعَمِيَتۡ عَلَيۡهِمُ
ٱلۡأَنۢبَآءُ يَوۡمَئِذٖ﴾ ئەمجـا لـەو ڕۆژەدا هەواڵەکانیـان (بەڵگەکانیان) لەبیـر دەچێتەوە ﴿فَهُمۡ لَا يَتَسَآءَلُونَ﴾
ئەوسـا پرسیاریش لەیەکتری ناکەن ﴿٦٦﴾ ﴿فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾ بەڵام ئەو کەسەی گەڕاوەتەوە
(لەبـێ باوەڕی)و باوەڕی هێناوەو کردەوەی چاکی کردووە ﴿فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلۡمُفۡلِحِينَ﴾ ئەوە بێگومان
لەڕزگار بووان دەبێ ﴿٦٧﴾ ﴿وَرَبُّكَ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخۡتَارُۗ﴾ وە پەروەردگارت (ئەی موحەممەد ﷺ) ئەوەی
بیەوێ دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێ ﴿مَا كَانَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُۚ﴾ (خەڵکی) هەڵبژاردنیان بۆ نیە (لەکاری
خوادا) ﴿سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ خوا پاك و بێگەرد و بەرز و بڵندە لەوەی دەیکەنە هاوبەشی
﴿٦٨﴾ ﴿وَرَبُّكَ يَعۡلَمُ﴾ وەپەروەردگارت دەزانێ ﴿مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ﴾ بەئەوەی لەسـینگیان
(دڵیان)دا دەیشـارنەوەو بە ئەوەشی ئاشکرای دەکەن ﴿٦٩﴾ ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ﴾ وە ئەو خوایە کەهیچ
پەرستراوێکی ڕاست نیە جگە لەو ﴿لَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأُولَىٰ وَٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ هەموو سوپاس تەنها بۆ خوا لەدونیاو
لەڕۆژی دواییشدا ﴿وَلَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ وە بڕیارو حوکم هەر بۆ ئەوە و هەمووتان تەنها بۆلای
ئەو دەگەڕێنرێنەوە (لەڕۆژی دواییدا) ﴿٧٠﴾

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ پێیـان) بڵـێ هەواڵـم بدەنێ ﴿إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا﴾
ئەگەر خوا شـەوتان بۆ درێژ بکاتەوە (هەر شـەوبێت) ﴿إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ تا ڕۆژی قیامەت ﴿مَنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ
ٱللَّهِ﴾ چ پەرستراوێکی تر جگە لەخوا ﴿يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ﴾ ڕووناکی (ڕۆژ)تان بۆ دێنێ ﴿أَفَلَا تَسْمَعُونَ﴾
دەی ئایا ئێوە نابیستن ﴿٧١﴾ ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾ (پێیـان) بڵێ پێـم بڵێن ﴿إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا﴾
ئەگـەر خوا ڕۆژ بکاتە هەمیشـەیی بۆتـان ﴿إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ تا ڕۆژی قیامـەت ﴿مَنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ﴾ کێیە
پەرسـتراوی تـر بێجگـە لەخـوا ﴿يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ﴾ کەشـەوتان بۆ دێنـێ ئارامـی تیا بگرن
﴿أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ دەی ئایـا ئێـوە نابینـن ﴿٧٢﴾ ﴿وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ لەبەزەیـی ئـەو
(خوایـە) کەشـەو ڕۆژی بۆ دروسـت کـردون ﴿لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ﴾ بۆ ئـەوە ئارام بگرن
لە(شـەو) داو بـۆ ئـەوە بگەڕێن بـەدوای ڕۆزی و بەهـرەی خوادا (لـەڕۆژدا) ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾
وە بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکەن (لەسەر ئەو نیعمەتانەی) ﴿٧٣﴾ ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ﴾ وە ڕۆژێ کە(خوا)
بانگیـان دەکات ئەمجـا (پێیـان) دەفەرمـوێ ﴿أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ﴾ لەکوێن هاوبەشـەکانی من ئەوانەی
﴿كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ کە ئێوە بە هاوبەشی منتان دادەنان ﴿٧٤﴾ ﴿وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا﴾ وە لەناو هەموو
ئوممەتێکدا شـایەتێك دەهێنین ﴿فَقُلْنَا هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ﴾ ئەمجا (بەبت پەرستان) دەڵێن بەڵگەتان بێنن
﴿فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ﴾ ئەوسـا دەزانـن بێگومان هەق و ڕاسـتی تایبەتی خوایە ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟
يَفْتَرُونَ﴾ ئـەوەی بـەدرۆ هەڵیان بەسـتبوو (کردبوویان بەپەرسـتراو جگە لە خوا) لێیـان گوم دەبێ
﴿٧٥﴾ ﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ﴾ بێگومـان قاروون لەگەلەکەی مووسـا بـوو (جوولەکە بوو) ﴿فَبَغَىٰ
عَلَيْهِمْ﴾ بـەڵام دەسـت درێـژی و سـتەمی لـێ دەکـردن ﴿وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ﴾ ئەوەندەمـان گەنج
(ئاڵتون و زیوو) پێدا بوو ﴿مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ﴾ کەبێگومان (هەڵگرتنی) کلیلەکانی (ئەو گەنج و قاسـانە)
﴿لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ﴾ بەزەحمەت هەڵدەگیـرا بۆ کۆمەڵێکی بەهێز ﴿إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ﴾ کاتێ
(ئیمانداران) گەلەکەی پێیان ووت دڵخۆش مەبە (بەو سامانە) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ﴾ بێگومان
خوا ئەو کەسـانەی خۆش ناوێ دڵخۆشـن(و لەخۆبایی بوون بەسـەروەت و سـامانەوە) ﴿٧٦﴾ ﴿وَٱبْتَغِ
فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ﴾ وە لـەو (گەنـج و سـامان)ەی خوا پێی داوی ئـەو دونیای پێ بـەدەس بێنە
﴿وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا﴾ وە بەشـی خۆیشـت لـەم دونیایە لەبیـر نەچێ ﴿وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ﴾
وە چاکە بکە (لەگەڵ خەڵکدا) هەرچۆنێ خوا چاکەی لەگەڵ تۆدا کردووە ﴿وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾
وە لەسـەر زەوی دا بەشـوێن خراپەدا مەگەڕێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ بەڕاستی خوا خراپەکارانی
خۆش ناوێت ﴿٧٧﴾

﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾ (قاروون) ووتی بێگومان ئەم سامانەم پێدراوە بەهۆی زانیاری یەکەوە
کە هەمە ﴿أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئایا (قاروون) نەیزانیوە کەبەڕاستی خوا ﴿قَدۡ أَهۡلَكَ مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ﴾
لەچەرخەکانی پێش ئەمدا لەناوی بردووە ﴿مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗاۚ﴾ کەسانی وا کە لەو
(قاروون) بەهێزتر بوون کوڕ و کۆمەڵیشیان لەو زۆر تربووە ﴿وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾
(کاتێك سزای خوا هات) پرسیار ناکرێ لەتاوانەکانی ئەم تاوانبارانە ﴿٧٨﴾ ﴿فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦۖ﴾
ئەمجا (قاروون) بەخۆ ڕازاندنەوە هاتەدەر بۆ ناو گەلەکەی ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا﴾ ئەوانەی
ژیانی دونیایان دەویست ووتیان ﴿يَٰلَيۡتَ لَنَا مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ﴾ ئای خۆزگە ئەوەندەی بەقاروون دراوە
ئێمەش بمان بوایە ﴿إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ﴾ بەڕاستی ئەو (قاروون) خاوەنی بەش و بەختێکی گەورەیە
﴿٧٩﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ﴾ بەڵام ئەو کەسانەی (باوەڕدار بوون) و زانستیان پێ درابوو ووتیان
﴿وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ﴾ هاوار بۆ ئێوە پاداشتی خوا (لەڕۆژی دواییدا) لەوە چاکترە ﴿لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ
صَٰلِحٗاۚ﴾ بۆ ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە ﴿وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ﴾
وە کەس ئەو (ووتەی زانایانە) وەرناگرێ جگە لەخۆڕاگران ﴿٨٠﴾ ﴿فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ﴾ ئەمجا
ئەو (قاروون) و کۆشکەکەیمان برد بەناخی زەوی دا ﴿فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٖ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ هیچ
دەستەیەکیشی نەبوو لەبەرانبەری (سزای) خوادا یارمەتی بدات ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُنتَصِرِينَ﴾ وە لەو
کەسانەش نەبوو بتوانێ خۆی ڕزگار بکات ﴿٨١﴾ ﴿وَأَصۡبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوۡاْ مَكَانَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ﴾ وە ئەوانەی دوێنێ
ئاواتیان دەخواست لەشوێن و پلەی ئەو (قاروون) دابن وایان لێ هات ﴿يَقُولُونَ وَيۡكَأَنَّ ٱللَّهَ﴾ دەیان
ووت وای وا دیارە خوا ﴿يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُۖ﴾ ڕۆزی زۆر دەکات بۆ هەرکەس خۆی
بیەوێ لە بەندەکانی کەمیش دەکاتەوە (بۆ هەرکەس خۆی بیەوێ) ﴿لَوۡلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا﴾ ئەگەر خوا
منەتی نەکردایە بەسەرمان دا ﴿لَخَسَفَ بِنَاۖ﴾ ئێمەشی دەبرد بەناخی زەوی دا ﴿وَيۡكَأَنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾
ئای لەم بەسەرهاتە سەرسوڕ هێنەرە، بێگومان ڕزگار نابن ئەوانەی شوکرانە بژێری چاکەی خوا نین
(کافرن) ﴿٨٢﴾ ﴿تِلۡكَ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ نَجۡعَلُهَا لِلَّذِينَ﴾ ئەوماڵی دوا ڕۆژە (بەهەشت) دەیدەین بەو کەسانەی
﴿لَا يُرِيدُونَ عُلُوّٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فَسَادٗاۚ﴾ نەبەرزی و خۆ بەزل زانی یان دەوێت لەزەوی دا نەدەست درێژی
و خراپەکاری ﴿وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ وە سەرئەنجامی چاك بۆ خۆپارێزانە ﴿٨٣﴾ ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ
مِّنۡهَاۖ﴾ هەر کەس کارێکی چاك بکات ئەوە (پاداشتی) چاکتر لەوەی بۆ هەیە ﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ﴾
هەرکەسیش خراپە بکات ﴿فَلَا يُجۡزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ ئەوە تۆڵە ناسەنرێ لەوانەی خراپەکانیان
کردووە ﴿إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ تەنها بە ئەندازەی ئەو کردەوانە نەبێت کەکردویانە ﴿٨٤﴾

﴿إِنَّ ٱلَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ﴾ بێگومان ئەو (خوایەی) کەقورئانی بۆ تۆ ناردووە (پێویست کردووە)
﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ دەتگێڕێتەوە بۆ مەککە ﴿قُل رَّبِّيٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ
پەروەردگارم زاناترە بەو کەسەی ڕێنموونیی (ئایینی ڕاستی) هێناوە ﴿وَمَنْ هُوَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ وە بەو
کەسەی لەگومڕایی یەکی ڕوون و ئاشکرادایە ﴿٨٥﴾ ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ﴾ وە تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ)
بەهیوا نەبوویت ﴿أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ﴾ کەئەم (قورئانە)ت بۆ بنێردرێ ﴿إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾ بەڵام
ڕەحمەتێك بوو لەلایەن پەروەردگاتەوە (بۆت نێردرا) ﴿فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ﴾ کەواتە هەرگیز
مەبە بەپشتیوان بۆ بێ بڕوایان ﴿٨٦﴾ ﴿وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ وە با (بێ بڕوایان) بەرگریت نەکەن
لە(گەیاندنی) ئایەتەکانی خوا ﴿بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ﴾ دوا ئەوەی دابەزێنراوە بۆت ﴿وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾
بانگی (خەڵك) بکە بۆلای پەروەردگارت ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ وە لەهاوبەش دانەران مەبە
﴿٨٧﴾ ﴿وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ وە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر مەپەرستە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ
پەرستراوێکی ڕاست وبەهەق نی یە جگە لەخوا ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ﴾ هەموو شتێك لەناو
دەچێ جگە لە ڕووی پیرۆزی ئەو نەبێت (لەم ئایەتە پیرۆزەدا جێگیر کردنی سیفەتی (وجه – ڕوو)
بۆ خوای گەورە هاتووە، بەڵام بەشێوەیەك کە شایستەی گەورەی وتەواوی زاتی خوا بێت، بەبێ هیچ
لێچواندن ولێکدانەوەیەك، بڕوامان پێیەتی وچۆنیەتیەکەی نازانین) ﴿لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ بڕیارو
حوکم تایبەتی خوایەو تەنها بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە ﴿٨٨﴾

## سورەتی ﴿العنكبوت﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓمٓ﴾ بە (ئەلیف ، لام ، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی بۆ زانیاری زیاتر سەیری
سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿١﴾ ﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ﴾ ئایا خەڵك وا دەزانن کەوازیان لێ
دەهێنرێ ﴿أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ ئەگەر بڵێن بڕوامان هێناوە ﴿وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ﴾ ئیتر ئەوان تاقی ناکرێنەوە ﴿٢﴾
﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ سوێند بەخوا بێگومان کەسانی پێش ئەوانمان تاقی کردەوە (ئەمانیش تاقی
دەکەینەوە) ﴿فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ﴾ ئەمجا بێگومان خوا ئەو کەسانەی ڕاستیان کرد دیاری دەکات
﴿وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ درۆزنەکانیش دیاری دەکات (دەناسرێن) ﴿٣﴾ ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾
یا ئەوانەی خراپەکان دەکەن وایان زانیووە ﴿أَن يَسْبِقُونَا﴾ کەلە دەستمان دەردەچن ﴿سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾
زۆر خراپە ئەو بڕیارەی دەیدەن ﴿٤﴾ ﴿مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ﴾ هەر کەس ئومێدی وایە بگات بەدیداری
خوا (با بەندایەتی خوا بکات) ﴿فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَءَاتٍ﴾ چونکە بەڕاستی کاتی دیاری کراوی خوا
هەردێت ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ وە تەنها خوایە بیسەری زاناو ئاگادار ﴿٥﴾ ﴿وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ﴾
وە هەرکەس جیهاد بکاو تێ بکۆشێ ئەوە تەنها بۆ خۆی تێ دەکۆشێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾
بەڕاستی خوا لە هەموو جیهانیان بێ نیاز و دەوڵەمەندە ﴿٦﴾

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ وە ئەوانـەی باوەڕیـان هێناوەو كردەوە چاكەكانیـان كردووە ﴿لَنُكَفِّرَنَّ
عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ﴾ بێگومـان خراپەكانیـان دەسـڕینەوە لێیان ﴿وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بەباشـتر
لـەوەی كەكردویانـە پاداشـتیان دەدەینـەوە ﴿٧﴾ ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا﴾ وە فەرمانمـان داوە
بەئادەمی كەچاكە لەگەڵ دایك و باوكی دا بكات ﴿وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي﴾ وە ئەگەر (دایك و باوكت)
هەوڵیـان لەگەڵ دای بۆ ئەوەی كەهاوبەشـم بۆ بڕیار بـدەی ﴿مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ كەهیچ زانیارییەكت
نـی یـە دەربـارەی ﴿فَلَا تُطِعْهُمَا﴾ ئەوە بەگوێیـان مەكە ﴿إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ﴾ تەنهـا بۆ لای منـە گەڕانەوەتان
(لـەدوا ڕۆژدا) ﴿فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەوسـا هەواڵتـان دەدەمـێ بـەو كردەوانـەی دەتانكرد ﴿٨﴾
﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ وە ئـەو كەسـانەی باوەڕیـان هێنـاوەو كـردەوەی چاكەیـان كـردووە
﴿لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِي الصَّالِحِينَ﴾ بێگومـان دەیان خەینە ڕیـزی پیاو چاكانەوە ﴿٩﴾ ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ﴾
هەنـدێ لەخەڵكـی دەڵێن باوەڕمان بەخوا هێناوە ﴿فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ﴾ ئەمجا كاتێ سـزا بدرێ لەپێناوی
خوادا (لەلایەن كافرانەوە) ﴿جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ﴾ ئازارو سـزای خەڵكی وەكو ئازارو سـزای
خـوا دادەنێ ﴿وَلَئِن جَاءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ﴾ وە ئەگـەر لەلایەن پەروەردگارتەوە سـەركەوتنێك بێت ﴿لَيَقُولُنَّ
إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ﴾ دڵنیابـە ئەوانـە دەڵێن بێگومـان ئێمە لەگەڵ ئێوەدا بوویـن ﴿أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ﴾ ئایا خوا
زاناو ئاگادارتر نیە ﴿بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ﴾ بەوەی لەدڵ و دەرونی هەموو كەس دایە ﴿١٠﴾ ﴿وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ
الَّذِينَ آمَنُوا﴾ سـوێند بـێ خوا چاك دەزانـێ ئەوانـەی باوەڕیان هێنـاوە كێن ﴿وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ﴾
وەچاك دەزانێ دووڕوانیش كێن ﴿١١﴾ ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەوانەی بێ بڕوابوون ووتیان
بەوانـەی ئیمان دار بوون ﴿اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا﴾ شـوێن ڕێگا و ڕێبـازی ئێمە بكەون ﴿وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ﴾
و تاوانەكانتـان بە ئەسـتۆی ئێمـە ﴿وَمَا هُم بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُم مِّن شَيْءٍ﴾ ئەوانە (بـێ بڕوایان) هیچێك
لەتـاوان و گوناهـی ئـەوان (بـاوەڕداران) هەڵناگرن ﴿إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـە درۆزنن ﴿١٢﴾
﴿وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ﴾ سـوێند بەخـوا (بێبـاوەڕان) بـاری گرانـی (كوفـرو تاوانی) خۆیـان هەڵدەگرن
﴿وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ﴾ وەبـاری گرانی (خەڵكانی) تریـش لەگەڵ باری گرانی خۆیـان دا (هەڵدەگرن)
﴿وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ وە بەڕاستی لەڕۆژی قیامەت دا پرسیاریان لێ دەكرێ ﴿عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾
لـەو درۆ و دەلەسـانەی لەدونیـادا هەڵیـان دەبەسـت ﴿١٣﴾ ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ﴾ سـوێند بەخـوا
نووحمان ناردبۆلای گەلەكەی (بە پێغەمبەری) ﴿فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا﴾ ئەمجا ئەویش
مایـەوە لەناویـان دا نۆسـەد و پەنجا سـاڵ (هەزار سـاڵ پەنجا كەم) ﴿فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ﴾
لەئاكامدا لافاو و زریان لەناوی بردن لەكاتێكدا ئەوان ستەمكار بوون ﴿١٤﴾

﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ﴾ ئەمجا ئەو (نووح) و كەسانێك لەكەشتییەكەدا بوون ڕزگارمان كردن
﴿وَجَعَلْنَٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ وە ئەو (كەشتی یە)مان كرد بەنیشانەیەك بۆ جیهانیان ﴿١٥﴾ ﴿وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ
لِقَوْمِهِ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ) باسی) ئیبراهیم بكە كاتێ بەگەلەكەی ووت ﴿ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ﴾
خوا بپەرستن ولێ ی بترسن ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەوە چاكترە بۆ ئێوە ئەگەر
ئێوە بزانن ﴿١٦﴾ ﴿إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا﴾ بەڕاستی ئێوە لەجیاتی خوا بتانێك دەپەرستن
﴿وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا﴾ وە ئێوە درۆیەكی گەورە هەڵدەبەستن ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی
ئەوانەی كەئێوە دەیان پەرستن بێجگە لەخوا ﴿لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا﴾ ناتوانن ڕزق و ڕۆزی ئێوە
بدەن ﴿فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ﴾ كەواتە داوای ڕزق و ڕۆزی لەخوا بكەن ﴿وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ﴾
وە ئەو بپەرستن و هەر سوپاسی ئەویش بكە ﴿إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ تەنها بۆلای ئەو دەگەڕێنرێنەوە
(لەقیامەتدا) ﴿١٧﴾ ﴿وَإِن تُكَذِّبُوا۟﴾ وە ئەگەر ئێوە باوەڕ نەهێنن ﴿فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ﴾ ئەوە
ئوممەتانی پێش ئێوەش باوەڕیان (بە پێغەمبەرەكانیان) نەهێنا ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾
وە پێغەمبەر تەنها ڕاگەیاندی ئاشكراو ڕوونی لەسەرە ﴿١٨﴾ ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟﴾ ئایا ئەوانە سەرنجیان نەداوە
﴿كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ﴾ كە چۆن خوا دروستكراوان بەدی دەهێنێت ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ﴾ لەپاش
(نەمان) دەیهێنێتەوە ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بێگومان ئەو (زیندوو كردنەوە) بۆ خوا ئاسانە ﴿١٩﴾
﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بڕۆن بگەڕێن بەزەوی دا ﴿فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ﴾
وسەرنج بدەن كەچۆن دروستكراوەكانی لەسەرەتاوە بەدی هێناوە ﴿ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْءَاخِرَةَ﴾ لەپاشان
هەر خوا بەدی هێنانی دوا ڕۆژیش بەدی دێنێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بەتوانایە
بەسەر هەموو شتێكدا ﴿٢٠﴾ ﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾ (خوا) سزای هەر كەسێك دەدات كەبیەوێ ﴿وَيَرْحَمُ
مَن يَشَآءُ﴾ وە ڕەحمیش دەكات بەهەر كەسێ كەبیەوێ ﴿وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ﴾ وەتەنها بۆ لای خوا
دەگەڕێنرێنەوە ﴿٢١﴾ ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ وە ئێوە ناتوانن لەدەست خوا دەربازبن ﴿فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى
ٱلسَّمَآءِ﴾ نە لەزەوی دا و نە لەئاسماندا ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ وە بۆ ئێوە نی یە جگە لەخوا ﴿مِن
وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ هیچ دۆست و یارمەتی دەرێك ﴿٢٢﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ﴾ وە ئەوانەی كە
بەنیشانەكانی خواو دیداری باوەڕیان نی یە ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ يَئِسُوا۟ مِن رَّحْمَتِى﴾ ئائەوانە لەبەزەیی من (خوا)
نائومێد دەبن ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە ئەوانە سزای بەسۆ وسەختیان بۆ هەیە ﴿٢٣﴾

﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ﴾ ئەمجا وەڵامی گەلەکەی ئەو (ئیبراهیم) تەنها ئەوە بوو کەووتیان
﴿ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ﴾ (ئیبراهیم) بکوژن یا بیسوتێنن ﴿فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ خواش ئەوی ڕزگار
کرد لەو ئاگرە ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ﴾ بێگومان لەو (ڕزگار کردنی ئیبراهیم)دا ﴿لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ چەند
نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ کەسانێ باوەڕ دەهێنن ﴿٢٤﴾ ﴿وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا﴾ وە (ئیبراهیم)
ووتی بێگومان ئەوەی ئێوە هەڵتان بژاردووە لەجیاتی خوا بتانێکن ﴿مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾
لەبەر خۆشەویستی نێوانتان لەژیانی دونیا (دەیانپەرستن) ﴿ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ﴾
لەپاشان لەڕۆژی دوایی دا هەندێکتان بێزاری دەردەبڕن لەهەندێکی ترتان (دان نانێن بەیەکتری دا)
﴿وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا﴾ وە نەفرین لەیەکتری دەکەن ﴿وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ﴾ جێگاشتان ئاگری
دۆزخە ﴿وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ وە هیچ یارمەتی دەرێکیشتان نی یە ﴿٢٥﴾ ﴿فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ﴾
ئەمجا لووط باوەڕی بەو (ئیبراهیم) هێنا ﴿وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ﴾ وە(ئیبراهیم) ووتی بێگومان
من کۆچ دەکەم بۆ لای پەروەردگارم (لە بابلەوە بۆ شام) ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بەڕاستی
تەنها ئەو زاڵی بەدەسەڵاتی کار دروستە ﴿٢٦﴾ ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ وە بەخشیمان بە ئەو
(ئیبراهیم) ئیسحاق(ی کوڕی) و یەعقوب (ی کوڕەزای) ﴿وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ﴾
وە پێغەمبەرێتی و کتێبمان بڕیاردا لەنەوەکانی (ئیبراهیم) دا ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا﴾ وە لەدونیادا
پاداشتمان دایەوە ﴿وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وە بەڕاستی ئەو لەڕۆژی دوایشدا لەپیاو چاکانە
﴿٢٧﴾ ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ﴾ (باسی) لووطیش بکە کاتێ بەگەلەکەی ووت ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ﴾
بێگومان ئێوە کارێکی ناشیرین و قێزەون دەکەن (کە نێربازیە) ﴿مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾
لەجیهاندا کەس پێش ئێوە ئەو کارەی نەکردووە ﴿٢٨﴾ ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ﴾ ئێوە نێربازی دەکەن
﴿وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ﴾ وە ڕێگا دەگرن (لە ڕێبواران) ﴿وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ﴾ وە لەنادی و شوێنی
کۆبونەوەتاندا هەموو خراپەیەك دەکەن ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ﴾ کەچی وەڵامی گەلەکەی تەنها
ئەوە بوو کە ووتیان (بە لووط) ﴿ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ﴾ سزای خوامان بۆ بێنە ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾
ئەگەر تۆ لەڕاست گۆیانی ﴿٢٩﴾ ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى﴾ (لووط) ووتی ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدە
(وزاڵم بکە) ﴿عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ بەسەر ئەو گەلە خراپەکارەدا ﴿٣٠﴾

﴿وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ﴾ وە کاتێـك نێراوەکانـی ئێمە مژدەی (بەخشـینی ئیسـماعیل)یان دا بەئیبراهیـم ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا مُهۡلِكُوٓاْ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِۖ﴾ ووتیـان بێگومـان ئێمـە لەناوبـەری دانیشـتوانی ئەم شارەین (سەدوم) ﴿إِنَّ أَهۡلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ﴾ بەڕاسـتی دانیشتوانەکەی ستەمکار بوون ﴿٣١﴾ ﴿قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ﴾ (ئیبراهیـم) ووتی بێگومـان لووط لەو (شـارە) دایە ﴿قَالُواْ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ﴾ ووتیان ئێمـە چـاك دەزانین کێـی لێیە ﴿لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ﴾ سـوێند بەخـوا ئێمە لـووط و ئەندامانی خێزانەکـەی ڕزگـار دەکەین جگـە ژنەکەی ﴿كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ﴾ کـە لەجێمـاوان (تیاچووان) دەبێـت ﴿٣٢﴾ ﴿وَلَمَّآ أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا﴾ کاتـێ نێراوەکانمـان هاتـن بـۆ لای لـووط ﴿سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗاۖ﴾ پێیـان تێکچـوو و زۆر دڵ تەنـگ و ناڕەحـەت بـوو ﴿وَقَالُواْ لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡ﴾ ووتیان مەترسە خەم مەخۆ (چونکە) ﴿إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ﴾ بێگومان ئێمە تۆ و خێزانەکەت ڕزگار دەکەین جگەلە ژنەکەت نەبێت ﴿كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ﴾ کەئەو لەجێماوان (تیاچووان) دەبێت ﴿٣٣﴾ ﴿إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ﴾ بەڕاسـتی ئێمە دەبارێنین بەسەر دانیشتوانی ئەم شارەدا ﴿رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ سـزایەك لەئاسـمانەوە ﴿بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ﴾ لەبـەر ئـەوەی لەسـنوورو فەرمانـی (خـوا) دەرچـوون ﴿٣٤﴾ ﴿وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ﴾ سـوێند بەخوا بێگومان لەو شـارە (وێـران کراوەدا) نیشـانە وپەندێکـی دیارمـان بەجـێ هێشـت ﴿لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ بـۆ گـەل و کۆمەڵـێ کەژیربـن ﴿٣٥﴾ ﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا﴾ وەبۆ خەڵکی مەدیەنیش شوعەیبی برایانمان (نارد) ﴿فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ ووتـی ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن ﴿وَٱرۡجُواْ ٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ﴾ و بەهیواو ئومێـدی ڕۆژی دوایی بن ﴿وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ﴾ وەخراپەکاری ڕۆچوو مەبن لەزەوی دا ﴿٣٦﴾ ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ﴾ بـەڵام ئـەوان باوەڕیان پـێ نەهێنا ئەوسـا بوومەلـەرزە بەتینەکە گرتنی (لێـی دان) ﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾ بەهـۆی ئـەوەوە لە خانووەکانـی خۆیاندا ئەژنۆیان دا دابـوو مردن ﴿٣٧﴾ ﴿وَعَادٗا وَثَمُودَاْ﴾ وە گەلـی عـاد و سەموودیشـمان (لەنـاو بـرد) ﴿وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمۡۖ﴾ بەڕاسـتی (ئەولەناوبردنە) ڕوونبووەتەوەبۆتان لەشوێنەوارە (وێرانە) کانیانەوە ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ شـەیتان کـردەوە خراپەکانیانـی بـۆ ڕازاندبوونـەوە ﴿فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسۡتَبۡصِرِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە بەرگری کردن لەڕێگای ڕاسـت لەکاتێکدا ئەوان توانای بیر کردنەوەیان هەبوو (ژیر بوون) ﴿٣٨﴾

﴿وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ﴾ هەروەها قاروون و فیرعەون و هامانیشـمان (لەناو برد) ﴿وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاستی مووسـا هات بۆ ناویان بەچەند موعجیزەیەکەوە ﴿فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بەڵام ئەوان خۆیان بەگەورە زانی لەزەویدا ﴿وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ﴾ نەشیانتوانی لەدەستمان دەرچن ﴿٣٩﴾ ﴿فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦ﴾ ئەوسـا ئێمە هەریـەك لەوانمان بەتاوانی خۆی سـزادا (لەناومان بـردن) ﴿فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا﴾ جـا هەندێکیان بایەکی بەهێزمان نارده سـەریان بەورده بەردەوە ﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ﴾ وە هەندێکی تریان پیاهەڵشـاخانێك و دەنگێکی گەورە لەناوی بردن ﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ﴾ وەهەندێکیشیانمان بەناخی زەوی دابردە خوارەوە ﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَاۚ﴾ وە هەندێکـی ترمـان لـەوان لەدەریـادا نوقم کرد ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ﴾ خوا ستەمی لـێ نەکردن ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾ بەڵکـو خۆیـان سـتەمیان لەخۆیـان کـرد ﴿٤٠﴾ ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ﴾ وێنـەی کەسـانێ کەبێجگـە لەخـوا پەرسـتراوانێك بـۆ خۆیـان دادەنێـن ﴿كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ﴾ وەکـو جاڵجاڵۆکـە وایـە کەماڵێکـی (بۆ خۆی) ڕەخسـاندووە ﴿وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِۚ﴾ کـە بەڕاسـتی لاوازترین مـاڵ ماڵـی جاڵجاڵۆکەیە ﴿لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر بزانـن ﴿٤١﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ﴾ بێگومان خوا دەزانێ ﴿مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ﴾ ئەوان لەجیاتی خواچی دەپەرستن وهاواری لێ دەکەن ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ وهەر ئەو(خوایە) زاڵی بەدەسەڵاتی کار دروست ﴿٤٢﴾ ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ﴾ ئەو وێنەو نموونانە بۆ خەڵکی دێنینەوە ﴿وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ﴾ تەنهـا زانایـان لەوانـە تێدەگـەن ﴿٤٣﴾ ﴿خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ﴾ خـوا ئاسـمانەکان و زەوی بەحـەق و ڕاسـتی دروسـت کـردووە ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بەڕاسـتی لـەوەدا بەڵگـە هەیـە بـۆ بـڕواداران ﴿٤٤﴾ ﴿ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ بیخوێنـەرەوە ئـەو قورئانـەی کەوەحـی کراوە بـۆت ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ﴾ وە نوێـژ بکە ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ﴾ بێگومـان نوێـژ بەرگـری (نوێژگـەر) دەکات لەکاری ناشـیرین و ناپەسـەند (خراپە) ﴿وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ﴾ وە زیکر و یادی خوا گەورەترە (لەهەموو شـتێك) ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ﴾ خواش دەزانێت بەهەر کارێك کە ئێوە دەیکەن ﴿٤٥﴾

﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ دەمەقاڵێ و موجادەلـە مەکـەن لەگـەڵ خاوەنـی کتێبـە ئاسـمانییەکاندا ﴿إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ﴾ بـە جوانتریـن شـێوە نەبێـت ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ﴾ جگـە لەوانەیـان کـە ستەمیان کرد (لە ئێوە) ﴿وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا﴾ وە (بە خاوەن کتێبـەکان) بڵێن باوەڕمان هێناوە بـەوەی نێردراوەتـە خـوارەوە بـۆ ئێمـە ﴿وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ﴾ و (بـەوەش) نێردراوەتـە خـوارەوە بـۆ ئێوە ﴿وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ﴾ وە خـوای ئێمـە و خـوای ئێـوە یەکێکـە ﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ وە ئێمە بۆ ئەو (خوا) گەردن کەچین ﴿٤٦﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ﴾ هەروەك (پێغەمبەرانی پێشوو) قورئانمان بـۆ تـۆ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) ناردەخـوارەوە ﴿فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ جـا ئـەو کەسانەی کـە کتێبمـان پێداون ﴿يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ﴾ (هەندێکیان) باوەڕ بەو (قورئانە) دەهێنن ﴿وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ﴾ وە لەمانەش (بت پەرستەکانی عەرەب) کەسانێ بڕوای پێ دەهێنێت ﴿وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ تەنهـا بێ باوەڕانی (ڕۆچوو) دان نانێن بە ئایەتەکانی ئێمەدا ﴿٤٧﴾ ﴿وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ﴾ وە تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) پێش ئەم (قورئانە) هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە ﴿وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ﴾ وە بەدەستی ڕاستت نەتنوسیووە ﴿إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ﴾ (ئەگـەر وابوایە) ئـەو کاتە ناڕاستەکان (بێ بڕوایان) دەکەوتنە گومانەوە ﴿٤٨﴾ ﴿بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ﴾ (نەخێر وا نییە گومان دەبەن) بەڵکو قورئان نیشـانەکانی ئاشـکران ﴿فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ﴾ لە دڵ و دەرونی کەسـانێکدایە کە زانستیان پێ دراوە (لە لایەن خواوە) ﴿وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ تەنیا سـتەمکاران دان نانێن بە نیشـانەکانی ئێمـەدا ﴿٤٩﴾ ﴿وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ﴾ وە ووتیـان ئـەوە بـۆ چەنـد موعجیـزە و بەڵگەیـەك دانابەزێنـرێ بـۆ سـەری (موحەممـەد ﷺ) لەلایـەن پەروەردگاریـەوە ﴿قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ بڵێ (پێیـان هێنانە خـوارەوەی) موعجیـزەکان تەنیا لەلایەن خواوەیە ﴿وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ﴾ وە بەڕاسـتی مـن تەنهـا ترسـێنەرێکی ئاشـکرام ﴿٥٠﴾ ﴿أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ﴾ ئایـا بـۆ ئـەوان بـەس نییـە ﴿أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ کـە ئێمە قورئانمـان ناردۆتە خوارەوە بۆ سـەر تـۆ، دەخوێنرێتەوە بەسـەریاندا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بەڕاسـتی لـەم قورئانـەدا بەزەیـی و پەنـد و ئامۆژگاری هەیە بۆ باوەڕداران ﴿٥١﴾ ﴿قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ﴾ بڵێ (پێیان) خوا بەسە ﴿بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدٗاۖ﴾ بۆ شایەتی دان لەنێوان مـن و ئێـوەدا ﴿يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ﴾ ئـەوەی لەئاسـمانەکان و زەویدایـە دەیزانێ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ﴾ وە کەسانێ کە باوەڕیان هێناوە بە بەتاڵ و بێ باوەڕبوون بەخوا ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ تەنها ئەوانەن زەرەرمەندان ﴿٥٢﴾

﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ﴾ بـە پەلـە داوای (هێنانـی) سـزات لـێ دەكەن ﴿وَلَوْلَآ أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَآءَهُمُ ٱلْعَذَابُ﴾
ئەگەر ماوەی دیاری كراو نەبوایە (بۆ سـزادانی ئەوانە) بێگومان سـزاكەیان بۆ دەهات ﴿وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً
وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ وە بەڕاستی لەناكاودا ئەو سزایەیان بۆ دێ كە ئەوان هەستی پێ ناكەن (٥٣) ﴿يَسْتَعْجِلُونَكَ
بِٱلْعَذَابِ﴾ بە پەلە لە تۆ داوای (هێنانی) سـزا دەكەن ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ﴾ كە بەڕاستی دۆزەخ
دەوری كافرانـی داوە (٥٤) ﴿يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ﴾ لەڕۆژێكـدا سـزا دایـان دەپۆشـێ ﴿مِن فَوْقِهِمْ وَمِن
تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ﴾ لـەلای سـەریانەوە و لە ژێـر پێیانەوە ﴿وَيَقُولُ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ وە (خـوا) دەفەرموێ:
بچێـژن تۆڵەی ئـەو كردەوانەی كە لە دونیـادا دەتان كرد (٥٥) ﴿يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئـەی بەندەكانم كە
باوەڕتـان هێنـاوە ﴿إِنَّ أَرْضِى وَٰسِعَةٌ﴾ بێگومان زەوی مـن پان و فراوانـە ﴿فَإِيَّٰىَ فَٱعْبُدُونِ﴾ كەواتە هەر
مـن بپەرسـتن (٥٦) ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۖ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ هەمووكـەس مـردن دەچێـژێ و دەمـرێ
پاشـان بـۆ لای ئێمـە دەگەڕێنرێنـەوە (٥٧) ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە كەسـانێ كـە باوەڕیـان
هێنـاوە و كردەوە چاكەكانیان كردووە ﴿لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ غُرَفًا﴾ سـوێند بەخوا لەكۆشـكە بەرزەكانی
بەهەشـتدا نیشـتەجێیان دەكەیـن ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ كـە ڕووبـارەكان بەژێریانـدا دێـن و دەچن
﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ نِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ﴾ بـێ بڕانـەوە تیایـدا دەمێننەوە ئای چەنـد چاكە پاداشـتی چاكەكاران (٥٨)
﴿ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ئەوانـەی دانیـان بـە خۆیاندا گرت و تەنها پشـتیان بـە پەروەردگاریان
بەست (٥٩) ﴿وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا﴾ زۆر گیان لەبەر (زیندەوەر) هەیە ڕۆزی خۆی هەڵناگرێ
و كۆی ناكاتەوە (بۆ داهاتوو) ﴿ٱللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ ۚ﴾ خوا ڕۆزی ئەو (گیان لەبەرانەو) و ئێوەیش دەدات
﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ وە هـەر ئـەوە بیسـەری زانـا (٦٠) ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ سـوێند
بەخـوا ئەگـەر پرسـیار لـەو (بـێ باوەڕانـە) بكەیـت كـێ ئاسـمانەكان و زەوی دروسـت كـردووە
﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ و ڕۆژ و مانگـی ڕامهێنـاوە وخسـتویەتیە خزمەتیانەوە ﴿لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾
بێگومـان دەڵێـن خـوا دەی كەواتە چۆن (لە پەرسـتنی خـوا) لادراون (٦١) ﴿ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ
عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥٓ ۚ﴾ خـوا ڕۆزی فـراوان دەكات بۆ هەر كەس لە بەنـدەكان كە بیەوێ یا بۆی كەم دەكات
﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خوا بەهەموو شتێك زانایە (٦٢) ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم﴾ وە ئەگەر پرسیاریان لێ
بكەیت ﴿مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ كێ لەئاسمانەوە باران دەبارێنێ ﴿فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ مَوْتِهَا﴾ ئەمجا
بـەو بارانە زەوی مردووی پـێ زیندوو دەكاتەوە ﴿لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ﴾ بێگومـان دەڵێن خوا ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ﴾
(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ هەموو سـوپاس هەر بۆ خوایە ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان
ژیریان بەكار ناهێنن (٦٣)

﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ﴾ وە ژیانـی ئەم دونیایە تەنها رابواردنێکی بێ هودە و یاری (منالآنە)
﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ﴾ وە بەڕاستی ماڵی قیامەت هەر ئەوەیە ژیانی (ڕاستەقینە) ﴿لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾
ئەگەر ئەوان بیانزانیایە ﴿٦٤﴾ ﴿فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ﴾ ئەمجا کاتێ ئەو (بێ باوەڕانە) سوار کەشتی دەبن ﴿دَعَوُا۟
ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ (و ترسان لە نوقم بوون) تەنها هاوار لە خوا دەکەن بە دڵسۆزی و گەردن کەچیەوە
﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ﴾ کەچـی کاتـێ خـوا ڕزگاریـان دەکات و دەگەنەوە ووشـکانی ﴿إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ﴾
کتوپڕ ئـەوان هاوبـەش بۆ خوا دادەنێن ﴿٦٥﴾ ﴿لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟﴾ (وازیـان لێ بهێنە)با دان
نەنێـن بەوەی ئێمـە پێماندان، وە لەزەت ببەن لە ژیان ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ جا لەمەولا دەزانن (ئەنجامی
ئـەو کـردەو خراپانەیان چـی دەبێ) ﴿٦٦﴾ ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟﴾ ئایا نەیـان زانیوە و سـەرنجیان نەداوە ﴿أَنَّا جَعَلْنَا
حَرَمًا ءَامِنًا﴾ کە ئێمە (شـاری مەککە) مان کردۆتە جێگایەکی ڕێز گیراوی بێ ترس وپڕ ئاساشـیش
﴿وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ﴾ لە کاتێکدا لە دەوروبەری ئەواندا خەڵك دەفڕێنرێت ﴿أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ﴾
دەی ئایا باوەڕ بە بەتاڵ دەهێنن ﴿وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ﴾ وە سپڵە وپێ نەزانن بەرامبەر نیعمەتەکانی خوای
گەورە ﴿٦٧﴾ ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستێ
﴿أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ﴾ یا باوەڕ نەهێنێ بەئایینی ڕاست کاتێ بۆی هات ﴿أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ﴾
ئایـا جێگـای مانەوە بۆ بـێ بڕوایان لە دۆزەخدا نیە ﴿٦٨﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا﴾ وە کەسـانێ کە لە پێناو
ڕەزامەنـدی ئێمەدا تێکۆشـانیان کردووە ﴿لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ بەڕاسـتی ڕێنموونیـان دەکەین بۆ ڕێگا
چاکەکانی خۆمان ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ وە بێگومان خوا لەگەڵ چاکەکاراندایە ﴿٦٩﴾

## سورەتی ﴿ٱلرُّومِ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓمٓ﴾ بـە (ئەلیـف، لام، میـم) دەخوێنرێتـەوە خـوا زاناتـرە بەماناکـەی بـۆ زانیاری زیاتر سـەیری
سـەرەتای سـورەتی (البقرة) بکـە ﴿١﴾ ﴿غُلِبَتِ ٱلرُّومُ﴾ ڕۆم شـکێنران و ژێرکەوتـن (فـارس زاڵ بـوو
بـە سـەریاندا) ﴿٢﴾ ﴿فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ﴾ لە نزیـك ترین خاکیان (لـە مەککەوە یا لە وڵاتی فارسـەوە)
﴿وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ﴾ وە ڕۆمـەکان دوای تێشـکانیان ﴿سَيَغْلِبُونَ﴾ لـە داهاتـوودا سـەر دەکـەون
(بەسـەر فارسـەکاندا) ﴿٣﴾ ﴿فِى بِضْعِ سِنِينَ﴾ لـە مـاوەی چەنـد سـاڵێکدا (لـە نێـوان ٣ تـا ٩ سـاڵدا)
﴿لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ﴾ هەمـوو کاروبـار تەنهـا بـە دەسـت خوایـە لەپێش(سـەرکەوتن)
ولـەدوا (سـەرکەوتنیش) ﴿وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ وە لـەو ڕۆژەی (ڕۆمـەکان سـەردەکەون)
ئیمانـداران دڵخـۆش دەبـن (چونکـە ڕۆمـەکان خـاوەن نامـەی ئاسـمانی بـوون) ﴿٤﴾ ﴿بِنَصْرِ ٱللَّهِ﴾
بەسەرخسـتنی خـوا (بـۆ ڕۆمـەکان) ﴿يَنصُرُ مَن يَشَآءُ﴾ خـوا هـەر کەسـی بوێـت سـەریدەخات
﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ وەهەرئەوزاڵی باڵادەستی میهرەبانە ﴿٥﴾

﴿وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ﴾ ئەوە بەڵێنی خوایە (کە ڕۆمەکان سەربخات) خوایش پێچەوانەی بەڵێنی
خۆی نـاکات ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بـەڵام زۆربـەی خەڵـك نازانـن ﴿٦﴾ ﴿يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا﴾ تەنهـا ڕواڵەتـی ئەم ژیانی دونیا دەزانن ﴿وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ﴾ بـەڵام بێ ئاگان لە ڕۆژی
دوایـی ﴿٧﴾ ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ﴾ ئایـا ئەوانـە لە دەروونـی خۆیاندا بیریـان نەکردۆتەوە ﴿مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ﴾ کە خوا ئاسـمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە دروستی نەکردووە
﴿إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ﴾ بەهەق و ڕاسـتی نەبێت، وە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾
بێگومـان زۆرێك لە خەڵك ﴿بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ﴾ باوەڕیان نیە بە خزمەت پەروەردگاریان بگەن
(لەدوا ڕۆژدا) ﴿٨﴾ ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئایائەوان بەسەر زەویدانە گەڕاون ﴿فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ
مِن قَبْلِهِمْ ۚ﴾ بـۆ ئـەوەی ببینن سـەرئەنجام ئەو (گەلانـەی کافر بوون) لە پێش ئەمـان چۆن بووە ﴿كَانُوٓا۟
أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً﴾ کـە زۆر بەهێزتـر بـوون لـە ئەمان (لـە خەڵکـی مەککـە) ﴿وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ﴾ و زەوییان
کێـڵا (بۆ کشـت و کاڵ) ﴿وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا﴾ و ئاوەدانیان کـردەوە زیاتر لەمان ﴿وَجَآءَتْهُمْ
رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ﴾ وە پێغەمبەرانیـان بـۆ هـات بـە موعجیـزە ڕوونەکانەوە ﴿فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ﴾
بۆیە خوا سـتەمی لێ نەکـردوون (کە لەناوی بـردوون) ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵام خۆیان
سـتەمیان لە خۆیان کرد ﴿٩﴾ ﴿ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ﴾ پاشـان چارەنوسی ئەوانەی کەتاوان
و خراپەیان کرد سـەخترین سـزایە (کەدۆزەخە) ﴿أَن كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ لەبەر ئەوەی باوڕیان نەهێنا
بـە ئایەتەکانـی خـوا ﴿وَكَانُوا۟ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ﴾ و هەمیشـە گاڵتەیان پـێ دەکـرد ﴿١٠﴾ ﴿ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ﴾ خـوا
لەسەرەتاوە (ئادەمی) دروستکرد ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ وە لە پاش (مردنیش) دروستی دەکاتەوە ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾
پاشـان بـۆ لای ئـەو (خـوا) دەگەڕێنـەوە ﴿١١﴾ ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ﴾ وە ئـەو ڕۆژەی قیامـەت هەڵدەسـێ
﴿يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ تاوانبـاران غەمبار و نائومێـد دەبن ﴿١٢﴾ ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَٰٓؤُا۟﴾ بێگومان لە
ناو پەرسـتراوەکانیاندا تکاکارانێـك نیە بۆ ئەوان ﴿وَكَانُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ كَٰفِرِينَ﴾ و ئەوان بێ باوەڕ
دەبـن بە پەرسـتراوەکانیان (کە کردبوونیان بە هاوبەشـی خـوا) ﴿١٣﴾ ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ﴾ ئەو ڕۆژەی
کـە قیامەت هەڵدەسـێ ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ﴾ (خەڵك) لەو ڕۆژەدا جیادەبنـەوە لەیەکتر ﴿١٤﴾ ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەمجا کەسـانێ کەباوەڕیـان هێناوەو کـردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿فَهُمْ فِى
رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ﴾ ئەوان لە بەهەشتدا دڵخۆش دەکرێن ﴿١٥﴾

﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ﴾ بـەڵام ئەوانـەی بێباوەڕ بـوون و دانیان نەدەنا ﴿بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾
بەنیشانەکانی ئێمە و گەیشتن بەڕۆژی دوایی ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ﴾ ئا ئەوانە لە سزا(ی دۆزەخ)
دا ئامادە دەکرێن ﴿١٦﴾ ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ﴾ ئەمجا پاك و بێگەردی خوا بڵێن ﴿حِينَ تُمۡسُونَ وَحِينَ تُصۡبِحُونَ﴾ کاتێ
ئێوارەتان لێ دێت، وە کاتێ بەیانیتان لێ دەبێتەوە ﴿١٧﴾ ﴿وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ وە سوپاس هەر
بۆ خوایە لە ئاسـمانەکان و زەویدا ﴿وَعَشِيّٗا وَحِينَ تُظۡهِرُونَ﴾ وە(پاکی و بێگەردی خوا بڵێن) لەشـەودا
و کاتـێ نیـوە ڕۆتـان لـێ دێـت ﴿١٨﴾ ﴿يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ﴾ (خوا) زینـدوو لەمردوو
دەردێنـێ و مـردوو لەزینـدوو دەردێنـێ ﴿وَيُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ﴾ وە زەوی زیندوو دەکاتـەوە لەپاش
مردن و وشـك بوونی ﴿وَكَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ﴾ وە هەر بەوجۆرە ئێـوەش دەردەهێنرێن (لە گۆڕەکانتان) ﴿١٩﴾
﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ﴾ لە نیشـانەکانی ئـەو (خوایە) کە ئێوەی لە خاك دروسـت کردووە
﴿ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ﴾ لـە پـاش (ماوەیـەك) کتوپڕ ئێوە ئادەمیـن و بڵاوبوونەتـەوە لە زەویدا ﴿٢٠﴾
﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم﴾ وە لەنیشـانەکانی ئەوە (نیشـانەکانی خوایە) کە بۆی دروسـت کردوون
﴿مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا﴾ لە(ڕەگـەزی) خۆتان هاوسـەرانێك بۆ ئەوەی ئـارام بگرن لە لایان
دا ﴿وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ﴾ وە خۆشەویسـتی و بەزەیی خسـتۆتە نێوانتان ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ
يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڕاستی لەوەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێ کەبیردەکەنەوە ﴿٢١﴾ ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ
خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ وە لـە نیشـانەکانی (دەسـەڵاتی) ئەوە دروسـت کردنی ئاسـمانەکان و زەوی
﴿وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ﴾ وجیاوازی زمانتان و ڕەگەزتان ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ﴾ بەڕاسـتی
لەوەدا (باسکرا) بەڵگەی زۆر هەیە بۆ زانایان ﴿٢٢﴾ ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ وە لە نیشانەکانی
ئـەوە، خەوتنتـان بـە شـەو و ڕۆژدا ﴿وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ﴾ و هەوڵدانتـان (لـە ڕۆژدا) بـۆ بەهـرە
وەرگرتـن لە بەخششـی (ڕۆزی) خوا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ﴾ بەڕاسـتی لـەوەدا بەڵگەو
نیشـانەی زۆر هەیـە بـۆ کۆمەڵـێ ببیسـتن ﴿٢٣﴾ ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا﴾ لـە نیشـانەکانی
(خوایە) کەهەورە بروسکەتان نیشان دەدات بۆ ترسان و ئومێد (ترسان لە هەورە بروسکە و ئومێدی
بارانبارین) ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ لەئاسـمانەوە بـاران دەبارێنـێ ﴿فَيُحۡيِۦ بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ﴾ کـە
زەوی دوای مردنی بە هۆی ئەو بارانەوە دەبوژێنێتەوە ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاسـتی لەوەدا (کەباسـکرا)
﴿لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ چەند بەڵگە و نیشانە هەیە بۆئەوانەی ژیریان بەکار دەهێنن ﴿٢٤﴾

﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ﴾ وە لەنیشانەکانی ئەوە ﴿أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ بِأَمۡرِهِۦۚ﴾ کەئاسمان و زەوی بەفەرمانی ئەو
وەستاون ﴿ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمۡ دَعۡوَةٗ مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ پاشان کاتێ (لەڕۆژی دواییدا) لە زەوی یەوە بانگتان دەکەن
﴿إِذَآ أَنتُمۡ تَخۡرُجُونَ﴾ یەکسەر ئێوە (لە گۆڕەکانتان) دێنە دەرەوە ﴿٢٥﴾ ﴿وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ ئەوەی
لە ئاسمانەکان و زەویدایە تەنها هی خوایە ﴿كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ هەموویان هەر بۆ ئەو (خوا) گەردن
کەچن ﴿٢٦﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ﴾ ئەو (خوا) زاتێکە بەدی هێنانی دەس پێکردووە ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾
لەپاشان (دوا مردنی) دووبارە دروستی دەکاتەوە ﴿وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ﴾ ئەم (دروست کردنەوەی دووەم)
لای خوا ئاسان ترە ﴿وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ و هەر بۆ ئەوە (هەموو) سیفەتێکی بەرزو
بڵند لە ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ و هەر ئەوە زاڵی کار دروست ﴿٢٧﴾ ﴿ضَرَبَ لَكُم
مَّثَلٗا مِّنۡ أَنفُسِكُمۡۖ﴾ (خوا) نموونەیەکتان لەخودی خۆتاندا بۆ دەهێنێتەوە ﴿هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتۡ
أَيۡمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ﴾ ئایا لە بەندەکانتان دا هاوبەشانێك هەیە بۆ ئێوە ﴿فِي مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ فَأَنتُمۡ فِيهِ
سَوَآءٞ﴾ لەو ڕۆزی و سامانەی بە ئێوەمان دا بوو بە جۆرێ ئێوەو ئەو بەندانە تیایدا یەکسان بن
﴿تَخَافُونَهُمۡ كَخِيفَتِكُمۡ أَنفُسَكُمۡۚ﴾ و لەوان دەترسن (حسابیان بۆ بکەن) وەکو ترستان لە کەسانی وەك
خۆتان ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ ئا بەو جۆرە نیشانەکان ڕوون دەکەینەوە (بەدرێژی باسی دەکەین)
﴿لِقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ بۆ کەسانێ ژیریان بەکار دەهێنن ﴿٢٨﴾ ﴿بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم﴾ (وازیان لێ
بێنە) بەڵکو ئەوانەی ستەمیان کردشوێن ئارەزووی خۆیان کەوتن ﴿بِغَيۡرِ عِلۡمٖۖ﴾ بێ شارەزایی و نەزانانە
﴿فَمَن يَهۡدِي مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ﴾ ئەمجا کێ (دەتوانێ) ڕێنموونیی کەسێ بکات کە خوا گومڕای کردبێ
﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ لە کاتێکدا بۆئەوان هیچ یارمەتی دەرێك نییە ﴿٢٩﴾ ﴿فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗاۚ﴾
کەواتە ڕووی خۆت ڕێك بکەرە ئاینی ئیسلام وپاك و ڕاست بۆ خوا ﴿فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ﴾
(شوێن ئاینی) یەکتاپەرستی بکەوە، ئەو ئاینەی کەخوای گەورە (لەسەرەتاوە) فترەتی پاکی
مرۆڤی لەسەر دروست کردووە ﴿لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِۚ﴾ ئاین ودروستکراوەکانی خوا هیچ جۆر
گۆڕانی بۆ نی یە ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾ ئەو (ئایینەی باسکرا) هەر ئەوە ئایینی ڕێك و ڕاستە
﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانن ﴿٣٠﴾ ﴿مُنِيبِينَ إِلَيۡهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُواْ
ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بەتۆبەکاریەوە شوێن ئاین بکەون، وە بۆلای خوا بگەڕێنەوە و هەر لەویش بترسن،
وە بەچاکی نوێژەکانتان ئەنجام بدەن ﴿وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ و لە هاوبەش دانەران مەبن ﴿٣١﴾
﴿مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ﴾ لەوانەی کە ئایینەکەیان بەش بەش کرد ﴿وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ﴾ و بوون بە چەند کۆمەڵ
ودەستەیەکەوە ﴿كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ﴾ هەر کۆمەڵێکیان بەو (ئایینەی) خۆیان دڵخۆشن ﴿٣٢﴾

﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ﴾ وە هـەر کاتێ زیان (وگرانی و بـێ بارانی) بکەوێ لەخەڵکی (هاوبەش دانەر بۆ
خوا) ﴿دَعَوۡاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيۡهِ﴾ هاوار بۆ پەروەردگاریان دەبەن و بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە ﴿ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنۡهُ
رَحۡمَةً﴾ پاشان کاتێ لەلایەن خۆیەوە ڕەحمەت وژیانی خۆشیان پێ بدات ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنۡهُم﴾ کتوپڕ دەستەیەك
لەوان ﴿بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ﴾ هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن ﴿٣٣﴾ ﴿لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡۚ﴾ (لێیان گەڕێ)
با سپڵە وپێ نەزان بن ودان نەنێن بەو چاکانەی کە ئێمە پێمان داوون ﴿فَتَمَتَّعُواْ﴾ جا ڕابوێرن ولەزەت
وەرگـرن لەژیان ﴿فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەمجا لەمەودوا دەزانن (چیتان بەسـەر دێت) ﴿٣٤﴾ ﴿أَمۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ
سُلۡطَٰنًا﴾ ئایـا بەڵگەیەکمـان بۆ نـاردوون ﴿فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُواْ بِهِۦ يُشۡرِكُونَ﴾ کە دەربـارەی ئەوەی ئەوان
کردویانەتە هاوبەشی خوا بدوێ؟ ﴿٣٥﴾ ﴿وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةً﴾ وە کاتێ ڕەحمەت و چاکەیەك بەخەڵك
بدەیـن ﴿فَرِحُواْ بِهَاۖ﴾ پێی دڵخۆش دەبن ﴿وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ﴾ وە ئەگەر زیانێکیان تووش ببێت ﴿بِمَا قَدَّمَتۡ
أَيۡدِيهِمۡ﴾ بەهـۆی کـردەوەی خراپیانـەوە ﴿إِذَا هُمۡ يَقۡنَطُونَ﴾ کتوپـڕ بـێ هیوا دەبـن (لەبەزەیـی خوا) ﴿٣٦﴾
﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئایا ئەوانە نەیان زانیوە کە بەڕاستی خوا ﴿يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ﴾ ڕۆزی فراوان
یـان کـەم دەکات بۆ هەر کـەس کەبیەوێـت ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بێگومان لەوەدا (باسـکرا)
چەندین بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی باوەڕ دەهێنن ﴿٣٧﴾ ﴿فَـَٔاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ﴾ کەواتە خزم مافی خۆی پێ بدە
﴿وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِۚ﴾ هەروەها هەژار و ڕێبوارانی کەم دەست ﴿ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِۖ﴾ ئەوە
بۆ کەسانێك ڕەزامەندی خوایان دەوێ چاکترە ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ و هەر ئەوانەن ڕزگار بووان
﴿٣٨﴾ ﴿وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا﴾ ئـەوەی بەنـاوی سـوود داوتانـە (بەخەڵکـی) ﴿لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ﴾ بۆ ئەوەی
زیاد ببێ لە ماڵ و سـامانی ئـەو خەڵکانەدا (زیاتر لەوە داوتانـە پێیان بتان دەنەوە) ﴿فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ﴾
ئـەوە لای خـوا هیچ زیاد ناکات (پاداشـتی نییـە) ﴿وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ﴾ وە هـەر زەکات و خێرێك
کەداوتانـە و ﴿تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ﴾ مەبەسـتان تەنهـا ڕەزامەنـدی خـوا بـووە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ﴾
ئـائەوانـە (پاداشـتیان) چەند جـارە دەکەینەوە ﴿٣٩﴾ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ ثُمَّ رَزَقَكُمۡ﴾ خوا زاتێکـە ئێوەی بەدی
هێنـاوە لەپاشـان ڕۆزی پـێ داون. ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۖ﴾ دواتـر دەتان مرێنـێ لەپاشـان زیندووتان
دەکاتەوە ﴿هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن﴾ ئایا هیچ یەك لەو هاوبەشانەی بۆ خواتان دائەنا هەیە ﴿يَفۡعَلُ مِن ذَٰلِكُم
مِّن شَيۡءٖۚ﴾ هیچ شـتێ لەوانە(ی خوا) بکات ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ پاکی و بەرزی بۆ خوا لەوەی
ئەوان دەیکەنە هاوبەشـی ﴿٤٠﴾ ﴿ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ﴾ خراپە (بەڵا و شـێوان ودەرد) لەوشـکانی
(زەوی) و دەریـادا دەرکەوتـووە ﴿بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ﴾ بەهـۆی ئـەو خراپانـەی خەڵکـی کردویانە
﴿لِيُذِيقَهُم بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ﴾ بۆ ئەوەی (تۆڵەی) هەندێ لەو (خراپانەی) کردویانە پێیان بچەژێ ﴿لَعَلَّهُمۡ
يَرۡجِعُونَ﴾ بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە (لەخراپەکاری) ﴿٤١﴾

﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ﴾ (ئـەی موحەممەد ﷺ) بلّـێ بەزەویدا بگەڕێن ﴿فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ﴾
ئەمجا سـەرنج بدە سـەرئەنجامی ئەوانـەی لەپێش (ئێوەوە) بـوون چۆن بوو ﴿كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ﴾
کـە زۆربەیان هاوبەش دانـەر بوون بۆ خوا ﴿٤٢﴾ ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ﴾ کەواتە ڕووی خۆت بکەرە
ئایینـی ڕێـك و ڕاسـت ﴿مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ﴾ لـە پێـش ئـەوە ڕۆژێ بێـت ﴿لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ﴾ لەلایـەن
خـواوە کە گێڕانەوەی بۆ نییە ﴿يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ﴾ لـەو ڕۆژەدا خەڵکی جیائەبنەوە لەیەکتر ﴿٤٣﴾ ﴿مَن كَفَرَ
فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ﴾ هەر کەس بێ باوەڕ بووبێ ئەوە (تۆڵەی) بێ باوەڕیی یەکەی لەسەرە ﴿وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا﴾
هەرکەسـیش کـردەوەی چاکـی کردبێت ﴿فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾ ئەوە شـوێن بۆ خۆیان (لە بەهەشـتدا)
ئامادە دەکەن ﴿٤٤﴾ ﴿لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ بۆ ئەوەی کەسـانێ کە باوڕیان هێناوەو کردەوەی
چاکیـان کردووە پاداشـتیان بداتـەوە ﴿مِن فَضْلِهِ﴾ لە میهرەبانـی و چاکەی خۆی ﴿إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾
بەڕاسـتی ئـەو (خـوا) بـێ باوەڕانی خـۆش نـاوێ ﴿٤٥﴾ ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ﴾ وە لە نیشـانەکانی ئـەو (خوایە)
﴿أَن يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ﴾ کە چەند بایەکی مژدەدەر (بەبارینی باران) دەنێرێ ﴿وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِ﴾ بۆ ئەوە
هەندێ لە (بارانی) بەزەیی خۆیتان پێ بچەژێ ﴿وَلِتَجْرِيَ الْفُلْكُ بِأَمْرِهِ﴾ و بۆ ئەوەی کەشتییەکان بەفەرمانی
خوا(بـەو بایە) بـڕۆن و بگەڕێن ﴿وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ﴾ و بۆ ئەوەی بـەدوای ڕۆزی ئەو (خوا)دا بگەڕێن
(لـە دەریـادا) ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ تـا شـوکرانە بژێری خوا بـن ﴿٤٦﴾ ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ﴾ سـوێند بەخوا
بەڕاستی پێش تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) ناردومانە ﴿رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ﴾ پێغەمبەرانێك بۆ لای گەلەکانیان
﴿فَجَاءُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ ئەمجـا موعجیـزە و بەڵگـە ڕوونەکانیـان بـۆ هێنـان (بـەڵام باوەڕیـان نەهێنـا)
﴿فَانتَقَمْنَا مِنَ الَّذِينَ أَجْرَمُوا﴾ ئەمجـا تۆڵەمان سـەند لەوانەیان تاوانیان کرد ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾
وە یارمەتیدانـی باوەڕداران وسەرخسـتنیان هـەق ومافێکە لەسـەرمان ﴿٤٧﴾ ﴿اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ﴾ خوا
زاتێکـە ئـەو بایانـە دەنێرێـت ﴿فَتُثِيرُ سَحَابًا﴾ بـۆ ئـەوەی هـەورەکان بجوڵێنـن (بگەڕێنن) ﴿فَيَبْسُطُهُ
فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ﴾ ئەمجا ئەو(هەورە خوا) چۆن بیەوێ بڵاوی دەکاتەوە بەئاسماندا﴿وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا﴾ وە
ئەو (هەورە) دەکاتە پارچەیەك (وکۆیان دەکاتەوە لەسەر یەکتر) ﴿فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ﴾ ئەمجا
دەبینـی قەتـرە قەترەی باران لـە نێوانـی هەورەکەوە دەبارێـت ﴿فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ ئەمجا
کاتێ (خوا) ئەو بارانە ببارێنێ بۆ (وولاّت وزەوی) هەر کام لەبەندەکانی کەبیەوێ ﴿إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾
کتوپڕ دڵخۆش وشادمان دەبن (بەو بارانە) ﴿٤٨﴾ ﴿وَإِن كَانُوا مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِ﴾ ئەگەر چی پێش
ئەوەی باران بەسـەریاندا بباریێ﴿لَمُبْلِسِينَ﴾ بێ هیـوا و نائومێد بوون ﴿٤٩﴾ ﴿فَانظُرْ إِلَىٰ آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ﴾
ئەمجا سـەیری ئاسـەواری بارانی خوابکە (وەك کشتوکاڵ و گژو گیا و درخت) ﴿كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ
مَوْتِهَا﴾ چۆن زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردن و ووشـك بوونی ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ﴾ بەڕاستی
هەر ئەو خوایە زیندوو کەرەوەی مردووانیشـە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ و هەرە ئەویش بەدەسەڵاتە
بەسەر هەموو شتێکدا ﴿٥٠﴾

﴿وَلَئِنۡ أَرۡسَلۡنَا رِيحٗا﴾ سوێند بەخوا ئەگەر بایەکی تونـدی (زەرمەند) بنێرین ﴿فَرَأَوۡهُ مُصۡفَرّٗا﴾ جا ئەو (هەورە یا کشتوکاڵەکەیان) دەبینن بەزەرد بوویی ﴿لَّظَلُّواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ يَكۡفُرُونَ﴾ لەپاش ئەو (زیانە) هەر نا شوکری دەکەن ﴿٥١﴾ ﴿فَإِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ چونکە بەڕاستی تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) ناتوانی بە مردووان (کافران) ببیستێنیت ﴿وَلَا تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ﴾ و ناتوانی بانگەوازت بەکەڕان (کافران) ببیستێنی ﴿إِذَا وَلَّوۡاْ مُدۡبِرِينَ﴾ کاتێ ڕوو وەردەگێڕن لێت بەپشت تێکردنەوە ﴿٥٢﴾ ﴿وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلۡعُمۡيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمۡۖ﴾ وە تۆ ڕێنموونیی کەری نابینایان نیت (ڕزگاریان کەیت) لە گومڕایی یان ﴿إِن تُسۡمِعُ إِلَّا مَن يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ تۆ تەنها بە کەسانێ دەشنەوێنی کە بەنیشانەکانی ئێمە باوەڕ دەهێنن ﴿فَهُم مُّسۡلِمُونَ﴾ چونکە ئەوانە گەردن کەچن (بۆ بانگ و فەرمانی تۆ) ﴿٥٣﴾ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٖ﴾ خوا زاتێکە ئێوەی دروست کردووە لە لاوازی (لاوازی نوتفەو بێچوو منداڵی شیرە خۆر..) ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٖ قُوَّةٗ﴾ پاشان دوای لاوزی بەهێزی کردون (بوون بە لاو) ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٖ ضَعۡفٗا وَشَيۡبَةٗۚ﴾ لەدوای بەهێز کردنتان لاواز وپیرتان دەکات ﴿يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ﴾ خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡقَدِيرُ﴾ وە هەر ئەوە زانای بە دەسەلات ﴿٥٤﴾ ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ﴾ وە ڕۆژی قیامەت هەڵدەسێ ﴿يُقۡسِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ تاوانباران سوێند دەخۆن (لە دونیادا یا لەبەرزەخ دا) ﴿مَا لَبِثُواْ غَيۡرَ سَاعَةٖۚ﴾ تەنها ساتێك ماونەتەوە (لەدونیادا) ﴿كَذَٰلِكَ كَانُواْ يُؤۡفَكُونَ﴾ هەر بەو وێنە ئەوان لە دونیادا لادران لە ڕاستی ﴿٥٥﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَٱلۡإِيمَٰنَ﴾ وە کەسانێ کەزانیاری و ئیمانیان پێ دراوە ووتیان ﴿لَقَدۡ لَبِثۡتُمۡ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡبَعۡثِۖ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێوە لە (بەرزەخدا بە پێی بڕیاری) نوسراوی خوا هەتا ڕۆژی زیندووبوونەوە ماونەتەوە ﴿فَهَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡبَعۡثِ﴾ ئەمجا ئەمە ڕۆژی زیندوو بوونەوەیە ﴿وَلَٰكِنَّكُمۡ كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام ئێوە نەتان دەزانی (ڕاستە و دێتە دی) ﴿٥٦﴾ ﴿فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَعۡذِرَتُهُمۡ﴾ جالەو ڕۆژەدا کەسانێك کەستەمیان کردووە، بەهانەوبیانوو هێنانەوەسوودیان پێ ناگەیەنێت ﴿وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ﴾ وە ئەوان داوایان لێ ناکرێ خوا لە خۆیان ڕازی بکەن ﴿٥٧﴾ ﴿وَلَقَدۡ ضَرَبۡنَا لِلنَّاسِ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی هێناومانەتەوە بۆ خەڵکی ﴿فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖۚ﴾ لەم قورئانەدا لە هەموو جۆرە نموونە و باسێك ﴿وَلَئِن جِئۡتَهُم بِـَٔايَةٖ﴾ ئەمجا بەڕاستی ئەگەر نیشانەیەکیان بۆ بێنی ﴿لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ دڵنیابن ئەو بێ بڕوایانە دەڵێن ﴿إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُبۡطِلُونَ﴾ ئێوە هەر ناڕاست وبەتاڵن (ئەمە سیحرە) ﴿٥٨﴾ ﴿كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ﴾ ئا بەو جۆرە خوا مۆر دەنێت ﴿عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەسەر دڵی ئەوانەی کەبێ ئاگا و نەزانن ﴿٥٩﴾ ﴿فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ﴾ جا دان بەخۆدا بگرە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە ﴿وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ﴾ تاوەکو ئەوانەی بێ باوەڕن لە (ئاییینی) ڕاست لات نەدەن و بێزارت نەکەن ﴿٦٠﴾

## سورەتی ﴿ لُقۡمَان ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓمٓ﴾ بـە (ئەلیـف، لام، میـم،) دەخوێنرێتـەوە خـوا زاناترە بە ماناکـەی بۆ زانیاری زیاتر سـەیری
سـەرەتای سـورەتی (البقـرة) بکـە ﴿١﴾ ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ ئـەم ئایەتانـە لەئایەتەکانـی
قورئانـی پڕلە حیکمـەت و دانایی یە ﴿٢﴾ ﴿هُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّلۡمُحۡسِنِينَ﴾ (هـۆی) ڕێنموونیی و بەزەیین بۆ
چاکەکاران ﴿٣﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ ئەوانەی کەنوێژ بەجێ دێنن و زەکات دەدەن ﴿وَهُم
بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ﴾ هەروەهـا باوەڕی پتەویان بـەڕۆژی دوایی هەیە ﴿٤﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ﴾ ئەوانە
لەسـەر ڕێنموونیین لەلایەن پەروەردگاریانەوە ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ وە هەر ئەوان ڕزگارن ﴿٥﴾
﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ﴾ هەندێ لەخەڵکی هەیە قسـە و باسـی بێهودە دەکرێ (وەك ئەفسـانە
و گۆرانی و مۆسیقا) ﴿لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾ بۆ ئەوەی بەنەزانی خەڵك لەڕێگای خوا گومڕا بکات
﴿وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ﴾ وە ڕێگای خوا دەکاتە جێگای گاڵتەو لاقرتی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ ئەوانە سزای
ڕیسواکەریان بۆ هەیە ﴿٦﴾ ﴿وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا﴾ وە هەر کاتێ ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا بخوێنرێتەوە
﴿وَلَّىٰ مُسۡتَكۡبِرٗا﴾ ڕوو وەردەگێڕێـت بەخـۆ بەگـەورە زانینێکـەوە ﴿كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗاۖ﴾
هـەروەك نەیبیسـتبن، یـا هـەروەك لـە هـەردوو گوێچکەیـدا کـەڕی ببـێ ﴿فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ دەی
(ئـەی موحەممـەد ﷺ) مـژدەی بدەرێ بەسـزایەکی سـەخت ﴿٧﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾
بێگومـان ئەوانـەی باوەڕیـان هێناوە و کـردەوە چاکەکانیـان ئەنجـام داوە ﴿لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ﴾ بۆئەوانە
بەهەشـتانی پڕنازونیعمـەت هەیـە ﴿٨﴾ ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ﴾ هەتـا هەتایـە دەمێننـەوە تێیـدا ئـەوە
بەڵێنێکی ڕاسـتە لەخواوە ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ وە هەر ئەو زاڵی باڵادەسـتی کاربەجێ یە ﴿٩﴾ ﴿خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ﴾ (خوا) ئاسمانەکانی دروست کردووە بەبێ هیچ کۆڵەکەو ئەستونێك کە ئێوە
ببینن ﴿وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ﴾ وە لە زەویدا چەندان شـاخی لەنگەر داکوتاوی داناوە ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمۡ﴾ بۆ
ئەوەی نەتانلەرزێنێ و نەجولێ لەژێرتاندا ﴿وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖۚ﴾ لەهەموو جۆرە زیندەوەرێکی تێدا
بڵاوکردۆتەوە ﴿وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ وە لەئاسمانەوە بارانمان باراندوە ﴿فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ﴾
بەهـۆی ئـەو (بارانـەوە) لەزەویـدا هەمـوو جـۆرە ڕووەکێکـی بەکەڵـك و جوانمـان ڕوانـدووە ﴿١٠﴾
﴿هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ﴾ ئەمە (باسـکرا) دروست کراوی خوایە ﴿فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ﴾ دەی نیشانم
بدەن ئەو (بت و پەرستراوانە)ی بێجگە لەخودان چییان دروست کردووە ﴿بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾
(هیچیان دروست نەکردووە) بەڵکو ستەمکاران لە گومڕایی یەکی ئاشکرادان ﴿١١﴾

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ﴾ سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی دانـای و حیکمەتماندا بـە لوقمان ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ﴾
(وپێمـان ووت) سوپاسـی خـوا بکە ﴿وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ﴾ جـا هەرکەس شـوکرانە بژێری
خوا بکات ئەوە بێگومان شـوکرانە بژێری (بۆ قازانج و سوودی) خۆی دەکات ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ
حَمِيدٌ﴾ هەرکەسـیش ناسوپاسـی کردبێ (زیانی بەخـوا نەگەیاندووە) ئەوە بێگومـان خوا بێ نیازی
سـوپاس کـراوە (١٢) ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) باسـی ئەوکاتـە بکـە
کـە لوقمـان بەکوڕەکـەی ووت کـە ئامۆژگـاری دەکـرد ﴿يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ﴾ (ووتـی) ئـەی کوڕە
شـیرینەکەم هاوبـەش بۆ خوا دامەنێ ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ چونکە بەڕاسـتی هاوبـەش دانان بۆ خوا
سـتەمێکی زۆر گەورەیە (١٣) ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ﴾ وە فەرمانمـان داوە بەئادەمی (بەچاکی هەڵس
و کەوت کردن لەگەڵ) دایك و باوکیدا ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ﴾ دایکی هەڵی ئەگرێ بەدووگیانی
(پێـی لاواز دەبـێ) لاوازی لەدوای لاوازی ﴿وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ﴾ و بڕینەوەی لەشیر لـە (دوا تەمەنی)
دووسـاڵیەوە ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ﴾ (وەفەرمانمـان بەئادەمـی دا) کـە سوپاسـگوزاری مـن (خـوا)
وبـاوك و دایکت بکە ﴿إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ﴾ تەنها بۆلای منە گەڕانەوەتان (١٤) ﴿وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى﴾
وەئەگـەر (بـاوك و دایکـت) ئەوپـەڕی هەوڵیـان دا لەگەڵـت بۆئـەوەی شـتێ بکەیـت بەهاوبەشـی
مـن ﴿مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا﴾ کەهیـچ زانیـاری یەکـت پێـی نـی یـە ئـەوە گوێڕایەڵییـان مەکـە
﴿وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا﴾ بـەڵام لەدونیـادا زۆر بەچاکـی هاوڕێیەتـی وهەڵسـو کەوتیان لەگەڵدا
بکە ﴿وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ﴾ وشـوێن ڕێبازی کەسـێك بکەوە کەبەدڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆلای من
﴿ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ﴾ (لەدوا ڕۆژدا) گەڕانەوەتان تەنها بۆلای منە ﴿فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەمجا
هەواڵتـان دەدەمـێ بـەو کردەوانـەی کەکردوتانە (١٥) ﴿يَٰبُنَىَّ﴾ (لقمـان ووتی) ئەی کوڕە شـیرینەکەم
﴿إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ﴾ بەڕاستی ئەو (چاکە و تاوانە) ئەگەر کێشی تۆوە خەرتەلەیەکیش بێت
﴿فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ لەنـاو بەردێکدا یان لەناو ئاسـمانەکان یـان لەزەوی دا بێت
﴿يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ﴾ خوا (لەقیامەت دا) دەیهێنێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ بەڕاسـتی خوا ووردبیین و ئاگادارە
(١٦) ﴿يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئـەی کـوڕە شـیرینەکەم نوێـژ بەجـێ بێنـە ﴿وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾
وفەرمان بکە بەچاکە و ڕێگری بکە لەخراپە ﴿وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ هۆگر و بەئارام بەلەسەر هەر بەڵاو
ناخۆشی یەك تووشت دێ ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ بێگومان ئەوە لەوکارە گەورانەیە کە خوا پێویستی
کـردووە (١٧) ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ﴾ ڕوو لەخەڵـك وەرمەگێـڕە ﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا﴾ و بەکەشـخە
و فیـزەوە مـەڕۆ بەزەویدا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ چونکەبەڕاسـتی خـوا هیـچ خۆبـەزل زانێکی
شـانازی کەریخۆش ناوێ (١٨) ﴿وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ﴾ وە لەڕۆشتندا مام ناوەندی بە (نەهێواش بە نەپەلە)
﴿وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ﴾ (لەقسـەکردندا) دەنگت نزم بکەرەوە ﴿إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ﴾ بەڕاسـتی
ناخۆش ترینی دەنگەکان دەنگی (سەڕەی) گوێدرێژە (١٩)

﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم﴾ ئایا نەتان زانیوە کە بەڕاستی خوا ڕامی هێناوە بۆتان ﴿مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾
ئەوەی لەئاسمانەکان و ئەوەی لەزەوی دایە ﴿وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ﴾ وە نیعمەتەکانی ڕشتووە بەسەرتاندا
﴿ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً﴾ چ دیار و ئاشکرا و چ پەنهان و نادیارە ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ﴾ هەندێ لەئادەمی
موجادەلە و دەمەقاڵێ دەکات لەبارەی خواوە ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ﴾ بەبێ هیچ زانیاریەك یان
ڕێنموونیەك یان کتێبێکی ڕوون وئاشکرا ﴿٢٠﴾ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ﴾ وەکاتێ پێیان بوترێ ﴿اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾
شوێن ئەو (ئایینە) بکەون خوا ناردوویەتی یە خوارەوە ﴿قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا﴾ دەڵێن نەخێر
بەڵکو ئێمە شوێن ئەو (ئایینە) دەکەوین کە باو باپیرانمان لەسەری بوون ﴿أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ﴾
ئەگەرچی شەیتان بانگیان بکات ﴿إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ﴾ بۆ سزای ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ ﴿٢١﴾
﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ﴾ هەرکەسێك بەڕاستی ڕووبکاتە خوا (ملکەچی فەرمانەکانی ئەو بێت)
﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ و چاکەکار بێت (لەگوفتار و کرداریدا) ﴿فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ﴾ ئەوە بێگومان
دەستی گرتووە بە بەهێزترین دەستە گیرەوە (کە یەکخواپەرستی وئایینی پیرۆزی ئیسلامە)
﴿وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾ وە سەرئەنجامی هەموو کارێك تەنها بۆلای خوایە ﴿٢٢﴾ ﴿وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ
كُفْرُهُ﴾ وە هەرکەس بێ بڕوا بوو بابێ بڕوایی یەکەی خەفەتبارت نەکات ﴿إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ﴾
گەڕانەوەیان تەنها بۆلای ئێمەیە ﴿فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا﴾ ئەمجا هەواڵیان دەدەینێ بەوەی کردوویانە
﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوا بەوەی لەناو دڵەکاندایە ئاگادارە ﴿٢٣﴾ ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا﴾ کەمێ ناز
و نیعمەتیان پێ دەدەین (لە دونیادا) ﴿ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ لەپاشان ناچاریان دەکەین کە
بڕۆنە ناو سزای سەختەوە ﴿٢٤﴾ ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر پرسیاریان
لێ بکەیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ﴿لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ بێگومان دەڵێن: خوا
(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: سوپاس بۆ خوا (کەدان بەو ڕاستی یەدا دەنێن) ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾
بەڵام زۆربەیان نازانن ﴿٢٥﴾ ﴿لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ موڵکی خوایە ئەوەی لەئاسمانەکان و زەوی
دایە ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ بەڕاستی هەر خوایە بێ نیازی ستایش کراو ﴿٢٦﴾ ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ
مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ﴾ بێگومان ئەگەر هەرچی درەخت لەزەوی دایە قەلەم و پێنووس بێت ﴿وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ﴾
هەموو دەریای زەوی ببێتە مرەکەب ﴿مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ﴾ حەوت دەریای تر دوای ئەوەی
(باسکرا) ببێت بەمرەکەب ﴿مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ﴾ ووتە و زانراوەکانی خوا دوایی نایەن و تەواو نابن
﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا زاڵی باڵادەستی کار دروستە ﴿٢٧﴾ ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ﴾ دروست
کردنی هەمووتان (لەسەرەتاوە) و زیندووکردنەوەتان ﴿إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ وەك (دروست کردن و
زیندوکردنەوەی) تەنها کەسێك وایە ﴿إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بیسەری بینایە ﴿٢٨﴾

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ﴾ ئایا نەتزانیوە کەبەڕاستی خوا شەو دەکات بەناو ڕۆژدا ﴿وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ
فِى ٱلَّيْلِ﴾ وە ڕۆژ دەکات بەناو شەودا﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ وە خۆرو مانگی ڕام هێناوە وخستویەتیە
خزمەتیانەوە﴿كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ هەر یەکەیان تا ئەوماوەیەی (بۆیان) دیاری کراوە،
دەگەڕێن ودەسوڕێنەوە﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ وە بەڕاستی خوا بەوەی دەیکەن خەبەردارە ﴿٢٩﴾
﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ﴾ ئەمە لەبەر ئەوەیەکە بێگومان تەنها خوا ڕاستە و حەقە ﴿وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ
مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ﴾ و بەڕاستی ئەوەی هاواری لێ دەکەن و دەیپەرستنن بێجگە لەو(خوا) بەتاڵ
وناڕاستە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ﴾ وە بێگومان هەر خوا بڵندو گەورەیە ﴿٣٠﴾ ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نەتزانیوە
(نەت دیوە) ﴿أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ﴾ کە کەشتیەکان بە چاکەو فەزڵی خوا دەڕۆن لەدەریادا
﴿لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ﴾ بۆ ئەوەی هەندێ لەنیشانەکانی خۆیتان نیشان بدات ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ﴾ چونکە
بەڕاستی لەمەدا (کەباسکرا) چەند بەڵگەیە هەیە ﴿لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بۆ هەموو ئارام گرێکی
شوکرانە بژێر ﴿٣١﴾ ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ﴾ وە هەرکاتێ (لەدەریادا) شەپۆلێکی وەك هەورەکان
دایان پۆشێ ﴿دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ (ترسی خنکان و نوقم بوونیان ببێت) هاوار لەخوا دەکەن،
دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو ملکەچ دەبن ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ﴾ ئەمجا کاتی (خوا) ڕزگاری کردن بۆ ووشکانی
﴿فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ﴾ ئەوسا هەندێکیان مام ناوەندی یە (هەندێکی تریان کافرە، وەدان نانێ بەچاکەی
خوادا) ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ﴾ کەس نیشانەکانی ئێمە ئینکار ناکات جگە لە پەیمان
شکێنانی ناشوکر و (سپڵە) نەبێت ﴿٣٢﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ﴾ ئەی ئادەمی خۆبپارێزن لە (تۆڵەی)
پەروەردگارتان ﴿وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا﴾ لەو ڕۆژەش بترسن ﴿لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ﴾ هیچ باوکێ تاوانی
ڕۆڵەکەی هەڵناگرێ ﴿وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا﴾ و هیچ ڕۆڵەیەکیش شتێك لە تاوانی باوکی
هەڵناگرێت ﴿إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾ بێگومان بەڵێنی خوا حەق و ڕاستە ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾
کەواتە با ژیانی دونیا هەڵتان نەخەڵەتێنێ ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ وە با شەیتانی فریودەر بە(بیانوی
بەزەیی و لێ بوردنی)خوا نەتان خەڵەتێنێ ﴿٣٣﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ﴾ بەڕاستی تەنها لای خوایە
زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی ﴿وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ﴾ وە هەر خوا باران دەبارێنێ ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ﴾
تەنها خوا دەزانێ بەوەی لەمنداڵدانی (دایکان) دایە ﴿وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا﴾ وە هیچ کەس
نازانێ سبەینێ (لە داهاتوودا) چی دەکات ﴿وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ﴾ وە هیچ کەس نازانێت لە
چ شوێن و زەوی یەکدا دەمرێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ﴾ بەڕاستی خوا زانا و ئاگادارە ﴿٣٤﴾

## سورەتی ﴿السَّجْدَة﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الٓمٓ﴾ بە (ئەلیف، لام، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی بۆزانیاری زیاتر سەیری سەرەتای
سورەتی (البقرة) بکە ﴿١﴾ ﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾ هێنانە خوارەوەی ئەم قورئانە هیچ گومانی
تێدانی یە ﴿مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوەیە ﴿٢﴾ ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۚ﴾ ئایا
(بێباوەڕەکان) دەڵێن: موحەممەد ﷺ خۆی ئەم (قورئانەی) هەڵبەستووە ﴿بَلۡ هُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ (نەخێر
هەڵی نەبەستووە) بەڵکو ئەو (قورئانە) ڕاستە لەلایەن پەروەردگارتەوە (هاتووە) ﴿لِتُنذِرَ قَوۡمٗا﴾ بۆ
ئەوەی بەو (قورئانە) بترسێنی خەڵکێ ﴿مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ﴾ کە لە پێش تۆ هیچ ترسێنەرێکیان
بۆ نەهاتووە ﴿لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ﴾ بەڵکو ڕێنموونی وەرگرن ﴿٣﴾ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا
بَيۡنَهُمَا﴾ خوا زاتێکە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە بەدی هێناوە ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾ لە
شەش ڕۆژدا ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ﴾ پاشان بەرز بوویەوە بۆ سەر عەرش و قەراری گرت (ئیمانمان
پێیەتی وچۆنیەتیەکەی نازانین) ﴿مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا شَفِيعٍۚ﴾ بێجگە لەو (خوا) هیچ پشتیوان و تکا
کارێکتان نییە ﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾ دەی بۆ بیرناکەنەوە و پەند وەرناگرن ﴿٤﴾ ﴿يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ﴾
خوا هەموو کاروبارەکان بەڕێوە دەبات لەئاسمانەوە تا زەوی (هەتا ڕۆژی دوای) ﴿ثُمَّ يَعۡرُجُ إِلَيۡهِ﴾ لە پاشان
هەموو ئەو کاروبارە بەرز دەبێتەوە بۆلای خۆی ﴿فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥٓ أَلۡفَ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ لە ڕۆژێکدا
(لەقیامەتدا) کەئەندازەکەی هەزار ساڵە لەو ساڵانەی ئێوە دەیژمێرن ﴿٥﴾ ﴿ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ ئەو
(خوا) زانایە بە هەموو نهێنی و ئاشکرایەك ﴿ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بە دەسەڵات و میهرەبانە ﴿٦﴾ ﴿ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ
كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ﴾ زاتێکە هەموو شتێکی بەجوانترین شێوە دروست کردووە ﴿وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن
طِينٖ﴾ جا مرۆڤی لە سەرەتاوە لە قوڕ دروست کرد ﴿٧﴾ ﴿ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ﴾ لەپاشان
نەوەی مرۆڤی لە پوختەیە لە ئاوی بێ نرخ و قێزەون دروست کردووە ﴿٨﴾ ﴿ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن
رُّوحِهِۦۖ﴾ لەپاشان ڕێك و پێکی کرد (بەشێوەی ئادەمی) و فوی کرد بە بەریدا لەڕۆحێك کە خۆی
دروستی کرد (دانە پاڵی ڕۆح بۆ لای خوا بۆ ڕێزو تەشریفە) ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ﴾
گوێ و چاو و دڵی پێبەخشیوون ﴿قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ﴾ بەڵام زۆر کەم سوپاسی خوا دەکەن ﴿٩﴾
﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ (بێ بڕواکان) دەڵێن: ئایا کاتێك (مردین و لەشمان ڕزاو) لە ناو زەویدا
وون بووین ﴿أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭۚ﴾ ئایا سەر لەنوێ جارێکی تر دروست دەکرێینەوە (وزیندوو دەبینەوە)
﴿بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ﴾ (وانیە) بەڵکو ئەوان باوەڕیان نییە بەخزمەت پەروەردگاریان بگەن
(بۆ دادگایی قیامەت) ﴿١٠﴾ ﴿قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ فریشتەی
گیان کێشان کە گیان کێشانی ئێوەی پێ سپێراوە دەتان مرێنێ ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ﴾ لە پاشان بۆ لای
پەروەردگارتان دەگەڕێنرێنەوە ﴿١١﴾

﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ ئەگەر دەبینی کاتێك (لەقیامەت دا) تاوانباران ﴿نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ لەحوزوری پەروەردگاریاندا (لەخەجاڵەتی دا) سەریان داخستووە ﴿رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا﴾ (دەڵێن) ئەی پەروەردگاری ئێمە (ئەوەی بەڵێنت پێ دابووین) دیمان و بیستمان ﴿فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا﴾ دەی بمانگێڕەرەوە (بۆ دونیاتا) کردەوەی چاك بکەین ﴿إِنَّا مُوقِنُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە دڵنیاین (لەقیامەت) ﴿١٢﴾ ﴿وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا﴾ ئەگەر بمانویستایە ڕێنموونیمان بەهەموو کەسێ دەدا ﴿وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي﴾ بەڵام بەڵێنی من چەسپاو و جێگیر بووە ﴿لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ﴾ کە بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەم ﴿مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ﴾ لەجنۆکە و ئادەمی بەتێکڕا ﴿١٣﴾ ﴿فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَآ﴾ کەواتە (سزای دۆزەخ) بچەژن، چونکە گەیشتن بەم ڕۆژەتان لەبیر کرد بوو ﴿إِنَّا نَسِينَٰكُمۡۖ﴾ بەڕاستی ئێمەش ئێوەمان لەبیرخۆمان بردەوە ﴿وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡخُلۡدِ﴾ و سزای بەردەوام بچێژن ﴿بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ بەهۆی ئەوەی دەتانکرد (لەدونیادا) ﴿١٤﴾ ﴿إِنَّمَا يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ﴾ تەنها کەسانێ باوەڕ بەئایەتەکانی ئێمە دەهێنن ﴿إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْۤ سُجَّدٗا﴾ هەر کاتێ بەو (ئایەتانە) ئامۆژگاری بکرێن ئەکەون بە ڕوودا بەسوژدە بردنەوە ﴿وَسَبَّحُواْ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ﴾ و بەپاکی ستایشی پەروەردگاریان دەکەن ﴿وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ۩﴾ و خۆیان بەگەورە دانانێن ﴿١٥﴾ ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ﴾ تەنیشتیان دوور ئەکەوێتەوە لەجێگای خەوتنیان (واتە: لەخەو هەڵدەسن بۆ شەو نوێژ کردن) ﴿يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا﴾ هاوار و نزا لەپەروەردگاریان دەکەن بەترس و هیواوە ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داوون دەبەخشن ﴿١٦﴾ ﴿فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ﴾ ئەمجا هیچ کەس نازانێ ﴿مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ﴾ چی شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشت دا کە هۆی) گەشبوونی چاوەکانن ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بە هۆی ئەو کردەوانەی کە کردویانە ﴿١٧﴾ ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا﴾ دەی ئایا کەسێ ئیماندار بووبێ ﴿كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ﴾ وەك کەسێکە دەرچووبێ لە ئیمان (وفاسق بووبێت) ﴿لَّا يَسۡتَوُۥنَ﴾ هەرگیز چونیەك نین ﴿١٨﴾ ﴿أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿فَلَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ نُزُلَۢا﴾ ئەوە بەهەشتانێکی پڕ ڕێزو خۆشیان بۆ هەیە ﴿بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ بەهۆی ئەو کردەوانەوەی کەدەیان کرد ﴿١٩﴾ ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ﴾ وە ئەوانەی کە فاسق بوون ﴿فَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ﴾ ئەوە جێگایان ئاگرە ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ﴾ هەر کاتێ بیانەوێ لە دۆزەخ دەرچن ﴿أُعِيدُواْ فِيهَا﴾ دووبارە دەیانگێڕنەوە ناو دۆزەخ ﴿وَقِيلَ لَهُمۡ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ و پێیان دەوترێ بچەژن سزای ئەو ئاگرەی ﴿ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ کە ئێوە باوەڕتان پێ نەدەکرد ﴿٢٠﴾

﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَىٰ﴾ وە بەڕاستی ئێمە سزای دونیایان پێ دەچێژین ﴿دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ﴾
جگەلە سزای هەرە گەورە (ی دۆزەخ) ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ تابگەڕێنەوە (بۆ لای خوا) (٢١) ﴿وَمَنْ
أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ﴾ وە کێ ستەمکارترە لەو کەسەی بە ئایەتەکانی پەروەردگاری ئامۆژگاری
بکرێت ﴿ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا﴾ دوا ئەوە ڕوو وەرگێڕێت وپشتی تێ بکات ﴿إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾
بەڕاستی ئێمە تۆڵە سێنەرین لە تاوانباران (٢٢) ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی
ئێمە تەوراتمان دا بەمووسا ﴿فَلَا تَكُن فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَائِهِ﴾ ئەمجا گومانت نەبێت (ئەی موحەممەد ﷺ)
لەگەیشتنت بە مووسا (یان گومانت نەبێت لەگەیشتنی تەورات بە مووسا) ﴿وَجَعَلْنَاهُ هُدًى لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ﴾
وە ئێمە ئەو (تەوراتە)مان کرد بەڕێنموونیی کەری بەنو ئیسرائیل (٢٣) ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً﴾ وە
لەناو ئەواندا پێشەوایانێکمان دانا ﴿يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا﴾ ڕێنموونیی (خەڵك) یان دەکرد بە فەرمانی ئێمە
﴿لَمَّا صَبَرُوا ۖ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ﴾ کاتێ خۆیان گرت و بەئایەتەکانی ئێمە دڵنیا بوون (باوەڕی
بتەویان هێنا) (٢٤) ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ﴾ بێگومان پەروەردگارت بڕیار دەدات لەنێوان (بەندەکانی
دا) ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لەڕۆژی قیامەتدا ﴿فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ لەوەی ئەوان تێیدا جیاواز بوون
(٢٥) ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ﴾ ئایا (ڕێگای ڕاست) ڕوون نەبۆتەوە بۆیان ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْقُرُونِ﴾
کە ئێمە پێش ئەمان زۆر گەل و نەتەوەمان لەناو بردووە ﴿يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ﴾ ئەمان (بێ باوەڕانی
مەککە) بەشوێن و خانووە (وێران کراوە) کانی ئەواندا هاتوو چۆ دەکەن ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ﴾
بەڕاستی لە (تیاچوونی) ئەواندا چەند بەڵگەی گەورە هەیە ﴿أَفَلَا يَسْمَعُونَ﴾ دەی ئایا ئەوانە (ئەو
ڕاستیانە) نابیستن (٢٦) ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا﴾ ئایا نابینن و نازانن ﴿أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ﴾ کە ئێمە ئاو
دەنێرین بۆ زەوی ووشکی بێ ڕووەك ﴿فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا﴾ ئەمجا بە هۆی ئەو (ئاوەوە) کشتوکاڵ و
گژوگیا دەڕوێنین ﴿تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ﴾ کە ئاژەڵیان لێی دەلەوەڕێ و خۆشیان لێی دەخۆن
﴿أَفَلَا يُبْصِرُونَ﴾ دەی ئایا ئەوانە نابینن (٢٧) ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْفَتْحُ﴾ وە(بێ باوەڕانی مەککەبەموسڵمانان)
دەڵێن ئەم حوکم و بڕیاردانی قیامەتە، کەی دەبێ ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن (٢٨)
﴿قُلْ يَوْمَ الْفَتْحِ لَا يَنفَعُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِيمَانُهُمْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ڕۆژی بڕیاردانی قیامەت
باوەڕ هێنان سوود ناگەیەنێت بەوانەی بێ باوەڕ بوون لە دونیادا ﴿وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ و مۆڵەتیشیان
پێ نادرێ (٢٩) ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ جا (ئەی موحەممەد ﷺ) ڕوویان لێ وەرگێڕە و گوێیان مەدەرێ
﴿وَانتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ﴾ وە تۆ چاوەڕوانی بکە بێگومان ئەوانیش چاوەڕوانن (٣٠)

## سورەتی ﴿الأحزاب﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ (بەردەوام) لە خوا بترسە ﴿وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ﴾ بە
گوێی کافران ودووڕووەکان مەکە ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ بێگومان خوا زانای کار بەجێیە
(١) ﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَىٰ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ وە شوێن ئەوە بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە وەحیت بۆکراوە
﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ بەڕاستی خوا بەوەی کەدەیکەن ئاگادارە (٢) ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾
پشت هەر بەخوا ببەستە ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا﴾ وە خوا بەسە پارێزەر بێت (٣) ﴿مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ﴾
خوا دای نەناوە بۆ هیچ پیاوێك (ئادەمییەك) ﴿مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ﴾ دوو دڵ لە ناوسنگیدا
﴿وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللَّائِي﴾ وە(خوا) ئەو هاوسەرانەتانی نەکردۆتە ﴿تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ﴾ دایکتان
کە (ظهار) یان لەگەڵ دەکەن (پێیان دەڵێن ئێوە وەك پشتی دایکمان وان بۆ ئێمە) ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ
أَبْنَاءَكُمْ﴾ وەخوا بە کوڕ کراوەکانتانی نەکردۆتە کوڕتان ﴿ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ﴾ ئەوە قسەی سەر
زارەکی تانە ﴿وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ﴾ خواش ووتەی ڕاست دەڵێ ﴿وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ﴾ هەر ئەویش
ڕێنموونیی(خەڵك) دەکات بۆ ڕێگای ڕاست (٤) ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ﴾ (ئەو بە کوڕ کراوانە) بەناوی
باوکیانەوە بانگیان بکەن ﴿هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ﴾ ئەوە ڕاسترە بەلای خواوە ﴿فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ﴾ ئەمجا
ئەگەر باوکیان نەناسن(تابەناویانەوە بانگیان بکەن) ﴿فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ﴾ ئەوانە برای ئاینی
و دۆست و خۆشەویستانن ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ﴾ هیچ گوناهێکتان لەسەر نی یە
لەو (بانگ کردنەدا) کە بە نەزانین گوتبێتان (پێش هاتنی ئەم ئایەتە) ﴿وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ﴾
بەڵام (گوناهبار دەبن) ئەگەر بەدڵ و بەدەس ئەنقەست بیکەن ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ وە خوا
لێبوردەی میهرەبانە (٥) ﴿النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ﴾ پێغەمبەر ﷺ لە خودی بڕواداران بۆ
خۆیان لە پێشترە ﴿وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ﴾ خێزانەکانیشی دایکی باوەڕدارانن ﴿وَأُولُو الْأَرْحَامِ﴾ و ئەوانەی
(بە نەسەب) خزمی یەکترن (ئەگەر موسڵمان بن) ﴿بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ﴾ لەقورئانی خودا
بۆیەکتری لە پێشترن (میرات لە یەکتر بەرن) ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ﴾ لە ئیمانداران و کۆچەران
(کە خزم نین) ﴿إِلَّا أَن تَفْعَلُوا إِلَىٰ أَوْلِيَائِكُم مَّعْرُوفًا﴾ مەگەر خۆتان چاکەیەك (بەخشین یا وەسێتیّ) بۆ
دۆست و خۆشەویستانتان بکەن ﴿كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا﴾ ئەو بڕیارە لە قورئان (یان لە لوح
المحفوظ دا) نوسراوە (٦)

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمْ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ بیریان بخەرەوە) کاتێ کـە پەیمانمان وەرگرت
لە پێغەمبـەران ﴿وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ﴾ هەروەها لە تۆ ولەنـووح ولەئیبراهیم و
لەمووسا و لەعیسای کوڕی مەریەم ﴿وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾ وەلە هەموویان پەیمانی بەهێزو بتەومان
وەرگرت ﴿٧﴾ ﴿لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ﴾ بۆ ئەوەی (خوا) پرسیار لەڕاست گۆیان بکات دەربارەی
ڕاستییان ﴿وَأَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ و سـزای پـڕ ئێش و ئازاریشـی ئامادە کردووە بۆ بـێ باوەڕان ﴿٨﴾
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ بیر لەچاکە و نیعمەتی
خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە ﴿إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ﴾ کاتێ لە شکرێکی زۆرتان بۆ هات (لە جەنگی خەندەقدا)
﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا﴾ ئەمجا ئێمە بایەکی بەهێزمان بۆ ناردن ﴿وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا﴾ ولەشکری (فریشتەش)
کـە ئێوە نەتان بینیـن ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾ وەخوا بەوەی ئێوە دەیکـەن بینایە ﴿٩﴾ ﴿إِذْ جَآءُوكُم
مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ﴾ کاتێ (بێ باوەڕان) هێرشیان بۆ هێنان لە سەرووتانەوە و لە خوارتانەوە
(چـوار دەوری مەدینەیـان گـرت) ﴿وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ وە چـاوەکان ئەبلـەق بـوون ﴿وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ
ٱلْحَنَاجِرَ﴾ و دڵەکان (لە ترسـا) گەیشتبوونە گەروو ﴿وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠﴾ و گومانی جۆربە جۆرتان
بـە خـوا دەبـرد ﴿١٠﴾ ﴿هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ لەوێدا ئیمانـداران تاقی کرانـەوە ﴿وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا﴾ وە
ڕاوەشێنران بەڕاوەشـاندنێکی توند ﴿١١﴾ ﴿وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێك
دوو ڕووەکان وئەوانـەی لـە دڵیانـدا نەخۆشـی هەبـوو ووتیـان ﴿مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا﴾ خواو
پێغەمبەرەکـەی بێجگـە لـە تەفرەدان هیـچ بەڵێنێکیان پـێ نەدایـن ﴿١٢﴾ ﴿وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ﴾ وە کاتێ
دەسـتەیە لـەو (دووڕووانـە) ووتیان: ﴿يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟﴾ ئـەی دانیشـتوانی مەدینە ئێرە
جێی مانەوەتان نی یە دەی بگەڕێنەوە ﴿وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ﴾ وە کۆمەڵێ تر لەوان مۆڵەتی گەڕانەوە
لەپێغەمبـەر ﷺ دەخـوازن ﴿يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ﴾ دەیـان ووت: خانووەکانمان بـێ پارێزەر و ڕووت
و کەلێناویـە ﴿وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ﴾ لەکاتێکـدا واش نەبوو (کەدەیـان ووت) ﴿إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا﴾ ئەوان تەنها
مەبەسـتیان هەڵهاتن بوو (لەجیهادکردن) ﴿١٣﴾ ﴿وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا﴾ وە ئەگەر هێرش بهێنرایەتە
سـەریان لـە هەمـوو لایەکـی (مەدینـە)وە ﴿ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَـَٔاتَوْهَا﴾ ئەمجـا داوای کافربـوون و جەنگ
کردنیـان لـێ بکرایـە (دژ بەتۆ ئەی موحەممـەد ﷺ) داواکەیان بەجـێ دەهێنـا (و بەگوێیان دەکردن)
﴿وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا﴾ وە ئەم داوایان دوانەدەخسـت ماوەیەکـی کەم نەبێت ﴿١٤﴾ ﴿وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَٰهَدُوا۟
ٱللَّهَ مِن قَبْلُ﴾ بێگومـان ئەوانـە لەپێش ئـەم (ڕوداوە) پەیمانیان بە خـوا دابوو ﴿لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَٰرَ﴾ کە (لە
غـەزادا) پشـت هەڵناکـەن و ڕاناکـەن ﴿وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا﴾ وە پەیمانێ درا بە خـوا (خاوەنەکەی)
لێپرسراو دەبێ ﴿١٥﴾

﴿قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلۡفِرَارُ﴾ (ئەى موحەممەد ﷺ بەدوورڕووەكان) بلّىَ هەلّهاتن سوودتان پىَ ناگەيەنىَ ﴿إِن فَرَرۡتُم مِّنَ ٱلۡمَوۡتِ أَوِ ٱلۡقَتۡلِ﴾ ئەگەر لەمردن ياكوشتن هەلّبيَن (خۆتان بدزنەوە) ﴿وَإِذٗا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ جا لەوكاتەدا بەهرەو خۆشى ژيانتان پىَ نادرىَ ماوەيەكى كەم نەبىَ ﴿١٦﴾ ﴿قُلۡ مَن ذَا ٱلَّذِي يَعۡصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾ بلّىَ كێيە ئەو كەسەى ئێوە لەخوا دەپاريَزىَ؟ ﴿إِنۡ أَرَادَ بِكُمۡ سُوٓءًا أَوۡ أَرَادَ بِكُمۡ رَحۡمَةٗۚ﴾ ئەگەر خوا زيان و خراپە يان بەزەيى و ڕەحمەتى بۆ ئێوە بويَت ﴿وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بێجگە لەخوا بۆ ئەوان نييە ﴿وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾ هيچ پشتيوان و يارمەتى دەريَك ﴿١٧﴾ ﴿قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلۡمُعَوِّقِينَ مِنكُمۡ﴾ بێگومان خوا دەزانىَ بەو كەسانەتان كەئاستەنگ دروست دەكات لەڕێگەى (موسلّمانان بۆجيهاد كردن) ﴿وَٱلۡقَآئِلِينَ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ هَلُمَّ إِلَيۡنَاۖ﴾ كە بەبرادەرەكانيان دەلّيَن:وەرن بۆلاى ئێمە (وخۆيان دەدزييەوە لەجيهاد) ﴿وَلَا يَأۡتُونَ ٱلۡبَأۡسَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ ئەوانە نايەن بۆ جەنگ و غەزا زۆر بەكەمى نەبێت ﴿١٨﴾ ﴿أَشِحَّةً عَلَيۡكُمۡۖ﴾ لەئاستى ئێوەدا (ئەى موسلّمانان ئەوانە) چرووكن ﴿فَإِذَا جَآءَ ٱلۡخَوۡفُ﴾ ئەمجا كاتێك (بەهۆى جەنگەوە) ترس و بيم پەيدا بێت ﴿رَأَيۡتَهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ﴾ دەيان بينى بەجۆرىَ سەيرت دەكەن (لەترسى جەنگ) ﴿تَدُورُ أَعۡيُنُهُمۡ﴾ چاويان بەم لاولادا دەسورِىَ ﴿كَٱلَّذِي يُغۡشَىٰ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ﴾ بەوێنەى كەسێك لەسەرە مەرگدا بێهۆشى بەسەردا بێت ﴿فَإِذَا ذَهَبَ ٱلۡخَوۡفُ﴾ بەلاّم كاتىَ ترسەكە ڕۆشت ونەما ﴿سَلَقُوكُم بِأَلۡسِنَةٍ حِدَادٍ﴾ بەزمانى تيژ زمانتان لىَ دريَژ دەكەن (وە داواى غەنيمەتتان لىَ دەكەن) ﴿أَشِحَّةً عَلَى ٱلۡخَيۡرِۚ﴾ كەچى چرووك و ڕژدن لەسەرمالّ وغەنيمەت ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يُؤۡمِنُواْ﴾ ئائەوانە باوەڕيان نەهێنا بوو ﴿فَأَحۡبَطَ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡۚ﴾ بۆيە خوا كردەوەيانى پوچەلّ كردنەوە ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا﴾ وەئەمە بەلاى خواوە (كاريَكى) ئاسانە ﴿١٩﴾ ﴿يَحۡسَبُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ لَمۡ يَذۡهَبُواْۖ﴾ وايان دەزانى كۆمەلّەكان (لەشكريان هێنابوو) نەڕۆشتوون ﴿وَإِن يَأۡتِ ٱلۡأَحۡزَابُ﴾ وە ئەگەر ئەو كۆمەلاّنە بگەڕێنەوە (بۆسەر مەدينە) ﴿يَوَدُّواْ لَوۡ أَنَّهُم بَادُونَ فِي ٱلۡأَعۡرَابِ﴾ ئاواتيان دەخواست كە لەناو (مەدينە) عەرەبە دەشتەكييەكان بەدوور بوونايە (لەترسى جەنگ) ﴿يَسۡـَٔلُونَ عَنۡ أَنۢبَآئِكُمۡۖ﴾ لەدوورەوە پرسياريان لەهەوالّى ئێوە بكردايە ﴿وَلَوۡ كَانُواْ فِيكُم﴾ وە ئەگەر لەناو ئێوەدا بوونايە ﴿مَّا قَٰتَلُوٓاْ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ جەنگيان نەدەكرد زۆر بەكەمى نەبىَ ﴿٢٠﴾ ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ﴾ سويَند بەخوا بەڕاستى لەپێغەمبەرى خوادا ﷺ بۆ ئێوە هەيە ﴿أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ﴾ سەرمەشقى وپێشەوايەتى چاك ﴿لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ﴾ بۆكەسێك بەهيواى خواو (پاداشتى) ڕۆژى دوايى يە ﴿وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا﴾ وە زۆر يادى خوا دەكات ﴿٢١﴾ ﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ﴾ وەكاتىَ ئيمانداران ئەو كۆمەلاّنەيان دى (لەشكريان هێنا بوو بۆ سەر مەدينە) ﴿قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ وتيان ئەمە ئەو بەلّێنەيە خوا و پێغەمبەرەكەى بە ئێمەيان دابوو ﴿وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ﴾ خوا و پێغەمبەرەكەى ڕاستيان فەرموو ﴿وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنٗا وَتَسۡلِيمٗا﴾ (هاتنى ئەو هەموو هيَزەى كوفر) باوەڕداران تەنها ئيمان و ملكەچيان پێى زيادى كرد ﴿٢٢﴾

﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ﴾ لەناو باوەڕداران دا پیاوانێك هەن ﴿صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾ ڕاستیان کرد لەگەڵ
ئەو پەیمانەی کە دابویان بەخوا ﴿فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ﴾ ئەمجا هەندێکیان نەزر و بەڵێنی خۆی بەجێ هێناو
(شەهید بوو) ﴿وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ﴾ هەندێکیشیان چاوەڕوانن (وهێشتا لەژیاندان) ﴿وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا﴾ هیچ
گۆڕانێکیان (لەبەڵێنی خۆیاندا) نەکردووە ﴿٢٣﴾ ﴿لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ﴾ بۆئەوەی (خوا) پاداشتی
ڕاست گۆیان بداتەوە بەهۆی ڕاستی یەکەیانەوە ﴿وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ﴾ وە سزای دوو ڕووەکان
بدات ئەگەر بیەوێت ﴿أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ یان تەوبەیان لێ گیرا کات ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ بێگومان
خوا لێبوردەی میهرەبانە ﴿٢٤﴾ ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ﴾ وە خوا کافرەکانی (قورەیش کە لەشکریان
هێنابوو بۆ سەر مەدینە) گەڕاندەوە بەڕق و مەراقەوە (بۆ وڵاتی خۆیان) ﴿لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا﴾ هیچ خێر و
ئاواتێکیان (لەناوبردنی ئیمانداران) دەست نەکەوت ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ﴾ خوا ئیمان دارانی
لەجەنگ پاراست (بەهۆی بای توند و فریشتەوە کافرانی پرژو بڵاوکرد) ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا﴾ وەخوا
هەمیشە بەهێزی بەدەسەڵاتە ﴿٢٥﴾ ﴿وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ (بەنی قورەیزە) کەپشتگیری
ئەوان (قورەیش و غەطفان) یان کرد خوای گەورە هێنانیە خوارەوە ﴿مِن صَيَاصِيهِمْ﴾ لەقەڵاکانیان
﴿وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ﴾ وە ترسی خستە ناو دڵیانەوە ﴿فَرِيقًا تَقْتُلُونَ﴾ کۆمەڵێکیان دەکوژن
﴿وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا﴾ وە کۆمەڵێکی تریان بەدیل دەگرن ﴿٢٦﴾ ﴿وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ﴾ (دوای
تیاچوونی ئەوان خوا) زەوی و خانوو سامانی ئەوانی دا بەئێوە ﴿وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا﴾ هەروەها زەوی
یەکیش کەپێتان پیانەنابوو ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا﴾ وەخوا بەسەر هەموو شێکدا بەتوانایە ﴿٢٧﴾
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بەخێزانەکانت بڵێ ﴿إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا﴾
ئەگەر ئێوە ژیانی دونیا و ڕازاوەی ئەوتان دەوێ ﴿فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ﴾ دەی هەمووتان وەرن موتعەتان
پێ بدەم (موتعە پارە و شتومەکێکە دەدرێتە ئافرەتی تەڵاق دراو) ﴿وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا﴾ وە تەڵاقتان
بدەم بە تەڵاق دانێکی چاك و بێ زیان ﴿٢٨﴾ ﴿وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ﴾ وە ئەگەر ئێوە
خواو پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی دوایی تان دەوێ ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ﴾ ئەوە بێگومان
خوا ئامادەی کردووە بۆ چاکەکاران لەئێوە ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاداشتێکی گەورە ﴿٢٩﴾ ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ﴾ ئەی
خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ﴿مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ هەر کام لە ئێوە گوناهێکی گەورە بکات
﴿يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ﴾ سزای بۆ دوو بەرابەر دەکرێتەوە بەدوو قاتی (خەڵکی تر) ﴿وَكَانَ
ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا﴾ وەئەم کارەش بۆ خوا ئاسانە ﴿٣٠﴾

﴿وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ (ئـەی خێزانەكانـی پێغەمبەر ﷺ) هـەر كام لەئێوە لەسـەر گوێڕایەڵی خـواو پێغەمبەرەكـەی بـەردەوام بێـت ﴿وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا﴾ وە كـردەوەی چاكیش بـكات ﴿نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ﴾ دووجار پاداشتی پێ دەدەین ﴿وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا﴾ وە ڕۆزییەكی چاك و خۆشمان بۆ ئامادە كـردووە (لەبەهەشـت دا) ﴿٣١﴾ ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ﴾ ئەی ژنانـی پێغەمبەر ﷺ ﴿لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ ئێوە وەك هیچ یەك لەئافرەتانی دیكە نین ﴿إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ﴾ ئەگەر خۆتان بپارێزن و لەخوا بترسن ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ﴾ كەواتە بەخەمزەو نازەوە قسە مەكەن (وەك ئافەرەتانی ڕەوشت نزم) ﴿فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ﴾ نەوەكـو ئـەوەی كەدڵـی نەخۆشـە (دەرون نزمـە) نیـازی خـراپ بـكات ﴿وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾ (كەواتـە) قسـەی چـاك و بەجـێ بكـەن ﴿٣٢﴾ ﴿وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ﴾ وە لـەماڵەكانـی خۆتانـدا بمێننـەوە ﴿وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ﴾ وە زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخەن (لەناو خەڵكی نامەحرەمدا) وەكو خۆدەرخستنی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی یەكەم (پێش ئیسلام) ﴿وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ نوێـژ بكـەن و زەكات بـدەن ﴿وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ وە گوێڕایەڵی خـواو پێغەمبەرەكەی بكەن ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ﴾ بەڕاسـتی خـوا دەیەوێـت ﴿لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾ ئەی ئـال و بەیتـی (پێغەمبەر ﷺ) هـەر جـۆرە پیسـی و گوناهێـك لەئێـوە دووربخاتـەوە ﴿وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ و پـاك و خاوێنتـان بكاتـەوە بەتـەواوی ﴿٣٣﴾ ﴿وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ﴾ وە بیربكەنـەوە لـەوەی دەخوێنرێـت لەماڵەكانتانـدا ﴿مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ﴾ لەئایەتەكانی خواو دانایـی (فەرمودەكانی پێغەمبەر ﷺ) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾ بەڕاسـتی خـوا ووردبینـی ئاگـادارە ﴿٣٤﴾ ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ﴾ بەڕاستی پیاوەموسـڵمانەكان وئافرەتە موسڵمانەكان ﴿وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ وە پیاوە باوەڕدارەكان و ئافرەتە باوەڕدارەكان ﴿وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ﴾ و پیاوانی هەمیشە گوێڕایەڵ و ئافرەتانی هەمیشە گوێڕایەڵ ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ﴾ و پیـاوە ڕاسـت گـۆكان و ئافرەتـە ڕاسـت گـۆكان ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ﴾ و پیـاوان و ئافرەتانـی خۆگـر و بەئـارام ﴿وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ﴾ وە پیاوانی لەخـوا ترس و ژنانی لەخـوا تـرس ﴿وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ﴾ و پیاوان و ئافرەتانی بەخشـندە ﴿وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ﴾ و پیـاوان و ئافرەتانـی ڕۆژووەوان ﴿وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ﴾ پیـاوان و ئافرەتانـی داوێـن پـاك ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ﴾ پیاوانێ كە زۆر یادی خوا دەكەن و ئافرەتانێ كەزۆر یادی خوا دەكەن ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم﴾ خوا ئامادەی كردووە بۆ هەموویان ﴿مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ لێخۆشـبوون و پاداشتی گـەورە ﴿٣٥﴾

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ﴾ بـۆ هیچ پیـاوو ئافرەتێکی باوەڕدار نییـە ﴿إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا﴾ کاتێ خواو پێغەمبەرەکـەی بڕیـاری هەر کارێکیان دا ﴿أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ (بۆیان نی یە) کەسەرپشـك بن لەکارەکەیاندا ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ وە هەر کەس سـەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ﴿فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بەگومڕا بونێکی ئاشکرا ﴿٣٦﴾ ﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ﴾ (بیربکـەرەوە) کاتێك دەتووت بەکەسـێك (زەیدی کوڕی حاریثە) کەخوا نیعمەتی بەسـەردا ڕشتبوو، تۆیش چاکەت لەگەڵدا کردبوو (بەئازاد کردنی و پەروەردەکردنی) ﴿أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ﴾ خێزانـت (زەینەب) لای خـۆت ڕاگرەو بیهێڵەوە ﴿وَٱتَّقِ ٱللَّهَ﴾ وە لەخوا بترسـە ﴿وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ﴾ لەدڵی خۆتدا شـتێك دەشـاریتەوە کەخوا ئاشـکرای دەکات ﴿وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ﴾ وە لە(قسـەی) خەڵك دەترسی لەکاتێکدا خوا شیاوترە کەلێی بترسی ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا﴾ ئەمجا کاتـێ زەید پێویسـتی بە (زەینەب)نەما و تەڵاقیـدا ﴿زَوَّجْنَٰكَهَا﴾ ئێمە (زەینەب)مـان لێ مارەکردیت ﴿لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ﴾ بـۆ ئـەوەی هیچ ناڕەحەتـی (وتاوانـێ) نەبێت لەسـەر ئیمانداران ﴿فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ﴾ لە(مارەکردنـی) ژنانـی بەکـوڕ کراوەکانیاندا ﴿إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا﴾ کاتێ پێویسـتیان پێیـان نەمـاو تەڵاقیـان دان ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا﴾ وە فەرمانـی خـوا (بەمـارە کردنـی زەینـەب بـۆت) دراوە و بڕاوەیـە ﴿٣٧﴾ ﴿مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ﴾ هیـچ ناڕەحەتـی (تـاوان) یێك لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ نیە ﴿فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ﴾ لە(مارە کردنی زەینەب) کەخوا بڕیاری داوە بۆی ﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ﴾ باوو سونەت وڕێگای (دانـراوی) خوایـە ﴿فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ﴾ لە نـاو پێغەمبەرانی لەمەوپێشـدا ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾ وە فەرمانـی خـواش بڕیارێکـی بڕاوەیـە (ودەبێت جێ بەجـێ بکرێت) ﴿٣٨﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کەسـانێ کەپەیامەکانـی خـوا ڕادەگەیەنـن ﴿وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ﴾ وە لە(خـوا) دەترسـن وبێجگە لەخوا لەکەسـی تر ناترسـن ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا﴾ خوا بەسـە کـە چاودێر ولێپرسـراوە بێت ﴿٣٩﴾ ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ﴾ موحەممـەد ﷺ باوکـی هیـچ یـەك لەپیاوەکانتـان نیـە (نەزەیـدی کـوڕی حاریثە و نەهیچ کەسـێك تر) ﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّۦنَ﴾ بەڵکو ئـەو نێرداروی خواو کۆتا هەمینی پێغەمبەرانە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾ وە خوا بەهەمـوو شـتێك زانایە ﴿٤٠﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە ﴿ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾ زۆر یـادی خوا بکـەن ﴿٤١﴾ ﴿وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ بەپاکـی یـادی خوا بکـەن بەبەیانیـان و ئێوارانـدا ﴿٤٢﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ﴾ ئـەو زاتێکە بەزەیـی خـۆی دەڕژێنـێ بەسـەرتاندا ﴿وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ﴾ و فریشـتەکانی داوای لێبوردنتـان بـۆ دەکـەن ﴿لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ بەوهۆیەوە(خوا)لەتاریکییەکانەوەدەرتان دێنێ بەرەونووروڕووناکی (ئیمان و ئیسلام) ﴿وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ وە خوا بە بەزەییە بەئیمانداران ﴿٤٣﴾

﴿تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ﴾ ڕۆژێـك بـاوەڕداران دەگەنە خزمەت ئەو (خوا) بەخێرهاتنیان بە(ووشـەی)
سـەلامە﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا﴾ وە خوا پاداشتی چاکی بۆ ئامادە کردوون ﴿٤٤﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ﴾
ئـەی پێغەمبـەر ﷺ بێگومـان ئێمە تۆمان نـاردووە (بۆ خەڵکی) ﴿شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ بەشـایەت
و مـژدە دەرو ترسـێنەر ﴿٤٥﴾ ﴿وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ﴾ و بەبانگخـواز بـۆ (ڕێگـەی) خـوا بەفەرمانی ئەو
﴿وَسِرَاجًا مُّنِيرًا﴾ و چرایەکـی ڕوونـاك کـەرەوە ﴿٤٦﴾ ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم﴾ وە مژدە بـدە بەئیمانداران
کەبێگومـان بـۆ ئەوان هەیـە﴿مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا﴾ بەهرەو بەخشـشێکی گەورە لەلایـەن خواوە ﴿٤٧﴾
﴿وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ﴾ گوێرایەڵـی کافـران و دوو ڕووان مەکە﴿وَدَعْ أَذَىٰهُمْ﴾ گـوێ مەدە بەئازار
دانی ئەوان (بۆ تۆ) ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ وپشت هەر بەخوا ببەستە ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ وە خوا بەسە
کەپشـتیوان بێت ﴿٤٨﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ کاتێ
ئافرەتانی ئیماندارتان مارە کرد ﴿ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾ لەپاشـان لەپێش ئەوەی بچنە لایان
تەڵاقتان دان ﴿فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾ ئەوە لەسـەریان نییە بۆ ئێـوە هیچ عیددەیەك هەڵژمێرن
﴿فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ﴾ کەواتـە موتعەیان (پۆشـاك و نوێن بۆ دڵخۆشـییان) بدەنـێ و تەڵاقیان بدەن
﴿سَرَاحًا جَمِيلًا﴾ بـە تەڵاقدانێکـی جـوان و ڕێك وپێـك ﴿٤٩﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ﴾ ئـەی پێغەمبەر
ﷺ بێگومـان ئێمە حەڵاڵمان کرد بۆ تۆ ﴿أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەو هاوسـەرانەت کەمارەییت
پـێ داوون ﴿وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ﴾ هەروەهـا ئـەو کەنیزەکانـەی کەخـوا دەسـتی تۆی
خسـتن(بەهۆی زاڵ بوونت بەسـەر کافراندا) ﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ﴾ و (بۆمـان حەڵاڵ کردویت)
کچانـی مامـت و کچانی پورت (خوشـکی باوکـت) ﴿وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ﴾ و کچانی خاڵـت و
کچانی پورت (خوشـکی دایکت) ﴿ٱلَّٰتِى هَاجَرْنَ مَعَكَ﴾ ئەوانـەی کەکۆچیان کرد لەگەڵت ﴿وَٱمْرَأَةً
مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِىِّ﴾ هەروەها ئافرەتێکی ئیماندار ئەگەر خۆی ببەخشێ بەپێغەمبەر (بەبێ مارەیی)
﴿إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِىُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا﴾ ئەگەر پێغەمبەر ﷺ وویستی مارەی بکات ﴿خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾
(ئەمەیـان) تەنیا بـۆ تـۆ دروسـتە بەجیـا لەئیماندارانـی تـر ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ﴾ بەڕاسـتی ئێمە
دەزانین چیمان پێویسـت کردووە لەسـەر ئیمانـداران ﴿فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ﴾ دەربارەی
هاوسـەرکانیان و کەنیزەکەکانیـان ﴿لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ﴾ لەبەر ئـەوەی هیچ لەلات زەحمەت
و گران نەبێ (کەشـتانێکت بەجیا لە موسـڵمانان بۆ دروسـتە) ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾وە خوا
لێبوردەی میهرەبانە ﴿٥٠﴾

﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) سەرەی) هەریەكێك لەخێزانەكانت ویست دوای بخە
﴿وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ﴾ و هەر یەكێ لەوانت ویست (پێشی بخەو) بیهێنە بۆ لای خۆت ﴿وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ
مِمَّنْ عَزَلْتَ﴾ وەهەر كامت بوێت (بێتەلات) لەوانەی بەركەنارت كردوون لەوەوپێش ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾
هیچ گوناهێكت لەسەر نییە ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ﴾ ئەو (سەرپشك كردنە) نزیكترە كەچاوو
دڵیانی پێ گەش بێتەوە ﴿وَلَا يَحْزَنَّ﴾ و خەفەت نەخۆن ﴿وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ﴾ و هەموویان
ڕازی بن بەوەی كەپێت داوون ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى قُلُوبِكُمْ﴾ وە خوا دەزانێ بەوەی كە لەدڵتاندایە
﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا﴾ وە خوا زانای لەسەر خۆیە ﴿٥١﴾ ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعْدُ﴾ دوای ئەمانە
(كە هاوسەرتن) هیچ ئافرەتێكت بۆ حەڵاڵ نییە ﴿وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَٰجٍ﴾ و ناشتوانی بیان
گۆڕی بەهاوسەرانی تر ﴿وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ﴾ هەرچەندە بە جوانیان سەرسام بیت (ڕێك و پێكیان
سەرنجت رابكێشێ) ﴿إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ﴾ مەگەر وەك كەنیزەك ببیتە خاوەنی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ رَّقِيبًا﴾ وەخوا بەسەر هەموو شتێكدا چاودێرە ﴿٥٢﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان
هێناوە ﴿لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ﴾ مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەكانی پێغەمبەر ﷺ ﴿إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ﴾
مەگەر ڕێگەتان پێ بدرێ بۆ نان خواردنێك ﴿غَيْرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ﴾ بێ ئەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی
بكەن ﴿وَلَٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُوا۟﴾ بەڵام ئەگەر بانگ كران (بۆنان خواردن) ئەوسا بڕۆنە ژوورەوە
﴿فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟﴾ ئەمجا ئەگەر خواردنەكەتان خوارد بڵاوەی لێ بكەن ﴿وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ﴾
وە مەمێننەوە بۆ قسە كردن ﴿إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ﴾ چونكە بەڕاستی ئەو (مانەوەتان) ئازاری پێغەمبەر
(ﷺ) دەدات ﴿فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ﴾ ئەویش شەرم دەكات لێتان (كە بێ دەنگە) ﴿وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾
بەڵام خوا لە(ووتنی) هەق شەرم ناكات ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا﴾ وە هەر كاتێ داوای شتێكی ناوماڵتان
كرد لە (هاوسەرەكانی پێغەمبەر ﷺ) ﴿فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ﴾ ئەوە لەپشتی پەردەوە لێیان داوا كەن
﴿ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ﴾ ئەو (شێوە داوا كردنە)تان خاوێن ترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش
﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ بە هیچ شێوەیە بۆ ئێوە دروست نی یە ئازاری (دڵی) پێغەمبەری
خوا بدەن ﴿وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا﴾ وە هەرگیز نابێ خێزانەكانی پاش خۆی مارە بكەن
﴿إِنَّ ذَٰلِكُمْ﴾ بەڕاستی ئەو (ئازاردانی دڵ و مارە كردنە)تان ﴿كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا﴾ بەلای خواوە
(گوناهێكی) زۆر گەورەیە ﴿٥٣﴾ ﴿إِن تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا﴾ ئەگەر هەر شتێك ئاشكرا بكەن (بیڵێن) ﴿أَوْ تُخْفُوهُ﴾
یا بیشارنەوە (لە دڵتاندا) ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾ ئەوە بەڕاستی خوا زانایە بەهەموو شتێك ﴿٥٤﴾

﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيۡهِنَّ﴾ (هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ) هیچ گوناهێکیان لەسەر نییە ﴿فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآئِهِنَّ وَلَآ
إِخۡوَٰنِهِنَّ﴾ (ئەگەر بێ حیجاب بن) لای باوکیان و کوڕانیان و براکانیان ﴿وَلَآ أَبۡنَآءِ إِخۡوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ﴾
وبرازاکانیان وخوشکەزاکانیان ﴿وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّۗ﴾ ولای ئافرەتانی هاودینیان ولای
غولام وکەنیزانی خۆیان ﴿وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَۚ﴾ وە لەخوا بترسن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا﴾ بەڕاستی
خوا چاودێرو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا ﴿٥٥﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ﴾ بەڕاستی
خوا وفریشتەکانی سەڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر ﷺ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی
کەباوەڕتان هێناوە ﴿صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا﴾ ئێوەش سەڵاوات و سەلامی زۆری لەسەر
بدەن ﴿٥٦﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ بەڕاستی کەسانێ کەئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن
﴿لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ خوا نەفرینی لێ کردوون لەدونیا و لەدواڕۆژدا ﴿وَأَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابٗا مُّهِينٗا﴾
وە سزای ڕیسواکەری بۆ ئامادەکردون ﴿٥٧﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ وە کەسانێ کەئازاری
پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار ئەدەن ﴿بِغَيۡرِ مَا ٱكۡتَسَبُواْ﴾ بێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان کردبێت ﴿فَقَدِ
ٱحۡتَمَلُواْ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا﴾ ئەوە بەڕاستی ئەوانە بوهتان و تاوانێکی ئاشکرایان گرتۆتە ئەستۆ ﴿٥٨﴾
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ بە هاوسەرانت ﴿وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾
وبەکچانت و بە ئافرەتانی بڕواداران ﴿يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ﴾ با عابا وباڵاپۆشەکانیان بدەن بەسەر
خۆیاندا (خۆیان و جوانیانی پێ داپۆشن) ﴿ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ﴾ ئەوە نزیکترە بناسرێن (بەداوێن پاك)
﴿فَلَا يُؤۡذَيۡنَۗ﴾ تا بەهۆیەوە ئازار نەدرێن ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ وە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە ﴿٥٩﴾
﴿لَّئِن لَّمۡ يَنتَهِ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ﴾ بەڕاستی ئەگەر کۆتایی نەهێنن دوو ڕووان ﴿وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ﴾ وە کەسانێك
لەدڵیاندا نەخۆشی هەیە ﴿وَٱلۡمُرۡجِفُونَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾ و پڕوپاگەندەچییەکان لەمەدینەدا ﴿لَنُغۡرِيَنَّكَ
بِهِمۡ﴾ ئێمە تۆ هان دەدەین (بەجەنگ کردن) لەدژیان ﴿ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ پاشان ماوەیەکی
کەم نەبێ (لەمەدینەدا) دراوسێت نابن (دەردەکرێن) ﴿٦٠﴾ ﴿مَّلۡعُونِينَۖ أَيۡنَمَا ثُقِفُوٓاْ﴾ (ئەوانە) نەفرین لێکراون
لەهەر کوێ بەر دەستت کەوتن ﴿أُخِذُواْ وَقُتِّلُواْ تَقۡتِيلٗا﴾ بەدیل دەگیرێن و بەکوشتن دەکوژرێن ﴿٦١﴾
﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ﴾ خوا (ئەوەی کردووە) بەسوننەت و باو ﴿فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۖ﴾ لەناو کەسانێك
کەپێشتر بوون ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا﴾ هەرگیز باوو سوننەتی خوا گۆڕانی بۆ نییە ﴿٦٢﴾

﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) خەڵك پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی (بەرپابوونی)
ڕۆژی دوایی ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ﴾ بڵێ زانینی (بەرپا بوونی) ئەو ڕۆژە تەنها لای خوایە ﴿وَمَا يُدْرِيكَ﴾
تۆ چوزانیت ﴿لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا﴾ لەوانەیە ڕۆژی دوایی نزیك بێت (بەڵام خەڵك نازانن) ﴿٦٣﴾
﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بەڕاستی خوا نەفرینی لە بێ باوەڕان كردووە ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا﴾ و ئاگری
هەڵگیرساوی بۆ ئامادە كردوون ﴿٦٤﴾ ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۖ﴾ بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا
وَلَا نَصِيرًا﴾ هیچ پشتیوان و یاری دەدەرێكیان نیە ﴿٦٥﴾ ﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ﴾ ڕۆژێ كەدەم
وچاویان لەئاگری دۆزەخدا ئەم دیوو ئەو دیو دەكرێت ﴿يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ﴾ دەڵێن: خۆزگە وكاشكای
﴿أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠﴾ گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەرمان بكردایە ﴿٦٦﴾ ﴿وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ﴾
وەدەڵێ: ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا﴾ بەڕاستی ئێمە بەگوێی سەران و گەورەكانمان كرد
﴿فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠﴾ ئیتر لەڕێگای ڕاست گومڕایان كردین ﴿٦٧﴾ ﴿رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ﴾ ئەی
پەروەردگارمان دوو بەرابەر سزایان بدە ﴿وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا﴾ و بەر نەفرینی گەورەی خۆتیان بخەیت ﴿٦٨﴾
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ﴾ وەك ئەو كەسانە مەبن
كە مووسایان ئازاردا (تۆمەتیان بۆ كرد) ﴿فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ۚ﴾ جا خوا مووسای پاك كردەوە لەوەی
دەیان ووت ﴿وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا﴾ (مووسا) لای خوا ڕێزو پلە وپایەی هەبوو ﴿٦٩﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾
ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ﴿ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ لەخوا بترسن و پارێزكار بن ﴿وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا﴾ وقسەی
ڕاست و دروست بكەن ﴿٧٠﴾ ﴿يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ﴾ كردەوەكانتان چاك دەكات ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْۗ﴾
ولەتاوانەكانتان خۆش دەبێ ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ و هەر كەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی بكات
﴿فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ ئەوە بەڕاستی سەركەوتنێكی گەورەی بەدەست هێناوە ﴿٧١﴾ ﴿إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ﴾
بێگومان ئێمە سپاردەمان نیشانی ﴿عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ﴾ ئاسمانەكان و زەوی و چیاكان
دا(هەڵگرتنی ئەمانەتی دینداریمان پێشنیار كرد بۆیان) ﴿فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا﴾ بەڵام هیچیان
ڕازی نەبوون كەهەڵیگرن و ترسان لەو (ئەمانەتە) ﴿وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُۖ﴾ كەچی ئادەمی ئەو(سپاردەی)
هەڵگرت ﴿إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ بەڕاستی ئەو (ئادەمی) زۆر ستەمكار و نەزانە ﴿٧٢﴾ ﴿لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ
وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ﴾ بۆ ئەوەی خوا سزای پیاوان و ئافرەتانی دوو ڕوو بدات ﴿وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ﴾ وە
(سزای) پیاوان و ئافرەتانی هاوەڵ دانەریش( بدات) ﴿وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِۗ﴾ وە لە پیاوان
و ئافرەتانی ئیماندار تەوبە وەرگرێت ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًۢا﴾ وەخوا لێبوردەی میهرەبانە ﴿٧٣﴾

## سورەتی ﴿ سَبَإٍ ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى﴾ هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوایە ﴿لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ کەهەرچی
لەئاسمانەکان و زەویدایە تەنیا موڵکی ئەوە ﴿وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾ وە لە دوارۆژیشدا ستایش هەر
بۆ ئەوە ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾ وە ئەو (خوا) دروست کاری ووردبینە ﴿١﴾ ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾
(خوا) دەزانێ چی دەچێ بەناو زەویدا ﴿وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا﴾ و چی لێ دەردەچێ ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾
وە چی دێتە خوارەوە لەئاسمان ﴿وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ و چی بۆ سەر دەکەوێ ﴿وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ﴾
وە خوا میهرەبانی لێبوردەیە ﴿٢﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بێ باوەڕان ووتیان: ﴿لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ﴾ ڕۆژی
دواییمان (بەسەردا) نایەت ﴿قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ (وانیە) سوێند
بەپەروەردگارم ئەو (قیامەتە)تان بۆ دێ ﴿عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ﴾ (خوا) زانای هەموو پەنهانەکانە ﴿لَا يَعْزُبُ عَنْهُ﴾
لەخوا گوم نابێ ﴿مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ قورسایی گەردیلەیەك لەئاسمانەکان وزەویدا
﴿وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ﴾ وە بچوکترو گەورەتر لەوە نییە ﴿إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ ئیللا
لەکتێبێکی ئاشکراو ڕووندایە ﴿٣﴾ ﴿لِّيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوانەی
باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە بداتەوە ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ﴾ بۆ ئەوانە هەیە لێبوردنی
(پەروەردگار) ﴿وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ و پاداشت و ڕۆزی یەکی چاك ﴿٤﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِىٓ ءَايَٰتِنَا﴾ وە کەسانێك
کەهەوڵ دەدەن باوەڕ بەنیشانەکانی ئێمە نەکرێ ﴿مُعَٰجِزِينَ﴾ دەستە پاچەن وهیچیان پێ ناکرێت
﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ﴾ بۆ ئەوانەیە سزای زۆر خراپ وسەخت ﴿٥﴾ ﴿وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ﴾
ئەوانە زانیاریان پێ دراوە دەزانن ﴿ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت
هاتووە ﴿هُوَ ٱلْحَقَّ﴾ تەنها ئەوە ڕاستە ﴿وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾ و ڕێنموونی (خەڵك) دەکات
بۆ ڕێگای خوای زاڵی ستایش کراو ﴿٦﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕ بوون دەیانووت
﴿هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ﴾ ئایا پیاوێکتان نیشان بدەین ﴿يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾ کە هەواڵتان پێ دەدات
کاتێك(مردن و) بە تەواوی ڕزین و پارە پارە بوون ﴿إِنَّكُمْ لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ بەڕاستی ئێوە سەر لەنوێ
دروست دەکرێنەوە ﴿٧﴾

﴿أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ ئایا ئەو (پێغەمبەر ﷺ) بەدەم خواوە درۆ دەکات ﴿أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ﴾ یا شێتە ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ (نەخێـر وانیـە) بەڵکو ئەوانەی بێ باوەڕن بـەدوا ڕۆژ ﴿فِى ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَـٰلِ ٱلْبَعِيدِ﴾ لەناو سـزاو گومڕاییەکـی دوور (لەڕاسـتی)دان ﴿٨﴾ ﴿أَفَلَمْ يَرَوْا۟﴾ دەی ئایا سـەرنج نادەن ﴿إِلَىٰ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُم﴾ بـۆ ئەوەی لەبەردەم و لەپشـتیانەوەیە ﴿مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ لەئاسـمان و زەویدا ﴿إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ﴾ ئەگەر بمانەوێ دەیان بەین بەناخی زەویدا ﴿أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ﴾ یان دەیخەینە خوار بەسەریاندا ﴿كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ چەند پارچەیەك لەئاسـمان ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً﴾ بەڕاسـتی لـەوەدا بەڵگەو پەند هەیـە ﴿لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾ بـۆ هـەر بەندەیـەك ڕوو لەخـوا بێـت ﴿٩﴾ ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا﴾ سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی لەلایـەن خۆمانـەوە فـەزڵ و بەهرەیەکـی گەورەمـان بـەداوود بەخشـیبوو ﴿يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ﴾ ئـەی چیـا وباڵنـدەکان لەگـەڵ داوود زیکـرو تەسـبیحاتی خـوا بکـەن ﴿وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ﴾ وە ئاسـنمان بـۆ نەرم کردبـوو ﴿١٠﴾ ﴿أَنِ ٱعْمَلْ سَـٰبِغَـٰتٍ﴾ (فەرمانمان پێ کـرد) قەڵغان وزرێی جەنگیان لێ دروست بکە ﴿وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ﴾ و لەچنینی زرێدا بائەندازەیی ئەڵقەکان وەك یەك بن ﴿وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا﴾ وکردەوەی چاك بکەن ﴿إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی من بەوەی کەدەیکەن بینام ﴿١١﴾ ﴿وَلِسُلَيْمَـٰنَ ٱلرِّيحَ﴾ وەبۆ سولەیمان (با، هەوا) مان ڕام هێنا ﴿غُدُوُّهَا شَهْرٌ﴾ بەیانیان تانیوەڕۆ (با) بەئەندازەی مانگێك ڕێگای دەبڕی ﴿وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ﴾ وە (نیوەڕوان تا) ئێوارانیش بەئەندازەی مانگێك ڕێگای دەبڕی ﴿وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ﴾ وە مسمان بۆ تواندەوە وەك کانیاو (دەڕۆی) ﴿وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ و هەندێ لەجنۆکەکانمان ڕام هێنا بوو لەبەر دەسـتی دا کاریان دەکرد ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِۦ﴾ بەفەرمانی پەروەردگاری ﴿وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا﴾ و ئەگەر هەر کام لەوان لەفەرمانی ئێمە لابدا ﴿نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾ سـزای ئاگری هەڵگراوی پێ دەچێژین ﴿١٢﴾ ﴿يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ﴾ (سولەیمان) هەرچی بوویستایە بۆیان دروست دەکرد ﴿مِن مَّحَـٰرِيبَ وَتَمَـٰثِيلَ﴾ لەپەرستگاو پەیکەرو ﴿وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ﴾ چەندین قاپی (نان خواردن) وەك حەوزی گەورەو ﴿وَقُدُورٍ رَّاسِيَـٰتٍ﴾ چەنـد قازان و مەنجەڵی دامەزراو (نەدەجوڵان لەبەر گەورەییان) ﴿ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا﴾ ئـەی ئالی داوود شـوکرانە بژێری خوا بکـەن ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ﴾ بەڵام کەمێ لەبەندەکانم (بۆ خوا) سوپاسگوزارن ﴿١٣﴾ ﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ﴾ ئەمجا کاتێك سولەیمانمان مراند ﴿مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ﴾ هیچ شتێك مردنی سولەیمانی نیشان (جنۆکەکان) نەدا ﴿إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ﴾ بێجگـە لەخۆرەو مۆریانەی زەوی ﴿تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ﴾ کە داردەسـتەکەی (سـولەیمان) یان دەخوارد (کەسـولەیمان خۆی دابوو بەسـەریدا) ﴿فَلَمَّا خَرَّ﴾ ئەمجا کاتێ (سـولەیمان) کەوت ﴿تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ﴾ بـۆ جنۆکـەکان ڕوون بویەوە ﴿أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ﴾ کـە ئەگەر غەیبیـان بزانیایە ﴿مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ﴾ لەو سزا ڕیسواکەرەدا نەدەمانەوە ﴿١٤﴾

﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی بۆ خەڵکی سەبەء لەو شوێنی ژیانەیاندا نیشانەیەك (لەسەر دەسەڵاتی خوا) هەبوو ﴿جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ﴾ دوو باخات لای ڕاست و لای چەپی (شوێنەکەیانەوە) هەبوو ﴿كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ﴾ (پێیان وترا) لەڕۆزی پەروەردگارتان بخۆن ﴿وَاشْكُرُوا لَهُ﴾ و سوپاسی ئەو بکەن ﴿بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ﴾ و لاتێکی پاك و خۆش و پەروەردگارێکی لێبوردە(یان هەیە) ⑮ ﴿فَأَعْرَضُوا﴾ ئەمجا ڕوویان وەرگێڕا ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ﴾ بەو هۆیەوە لافاوی وێرانکارمان بۆ ناردن ﴿وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ﴾ دوو باخاتی (چاکی بەرووبووم دار) ئەوانمان گۆڕی بەدوو باخاتی ﴿ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ﴾ (خراپی) خاوەن بەرێکی تفت و تاڵ و دار گەز ﴿وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ﴾ و کەمێك لەداری نەبگ (تاوگ، سیدر) ⑯ ﴿ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا﴾ ئا بەو جۆرە تۆڵەمان لێ سەندن بەهۆی نا سوپاسییانەوە ﴿وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ﴾ و ئایا جگە لەوانەی زۆر سپڵەن تۆڵە لەکەس ئەسێنین؟! ⑰ ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا﴾ وە لەنێوان (ڕێگای) ئەوان و ئەو شارانەی پیتو بەرەکەتمان تێ خستبوون (لەشام) سازاندبوومان ﴿قُرًى ظَاهِرَةً﴾ چەند شارۆچکە و دێهاتی نزیك ولەیەکەوە دیار ﴿وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ﴾ و ڕێگەی نزیکمان بۆ ڕۆشتن لەنێوان (ئەو دێهاتانە)دا دانابوو ﴿سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ﴾ (ووتمان پێیان)چەند شەوو ڕۆژ بەو (ڕێگایانە)دا بڕۆن بەئارامی و بێ ترس ⑱ ﴿فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا﴾ کەچی (خەڵکی سەبەء) ووتیان ئەی پەروەردگارمان ماوەی (ڕێگەی) سەفەرەکانمان دور بخەرەوە ﴿وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ﴾ وستەمیان لەخۆیان کرد ﴿فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ﴾ ئێمەش کردمانن بەداستانێ لەناو خەڵکدا بیگێڕنەوە ﴿وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾ پرژ و بلاومان کردن (بەوڵاتاندا) بەو پەڕی پرژو بلاو کردن ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەو بەسەرهاتەدا ﴿لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ چەند نیشانە هەیە بۆ هەموو زۆر خۆگری شوکرانە بژێر ⑲ ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی شەیتان گومانی خۆی لەواندا بەدی هێنا ﴿فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆیە ئیمانداران نەبێت هەموویان شوێنی شەیتان کەوتن ⑳ ﴿وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ﴾ وە شەیتان هیچ دەسەڵاتی بەسەر ئیمانداران دا نەبوو ﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ﴾ تەنها بۆ ئەوەی بزانرێت کێ باوەڕی بەڕۆژی دوایی هەیە ﴿مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ﴾ وەکێ لەوان دەربارەی (دواڕۆژ) لەگوماندایە ﴿وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ﴾ وە پەروەردگارت (ئەی موحەممەد ﷺ) بەسەر هەموو شتێکدا چاودێرە ㉑ ﴿قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ هاوار بکەن لەوانەی کەبێجگە لەخوا بەپەرستراوتان دەزانین ﴿لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ بەقەدەر هەرە وردیلەیەکیان بەدەست نیە ﴿فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ﴾ نە لە ئاسمانەکان و نە لەزەویدا ﴿وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ﴾ وە ئەو پەرستراوانە هاوبەشی (خوا) نەبوون (لە دروست کردنی) ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ﴾ و هیچ یەك لەوان یارمەتی دەری خوا نەبوون ㉒

﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ﴾ وە تکا کردن لای خوا سوودی نییە ﴿إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥۚ﴾ مەگەر بۆ کەسێ ئەو (خوا) ڕێگە بدات ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ﴾ هەتا کاتێ ترس و بیم لەدڵی (تکاکاران) لادەبرێ (بەهۆی ڕێگەپێدانی شەفاعەت) ﴿قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ﴾ (بە یەکتر) دەڵێن: پەروەردگارتان چی بڕیارێکی فەرموو ﴿قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ﴾ دەڵێن: ووتە ڕاستەکەی فەرموو (کەڕێگە دانە بەتکا کردن) ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ﴾ وە تەنها (خوا) بەرزو بڵندو گەورەیە ﴿٢٣﴾ ﴿قُلۡ مَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ بڵێ کێ ڕۆزیتان دەدات لەئاسمانەکان و زەویدا ﴿قُلِ ٱللَّهُۖ﴾ بڵێ خوا (ڕۆزیمان دەدات) ﴿وَإِنَّآ أَوۡ إِيَّاكُمۡ﴾ بێگومان ئێمە یا ئێوە (یەکێکمان) ﴿لَعَلَىٰ هُدًى أَوۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ لەسەر ڕێنموونین یان لەگومڕاییەکی ئاشکرادایین ﴿٢٤﴾ ﴿قُل لَّا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّآ أَجۡرَمۡنَا﴾ (بڵێ) پرسیارتان لێ ناکرێ لەتاوانێ کەئێمە کردوومانە ﴿وَلَا نُسۡـَٔلُ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ ئێمەش پرسیارمان لێ ناکرێ لەوەی ئێوە دەیکەن ﴿٢٥﴾ ﴿قُلۡ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَا رَبُّنَا﴾ بڵێ پەروەردگارمان ئێمەو ئێوە کۆدەکاتەوە ﴿ثُمَّ يَفۡتَحُ بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ﴾ لەپاشان بڕیار دەدات لەنێوانماندا بەهەق و ڕاستی ﴿وَهُوَ ٱلۡفَتَّاحُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ وە هەر ئەوە دادوەری زانا ﴿٢٦﴾ ﴿قُلۡ أَرُونِيَ ٱلَّذِينَ أَلۡحَقۡتُم بِهِۦ شُرَكَآءَۖ﴾ بڵێ ئادەی نیشانم دەن ئەو هاوبەشانەی بردوبووتاننە ڕیزی خواوە ﴿كَلَّاۚ بَلۡ هُوَ ٱللَّهُ﴾ وانییە بەڵکو زاتی خوایە ﴿ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ زاڵی دروست کارە ﴿٢٧﴾ ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا﴾ وە ئێمە تۆمان نەناردوە بۆ هەموو ئادەمی بەمژدەدەر و ترسێنەر نەبێت ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانن ﴿٢٨﴾ ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ﴾ وە دەڵێن ئەم بەڵێنی (ڕۆژی دوایی)ە کەی دێ ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست گۆن ﴿٢٩﴾ ﴿قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوۡمٖ﴾ بڵێ بەڵێنی ئێوە ڕۆژێکە ﴿لَّا تَسۡتَـٔۡخِرُونَ عَنۡهُ سَاعَةٗ وَلَا تَسۡتَقۡدِمُونَ﴾ نەساتێك دوا دەکەون لێی و نەپێشیش دەکەون ﴿٣٠﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ووتیان ﴿لَن نُّؤۡمِنَ بِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ﴾ ئێمە هەرگیز باوەڕ ناهێنین بەم قورئانە ﴿وَلَا بِٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ﴾ و بەو کتێبانەش پێش ئەم (قورئانە) هاتوون ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ خۆزگە دەت دی کاتێ ئەو ستەمکارانە ﴿مَوۡقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ ڕادەگیرێن لەبەردەم (دادگای) پەروەردگاریاندا ﴿يَرۡجِعُ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ﴾ قسەو تاوان ئاڕاستەی یەکتر دەکەن ﴿يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ﴾ لاوازو ژێردەستە کراوان دەڵێن ﴿لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ بەوانەی خۆیان بەگەورە دەزانی (دەسەڵاتدارەکان) ﴿لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە نەبوونایە بێگومان ئێمە باوەڕدار دەبووین ﴿٣١﴾

﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ ئەوانـەی خۆیان بەگـەورە دادەنا دەڵێن ﴿لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ﴾ بەوانەی ژێردەستە و لاواز کرابـوون ﴿أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ﴾ ئایا ئێمـە بەرگریمان کردن لەڕێنموونی ﴿بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُم﴾ دوای ئـەوە بۆتـان هات ﴿بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ﴾ (نەخێر وانیە) بەڵکـو خۆتان تاوانبار بوون ﴿٣٢﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ﴾ ژێـر دەستەو چەوساوەکان دەڵێـن ﴿لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ بەوانـەی خـۆ بـەزل زان بـوون ﴿بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ (نەخێـر وانیـە) بەڵکو پیلانـی (ئێوە) بەشـەو و بەڕۆژ (چەواشـەی کردین) ﴿إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ﴾ کاتێك فەرمانتان پێ دەداین کە بێ بڕوا بین بەخوا ﴿وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ﴾ وە وێنە وهاوبەشـانی بـۆ دابنێین ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ﴾ هەموویان پەشـیمانی دەشـارنەوە ﴿لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۚ﴾ کاتێك کەسـزای دۆزەخ دەبینـن ﴿وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ﴾ وە زنجیـرو تەوقمـان کـردە گەردنـی بێباوەڕان ﴿هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ ئایا تۆڵەیان لێ ئەسەنرێت جگە لەسزای ئەوەی دەیان کرد ﴿٣٣﴾ ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ﴾ وە لەهیچ شـارێکدا پێغەمبەری ترسێنەرمان نەناردووە ﴿إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ﴾ مەگـەر خاوەن نازو نیعمەتەکانی (دەوڵەمەندەکانی) ووتوویانە ﴿إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ بەڕاسـتی ئێمـە باوەڕمـان نـی یـە بـەو (ئاینـە)ی ئێـوەی پـێ نێـردراون ﴿٣٤﴾ ﴿وَقَالُواْ نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا﴾ وە ووتیـان ئێمـە سـامان و منداڵمـان زۆرتـرە (لەئێـوە) ﴿وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ وە ئێمە قەت سـزا نادرێین ﴿٣٥﴾ ﴿قُلۡ إِنَّ رَبِّي﴾ بڵـێ بەڕاسـتی پەروەردگـارم ﴿يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ﴾ ڕۆزی فـراوان دەکات ودەیگرێتـەوە بۆ هەر کەسـێ بیەوێ ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆر بـەی خەڵك نازانن ﴿٣٦﴾ ﴿وَمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُم بِٱلَّتِي﴾ وە سامان و منداڵتان شتێك نین ﴿تُقَرِّبُكُمۡ عِندَنَا زُلۡفَىٰٓ﴾ لای ئێمە پلەو پایەتان نزیـك بکەنەوە ﴿إِلَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾ مەگـەر ئەوەی باوەڕی هێنابێ و کـردەوەی چاکی کردبێ ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَزَآءُ ٱلضِّعۡفِ﴾ بـۆ ئەوانـە پاداشـتی دوو بەرامبـەر هەیە ﴿بِمَا عَمِلُواْ﴾ بەهۆی ئـەو چاکانەی کەکردویانـە ﴿وَهُمۡ فِي ٱلۡغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ﴾ ئەوان لەکۆشـکە بەرزەکانی (بەهەشـتدا) لەئاسـایش دان ﴿٣٧﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ يَسۡعَوۡنَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا﴾ وە ئەوانـەی هەوڵـی پوچەڵ کردنـەوەی نیشـانەکانی ئێمە دەدەن ﴿مُعَٰجِزِينَ﴾ دەسـتە پاچەن و هیچیان پێ ناکرێ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ﴾ ئەوانە لەسـزای دۆزەخدا ئامادە کراو دەبـن ﴿٣٨﴾ ﴿قُلۡ إِنَّ رَبِّي﴾ بڵـێ بێگومان پەروەردگـارم ﴿يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥۚ﴾ ڕۆزی هـەرکام لەبەندەکانـی بیەوێ فراوان یان کەمی دەکات بۆی ﴿وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن شَيۡءٖ﴾ وە ئێوە هەر شـتێك ببەخشـن (لەپێناو خـوادا) ﴿فَهُوَ يُخۡلِفُهُۥۖ﴾ ئەوە خوا جێگـەی پڕدەکاتەوە ﴿وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ وە ئەو (خوا) چاکترینی ڕۆزی دەرانە ﴿٣٩﴾

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ وە ڕۆژێك(خوا) هەموویان كۆ دەكاتەوە ﴿ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ﴾ پاشان بەفریشتەكان
دەفەرموێ ﴿أَهَٰؤُلَاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ﴾ ئایا ئەوانە (لەدونیا) ئێوەیان دەپەرست ﴿٤٠﴾ ﴿قَالُوا سُبْحَانَكَ﴾
(فریشتەكان) دەڵێن پاك و بێگەردی بۆ تۆ ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم﴾ تەنیا تۆ گەورە وپشتیوانیی ئێمەی
نەك ئەوان ﴿بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ﴾ بەڵكو ئەوان جنۆكەیان دەپەرست ﴿أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ﴾
زۆربەیان باوەڕیان بەوان (جنۆكە) هەبوو ﴿٤١﴾ ﴿فَالْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا﴾ ئەمجا ئەمڕۆ
ناتوانن هیچ سوودو زیانێك بەیەكتری بگەیەنن ﴿وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ وە بەستەمكاران دەڵێین:
﴿ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ﴾ سزای ئاگری دۆزەخ بچەژن ﴿الَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ ئەوەی ئێوە باوەڕتان پێی
نەبوو ﴿٤٢﴾ ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ كاتێ بخوێنرێتەوە بەسەریاندا ﴿آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ﴾ نیشانە ڕوونەكانی ئێمە
﴿قَالُوا مَا هَٰذَا إِلَّا رَجُلٌ﴾ دەڵێن: ئەمە (پێغەمبەر ﷺ) هیچ نییە جگە لەپیاوێك ﴿يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ﴾ دەیەوێ
ڕێگریتان بكات ﴿عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُكُمْ﴾ لەوەی كەباوو باپیرانتان دەیان پەرست ﴿وَقَالُوا مَا هَٰذَا﴾ وە
دەڵێن: ئەمە (قورئان) شتێك نییە﴿إِلَّا إِفْكٌ مُّفْتَرًى﴾ بێجگە لە درۆیەكی هەڵبەستراو بەناوی خواوە
﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ﴾ وە بێباوەڕان بەڕاستی بە (قورئان) یان دەووت كەبۆیان هاتبوو
﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەمە تەنها جادوویەكی ئاشكرایە ﴿٤٣﴾ ﴿وَمَا آتَيْنَاهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا﴾ (خۆ
ئێمە) پێشتر چەند كتێبێكمان پێ نەدابوون كە بیانخوێننەوە ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ﴾ و بۆمان نەناردبوون
﴿قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ﴾ پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێكی ترسێنەر ﴿٤٤﴾ ﴿وَكَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ وە كەسانێ پێش
ئەمان (قوڕەیشییەكان) باوەڕیان بەپێغەمبەرانیان نەهێنا ﴿وَمَا بَلَغُوا مِعْشَارَ مَا آتَيْنَاهُمْ﴾ ئەمان (قوڕەیش)
نەگەیشتبوونە دەیەكی ئەوەی بەوانمان دابوو ﴿فَكَذَّبُوا رُسُلِي﴾ ئەمجا ئەوان باوەڕیان بەپێغەمبەرانی
من نەهێنا ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ جا چۆن بوو تۆڵە سەندنی ئێمە (لەوان) ﴿٤٥﴾ ﴿قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ﴾
بڵێ من تەنیا بەیەك شت ئامۆژگاریتان دەكەم ﴿أَن تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَادَىٰ﴾ كەدوو دوو، یەك یەك، لەبەر
خوا هەڵسن ( وگوێڕایەڵی فەرمانەكانی بن) ﴿ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾ پاشان بیر بكەنەوە
هاوڕێكەتان(پێغەمبەر ﷺ) شێت نییە ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم﴾ ئەو (پێغەمبەر ﷺ) تەنیا ترسێنەرە بۆ
ئێوە ﴿بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ لەپێش هاتنی سزای سەختی (قیامەت) ﴿٤٦﴾ ﴿قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ﴾
بڵێ هەركرێ و پاداشتێكم لێ داوا كردوون ئەوە بۆ خۆتان ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ﴾ پاداشتی من
تەنها لەسەر خوایە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ وە ئەو (خوا) بەسەر هەموو شتێكدا ئاگادارە ﴿٤٧﴾ ﴿قُلْ
إِنَّ رَبِّي يَقْذِفُ بِالْحَقِّ﴾ بڵێ بەڕاستی پەروەردگارم بەتوندی هەق دەدات بەسەر (بەتاڵدا) ﴿عَلَّامُ الْغُيُوبِ﴾
(خوا) زانایە بە نهێنی و شاراوەكان ﴿٤٨﴾

﴿قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ (ئایینی) ڕاست هات ﴿وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ و بەتاڵ
(نەما) و دروست نابێتەو دووبارە ناگەڕێتەوە ﴿٤٩﴾ ﴿قُلْ إِن ضَلَلْتُ﴾ بڵێ ئەگەر من گومڕابم ﴿فَإِنَّمَآ أَضِلُّ
عَلَىٰ نَفْسِى﴾ ئەوە زیانەکەی تەنیا بۆ خۆمە ﴿وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ﴾ وە ئەگەر ڕێنموونبم ﴿فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓ﴾ ئەوە
بەهۆی ئەو(قورئانە)وەیە کەپەروەردگارم بۆی ناردووم ﴿إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ﴾ بەڕاستی خوا بیسەرو
نزیکە ﴿٥٠﴾ ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) ئەگەر دەبینی کاتێ (بێ باوەڕان) زۆر دەترسن
﴿فَلَا فَوْتَ﴾ ئەمجا بەهیچ جۆرێ ڕزگار بوونیان نییە ﴿وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ﴾ وە لەشوێنێکی نزیك
(دۆزەخەوە) دەبرێن بۆ ناوی ﴿٥١﴾ ﴿وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ لەو کاتەدا دەڵێن باوەڕمان هێنا بەو (قورئانە)
﴿وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ﴾ چۆن (باوەڕیان) دەست دەکەوێ لەشوێنێکی دوورەوە ﴿٥٢﴾
﴿وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ﴾ کەبەڕاستی ئەوان لەدونیادا بێ باوەڕ بوون پێی ﴿وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ
بَعِيدٍ﴾ وە بە نەزانی قسەیان لەپەنهانیەکان دەکرد لەشوێنێکی دورەوە (کەدونیایە). ﴿٥٣﴾ ﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ
وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ﴾ بەر بەست دەخرێتە نێوان ئەوان و ئەوەی ئارەزووی دەکەن (کەبڕوا هێنان و تەوبە
کردنە) ﴿كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ﴾ هەر وەکو بەهاوشێوەکانیان کرا لەپێش ئەماندا ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ
مُّرِيبٍۭ﴾ بەڕاستی ئەوان لەگومانێکی دوو دڵ کەردان ﴿٥٤﴾

## سورەتی ﴿ فَاطِر ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ هەموو ستایش بۆ خوایە کەبەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەوییە
﴿جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا﴾ فریشتەکانی کردووە بەنێراوانێك ﴿أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾ خاوەنی (چەند
جۆرە) باڵن : دووان و سیان و چوار ﴿يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ﴾ (خوا) هەرچی بیەوێ لەدروست
کردندا زیادی دەکات ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە ﴿١﴾
﴿مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ﴾ خوا هەر ڕەحمەت وچاکەیەك بۆ خەڵك بەڕەڵا بکات و بیکاتەوە ﴿فَلَا مُمْسِكَ
لَهَا﴾ ئیتر شتێك نیە ڕێگری لێ بکات وبیگرێتەوە ﴿وَمَا يُمْسِكْ﴾ وەخوا هەر بەهرەیەك بگرێتەوە
﴿فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ ئیتر لەپاش گرتنەوەی خوا بەڕەڵاکەر و نێرەری بۆ نییە ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ وە
خوا زاڵی باڵادەستی کار دروستە ﴿٢﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ بیربکەوە
لەبەهرەی خوا بەسەرتانەوە ﴿هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ﴾ ئایا بێجگە لەخوا دروست کەرێکی تر هەیە
﴿يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ کەڕۆزیتان بدات لەئاسمان و زەویدا ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی
ڕاست نییە بێجگە لەخوا ﴿فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ دەی چۆن وا ڕوو وەردەگێڕن (لەیەکخواپەرستی) ﴿٣﴾

﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ﴾ ئەگەر باوەڕیان پێ نەهێنایت (دڵگران مەبە) ﴿فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ﴾ چونكە بەڕاستی
پێغەمبەرانی پێش تۆش باوەڕیان پێ نەهێنرا ﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾ هەموو كارو بارەكان تەنها بۆ لای
خوا دەگەڕێتەوە ﴿٤﴾ ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ ئەی خەڵكینە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ
الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ دەی كەواتە با ژیانی دونیا فریوتان نەدات ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ وە باشەیتان بە(بەزەیی
و لێبوردەی) خوا فریوتان نەدات ﴿٥﴾ ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ﴾ بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە ﴿فَاتَّخِذُوهُ
عَدُوًّا﴾ دەی كەواتە ئێوەش بەدوژمنی خۆتانی دابنێن ﴿إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ﴾ بێگومان ئەو (شەیتان) تاقم
وكۆمەڵەكەی بانگ دەكات ﴿لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی
(دۆزەخ) ﴿٦﴾ ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون سزای بەتینیان بۆ هەیە ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا
وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو كردەوە چاكەكانیان كردوە ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ لێبوردن
و پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە ﴿٧﴾ ﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ﴾ دەی ئایا كەسێ كەكردەوەی خراپی خۆی
بۆ جوان كراوە ﴿فَرَآهُ حَسَنًا﴾ و بەچاك و جوانی دەبینێ (وەك كەسێكە پێوەری چاكەو خراپەی ئایین
بێت) ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَاءُ﴾ وە بەڕاستی خوا هەركەسێكی بوێ گومڕای دەكات ﴿وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾
وە هەركەسێكی بوێ ڕێنموونی دەكات ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ﴾ دەی كەواتە بەخەفەت خواردن
لەبەر (ئیمان نەهێنانی) ئەوان خۆت مەفەوتێنە ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ بەڕاستی خوا بەوەی كەئەوان
دەیكەن ئاگادارە ﴿٨﴾ ﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ﴾ خوا زاتێكە (با،هەوا) كانی ناردووە ﴿فَتُثِيرُ سَحَابًا﴾ بۆ
ئەوەی هەورەكان بگەڕێنێ (بڵاویان بكەنەوە) ﴿فَسُقْنَاهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ﴾ ئەمجا ئەو (هەورانە) دەنێرین
بۆ سەر وڵاتێكی مردوو ﴿فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ جا (بارانی لێ دەبارێ و) زەوی پێی زیندوو
دەكەینەوە لەپاش ووشك بوون و مردنی ﴿كَذَٰلِكَ النُّشُورُ﴾ زیندوو كردنەوەی(مردووانیش لەقیامەتدا)
هەر بەو شێوەیە ﴿٩﴾ ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ﴾ هەر كەسێ گەورەیی و سەربەرزی دەوێ (لەخوای بوێ)
﴿فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا﴾ چونكە بەڕاستی هەموو گەورەیی و دەسەڵات هەر بۆ خوایە ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ﴾
ووتەی پاك و چاك تەنها بۆ لای ئەو (خوا) سەر دەكەوێ ﴿وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ وە (ووتەی پاكو)
كردەوەی چاك بەرز دەكاتەوە (بۆ لای خۆی) ﴿وَالَّذِينَ يَمْكُرُونَ السَّيِّئَاتِ﴾ وە ئەوانەی كەپیلانە خراپەكان
دەگێڕن ﴿لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ سزایەكی توندو بەتینیان بۆ هەیە ﴿وَمَكْرُ أُولَٰئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾ و فێڵ و پیلانی ئەوانە
لەناو دەچێ ﴿١٠﴾ ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾ خوا (باوكی) ئێوەی لەخاك دروست كردووە ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾
لەپاشان (نەوەكانی دروست كرد) لەنوتفەیەك ﴿ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجًا﴾ ئەمجا (خوا) كردوونی بەچەند
جووت (نێر و مێ) ﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ﴾ وە هیچ مێینەیەك (ئافرەتێك) دوو گیان نابێ و
سكەكەی دانانی (نابێت) مەگەر بەئاگاداری خوا نەبێت ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ﴾ وە هیچ تەمەن درێژ كراوێ
تەمەنی درێژ ناكرێ ﴿وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ﴾ وە لەتەمەنی كەم ناكرێ مەگەر لەكتێبێك (لوح
المحفوظ ) دا نوسراوە ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بەڕاستی ئەم كارە بۆ خوا ئاسانە ﴿١١﴾

﴿وَمَا يَسْتَوِي ٱلْبَحْرَانِ﴾ ئەو دوو (جۆرە) دەریا وەك یەك نین ﴿هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ﴾ ئەمەیان سازگار وشیرینە
﴿سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ﴾ و خواردنەوەی ئاسانە و خۆشە ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ ئەوی تریان سوێرو تاڵ و تفتە
﴿وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا﴾ و لەهەردووکیان گۆشتی تەڕو تازە دەخۆن ﴿وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً
تَلْبَسُونَهَا﴾ و خشڵی (مرواری و سەدەف و دوڕ لەدەریا) دەرئەهێنن و دەیپۆشن، وخۆتانی پێ
دەڕازێننەوە ﴿وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ﴾ و کەشتی یەکان دەبینی ئاوەکە لەت دەکەن (کاتێ بەناویدا
دەڕۆن) ﴿لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ﴾ بۆ ئەوەی هەندێ ڕزق و ڕۆزی خوا پەیدا بکەن ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾
وە تا ستایشی خوا بکەن (لەسەر بەهرەکانی) ﴿١٢﴾ ﴿يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ﴾ (خوا) شەو دەکات بەناو
ڕۆژدا ﴿وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ﴾ و ڕۆژ دەکات بەناو شەودا ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ وە خۆرو مانگی
ڕام هێناوە ﴿كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ هەریەکەیان (لە خولگەی خۆیدا) تا ئەو ماوەیەی بۆی
دیاری کراوە دەگەڕێت ودەسوڕێتەوە ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ ئەوەیە خوای پەروەردگاری ئێوە
﴿لَهُ ٱلْمُلْكُ﴾ پادشایەتی تەنها بۆ ئەوە ﴿وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ و ئەوانەی ئێوە هاواریان لێ
دەکەن بێجگە لەخوا ﴿مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ﴾ خاوەنی توێکڵە سپیەکەی ناوکی خورمایش نین ﴿١٣﴾
﴿إِن تَدْعُوهُمْ﴾ (بتەکان) ئەگەر نزاو هاواریان لێ بکەن ﴿لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ﴾ هاوارەکەتان نابیستن
﴿وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ﴾ و ئەگەر بیشی بیسن وەڵامتان نادەنەوە ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾
و لەڕۆژی قیامەتیشدا بێ باوەڕ دەبن بەهاوبەش دانانەکەتان (وبەدرۆتان دەخەنەوە)
﴿وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾ وە دڵنیابە کەس وەك (خوای) ئاگادار ئاگادارت ناکات (لەسەر ئەنجامتان) ﴿١٤﴾
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ئەی خەڵکینە هەر ئێوە هەژاری لای خوان ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾
وە تەنیا خوایە بێ نیازی ستایش کراو ﴿١٥﴾ ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ﴾ ئەگەر (خوا) بیەوێ لەناوتان
دەبات ﴿وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ وە خەڵکێکی تری تازە دەهێنێت ﴿١٦﴾ ﴿وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ وە ئەمەش
بۆ خوا کارێکی گران نییە ﴿١٧﴾ ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ هیچ گوناهبارێك گوناهی کەسێکی تر
هەڵناگرێت ﴿وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا﴾ وە ئەگەر بارگرانێ (گوناهبارێ) بانگی کەسێ تر بکات بۆ
هەڵگرتنی (بارە گوناهەکەی) ﴿لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ﴾ هیچ لەو (بارە گوناهە) هەڵناگرێ ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا
قُرْبَىٰٓ﴾ هەرچەندە (داوا لێ کراوەکە) خزمیشی بێت ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی تۆ (ئەی موحەممەد
ﷺ) تەنها ئەوانە بێدار دەکەیتەوە ﴿يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ﴾ کە بەپەنهانی لەپەروەردگاریان دەترسن
﴿وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ و نوێژەکانیان بەرێکی بەجێ دەهێنن ﴿وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ﴾ وە هەر
کەس خۆی پاك ڕاگرێ (لە تاوان) ئەوە بەڕاستی (سوودی) خۆ پاك ڕاگرتنەکەی هەر بۆ خۆیەتی
﴿وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ و گەڕانەوەش تەنها بۆ لای خوایە ﴿١٨﴾

﴿وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ﴾ نەکوێرو بینا یەکسانن ﴿١٩﴾ ﴿وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ﴾ و نە تاریکستان
و ڕووناکی (وەك یەکن) ﴿٢٠﴾ ﴿وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ﴾ و نەسێبەرو خۆرەتاو (وەك یەکن) ﴿٢١﴾ ﴿وَمَا
يَسْتَوِي ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ﴾ نەزیندووان و مردووان بەرانبەرن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ﴾ بەڕاستی خوا
(بانگی خۆی) دەبیستێنێ بەهەر کەس کەبیەوێت ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي ٱلْقُبُورِ﴾ بەڵام تۆ ناتوانی
(ئەی موحەممەد ﷺ) پەیامەکەت) ببیستێنی بەوانەی لەگۆڕەکاندان (مردوون) ﴿٢٢﴾ ﴿إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ﴾
تۆ تەنها ترسێنەری ﴿٢٣﴾ ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ بێگومان ئێمە تۆمان بە(ئاینی) ڕاستەوە
ناردووە مژدەدەر و ترسێنەر بیت ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ هەر گەل و ئوممەتێك (پێغەمبەرێکی)
ترسێنەری تێدا هاتووە ﴿٢٤﴾ ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ﴾ وە ئەگەر باوەڕت پێ نەهێنن ﴿فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾
ئەوە بێگومان لەپێش ئەوانیشەوە کەسانێك باوەڕیان نەهێنا (بە پێغەمبەرەکانیان) ﴿جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم
بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ پێغەمبەرەکانیان هاتنە لایان بەموعجیزەکان ﴿وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ﴾ و پەڕاوو کتێبە
ڕوون کەرەوەکانەوە ﴿٢٥﴾ ﴿ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ پاشان ئەوانەیان بێ باوەڕ بوون قارم لێ گرتن
﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ جا چۆن بوو تۆڵە سەندنی ئێمە (لەوان) ﴿٢٦﴾ ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نەتدی ﴿أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ﴾ کە بەڕاستی خوا لەئاسمانەوە بارانی باراندووە، ئەمجا بەو بارانە
هەموو جۆرە میوەیەکمان ڕواند ﴿مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا﴾ کەشێوە و ڕەنگەکانیان جیاوازە ﴿وَمِنَ ٱلْجِبَالِ
جُدَدٌۢ﴾ و لەچیاکاندا چەند ڕێگا هەیە ﴿بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا﴾ کەڕەنگیان سپی و سورە (سپی
و سورەکانیش) جیاوازن ﴿وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾ و هەشیانە ڕەشێکی تۆخە ﴿٢٧﴾ ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ
وَٱلْأَنْعَٰمِ﴾ وە لەئادەمی و زیندەوەرو ئاژەڵ و ماڵاتیشدا ﴿مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ﴾ ڕەنگی جۆراو
جۆر هەیە بەوێنەی جیاوازی میوەهات ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾ بەڕاستی لەناو بەندەکانی
خودا، تەنها زانایان (وەك پێویست) لەخوا دەترسن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ بێگومان خوا زاڵی
باڵادەستی لێبوردەیە. ﴿٢٨﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەکتێبی خوا دەخوێننەوە
﴿وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ و بەچاکی نوێژیان بەجێ هێناوە ﴿وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ وە لەوەی
کەپێمان داون بەنهێنی و ئاشکرا دەبەخشن ﴿يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ﴾ چاوەڕوانی بازرگانییەکن هەرگیز
زەرەر ناکات ﴿٢٩﴾ ﴿لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ﴾ بۆ ئەوەی (خوا) بەتێرو تەواوی پاداشتیان بداتەوە ﴿وَيَزِيدَهُم مِّن
فَضْلِهِۦٓ﴾ وە لە فەزڵ وبەهرەی خۆی زیاتریشیان پێ بدات ﴿إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ بە ڕاستی خوا
لێبوردەی سوپاس وەرگرە ﴿٣٠﴾

﴿وَٱلَّذِىٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ وە ئـەوەی لەقورئانـدا نیگامـان کـردوە بـۆ تـۆ ﴿هُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ﴾ هەر ئەوە ڕاستەو پشتیوانی کتێبەکانی پێش خۆیەتی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ﴾ بێگومان خوا بەبەندەکانی ئاگادارو بینایە ﴿٣١﴾ ﴿ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ﴾ لەپاشـان ئەم قورئانەمان بەخشی بەکەسانێك ﴿ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ﴾ کە لەناو بەندەکانماندا هەڵمان بژاردن ﴿فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ﴾ ئەمجا هەندێکیان ستەمکارن لەخودی خۆیان ﴿وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ﴾ وهەندێکیان مام ناوەندین ﴿وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ﴾ وهەندێکی تریان بەفەرمانی خوا پێشکەوتوون بەهۆی چاکەکانیانەوە ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ﴾ ئـەم (قورئـان پێدانـە) لەخۆیـدا بەهرەیەکی گەورەیـە ﴿٣٢﴾ ﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا﴾ ئەوانـە دەچنە ناو بەهەشـتانێك کـە جێگـای مانـەوەی هەمیشـەیی یـە ﴿يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ﴾ لەوێـدا بەبازنـی ئاڵتونی و مرواری دەڕازێنرێنەوە ﴿وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ﴾ وپۆشاکیشـیان تێیدا ئاوریشـمە ﴿٣٣﴾ ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ﴾ وە ئـەوان دەڵێن: هەموو سـوپاس بۆ ئەو خوایە ﴿أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ﴾ کەخەفەتی لابردین و نەیهێشت ﴿إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگارمان لێبوردەی شایستەی سوپاسە ﴿٣٤﴾ ﴿ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ ئـەو (خوایـە) کـە بەچاکـەو بەهرەی خـۆی نیشـتەجێی کردین لەماڵی هەمیشـەیی (بەهەشت دا) ﴿لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٞ﴾ لەوێدا نەهیچ ماندوو بوونێکمان تووش دەبێ ﴿وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ﴾ ونەهیچ ئەرك و زەحمەتێکمان دووچار دەبێ ﴿٣٥﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ نَارُ جَهَنَّمَ﴾ ئاگری دۆزەخ بۆ ئەوانەیە بێ باوەڕ بوون ﴿لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ﴾ بڕیاری مردن نادرێ بەسـەردایاندا تـا بمـرن ﴿وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَاۚ﴾ هەروەهـا هەنـدێ لەسـزای (دۆزەخ)یـان لـێ سـووك ناکـرێ ﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ﴾ ئـا بـەو جۆرە تۆڵە ئەسـەنین لەهەمـوو بـێ باوەڕێك ﴿٣٦﴾ ﴿وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا﴾ وە ئەوانـە لەدۆزەخدا هـاوار دەکەن ﴿رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا﴾ (دەڵێن) ئـەی پەروەردگارمان (لـەدۆزەخ) دەرمان بهێنە تا کردەوەی چاك بکەیـن ﴿غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ﴾ جیاواز لەوەی دەمان کرد (لەدونیادا) ﴿أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم﴾ (وەڵام دەدرێنەوە) ئایا تەمەنمان درێژ نەکردن ﴿مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾ ئەوەنـدەی ئـەوەی دەیەوێ بیر بکاتـەوە تیایدا بیر بکاتـەوە ﴿وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ﴾ وە ترسـێنەرتان بۆ نەهات ﴿فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ دەی (ئەو سـزا) بچەژن چونکە هیچ یاریدەدەرێك بۆ (بێ باوەڕە) ستەمکارەکان نییـە ﴿٣٧﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيۡبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ بەڕاسـتی خـوا بەنهێنی ئاسـمانەکان وزەوی زانایە ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بێگومان خوا بەنهێنی دڵان ئاگادارە ﴿٣٨﴾

﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِۚ﴾ هەر ئەو زاتە ئێوەی کردە جێنشین(ی پێشوان) لەزەویدا ﴿فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥۖ﴾ ئەوسا هەر کەس بێ باوەڕ بێ ئەوە (تۆڵەی) بێ باوەڕییەکەی هەر بۆ خۆیەتی ﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ و بێ باوەڕی کافران هیچیان بۆ زیاد ناکات لای پەروەردگاریان ﴿إِلَّا مَقْتًاۖ﴾ جگە لەخەشم و ڕقی زۆر ﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا﴾ وە بێ باوەڕیی کافران هیچیان بۆ زیاد ناکات بێجگە لەزەرەرمەندی ﴿٣٩﴾ ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ هەواڵم بدەنێ ﴿شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەو هاوبەشانەی لەجیاتی خوا دەتانپەرستن (هاوارتان لێ دەکردن) ﴿أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ﴾ نیشانم بدەن لەزەویدا چیان دروست کردووە؟ ﴿أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ یان لەبەدی هێنانی ئاسمانەکاندا بەشداری (خوا)یان کردووە؟ ﴿أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا﴾ یا کتێبێکمان پێ داون ﴿فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُۚ﴾ جا بەڵگەیان لەو کتێبەدا هەیە (کەبتەکان هاوبەشی خوان) ﴿بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا﴾ (نەخێر وانییە) بەڵکو ستەمکاران هیچ بەڵێنێك بەیەکتری نادەن جگە لەفریودان و(هەڵخەڵەتانـدن) نەبێت ﴿٤٠﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ بەڕاستی خوا ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیر دەکات ﴿أَن تَزُولَاۚ﴾ بۆ ئەوەی لەڕێڕەوی خۆیان لانەدەن ﴿وَلَئِن زَالَتَآ﴾ بەڕاستی ئەگەر لەڕێڕەوی (خۆیـان) لابدەن ﴿إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓۚ﴾ کێ هەیە جگە خوا ڕایان بگرێت ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ بێگومان ئەو (خوا) لەسەر خۆ و لێبوردەیە ﴿٤١﴾ ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ﴾ (بت پەرستان) بەسوێندی هەرە گەورەیان سوێندیان دەخوارد بەخوا ﴿لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ﴾ (دەیان ووت) ئەگەر پێغەمبەرێکی ترسێنەریان بۆ بێت ﴿لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِۖ﴾ بەڕاستی ئەوان لەهەر یەك لە ئوممەتانی تر ڕێنموون تر دەبن ﴿فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ﴾ ئەمجا کاتێ پێغەمبەری ترسێنەریان بۆ هات ﴿مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا﴾ زیاتر دوور کەوتنەوە(لەڕێگەی ڕاست) ﴿٤٢﴾ ﴿ٱسْتِكْبَارًا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ لەبەر خۆ بەزل زانی لەزەویدا ﴿وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِۚ﴾ و فێڵ وپیلانی خراپ کردن ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦۚ﴾ وە فێڵ و پیلانی خراپ تەنیا زیان بەخاوەنەکەی دەگەیەنێ ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَۚ﴾ دەی کەواتە ئەوان جگە لەچارەنووسی پێشینان چاوەڕوانی شتێکی تر دەکەن؟ ﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًاۖ﴾ چونکە باوی خوا هەرگیز گۆڕانی بۆ نییە ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا﴾ و باوی خوا لادانی بۆ نییە ﴿٤٣﴾ ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا ئەوان بەزەویدا نەگەڕاون ﴿فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ تا سەیر بکەن سەر ئەنجام گەلانی پێش خۆیان چۆن بووە ﴿وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةًۚ﴾ کە ئەوان لەمان بەهێزتر بوون ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ﴾ هیچ شتێك ناتوانێ لەدەستی خوا دەرچێ ﴿فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِۚ﴾ نە لەئاسمانەکان ونەلەزەویدا ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾ بەڕاستی خوا زانا و بەدەسەڵات وبەتوانایە ﴿٤٤﴾

﴿وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ﴾ وە ئەگەر خوا قار بگرێ لەخەڵکی (تۆڵەیان لێ بسەنێ) ﴿بِمَا كَسَبُواْ﴾ لەبەر ئەو (خراپانەی) کردویانە ﴿مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ﴾ هیچ گیانداریکی بەسەر زەویەوە نەدەهێشت ﴿وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ﴾ بەڵام (خوا) مۆڵەتی ئەوان دەدات تا ماوەی دیاری کراو ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ﴾ ئەمجا کاتێ ماوەکەیان (کۆتایی) هات (دەیان مرێنێ) ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرَۢا﴾ جا بێگومان خوا بە بەندەکانی ئاگادارو بینایە ﴿٤٥﴾

## سورەتی ﴿ يسٓ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿يسٓ﴾ بە(یا، سین) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بەماناکەی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿١﴾ ﴿وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ سوێند بە قورئانی پڕ لەدانایی ﴿٢﴾ ﴿إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ بەڕاستی تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) لە پێغەمبەرانی خوای ﴿٣﴾ ﴿عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ لەسەر ڕێبازی ڕاستی ﴿٤﴾ ﴿تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ﴾ (قورئان) دابەزێنراوە لەلایەن خوای زاڵی باڵادەستی میهرەبانەوە. ﴿٥﴾ ﴿لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ﴾ بۆ ئەوەی گەلێ بترسێنی (لەسزا) کەباوو باپیرانیان نەترسێنرابوون ﴿فَهُمۡ غَٰفِلُونَ﴾ بۆیە ئەوان بێ ئاگا بوون ﴿٦﴾ ﴿لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی بەڵێنی خوا چەسپاو هاتە دی لەسەر زۆربەیان ﴿فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ چونکە ئەوان باوەڕ ناهێنن ﴿٧﴾ ﴿إِنَّا جَعَلۡنَا فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ أَغۡلَٰلٗا﴾ (وەك کەسانێ وان کە) تەوقمان کردبێتە گەردنیان ﴿فَهِيَ إِلَى ٱلۡأَذۡقَانِ﴾ جائەو (تەوقانە) تا چەناکەیان هاتبێ (گەردنیانی بەتەواوی گرتبێتەوە) ﴿فَهُم مُّقۡمَحُونَ﴾ ئەمجا سەریان بەرز کرابێتەوە (نەتوانن بۆ خوارو ئەم لاو لا بیجوڵێنن) ﴿٨﴾ ﴿وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا﴾ وە بەربەستمان لەبەردەم و پشتیانەوە داناوە ﴿فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ﴾ پەردەشمان داوە بەسەر چاویان دا بۆیە ئەوان (ڕاستی) نابینن ﴿٩﴾ ﴿وَسَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ﴾ وە بۆ ئەوان یەکسانە چ بیان ترسێنیت یان نەیان ترسێنیت ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ باوەڕ ناهێنن ﴿١٠﴾ ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ﴾ تۆ تەنها کەسێك دەترسێنی کە شوێن قورئان دەکەوێت ﴿وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِۖ﴾ لەپەنهانیشدا لە خوای میهرەبان دەترسن ﴿فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ﴾ بەهۆی (ئەو شوێن کەوتن و ترسانەوە) مژدەی بدەرێ بەلێخۆشبوونی (گوناهەکانی) و پاداشتی چاکی (بەهەشت) ﴿١١﴾ ﴿إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ بەڕاستی هەر ئێمە مردووان زیندوو دەکەینەوە ﴿وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡۚ﴾ و هەرچی پێشتر کردویانە وشوێنەواری پاش خۆشیان دەنوسین ﴿وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ﴾ وە هەموو شتێکمان لە پەڕاوێکی ڕوون وئاشکرادا ژماردووە و نووسییوە کە (لوح المحفوظ) ە ﴿١٢﴾

﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) نموونەیـان بـۆ بێنەرەوە بەخەڵکی شـاری
(أنطاكيـة) ﴿إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ کاتـێ کەپێغەمبەرانیان بـۆ هات (١٣) ﴿إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا﴾
کاتـێ دوو (پێغەمبەر)مـان نـارد بـۆ ناویـان باوەڕیـان پێنەکـردن ﴿فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ﴾ ئەمجـا بە(ناردنـی
پێغەمبەری) سـێیەم بەهێزمان کردن (وپشـتمان گرتـن) ﴿فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ﴾ جا (هەموویان)
وتیان بێگومان ئێمە نێردراوین بۆ سەر ئێوە (١٤) ﴿قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا﴾ (خەڵکەکە) وتیان ئێوە
هەر ئادەمییەکی وەك ئێمەن ﴿وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ﴾ و خوای میهرەبان هیچ شتێکی (لەنیگا) نەناردۆتە
خوارەوە ﴿إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ﴾ ئێوە تەنها درۆزنن و درۆ دەکەن (١٥) ﴿قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ﴾
(پێغەمبـەرەکان) وتیان پەروەردگارمان دەزانێ بەڕاسـتی ئێمە (بەپێغەمبەرێتی) نێردراوین بۆ سـەر
ئێـوە (١٦) ﴿وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ و ئێمـە تەنهـا گەیاندنـی (ئاینەکە)مـان لەسـەرە بەڕوونـی (١٧)
﴿قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ﴾ (خەڵکەکە) وتیان بێگومان ئێمە بەهۆی ئێوەوە دووچاری شوومی و بەدبەختی
بووین ﴿لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر واز نەهێنن (لەو کارەتان) بەرد بارانتان دەکەین
﴿وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ و بەڕاسـتی لەلایەن ئێمەوە دووچاری سـزایەکی پڕ ئێش و ئازار دەبن (١٨)
﴿قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ﴾ (پێغەمبـەرەکان) وتیان شـوومی ئێوە بەخۆتانەوەیـە چونکە ئێوە
ئەگەر ئامۆژگاری بکرێن (هەست بەشوومی دەکەن) ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ﴾ (نەخێر وانیە) بەڵکو ئێوە
گەلێکـی لەسـنوور دەرچـوون (١٩) ﴿وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ﴾ وە لـەو پەڕی شـارەکەوە پیاوێك
بەپەلـە هـات ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ وتی ئەی گەلەکەم شـوێن ئـەم پێغەمبەرانە بکەون (٢٠)
﴿ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا﴾ شوێن کەسانێ بکەون داوای هیچ کرێ و پاداشتێکتان لێ ناکەن ﴿وَهُم
مُّهۡتَدُونَ﴾ کەخۆشـتان ڕێنموونیی کراون (٢١) ﴿وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي﴾ وە من بۆچی زاتێ نەپەرستم
کەمنی بەدی هێناوە ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ وە هەر بۆ لای ئەوە دەگەڕێنەوە (٢٢) ﴿ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً﴾ ئایا
بێجگە لەو (خوا) پەرستراوانێك بۆ خۆم بڕیار بدەم ﴿إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ﴾ ئەگەر خوای میهرەبان
زیانـی بۆ من بـوێ ﴿لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا﴾ تکای ئەوان هیچ سـوودێك بەمـن ناگەیەنێ ﴿وَلَا
يُنقِذُونِ﴾ و (لەسـزای خوا) ڕزگارم ناکەن (٢٣) ﴿إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ﴾ بێگومان من (ئەگەر هاوبەش
دابنێم) ئەو کاتە لەگومڕاییەکی زۆر ئاشکرادام (٢٤) ﴿إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ﴾ بەڕاستی من باوەڕم
هێنا بەپەروەردگارتان و دە ئێوەش گوێتان لێبێ (٢٥) ﴿قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ﴾ (ئەم پیاوەیان شەهید کرد) پێی
وترا: بڕۆرە بەهەشـتەوە ﴿قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ﴾ (ئەو پیاوەش) وتـی خۆزگە گەلەکەم بیانزانیایە
(٢٦) ﴿بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي﴾ بـە ئـەوەی کەپەروەردگـارم لێـم خۆشـبووە ﴿وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ﴾ وەبردمیە
ڕیزی ڕێز گیراوانەوە (٢٧)

﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾ وە لە دوای ئەو نەمان نارده خوارەوە بۆ سەر گەلەكەی ﴿مِن جُندٖ مِّنَ
ٱلسَّمَآءِ﴾ هیچ لەشكرێك لەئاسمانەوە ﴿وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ﴾ و ئێمە دابەزێنەر نەبووین ﴿٢٨﴾ ﴿إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ
وَٰحِدَةٗ﴾ (هۆی تیاچوونیان) تەنیا شریخەیەكی بەهێز بوو ﴿فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ﴾ جا كتوپڕ ئەوانە هەموو
جوڵەیان نەما و مردن ﴿٢٩﴾ ﴿يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ﴾ ئای پەشیمانی وداخی سەخت بۆ ئەو بەندانەی
(كەبێ باوەڕن) ﴿مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ هەر پێغەمبەرێكیان بۆ بهاتایە تەنیا گاڵتەیان
پێ دەكرد (و هیچ تر) ﴿٣٠﴾ ﴿أَلَمۡ يَرَوۡاْ﴾ ئایا نەیان زانیوە ﴿كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ﴾ لە پێش ئەواندا
چەند گەلی (تاوانبار) مان لە ناو بردووە ﴿أَنَّهُمۡ إِلَيۡهِمۡ لَا يَرۡجِعُونَ﴾ كەبێگومان ناگەڕێنەوە بۆ لای ئەمان
﴿٣١﴾ ﴿وَإِن كُلّٞ لَّمَّا جَمِيعٞ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ﴾ هەر هەموو (لە ناوبراوان) كۆ دەكرێنەوە لای ئێمە (و لەقیامەت
دا) ئامادە دەكرێن ﴿٣٢﴾ ﴿وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ﴾ وە نیشانەو بەڵگەیەك بۆ ئەوان، ئەم زەوییە مردووەیە
﴿أَحۡيَيۡنَٰهَا﴾ كە زیندوومان كردەوە ﴿وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ﴾ و دانەوێڵەمان لێ دەرهێنا
(لێ ڕواند) كە لێی دەخۆن ﴿٣٣﴾ ﴿وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ﴾ وە لەو (زەوییە) دا چەند
باخ لەخورما و ترێمان بەدی هێنا ﴿وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ﴾ و چەند كانیاومان تیادا هەڵقوڵاندوە
﴿٣٤﴾ ﴿لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ﴾ بۆ ئەوەی لەبەروبوومەكانی بخۆن كەدەستی ئەوان بەرهەمی
نەهێناوە ﴿أَفَلَا يَشۡكُرُونَ﴾ دەی ئایا سوپاسی خوا ناكەن ﴿٣٥﴾ ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا﴾ پاك
وبێگەردە زاتێك كە هەموو جووتەكانی (نێر و مێ) دروست كردووە ﴿مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ﴾
لەوەی كە زەوی دەیڕوێنێ و لە(ئادەمی) خۆیان ﴿وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ﴾ و لەو شتانەش كە نایزانن ﴿٣٦﴾
﴿وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ﴾ شەویش بەڵگەو نیشانەیە بۆ ئەوان كە ئێمە ڕۆژی لێ دەردەهێنین
﴿فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ﴾ ئەمجا لەناكاودا تاریكی هەموویان دەگرێتەوە ﴿٣٧﴾ ﴿وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ﴾
خۆریش بەرەو بنكەی خۆی (لەگەڕاندایە و) دەڕوا ﴿ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ ئەوە بڕیاردراوی
(خوای) زاڵی باڵادەستی زانایە ﴿٣٨﴾ ﴿وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ﴾ وەبۆ مانگیش چەند قۆناغێكمان داناوە ﴿حَتَّىٰ
عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ﴾ (دوای تەواو كردنی قۆناغەكانی) هەتا وەكو پەلی دار خورمای كۆنی (وشك
بووی) لێ دێت ﴿٣٩﴾ ﴿لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ﴾ خۆر بۆی نییە (ناتوانێ) بگات بەمانگ
﴿وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ﴾ و شەویش ناتوانێ پێشكەوێ لەرۆژ ﴿وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ﴾ و هەر یەكەیان
(خۆرو مانگ)لە خولگەیەكدا مەلە دەكەن و دەسوڕێنەوە﴿٤٠﴾

﴿وَءَايَةٌ لَّهُمۡ﴾ وەبەڵگەیەکی ئاشکرای تر بۆ ئەوان ئەمەیە﴿أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾ کەبێگومان
ئێمە نەوەکانی ئەوانمان لەکەشتی پڕ کراو (لەخۆیان و کەل و پەلیان) دا هەڵگرتووە ﴿٤١﴾ ﴿وَخَلَقۡنَا لَهُم
مِّن مِّثۡلِهِۦ مَا يَرۡكَبُونَ﴾ وە بە وێنەی کەشتی شتانێکی تریشمان بۆ دروست کردوون کە سواری بن ﴿٤٢﴾
﴿وَإِن نَّشَأۡ نُغۡرِقۡهُمۡ﴾ وە ئەگەر بمانەوێ نوقمیان دەکەین ﴿فَلَا صَرِيخَ لَهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنقَذُونَ﴾ جا هیچ کەس نایەت
بە هاواریانەوە و ڕزگاریش ناکرێن(لە نوقم بوون) ﴿٤٣﴾ ﴿إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ﴾ مەگەر بەزەیی
ئێمە (ڕزگاریان بکات) وتا کاتی دیار کراو بیان ژێنین ﴿٤٤﴾ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ﴾ وە کاتێك پێیان بوترێت
﴿ٱتَّقُواْ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيكُمۡ وَمَا خَلۡفَكُمۡ﴾ خۆتان بپارێزن (لەو سزای کە) لە بەردەمتان دایە و لەوەش لەپشتانەوەیە
(لە ڕۆژی دوایی) ﴿لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ تارەحمتان پێ بکرێ ﴿٤٥﴾ ﴿وَمَا تَأۡتِيهِم مِّنۡ ءَايَةٖ مِّنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾
وە هەر بەڵگەو ئایەتێکیان لە ئایەتەکانی پەروەردگاریان بۆ بێت﴿إِلَّا كَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ﴾ ئەوان هەر
ڕوو وەردەگێڕن لەو(ئایەتانە) ﴿٤٦﴾ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ وە هەر کاتێ پێیان بوترێ لەوەی
خوا پێی داون ببەخشن ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون دەڵێن بەوانەی ئیمانیان
هێنا بوو﴿أَنُطۡعِمُ مَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطۡعَمَهُۥٓ﴾ئایا خواردن بدەین بە کەسێ ئەگەر خوا بیوویستایە خواردنی
پێ دەدا ﴿إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ئێوە تەنها لە گومڕاییەکی ئاشکرادان ﴿٤٧﴾ ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ
صَٰدِقِينَ﴾ وەدەڵێن ئەم بەڵێنەکەی دێت ئەگەر ئێوە ڕاست گۆن ﴿٤٨﴾ ﴿مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ تَأۡخُذُهُمۡ﴾
ئەمانە چاوەڕوانی هیچ ناکەن مەگەر شریخە و دەنگێکی بەهێز(فوو کردن بە کەڕەنادا)بیانگرێت
﴿وَهُمۡ يَخِصِّمُونَ﴾ لە کاتێکدا لە نێو خۆیاندا دەمە قاڵێ دەکەن ﴿٤٩﴾ ﴿فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ تَوۡصِيَةٗ وَلَآ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ
يَرۡجِعُونَ﴾ئەوسا ناتوانن هیچ وەسیەتێك بکەن یان بگەڕێنەوە لای کەس و کاریان ﴿٥٠﴾ ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ﴾
وە (جارێ تر) فوو دەکرێ بە کەڕەنادا ﴿فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ﴾ ئەمجا ئەوان کتوپڕ لە گۆڕەکان
دێنەدەرەوەو﴿إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يَنسِلُونَ﴾بە پەلە دەڕۆن بۆ لای پەروەردگاریان ﴿٥١﴾ ﴿قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن
مَّرۡقَدِنَاۜ﴾ دەڵێن ئەی هاوار بۆ ئێمە کێ زیندووی کردینەوەلە گۆڕەکانمان دا﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ
ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ئەمە ئەو بەڵێنەیە خوای میهرەبان پێ ی داین و پێغەمبەرەکان ڕاستیان کرد ﴿٥٢﴾ ﴿إِن كَانَتۡ
إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ تەنها شریخە ودەنگێکی گەورە دێت﴿فَإِذَا هُمۡ جَمِيعٞ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ﴾ئیتر کتوپڕ
هەموویان (بە کۆمەڵ) لای ئێمە ئامادە کراون ﴿٥٣﴾ ﴿فَٱلۡيَوۡمَ لَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗا﴾ئەمڕۆش هیچ جۆرە
ستەمێك لە کەس ناکرێ﴿وَلَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾وە جگە لەوەی کەدەتان کرد پاداشت
وسزا نادرێنەوە ﴿٥٤﴾

﴿إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ﴾ بەڕاستی بەهەشتی یەکان ئەمڕۆ ﴿فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ﴾ لەخۆشی و شادیدا
سەرقاڵن ﴿٥٥﴾ ﴿هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ﴾ خۆیان و هاوسەرەکانیان لە سێبەرەکاندا
لە سەر تەخت (ی ڕازاوە) پاڵیان داوەتەوە﴿٥٦﴾ ﴿لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ﴾ لەو (بەهەشتە)دا
بۆیان ئامادەیەمیوەهات وهەرچی داوا بکەن ﴿٥٧﴾ ﴿سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ﴾ سەلام (یان لێ دەکرێت)
بەووتەیەك لە لایەن پەروەردگاری میهرەبانەوە ﴿٥٨﴾ ﴿وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ ئێوەش ئەی تاوانباران
ئەمڕۆ جیا ببنەوە (لە ئیمانداران) ﴿٥٩﴾ ﴿۞أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾ ئەی نەوەکانی ئادەم ئایا وەسێتم
بۆ نەکردن ﴿أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ﴾ کە شەیتان نەپەرستن ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ چونکە بەڕاستی
شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە ﴿٦٠﴾ ﴿وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ﴾ وە(ئایا وەسێتم بۆ نەکردن)
کەمن بپەرستن ئەمە ڕێگای ڕاستە ﴿٦١﴾ ﴿وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ﴾ سوێند بەخوا بێگومان
(شەیتان) خەڵکێکی زۆری لە ئێوە گومڕا کرد ﴿أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا بۆ ژیر نەبوون ﴿٦٢﴾
﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾ ئەمەئەودۆزەخەیە کەبەڵێنتان پێ درابوو ﴿٦٣﴾ ﴿ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ
تَكۡفُرُونَ﴾ ئەمڕۆ بڕۆنە ناوی یەوە بەهۆی بێ باوەڕ بوونتانەوە ﴿٦٤﴾ ﴿ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ ئەمڕۆ
مۆر دەنێین بەسەر دەمیاندا ﴿وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ﴾ و دەستیان قسەمان لەگەڵدا دەکەن ﴿وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم
بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ و قاچیان شایەتی دەدەن بەوەی کە کردویانە ﴿٦٥﴾ ﴿وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ﴾
وەئەگەر بمانەوێ ڕووناکی چاویان ناهێڵین (کوێریان دەکەین) ﴿فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ﴾ ئەوسا
دەیانەوێ بەرەو ڕێگای ڕاست پێشبرکێ بکەن جا چۆن دەبینن ﴿٦٦﴾ ﴿وَلَوۡ نَشَآءُ لَمَسَخۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ﴾
خۆ ئەگەر بمانەوێ لەشوێنی خۆیاندا شێوەی ئادەمییان دەگۆڕین (دەیان کەین بە شتێکی خراپ)
﴿فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ﴾ بەهۆی ئەو (گۆڕینەوە) نەیان دەتوانی نەبڕۆن ونەبگەڕێنەوە ﴿٦٧﴾
﴿وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ﴾ وە تەمەنی هەر کەس درێژ کەین لاشەی لاواز و ناتەوان
دەکەین دەی ئایا ژیر نابن ﴿٦٨﴾ ﴿وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓۚ﴾ ئێمە ئەو (موحەممەد ﷺ) مان فێری
شیعر نەکردووە، وشیعروتن شیاوی ئەو نی یە ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ﴾ و ئەوەی (موحەممەد ﷺ)
دەیڵێ پەند و ئامۆژگاری و قورئانی ڕونکەرەوەی (ڕاستی یە) ﴿٦٩﴾ ﴿لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا﴾ بۆ ئەوەی
ئەوانەی (دڵ) زیندوون بیان ترسێنێ ﴿وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ و بەڵێنی (سزا) بسەپێنێت بەسەر
بێ باوەڕاندا ﴿٧٠﴾

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا﴾ ئایا نەیان دی (نەیان زانیوە) ﴿أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا﴾ کە بێگومان ئێمە
ئاژەڵمان بۆ ئەوان دروست کردووە ﴿فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ﴾ ئەمجا ئەوان خاوەنیانن ﴿٧١﴾ ﴿وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ﴾
وە ڕامیان هێناون بۆیان ﴿فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾ ئەمجا سواری هەندێکیان دەبن و (گۆشتی)
هەندێکیشیان دەخۆن ﴿٧٢﴾ ﴿وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ﴾ وە زۆر سوودیان لێ دەبینن وشتی خواردنەوەشیان
لێ وەردەگرن ﴿أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾ دەی ئایا سوپاسی خوا ناکەن ﴿٧٣﴾ ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً﴾ وە
بێجگە لە خوا چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان داناوە ﴿لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ﴾ بەو هیوایەی یارمەتی
بدرێن ﴿٧٤﴾ ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ﴾ (ئەو پەرستراوانە) ناتوانن یارمەتیان بدەن ﴿وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ﴾
بەڵام ئەمان سەربازی ئامادەن، لە خزمەتیاندان (وملکەچی ئەو بتانەن) ﴿٧٥﴾ ﴿فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ﴾ جا
قسەکانیان خەمبارت نەکات ﴿إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ چونکە بەڕاستی ئەوەی دەی شارنەوەو
ئەوەی ئاشکرای دەکەن دەیزانین ﴿٧٦﴾ ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ﴾ ئایا ئادەمی نەیزانیوە ﴿أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ﴾
کە ئەومان لە نوتفەیەك دروست کردووە ﴿فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾ کەچی یەکسەر دەبێتە دوژمنێکی
سەرسەختی دیار (دەمقاڵێ کەرێکی ئاشکرایە) ﴿٧٧﴾ ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ﴾ وە نموونەمان بۆ
دێنێتەوە و بەدیهێنانی خۆی لە بیر چۆتەوە ﴿قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ﴾ (ئەو بێ بڕوایە) دەڵێ کێ
ئێسکەکان زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیون ﴿٧٨﴾ ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) بڵێ ئەو زاتە زیندوویان دەکاتەوە کە لە یەکەم جارەوە بە دی هێناون ﴿وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ و
ئەو بە هەموو دروست کراوێك زانا و ئاگادارە ﴿٧٩﴾ ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا﴾ زاتێ کە
لە درەختی سەوز ئاگری بۆ دروست کردون ﴿فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾ ئیتر ئێوە ئاگری پێ دەکەنەوە
﴿٨٠﴾ ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ ئایا زاتێ کە ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە ﴿بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن
يَخْلُقَ مِثْلَهُم﴾ ناتوانێ وێنەیان دروست بکات؟ ﴿بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ﴾ بەڵێ دەتوانێ و هەر ئەویش
دروست کەری زانایە ﴿٨١﴾ ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا﴾ بەڕاستی کاری ئەو (خوا) ئەمەیە هەر کاتێ بیەوێ
شتێك بە دی بهێنێت ﴿أَن يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ پێی دەڵێ: ببە، دەست بەجێ (ئەو شتە) دەبێت ﴿٨٢﴾
﴿فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ جا پاك و بێگەردە ئەو خوایەی کە موڵکایەتی هەموو شتێك
بەدەست ئەوە ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ و بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە ﴿٨٣﴾

## سورەتی ﴿الصَّافَّاتِ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندی میهرەبان

﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا﴾ سوێند بەو فریشتانە ڕیز بوون (لە کاتی عیبادەتدا) ﴿١﴾ ﴿فَالزَّاجِرَاتِ زَجْرًا﴾ وە سوێند بەوانە کە
دەخوڕن بەسەر هەورەکاندا ﴿٢﴾ ﴿فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا﴾ وە سوێند بەخوێنەرانی قورئان ﴿٣﴾ ﴿إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَاحِدٌ﴾ بەڕاستی
پەرستراوی ئێوە تاك و تەنهایە ﴿٤﴾ ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی
وئەوەی لە نێوانیاندایە ﴿وَرَبُّ الْمَشَارِقِ﴾ و پەروەردگاری خۆر هەڵاتەکان ﴿٥﴾ ﴿إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ﴾
بێگومان ئێمە ئاسمانی دونیامان بەجوانی ئەستێرەکان ڕازاندۆتەوە ﴿٦﴾ ﴿وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَانٍ مَّارِدٍ﴾ وە لەهەموو
شەیتانێکی سەر کەش پاڕاستوومانە ﴿٧﴾ ﴿لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ﴾ ناتوانن گوێ بگرن بۆ ئەو فریشتانەی لە
بەرزترین پلەدان ﴿وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ﴾ وە (ئەگەر بچن گوێ بگرن) لە هەموو لایەکی (ئاسمانەوە) ئاگر
باران دەکرێن ﴿٨﴾ ﴿دُحُورًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ﴾ ڕاو دەنرێن زۆر بە توندی و (لە قیامەتدا) سزایان بەردەوامە
وسەختە ﴿٩﴾ ﴿إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ﴾ (شەیتانەکان ناتوانن گوێ بگرن) مەگەر یەکێکیان بە دزیەوە هەواڵێك
(لە فریشتەیەك ببیستێ و) بە پەلە بیفڕێنێ ﴿فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾ پزیسکی گڕدار وسوتێنەری شوێن دەکەوێت
(و دەی سوتێنێ) ﴿١٠﴾ ﴿فَاسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا﴾ ئەمجا (ئەی موحەممەد ﷺ) بپرسە لەوانەی (کە بێباوەڕن) ئایا
ئەوان دروستکراوێکی گەورەتر و گرنگتر و بەهێز ترن ؟ ﴿أَم مَّنْ خَلَقْنَا ۚ﴾ یان ئەو شتانەی تر کە دروستمان
کردووە (لە ئاسمان و خۆر و زەوی و ... ) ﴿إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەوان (ئادەمی) مان
دروست کرد لە قوڕێکی لینجی جیڕ ﴿١١﴾ ﴿بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ﴾ بەڵام (سەیرە) تۆ سەرت سوڕماوە (چۆن باوەڕ
ناهێنن) کەچی ئەوان گاڵتە دەکەن (بە تۆ کە دەڵێیت زیندوو بوونەوە هەیە) ﴿١٢﴾ ﴿وَإِذَا ذُكِّرُوا لَا يَذْكُرُونَ﴾ وە کاتێ
ئامۆژگاری بکرێن ئامۆژگاری وەر ناگرن ﴿١٣﴾ ﴿وَإِذَا رَأَوْا آيَةً يَسْتَسْخِرُونَ﴾ وە کاتێ موعجیزەیەك ببینن دەیکەنە
گاڵتەجار ﴿١٤﴾ ﴿وَقَالُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ وە دەڵێن ئەم (قورئانە) هیچ نییە جگە لە جادوویەکی ئاشکرا ﴿١٥﴾
﴿أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا﴾ (دەڵێن) ئایا ئێمە کە مردین و بووین بەخۆڵ و ئێسکی ڕزیو ﴿أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴾ ئایا
ئێمە زیندوو دەکرێینەوە؟! ﴿١٦﴾ ﴿أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ﴾ لەگەڵ باوو باپیرانی پێشینانمان ﴿١٧﴾ ﴿قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَاخِرُونَ﴾
(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: بەڵێ (هەمووتان زیندوو دەکرێنەوە) و لەو کاتەدا ئێوە زەلیل و سەر شۆڕن ﴿١٨﴾
﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ﴾ چونکە ئەو (زیندوو بوونەوەیە) هەر یەك دەنگە ئیتر دەست بەجێ
زیندوون و دەڕوانن ﴿١٩﴾ ﴿وَقَالُوا يَا وَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ الدِّينِ﴾ وە دەڵێن: وای بۆ خۆمان ئەمە ڕۆژی تۆڵەسەندن
وپاداشتە ﴿٢٠﴾ ﴿هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ (پێیان دەوترێ) ئەمە ئەو ڕۆژی بڕیاردانە یە کە باوەڕتان پێی
نەبوو ﴿٢١﴾ ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ﴾ (خوا بەفریشتەکان دەفەرموێ) ئەوانەی ستەمیان کرد کۆیان بکەنەوە
لەگەڵ هاوڕێکانیان (هاو وێنەکانیان) ﴿وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ﴾ لەگەڵ ئەوانەش دەیان پەرستن ﴿٢٢﴾ ﴿مِن دُونِ اللَّهِ﴾
جگە لە خوا ﴿فَاهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَاطِ الْجَحِيمِ﴾ ئەمجا ڕێگای دۆزەخیان نیشان دەن ﴿٢٣﴾ ﴿وَقِفُوهُمْ ۖ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ﴾ وە ئەوانە
ڕاوەستێنن بێگومان پرسیاریان لێ دەکرێ ﴿٢٤﴾

﴿مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ﴾ (پێیان دەوترێ) ئەوە چیتانە یارمەتی یەکتر نادەن ٢٥ ﴿بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ﴾ (نەخێر
یارمەتی یەکتر نادەن) بەڵکو ئەوان هەموو (بەندەو پەرستراوەکانیان) لەو ڕۆژەدا گەردن کەچن بۆ
خوا ٢٦ ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ و (لەو ڕۆژەدا) ڕوو دەکەنە یەکترو پرسیار لەیەکتر دەکەن ٢٧
﴿قَالُوا إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ الْيَمِينِ﴾ (گومڕاکراوەکان بە گومڕاکەرەکان) دەڵێن بەڕاستی ئێوە بوون لەلای
ڕاستەوە هاتنە لامان (نەتان هێشت شوێنی کەوین) ٢٨ ﴿قَالُوا بَل لَّمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ (گومڕاکەرەکان)
دەڵێن (نەخێر ڕاست ناکەن) بەڵکو ئێوە خۆتان ئیمان دار نەبوون ٢٩ ﴿وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ﴾ وە
ئێمە هیچ دەسەلاتێکمان بەسەر ئێوەدا نەبوو ﴿بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَاغِينَ﴾ بەڵکو خۆتان گەلێکی لەخوایاخی
بوون ٣٠ ﴿فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَا ۖ إِنَّا لَذَائِقُونَ﴾ ئەوەتە بڕیاری پەروەردگارمان (بەسزا دانمان) سەپا
بەسەرماندا، کە بەڕاستی دەبێ بیچەژین ٣١ ﴿فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ﴾ بەڵێ ئێمە ئێوەمان گومڕا کرد
چونکە بەڕاستی خۆشمان گومڕا بووین ٣٢ ﴿فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ جا بەڕاستی هەموویان
(گومڕاکراو و گومڕاکار) لەو ڕۆژەدا لەسزادا هاوبەشن ٣٣ ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ﴾ بێگومان
ئێمە تاوانباران بەو جۆرە لێ دەکەین ٣٤ ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ بەڕاستی هەر کاتێ بەوانە بوترایە
﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە بێجگە لە خوا، خۆیان بە گەورە دەزانی
(و ملکەچی نەدەبوون) ٣٥ ﴿وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُو آلِهَتِنَا﴾ وە دەیان ووت: ئایا ئێمە پەرستراوەکانمان
واز لێ بهێنین؟ ﴿لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ﴾ لە بەر شاعیرێکی شێت ٣٦ ﴿بَلْ جَاءَ بِالْحَقِّ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ﴾ (نەخێر
وانییە) بەڵکو ئەو (پێغەمبەرە) هەقی هێناوەو باوەڕی بە پێغەمبەرانی پێشوو هەیە ٣٧ ﴿إِنَّكُمْ
لَذَائِقُو الْعَذَابِ الْأَلِيمِ﴾ بەڕاستی ئێوە سزای سەخت دەچەژن ٣٨ ﴿وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ و ئێوە
تەنها تۆڵەی ئەو (خراپانە)تان لێ ئەسەنرێ کەکردوتانە ٣٩ ﴿إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ بەڵام بەندە
پاك و هەڵبژاردەکانی خوا ٤٠ ﴿أُولَٰئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ﴾ ئەوانەن ڕزق و ڕۆزی دیار کراویان بۆ هەیە
٤١ ﴿فَوَاكِهُ ۖ وَهُم مُّكْرَمُونَ﴾ کەمیوە هاتی جۆرا و جۆرە، وە ئەوان ڕێز لێگیراون ٤٢ ﴿فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾
لەبەهشتانی پڕ ناز و نیعمەتدا ٤٣ ﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ﴾ لەسەر تەخت و کورسی یە ڕازاوەکان بەرامبەر
یەکتر دانیشتوون ٤٤ ﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾ بەسەریاندا دەسوڕێنەوە بە پەرداخی پڕ لەشەرابی
پاك وخاوێن لە ڕووبارە ڕۆشتوەکانی بەهەشت ٤٥ ﴿بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ﴾ سپیە لە ڕەنگدا، زۆر
بەلەزەتە بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە (کەهیچ زیانێك بەلاشەو ژێری مرۆڤ ناگەیەنێت) ٤٦ ﴿لَا فِيهَا
غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ﴾ (ئەو شەرابە)نەمێشکیان تێك دەدات نەسەر خۆشیان دەکات ٤٧ ﴿وَعِندَهُمْ
قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ﴾ وە ئافرەتانی چاو جوان و گەورەیان لایە، کە جگە لە مێردەکانیان سەیری کەس
ناکەن ٤٨ ﴿كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ﴾ وەکو هێلکەی ناو هێلانەن (یان ئەڵێی مرواری ناو سەدەفن) ٤٩
﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ ئەمجا ڕوو دەکەنە یەك و پرسیار لە یەکتر دەکەن ٥٠ ﴿قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ
إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ﴾ یەکێ لەوان دەڵێ: من (لە دونیا) هاوەڵێکم هەبوو ٥١

﴿يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ﴾ دەی ووت: ئایا بەڕاستی تۆ لەوانەی باوەڕت هەیە (بەزیندوو بوونەوە؟!)
﴿٥٢﴾ ﴿أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا﴾ ئایا کاتێ مردین و بووین بە خاك و ئێسقانی ڕزیوو ﴿أَءِنَّا لَمَدِينُونَ﴾ ئایا
بەڕاستی ئێمە(زیندوو دەکرێینەوەو) سزا دەدرێن ﴿٥٣﴾ ﴿قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ﴾ (پیاوە بەهەشتییەکە) ووتی
ئایا ئێوە تەماشا (ی دۆزەخ) ناکەن ﴿٥٤﴾ ﴿فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئەمجا خۆی سەیری کرد کتوپڕ
لە ناوەڕاستی دۆزەخدا ئەو (هاوڕێی) بینی ﴿٥٥﴾ ﴿قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ﴾ پێی ووت سوێند بەخوا نزیك
بوو منیش هەڵدێری ﴿٥٦﴾ ﴿وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ﴾ وە ئەگەر میهرەبانی پەروەردگارم
فریام نەکەوتایە، منیش لە ئامادەکراوان (ی ناو دۆزەخ) دەبووم ﴿٥٧﴾ ﴿أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ﴾ دەی ئایائێمە
نامرین؟! ﴿٥٨﴾ ﴿إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ﴾ جگە لە مردنەکەی یەکەم (ی دونیا)مان ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾
وەئێمە سزا نادرێین؟! ﴿٥٩﴾ ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ بەڕاستی ئەمەیە سەرکەوتنی گەورە ﴿٦٠﴾
﴿لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ﴾ باتێکۆشەران بۆ پاشەڕۆژی ڕۆژێکی واتێبکۆشن ﴿٦١﴾ ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ
ٱلزَّقُّومِ﴾ ئایا ئەو (نیعمەتانەی باسکرا) ڕێزگرتن و میوان دارییە باشە، یان(بەری) درەختی ژەقنەمووت
؟﴿٦٢﴾ ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومان ئێمە ئەو (دارە)مان کردە هۆی تاقی کردنەوەی ستەمکاران
(کە لە دونیادا گاڵتەیان پێ دەکرد) ﴿٦٣﴾ ﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ﴾ بەڕاستی ئەو (ژەقنەمووتە)
درەختێکە لە بێخی دۆزەخ دا دەڕوێت ﴿٦٤﴾ ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾ بەروبومەکەی هەروەك
سەری شەیتانەکانە (ناشیرین و چڵ چڵاوی یە) ﴿٦٥﴾ ﴿فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا﴾ جا بێگومان ئەو
(دۆزەخیانە) لەو درەختە دەخۆن ﴿فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ﴾ و سکیان لە (بەری) ئەو درەختە پڕ دەکەن
﴿٦٦﴾ ﴿ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ﴾ لە پاشان بە ڕاستی ئاوێکی لیلی زۆر گەرمی بەسەردا دەخۆنەوە
﴿٦٧﴾ ﴿ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ﴾ بێگومان دواتر گەڕانەوەیان بۆ دۆزەخە ﴿٦٨﴾ ﴿إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ
ضَآلِّينَ﴾ بەڕاستی ئەوان باو و باپیرانی خۆیانیان بە گومڕایی بینی ﴿٦٩﴾ ﴿فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ﴾ ئەمجا
ئەوان هاندەدران بۆ شوێن کەوتنیان (لە گومڕاییدا) ﴿٧٠﴾ ﴿وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ سوێند بەخوا
بێگومان پێش ئەو (گومڕایانەی قوڕەیش) زۆربەی گەلە پێشینەکان گومڕا بوون ﴿٧١﴾ ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا
فِيهِم مُّنذِرِينَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لە ناو خۆیاندا (پێغەمبەرانی) ترسێنەرمان بۆ ناردن ﴿٧٢﴾
﴿فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ﴾ ئەمجا (ئەی موحەممەد ﷺ) سەرنج بدە سەرئەنجامی
ترسێنراوەکان چۆن بوو ﴿٧٣﴾ ﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ بێجگە لە بەندە هەڵبژێراوەکانی خوا ﴿٧٤﴾
﴿وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی نووح (علیه السلام) هاواری لێ کردین
ئەمجا ئێمەش زۆر چاك وەڵامی (هاوارەکەی) ئەومان دایەوە ﴿٧٥﴾ ﴿وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ﴾
خۆی و کەس و کاری (باوەڕداری) مان لە تەنگانە گەورەکە ڕزگار کرد ﴿٧٦﴾

﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ﴾ وە تەنها نەوەكانی ئەومان (لەسـەر زەوی) هێشـتەوە ﴿٧٧﴾ ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ﴾
وە باس وناوبانگی (باشـی) ئەومان لەناو گەلە پاشـینەكاندا هێشـتەوە (كە ئەمەیە) ﴿٧٨﴾ ﴿سَلَـٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى
ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ سـەلام و دروود لەسـەر نووح لـە لایەن هەمـوو جیهانیانەوە ﴿٧٩﴾ ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾
بەڕاسـتی ئێمـە ئـا بـەو شـێوە پاداشـتی چاكـەكاران دەدەینـەوە ﴿٨٠﴾ ﴿إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان
ئـەو لـە بەنـدە باوەڕدارەكانی ئێمە بوو ﴿٨١﴾ ﴿ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ﴾ لە پاشـان ئەوانی تـر (دوژمنان) مان
نوقـم كـرد ﴿٨٢﴾ ﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ﴾ بەڕاسـتی ئیبراهیم لە پەیـڕەوان و شـوێنكەوتوانی نووح بوو
(لـە بنەماكانـی ئایینـدا) ﴿٨٣﴾ ﴿إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ كاتێ بە دڵێكی سـاغەوە بـەرەو پەروەردگاری
هـات ﴿٨٤﴾ ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ﴾ كاتـێ كـە بەباوكـی و گەلەكەی ووت چی دەپەرسـتن ﴿٨٥﴾
﴿أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ﴾ ئایا بێجگە لە خوا پەرسـتراوێكی درۆ و هەڵبەستراوتان دەوێ (بیپەرستن)
﴿٨٦﴾ ﴿فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ ئاخـۆ گومانتان چۆنە بەرانبەر بە پەروەردگاری جیهانیان؟ ﴿٨٧﴾ ﴿فَنَظَرَ نَظْرَةً
فِى ٱلنُّجُومِ﴾ ئەمجا سەیرێكی ئەستێرەكانی كرد ﴿٨٨﴾ ﴿فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ﴾ جا ووتی من نەخۆشم (نایەم بۆ
جەژنەكەتان لە دەرەوەی شار) ﴿٨٩﴾ ﴿فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ﴾ ئەوانیش پشتیان تێ كرد و ڕۆشتن (بۆ دەرەوەی
شـار بـۆ جەژنەكەیـان) ﴿٩٠﴾ ﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ﴾ جـا (ئیبراهیـم) بـە نهێنـی ڕۆشـت بۆ لای
پەرسـتراوەكانیان (بە گاڵتەوە) پێی ووتن ئەوە بۆ شـت ناخۆن ﴿٩١﴾ ﴿مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ﴾ ئەوە چیتانە قسـە
ناكەن ﴿٩٢﴾ ﴿فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ﴾ ئەمجا بەدەسـتی ڕاسـتی (بە تەور) دەسـتی كرد بەلێدانیان (ورد
وردی كـردن جگە بتە گەورەكەیان) ﴿٩٣﴾ ﴿فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ﴾ (گەلەكەی زانیان) یەكسـەر بە پەلە بەرەو
ئیبراهیـم هاتـن ﴿٩٤﴾ ﴿قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ﴾ (ئیبراهیم) ووتی ئایـا ئێوە بتانێك دەپەرسـتن كە خۆتان
دەیتاشـن و دروسـتی دەكـەن؟ ﴿٩٥﴾ ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾ لە كاتێكدا خوا بەدیهێنـەری خۆتان و ئەو
بتانەشـە دروسـتان كردون ﴿٩٦﴾ ﴿قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَـٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ﴾ ووتیان بینایەكی بەرزی بۆ دروست
بكـەن (پـڕی كەن لە ئاگـر) و فڕێ ی بدەنـە ناو ئاگرەكـەوە ﴿٩٧﴾ ﴿فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَـٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ﴾
وویسـتیان (بیكـوژن) بـە پیلان بـەڵام ئێمـە ئەوانمـان ژێر خسـت ﴿٩٨﴾ ﴿وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ﴾
(ئیبراهیم) ووتی من دەڕۆم بۆ لای پەروەردگارم، دڵنیام ڕێنموونیم دەكات ﴿٩٩﴾ ﴿رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾
ئـەی پەروەردگـارم منداڵێكـی چاكم پـێ ببەخشـە ﴿١٠٠﴾ ﴿فَبَشَّرْنَـٰهُ بِغُلَـٰمٍ حَلِيمٍ﴾ ئێمەش مـژدەی كوڕێكی
لەسـەرخۆمان پێـدا ﴿١٠١﴾ ﴿فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ﴾ جا كاتێ ئـەو (كوڕە گەورە بوو تا) گەشـتە ئەوەی ئیش
و كار بـكات لەگـەڵ (ئیبراهیـم) دا ﴿قَالَ يَـٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ﴾ (ئیبراهیـم) ووتـی ئەی كوڕە
خۆشەویستەكەم بەڕاستی من لە خەودا بینیم كە سەرت دەبڕم ﴿فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ﴾ جا سەرنج بدە دەڵێیت
چی و ڕات چی یە؟ ﴿قَالَ يَـٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ﴾ (كوڕەكە = ئیسماعیل) ووتی بابەگیان ئەوەی فەرمانت
پـێ دراوە بیكـە ﴿سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ دڵنیابـە دەمبینـی بـە وویسـتی خوا لـە خۆگران
دەبم ﴿١٠٢﴾

﴿فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ﴾ ئەمجا کاتێ هەر دووکیان ملکەچ بوون (بۆ فەرمانی خوا) و ئیبراهیم
ئیسماعیلی بەڕوودا خستەسەر زەوی ﴿١٠٣﴾ ﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ﴾ ئێمەش بانگمان کرد ئەی ئیبراهیم
﴿١٠٤﴾ ﴿قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ﴾ بێگومان خەوەکەت بەجێ هێنا ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە
ئابەو شێوە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ﴿١٠٥﴾ ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ﴾ بێگومان ئەمە تاقی کردنەوەی
ئاشکرابوو ﴿١٠٦﴾ ﴿وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ﴾ وە بەرانێکی گەورەمان کردە قوربانی ئەو (ئیسماعیل) ﴿١٠٧﴾
﴿وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ وە باسکردن بەچاکەی ئیبراهیممان لەناو گەلانی داهاتوودا هێشتەوە ﴿١٠٨﴾
﴿سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ دروود و سەلام لەسەر ئیبراهیم ﴿١٠٩﴾ ﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ ئا بەو شێوە
پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ﴿١١٠﴾ ﴿إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بەڕاستی ئەو لەبەندە ئیمان دارەکانی
ئێمەیە ﴿١١١﴾ ﴿وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ مژدەی ئیسحاقمان پێدا (کە دەبێتە) پێغەمبەرێك
لەچاکەکاران ﴿١١٢﴾ ﴿وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَۚ﴾ جا فەڕ و بەرەکەتمان ڕشت بەسەر ئیبراهیم و ئیسحاق
دا ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ﴾ و لە نەوەی هەردووکیان کارچاك و ستەمکار لەدەروونی
خۆی بەئاشکرا هەبوو ﴿١١٣﴾ ﴿وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان منەتمان نا بەسەر
مووساو هاروون دا ﴿١١٤﴾ ﴿وَنَجَّيۡنَٰهُمَا وَقَوۡمَهُمَا مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ هەردووکیان و گەلەکەیانمان لە تەنگانە
گەورەکە ڕزگار کرد ﴿١١٥﴾ ﴿وَنَصَرۡنَٰهُمۡ فَكَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ﴾ وە یارمەتیمان دان، بۆیە هەر ئەوان سەرکەوتن
(بەسەر فیرعەون و کۆمەڵەکەیدا) ﴿١١٦﴾ ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُمَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلۡمُسۡتَبِينَ﴾ وە کتێبی ڕوونکەرەوەمان دا
بەهەردووکیان (بەمووسا و هاروون) ﴿١١٧﴾ ﴿وَهَدَيۡنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ وە ڕێنموونی هەردووکیانمان
کرد بۆ ڕێگای ڕاست ﴿١١٨﴾ ﴿وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ وە ناوبانگی چاکی هەردووکیانمان لە ناو
گەلە پاشینەکاندا هێشتەوە ﴿١١٩﴾ ﴿سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ سەلام لەسەر مووسا و هاروون بێت
﴿١٢٠﴾ ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە ئا بەو جۆرە پاداشتی کارچاکان دەدەینەوە ﴿١٢١﴾
﴿إِنَّهُمَا مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بێگومان هەردووکیان لەبەندە ئیماندارەکانی ئێمەن ﴿١٢٢﴾ ﴿وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ
ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ بەڕاستی ئیلیاس (پێغەمبەرێك بوو) لەپێغەمبەران ﴿١٢٣﴾ ﴿إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ﴾ کاتێ
بەگەلەکەی ووت ئەوەلەخوا ناترسن (خۆتان ناپارێزن) ﴿١٢٤﴾ ﴿أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ ٱلۡخَٰلِقِينَ﴾ ئایا (بتی)
بەعل دەپەرستن و واز دێنن لە (پەرستنی) چاکترینی دروستکەر و بەدیهێنەران (کە خوای گەورەیە) ﴿١٢٥﴾
﴿ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ کەخوای پەروەردگاری ئێوە و باوو باپیرە پێشینەکانتانە ﴿١٢٦﴾

﴿فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾ کەچی باوەڕیان نەهێنا بە ئیلیاس کەوابوو بێگومان ئەوان ئامادە دەکرێن (لە
دۆزەخ دا) ﴿١٢٧﴾ ﴿إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ جگە بەندە هەڵبژێراوەکانی خوا ﴿١٢٨﴾ ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ﴾
وە باسی چاکی ئەو (ئیلیاس) مان لەناو گەلە پاشینەکان دا هێشتەوە ﴿١٢٩﴾ ﴿سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ﴾ سەلام
لەسەر ئیلیاس بێت (ئیلیاسین و ئیلیاس هەر یەك کەسە) ﴿١٣٠﴾ ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ بەڕاستی
ئێمە ئا بەو شێوە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ﴿١٣١﴾ ﴿إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان ئەو (ئیلیاس)
لە بەندە باوەڕدارەکانی ئێمەیە ﴿١٣٢﴾ ﴿وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ بەڕاستی لووط (پێغەمبەرێك بوو) لە
پێغەمبەران ﴿١٣٣﴾ ﴿إِذْ نَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ﴾ کاتێك خۆی و هەموو کەسەکانی و شوێن کەوتووانیمان
ڕزگار کرد ﴿١٣٤﴾ ﴿إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ﴾ بێجگە لەپیرەژنێك (خێزانی لووط) کە لە تیاچووەکان بوو
﴿١٣٥﴾ ﴿ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ﴾ پاشان ئەوانی ترمان لەناو برد ﴿١٣٦﴾ ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ﴾ بەڕاستی
ئێوە (ئەی قوڕەیشییەکان) بە بەیانیاندا (بە ڕۆژ) دەڕۆن بەسەر (شوێنەوارەکانیاندا) ﴿١٣٧﴾ ﴿وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا
تَعْقِلُونَ﴾ و بەشەودا ئایا ئیتر ژیر نابن ﴿١٣٨﴾ ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ وە بە ڕاستی یونس (پێغەمبەرێك
بوو) لەپێغەمبەران ﴿١٣٩﴾ ﴿إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾ کاتێ ڕای کرد بۆ لای کەشتیەکی پڕ (لە خەڵك)
﴿١٤٠﴾ ﴿فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ﴾ ئەمجا (ئەو کەشتیە لەبەر ئەوەی باری قوورس بوو، لەترسی
نوقم نەبوونی، خەڵکەکەی کە لەناویدا بوون، قورعەکێشیان کرد بۆ ئەوەی ئەو کەسەی دەرچوو
بیخەنە ناو دەریاکەوە وباری کەشتەیەکە سووکتر ببێت) قورعەیان کرد (یونس) ئەو کەسە بوو
لەقورعەکە سەرنەکەوت ﴿١٤١﴾ ﴿فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ﴾ (خرایە دەریاکەو) ئەمجا نەهەنگێك قووتی
دا ئەویش شایانی سەرزەنشت بوو ﴿١٤٢﴾ ﴿فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ﴾ خۆ ئەگەر بەڕاستی ئەو لە یاد
کارانی (خوا) نەبوایە ﴿١٤٣﴾ ﴿لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ هەتا ڕۆژی زیندوو بوونەوە لەناو سکی
ئەو (نەهەنگەدا) دەمایەوە ﴿١٤٤﴾ ﴿فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ﴾ بە هۆی ئەوەوە فڕێمان دایە زەویەکی
ڕووت (بێ دار و درەخت) و نەخۆشیش بوو ﴿١٤٥﴾ ﴿وَأَنبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ﴾ وە ڕووەکێکی
کولەکەمان بەسەریدا ڕواند ﴿١٤٦﴾ ﴿وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴾ ئەوسا بە پێغەمبەرێتی ناردمان
بۆ لای سەد هەزار کەس یا زیاتر ﴿١٤٧﴾ ﴿فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾ گەلەکەش باوەڕیان هێنا و بەو
هۆیەوە بەهرەمەندمان کردن لەژیان تا ماوەیەك ﴿١٤٨﴾ ﴿فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ وَلَهُمُ الْبَنُونَ﴾ ئەمجا
(ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیاریان لێ بکە ئایا کچان بۆ پەروەردگاری تۆیە و کوڕانیش هی ئەوانە؟ ﴿١٤٩﴾
﴿أَمْ خَلَقْنَا الْمَلَائِكَةَ إِنَاثًا وَهُمْ شَاهِدُونَ﴾ یان ئەوان بەدیارەوەبوون کە ئێمە فریشتەکانمان بە مێینە دروست
کرد ﴿١٥٠﴾ ﴿أَلَا إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ﴾ بێدار بن بەڕاستی ئەوان لە دەس هەڵبەسی خۆیانەوە دەڵێن ﴿١٥١﴾
﴿وَلَدَ اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ خوا منداڵی بووەو بێگومان ئەوانە درۆزنن ﴿١٥٢﴾ ﴿أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ﴾ ئایا
(خوا) کچانی هەڵبژاردووە(بۆ خۆی)بەسەر کوڕان دا ﴿١٥٣﴾

﴿مَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ﴾ چیتانە چۆن بڕیاری وا دەدەن ﴿١٥٤﴾ ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا بیر ناکەنەوە؟ ﴿١٥٥﴾ ﴿أَمۡ
لَكُمۡ سُلۡطَٰنٞ مُّبِينٞ﴾ یان بەڵگەیەکی ڕوونتان (لەم بارەیەوە) هەیە ﴿١٥٦﴾ ﴿فَأۡتُواْ بِكِتَٰبِكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ دەی
کتێبەکەتان (بەڵگەکەتان) بێنن ئەگەر ڕاست دەکەن ﴿١٥٧﴾ ﴿وَجَعَلُواْ بَيۡنَهُۥ وَبَيۡنَ ٱلۡجِنَّةِ نَسَبٗاۚ﴾ وە ئەو (بێ
باوەڕانە) لە نێوان خواو جنۆکەدا خزمایەتی یان بڕیار داوە ﴿وَلَقَدۡ عَلِمَتِ ٱلۡجِنَّةُ إِنَّهُمۡ لَمُحۡضَرُونَ﴾ سوێند
بەخوا بێگومان جنۆکەکان دەیان زانی کە بەڕاستی ئەوان ئامادە دەکرێن (لەڕۆژی دوایيدا) ﴿١٥٨﴾
﴿سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پاك و بێگەردە خوا لەوەی ئەو (بێ باوەڕانە) دەیلێن ﴿١٥٩﴾ ﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾
(هەموویان سزا دەدرێن) بێجگە بەندە خاوێن کراوەکانی خوا ﴿١٦٠﴾ ﴿فَإِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ﴾ ئەمجا بەڕاستی
ئێوە و ئەو (بتانە) یش کە دەیپەرستن ﴿١٦١﴾ ﴿مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ بِفَٰتِنِينَ﴾ ئێوە ناتوانن لەبەرانبەری خوادا گومڕاکەری
(کەس) بن ﴿١٦٢﴾ ﴿إِلَّا مَنۡ هُوَ صَالِ ٱلۡجَحِيمِ﴾ بێجگە ئەو کەسەی (خوا دەزانێ) دەچێتە دۆزەخەوە ﴿١٦٣﴾
﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٞ مَّعۡلُومٞ﴾ (فریشتەکان دەڵێن) هیچ کام لەئێمە نییە مەگەر پلەو شوێنێکی دیاری کراوی
خۆی هەیە ﴿١٦٤﴾ ﴿وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلصَّآفُّونَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە هەموومان بەڕیز وەستاوین (بۆ عیبادەت و بەجێ
هێنانی فەرمانی خوا) ﴿١٦٥﴾ ﴿وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلۡمُسَبِّحُونَ﴾ وە بێگومان ئێمەین هەمیشە تەسبیحات وزیکر ویادی ئەو
دەکەین ﴿١٦٦﴾ ﴿وَإِن كَانُواْ لَيَقُولُونَ﴾ بێگومان هەر چەندە بت پەرستان دەیانووت ﴿١٦٧﴾ ﴿لَوۡ أَنَّ عِندَنَا ذِكۡرٗا مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾
بەڕاستی ئەگەر کتێبێك (ی ئاسمانی وەك کتێبی) پێشینانمان هەبوایە ﴿١٦٨﴾ ﴿لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾
بەڕاستی ئێمە لە بەندە پاك و خاوێنەکانی خوا دەبووین ﴿١٦٩﴾ ﴿فَكَفَرُواْ بِهِۦۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾ ئەمجا (کە کتێبیان
بۆ هات) باوەڕیان پێ نەهێنا، جابەزوویی دەزانن (سەر ئەنجامی بێ بڕواییەکەیان چۆن دەبێ) ﴿١٧٠﴾
﴿وَلَقَدۡ سَبَقَتۡ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان پێشتر بڕیارمان داوە بۆ بەندە نێردراوەکانمان
﴿١٧١﴾ ﴿إِنَّهُمۡ لَهُمُ ٱلۡمَنصُورُونَ﴾ کە بێگومان هەر ئەوان سەر دەخرێن ﴿١٧٢﴾ ﴿وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ﴾ دیاریشە هەر
سەربازانی ئێمە سەردەکەوون ﴿١٧٣﴾ ﴿فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ﴾ تۆش وازیان لێ بهێنە تا ئەو ماوەی(دیاری
کراوە بۆ لەناوبردنیان) ﴿١٧٤﴾ ﴿وَأَبۡصِرۡهُمۡ فَسَوۡفَ يُبۡصِرُونَ﴾ وە بیان بینە (سەرنجامیان چۆن دەبێت) لەمەولا
ئەوانیش دەبینن (چییان بەسەر دێت) ﴿١٧٥﴾ ﴿أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ﴾ جا ئایا بەپەلە داوای سزای ئێمە دەکەن ﴿١٧٦﴾
﴿فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمۡ﴾ هەر کاتێ سزای ئێمە هاتە خوارەوە بۆ ناو ماڵەکانیان ﴿فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلۡمُنذَرِينَ﴾ ئەوسا
ترسێنراوان چ ڕۆژێکی خراپ و تەنگیان دەبێ ﴿١٧٧﴾ ﴿وَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ﴾ وە وازیان لێ بهێنە هەتائەو
ماوەی (دیاری کراوە بۆیان) ﴿١٧٨﴾ ﴿وَأَبۡصِرۡ فَسَوۡفَ يُبۡصِرُونَ﴾ وە ببینە ئەمجا لەمەولا ئەوانیش دەبینن ﴿١٧٩﴾
﴿سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پەروەردگارت پاك و بێگەردە، پەروەردگاری باڵا دەست لەوەی
بێ باوەڕان دەیلێن (دەربارەی) ﴿١٨٠﴾ ﴿وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ سڵاو و درودیش بۆ گشت پێغەمبەران ﴿١٨١﴾
﴿وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ سوپاس و ستایشیش بۆ خوای ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ پەروەردگاری هەموو جیهانیان ﴿١٨٢﴾

## سورەتی ﴿صٓ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿صٓ﴾ بـە (صـاد) دەخوێنرێتـەوە خوازاناتـرە بـە ماناکـەی بۆ زانیاری زیاتر سـەیر سـەرەتای سـورەتی (البقـرة) بکە
﴿وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ﴾ سوێند بە قورئانی خاوەن ڕێز و پەند و ئامۆژگاری ﴿١﴾ ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ﴾ بەڵام ئەوانەی
بێ باوەڕن ڕۆ چوون، لە خۆبەگەورە زانین و دژایەتیدا (بەرانبەر ئیسلام و شـوێن کەوتووانی) ﴿٢﴾ ﴿كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن
قَرۡنٖ﴾ چەندەها گەلمـان پێش ئـەوان (کافرانی مەککـە) لەناو بـرد ﴿فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ﴾ ئەمجـا هاواریـان کرد لە
حاڵێکدا کاتی ڕزگار بوون نەمابوو ﴿٣﴾ ﴿وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ﴾ سـەریان سـوڕدەماکە ترسـێنەرێکیان لە خۆیان بۆ
هاتـووە ﴿وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ﴾ وە بێ بـاوەڕان دەیان ووت ئەم (پێغەمبەرە) جـادوو گەرێکی زۆر درۆزنە ﴿٤﴾
﴿أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ﴾ ئایـا ئـەو (پێغەمبـەرە) هەموو خواکانـی کردوەتە یەك خوا ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ﴾ بەڕاستی ئەمە
(کەیـەك خـوا ببێ) شـتێکی زۆر سەرسـوڕهێنەرە ﴿٥﴾ ﴿وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ﴾ وە گەورەکانـی (قوڕەیش لەگـەڵ پێغەمبەر
قسـەیان کـرد و هەڵسـان) بـە پەلـە دەرچـوون ﴿أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ﴾ (بەخەڵکیـان ووت) بڕۆن و خـۆ گر بن
لەسـەر (پەرستنی) خواکانتان ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ﴾ بەڕاستی ئەمە(ی موحەممەد ﷺ) دەیڵێ) شتێکە لە ئێوە داوا کراوە
(هەتا ببێتە گەورەی هەموو عەرەب) ﴿٦﴾ ﴿مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئەمەمان نەبیستووە لە کۆتا ئایینەدا (کە نەسرانی یە)
﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ﴾ ئەمـە تەنهـا شـتێکی هەڵبەسـتراوە ﴿٧﴾ ﴿أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ﴾ ئایـا چۆن وەحی لە نـاو هەموومان
دا بـۆ ئـەو (موحەممەد ﷺ) دابەزێنـراوە ﴿بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ﴾ (نەخێر ڕاسـت ناکەن) بەڵکو ئەوانە لـە گوماندان لە
قورئانەکەی من ﴿بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ﴾ (نەخێر وا نیە) بەڵکو ئەوانە هێشتا سزای منیان نەچەشتووە (بۆیە باوەڕ ناهێنن) ﴿٨﴾
﴿أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ﴾ یا خەزێنەکانی بەزەیی پەروەردگاری زاڵی باڵادەستی بەخشندەت لای ئەوانە؟ ﴿٩﴾
﴿أَمۡ لَهُم مُّلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ﴾ یا دەسـەڵات و پاشـایی ئاسـمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە هی ئەوانە
﴿فَلۡيَرۡتَقُواْ فِي ٱلۡأَسۡبَٰبِ﴾ (ئەگـەر وایـە) دەبـا بـەرز ببنەوە لـە نـاو هۆکارەکانی بـەرز بوونەوەدا (تـا دەگەنە عـەرش ئەمجا
وەحـی دابەزێنـن بـۆ هەر کەسـێ خۆیـان دەیانەوێت) ﴿١٠﴾ ﴿جُندٞ مَّا هُنَالِكَ مَهۡزُومٞ مِّنَ ٱلۡأَحۡزَابِ﴾ (بـێ بڕوایانـی قوڕەیش)
لەشـکر و کۆمەڵێکـی بـێ نرخـن لـەو کۆمەڵانـەی (دژی پێغەمبەرانن بەزوویی) دەشـکێنرێن و سـەر شـۆڕ دەبن ﴿١١﴾
﴿كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ ذُو ٱلۡأَوۡتَادِ﴾ پێـش ئـەوان گەلی نووح و عـاد و فیرعەونی خاوەن مێخـەکان باوەڕیان
(بە پێغەمبەرەکانیان) نەهێنا ﴿١٢﴾ ﴿وَثَمُودُ وَقَوۡمُ لُوطٖ وَأَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِۚ﴾ وە (گەلی) سەموود و گەلی لووط و خاوەن باخە چڕو
پـڕەکان ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَحۡزَابُ﴾ ئەوانە تاقم و کۆمەڵانێك بوون ﴿١٣﴾ ﴿إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ﴾ هەر هەموویان
باوەڕیان بە پێغەمبەران نەهێنا بۆیە سـزای منیان بەسـەرا چەسپا (و لە ناو چوون) ﴿١٤﴾ ﴿وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ﴾
ئەمانە تەنها چاوەڕوانی دەنگێکی زۆر گەورە دەکەن ﴿مَّا لَهَا مِن فَوَاقٖ﴾ ئەو دەنگە (فوو کردن بە کەڕەنادا) کەمترین ماوە
دوا خسـتنی نییـە ﴿١٥﴾ ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ﴾ (بەگاڵتە پێکردنێکـەوە) وە ووتیان: ئـەی پەروەردگارمان
پێش ڕۆژی لێ پرسینەوە بەشەکەمان (لە سزا یان پاداشت) پێ بدە ﴿١٦﴾

﴿ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) دان بە خۆتدا بگرە لەسەر ئەو قسانەی کە دەیکەن ﴿وَٱذۡكُرۡ
عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ بیری بەندەمان (داوود) ی خاوەن هێز و توانا بکەرەوە بێگومان ئەو هەمیشە
گەڕاوە بوو بۆ لای خوا ﴿١٧﴾ ﴿إِنَّا سَخَّرۡنَا ٱلۡجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحۡنَ﴾ بەڕاستی ئێمە چیاکانمان رام هێنا بوو
تەسبیحاتی خوایان دەکرد لەگەڵ ئەو(داوود) ﴿بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِشۡرَاقِ﴾ بەئێواران و بەیانیاندا ﴿١٨﴾ ﴿وَٱلطَّيۡرَ
مَحۡشُورَةٗۖ كُلّٞ لَّهُۥٓ أَوَّابٞ﴾ وە باڵندەکان کە لەدەوری ئەو (داوود) کۆدەکرانەوە هەموو(بۆ تەسبیحات)
بۆلای ئەو دەگەڕانەو(تا لەگەڵ داوود یادی خوا بکەن) ﴿١٩﴾ ﴿وَشَدَدۡنَا مُلۡكَهُۥ﴾ وە پاشایەتیەکەی
ئەومان بەهێز کرد ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحِكۡمَةَ وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ﴾ دانایی و گوفتاری جیاکەرەوەمان پێ بەخشی ﴿٢٠﴾
﴿وَهَلۡ أَتَىٰكَ نَبَؤُاْ ٱلۡخَصۡمِ إِذۡ تَسَوَّرُواْ ٱلۡمِحۡرَابَ﴾ وە ئایا هەواڵی داوا چییەکانت پێ گەیشتووە کاتێ بەدیواری
خەڵوەتگاکەدا سەر کەوتن ﴿٢١﴾ ﴿إِذۡ دَخَلُواْ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنۡهُمۡۖ﴾ لە ناکاودا چوونە ژوورەوە بۆ لای داوود
ئەویش داچڵەکا و ترسا لێیان ﴿قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ خَصۡمَانِ﴾ ووتیان: مەترسە(ئێمە)دوو داوا چین ﴿بَغَىٰ بَعۡضُنَا عَلَىٰ
بَعۡضٖ﴾ یەکێکمان ستەمی لەوی تر کردووە ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ وَلَا تُشۡطِطۡ﴾ جا لە نێوانماندا بەهەق وڕاستی بڕیار
بدەولە ڕاستی لامەدە(لە بڕیارەکەتدا) ﴿وَٱهۡدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ﴾ وە ڕێنموونیمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست ﴿٢٢﴾
﴿إِنَّ هَٰذَآ أَخِي لَهُۥ تِسۡعٞ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ﴾ (یەکیان ووتی) بێگومان ئەمە برامە، نەوەدونۆ سەرمەڕی هەیە ﴿وَلِيَ نَعۡجَةٞ وَٰحِدَةٞ﴾
و منیش یەك مەڕم هەیە ﴿فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ﴾ کەچی دەڵێت ئەو مەڕەش بدە بەمن (بیسپێرە بە من)
و لەکاتی قسە کردندا زاڵە بەسەرمدا ﴿٢٣﴾ ﴿قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦۖ﴾ (ئەمجا داوود علیه السلام بەبێ
ئەوەی گوێ لەبراکەی تریان بگرێت وبەپەلە ئەم حوکمەی دا) ووتی: سوێندبەخوا بەڕاستی ستەمی لێکردوی
کە داوات لێدەکات تاقە مەڕەکەت بخاتە ناو مەڕەکانی خۆیەوە ﴿وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ﴾
و بێگومان زۆر لەشەریك و هاوبەشان ستەم لەیەکتری دەکەن ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٞ مَّا هُمۡۗ﴾
بێجگە لەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە، ئەوانەش زۆر کەمن ﴿وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ﴾
داوود زانی کە ئێمە تەنها تاقیمان کردوەتەوە ﴿فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّۤ رَاكِعٗاۤ وَأَنَابَ ۩﴾ بۆیە داوای لێبوردنی کرد لە
پەروەردگاری وکەوت بە ڕوودا بە سوژدە بردنەوە و تۆبەی کرد (لەوەی نەدەبوو بەبێ گوێگرتن لەکەسی
بەرامبەر حوکم بدات وپەلەش بکات لەبڕیاردانا) ﴿٢٤﴾ ﴿فَغَفَرۡنَا لَهُۥ ذَٰلِكَۖ﴾ ئێمەش لەو هەڵەی ئەو خۆش بووین
﴿وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ﴾ بەڕاستی ئەو (داوود) پلە و پایەی بەرزەو نزیکە لە ئێمەوە
ودوارۆژێکی چاکیشی هەیە ﴿٢٥﴾ ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەی داوود بێگومان ئێمە تۆمان کرد
بەجێنشینی (پێغەمبەرانی پێش خۆت) لە زەویدا ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ﴾ کەوابوو تۆش لە نێوان خەڵکدا
بەڕاستی فەرمانڕەوایی بکە ﴿وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ شوێن هەوا و ئارەزوو مەکەوە با لەڕێگای
خوا لات نەدات ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بێگومان ئەوانەی لەڕێگای خوا لادەدەن و گومڕا دەبن
﴿لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ﴾ سزای سەختیان بۆ هەیە چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەیان
لەبیر کردبوو ﴿٢٦﴾

﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًاۚ﴾ ئێمـە ئاسـمان و زەوی و ئـەوەی لـە نێوانیاندایـە بەبێهـودە دروسـتمان
نەکردووە ﴿ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ﴾ ئەوە گومانی ئەو کەسـانەیە کە بێ باوەڕ بوون ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ سا هاوار
بۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون بەئاگری دۆزەخ ﴿٢٧﴾ ﴿أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئایا ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو
کـردەوە چاکەکانیـان کـردووە ﴿كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ لەگەڵ خراپـەکاران لە زەویـدا وەك یەکیـان دانێین (لە دوا
ڕۆژدا، نەخێر وانی یە) ﴿أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ﴾ یان پارێزکاران ولەخواترسان وەك بەد کرداران لێ دەکەین ﴿٢٨﴾
﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ﴾ (ئەم قورئانە) کتێبێکـی پیرۆزە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ تۆ ﴿لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ
ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ بـۆ ئـەوەی بیـر بکەنـەوە لەئایەتەکانـی، وە خاوەنانـی بیـر و ژیـری پەنـدی لـێ وەربگـرن ﴿٢٩﴾
﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَۚ﴾ ئێمـە سـولەیمانمان بەخشـی بـە داوود (علیهمـا السـلام) ﴿نِعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ ئـەو
(سـولەیمان) بەندەیەکـی چـاك بـوو، بێگومان ئـەو زۆر ڕوو لەخـوا بوو ﴿٣٠﴾ ﴿إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ﴾
سـەر لـە ئێـوارە کاتێك ئەسـپانی ڕەسـەن و خێـرا نیشـانی سـولەیمان درا ﴿٣١﴾ ﴿فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى﴾
جا (سولەیمان) ووتی خۆشەویستی ئەم ئەسپانەم باودا بەسەر یاد و عیبادەتی پەروەردگارم دا (کە نوێژی عەسر بوو)
﴿حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ﴾ (سەیری ئەسپەکانی دەکرد) هەتا لەچاوو گوم بوون ﴿٣٢﴾ ﴿رُدُّوهَا عَلَىَّ﴾ (ووتی) جارێکی تر
ئەو ئەسپانەم بۆ بگێڕنەوە ﴿فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ﴾ ئەمجا دەستی هێنا بە دەست و قاچ و گەردن و یاڵی (ئەو
ئەسپانەدا) ﴿٣٣﴾ ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی سولەیمانمان تاقی کردەوە ﴿وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا﴾
و لاشـەی (لەتە کوڕێ) کمان فڕێدا بەسـەر تەختەکەیدا (چونکە پێشـتر سـوێندی خواردبوو، کە بەسەر تەواوی
خێزانەکانیـدا ئەسـوڕێتەوە وکۆ ئەبێتەوە لەگەڵیاندا، وهەریەکەشـیان کوڕێکی ببێت ولەپێنـاو خوادا جیهاد بکەن
بەبێ ئەوەی (ان شاء الله) بکات لەدواییدا لەهەر هەموو خێزانەکانی تەنها کوڕێکی نوقسانی ناتەواوی بوو، خوای
گەورەش بەمە تاقیکردەوە) ﴿ثُمَّ أَنَابَ﴾ پاشان تەوبەی کرد و گەڕایەوە بۆ لای خوا ﴿٣٤﴾ ﴿قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا﴾
(سولەیمان) ووتی ئەی پەروەردگارم لێم خۆشبە و دەسەڵات و پاشایەتێکم پێ ببەخشە ﴿لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ﴾
کـەدوای من دەس نەدا بۆ کەسـی تر ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ﴾ بێگومان تەنها تۆی بەخشـندەی (هەموو شـتێکی) ﴿٣٥﴾
﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ﴾ (دوای نزاکـەی) (بـا) مـان بـۆ ڕام هێنـا وخسـتمانە خزمەتیـەوە ﴿تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ﴾
بەفەرمانـی ئەو بەنەرمـی دەڕۆیی بۆ هەر جێگایەك بیویسـتایە ﴿٣٦﴾ ﴿وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ﴾ وە هەموو (جنۆکەو)
شەیتانەکانمان بۆ ڕام هێنا بوو کە بینا سازو مەلەوانی ژێر دەریا بوون ﴿٣٧﴾ ﴿وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ﴾ وە هەندێکی
تریان (کە سـەرپێچی سـولەیمانیان کردبوو ڕامیان هێنان بۆی) بە پێکەوە بەسـتراوی لە کۆت زنجیردا ﴿٣٨﴾ ﴿هَٰذَا
عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ ئەمەی (کە باسکرا) بەخششی ئێمەیە (بۆ تۆ)، ئەمجا بەویستی خۆت ببەخشە، یان
بیگرەوە و مەیبەخشـە بەبێ پرسینەوە (لێت) ﴿٣٩﴾ ﴿وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ﴾ وە بەڕاسـتی ئەو (سولەیمان) پلەی
بـەرزی هەیـە لای ئێمە وە سـەر ئەنجامی چاکی هەیـە ﴿٤٠﴾ ﴿وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ)
باسـی بەنـدەی ئێمە ئەیوب بکە کاتێك هاواری لـە پەروەردگاری کرد ﴿أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلشَّيْطَٰنُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ﴾ (ووتی)
بەڕاسـتی شەیتان تووشی زەحمەت و ناڕەحەتی و ئازاری کردووم ﴿٤١﴾ ﴿ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَۖ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ﴾ (پێ ی
وتـرا) پێت بدە بە زەویدا ئەوە کانیاوێکی سـاردە بۆ خۆشـتن و خواردنەوە (پێی دا بەزەویـدا و ئاو هەڵقوڵی ولەو
ئاوە خۆی شت و ئاوی خواردەوە ولە نەخۆشییەکەیشی چاك بوویەوە) ﴿٤٢﴾

﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ﴾ وە ژن و منداڵەکانی و ئەوەندەی تریشمان لەگەڵیان دا بە (ئەیوب) بەخشی
﴿رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ بەڕەحم ومیهرەبانی لە لایەن خۆمانەوە (بۆ ئەیوب) وە بۆ پەند و ئامۆژگاری بۆ
خاوەنانی ژیری و بیرو هۆش (٤٣) ﴿وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡ﴾ (پێمان ووت) چەپکێ شووڵ (داری زۆر
باریك) بە دەستەوە بگرە و پێی بدە (لەخێزانت یەك جار) و سوێندەکەت مەشکێنە (کە لە خێزانت خوارد بوو
سەد داری لێ بدەی) ﴿إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗا﴾ بەڕاستی ئێمە ئەو (ئەیوب)مان بەخۆگری بینی ﴿نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ﴾
چ بەندەیەکی چاك بوو بەڕاستی ئەو زۆر گوێڕایەڵ و ڕوو لە خوا بوو (٤٤) ﴿وَٱذۡكُرۡ عِبَٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ﴾
وە باسی بەندەکانی ئێمە بکە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب ﴿أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾ کە خاوەنی هێزو توانا
و بینایی بوون (٤٥) ﴿إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ﴾ بەڕاستی لەبەر ئەوەی هەمیشە ڕۆژی دواییان لەبیردابوو
ئێمە (بە بەندەی تایبەتی خۆمان) هەڵمان بژاردن (٤٦) ﴿وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ﴾ وە بەڕاستی ئەوانە
(هەر سیانیان) لای ئێمە لەبەند هەڵبژێردراوە چاکەکانن (٤٧) ﴿وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ﴾ وە باسی
(بەندەکانی ئێمە) ئیسماعیل و ئەلیەسەع و ذو لکیفل بکە ﴿وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ﴾ کەهەموویان لە چاکەکارانن
(٤٨) ﴿هَٰذَا ذِكۡرٞۚ وَإِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ لَحُسۡنَ مَـَٔابٖ﴾ ئەم (باسی پێغەمبەرانە) باس و ناوبانگی چاکیانە لە دونیادا و بێگومان
پارێزکاران سەرئەنجامێکی چاکیان هەیە (٤٩) ﴿جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ﴾ (کە بریتی یە لە) بەهەشتانی
جێگای مانەوەی هەمیشەیی، کەدەرگاکانی کراوەتەوە بۆیان (٥٠) ﴿مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا﴾ لەوێدا (لەسەر کورسی
ڕازاوە) پاڵیان داوەتەوە ﴿يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ﴾ تێیدا داوای میوەهاتی زۆر و جۆرەها خواردنەوە
دەکەن (٥١) ﴿وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ أَتۡرَابٌ﴾ و حۆرییانی هاوتەمەنیان لایە (خێزانیانن) کەچاویان بڕیوەتە
مێردەکانیان (٥٢) ﴿هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ﴾ ئەمە ئەو (نازو نیعمەتانە)یە کە بەڵێنتان پێ درا بوو بۆ ڕۆژی
لێپرسینەوە(ی قیامەت) (٥٣) ﴿إِنَّ هَٰذَا لَرِزۡقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ﴾ بەڕاستی ئەمە ڕزق و ڕۆزی ئێمەیە هەرگیز تەواو
بوونی بۆ نییە (٥٤) ﴿هَٰذَاۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٖ﴾ ئا ئەمە (پاداشتی پارێزکارانە) و بێگومان سەرکەشانیش
خراپترین پاشە ڕۆژیان هەیە (٥٥) ﴿جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَا فَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ﴾ دۆزەخە کەدەچنە ناویەوە، ئای چ جێگایەکی
بەدو خراپە (٥٦) ﴿هَٰذَا فَلۡيَذُوقُوهُ حَمِيمٞ وَغَسَّاقٞ﴾ ئەمە و ئاوی لەکوڵ و کێم وزووخاو، دەبا بیچەژن (٥٧)
﴿وَءَاخَرُ مِن شَكۡلِهِۦٓ أَزۡوَٰجٌ﴾ وە چەند جۆری تر سزایان هەیە لەو شێوە (٥٨) ﴿هَٰذَا فَوۡجٞ مُّقۡتَحِمٞ مَّعَكُمۡ﴾
(بە گومڕاکەرەکان دەوترێ) ئەمە کۆمەڵێکە لەگەڵ ئێوەدا دێنە دۆزەخ ﴿لَا مَرۡحَبَۢا بِهِمۡۚ﴾ (گومڕاکەرەکانیش
دەڵێن) بەخێر نەیەن ﴿إِنَّهُمۡ صَالُواْ ٱلنَّارِ﴾ بێگومان ئەوانە دەچنە ناو ئاگری دۆزەخ (٥٩) ﴿قَالُواْ بَلۡ أَنتُمۡ لَا مَرۡحَبَۢا بِكُمۡۖ﴾
ئەوان (بە گومڕاکەرەکان) دەڵێن بەڵکو ئێوە بەخێر نەیەن ﴿أَنتُمۡ قَدَّمۡتُمُوهُ لَنَاۖ﴾ ئێوە (لەدونیا گومڕاتان کردین)
و ئەم سزاتان پێش هێنا بۆمان ﴿فَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ﴾ ئای چ جێگاو مەنزڵێکی خراپە (٦٠) ﴿قَالُواْ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا﴾
دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان هەر کەس (هۆی) پێش هێنانی ئەم سزایە بوو بۆ ئێمە ﴿فَزِدۡهُ عَذَابٗا ضِعۡفٗا فِي ٱلنَّارِ﴾
ئەوە سزای ئەو کەسە لەدۆزەخدا چەند قات بکە رەوە (٦١)

﴿وَقَالُوا مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا﴾ وە (گومڕاکـەرەکان) دەڵێـن ئـەوە چیمانە بۆچ پیاوانێـك نابینین ﴿كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ
الْأَشْرَارِ﴾ کـە ئێمـە لە خراپەرکارانمان دەژمـاردن ﴿٦٢﴾ ﴿أَتَّخَذْنَاهُمْ سِخْرِيًّا﴾ ئایا ئەوانەن کـە گاڵتەمان پێ
دەکـردن؟ ﴿أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ الْأَبْصَارُ﴾ یـا (لێرەن بەڵام) چاوەکان لێیان کەلا بـووە (و نایان بینن) ﴿٦٣﴾ ﴿إِنَّ
ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ النَّارِ﴾ بێگومان ئەوە (کە باسکرا) ئاژاوە و شەڕە قسەی دۆزەخیانە، وڕاستە (و دێتەدی)
﴿٦٤﴾ ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا مُنذِرٌ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵێ من تەنها ترسـێنەرێکم ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾
و هیـچ پەرسـتراوێکی ڕاسـت نییـە بێجگـە لە خـوای تەنهای بەدەسـەڵات ﴿٦٥﴾ ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ
وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە ﴿الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ﴾ زاڵی باڵادەستی
لێبوردەیـە ﴿٦٦﴾ ﴿قُلْ هُوَ نَبَأٌ عَظِيمٌ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ ئـەوە هەواڵێکـی زۆر گەورەیـە ﴿٦٧﴾
﴿أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ﴾ کە ئێوە گوێ ی پێ نادەن ﴿٦٨﴾ ﴿مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ﴾ (بڵێ ئەگەر وەحیم بۆ نەهاتایە)
مـن هیچ ئاگام لەکۆمەڵـی هەرە بڵند (فریشـتەکان) نەبووە ﴿إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ کاتێ دەمـە قاڵێیان دەکرد
(دەربارەی ئادەم) ﴿٦٩﴾ ﴿إِن يُوحَىٰ إِلَيَّ﴾ نیگا بۆ من ناکرێت ﴿إِلَّا أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ جگە لەوە نەبێت کە من
تەنها ترسێنەرێکی ڕوونکەرەوەم ﴿٧٠﴾ ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ﴾ ئەو کاتەی (دەمەقاڵێ یان بوو) پەروەردگارت
بەفریشـتەکانی فەرمـوو ﴿إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن طِينٍ﴾ بەڕاسـتی مـن مرۆڤێـك لـە قـوڕ دروسـت دەکەم ﴿٧١﴾
﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ ئەمجا کاتێ شێوەکەیم ڕێك خست و فوم پێدا کرد و گیانم کرد بەبەرید اله
گیانێك کەخۆم دروستم کردووە ﴿فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾ ئەوساهەموو بەسوژدە بردن بۆی بکەون بەڕوودا ﴿٧٢﴾
﴿فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ﴾ جافریشـتەکان هـەر هەموویـان سـوژدەیان برد ﴿٧٣﴾ ﴿إِلَّا إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ﴾
بێجگە لە شـەیتان کە خۆی بە گەورە دانا ﴿وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ و لە بێ باوەڕان بوو ﴿٧٤﴾ ﴿قَالَ يَا إِبْلِيسُ﴾
(خوا) فەرمووی ئەی ئیبلیس ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ چی شتێك ڕێگری کردی (لەوەی) کە
سوژدە ببەیت بۆ کەسێ کە بە هەردوو دەستی خۆم دروستم کردووە ﴿أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْعَالِينَ﴾ ئایا خۆت
بە گـەورە زانی، یاخو لەبەرزو بڵندەکانی ﴿٧٥﴾ ﴿قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ﴾ (شـەیتان) وتـی من لە (ئادەم) چاکترم
﴿خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾ چونکە منت لەئاگر دروست کردووە، بەڵام ئەوت لەقوڕ دروستکردووە ﴿٧٦﴾
﴿قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ﴾ (خوا) فەرمووی کەواتە لەو (بەهەشـتە) دەرچۆ و بڕۆ، چونکە بێگومان تۆ
دەرکراوی لەڕەحمەتی من ﴿٧٧﴾ ﴿وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِي إِلَىٰ يَوْمِ الدِّينِ﴾ وە بەڕاستی نەفرینی منت لەسەر بێ تا ڕۆژی
(پاداشت و تۆڵە) ﴿٧٨﴾ ﴿قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ (شەیتان) وتی ئەی پەروەردگارم دەی مۆڵەتم
بـدە (نەمرم) تا ڕۆژێ (مـردوان) زیندوو دەکرێنەوە ﴿٧٩﴾ ﴿قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ﴾ (خوا) فەرمووی:
دەی بەڕاسـتی تـۆ لـە مۆڵـەت دراوانـی ﴿٨٠﴾ ﴿إِلَىٰ يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ﴾ تـاڕۆژی کاتی دیـاری کراو ﴿٨١﴾
﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ (شـەیتان) وتـی ئەمجا سـوێند بەعیزەتـت هەر هەموویـان گومڕا
دەکەم ﴿٨٢﴾ ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾ ئەوانەیان نەبێ کەبەندەی پاك و هەڵبژاردەی تۆن ﴿٨٣﴾

﴿قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ﴾ (خـوا) فەرمووی: مـن حەقم هەر حەقیـش دەڵێم ﴿٨٤﴾ ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ
مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ بەڕاسـتی دۆزەخ پـڕ دەکەم لە تـۆ و ئەوانەی (لە ئادەمییان) شـوێنت دەکەون بەتێکڕا ﴿٨٥﴾
﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ من هیچ کرێ و پاداشـتێك لەسـەر گەیاندنی
ئەم ئایینە لە ئێوە داواناکەم ﴿وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾ و من لەو کەسـانەش نیم کە درۆ هەڵبەسـتم و زۆر لە
خـۆم بکەم ﴿٨٦﴾ ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾ ئەم (قورئانە) تەنها پەند و ئامۆژگارییە بۆ هەموو جیهانیان ﴿٨٧﴾
﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾ بەڕاستی پاش ماوەیەك لە هەواڵی ئەو (قورئانە) دەزانن ﴿٨٨﴾

## سورەتی ﴿الزُّمَرِ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ﴾ ئـەم قورئانـە هێنراوەتەخوارەوە ﴿مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ لە لایەن خوای باڵادەسـتی
کار بەجـێ وە ﴿١﴾ ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ بێگومـان ئێمـە بەحـەق و ڕاسـتی قورئانمـان بـۆ تۆ
هێناوەتـە خـوارەوە ﴿فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ﴾ کەواتـە خوا بپەرستە و بە تەنها هەر بـۆ ئەو ملکەچ
بـە ﴿٢﴾ ﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ﴾ بێداربـە ئایینـی (گـەردن کەچـی) پـاك و خاوێـن هـەر بـۆ خوایـە
﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ﴾ وە کەسـانێ جگە لەو (خوا) چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان داناوە
﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ﴾ (دەڵێـن) تەنهـا لەبەر ئەوە دەیان پەرسـتین نزیکمـان بکەنەوە لە
خـوا ﴿إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ بێگومـان خوا بڕیـار دەدات لـە نێوانیاندا ﴿فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ لەو
شـتانەدا کەئـەوان تیایا جیاواز بوون ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾ بەڕاسـتی خـوا ڕێنموونیی
کەسـێ نـاکات کـە درۆزنـی زۆر بـێ بـاوەڕە ﴿٣﴾ ﴿لَّوْ أَرَادَ اللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا﴾ ئەگـەر خوا بیوویسـتایە
منداڵێـك بۆ خۆی بڕیار بدات ﴿لَّاصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ ئەوە لەناو دروسـت کراوەکانیدا کامەی
بوویسـتایە هەڵـی دەبژارد ﴿سُبْحَانَهُ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ پـاك و بێگەردە هەر ئـەوە خوای تەنهای
زاڵ و بە دەسـەڵات ﴿٤﴾ ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ (خوا) ئاسمانەکان و زەوی بەهەق دروست
کردووە ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ﴾ شـەو دەهێنـێ بەسـەر ڕۆژدا ﴿وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ و ڕۆژ دەهێنێ
بەسـەر شـەودا ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾ و خـۆر و مانگـی ڕام هێنـاوە ﴿كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾
هەریەکەیـان (لەخولگـەی خۆیـدا) تا ئـەو ماوەیەی بۆی دیـاری کـراوە دەگەڕێت ودەسـوڕێتەوە
﴿أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ﴾ بێداربە هەر ئەو (خوا) زاڵی لێ بوردەیە ﴿٥﴾

﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ (خوا) ئێوەی لە تاکە کەسێك (ئادەم) دروست کردووە ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾
پاشان لەو (کەسە) هاوسەرەکەی (حەووای) بەدی هێناوە ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ الْأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ﴾ وە بۆ
ئێوە هەشت جووتی (نێر و مێ) لە ئاژەڵ بە دی هێناوە ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾ ئێوە دروست
دەکات لەناو سکی دایکتاندا ﴿خَلْقًا مِّن بَعْدِ خَلْقٍ﴾ بە بەدی هێنانی یەك لە دوای یەك ﴿فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾
لەناو سێ تاریکی (ناو سك، منداڵدان، پەردەی کۆرپەلە)دا ﴿ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ﴾ ئا ئەوە
پەروەردگاری ئێوەیەکە دەسەڵات و پاشایی هەر مولکی ئەوە ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ﴾ هیچ
پەرستراوێکی ڕاست جگە لە زاتی ئەو نیە، کەواتە ئێوە چۆن لە ئایینی ڕاست لادەدرێن ﴿٦﴾
﴿إِن تَكْفُرُوا﴾ ئەگەر ئێوە بێ باوەڕبن ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ﴾ ئەوە بێگومان خوا بێ نیازە لەئێوە
﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ﴾ و ڕازی نییە بە بێ باوەڕی بۆ بەندەکانی ﴿وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ وە ئەگەر
سوپاسی خوا بکەن (وگەردن کەچ بن) بەوە لێتان ڕازی دەبێت ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ هیچ
گوناهبارێك گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێت ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ﴾ پاشان گەڕانەوەتان
هەر بۆ لای پەروەردگارتانە ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەوسا هەواڵتان دەداتێ بەوەی کە دەتان
کرد ﴿إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوا ئاگادارە بە نهێنی دڵان ﴿٧﴾ ﴿وَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ﴾
وە کاتێ ئادەمی زیانێکی لێ بکەوێ ﴿دَعَا رَبَّهُ مُنِيبًا إِلَيْهِ﴾ دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری
وهاواری لێ دەکات ﴿ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُ نِعْمَةً مِّنْهُ﴾ پاشان ئەگەر لەلایەن خۆیەوە بەهرە ونیعمەتێکی دایە
﴿نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُو إِلَيْهِ مِن قَبْلُ﴾ ئەوەی لەبیر دەچێت کە لەپێشترا هاواری لە پەروەردگاری دەکرد
﴿وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا﴾ وهاوتایانێ بۆ خوا دادەنێ ﴿لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِ﴾ بۆ ئەوەی (خەڵك) لە ڕێگای ئەو
گومراکات ﴿قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ بە هەڕەشەوە) بڵێ : بە بێ باوەڕێکەت کەمێك
لەزەت وەرگرە لە ژیان ﴿إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ﴾ چونکە بەڕاستی تۆ لەهاوەڵانی ئاگری دۆزەخی ﴿٨﴾
﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ﴾ (هاوبەش دانەران چاکترن) یان کەسێك ملکەچ وخواپەرست بێت؟ ﴿آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا
وَقَائِمًا﴾ لە کاتەکانی شەودا بە سوژدە بردن و ڕاوەستان (لە شەو نوێژدا) ﴿يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ﴾
کە لە (سزای) دوا ڕۆژ دەترسێت و بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ﴾
(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن ﴿وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ لەگەڵ ئەوانەی کە
نازانن ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ بەڕاستی تەنها خاوەنانی ژیریی ئامۆژگاری وەردەگرن ﴿٩﴾ ﴿قُلْ يَا عِبَادِ
الَّذِينَ آمَنُوا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بەو بەندانەم کە باوەڕیان هێناوە ﴿اتَّقُوا رَبَّكُمْ﴾ لە (سزای)
پەروەردگارتان خۆ بپارێزن ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾ کەسانێ لەم دونیایەدا چاکەیان
کردووە، پاداشتی چاکیان بۆ هەیە ﴿وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ﴾ وە زەوی خوا فراوانە ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم
بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بەڕاستی تەنها ئارامگران بەبێ حیساب وژماردن پاداشتیان دەدرێتەوە ﴿١٠﴾

﴿قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵێ بەڕاسـتی مـن فەرمانم پـێ دراوە ﴿أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ﴾
کە خوا بپەرسـتم بە دڵسـۆزی بۆی ملکەچ بم ﴿١١﴾ ﴿وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ وە فەرمانم پێ دراوە
کە یەکەم کەسـی موسـڵمانان (ی ئوممەتم) بم ﴿١٢﴾ ﴿قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بەڕاستی
من دەترسم ﴿إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي﴾ ئەگەر سەر پێچی پەروەردگارم بکەم ﴿عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ لە سزای ڕۆژێکی
گـەورە (قیامـەت) ﴿١٣﴾ ﴿قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي﴾ بڵـێ من هەر خوا دەپەرسـتم بە پاکـی و تەنیا هەر بۆ
ئـەو ملکەچـم ﴿١٤﴾ ﴿فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ﴾ (بە بێ باوەڕان بڵێ) ئێوەش جگە لە خوا چیتان وویسـت
بـی پەرسـتن ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ﴾ بڵێ بێگومـان زەرەرمەندان کەسـانێکن ﴿خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ﴾
کەخۆیان و کەس و کاریان لەدەست داوە ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا ﴿أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ﴾
بێدار بـن، هەر ئەوە زەرەر مەندی ئاشـکراو دیار ﴿١٥﴾ ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ﴾ بۆ ئـەوان هەیە لەلای
سەریانەوە چەند تەبەقێ (وەك هەوری ڕەش) لەئاگر ﴿وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾ و لەژێریشیانەوە چەند تەبەقێ
هەیـە ﴿ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ﴾ ئـەو (سـزایە) خـوا بەندەکانـی خـۆی پـێ دەترسـێنێ ﴿يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ﴾
ئـەی بەندەکانـم خۆتان بپارێزن (لە سـزای من) ﴿١٦﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا﴾ وە کەسـانێ کە
لەپەرستنی بت (و هەموو پەرستراوێکی تر) خۆیان پاراستووە ﴿وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ﴾ وە گەڕاونەتەوە بۆ لای
خـوا ﴿لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فَبَشِّرْ عِبَادِ﴾ مژدەی گـەورە تەنیا بۆ ئەوانەیـە، کەواتە مژدە بـدە بەبەندەکانم ﴿١٧﴾ ﴿ٱلَّذِينَ
يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ﴾ ئەوانەی گوێ دەگرن بۆ قسـە و گوفتار ﴿فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ﴾ ئەمجا شـوێن چاکترینی
ئەو (قسـانە) دەکەون ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ﴾ ئەوانە کەسـانێکن خودا ڕێنموونی کردوون ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ
هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ هـەر ئەوانـەن خاوەنانـی ژیـری و هـۆش ﴿١٨﴾ ﴿أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ﴾ جـا ئایـا
کەسـێك بەڵێنی سـزای بەسـەردا چەسـپابێت (بۆی بڕیاردرا بێت) ﴿أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِى ٱلنَّارِ﴾ دەی ئایا
تـۆ (دەتوانـی) کەسـێ ڕزگار بکەیـت کە لەناو ئاگـری دۆزەخدایـە؟ ﴿١٩﴾ ﴿لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ﴾ بەڵام
کەسـانێ کە لە پەروەردگاریان ترساون و خۆیان (لە سزای) پاراستووە ﴿لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ﴾
(لـە بەهەشـتدا) بۆ ئەوانە کۆشـك و تەلاری چەند نهۆم هەیـە ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ڕووباری ئاو
بـە ژێریاندا دەڕوات ﴿وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ﴾ (ئەمـە) بەڵێنی خوایە و خواش بەڵێنی خۆی دەباتە
سەر ﴿٢٠﴾ ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئایا نەتبینی کە خوا ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ لە ئاسمانەوە بارانێ دەبارێنێ (بۆ سەر
زەوی) ﴿فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەمجا ئەو بارانە دەبات بە ناو زەویدا کانیاوەکانی لێ دەردێنێ ﴿ثُمَّ
يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ﴾ لە پاشان کشتوکاڵ و گژوگیا و گوڵی پێ دەڕوێنێ کە ڕەنگەکانیان جیاوازە
﴿ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا﴾ پاشان دەیبینی ووشـك دەبێ و زەرد هەڵدەگەڕێ ﴿ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا﴾ دواتر
دەیکات بە پووشـی ورد و خاش ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ بەڕاسـتی لەمەدا (کە باسـکرا)
ئامۆژگاری و پەند هەیە بۆ ئەوانەی خاوەن ژیرین ﴿٢١﴾

﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ﴾ دەی ئایا کەسێ خوا سینەی گوشاد کردووە بۆ ئیسلام ﴿فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦۚ﴾ و ئەو لەسەر ڕێبازی ڕووناکی پەروەردگاریەتی (وەك کەسێکە دڵی ڕەق بوو بێت لەئاست ئیسلام) ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ جا سزا و لە ناوچوون بۆ ئەوانەی دڵیان ڕەقە لەئاست (قورئان و) یادی خوادا ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ﴾ ئائەوانە لە گومراییەکی ئاشکرادان ﴿٢٢﴾
﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ﴾ خوا جوانترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە ﴿كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ﴾ قورئانێکە (کەئایەتەکانی) لەیەکچووی دووپات کراوەن ﴿تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ﴾ ئەو کەسانەی لەپەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزووی پیادێ (بە بیستنی قورئان) ﴿ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێ بە یادی (قورئانی) خودا ﴿ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ﴾ ئەو (قورئانە) ڕێنموونی خوایە ﴿يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ﴾ بەو (قورئانە) ڕێنموونی هەر کەسێ دەکات کە بیەوێ ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ﴾ هەر کەسیش خوا گومڕای بکات ﴿فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ﴾ ئەوە ڕێنموونی کەرێك بۆ ئەو نییە ﴿٢٣﴾
﴿أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجۡهِهِۦ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ﴾ دەی ئایا کەسێك بەدەم وچاوی خۆی بپارێزێت لەسزای سەختی ڕۆژی دوایی (وەك کەسێك وایە کەلەبەهەشت دابێت) ﴿وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ﴾ بەستەمکاران دەگوترێ ﴿ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ﴾ بچەژن سزای ئەو (کردەوانەی) لە دونیا دەتان کرد ﴿٢٤﴾ ﴿كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ ئەوانەی پێش ئەمان (پێش قوڕەیشیەکان) بوون باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکانیان ﴿فَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ﴾ بەو هۆیەوە سزا (ی خوا) یان بۆ هات ﴿مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ لە لایەکەوە کە هەستیان پێ نەکرد ﴿٢٥﴾ ﴿فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ﴾ ئەمجا خوا پێی چەشتن ﴿ٱلۡخِزۡيَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ ڕیسوایی لە ژیانی دونیادا ﴿وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ﴾ وە بێگومان سزای ڕۆژی دوایی گەورەتر ﴿لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر ئەوانە بزانن ﴿٢٦﴾
﴿وَلَقَدۡ ضَرَبۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی لەم قورئانەدا هێناومانەتەوە بۆ خەڵکی ﴿مِن كُلِّ مَثَلٖ﴾ هەموو جۆرە نموونەیەك ﴿لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ﴾ تا پەندو ئامۆژگاری وەرگرن ﴿٢٧﴾ ﴿قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا غَيۡرَ ذِي عِوَجٖ﴾ (ئەو قورئانە) قورئانێکی عەرەبی یە هیچ خواری و لاری یەکی تیا نییە ﴿لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ﴾ بۆ ئەوەی (لەسزا) خۆ بپارێزن وببنە لە خواترس ﴿٢٨﴾ ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا رَّجُلٗا﴾ خوا نموونەی هێناوەتەوە بە پیاوێکی (بەندە) ﴿فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ﴾ هی چەند کەسێکە ئاژاوەیانە لەسەر ئەو (بەندە) ﴿وَرَجُلٗا سَلَمٗا لِّرَجُلٍ﴾ وە پیاوێکیش کە تەنیابەندەی پیاوێکە ﴿هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ﴾ ئایا ئەم دوو کەسە وەك یەکن ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ هەموو سوپاس تەنها بۆ خوایە بەڵام زۆربەیان نازانن ﴿٢٩﴾ ﴿إِنَّكَ مَيِّتٞ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بەڕاستی تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن ﴿٣٠﴾ ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ لەپاشان بێگومان ئێوە لە ڕۆژی دواییدا ﴿عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ﴾ لای پەروەردگارتان داوا چی دەبن دژی یەکتری ﴿٣١﴾

﴿فَمَنْ أَظْلَمُ﴾ ئەمجا کێ ستەم کارترە ﴿مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ﴾ لەوکەسەی کەدرۆ بەناوی خواوە دەکات
﴿وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ﴾ وە باوەڕی بەڕاستی قورئان نی یە ﴿إِذْ جَآءَهُۥٓ﴾ کەبۆی هاتووە ﴿أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ
مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ﴾ ئایا لە دۆزەخ دا جێگەیەك نی یە بۆ بێ بڕوایان ﴿٣٢﴾ ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ﴾ وە ئەو
کەسەی قورئانی هێناوە (واتە پێغەمبەر ﷺ) ﴿وَصَدَّقَ بِهِۦٓ﴾ باوەڕیشی پێ یەتی ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾
هەر ئەوانن لەخواترسان و پارێزکاران ﴿٣٣﴾ ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ بۆیان هەیە (لەبەهەشت
دا) ئەوەی بیانەوێت لای پەروەردگاریان ﴿ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ ئەوەیە پاداشتی چاکەکاران ﴿٣٤﴾
﴿لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ﴾ تاخوا لێیان بسڕێتەوە ﴿أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟﴾ خراپترین (کردەوەیەك) کەکردوویانە
﴿وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم﴾ وە پاداشتیان بداتەوە ﴿بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ بە (پاداشتی) چاکترین
ئەو کردەوانەی کردوویانە ﴿٣٥﴾ ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ﴾ ئایا خوا بۆ بەندەی خۆی (پێغەمبەر ﷺ)
بەس نی یە (کە پشتیوانی بێت)؟ ﴿وَيُخَوِّفُونَكَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) ئەو بێباوەڕانە دەتترسێنن
﴿بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ﴾ بەوانەی جگە لەخوان (واتە دەترسێنن بەخواکانیان کە زیانت پێ دەگەیەنن)
﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ﴾ وە هەر کەس کەخوا گومڕای بکات ﴿فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ﴾ ئیتر هیچ کەس ناتوانێت
ببێت بە ڕێنموونیکەری و هیدایەتی بدات ﴿٣٦﴾ ﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ﴾ وە هەر کەس کەخوا ڕێنموونی بکات
﴿فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ﴾ ئەوە هیچ گومڕاکەرێکی بۆ نی یە ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ﴾ ئایا خوا زاڵی
باڵادەستی تۆڵەسێن نییە؟ ﴿٣٧﴾ ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم﴾ سوێند بەخوا ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت ﴿مَّنْ خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ﴿لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾ بێگومان دەڵێن: خوا
﴿قُلْ أَفَرَءَيْتُم﴾ بڵێ: دەی پێم بڵێن ﴿مَّا تَدْعُونَ﴾ ئەوانەی دەیان پەرستن ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ جگە لەخوا
﴿إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ﴾ ئەگەر خوا ویستی زیانێکم پێ بگەیەنێت ﴿هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ﴾ ئایا ئەو
(پەرستراوانە) دەتوانن ئازارو زیانی ئەوم لێ لادەن؟ ﴿أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ﴾ یا ئەگەر ویستی نیعمەت
و بەهرەیەکم پێ بدات ﴿هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ﴾ ئایا ئەوانە دەتوانن بەهرەو میهرەبانی ئەوم لێ
بگرنەوە ﴿قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ﴾ بڵێ: من هەر خوام بەسە ﴿عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ﴾ خۆسپێران تەنها پشت
بەو دەبەستن ﴿٣٨﴾ ﴿قُلْ يَٰقَوْمِ﴾ بڵێ ئەی گەلەکەم ﴿ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ﴾ ئێوە لەسەر ڕێبازو شێوازی
خۆتان کاربکەن ﴿إِنِّى عَٰمِلٌ﴾ منیش (لەسەر ڕێبازی خۆم) کاردەکەم ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ ئەمجا بەم
زووانە دەزانن ﴿٣٩﴾ ﴿مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ﴾ کێ (لەم دونیادا) سزایەکی بۆ دێت کەڕیسوای دەکات
﴿وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ وە سزایەکی بێ بڕانەوەی بەسەردا دێ ﴿٤٠﴾

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ بەڕاستی ئەم قورئانەمان بۆ سەر تۆ ناردۆتە خوارەوە ﴿لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّۖ﴾ بۆ
هەموو خەڵكی بەهەق و ڕاستی ﴿فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ﴾ جا هەركەسێ هیدایەت وەر گرێت ﴿فَلِنَفۡسِهِۦۖ﴾ ئەوە
قازانجی هەر بۆ خۆیەتی ﴿وَمَن ضَلَّ﴾ هەر كەسیش لاڕێ وگومڕا بێت ﴿فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ﴾ ئەوە
بەڕاستی زیانی گومڕا بوونەكەی هەر بۆخۆیەتی ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٍ﴾ وە ئەی پێغەمبەر ﷺ
تۆ كارسپێرراو و چاودێر نیت بەسەریانەوە (تابڕوا بهێنن) ﴿٤١﴾ ﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ﴾ خوا گیانەكان
دەكێشێ ﴿حِينَ مَوۡتِهَا﴾ لەكاتی مردنیان دا ﴿وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ﴾ وە ئەوەی نەمردبێت ﴿فِي مَنَامِهَاۖ﴾ لەكاتی
خەوتنیدا ﴿فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي﴾ ئەمجا ئەو (گیانانە) ڕادەگرێ ﴿قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ﴾ بڕیاری مردنی داوە
﴿وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ﴾ وە ئەوانی تر بەرەڵا دەكات (كەدەبێ زیندوو بمێنن) ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ﴾ تاماوەیەكی
دیاری كراو ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ﴾ بەڕاستی لەمەدا چەند بەڵگە هەیە ﴿لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بۆ ئەو
كەسانەی بیردەكەنەوە ﴿٤٢﴾ ﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَۚ﴾ ئاخۆ جگە لەخوا تكا كارانێكیان بۆ
خۆیان داناوە ﴿قُلۡ أَوَلَوۡ كَانُواْ﴾ بڵێ گەرچی ئەوانە ﴿لَا يَمۡلِكُونَ شَيۡـٔٗا﴾ نەهیچ شتێكیان بەدەستە
﴿وَلَا يَعۡقِلُونَ﴾ وە نەتێش دەگەن ﴿٤٣﴾ ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ﴾ بڵێ: تكا هەمووی هەر بۆ خوایە
﴿لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ موڵكی ئاسمانەكان و زەوی هەر بۆ ئەوە ﴿ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ پاشان
هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنرێنەوە ﴿٤٤﴾ ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ﴾ وەكاتێك یادی خوا بكرێ بەتاك و تەنیا
﴿ٱشۡمَأَزَّتۡ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ﴾ تێكدەچێت وە بێزار دەبێ دڵی كەسانێ ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ كەباوەڕیان نییە
بەڕۆژی دوایی ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ﴾ كەچی كاتێك ناوی پەرستراوانی بێجگە لەخوا ببرێت
﴿إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾ یەكسەر شادو ڕووخۆش دەبن ﴿٤٥﴾ ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ﴾ بڵێ: ئەی خوایە ﴿فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ﴾ بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی ﴿عَٰلِمَ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ زانای نهێنی و ئاشكراكان
﴿أَنتَ تَحۡكُمُ بَيۡنَ عِبَادِكَ﴾ هەر تۆ دادوەری دەكەیت لەنێوان بەندەكانتدا ﴿فِي مَا كَانُواْ فِيهِ﴾ لەوەی ئەوان
تیایدا ﴿يَخۡتَلِفُونَ﴾ جیاوازبوون ﴿٤٦﴾ ﴿وَلَوۡ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ بەڕاستی ئەگەر هی ئەو كەسانە بوایە
ستەمیان كرد ﴿مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ هەموو ئەوەی لەسەر زەویدایە ﴿وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ﴾ ئەوەندەی تریشی
لەگەڵدا بێت ﴿لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦ﴾ لەبریتی خۆیان دا دەیاندا ﴿مِن سُوٓءِ ٱلۡعَذَابِ﴾ بۆ ڕزگاربوونیان لەسزای
خراپی ﴿يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ﴾ ڕۆژی قیامەت ﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾ وە لەلایەن خواوە بۆیان دەركەوت
﴿مَا لَمۡ يَكُونُواْ يَحۡتَسِبُونَ﴾ شتی وا كەئەوان بیریان لێ نەكردوەتەوەو گومانیان بۆی نەچووە ﴿٤٧﴾

﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ﴾ وە بۆشیان دەرکەوت چی خراپەیان کردووە ﴿وَحَاقَ بِهِم﴾ وە دەوری
گرتن ﴿مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ ئەو سزای ئەوان گاڵتەیان پێ دەکرد ﴿٤٨﴾ ﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ﴾
ئەمجا کاتێ ئادەمی زیانێکی لێ کەوت ﴿دَعَانَا﴾ هاوارمان بۆ دێنێ ﴿ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا﴾
لەپاشان هەر کاتێ بەهرە ونیعمەتێکمان پێدا ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ﴾ دەڵێ: بەڕاستی ئەم بەهرە ونیعمەتەم
پێدراوە ﴿عَلَىٰ عِلْمٍ﴾ بەهۆی لێزانی وزانستی خۆمەوە ﴿بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ﴾ (وانی یە) بەڵکو ئەوە ئەزمون
و تاقی کردنەوەیە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن ﴿٤٩﴾ ﴿قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن
قَبْلِهِمْ﴾ بێگومان ئەم قسەیە کەسانی پێش ئەمانیش کردیان ﴿فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم﴾ بەڵام هیچ سوودی پێ
نەگەیاندن ﴿مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ ئەوەی ئەوان کردیان ﴿٥٠﴾ ﴿فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ﴾ ئەمجا دوو
چاریان بوو (تۆڵەی) ئەو خراپانەی کردبوویان ﴿وَٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ ئەو کەسانەیان ستەمیان کرد
(بێباوەڕانی مەککە) ﴿سَيُصِيبُهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ﴾ لەمەو پاش دووچاری (تۆڵەی) کردەوە خراپەکانیان
دەبن ﴿وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ﴾ وە ئەمانە (لەدەستی خوا) دەرباز نابن ﴿٥١﴾ ﴿أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئایا نەیانزانیوە
کەبێگومان خوا ﴿يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ ڕۆزی فراوان دەکات ودەیشیگرێتەوە لەهەر کەسێك
کە بیەوێت ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان لەوەدا بەڵگە ونیشانەی زۆر هەن بۆ ئەو کەسانەی
باوەڕ دێنن ﴿٥٢﴾ ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ئەی بەندەکانم
ئەی ئەوانەی کەخۆتان زۆر گوناهبار کردووە ﴿لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾ نائومێد مەبن لەمیهرەبانی
و بەزەیی خوا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾ چونکە بێگومان خوا لەهەموو گوناهەکان خۆش
دەبێت ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەر ئەوە لێ بووردەی بەبەزەیی یە ﴿٥٣﴾ ﴿وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ﴾
(بەو مەرجەی کە) بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان ﴿وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ﴾ وە گەردن کەچی ئەو بن ﴿مِن
قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ﴾ بەر لەوەی سزاتان بۆ بێت ﴿ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ پاشان یارمەتی نادرێن (لەلایەن
هیچ کەسێکەوە) ﴿٥٤﴾ ﴿وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم﴾ وە شوێن چاکترین شتێ بکەون کە نێردراوەتە
خوارەوە بۆتان ﴿مِّن رَّبِّكُم﴾ لە پەروەردگارتانەوە ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً﴾ بەر لەوەی
لەناکاودا سزاتان بۆ بێت ﴿وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ کە ئێوە هەر هەستی پێ نەکەن ﴿٥٥﴾ ﴿أَن تَقُولَ نَفْسٌ﴾
نەکا ئەوسا کەسێ بڵێ ﴿يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ﴾ ئەی مەخابن لەسەر ئەوەی کەمتەرخەمیم کرد
﴿فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ﴾ لەکارکردن بەوەی خودا فەرمانی پێکردبوو ﴿وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ﴾ وەبەڕاستی من
لەو گاڵتە چییانە بووم (کە گاڵتەیان بە ئاینەکەی دەکرد) ﴿٥٦﴾

﴿أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ اللَّهَ هَدَانِي﴾ یان بڵێت: ئەگەر خوا ڕێنموونی بکردمایە ﴿لَكُنتُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ ئەوە بێگومان لەپارێزکاران ولەخواترسان دەبووم ﴿٥٧﴾ ﴿أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى الْعَذَابَ﴾ یان کاتێك سزاکەی دەبینێت بڵێت ﴿لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً﴾ خۆزگە جارێکی تر بگەڕامایەتەوە (بۆ دونیا) ﴿فَأَكُونَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ ئەوسا لەچاکەکاران دەبووم ﴿٥٨﴾ ﴿بَلَىٰ قَدْ جَاءَتْكَ آيَاتِي﴾ (ڕاست ناکەیت) خۆ بێگومان بەڵگەو ئایەتەکانی منت بۆهات ﴿فَكَذَّبْتَ بِهَا وَاسْتَكْبَرْتَ﴾ بەڵام باوەڕت پێ نەهێناو خۆت بەگەورەزانی ﴿وَكُنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ وە تۆ لەبێ باوەڕان بوویت ﴿٥٩﴾ ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لەڕۆژی دوایی دا ﴿تَرَى الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ﴾ دەبینی ئەوانەی درۆیان بۆ خوا هەڵدەبەست ﴿وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ﴾ ڕوویان ڕەشە ﴿أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ ئایا لەدۆزەخ دا شوێنێك نی یە بۆ خۆ بەگەورە زانان؟ ﴿٦٠﴾ ﴿وَيُنَجِّي اللَّهُ الَّذِينَ اتَّقَوْا﴾ وە ئەوانەی خۆیان پاراست (لەکوفرو تاوان) خوا ڕزگاریان دەکات ﴿بِمَفَازَتِهِمْ﴾ چونکە ڕێگەی ڕزگاریان گرتبوەبەر ﴿لَا يَمَسُّهُمُ السُّوءُ﴾ نەتووشی ناخۆشی دەبن ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ وە نەخەم دەخۆن ﴿٦١﴾ ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ خوا بەدی هێنەری هەموو شتێکە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ وە هەر ئەویش پارێزەری هەموو شتێکە ﴿٦٢﴾ ﴿لَّهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ کلیلەکانی ئاسمانەکان و زەوی بەدەست خوایە ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ وە ئەوانەی بەبەڵگەو نیشانەکانی خوا بێ باوەڕن ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ هەر ئەوانن زەرەرمەند ﴿٦٣﴾ ﴿قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: دەی ئایا ئێوە داوام لێ دەکەن من بێجگە لەخوا شتێکی تر بپەرستم ﴿أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ﴾ ئەی نەفام و نەزانان ﴿٦٤﴾ ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ﴾ سوێند بەخوا نیگا کراوە بۆ تۆ ﴿وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ﴾ وەبۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾ ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێیت بەڕاستی کردەوەت هەڵدەوەشێتەوە ﴿وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ وە بێگومان لەزەرەرمەندان دەبیت ﴿٦٥﴾ ﴿بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ﴾ (وا مەکە) بەڵکو تەنها خوا بپەرستە ﴿وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ﴾ و لەسوپاسگوزاران بە ﴿٦٦﴾ ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾ (کافران) خوایان نەناسیوە (بەگەورەیان نەزانی) بەو جۆرەی شیاویەتی ﴿وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لە ڕۆژی دوایی دا هەموو زەوی لە چنگی ئەودایە (بەدەست خوایە) ﴿وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾ وە ئاسمانەکانیش بەدەستی ڕاستی ئەو پێچراونەتەوە (لەم ئایەتەدا جێگیرکردن سیفەتی دەستی ڕاست بۆ خودا هاتووە ئێمە باوەڕمان پێیەتی، بەبێ هیچ لێچواندن ولێکدانەوەیەك وشێوەکەی نازانین، تەنها خودا دەیزانێت) ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ خوا پاك و بڵند ترە لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی ﴿٦٧﴾

﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ﴾ کاتێك فووكـرا بەكەڕەنـادا (بەشـەیپوردا) ﴿فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾
یەكسـەر هەمـوو ئەوانـەی لەئاسـمانەكان و زەویـدان دەمـرن ﴿إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ﴾ مەگەر كەسـانێ خوا
بیەوێـت (نەمـرن) ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ﴾ پاشـان جارێكـی تـر فـوو دەكـرێ بەكەڕەنـادا ﴿فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ﴾
جـا لـە پـڕ هەمـوو ڕاسـت دەبنـەوە ﴿يَنظُرُونَ﴾ چـاوەڕوان دەكـەن ﴿٦٨﴾ ﴿وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا﴾
وەزەوی لـەو ڕۆژەدا بەنـوری پەروەردگاری ڕووناك دەبێتـەوە ﴿وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ وەنامەی كردەوە
لەبەردەمیـان دادەنرێـت ﴿وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ﴾ و پێغەمبـەران و شـاهیدی (سـەر گەلـەكان)
دەهێنرێـن ﴿وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ﴾ وە لەنێوانیانـدا بەهـەق دادوەری دەكـرێ ﴿وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ وە ئـەوان
ستەمیان لـێ ناكـرێ ﴿٦٩﴾ ﴿وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ﴾ وە (لـەو ڕۆژەدا) هەموو كەسێك چـی كردووە
بەتێـرو تـەواوی پاداشـت دەدرێتـەوە ﴿وَهُوَ أَعۡلَمُ﴾ وە خوا خۆشـی ئاگـادارە (بە بێ شـایەت و نامەی
كـردەوەكان) ﴿بِمَا يَفۡعَلُونَ﴾ بـەو كردەوانـەی كەدەیكـەن ﴿٧٠﴾ ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ ئەوسـا ئەوانـەی
بێبـاوەڕ بـوون ڕاپێـچ دەكرێـن ﴿إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ﴾ بـۆ دۆزەخ كۆمـەڵ كۆمـەڵ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا﴾
تاكاتـێ دێنـە (نزیكـی) دۆزەخ ﴿فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا﴾ دەرگاكانـی دەكرێنـەوە ﴿وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ﴾
وە دەرگاوانەكانی دۆزەخ (بەلۆمەكردنێكەوە) بەوان دەڵێن ﴿أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ﴾ ئایا پێغەمبەرانتان
لەخۆتـان بـۆ نەهـات ﴿يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ﴾ كەئایەتەكانـی پەروەردگارتـان بەسـەردا بخوێننەوە
﴿وَيُنذِرُونَكُمۡ﴾ وە بتانترسێنن ﴿لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ﴾ لەگەشتنتان بـەم ڕۆژە ﴿قَالُواْ بَلَىٰ﴾ دەڵێـن: بەڵێ
(هاتـن ئاگاداریـان كردیـن) ﴿وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ﴾ بـەڵام بڕیـاری سـزا دراوە ﴿عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾
بەسـەر (ئێمـەی) بێبـاوەڕان دا ﴿٧١﴾ ﴿قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ﴾ پێیان دەوتـرێ: لەدەرگاكانی دۆزەخەوە
بچنەژوورەوە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ﴾ بەهەمیشەیی لەوێدا بمێننەوە ﴿فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ﴾ ئای چ خراپە
جێگەو مەنزڵگای خۆبەزل زانان ﴿٧٢﴾ ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ﴾ وە كەسانێ (كە خواناس
بـوون) و لە پەروەردگاریان دەترسـان پۆل پۆل دەبرێن بۆ بەهەشـت ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا﴾ تاكاتێ دێنە
(نزیكی) بەهەشـت ﴿وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا﴾ و دەرگاكانی دەكرێنـەوە ﴿وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا﴾ وە دەرگاوانەكانی
بەوان دەڵێن ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ﴾ سەلامتان لێ بێت ﴿طِبۡتُمۡ﴾ ئێوە پاك و خاوێن بوون (لە تاوان لە دونیادا)
﴿فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ﴾ كەواتـە بڕۆنـە نـاو بەهەشـت بەهەمیشـەیی ﴿٧٣﴾ ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي﴾
(ئەوانیـش) دەڵێن: سـوپاس بۆ ئەو خوایـەی ﴿صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ﴾ هەر بەڵێنێكی بەئێمەدا ڕاسـت بوو
﴿وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ﴾ وە زەوی (بەهەشـتی) بەمیـرات پـێ دایـن ﴿نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ﴾ لەهەر
شـوێنێكی بەهەشـتدا بمانەوێـت نیشـتەجێ دەبیـن ﴿فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ﴾ ئـای چەند چاكە پاداشـتی
چاكەكاران ﴿٧٤﴾

﴿وَتَرَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ﴾ وە فریشتەکان دەبینی ﴿حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ﴾ چوار دەوری عەرشیان داوە ﴿يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾ تەسبیحات دەکـەن بەستایشی پەروەردگاریان ﴿وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ﴾ وە لەنێوانیاندا بەحەق دادوەری کرا ﴿وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ وە (لەکۆتایی دا) دەووترێت هەموو سوپاس هەر بۆ خوایە ﴿رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ کەپەروەردگاری جیهانیانە ﴿٧٥﴾

## سورەتی ﴿غَافِر﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿حمٓ﴾ بە (حا، میم) دەخوێنرێتەوەو خوا بەواتای ئەم پیتانە زاناترە، سەرنجی سەرەتای
سورەتی(البقرة) بدە دەربارەی واتاکەیان ﴿١﴾ ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَـٰبِ﴾ ئەم قورئانە هێنراوەتە خوارەوە﴿مِنَ
ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾ لەلایەن خوای بالادەستی داناوە ﴿٢﴾ ﴿غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ﴾ لێبوردەی تاوان و﴿وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ﴾
وەرگری تۆبەی (گوناهباران وتۆبەکارانە)﴿شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ﴾ (ئەو خودایە) تۆڵەی سەخت وبەتینە
﴿ذِى ٱلطَّوْلِ﴾ وە خاوەن فەزڵ و بەهرە و چاکەیە ﴿لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ بێجگە لەو هیچ پەرستراوێکی بەهەق
و ڕاست نی یە ﴿إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ گەڕانەوەی هەمووان هەر بۆلای ئەوە ﴿٣﴾ ﴿مَا يُجَـٰدِلُ فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ دەمە
قاڵێ وکێشمەکێش ناکات لەنیشانەکانی خوادا ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بێباوەڕان نەبێت ﴿فَلَا يَغْرُرْكَ﴾ کەوا
بوو فریوت نەدات﴿تَقَلُّبُهُمْ فِى ٱلْبِلَـٰدِ﴾ هاتوچۆ و گەڕانیان بەووڵاتدا (بۆ بازرگانی وسامان دەس
خستن) ﴿٤﴾ ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ﴾ پێش ئەوان گەلی نووح باوەڕیان نەهێنا (بەنووح) ﴿وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ
بَعْدِهِمْ﴾ وە دەستەو تاقمەکانی دوای ئەوانیش (باوەڕیان نەهێنا) ﴿وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍ﴾ و هەموو گەلێك
وویستوویەتی (نیازی کردووە) ﴿بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ﴾ کە پێغەمبەرەکەیان بکوژن (یا بیگرن و
ئازاری بدەن) ﴿وَجَـٰدَلُوا۟ بِٱلْبَـٰطِلِ﴾ وە دەمەقاڵێیان (لەگەڵ)دەکرد بەناڕەوا﴿لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ﴾ بۆ ئەوەی
ڕاستی پێ لابەرن و نەیهێڵن ﴿فَأَخَذْتُهُمْ﴾ ئیتر (قار وتووڕەیی) من گرتنی ﴿فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ﴾ جا چۆن
بوو تۆڵەسەندنی من لەوان ﴿٥﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ﴾ وە ئابەو جۆرە بڕیاری پەروەردگارت
بەدی هات ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ لەسەر ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿أَنَّهُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ﴾ کەبێگومان ئەوان
دۆزەخین ﴿٦﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ﴾ ئەو فریشتانەی هەڵگری عەرشن و ﴿وَمَنْ حَوْلَهُۥ﴾ ئەوانەش
بەدەوری دان ﴿يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾ بەستایشی پەروەردگاریان تەسبیحات دەکەن ﴿وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾
وە باوەڕیان بەو هەیە ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ وە داوای لێبوردن دەکەن بۆ ئەوانەی ئیماندارن ﴿رَبَّنَا
وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا﴾ (دەڵێن:) ئەی پەروەردگارمان میهرەبانی و زانیاریت هەموو شتێکی
گرتۆتەوە ﴿فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟﴾ دەی خۆش ببە لەوانەی تۆبەیان کردووە ﴿وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ﴾ و شوێنی
ڕێگای تۆ کەوتوون ﴿وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾ وە بیانپارێزە لەسزای دۆزەخ ﴿٧﴾

﴿رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ﴾ ئەی پەروەردگارمان بیشیان خەرە بەهەشتانێکی هەمیشەیی ﴿ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ﴾
کە بەڵێنت پێ دابوون ﴿وَمَن صَلَحَ﴾ ئەو کەسانەش چاکەکار بوون ﴿مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ﴾
لەباوو باپیران و هاوسەران و ڕۆڵەکانیان (نەوەکانیان) ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بەڕاستی هەر تۆ
زاڵـی کار دروسـتی ﴿٨﴾ ﴿وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ وە بیانپارێـزە لە(تۆڵـەی) تاوانـەکان ﴿وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ
يَوْمَئِذٍ﴾ چونکـە هەر کەسێك لە (تۆڵەی) خراپـەو تاوان بپارێزی لـەو ڕۆژەدا ﴿فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ﴾ ئەوە
بێگومـان ڕەحمـت پێ کـردووە ﴿وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ وە هـەر ئەوەیە سـەرکەوتنی زۆر گەورە
﴿٩﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنَادَوْنَ﴾ بەڕاسـتی کەسـانێ بـێ بـاوەڕ بـوون (لەپاشـەڕۆژدا) بانـگ دەکرێـن
﴿لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ کەبەڕاسـتی تورەیی و خەشمی خوا (لەدونیادا) گەورەتر بوو
لـەڕق و تورەییتان لەخۆتـان (لەقیامەتدا) ﴿إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ﴾ کاتێـك بانگ دەکران بۆ
بـاوەڕ هێنـان بەڵام باوەڕتـان نەدەهێنـا ﴿١٠﴾ ﴿قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ﴾ دەڵێن ئـەی پەروەردگارمان تۆ دوو
جارت مراندووتیـن ﴿وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ﴾ وە دوو جاریش ژیانت بەبەردا کردووین ﴿فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا﴾
جـا دانمان نـا بەتاوانەکانمـان دا ﴿فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ﴾ دەی ئایا ڕێگایەك هەیە بـۆ دەرباز بوون
﴿١١﴾ ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ﴾ ئـەم سـزایەتان لەبـەر ئەوەیە کە بەڕاسـتی هەرکاتێ
خوا بەتاك و تەنیایی بپەرسـترایە ئێوە بێ باوەڕ دەبوون ﴿وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟﴾ وە ئەگەر هاوبەشـی بۆ
دابنرایـە باوەڕتـان دەهێنا (بـەو هاوبەش دانانە) ﴿فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ﴾ بڕیـاردان هەر بۆ خوای
بڵنـدو بـەرزو گەورەیـە ﴿١٢﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾ ئـەو زاتێکـە نیشـانەکانی خۆیتان نیشـان دەدات
﴿وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا﴾ وە لەئاسـمانەوە ڕزق و ڕۆزیتـان بـۆ دەنێرێتـە خـوارەوە ﴿وَمَا يَتَذَكَّرُ﴾
کـەس بیرناکاتەوە(پەنـد وەرناگـرێ) ﴿إِلَّا مَن يُنِيبُ﴾ مەگـەر کەسـێك ڕوو لەخـوا بـێ ﴿١٣﴾ ﴿فَٱدْعُوا۟
ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ کەواتـە لەخـوا بپاڕێنـەوەو بەپاکیـی ودڵسـۆزی و بـۆی گـەردن کـەچ بـن
﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ هەر چەندە بێ باوەڕانیش پێیان ناخۆش بێ ﴿١٤﴾ ﴿رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلْعَرْشِ﴾
(خـوا) پلـەو پایە زۆر بەرزی خاوەن عەرشـی مەزنـە ﴿يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ﴾ بەفەرمانی خۆی وەحی
دەنێـرێ ﴿عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ بۆ هەر کەس لەبەندەکان کەبیـەوێ ﴿لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ﴾ تا(خەڵك)
بترسێنێ لە ڕۆژی بەیەکتر گەیشتن ﴿١٥﴾ ﴿يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ﴾ ڕۆژێ کە هەموو (لە گۆڕەکانیان دێنە دەرو)
ئاشـکرا دەبن ﴿لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ﴾ هیچ شـتێکیان لە خوا پەنهان نابێت ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ﴾ (خوا
دەفەرمـووێ:) ئەمڕۆ پادشـایەتی و دەسـەڵات بۆ کێیـە (وەڵام نادرێتەوە) ﴿لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾ (خۆی
وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت) هەر بۆ خوای تاك و تەنهایە کە بەسەر هەموو شتدا زاڵە ﴿١٦﴾

﴿ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ﴾ ئەمڕۆ هەموو کەس پاداشت یان سزا دەدرێتەوە ﴿بِمَا كَسَبَتۡۚ﴾ بەگوێرەی
ئەوەی کردوویەتی ﴿لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ﴾ ئەمڕۆ ستەم کردن نی یە (لە کەس) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ بەڕاستی
لێپرسینەوەی خوا بەپەلەو خێرایە (١٧) ﴿وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) ئەوان لەڕۆژە
نزیکەکە (قیامەت) بترسێنە ﴿إِذِ ٱلۡقُلُوبُ لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ﴾ لەوکاتەی دڵەکان (لەترسا) گەشتوونەتە گەروو
﴿كَٰظِمِينَۚ﴾ هەموو پیش دەخۆنەوە ﴿مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ﴾ ستەمکاران نەهیچ دۆستێکیان هەیە ﴿وَلَا
شَفِيعٖ يُطَاعُ﴾ وە نە تکاکارێك بەگوێی بکرێت (١٨) ﴿يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ﴾ (خوا) دەزانێ بەخیانەتی چاوان
و ﴿وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ﴾ هەرچی دڵان دەیشارنەوە (١٩) ﴿وَٱللَّهُ يَقۡضِي بِٱلۡحَقِّۖ﴾ وەخوا بەهەق و ڕاستی دادوەری
دەکات ﴿وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ بەڵام ئەوانەی جگە لەخوا هاواریان لێ دەکەن (دەیانپەرستن)
﴿لَا يَقۡضُونَ بِشَيۡءٍۗ﴾ ناتوانن بڕیاری هیچ شتێك بدەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ بەڕاستی هەرخوا
بیسەری بینایە (٢٠) ﴿أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئایا بەزەویدا نەگەڕاون ﴿فَيَنظُرُواْ﴾ تا ببینن (بزانن)
﴿كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبۡلِهِمۡۚ﴾ سەرەنجامی ئەوانەی کەپێش ئەمان بوون چۆن بوو ﴿كَانُواْ
هُمۡ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ﴾ ئەوانە لەمان بەهێزتر بوون ﴿وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ وە شوێنەواریان لەزەویدا
زیاتر بوو ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡ﴾ بەڵام خوا بەهۆی تاوانەکانیانەوە گرتنی وتۆڵەی لێ سەندن
﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ﴾ وە کەس پارێزەریان نەبوو لە (سزای) خوا (٢١) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانَت﴾ ئەمە
لەبەر ئەوە بوو کەبێگومان ئەوان ﴿تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم﴾ پێغەمبەرەکانیان بۆ دەهات ﴿بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ بەنیشانە
ئاشکراکانەوە ﴿فَكَفَرُواْ﴾ کەچی باوەڕیان نەهێنا ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُۚ﴾ ئەمجا خوا قاری لێ گرتن و سزای
دان ﴿إِنَّهُۥ قَوِيّٞ﴾ بەڕاستی خوا بەهێزی ﴿شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ تۆڵەسێنی بەتینە (٢٢) ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ
بِـَٔايَٰتِنَا﴾ سوێند بەخوا بێگومان مووسامان نارد بەچەند موعجیزە ﴿وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ﴾ و بەڵگەی
ڕوونەوە(بەتەوراتەوە) (٢٣) ﴿إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ﴾ بۆ لای فیرعەون و هامان و قاروون
﴿فَقَالُواْ سَٰحِرٞ كَذَّابٞ﴾ هەموو وتیان: جادوو گەرێکی درۆزنە (٢٤) ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ مِنۡ عِندِنَا﴾
ئەمجا کاتێ مووسا (ئایینی) ڕاستی لەلایەن ئێمەوە بۆ هێنان ﴿قَالُواْ ٱقۡتُلُوٓاْ أَبۡنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾
وتیان کوڕانی ئەوانەی لەگەڵ ئەو(مووسا) باوەڕیان هێناوە بکوژن ﴿وَٱسۡتَحۡيُواْ نِسَآءَهُمۡۚ﴾
وە ژنەکانیان بەزیندوویی بهێڵنەوە (بۆ کارەکەری) ﴿وَمَا كَيۡدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ﴾ بەڵام فێڵی
بێ باوەڕان هەر مایەی سەر لێ شێوانە (هەرگیز سەرناگرێت) (٢٥)

﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ﴾ وە فیرعەون ووتی: لێم گەڕێن ﴿أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ﴾ با مووسا بکوژم ﴿وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ﴾ ئەوسا
بائەو هانا بۆ پەروەردگاری بەریٚ (ڕزگاری بکات) ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ﴾ بەڕاستی من دەترسم
کەئاینەکەتـان بگۆڕێت ﴿أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ﴾ یان لەزەویدا ئـاژاوە وخراپەکاری بنێتەوە ﴿٢٦﴾
﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذۡتُ﴾ وە مووسا ووتی: بەڕاستی من پەنا دەگرم ﴿بِرَبِّي وَرَبِّكُم﴾ بەپەروەردگاری خۆم
و پەروەردگاری ئێوەش ﴿مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٖ﴾ لەهەموو خۆبەزل زانێك ﴿لَّا يُؤۡمِنُ بِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ﴾ کە باوەڕی
بەڕۆژی لێ پرسـینەوە نی یە ﴿٢٧﴾ ﴿وَقَالَ رَجُلٞ مُّؤۡمِنٞ﴾ وە پیاوێکی باوەڕدار ووتی: ﴿مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ﴾
لەکـەس و کاری فیرعـەون بـوو ﴿يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ﴾ کـە باوەڕەکـەی شـارد بـووەوە ﴿أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا﴾ ئایا
(چـۆن) پیاوێـك دەکـوژن؟ ﴿أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ﴾ لەبـەر ئـەوەی دەڵـێ: خـوا پەروەردگارمە ﴿وَقَدۡ
جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ﴾ کـە بەڕاسـتی چەنـد بەڵگە و موعجیـزەی ڕوونـی لـە پەروەردگارتانەوە
بـۆ هێناون ﴿وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ﴾ خۆ ئەگـەر درۆزن بێ (کەدەڵێ پێغەمبـەرم) ئەوە (تاوانی)
درۆکەی بەئەستۆی خۆیەتی ﴿وَإِن يَكُ صَادِقٗا﴾ خۆ ئەگەر ڕاستگۆ بێ ﴿يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ﴾
هەندێ لەو (سزایەی) بەڵێنی پێ داوون تووشتان دەبێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ﴾ بێگومان
خوا ڕێنموونی کەسێ ناکات کە زیادەڕۆ و درۆزن بێت ﴿٢٨﴾ ﴿يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ﴾ (مووسا ووتی)
: ئـەی گەلەکـەم فەرمان ڕەوایی ئەمڕۆ هی ئێوەیە ﴿ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ و بەدەسـەڵات و زاڵن لەسـەر
زەویـدا ﴿فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ﴾ دەی کـێ یارمەتیمان دەدات ئەگەر سـزای خوامـان بۆ بێت
﴿قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ﴾ فیرعـەون ووتی: چی خـۆم بەچاکی دەبینم هەر ئەوەتان نیشـانە دەدەم
﴿وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ وەتەنیا بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنموونیتان دەکەم ﴿٢٩﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ﴾ وە
ئـەو (پیـاوەی) باوەڕی هێنا بوو ووتی: ئەی گەلەکەم ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم﴾ بەڕاسـتی من لـەوە دەترسـم
بەسەرتان بێ ﴿مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ﴾ وێنەی (سزای) ئەو ڕۆژەی بەسەر کۆمەڵان و گەلانی پێشوو هات
﴿٣٠﴾ ﴿مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ﴾ وەك ئەو (سـزایەی) هات بەسـەر گەلی نووح و عاد و سـەموود و
﴿وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ﴾ ئەوانەش لەدوای ئەوان بوون ﴿وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ﴾ وەخوا زوڵم وستەمی ناوێ
بۆ بەندەکانی ﴿٣١﴾ ﴿وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ﴾ وە ئەی گەلەکەم بەڕاستی من ترسی ڕۆژی هاوارو
بانـگ لەیەکتـری کردنم هەیە لێتان (ئەو ڕۆژەی کە هەموو کـەس هاوار وداوای یارمەتی لەیەکتری
دەکـەن) ﴿٣٢﴾ ﴿يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ﴾ ئـەو ڕۆژەی پشـت هەڵدەکـەن و هەڵدێـن ﴿مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ﴾
هیـچ پەناگەیـەك بۆ ئێوە نی یە لە(سـزای) خوا ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ﴾ وە هەر کەسـێ خوا گومڕای بکات
﴿فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ﴾ ئەوە هیچ ڕێنموونی کەرێکی بۆ نی یە ﴿٣٣﴾

﴿وَلَقَدْ جَاءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِالْبَيِّنَاتِ﴾ سوێند بەخوا بێگومان پێشتر یوسف پێغەمبەرتان بۆهات
بەبەڵگە ڕوونەکانەوە ﴿فَمَا زِلْتُمْ فِي شَكٍّ﴾ کەچی ئێوە هەر لەگوماندا بوون ﴿مِّمَّا جَاءَكُم بِهِ﴾
لەو بەڵگانەی بۆی هێنابوون ﴿حَتَّىٰ إِذَا هَلَكَ﴾ تا کاتێ (یوسف) وەفاتی کرد ﴿قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ اللَّهُ
مِن بَعْدِهِ رَسُولًا﴾ ووتتان ئیتر دوای ئەو خوا هیچ پێغەمبەرێکی تر نانێرێ ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ﴾
ئا بەو جۆرە خوا گومڕای دەکات ﴿مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ﴾ ئەو کەسەی زیادە ڕۆی دوو دڵە ﴿٣٤﴾
﴿الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ﴾ ئەوانەی دەربارەی نیشانەکانی خوادەمەقاڵێ دەکەن ﴿بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ﴾
بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێ ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ﴾ (ئەو دەمەقاڵەیان) هۆی توڕەی یە لای خوای
گەورە ﴿وَعِندَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ وەلای ئەوانەش باوەڕیان هێناوە ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ﴾ ئابەوجۆرە خوامۆردەنێ
﴿عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾ بەسەر دڵی هەموو خۆبەزل زانێکی زۆرداردا ﴿٣٥﴾ ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ﴾
فیرعەون ووتی ئەی هامان ﴿ابْنِ لِي صَرْحًا﴾ کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە ﴿لَّعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ﴾
بەڵکو بگەمە ئەو ڕێگایانە ﴿٣٦﴾ ﴿أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ﴾ کەڕێگاکانی (بەرز بوونەوەن بۆ) ئاسمانەکان
﴿فَأَطَّلِعَ إِلَىٰ إِلَٰهِ مُوسَىٰ﴾ بۆ ئەوەی (لەوێوە) سەیری خواکەی مووسا بکەم ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ كَاذِبًا﴾ وە
بەڕاستی من وا گومان دەبەم ئەو (مووسا) درۆزنە ﴿وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ﴾ ئابەو جۆرە ڕازێنرایەوە
بۆ فیرعەون ﴿سُوءُ عَمَلِهِ﴾ کردەوەی خراپی ﴿وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ﴾ وە (بە هۆیەوە) ڕێگری کرا
لەڕێگای ڕاست ﴿وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ﴾ وە هەر فێڵ و پلانێکی فیرعەون هەبوو بەفیڕۆ چوو
﴿٣٧﴾ ﴿وَقَالَ الَّذِي آمَنَ﴾ وە ئەو (پیاوەی) باوەڕی (بە مووسا) هێنا بوو ووتی ﴿يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ﴾ ئەی
گەلەکەم شوێن من بکەون ﴿أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾ ڕێگای ڕاستتان نیشان دەدەم ﴿٣٨﴾ ﴿يَا قَوْمِ
إِنَّمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ﴾ ئەی گەلەکەم بەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە ڕابواردنێکی کەمە ﴿وَإِنَّ
الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ﴾ وە بەڕاستی هەر پاشەڕۆژ جێی حەسانەوەی هەمیشەیی یە ﴿٣٩﴾ ﴿مَنْ عَمِلَ
سَيِّئَةً﴾ هەر کەسێك کاری خراپەی کردبێ ﴿فَلَا يُجْزَىٰ إِلَّا مِثْلَهَا﴾ هەر بەئەندازەی خراپەکەی
سزا دەدرێ ﴿وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا﴾ هەر کەسیش چاکەی کرد بێت ﴿مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ ئافرەت
بێت یان پیاو (بەو مەرجەی) باوەڕدار بێت ﴿فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ﴾ ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە
﴿يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ لەوێدا بەبێ ژمارە وحیساب ڕزق و ڕۆزییان پێ دەدرێت ﴿٤٠﴾

﴿وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ﴾ وە ئەی گەلەکەم ئەوە چی یە من بانگتان دەکەم بۆ ڕزگاربوون
﴿وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ کەچی ئێوە من بانگ دەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ ﴿٤١﴾ ﴿تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ﴾ بانگم
دەکەن بۆ ئەوەی بێ باوەڕبم بەخوا ﴿وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ﴾ وە شتێ بکەمە هاوبەشی خوا کەهیچ
زانیاری یەکم لێ ی نیە ﴿وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ﴾ لەکاتێکدا من بانگتان دەکەم بۆلای خوای
بەدەسەلاتی لێبوردە ﴿٤٢﴾ ﴿لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ﴾ ڕاستە و گومانی تێدا نی یە ئەوەی ئێوە منی بۆ بانگ
دەکەن ﴿لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ شیاوی بانگ کردن نییە نە لە دونیا و نە لە دوا ڕۆژدا
﴿وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ وە بەڕاستی گەڕانەوەمان هەر بۆلای خوایە ﴿وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾
و بێگومان زیادەڕۆیان هاوەڵانی ئاگری دۆزەخن ﴿٤٣﴾ ﴿فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ﴾ جا لەمەودوا
ئەوەی من پێتان دەڵێم بیرتان دەکەوێتەوە ﴿وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ﴾ وە من کاری خۆم بەخوا دەسپێرم
﴿إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾ بەڕاستی خوا بینایە بەبەندەکانی ﴿٤٤﴾ ﴿فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ﴾ جا خوا ئەو
(پیاوە ئیمانداره) ی پاراست لەزیانی ئەو فڕو فێڵانەی دەیان کرد ﴿وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ﴾
وە سزای سەخت هات و داروودەستەی فیرعەونی گرتەوە ﴿٤٥﴾ ﴿ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ﴾
بەیانیان و ئێواران (فیرعەون ودەست وپێوەندەکەی) دەبرێنە دیاری ئاگری دۆزەخ ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ
ٱلسَّاعَةُ﴾ ڕۆژێکیش قیامەت هەڵدەسێت ﴿أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ﴾ (فەرمان دەدرێ)
داروودەستەی فیرعەون بخەنە سەخترین سزاوە ﴿٤٦﴾ ﴿وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ﴾ وەکاتێك
(دۆزەخیەکان) لەناو ئاگرەکەدا دەمە قاڵێ دەکەن ﴿فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ﴾ لاوازەکان
بەوانەی خۆ بەزل زان بوون دەڵێن ﴿إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا﴾ بەڕاستی ئێمە شوێن کەوتووی ئێوە بووین
﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا﴾ دەی ئایا ئێوە لەجیاتی ئێمە لەئەستۆ دەگرن ﴿نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ﴾ بەشێك لەم
ئاگرە ﴿٤٧﴾ ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ﴾ ئەوانەی خۆ بەزل زان و زۆردار بوون دەڵێن: ﴿إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ﴾
بەڕاستی هەموومان لەئاگرداین ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ﴾ بێگومان خوا لەنێوان بەندەکانیدا
دادوەری کردوو ( وحوکمی تەواو بوو) ﴿٤٨﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ﴾ وە ئەوانەی
لەئاگری دۆزەخدان بەدەرگاوانەکانی دۆزەخ دەڵێن ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ﴾ داوا لەپەروەردگارتان بکەن
﴿يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ﴾ تەنها یەك ڕۆژ سزامان لەسەر سووك بکات ﴿٤٩﴾

﴿قَالُوٓاْ﴾ دەڵێن: ﴿أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم﴾ ئایا پێغەمبەرەكان نەهاتن بۆلاتان؟ ﴿بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ﴾ بەچەندین
بەڵگەی ڕوون وئاشكراوە؟ ﴿قَالُواْ بَلَىٰۚ﴾ دەڵێن: بەڵێ (هێنابوویان) ﴿قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ﴾ پێیان دەڵێن دەی خۆتان
بپاڕێنەوە ﴿وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ﴾ بێگومان پاڕانەوەی بێ باوەڕان وون دەبێ و بێ سوودە ﴿٥٠﴾
﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەركەوتوو
دەكەین ﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ لەژیانی دونیادا ﴿وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ﴾ وە لەو ڕۆژەی (قیامەت) كە
شایەتەكان هەڵدەسنەوە ﴿٥١﴾ ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ﴾ ڕۆژێكە بیانوو و پاكانە كردنی بێ باوەڕان
هیچ سوودیان پێ ناگەیەنێت ﴿وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾ هەموویان نەفرەتیان لێ كراوەو خراپترین
جێگایان هەیە ﴿٥٢﴾ ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡهُدَىٰ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە تەوراتمان دا بەمووسا
﴿وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ وە نەوەكانی ئیسرائیلمان كردە میرات گری تەورات ﴿٥٣﴾ ﴿هُدٗى
وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ (كەهۆی) ڕێنموونیی و پەندو بیرخەرەوەیە بۆ خاوەن ژیری یەكان ﴿٥٤﴾
﴿فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ﴾ ئەمجا (ئەی موحەممەد ﷺ) خۆ گربە بێگومان بەڵێنی خوا هەقەو دێتە
دی ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ﴾ وە داوای لێبوردنی گوناهت بكە ﴿وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ﴾ وە تەسبیحات بكە
بەستایشی پەروەردگارت ﴿بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ﴾ بەئێواران وبەیانیاندا ﴿٥٥﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ﴾
بەڕاستی ئەو كەسانەی دەمە قاڵێ و كێشە دەكەن ﴿فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ دەربارەی نیشانەكانی خودا ﴿بِغَيۡرِ
سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ﴾ بەبێ ئەوەی بەڵگەیەكیان بۆ هاتبێت ﴿إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ﴾ هیچ لە دڵیاندا
نی یە جگە لەخۆبەزل زانی نەبێت ﴿مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ﴾ هەرگیز ئەوان بە (مەبەستیان) ناگەن ﴿فَٱسۡتَعِذۡ
بِٱللَّهِۖ﴾ كەواتە پەنا بەخوا بگرە ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ بەڕاستی هەر ئەو بیسەری بینایە ﴿٥٦﴾
﴿لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ﴾ بەڕاستی بەدی هێنانی ئاسمانەكان و زەوی گەورەترە ﴿مِنۡ
خَلۡقِ ٱلنَّاسِ﴾ لەبەدی هێنانی خەڵكی ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی مەردووم
ئەمە نازانن ﴿٥٧﴾ ﴿وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ﴾ وە نابینا و بینا یەكسان نین ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە كەسانێ باوەڕیان هێناوە و كردەوە چاكەكانیان كردووە ﴿وَلَا ٱلۡمُسِيٓءُۚ﴾ لەگەڵ
بەدكاران وەك یەك نین ﴿قَلِيلٗا مَّا تَتَذَكَّرُونَ﴾ زۆر كەم (لەخەڵكی) بیر دەكەنەوە ﴿٥٨﴾

﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأَتِيَةٌ﴾ بەڕاستی ڕۆژی دوایی دێت ﴿لَّا رَيۡبَ فِيهَا﴾ هیچ گومانی تێدا نی یە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناکەن ﴿٥٩﴾ ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ﴾ وە پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە ﴿أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ﴾ وەڵامتان دەدەمەوە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي﴾ بەڕاستی ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن کەبمپەرستن ﴿سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ بێگومان بەسەر شۆڕی دەچنە دۆزەخەوە ﴿٦٠﴾ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ﴾ خوا ئەو زاتەیە شەوی داناوە بۆ ئێوە ﴿لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ﴾ تائارامی تێدا بگرن ﴿وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ﴾ وە ڕۆژیشی ڕوناك کردۆتەوە (بۆ ژیان پەیدا کردن) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بەڕاستی خوا خاوەن چاکەو میهرەبانی یە بەسەر خەڵکەوە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئادەمی سوپاس گوزار نین ﴿٦١﴾ ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ﴾ ئەمەیە خوای پەروەردگاری ئێوە ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ دروستکەر وداهێنەری هەموو شتێکە ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ﴾ هیچ پەرستراوێکی بەهەق وڕاست نییە جگە لە ئەو ﴿فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ﴾ دەی کەواتە چۆن لائەدەن لەڕاستی ﴿٦٢﴾ ﴿كَذَٰلِكَ يُؤۡفَكُ﴾ ئا بەم جۆرە لائەدرێن ﴿ٱلَّذِينَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ﴾ ئەوانەی کەدان نانێن بەبەڵگەو نیشانەکانی خوادا ﴿٦٣﴾ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا﴾ خوا زاتێکە کەزەوی بۆ کردونەتە نیشتەجێ (وئارامگا) ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ﴾ وە ئاسمانیشی بۆ کردوون بەسەربان ﴿وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ﴾ و بەجوانترین شێوە ئێوەی دروست کردووە ﴿وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ﴾ لەوشتانەیش کەحەڵاڵ و پاکن ڕۆزی داوون ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ﴾ ئەمەیە خوای پەروەردگاری ئێوە ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بەرزی و پیرۆزی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان ﴿٦٤﴾ ﴿هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هەر زیندووەو هیچ پەرستراوێکی بەهەق وڕاست نییە جگە لە ئەو ﴿فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ﴾ کەواتە خوا بپەرستن بەدڵسۆزی وتەنها بۆ ئەو ملکەچ بن ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان ﴿٦٥﴾ ﴿قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: بەڕاستی من ڕێگری کراوم لەپەرستنی ﴿ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی ئێوە دەیان پەرستن جگە لەخوا ﴿لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي﴾ دوای ئەوەی بەڵگەی ڕوونم بۆ هاتووە لەپەروەردگارمەوە ﴿وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ﴾ وە فەرمانم پێ کراوە کە گەردن کەچ بم ﴿لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بۆ پەروەردگاری جیهانیان ﴿٦٦﴾

﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾ ئەو خوایەیە کەئێوەی لەخاك دروست کردووە ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾ لەپاشان
لەدڵۆپێك ئاو ﴿ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ﴾ پاشان لەپارچە خوێنێك ﴿ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا﴾ لەپاشان بەمنداڵی
(ساوایی) دەتان هێنێتە دەر (لەسکی دایك) ﴿ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ﴾ لەپاشان تا دەگەنە تینی هێزو
لاوییتان ﴿ثُمَّ لِتَكُونُوا۟ شُيُوخًا﴾ لەپاشان تاپیر دەبن ﴿وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ﴾ وە هەندێکتان پێش پیربوون
دەمرێنرێن ﴿وَلِتَبْلُغُوٓا۟ أَجَلًا مُّسَمًّى﴾ هەتا دەگەنە ئەو کاتەی کەبۆتان دیاری کراوە ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾
بۆ ئەوەی بیربکەنەوە ﴿٦٧﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُحْيِۦ وَيُمِيتُ﴾ ئەو خوایەیە کەدەژێنێ و دەمرێنێ ﴿فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا﴾
جا هەرکاتێك (بیەوێت) بڕیارێك بدات ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ تەنها پێی دەفەرموێت
ببە ،دەست بەجێ دەبێ ﴿٦٨﴾ ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە سەبارەت
بە بەڵگە ونیشانەکانی خوادەمە قاڵێ وموجادەلە دەکەن (بەبێ هیچ زانیاریەك) ﴿أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ﴾
چۆن لەڕێی (ڕاست) لادەدرێن ﴿٦٩﴾ ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەوانەی باوەڕیان بەقورئان نەهێنا
﴿وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا﴾ وە بەو (پەڕاوانەی) بەپێغەمبەرەکانماندا ناردومانە ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾
ئەوە لەمەو پاش (سەرئەنجامی خۆیان) دەزانن ﴿٧٠﴾ ﴿إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ﴾ کاتێ زنجیرو
تەوقیان لەگەردندایە ﴿يُسْحَبُونَ﴾ پێ ی ڕادەکێشرێن ﴿٧١﴾ ﴿فِي ٱلْحَمِيمِ﴾ لەناو ئاوی زۆر گەرمدا
﴿ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ﴾ پاشان لەدۆزەخدا دەسوتێنرێن ﴿٧٢﴾ ﴿ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ﴾ لەپاشان پێیان دەوترێت:
﴿أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ﴾ لەکوێن ئەو هاوبەشانەی بۆ خواتان دادەنان ﴿٧٣﴾ ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بێجگە لەخوا
﴿قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا﴾ دەڵێن: وون بوون لێمان ﴿بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُوا۟ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا﴾ (وا نی یە) بەڵکو ئێمە لەدونیا
(بێجگە لەخوا) شتێکمان نەدەپەرست ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ ئابەم جۆرە خوا بێ باوەڕان
لەڕێگە لادەدات ﴿٧٤﴾ ﴿ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ﴾ ئەمەتان لەبەر ئەوەیە کەئێوە ﴿تَفْرَحُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾
بەناڕەوا شادی و کەیفتان دەکرد لەزەویدا ﴿وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ﴾ وە لەبەر ئەوەی کەئێوە فیزو کەشخەتان
دەکرد لەزەویدا ﴿٧٥﴾ ﴿ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ دەی لەدەرگاکانی دۆزەخەوە بڕۆنە ژوورەوە تیایدا
دەمێننەوە بە هەمیشەیی و ئێجگاری ﴿فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ ئای چەند خراپە شوێنی خۆ بەزل زانان
﴿٧٦﴾ ﴿فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾ دەی کەواتە (ئەی موحەممەد ﷺ) خۆڕاگربە بێگومان بەڵێنی خوا
ڕاستە ﴿فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمْ﴾ جا یان هەندێك لەو بەڵێنانەی پێیان دەدەین نیشانت دەدەین
﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ یان تۆ دەمرێنین (بەڵێنەکان نابینی) ﴿فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾ ئەوسا هەموتان هەر بۆلای
ئێمە دەگەڕێنەوە ﴿٧٧﴾

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاسـتی بەر لەتـۆ پێغەمبەرانێکمان نـاردووە ﴿مِنْهُم مَّن
قَصَصْنَا عَلَيْكَ﴾ بەسەرهاتی هەندێکیانمان بۆباس کردوی ﴿وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ﴾ وەهەندێکیانمان
بـۆ باس نەکردوی ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ﴾ وە هیچ پێغەمبەرێك ناتوانێ موعجیزەیەك بهێنێت
﴿إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ مەگەر بەئیزنی خوا نەبێت ﴿فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ﴾ جاکاتێ فەرمانی خوا هات (بەسزادانیان)
﴿قُضِيَ بِالْحَقِّ﴾ بەهـەق دادوەری دەکرێـت (لەنێوانیانـدا) ﴿وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ﴾ وە لەوێـدا
ناڕاسـتان زەرەرمەنـد دەبـن ﴿٧٨﴾ ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ﴾ خـوا ئـەو زاتەیـە ئـاژەڵ و ماڵاتی بۆ
ئێـوە بـەدی هێنـاوە ﴿لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ بـۆ ئـەوەی سـواری هەندێکیان بن و (گۆشـتی)
هەندێکیشـیان بخۆن ﴿٧٩﴾ ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ﴾ وە لەو (ئاژەڵانە) دا چەند سـوودو کەڵك بۆ ئێوە هەیە
﴿وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ﴾ وە تابەهۆی ئەوانەوە بگەنە پێویسـتی یەك کە لەدڵ و دەرونتان
دایـە ﴿وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾ وە لەسـەر پشـتی ئـەو (وڵاخانـە)و لەسـەر کەشـتی ئێـوە سـوار
دەکرێـن ﴿٨٠﴾ ﴿وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ﴾ خوا زۆر نیشـانەی خۆیتان نیشـان دەدات ﴿فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ﴾
جـا ئێـوە ئینـکاری کام لـە نیشـانە وبەڵگەکانـی خـوا دەکـەن؟! ﴿٨١﴾ ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا﴾
دەی ئایـا بەزەویـدا نەگەڕاون تا ببینن ﴿كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ سـەرەنجامی کەسـانێك کە
لـە پێش ئەوان بوون چـۆن بووە ﴿كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً﴾ کەلەمان زۆر تـرو بەهێزتریش بوون
﴿وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ﴾ وە شوێنەواریشـیان لەزەویدا (زیاتر بوو) ﴿فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ ئەمجا
ئـەوەی کرد بوویان (لەدونیادا) سـوودی پێ نەگەیانـدن ﴿٨٢﴾ ﴿فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ جا کاتێ
پێغەمبەرەکانیـان بەبەڵگـە ڕوونەکانـەوە هاتنـە لایـان ﴿فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ﴾ دڵخـۆش بـوون بەو
زانینـەی هەیان بوو ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ ئەو (سـزایەی ئـەوان) گاڵتەیـان پێ دەکرد
چـوار دەوری دان (وهاتـە دی) ﴿٨٣﴾ ﴿فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا﴾ ئەمجـا کاتێك سـزای بەتینـی ئێمەیان بینی ﴿قَالُوا
آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ ووتیـان: باوەڕمـان بەخـوای تـاك و تەنهـا هێنـا ﴿وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ﴾
وە بێ باوەڕین بەو شتانەی کردبوومانە هاوبەشی خوا ﴿٨٤﴾ ﴿فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ﴾ جا باوەڕ هێنانەکەیان
هیچ سوودی نەبوو بۆیان ﴿لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا﴾ لەکاتێکدا سزای ئێمەیان دی ﴿سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ﴾
بـاوو سـوننەتی خـوا هـەر وا بـووە پێشـتر لەگـەڵ بەندەکانـی دا ﴿وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ﴾ وە لەوێدا
بێ باوەڕان زەرەرمەند بوون ﴿٨٥﴾

## سورەتی ﴿ فُصِّلَتْ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿حمٓ﴾ بە(حا، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بەواتای، سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة)ش بکە
(١) ﴿تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ قورئان لەلایەن خوای بەخشندەی میهرەبانەوە نێردراوەتە خوارەوە (٢)
﴿كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ﴾ پەڕاوێکە بەڵگەکانی ڕوون کراوەتەوە (لێك جیاکراوەتەوە) ﴿قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٖ
يَعۡلَمُونَ﴾ قورئانێکە بەزمانی عەرەبی بۆ گەلێك کەشارەزان و دەزانن (٣) ﴿بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا﴾ مژدەدەرو
ترسێنەرە ﴿فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ﴾ کەچی زۆربەیان گوێ ی پێ نادەن و بۆیە (قورئان) نابیستن
(٤) ﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٖ﴾ دەڵێن دڵەکانمان لەناو چەند پەردەیەکدایە (تێ ناگەین) ﴿مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ﴾
لەئەوەی تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەیت ﴿وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٞ﴾ وە لەگوێیەکانماندا گرانی و کەڕی هەیە
﴿وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ﴾ وە لەنێوان ئێمەو تۆدا پەردەیەك هەیە ﴿فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ﴾ کەواتە تۆ کاری
خۆت بکە و بێگومان ئێمەیش کاری خۆمان دەکەین (٥) ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ﴾ بڵێ: بەڕاستی
من مرۆڤێکم وەك ئێوە ﴿يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ بەڵام (هەندە هەیە من) نیگام بۆ دەکرێت ﴿أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ﴾
کە بەڕاستی پەرستراوی ئێوە خوایەکی تاك و تەنیایە ﴿فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُۗ﴾ کەواتە باڕووتان
هەر بەرەو خوا بێت (لەپەرستنەکانتاندا) و داوای لێبوردنی لێ بکەن ﴿وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ﴾
وە سزاو لەناوچوون بۆ هاوبەش دانەرانە (٦) ﴿ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ ئەوانەی کەزەکات نادەن و
﴿وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ باوەڕیشیان بەڕۆژی دوایی نی یە (٧) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾
بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ﴾ پاداشتی بێ
بڕانەوەیان بۆ هەیە (٨) ﴿قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي﴾ بڵێ: ئاخۆ بەڕاستی ئێوە باوەڕتان بەو زاتە نی یە؟
﴿خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ﴾ کەزەوی لەدوو ڕۆژدا دروست کردووە ﴿وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ﴾ وە هاوبەشانی بۆ
دادەنێن ﴿ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ هەر ئەوە پەروەردگاری جیهانیان (٩) ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا﴾ وە
لەسەر زەویدا شاخی زۆری داناوە ﴿وَبَٰرَكَ فِيهَا﴾ وە فەڕ و بەرەکەتی تێ خستووە ﴿وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا﴾
وە بژێوی (هەموو گیاندارێکی) لەزەویدا دیاری کرد ﴿فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ﴾ لەماوەی چوار ڕۆژدا ﴿سَوَآءٗ
لِّلسَّآئِلِينَ﴾ بەیەکسانی بۆ گشت داواکەران (١٠) ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ﴾ پاش دروستکردنی
زەوی ئیرادەی دروستکردنی ئاسمانی کرد کە پێشتر دوکەڵێك بوو ﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا﴾ ئەمجا
بەئاسمان وبەزەوی فەرموو: وەرن ﴿طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا﴾ بەوویستی خۆتان یان بەناچاری (بێنە ژێر فەرمانم)
﴿قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ﴾ هەر دووکیان ووتیان بەوویستی خۆمان هاتین (١١)

﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ﴾ ئەوسا حەوت ئاسمانی لەدوو ڕۆژدا دروست کرد (کەواتە خوای
گەورە زەوی و ئاسمانەکانی بەشەش ڕۆژ دروستکرد) ﴿وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ﴾ وە هەر ئاسمانەی
فەرمان (کار) ی خۆی بۆ نارد ﴿وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ﴾ وەئاسمانی دونیامان بەئەستێرە
درەوشاوەکان ڕازاندەوە، وپارێزراوە (لەگوێ گرتنی شەیتانەکان) ﴿ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ ئەوە
بڕیاری خوای زاڵی بەدەسەڵاتە ﴿١٢﴾ ﴿فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ﴾ جا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا ﴿فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةٗ﴾
ئەوە بڵێ بەهەورە تریشقەیەك (بروسکەیەك) دەتانترسێنم ﴿مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ﴾ وەك هەورە
تریشقەی (گەلی) عادو سەموود ﴿١٣﴾ ﴿إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ﴾ کاتێ پێغەمبەرەکانیان هاتنە لایان
﴿مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ﴾ لەبەردەمیان و لە پشتیانەوە (لەهەموو لایەکەوە) ﴿أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ﴾
(پێیان ووتن) کەجگە لەخوا نەپەرستن ﴿قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ﴾ ووتیان: ئەگەر پەروەردگارمان
بیویستایە فریشتەیەکی دەنارده خوارەوە (بۆمان) ﴿فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ بۆیە بەڕاستی ئێمە
بەوەی ئێوەی پێ نێرراون باوەڕ ناکەین ﴿١٤﴾ ﴿فَأَمَّا عَادٞ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ ئەمجا (گەلی)
عاد بەناڕەوا خۆیان بەگەورە زانی لەزەویدا ﴿وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ﴾ وە ووتیان: کێ لەئێمە بەهێز ترە
﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ﴾ ئایا نەیان زانی بوو ﴿أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۖ﴾ بێگومان ئەو خوایەی کەئەوانی
دروست کردووە لەئەوان بەهێز ترە ﴿وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ﴾ وە ئەوان دانیان نەدەنا بەبەڵگەکانی ئێمەدا
وئینکاریان دەکرد ﴿١٥﴾ ﴿فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا﴾ ئەوسا ئێمە بایەکی زۆر بەهێزی ساردمان بۆ ناردن
﴿فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ﴾ لەڕۆژانێکی بەردەوام (وشوم)دا ﴿لِّنُذِيقَهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ﴾ بۆ ئەوەی سزای ئابڕو بەریان
پێ بچەژین ﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ لەژیانی دونیادا ﴿وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ﴾ بێگومان سزای پاشە ڕۆژیان
ئابڕو بەر (وڕیسواکەر) ترە ﴿وَهُمۡ لَا يُنصَرُونَ﴾ وە ئەوان یارمەتی نادرێن ﴿١٦﴾ ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ﴾ وە
(هۆزی) سەموودمان ڕێنموونی کرد ﴿فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ﴾ بەڵام ئەوان زیاتر حەزیان لەکوێری
وگومڕایی کرد تا شارەزایی و ڕێنموونی ﴿فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡهُونِ﴾ جا بۆیە هەورە بروسکەی
سزای ڕیسواکەر لێی دان ﴿بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ بەهۆی ئەو (خراپانەوە) کەدەیانکرد ﴿١٧﴾ ﴿وَنَجَّيۡنَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ وە ئەو کەسانەشمان ڕزگار کرد کەباوەڕدارو پارێزکار ولەخواترس بوون ﴿١٨﴾
﴿وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ وە ڕۆژێك هەموو دوژمنانی خوا بەرەو ئاگری دۆزەخ کۆدەکرێنەوە ﴿فَهُمۡ
يُوزَعُونَ﴾ جا ئەوان (لە پێش کەوتن و دواکەوتن) بەرگری دەکرێن (تا هەموو پێکەوە بەڕیز بڕۆن)
﴿١٩﴾ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا﴾ تا کاتێ دەگەنە لای ئاگری دۆزەخ ﴿شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ﴾ شایەتی دەدات لە دژیان
﴿سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم﴾ گوێ و چاو و پێستی لەشیان ﴿بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ بەو کردەوانەی کە
کردویانە ( لەدونیادا) ﴿٢٠﴾

﴿وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ﴾ وە بەپێستەکانیان دەڵێن: ﴿لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا﴾ بۆچی شایەتییتان دا لەدژمان
﴿قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي﴾ دەڵێن: ئەو خوایە ئێمەی هێناوەتە زمان ﴿أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ کە هەموو شتێکی
هێناوەتە زمان (وقسەکردن) ﴿وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ هەر ئەویش یەکەم جار ئێوەی دروست کردوە
﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ وە هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە ﴿٢١﴾ ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ﴾ وە ئێوە خۆتان
نەدەشاردەوە (نەدەپاراست لەگوناه) ﴿أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ لەشایەتی دانی گوێ
و چاوو پێستی لەشتان لەدژتان ﴿وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ﴾ بەڵکو وا گومانتان دەبرد ﴿أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾
کەخوا نازانێ بەزۆرێك لەو کارانەی کە دەیکەن ﴿٢٢﴾ ﴿وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ﴾ ئا ئەوە گومانتان
بوو کە دەتان برد بەپەروەردگارتان ﴿أَرْدَاكُمْ﴾ ئێوەی هەڵدێرا (لەناوی بردن) ﴿فَأَصْبَحْتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ﴾
و چوونە ڕیزی زیانباران و خەسارۆمەندانەوە ﴿٢٣﴾ ﴿فَإِن يَصْبِرُوا﴾ ئەمجا ئەگەر ئارام بگرن ﴿فَالنَّارُ مَثْوًى
لَّهُمْ﴾ ئەوانە ئاگر شوێنی مانەوەیانە ﴿وَإِن يَسْتَعْتِبُوا﴾ وە ئەگەر داوای لێبوردن و ڕازی بوونی خوا
بکەن ﴿فَمَا هُم مِّنَ الْمُعْتَبِينَ﴾ ئەوە خوا هەرگیز ڕازی نابێ (خۆش نابێ لێیان) ﴿٢٤﴾ ﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ﴾
وە چەند دۆست (و هاودەم)مان لەدونیا بۆ دانان ﴿فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ کە خراپەکردنی
دونیاو (بێ بڕوایی) ڕۆژی دوایی بۆ ڕازاندنەوە ﴿وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ﴾ وە بەڵێنی (سزادانیان) بەسەردا درا
﴿فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم﴾ لە(ڕیزی) ئەو گەلانەی ڕابوردن پێش ئەمان ﴿مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ﴾ لەجنۆکە
و ئادەمی ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ﴾ بەڕاستی زەرەرمەند بوون ﴿٢٥﴾ ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ﴾ وە
بێ باوەڕان (بەیەکتریان) دەووت گوێ مەگرن بۆ ئەم قورئانە ﴿وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ وە قسەی
پڕوپوچی تێکەڵ بکەن بەڵکو سەرکەون (بەسەریدا) ﴿٢٦﴾ ﴿فَلَنُذِيقَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ دەی سوێند بەخوا
بێگومان ئەوانەی بێباوەڕ بوون پێیان دەچێژین ﴿عَذَابًا شَدِيدًا﴾ سزایەکی سەخت ﴿وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي كَانُوا
يَعْمَلُونَ﴾ وە تۆڵەیان لێ دەسەنین (بەتۆڵەی) خراپترینی تاوانێ کەدەیان کرد ﴿٢٧﴾ ﴿ذَٰلِكَ جَزَاءُ أَعْدَاءِ اللَّهِ
النَّارُ﴾ ئەوەی (باسکرا) سزای دوژمنانی خوایە کەئاگری دۆزەخە ﴿لَهُمْ فِيهَا دَارُ الْخُلْدِ﴾ماڵی هەمیشەی
ئەوان لەو ئاگرەدایە ﴿جَزَاءً بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ ئەو سزایە (دەدرێن) چونکە دانیان نەدەنا
بەنیشانەکانی ئێمەدا ﴿٢٨﴾ ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕن دەڵێن ﴿رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا﴾
ئەی پەروەردگارمان ئەو دوانەمان نیشان بدەن کە گومڕایان کردین ﴿مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ﴾ لە جنۆکە
وئادەمی ﴿نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا﴾ تا بیانخەینە ژێر پێمان ﴿لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ﴾ تا لە ژێری ژێرەوەی
دۆزەخ بن ﴿٢٩﴾

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾ بەڕاستی ئەوانەی ووتیان خوا پەروەردگارمانە و ﴿ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟﴾ لەپاشان ڕێـك و ڕاسـت (لەسـەر ئایین) بـەردەوام بـوون ﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ﴾ فریشـتەكان پۆل پۆل دێنـە لایـان (كاتی مـردن یان زینـدوو بوونەوە) ﴿أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟﴾ (پێیـان دەڵێن) كەمەترسـن و خەفەت مەخۆن ﴿وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ وە مژدە بێ لێتان ئەو بەهەشـتەی كەبەڵێنتان پێ درابوو ﴿٣٠﴾ ﴿نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ ئێمە لەژیانی دونیا و لەڕۆژی دواییدا پشـتیوانی ئێوەین ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ﴾ وە لەو (بەهەشـتەدا) هەرچی حەزی لێ بكەن بۆتان ئامادەیە ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ﴾ وە هەرچـی داوا بكـەن لەوێـدا لەخزمەتتاندایـە ﴿٣١﴾ ﴿نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ ڕێزلێنـان و میوانداریە لەلایەن خوای لێبوردەی میهرەبانەوە ﴿٣٢﴾ ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ كێ ووتەی چاكترو بەجێترە لەوكەسەی (خەڵك) بۆلای خوا بانگ دەكات ﴿وَعَمِلَ صَـٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ وەكاری چاكـە دەكات و دەڵـێ بێگومان مـن لەكۆمەڵی گەردن كەچ و موسـڵمانانم ﴿٣٣﴾ ﴿وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ﴾ چاكە و خراپە چـوون یەك نین ﴿ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾ بەچاكترین شـێوە وەڵامی (خراپە) بدەرەوە ﴿فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ﴾ ئەوسـا كەسـێك كە لەنێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتـی هەیـە ﴿كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ﴾ وەك دۆسـتێكی دڵسـۆز و گیانـی بەگیانی لـێ دێت (ئەمەش دەرەنجامـی ڕەوشـتی بـەرز وكار وكـردەوەی جوانـە) ﴿٣٤﴾ ﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟﴾ بـەم ئاسـتە ناگـات كەسـانێك نەبێـت كـە خۆڕاگـرن و بەئارامن ﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ وە پێـی ناگات مەگـەر كەسـێك خاوەنی بەشـی هەرە گـەورە بێت (لەپاداشـت) ﴿٣٥﴾ ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ نَزْغٌ﴾ وە ئەگەر لەشـەیتانەوە تووشـی خەتەرەو خەیاڵی نادروست بوویت ﴿فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ﴾ ئەوە پەنا بگرە بەخوا ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ چونكە بەڕاستی هەر ئەو بیسەری زانایە ﴿٣٦﴾ ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ﴾ لەنیشـانەكانی (دەسـەڵاتی) خوایە شـەوو ڕۆژو خۆرو مانگ ﴿لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ﴾ سوژدە مەبەن نەبۆ خۆرو نەبۆ مانگ ﴿وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ﴾ بەڵكو سوژدە بەرن بـۆ ئەو خوایـەی ئەوانی بەدی هێناوە ﴿إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ ئەگەر ئێوە تەنها ئەو دەپەرسـتن ﴿٣٧﴾ ﴿فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟﴾ جـا ئەگـەر خۆیـان بەگـەورە زانـی (مـن بپەرسـتن) ﴿فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ﴾ دەی ئەوانـەی لای پەروەردگارتـن (فریشـتەكان) ﴿يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩﴾ بەشـەو و بەڕۆژ عیبادەتی ئەو دەكەن و ماندو وەڕەس نابن ﴿٣٨﴾

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً﴾ لەنیشانەکانی (دەسەلاتی) خوایە کەزەوی دەبینی ووشك و ماتە
﴿فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ﴾ کەچی کاتێك بارانمان باراند بەسەریدا ﴿ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ﴾ (بەڕواندنی ڕوەك)
دەکەوێتە جولەو دەبوژێتەوە(بەرز دەبێتەوە) ﴿إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ﴾ بێگومان ئەوەی (زەوی
ووشك) دەبوژێنێتەوە زیندوو کەرەوەی مردووەکانیشە ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی ئەو (خوا) بەسەر
هەموو شتێکدا بەتوانایە ﴿٣٩﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا﴾ بێگومان ئەوانەی لەئایەتەکانی ئێمە لادەدەن
﴿لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ﴾ لەئێمە شاراوە نین ﴿أَفَمَن يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ﴾ دەی ئایا کەسێ دەخرێتە ناو ئاگرەوە چاکترە
﴿أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ یان ئەو کەسەی لەڕۆژی قیامەت دا بێ ترس دێت ﴿ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ﴾ هەرچیتان
وویست (حەزتان لێ کرد) بیکەن ﴿إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بێگومان خوا بەوەی دەیکەن بینایە ﴿٤٠﴾ ﴿إِنَّ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەقورئانیان بۆ هات وباوەڕیان پێ نەهێنا (سزایان دەدەین)
﴿وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ﴾ کەبەڕاستی کتێبێکی زۆر بەرزو جێگەی ڕێزە ﴿٤١﴾ ﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ﴾ بەتاڵ وناڕاستی ڕوی
تێ ناکات ﴿مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ﴾ نە لەئێستا و نەلە دووا ڕۆژدا (نە بەلێ کەمکردن نە بەلێ زیادکردن)
﴿تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾ چونکە نێردراوەتە خوارەوە لەلایەن (خوای) کاردروستی ستایش کراوەوە ﴿٤٢﴾
﴿مَّا يُقَالُ لَكَ﴾ هیچ شتێك بەتۆ ناوترێت ﴿إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ﴾ مەگەر ئەوەی بەپێغەمبەرانی
بەرلەتۆ ووتراوە ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت خاوەن لێبوردنە (بۆ ئیمانداران)
﴿وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ﴾ وە خاوەن تۆڵەی سەختە (بۆبێ باوەڕان) ﴿٤٣﴾ ﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا﴾ ئەگەر ئەم
قورئانەمان بەزمانێکی تر جگە لەعەرەبی بناردایە ﴿لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ﴾ بێ باوەڕان دەیان ووت بۆچی
ئایەتەکانی بەڕوونی شینەکراونەتەوە ﴿ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ﴾ (چۆن دەبێ) قورئانی عەجەمی و پێغەمبەری
عەرەبی ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: قورئان بۆ کەسانێ باوەڕیان پێی هێناوە
ڕێنیشاندەرو شیفایە ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ﴾ وە ئەوانەی باوەڕی پێ نایەنن لەگوێیاندا گرانی و
کەڕی هەیە (لەبیستنی حەق) ﴿وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ﴾ هەروەها لەئاست ئەو
قورئانەدا کوێرن، ئەوانە لەشوێنێکی زۆر دورەوە بانگ دەکرێن ﴿٤٤﴾ ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ سوێند
بەخوا بەڕاستی تەوراتمان دا بەمووسا ﴿فَٱخْتُلِفَ فِيهِ﴾ بەڵام جیاوازی تێدا کرا (لەلایەن جولەکەکانەوە)
﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ﴾ وە ئەگەر پێشتر بڕیار نەدرایە لەلایەن پەروەردگارتەوە (کە سزایان
دوا بخرێت) ﴿لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ﴾ لەنێوانیاندا دادوەری دەکرا (بەسزا دانیان لەدونیا) ﴿وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ
مُرِيبٍ﴾ وە بەڕاستی ئەوان لەدوو دڵی و بەدگومانی دان دەربارەی قورئان ﴿٤٥﴾ ﴿مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا
فَلِنَفْسِهِۦ﴾ هەر کەسێ کاری چاکە بکات (قازانجەکەی) بۆ خۆیەتی ﴿وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا﴾ هەر کەسیش
خراپە بکات (زیانەکەی) بۆ خۆیەتی ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ وە پەروەردگارت ستەم لەبەندەکانی
ناکات ﴿٤٦﴾

﴿إِلَيۡهِ يُرَدُّ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِۚ﴾ زانینی ڕۆژی دوایی تەنیابۆ لای خوادەگەڕێنرێتەوە ﴿وَمَا تَخۡرُجُ مِن ثَمَرَٰتٖ مِّنۡ أَكۡمَامِهَا﴾
وە هەر بەروبوومێك كە لە پێست و قەباغەكەی دێتە دەرەوە ﴿وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ﴾ و هەر مێینەیەك ئاوس
دەبێ ﴿وَلَا تَضَعُ﴾ و (سكەكەی) دادەنێت ﴿إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ﴾ ئەوە (خوا) ئاگای لێ یە ﴿وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ﴾
وە ڕۆژێ خوا (هاوبەش پەیدا كەران) بانگ دەكات ﴿أَيۡنَ شُرَكَآءِي﴾ هاوبەشانێ (كەداتان نابوو
بۆ) من لەكوێن ﴿قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ﴾ دەڵێن پێمان ڕاگەیاندی ﴿مَا مِنَّا مِن شَهِيدٖ﴾ كەس لەئێمە شایەت نین
(تۆهاوبەشت هەبێ) ﴿٤٧﴾ ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم﴾ وە وون بوولێیان ﴿مَّا كَانُواْ يَدۡعُونَ مِن قَبۡلُۖ﴾ ئەوانەی پێشتر
دەیانپەرستن ﴿وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ﴾ وە زانیان كە هیچ پەنایەكیان نی یە ﴿٤٨﴾ ﴿لَّا يَسۡـَٔمُ ٱلۡإِنسَٰنُ﴾
ئادەمی ماندو نابێ ﴿مِن دُعَآءِ ٱلۡخَيۡرِ﴾ لە داواكردنی خێرو خۆشی ﴿وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ﴾ وە ئەگەر ناخۆشی
یەك دووچاری ببێ ﴿فَيَـُٔوسٞ قَنُوطٞ﴾ ئەوە بێ هیوا و نائومێد دەبێ ﴿٤٩﴾ ﴿وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ﴾ وە ئەگەر پێمان
بەخشی ﴿رَحۡمَةٗ مِّنَّا﴾ میهرەبانی یەك لەلایەن خۆمانەوە ﴿مِنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ﴾ لەپاش زیانێك لێی
كەوتووە ﴿لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي﴾ دەڵێت: ئەمە هی خۆمە ﴿وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ﴾ وە گومان نابەم ڕۆژی
دوایی بەرپا بێت ﴿وَلَئِن رُّجِعۡتُ إِلَىٰ رَبِّيٓ﴾ وە ئەگەر گەڕێندرامە وە بۆلای پەروەردگارم (زیندووبونەوە
هەبوو) ﴿إِنَّ لِي عِندَهُۥ لَلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ بێگومان لای خوا (پاداشتی) زۆر چاكم هەیە ﴿فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾
جا سوێند بەخوا هەواڵ دەدەین بەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿بِمَا عَمِلُواْ﴾ بەوەی كردوویانە (لەدونیا)
﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم﴾ وە سوێند بەخودا پێیان دەچەژێن ﴿مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ﴾ سزایەكی بەهێز و بەتین ﴿٥٠﴾
﴿وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ﴾ وە كاتێ چاكە و خۆشیمان ڕشت بەسەر ئادەمی دا ﴿أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ﴾ ڕوو
وەردەگێڕێ و بە خۆبەزل زانینە وە دوور دەكەوێتەوە ﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ﴾ بەڵام كاتێ ناخۆشی تووش
بێت ﴿فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٖ﴾ ئەوە نزاو هاواری زۆر دەكات ﴿٥١﴾ ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ﴾ بڵێ پێم بڵێن ﴿إِن كَانَ مِنۡ عِندِ
ٱللَّهِ﴾ ئەگەر (قورئان) لەلایەن خواوە بوو ﴿ثُمَّ كَفَرۡتُم بِهِۦ﴾ پاشان ئێوەش باوەڕتان پێ نەكرد
﴿مَنۡ أَضَلُّ﴾ كێ گومڕاترە ﴿مِمَّنۡ هُوَ فِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ﴾ لەو كەسەی كەلە دژایەتی یەكی دوور لەڕاستیدا
بێت ﴿٥٢﴾ ﴿سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا﴾ لەمەودوا بەڵگە كانی خۆمانیان نیشان دەدەین ﴿فِي ٱلۡأٓفَاقِ﴾ لە ئاسۆی
دونیا (لەبوونەوەردا) ﴿وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ وە لە خودی خۆیاندا ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ﴾ هەتا بۆیان ڕوون
بێتەوە ﴿أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ﴾ بێگومان ئەم (قورئانە) ڕاستە ﴿أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ﴾ ئایا پەروەردگارت بەس نییە
﴿أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ كە بەڕاستی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێكدا ﴿٥٣﴾ ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ فِي مِرۡيَةٖ﴾
ئاگاداربە بەڕاستی ئەوانە لە دوو دڵیدان ﴿مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمۡۗ﴾ لەدیدار و گەشتن بە پەروەردگاریان
﴿أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطُۢ﴾ ئاگاداربە بەڕاستی (زانست وزانیاری) خوا دەوری هەموو شتێكی
داوە ﴿٥٤﴾

# سورەتی ﴿ الشُّورَىٰ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿حمٓ﴾ بە (حا میم) دەخوێنرێتەوە ﴿١﴾ ﴿عٓسٓقٓ﴾ بە (عەین، سین، قاف) دەخوێنرێتەوە خوا
زاناترە بە ماناکەی بۆ زانیاری زیاترو واتاکەشیان سەرنجی سەرەتای سورەتی (البقرة) بدە ﴿٢﴾
﴿كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيْكَ﴾ ئا بەو جۆرە خودا نیگا دەکات بۆ تۆ ﴿وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ﴾ وە بۆ ئەو (پێغەمبەرانەی)
پێش تۆش ﴿ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ خوای زاڵی باڵادەستی کاردروستە ﴿٣﴾ ﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ هەر
بۆ خوایە هەرچی لە ئاسمانەکان ﴿وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ وە هەرچی لە زەوی دایە ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ﴾
وە ئەو (خوا) بڵند و گەورەیە ﴿٤﴾ ﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ﴾ نزیکە ئاسمانەکان پارچە پارچەببن
﴿مِن فَوْقِهِنَّ﴾ لە سەرویانەوە ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾ وە فریشتەکان بەپاکی یادو سوپاسی
پەروەردگاریان دەکەن ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ﴾ وە داوای لێبوردن دەکەن ﴿لِمَن فِي ٱلْأَرْضِ﴾ بۆ ئەوانەی
لەزەویدان ﴿أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ ئاگاداربن کە بێگومان تەنها خوا لێبوردەی میهرەبانە
﴿٥﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ﴾ وە ئەوانەی جگە لەخوا دۆستانێکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە
﴿ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ﴾ خوا ئاگادار و چاودێرە بەسەریانەوە ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ﴾ وە تۆ (ئەی موحەممەد
ﷺ) پارێزەر وچاودێر نیت بەسەریانەوە ﴿٦﴾ ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ هەروەها نیگامان کردووە بۆت
﴿قُرْءَانًا عَرَبِيًّا﴾ قورئانێك (بەزمانی) عەرەبی ﴿لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا﴾ بۆ ئەوەی خەڵکی مەککە
و کەسانی دەورو بەریی بترسێنی ﴿وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ﴾ وە (خەڵك) بترسێنی لەڕۆژیی کۆکردنەوە
﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ کە هیچ گومانی تێدا نیە ﴿فَرِيقٌ فِي ٱلْجَنَّةِ﴾ کۆمەڵێك لە بەهەشتدان ﴿وَفَرِيقٌ فِي ٱلسَّعِيرِ﴾ وە
کۆمەڵێك لە ئاگریی بڵێسەداردان ﴿٧﴾ ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ﴾ وەئەگەر خوا بیویستایە ﴿لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ دەیکردن
بەیەك نەتەوە (باوەڕداریان بێ باوەڕ) ﴿وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحْمَتِهِۦ﴾ بەلام هەر کەسێکی بوێت دەیخاتە ناو
میهرەبانی خۆیەوە ﴿وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ ستەمکارەکانیش هیچ دۆست و یارمەتی دەرێکیان
نی یە ﴿٨﴾ ﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ﴾ ئایا ئەوان جگە لەخوا پشتیوان و دۆستانێکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە؟
﴿فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِيُّ﴾ هەر خوا پشتیوان و دۆستە ﴿وَهُوَ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ وە تەنها ئەو مردووان زیندوو دەکاتەوە
﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ وە ئەو بەدەسەلات وبەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا ﴿٩﴾ ﴿وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ﴾
وە هەرشتێك کە تێیدا جیاواز بوون ﴿فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ئەوە بڕیارەکەی بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە
﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي﴾ ئەو خوایە پەروەردگاریی منە ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ تەنها پشتم بەو بەستووە ﴿وَإِلَيْهِ
أُنِيبُ﴾ وە هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە ﴿١٠﴾

﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ (خـوا) بەدیهێنەری ئاسـمانەكان و زەویی یە ﴿جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا﴾
بـۆی بەدی هێناون هاوسـەران لەخودی خۆتـان ﴿وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا﴾ هەروەها لە ئاژەڵیشـدا جووتی
(دروسـتكردووە) ﴿يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ﴾ لەجـووت بووندا ژمارەتـان زۆر دەكات ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ﴾ هیچ
شـتێك بەوێنەی خوانی یە (نە لەزات و نە لەسـیفات و نە لە كرداریدا) ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ وە ئەوە
بیسـەری بینایە ﴿١١﴾ ﴿لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ هەر بۆ ئەوە (كلیلەكانی) دەسەڵاتداریی ئاسمانەكان
وزەوی ﴿يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ﴾ ڕزق و ڕۆزی فـراوان دەكات و دەیگرێتـەوە لە هەركەسـێ كە
بیەوێـت ﴿إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ بەڕاسـتی خـوا ئاگـادارە بەهەموو شـتێك ﴿١٢﴾ ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ﴾ ئەو
ئایینـەی بـۆ دانـاوون ﴿مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحٗا﴾ كـە فەرمانـی داوە بە نـووح و ﴿وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ ئەوەش
نیگامان كردووە بۆ تۆ و ﴿وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ﴾ ئەوەش كە فەرمانمان داوە بە ئیبراهیم
وموسا وعیسا ﴿أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ﴾ كە لەسەر ئەو ئایینەبن بەڕێك و ڕاستی و جیاوازی تێدا
مەكەن ﴿كَبُرَ عَلَى ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ زۆر قورس وگرانە بەلای هاوبەش دانەرانەوە ﴿مَا تَدۡعُوهُمۡ إِلَيۡهِۚ﴾ ئەوەی
ئەوانی بۆ بانگ دەكەیت ﴿ٱللَّهُ يَجۡتَبِيٓ إِلَيۡهِ مَن يَشَآءُ﴾ خوا هەركەسی بوێت هەڵی دەبژێرێ بۆ(موسڵمان
بوون) لای خۆی ﴿وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ﴾ وە ڕێنموونیی كەسێك دەكات بۆ لای خۆی بگەڕێتەوە ﴿١٣﴾
﴿وَمَا تَفَرَّقُوٓاْ﴾ وە جیاواز نەبوون ﴿إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ﴾ مەگەر لەپاش ئەوەی كەزانست و زانیاریان
بۆ هات ﴿بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۚ﴾ بەهۆی دژایەتی و حەسوودی نێوانیانەوە ﴿وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ﴾ وە ئەگەر
فەرمانێك پێشتر لە پەروەردگارتەوە دەرنەچوایە ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾ تا كاتێ دیاری كراو (دەبێ بژین)
﴿لَّقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ﴾ ئـەوە بڕیـار لەنێوانیاندا دەكرا (بەسـزادانیان) ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ﴾ وە
بەڕاسـتی ئەوانەی لـەدوای ئەوان نامەیان پێ درا ﴿لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مُرِيبٖ﴾ لە گومـان و دوو دڵیدا بوون
لێی ﴿١٤﴾ ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ﴾ كەواتە تۆ بۆ ئەوە بانگەوازبكە و ﴿وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ﴾ ڕاست وڕاوەستاوبە
لەسـەر ئایینەكـەت بـەو جـۆرەی فەرمانـت پێكـراوە ﴿وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ﴾ وە شـوێن ئارەزووەكانی
ئـەوان مەكـەوە ﴿وَقُلۡ ءَامَنتُ﴾ وەبڵـێ بـاوەڕم هێنـاوە ﴿بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ﴾ بەهەرنامەیـەك
كـە خـوا ناردویەتیـە خـوارەوە ﴿وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ﴾ وە فەرمانـم پـێ دراوە كـە داد پەروەربـم لـە
نێوانتاندا ﴿ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ﴾ خوا پەروەردگاری ئێمە و ئێوەشـە ﴿لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا﴾ (پاداشـتی) كردەوەی
خۆمان بۆ خۆمانە و ﴿وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ﴾ (پاداشتی) كردەوەی ئێوەش بۆ خۆتانە ﴿لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ﴾
هیچ بەڵگەیەك نەماوە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا (باس نەكرابێ) ﴿ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ﴾ خوا (لەڕۆژی دوایی دا)
كۆمان دەكاتەوە ﴿وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ سەرەنجام و گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە ﴿١٥﴾

﴿وَالَّذِينَ يُحَاجُّونَ فِي اللَّهِ﴾ ئەوانـەی دەمەدەمـێ دەکەن لەبارەی خـواوە ﴿مِن بَعْدِ مَا اسْتُجِيبَ لَهُ﴾ لەدوای
ئـەوەی (خەڵکی بانگـەوازی) ئەویان وەڵام دایەوە و(موسـڵمان بوون) ﴿حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ﴾
بەڵگە کانیان پوچ و بەتاڵە لای پەروەردگاریان ﴿وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ﴾ وە خەشـم و ڕقی خوایان لەسـەرە
﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ وە سزای زۆر سەختیان بۆ هەیە ﴿١٦﴾ ﴿اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ خوا ئەو زاتەیە کە
ئەم قورئانەی بەڕاسـتی ناردووەتـە خوارەوە ﴿وَالْمِيزَانَ﴾ وە تەرازووی نـاردووە (بۆ جیاکردنەوەی
حـەق و بەتـاڵ) ﴿وَمَا يُدْرِيكَ﴾ وە تۆ چوزانیت ﴿لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ﴾ لەوانەیە هاتنـی ڕۆژی دوایی زۆر
نزیـك بێـت ﴿١٧﴾ ﴿يَسْتَعْجِلُ بِهَا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا﴾ ئەوانـەی باوەڕیـان پێی نیـە پەلەی هاتنـی دەکەن
﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا مُشْفِقُونَ مِنْهَا﴾ بەڵام ئەوانەی باوەڕیان پێی هەیە دەترسن لێی ﴿وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا الْحَقُّ﴾ وە
دەزانن ڕۆژی دوایی ڕاسـتە ﴿أَلَا إِنَّ الَّذِينَ يُمَارُونَ فِي السَّاعَةِ﴾ بێداربن بەڕاستی ئەوانەی کە گومانیان
هەیـە لـەڕۆژی دوایی ﴿لَفِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ﴾ ئەوە بەڕاسـتی لـە گومڕاییەکی زۆر دوور لەڕاسـتی دان ﴿١٨﴾
﴿اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَادِهِ﴾ خوا دڵسۆزە بەبەندە کانی ﴿يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ﴾ هەرکەسی بوێت ڕزق و ڕۆزی دەدات
﴿وَهُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ﴾ وە هـەر ئـەو بەهێـزو باڵادەسـەت ﴿١٩﴾ ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ﴾ هەرکـەس
بەرهەمـی دوا ڕۆژی بوێـت ﴿نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ﴾ ئێمـە بەرهەمەکـەی بـۆ زیـاد دەکەین ﴿وَمَن كَانَ يُرِيدُ
حَرْثَ الدُّنْيَا﴾ وە هەرکەسێك بەرهەمـی دونیـای بوێـت ﴿نُؤْتِهِ مِنْهَا﴾ هەنـدێ لەدونیای پـێ دەدەین
﴿وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ﴾ بەڵام لەڕۆژی دوایی دا هیچ بەشێکی نی یە ﴿٢٠﴾ ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ﴾ ئاخۆ
ئەو (بێباوەڕانە) هاوبەشـانێکیان هەیە ﴿شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ﴾ ئاینێکیان بۆ داناوون ﴿مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾
کـە خوا ڕێگەی پێ نەداوە ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ﴾ وە ئەگـەر بڕیاری یەکجاری دەرنەچوایە ﴿لَقُضِيَ
بَيْنَهُمْ﴾ لەنێوانیـان دا بڕیار دەدرا (بە لە ناوبردنیان) ﴿وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە بەڕاسـتی بۆ
ستەم کاران سزای سەختی ئازار دەر هەیە ﴿٢١﴾ ﴿تَرَى الظَّالِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا﴾ تۆ ستەمکاران
دەبینـی زۆر دەترسـن لەتاو ئـەوەی کردویانە ﴿وَهُوَ وَاقِعٌ بِهِمْ﴾ بێگومان ئەو سـزایە هەر دووچاریان
دەبێـت ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ وە ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە و چاکە کانیـان کـردووە
﴿فِي رَوْضَاتِ الْجَنَّاتِ﴾ لـە نـاو بـاخ وباخاتـی بەهەشـتدان ﴿لَهُم مَّا يَشَاءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ لـە لایـەن
پەروەردگاریانـەوە هەرچییـان بوێـت بۆیـان ئامادەیـە ﴿ذَٰلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾ ئـە وەیـە چاکـەو
بەخششی زۆر گەورە ﴿٢٢﴾

﴿ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ﴾ ئـەو (بەخششـە) ئەوەیە کە خوا مـوژدە دەدات بـە بەندەکانی ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۗ﴾ ئەوانـەی کـە باوەڕیـان هێنـاوەو چاکەکانیان کـردووە ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا﴾ (ئەی
موحەممـەد ﷺ) بڵـێ داوای هیـچ پاداشـتێکتان لـێ ناکـەم لەسـەری ﴿إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰۗ﴾ مەگـەر
خۆشویستنی خزمایەتی ﴿وَمَن يَقۡتَرِفۡ حَسَنَةٗ نَّزِدۡ لَهُۥ فِيهَا حُسۡنًاۚ﴾ هەر کـەس هەر چاکەیەك بکات چاکەی
بۆ زیاد دەکەین (بە چەند بەرانبەر) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ شَكُورٌ﴾ بەڕاستی خوا لێ بوردەی سوپاسگوزارە ﴿٢٣﴾
﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗاۖ﴾ یان ئەو (بێ باوەڕانە) دەڵێن پێغەمبەر درۆی بەدەم خواوە هەڵبەستووە ﴿فَإِن
يَشَإِ ٱللَّهُ﴾ خۆ ئەگەر خوا بیەوێت ﴿يَخۡتِمۡ عَلَىٰ قَلۡبِكَۗ﴾ مۆر دەنێ بەسەر دڵت دا ﴿وَيَمۡحُ ٱللَّهُ ٱلۡبَٰطِلَ﴾ وە خوا
بەتاڵ لە ناو دەبات ﴿وَيُحِقُّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓۚ﴾ وە بە ووتەکانی (قورئان) ڕاستی جێگیر دەکات ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ
ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاسـتی خوا زانایە بەوەی لە ناو دڵاندایە ﴿٢٤﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ﴾ وە ئە و خوا
زاتێکـە تەوبـە لە بەندەکانـی وەردەگرێت ﴿وَيَعۡفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ وە لە کردەوە خراپەکان چاوپۆشـی
دەکات ﴿وَيَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ﴾ وە دەزانـێ بـە هەرچی کەئێـوە دەیکەن ﴿٢٥﴾ ﴿وَيَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو چاکەکانیان کردووە (داوایان) وەردەگرێت ﴿وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۚ﴾
وە لە بەهرەو بەخششی خۆیی زیاتریان دەداتێ ﴿وَٱلۡكَٰفِرُونَ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ﴾ بەڵام بێ باوەڕان سزای
سەختیان بۆ هەیە ﴿٢٦﴾ ﴿وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ﴾ خۆ ئەگەر خوا ڕزق و زۆری فراوان بکردایە بۆ بەندەکانی
﴿لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لە زەویدا ستەمیان دەکرد و سەرکەش دەبوون ﴿وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ﴾ بەڵام (خوا)
ڕزق و ڕۆزی بـەو ئەندازە دەنێرێتەخوارەوە کە خۆی بیەوێت ﴿إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٞ﴾ بەڕاسـتی خوا
بەئاگاو بینایە بە بەندەکانی ﴿٢٧﴾ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ﴾ وە خوا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێ ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ﴾
لـە پـاش ئەوەی کە خەڵکی بێ ئومێد بوون ﴿وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ﴾ وە (بارانی) ڕەحمەتی خۆی بڵاو دەکاتەوە
﴿وَهُوَ ٱلۡوَلِيُّ ٱلۡحَمِيدُ﴾ وەهەر ئە و پشـتیوان و سوپاسکراوە ﴿٢٨﴾ ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ﴾ وە لە بەڵگەکانی (دەسەڵاتی)
خوایـە ﴿خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ دروسـتکردنی ئاسـمانەکان و زەوی ﴿وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٖۚ﴾ و ئـەوەی
بـڵاوی کردوەتـەوە لە گیانلەبەران لە هـەر دووکیاندا ﴿وَهُوَ عَلَىٰ جَمۡعِهِمۡ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٞ﴾ وە خـوا هەر کاتێك
بیەوێت بەتوانایە بەسـەر کۆکردنەوەیاندا ﴿٢٩﴾ ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ﴾ وە هەر ناخۆشـی یەکتان تووش
بووبـێ ﴿فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ﴾ ئەوە بەهۆیی کردەوەیـی (خراپی) خۆتانەوەیە ﴿وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ﴾ وە لە
زۆرێکیش چاوپۆشـی کـردووە ﴿٣٠﴾ ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ﴾ وە ئێـوە ناتوانن لە زەویـدا قوتاربن
﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ وە نیتانـە بێجگـە لـە خـوا ﴿مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴾ هیـچ پشـتیوان و یارمەتـی
دەرێك ﴿٣١﴾

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ﴾ وە لە بەڵگەكانی (دەسـەڵاتی) خوایە كەشـتیانێك وەك شاخەكان لە
دەریادا دەڕۆن ﴿٣٢﴾ ﴿إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ﴾ ئەگەر خوابیەوێ (با = هەوا) ڕادەگرێت ﴿فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ﴾
ئیتر كەشتیەكان بەسـەر پشتی دەریاكەوە دەوەسـتن ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ﴾ بەڕاسـتی ئـەوەی (كەباس
كـرا) چەندیـن بەڵگە و نیشـانە هەیـە ﴿لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بۆ هەموو ئـارام گرێكی سوپاسـگوزار ﴿٣٣﴾
﴿أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟﴾ یـان بەهۆیی كردەوەكانیانەوە نوقمیـان دەكات ﴿وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ﴾ لەزۆرێكیش
(لـە گوناهیـان) چاوپۆشـی دەكات ﴿٣٤﴾ ﴿وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا﴾ ئەوانـەی كەدەمـە قاڵی دەكەن
دەربـارەی بەڵگەكانـی ئێمـە دەزانـن ﴿مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾ هیـچ پەنایەكیـان نییـە ﴿٣٥﴾ ﴿فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ﴾
جا هەرشتێكتان پێ بەخشراوە ﴿فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەوە تەنها خۆشی ژیانی ئەم دونیایە ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ
وَأَبْقَىٰ﴾ وە ئـەوەی لای خوایـە چاكتر و بەردەوامترە ﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بۆ ئەوانـەی باوەڕیان هێناوە ﴿وَعَلَىٰ
رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ وە تەنهـا پشـت بەپەروەردگاریان دەبەسـتن ﴿٣٦﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ﴾ وە
ئەوانـەی لـە گوناهە گـەورەكان و خراپە زۆر ناشـیرینەكان دور دەكەونـەوە ﴿وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟﴾ وە كاتێ
ڕق و قینیـان هەڵسـێت ﴿هُمْ يَغْفِرُونَ﴾ ئـەوان لـێ دەبـوورن ﴿٣٧﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ﴾ وە ئەوانـەی كە
گوێڕایەڵـی پەروەردگاریـان كردووە﴿وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژەكانیـان بەچاكـی ئەنجام داوە﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ
بَيْنَهُمْ﴾ وە كارو باریی نێوانیان بەپرس و مەشورەتە ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ وە لەو ڕۆزی یەی پێمان داوون
دەیبەخشـن ﴿٣٨﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ﴾ وە ئەوانـەی كاتێ دەسـت درێژیان لـێ دەكرێت ﴿هُمْ يَنتَصِرُونَ﴾
تۆڵـەی خۆیـان دەسـتێنن (و سـەرداناخەن) ﴿٣٩﴾ ﴿وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا﴾ وە تۆڵەی هـەر خراپەیەك
خراپەیەكـە بەوێنەی خۆیی ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ﴾ جا هەركەسـێ ببورێ و ئاشـتی بكات ﴿فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾
ئـەوە پاداشـتی ئەو لە لای خوایە ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاسـتی خوا سـتەمكارانی خـۆش ناوێ ﴿٤٠﴾
﴿وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ﴾ وەهەركەس تۆڵە بسەنێ لە پاش ئەوەی ستەمی لێكراوە ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ﴾
ئا ئەوانە هیچ تاوان و گوناهێكیان لەسەر نیە ﴿٤١﴾ ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ﴾ تاوان و گوناهـ هەر
لەسـەر ئەو كەسانەیە كەسـتەم لەخەڵكی دەكەن ﴿وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ وە بە ناهەق خراپەكاریی
دەكەن لە زەویدا ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانە سـزای زۆر سەختیان بۆ هەیە ﴿٤٢﴾ ﴿وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ﴾
وە هـەر كـەس خـۆ گرو لێ بـوردە بێ ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ بەڕاسـتی ئەمـە لەكارە پـڕ بایەخ و
پەسـەندەكانە ﴿٤٣﴾ ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ﴾ وە هـەر كەس خوا گومڕایـی بكات ﴿فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ﴾ ئەوە
پاش ئەوە هیچ دۆست و یارمەتی دەرێكی نی یە ﴿وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ﴾ وە ستەمكاران دەبینیت
كاتێك سزای (خوا) دەبینن ﴿يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ﴾ دەڵێن ئایـا ڕێگـایـەك هەیە بگەڕێینەوە بۆ
دونیا ﴿٤٤﴾

﴿وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا﴾ وە دەیـان بینی پیشـانی دۆزەخ دەدرێن ﴿خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ﴾ بەمل کەچی و
زەلیلی و داماوی ﴿يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ﴾ بەگۆشـەی چاوو بەدزیەوە دەڕوانن ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾
وە ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە دەڵێن ﴿إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ بەڕاسـتی
زیانبـارەکان ئەوانـەن کە خۆیان و کەس و کاریان لەڕۆژی هەسـتانەوەدا لەدەس داوە ﴿أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ
فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ﴾ بێداربـن بەڕاسـتی سـتەمکاران لـە سـزایەکی هەمیشـەیی دان (٤٥) ﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ
أَوْلِيَآءَ﴾ وە ئەوانە هیچ پشـتیوانێکیان نی یە ﴿يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ کەیارمەتیان بدەن بێجگە لەخوا
﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ﴾ وە هەرکەسـێك خوا گومڕایی بکات ﴿فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ﴾ ئـەوە هیچ ڕێگەیەکی ڕزگار
بوونـی بۆ نی یـە (٤٦) ﴿ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُم﴾ گوێڕایـەڵ بن بۆ پەروەردگارتـان ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ﴾ پێش
ئـەوەی ڕۆژێك بێـت ﴿لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾ لەلایەن خواوە کـە گەڕانەوەیی بۆ نی یە ﴿مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ
يَوْمَئِذٍ﴾ ئـەو ڕۆژە هیچ پەناگایەکتان نابێت ﴿وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ﴾ وە هیچ ئینکارییەکتان پێ ناکرێت
(٤٧) ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا۟﴾ جا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا ﴿فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ ئەوە ئێمە تۆمان بەپارێزەر
وچاودێر نەناردووە بۆ سەریان ﴿إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ﴾ تۆ تەنها ڕاگەیاندت لەسەرە ﴿وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا
رَحْمَةً﴾ وە بەڕاسـتی کاتـێ ئێمـە لەلایـەن خۆمانـەوە بەهـرە ونیعمەتێـك بـە کەسـێك بچەژێـن
﴿فَرِحَ بِهَا﴾ پێـی دڵخـۆش دەبـێ ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ﴾ وە ئەگـەر ناخۆشـیەکیان تـووش ببێـت
﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ بەهـۆی کـردەوەی خۆیانـەوە ﴿فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ﴾ ئـەوە بەڕاسـتی ئادەمـی
پـێ نـەزان و سـپڵەیە (٤٨) ﴿لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ هـەر بۆ خوایە موڵك وپاشـایەتی ئاسـمانەکان
و زەوی ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ﴾ هەرچـی بیەوێـت بـەدی دەهێنێـت ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا﴾ بـۆ هەرکەسـێك
بیەوێـت کچـی پـێ دەبەخشـێت ﴿وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ﴾ وە بـۆ هەرکەسـیش بیەوێـت کـوڕی
پـێ دەبەخشـێت (٤٩) ﴿أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا﴾ یـان کـوڕ و کچـی بەیەکـەوە پـێ دەبەخشـێت
﴿وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا﴾ وە هەرکەسێکیشـی بوێـت نەزۆکـی دەکات ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ بەڕاسـتی
خـوا زانایـی دەسـەڵاتدارە (٥٠) ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ﴾ بـۆ هیـچ کـەس نەبـووە کەخـوا
قسـەی لەگەڵـدا بـکات ﴿إِلَّا وَحْيًا﴾ بـە وەحـی نەبێـت ﴿أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ﴾ یـان لەپشـت پـەردەوە
﴿أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا﴾ یـان نێرراوێـك بنێرێـت ﴿فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ﴾ و بەفەرمانـی خۆیـی ئـەوەی کـە
بیەوێت وەحی بۆ دەکات ﴿إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا بڵندی کاردروستە (٥١)

﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا﴾ هەر بەو شێوە (کە وەحی پێ دێت) قورئانمان بۆ تۆ نارد (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿مِّنْ أَمْرِنَا﴾ بە فەرمانی خۆمان ﴿مَا كُنتَ تَدْرِي مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ﴾ کەتۆ نەتدەزانی کتێب و ئیمان چی یە ﴿وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا﴾ بەلاّم ئێمە ئەوەمان کردە ڕووناکی یەك ﴿نَّهْدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ﴾ ڕێنموونی هەر کەسێکی پێ دەکەین کەبمانەوێت ﴿مِنْ عِبَادِنَا﴾ لەبەندەکانمان ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ وە بەڕاستی تۆ (خەڵك) ڕێنموونی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست ﴿٥٢﴾ ﴿صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِي﴾ ڕێگەی ئەو خوایەی ﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ کە هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایە هی ئەوە ﴿أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ﴾ بێداربن هەموو کارەکان هەر بۆلای خوا دەگەڕێتەوە ﴿٥٣﴾

## سورەتی ﴿ ٱلزُّخْرُف ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿حمٓ﴾ بە (حا، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە واتاکەیی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿١﴾ ﴿وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ﴾ سوێند بەم پەڕاوە ڕوون کەرەوەیە ﴿٢﴾ ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾ بەڕاستی ئێمە قورئانمان بەعەرەبی داناوە ﴿لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بۆ ئەوەی تێ بگەن ﴿٣﴾ ﴿وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا﴾ بەڕاستی ئەم قورئانە لەتابلۆیی پارێزراودایە لای ئێمە (لە لوح المحفوظ دا) ﴿لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾ کەزۆر بڵندەو پڕە لەدانایی ﴿٤﴾ ﴿أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا﴾ دەی ئایا ئێمە ئەم قورئانەتان لێ دوور بخەینە وە ﴿أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ﴾ لەبەر ئەوەی ئێوە گەلێکی زیادەڕۆن ﴿٥﴾ ﴿وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي ٱلْأَوَّلِينَ﴾ وە زۆر پێغەمبەرمان لە گەلە پێشوەکان ناردووە ﴿٦﴾ ﴿وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ﴾ وە هەر پێغەمبەرێکیان بۆ هاتبێ ﴿إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ ئەوان هەر گاڵتەیان پێ کردووە ﴿٧﴾ ﴿فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا﴾ جا کەسانێ کە لەمان بەهێزتر بوون لەناومان بردن ﴿وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ وە بەسەرچوو سەرگوزشتەیی پێشینان ﴿٨﴾ ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ وە ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت کێ ئاسمانەکان و زەویی بەدی هێناوە؟ ﴿لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بێگومان دەڵێن خوای زاڵی باڵادەستی زانا دروستی کردوون ﴿٩﴾ ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا﴾ ئەو خوایەی زەوی کردووە بەلانکە بۆتان ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾ وە چەند ڕێگایەکی تیادا دروست کردووە بۆتان ﴿لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ بۆ ئەوەی بگەن بە مەبەستەکانتان ﴿١٠﴾

﴿وَٱلَّذِي نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ﴾ وە ئـەو خوایـەی کـە لەئاسـمانەوە بەئەنـدازە بارانی بـۆ باراندوون
﴿فَأَنشَرۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ﴾ جا وولاتێکی ووشك و مردووی پێ زیندوو دەکەینەوە ﴿كَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ﴾ ئابەو
جۆرە ئێوەش زیندوو دەکرێنەوە ﴿١١﴾ ﴿وَٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا﴾ وە ئەو خوایەی کە هەموو جووتەکانی
بەدی هێناوە ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡفُلۡكِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مَا تَرۡكَبُونَ﴾ وە کەشتی و ولآخی بۆ فەراهەم هێناون کە سواریان
دەبن ﴿١٢﴾ ﴿لِتَسۡتَوُۥاْ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ﴾ بۆ ئەوەی سواری پشتیان بن ﴿ثُمَّ تَذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ رَبِّكُمۡ﴾ لەپاشان بیر لەبەهرە
ونیعمەتی پەروەردگارتان بکەنەوە ﴿إِذَا ٱسۡتَوَيۡتُمۡ عَلَيۡهِ﴾ کاتێ سواریان بوون ﴿وَتَقُولُواْ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا
هَٰذَا﴾ وەبڵێـن پاك و بێگـەردی بۆ ئەو (خوایە)ی کە ئەمەی بۆ ڕام هێناوین ﴿وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ﴾ کە
پێشتر ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو ﴿١٣﴾ ﴿وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان
دەگەڕێینـەوە ﴿١٤﴾ ﴿وَجَعَلُواْ لَهُۥ مِنۡ عِبَادِهِۦ جُزۡءًاۚ﴾ وە بێگومان لەناو بەندەکانی خوادا هەندێك (منداڵیان)
بۆپەروەردگاردانا ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ مُّبِينٌ﴾ وەبەڕاستی مرۆڤ (ی کافر) پێ نەزان و سپڵەی ئاشکرایە ﴿١٥﴾
﴿أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخۡلُقُ بَنَاتٖ﴾ ئایـا لەناو دروسـت کراوەکانیـدا کچانی بۆ خـۆی هەڵبژاردوە ﴿وَأَصۡفَىٰكُم
بِٱلۡبَنِينَ﴾ وە کوڕانـی تایبـەت کـردووە بەئێـوەوە ﴿١٦﴾ ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم﴾ وە کاتـێ مـژدە بەیەکـێ
لـەوان بـدرێ ﴿بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحۡمَٰنِ مَثَلٗا﴾ بـەوەی بەنموونـە بـۆ خـوای دادەنێـت (واتـە : ئەگـەر پێـی
بووترێـت کچتـان بـووە) ﴿ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ ڕووی ڕەش هەڵدەگـەڕێ و پیـش
دەخواتـەوە ﴿١٧﴾ ﴿أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِي ٱلۡحِلۡيَةِ﴾ ئایـا ئـەو (کچـە)ی لەنـاو ئاڵتـون و خشـڵا بەخێـوو کرابـێ
و ﴿وَهُوَ فِي ٱلۡخِصَامِ غَيۡرُ مُبِينٖ﴾ لەکاتـی دەمەقاڵێـدا ناتوانـێ مەبەسـتی خـۆی دەرببڕێـت (بـۆ خـوای
بڕیـار دەدەن) ﴿١٨﴾ ﴿وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًاۚ﴾ وەئـەو فریشـتانەی کـە بەنـدەی خـوای
بەخشـندەن بەمێینەیـان دادەنـان ﴿أَشَهِدُواْ خَلۡقَهُمۡۚ﴾ ئایـا ئـەوان بەدیـاری دروسـتکردنیانەوە بـوون
﴿سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ﴾ بێگومـان ئـەو شـایەتیانەیان دەنوسـرێت و پرسـیاریان لـێ دەکرێ ﴿١٩﴾
﴿وَقَالُواْ لَوۡ شَآءَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَا عَبَدۡنَٰهُمۗ﴾ وە دەڵێن ئەگەر خوا بیوویستایە ئێمە ئەو (فریشتانەمان) نەدەپەرست
﴿مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ﴾ هیـچ زانیـاری یەکیـان نـی یـە لـەو بارەیـەوە ﴿إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ﴾ ئەوانـە
هـەردرۆ دەکـەن ﴿٢٠﴾ ﴿أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا مِّن قَبۡلِهِۦ﴾ وە ئایـا لـە پێـش قورئـان پەرتوکێکمـان پـێ داون
﴿فَهُم بِهِۦ مُسۡتَمۡسِكُونَ﴾ کـە ئـەوان دەسـتیان پێـوە گرتبـێ ﴿٢١﴾ ﴿بَلۡ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ﴾
(نەخێروانی یە) بەڵکو دەیانووت بەڕاستی ئێمەباووباپیرانمان لەسەر ئاینێك دیووە (لەسەربت پەرستی)
﴿وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ﴾ وە بێگومان ئێمەش پەیڕەوی ڕێبازی ئەوانین ﴿٢٢﴾

﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ﴾ هەروەها پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە لەهیچ شارێکدا
﴿إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ﴾ مەگەر خۆشگوزەرانەکان (دەوڵەمەندەکان)ی ووتویانە ﴿إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ﴾
بەڕاستی ئێمە باوو باپیرانی خۆمان لەسەر ئایینێك دیووە ﴿وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە
لەسەر ئایینی ئەوان دەڕۆین (٢٣) ﴿قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ﴾ ووتی ئەگەر چی من (ئایینی) ڕاستریشم
بۆ هێنابن ﴿مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ﴾ لەوەی کە باووباپیرتان دیووە لەسەری ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ
كَٰفِرُونَ﴾ ووتیان بێگومان ئێمە بێ باوەڕین بەو(ئایینەی) بەئێوەدا نێرراوە (٢٤) ﴿فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ بۆیە
تۆڵەمان لێ سەندن ﴿فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ﴾ جا سەیرکە سەرئەنجامی درۆزنان چۆن بوو (٢٥)
﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ﴾ وە کاتێك ئیبراهیم بەباوکی و گەلەکەی ووت ﴿إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ﴾ بێگومان
من بەریم لەوەی ئێوە دەیپەرستن (٢٦) ﴿إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى﴾ جگە لەو زاتەی کەدروستی کردووم ﴿فَإِنَّهُۥ
سَيَهْدِينِ﴾ چونکە هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات (٢٧) ﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ﴾ ئەو (یەکخواپەرستی)
لەناو نەوەکانیدا بەجێ هێشت ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ تابگەڕێنەوە(سەری) (٢٨) ﴿بَلْ مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ﴾
بەڵکو من ئەوانە وباو وباپیرانیانم لەخۆشگوزەرانیدا هێشتەوە ﴿حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ﴾ هەتا ئەو کاتەی
قورئانیان بۆ هات ﴿وَرَسُولٌ مُّبِينٌ﴾ لەگەڵ پێغەمبەری ئاشکرا (٢٩) ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ﴾ جا کاتێ قورئانیان
بۆ هات ﴿قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ﴾ ووتیان ئەمە جادووە ﴿وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە باوەڕی پێ ناکەین (٣٠)
﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ﴾ وەووتیان بۆچی ئەم قورئانە نەنێرراوەتە خوارەوە ﴿عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾
بۆ پیاوێکی گەورەی (ناودارو دارا) لەم دوو شارە (مەککە و طائف) (٣١) ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ﴾ ئایا
ئەوان ڕەحمەتی پەروەردگارت دابەش دەکەن ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم﴾ لەکاتێکدا ئێمە لەنێوانیاندا دابەشمان
کردووە ﴿مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ هۆی گوزەرانیان لەژیانی ئەم دونیایەدا ﴿وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ
دَرَجَٰتٍ﴾ وەهەندێکیانمان چەندپلە بەرز کردۆتەوە بەسەر هەندێکی تریاندا ﴿لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا﴾
تاهەندێکیان ئیش بەهەندێکی تریان بکەن ولەخزمەتی یەکتردا بن ﴿وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ وە
بەزەیی پەروەردگارت (بۆ تۆ) لەوە چاکترە کە ئەوان کۆی دەکەنەوە (٣٢) ﴿وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً
وَٰحِدَةً﴾ خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە خەڵکی یەك ئوممەتی بێ باوەڕ بوونایە ﴿لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ
بِٱلرَّحْمَٰنِ﴾ وامان دەکرد هەر کەس بێ باوەڕ بوایە بەخوای میهرەبان ﴿لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ﴾ سەقفی
خانووەکانیان لەزیوو بوایە ﴿وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ﴾ هەروەها پلەکان کەپێی داسەر دەکەون (بۆمان
دەکردن بەزیوو) (٣٣)

﴿وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا﴾ وەدەرگـای زۆرمـان بـۆ خانووەکانیـان دادەنـا ﴿وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ﴾ وە کورسـی و
قەنەفەی زۆر تالەسـەری دانیشـن وپاڵ بدەنەوە ﴿٣٤﴾ ﴿وَزُخْرُفًا ۚ﴾ زرق وبرق ورازاندنەوەی ماڵی دونیا
(لەئاڵتـون و زیوو) (خـوای گەورە واز دەهێنێت لەو بێباوەڕانە کە لەزەت لەماڵ وسـامان وخۆشـی
دونیا وەربگرن، بەڵام پاشەڕۆژ هەر دەگەڕێنەوە بەردەستی) ﴿وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ﴾ جا
هەمـوو ئەوانـە چەنـد سـاتێکە لـە بەهـرەو خۆشـی ژیانـی دونیـا ﴿وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ بـەڵام
(پاداشـتی) ڕۆژی دوایی لای پەروەردگارت بۆ پارێزکاران ولەخواترسانە ﴿٣٥﴾ ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ
ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ وە هەرکـەس پشـت لە یادیـی خـوا هەڵکات ﴿نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا﴾ شـەیتانێکی بۆ ئامـادە دەکەن
﴿فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ﴾ کە هەمیشە لەگەڵی بێت ولێی جیا نەبێتەوە ﴿٣٦﴾ ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ وە بێگومان
ئەوانـە (شـەیتانەکان) لەڕێگایـی ڕاسـت ڕێگرییـان دەکـەن ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ واش دەزانـن
کەبێگومـان هەر ئەوانن کە هیدایەتـدراوون ﴿٣٧﴾ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا﴾ هەتا کاتێ کە(دەمرێ و) دێتەوە لامان
﴿قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ﴾ دەڵێ خۆزگە نێوانی من وتۆ بەقەدەر نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا
بوایـە ﴿فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ﴾ ئـای چ هـاوڕێ یەکی خـراپ بوویـت ﴿٣٨﴾ ﴿وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ﴾ (ئەم
خۆزگە)هیچ سـوودێکتان پێناگەیەنێت چونکە ستەمتان کـرد ﴿أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ بێگومان
ئێـوە لـە سـزایی سـەخت دا هاوبەشـن ﴿٣٩﴾ ﴿أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ﴾ دەی ئایـا تۆ (ئـەی موحەممـەد ﷺ)
دەتوانی بەکەڕ بشنەوێنی ﴿أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ﴾ یان کوێر ڕێنموونی بکەیت ﴿وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ وە ئەو
کەسـەی کەلەگومڕایی یەکی ئاشـکرادا بێت ﴿٤٠﴾ ﴿فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ﴾ جا ئەگـەر تۆ بمرێنین ﴿بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم
مُّنتَقِمُونَ﴾ ئـەوە بێگومـان ئێمـە هـەر تۆڵـە لـەوان دەسـێنین ﴿٤١﴾ ﴿أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى وَعَدْنَٰهُمْ﴾ یـان ئەو
هەڕەشـەی لێمان کردوون پیشـانت دەدەین ﴿فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ﴾ چونکە بەڕاسـتی ئێمە بەدەسەڵاتین
بەسـەریاندا ﴿٤٢﴾ ﴿فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ ۖ﴾ کەواتـە دەسـت بگـرە بـەو قورئانـەوەی بـۆت نێـرراوە
﴿إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بەڕاستی تۆ لەسەر ڕێبازێکی ڕاستیت ﴿٤٣﴾ ﴿وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ﴾ وەبێگومان
ئەم قورئانە هۆی ناوداری یە بۆ خۆت و بۆ گەلەکەت ﴿وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ﴾ لە داهاتووشدا پرسیارتان لێ
دەکرێت ﴿٤٤﴾ ﴿وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ﴾ تۆ پرسیار بکە لە و پێغەمبەرانەی پێش تۆ ناردوومانن
﴿أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ ئایا بێجگە لە خوای میهرەبان بڕیارمان داوە ﴿ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ﴾ پەرستراوانێك
کە بپەرسـترێن ﴿٤٥﴾ ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاسـتی مووسـامان بەبەڵگەکانمانەوە
نـارد ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ﴾ بـۆلای فیرعـەون و دەسـت و پێوەندەکـەی ﴿فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾
ووتی بەڕاسـتی من پێغەمبەری پەروەردگاری جیهانیانم ﴿٤٦﴾ ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ جا کاتێ بەڵگەکانی
ئێمەی بۆ هێنان ﴿إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ﴾ کەچی ئەوان بەبەڵگەکان پێدەکەنین ﴿٤٧﴾

﴿وَمَا نُرِيهِم مِّنْ آيَةٍ﴾ وە هیچ بەڵگەیەکمان نیشان نەداون ﴿إِلَّا هِيَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا﴾ مەگەر ئە و بەڵگەیە
گەورەتربوو لەهاوتاکەی ﴿وَأَخَذْنَاهُم بِالْعَذَابِ﴾ وەتووشی بەڵاو سزامان کردن (چونکە باوەڕیان نەهێنا)
﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بۆ ئـەوەی بگەڕێنەوە (لەبێ باوەڕیی) ﴿٤٨﴾ ﴿وَقَالُوا يَا أَيُّهَ السَّاحِرُ﴾ ووتیان (بەمووسـا)
ئەی جادوو باز ﴿ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ﴾ داوامان بۆ بکە لە پەروەردگارت ئەوەی بەڵێنی پێ داوی
(بەدی بهێنێت) ﴿إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ﴾ ئەوسا بەڕاستی ئێمە باوەڕدەهێنین ﴿٤٩﴾ ﴿فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ الْعَذَابَ﴾
جا کاتی بەڵاو سزاکەمان لەسەریان لابرد ﴿إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ﴾ کتوپڕ پەیمانەکەیان هەڵدەوەشاندەوە ﴿٥٠﴾
﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِ﴾ وە فیرعەون جاڕی دابەناو گەلەکەیدا ﴿قَالَ يَا قَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ﴾ ووتی ئەی
گەلەکـەم ئایا پادشـایی میصر هی مـن نی یە ؟ ﴿وَهَٰذِهِ الْأَنْهَارُ تَجْرِي مِن تَحْتِي﴾ وە (ئایا) ئـەم ڕووبارانە
بەژێر (کۆشکەکانی) مندا ناڕۆن؟ ﴿أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە نابینن؟! ﴿٥١﴾ ﴿أَمْ أَنَا خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا الَّذِي هُوَ
مَهِينٌ﴾ بەڵکو من باشـترم لەو (مووسـا) کەلاواز و بێ ڕێزە ﴿وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴾ وەناتوانێ بەچاکی قسە
بـکات (زمانی تـەواو نی یە) ﴿٥٢﴾ ﴿فَلَوْلَا أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ﴾ دەبۆچی بازنـی ئاڵتونی پێ نەدراوە؟
(ئەگەر ڕاسـت دەکات) ﴿أَوْ جَاءَ مَعَهُ الْمَلَائِكَةُ مُقْتَرِنِينَ﴾ یان فریشـتەی (شـایەتی دەری) لەگەڵدا
نەهاتووە ﴿٥٣﴾ ﴿فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ فَأَطَاعُوهُ﴾ جا بەم قسانە گەلەکەی هەڵخەڵەتان و ئەوانیش گوێڕایەڵیان
کـرد ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا﴾ بێگومان ئەوان هەمیشـە ﴿قَوْمًا فَاسِقِينَ﴾ گەلێکی لە سـنوور دەرچوو بوون ﴿٥٤﴾
﴿فَلَمَّا آسَفُونَا انتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ جا کاتێ ڕقیان هەڵساندین تۆڵەمان لێ سەندن ﴿فَأَغْرَقْنَاهُمْ أَجْمَعِينَ﴾
ئەمجاهەموویانمان لەدەریادا خنکاند ﴿٥٥﴾ ﴿فَجَعَلْنَاهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْآخِرِينَ﴾ و کردمانن بەپەندونموونە
وئامۆژگاری بۆ کەسـانی دوای خۆیان ﴿٥٦﴾ ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ابْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا﴾ وە کاتێ عیسـای کوڕی مەریەم
بەنموونە هێنرایەوە ﴿إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ﴾ دەستبەجێ گەلەکەت دەیکەنە هاوارو قیڕەی خۆشی
(وادەزانن قسـەی ئەوان بەسـەر قسەی پێغەمبەردا ﷺ سـەرکەوتووە) ﴿٥٧﴾ ﴿وَقَالُوا أَآلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ﴾
وە دەڵێن ئایا پەرستراوەکانی ئێمە باشترە یان عیسا ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا﴾ ئەوانە نموونەی عیسایان
تەنها بۆ دەمبازی ودەمەدەمێ بۆ دەهێنایەتەوە ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ﴾ (وانیە کە دەیڵێن) بەڵکو ئەوانە گەلێکی
زۆر دەمەقاڵـێ کەرن ﴿٥٨﴾ ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ﴾ عیسـا هیچ نی یـە جگە لە بەندە یەك کە نیعمەتی
خۆمان ڕشتووە بەسەریدا ﴿وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ وە کردومانە بەنموونە بۆ نەوەی ئیسرائیل ﴿٥٩﴾
﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَائِكَةً﴾ ئەگەر بمانویستایە لەجیاتی ئێوە فریشتەمان دادەنا ﴿فِي الْأَرْضِ يَخْلُفُونَ﴾
لەزەویدا دەبوونە جێ نشینی ئێوە ﴿٦٠﴾

﴿وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ﴾ وە بێگومان (دابەزینی عیسا بۆ سەر زەوی) یەكێكە لەنیشانەكانی قیامەت ﴿فَلَا
تَمْتَرُنَّ بِهَا﴾ كەواتە دەربارەی قیامەت هیچ گومانتان نەبێ ڕاستە ﴿وَٱتَّبِعُونِ﴾ وە شوێنی من بكەون
﴿هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ ئەمە ڕێگای ڕاستە ﴿٦١﴾ ﴿وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ وەباشەیتان ڕێگریتان نەكات
لەڕێنموونی خوا ﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ بەڕاستی ئەو (شەیتان) دوژمنێكی ئاشكرای ئێوەیە ﴿٦٢﴾ ﴿وَلَمَّا
جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ وە كاتێ عیسا بەڵگە ڕوونەكانی هێنا ﴿قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ﴾ ووتی (بەنەوەی
ئیسرائیل) بێگومان بەپێغەمبەرایەتی هاتووم بۆ ناوتان ﴿وَلِأُبَيِّنَ لَكُم﴾ بۆ ئەوەی ڕوونی بكەمەوە بۆتان
﴿بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ﴾ هەندێ لەوشتانەی جیاوازن تێیدا ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ دەی لەخوا بترسن ﴿وَأَطِيعُونِ﴾
و گوێرایەڵیم بكەن ﴿٦٣﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ﴾ بەڕاستی خوا پەروەردگاری من و پەروەردگاری
ئێوەشە ﴿فَٱعْبُدُوهُ﴾ كەواتە هەر ئەو بپەرستن ﴿هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ هەر ئەمە ڕێگای ڕاستە ﴿٦٤﴾
﴿فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ﴾ جا كۆمەڵەكان جیاواز بوون لەنێوان خۆیاندا ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟﴾
سزاو لەناوچوون بۆ ئەوانەی ستەمیان كرد ﴿مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾ لەسزای سەختی ڕۆژی بەئازار
﴿٦٥﴾ ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ﴾ ئایا جگە لە ڕۆژی دوای چاوەڕوانی چی دەكەن ﴿أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً﴾
كە كتوپڕ بێت بۆیان ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ لەكاتێكدا ئەوان هەست ناكەن ﴿٦٦﴾ ﴿ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ
بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ دۆست و خۆشەویستەكان لەو ڕۆژەدا دوژمنی یەكترن ﴿إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ﴾ جگە
لە پارێزكاران ولەخواترسان نەبێت ﴿٦٧﴾ ﴿يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ﴾ (پێیان دەوترێت) ئەی بەندەكانم
ئەمڕۆ هیچ مەترسیەكتان لەسەر نی یە ﴿وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ﴾ خەفەتیش ناخۆن ﴿٦٨﴾ ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا﴾
ئەوانەی باوەڕیان بەئایەتەكانی ئێمە هێناوە ﴿وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ﴾ و هەمیشە گەردن كەچ بوون ﴿٦٩﴾
﴿ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ﴾ (لەو ڕۆژەدا پێیان دەڵێن) بچنە بەهەشتەوە ﴿أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ﴾ ئێوە و هاوسەرەكانتان
﴿تُحْبَرُونَ﴾ (ڕێز دەگیرێن و) دڵ خۆش دەكرێن ﴿٧٠﴾ ﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ﴾
بەسینی وپەرداخی ئاڵتونی (خواردن و خواردنەوە) دەگێڕن بەسەریاندا ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ﴾
وە لەو بەهەشتەدا هەیە ئەوەی دڵ حەزی لێ بكات ﴿وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ﴾ و چاو لەززەت لەبینینی ببات
﴿وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ وە ئێوە بەهەتا هەتایی دەمێننەوە تیایدا ﴿٧١﴾ ﴿وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا﴾ ئەوە
ئەو بەهەشتەیە كە بۆ ئێوە ماوەتەوە (پێتان دراوە) ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بەهۆی ئەو كردەوانەوەی كە
دەتانكرد ﴿٧٢﴾ ﴿لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ﴾ بۆ ئێوە هەیە تێیدا میوە هاتی زۆر ﴿مِّنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ كەلێیان
دەخۆن ﴿٧٣﴾

﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ بەڕاستی تاوانباران ﴿فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾ لەسزای دۆزەخدا بەهەمیشەیی دەمێننەوە ﴿٧٤﴾
﴿لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ﴾ سزایان لەسەر سووك ناكرێت ﴿وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ وە ئەوان لەناو ئەو سزایەدا بێ ئومێدن
﴿٧٥﴾ ﴿وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ﴾ وە ئێمە هیچ ستەمێكمان لێ نەكردوون ﴿وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڵكو هەر خۆیان
ستەمكار بوون ﴿٧٦﴾ ﴿وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ﴾ وە هاوار دەكەن ئەی مالیك (سەرپەرشتیاری دۆزەخ) ﴿لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ﴾
با پەروەردگارت بمان مرێنێت (تارزگاربین) ﴿قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ﴾ (ئەویش پاش ماوەیەكی زۆر وەڵامیان
دەداتەوە و) دەڵێت : بێگومان ئێوە دەمێننەوە تیایدا ﴿٧٧﴾ ﴿لَقَدْ جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی (ئایینی)
هەقمان بۆ هێناون ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ﴾ بەڵام زۆربەتان ڕاستیتان پێناخۆشە ﴿٧٨﴾ ﴿أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا﴾ بەڵكو
ئەوانە بۆ پیلان و فێڵیان (لەپێغەمبەر ﷺ) لێبڕان ﴿فَإِنَّا مُبْرِمُونَ﴾ بۆیە بەڕاستی ئێمەش (بۆ تۆڵە لێ سەندنیان)
لێبڕاین ﴿٧٩﴾ ﴿أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم﴾ ئاخۆ وا دەزانن ئێمە نهێنی و چپەكانیان نابیستین ﴿بَلَىٰ﴾
بەڵێ دەیبیستین ﴿وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ﴾ فریشتەكانیشمان كەلەلایانن وئامادەی (ئەو پیلان و فێڵانەیان)
دەنوسن ﴿٨٠﴾ ﴿قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ﴾ بڵێ ئەگەر پەروەردگار كوڕی ببوایە ﴿فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ﴾ ئەوە من
یەكەمین كەس بووم دەمپەرست ﴿٨١﴾ ﴿سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری
ئاسمانەكان و زەوی ﴿رَبِّ ٱلْعَرْشِ﴾ و پەروەردگاری عەرش ﴿عَمَّا يَصِفُونَ﴾ لەو (قسە ناڕێكانە)ی كە
ئەوان بۆ خوای هەڵدەبەستن ﴿٨٢﴾ ﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟﴾ جا لێیان گەڕێ با سەرگەرمی پڕوپوچی بن و
گاڵتە بكەن ﴿حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ﴾ هەتا دەگەن بەڕۆژی خۆیان ﴿ٱلَّذِى يُوعَدُونَ﴾ كە بەڵێنیان پێ دراوە ﴿٨٣﴾
﴿وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ﴾ وە ئەو (خوایە) زاتێكە پەرستراوە لە ئاسماندا ﴿وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ﴾ وە پەرستراوە
لە زەویدا ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ﴾ وە تەنها ئەویش كار دروستی زانایە ﴿٨٤﴾ ﴿وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ﴾ وە پاك و بەفەڕو گەورەیە ئە و خوایەی كە خاوەنی ئاسمانەكان و زەوی یە ﴿وَمَا بَيْنَهُمَا﴾
وە هەرچی لەنێوانیاندایە ﴿وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ﴾ وە زانینی (هاتنی) ڕۆژی دوایی تەنها لای ئەوە
﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ وە هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە ﴿٨٥﴾ ﴿وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ﴾ وە
ئەوانەی بێجگە لە خوا دەپەرسترێن (وهاواریان لێ دەكرێت) ناتوانن تكا بكەن ﴿إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ﴾
مەگەر كەسانێك شایەتییان بەهەق دابێ ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ وە هەقیان زانیوە و ئاگاداری بوون ﴿٨٦﴾
﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ﴾ وە ئەگەر پرسیاریان لێ بكەیت كێ دروستی كردوون ﴿لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾ بێگومان
دەڵێن خوا ﴿فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ دەی چۆن ئەوان لەهەق وڕاستی لادەدن ﴿٨٧﴾ ﴿وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ﴾ وە ( پێغەمبەر ﷺ
شكاتی كردو) ووتی ئەی پەروەردگار ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانە گەلێكن باوەڕ ناهێنن
﴿٨٨﴾ ﴿فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ﴾ (خوای گەورە فەرمووی: ئەی موحەممەد ﷺ) تۆش وازیان لێ بهێنە و گوێیان پێ
مەدە ﴿وَقُلْ سَلَٰمٌ﴾ وپێان بڵێ (سەلام) ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ لەمەو پاش دەزانن (چی یان بەسەردێت) ﴿٨٩﴾

## سورەتی ﴿ الدُّخَانِ ﴾

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿حمٓ﴾ بە (حا، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە واتاکەیی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی
(البقرة) بکە ﴿١﴾ ﴿وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ﴾ سوێند بەم قورئانە ڕوون کەرەوەیە ﴿٢﴾ ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ﴾
بەڕاستی ئێمە ئەم قورئانەمان لە شەوێکی پیرۆزدا ناردوەتە خوارەوە ﴿إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾ بێگومان
ئێمە ترسێنەرین ﴿٣﴾ ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾ لەو (شەوە پیرۆزە)دا هەموو کار و بارێکی شیاو لە
یەك جیادەکرێتەوە ﴿٤﴾ ﴿أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ﴾ فەرمانێکە لەلایەن ئێمەوە ﴿إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ﴾ بەڕاستی
ئێمە پێغەمبەران دەنێرین ﴿٥﴾ ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾ کەڕەحمەتێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿إِنَّهُۥ هُوَ
ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بێگومان هەر خوا بیسەری زانایە ﴿٦﴾ ﴿رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ﴾ پەروەردگاری
ئاسمانەکان و زەوی وە هەرچی لە نێوانیاندایە ﴿إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ ئەگەرئێوە ئیمانداری ڕاستەقینەن
﴿٧﴾ ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی بەهەق و ڕاست نی یە جگە لە خوا ﴿يُحْىِۦ وَيُمِيتُ﴾ (خوا)
دەژێنێ و دەمرێنێ ﴿رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ پەروەردگاری ئێوە و پەروەردگاری باو و باپیرە
پێشوەکانتانە ﴿٨﴾ ﴿بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ﴾ بەڵام ئەوان لە دوو دڵی و گوماندا گەمە و گاڵتە دەکەن ﴿٩﴾
﴿فَٱرْتَقِبْ﴾ جا چاوەڕوان بە ﴿يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ ڕۆژێ کە ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ
پەیدا دەبێ ﴿١٠﴾ ﴿يَغْشَى ٱلنَّاسَ﴾ هەموو ئادەمی دادەگرێ ﴿هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ و (دەڵێن) ئەمە بەڵایەکی
سەختە ﴿١١﴾ ﴿رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ﴾ ئەی پەروەردگارمان ئەم سزایەمان لەسەر لابە ﴿إِنَّا مُؤْمِنُونَ﴾
بەڕاستی ئێمە باوەڕدارین ﴿١٢﴾ ﴿أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ چۆن تەمێ خواردەبن و ئامۆژگاری وەردەگرن
﴿وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ﴾ کە بەڕاستی پێغەمبەرێکی ڕوون و ئاشکرایان بۆ هاتووە ﴿١٣﴾ ﴿ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ﴾
لە پاشان گوێیان پێ نەداو ﴿وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ﴾ وە ووتیان: فێرکراوێکی شێتە ﴿١٤﴾ ﴿إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ
قَلِيلًا﴾ بێگومان بۆ ماوەیەکی کەم ئەم بەڵایە لا دەبەین ﴿إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ﴾ بێگومان ئێوە دەگەڕێنەوە (بۆ بێ
باوەڕی) ﴿١٥﴾ ﴿يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ﴾ ڕۆژێك دێت پەلامارێکی بەهێز و هەرە گەورەیان بۆ دەبەین
﴿إِنَّا مُنتَقِمُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆڵە دەسەنین (لە کافران لە جەنگی بەدردا) ﴿١٦﴾ ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ﴾
سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێش ئەمان گەلی فیرعەونمان تاقی کردەوە ﴿وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ﴾
وپێغەمبەرێکی بەڕێزیان بۆ هات ﴿١٧﴾ ﴿أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ﴾ (پێی ووتن) کە بەندەکانی خوا
(بەنو ئیسرائیل) بە من بسپێرن ﴿إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ چونکە بەڕاستی من پێغەمبەرێکی ئەمین
وباوەڕ پێکراوم بۆ ناو ئێوە ﴿١٨﴾

﴿وَأَن لَّا تَعْلُوا عَلَى اللَّهِ﴾ وە خۆتـان بەبـەرزو گـەورە مەزانـن لەبەرامبـەر خـوادا ﴿إِنِّي آتِيكُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ﴾
بێگومـان مـن بەڵگـە ونیشـانەیەکی ئاشـکرام بـۆ هێنـاون ﴿١٩﴾ ﴿وَإِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ﴾ وە بێگومان من
پەنادەگـرم بەپەروەردگاری خۆم و پەروەردگاری ئێوە لەوەی ﴿أَن تَرْجُمُونِ﴾ کە ئێوە بەردبارانم بکەن
﴿٢٠﴾ ﴿وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا لِي فَاعْتَزِلُونِ﴾ وە ئەگەر باوەڕم پێناهێنن ئەوە وازم لێ بهێنن (و خراپەم دەربارە مەکەن)
﴿٢١﴾ ﴿فَدَعَا رَبَّهُ﴾ جـا هـاواری لـە پەروەردگاری کـرد (ووتی) ﴿أَنَّ هَٰؤُلَاءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ﴾ بەڕاسـتی ئەمانە
گەلێکـی تاوانبارن ﴿٢٢﴾ ﴿فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا﴾ ئەوسـا (پێـی ووترا) بەندەکانم بەشـەو بەرە ﴿إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾
چونکە بەڕاستی (فیرعەون و کۆمەڵەکەی) دواتان دەکەوون ﴿٢٣﴾ ﴿وَاتْرُكِ الْبَحْرَ رَهْوًا﴾ وە دەریاکە (دەریای
سـوور) بەئارامـی و ئاوەڵا بەجێ بهێڵـە ﴿إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ﴾ بێگومان ئەوانە سـەربازانێکی خنکێنراو
دەبـن (تێیدا) ﴿٢٤﴾ ﴿كَمْ تَرَكُوا﴾ چەندەهایان بەجێ هێشـت ﴿مِن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ لە باخات و کانیاو ﴿٢٥﴾
﴿وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ﴾ و کشـتوکاڵ و جـێ ومەئوای چاك و خـۆش ﴿٢٦﴾ ﴿وَنَعْمَةٍ كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ﴾ وە ناز
ونیعمەتی زۆر کەئەوان تیایدا دەژیان و ڕایان دەبوارد ﴿٢٧﴾ ﴿كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا قَوْمًا آخَرِينَ﴾ هەربەم جۆرە
ئەو (خۆشی یە)مان دا بە گەلێکی تر ﴿٢٨﴾ ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ﴾ جا نەئاسمان و نەزەوی نەگریان
بۆیان ﴿وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ﴾ و مۆڵەتیشـیان پێ نەدرا ﴿٢٩﴾ ﴿وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاستی
نەوەی ئیسـرائیلمان ڕزگار کرد ﴿مِنَ الْعَذَابِ الْمُهِينِ﴾ لە سزای ڕیسواکەر ﴿٣٠﴾ ﴿مِن فِرْعَوْنَ﴾ لەفیرعەون
﴿إِنَّهُ كَانَ عَالِيًا مِّنَ الْمُسْرِفِينَ﴾ بێگومـان فیرعەون خۆبـەزل زانێکی لەسـنوور دەرچوو بوو ﴿٣١﴾ ﴿وَلَقَدِ
اخْتَرْنَاهُمْ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاستی نەوەی ئیسـرائیلمان هەڵبژارد ﴿عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ بەسەر خەڵکی
(سـەردەمی خۆیان)دا بەپـێ ی زانیاری (خۆمـان) ﴿٣٢﴾ ﴿وَآتَيْنَاهُم مِّنَ الْآيَاتِ﴾ وە موعجیزەو بەڵگەی
زۆرمـان پێـدان ﴿مَا فِيهِ بَلَاءٌ مُّبِينٌ﴾ کە بـۆ تاقیکردنەوەی ڕوون وئاشـکرا بەس بێت ﴿٣٣﴾ ﴿إِنَّ هَٰؤُلَاءِ﴾
بەڕاستی ئائەوانە ﴿لَيَقُولُونَ﴾ دەڵێن ﴿٣٤﴾ ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا مَوْتَتُنَا الْأُولَىٰ﴾ هەر بۆیە یەکەم جار دەمرین ﴿وَمَا نَحْنُ
بِمُنشَرِينَ﴾ ئیتـر زیندوو ناکرێینـەوە ﴿٣٥﴾ ﴿فَأْتُوا بِآبَائِنَا﴾ دەی باوو باپیرانمان (زینـدوو بکەنەوەو) بیان
هێننەوە (بۆ دونیا) ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن ﴿٣٦﴾ ﴿أَهُمْ خَيْرٌ﴾ ئایا ئەوانە چاکترن
﴿أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ﴾ یان گەلی توببەع (ی پادشـایی یەمەن) ﴿وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ و ئەوانەی لە پێشیانەوە بوون
﴿أَهْلَكْنَاهُمْ﴾ هەموویانمـان لەناو بـرد ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ﴾ چونکە بێگومان گشـتیان تاوانباربوون
﴿٣٧﴾ ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ وە دروسـتمان نەکردووە ئاسـمانەکان و زەوی ﴿وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ ئەوەی لە
نێوانیاندایە ﴿لَاعِبِينَ﴾ بەبێهودە و گاڵتە ﴿٣٨﴾ ﴿مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ هەر دووکیانمان بەدی نەهێناوە بەهەق
وڕاستی نەبێت ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن ﴿٣٩﴾

﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ﴾ بێگومـان ڕۆژی جیاکردنەوە(ی حـەق و بەتاڵ) ﴿مِيقَـٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ کاتی دیاری
کراویـی هەموویانـە ﴿٤٠﴾ ﴿يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا﴾ ڕۆژێکە هیچ دۆسـتێ ناتوانێ کەمترین سـوود
بگەیەنـێ بە دۆسـتی خـۆی ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ وە یارمەتیش نادرێـن ﴿٤١﴾ ﴿إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ﴾ مەگەر
کەسێ خوا ڕەحمی پێ بکات ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی تەنها خوا زاڵی باڵادەستی میهرەبانە
﴿٤٢﴾ ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ﴾ بێگومـان درەختی ژەقنەموت ﴿٤٣﴾ ﴿طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ﴾ خۆراکی کەسـانی تاوانبارە
(کافرە) ﴿٤٤﴾ ﴿كَٱلْمُهْلِ﴾ وەکو خڵتەی ڕۆن زەیتوون ﴿يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ﴾ لەناو سکەکاندا دەکوڵێت ﴿٤٥﴾
﴿كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ﴾ هـەر وەکو کوڵانی ئـاوی زۆر گەرم ﴿٤٦﴾ ﴿خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ﴾ (ئـەو کافرە) بیگرن و
بەتوندی ڕای کێشن ﴿إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ﴾ تا (دەیبەنە) ناوەڕاستی دۆزەخ ﴿٤٧﴾ ﴿ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ﴾
پاشـان بیـرژن بەسـەر سـەریدا ﴿مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ﴾ هەنـدێ لـە ئاگر و ئـاوی زۆر گـەرم ﴿٤٨﴾ ﴿ذُقْ﴾
(پێـی دووترێت) بیچێژە ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ﴾ (بەگاڵتـە پێکردنێکەوە پێی دەوترێت)چونکە
بەڕاسـتی تۆ بە دەسـەڵات و بەڕێز بوویت ( لەدونیادا) ﴿٤٩﴾ ﴿إِنَّ هَـٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ﴾ بێگومان ئەمە
ئـەو سـزایەیە کەئێـوە گومانتان لێـی هەبـوو ﴿٥٠﴾ ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ﴾ بەڕاسـتی پارێزکاران
ولەخواترسان لە شوێنێکی بێوەیی و ئارام دان ﴿٥١﴾ ﴿فِى جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ﴾ لەناو باخات و نزیك کانیاودان
﴿٥٢﴾ ﴿يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ﴾ لـە ئاوریشـمی ناسـك و ئەسـتور دەپۆشـن ﴿مُّتَقَـٰبِلِينَ﴾
ڕوبەڕووی یەکتری دادەنیشـن ﴿٥٣﴾ ﴿كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَـٰهُم بِحُورٍ عِينٍ﴾ هەروەها کیژانی چاوگەورە وجوان
دەکەینە هاوسـەریان ﴿٥٤﴾ ﴿يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَـٰكِهَةٍ﴾ لەو بەهەشتەدا هەموو جۆرە میوەیەك داوا دەکەن
﴿ءَامِنِينَ﴾ بەئاسـوودەیی و بێوەیـی ﴿٥٥﴾ ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ﴾ لـە بەهەشـتدا هەرگیـز مردن
ناچەژن ﴿إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ﴾ جگە لەمردنی یەکەم جار (کەلە دونیادا بوو) ﴿وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾
وە (خوا) لەسـزای دۆزەخ پاراسـتوونی ﴿٥٦﴾ ﴿فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ﴾ ئەمە بەخششـە لەلایەن پەروەردگارتەوە
﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ ئـا ئەوەیـە سـەرکەوتنی زۆر گەورە ﴿٥٧﴾ ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَـٰهُ بِلِسَانِكَ﴾ جا بەڕاسـتی
ئـەم قورئانەمـان لەسـەر زمانی تۆ ئاسـان کـردووە ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بـۆ ئـەوەی بیربکەنەوە ﴿٥٨﴾
﴿فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ﴾ ئیتر تۆ چاوەڕوان بە، بێگومان ئەوانیش چاوەڕوانن ﴿٥٩﴾

## سورەتی ﴿الجاثية﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿حمٓ﴾ بە (حا میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بەواتاکەی ،بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای
سورەتی (البقرة) بکە ﴿١﴾ ﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ هێنا نە خوارەوەی ئەم قورئانە ﴿مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ لەلایەن
خوای باڵادەستی کاردروستەوەیە ﴿٢﴾ ﴿إِنَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ بێگومان لە ئاسمانەکان و زەویدا
﴿لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ چەندەها بەڵگە هەیە بۆ باوەڕداران ﴿٣﴾ ﴿وَفِي خَلۡقِكُمۡ﴾ وە لە دروست کردنی خۆتان دا
﴿وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ﴾ وە ئەو گیان لەبەرانەی بڵاودەبنەوە ﴿ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ﴾ چەند بەڵگە هەیە بۆ کەسانێ
باوەڕی بتەویان هەیە ﴿٤﴾ ﴿وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ وە لە جیاوازی شەو و ڕۆژدا ﴿وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزۡقٖ﴾
وە لەو بارانەی کەخوا لەئاسمانەوە دەیبارێنێت (کە هۆی ڕزق و ڕۆزی یە) ﴿فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا﴾ کە
بەهۆیەوەزەوی زیندوودەکاتەوە (ودەبووژێنێتەوە) ﴿وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ﴾ وەلە گۆڕانی بایەکاندا ﴿ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ
يَعۡقِلُونَ﴾ چەند بەڵگەهەیە بۆ کەسانێ کەتێ دەگەن ﴿٥﴾ ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ﴾ ئائەمانە بەڵگەکانی خوان
﴿نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۖ﴾ دەیخوێنینە وە بۆت بەڕاستی و دروستی ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ﴾ جا بە چی قسە و گوفتارێك
﴿بَعۡدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤۡمِنُونَ﴾ دوای خواو بەڵگەکانی باوەڕ دەهێنن ﴿٦﴾ ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ﴾ سزاو لەناوچوون
بۆ هەموو درۆزنێکی گوناهبار ﴿٧﴾ ﴿يَسۡمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کە بەڵگەکانی خوا دەبیستێت ﴿تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ﴾
وبۆی دەخوێنرێتەوە ﴿ثُمَّ يُصِرُّ مُسۡتَكۡبِرٗا﴾ لەپاشان (لەسەر کافری) بەردەوامە چونکە خۆیەزل زانە
﴿كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَاۖ﴾ ئەڵێی هەر نەی بیستووە ﴿فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ دەی مژدەی پێ بدە بەسزا یەکی سەخت
﴿٨﴾ ﴿وَإِذَا عَلِمَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا شَيۡـًٔا﴾ وە هەرکاتێ شتێك لەبەڵگە کانمان ئاگادار بێت ﴿ٱتَّخَذَهَا هُزُوًاۚ﴾ بەگاڵتەی
دەگرێ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ ئەوانە سزای ڕیسواکەریان بۆ هەیە ﴿٩﴾ ﴿مِّن وَرَآئِهِمۡ جَهَنَّمُۖ﴾ لە پێشیانەوە
ئاگری دۆزەخە ﴿وَلَا يُغۡنِي عَنۡهُم﴾ هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ ﴿مَّا كَسَبُواْ شَيۡـٔٗا﴾ ئەوەی لە(دونیا)دا
کردوویانە ﴿وَلَا مَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَۖ﴾ وە ئەو پشتیوانانەی جگە لەخوا هەڵیان بژاردون (سوودی
نی یە) ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ وە سزایەکی زۆر گەورەیان بۆ هەیە ﴿١٠﴾ ﴿هَٰذَا هُدٗىۖ﴾ ئەم قورئانە هۆی
ڕێنموونیی یە ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕن بە ئایەت و بەڵگەکانی پەروەردگاریان
﴿لَهُمۡ عَذَابٞ مِّن رِّجۡزٍ أَلِيمٌ﴾ بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی پڕ ئازاری سەخت ﴿١١﴾ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡبَحۡرَ﴾ خوا
ئەو زاتەیە دەریای بۆ ڕام هێناون ﴿لِتَجۡرِيَ ٱلۡفُلۡكُ فِيهِ بِأَمۡرِهِۦ﴾تا بەفەرمانی خوا کەشتی تیایدا بگەڕێ
﴿وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ وە تا لەهەندێك بەخششی خوا بەهرەمەند ببن ﴿وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ وە بۆ ئەوەی
سوپاسی خوا بکەن ﴿١٢﴾ ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ وە ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوی دا
هەیە بۆ ئێوەی ژێربار کردووە (وخستویەتیە خزمەتتانەوە) ﴿جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ﴾ هەمووی لەلایەن خواوەیە
﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بێگومان لەو شتانەدا چەند بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیر
بکەنەوە ﴿١٣﴾

﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بڵێ بەو کەسانەی بڕوایان هێناوە ﴿يَغْفِرُواْ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ﴾ چاو پۆشی بکەن
لەو کەسانەی هیوایان بە پاداشت و سزای خوا نیە ﴿لِيَجْزِيَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ بۆ ئەوەی پاداشتی
خەڵکانێ بداتەوە بەگوێرەی ئەوەی کردوویانە (١٤) ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ﴾ هەرکەسێ چاکەی کرد
ئەوە (قازانجەکەی) بۆ خۆیەتی ﴿وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا﴾ وە هەرکەسێ خراپەی کرد ئەوە (زیانەکەی)
بۆ خۆیەتی ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾ لەپاشان بۆلای پەروەردگارتان دەگەڕێنرێنەوە (١٥) ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا
بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان بە نەوەی ئیسرائیلمان بەخشی ﴿ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ﴾ پەیام
و حوکمڕانی و پێغەمبەرایەتی ﴿وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ وە ڕۆزیمان دان لە شتە حەڵاڵ و پاکەکان
﴿وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ وە ڕێزمان دان بەسەر جیهانیاندا (١٦) ﴿وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ﴾ وە بەڵگە
ڕوونەکانمان پێدان لە بارەی شەریعەتەوە ﴿فَمَا ٱخْتَلَفُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ﴾ جا جیاواز نەبوون
لەنێو خۆیاندا دوای ئەوە نەبێت زانستیان بۆهات ﴿بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ﴾ لەبەر دوژمنایەتی و حەسادەتی نێوان
خۆیان ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ بێگومان پەروەردگارت لەڕۆژی هەستانەوەدا لە نێوانیاندا
دادوەری دەکات ﴿فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ لەو شتانەی جیاوازیان تێدا دەکرد (١٧) ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ
شَرِيعَةٍ﴾ لە پاشان تۆمان خستەسەر شەریعەتێك ﴿مِّنَ ٱلْأَمْرِ﴾ لە بارەی ئایینەوە ﴿فَٱتَّبِعْهَا﴾ تۆش
شوێنی بکەوە ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ وە شوێن هەواو ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن
(١٨) ﴿إِنَّهُمْ لَن يُغْنُواْ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ بێگومان ئەوانە لەلایەن خواوە هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنن
﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ﴾ وە بەڕاستی ستەم کاران هەندێکیان دۆست و پیشتیوانی هەندێکیانن
﴿وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ وەخوا دۆست و پشتیوانی پارێزکاران ولەخواترسانە (١٩) ﴿هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ﴾ ئەم
قورئانە بینایيە وهۆی چاوڕشنی یە بۆ مەردومان ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ وە ڕێنموونیی و میهرەبانیە
بۆ گەلێك کەباوەڕی پتەویان هەیە (٢٠) ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ ئایا ئەوانەی کە خراپەکانیان
کردووە وا گومان دەبەن ﴿أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئێمە ئەوانە وەکو کەسانێك دادەنێن
کەبڕوایان هێناوە و چاکەکانیان کردووە ﴿سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ﴾ وەکو یەك بێت ژیانیان و مردنیان
﴿سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ ئای چەند خراپ دادوەری دەکەن (٢١) ﴿وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾
وەخوا ئاسمانەکان و زەوی بەهەق و ڕاستی دروست کردووە ﴿وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ﴾ بۆ ئەوەی
هەموو کەسێك پاداشت بدرێتەوە ﴿بِمَا كَسَبَتْ﴾ بەگوێرەی ئەو کار و کردەوانەی کە کردوویەتی
﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ وە ئەوان هیچ ستەمیان لێ ناکرێت (٢٢)

﴿أَفَرَءَيْتَ﴾ ئاخۆ بینیوتە ﴿مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾ ئەو كەسەی هەواو ئارەزووی خۆی كردۆتە پەرستراوی
خۆی ﴿وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾ خواش بەزانایی گومڕای كرد ﴿وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ﴾ وە مۆری ناوە بەسەر
گوێ و دڵیدا ﴿وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً﴾ وە پەردەی داوە بەسەرچاویدا ﴿فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ﴾ دەی جگە
لە خوا كێ ڕێنموونیی دەكات ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی بۆچی بیر ناكەنەوە (٢٣) ﴿وَقَالُوا۟ مَا هِىَ﴾ وە ووتیان
هیچ نیە ﴿إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا﴾ جگە لە ژیانی دونیامان ﴿نَمُوتُ وَنَحْيَا﴾ وە دەمرین و دەژین ﴿وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ﴾
وە جگە لە ڕۆژگار هیچ شتێ ئێمە لەناو نابات ﴿وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ﴾ وە ئەوانە بەو قسانە هیچ زانیاریان
نی یە ﴿إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ تەنها گومان دەبەن (٢٤) ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ وە كاتێك بخوێنرێتەوە بەسەریاندا
﴿ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾ بەڵگە ڕوونەكانمان ﴿مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ﴾ هیچ بەڵگەیەكیان نیە ﴿إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ﴾ جگە
ئەوە كە دەڵێن باووباپیرانمان زیندووبكەنەوە ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن (٢٥) ﴿قُلِ ٱللَّهُ
يُحْيِيكُمْ﴾ بڵێ: خوا زیندووتان دەكاتەوە ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ لەپاشان دەتان مرێنێت ﴿ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ﴾ پاشان
كۆتان دەكاتەوە ﴿إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لە ڕۆژی دواییدا ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ هیچ گومانی تێدا نیە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا
يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی مەردوومان نازانن (٢٦) ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ وە بۆ خوایە موڵكداریتی
ئاسمانەكان و زەوی ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ﴾ ئەو ڕۆژەی قیامەت هەڵدەستێ ﴿يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾ لەو
ڕۆژەدا بەتاڵ خوازەكان خەسارۆمەندن (٢٧) ﴿وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً﴾ هەموو گەلێ دەبینی كۆمەڵ كۆمەڵ
كەوتوون بەسەر ئەژنۆدا ﴿كُلُّ أُمَّةٍ﴾ هەموو گەلێ ﴿تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا﴾ بانگ دەكرێ بۆلای پەڕاوەكەی
﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ﴾ ئەمڕۆ سزاو پاداشت دەدرێنەوە ﴿مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بە گوێرەی ئەو كردەوانەی كە دەتانكرد
(٢٨) ﴿هَٰذَا كِتَٰبُنَا﴾ ئەمە پەڕاوەكەمانە ﴿يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ﴾ بەڕاستی لەسەرتان دەدوێ ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ﴾
بەڕاستی ئێمە وەك خۆی نوسیومانەتەوە (وێنەمان گرتووە) ﴿مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەوەی كە ئێوە دەتانكرد (٢٩)
﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ جا ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وكردەوە چاكەكانیان ئەنجامداوە
﴿فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ﴾ ئەوە پەروەردگاریان دەیانخاتە ناو میهرەبانی خۆیەوە ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ
ٱلْمُبِينُ﴾ ئا ئەوەیە سەركەوتنی ئاشكرا (٣٠) ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ وە ئەوانەی بێ بڕوابوون ﴿أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ
عَلَيْكُمْ﴾ (پێیان دەڵێن) ئاخۆ بەڵگەكانی ئێمەتان بەسەردا نەدەخوێنرایەوە ﴿فَٱسْتَكْبَرْتُمْ﴾ كەچی خۆتان
بە گەورە دەزانی ﴿وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ﴾ وە ئێوە گەلێكی تاوانبار بوون (٣١) ﴿وَإِذَا قِيلَ﴾ وە هەر كاتێ
بووترایە ﴿إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾ بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە ﴿وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا﴾ وە ڕۆژی دوای هیچ
گومانی تێدا نیە ﴿قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ﴾ دەتان ووت نازانین ڕۆژی دوایی چی یە ﴿إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا﴾ ئێمە
تەنیا گومان دەبەین ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ﴾ وە ئێمە دڵنیانین (٣٢)

﴿وَبَدَا لَهُمْ﴾ وە دەردەکەویت بۆیان ﴿سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا﴾ ئەو خراپانەی کە کردویانە ﴿وَحَاقَ بِهِم﴾ وە دەوریان دەدا ﴿مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ تۆڵەی ئەوەی گاڵتەیان پێ دەکرد ﴿٣٣﴾ ﴿وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ﴾ پێیان دەووترێ ئەمڕۆ لەبیرتان دەکەین ﴿كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا﴾ هەر چۆنێ ئێوە ئەم ڕۆژەتان لەبیر چوو بوو ﴿وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ﴾ وە جێگای مانەوەی ئێوە دۆزەخە ﴿وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾ و هیچ یارمەتی دەرێکتان نی یە ﴿٣٤﴾ ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ﴾ ئەمە لەبەرئەوەیە بێگومان ئێوە ﴿اتَّخَذْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا﴾ بەڵگەکانی خواتان بەگاڵتە دانا بوو ﴿وَغَرَّتْكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ وە ژیانی دونیا فریوی دان ﴿فَالْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا﴾ جا ئەمڕۆ لەو دۆزەخەدا دەرناهێنرێن ﴿وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾ وەرێگە نادرێن داوای لێبوردنیش بکەن ﴿٣٥﴾ ﴿فَلِلَّهِ الْحَمْدُ﴾ جا هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوای ﴿رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَرَبِّ الْأَرْضِ﴾ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی ﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ و پەروەردگاری جیهانیان ﴿٣٦﴾ ﴿وَلَهُ الْكِبْرِيَاءُ﴾ وە دەسەڵات و گەورەی تەنها بۆ ئەوە ﴿فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لەهەموو ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ وە هەر ئەو زاڵ وباڵادەست ودانا وکار سازە ﴿٣٧﴾

## سورەتی ﴿ الأَحْقَافِ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿حم﴾ بە (حا، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿١﴾ ﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ﴾ ئەم قورئانە هێنراوەتە خوارەوە ﴿مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ لەلایەن خوای زاڵی باڵادەستی کاربەجێوە ﴿٢﴾ ﴿مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندایە دروستمان نەکردووە ﴿إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ مەگەر بە هەق و ڕاستی و بۆ کاتێکی دیاری کراو نەبێت ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾ کەچی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ﴾ لەوەی کە پێ ی ترسێنرابوون ڕوو وەردەگێڕن ﴿٣﴾ ﴿قُلْ أَرَأَيْتُم﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ پێم بڵێن ﴿مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ ئەو شتانەی ئێوە دەیانپەرستن جگە لە خوا ﴿أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ﴾ پیشانم بدەن لە زەویدا چیان دروست کردووە ﴿أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ﴾ یان لە(دروست کردنی) ئاسمانەکاندا بەشداریان کردووە ﴿ائْتُونِي بِكِتَابٍ﴾ دەی پەڕاوێکم بۆ بهێنن ﴿مِّن قَبْلِ هَٰذَا﴾ لە پێش ئەم (قورئانە هاتبێ) ﴿أَوْ أَثَارَةٍ مِّنْ عِلْمٍ﴾ یان زانیاریەك كە لە پێشووان بەجێ مابێت ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست گۆن ﴿٤﴾ ﴿وَمَنْ أَضَلُّ﴾ کێ گومڕاترە ﴿مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن﴾ لەو کەسەی کە هاوار لەغەیری خوا بکات ﴿لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ﴾ کە وەڵامی ناداتەوە ﴿إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ تا ڕۆژی دوایی ﴿وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ﴾ وە ئەو (هاوار لێکراو)انە لە هاواری ئەوان ﴿غَافِلُونَ﴾ بێ ئاگان ﴿٥﴾

﴿وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ﴾ کاتێکیش خەڵك کۆدەکرێنەوە (لەقیامەت) دا ﴿كَانُواْ لَهُمْ أَعْدَآءً﴾ پەرستراوەکان
دەبنە دوژمنیان ﴿وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ﴾ وە(پەرستراوەکان) بەپەرستنەکەیان باوەڕ ناکەن ﴿٦﴾ ﴿وَإِذَا
تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾ کاتێکیش ئایەتە ڕوونەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾
ئەوانەی بێ باوەڕبوون دەڵێن ﴿لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ﴾ بەو قورئانەی بۆیان دێت ﴿هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەمە
جادوویەکی ئاشکرا و دیارە ﴿٧﴾ ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ﴾ یان دەڵێن (موحەممەد ﷺ) خۆی ئەم قورئانەی
هەڵبەستووە ﴿قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەگەر خۆم هەڵم بەستبێ (خوا سزای بەتینم
دەدات) ﴿فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ ئەوسا ئێوەش لەبەرانبەر خوادا بۆ من هیچتان لە دەست نایەت
﴿هُوَ أَعْلَمُ﴾ خوا چاك دەزانێ ﴿بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ﴾ بەو توانجانەی دەیدەن لەقورئان ﴿كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا﴾ ئەو
خوایە بەسە کەشایەت بێت ﴿بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ﴾ لە نێوان من و ئێوەدا ﴿وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ هەر ئەوە لێبوردەی
میهرەبان ﴿٨﴾ ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾ بڵێ من یەکەم پێغەمبەر نیم (نێرراوم) ﴿وَمَآ أَدْرِى﴾ ناشزانم
﴿مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ﴾ چی بەسەر من و ئێوەش دەهێنرێ ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ﴾ تەنها پەیڕەوی ئەوە دەکەم
کە وەحی دەکرێت بۆم ﴿وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ وەمن تەنها ترسێنەرێکی ئاشکرام و بەس ﴿٩﴾ ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾
(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ پێم بڵێن ﴿إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەگەر (ئەم قورئانە) لەلایەن خواوە بێ
﴿وَكَفَرْتُم بِهِۦ﴾ ئێوەش باوەڕتان پێ نەهێنابێ ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ وە کەسێك لە نەوەی
ئیسرائیل شایەتی دابێت ﴿عَلَىٰ مِثْلِهِۦ﴾ لەسەر وێنەی (ئەوەی وا لە) قورئاندا هەیە ﴿فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ﴾
جا باوەڕی هێنابێت، کەچی ئێوە خۆتان بە گەورەزانی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومان
خوا ڕێنموونیی گەلی ستەمکاران ناکات ﴿١٠﴾ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی بێ باوەڕن دەڵێن
﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ دەربارەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿لَوْ كَانَ خَيْرًا﴾ ئەگەر (ئیسلام و باوەڕ هێنان) چاك بوایە
﴿مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ﴾ ئەوانە پێش ئێمە نەدەکەوتن بۆ ئەو (باوەڕ هێنانە) ﴿وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُواْ بِهِۦ﴾ چونکە خۆیان
بەو (قورئانە) ڕێنموون نەبوون ﴿فَسَيَقُولُونَ﴾ جا دواتر دەڵێن ﴿هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ﴾ ئەمە دەس هەڵبەسێکی
کۆنە ﴿١١﴾ ﴿وَمِن قَبْلِهِۦ﴾ وە لەپێش ئەم (قورئانە)دا ﴿كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً﴾ تەوراتی مووسا پێشەوا
و ڕەحمەت بوو ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ﴾ ئەم قورئانەش (کتێبەکانی پێش خۆی) بەڕاست دادەنێت
﴿لِّسَانًا عَرَبِيًّا﴾ کە بەزمانی عەرەبی یە ﴿لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ تاستەمکاران بترسێنێ ﴿وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ﴾
وە بۆ چاکەکاران مژدە بێ ﴿١٢﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە دەڵێن پەروەردگارمان
(الله) یە ﴿ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ﴾ پاشان بەردەوام بوون (لەسەر باوەڕەکەیان) ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾
ئەوە نەترسیان لەسەرە و نەخەفەتیش دەخۆن ﴿١٣﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ﴾ ئەوانە هاوەڵانی بەهەشتن
﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ لەپاداشتی ئەو کردەوانەی کە دەیانکرد
(لەدونیادا) ﴿١٤﴾

﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ﴾ وە ئێمـە ئامۆژگاری ئادەمیی مان کرد ﴿بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا﴾ بە چاکە کردن لەگەڵ دایك
و باوکی دا ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا﴾ دایکی بە ناڕەحەتی و ئازارەوە هەڵی گرتووە ﴿وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا﴾ وە بەئازار
و ناڕەحەتیش بوویەتی ﴿وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا﴾ ماوەی دووگیان بوون (ی دایك) پـێ یەوە و لە
شیر بڕینەوەی سی مانگە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ﴾ تا دەگاتە تافی لاوی (پێ گەیشتوی لاشەیی و ژیری)
﴿وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً﴾ و دەگاتـە چـل سـاڵی ﴿قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ﴾ دەڵـێ ئـەی پەروەردگـار ڕام بهێنـە
﴿أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ﴾ تا شوکرانە بژێری ئەو بەهرە و نیعمەتانەت بکەم ﴿أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ﴾ کە ڕشتوتە
بەسەر من و دایك و باوکم دا ﴿وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ﴾ وە (ڕام بهێنە) کردەوەی چاك بکەم کە تۆ پێی ڕازی بیت
﴿وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ﴾ نەوەکانیشـم چاك و صالح بکە ﴿إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ﴾ بێگومـان بۆلای تۆ گەڕاومەتەوە
﴿وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ وە بەڕاستی من لەموسوڵمانی گەردن کەچم ﴿١٥﴾ ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە کەسانێکن
﴿نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟﴾ کە ئێمە کـردەوە چاکەکانیان لێ وەردەگرین ﴿وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ﴾ وە
چاوپۆشـی دەکەیـن لـە خراپەکانیان ﴿فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ﴾ لـە ڕیزی بەهەشـتیاندان ﴿وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى﴾
ئەمە ئەو بەڵێنە ڕاسـتەیە ﴿كَانُوا۟ يُوعَدُونَ﴾ کە بەڵێنیان پێ درابوو لەدونیادا ﴿١٦﴾ ﴿وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ﴾ ئەو
کەسـەش کە بەباوك و دایکی بڵێت ﴿أُفٍّ لَّكُمَآ﴾ ئۆف لە دەس ئێوە ﴿أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ﴾ ئایا هەڕەشـەم
لـێ دەکـەن کە (زیندوو دەکرێمەوە و لە گۆڕ) دێمە دەرەوە ﴿وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى﴾ لەکاتێکدا چەند
چین خەڵك پێش من ڕۆیشتوون (و زیندوو نەبوونەتەوە) ﴿وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ﴾ وە (دایکی و باوکی)
هەردووکیان هانا بۆ خوا دەبەن ﴿وَيْلَكَ ءَامِنْ﴾ (دەڵێن) هاوار بۆ تۆ باوەڕ بهێنە ﴿إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾ بێگومان
بەڵێنی خوا ڕاسـتە ﴿فَيَقُولُ﴾ کەچی ئەو دەڵێ ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئەمە تەنها ئەفسانەی پێشینانە و
هیچی تر ﴿١٧﴾ ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە ئەو کەسـانەن ﴿حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ﴾ بڕیار(ی خوا) یان بەسەردا چەسپا
﴿فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم﴾ لـە ڕیـزی ئـەو ئوممەتانەدا کە پێـش ئەمان ڕابـوردوون ﴿مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ﴾ لە
جنۆکەو ئادەمیـی ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ﴾ بێگومان ئەوانە خۆیـان زەرەرمەندن ﴿١٨﴾ ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟﴾
وە بـۆ هەریـەك لەوانە پلە و پایـە هەیە بە گوێـرەی کردەوەکانیان ﴿وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ تا خوا پاداشـت
و سـزای کردەوەکانیـان بـە تـەواوی بداتەوە ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ وە ئەوان هیچ سـتەمیان لـێ ناکرێت ﴿١٩﴾
﴿وَيَوْمَ﴾ وە (بیریـان بخـەرەوە) ئەو ڕۆژەی ﴿يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ﴾ ئەوانەی کـە بێ باوەڕن بەرانبەر
دۆزەخ ڕادەگیرێن ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ﴾ (پێیان دەووترێت) هەرچی خۆشیتان بوو بەسەرتان برد ﴿فِى حَيَاتِكُمُ
ٱلدُّنْيَا﴾ لـە ژیانـی دونیاتانـدا ﴿وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا﴾ وەلەزەتتان لێ برد و(ڕاتان بـوارد) ﴿فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ﴾ بۆیە
ئەمڕۆ تۆڵەتان لێ دەسـەنرێ ﴿عَذَابَ ٱلْهُونِ﴾ بەسـزایەکی ڕیسواکەر ﴿بِمَا كُنتُمْ﴾ لەبەر ئەوەی کە ئێوە
﴿تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ بـە ناهـەق خۆتـان بـە زل دەزانی لـە زەوی دا ﴿وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ﴾ وە
لەبەر ئەوەی لە فەرمانی خوا دەردەچوو بوون ﴿٢٠﴾

﴿وَٱذْكُرْ أَخَا عَادٍ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) باسی (هوودی ) برای گەلی عاد بکە ﴿إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِٱلْأَحْقَافِ﴾
کاتێ گەلەکەی ترساند لە (وولاتی ) ئەحقاف ﴿وَقَدْ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ﴾ بێگومان پێغەمبەرانی زۆر ڕابوردوون
﴿مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ﴾ لە پێش و دوای ئەویشەوە ﴿أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ (ووتوویانە) جگە لەخوا هیچی
تر نەپەرستن ﴿إِنِّىٓ أَخَافُ﴾ بێگومان من دەترسم ﴿عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ لەسزای ڕۆژێکی گەورە بۆ ئێوە
(پێش بێ) ﴿٢١﴾ ﴿قَالُوٓاْ﴾ (گەلەکەی) ووتیان ﴿أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا﴾ ئایا تۆ (ئەی هوود) هاتوویت هەتا لامان
بدەیت ﴿عَنْ ءَالِهَتِنَا﴾ لە(پەرستنی) پەرستراوەکانمان ﴿فَأْتِنَا﴾ دەی بۆمان بهێنە ﴿بِمَا تَعِدُنَآ﴾ ئەو (سزا)
ی بەڵێنت پێ داووین ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەگەر لە ڕاست گۆیانیت ﴿٢٢﴾ ﴿قَالَ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ﴾
(هوود) ووتی بێگومان زانیاری (ئەو سزا) لای خوایەوە بەس ﴿وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦ﴾ وەمن تەنها
ئەوەی پێی نێردراوم پێتان ڕادەگەیەنم ﴿وَلَٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ﴾ بەڵام من دەبینم ئێوە ﴿قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾ گەلێکی
نەزان و نەفامن ﴿٢٣﴾ ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا﴾ جا کاتێ ئەو (سزایە)یان بینی پەڵە هەورێك بوو ﴿مُّسْتَقْبِلَ
أَوْدِيَتِهِمْ﴾ بەرەو شیوەکانیان دێ (دڵخۆش بوون) ﴿قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا﴾ ووتیان ئەمە هەورێکە
بارانی پێیە بۆمان ﴿بَلْ هُوَ مَا ٱسْتَعْجَلْتُم بِهِۦ﴾ (هوود ووتی نەخێر) بەڵکو ئەوە ئەو (سزایە) یە بەپەلە داواتان
دەکرد ﴿رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بایەکی بەهێزە سزای سەختی پێیە ﴿٢٤﴾ ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَىْءٍۭ بِأَمْرِ رَبِّهَا﴾ بەفەرمانی
پەروەردگاری هەموو شتێك دەڕوخێنێ ﴿فَأَصْبَحُواْ﴾ ئیتر وایان بەسەرهات ﴿لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمْ﴾
تەنها شوێنی خانووەکانیان دەبینرا ﴿كَذَٰلِكَ﴾ هەر بەو جۆرە ﴿نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ سزای هۆزی
تاونباران دەدەین ﴿٢٥﴾ ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمْ فِيهِ﴾ سوێند بەخوا ئەوەی بەوان (گەلی عاد) مان
دابوو (لەسامان و دەسەڵات) بە ئێوەمان نەدابوو ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً﴾ وە گوێ و چاوو
دڵمان پێدابوون ﴿فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ﴾ بەڵام سوود و کەڵکی پێ نەگەیاندن ﴿سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم﴾
نە گوێ و نە چاوو نە دڵیان ﴿مِّن شَىْءٍ﴾ هیچ شتێك ﴿إِذْ كَانُواْ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ چونکە ئەوان باوەڕیان
بەنیشانەکانی خوا نەبوو ﴿وَحَاقَ بِهِم﴾ وە دەوری دان ﴿مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ ئەو سزای گاڵتەیان پێ
دەکرد ﴿٢٦﴾ ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا﴾ وە بێگومان لەناومان برد ﴿مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ﴾ (دانیشتووانی) ئەو شار و
دێهاتانەی کە بەدەورو بەرتان دابوون ﴿وَصَرَّفْنَا ٱلْـَٔايَٰتِ﴾ وە بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆرمان نیشان
دان ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ تا (لەبێ باوەڕی) بگەڕێنەوە ﴿٢٧﴾ ﴿فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ﴾ دەی بۆچی یارمەتی نەدان
﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرْبَانًا ءَالِهَةًۢ﴾ ئەوانەی جگە لەخوا بۆ نزیك بوونەوە لەخوا کردبوونیانە
پەرستراوی (خۆیان) ﴿بَلْ ضَلُّواْ عَنْهُمْ﴾ (نەك یارمەتیان نەدان) بەڵکو گومیش بوون لێیان
﴿وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ ئەوە بوو (بەرهەمی پەرستراوە) درۆکەیان و ئەو درۆیانەی هەڵیان
دەبەستن ﴿٢٨﴾

﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾ وە (بیریان خەرەوە) کاتێك چەند جنۆ کەیەکمان نارد بۆ لات ﴿يَسْتَمِعُونَ
ٱلْقُرْءَانَ﴾ تا گوێ لەقورئان بگرن ﴿فَلَمَّا حَضَرُوهُ﴾ جاکاتێك ئامادەی گوێ گرتن لە قورئان بوون ﴿قَالُوٓا۟
أَنصِتُوا۟ۖ﴾ ووتیـان (بەیەکتری) بێ دەنگ بن (و گـوێ بگرن) ﴿فَلَمَّا قُضِىَ﴾ جا کە (قورئان خوێندنەکە)
تـەواو بـوو ﴿وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ﴾ هەموویـان گەڕانەوە بۆلای قـەوم و هۆزەکەیان بەترسـێنەر ﴿٢٩﴾
﴿قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ﴾ ووتیان ئەی هۆزو قەومەکەمان ﴿إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا﴾ بەڕاستی ئێمە گوێ بیستی کتێبێك
بووین ﴿أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ﴾ کە لەپاش مووسـا نێردراوەتە خوارەوە ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ بەڕاوەکانی
پێش خۆی بەڕاسـت دادەنێ ﴿يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ (خەڵك) ڕێنموونی دەکات بۆ هەق و
ڕێبازی ڕاستی ﴿٣٠﴾ ﴿يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ﴾ ئەی قەومەکەمان وەڵامی بانگخوازی خوا (موحەممەدﷺ)
بدەنـەوە ﴿وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ﴾ و بـاوەڕی پێ بێنن ﴿يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ﴾ (خوا) لـە تاوانەکانتان خۆش دەبێ
و دەیسـڕێتەوە ﴿وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ وە لەسـزای سـەخت دەتان پارێزێ ﴿٣١﴾ ﴿وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ﴾
هەرکەسـیش وەڵامـی بانگخوازی خوا (کـە موحەممـەدە ﷺ) نەداتەوە ﴿فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەو
بەهیچ جۆرێك ناتوانێ لە زەوی دا لە دەست خوا دەرچێ و خۆی قوتار کات ﴿وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ﴾
وە جگـە لەخـوا یارمەتیدەر و پشـتیوانیکی نی یـە ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ ئا ئەوانە لـە گومڕایی یەکی
ئاشـکرادان ﴿٣٢﴾ ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟﴾ ئایـا ئەوانـە نەیـان زانیـوە ﴿أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ بەڕاسـتی
ئـەو خوایـەی ئاسـمانەکان و زەوی دروسـت کـردووە ﴿وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ وە
لەدروست کردنیاندا ناتوانا و دەستە پاچە نەبووە، وە بەتوانایە مردووانیش زیندوو بکاتەوە ﴿بَلَىٰٓ﴾ بەڵێ
﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە ﴿٣٣﴾ ﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ﴾
وە ڕۆژێك بێ باوەڕان بەرانبەر دۆزەخ ڕادە گیرێن ﴿أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ﴾ (پێیان دەڵێن) ئایا ئەمە ڕاست نی یە
﴿قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا﴾ دەڵێن: بەڵێ سوێند بەپەروەردگارمان ڕاستە ﴿قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ﴾ (خوا) دەفەرموێ:
دەی ئـەو سـزایە بچەژن ﴿بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ چونکە ئێـوە باوەڕتان پێ نەدەکـرد ﴿٣٤﴾ ﴿فَٱصْبِرْ﴾ کەواتە
خۆ گربـە (ئەی موحەممـەد ﷺ) ﴿كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾ هەروەکـو پێغەمبەرانـی خۆڕاگری
بەهێز دانیان بەخۆ داگرت ﴿وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ﴾ وە پەلە مەکە بۆ (سزادان)یان ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ﴾
ئەو ڕۆژەی کە (سـزای) بەڵێـن پێدراو یان دەبینن وا دەزانن ﴿لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ﴾ تەنها سـاتێك
لـەڕۆژ لـە دونیـادا ماونەتەوە ﴿بَلَٰغٌ﴾ (ئـەم قورئانە) ئاگـاداری یە ﴿فَهَلْ يُهْلَكُ﴾ جا ئایـا کەس لەناو
دەچێت ﴿إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ جگە لە گەلی لەسنوور دەرچوو نەبێت ﴿٣٥﴾

## سورەتی ﴿ مُحَمَّد ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەو کەسانەی بێ باوەڕ بوون ﴿وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وە ڕێگری (خەڵك)یان کرد لەڕێبازی
خوا ﴿أَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ (خوا) کردەوەکانیان پوچەڵ دەکاتەوە ﴿١﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەش باوەڕیان هێناوە
﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وکردەوە چاکەکانیان کردو ﴿وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٖ﴾ باوەڕیشیان هێنا بەو (قورئانە) ی کە
نێردراوەتە خوارەوە بۆ موحەممەد (ﷺ) ﴿وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ تەنها ئەویش ڕاستەو لەلایەن پەروەردگاریانەوە
هاتووە ﴿كَفَّرَ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ﴾ خوا لە گوناهەکانیان خۆش بووە ﴿وَأَصۡلَحَ بَالَهُمۡ﴾ دڵ و هۆشیانی ڕێك و چاك
کردوە ﴿٢﴾ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوەش لەبەر ئەوەیە بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿ٱتَّبَعُواْ ٱلۡبَٰطِلَ﴾ شوێن
بەتاڵ و پڕو پووچ کەوتن ﴿وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ و بێگومان ئەوانەش ئیمانیان هێنا بوو ﴿ٱتَّبَعُواْ ٱلۡحَقَّ مِن رَّبِّهِمۡۚ﴾ شوێن
ئەو هەقە کەوتبوون کە لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتووە ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئابەو شێوە ﴿يَضۡرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمۡثَٰلَهُمۡ﴾
خوا نموونەی (کردەوەی) خۆیانیان بۆ دەهێنێتەوە ﴿٣﴾ ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەمجا ئەگەر (لە جەنگدا) گەشتن
بەوانەی بێ باوەڕن ﴿فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ﴾ ئەوە بدەن لە گەردنیان و بیانکوژن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ﴾ هەتا کاتێ کوشتاری
زۆریان لێ دەکەن ﴿فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ﴾ ئەمجا (دیلەکانیان) قایم ببەستەنەوە ﴿فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ﴾ جا دواتر یان بەمنەت
وچاکە (بەرەڵایان کەن) ﴿وَإِمَّا فِدَآءً﴾ یان بە فیدیە و بریتی ﴿حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَاۚ﴾ هەتا جەنگ چەکەکان (بە بێ
باوەڕان) دادەنێ (یان تا جەنگ کۆتایی دێت بە نەمانی بت پەرستان) ﴿ذَٰلِكَۖ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ﴾ فەرمان ئەوەیە ئەگەر
خوا بیوویستایە ﴿لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ﴾ خۆی تۆڵەی لێ دەسەندن ﴿وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖۗ﴾ بەڵام (فەرمانی پێدان
بە جەنگ) تا بەیەکتری تاقیتان بکاتەوە ﴿وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەو کەسانەش لە پێناو ڕێبازی خوادا کوژران
﴿فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ ئەوە خوا هەرگیز (پاداشتی) کردەوەکانیان وون ناکات ﴿٤﴾ ﴿سَيَهۡدِيهِمۡ﴾ بێگومان
ڕێنموونیان دەکات ﴿وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ﴾ و دڵ و بیریان پاك ساف دەکات ﴿٥﴾ ﴿وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ﴾ وە دەیانخاتە
ئەوبەهەشتەی بۆی باس کردون ﴿٦﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ﴿إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ﴾
ئەگەر ئێوە یارمەتی (ئایینی) خوا بدەن ﴿يَنصُرۡكُمۡ﴾ خواش ئێوە زاڵ و سەرکەوتوو دەکات (بەسەر کافران دا)
﴿وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ﴾ وە پێیەکانتان جێگیر دەکات (لە جەنگدا خۆڕاگرتان دەکات) ﴿٧﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەش کە
بێ باوەڕ بوون ﴿فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ﴾ ئەوە نەگبەتی و سەرشۆڕی بەشیانە ﴿وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ وە (خوا) کردەوەکانیان پووچ
و بێ مایە دەکات ﴿٨﴾ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ﴾ ئەو تۆڵەیان لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە ﴿كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ڕقیان
لەو قورئانە بوو کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە ﴿فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ بۆیە خواش کردەوەکانیانی پووچ کردنەوە ﴿٩﴾
﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئاخۆ ئەوانە بە زەوی دانە گەڕاون ﴿فَيَنظُرُواْ﴾ تا ببینن ﴿كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ﴾ ئەوانەی
پێش خۆیان سەرەنجامیان چۆن بووە ﴿دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ﴾ خوا لە ناوی بردن ﴿وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا﴾ (دەی بێگومان بن) بۆ
بێ باوەڕانیش سەرئەنجامی ئاوا هەیە ﴿١٠﴾ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ﴾ چونکە بێگومان خوا ﴿مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ پشتیوانی
ئەوانەیە کە باوەڕیان هێناوە ﴿وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ وە بێگومان بێ باوەڕانیش ﴿لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾ هیچ پشتیوانێکیان
نییە ﴿١١﴾

﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بێگومان خوا ﴿يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوەی باشیان
کردوە دەیانخاتە باخاتی بەهەشتەوە ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ﴾ کە ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕوات ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾
ئەوانەش بێ باوەڕ بوون ﴿يَتَمَتَّعُونَ﴾ (لە دونیادا) ڕادەبوێرن و ﴿وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ﴾ وەك ئاژەڵ دەخۆن و
دەلەوەڕێن ﴿وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ﴾ وە دۆزەخ شوێنی مانەوەیانە ﴿١٢﴾ ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ﴾ وە(خەڵکی) زۆر شار هەبوون
﴿هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ﴾ کە بەهێزتر بوون ﴿مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ﴾ لەو(خەڵکی) مەککەیە کە تۆیان دەرکرد ﴿أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ﴾
لە ناومان بردن ﴿فَلَا نَاصِرَ لَهُمۡ﴾ و هیچ پشتیوانێکیان نەبوو ﴿١٣﴾ ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ ئا خۆ ئەو کەسەی
بەڵگەی ڕوونی لە پەروەردگاریەوە بۆ هاتبێ (کە قورئانە) ﴿كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ﴾ وەك ئەو کەس وایە کە
کرداری خراپی بۆ جوان کرابێ و ڕازێنرابێتەوە ﴿وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم﴾ شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتبن
﴿١٤﴾ ﴿مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي﴾ شێوەی نایابی ئەو بەهەشتە وایە ﴿وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ﴾ کە بەڵێن دراوە بە پارێزکاران و خواناسان
﴿فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ﴾ چەندەها ڕووباری تێدایە ﴿مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ﴾ لە ئاوی سازگاری تام و بۆن نەگۆڕاو ﴿وَأَنۡهَٰرٞ﴾
وە چەندەها ڕووبار ﴿مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ﴾ لەشیر کە تامی نەگۆڕاوە ﴿وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ﴾ وە چەندەها ڕووبار
لەشەرابی نایابی ﴿لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ﴾ بەلەزەت و خۆش بۆ بنۆشانی ﴿وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗىۖ﴾ وە چەند ڕووباریشی
تێدایە لەهەنگوینی پاڵفتە ﴿وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ وە لەوێ هەموو جۆرە میوەهاتێکیان بۆ ئامادەیە ﴿وَمَغۡفِرَةٞ مِّن
رَّبِّهِمۡۖ﴾ لەگەڵ لێبوردن لە پەروەردگاریانەوە ﴿كَمَنۡ هُوَ خَٰلِدٞ فِي ٱلنَّارِ﴾ (ئایا ئەو بەهەشتیانە) وەکو کەسانێك وان
کە لە ئاگری دۆزەخ دابن بەهەمیشەیی ﴿وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمٗا فَقَطَّعَ أَمۡعَآءَهُمۡ﴾ ئاوی کوڵاو کوڵیان دەرخوارد بدرێ کە
ڕیخۆڵەکانیان پارچە پارچە بکات ﴿١٥﴾ ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُ إِلَيۡكَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) هەندێ لەوانە گوێت
لێدەگرن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُواْ مِنۡ عِندِكَ﴾ بەڵام کاتێك لای تۆ دەردەچن ﴿قَالُواْ لِلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ﴾ دەڵێن بەوانەی زانیاریان
پێ دراوە (لە هاوەڵان) ﴿مَاذَا قَالَ ءَانِفًاۚ﴾ ئەوە ئێستە موحەممەد (ﷺ) ووتی چی؟ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە ئەو
کەسانەن ﴿طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ کە خوا مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا ﴿وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾ وە شوێن هەوا و ئارەزووی
خۆیان کەوتوون ﴿١٦﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ﴾ ئەو کەسانەی هیدایەتیان وەرگرتووە ﴿زَادَهُمۡ هُدٗى﴾ (خوا) شارەزاییان
زیاد دەکات ﴿وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ﴾ وە تەقواو پارێزکاری وخواناسیان پێ دەبەخشێ ﴿١٧﴾ ﴿فَهَلۡ يَنظُرُونَ﴾ دەی ئایا ئەو
(ناپاکانە)چاوەڕوانی چی دەکەین ﴿إِلَّا ٱلسَّاعَةَ﴾ جگە لە قیامەت ﴿أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗۖ﴾ کە کتوپڕ یەخەیان بگرێت
﴿فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَاۚ﴾ دەی بێگومان هەندێ لەنیشانەکانی هاتۆتە دی ﴿فَأَنَّىٰ لَهُمۡ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ ذِكۡرَىٰهُمۡ﴾ کاتێ (ڕۆژی
دوایی) یەخەیان بگرێت ئیتر کەی بیر دەکەنەوە ﴿١٨﴾ ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ کەواتە دڵنیابە و بزانە بێجگە لە
(اللە) هیچ پەرستراوێکی بەهەق و ڕاست نی یە ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ﴾ وە داوای لێبوردن بکە (لەخوا) بۆ
گوناهی خۆت ﴿وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ﴾ وە بۆ (گوناهی) پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ﴾ وبێگومان
خوا دەزانێ ﴿مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ﴾ بە جم و جوڵتان (لە ڕۆژدا) و ئارام گرتنتان (لە شەودا) ﴿١٩﴾

﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن ﴿لَوۡلَا نُزِّلَتۡ سُورَةٞۖ﴾ بۆچی سورەتێك (لەقورئان) نانێردرێتە خوارەوە؟ (دەربارەی جەنگ و جیهاد) ﴿فَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ مُّحۡكَمَةٞ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ﴾ کەچی کاتێك سورەتێکی ڕوون و دامەزراو نێرابێتە خوارەوە و تیایدا باسی جەنگ کرا بێ ﴿رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ﴾ دەبینی ئەو کەسانەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ﴾ کە لەدڵیاندا نەخۆشی (دوو ڕوویی) هەیە ﴿يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ﴾ تەماشای تۆ دەکەن ﴿نَظَرَ ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ﴾ وەك تەماشا کردنی کەسێك کە لە ترسی مردن لە هۆشی خۆی چووبێت ﴿فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾ بۆ ئەوان وا چاکتر بوو ﴿٢٠﴾ ﴿طَاعَةٞ وَقَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞۚ﴾ فەرمان بەردار بوونایە و قسەی جوان و چاکیان بکردایە ﴿فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ﴾ هەر کاتێکیش فەرمانی (جەنگ) درا (جێ بەجێ ی ناکەن) ﴿فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ﴾ خۆ ئەگەر لەگەڵ خوا ڕاستیان بکردایە ﴿لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ﴾ ئەوە باشتر بوو بۆیان ﴿٢١﴾ ﴿فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ﴾ جا ئایا ئێوە بەتەمان (ئەی ناپاکان) ﴿إِن تَوَلَّيۡتُمۡ﴾ ئەگەر پشت هەڵکەن (لە ئیسلام و جیهاد) ﴿أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لە زەویدا ئاژاوە و خراپە بەرپابکەن ﴿وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ﴾ وە هەرچی پەیوەندی خزمایەتی یە بیبچڕێنن ﴿٢٢﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئا ئەوانە ئەو کەسانەن ﴿لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ﴾ کە خوا نەفرینی لێ کردوون ﴿فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ﴾ وە کەڕی کردوون و چاویانی کوێر کردووە ﴿٢٣﴾ ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ ئاخۆ ئەوانە وورد نابنەوە لە قورئان (و تێی ناگەن)؟! ﴿أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ﴾ (وانی یە) بەڵکو دڵیان قوفڵی لێ دراوە ﴿٢٤﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بێگومان ئەو کەسانەی ﴿ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم﴾ پاشە و پاش گەڕانەوە لە ئایینەکەیان ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى﴾ لە پاش ئەوەی هەقیان بۆ ڕوون بوویەوە ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ﴾ شەیتان خراپەکانیانی بۆ جوان و ڕازاوە کردبوون ﴿وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ﴾ وە بەهیوا و ئومێد فریوی دابوون ﴿٢٥﴾ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ﴾ چونکە ئەوان دەیان ووت ﴿لِلَّذِينَ كَرِهُواْ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ﴾ بەو کەسانەی کەڕقیان بوو لەو قورئانەی خوا نارد بووی ﴿سَنُطِيعُكُمۡ فِي بَعۡضِ ٱلۡأَمۡرِۖ﴾ ئێمە لە مەولا لەهەندێ کاردا گوێڕایەڵیتان دەکەین ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِسۡرَارَهُمۡ﴾ وە خوا بە نهێنیەکانیان دەزانێ ﴿٢٦﴾ ﴿فَكَيۡفَ إِذَا تَوَفَّتۡهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئاخۆ چۆن بێ (حاڵی ئەو ناپاکانە) کاتێك فریشتەکان گیانیان دەکێشن و ﴿يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ﴾ لە ڕوخسار و پاشیان دەدەن ﴿٢٧﴾ ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو (جۆرە گیان کێشانە) ﴿بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ﴾ لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە شوێن شتانێ کەوتبوون کە خوای تورە کرد بوو ﴿وَكَرِهُواْ رِضۡوَٰنَهُۥ﴾ ڕەزامەندی خواشیان پێ ناخۆش بوو ﴿فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ بۆیە خواش کردەوەکانیانی پووچەڵ کردەوە ﴿٢٨﴾ ﴿أَمۡ حَسِبَ﴾ ئایا وا دەزانن ﴿ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئەوانەی کە نەخۆشی (ناپاکی) لە دڵیان دایە ﴿أَن لَّن يُخۡرِجَ ٱللَّهُ أَضۡغَٰنَهُمۡ﴾ کە خوا هەرگیز ڕق و کینەیان دەرناخات و ئاشکرای ناکات ﴿٢٩﴾

﴿وَلَوۡ نَشَآءُ﴾ ئەگەر بمانویستایە ﴿لَأَرَيۡنَٰكَهُمۡ﴾ ئەوانەمان نیشان دەدایت (کە دووڕوون) ﴿فَلَعَرَفۡتَهُم
بِسِيمَٰهُمۡۚ﴾ ئەوسا هەر بەشێوە و دیمەنیاندا دەتناسین ﴿وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِۚ﴾ وە بێگومان بە شێوازی
قسەشیاندا دەیانناسییت ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ أَعۡمَٰلَكُمۡ﴾ وە دڵنیابن خوا بە هەموو کردەوەکانتان دەزانێت ﴿٣٠﴾
﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُمۡ﴾ سوێند بەخوا تاقیتان دەکەینەوە ﴿حَتَّىٰ نَعۡلَمَ﴾ تا دەری بخەین و دیاربێ ﴿ٱلۡمُجَٰهِدِينَ
مِنكُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ﴾ موجاهیدان و خۆڕاگرانتان ﴿وَنَبۡلُوَاْ أَخۡبَارَكُمۡ﴾ وە تا هەواڵتان چی یە ئاشکرای کەین
﴿٣١﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێگومان کەسانێ کە بێ باوەڕبوون ﴿وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وەڕێگری (خەڵك)
یان دەکرد لە ڕێبازی خوا ﴿وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ﴾ دژایەتی پێغەمبەریشیان دەکرد ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ﴾
پاش ئەوەی هەق و ڕاستیان بۆ ڕوون بۆتەوە ﴿لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا﴾ هیچ زیانێك بەخوا ناگەیەنن
﴿وَسَيُحۡبِطُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ وە بە زوویی (خوا پیلان) وکردەوەکانیان پووچەڵ دەکاتەوە ﴿٣٢﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی
خوا و پێغەمبەربن ﴿وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ﴾ وە کردەوە (چاکە) کانتان هەڵمەوەشێننەوە ﴿٣٣﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾
بێگومان ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون ﴿وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وەڕێگری (خەڵك)یان دەکرد لە ڕێبازی
خوا ﴿ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ﴾ پاشان بەبێ باوەڕی مردن ﴿فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡ﴾ ئەوە هەرگیز خوا لێیان
خۆش نابێت ﴿٣٤﴾ ﴿فَلَا تَهِنُواْ وَتَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلۡمِ﴾ جا (باوەڕداران) لاوازو سست مەبن و داوای ئاشتی
(و شەڕ وەستان) مەکەن ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ﴾ چونکە هەر ئێوە زاڵ و بەهێزترن ﴿وَٱللَّهُ مَعَكُمۡ﴾ (یارمەتی)
خواش لەگەڵ ئێوەدایە ﴿وَلَن يَتِرَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ﴾ وە (پاداشتی) کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە ﴿٣٥﴾ ﴿إِنَّمَا
ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا﴾ بێگومان ژیانی دونیا تەنها ﴿لَعِبٞ وَلَهۡوٞۚ﴾ گاڵتە و گەپێکە (ودەبڕێتەوە) ﴿وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ﴾
خۆ ئەگەر باوەڕ بهێنن ولەخواترس بن ﴿يُؤۡتِكُمۡ أُجُورَكُمۡ﴾ (خوا) پاداشتی خۆتان پێ دەدات
﴿وَلَا يَسۡـَٔلۡكُمۡ أَمۡوَٰلَكُمۡ﴾ وە داوای بەخشینی هەموو دارایی و ماڵتان لێ ناکات ﴿٣٦﴾ ﴿إِن يَسۡـَٔلۡكُمُوهَا﴾
ئەگەر (خوا) داوای بەخشینی هەموو سامانتان لێ بکات ﴿فَيُحۡفِكُمۡ﴾ زۆریش داکۆکی بکات لێتان
﴿تَبۡخَلُواْ﴾ ئێوە چرووکی و ڕەزیلی دەکەن ﴿وَيُخۡرِجۡ أَضۡغَٰنَكُمۡ﴾ و ڕق و کینەی دەروونتان دەردەخات
﴿٣٧﴾ ﴿هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ بێداربن ئێوە ئەو کەسانەن ﴿تُدۡعَوۡنَ﴾ کە بانگ دەکرێن ﴿لِتُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ تا لە
پێناوی خوا ماڵ ببەخشن ﴿فَمِنكُم مَّن يَبۡخَلُۖ﴾ کەچی هەندێکتان ڕژدەی دەکەن ﴿وَمَن يَبۡخَلۡ﴾ هەر کەسیش
ڕژدەیی و ڕەزیلی بکات ﴿فَإِنَّمَا يَبۡخَلُ عَن نَّفۡسِهِۦۚ﴾ ئەوە بێگومان تەنها ڕژدیی لە (دژی) خۆی دەکات
﴿وَٱللَّهُ ٱلۡغَنِيُّ﴾ چونکە خوا (دەوڵەمەندە) و بێ نیازە ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُۚ﴾ هەر ئێوەن هەژار و بێ نەوا
﴿وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ﴾ جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن (لەئاینەکەتان) ﴿يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ﴾ (خوای گەورە)
ئێوە دەگۆڕێت بەکەسانێکی تر(ی زۆر چاك) ﴿ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم﴾ پاشان (ئەوان) وەکو ئێوە نابن
(ڕاستگۆن لەگەڵ پەروەردگاریاندا) ﴿٣٨﴾

# سورەتی ﴿ الفَتْح ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێ دایت
(کەرێکەوتنی حودەیبییەیە) (١) ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ﴾ تا خوا خۆش ببێت ﴿مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ لە
گوناهەکانی ڕابوردوو داهاتووت ﴿وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ﴾ وە نیعمەتی خۆی بەتەواوی بڕژێت بەسەرتدا
﴿وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ وەرێگای ڕاستت نیشان بدات (بەردەوامت کات) (٢) ﴿وَيَنصُرَكَ اللَّهُ﴾
وەخوا سەرت بخات ﴿نَصْرًا عَزِيزًا﴾ بەسەرکەوتنێکی بالادەستانە (٣) ﴿هُوَ الَّذِي﴾ ئەو خوا زاتێکە
﴿أَنزَلَ السَّكِينَةَ﴾ ئارامی دابەزاندووەتە ﴿فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ناو دڵی ئیمانداران ﴿لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا﴾ تا ئیمانیان
زیاد بکات ﴿مَّعَ إِيمَانِهِمْ﴾ لەگەڵ ئەو ئیمانەی کە هەیانە ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ﴾ تەنها هی خوایە سەربازانی
﴿السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ وە هەمیشە خوا زانای کاردروستە (٤)
﴿لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ تا پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار بباتە ﴿جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ بەهەشتانێك
کە ڕوبارەکان بەژێریاندا دەڕوات ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ بەهەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە ﴿وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ
سَيِّئَاتِهِمْ﴾ وەتا لەگوناهەکانیان خۆش ببێت ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ اللَّهِ﴾ وە ئەم (بەڵێنە) لای خوا
﴿فَوْزًا عَظِيمًا﴾ سەرکەوتنێکی گەورەیە (٥) ﴿وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ﴾ و تا سزای بدات پیاوان
و ئافرەتانی (دوو ڕوو) و ناپاك و ﴿وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ﴾ پیاوان و ئافرەتانی هاوبەش پەیداکەری
﴿الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ﴾ گومان بەرانی خراپ دەربارەی خوا﴿عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ﴾ئەوخراپە(لەناو
چوونەی چاوەڕوانی دەکەن بۆ ئیمانداران) هەر بەسەر خۆیاندا دێت ﴿وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ وەخوا
خەشمی لێ گرتوون و﴿وَلَعَنَهُمْ﴾ نەفرینی لێ کردوون و ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ﴾ دۆزەخی بۆ ئامادە
کردوون ﴿وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾ ئای چ سەرئەنجامێکی خراپە (٦) ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ﴾ تەنها هی خوایە سەربازانی
﴿السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ وەخوا هەمیشە بالادەستی
کاربەجێ یە (٧) ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ﴾ بەڕاستی (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆمان ناردووە ﴿شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾
بەشایەت و مژدەدەر و ترسێنەر (٨) ﴿لِّتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بۆ ئەوەی باوەڕ بە خوا و پێغەمبەرەکەی
بهێنن ﴿وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾ وە پشتیوانی لێ بکەن و ڕێزی لێ بگرن ﴿وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ وە
تەسبیحاتی خوا بکەن بە بەیانیان و ئێوارانیدا (٩)

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ﴾ بەڕاستی ئەوکەسانەی پەیمان دەدەن بەتۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿إِنَّمَا يُبَايِعُونَ
ٱللَّهَ﴾ بێگومان ئەوانە پەیمان بەخوا دەدەن ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْۚ﴾ دەستی خوا لەسەر دەستی ئەوانەوەیە
(لەم ئایەتە پیرۆزەدا جێگیرکردن وباسکردنی سیفەتی دەست بۆ خودا هاتووە ئێمەش بڕوامان
پێیەتی بەبێ هیچ لێچواندن ولەیەکدانەوەیەك، وەشێوەکەی نازانین تەنها خودا خۆی دەیزانێت)
﴿فَمَن نَّكَثَ﴾ جا هەرکەس پەیمانەکەی شکاند ﴿فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦۖ﴾ ئەوە بێگومان ئەو پەیمان
شکاندنە تەنها (زیانی) بۆ خۆیەتی ﴿وَمَنْ أَوْفَىٰ﴾ هەر کەسیش وەفا بکات ﴿بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ﴾ بەو
پەیمانەی کەداویتی بەخوا ﴿فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ ئەوە بەڕاستی خوا پاداشتی گەورەیی دەداتێ ﴿١٠﴾
﴿سَيَقُولُ لَكَ﴾ بێگومان پێت دەڵێن ﴿ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ﴾ ئەو عەرەبە دەشتەکیانەی کەلە غەزا جێ
مابوون ﴿شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا﴾ سامان و خاوخێزانمان مەشغوڵیان کردین (نەیان هێشت بێین بۆ
غەزا) ﴿فَٱسْتَغْفِرْ لَنَاۚ﴾ لەبەر ئەوە داوای لێ خۆشبوونمان بۆ بکە ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْۚ﴾
ئەوەی بەزمانیان دەیڵێن لەدڵیاندا نی یە ( وباوەڕیان پێی نیە) ﴿قُلْ فَمَن﴾ بڵێ جا کێ ﴿يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا﴾ لەبەرانبەر خوادا هیچی بەدەستە بۆتان ﴿إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا﴾ ئەگەر خوا زیانێکی بۆتان بوێت
﴿أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢاۚ﴾ یان سوودو قازانجێکی بۆتان بوێت﴿بَلْ كَانَ ٱللَّهُ﴾ (وانییەکەدەیڵێن) بەڵکو خوا
﴿بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا﴾ ئاگادارە بەهەرچییەك کەدەیکەن ﴿١١﴾ ﴿بَلْ ظَنَنتُمْ أَن﴾ بەڵکو وا گومانتان دەبرد کە
﴿لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا﴾ پێغەمبەر و ئیمانداران هەرگیز ناگەڕێنەوە بۆ ناو کەس
و کاری خۆیان (و شەهید دەبن) ﴿وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمْ﴾ ئەو گومانە لەدڵتاندا ڕازێنرابوویەوە
﴿وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ﴾ وە گومانی خراپتان دەبرد ﴿وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا﴾ و بەڕاستی ئێوە گەلێکن لەناو دەچن ﴿١٢﴾
﴿وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ﴾ و هەر کەس باوەڕی نەهێنا بێ ﴿بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ بەخوا و پێغەمبەرەکەی ﴿فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا﴾
ئەوە بەڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە ﴿لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا﴾ بۆ ئەو بێ باوەڕانە ئاگرێکی هەڵگیرساو ﴿١٣﴾
﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ﴾ ئاسمانەکان و زەوی تەنها موڵکی خوایە ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ لەهەر کەس
کەبیەوێت خۆش دەبێت ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ﴾ سزای هەرکەسیش دەدات کەبیەوێت (لەتاوانباران)
﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ وەخوا لێبوردەی میهرەبانە ﴿١٤﴾ ﴿سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ﴾ بێگومان بەجێماوان
لەغەزا دەڵێن ﴿إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ﴾ هەرکاتێك (لەمەدینە) دەرچوون ﴿إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا﴾ بۆ گرتنی
دەسکەوتەکان (غەنیمەت) ﴿ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْۖ﴾ لێمان گەڕێن باشوێنتان بکەوین ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ
ٱللَّهِۚ﴾ دەیانەوێ وتەی خوا (کە دەسکەوتەکانی خەیبەر بۆ بەشدارانی حودەیبییەیە) بگۆڕن ﴿قُل لَّن
تَتَّبِعُونَا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ هەرگیز نابێت شوێنمان کەون ﴿كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُۖ﴾ چونکە
پێشتر خوا دەربارەتان هەروای فەرمووە ﴿فَسَيَقُولُونَ﴾ ئەمجا دواتر دەڵێن ﴿بَلْ تَحْسُدُونَنَاۚ﴾ (وا نی یە)
بەڵکو حەسوودی بە ئێمە دەبەن ﴿بَلْ كَانُوا۟﴾ (وا نی یە) بەڵکو ئەوان ﴿لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ زۆر کەم
تێدەگەن ﴿١٥﴾

﴿قُل لِّلۡمُخَلَّفِينَ﴾ بڵێ بەجێماوان لەغەزا ﴿مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ﴾ لە عەرەبە دەشتەکی یەکان ﴿سَتُدۡعَوۡنَ﴾
لەمەولا بانگ دەکرێن ﴿إِلَىٰ قَوۡمٍ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ﴾ بۆ (جەنگ لەگەڵ) گەلێکی زۆر بەهێزی جەنگاوەر
﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَۖ﴾ (دەبێ) جەنگیان لەگەڵ بکەن یان خۆیان موسڵمان ببن ﴿فَإِن تُطِيعُواْ﴾ جائەگەر
گوێڕایەڵ بن ﴿يُؤۡتِكُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا پێیان دەدات ﴿أَجۡرًا حَسَنٗاۖ﴾ پاداشتێکی زۆرباش ﴿وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ﴾
وە ئەگەر سەرپێچی بکەن ﴿كَمَا تَوَلَّيۡتُم مِّن قَبۡلُ﴾ هەروەك لەوەو پێش سەرپێچیتان کرد (لە حودەیبیەدا)
﴿يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا﴾ (خوا) سزایەکی سەختتان دەدات ﴿١٦﴾ ﴿لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ﴾ بۆ کوێر گوناه نییە
(بەشداری جیهاد نەکات) ﴿وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ﴾ بۆ شەلیش گوناه نییە ﴿وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞۗ﴾ هەروەها
بۆ نەخۆشیش گوناه نییە ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ وە هەر کەس گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی
بێت ﴿يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ﴾ دەیباتە بەهەشتانێك ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ﴾ کەڕوبارەکان بەژێریاندا دێن
ودەچن ﴿وَمَن يَتَوَلَّ﴾ هەر کەسیش سەرپێچی بکات ﴿يُعَذِّبۡهُ عَذَابًا أَلِيمٗا﴾ (خوا) سزای سەختی دەدات
﴿١٧﴾ ﴿لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ﴾ سوێند بەخوا بێگومان خوا ڕازی بوو ﴿عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ لەو ئیماندارانەی ﴿إِذۡ
يُبَايِعُونَكَ﴾ کە پەیمانیان پێدایت ﴿تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ﴾ لەژێر درەختەکەدا (لە حودەیبیە) ﴿فَعَلِمَ مَا فِي
قُلُوبِهِمۡ﴾ جا خوا ئاگادار بوو بەوەی لە دڵیاندایە ﴿فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ﴾ بۆیە دڵنیایی و ئارامی بۆ
ناردن ﴿وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا﴾ وە پاداشتی دانەوە بەسەرکەوتنێکی نزیك (کەئازاد کردنی خەیبەر بوو) ﴿١٨﴾
﴿وَمَغَانِمَ كَثِيرَةٗ يَأۡخُذُونَهَاۗ﴾ وە غەنیمەتی زۆر کەبەدەستی دەهێنن ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا﴾ وە خوا هەمیشە
زاڵی باڵادەستی کاربەجێ یە ﴿١٩﴾ ﴿وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا بەڵێنی پێ داوون ﴿مَغَانِمَ كَثِيرَةٗ﴾ کەغەنیمەتی زۆر
﴿تَأۡخُذُونَهَا﴾ (لە بێ باوەڕان) دەگرن ﴿فَعَجَّلَ لَكُمۡ هَٰذِهِۦ﴾ بۆیە ئەم (غەنیمەتەی خەیبەر)ی بۆ
پێش خستن ﴿وَكَفَّ أَيۡدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمۡ﴾ وە دەستی خەڵکی (مەککەی) لێتان کۆتا کرد ﴿وَلِتَكُونَ ءَايَةٗ﴾
تا(ئەم ڕووداوە) ببێتە بەڵگەیەك ﴿لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بۆ باوەڕداران ﴿وَيَهۡدِيَكُمۡ﴾ وەتا ڕێنموونیتان بکات
﴿صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا﴾ بۆ ڕێگای ڕاست ﴿٢٠﴾ ﴿وَأُخۡرَىٰ لَمۡ تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهَا﴾ وە چەندەها (غەنیمەتی)تر
هەیە کەهێشتا دەسەڵاتتان نی یە بەسەری دا ﴿قَدۡ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَاۚ﴾ بێگومان خوا ئاگای لەهەموویانە
﴿وَكَانَ ٱللَّهُ﴾ وەخوا هەمیشە ﴿عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا﴾ بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەڵات وبەتوانایە ﴿٢١﴾
﴿وَلَوۡ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەگەر ئەوانەی کافرن جەنگیان لەدژتان بکردایە ﴿لَوَلَّوُاْ ٱلۡأَدۡبَٰرَ﴾ بێگومان
(تێك دەشکان و) هەڵدەهاتن ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُونَ﴾ پاشان دەستیان نەدەکەوت ﴿وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾ هیچ دۆست و
پشتیوانێك ﴿٢٢﴾ ﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي﴾ ئەوەیاساوباوی خوایە ﴿قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلُۖ﴾ کەبێگومان پێشتریش هەروابووە
﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا﴾ قەت نابینیت باو و یاسای خوا هیچ گۆڕانێکی بەسەردا بێت ﴿٢٣﴾

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى﴾ خوا ئەو زاتەیە ﴿كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ﴾ کەدەستی ئەوانی (کافران) لەئێوە کۆتا کرد ﴿وَأَيْدِيَكُمْ
عَنْهُم﴾ دەستی ئێوەشی لەوان (کۆتاکرد بەڕێکەوتنی حودەیبیە) ﴿بِبَطْنِ مَكَّةَ﴾ لەناوجەرگەی مەککەدا
﴿مِنۢ بَعْدِ﴾ لەپاش ئەوەی ﴿أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾ ئێوەی بەسەر ئەواندا زاڵ کرد ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾
وەخوا بەهەرچی ئێوە دەیکەن بینایە (٢٤) ﴿هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ هەر ئەوان (مەککەیەکان) بوون کافر بوون
﴿وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ وەڕێگری ئێوەیان کرد (لەزیارەتی) مزگەوتی حەرام (کەعبەی پیرۆز)
﴿وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا﴾ وە(نەیانهێشت) قوربانیە وەستێنراوەکان (لەحودەیبیەدا) ﴿أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ﴾ بگاتە
شوێنی سەربڕینی خۆی ﴿وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ﴾ (خوا زاڵی دەکردن بەسەر مەککەدا لەو
ساڵەدا) ئەگەر پیاو و ئافرتانی ئیماندار نەبوایە (لەناو کافرانی مەککەدا) ﴿لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ﴾ کەئێوە نەتان
دەناسین ﴿أَن تَطَـُٔوهُمْ﴾ پێتان پێدادەنان (دەتان کوشتن) ﴿فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ﴾ جابەهۆیانەوە تووشی
تاوان دەبوون ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بێ ئەوەی بزانن ﴿لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ﴾ تاخوا بیخاتە بەر بەزەیی خۆی
﴿مَن يَشَآءُ﴾ ئەو کەسەی کە خۆی دەیەوێ ﴿لَوْ تَزَيَّلُوا۟﴾ بەڵام ئەگەر (ئیمانداران و کافران لەمەککەدا)
لەیەکتر جیابیوونایەتەوە ﴿لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ﴾ بێگومان بێ باوەڕەکانیانمان سزادەدا ﴿عَذَابًا أَلِيمًا﴾
بەسزادانێکی سەخت (٢٥) ﴿إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ﴾ کاتێك ئەوانەی بێ باوەڕن دەمار
گیرییان خستە دڵیانەوە ﴿حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ﴾ کەدەمارگیری نەفامی یە ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ﴾ جا خواش
دڵنیایی و ئارامی خۆیی ناردە خوارەوە ﴿عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئیمانداران
﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ وەباوەڕدانی پابەند کرد بەووشەی (لا اله الا الله محمد رسول الله) وە
﴿وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا﴾ وەئەوان بەووشەیە شیاو تر بوون و خاوەنی بوون ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾
وەخوا بەهەمووشتێك ئاگادار و زانایە (٢٦) ﴿لَّقَدْ﴾ سوێندبەخوا بێگومان ﴿صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ﴾
خوائەوخەوەی کەپێغەمبەرەکەی دیبوی بەڕاستی گێڕاو هێنایەدی ﴿لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ﴾ کە(ووتبوی)
دڵنیابن دەچنە ناومزگەوتی حەرام (کەعبەی پیرۆز) ﴿إِن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ بەوویستی خوا ﴿ءَامِنِينَ﴾ بەئارامی و
بێ ترس ﴿مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ﴾ سەرتان تاشیبوەیان کورتان کردۆتەوە ﴿لَا تَخَافُونَ﴾ (لەدوژمن)
ناترسن ﴿فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟﴾ جا ئەوەی (خوا) دەیزانی ئێوە نەتان دەزانی (کەخێر لەڕێکەوتن دایە)
﴿فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ﴾ وە جگە لە (چوونە مەککە) بڕیاری داوە ﴿فَتْحًا قَرِيبًا﴾ سەرکەوتنێکی نزیك
(بۆ ئێوەیە کەڕێکەوتنی حودەیبیەیە) (٢٧) ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ﴾ خوا ئەو زاتەیە کەپێغەمبەرەکەی
ناردووە ﴿بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ﴾ بەڕێنموونی و ئایینی ڕاستەوە ﴿لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾ تا بەسەر
هەموو ڕێبازێکدا زاڵی بکات ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾ تەنها خوا بەسە کە شاهید بێت لەسەر ئەمە (٢٨)

﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ﴾ موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە ﴿وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾ ئەو (باوەڕدار)انەش کەلەگەڵیدان
﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ﴾ بەرامبەر بێ باوەڕان توندو تیژن و ﴿رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ﴾ لەنێوان خۆیاندا بە بەزەیین ﴿تَرَىٰهُمۡ
رُكَّعٗا سُجَّدٗا﴾ دەیـان بینـی (هەمیشـە) لـە کوڕنوش و سـوژدە بردنـدان ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ﴾
داوای فەزڵ و ڕەزامەندی خودا دەکەن ﴿سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم﴾ نیشانەیان لە ناو چاوانیاندا دیارە ﴿مِّنۡ أَثَرِ
ٱلسُّجُودِۚ﴾ بەهـۆی زۆر سـوژدە بـردن (یانـەوە) ﴿ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ﴾ جا ئـەو (هاوەڵـە بەڕێزانە) ئەوە
نموونـە و صیفەتیـان بـوو لـە تەوراتـدا ﴿وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ﴾ وە نموونـە و صیفەتیـان لە ئینجیلیشـدا
﴿كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ﴾ وەك ڕووەك وکشـتوکاڵێك وایـە چەکـەرەی دەرکردبێـت (سـەوز بووبـێ)
﴿فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ﴾ ئەمجا چەکەرەکەی بەهێز کرد بێ و قاییم بوو بێ ﴿فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ﴾ جا لەسـەر
لاسـکی خـۆی ڕێك وەسـتابێ ﴿يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ﴾ (ئەوەنـدە جوان بـێ) جوتیارەکانی سەرسـام کرد بێ
﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ﴾ تـا بە (زۆر بوونـی) هەوەڵانی داخ و مەراق بدا بەکافـران ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ﴾ خوا بەڵێنی
داوە ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم﴾ بەوانەیـان کـە باوەڕیان هێناوە وکـردەوەی چاکەیان کردووە
﴿مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا﴾ بە لێبوردن و پاداشتی گەورە (کە بەهەشتە) (٢٩)

## سورەتی ﴿ ٱلۡحُجُرَاتِ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئـەی ئـەو کەسـانەی کەباوەڕتـان هێنـاوە ﴿لَا تُقَدِّمُواْ﴾ پێـش مەکـەون (لـە هیـچ
کاروبڕیارێکـدا) ﴿بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ﴾ لەخـواو پێغەمبەرەکـەی ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ﴾ و لەخـوا بترسـن
﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾ بێگومـان خـوا بیسـەری زانایـە (١) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئـەی ئـەو کەسـانەی
باوەڕتـان هێنـاوە ﴿لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ﴾ دەنگتـان بـەرز مەکەنـەوە ﴿فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ﴾ بەسـەر دەنگـی
پێغەمبـەردا ﷺ ﴿وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ﴾ وە بەدەنگـی بـەرز قسـەی لەگـەڵ مەکەن ﴿كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ﴾
وەك دەنگ بەرز کردنەوەتـان لەگەڵ یەکتریدا ﴿أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ﴾ نەوەکو کردەوەکانتان بەتاڵ ببێتەوە
﴿وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ﴾ و خۆشتان هەستی پێ نەکەن (٢) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بێگومان ئەوانەی ﴿يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ﴾
دەنگیان نزم دەکەنەوە ﴿عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ﴾ لەخزمەتی پێغەمبەردا ﷺ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە ئەو کەسانەن
﴿ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ﴾ خـوا دڵیانـی زاخـاو داوە وپاکـی کردوەتـەوە ﴿لِلتَّقۡوَىٰۚ﴾ بـۆ تەقوا وخواناسـین
﴿لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ لێ خۆش بوون و پاداشـتی گەورەیان بۆ هەیە (٣) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بێگومان ئەو
کەسـانەی ﴿يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلۡحُجُرَٰتِ﴾ لـە دەرەوەی ژوورەکان بانگت دەکەن (ئەی موحەممەد ﷺ)
﴿أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ زۆربەیان نەفامن و تێ ناگەن (٤)

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا﴾ خۆ ئەگەر چاوەڕوانیان بکردایە ﴿حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ﴾ تادەرۆشتیتە دەرەوە بۆ لایان ﴿لَكَانَ
خَيْرًا لَّهُمْ﴾ ئەوە چاکتر بوو بۆیان ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وەخوا لێبوردەی میهرەبانە ﴿٥﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾
ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ﴿إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ﴾ ئەگەر گوناهکارێ هەواڵێکی گرنگی هێنا بۆتان
﴿فَتَبَيَّنُوا﴾ ئەوە لێ ی بکۆڵنەوە (تاڕوون ببێتەوە) ﴿أَن تُصِيبُوا﴾ نەوەك زیان بگەیەنن ﴿قَوْمًا بِجَهَالَةٍ﴾
بەخەڵکێك بەنەزانین ﴿فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾ ئەوسا پەشیمان بن لەوکارەی کەکردووتانە
﴿٦﴾ ﴿وَاعْلَمُوا﴾ زۆر چاك بزانن ﴿أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ﴾ کە بێگومان پێغەمبەری خوا لە ناوتاندایە
﴿لَوْ يُطِيعُكُمْ﴾ ئەگەر بەگوێ ی ئێوەی بکردایە ﴿فِي كَثِيرٍ مِّنَ الْأَمْرِ﴾ لەزۆرێك لەکارەکاندا ﴿لَعَنِتُّمْ﴾
تووشی ناڕەحەتی دەبوون ﴿وَلَٰكِنَّ اللَّهَ﴾ بەڵام خوا ﴿حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ﴾ ئیمانی لاتان خۆشەویست
کردووە ﴿وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ﴾ وە لەدڵتاندا (شیرین و) ڕازاوەی کردووە ﴿وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ﴾ وە بێزراوو
ناشرینی کردووە لەلاتان ﴿الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ﴾ بێ باوەڕیی و تاوان و سەرپێچی فەرمانی خوا
﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ﴾ هەر ئەوانەن شارەزاو لەسەر ڕێبازی ڕاستن ﴿٧﴾ ﴿فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَنِعْمَةً﴾ (ئەوە)
بەخشش ونیعمەتێکە لەلایەن خواوە ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خواش زانا و دانایە ﴿٨﴾ ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ
مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر دووکۆمەڵ لەئیمانداران ﴿اقْتَتَلُوا﴾ دژ بەیەکتر جەنگیان کرد ﴿فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾
ئەوە لەنێوانیاندا ئاشتەوایی بکەن ﴿فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا﴾ ئەمجا ئەگەر کۆمەڵێکیان دەست درێژی
وسەرکەشی کرد ﴿عَلَى الْأُخْرَىٰ﴾ بۆ سەر کۆمەڵێکی تریان ﴿فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي﴾ ئەوە ئێوە (ئەی موسوڵمانان)
دژی ئەوەیان بجەنگن دەست درێژی دەکات ﴿حَتَّىٰ تَفِيءَ﴾ تا دەگەڕێتەوە ﴿إِلَىٰ أَمْرِ اللَّهِ﴾ بۆ فەرمانی
خوا (ملکەچی فەرمانی خوا دەبێ) ﴿فَإِن فَاءَتْ﴾ ئەمجا ئەگەر گەڕایەوە ﴿فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾ ئەوسا
لەنێوانیاندا ئاشتەوایی بکەن ﴿بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا﴾ بەدادگەرانە و ڕاست و دادپەروەر بن (لەنێوانیاندا)
﴿إِنَّ اللَّهَ﴾ بێگومان خوا ﴿يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ دادپەروەرانی خۆش دەوێ ﴿٩﴾ ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾
بێگومان تەنها باوەڕداران برای یەکترن ﴿فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ﴾ کەواتە لەنێوان دووبراتاندا (ئاژاوە
هەبوو) ئاشتەوایی بکەن ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ و لەخوا بترسن ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ تاڕەحمتان پێ بکات ﴿١٠﴾
﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ﴾ باهیچ کۆمەڵە پیاوێك گاڵتە
نەکەن بەکۆمەڵێکی تریان ﴿عَسَىٰ أَن يَكُونُوا﴾ ڕەنگە گاڵتە پێ کراوەکان ﴿خَيْرًا مِّنْهُمْ﴾ لە گاڵتەکەرەکان
باشتربن (لای خوا) ﴿وَلَا نِسَاءٌ مِّن نِّسَاءٍ﴾ وە ژنانێك گاڵتە نەکەن بەژنانێکی تر ﴿عَسَىٰ أَن يَكُنَّ﴾ ڕەنگە
ئافرەتە گاڵتە پێکراوەکان ﴿خَيْرًا مِّنْهُنَّ﴾ لە ئافرەتە گاڵتەکەرەکان باشتربن (لای خوای گەورە)
﴿وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ﴾ تانە وتەشەر لەیەکتری مەدەن (لەنێو خۆتاندا) ﴿وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ﴾ ناوو ناتۆرە
لەیەکتری مەنێن ﴿بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ﴾ ئای چەند خراپە ناو بردنێ کە گوناهە (بە موسڵمان بڵێیت
کافر، یان داوێن پیس) ﴿بَعْدَ الْإِيمَانِ﴾ پاش باوەڕ هێنان ﴿وَمَن لَّمْ يَتُبْ﴾ جا ئەوەی پەشیمان نەبێتەوە
﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ئەوە ئەوانە هەر خۆیان ستەمکارن ﴿١١﴾

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ﴿اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ﴾ خۆتان لەزۆرێك لە
گومانەکان بپارێزن ﴿إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾ چونکە بەڕاستی هەندێك لەگومانەکان تاوانن ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾
سیخوڕی مەکەن (وبەدوای ناتەواوی یەکتردا مەگەڕێن) ﴿وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا﴾ لەپاشملە بەخراپە
باسی یەکتری مەکەن ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ﴾ ئایا کام لەئێوە پێ ی خۆشە ﴿أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ﴾ کە گۆشتی
برا (ئایینی یەکەی) بخوات؟ ﴿مَيْتًا﴾ بەمردووی ﴿فَكَرِهْتُمُوهُ﴾ بێگومان قێزتان لێ ی دێتەوەو
پێتان ناخۆشە ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ وە لەخوا بترسن ﴿إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومان خوا تەوبە گیراکەری
بەبەزەیی یە ﴿١٢﴾ ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ﴾ بێگومان ئێمە دروستمان کردوون ﴿مِنْ ذَكَرٍ
وَأُنْثَى﴾ لە نێر و مێ یەك ﴿وَجَعَلْنَاكُمْ﴾ وە کردومانن ﴿شُعُوبًا وَقَبَائِلَ﴾ بەچەند گەل و هۆزێکەوە ﴿لِتَعَارَفُوا﴾
تایەکتری بناسن ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ﴾ بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ﴿أَتْقَاكُمْ﴾ ئەو کەسەتانە زیاتر
لەخودا دەترسێت ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ بێگومان خوا زانای ئاگادارە ﴿١٣﴾ ﴿قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا﴾ عەرەبە
دەشتەکیەکان وتیان باوەڕمان هێناوە ﴿قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ باوەڕتان نەهێناوە
﴿وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾ بەڵکو بڵێن موسڵمان بووین (بەسەر زارەکی) ﴿وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ﴾
چونکە هێشتا باوەڕ نەچووەتە ناو دڵەکانتانەوە ﴿وَإِنْ تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ خۆ ئەگەر گوێڕایەڵی
خوا و پێغەمبەرەکەی بن ﴿لَا يَلِتْكُمْ مِنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا﴾ هیچ لە (پاداشتی) کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە
﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوالێبوردەی میهرەبانە ﴿١٤﴾ ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ﴾ بێگومان ئیماندارانی
ڕاستەقینە ئەوانەن ﴿آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ کە باوەڕیان هێناوە بە خوا و پێغەمبەرەکەی ﴿ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا﴾
پاشان دوو دڵ نەبوون (لە ئیمانەکەیاندا) ﴿وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ﴾ وە بەماڵ و گیانیان تێکۆشانیان
کردووە ﴿فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لەپێناو ڕێبازی خوادا ﴿أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ هەر ئەوانەن ڕاسگۆیان ﴿١٥﴾
﴿قُلْ أَتُعَلِّمُونَ اللَّهَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا ئێوە خوا ئاگادار دەکەن ﴿بِدِينِكُمْ﴾ لەئایینەکەتان
﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ﴾ لەکاتێکدا خوا ئاگادارەو دەزانێ ﴿مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ بەهەرچی لەئاسمانەکان و
زەوی دایە ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ وە خوا بەهەموو شتێك زانایە ﴿١٦﴾ ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ﴾ ئەو کەسانە منەت
دەکەن بەسەر تۆدا (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿أَنْ أَسْلَمُوا﴾ کە موسڵمان بوون ﴿قُلْ لَا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُمْ﴾
تۆش بڵێ منەتی موسڵمان بوونی خۆتان بەسەر مندا مەکەن ﴿بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ﴾ بەڵکو خوا منەت
دەکات بەسەر ئێوەدا ﴿أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ﴾ کە ڕێنموونیی کردوون بۆ باوەڕهێنان ﴿إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر
ئێوە ڕاستگۆن (کە ئیماندارن) ﴿١٧﴾ ﴿إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ﴾ بەڕاستی خوا دەزانێ ﴿غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ نهێنی
ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ وەخوا بینایە بەهەر کردەوەیەك کە ئێوە دەیکەن ﴿١٨﴾

## سورەتی ﴿ قٓ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿قٓ﴾ بە (قاف) دەخوێندرێتەوە، ماناکەی تەنها خوا دەیزانێ بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی
(البقرة) بکە﴿وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ﴾ سوێند بەقورئانی بەرزو بەڕێز (تۆ نێردراوی خوای ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿١﴾
﴿بَلْ عَجِبُوٓا۟﴾ بەلام (بێ باوەڕان) سەریان سوڕماوە ﴿أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ﴾ لەوەی کەپێغەمبەرێکی ترسێنەریان
بۆ هاتووە لە خۆیان ﴿فَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ جا بێ باوەڕان دەیان ووت ﴿هَٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ﴾ ئەمە شتێکی سەیرە ﴿٢﴾ ﴿أَءِذَا
مِتْنَا﴾ ئایا کاتێ مردین و ﴿وَكُنَّا تُرَابًا﴾ بووین بەخۆڵ (چۆن زیندوو دەبینەوە) ﴿ذَٰلِكَ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ﴾ ئەوە گەڕانەوەیەکی
دوورەو نابێ ﴿٣﴾ ﴿قَدْ عَلِمْنَا﴾ بێگومان ئێمە دەزانین ﴿مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ﴾ زەوی چەندێ لە لاشەیان
دەخوات (هیچیمان لێ وون نابێ) ﴿وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌۢ﴾ پەڕاوێکیشمان لایەکە پارێزەری هەموو شتێکە ﴿٤﴾
﴿بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ﴾ (زیندوو بوونەوە دوورنی یە) بەڵکو ئەوان باوەڕیان بەقورئان نەکرد﴿لَمَّا جَآءَهُمْ﴾ کاتێك
بۆیان هات ﴿فَهُمْ فِىٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ﴾ بۆیە ئەوان لەناو کارێکی تێکەڵ و پێکەڵدان ﴿٥﴾ ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ﴾
دەی ئایا سەرنجی ئەو ئاسمانەیان نەداوە کە لەسەریانەوەیە ﴿كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا﴾ چۆن دروستمان
کردووە و ڕازاندومانەتەوە ﴿وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾ وەهیچ درزو کەلێنێکی تێدا نی یە ﴿٦﴾ ﴿وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا﴾
زەویشمان ڕاخستووە ﴿وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ﴾ چەندەها شاخی دامەزراومان تێدا داناوە ﴿وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا﴾ ڕواندومانە
تێیشیدا ﴿مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ﴾ هەموو جۆر ڕووەکێکی جوان ﴿٧﴾ ﴿تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ﴾ تابەر چاو ڕوونی و پەندو
بیرخەرەوە بێت ﴿لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾ بۆ هەموو بەندەیەکی تەوبە کارو گەڕاوە بۆ لای خوا ﴿٨﴾ ﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾
وە لەئاسمانەوە باراندوومانە ﴿مَآءً مُّبَٰرَكًا﴾ بارانێکی بەپیت و فەڕ﴿فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ﴾ جابەو بارانە ڕوواندومانە
﴿جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ﴾ باخات و دانەوێڵە(ی ئەو کشتوکاڵانەی) کەدروێنە دەکرێن ﴿٩﴾ ﴿وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ﴾
هەروەها دارخورمای بەرزو بڵند ﴿لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ﴾ بە هێشووی تێك پەستراوەوە ﴿١٠﴾ ﴿رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ﴾ (تابێتە)
ڕزق و ڕۆزی بۆ بەندەکان ﴿وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا﴾ هەر بەو بارانە زەوی مردو (ووشك) دەبوژێنینەوە
﴿كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ﴾ زیندوو کردنەوە(ی مردوانیش) هەر بەو شێوەیە ﴿١١﴾ ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ﴾ پێش ئەمانیش باوەڕیان
نەهێنا (بە پێغەمبەرەکانیان) ﴿قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ﴾ گەلی نووح و خاوەن چاڵ و بیرەکان و (گەلی)
سەموود ﴿١٢﴾ ﴿وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ لُوطٍ﴾ وەگەلی عادو فیرعەون و گەلی لووطیش ﴿١٣﴾ ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ﴾
هەروەها خاوەن باخاتە چڕو پڕەکان و گەلی توببەعیش ﴿كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ﴾ هەر هەموویان باوەڕیان نەهێنا
بەپێغەمبەرەکانیان ﴿فَحَقَّ وَعِيدِ﴾ بۆیە هەڕەشەی (من لەدژیان) هاتەدی ﴿١٤﴾ ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ﴾ جا ئایا ئێمە
لەدروستکردنی یەکەم جاردا دەستەوسان بووین (تانەتوانین زیندووتان بکەینەوە)؟! ﴿بَلْ هُمْ﴾ (نەخێر وانیە)
بەڵکو ئەوان ﴿فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ لە گوماندان لە دروست بوونەوەیەکی سەر لە نوێ ﴿١٥﴾

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ﴾ سـوێند بەخـوا ئێمـە ئادەمیمان بـەدی هێناوە و ﴿وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ﴾ چـاك ئاگادارین
بـەو خەیاڵ و خەتەرانەی دێن بەدڵ و دەروونیـدا ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ﴾ وئێمە لەوەوە نزیکترین (واتە خوای گەورە
عیلـم و زانینـی تـەواوی هەیە بـە هەمـوو جموجولێکـی ئادەمیزاد) ﴿مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ لـە شـادەماری دڵی (١٦)
﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ﴾ کاتێـك ئـەو دووفریشـتە (کـرداری) تۆمار دەکـەن ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾ کە لەلای
ڕاسـت و لای چەپیـەوە دانیشـتوون (١٧) ﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ﴾ هـەر ووتەیەك لەدەمـی دەرچێ ﴿إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾
چاودێرێکی بەسەرەوەیە (و دەینوسێ) (١٨) ﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ﴾ نارەحەتی و بێهۆشی مردن دێت لەگەڵ
ڕاستیەکاندا ﴿ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ (پێـی دەووتـرێ) ئەمـە ئەو (مردنە)یـە کە خۆت لێ دەپاراسـت و لادەدا
(١٩) ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ﴾ ئەمجـا فـوو دەکرێ بە (شـەیپوڕ) کەڕەنـادا ﴿ذَٰلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ﴾ ئـەوە ڕۆژی (بەدی هاتنی)
هەڕەشـەکانە (٢٠) ﴿وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا﴾ لەگـەڵ هەمـوو کەسـێکدا دێت (بۆ مەحشـەر) ﴿سَائِقٌ وَشَهِيدٌ﴾ دوو
فریشتە، یەکێکیان پێش خۆی داوە، ئەوی دیکەشیان شاهیدی لەسەر ئەدات، (لەتەواوی ئەو کارورکردەوانەی
کـە کردوونـی لە دونیـادا) (٢١) ﴿لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا﴾ (پێی دەووترێت) سـوێند بەخوا بەڕاسـتی تۆ لەمە بێ
ئاگا بوویت لەدونیادا ﴿فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ﴾ جا ئێمە پەردە (ی قیامەت) مان لەسـەر لادایی ﴿فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾
جـا ئەمڕۆ (کە قیامەتە) چاوت تیژە و چاك دەبینێ (٢٢) ﴿وَقَالَ قَرِينُهُ﴾ وە ئەو (فریشـتە شـاهیدەی) لەگەڵیدایە
دەڵێـت ﴿هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ﴾ ئەمـە (نامەی کردەوەکانە) ئامادەیـە و لای منە (٢٣) ﴿أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ﴾ (خوا دەفەرموێ
بـەدوو فریشـتەکە) فـڕێ ی بدەنـە نـاو دۆزەخـەوە ﴿كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ﴾ هەمـوو کافرێکی سەرکەشـی (٢٤) ﴿مَّنَّاعٍ
لِّلْخَيْرِ﴾ ڕێگـری کـەر لەچاکـە ﴿مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ﴾ دەسـت درێـژ کـەری گومانـاوی (٢٥) ﴿الَّذِي جَعَلَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا
آخَرَ﴾ ئەو کەسـەی کەپەرسـتراوی تری لەگەڵ خوادا داناوە ﴿فَأَلْقِيَاهُ فِي الْعَذَابِ الشَّدِيدِ﴾ جا هەر دووکتان (ئەی
فریشـتەکان) فڕێ ی بدەنە سـزای سـەختەوە (٢٦) ﴿قَالَ قَرِينُهُ﴾ ئەو (شـەیتانەی لەدونیادا) لەگەڵیـدا بوو دەڵێ
﴿رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ﴾ ئـەی پەروەردگـارم مـن ئـەوم سـەرکەش نەکـرد ﴿وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ﴾ بەڵکـو خـۆی
لەگومڕایـی یەکی دوور لەڕاسـتیدا بوو (٢٧) ﴿قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا لَدَيَّ﴾ (خـوا دەفەرموێ) لەلای منـدا دەمەقاڵێ و
مشـتومڕ مەکەن ﴿وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِالْوَعِيدِ﴾ چونکە بێگومان پێشـتر هەڕەشـەم (لەم بارەیەوە) ناردووە بۆتان (٢٨)
﴿مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ﴾ بەڵێنی من هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نایەت ﴿وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ وە من هیچ جۆرە ستەمێك
لـە بەندەکانـم ناکـەم (٢٩) ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ﴾ ڕۆژێـك دەبێت بـەدۆزەخ دەڵێین ﴿هَلِ امْتَلَأْتِ﴾ ئایا پـڕ بوویت؟
﴿وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾ دۆزەخیش دەڵێ ئایا کەسی تر هەیە (بیهێنن)؟ (٣٠) ﴿وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ بەهەشتیش (لەو
ڕۆژەدا) نزیـك کراوەتەوە بۆ پارێزکاران ولەخواترسـان ﴿غَيْرَ بَعِيدٍ﴾ دوور نی یە (لێیان) (٣١) ﴿هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ﴾
(پێیـان دەوترێ) ئەمە ئەو (بەهەشـتە)یە کـە بەڵێنتان پێ درابوو ﴿لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ﴾ بەهەمـوو ڕوو لەخوایەکی
خۆپاریـز (٣٢) ﴿مَّنْ خَشِيَ الرَّحْمَٰنَ بِالْغَيْبِ﴾ ئـەوەی لـە خـوای میهرەبان ترسـابێ لەپەنهانـدا ( وخـۆی لـە گـوناه
پاراسـت بێـت) ﴿وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ﴾ وە بەدڵێکـی ڕوو لە خـواوە گەڕابێتەوە (بـۆ لامان) (٣٣) ﴿ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ﴾
(پێیان دەووترێت) هەمووتان بڕۆنە ناو بەهەشـتەوە، دڵنیا و بێ ترس بن (لەسزاو ناخۆشی) ﴿ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ﴾
ئەم ڕۆژە ڕۆژی هەمیشەیی و نەمری یە (٣٤) ﴿لَهُم مَّا يَشَاءُونَ فِيهَا﴾ لەو بەهەشتەدا هەرچیان بوێت بۆیان ئامادەیە
﴿وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾ وە لەوە زیاتریشمان هەیە (کە بینینی خوای گەورەیە) (٣٥)

﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ﴾ وەپێش ئەمان گەل و چینی زۆرمان لەناوبرد ﴿هُمۡ أَشَدُّ مِنۡهُم بَطۡشٗا﴾ کەئەوان لەمانیش بەهێزتر بوون ﴿فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾ خۆ شاران و وولاتانیان پشکنیوە و گەڕاوون ﴿هَلۡ مِن مَّحِيصٍ﴾ ئایا هیچ پەنا گایەك هەبوو (بۆیان لەمردن) ﴿٣٦﴾ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ﴾ بێگومان لەم (باسەدا) پەندو ئامۆژگاری هەیە ﴿لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ﴾ بۆ کەسێك خاوەن دڵێکی (زیندوو بێت یان ژیربێ) ﴿أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ﴾ یاگوێ بگرێ (بۆ قورئان) و بیریشی لەلای بێت ﴿٣٧﴾ ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا﴾ سوێند بەخوا بێگومان دروستمان کردووە ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا﴾ ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندایە ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾ لە شەش ڕۆژدا ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٖ﴾ وە هیچ ماندوو بوونێکمان تووش نەبوو ﴿٣٨﴾ ﴿فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾ کەواتە (ئەی موحەممەد ﷺ) خۆ گرببە بەرامبەر ئەو (قسە نابەجێ یانە)ی کەدەیڵێن ﴿وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ﴾ بەستایشی پەروەردگارت تەسبیحات بکە ﴿قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ﴾ پێش هەڵهاتنی خۆرو ﴿وَقَبۡلَ ٱلۡغُرُوبِ﴾ پێش ئاوا بوونیشی ﴿٣٩﴾ ﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ﴾ وە لەبەشێك لەشەودا ستایشی پەروەردگارت بکە ﴿وَأَدۡبَٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾ وە لەپاش نوێژەکانیش ﴿٤٠﴾ ﴿وَٱسۡتَمِعۡ يَوۡمَ﴾ وە گوێ بگرە لەڕۆژێکدا ﴿يُنَادِ ٱلۡمُنَادِ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ﴾ جاڕ دەرێك لەشوێنێکی نزیکەوە بانگ دەکات ﴿٤١﴾ ﴿يَوۡمَ يَسۡمَعُونَ ٱلصَّيۡحَةَ بِٱلۡحَقِّۚ﴾ ڕۆژێ کە نەعرەتەیەك (دەنگێکی گەورەی ترسناك) بەڕاستیی دەبیستن ﴿ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُرُوجِ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژی هاتنەدەرەوەیە (لەگۆرەکان) ﴿٤٢﴾ ﴿إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ﴾ بێگومان هەر ئێمەین دەژێنین و دەشمرێنین ﴿وَإِلَيۡنَا ٱلۡمَصِيرُ﴾ گەڕانەوەش هەر بۆلای ئێمەیە ﴿٤٣﴾ ﴿يَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلۡأَرۡضُ عَنۡهُمۡ﴾ ڕۆژێك دێت زەوی لەئاست ئەوانە (ی مردوون) قڵیش دەبات ﴿سِرَاعٗاۚ﴾ بەپەلە (دێنە دەرەوە) ﴿ذَٰلِكَ حَشۡرٌ عَلَيۡنَا يَسِيرٞ﴾ ئەو کۆکردنەوە بەلای ئێمەوە ئاسانە ﴿٤٤﴾ ﴿نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَۖ﴾ بێگومان ئێمە ئاگادارین بەوەی کەدەیڵێن ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ﴾ تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نی یە ﴿فَذَكِّرۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مَن﴾ کەوایە تۆ بەم قورئانە ئامۆژگاری ئەو کەسە بکە ﴿يَخَافُ وَعِيدِ﴾ کە لەهەڕەشەی من دەترسێ ﴿٤٥﴾

## سورەتی ﴿ ٱلذَّارِيَاتِ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا﴾ سوێند بەو بایانەی کە زۆر شت پرژو بڵاودەکەنەوە بە بڵاوکردنەوە ﴿١﴾
﴿فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا﴾ ئەمجا سوێند بەو هەورانەی کە هەڵگری بارانن ﴿٢﴾ ﴿فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا﴾ ئەمجا سوێد
بەو کەشتیانەی کە بەئاسانی دەگەڕێن (لە ناو دەریادا) ﴿٣﴾ ﴿فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا﴾ ئەمجا سوێند بەو
فریشتانەی کار دابەشکەرن ﴿٤﴾ ﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٞ﴾ بێگومان هەر بەڵێنێ کە پێتان دەدرێ ڕاستە ﴿٥﴾
﴿وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٞ﴾ وە بەڕاستی (ڕۆژی) پاداشت و تۆڵە ڕوودەدات ﴿٦﴾

﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ﴾ وەسوێند بەئاسمانی خاوەن ڕێگای زۆر (خاوەن جوانی و ڕێك و پێکی) ﴿٧﴾
﴿إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ﴾ بێگومان ئێوە لەقسە و گوفتاری جیاوازدان ﴿٨﴾ ﴿يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ﴾ ئەو کەسە
لادەدرێت لەئیمان کەلادراوە (چونکە خۆی گومڕایە) ﴿٩﴾ ﴿قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ﴾ دەك بەکوشت چن ئەو
درۆزنانە(و نەفرینیان لێ بێ) ﴿١٠﴾ ﴿الَّذِينَ هُمْ﴾ ئەوانە کەسانێکن ﴿فِي غَمْرَةٍ سَاهُونَ﴾ لەگێژاوی نەزانیدا بێ
ئاگان (لەهەموو شت) ﴿١١﴾ ﴿يَسْأَلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ الدِّينِ﴾ (بەگاڵتەوە) دەپرسن کەی ڕۆژی دوایی دێت ﴿١٢﴾
﴿يَوْمَ هُمْ﴾ ڕۆژێك (سزا دەدرێن) کەئەوان ﴿عَلَى النَّارِ يُفْتَنُونَ﴾ بەئاگری دۆزەخ دەسوتێنرێن ﴿١٣﴾
﴿ذُوقُوا فِتْنَتَكُمْ﴾ (پێیان دەووترێت) سزاکەتان بچەژن ﴿هَذَا الَّذِي﴾ ئەمە ئەو (سزایە) ﴿كُنتُم بِهِ
تَسْتَعْجِلُونَ﴾ (بەگاڵتەوە) بە پەلە داواتان دەکرد ﴿١٤﴾ ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ﴾ بێگومان پارێزکاران و لەخواترسان
﴿فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ وان لە باخات و کەناری سەرچەشمەی ڕەواندا ﴿١٥﴾ ﴿آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ﴾ ئەوەی خوا
پێی داوون وەری دەگرن ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ﴾ (چونکە) بێگومان ئەوان لەوەو پێش چاکەکار
بوون ﴿١٦﴾ ﴿كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ﴾ ئەوانە کەمێك لەشەودا ﴿مَا يَهْجَعُونَ﴾ دەخەوتن (ئەوی تری شەو نوێژیان
دەکرد) ﴿١٧﴾ ﴿وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ وە لەبەرەبەیاناندا داوای لێخۆشبوونیان دەکرد ﴿١٨﴾ ﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ﴾ وە
لە ماڵ و دارایی یاندا ﴿حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ بۆ (هەژاری) داواکەرو داوانەکەر مافی خۆیان هەبوو ﴿١٩﴾
﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ﴾ وەلەزەویدا بەڵگە و نیشانە هەیە بۆ باوەڕداران ﴿٢٠﴾ ﴿وَفِي أَنفُسِكُمْ﴾ وە
لەخودی خۆشتاندا (بەڵگەی زۆر هەیە) ﴿أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ دەی ئایا بۆ وورد نابنەوە و سەرنج نادەن ﴿٢١﴾
﴿وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ﴾ وەڕزق و ڕۆزی ئێوە و ئەو بەڵێنانەی پێتان دەدرێ لەئاسمانە ﴿٢٢﴾ ﴿فَوَرَبِّ
السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾ جا سوێند بەپەوەردگاری ئاسمان و زەوی ﴿إِنَّهُ لَحَقٌّ﴾ بێگومان ئەوە(ی باسکرا) هەق
و ڕاستە ﴿مِّثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ﴾ بەوێنەی ئەو قسانەی خۆتان دەیکەن ﴿٢٣﴾ ﴿هَلْ أَتَاكَ﴾ ئایا پێت گەشتووە
﴿حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ﴾ بەسەرهاتی میوانە ڕێزدارەکانی ئیبراهیم ﴿٢٤﴾ ﴿إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ﴾ کاتێ چوونە
لای ئیبراهیم و ﴿فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ﴾ ووتیان سڵاو (ئەویش) ووتی سڵاو لەخۆتان ﴿قَوْمٌ مُّنكَرُونَ﴾
(ئێوە) کەسانێکی نەناسراوون ﴿٢٥﴾ ﴿فَرَاغَ إِلَى أَهْلِهِ﴾ جا خێرا چوو بۆلای خێزانەکەی ﴿فَجَاءَ بِعِجْلٍ
سَمِينٍ﴾ ئەمجا گوێرەکەیەکی قەڵەوی (بەبرژاوی بۆیان) هێنا ﴿٢٦﴾ ﴿فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ﴾ وەنزیکی کردەوە
لێیان (بەڵام نەیان خوارد) ﴿قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ﴾ ووتی ئەوە ناخۆن؟ ﴿٢٧﴾ ﴿فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً﴾ ئەوسا لێیان
ترسا ﴿قَالُوا لَا تَخَفْ﴾ ووتیان مەترسە (ئێمە نێردراوی خواین) ﴿وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ﴾ وە مزگێنیان پێ دا
بەکوڕێکی دانا (کەئیسحاقە) ﴿٢٨﴾ ﴿فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ﴾ جاژنەکەی قریوەیەکی کرد و هات ﴿فَصَكَّتْ
وَجْهَهَا﴾ وە دای بەڕوومەتی خۆیدا (وەك باووی ژنان) ﴿وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ﴾ وە ووتی پیرەژنێکی نەزۆك
(چۆن منداڵی دەبێ) ﴿٢٩﴾ ﴿قَالُوا كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ﴾ (فریشتەکان) ووتیان پەروەردگارت وای فەرمووە
﴿إِنَّهُ هُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ﴾ بێگومان هەر خوا کار بەجێ ی زانایە ﴿٣٠﴾

﴿قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ (ئیبراهیـم) ووتی: چیتان پێ سـپێردراوه ئـەی نێرراوانی خوا ﴿٣١﴾ ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّآ
أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ﴾ ووتیان بێگومان ئێمه نێرراوین بۆ سەر گەلی تاوانباران ﴿٣٢﴾ ﴿لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن
طِينٍ﴾ بـۆ ئـەوەی ببارێنیـن به سـەریاندا بـەرد له گڵی سـورەوە کـراوی ﴿٣٣﴾ ﴿مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ﴾
نیشانه کراو لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ له سنوور دەرچوان ﴿٣٤﴾ ﴿فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەمجا
هەرچـی بوو لەو (شـارەی لووط) دا له بـڕواداران دەرمان کردن ﴿٣٥﴾ ﴿فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾
وه نەمانـدی تێیـدا بێجگـه لەیـەك ماڵی موسـڵمان نەبێـت (ئەویش ماڵی لـووط بوو) ﴿٣٦﴾ ﴿وَتَرَكْنَا فِيهَآ
ءَايَةً﴾ وەپەند و نیشـانەیەکمان تێدا بەجێ هێشـت ﴿لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾ بۆ ئەوانەی که له سزای
به ئازار دەترسـن ﴿٣٧﴾ ﴿وَفِى مُوسَىٰٓ إِذْ أَرْسَلْنَٰهُ﴾ هەروەها لەبەسەر هاتی مووسادا (چەند بەڵگەو پەند هەیە)
کاتـێ کەناردمـان ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾ بۆ لای فیرعەون به بەڵگەی ڕوون و ئاشـکراوه ﴿٣٨﴾ ﴿فَتَوَلَّىٰ
بِرُكْنِهِۦ﴾ فیرعەونیش ڕوی وەرگێڕا و سـەرپێچی کرد بەهۆی دەسـەڵاتەکەیەوە ﴿وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ﴾ وه
ووتی: (مووسـا) جادووگـەره یان شـێته ﴿٣٩﴾ ﴿فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ﴾ ئێمەش خۆی و لەشکرەکەیمان گرت
﴿فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ﴾ و فڕێمـان دانـه نـاو دەریـاوه ﴿وَهُوَ مُلِيمٌ﴾ که ئەو شـیاوی لۆمه کـردن بوو ﴿٤٠﴾ ﴿وَفِى
عَادٍ﴾ وه له گەلی عاددا بەڵگەو پەند هەیە ﴿إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ﴾ کاتێ که ناردمانه سـەریان ﴿ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ﴾
بای (گەرمی توندی) بێ خێر ﴿٤١﴾ ﴿مَا تَذَرُ مِن شَىْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ﴾ بەسـەر هەر شـتێکدا بڕۆیشـتایه وازی لێ
نەدەهێنـا ﴿إِلَّا جَعَلَتْهُ كَٱلرَّمِيمِ﴾ هەتـا وەك ڕزیوی لێ ئەکرد ﴿٤٢﴾ ﴿وَفِى ثَمُودَ﴾ وه له گەلی سـەموددا (پەند
وئامۆژگـاری هەیه) ﴿إِذْ قِيلَ لَهُمْ﴾ کاتێ که پێیان ووترا ﴿تَمَتَّعُوا۟ حَتَّىٰ حِينٍ﴾ ڕابوێرن تا کاتی خۆی دێت
﴿٤٣﴾ ﴿فَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ﴾ جـا ئـەوان سەرکەشیان کـرد لەفەرمانـی پەروەردگاریان ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ﴾
ئەمجا هەوره بروسـکه لێیـدان ﴿وَهُمْ يَنظُرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان (تیاچوونـی خۆیانیان) بەچاو دەبینی
﴿٤٤﴾ ﴿فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مِن قِيَامٍ﴾ ئیتر نەیانتوانی هەسـتنەوە ﴿وَمَا كَانُوا۟ مُنتَصِرِينَ﴾ وه سـەرکەوتوویش نەبوون
﴿٤٥﴾ ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ﴾ وه گەلـی نووحیـش لەپێش ئەماندا بوو ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ﴾ که بەڕاسـتی
گەلێکی بەدکارو لەسـنوور دەرچـوو بوون ﴿٤٦﴾ ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْي۟دٍ﴾ و ئاسـمانمان بەهێزو توانایەکی
گەوره دروسـت کردووه ﴿وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ وه ئێمه بەڕاسـتی فراوانکەری (ئاسـمانین) بـه بەردەوامی
﴿٤٧﴾ ﴿وَٱلْأَرْضَ فَرَشْنَٰهَا﴾ وه زەویمـان ڕاخسـتووه ﴿فَنِعْمَ ٱلْمَٰهِدُونَ﴾ ئـای چ ڕاخەرێکـی چاکین ئێمه ﴿٤٨﴾
﴿وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ﴾ وه لـه هەمـوو شـتێك جووتێـك (نێـر و مـێ) مان دروسـت کـردووه.
﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ بـۆ ئـەوەی بیربکەنـەوه و پەندی لێ وەربگرن ﴿٤٩﴾ ﴿فَفِرُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ئەمجـا بەپەله بەرەو
لای خوا بڕۆن ﴿إِنِّى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ بەڕاسـتی من لەلایەن خواوه ترسـێنەرێکی ئاشکراو ڕوونم بۆ
ئێوه ﴿٥٠﴾ ﴿وَلَا تَجْعَلُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ وه لەگەڵ خوادا پەرستراوی تر دامەنێن ﴿إِنِّى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾
بەڕاستی من لەلایەن خواوه ترسێنەرێکی ئاشکراو ڕوونم بۆ ئێوه ﴿٥١﴾

﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ﴾ هـەر بـەم شـێوەیە هیـچ پێغەمبەرێـك نەهاتـووە بـۆ لای ئوممەتانی
پێش ئەمـان ﴿إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ﴾ مەگـەر ووتوویانە(بـەو پێغەمبـەرە) جادووگـەرە یان شـێتە (٥٢)
﴿أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦ﴾ ئایا(ئەمـان و ئـەوان) ڕاسـپاردەیان بۆیەکتـری کـردووە؟ ﴿بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ﴾ (نەخێر)
بەڵکـو ئەمـان گەلێکـی سـەرکەش و یاخییـن (٥٣) ﴿فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ﴾ تۆ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) ڕوویان
لێ وەرگێڕە ﴿فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٖ﴾ چونکە تۆ لۆمە کراو نیت (٥٤) ﴿وَذَكِّرۡ﴾ وە ئامۆژگاریان بکەو بیریان بخەرەوە
﴿فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ چونکە بەڕاستی ئامۆژگاری (ئەگەر سوودی بۆ بێ بڕوایان نەبێ) سوود
ئەگەیەنـێ بەبـڕواداران (٥٥) ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ﴾ وە من جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە
دروسـت کـردووە کەبەندایەتـی من بکـەن (٥٦) ﴿مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ﴾ من هیـچ ڕۆزییەکم نـاوێ لێیان.
﴿وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ﴾ ناشمەوێ خواردنم بدەنێ (٥٧) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ﴾ بەڕاستی تەنها خوا خۆی ڕۆزی
دەرە ﴿ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ﴾ کە خاوەن دەسەڵاتی زۆر بەهێزە (٥٨) ﴿فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبٗا﴾ ئەمجا بێگومان
بۆ ئەوانەی ستەمیان کردووە، سزای زۆرمان بۆ ئامادە کردوون ﴿مِّثۡلَ ذَنُوبِ أَصۡحَٰبِهِمۡ﴾ هەروەك چۆن بۆ
هاوەڵ وهاوبیرەکانیان ئامادەمانکردووە ﴿فَلَا يَسۡتَعۡجِلُونِ﴾ دەی با ئیتر پەلە نەکەن (لە داواکردنی سـزا)
(٥٩) ﴿فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ سا هاوار بۆ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿مِن يَوۡمِهِمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ﴾ لەو ڕۆژەی
کە هەڕەشەیان پێ لێکراوە (٦٠)

## سورەتی ﴿ٱلطُّورِ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَٱلطُّورِ﴾ سـوێند بـە کێـوی طـوور (بـەو کێوەی مووسـا لەسـەری قسـەی لەگەڵ خـوای گەورە
کـرد) (١) ﴿وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ﴾ وە بەکتێبـی نووسـراو (مەبەسـت پێـی قورئانـە) (٢) ﴿فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ﴾
لەچەنـد پەڕەیەکی بڵاوکراوە (قورئان نووسـراوەتەوە لەچەنـد پەڕەیەکدا) (٣) ﴿وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ﴾ وە
سـوێند بەو خانەی ئاوەدانە (بیت المعمور: جێگایەکە لە ئاسـمان، فریشـتەکان هەمیشـە بەدەوریدا
دێـن ودەچـن، بەوانـەوە ئاوەدانـە) (٤) ﴿وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ﴾ وە سـوێند بەبانـی بڵندکـراو (ئاسـمانی
دونیـا) (٥) ﴿وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ﴾ وە سـوێند بەدەریـای پـڕ کـراو (لـە ئـاو یـان ئاگـری داگیرسـاو) (٦)
﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ﴾ بێگومـان سـزای پەروەردگارت(بـۆ بـێ بڕوایـان) دەبـێ (٧) ﴿مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ﴾
هیـچ بەرگـری کـەری نـی یـە (٨) ﴿يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوۡرٗا﴾ ڕۆژێـك کەئاسـمان زۆر تونـد دەکەوێتە
جوڵـە و هاتوچـۆ (٩) ﴿وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا﴾ وە چیـاکان (لەجێـی خۆیـان) دەجووڵێـن و تونـد
دەڕۆن (١٠) ﴿فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ کەواتـە لـەو ڕۆژەدا هـاوار بـۆ بـێ بـاوەڕان (١١) ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ
يَلۡعَبُونَ﴾ ئەوانـەی کـە لەکاری نـاڕەوادا ڕۆدەچن و هەمیشـە گاڵتە وگـەپ دەکەن (١٢) ﴿يَوۡمَ يُدَعُّونَ
إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا﴾ ڕۆژێ پاڵیـان پێـوە دەنـرێ بـەرەو ئاگـری دۆزەخ چـۆن پـاڵ پێوەنانێـك (١٣)
﴿هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ (پێیان دەووترێت) ئەمە ئەو ئاگرەیە کەئێوە بە درۆتان دەزانی (١٤)

﴿أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ﴾ ئایا ئەم ئاگرە جادووە ﴿أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ﴾ یان ئێوە نابینن ﴿١٥﴾ ﴿ٱصْلَوْهَا﴾ بچنە ناویەوە
﴿فَٱصْبِرُوٓا۟ أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟﴾ ئەمجا ئارام بگرن یا نەیگرن ﴿سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ﴾ یەکسانە بۆتان ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ
تَعْمَلُونَ﴾ بێگومان هەر تۆڵەی ئەو کردەوانەی دەتانکرد لێتان دەسەنرێتەوە ﴿١٦﴾ ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ
وَنَعِيمٍ﴾ بە ڕاستی پارێزکاران ولەخواترسان لە ناو باخات و نیعمەتەکانی بەهەشتدان ﴿١٧﴾ ﴿فَٰكِهِينَ بِمَآ
ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ﴾ چێژ ئەبەن لەو شتانەی پەروەردگاریان پێی بەخشیوون ﴿وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾
وە پەروەردگاریان پاراستوونی لەسزای دۆزەخ ﴿١٨﴾ ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟﴾ (پێیان دەووترێت) بخۆن و
بخۆنەوە ﴿هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ نۆشی گیانتان بێت بەهۆی ئەوچاکانەی لەدونیادا دەتانکرد ﴿١٩﴾
﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ﴾ پاڵیان داوەتەوە لەسەر کورسی و قەنەفەی ڕیزکراو ﴿وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ﴾ وە
حۆریانی چاو گەش و چاو گەورەمان کردە هاوسەریان ﴿٢٠﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ وە ئەوانەی بڕوایان هێناوە
﴿وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ﴾ وە نەوەکانیشیان دوایان کەوتوون بەئیمانەوە ﴿أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ نەوەکانیان
دەگەیەنین پێیان (لەپلەی بەهەشتدا) ﴿وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ﴾ وە هیچ لە کردەوەی (باوکە)
کانیان کەم ناکەینەوە ﴿كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾ هەرکەسە بارمتەی کردەوەکانی خۆیەتی ﴿٢١﴾
﴿وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ﴾ وە بەردەوام هەموو جۆرە میوە و گۆشتێکیان پێ دەدەن ﴿مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ لەوەی
ئارەزووی دەکەن ﴿٢٢﴾ ﴿يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا﴾ لەو (بەهەشتە)دا پەرداخی شەراب لە یەکتری وەردەگرن
﴿لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ﴾ نە قسەی پڕوپووچی تێدایە و نە گوناە کردن ﴿٢٣﴾ ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ﴾ دەگەڕێن
بەسەریاندا کوڕانی نەوجەوانی ئێسك سووکی خۆیان وخزمەتیان دەکەن ﴿كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ﴾
وەك مرواری ناو سەدەفن (لە جوانی وپاکی دا) ﴿٢٤﴾ ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ بەهەشتییەکان ڕوو دەکەنە
یەکتری و ﴿يَتَسَآءَلُونَ﴾ پرسیار لە یەکتری دەکەن ﴿٢٥﴾ ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ﴾ ئەڵێن: بەڕاستی
ئێمە پێشتر لەناو کەس وکارماندا دەترساین (لەسزای دۆزەخ) ﴿٢٦﴾ ﴿فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا﴾ ئەوەتە خوا منەتی
نابەسەرماندا ﴿وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ﴾ وە لەسزای دۆزەخ پاراستینی ﴿٢٧﴾ ﴿إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ﴾
بەڕاستی ئێمە لەمەو پێش خوامان دەپەرست و هاوارمان لێ دەکرد ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی
ئەو چاکەکارێکی میهرەبانە ﴿٢٨﴾ ﴿فَذَكِّرْ﴾ جا (ئەی موحەممەد ﷺ) یادیان خەرەوە ﴿فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ
رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ﴾ چونکە تۆ بەهۆی نیعمەتەکانی پەروەردگارتەوە نەفاڵچیت ونەشێتیت ﴿٢٩﴾
﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ﴾ نەء بەڵکو دەڵێن (موحەممەد ﷺ) شاعیرە ﴿نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ﴾ چاوەڕوانی مردنی
دەکەین ﴿٣٠﴾ ﴿قُلْ تَرَبَّصُوا۟﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: چاوەڕوان بن ﴿فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ﴾
بێگومان منیش لە گەڵتاندا لەچاوەڕوانانم ﴿٣١﴾

﴿أَمۡ تَأۡمُرُهُمۡ أَحۡلَٰمُهُم بِهَٰذَآۚ﴾ ئاخۆ فام و ژیرییان فەرمانیان پێ ئەدا بەم قسانە ﴿أَمۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ﴾ (نەخێر)
بەڵکو ئەمانە گەلێکی سەرکەش و یاخین ﴿٣٢﴾ ﴿أَمۡ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥۚ﴾ یا دەڵێن قورئان (موحەممەد ﷺ)
خۆی هەڵیبەستووە؟ ﴿بَل لَّا يُؤۡمِنُونَ﴾ (نەخێر وانییە) بەڵکو بڕوا ناهێنن ﴿٣٣﴾ ﴿فَلۡيَأۡتُواْ بِحَدِيثٖ مِّثۡلِهِۦٓ﴾ دەی
با ئەوان(بێ باوەڕەکان) نموونەیەکی وەك قورئان بهێنن ﴿إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست ئەکەن،
(کە هەڵبەستراوی مرۆڤە) ﴿٣٤﴾ ﴿أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ﴾ ئایا ئەوان (بێ خالقێك) لە خۆیانەوە دروست
بوون ﴿أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ﴾ یان خۆیان (خالق) ودروستکەری خۆیانن؟ ﴿٣٥﴾ ﴿أَمۡ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۚ﴾
ئەی ئایا ئەوان ئاسمانەکان و زەویان دروست کردووە ﴿بَل لَّا يُوقِنُونَ﴾ (نەخێر وا نی یە) بەڵکو
دڵنیانین و گومانمان هەیە ﴿٣٦﴾ ﴿أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَبِّكَ﴾ ئەی ئایا گەنجینەکانی پەروەردگاری تۆ لای
ئەوانە؟ ﴿أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَۜيۡطِرُونَ﴾ یان ئایا هەر ئەوان دەسەڵاتدار و زاڵن ﴿٣٧﴾ ﴿أَمۡ لَهُمۡ سُلَّمٞ يَسۡتَمِعُونَ فِيهِۖ﴾
یان پەیژەیەکیان هەیە (پێیدا سەربکەون بۆ ئاسمان و) گوێ بگرن تێیدا (لە هەواڵی ئاسمان)؟
﴿فَلۡيَأۡتِ مُسۡتَمِعُهُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ﴾ جا (ئەگەر ڕاست ئەکەن) با گوێ گرەکەیان بەڵگەیەکی ڕوون بێنێت
﴿٣٨﴾ ﴿أَمۡ لَهُ ٱلۡبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلۡبَنُونَ﴾ یان ئایا کچان بۆ خوایەو کوڕان بۆ ئێوەیە؟ ﴿٣٩﴾ ﴿أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا﴾ یان ئایا
تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) داوای کرێ وپاداشتیانیان لێ دەکەیت؟ ﴿فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ﴾ ئەوانیش
لەبەر بژاردنی باریان گرانە؟ ﴿٤٠﴾ ﴿أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ﴾ یا ئایا زانیاری غەیبیان لایە؟ ﴿فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ﴾ کە
(لەبەری) بنووسنەوە ﴿٤١﴾ ﴿أَمۡ يُرِيدُونَ كَيۡدٗاۖ﴾ ئەی ئایا ئەیانەوێ فێڵ بکەن؟ ﴿فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هُمُ ٱلۡمَكِيدُونَ﴾ دەی
هەربێ باوەڕان فێڵ لێ کراوون ﴿٤٢﴾ ﴿أَمۡ لَهُمۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِۚ﴾ ئەی ئایا پەرستراوێکیان هەیە بێجگە لە خوا؟
﴿سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ خوا پاکە لە هەموو هاوبەشێك کە بۆی بڕیار دەدەن ﴿٤٣﴾ ﴿وَإِن يَرَوۡاْ كِسۡفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
سَاقِطٗا﴾ وە ئەگەر پارچەیەك لە ئاسمان ببینن بکەوێتە خوارەوە ﴿يَقُولُواْ سَحَابٞ مَّرۡكُومٞ﴾ ئەڵێن: (ئەمە)
هەورێکی بەسەریەکداکەوتووە(بارانمان بۆدەبارێنێ) ﴿٤٤﴾ ﴿فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ﴾ دەی لێیان گەڕێ تاتووشی
﴿يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ﴾ ڕۆژی خۆیان دەبن کە تیایدا لەناو دەچن ﴿٤٥﴾ ﴿يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا﴾ ڕۆژێ
کە فێڵەکانیان هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ ﴿وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾ وە هیچ سەرکەوتوو وسەرفراز نابن ﴿٤٦﴾
﴿وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ بە ڕاستی ئەوانەی ستەمیان کردووە (لە خۆیان و بێ بڕوا بوون) بۆیان هەیە.
﴿عَذَابٗا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ سزایەك پێش سزای ڕۆژی دوایی ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نایزانن ﴿٤٧﴾
﴿وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ﴾ چاوەڕوانی بڕیاری پەروەردگارت بە ﴿فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ﴾ چونکە بێگومان تۆ لەپێش
چاو و چاودێری ئێمەدایت (لەم ئایەتەدا جێگیر کردن وباسکردنی سیفەتی چاو بۆ خودا هاتووە ئێمە
بڕوامان پێیەتی بەبێ هیچ لێچواندن ولێکدانەوەیەك، وەشێوەکەی نازانین تەنها خودا دەیزانێت)
﴿وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾ هەرکاتێ (لەخەو) هەستایت تەسبیحات بکە بە ستایشی پەروەردگارت ﴿٤٨﴾
﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ﴾ وە بیپەرستە و ستایشی بکە لە بەشێك لەشەودا ﴿وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ﴾ وە کاتێك ئەستێرەکان
وون دەبن (وپشت هەڵدەکەن) ﴿٤٩﴾

## سورەتی ﴿ ٱلنَّجۡمِ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ﴾ سـوێند بە ئەسـتێرە کاتێ ئـاوا دەبێ ﴿١﴾ ﴿مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ﴾ هاوڕێکەتـان (موحەممەد
ﷺ) گومـڕا نەبـووە ﴿وَمَا غَوَىٰ﴾ وە لـە ڕاسـتی لای نـەداوە ﴿٢﴾ ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ﴾ وە لـە هـەوا
و هەوسـەوە قسـە نـاکات (کـە قورئـان دەخوێنێـت) ﴿٣﴾ ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ هەرچـی دەیڵـێ
(قورئانـەو) نیگا دەکرێت بـۆی ﴿٤﴾ ﴿عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ﴾ (جوبرەئیلی) زۆر بەتوانـا فێری کردووە ﴿٥﴾
﴿ذُو مِرَّةٍ﴾ خاوەنی بیرو هۆشـی بەهێزە ﴿فَاسْتَوَىٰ﴾ جا لەسـەر شێوەی ڕاسـتەقینەی خۆی ڕاوەستاوە
﴿٦﴾ ﴿وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَىٰ﴾ کـە بە ئاسـۆی هـەرە بەرزی ئاسـمانەوە بوو ﴿٧﴾ ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ﴾ پاشـان نزیک
بوویـەوە (لـە موحەممەد ﷺ) و ئەمجا هاتە خـوارەوە ﴿٨﴾ ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ﴾ تا بە ئەندازەی دوو
کـەوان یان کەمتر (ی مـاوە بوو لە گەڵ موحەممـەددا ﷺ) ﴿٩﴾ ﴿فَأَوْحَىٰ إِلَىٰ عَبْدِهِ مَا أَوْحَىٰ﴾ ئەمجا (خوا)
نیگـای کـرد بـۆ بەندەی خـۆی، ئـای چ نیگایەك بـوو ﴿١٠﴾ ﴿مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَىٰ﴾ ئـەوەی (موحەممەد
ﷺ) بەچـاوی سـەر بینـی دڵی (بـڕوای پێ کرد و) بـە درۆی نەزانـی ﴿١١﴾ ﴿أَفَتُمَارُونَهُ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ﴾ جا ئایا
(بـێ بـاوەڕان) ئێـوە دەمەقاڵـێ ی لە گەڵ دەکـەن دەربارەی ئەوەی کـە بە چاوی خـۆی دەی بینێ ﴿١٢﴾
﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ﴾ سوێند بەخوا بێگومان جارێکی تر جوبرەئیلی بینیوە ﴿١٣﴾ ﴿عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَىٰ﴾ لای
درەختی (سـیدرەتولمونتـەها) ﴿١٤﴾ ﴿عِندَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَىٰ﴾ کە لای ئەوەوەیە بەهەشـتی نیشتەجێ بوون ﴿١٥﴾
﴿إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ﴾ ئەو کاتەی (پێغەمبەر ﷺ) ئەو شتە گرنگ وسەر سوڕهێنەرەی بینی کە سیدرەی
داپۆشی چۆن داپۆشینێك ﴿١٦﴾ ﴿مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ﴾ چاوی ئەو (موحەممەد ﷺ) بەملاو لادا نەیـدەڕوانی
(لە مەبەست تێ نەدەپەڕی) ﴿١٧﴾ ﴿لَقَدْ رَأَىٰ﴾ سوێند بەخوا بێگومان بینی ﴿مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَىٰ﴾ گەورەترین
بەڵگـە ونیشـانەی پەروەردگـاری ﴿١٨﴾ ﴿أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّىٰ﴾ دەی پێـم بڵێـن ئایـا لات و عـوززا (کە
دووبتن) ﴿١٩﴾ ﴿وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَىٰ﴾ وە بتی سـێیەم کە مەناتە (ئایا هیچیان پێ دەکرێ) ﴿٢٠﴾ ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ
الْأُنثَىٰ﴾ ئایا ڕاسـتە ئێوە کوڕان بۆ خۆتان و کچان بۆ خودا بەڕەوا و چاك دەزانن؟ ﴿٢١﴾ ﴿تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ
ضِيزَىٰ﴾ ئەگەر وابێ دابەشکردنێکی نادروست دەبێ ﴿٢٢﴾ ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم﴾ ئەم بتانە
هەر ناوانێکی ڕوتن کە ئێوە و باو و باپیرانتان لێتان ناون (بەبێ ناوەڕۆك) ﴿مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ﴾ خوا
هیچ بەڵگەیەکی لەسەر پەرستراوی ئەوان نەناردووەتە خوارەوە ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ﴾
تەنها شوێنی گومان و ئەو شتە دەکەون کە نەفسی خۆیان حەزی لێ یەتی. ﴿وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَىٰ﴾
لـە کاتێکدا کە بەڕاسـتی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هیدایەتیـان بۆ هاتووە ﴿٢٣﴾ ﴿أَمْ لِلْإِنسَانِ مَا تَمَنَّىٰ﴾ ئایا
مـرۆڤ ئـارەزووی هەرچی کرد بـۆی دێتە دی (نەخێـر) ﴿٢٤﴾ ﴿فَلِلَّهِ الْآخِرَةُ وَالْأُولَىٰ﴾ چونکە هەر خوایە
خاوەنی دونیا و دواڕۆژە ﴿٢٥﴾ ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ﴾ وە چەندەها فریشتە کە لە ئاسمانەکاندا هەن
﴿لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا﴾ تـکا و شـەفاعەتیان هیـچ سـوودی نی یە ﴿إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ﴾ مەگـەر دوای
ئەوەی کە خوا مۆڵەت بدات ﴿لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ﴾ بۆ هەرکەسێك کە خۆی بیەوێ و ڕازی بێت پێی ﴿٢٦﴾

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ناهێنن ﴿لَيُسَمُّونَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ﴾ فریشتەکان بە کچی (خوا) ناو دەبەن ﴿٢٧﴾ ﴿وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍۖ﴾ لە کاتێکدا هیچ زانیاریەکیان دەربارەی نی یە ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّۖ﴾ تەنها دوای گومان دەکەون ﴿وَإِنَّ ٱلظَّنَّ﴾ وە بەڕاستی گومان ﴿لَا يُغۡنِي مِنَ ٱلۡحَقِّ شَيۡـٔٗا﴾ هیچ سوودێکی نی یە لەزانینی هەق و ڕاستی دا ﴿٢٨﴾ ﴿فَأَعۡرِضۡ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكۡرِنَا﴾ دەی کەواتە تۆش وازبهێنە لەو کەسە پشت دەکاتە قورئان و یادی ئێمە ﴿وَلَمۡ يُرِدۡ إِلَّا ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا﴾ وە بێجگە ژیانی دونیا هیچی تری ناوێ ﴿٢٩﴾ ﴿ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِۚ﴾ ئەمە ئەوپەڕی زانیاری و تێگەیشتنیانە لەزانیاریدا ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت چاك دەزانێ بەوەی لە ڕێبازەکەی گومڕا بووە ﴿وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱهۡتَدَىٰ﴾ وە چاك دەزانێ بەوەی کە ڕێنووین بووە ﴿٣٠﴾ ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ وە خوا خاوەنێتی هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە ﴿لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ﴾ تا سزای ئەوانە بدات کە خراپەیان کردووە بە پێی کردەوەکانیان ﴿وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى﴾ وە پاداشتی ئەوانە بداتەوە کەچاکەیان کردووە بەچاکەتر (لەوەی کردویانە) ﴿٣١﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ﴾ ئەوانەی کە لەگوناهی گەورە و کردەوەی دزێو خۆیان دەپارێزن ﴿إِلَّا ٱللَّمَمَۚ﴾ جگە تاوانی بچووك نەبێت ﴿إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلۡمَغۡفِرَةِۚ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت لێبوردنی فراوانە ﴿هُوَ أَعۡلَمُ بِكُمۡ إِذۡ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەو لەهەموو کەس بەحاڵی ئێوە زاناترە لەکاتێکدا کە لەزەوی دروستی کردون ﴿وَإِذۡ أَنتُمۡ أَجِنَّةٞ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡۖ﴾ وە کاتێك کە ئێوە کۆرپەلەن ولەسکی دایکتاندان ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ﴾ کەواتە خۆتان بەچاك و پاك دامەنێن ﴿هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ﴾ خوا زاناترە بەو کەسەی زیاتر لە خواترسە ﴿٣٢﴾ ﴿أَفَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي تَوَلَّىٰ﴾ جا ئایا دیت ئەو کەسەی کە پشتی هەڵکرد (لەباوەڕ) ﴿٣٣﴾ ﴿وَأَعۡطَىٰ قَلِيلٗا وَأَكۡدَىٰٓ﴾ (لەوەی بڕیاری دابوو) کەمێکی بەخشی و ئەوەی تری گرتەوە ﴿٣٤﴾ ﴿أَعِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلۡغَيۡبِ﴾ ئایا (ئەو کەسە) زانیاری پەنهانی لایەو ﴿فَهُوَ يَرَىٰٓ﴾ و بەچاو دەیبینێ ﴿٣٥﴾ ﴿أَمۡ لَمۡ يُنَبَّأۡ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ﴾ یان ئایا ئاگادار نەکرابوو بەوەی کە لەپەڕاوەکانی موسادا بوو ﴿٣٦﴾ ﴿وَإِبۡرَٰهِيمَ ٱلَّذِي وَفَّىٰٓ﴾ (وە بەوەی کە لەپەڕاوی ئیبراهیمدا بوو) ئەو ئیبراهیمەی کە پەیمانی خۆی بەچاکی بەجێ هێنا ﴿٣٧﴾ ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰ﴾ (لەوپەڕاوانەدا هاتووە) کە هیچ تاوانبارێك گوناهی تاوانبارێکی تر هەڵناگرێ ﴿٣٨﴾ ﴿وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾ وەبێگومان ئادەمی جگە لەکۆششی خۆی خاوەنی هیچی تر نی یە (لەدوا ڕۆژدا) ﴿٣٩﴾ ﴿وَأَنَّ سَعۡيَهُۥ سَوۡفَ يُرَىٰ﴾ و بێگومان هەوڵ کۆششەکەی لە داهاتوو (لەقیامەت)دا دەبینرێتەوە ﴿٤٠﴾ ﴿ثُمَّ يُجۡزَىٰهُ ٱلۡجَزَآءَ ٱلۡأَوۡفَىٰ﴾ پاشان پاداشت دەدرێتەوە بەتێر و تەواوی ﴿٤١﴾ ﴿وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلۡمُنتَهَىٰ﴾ وە بەڕاستی هەموو کارێك سەرەنجامەکەی هەر بۆ لای پەروەردگارت دەگەڕێتەوە ﴿٤٢﴾ ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ﴾ وە بێگومان هەر ئەویش بەندەکان دەخاتە گریان و پێکەنین ﴿٤٣﴾ ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحۡيَا﴾ وە بێگومان هەر ئەوە دەیانمرێنێ و زیندووشیان دەکاتەوە ﴿٤٤﴾

﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ﴾ وەبەڕاستی هەر ئەوە کە جوتێ نێر و مێی دروست کردووە ﴿٤٥﴾
﴿مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ﴾ لەنوتفەیەك کاتێك دەڕژێنرێتە منداڵدانەوە ﴿٤٦﴾ ﴿وَأَنَّ عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ﴾ وە
بەڕاستی هەر لەسەر خوایە دروست کردنەوەی لەڕۆژی دواییدا ﴿٤٧﴾ ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ﴾ وە
بێگومان هەر ئەویشە کەخەڵکی دەوڵەمەند و هەژار دەکات ﴿٤٨﴾ ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ﴾ وە بەڕاستی
هەر ئەوە پەروەردگاری ئەستێرەی شیعرا ( شیعرا : ئەستێرەیەك بوو خەڵکانێك لەسەردەمی
نەفامیدا دەیانپەرست) ﴿٤٩﴾ ﴿وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ﴾ وەبێگومان هەر ئەو خوایە گەلی عادی
یەکەمی لەناو برد ﴿٥٠﴾ ﴿وَثَمُودَا۟ فَمَآ أَبْقَىٰ﴾ گەلی سەموودیشی لەناوبرد و کەسی نەهێشتن ﴿٥١﴾
﴿وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ﴾ وەگەلی نووحیشی (لەناو برد) لەپێش (عادو سەموود)دا ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ هُمْ أَظْلَمَ﴾
کەبەڕاستی ئەوان ستەم کارترو ﴿وَأَطْغَىٰ﴾ سەر کەش تربوون ﴿٥٢﴾ ﴿وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ﴾ وەگوندە
سەروژێر کراوەکانی (بەزەویدا) بردەخوارەوە (کەگوندەکانی گەلی لووط بوون) ﴿٥٣﴾ ﴿فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ﴾
ئەمجا ئەو گوندانەی داپۆشی (بەجۆرەها سزای سەخت) چۆن داپۆشینێك ﴿٥٤﴾ ﴿فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ﴾
لەکام نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارت ﴿تَتَمَارَىٰ﴾ دوو دڵییت ﴿٥٥﴾ ﴿هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ﴾ ئەم
(پێغەمبەرە) ترسێنەرێکە لە (پێغەمبەرە) ترسێنەرەکانی پێشوو ﴿٥٦﴾ ﴿أَزِفَتِ ٱلْءَازِفَةُ﴾ ڕۆژی دوایی زۆر
نزیك بووەتەوە ﴿٥٧﴾ ﴿لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ﴾ جگە لەخوای گەورە کەس نی یە ئاشکرای بکات
(وبزانێت کەی دێت) ﴿٥٨﴾ ﴿أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ﴾ جا ئایا لەم قورئانە سەرتان سوڕ دەمێنێت؟! ﴿٥٩﴾
﴿وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ﴾ وە پێدەکەنن و ناگریین! ﴿٦٠﴾ ﴿وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ﴾ وە ئێوە سەر گەرم و بێ ئاگان ﴿٦١﴾
﴿فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ۩﴾ دەی سوژدە بەرن بۆ خوا و پەرستشی بکەن ﴿٦٢﴾

## سورەتی ﴿ٱلْقَمَرِ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ﴾ ڕۆژی دوایی نزیك بوویەوە ﴿وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ﴾ وە مانگ لەت بوو ﴿١﴾ ﴿وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً﴾ وە
ئەگەر بێ بڕوایان موعجیزەیەك ببینن ﴿يُعْرِضُوا۟﴾ پشت هەڵدەکەن ﴿وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ﴾ وە دەڵێن ئەمە
جادوویەکی بەردەوامە (و موحەممەد لێیان دەکات) ﴿٢﴾ ﴿وَكَذَّبُوا۟ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ﴾ وەئەو (بت پەرستانە)
باوەڕیان نەهێناو شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتن ﴿وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ﴾ لەکاتێکدا هەموو
کارێك سەرەنجامێکی هەیە ﴿٣﴾ ﴿وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ﴾ بێگومان هەواڵی زۆر (لەناوبردنی یاخییانیان)
پێ گەیشتووە (لەقورئاندا) ﴿مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ﴾ کە بیانگێڕێتەوە (لە بت پەرستی) ﴿٤﴾ ﴿حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ﴾
(قورئان) هەمووی حیکمەتێکی تەواوە ﴿فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ﴾ بەڵام ترساندنی ترسێنەران (بۆ گەلی بێ
بڕوا) سوودی نی یە ﴿٥﴾ ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ﴾ ئەمجا تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) ڕوویان لێ وەرچەرخێنە
﴿يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ﴾ (چاوەڕوانی) ئەو ڕۆژە بکە کە جاڕ دەرێك بانگی خەڵکی دەکات ﴿إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ﴾
بۆ شتێکی زۆر ناخۆش (کەڕۆژی حەشرە) ﴿٦﴾

﴿خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ﴾ (بێ باوەڕان) بەکزوچاو شۆڕی یەوە ﴿يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ﴾ لەگۆڕەکانیان دێنەدەرەوە
﴿كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ﴾ وەك کوللەی پەرش و بڵاون ﴿٧﴾ ﴿مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ﴾ خێرا دوای جاڕ دەرەکە
دەکەون ﴿يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ بێ باوەڕان دەڵێن ﴿هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾ ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر دژوار و سەختە ﴿٨﴾
﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا﴾ پێش ئەمان گەلی نووح بێ باوەڕ بوون، جابەندەی ئێمە (نووح)یان بەدرۆزن دانا
﴿وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ﴾ وە ووتیان (نووح) شێتە ﴿وَٱزْدُجِرَ﴾ وە هەڕەشەیان لێکرد و ڕێگری کرا لەبانگەوازەکەی
﴿٩﴾ ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ﴾ جا (نووح) هاواری کردە پەروەردگاری و ﴿أَنِّى مَغْلُوبٌ﴾ (ووتی) بەڕاستی من شکستم
خواردووە(بێ دەسەڵاتم) ﴿فَٱنتَصِرْ﴾ دەی تۆ یارمەتیم بدە ﴿١٠﴾ ﴿فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ﴾ ئێمەش هەموو
دەرگای ئاسمانمان کردەوە ﴿بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ﴾ بەئاوی بارانی بەلێزمە ﴿١١﴾ ﴿وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا﴾ وە کانیاوی
زۆرمان لەزەویدا هەڵقوڵاند ﴿فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ﴾ جائاوی ئاسمان و زەوی بەیەك گەشتن بەو ئەندازەی
﴿قَدْ قُدِرَ﴾ کە بڕیاری لەسەر درا بوو ﴿١٢﴾ ﴿وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ﴾ وە نووحمان (لەگەڵ شوێن کەوتووانی)
هەڵگرت لەسەر کەشتییەك کە بەچەند پارچە تەختەو ﴿وَدُسُرٍ﴾ بزمار (دروست کرابوو) ﴿١٣﴾
﴿تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا﴾ لە پێش چاوو چاودێری ئێمە دەڕۆیشت (نەمان هێشت نوقم ببێت) (لەم ئایەتەدا
جێگیر کردنی صیفەتی [عین = چاو] بۆ خوای گەورە هاتووە، بەڵام بەشێوەیەك کە شایستەی
گەورەیی و تەواوی زاتی خوا بێت، بەبێ هیچ لێچواندن و لێکدانەوەیەك، وە بڕوامان پێیەتی و
چۆنیەتیەکەی نازانین، تەنها خوا دەیزانێت) ﴿جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾ ئەمە پاداشتە بۆ ئەو کەسەی باوەڕی پێ
نەکرا (کە نووحە) ﴿١٤﴾ ﴿وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً﴾ بێگومان ئەو ڕووداوەمان هێشتەوە تابیبێتە پەندێك. ﴿فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾
جا ئایا کەسێك هەیە پەند وەرگرێ؟ ﴿١٥﴾ ﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ﴾ دەی ئایا سزاو ترساندنم چۆن بوو؟ ﴿١٦﴾
﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئامۆژگاری لێ وەرگرتن
﴿فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾ جا ئایا کەسێك هەیە پەندی لێ وەربگرێت؟ ﴿١٧﴾ ﴿كَذَّبَتْ عَادٌ﴾ گەلی عادیش پێغەمبەرەکەیان
بەدرۆ زانی ﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ﴾ جائایا سزاو ترساندنم چۆن بوو؟ ﴿١٨﴾ ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا﴾
بێگومان ئێمە بایەکی توندی ساردمان ناردە سەریان ﴿فِى يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ﴾ لەڕۆژێکی شوومی سەختدا بە
بەردەوامی ﴿١٩﴾ ﴿تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ﴾ خەڵکی (لە زەوی) هەڵئەگرت وەك بنە دارخورمای لەبێخ
هەڵکەندراوی (لێکردن) ﴿٢٠﴾ ﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ﴾ جا ئایا سزاو هەڕەشەی ئێمە چۆن بوو (لەبێ باوەڕان)؟
﴿٢١﴾ ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ﴾ بەڕاستی قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئامۆژگاری لێ وەرگرتن ﴿فَهَلْ مِن
مُّدَّكِرٍ﴾ جا ئایا کەسێك هەیە پەندی لێ وەربگرێت؟ ﴿٢٢﴾ ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ﴾ گەلی سەموود باوەڕیان بە
پێغەمبەرەکەیان نەهێنا (کە صاڵح پێغەمبەریان بوو علیه السلام) ﴿٢٣﴾ ﴿فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرًا مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ﴾ جاووتیان:
چۆن ئێمە دوای تاکە کەسێك بکەوین لەخۆمان ﴿إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ﴾ ئەگەر دوای تۆ بکەوین ئەوسا
ئێمە لەگومڕایی و شکست داین ﴿٢٤﴾ ﴿أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا﴾ ئایا لەناو هەمووماندا نیگا هەر بۆ ئەو کراوە
بەتەنیا؟ ﴿بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ﴾ (نەخێر) بەڵکو ئەو (صاڵح) پیاوێکی زۆر درۆزنی خود پەسەند و لوت بەرزە ﴿٢٥﴾
﴿سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ﴾ سبەی دەزانن کە کێ زۆر درۆزنی خود پەسەندە ﴿٢٦﴾ ﴿إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ﴾
ئێمە حوشترەکە دەنێرین بۆ تاقی کردنەوەیان ﴿فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ﴾ جا (ئەی صاڵح) چاوەڕوانی سەر
ئەنجامیان بکە و دان بەخۆدا بگرە ﴿٢٧﴾

﴿وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ﴾ وە هەواڵیـان پـێ بـدە کەئاوەکـە لەنێوانـی (حوشـترەکەو ئەو)انـدا بـەش کـراوە
﴿كُلُّ شِرْبٍ مُحْتَضَرٌ﴾ هەریەکەیـان لـە نـۆرە ئـاوی خۆیـدا حازربـێ ﴿٢٨﴾ ﴿فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ﴾ (گەلەکـەی لـەم کارە
بێـزار بـوون) جـا بانگـی هـاوڕێ (خراپە)کەیـان کـرد (قـوداری کـوڕی سـالیف) ﴿فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ﴾ ئەویش
دەسـتی دایـە شمشـێر و (حوشـترەکەی) سـەر بـڕی ﴿٢٩﴾ ﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ جـا تۆڵـەو ترسـاندنی مـن
چـۆن بـۆ بۆیـان؟ ﴿٣٠﴾ ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَاحِدَةً﴾ بێگومـان ئێمـە دەنگێکـی گـەورەی ترسـناکمان بـۆ
نـاردن ﴿فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ﴾ هەمـوو (مـردن وتەفروتونـا بـوون) بەوێنـەی پووشـی ژێـر پـێ ی ئـاژەڵ ﴿٣١﴾
﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ﴾ سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی قورئانمـان ئاسـان کـردووە بـۆ ئامۆژگـاری لـێ وەرگرتن
﴿فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾ جـا ئایـا کەسـێك هەیـە پەنـدی لـێ وەربگرێـت؟ ﴿٣٢﴾ ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ﴾ گەلـی لـووط
باوەڕیـان نەهێنـا بـە پێغەمبەرەکەیـان ﴿٣٣﴾ ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا﴾ بـە ڕاسـتی ئێمـەش ناردمانـە سـەریان
بایەکـی بەهێـز بـەوردە زیخـەوە (ولەنـاوی بـردن) ﴿إِلَّا آلَ لُوطٍ﴾ جگـە لـە کـەس و کاری لـووط نەبێـت
﴿نَّجَّيْنَاهُم بِسَحَرٍ﴾ کـە لـە بەرەبەیانـدا ڕزگارمـان کـردن ﴿٣٤﴾ ﴿نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾ بـە بەزەیـی و ڕەحمەتـی خۆمان
﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي مَن شَكَرَ﴾ هەربەوشێوە پاداشتی سوپاسگوزاران دەدەینەوە ﴿٣٥﴾ ﴿وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا﴾ بەڕاستی (لووط)
گەلەکەی ترساند لەتۆڵەی سەختی ئێمە ﴿فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ﴾ بەڵام ئەوان گومانیان هەبوو لەو ترساندنە وبڕوایان
پێی نەبوو ﴿٣٦﴾ ﴿وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِ﴾ سوێند بەخوا بێگومان (گەلی لووط) داوای میوانەکانیان لێکرد ﴿فَطَمَسْنَا
أَعْيُنَهُمْ﴾ جا ئێمەش چاویانمان کوێر کرد ﴿فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ دە بچەژن سزا و سەرەنجامی هەڕەشەکانم ﴿٣٧﴾
﴿وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ﴾ سوێند بەخوا بێگومان هێرشی بردە سەریان لەبەرەبەیاندا سزایەکی بەردەوام
﴿٣٨﴾ ﴿فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ دەی بچەژن سزاو سەرەنجامی هەڕەشەکانم ﴿٣٩﴾ ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ﴾ سوێند بەخوا
بەڕاستی ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ خوێندنەوەو ئامۆژگاری ﴿فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾ جا ئایا کەسێك هەیە پەندی
لێ وەربگرێت؟ ﴿٤٠﴾ ﴿وَلَقَدْ جَاءَ آلَ فِرْعَوْنَ النُّذُرُ﴾ بێگومان ترسێنەران (مووسا و هاروون) هاتن بۆ سەر فیرعەون
و دەست وپێوەندەکەی ﴿٤١﴾ ﴿كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كُلِّهَا﴾ باوەڕیان بە هەر هەموو نیشانەکانی ئێمە نەکردو بەدرۆیان زانی
﴿فَأَخَذْنَاهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ﴾ جائێمـەش تۆڵەمـان لـێ سـەندن بەتۆڵەسـەندنی کەسـێکی زاڵـی بەتوانـا ﴿٤٢﴾
﴿أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ﴾ ئایـا کافرەکانـی ئێـوە (ئەی خەڵکـی مەککە) باشـترن لەم گەلانەی (کەباسـکران)
﴿أَمْ لَكُم بَرَاءَةٌ فِي الزُّبُرِ﴾ یـان ئێـوە ( ئەماننامەتان) هەیە لـە کتێبە ئاسـمانی یەکاندا ( ودڵنیان کەسـزانادرێن) ﴿٤٣﴾
﴿أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ﴾ یـان دەڵێـن ئێمـە کۆمەڵێکـی سـەرکەوتووین و نابەزیـن ﴿٤٤﴾ ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ
وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ﴾ بێگومـان کۆمەڵەکەیان دەشـکێنرێ و هەڵدێن ﴿٤٥﴾ ﴿بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ﴾ بەڵکـو بەڵێنیان ڕۆژی
دوایی یە ﴿وَالسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ﴾ وە (سزای) ئەو ڕۆژە زۆر سەخت ترو تاڵ ترە ﴿٤٦﴾ ﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ﴾
بەڕاستی تاوانبارەکان لەگومڕایی و شێتی دان ﴿٤٧﴾ ﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ﴾ ئەو ڕۆژەی کە لە ئاگری
دۆزەخـدا بەسـەر ڕوخسـاریاندا ڕادەکێشـرێن ﴿ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ﴾ (پێیان دەڵێـن) بچەژن ئـازاری دۆزەخ ﴿٤٨﴾
﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازە دروست کردووە ﴿٤٩﴾

﴿وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ﴾ وە فەرمانی ئێمە تەنها یەك جارە ﴿كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ﴾ وەك چاو تروكاندنێك (وایە
لەخێراییدا) ﴿٥٠﴾ ﴿وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ أَشۡيَاعَكُمۡ﴾ سوێند بەخوا بێگومان زۆر لە کەسانی بێ باوەڕی وەك
ئێوەمان لەناوبردووە ﴿فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾ جائایا کەسێك هەیە پەندی لێ وەربگرێت؟ ﴿٥١﴾ ﴿وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي
ٱلزُّبُرِ﴾ وە هەر چیەکیان کردووە لە نامەی کردەوەکانیاندایە ﴿٥٢﴾ ﴿وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ﴾ وە
وورد ودرشتی (کردەوەکانیان) هەموو نوسراوە ﴿٥٣﴾ ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ﴾ بێگومان پارێزکاران
ولەخواترسان وان لە باخات و ڕووبارەکانی (بەهەشتدا) ﴿٥٤﴾ ﴿فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ﴾ لە جێگایەکی خۆش
و پەسەندان ﴿عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ﴾ لای پاشایەکی بەدەسەلاتی بە توانان ﴿٥٥﴾

## سورەتی ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ خوای بەخشندە ( ئەو خوایەیە ) ﴿١﴾ ﴿عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ کە قورئانی فێر(ی موحەممەد
ﷺ) وئادەمیزاد کرد، بەئاسانکردنی خوێندنەوە و لەبەرکردن وتێگەیشتنی مانا و واتاکانی) ﴿٢﴾
﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ﴾ ئادەمی دروست کرد ﴿٣﴾ ﴿عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ﴾ وە فێری گفتوگۆی کرد ﴿٤﴾ ﴿ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ
بِحُسۡبَانٖ﴾ ڕۆژو مانگ بە حسابێکی زۆر وورد دێن و دەچن ﴿٥﴾ ﴿وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ﴾ ئەستێرە
و گژوگیاو درەخت (بۆ خوا) سوژدە دەبەن ﴿٦﴾ ﴿وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ﴾ وە ئاسمانی بڵندو
بەرزکردووەتەوە وە تەرازو(ی عەدالەتی) داناوە ﴿٧﴾ ﴿أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ﴾(وە فەرمانی داوە) کە هەرگیز
زیادەڕۆی لەتەرازودانەکەن ﴿٨﴾ ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ﴾ وە کێشانەتان ڕێك بکێشن ﴿وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ﴾
لە تەرازودا کەم و کووڕی مەکەن (سووك مەیکێشن) ﴿٩﴾ ﴿وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ﴾ وە زەوی بۆ خەڵکی
ڕاخستووە ﴿١٠﴾ ﴿فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ﴾ تێدایە میوەهات و دارخورمای خاوەن پۆرك ﴿١١﴾
﴿وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ﴾ وە دانەوێڵەی خاوەن کاو پەل و پۆدار و ڕەیحانە ﴿١٢﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾
جا بەکام لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ ﴿١٣﴾ ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ﴾ ئادەمیی دروست کرد
﴿مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ﴾ لەقوڕێکی ووشکەوە بووی وەك سواڵەت ﴿١٤﴾ ﴿وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ مِن مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ﴾ وە
جنۆکەی دروست کرد لە بڵێسەی ئاگرێکی بێ دووکەڵ ﴿١٥﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام
لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ ﴿١٦﴾ ﴿رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ وَرَبُّ ٱلۡمَغۡرِبَيۡنِ﴾ (خوا) پەروەردگاری
هەر دووڕۆژهەڵات و پەروەردگاری هەر دوو ڕۆژ ئاوایە ﴿١٧﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەی بەکام لە
نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن ﴿١٨﴾

﴿مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ يَلۡتَقِيَانِ﴾ دوو دەریای بەرەڵا کردووە کەدەگەن بەیەك ﴿١٩﴾ ﴿بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ لَّا يَبۡغِيَانِ﴾
لەنێوانیاندا بەربەستێك هەیە تێکەڵی یەکتر نابن ﴿٢٠﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام لە نیعمەتەکانی
پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ ﴿٢١﴾ ﴿يَخۡرُجُ مِنۡهُمَا ٱللُّؤۡلُؤُ وَٱلۡمَرۡجَانُ﴾ لەو دوودەریایە مرواری و مەرجان
دەردەچن (دروست دەبن) ﴿٢٢﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ
ناکەن؟ ﴿٢٣﴾ ﴿وَلَهُ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡمُنشَـَٔاتُ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ﴾ وە بۆ خوایە ئەو کەشتی یە گەورە دروستکراوانەی کە
وەك شاخن لەدەریادا دەگەڕێن ﴿٢٤﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا کام لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان
بەدرۆ دەزانن؟ ﴿٢٥﴾ ﴿كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ﴾ هەرچی دروستکراو لەسەر زەویدا هەیە نامێنێ و تیادەچێ ﴿٢٦﴾
﴿وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ﴾ وە هەر ڕووی پیرۆزی پەروەردگارت دەمێنێت (لەم ئایەتەدا جێگیر کردنی سیفەتی
[وجە = ڕوو] بۆ خوای گەورە هاتووە، بەڵام بەشێوەیەك کە شایستەی گەورەیی و تەواوی زاتی خوابێت،
بەبێ هیچ لێچواندن و لێکدانەوەیەك، وە بڕوامان پێیەتی و چۆنیەتیەکەی نازانین، تەنها خوا دەیزانێت).
﴿ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾ کەخاوەن شکۆی ڕێزدارە ﴿٢٧﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا کام لەنیعمەتەکانی
پەروەردگارتان بەدرۆ دەزانن؟ ﴿٢٨﴾ ﴿يَسۡـَٔلُهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ ئەوەی لەئاسمانەکان و زەوی
دایە (هەموو) داوای (پێویستیان) لەخوا دەکەن ﴿كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ﴾ هەموو ڕۆژێ خوا لە (بەئەنجام
گەیاندنی) کارێکی (گشتی بوونەوەر) دایە (یەك دەمرێنێت، یەك لەدایك دەبێت، یەکێك سەردەخات
ویەکێکی تر دەشکێنێت ....هتد..) ﴿٢٩﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام لە نیعمەتەکانی
پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ ﴿٣٠﴾ ﴿سَنَفۡرُغُ لَكُمۡ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ﴾ لەمەولا موحاسەبەتان دەکەین ئەی گرۆی
ئادەمی و جنۆکە ﴿٣١﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن ﴿٣٢﴾
﴿يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ﴾ ئەی کۆمەڵی جنۆکەو ئادەمی ﴿إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ﴾ ئەگەر توانیتان دەرچن
﴿مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ لەبەشەکانی ئاسمانەکان و زەوی ﴿فَٱنفُذُواْۚ﴾ ئەوە بڕۆن دەرچن.
﴿لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ﴾ ناشتوانن مەگەر بەدەسەلاتێك نەبێت ﴿٣٣﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام لە
نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ ﴿٣٤﴾ ﴿يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا﴾ بۆتان دەنێرێ ﴿شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ﴾
بڵێسەی ئاگر و مسی تواوە (یادوو کەڵی ئاگر) ﴿فَلَا تَنتَصِرَانِ﴾ ئەوسا یارمەتی یەکترتان پێ نادرێت
﴿٣٥﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ ﴿٣٦﴾ ﴿فَإِذَا ٱنشَقَّتِ
ٱلسَّمَآءُ﴾ ئەمجا کاتێك ئاسمان لەت لەت بوو ﴿فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ﴾ وەك گوڵی سوور یان ڕۆنی
هەڵقرچاوی لێهات ﴿٣٧﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ
ناکەن؟ ﴿٣٨﴾ ﴿فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُسۡـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ﴾ ئەمجا لەو ڕۆژەدا پرسیار ناکرێت لەتاوانی ﴿إِنسٞ وَلَا جَآنّٞ﴾
هیچ ئادەمی و جنۆکەیەك (چونکە هەموو کەس لەو ڕۆژەدا بە ڕوویدا دەناسرێتەوە کە تاوانبارە یان
چاکەکار) ﴿٣٩﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ ﴿٤٠﴾
﴿يُعۡرَفُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ بِسِيمَٰهُمۡ﴾ خراپەکاران بەڕوخساریاندا دەناسرێنەوە. ﴿فَيُؤۡخَذُ بِٱلنَّوَٰصِي وَٱلۡأَقۡدَامِ﴾ ئەمجا
ڕائەکێشرێن بەمووی پێشی سەریان و بەقاچیان (بۆ ناو دۆزەخ) ﴿٤١﴾

﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام لەنیعمەتەكانی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن؟ ﴿٤٢﴾ ﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ
بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ ئەمە ئەو دۆزەخەیە كەتاوانباران بەدرۆیان دەزانی ﴿٤٣﴾ ﴿يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ﴾
هاتوچۆ ئەكەن لەنێوان ئەو (دۆزەخە) و ئاوی زۆر گەرمدا ﴿٤٤﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام لە
نیعمەتەكانی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن؟ ﴿٤٥﴾ ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ﴾ وە بۆ ئەو كەسەی لەوەستانی
بەردەم پەروەردگاری بترسێت هەیە ﴿جَنَّتَانِ﴾ دوو باخی (خۆش) ﴿٤٦﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا
كام لەنیعمەتەكانی پەروەردگارتان بەدرۆ دەزانن؟ ﴿٤٧﴾ ﴿ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ﴾ (دوو باخەكە) خاوەنی میوە و
درەختی زۆرن ﴿٤٨﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەی بەكام لە نیعمەتەكانی پەروەردگارتان بێ باوەڕن؟ ﴿٤٩﴾
﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾ تیایاندا هەیە دوو ڕووبار وكانیاووی ڕەوان ﴿٥٠﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام
لە نیعمەتەكانی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن؟ ﴿٥١﴾ ﴿فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾ هەیە لە ناویاندا لەهەر
میوەیەك دوو جۆر ﴿٥٢﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام لە نیعمەتەكانی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن؟
﴿٥٣﴾ ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ﴾ پاڵیان داوەتەوە لەسەر جۆرە فەرشێك ﴿بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ﴾ كە بەرەكانیان
لەئاوریشمی ئەستورە ﴿وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾ وە میوە لێ كردنەوەی ئەو دوو باخە نزیكە دەستە ﴿٥٤﴾
﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام لە نیعمەتەكانی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن؟ ﴿٥٥﴾ ﴿فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ
ٱلطَّرْفِ﴾ لەو باخانەدا هەن حۆریانێك كەتەنها چاویان بڕیوەتە مێردەكانیان ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ﴾
پێش ئەوان دەستی ئادەمی و جنۆكەیان لێ نەكەوتووە ﴿٥٦﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام لە
نیعمەتەكانی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن؟ ﴿٥٧﴾ ﴿كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ﴾ ئەو (حۆری یانە) وەك
یاقووت و مەرجان وان ﴿٥٨﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام لە نیعمەتەكانی پەروەردگارتان
باوەڕ ناكەن؟ ﴿٥٩﴾ ﴿هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ﴾ ئایا پاداشتی چاكە هەر چاكە نی یە؟ ﴿٦٠﴾
﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام لە نیعمەتەكانی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن؟ ﴿٦١﴾ ﴿وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ﴾
وە بێجگە لەو دوو باخەی (كەباسكران) دوو باخی تر هەن ﴿٦٢﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام
لە نیعمەتەكانی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن؟ ﴿٦٣﴾ ﴿مُدْهَآمَّتَانِ﴾ دوو باخی ئەوەندە سەوزن
(لەسەوزیدا ڕەش دەنوێنن) ﴿٦٤﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام لە نیعمەتەكانی پەروەردگارتان
باوەڕ ناكەن؟ ﴿٦٥﴾ ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ﴾ لەو دوو (باخە)دا دوو كانی هەڵقوڵاویان تێدایە ﴿٦٦﴾
﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەكام لەنیعمەتەكانی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن ﴿٦٧﴾ ﴿فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ
وَرُمَّانٌ﴾ لەو دوو (باخەدا لەهەموو جۆرە) میوە ودارخورماو هەنارێكیان تێدایە ﴿٦٨﴾ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا كام لە نیعمەتەكانی پەروەردگارتان بەدرۆ دەزانن ﴿٦٩﴾

﴿فِيهِنَّ خَيۡرَٰتٌ حِسَانٞ﴾ تێیانـدا هەیـە ئافرەتانـی ئـاکار چاکـی ڕواڵـەت جـوان (٧٠) ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ﴾ جا بـەکام لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتـان باوەڕ ناکەن؟ (٧١) ﴿حُورٞ مَّقۡصُورَٰتٞ فِي ٱلۡخِيَامِ﴾
حۆریانێـك لەنـاو خێـوەت و چادرەکانـدا دەرناچـن و دوور ناکەونـەوە (هەمیشـە چاوەڕێـی
هاوسـەرەکانیان) (٧٢) ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام لـە نیعمەتەکانـی پەروەردگارتان باوەڕ
ناکـەن؟ (٧٣) ﴿لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ﴾ پێـش ئـەوان نەدەسـتی ئادەمی و نەدەسـتی جنۆکەیان لێ
نەکەوتـووە (٧٤) ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جا بەکام لـە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟
(٧٥) ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٖ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٖ﴾ پـاڵ دەدەنـەوە بەپشـتی سـەوزباوی ڕازاوە و فەرشـی
زۆر جوانـی نایابـەوە (٧٦) ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ جـا بـەکام لـە نیعمەتەکانـی پەروەردگارتان
بـاوەڕ ناکـەن؟ (٧٧) ﴿تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾ پیرۆزە ناوی پەروەردگـاری خاوەن گەورەیی
وبەخشش (٧٨)

## سورەتی ﴿ الواقعة ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ﴾ کاتێك کە ڕووداوی گەورەی (قیامەت) ڕوویدا (١) ﴿لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾ لەڕودانیدا
هیچ درۆ و گومانێك نی یە (٢) ﴿خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ﴾ نزم کەرەوەی (کەسانێکەو) بەرزکەرەوەیە (بۆ کەسانێکی
تـر) (٣) ﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا﴾ کاتێك کـە زەوی هێنرایە جوولان بـە جوولانێکی توند (٤) ﴿وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ
بَسّٗا﴾ وە شاخەکان زۆر وورد کران بەورد کردن (٥) ﴿فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا﴾ وە بوون بە تەپوتۆزی پرش و
بڵاو (٦) ﴿وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ﴾ وە ئێوە دەبنە سـێ کۆمەڵ (لە دوا ڕۆژدا) (٧) ﴿فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡمَيۡمَنَةِ﴾ ئەمجا یارانی لای ڕاست، کام یارانی لای ڕاست؟ (٨) ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ﴾
وە یارانـی لای چـەپ، کام یارانـی لای چـەپ؟ (٩) ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ﴾ وە پێشـەکەوتوەکان هـەر
خۆیانـن پێـش کەوتوو (١٠) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾ ئەوانەن نزیکانـی (بارەگای خوا) (١١) ﴿فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾
لـە بەهەشـتانی پـڕ نازو نیعمەتـدان (١٢) ﴿ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ کۆمەڵێکـی زۆرن لە (گەلانی) پێشـینان (١٣)
﴿وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ وە کەمێکـن لە پاشـینان (لە ئوممەتـی موحەممەد ﷺ) (١٤) ﴿عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ﴾
لەسەر قەنەفە و کورسی چنرا و بە ئاڵتون (١٥) ﴿مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ﴾ پاڵ ئەدەنەوە لەسەری بەرامبەر
بەیەکتری (١٦)

﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ﴾ تازە لاوی هەمیشەیی بەسەریاندا دەگەڕێن (١٧) ﴿بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾
بەپەرداخ و سوراحیی و گلاسی پڕ لەشەرابی سەرچاوەی ڕەوان (١٨) ﴿لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ﴾
نەسەریان پێ ی دەیێشێت ونەسەرخۆش ئەبن پێ ی (١٩) ﴿وَفَاكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ﴾ میوەهاتیش کەخۆیان
هەڵی بژێرن (٢٠) ﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ وە گۆشتی هەر باڵندەیەك کەحەزی لێ بکەن (٢١) ﴿وَحُورٌ عِينٌ﴾
وەحۆریانی چاو گەش و چاو بەلەك (٢٢) ﴿كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ﴾ وەك مرواری ناو سەدەف وان (٢٣)
﴿جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (ئەم نیعمەتانە) لەپاداشتی ئەو کردەوانەدایە کە ئەنجامیان ئەدا (٢٤) ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا
وَلَا تَأْثِيمًا﴾ نایبیستن لەو بەهەشتانەدا نەقسەی بێهودە، وە نەتاوانبارکردن (٢٥) ﴿إِلَّا قِيلًا سَلَامًا سَلَامًا﴾ جگە
لەووتەی سڵاو سەلام کردن (لەیەکتری) (٢٦) ﴿وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ﴾ وە یارانی لای ڕاست کام
یارانی لای ڕاست (٢٧) ﴿فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ﴾ لەژێر سێبەری دارتاوگی بێ دڕکدان (٢٨) ﴿وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ﴾
وداری مۆزی هۆنراو بەهێشووە مۆز (٢٩) ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾ و سێبەری بەردەوام (٣٠) ﴿وَمَاءٍ مَّسْكُوبٍ﴾
وەئاوی تاڤگەیی و ئاوی ڕەوان (٣١) ﴿وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ﴾ وەمیوەهاتی زۆر (٣٢) ﴿لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ﴾ کە
هەرگیز تەواو نابێ و قەدەغەش ناکرێ (٣٣) ﴿وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ﴾ هەروەها ڕاخەری بەرز زبڵندی تێدایە (٣٤)
﴿إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاءً﴾ ئێمە حۆریەکانی بەهەشتمان دروست کردووە بەدروست کردنێکی زۆر جوان (٣٥)
﴿فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا﴾ وە گێڕاومانن بەحۆریانی هەمیشە کچ (واتە: هەرچەندهاوسەرکانیان بچنە لایان خوای
گەورە بۆیان دەکاتەوە بەکچ) (٣٦) ﴿عُرُبًا أَتْرَابًا﴾ هاوسەرەکانیان زۆر خۆش دەوێت و هاوتەمەنیانن (٣٧)
﴿لِّأَصْحَابِ الْيَمِينِ﴾ (ئەمانە هەموو) بۆ یارانی لای ڕاستن (٣٨) ﴿ثُلَّةٌ مِّنَ الْأَوَّلِينَ﴾ (یارانی لای ڕاست)
کۆمەڵێکی زۆرن لە (گەلانی) پێشیوو (٣٩) ﴿وَثُلَّةٌ مِّنَ الْآخِرِينَ﴾ کۆمەڵێکی زۆریش لەپاشینان (لە
ئوممەتی موحەممەد ﷺ) (٤٠) ﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ﴾ وە هاوڕێیانی لای چەپ کام هاوڕێیانی
لای چەپ؟ (٤١) ﴿فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ﴾ لەناو گڕی دۆزەخ و ئاوی لەکوڵ دان (٤٢) ﴿وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ﴾ وە
لە سێبەری چڕە دووکەڵی ڕەش دان (٤٣) ﴿لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ﴾ نە فێنکە و نە کەڵکیشی هەیە (٤٤)
﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ﴾ چونکە بەڕاستی ئەمانە پێشتر خۆشگوزەران بوون (٤٥) ﴿وَكَانُوا
يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنثِ الْعَظِيمِ﴾ وە بەردەوام بوون لەسەر گوناهە گەورەکە (هاوەڵ دانان بۆ خوا) (٤٦)
﴿وَكَانُوا يَقُولُونَ﴾ وە دەیانووت ﴿أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا﴾ ئایا ئەگەر مردین و بووین بەخۆڵ و ئێسکی
ڕزیو ﴿أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴾ ئایا ئێمە زیندوو ئەکرێینەوە (٤٧) ﴿أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ﴾ یاخود باوو باپیرانمان
(زیندوو ئەکرێنەوە) (٤٨) ﴿قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بێگومان هەموو پێشینان
و پاشینان (٤٩) ﴿لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَاتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ کۆدەکرێنەوە وڕاپێچ دەکرێن بۆکاتی ڕۆژی دیاری
کراو (٥٠)

﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ﴾ پاشان ئێوە ئەی گومڕایانی بێ باوەڕان ﴿٥١﴾ ﴿لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ﴾
بێگومان لە(بەری) درەختی ژەقنەمووت (دەخۆن) ﴿٥٢﴾ ﴿فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ﴾ جا وورگی خۆتانی
لێ پڕدەکەن ﴿٥٣﴾ ﴿فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ﴾ ئەمجا ئاوی کوڵاوی بەسەردا دەخۆنەوە ﴿٥٤﴾ ﴿فَشَارِبُونَ
شُرْبَ الْهِيمِ﴾ دەی خۆنەوە وەکو خواردنەوەی (حوشترانی) تینوو ﴿٥٥﴾ ﴿هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ﴾ ئەمە
میوانداری ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا ﴿٥٦﴾ ﴿نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ﴾ ئێمە دروستمان کردون ئەی
بۆ بڕوا ناکەن (بەزیندوو بوونەوە) ﴿٥٧﴾ ﴿أَفَرَأَيْتُم مَّا تُمْنُونَ﴾ جا پێم بڵێن ئەو ئاوەی کە دەیڕێژنە ناو
منداڵدانەوە؟ ﴿٥٨﴾ ﴿أَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُ﴾ ئایا ئێوە دروستی دەکەن؟ ﴿أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ﴾ یان ئێمەین بەدی
هێنەرین؟ ﴿٥٩﴾ ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾ ئێمە لەناوتاندا مردنمان داناوە، وەکەس
پێش دەسەڵاتی ئێمە ناکەوێ ﴿٦٠﴾ ﴿عَلَىٰ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ﴾ (بەدەسەڵاتین) کە لەجیاتی ئێوە نەوەی
تر بهێنین ﴿وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ وە دروستتان بکەینەوە بەشێوەیەك کەهیچی لێ نازانن
﴿٦١﴾ ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَىٰ﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئێوە لەبەدی هێنانی یەکەمی ئاگادارن
﴿فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ﴾ ئیتر بۆ بیرناکەنەوە ﴿٦٢﴾ ﴿أَفَرَأَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ﴾ جا پێم بڵێن ئەو تۆوەی کەدەیچێنن ﴿٦٣﴾
﴿أَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُ﴾ ئایا ئێوە دەیڕوێنن؟ ﴿أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ﴾ یائێمەین دەیڕوێنین؟ ﴿٦٤﴾ ﴿لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ
حُطَامًا﴾ ئەگەر بمان ویستایە ئەو (ڕواوە)مان دەگێڕا بە پووش و کا ﴿فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ﴾ ئەمجا دەستان
دەکرد بەقسەی بێ کەڵك ﴿٦٥﴾ ﴿إِنَّا لَمُغْرَمُونَ﴾ (دەتانووت) بەڕاستی زەرەرلێکەوتوو ئێمەین ﴿٦٦﴾
﴿بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ بەڵکو ئێمە لە ڕزق وڕۆزی بێ بەشین ﴿٦٧﴾ ﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ﴾ جا پێم
بڵێن ئەو ئاوەی کەدەیخۆنەوە ﴿٦٨﴾ ﴿أَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ﴾ ئایا ئێوە لە هەورەکانەوە دەیبارێنن
﴿أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ﴾ یائێمەدەی بارێنین ﴿٦٩﴾ ﴿لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا﴾ ئەگەربمان ویستایەدەمانکرد بەئاوێکی زۆر
سوێری تاڵ. ﴿فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾ ئیتربۆ سوپاسی خواناکەن ﴿٧٠﴾ ﴿أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ﴾ پێم بڵێن ئەوئاگرەی
کە دایدەگیرسێنن ﴿٧١﴾ ﴿أَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا﴾ ئایا ئێوە دارەکەیتان بەدی هێناوە؟ ﴿أَمْ نَحْنُ الْمُنشِئُونَ﴾
یائێمە بەدی هێنەرینی؟ ﴿٧٢﴾ ﴿نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً﴾ ئێمە ئەو (ئاگرە)مان کردووە بەهۆی یادخەرەوە
(ی ئاگری دۆزەخ) ﴿وَمَتَاعًا لِّلْمُقْوِينَ﴾ وە (کردومانەتە) هۆی کەڵك لێ وەرگرتن بۆ گەشتیاران ﴿٧٣﴾
﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ جا کەواتە یاد وتەسبیحاتی پەروەردگاری گەورەی خۆت بەپاکی بکە
﴿٧٤﴾ ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ﴾ جا سوێند بێت بەشوێنی (هەڵهاتن و ئاوابوونی) ئەستێرەکان ﴿٧٥﴾
﴿وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ﴾ بەڕاستی ئەم سوێندە ئەگەر بزانن سوێندێکی زۆر گەورەیە ﴿٧٦﴾

﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ﴾ کە بێگومان ئەمە قورئانێکی گەورە و بەڕێزە ﴿٧٧﴾ ﴿فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ﴾ لەناو کتێبێکی شاراوەدایە (کەلـوح المحفوظـە) ﴿٧٨﴾ ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ﴾ جگە لە (فریشـتە) پاکـەکان کەس دەستی لێ نادات ﴿٧٩﴾ ﴿تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ﴿٨٠﴾ ﴿أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە بەم قورئانە باوەڕ ناکەن ﴿٨١﴾ ﴿وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ﴾ وە لەجیاتی سوپاسـگوزاری لەسـەر ڕۆزیتان ﴿أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ﴾ ئێوە بـاوەڕ ناهێنن ﴿٨٢﴾ ﴿فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ﴾ دەی بۆچـی کاتێ گیان (ی نەخۆشـەکەتان) دەگاتە گـەرووی ﴿٨٣﴾ ﴿وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ﴾ وە ئێوە لەو کاتەدا تەماشـا دەکەن ﴿٨٤﴾ ﴿وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنكُمۡ﴾ لەو کاتەدا (فریشـتەکانمان) لە ئێوە نزیکترن لەو (کەسـەی لەسەرەمەرگدایە) ﴿وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ﴾ بەلاّم ئێوە (فریشتەکانی) ئێمە نابینن ﴿٨٥﴾ ﴿فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ﴾ دەی بۆچی ئەگەر ئێوە (زیندوو ناکرێنەوەو) پاداشت نادرێنەوە؟ ﴿٨٦﴾ ﴿تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ڕۆحی (مردووەکەتان) بگێڕنەوە ئەگەر ڕاسـت دەکەن ﴿٨٧﴾ ﴿فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ﴾ ئەمجا ئەگەر ئەو (کەسەی لـە گیانـە لادایە) لەنزیکان بێ (لەخوا) ﴿٨٨﴾ ﴿فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ﴾ ئەوە حەسـانەوەو بۆنی خۆش و بەهەشـتی پڕ لەناز و نیعمەتی بۆ هەیە ﴿٨٩﴾ ﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾ وە ئەگەر لەهاوەڵانی دەستی ڕاسـت بـێ ﴿٩٠﴾ ﴿فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾ ئەوە سـەلامەتی و بێ زیانی بـۆ تۆ (چونکە) تـۆ لەیارانی دەسـتی ڕاسـتی ﴿٩١﴾ ﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ بـەلاّم ئەگـەر لـە بـێ باوەڕانـی گومـڕا بێـت ﴿٩٢﴾ ﴿فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ﴾ ئەوە(شـوێنی) میوانداریەکـەی ئێجگـار گەرمـە ﴿٩٣﴾ ﴿وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ﴾ وەچوونە ناو دۆزەخە ﴿٩٤﴾ ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ﴾ بەڕاسـتی ئەوەی (کـە لەم سـورەتەدا باسـکرا) حـەق و بێگومانە ﴿٩٥﴾ ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ﴾ جـا کەوا بـوو بەپاکی یاد وتەسـبیحاتی پەروەردگـاری گەورەی خۆت بکە ﴿٩٦﴾

## سورەتی ﴿الحديد﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ هەرچـی لەئاسـمانەکان و زەویـدا هەیـە تەسـبیحاتی خـوا دەکـەن ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ وە هـەر ئـەوە بالاّدەسـتی کار بەجـێ ﴿١﴾ ﴿لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ هـەر بـۆ ئـەوە دەسـەلاّت و خاوەنیەتـی ئاسـمانەکان و زەوی ﴿يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ﴾ دەژێنـی دەمرێنێ ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ وە ئەو دەسەلاّتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ﴿٢﴾ ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ﴾ هەر ئەوە یەکەمینە (پێش هەموو شـتێك هەبووە) وە هەر ئەوە دواهەمینیشـە و(پاشـی هەموو شـتێك دەمێنێت) ﴿وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ﴾ وە دیارو ئاشکرایە (بۆ خاوەن هۆش وفامەکان بەبەڵگەکانی) وە پەنهان وشاراوەیە (لەچاوی بەندەکان وزانایە بەئاشکرا ونهێنیەکان) ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾ وە ئەو بەهەموو شتێك ئاگادارە ﴿٣﴾

﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ (خودا) ئەو زاتەیە کەئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە
﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾ لەشەش ڕۆژدا ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ﴾ پاشان بەرزبویەوە سەر عەرش و قەراری
گرت (باوەڕمان پێیەتی بەو شێوەی شیاوی خوا بێت، وەچۆنیەتیەکەی نازانین، تەنها خوا
خۆی دەزانێت) ﴿يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ دەزانێت چی دەچێتە ناوی زەوی ﴿وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا﴾ وەچی
لێ دێتە دەرەوە ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ وەچی لەئاسمانەوە دێتە خوار ﴿وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ﴾ وەچی بۆ
سەردەکەوێ ﴿وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ﴾ وە لەهەر کوێ بن خوا لەگەڵتانە (بەزانیاری و ئاگاداری)
﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ وەخوا بینایە بەهەرچی کە دەیکەن (٤) ﴿لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾
خاوەنداریتی ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆ ئەوە ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ وە هەموو کارێك هەر بۆ
لای خوا دەگەڕێنرێتەوە (٥) ﴿يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ﴾ شەو دەبات بەناو ڕۆژدا (لەهاوین و پایزدا)
﴿وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۚ﴾ وە ڕۆژ دەبات بەناو شەودا (لە زستان و بەهاردا) ﴿وَهُوَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ وە
ئەو (خوا) ئاگادارە بەنیازی ناو دڵان (٦) ﴿ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ باوەڕ بهێنن بەخوا و پێغەمبەرەکەی
﴿وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِۖ﴾ و ببەخشن لەو ماڵ وسامانەی کە خوا ئێوەی کردووە بە جێ نشینی
پێشینان تیایدا ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ﴾ ئەمجا ئەوانەتان کە باوەڕی هێناوە و دارایی یان بەخشیوە
﴿لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ﴾ پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە (٧) ﴿وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ ئەوە چیتانە بۆ باوەڕ بەخوا
ناهێنن؟ ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ﴾ کە پێغەمبەر بانگتان دەکات ﴿لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ﴾ کە باوەڕ بە پەروەردگارتان
بهێنن ﴿وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ﴾ لەکاتێکدا کە بێ گومان خوا پەیمانی (باوەڕ هێنانی) لێ وەرگرتوون
﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕدارن (٨) ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ﴾ خوا ئەو زاتەیە دەینێرێت بۆ بەندەی
خۆی (کە موحەممەد ﷺ)ە ﴿ءَايَٰتِۢ بَيِّنَٰتٖ﴾ بەڵگە و ئایەتانێکی ڕوون وئاشکرا ﴿لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى
ٱلنُّورِۚ﴾ تا لەتاریکستانی (گومڕایی وبێباوەڕی) دەرتان بهێنێت بۆ ناو ڕووناکی (ئیمان وئیسلام)
﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ وە بەڕاستی خوا بەرامبەر ئێوە بەسۆز و میهرەبانە (٩) ﴿وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ
ٱللَّهِ﴾ ئەوە چیتانە کەوا هیچ نابەخشن لە ڕێ ی خوادا ﴿وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ لە کاتێکدا میراتی
ئاسمانەکان و زەوی بۆ خوا دەمێنێتەوە ﴿لَا يَسۡتَوِي مِنكُم﴾ یەکسان نین ئەوانەتان ﴿مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ
وَقَٰتَلَۚ﴾ کە لەپێش گرتنی (مەککە)دا ماڵیان بەخشیو و جەنگاون (لەگەڵ ئەوانەی لە دوای فەتحی مەککە
ئەو کارانە بکەن) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ﴾ ئەوانە پلەو پایەیان زۆر گەورەترە ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ﴾
لەوانەی کە لەدوای (گرتنی مەککە) ماڵیان بەخشیوە و جەنگاون ﴿وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ وە بەهەر
دوو لا خوا بەڵێنی بەهەشتی داوە ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ وە خوا ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن (١٠)
﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ﴾ کێ یە ئەو کەسەی قەرز دەدات بەخوا ﴿قَرۡضًا حَسَنٗا﴾ بەقەرزێکی چاك
(مەبەست ئەوەیە ماڵ ببەخشێت لەپێناو خوا) ﴿فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ﴾ تا خواش چەند بەرامبەر بیداتەوە
﴿وَلَهُۥٓ أَجۡرٞ كَرِيمٞ﴾ وە پاداشتی زۆر چاکی بۆ هەیە (١١)

﴿يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ لەرۆژێكـدا كەتۆ پیـاوان و ئافرەتانی ئیماندار دەبینیت ﴿يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ
أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم﴾ كەڕووناكـی (باوەڕیان) لەپێشـیانەوە و لەلای ڕاسـتیانەوە دەڕوات ﴿بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ﴾
(پێیان دەڵێن) مژدەی ئێوە ئەمڕۆ ﴿جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ بەهەشتانێكە كەڕووباری زۆر بەژێریاندا
دەڕوات ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ تێیدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ هەر ئەوەیە سەركەوتنی گەورە
(١٢) ﴿يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ﴾ لەو ڕۆژەدا پیاوان و ئافرەتانی دووڕوو دەڵێن ﴿لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ بەوانەی
كەبـاوەڕدار بوون ﴿انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ﴾ سـەیرێكمان بكەن تا لەڕووناكیتان تروسـكێك وەرگرین
﴿قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ﴾ پێیان دەوترێت بگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان ﴿فَالْتَمِسُوا نُورًا﴾ وە داوای ڕووناكی
بكەن بۆ خۆتان ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ﴾ یەكسەر شوورایەك دەكێشرێ لەنێوانیاندا ﴿لَّهُ بَابٌ﴾ كەدەرگایەكی
تێدایە ﴿بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ﴾ ڕووی ناوەوەی ڕەحمەتی تێدایە ﴿وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ﴾ دەرەوەیشـی ڕووی
لەسـزایە (١٣) ﴿يُنَادُونَهُمْ﴾ (دوو ڕووان ئیمانـداران) بانـگ دەكـەن و دەڵێـن ﴿أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾ ئایـا ئێمە
لەگـەڵ ئێـوە نەبویـن (لـە نوێـژ و ڕۆژوودا) ﴿قَالُوا بَلَىٰ﴾ ئیمانـداران دەڵێـن: بەڵـێ لەگەڵمانـدا بوون
﴿وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ بـەڵام ئێوە خۆتان خەڵەتاند (دووڕوو پیلان گێڕبوون) ﴿وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ﴾ وە
چاوەڕوانـی (نەمانـی باوەڕدارانتان) دەكرد و دوودڵ بوون ﴿وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ﴾ وە هیواو ئاوات فریووی
دان ﴿حَتَّىٰ جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ﴾ تـا فەرمانی خـوا هات( و مردن) ﴿وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ وە شـەیتان فریوی دان بە
لـێ بوردەیـی خوای گەورە (١٤) ﴿فَالْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ﴾ ئەمـڕۆ هیچ بریتیـەك وەرناگیرێت نە لەئێوە
﴿وَلَا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە نـە لـە بـێ باوەڕان بـۆ ڕزگـار بوونتـان ﴿مَأْوَاكُمُ النَّارُ﴾ جێگاتـان ئاگری
دۆزەخـە ﴿هِيَ مَوْلَاكُمْ﴾ ئەو ئاگرە شـیاوتانە ﴿وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئای چەند سـەرئەنجامێكی خراپە (١٥)
﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئایا كاتی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران ﴿أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ﴾ كە دڵیان
ڕاچڵەكێت وملكەچ بێ بۆیادوزیكری خوا﴿وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ﴾ وەبۆ ئەوقورئانەی كەناردویەتیەخوارەوە؟
﴿وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ﴾ وەك ئەوكەسـانە (جوولەكـە و گـاوور) نەبـن ﴿أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ﴾ كـە لەمـەو
پێش كتێبـی ئاسـمانیان پێـدرا ﴿فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ﴾ وە ماوەیەكـی دووروو درێژیـان بەسـەردا تێپـەڕی
﴿فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ ئەمجا دڵیان ڕەق بوو ﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ وە زۆربەیان یاخی و لەسنووردەرچوو بوون
(١٦) ﴿اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الْأَرْضَ﴾ بێگومـان بزانن كەخوا زەوی زینـدوو دەكاتەوە ﴿بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ دوای مردنی
﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ﴾ بێگومان نیشانەو بەڵگەكانمان بۆ ڕوون كردونەتەوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ تابیربكەنەوە (١٧)
﴿إِنَّ الْمُصَّدِّقِينَ وَالْمُصَّدِّقَاتِ﴾ بێگومان پیاوان و ژنانی خێرخواز ﴿وَأَقْرَضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ ئەوانەش قەرز
دەدەن بەخوا بەقەرزێكی چاك (یارمەتی هەژاران دەدەن) ﴿يُضَاعَفُ لَهُمْ﴾ چەند بەرامبەر دەیاندرێتەوە
﴿وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ وە بۆ ئەوان هەیە پاداشتی زۆر چاك (١٨)

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ وە ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە بەخـوا و بەپێغەمبەرانی ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الصِّدِّيقُونَ﴾
ئەوانە خۆیانن ڕاسـت گۆیان ﴿وَالشُّهَدَاءُ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ وەشـەهیدان لـەلای پەروەردگاریان ﴿لَهُمْ أَجْرُهُمْ
وَنُورُهُمْ﴾ خاوەن پاداشت و نور و ڕووناکی خۆیانن ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ وە ئەوانەی کەبێ
باوەڕبوون و بەڵگە و نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانی ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ ئەوانە هاوەڵی ئاگری
دۆزەخن (١٩) ﴿اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ وە بزانن کەبێگومان ژیانی دونیا تەنها ﴿لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ﴾ گاڵتە
و گەمە و ڕازاندنەوە و ﴿وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ﴾ خۆهەڵکێشانە لەنێوانتاندا و لاف لێدانە
بەدارایـی و منداڵـی زۆرەوە ﴿كَمَثَلِ غَيْثٍ﴾ وەك بارانێـك وایە ﴿أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ﴾ كە حاسـڵاتەكەی
جووتیـاران دڵخـۆش بـكات ﴿ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا﴾ پاشـان ووشـك ببـێ و بـەزەردی بـی ببینیـت
﴿ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا﴾ لـە پاشـان ببێت بـە پووش و پـەلاش ﴿وَفِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ لە ڕۆژی دوایشـدا
سـزای توند و سـەخت (هەیە بۆ دونیا پەرستان) ﴿وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ﴾ وە لێ بوردن و ڕەزامەندی
هەیـە لەلایـەن خواوە (بۆ خوا ناسـان) ﴿وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾ وە ژیانی دونیـا هیچ نی یە
جگـە لـە ڕابواردنێکـی خەڵەتێنـەر نەبێـت (٢٠) ﴿سَابِقُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ (کەواتە) پێشـبرکێ بکەن
بۆ (دەسـت خسـتنی) لێخۆشـبوون لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا﴾ وە بۆ بەهەشـتێك كە
پانتایـی یەکـەی ﴿كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾ بەوێنـەی پانتایی ئاسـمان و زەوی یە ﴿أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾
ئامادەکـراوە بـۆ ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە ﴿بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ بەخـوا و پێغەمبەرانـی ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ﴾
ئـەو (پاداشـتە) بەخشـێکی خوایـی یە ﴿يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ﴾ دەیـدات بە هـەر کەس کەخـۆی بیەوێت
﴿وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ وە خـوا خاوەنـی بەخششـی گەورەیـە (٢١) ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ﴾ هیچ زیان و
بەڵایـەك ڕووی نەداوە ﴿فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ﴾ نە لەزەوی و نە لە خـودی خۆتاندا ﴿إِلَّا فِي كِتَابٍ﴾
ئیلـلا لە (لوح المحفوظ) دا نوسـراوە ﴿مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا﴾ پێش ئەوەی بەدی بهێنین ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ
يَسِيرٌ﴾ بێگومان ئەوە بۆ خوا زۆر ئاسانە (٢٢) ﴿لِّكَيْلَا تَأْسَوْا﴾ تا خەفەت نەخۆن ﴿عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ﴾
بۆ ئەوەی لەدەسـتتان چـووە ﴿وَلَا تَفْرَحُوا﴾ وە دڵخۆش و مەغـرور نەبن ﴿بِمَا آتَاكُمْ﴾ بەوەی كە
پێـی داوون ﴿وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ وەخـوا هیـچ خـۆ بـەزل زانێکـی شـانازی کـەری خۆش
ناوێـت (٢٣) ﴿الَّذِينَ يَبْخَلُونَ﴾ ئەوانـەی چرۆکـی و ڕەزیلـی دەکەن (لەماڵ بەخشـین لەپێنـاو خوادا)
﴿وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ﴾ وە فەرمان بەخەڵکیش دەکەن ڕەزیل و چرۆك بن ﴿وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ﴾ وە هەر
کەس پشت هەڵکات ئەوە بێگومان خوا ﴿هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ هەر خۆی بێ نیازی سوپاسکراوە (٢٤)

﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا﴾ سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی ئێمـە پێغەمبەرانـی خۆمانمـان نـاردووە ﴿بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ بە
بەڵگـەو موعجیـزەی ڕوونەوە ﴿وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ﴾ وە کتێبی (ئاسـمانی) و تەرازوی
دادمـان لەگەڵـدا ناردن ﴿لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ﴾ بۆ ئـەوەی خەڵکـی بەدادگەری ڕەفتار بکـەن (لەناو
خۆیانـدا) ﴿وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ﴾ وەئاسـنمان دروسـت کرد ﴿فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ﴾ کـە هێزێکـی بەتینی توندی
تێدایـە بۆجەنـگ کردن ﴿وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾ وە سـوودێکی زۆریشـی هەیە بـۆ خەڵکـی (لەبەرکاهێنانی
لـە هەمـوو جـۆرە پیشەسـازییە خزمەتگوزاریەکانـدا) ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ﴾ وە تـا خـوا دەری بخـات
﴿مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ﴾ چ کەسـێ یارمەتـی (ئاینی) خـواو پێغەمبەرانی دەدات کە پەنهانیشـە ﴿إِنَّ
ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ﴾ بێگومان خوا بەهێزو دەسـەڵاتە (٢٥) ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحٗا وَإِبۡرَٰهِيمَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان
نـووح و ئیبراهیـم مـان ڕەوانەکـرد ﴿وَجَعَلۡنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلۡكِتَٰبَۖ﴾ وە لە نـاو وەچەکانیشـیاندا
پێغەمبەریتـی و کتێبـی ئاسـمانیمان دانـا ﴿فَمِنۡهُم مُّهۡتَدٖۖ﴾ ئەمجـا هەندێکیان ڕێنموونیـان وەرگرت
﴿وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ﴾ وە زۆریشـیان یاخـی و کافربـوون (٢٦) ﴿ثُمَّ قَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا﴾ لـە
پاشان بەشـوێن ئەواندا دیسان پێغەمبەرانی خۆمانمان نارد ﴿وَقَفَّيۡنَا بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ﴾ وە دواتر عیسای
کوڕی مەریەممان نارد ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَۖ﴾ وەئینجیلمان پێ بەخشـی ﴿وَجَعَلۡنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ﴾ وە
لە دڵی ئەوانەدا کەشـوێنی کەوتن ﴿رَأۡفَةٗ وَرَحۡمَةٗۚ﴾ سـۆز و بەزەییمان دروسـت کرد ﴿وَرَهۡبَانِيَّةً
ٱبۡتَدَعُوهَا﴾ وە گۆشە گیری یەك کە خۆیان دایان هێنا بوو ﴿مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ﴾ کە ئێمە ئەوەمان لەسەر
پێویست نەکردبوون ﴿إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ رِضۡوَٰنِ ٱللَّهِ﴾ بەڵام خۆیان دایان هێنا بۆ ڕەزامەندی خوا ﴿فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ
رِعَايَتِهَاۖ﴾ کەچـی وەك پێویسـت پارێزگـاری ئـەو گۆشـەگیرییەیان نەکرد ﴿فَـَٔاتَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۡهُمۡ﴾
ئێمەش بەخشـیمان بەوانەیان کەباوەڕیان هێنا بوو ﴿أَجۡرَهُمۡۖ﴾ پاداشتی خۆیان. ﴿وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ﴾
وە زۆریشـیان لـە سـنوور دەرچـوون (٢٧) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئـەی ئەو کەسـانەی باوەڕتـان هێناوە
﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ﴾ لەخـوا بترسـن و باوەڕبهێنـن بەپێغەمبەرەکـەی ﴿يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ﴾
دوو بەشـتان لەڕەحمەت و بەخششی خۆی پێ دەبەخشێ ﴿وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا﴾ وە ڕووناکییەکتان دەداتێ
﴿تَمۡشُونَ بِهِۦ﴾ کـە ڕێنموونـی وڕێـی ڕاسـتی پـێ دەرکـەن ﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ﴾ وە لێتـان خـۆش دەبێـت
﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ وەخـوا لێ خۆشـبووی میهرەبانە (٢٨) ﴿لِّئَلَّا يَعۡلَمَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ تـا خاوەن پەڕاوە
ئاسمانیەکان بزانن ﴿أَلَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّن فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾ کە دەسەڵاتیان نی یە بەسەر هیچێك لە بەخشیشی
خوا ﴿وَأَنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ﴾ وە هەرچی بەخشش هەیە بە دەست خوایە ﴿يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ﴾ دەیدات بە هەر
کەسێك کە خۆی بیەوێت ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ وە خوا خاوەنی بەخششی زۆر گەورەیە (٢٩)

## سورەتی ﴿ المجادلة ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ﴾ بەڕاستی خوا بیستی ﴿قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا﴾ ووتەی ئەو ژنەی کە لەبارەی مێردەکەیەوە
گفتوگۆی لەگەڵ ئەکردی ﴿وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ وە سکاڵای خۆی بۆ لای خوا ئەبرد ﴿وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ
تَحَاوُرَكُمَآۚ﴾ وە خوا گوێی لە ووتووێژی هەردووکتان بوو ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بیسەری
بینایە ﴿١﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم﴾ ئەوانەتان کە ظهار دەکەن ﴿مِّن نِّسَآئِهِم﴾ لەگەڵ ژنەکانیاندا (پێیان
دەڵێن وەك دایکمان وان) ﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡۖ﴾ ئەوانە دایکی ئەوان نین ﴿إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ﴾ دایکی ئەوان
﴿إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدۡنَهُمۡۚ﴾ هەر ئەو ژنانەن کەئەوانیان لێ بووە ﴿وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ﴾ وە بێگومان
ئەوانە گوفتارێکی خراپی ناپەسەند دەڵێن ﴿وَزُورٗاۚ﴾ و درۆ دەکەن ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ﴾ وە بەڕاستی
خوا لێ خۆش بووی لێ بووردەیە ﴿٢﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ﴾ ئەوانەی ظهار دەکەن ﴿مِن نِّسَآئِهِمۡ﴾ لەگەڵ
هاوسەرەکانیان ﴿ثُمَّ يَعُودُونَ﴾ لەپاشان پەشیمان دەبنەوەو (دەیانەوێت بچنە لایان) ﴿لِمَا قَالُواْ﴾
لەوەی کەووتویانە (واتە خێرا تەڵاقیان نادەن) ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ﴾ ئەوە پێویستە بەندەیەك ئازاد بکەن
﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ﴾ لەپێش ئەوەی بەیەك بگەن ( و بچنە لایان) ﴿ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ﴾ ئەم کەفارەتەی
(کە لەسەرتان پێویست کراوە) ئامۆژگاری دەکرێن پێ ی ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ وە خوا شارەزا
وئاگادارە بەوەی کە دەیکەن ﴿٣﴾ ﴿فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ﴾ ئەمجا ئەگەر یەکێك (بەندەی) دەست نەکەوت
﴿فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ﴾ ئەوە با دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێت ﴿مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ﴾ پێش ئەوەی
بچنە لای یەك ﴿فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ﴾ ئەگەر یەکێك نەیتوانی (دوومانگ بەڕۆژوو بێت) ﴿فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗاۚ﴾
ئەوە با نانی شەست هەژار بدات ﴿ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ﴾ ئەو (کەفارەتانە کە لەسەرتان پێویست
کراوە) بۆ ئەوەیە باوەڕ بکەن بەخوا و پێغەمبەری خوا (مل کەچی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بن)
﴿وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ﴾ وە ئەوانە سنووری خوان ﴿وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە بۆ بێ باوەڕان هەیە سزای
سەخت ﴿٤﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ بێگومان ئەوانەی دژایەتی و سەرپێچی خواو پێغەمبەری
خوا دەکەن ﴿كُبِتُواْ﴾ ڕیسواو سەرشۆڕ دەکرێن ﴿كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ﴾ هەر وەك ئەوانەی
پێش ئەمان ڕیسواو سەرشۆڕ کران ﴿وَقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتِۢ بَيِّنَٰتٖۚ﴾ (چۆن نافەرمانی دەکەن) لەکاتێکدا
دڵنیان کە ئێمە بەڵگەی ڕوونمان ناردۆتە خوارەوە ﴿وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ وە بۆ بێ باوەڕان سزای
ڕیسواکەر هەیە ﴿٥﴾ ﴿يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا﴾ لەڕۆژێکدا کەخوا هەموویان تێکڕا زیندوو دەکاتەوە
﴿فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْۚ﴾ پاشان هەواڵیان پێ دەدات بەوەی کە کردویانە ﴿أَحۡصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُۚ﴾ کەخوا
(هەمووی) ژماردووە وە (بەڵام) خۆیان لەبیریان چووە ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ وە خوا بەسەر
هەموو شتێکدا ئاگادارە ﴿٦﴾

﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نەت زانیوە ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ کە خوا دەزانێ چی لەئاسمانەکان ﴿وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾
وە چی لەزەویی دایە ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ﴾ چپەی هیچ سێ کەسێك نی یە ﴿إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ﴾ کە خوا
چوارەمیان نەبێت ﴿وَلَا خَمْسَةٍ﴾ وە چپەی هیچ پێنج کەسێك نی یە ﴿إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ﴾ کە ئەو شەشەمیان
نەبێت ﴿وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ﴾ وە نەکەمتر لەو ژمارە نە زۆرتر نی یە ﴿إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ﴾ مەگەر خوایان
لەگەڵدایە(بە زانیاری و ئاگاداری) ﴿أَيْنَ مَا كَانُوا۟﴾ لەهەر جێگایەکدا بن ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾
پاشان لەڕۆژی دواییدا ئاگاداریان دەکاتەوە بەوەی کە کردوویانە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی
خوا بەهەموو شتێك ئاگادار و زانایە (٧) ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا سەرنجت نەداوە ﴿إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ﴾
لە ئەوانەی کە قەدەغە کران لە چپە ﴿ثُمَّ يَعُودُونَ﴾ پاشان دەگەڕێنەوە ﴿لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ﴾ بۆ ئەوەی لێیان
قەدەغە کرا بوو ﴿وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ وە لەگەڵ یەکتریدا بەچپە ئەدوێن دەربارەی گوناهو تاوان
و دەست درێژی ﴿وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ﴾ وبێ فەرمانی پێغەمبەریش ﷺ ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ﴾ وە کاتێ بێن بۆ
لات سەلامت لێ دەکەن ﴿بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ﴾ بە شێوەیەك کە خوا بەو جۆرە سەلامی لێ نەکردوویت
﴿وَيَقُولُونَ فِيٓ أَنفُسِهِمْ﴾ وە لەدڵی خۆیاندا دەڵێن: (ئەگەر پێغەمبەرە) ﴿لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ﴾ بۆچی خوا
سزامان نادات بە هۆی ئەو قسانەی کە پێ ی دەڵێن ﴿حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ ئەوانە
دۆزەخیان بەسە کە (بێگومان) دەچنە ناویەوە کە جێگایەکی زۆر خراپە (٨) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەی
ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا تَنَٰجَيْتُمْ﴾ کە چپە تان کرد ﴿فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ بە چپە باسی
گوناهو دەست درێژی ﴿وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ﴾ و سەرپێچی پێغەمبەر مەکەن ﴿وَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ﴾
وە باسی چاکە و پارێزکاری و لەخواترسان بکەن ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ﴾ لەخوا بترسن (وخۆتان بپارێزن
لە سزای ئەو خوایەی) ﴿إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ کە هەر لای ئەو کۆدەکرێنەوە (٩) ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾
بێگومان چپە تەنها لە شەیتانەوەیە ﴿لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ تا ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە دڵتەنگ بکات
﴿وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا﴾ لەکاتێکدا هیچ زیانیان پێ ناگەیەنێت ﴿إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ مەگەر بە فەرمانی خوا نەبێت
﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ (دەبا)ئیماندارانیش تەنها پشت بەخوا ببەستن (١٠) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾
ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿إِذَا قِيلَ لَكُمْ﴾ کاتێك پێیان ووترا ﴿تَفَسَّحُوا۟ فِي ٱلْمَجَٰلِسِ﴾ لە کۆڕ
ودانیشتنەکاندا جێگە بکەنەوە (وفراوانی بکەن) ﴿فَٱفْسَحُوا۟ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ ئێوەش فراوانی بکەن خواش
گوشادی بە ئێوە دەدات ﴿وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُوا۟ فَٱنشُزُوا۟﴾ وە کاتێك پێتان ووترا هەستن ، ئێوەش هەستن
﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ﴾ خواش پلە و پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە لەئێوە کە بڕوایان هێناوە
﴿وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ﴾ وە ئەوانەی کە زانستیان پێ بەخشراوە بە چەند پلەیەك (پلەیان بەرز
دەکاتەوە) ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ وە خوا شارەزایە بەوەی دەیکەن (١١)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ﴾ هەر کاتێ (ویستان)
قسەی پەنهانی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکەن ﴿فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ﴾ ئەوە پێش چپە کردنەکەتان
خێرێك بکەن ﴿ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ﴾ ئەمە بۆ خۆتان چاکتر و پاکترە ﴿فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ﴾ ئەمجا ئەگەر هیچتان
نەبوو ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خوا لێخۆش بوو میهرەبانە ﴿١٢﴾ ﴿ءَأَشۡفَقۡتُمۡ﴾ ئایا دەترسان
(لە هەژاری) ﴿أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ﴾ پێش چپە کردنەکەتان خێرێك بکەن ﴿فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ﴾ ئەمجا
ئەگەر خێرەکەتان نەکرد ﴿وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ﴾ و خواش تەوبەی لێ گیرا کردن ﴿فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾
ئەوسا نوێژ بکەن و زەکات بدەن ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ﴾ وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن
﴿وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ وە خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن ﴿١٣﴾ ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ﴾ ئایا بۆ سەرنجێك
نادەی لە ئەوانەی ﴿تَوَلَّوۡاْ﴾ کە دۆستایەتی ئەکەن ﴿قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم﴾ لەگەڵ هۆزێك (ی جوولەکە)
کەخوا غەزەبی لێگرتوون ﴿مَّا هُم مِّنكُمۡ وَلَا مِنۡهُمۡ﴾ ئەوان نە لەئێوەن و نەلە ئەوانیشن ﴿وَيَحۡلِفُونَ عَلَى ٱلۡكَذِبِ﴾
وە سوێند دەخۆن بەدرۆ ﴿وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا خۆیان دەزانن (درۆ دەکەن) ﴿١٤﴾ ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ عَذَابٗا
شَدِيدًاۖ﴾ خوا سزای دژواری بۆ ئامادە کردوون ﴿إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ بەڕاستی ئەوەی ئەوان
دەیانکرد کارێکی ناپەسەند بوو ﴿١٥﴾ ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ﴾ (دوو ڕووەکان) سوێندەکانیان کردبووە
قەڵغانی (درۆ وخراپەکانیان) ﴿فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وە ڕێگری (خەڵك)یان کرد لەڕێبازی خوا
﴿فَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ ئەمجا بۆ ئەوان هەیە سزای ڕیسواکەر ﴿١٦﴾ ﴿لَّن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ
شَيۡـًٔاۚ﴾ ماڵ و منداڵیان هیچ سوودێکی نی یە بۆیان ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ ئەوانە یار و هاودەمی ئاگرن
﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ تێیدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿١٧﴾ ﴿يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا﴾ لەڕۆژێکدا کە خوا
هەموویان زیندوو دەکاتەوە ﴿فَيَحۡلِفُونَ لَهُۥ﴾ ئەوسا سوێندی بۆ دەخۆن ﴿كَمَا يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ﴾ هەر چۆنێ
سوێندیان دەخوارد بۆ ئێوە (لە دونیاندا) ﴿وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍۚ﴾ وە وادەزانن شتێکیان بە دەستەوەیە
﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ﴾ با بزانن بەڕاستی هەر ئەوانن درۆزن ﴿١٨﴾ ﴿ٱسۡتَحۡوَذَ عَلَيۡهِمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ شەیتان
بەسەریاندا زاڵ بووە (بەجۆرێك) ﴿فَأَنسَىٰهُمۡ ذِكۡرَ ٱللَّهِۚ﴾ کە یادی خوای لەبیر بردوونەتەوە
﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ ئەوانە کۆمەڵ و دەستەی شەیتانن ﴿أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱلشَّيۡطَٰنِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ با بزانن کە
بەڕاستی هەر کۆمەڵ و دەستەی شەیتان زەرەرمەندن ﴿١٩﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ بەڕاستی ئەوانەی
کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡأَذَلِّينَ﴾ ئەوانە لە ڕیسوا ترینی خەڵکن ﴿٢٠﴾
﴿كَتَبَ ٱللَّهُ﴾ خوا نووسیویەتی ﴿لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ﴾ کە بێگومان من و پێغەمبەرانم سەردەکەوین
﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ﴾ بەڕاستی خوا بەهێز و بە توانای باڵادەستە ﴿٢١﴾

﴿لَّا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ﴾ کەسانێك نابینیت کە باوەڕیان هەبێت ﴿بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ بە خواو بەڕۆژی دوایی ﴿يُوَآدُّونَ﴾ کە دۆستایەتی بکەن ﴿مَنۡ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خوا و پێغەمبەری خوا دەکەن ( واتە : نابێت باوەڕداران دۆستایەتی و پشتیوانی بێ باوەڕان بن) ﴿وَلَوۡ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ﴾ هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن ﴿أَوۡ أَبۡنَآءَهُمۡ أَوۡ إِخۡوَٰنَهُمۡ أَوۡ عَشِيرَتَهُمۡۚ﴾ یان کوڕ و براو خزمیان بن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ﴾ ئەوانە خوا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە ﴿وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ﴾ بەهێزی کردوون و سەری خستون بە قورئان و ئیمان لەلایەن خۆیەوە ﴿وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ﴾ وە دەیانخاتە بەهەشتانێکەوە ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوات بەژێر درەختەکانیاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ﴾ خوا لێ یان ڕازی بووە ﴿وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾ ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ﴾ ئەوانە کۆمەڵ ودەستەی خودان ﴿أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ ئاگاداربن کە تەنها کۆمەڵ ودەستەی خودا ڕزگار و سەرفرازن (٢٢)

## سورەتی ﴿ الحَشر ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە تەسبیحاتی خوا دەکات ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ وە تەنها ئەو زاڵی باڵادەستی کاردروستە (١) ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ﴾ خوا زاتێکە ﴿أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ بێ باوەڕانی خاوەن کتێبی دەرکرد ﴿مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾ لە ماڵ و شوێنی خۆیان ﴿لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِۚ﴾ بۆ یەکەم کۆبوونەوە ﴿مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْۖ﴾ بە تەمانەبوون (ئەی موسوڵمانینە) کە (لە قەڵاکانیان) دەربچن ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم﴾ خۆشیان وایان دەزانی ﴿مَّانِعَتُهُمۡ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾ کە قەڵاکانیان دەیانپارێزن لە (سزای) خوا ﴿فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ﴾ بۆیە (سزای) خوایان بۆ هات ﴿مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْۖ﴾ لە شوێنێکەوە کە گومانیان بۆی نەدەچوو ﴿وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَۚ﴾ وە خوا ترسێکی خستە ناو دڵیانەوە ﴿يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم﴾ کە خانوەکانی خۆیانیان وێران دەکرد ﴿بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بە دەستی خۆیان وبەدەستی ئیمانداران ﴿فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾ ئەمجا پەند وەرگرن ئەی خاوەن بیرو هۆشان (٢) ﴿وَلَوۡلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡجَلَآءَ﴾ ئەگەر خوا دەربەدەری لەسەر بڕیار نەدانایە (لەسەر ئەو جولەکانە) ﴿لَعَذَّبَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ بێگومان لە دونیادا سزای دەدان ﴿وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ لە ڕۆژی دواییشدا بۆ ئەوان هەیە ﴿عَذَابُ ٱلنَّارِ﴾ سزای ئاگری دۆزەخ (٣)

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ﴾ ئـەم سـزایە بە هۆی ئـەوەوە بوو ﴿شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۖ﴾ دژایەتـی خـوا و پێغەمبەریان کرد
﴿وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ﴾ وە هـەر کەسێك دژایەتی خوا بـكات ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ ئەوە بەڕاسـتی خوا تۆڵە
سێنی بەتینـە ﴿٤﴾ ﴿مَا قَطَعۡتُم مِّن لِّينَةٍ﴾ ئـەوەی بڕیتـان لـە دارخورمـا ﴿أَوۡ تَرَكۡتُمُوهَا﴾ یـا لێـی گـەڕان
﴿قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا﴾ بـە وەسـتاوی لەسـەر بنەكانیان بمێننـەوە ﴿فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ ئەوە بە فەرمانـی خوا بووە
﴿وَلِيُخۡزِيَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ وە بۆ سـەر شـۆڕكردنی لەسـنوور دەرچووان بوو (مەبەسـت پێ جولەكەكانە)
﴿٥﴾ ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئـەو (دەسـتكەوتانە) كەخـوا سـەندیەوە (بێ جەنـگ كـردن) ﴿عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ﴾
بـۆ پێغەمبەرەكەی لە ماڵی (بەنی نەضیر) ﴿فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ﴾ ئێوە بۆ بەدەسـت هێنانی
(ئـەو مـاڵ وسـامانەی جولەكـە) هیـچ ئەسـپ و حوشـترێكیان تاونـەداوە و(نەجەنگـاون) ﴿وَلَٰكِنَّ
ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ﴾ بەڵكو خوا پێغەمبەرانی زاڵ دەكات ﴿عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ﴾ بەسـەر هەركەسـدا كەبیەوێت
﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ وە خوا بەسەر هەموو شتێكدا بە دەسەلاتە ﴿٦﴾ ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ﴾ ئەوەی خوا
دەسـت پێغەمبەری خست (بەبێ جەنگ) ﴿مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ﴾ لە (سـەروەت و سامانی) گوندنشینەكانی
جولەكە ﴿فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ﴾ ئەوە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرە ﷺ (واتە لە بەرژەوەندی گشتی موسڵمانانندا خەرج
دەكرێـت) ﴿وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ وە بـۆ خزمانـی (پێغەمبـەر ﷺ) و هەتیـوان ﴿وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾
وە بـۆ هـەژاران و ڕێبوارانـی كەم دەسـتە ﴿كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ﴾ تـا (ئەو ماڵ وسـامانە)
تەنها لەناو دەوڵەمەندەكانتاندا دەسـت بە دەسـتی پـێ نەكرێت و بەس ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ﴾
وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێ ی دان وەریبگرن ﴿وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ﴾ وە ئەوەی لێتانی قەدەغەكرد وازی
لێ بهێنن ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ﴾ وەلە خوا بترسن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بێگومان خوای گەورە سزای سەختە ﴿٧﴾
﴿لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ﴾ (ئەو دەسـكەوتەی لـە بەنی نەضیر گیرا) بۆ نەدارانـی كۆچكەرانە ﴿ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ﴾
ئەوانـەی كـە دەركـران ﴿مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ﴾ لەمـاڵ و سـامانیان ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا﴾
فـەزڵ و بەهرەی خـوا و ڕەزامەندی ئەویان دەوێـت ﴿وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ﴾ وە یارمەتی (ئایینی) خوا
وپێغەمبەری خوا دەدەن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾ هەر ئەوانن ڕاستگۆیان ﴿٨﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن
قَبۡلِهِمۡ﴾ ئەوانە (یاریدەدەرەكان) كە لەماڵ وشـوێنی خۆیان بوون (لەشـاری مەدینە) و باوەڕیان هێنا
پێش (كۆچكردنی برا موهاجرەكانیان) ﴿يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ﴾ ئەوەی كۆچ بكات بۆ لایان خۆشیان
دەوێ ﴿وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ﴾ وە شـك نابـەن لـە دڵ ودەروونی خۆیانـدا هیچ جۆرە
حەسـوودی و بەخیلیەك لەبەر ئەوەی بەشـی كۆچكەران درا و(بەشی ئەوان نەدرا لەو ماڵ وسامانەی
كـە گیـرا لەجولەكـەكان) ﴿وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ وە فەزڵـی ئـەوان ئـەدەن بەسـەر فەزڵـی خۆیانـدا
﴿وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ﴾ ئەگەر چی خۆشـیان زۆر پێویسـتیان پێـی بێت ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ﴾ وە ئەو
كەسـەی خـۆی لە ڕژدی وبەخیلـی دەروونی بپارێزێت ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ (بەڕاسـتی) هەر
ئەوانن سەرفەراز وسەركەوتوو ﴿٩﴾

﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ﴾ ئەو (باوەڕدارانەش) لەپاش ئەمانەوە هاتوون ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا﴾ ئەی
پەروەردگارمان لێمان خۆشبە ﴿وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ﴾ وە لەو برایانەشمان (خۆش بە) ﴿سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ﴾
کە پێشمان کەوتوون لەئیمان هێناندا ﴿وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ وە هیچ ڕق و کینەیەك
مەخەرە دڵمانەوە دەربارەی باوەڕداران ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی
هەرتۆی دڵسۆزی میهرەبانی ﴿١٠﴾ ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا سەرنجێکت نەداوە ﴿إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا﴾ لەوانەی کە
دووڕوو بوون ﴿يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ﴾ ئەڵێن بەو برادەرانەیان ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ کە بێ باوەڕ
بوون لە (جولەکە) خاوەن کتێبەکان ﴿لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ﴾ ئەگەر دەربکرێن (لەماڵ وخاك و ئاوتان)
﴿لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ﴾ ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین ﴿وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا﴾ وە هەرگیز گوێڕایەڵی کەس
ناکەین لەدژی ئێوە ﴿وَإِنْ قُوتِلْتُمْ﴾ وە ئەگەر جەنگتان لەگەڵ دا بکرێ ﴿لَنَنْصُرَنَّكُمْ﴾ بێگومان ئێمە
یارمەتی ئێوە ئەدەین ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ بێگومان خوا شایەتی ئەدات کە ئەوان درۆزنن ﴿١١﴾ ﴿لَئِنْ
أُخْرِجُوا﴾ ئەگەر دەر بکرێن ﴿لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ﴾ ئەوان لەگەڵیاندا دەرناچن ﴿وَلَئِنْ قُوتِلُوا لَا يَنْصُرُونَهُمْ﴾
وە ئەگەر جەنگیان لە دژ کرا یارمەتیان نادەن ﴿وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ﴾ وە ئەگەر یارمەتیان بدەن
﴿لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ﴾ بێگومان (ئەشکێن و) پشت هەڵئەکەن ﴿ثُمَّ لَا يُنْصَرُونَ﴾ پاشان سەرناخرێن ﴿١٢﴾
﴿لَأَنْتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِمْ مِنَ اللَّهِ﴾ بەڕاستی (ئەی باوەڕداران) ئێوە ترستان زیاترە لەدڵی ئەواندا
تا خوا ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ﴾ ئەوەش لەبەرئەوەیە کە بێگومان ئەوانە ﴿قَوْمٌ لَا يَفْقَهُونَ﴾ کەسانێکن تێ ناگەن
﴿١٣﴾ ﴿لَا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا﴾ (جولەکە) جەنگتان لەگەڵ ناکەن هەموو پێکەوە ﴿إِلَّا فِي قُرًى مُحَصَّنَةٍ﴾
مەگەر لەچەند گوندێکی قایمی قەڵایندا نەبێت ﴿أَوْ مِنْ وَرَاءِ جُدُرٍ﴾ یان لەپشتی دیوارەوە
﴿بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ﴾ دژایەتی نێوانیان زۆر سەختە ﴿تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا﴾ تۆ وادەزانی کە ئەوان کۆ و پێکەوەن
﴿وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ﴾ لەکاتێکدا دڵیان جیا ولەیەك دوورە ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ﴾ ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە
کە ئەوان گەلێکی نەفامن ﴿١٤﴾ ﴿كَمَثَلِ الَّذِينَ﴾ نموونەی (ئەم جولەکانە) وەك نموونەی ئەوانەن
﴿مِنْ قَبْلِهِمْ قَرِيبًا﴾ کە لە پێش ئەماندا بوون بە ماوەیەکی کەم (مەبەست پێی موشریکەکانی قورەیش
وجولەکەکانی بەنو قەینوقاعە) ﴿ذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ﴾ سەرئەنجامی کاری خۆیان چەشت ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ
أَلِيمٌ﴾ وە بۆ ئەوان هەیە سزای سەخت ﴿١٥﴾ ﴿كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ﴾ (نموونەی ئەم ناپاکانە) وەك شەیتان وایە
﴿إِذْ قَالَ لِلْإِنْسَانِ اكْفُرْ﴾ کە بەمرۆڤی ووت: بێ بڕوا بە ﴿فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ﴾ جا کە بێ بڕوا بوو (شەیتان)
ووتی: ﴿إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ﴾ بەڕاستی من بەریم لە تۆ ﴿إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ بێگومان من لە خوای
پەروەردگاری جیهانیان دەترسم ﴿١٦﴾

﴿فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ﴾ جـا سـەرئەنجامی هەردووکیـان ئەوەیـە ﴿أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَاۚ﴾ کـە بێگومـان
هەردوولا لە دۆزەخدا ئەبن بەهەمیشـەیی ﴿وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە ئەمەیە سـزای سـتەمکاران (١٧)
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن ﴿وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ﴾ وە هەموو
کەسێك باسەرنج بدات ﴿مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ﴾ (بزانێ) چی پێش خۆی ناردوە بۆپاشەڕۆژی (لە کارو کردەوەی
چاکـە) ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ﴾ وە لەخـوا بترسـن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ بەڕاسـتی خوا شـارەزایە بەوەی
کە دەیکەن (١٨) ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ﴾ وەك ئەوانە مەبن کە خوایان لەبیر خۆیان بردەوە ﴿فَأَنسَىٰهُمۡ
أَنفُسَهُمۡۚ﴾ جـا خواش ئەوانی لەبیـر خۆیان بردوەتەوە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ هـەر ئەوانن دەرچوان لە
فەرمانی خوا (١٩) ﴿لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ﴾ دۆزەخیان و بەهەشتیان وەك یەك ویەکسان
نین ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ﴾ بەهەشتیان ڕزگارو سەرکەتوون (٢٠) ﴿لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ ئەگەر ئەم
قورئانەمان دابەزاندایە ﴿عَلَىٰ جَبَلٖ﴾ بۆ سەر کێوێك ﴿لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا﴾ (وە تێیگەشتایە لەوەی کە
تێیدا هاتووە) دەتبینی بەملکەچی ولەت لەت بووی ﴿مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ﴾ لەترسی خوا ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ﴾ ئەم
جۆرە نموونانە ﴿نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ﴾ دەیان هێنینەوە بۆ خەڵکی ﴿لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوەی بیربکەنەوە (٢١)
﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي﴾ خـوا هەر ئـەو زاتەیە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ﴾ هیچ پەرسـتراوێکی ڕاسـت نی یـە بێجگە ئەو
﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ﴾ زانای هەموو نهێنی و ئاشـکراکانە ﴿هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾ هەر ئەوە بەخشندەی
میهرەبـان (٢٢) ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي﴾ ئـەوە ئـەو خوایـە یـە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ کـە بێجگـە لـەو پەرسـتراوێکی
ڕاسـت نییە ﴿ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ﴾ پاشـا و پاك و بێگەرد ﴿ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ﴾ وئاشـتی دەر و، دڵنیا کەرەو
﴿ٱلۡمُهَيۡمِنُ﴾ چاودێـر و پارێزگـار ﴿ٱلۡعَزِيزُ﴾ وزاڵ وباڵادەسـەت و ﴿ٱلۡجَبَّارُ﴾ خـاوەن شـکۆ
﴿ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ﴾ وشایسـتەی هەمـوو گەورەیـی یەکـە ﴿سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ﴾ پاکـی و بێگـەردی بـۆ خوایـە
﴿عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ لەو هاوبەشانەی کە بۆی دائەنرێ (٢٣) ﴿هُوَ ٱللَّهُ﴾ هەر ئەوە خواو ﴿ٱلۡخَٰلِقُ﴾ بەدیهێنەر
و ﴿ٱلۡبَارِئُ﴾ داهێنەرو ﴿ٱلۡمُصَوِّرُۖ﴾ ووێنە کێشە ﴿لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ هەر بۆ ئەوەهەموو ناوێکی هەرە
جوان وپاك ﴿يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە ستایشی ئەو دەکەن
﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ وە هەر ئەوە زاڵ و باڵادەستی کار بەجێ (٢٤)

## سورەتی ﴿ٱلۡمُمۡتَحَنَةِ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ﴾ دوژمنانی
من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان ﴿تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ﴾ دۆستایەتی خۆتانیان بۆ بنێرن
﴿وَقَدۡ كَفَرُواْ﴾ لەکاتێکدا دڵنیاشن ئەوان بێ باوەڕن ﴿بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ﴾ بەو ئاینە ڕاستەی کە بۆتان هاتووە
﴿يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ﴾ پێغەمبەر ﷺ و ئێوەش دەردەکەن ﴿أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ﴾ (لەبەرئەوەی) کە
باوەڕتان هەیە بەخوای پەروەردگارتان ﴿إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ﴾ جا ئەگەر دەرچوون لەووڵاتی خۆتان
﴿جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي﴾ بۆ تێکۆشان و جەنگ کردن لە ڕێی مندا ﴿وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ﴾ وە بۆ بەدەستهێنانی
خۆشنوودی من (دۆستایەتی ئەوان مەکەن) ﴿تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ﴾ ڕازو نهێنی (باوەڕدارانیان) پێ دەڵێن
بە دۆستایەتی ﴿وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ﴾ لە کاتێکدا من ئەزانم ﴿بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ﴾ بەوەی شاردتانەوەو بەوەیشی
ئاشکراتان کرد ﴿وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ﴾ وە هەرکەسێك لە ئێوە دۆستایەتیان بکات ﴿فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾
ئەوە بێگومان ڕێ ی ڕاستی وون کردووە ﴿١﴾ ﴿إِن يَثۡقَفُوكُمۡ﴾ ئەگەر تووشتان بین ﴿يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ﴾ ئەبن
بەدوژمنی ئێوە ﴿وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ﴾ وە درێژ ئەکەن بۆتان ﴿أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ﴾ دەستیان و زمانیان
بەخراپی ﴿وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ﴾ ئاواتە خوازن کە ئێوە بێ باوەڕ بوونایە ﴿٢﴾ ﴿لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡۚ﴾
نەخزمانتان و نەمناڵانتان سوودتان پێ ناگەیەنن ﴿يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡۚ﴾ لەڕۆژی دواییدا (خوا
ئێوە و خزمەکانتان) لە یەك جیادەکاتەوە ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ وە خوا بینایە بەوەی کەدەیکەن ﴿٣﴾
﴿قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ﴾ بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە ﴿أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ﴾ سەرمەشقێکی جوان و چاك ﴿فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾
لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدابوون ﴿إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ﴾ کەبەگەلەکەی خۆیانیان ووت ﴿إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ﴾
بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لەئێوە ﴿وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ﴾ وە لەو شتانەش کەدەیان پەرستن ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾
لەجیاتی خوا ﴿كَفَرۡنَا بِكُمۡ﴾ ئێمە باوەڕمان نی یە بە(ئایینی) ئێوە ﴿وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ﴾ وە پەیدابوو لەنێوان
ئێمەو ئێوەدا ﴿ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا﴾ دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشەیی ﴿حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ﴾ تا کاتێك
کەبڕوا بەخوای تاك و تەنیا دەهێنن ﴿إِلَّا قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ﴾ جگە لەو قسەیەی ئیبراهیم کە بەباوکی
ووت ﴿لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ﴾ بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ ئەکەم ﴿وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۖ﴾ وە من
هیچم بەدەست نی یە لەبەرانبەر خوادا بۆ تۆ ﴿رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان تەنها پشتمان
بەتۆ بەستووە ﴿وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا﴾ وە هەر بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە ﴿وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ سەر ئەنجامیش هەر
بۆلای تۆیە ﴿٤﴾ ﴿رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا﴾ ئەی پەروەردگار نەمان کەیت ﴿فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بە مایەی گومڕایی
ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿وَٱغۡفِرۡ لَنَا رَبَّنَآۖ﴾ وە لێمان خۆشبە ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾
بەڕاستی هەر تۆیت زاڵی باڵادەستی کاربەجێ ﴿٥﴾

﴿لَقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِيهِمۡ﴾ سوێند بەخوا بێگومان بۆ ئێوە هەیە لەئیبراهیم و بڕوادارەکاندا ﴿أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ سەر
مەشقێکی جوان ﴿لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَۚ﴾ بۆ کەسێك کە ئومێد و هیوای بێ بە خوا و بەڕۆژی دوای
﴿وَمَن يَتَوَلَّ﴾ وەهەر کەسێك پشت هەڵکات ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ﴾ ئەوە بەڕاستی هەر خوایە بێ نیازو دەوڵەمەندو
﴿ٱلۡحَمِيدُ﴾ شایستەی ستایش ﴿٦﴾ ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجۡعَلَ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ عَادَيۡتُم مِّنۡهُم مَّوَدَّةٗۚ﴾ دڵنیا بن خوای گەورە
دۆستایەتی و خۆشەویستی دروستی دەکات لەنێوان ئێوە و ئەوانەی دوژمنایەتیتان لەگەڵ کردوون (بەئیمان
هێنانی زۆربەیان) ﴿وَٱللَّهُ قَدِيرٞۚ﴾ وە خوا بەتوانایە ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ وەخوا لێ خۆشبوی میهرەبانە ﴿٧﴾
﴿لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا ڕێتان لێ ناگرێت ﴿عَنِ ٱلَّذِينَ﴾ لەگەڵ ئەوانەی ﴿لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ﴾ کە جەنگیان لەگەڵ نەکردوون
﴿فِي ٱلدِّينِ﴾ لەسەر ئەم دینە ﴿وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم﴾ وە دەریان نەکردوون ﴿مِّن دِيَٰرِكُمۡ﴾ لەجێگا و شوێن وخاك و
وڵاتی خۆتان ﴿أَن تَبَرُّوهُمۡ﴾ کەچاکەیان لەگەڵ بکەن ﴿وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ﴾ وەدادگەربن لەگەڵ یاندا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ
ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کەدادگەرن ﴿٨﴾ ﴿إِنَّمَا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ﴾ بێگومان خوا ڕێگریتان لێ
دەکات تەنها ﴿عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمۡ﴾ لەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ کردوون ﴿فِي ٱلدِّينِ﴾ لەسەر دین(وباوەڕەکەتان)
﴿وَأَخۡرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ﴾ وەدەریان کردوون لە جێگا و شوێن وخاك و وڵاتی خۆتان ﴿وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخۡرَاجِكُمۡ﴾
وەیارمەتیان داوە لەسەر دەرکردنتان ﴿أَن تَوَلَّوۡهُمۡۚ﴾ (ڕێگریتان دەکات) لەوەی کەدۆستایەتیان لەگەڵ
بکەن وبەدۆستیان دابنێن ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُمۡ﴾ وە هەر کەسێك دۆستایەتیان بکات ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئا ئەوانە
خۆیان ستەمکارن ﴿٩﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ﴿إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ﴾ ئەگەر ئافرەتانی
ئیماندار هاتن بۆلاتان ﴿مُهَٰجِرَٰتٖ﴾ بە کۆچ کەری ﴿فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ﴾ تاقیان بکەنەوە ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ﴾ خوا
بەباوەڕی ئەوان زاناترە ﴿فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ﴾ ئەمجا ئەگەر زانیتان ئەو (ئافرەتانە) ﴿مُؤۡمِنَٰتٖ﴾ باوەڕدارن
﴿فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ﴾ ئەوە مەیانگێڕنەوە بۆلای (مێردە) بێ بڕواکانیان ﴿لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ﴾ نەئەو ئافرەتانە
حەڵاڵن بۆ ئەو مێردە بێ باوەڕانە ﴿وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ﴾ وە نە ئەو مێردانەش بۆ ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن ﴿وَءَاتُوهُم
مَّآ أَنفَقُواْۚ﴾ وە ئەوەی (مێردەکانیان) خەرجیان کردووە، بیاندەنەوە ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ﴾ هیچ گوناهێکتان
لەسەر نی یە ﴿أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾ کە ئەم ئافرەتانە مارە بکەن ﴿إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ﴾ ئەگەر مارەییەکانیان بدەنێ
﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾ ژنە کافرە (بت پەرستەکان) لای خۆتان ڕامەگرن (ئەوانەی کە لە مەککە بەبێ
باوەڕی ماونەتەوە) ﴿وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ﴾ ئێوە داوای ئەوە بکەنەوە کەخەرجتان کردووە (بۆ ژنە کافرەکانتان
کە ئێستە چوونەتە لای کافران) ﴿وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ﴾ ئەوانیش با داوای ئەوە بکەن کە خەرجیان کردووە
(بۆ ژنە موسوڵمان بوەکانیان کە هاتونەتە لای ئێوە) ﴿ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ﴾ ئەمە فەرمانی خوایە ﴿يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۖ﴾
بڕیار ئەدا لەنێوانیاندا ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ وە خوا زانای کاربەجێ یە ﴿١٠﴾ ﴿وَإِن فَاتَكُمۡ﴾ ئەگەر لە دەستتان چوو
﴿شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ﴾ یەکێك لە خێزانەکانتان (بەچوونیان) ﴿إِلَى ٱلۡكُفَّارِ﴾ بۆ لای بێ باوەڕان ﴿فَعَاقَبۡتُمۡ﴾ ئێوەش
تۆڵەتان لێ سەندن(و غەنیمەتتان گرت) ﴿فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتۡ أَزۡوَٰجُهُم﴾ ئەمجا (لەو غەنیمەتە)بدەن بەوانەی کە
ژنەکانیان ڕۆشتووە ﴿مِّثۡلَ مَآ أَنفَقُواْۚ﴾ بە ئەندازەی ئەوەی کە خەرجیان کردووە ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وە بترسن لەو
خوایەی ﴿ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ﴾ کە ئێوە بڕواتان پێ هێناوە ﴿١١﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ﴾ هـەر كاتێـك ئافرەتانـی ئیمانـدار هاتـن بۆلات ﴿يُبَايِعْنَكَ﴾ كـە پەیمانـت لەگەڵ ببەسـتن ﴿عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ لەسـەر ئەوەی هیچ شـتێك نەكەن بەهاوبەشی خوا ﴿وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ﴾ وە دزیی و داوێن پیسی نەكەن و ﴿وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ﴾ وە منداڵانی خۆیـان نەكوژن ﴿وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ﴾ هیچ جۆرە بوهتانێك هەڵنەبەسـتن ﴿بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾ لەنێـوان دەسـت و پێ یاندا ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ﴾ وە بێ فەرمانیت نەكـەن لەهیچ كارێكی چاكەدا ﴿فَبَايِعْهُنَّ﴾ تـۆش پەیمانیـان لەگـەڵ ببەسـتە ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ﴾ وە لەخـوا داوای لێ خۆشـبوونیان بۆبكە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاسـتی خوا لێ خۆشـبووی میهرەبانە ﴿١٢﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەو كەسـانەی كە باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَتَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ كەسـانێك كەخـوا غەزەبی لێ گرتوون مەیكەن بە دۆست وپشتیوانی خۆتان ﴿قَدْ يَئِسُوا۟ مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ بەڕاستی ئەوان بێ هیوا بوون لە (پاداشتی) ڕۆژی دوایی ﴿كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ﴾ هەر چۆن بێ بڕوایان بێ هیوان ﴿مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ﴾ لە مردووی ناو گۆڕستان (كە زیندوو ببێتەوە) ﴿١٣﴾

## سورەتی ﴿ ٱلصَّفِّ ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ تەسبیحاتی خـوا دەكات هەرچـی لـە ئاسـمانەكان و لە زەوی دایـە ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ وە ئەو زاڵی باڵادەسـتی كاربەجـێ یە ﴿١﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی كە بڕواتان هێناوە ﴿لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ بۆچی ئەوەی ئەیڵێن ئەنجامی نادەن ﴿٢﴾ ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ﴾ زۆر مایـەی ڕق و توڕەیـی یە لای خـوا ﴿أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ كە قسـەیەك بڵێن كردەوەی پێ نەكەن ﴿٣﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاسـتی خوا كەسانێكی خۆش دەوێ ﴿يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا﴾ كە بەیەك ڕیز دەجەنگن لەڕێی خوادا ﴿كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ وەك كۆشكێكی قایمی چەسپیووی دامـەزراو ﴿٤﴾ ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ﴾ (بیربكـەرەوە) كاتێـك كـە مووسـا بەگەلەكـەی ووت ﴿يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى﴾ ئـەی گەلەكەم بۆچی ئازارم دەدەن ﴿وَقَد تَّعْلَمُونَ﴾ لە كاتێكـدا بەدڵنیاییەوە دەزانن ﴿أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ﴾ كـە من نێردراوی خـوام بۆلای ئێوە ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓا۟﴾ جا كاتێـك لایان دا لەهەق ﴿أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾ خـواش دڵـی وەرگێڕان ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ وە خـوا ڕێنموونی گەلی لەڕێ دەرچوو ناكات ﴿٥﴾

﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ (بیربکەرەوە) کاتێك کە عیسای کوڕی مەریەم ووتی ﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى﴾ ئەی بەنو ئیسرائیل
(نەوەکانی یەعقوب) بێگومان من ﴿رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم﴾ نێردراوی خوام بۆلای ئێوە ﴿مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾
ئەو تەوراتەی کە لە پێش مندا هاتووە بەڕاستی دائەنێم ﴿وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ﴾ وە مژدەتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێك
﴿يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى﴾ کە لەدوای من دێ و ﴿ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ﴾ ناوی ئەحمەدە ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم﴾ ئەمجا کاتێك کە ئەو (پێغەمبەرە)
یان بۆ هات ﴿بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟﴾ بە چەند نیشانەی ڕوون و ئاشکراوە ووتیان ﴿هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەمە جادوویەکی
ئاشکرایە ﴿٦﴾ ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ﴾ جاکێ لەوکەسە ستەمکارترە ﴿ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ﴾ کەدرۆ هەڵبیەستێت بەدەم خواوە
﴿وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ﴾ لە کاتێکدا کە بۆ ئیسلام بانگ دەکرێ ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە خوا ڕێنموونی
گەلی ستەم کار ناکات ﴿٧﴾ ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ﴾ دەیانەوێ ڕووناکی دینی خوا بکوژێننەوە ﴿بِأَفْوَٰهِهِمْ﴾
بە(فوی) دەمیان ﴿وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ﴾ وە خوا ڕووناکی خۆی تەواو دەکات ﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ با بێ باوەڕانیش
پێ یان ناخۆش بێ ﴿٨﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ﴾ خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردووە ﴿بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ
لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾ بە ڕێنموونیی و ئایینێکی ڕاست و دروستەوە، هەتا بەسەر هەموو ئایینێکدا سەری بخات
﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ﴾ هەرچەندە هاوبەش پەیداکەرانیش پێ یان ناخۆش بێ ﴿٩﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەو
کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ﴾ ئایا بازرگانیەکتان نیشان بدەم ﴿تُنجِيكُم﴾ کە ڕزگارتان
بکات ﴿مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ لە سزایەکی پڕ لە ئازار ﴿١٠﴾ ﴿تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ (بازرگانیەکەش ئەمەیە) باوەڕ بهێنن
بەخوا و پێغەمبەرەکەی ﴿وَتُجَٰهِدُونَ﴾ وە تێبکۆشن ﴿فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە ڕێ ی خوادا ﴿بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ﴾ بە سامان
وگیانی خۆتان ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەمەتان باشترە بۆ خۆتان ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بزانن ﴿١١﴾ ﴿يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾
(ئەوسا خوا) لە گوناهەکانتان خۆش دەبێ ﴿وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ﴾ وە (لە ڕۆژی دواییدا) دەتان خاتە باخاتێکەوە
﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ کە جۆگەی ئاوی زۆر بەژێریاندا دەڕوات ﴿وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً﴾ (وە دەتانخاتە) خانوو کۆشکی
زۆر پاك و خۆشەوە ﴿فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ﴾ لە بەهەشتانی جێگای مانەوەی هەمیشەیی دان ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ ئەمەیە
سەرکەوتنی گەورە ﴿١٢﴾ ﴿وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا﴾ وە شتێکی تر کە حەزی لێ دەکەن ﴿نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ کەیارمەتی دانە لە
خواوە ﴿وَفَتْحٌ قَرِيبٌ﴾ وە ڕزگارکردنێکی نزیك (وئازادکردنی شاری مەککە یە) ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ وە (بەمە) مژدە
بدە بەئیمانداران ﴿١٣﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿كُونُوٓا۟ أَنصَارَ ٱللَّهِ﴾ ببن بە یارمەتی
دەرانی (ئایینی) خوا ﴿كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ هەروەك عیسای کوڕی مەریەم ووتی ﴿لِلْحَوَارِيِّۦنَ﴾ بە هاوڕێ
تایبەتیەکانی خۆی ﴿مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ کێ یارمەتی دەری منە بۆ لای خوا ﴿قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ﴾ هاوڕێکانی ووتیان
﴿نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ﴾ ئێمە یارمەتی دەرانی (دینی) خواین ﴿فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ ئەمجا دەستەیەك لە بەنو
ئیسرائیل باوەڕیان هێنا ﴿وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ﴾ وە دەستەیەکیشیان بێ باوەڕ بوون ﴿فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئێمەش پشتیوانی
ئەوانەمان کرد کە باوەڕیان هێنا ﴿عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ﴾ لە بەرانبەر دوژمنەکانیاندا ﴿فَأَصْبَحُوا۟ ظَٰهِرِينَ﴾ بۆیە سەرکەوتن و
زاڵ بوون بەسەریاندا ﴿١٤﴾

## سورەتی ﴿ الجُمُعَة ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ﴾ تەسبیحاتی خوا دەكات ﴿مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ ئەوەی لە ئاسمانەكان ﴿وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ وە ئەوەی
لە زەوی دایە ﴿ٱلۡمَلِكِ ٱلۡقُدُّوسِ﴾ (ئەو خوایەی) كە پاشایەكی پاك و بێگەردی ﴿ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ زاڵی
باڵادەستەتی كار بەجێ یە (١) ﴿هُوَ ٱلَّذِي﴾ خوا ئەو زاتەیە ﴿بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ﴾ كە ناردوویەتی لە ناو
نەخوێندەواراندا (عەرەبەكاندا) ﴿رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ﴾ پێغەمبەرێك لە خۆیان ﴿يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ﴾ دەخوێنێتەوە
بەسەریاندا نیشانەكانی خوا ﴿وَيُزَكِّيهِمۡ﴾ پاكیان دەكاتە ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ وە قورئان
وفەرموودەی (پڕ سوود) یان فێر دەكات ﴿وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ﴾ هەر چەند ئەوان لەپێشدا ﴿لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾
لە گومڕاییەكی ئاشكرادابوون (٢) ﴿وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ﴾ وە (ڕەوانەشی كردووە بۆ) گەلانی تری جگە لەوان
﴿لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡۚ﴾ كە هێشتا پێ یان نەگەیشتوون (و موسوڵمان نەبوون) ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ وە خوا
زاڵی باڵادەستەتی كار دروستە (٣) ﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ﴾ ئەوە بەهرەیەكی خوایی یە ﴿يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ﴾
ئەیدا بە هەر كەسێك كە(خۆی) بیەوێ ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ وە خوا خاوەنی فەزڵ و بەهرە
وبەخششی گەورەیە (٤) ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ﴾ نموونەی بەسەرهاتی ئەوانەی ﴿حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ﴾ كە تەوراتیان
درا بەسەردا ﴿ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا﴾ لە پاشان هەڵیان نەگرت (ڕەفتاریان پێ نەكرد) ﴿كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ﴾
وەك گوێ درێژێكە ﴿يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ﴾ كە كتێبێكی زۆری هەڵگرتبێ (سوودی لێ نابینێ)
﴿بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ﴾ ئای چەند خراپە نموونەی ئەو گەلەی ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ﴾ كە نیشانەكانی
خوایان بە درۆزانی ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە خوا ڕێ نموونیی گەلی ستەمكاران ناكات
(٥) ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ئەی ئەوانەی كە لەسەر دینی جوولەكەن
﴿إِن زَعَمۡتُمۡ﴾ ئەگەر پێتان وایە ﴿أَنَّكُمۡ أَوۡلِيَآءُ لِلَّهِ﴾ كە بەڕاستی ئێوە دۆستی خوان ﴿مِن دُونِ ٱلنَّاسِ﴾
بێجگە لە خەڵكی تر ﴿فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ﴾ كەوا بوو داوای مردن بكەن ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە
ڕاست دەكەن (٦) ﴿وَلَا يَتَمَنَّوۡنَهُۥٓ أَبَدَۢا﴾ وە ئەوانە هەرگیز داوای مردن ناكەن ﴿بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ﴾ لەبەر
ئەو (گوناهانەی) كە بەدەستی خۆیان پێشیان خستووە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە خوا ئاگادارە
بەستەم كاران (٧) ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡمَوۡتَ ٱلَّذِي﴾ بڵێ بەڕاستی ئەو مردنەی كە ﴿تَفِرُّونَ مِنۡهُ﴾ لێ ی ڕادەكەن
﴿فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمۡۖ﴾ بێگومان پێتان دەگات و تووشتان دەبێ ﴿ثُمَّ تُرَدُّونَ﴾ لەپاشان دەگەڕێنرێنەوە
﴿إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ بۆ لای خوای زانا بەئاشكرا و نهێنیەكان ﴿فَيُنَبِّئُكُم﴾ ئەمجا هەواڵتان پێ
دەدات ﴿بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ بەوەی كەدەتانكرد (٨)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ﴾ کاتێك کە بانگدرا بۆ نوێژ
﴿مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ﴾ لە ڕۆژی هەینی دا ﴿فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾ بەپەلە بڕۆن بۆ یادی خوا (و نوێژی هەینی)
و ﴿وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ﴾ واز لەکڕین و فرۆشتن بهێنن ﴿ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ ئائەوە بۆ ئێوە چاکترە ﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾
ئەگەر بزانن و تێ بگەن (٩) ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ﴾ جا کاتێك کە نوێژی هەینی تەواوبوو ﴿فَٱنتَشِرُواْ
فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئیتر بڵاو ببنەوە بەسەر زەویی دا ﴿وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾ وە داوای ڕزق و ڕۆزیی خوا بکەن
﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا﴾ وە زۆر یادی خوا بکەن ﴿لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ بۆ ئەوەی ڕزگارو سەر فەرازبن (١٠)
﴿وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا﴾ هەر کارێکی بازرگانی یان هەر کارێکی بێهودە ببینن ﴿ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا﴾ بڵاوەی لێ
ئەکەن بۆلای ئەو بازرگانی یە ﴿وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ﴾ وە تۆ بەجێ دێڵن بە ڕاوەستاوی (لەسەر مینبەرەکەت)
﴿قُلۡ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەوەی لای خوایە چاکترە ﴿مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ﴾
لەشتی بێ هودە و بازرگانی ﴿وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ وەخوا باشترینی ڕۆزی دەرانە (١١)

## سورەتی ﴿المُنَافِقُونَ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ﴾ کاتێك کە دووڕوان بێنە لات ﴿قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ﴾ دەڵێن شایەتی دەدەین
کە بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ﴾ وە دیارە خوایش دەزانێ کە تۆ ڕەوانەکراوی
ئەوی ﴿وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ﴾ وەخوا شایەتی دەدات ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ﴾ کە بێگومان دووڕوان درۆزنن (١)
﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ﴾ سوێندە (درۆ)کانی خۆیان کرد بەقەڵغان (بۆ خۆیان) ﴿فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾
ئەمجا ڕێگری (خەڵك)یان دەکرد لەڕێ ی خوا ﴿إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ بەڕاستی ئەوان کارێکی
خراپیان دەکرد (٢) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ﴾ ئەوە(ی کەووترا) لەبەر ئەوە بوو کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان
هێناو ﴿ثُمَّ كَفَرُواْ﴾ لەپاشان بێ باوەڕبوون ﴿فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ ئەمجا مۆر نرا بەسەر دڵیاندا ﴿فَهُمۡ
لَا يَفۡقَهُونَ﴾ ئیتر ئەوان هیچ تێ ناگەن (٣) ﴿وَإِذَا رَأَيۡتَهُمۡ﴾ هەر کاتێك دەیان بینیت ﴿تُعۡجِبُكَ أَجۡسَامُهُمۡۖ﴾
لەش و قەڵافەتیان سەرسامت دەکات ﴿وَإِن يَقُولُواْ تَسۡمَعۡ لِقَوۡلِهِمۡۖ﴾ وە ئەگەر قسە بکەن گوێ لە قسەکەیان
دەگرییت ﴿كَأَنَّهُمۡ خُشُبٞ مُّسَنَّدَةٞۖ﴾ (دوو ڕووان) هەروەك داری هەڵسپێردراو وان ﴿يَحۡسَبُونَ﴾ وا گومان
دەبەن ﴿كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ هەموو هاوار و قیرەیەك بۆسەر ئەوانە ﴿هُمُ ٱلۡعَدُوُّ﴾ هەر ئەوانن دوژمن
﴿فَٱحۡذَرۡهُمۡۚ﴾ کەواتە خۆتیان لێ بپارێزە ﴿قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ﴾ خوا بیانکوژێ (یان خوا لەناویان بەرێت)
﴿أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ﴾ چۆن وەردە گێڕرێن (لەحەق) (٤)

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ کاتێـك پـێ یان بووترێـت ﴿تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ﴾ وەرن بـۆ لای پێغەمبەری خوا
تا داوای لێخۆشـبوونتان بۆ بکات ﴿لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ﴾ (سـەرپێچی دەکەن) سـەریان با دەدەن ﴿وَرَأَيْتَهُمْ
يَصُدُّونَ﴾ وە دەیـان بینیت ڕوو وەرئەگێـڕن ﴿وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ﴾ لەکاتێکدا کە ئەوان خۆیان بەگەورە
دەزانـن ﴿٥﴾ ﴿سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ﴾ بـۆ ئـەوان یەکسـانە ﴿أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ﴾ داوای لێخۆشـبوونیان بۆ بکەیت
﴿أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ﴾ یان داوای لێخۆشبوونیان بۆ نەکەیت ﴿لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ﴾ هەرگیز خوا لێ یان
خۆش نابێ ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ بەڕاسـتی خوا ڕێنموونی گەلی لەڕێ لادەران ناکات ﴿٦﴾
﴿هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ﴾ ئەوان ئەو کەسانەن کە دەڵێن: ﴿لَا تُنفِقُوا عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ﴾ (هیچ) مەبەخشن
بـە ئەوانـەی کـە لەگـەڵ پێغەمبەردان ﴿حَتَّىٰ يَنفَضُّوا﴾ تا بـڵاوەی لێ بکـەن (و ئەم دینـە بفەوتێت)
﴿وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لە کاتێکدا هەرچی گەنجینەکانی ئاسمانەکان و زەویی هەیە هەمووی
هـی خوایـە ﴿وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ﴾ بـەڵام دوو ڕووەکان نازانـن ﴿٧﴾ ﴿يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى
الْمَدِينَةِ﴾ (دووڕوەکان) دەڵێـن سـوێندبێ ئەگـەر گەڕاینـەوە بـۆ مەدینە ﴿لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ﴾
بێگومـان دەسـەڵاتدار و بەڕێـزەکان (مەبەسـت پێـی خۆیـان بـوو) لات و بـێ ڕێـزەکان لـە مەدینە
دەردەکـەن (مەبەسـت پێـی بـڕواداران بـوو) ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (خـوای گەورەش
بەرپەرچیان دەداتەوە و دەفەرموێت) :ڕێز و گەورەیی تەنها بۆ خوا و بۆ پێغەمبەری خوا و باوەڕدارانە
﴿وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام دووڕووان نازانن ﴿٨﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان
هێناوە ﴿لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ﴾ ماڵ و منداڵانتان بێ ئاگاتان نەکەن لەیادی خوا
﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ هەر کەسێك وابکات ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ ئا ئەوانە خۆیان خەسارۆمەندن
﴿٩﴾ ﴿وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم﴾ ببەخشـن لـەوەی ڕزق و ڕۆزیمـان داوون ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ﴾
پێش ئەوەی مـردن یەخە بـە یەکێکتان بگرێ ﴿فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي﴾ ئەوسـا بڵێـت : خوایە خۆزگە
مردنـی منـت دوابخسـتایە ﴿إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ بـۆ ماوەیەکـی نزیـك ﴿فَأَصَّدَّقَ﴾ جـا ماڵم ببەخشـیایە
﴿وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾ وە لە چاکەکاران بوومایە ﴿١٠﴾ ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا﴾ هەرگیز خوا هیچ کەسێك
دوا ناخات (لەمردن) ﴿إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا﴾ کاتێك کەوەختی (مردنی) هات ﴿وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ وەخوا
شارەزایە بەوەی کە دەیکەن ﴿١١﴾

## سورەتی ﴿التَّغَابُنِ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ﴾ تەسبیحاتی خوا دەکات ﴿مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە ﴿لَهُ
الْمُلْكُ﴾ دەسەلاتی تەواو بۆ ئەوە ﴿وَلَهُ الْحَمْدُ﴾ وە هەرچی ستایش هەیە هەمووی بۆ ئەوە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ
قَدِيرٌ﴾ وە ئەوە بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەلاتە ﴿١﴾ ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ﴾ خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروست
کـردووە ﴿فَمِنكُمْ كَافِرٌ﴾ ئەمجـا هەندێکتـان بێ بـاوەڕو ﴿وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ﴾ هەندێکی تریشتان باوەڕدارن
﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ وە خوا بینایە بەهەر شتێك کە ئەنجامی دەدەن ﴿٢﴾ ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾
خوا ئاسـمانەکان و زەوی دروسـت کـردووە بەحەق و ڕاسـتی ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ﴾ لەجوانترین
شێوەشدا وێنەی کێشاون ﴿وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ وە سەرئەنجامیش هەر بۆلای ئەوە (گەڕانەوە) ﴿٣﴾ ﴿يَعْلَمُ
مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ هەرچی لـە ئاسـمانەکان و زەوی دایە خـوا دەیزانێ ﴿وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ﴾
وە شـارەزایە بەوەی دەیشـارنەوە، وە بەوەیشـی ئاشـکرای دەکـەن ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ وە خوا
زانایـە بـەوەی لەناو دڵ و دەروندایـە ﴿٤﴾ ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ﴾ ئایا پێتان نەگەیشـتووە هەواڵی ئەوانەی
﴿كَفَرُوا مِن قَبْلُ﴾ کە بێ باوەڕ بوون لەمەو پێش ﴿فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ﴾ بۆیە چەشتیان تۆڵەی کاری خۆیان
﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە بـۆ ئـەوان هەیە سـزای سـەخت ﴿٥﴾ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُ﴾ ئەو (سـزایە) بێگومـان بەهۆی
ئـەوە وەبوو ﴿كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ کەپێغەمبەرەکانیان بۆهات بەبەڵگەی ئاشـکراوە ﴿فَقَالُوا أَبَشَرٌ
يَهْدُونَنَا﴾ کـە چی دەیان ووت چـۆن ئەبێ ئادەمی یەك لە خۆمان ڕێ نموونیمان بکات ﴿فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا﴾
ئەمجـا بێ بڕوا بوون و ڕوویـان وەرگێڕا ﴿وَّاسْتَغْنَى اللَّهُ﴾ وە خواش بێ نیازیی نواند (لە باوەڕهێنانیان)
﴿وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ وەخوا دەوڵەمەندەو شایستەی ستایشە ﴿٦﴾ ﴿زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بێ باوەڕان وایان دەزانی
﴿أَن لَّن يُبْعَثُوا﴾ کـە (لـە ڕۆژی دوایـی دا) زینـدوو ناکرێنـەوە ﴿قُلْ بَلَىٰ﴾ (ئەی موحەممـەد ﷺ) پێیان
بڵێ : بەڵێ ﴿وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ﴾ سـوێند بە پەروەردگارم بێگومـان زیندوو دەکرێنەوە ﴿ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ﴾
دڵنیابن پاشان هەواڵتان پێ دەدرێت بەوەی کە کردووتانە ﴿وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ وە ئەمە بۆ خوا (زۆر)
ئاسـانە ﴿٧﴾ ﴿فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ کەواتە بـاوەڕ بهێنن بەخـواو پێغەمبەرەکەی و ﴿وَالنُّورِ الَّذِي أَنزَلْنَا﴾ بەو
ڕووناکـی یەی دامان بەزاندووە (کە قورئانـە) ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ وەخوا ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن
﴿٨﴾ ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ﴾ (پاداشـتان دەداتەوە) لەڕۆژێکدا کە کۆتـان دەکاتەوە بۆ ڕۆژی کۆکردنەوە
﴿ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ﴾ ئـەوڕۆژە ڕۆژی زیانباری یە ﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ﴾ وە هەرکەسـێك بـڕوا بهێنێت بەخوا
﴿وَيَعْمَلْ صَالِحًا﴾ وە کـردەوەی چاك بـکات ﴿يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ﴾ خوا چاوپۆشـی دەکات لەگوناهەکانی
ودەیانسـڕێتەوە ﴿وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ﴾ وەدەیخاتـە نـاو بەهەشـتانێکەوە ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ کە جۆگە
ئـاوی زۆر بەژێریانـدا دەڕوات ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ تێیـدا دەمێننـەوە بەهەمیشـەیی وهەتـا هەتایـی
﴿ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ ئەوەیە بردنەوە و سەرکەوتنی گەورە ﴿٩﴾

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون و نیشانە و بەڵگەکانی ئێمەیان بە درۆزانی
﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ ئەوانە هاوەڵی ئاگرن ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ تێیدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿وَبِئْسَ
الْمَصِيرُ﴾ وە سەر ئەنجامێکی زۆر خراپە (١٠) ﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ﴾ هیچ ناڕەحەتی یەك تووشی
(خەڵك) نابێت ﴿إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ مەگەر بەفەرمانی خوا نەبێت ﴿وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ﴾ هەر کەسێك باوەڕ
بهێنێت بەخوا ﴿يَهْدِ قَلْبَهُ﴾ خوا ڕێ نموونی دڵی دەکات ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ وە خوا بەهەموو
شت ئاگادارە (١١) ﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکەن ﴿فَإِنْ
تَوَلَّيْتُمْ﴾ ئەوسا ئەگەر پشتان تێ کرد ﴿فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا﴾ جا ئەوەی لەسەر پێغەمبەری ئێمەیە
﴿الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ تەنها گەیاندنی ڕوون و ئاشکرای (ئاینەکەیەتی) (١٢) ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ خوا
زاتێکە کە جگە لەو هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ دەی
با باوەڕداران تەنها پشت بەخوا ببەستن (١٣) ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە
﴿إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ﴾ بەڕاستی هەندێك لەژنان و منداڵەکانتان دوژمنی
ئێوەن (بەوەی دەیانەوێت ڕێگریتان بکەن لەڕێگەی خودا و پەشیمانتان بکەنەوە لەئاینەکەتان)
﴿فَاحْذَرُوهُمْ﴾ جا خۆتانیان لێ بپارێزن ( وئاگاداریان بن، بەگوێیان نەکەن) ﴿وَإِنْ تَعْفُوا﴾ وە ئەگەر
(لێیان) ببورن ﴿وَتَصْفَحُوا﴾ وە واز بهێنن (لێیان) ﴿وَتَغْفِرُوا﴾ وە (لێیان) خۆش ببن ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ
رَحِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خواش لێ خۆش بووی میهرەبانە (١٤) ﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾
بێگومان سەروەت وسامان ومال و منداڵتان هۆی تاقی کردنەوەتانن ﴿وَاللَّهُ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾
لەکاتێکدا خوا پاداشتی زۆر گەورەی لەلایە (١٥) ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ کەوا بوو لەخوا بترسن
وبەندایەتی ئەو بکەن ئەوەندەی کە دەتوانن ﴿وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا﴾ وە گوێڕایەڵ و ملکەچی بن ﴿وَأَنْفِقُوا
خَيْرًا لِأَنْفُسِكُمْ﴾ وە ماڵ ببەخشن کە بۆ خۆتان چاکترە ﴿وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ﴾ وە ئەوەی پارێزراو بێ
لەچرووکی نەفسی خۆی ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ هەر ئەوانن سەرکەوتوو ڕزگار (١٦) ﴿إِنْ تُقْرِضُوا
اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ ئەگەر قەرز بدەن بەخوا بە قەرزێکی چاك (واتە ببەخشن لەپێناو خوا) ﴿يُضَاعِفْهُ
لَكُمْ﴾ چەند بەرانبەری دەکاتەوە بۆتان ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ﴾ وە لێتان خۆش دەبێ ﴿وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ﴾
وە خوا سوپاسگوزاری لەسەرخۆ وبەئارامە (١٧) ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ (ئەو زاتە پەروەردگارێکی)
زانا وئاگادارە بە شتە پەنهان و ئاشکراکان ﴿الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ زاڵی باڵادەستی کاربەجێ یە (١٨)

## سورەتی ﴿الطَّلَاقِ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ (تۆ و ئوممەتەکەت) ﴿إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ هەر کاتێك ویستان ژنەکانتان
تەڵاق بدەن ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ با تەڵاقیان بدەن لەکاتی عیدەیاندا (ئەو کاتەی لەحەیز پاك بوونەتەوەو
لەگەڵیان دروست نەبوون) ﴿وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ﴾ وە عیدەی (ژنەکانتان) بەووردی بژمێرن ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ﴾
وە لەخوا بترسن کەپەروەردگارتانە ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ﴾ ئەو ژنانە دەرمەکەن ﴿مِنۢ بُيُوتِهِنَّ﴾ لەماڵەکانی
خۆیان (تاعیدەیان تەواو دەبێ) ﴿وَلَا يَخْرُجْنَ﴾ ئافرەتانیش با دەرنەچن (لە ماڵەکانیان) ﴿إِلَّآ أَن
يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن ﴿وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾ وە ئەوانە سنوورەکانی
خودان ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ﴾ هەر کەسێك لەسنوورەکانی خوا دەربچێت ﴿فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾ ئەوە بێگومان
ستەمی لەخۆی کردووە ﴿لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ﴾ تۆ چووزانی لەوانەیە خوا پێشی بهێنێت ﴿بَعْدَ ذَٰلِكَ
أَمْرًا﴾ دوای ئەوە کار وباروودۆخێکی تر (و ژن وپیاوەکە بکەونەوە یەکتر وئاشتیان ببێتەوە) (١)
﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ ئەمجا کە گەیشتنە کاتی خۆیان (پاش تەڵاقێك یان دوو تەڵاق) ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾
ئەوسا یان بیانهێڵنەوە بەباشی (بیانبەنەوە بۆ لای خۆتان بەشێوەیەکی چاك) ﴿أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ یان
لێیان جیا ببنەوە بەباشی ﴿وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ وە دوو شاهیدی دادپەروەر بگرن لەخۆتان
﴿وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ﴾ کە لەبەر خوا ئەو شاهیدیە بدەن ﴿ذَٰلِكُمْ﴾ ئەوانەی (باسکران پەندێکن)
﴿يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ﴾ کە ئامۆژگاری ئەوانەی پێ دەکرێ کە باوەڕیان هەبێ ﴿بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ بەخوا
و ڕۆژی دوایی ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ﴾ وە هەر کەسێ خواناس بێ ﴿يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا﴾ خوا دەرووی لێ دەکاتەوە (٢)
﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ وە رزق و ڕۆزی دەدات لەلایەکەوەکە بەخەیاڵیدا نەهاتووە
وبیری لێ نەکردوەتەوە ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ وە هەکەسێ پشت بەخوا ببەستێ ﴿فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾
ئەوە خوای بەسە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ﴾ بەڕاستی خوا کار و فەرمانی خۆی بەئەنجام دەگەیەنێ
﴿قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا﴾ بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك ئەندازەیەکی دیاری کراوی داناوە
(٣) ﴿وَٱلَّٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ﴾ ئەوانەی کە بێ هیوا دەبن لەکەوتنە حەیزەوە ﴿مِن نِّسَآئِكُمْ﴾
لە ژنانتان ﴿إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ﴾ ئەگەر (دەربارەی زانینی عیدەیان) دوو دڵ بوون ئەوا
عیدەیان سێ مانگە ﴿وَٱلَّٰٓـِٔى لَمْ يَحِضْنَ﴾ وە (هەروا) ئەوانەش کە (لەبەر منداڵی) هێشتا حەیزیان
پێیدا نەهاتووە (عیدەیان هەر سێ مانگە) ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ﴾ وە ژنانی سك پڕ (دوو گیان)
﴿أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ عیدەیان ئەو کاتەیە کە سکەکەیان دابنێن ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ﴾ هەر
کەسێك لە خوا بترسێت ﴿يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا﴾ خوا کاری بۆ ئاسان دەکات (٤) ﴿ذَٰلِكَ أَمْرُ ٱللَّهِ﴾
ئەوەی (کەباسکرا) فەرمانی خوایە ﴿أَنزَلَهُۥٓ إِلَيْكُمْ﴾ کە بۆی ناردونەتە خوارەوە ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ﴾ وە
هەر کەسێك خواناس و لەخواترس بێت ﴿يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ﴾ گوناهەکانی بۆ دائەپۆشێ و
ئەیانسڕێتەوە ﴿وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا﴾ پاداشتی گەورەی دەداتەوە (٥)

﴿أَسْكِنُوهُنَّ﴾ (ژنانی تەلاق دراو) دابنێن و نیشتەجێیان بکەن﴿مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم﴾ لەو شوێنەی کە
(خۆتان) دادەنیشن ونیشتەجێ دەبن ﴿مِّن وُجْدِكُمْ﴾ بە پێ ی توانای خۆتان ﴿وَلَا تُضَارُّوهُنَّ﴾ وە
زیانیان پێ مەگەیەنن ﴿لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ﴾ تا تەنگیان پێ هەڵچنن ﴿وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ﴾ وە ئەگەر دووگیان
بوون ﴿فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ﴾ ئەوە خەرجیان بکێشن ﴿حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ تا سکەکەیان دائەنێن ﴿فَإِنْ
أَرْضَعْنَ لَكُمْ﴾ ئەوسا ئەگەر شیریان دا بە منداڵەکەتان ﴿فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەوا ئێوەش کرێ یان بدەنێ
﴿وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ﴾ وە لەناو خۆتاندا ڕاوێژ بکەن بەچاکی (دەربارەی منداڵەکە) ﴿وَإِن تَعَاسَرْتُمْ﴾
وە ئەگەر تەنگیتان کرد(نەسازان لە کرێکەدا) ﴿فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَىٰ﴾ ئەوە با ئافرەتێکی تر شیری بداتێ
﴿٦﴾ ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ﴾ بادەوڵەمەند بەپێ ی دەوڵەمەندیی نەفەقە بدات ﴿وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ﴾
وە هەر کەسێك کەم دەست وهەژار بوو ﴿فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ﴾ با بەپێ ی ئەوەی کەخوا داویەتیە
نەفەقە بدات ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا﴾ خوا داوا لەکەس ناکات ﴿إِلَّا مَا آتَاهَا﴾ مەگەر بە پێی ئەوە نەبێت
کەپێی داوە ( (لە توانا) ﴿سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾ بێگومان خوا دوای تەنگانە ئاسانی دێنێت ﴿٧﴾
﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ﴾ زۆر لە گوندنشین و شارنشینەکان سەرپێچی یان کرد ﴿عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِ﴾
لە فەرمانی پەروەردگار و پێغەمبەرەکانی ﴿فَحَاسَبْنَاهَا﴾ ئێمەش پرسینەوەمان لەگەڵ کردن ﴿حِسَابًا شَدِيدًا﴾
بە پرسینەوەیەکی سەخت ﴿وَعَذَّبْنَاهَا عَذَابًا نُّكْرًا﴾ وە سزامان دان بەسزایەکی دژوار ﴿٨﴾ ﴿فَذَاقَتْ وَبَالَ
أَمْرِهَا﴾ ئیتر ئاکامی کردەوەی خۆیانیان چەشت ﴿وَكَانَ عَاقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا﴾ وە سەرئەنجامی کاریان بوو
بەزیانباریی و خەسارۆمەندی ﴿٩﴾ ﴿أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا﴾ خوا ئامادەی کردووە بۆیان سزایەکی سەخت
﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ کەواتە لەخوا بترسن ﴿يَا أُولِي الْأَلْبَابِ﴾ ئەی ئەو کەسانەی خاوەن ژیری وبیر و هۆشن ﴿الَّذِينَ
آمَنُوا﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿قَدْ أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا﴾ بێگومان خوا قورئانی بۆ دابەزاندون ﴿١٠﴾ ﴿رَّسُولًا
يَتْلُو عَلَيْكُمْ﴾ (هەروەك بۆی ناردون) پێغەمبەرێك کەدەخوێنێتەوە بۆتان﴿آيَاتِ اللَّهِ مُبَيِّنَاتٍ﴾ ئایەتەکانی
خوا کە ڕوون کەرەوەن﴿لِّيُخْرِجَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ تا دەربهێنێت ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾
وە کردەوەی چاکیان کردووە ﴿مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ لەتاریکستانی (بێ دینی) بۆ ڕووناکی (دینداری)
﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ﴾ وە هەر کەسێك باوەڕ بهێنێت بەخوای گەورە ﴿وَيَعْمَلْ صَالِحًا﴾ وە کار وکردەوەی چاك
ئەنجام بدات ﴿يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ﴾ ئەوە خوای گەورە دەیخاتە ناو بەهەشتانێکەوە ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ کە
بە ژێر درەختەکانیدا جۆگە ئاوی زۆر دەڕوا ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ تیادەمێننەوەوبەهەمیشەیی ﴿قَدْ أَحْسَنَ اللَّهُ لَهُ
رِزْقًا﴾ بێگومان خوا (لەوێ) ڕۆزیی چاکی بۆ ئامادەکردووە ﴿١١﴾ ﴿اللَّهُ الَّذِي﴾ خوا زاتێکە ﴿خَلَقَ سَبْعَ
سَمَاوَاتٍ﴾ کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە ﴿وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ﴾ وە بەوێنەی ئەوان زەویشی
دروست کردووە ﴿يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ﴾ فەرمانی خوا لە نێوانیاندا دادەبەزێت ﴿لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ﴾ تا چاك
بزانن کە خوا ﴿عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەسەر هەموو شتێکدا بە دەسەڵات و بە توانایە ﴿وَأَنَّ اللَّهَ﴾ وە
بێگومان خوا ﴿قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ (بەزانست وزانیاری) دەوری هەموو شتێکی داوە ( واتە :
ئاگاداری هەموو بوونەوەرە) ﴿١٢﴾

## سورەتی ﴿ التَّحْرِيمِ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ خاتوو ماریەی خێزانی کۆبویەوە و حەفصەی دایکی باوەڕدارانیش بەمەی
زانی، پێغەمبەریش (ﷺ) بەحەفصەی فەرموو: ئەوە ماریەم لەخۆم حەرام کرد بەو مەرجەی ئەم نهێنیە لای
کەس نەدرکێنیت، حەفصەش ڕۆشت لای عائیشە نهێنیەکەی درکاندا، بەم هۆیەوە ئەم سورەتە هاتە خوارەوە
﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ ﴿لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ﴾ بۆچی شتێك لەخۆت حەرام دەکەیت کە خوا
بۆی حەلاڵ کردویت (مەبەست پێی خاتوو ماریە بوو) ﴿تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ﴾ تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت
دەوێ ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ لەکاتێکدا خوا لێخۆشبووی میهرەبانە ﴿١﴾ ﴿قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ بێگومان خوا
دایناوە بۆتان ﴿تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ﴾ هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتان ﴿وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ﴾ خوا کارساز و دۆستی
ئێوەیە ﴿وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ وە ئەو زانای کاردروستە ﴿٢﴾ ﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ﴾ کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ بەنهێنی
﴿إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا﴾ لای هەندێ لەژنەکانی قسەیەکی درکاند ﴿فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ﴾ ئەمجا کەئەو (ژنە)
قسەکەی کرد (بۆ هەوێکەی) ﴿وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ﴾ خواش پێغەمبەری ﷺ ئاگادار کرد ﴿عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ﴾
(پێغەمبەر ﷺ) هەندێك (لەقسەکان) ی باسکردو بێ دەنگ بوو لە ﴿بَعْضٍ﴾ هەندێکی تری ﴿فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ﴾
ئەمجا کە پێ ی ووت (ژنەکەی) ووتی: ﴿مَنْ أَنْبَأَكَ هَٰذَا﴾ کێ ئەمەی پێ گەیاندی ﴿قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ
الْخَبِيرُ﴾ فەرمووی خوای زانای ئاگادار پێ ی گەیاندم ﴿٣﴾ ﴿إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ﴾ (ئەی حەفصە و عائیشە)
ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خودا (جێ ی خۆیەتی) ﴿فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾ چونکە
بەڕاستی دڵتان لایدا (لە حەق و ڕاستی) ﴿وَإِنْ تَظَاهَرَا عَلَيْهِ﴾ وە ئەگەر پشتی یەکتر بگرن لەدژی پێغەمبەر
ﷺ (سەرکەوتوو نابن) ﴿فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ﴾ چونکە بێگومان پشگیری ئەوە خواو ﴿وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ﴾
جوبرەئیل و ئیماندارە چاکەکانیش ﴿وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ دوای ئەوان فریشتەکانیش پشتیوانی ئەون
﴿٤﴾ ﴿عَسَىٰ رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ﴾ دڵنیابن ئەگەر ئێوە تەلاق بدات پەروەردگاری ﴿أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ﴾ لەبری
ئێوە ژنانێکی باشتر لەئێوەی دەداتێ ﴿مُسْلِمَاتٍ مُؤْمِنَاتٍ﴾ موسڵمانانی، بڕوادارانی ﴿قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ﴾ نزاکارانی،
تەوبەکارانی ﴿عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ﴾ خواپەرستانی، ڕۆژووگران ﴿ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾ لە بێوەژنان و کیژان ﴿٥﴾
﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾ خۆتان و کەس
وکارتان بپارێزن لەئاگرێك ﴿وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ کە سووتەمەنی یەکەی ئادەمی و بەردە ﴿عَلَيْهَا
مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ﴾ سەرپەرشتی ئەو (ئاگری دۆزەخەن) چەند فریشتەیەکی زبر و توندو تیژی وان
﴿لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ﴾ کە نافەرمانی خوا ناکەن لەوەی کەفەرمانیان پێ ئەدات ﴿وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ وەچ
فەرمانێکیان پێ بدرێ دەیکەن ﴿٦﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون ﴿لَا تَعْتَذِرُوا الْيَوْمَ﴾
ئەمڕۆ (کەڕۆژی دواییە) عوزر وبیانوو مەهێننەوە ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ چونکە بێگومان پاداشت
دەدرێنەوە لەسەر ئەوەی کە دەتانکرد ﴿٧﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە
﴿تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا﴾ بە گەڕانەوەیەکی ئێجگاریی (وڕاست ودروست، کەجارێکی تر نە گەڕێنەوە سەر
ئەو گوناهە) ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ﴾ تا پەروەردگارتان لە گوناهەکانتان خۆش بێ
﴿وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ﴾ وە بتان خاتە ناو باخاتێکەوە ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ کە دەڕوا بەژێریاندا
جۆگە ئاوی زۆر ﴿يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ﴾ لەڕۆژێکدا کە خوای گەورە، پێغەمبەر
ﷺ وکەسانێ کەباوەڕیان هێناوە لەگەڵیدا سەرشۆڕیان ناکات ﴿نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ﴾ ڕووناکی
(ئیمان)یان دەڕوات لەپێشیانەوەو ﴿وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ﴾ لەلای ڕاستیانەوە ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا﴾
دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ڕووناکی یەکەمان بۆ زیادو تەواوبکە ﴿وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ﴾ وەلێمان خۆش ببە
﴿إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ بەڕاستی هەر تۆیت بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتداری ﴿٨﴾ ﴿يَٰٓأَيُّهَا
ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ ﴿جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ﴾ بجەنگە لەگەڵ بێ باوەڕان و دوو ڕوواندا
﴿وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ وەتوند و تیژبە لەگەڵیاندا ﴿وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ﴾ وەجێیان دۆزەخە ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾
کە سەرئەنجامێکی زۆر خراپە ﴿٩﴾ ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمۡرَأَتَ نُوحٖ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٖۖ﴾ خوا بۆ بێ
باوەڕان ژنی نووح و ژنی لووطی بەنموونە هێنایەوە ﴿كَانَتَا تَحۡتَ عَبۡدَيۡنِ﴾ کە لەژێر (نیکاحی) دوو
بەندەدا بوون ﴿مِنۡ عِبَادِنَا صَٰلِحَيۡنِ﴾ لەبەندە چاکەکانی ئێمە ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾ ئەمجا خیانەتیان لەگەڵکردن
(مەبەست پێی بێ باوەڕ بوون پێیان) ﴿فَلَمۡ يُغۡنِيَا عَنۡهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا﴾ کەچی (مێردەکانیان) نەیانتوانی
شتێك لەسزای خوایان لێ دووربخەنەوە ﴿وَقِيلَ ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ﴾ وەپێیان ووترا کەبڕۆنە ناو ئاگرەوە
﴿مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ﴾ لەگەڵ ئەوانەی کەدەڕۆنە ناویەوە ﴿١٠﴾ ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا﴾ (هەروا) خوا نموونەیەکی
تری هێنایەوە ﴿لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ﴾ (بە) ژنی فیرعەون
﴿إِذۡ قَالَتۡ﴾ کاتێك کەووتی ﴿رَبِّ ٱبۡنِ لِي﴾ پەروەردگارم بۆم دروست بکە ﴿عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ﴾
لای خۆت ماڵێك لە بەهەشتدا ﴿وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ وَعَمَلِهِۦ﴾ وە ڕزگارم بکە لە فیرعون و کردەوەکانی
﴿وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وەڕزگارم بکە لە گەلی ستەمکاران ﴿١١﴾ ﴿وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ﴾ وە(بە)
مەریەمی کچی عیمران (نموونە دەهێنێتەوە) ﴿ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا﴾ ئەوەی کە داوێنی خۆی پاك
ڕاگرت ﴿فَنَفَخۡنَا فِيهِ﴾ ئەوسا ئێمە فوومان پیاکرد ﴿مِن رُّوحِنَا﴾ لەڕۆحێك کە خۆمان دروستمان
کردووە ﴿وَصَدَّقَتۡ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ﴾ وە باوەڕی هێنا بوو بە ووتەکانی پەروەردگاری خۆی
وکتێبەکانی ﴿وَكَانَتۡ مِنَ ٱلۡقَٰنِتِينَ﴾ وە لەڕیزی گوێڕایەڵ وفەرمانبەرداراندا بوو ﴿١٢﴾

## سورەتی ﴿ المُلك ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾ گەورەو پیرۆزە ئەو زاتەی کەهەرچی دەسەڵات و پاشایی هەیە بەدەست ئەوە
﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ وە ئەو دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا (١) ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ﴾ ئەو
زاتەی کە مردن و ژیانی داهێناوە ودروستکردووە ﴿لِيَبْلُوَكُمْ﴾ تا تاقیتان بکاتەوە ﴿أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾
کە کردەوەی کامتان چاکترە ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ وە هەر ئەوە باڵا دەست و لێ خۆشبوو (٢)
﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا﴾ ئەو زاتەی کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە یەك لەسەر یەك ﴿مَا تَرَىٰ﴾
تۆ نابینیت (ئەی تەماشاکەر) ﴿فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ﴾ لەدروست کراوەکانی خوای میهرەباندا ﴿مِنْ تَفَاوُتٍ﴾ هیچ
ناڕێکی یەك ﴿فَارْجِعِ الْبَصَرَ﴾ چاو بگێڕە و ورد بەرەوە (بزانە) ﴿هَلْ تَرَىٰ مِنْ فُطُورٍ﴾ ئایا هیچ ناتەواویەك
دەبینیت (٣) ﴿ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ﴾ دووبارە چاو بگێڕە ﴿كَرَّتَيْنِ﴾ یەك لە دوای یەك ﴿يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا﴾
چاووت بەڕیسوایی و نائومێدیی دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆت ﴿وَهُوَ حَسِيرٌ﴾ وە ئەو (چاوەت) ماندووە
وتاقەتی چووە (٤) ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ﴾ سوێندبێت بێگومان ئاسمانی دونیامان ڕازاندوەتەوە
بەچرای زۆر(ی ئەستێرە) ﴿وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِلشَّيَاطِينِ﴾ وە گێڕاومانن بەڕەجمی شەیتانەکان ﴿وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ
السَّعِيرِ﴾ وە ئامادەمان کردووە بۆ ئەوان (لە قیامەتدا) سزای ئاگری هەڵگیرساو (٥) ﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا
بِرَبِّهِمْ﴾ وە بۆ ئەوانەی کە بێ بڕوان بە پەروەرگاریان ﴿عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ سزای دۆزەخ
ئامادەیە، کە مەنزڵگایەکی زۆر خراپە (٦) ﴿إِذَا أُلْقُوا فِيهَا﴾ کاتێك کە فڕێ درانە ناوی یەوە
﴿سَمِعُوا لَهَا شَهِيقًا﴾ لەو دۆزەخەوە لوورەو نرکەیەك دەبیستن ﴿وَهِيَ تَفُورُ﴾ وە ئەو ئەکوڵێ و جۆش
دەخوات (٧) ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ﴾ نزیکە (دۆزەخ) لەڕقانا پارە پارە ببێ ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ﴾ هەر
کاتێ دەستەیەك فڕێ بدرێنە ناویەوە ﴿سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا﴾ دەرگاوانەکانی دۆزەخ پرسیاریان لێ دەکەن
﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ﴾ ئایا پێغەمبەرێکی ترسێنەرتان بۆ نەهاتووە (لە دونیادا) (٨) ﴿قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ﴾ دەڵێن
بەڵێ بۆمان هاتووە ﴿فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا﴾ بەڵام بەدرۆمان دەزانی، و دەمان ووت (پێی) ﴿مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ﴾
خوا هیچی نە ناردۆتە خوارەوە ﴿إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ﴾ ئێوە بەس لە گومڕاییەکی گەورەدان (٩)
﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ﴾ وە دەڵێن ئەگەر قسەی (پێغەمبەران) مان ببیستایە ﴿أَوْ نَعْقِلُ﴾ یان تێ بگەشتینایە
﴿مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ ئەمڕۆ لە هاوەڵانی دۆزەخ نە دەبووین (١٠) ﴿فَاعْتَرَفُوا بِذَنْبِهِمْ﴾ ئەوسا ئیتربەناچاری
دان بە گوناهەکانیاندا دەنێن ﴿فَسُحْقًا لِأَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ کەوابوو دووریی لە میهرەبانی خوا بۆ هاوەڵانی
دۆزەخ. (١١) ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ﴾ بێگومان ئەوانەی لە پەنهانیدا لە خوای خۆیان دەترسن
﴿لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ لێ خۆش بوون و پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە (١٢)

﴿وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓ﴾ ئێوه قسه به پهنهانی بکهن یان به ئاشکرا (بۆ خوا یهکسانه چونکه) ﴿إِنَّهُۥ
عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ ئهو (خوای گهوره) ئاگاداره بهخودی (نهێنی) دڵان ﴿١٣﴾ ﴿أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ﴾ ئایا ئهو
خوایهی که مهردوومی دروست کردووه ئاگای له نهێنییان نییه ﴿وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ له کاتێکدا که
ئهو ووردبین وئاگاداره ﴿١٤﴾ ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا﴾ خوا ئهو زاتهیه که زهوی بۆ ڕام کردوون
﴿فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا﴾ دهی بگهڕێن به ههموو گۆشهو کهنارێکیدا ﴿وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ﴾ وه له ڕۆزی خوا
بخۆن ﴿وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ﴾ وه ههر بۆلای ئهوه گهڕانهوه ﴿١٥﴾ ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ ئایا دڵنیان لهو خوایهی
که له ئاسمانه ﴿أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ﴾ که بتانباته خوارهوه بهناخی زهویی دا ﴿فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ له کاتێکدا
که زهوی (وهك دهریا) گێژ بخوات و (بێته لهرزین)؟ ﴿١٦﴾ ﴿أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ ئایا دڵنیان لهو خوایهی
که له ئاسمانه ﴿أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ﴾ که بای توندتان بنێرێته سهر به وورده زیخهوه ﴿فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ
نَذِيرِ﴾ ئهو دهمه تێ دهگهن که ههڕهشهی ئێمه چۆنه ؟ ﴿١٧﴾ ﴿وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ سوێند بهخوا
بهڕاستی ئهو (گهلانهی) که لهپێش ئهماندا بوون (پێغهمبهرانی ئێمهیان) به درۆزن دانا ﴿فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ﴾
جا چۆن بوو بهگژدا چوونهوهی ئێمه (لهوان) ﴿١٨﴾ ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ﴾ ئایا سهیری باڵندهکان ناکهن
به ژوور سهریانهوه ﴿صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَۚ﴾ به باڵ کراوهیی و هێنانهوهیهك ﴿مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُۚ﴾ ڕای
نهگرتوون (بهو ئاسمانهوه) خوا نهبێ ﴿إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۢ بَصِيرٌ﴾ که ئهو به ههموو شتێك بینایه ﴿١٩﴾ ﴿أَمَّنۡ
هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ جُندٞ لَّكُمۡ﴾ ئایا ئهوه کێ یه ئهو کهسهی که لهشکری ئێوهیه ﴿يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ﴾ یارمهتیتان
دهدات له جیاتی خوای میهرهبان ؟! ﴿إِنِ ٱلۡكَٰفِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ﴾ بێ بڕوایان ههر له فریو خواردنان ﴿٢٠﴾
﴿أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي يَرۡزُقُكُمۡ﴾ ئایا ئهوه کێ یه ئهو کهسهی که ڕۆزیتان دهدات ﴿إِنۡ أَمۡسَكَ رِزۡقَهُۥۚ﴾ ئهگهر خوا
ڕۆزی خۆیتان لێ بگرێتهوه ؟ ﴿بَل لَّجُّواْ فِي عُتُوّٖ وَنُفُورٍ﴾ بهڵکو (به ئارهزوو) درێژهیان دا بهسهرکهشی و
دوور کهوتنهوه (له ڕێ ی ڕاست) ﴿٢١﴾ ﴿أَفَمَن يَمۡشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجۡهِهِۦٓ أَهۡدَىٰٓ﴾ ئایا ئهو کهسهی بڕواو بهدهما
بکهوێ باشتر ڕێ دهردهکات؟ ﴿أَمَّن يَمۡشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ یان یهکێك که قنج و قیت بڕوا
بهسهر ڕێگایهکی ڕاست و ڕهواندا ؟ ﴿٢٢﴾ ﴿قُلۡ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمۡ﴾ (ئهی موحهممهد ﷺ) بڵێ: ههر خوایه
که درووستی کردوون و بهدیهێناون ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ﴾ وه گوێ و چاوو دڵی پێ داوون
﴿قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ﴾ زۆر به دهگمهن سوپاسی (ئهم بههرانه) دهکهن ﴿٢٣﴾ ﴿قُلۡ هُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾
بڵێ: ههر خوایه که ئێوهی بڵاوکردوهتهوه له زهویدا ﴿وَإِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ﴾ وهههر لای خواش کۆدهکرێنهوه
(لهڕۆژی دواییدا) ﴿٢٤﴾ ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ﴾ (بێ بڕواکان به گاڵتهوه) دهڵێن : ئهم بهڵێنه (به
هاتنی ڕۆژی دوایی) کهی دهبێ ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئهگهر ڕاست دهکهن ﴿٢٥﴾ ﴿قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ﴾
(ئهی موحهممهد ﷺ) بڵێ : زانینی ئهو ڕۆژه ههر لای خوایه ﴿وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾ وه من تهنها
ترسێنهرێکی ئاشکرام ﴿٢٦﴾

﴿فَلَمَّا رَأَوۡهُ زُلۡفَةً﴾ کاتێك بێ بڕوایان ئەو سزایەیان بەدی کرد لە نزیك خۆیانەوە ﴿سِيٓـَٔتۡ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾
تاڵ دەبێ ڕووخساری ئەوانەی کەبێ بڕوا بوون ﴿وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ﴾ وە (پێ یان) دەووترێ:
ئەمەیە ئەو (ڕۆژە) ی کە داواتان دەکرد ﴿٢٧﴾ ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ﴾ بڵێ: پێم بڵێن ﴿إِنۡ أَهۡلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِيَ﴾
ئەگەر خوا من و ئەو (موسوڵمانانە) ی کە لە گەڵمان لە ناومان بیات ﴿أَوۡ رَحِمَنَا﴾ یا میهرەبانییمان
لەگەڵ بکات ﴿فَمَن يُجِيرُ ٱلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ دەی کێ پەنای بێ بڕوایان دەدات لە سزای سەخت
﴿٢٨﴾ ﴿قُلۡ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ بڵێ: هەر ئەوە خوای بەخشندە کە بڕوامان پێ هێناوە ﴿وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَاۖ﴾
وە هەر بەو پشتمان بەستووە ﴿فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ جا لەمەولا دەزانن کە کێ لە گومڕایی
یەکی ئاشکرا دایە ﴿٢٩﴾ ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ﴾ بڵێ: پێم بڵێن ﴿إِنۡ أَصۡبَحَ مَآؤُكُمۡ غَوۡرٗا﴾ ئەگەر ئاو(ی خواردنەوە)
تان ڕۆبچێ بە ناخی زەوی دا ﴿فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ﴾ دەی کێ (بێجگە لە خوا) ئاوی زوڵاڵتان بۆ
دەهێنێ ﴿٣٠﴾

## سورەتی ﴿ٱلۡقَلَمِ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿نٓۚ﴾ بە (نوون) دەخوێنرێتەوە، خوا بەماناکەی زاناترە بۆ زیاتر زانیاری سەیری سەرەتای سورەتی
(البقرة) بکە ﴿وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ﴾ سوێند بە پێنووس و بەو دێڕانەی دەینوسن ﴿١﴾ ﴿مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ
بِمَجۡنُونٖ﴾ تۆ لە سایەیی بەخششی خواوە شێت نیت ﴿٢﴾ ﴿وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ﴾ وە بێگومان
پاداشتی نەبڕانەوە هەیە بۆ تۆ ﴿٣﴾ ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ﴾ وە بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خویەکی
ئێجگار بەرزو گەورەیت ﴿٤﴾ ﴿فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ﴾ جا بەم زووانە تۆش و ئەوانیش دەبینن ﴿٥﴾
﴿بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ﴾ کە کامتان شێتن ﴿٦﴾ ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ بێگومان پەروەردگاری
تۆ لە هەموو کەس زاناترە بەو کەسەی کە ڕێ ی ڕاستی خوای وون کردبێ ﴿وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾
وە ئەو زاناترە بەو کەسانەی کە ڕێ ی ڕاستیان گرتبێ ﴿٧﴾ ﴿فَلَا تُطِعِ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ گوێڕایەڵی ئەوانە
مەبە کە قسەکانت بە درۆ دەزانن ﴿٨﴾ ﴿وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ﴾ حەزیان دەکرد کە تۆ نەرمی نیشان بدەیت
﴿فَيُدۡهِنُونَ﴾ ئەوسا ئەوانیش نەرمیی (بەرانبەرت) دەنوێنن ﴿٩﴾ ﴿وَلَا تُطِعۡ كُلَّ حَلَّافٖ﴾ گوێڕایەڵی مەکە
بۆ هیچ سوێند خۆرێکی ﴿مَّهِينٍ﴾ پەست و ڕیسوا (ی درۆزن). ﴿١٠﴾ ﴿هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ﴾ پیتك
گری هاتووچۆکەر بۆ قسە هێنان و بردن ﴿١١﴾ ﴿مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ﴾ زۆر ڕێگری کەر لە چاکە ﴿مُعۡتَدٍ
أَثِيمٍ﴾ ستەمکاری گوناهکار ﴿١٢﴾ ﴿عُتُلِّۭ بَعۡدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ﴾ دڵ ڕەقی کەللە شەق دوای ئەوەش زۆڵ ﴿١٣﴾
﴿أَن كَانَ ذَا مَالٖ وَبَنِينَ﴾ لەبەر ئەوەی کە خاوەنی دارایی و کوڕی زۆرە (هەموو ئەم سیفەتانە وەك زانایان
دەڵێن مەبەست پێی وەلیدی کوڕی موغەیرەیە) ﴿١٤﴾ ﴿إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ﴾ کە ئایەتەکانی ئێمەی
بە سەردا بخوێنرێتەوە دەڵێ: ﴿أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ (ئەمانە) ئەفسانەی پێشینانن ﴿١٥﴾ ﴿سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ﴾
بەم زووانە سەری لووتی داخ دەکەین ﴿١٦﴾

﴿إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ﴾ ئێمە تاقیمان کردنەوە ﴿كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ﴾ هەروەك لەمەوپێش خاوەنانی ئەو باخەمان تاقی کردەوە
﴿إِذْ أَقْسَمُوا۟﴾ کە (لە شەودا) سوێندیان خوارد ﴿لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ﴾ کە لەدەمی بەرەبەیاندا (بەروبوومەکەی) بڕنن
(تا هەژاران نەزانن) ﴿١٧﴾ ﴿وَلَا يَسْتَثْنُونَ﴾ هیچی (بۆ هەژاران) لێ دەرنەکەن ﴿١٨﴾ ﴿فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ﴾ ئەمجا
بەڵایەك لە لایەن پەروەردگارتەوە سوڕایەوە بە سەر باخەکەدا ﴿وَهُمْ نَآئِمُونَ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوان خەوتبوون
﴿١٩﴾ ﴿فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ﴾ ئەوسا وەك باخێکی ڕنراوی لێ هات ﴿٢٠﴾ ﴿فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ﴾ لە شەبەقدا (براکان) بانگی
یەکتری یان کرد ﴿٢١﴾ ﴿أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ﴾ (ووتیان) : کە هەستن بچن بۆ سەر باخەکەتان ﴿إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ﴾
ئەگەر ئەتانەوێ بیڕنن ﴿٢٢﴾ ﴿فَٱنطَلَقُوا۟﴾ ئەمجا کەوتنە ڕێ ﴿وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ﴾ وە ئەوان بەچرپە بە یەکتریان
ئەووت ﴿٢٣﴾ ﴿أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ﴾ ئەمڕۆ هیچ هەژارێك نەیەت بەسەرتاندا لە ناو باخەکەدا ﴿٢٤﴾
﴿وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ﴾ دەمەو بەیان ڕۆشتن لایان وابوو کە دەتوانن بێ بەشیان بکەن ﴿٢٥﴾ ﴿فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟﴾ کە
باخەکەیان دیی (بە سوتاوی) ووتیان ﴿إِنَّا لَضَآلُّونَ﴾ ئێمە ڕێگامان وون کردووە (ئەمە باخەکەی ئێمە
نی یە) ﴿٢٦﴾ ﴿بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ نەء بەڵکو بەش بڕاو کراویین ﴿٢٧﴾ ﴿قَالَ أَوْسَطُهُمْ﴾ برا ناوەنجی یەکەیان
(لە ژیریدا) ووتی ﴿أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ﴾ مەگەر پێم نەووتن؟ ﴿لَوْلَا تُسَبِّحُونَ﴾ بۆ چی یادو سوپاسی خوا ناکەن ﴿٢٨﴾
﴿قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا﴾ هەموو ووتیان: پاك وبێگەردی بۆ پەروەردگارمانە (ستەم لەکەس ناکات) بێگومان
ئێمە خۆمان ﴿ظَٰلِمِينَ﴾ ستەم کارین ﴿٢٩﴾ ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ ئەمجا ڕوویان کردە یەکتریی ﴿يَتَلَٰوَمُونَ﴾
بەسەرزەنشت کردن ﴿٣٠﴾ ﴿قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ﴾ ووتیان: وای بۆ خۆمان بەڕاستی لە خوا یاخی بووین ﴿٣١﴾
﴿عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ﴾ ئومێدەوارین کە خوا لە جیاتی ئەو باخە باشترمان بداتێ ﴿إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ﴾
بەڕاستی ئێمە هیوامان هەر بە پەروەردگاری خۆمانە ﴿٣٢﴾ ﴿كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ﴾ ئاوایە سزا (ی خوا لە جیهاندا)
﴿وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ﴾ وە سزای ڕۆژی دوایی گەلێ گەورەترە ﴿لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾ خۆزگە بیانزانیایە ﴿٣٣﴾ ﴿إِنَّ
لِلْمُتَّقِينَ﴾ بێگومان بۆ لەخواترسان هەیە ﴿عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ لای پەروەردگاریان باخاتی پڕ لە ناز
و نیعمەت ﴿٣٤﴾ ﴿أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ﴾ چۆن ئێمە موسوڵمان و بەدکاران وەك یەك لێ دەکەین؟ ﴿٣٥﴾
﴿مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ ئەوە چیتانە چۆن بڕیارێك دەدەن ﴿٣٦﴾ ﴿أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ﴾ نەخێر ئایا کتێبێکی
(ئاسمانی) تان هەیە ئەمەی تێیدا دەخوێننەوە ﴿٣٧﴾ ﴿إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ﴾ وە لەو کتێبەدا ڕێتان پێ دراوە چیتان
بوێت ئەوە هەڵبژێرن بۆ خۆتان؟ ﴿٣٨﴾ ﴿أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ﴾ یان پەیمانی بەهێزتان هەیە لە گەڵمان ﴿إِلَىٰ يَوْمِ
ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ تا ڕۆژی دوایی ﴿إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ﴾ کە هەرچی ئێوە بڕیار بدەن بتاندرێتێ ﴿٣٩﴾ ﴿سَلْهُمْ﴾ بپرسە لێیان
(بزانە) ﴿أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ﴾ کامیان زامنی ئەم کارەن ﴿٤٠﴾ ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ﴾ ئاخۆ هاوبیریان هەیە (لەم قسەیەدا)
﴿فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ﴾ دەبا هاوبیرەکانیان بهێنن ﴿إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست دەکەن ﴿٤١﴾ ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾
لە ڕۆژێکدا (کە قیامەت و ناڕەحەتیەکانیەتی) خوای گەورە لاقی پیرۆزی دەردەخات (وەك لەفەرمودەی
ئیمامی بوخاری وموسلیمدا هاتووە، باوەڕمان پێیەتی بەبێ هیچ لێچواندن ولێکدانەوەیەك، وە ئێمەش
چۆنێتیەکەی نازانین) ﴿وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ﴾ وە (بە تەوسەوە) بانگ دەکرێن بۆ سوژدە بردن (بۆ خوای
گەورە) ﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ (کەچی) ناتوانن (سوژدە ببەن) ﴿٤٢﴾

﴿خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ﴾ چاویان شۆڕو ﴿تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ﴾ ڕیسوایی دایان دەگرێ ﴿وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى﴾
بەڕاستی جاران کە بانگ دەکران بۆ ﴿ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ﴾ سوژدەو (نەیان دەبرد) کە ساغیش
بوون ﴿٤٣﴾ ﴿فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ﴾ وازم لێ بهێنە بۆ ئەوانەی کە ئەم قورئانە بەدرۆ دەزانن
﴿سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەرە بەرە کێشیان دەکەم بە ڕەنگێك کە پێ نەزانن ﴿٤٤﴾ ﴿وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ﴾
وە مۆڵەتیان دەدەم ﴿إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ﴾ بەڕاستی پیلانی من تۆکمە و بەهێزە (لە بەرانبەر پیلانی ئەواندا)
﴿٤٥﴾ ﴿أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا﴾ ئاخۆ تۆ لە بێ بڕوایان داوای کرێ (ی کۆششی پێغەمبەرێتی) یان لێ دەکەیت
﴿فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ﴾ ئەوانیش لە بژاردنی قەرزداری گران بارن ﴿٤٦﴾ ﴿أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ﴾ یا ڕووپەڕەی
غەیبیان لەلایە ﴿فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ﴾ وە ئەوان لەبەری دەنووسنەوە ﴿٤٧﴾ ﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ﴾ (ئەی موحەممەد
ﷺ) دان بە خۆتا بگرە و چاوەڕوانی فەرمانی پەروەردگارت بکە ﴿وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ﴾ وەك
هاوڕێ ی نەهەنگەکە مەبە (کە یونس پێغەمبەرە علیه السلام) ﴿إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ﴾ کاتێك کە
بانگی (خودای) کرد، ئەو توورە بوو(لە بێ بڕوایی گەلەکەی) ﴿٤٨﴾ ﴿لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾
ئەگەر میهرەبانییەك لەلایەن پەروەردگاریەوە فریای نەکەوتایە ﴿لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ وَهُوَ مَذۡمُومٞ﴾ فڕێ دەدرایە
دەشتێکی ڕووتەن وە ئەو بەدناو دەبوو ﴿٤٩﴾ ﴿فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ﴾ ئەمجا پەروەردگاری هەڵی بژاردەوە
﴿فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وە کردی (بە یەکێك) لە چاکەکاران ﴿٥٠﴾ ﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاستی
نزیك بوو بێ بڕواکان ﴿لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ هەڵت خلیسکێنن بەچاو (ی پیس) یان ﴿لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكۡرَ﴾
لە کاتێکدا کە قورئان دەبیستن ﴿وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجۡنُونٞ﴾ وە دەیان ووت: بەڕاستی ئەم (پێغەمبەرە) شێتە
﴿٥١﴾ ﴿وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ لە کاتێکدا کە ئەم قورئانە هەر ئامۆژگاری یە بۆ هەموو جیهانیان ﴿٥٢﴾

## سورەتی ﴿ ٱلۡحَآقَّةُ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿ٱلۡحَآقَّةُ﴾ هاتنی ڕۆژی دوایی(هەق وڕاستە) ﴿١﴾ ﴿مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾ جا چی بێت ئەو ڕۆژە (هەق وڕاستە)
﴿٢﴾ ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾ تۆ چووزانیت ئەو ڕۆژە چی یە ﴿٣﴾ ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ﴾ گەلی سەموود
وعاد ئەو ڕۆژەیان بەدرۆ زانی (کە دڵەکان دادەخورپێنێ) ﴿٤﴾ ﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ﴾ ئەمجا
(گەلی) سەموود لە ناوبران بە نەعرەتەیەکی زۆر گەورە ﴿٥﴾ ﴿وَأَمَّا عَادٞ﴾ وە (گەلی) عادیش
﴿فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ﴾ لە ناوبران بە بایەکی سەختی ساردی بەتینی بەگرمە ﴿٦﴾ ﴿سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ﴾ (خوا)
زاڵی کرد بە سەریاندا ﴿سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ﴾ حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بەبێ ووچان (لەناوی
بردن) ﴿فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ﴾ ئەو گەلەت دەبینی لەو ماوەیەدا بێ گیان کەوتبوون ﴿كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ﴾
وەك قەدی داری خورمای گەندەڵ (ناوڕزاو) ﴿٧﴾ ﴿فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ﴾ ئایا کەس دەبینیت لەوان کە
مابێتەوە؟ ﴿٨﴾

﴿وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ﴾ (هـەر بـەو ڕەنگە) فیرعەون و گەلانی پێش ئەو لەگەڵ (دانیشـتووانی
دێهاتـە) سـەرەو ژێربـووەکان هاتـن ﴿بِٱلۡخَاطِئَةِ﴾ بە گوناهـو خراپـەوە (٩) ﴿فَعَصَوۡاْ رَسُولَ رَبِّهِمۡ﴾ وە بێ
فەرمانیی پێغەمبەری پەروەردگاریان کرد ﴿فَأَخَذَهُمۡ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً﴾ ئەوسـا گرتنی بە گرتنێکی زۆر سـەخت
(١٠) ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ﴾ بەڕاسـتی ئێمە کاتێك کە ئاو(ی تۆفان) سـەرکەوت (باپیرەکانی)
ئێوەمـان هەڵگـرت لـە کەشـتیدا ئەی بـێ بڕوایانـی مەککـە (١١) ﴿لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةٗ﴾ تا ئـەم کردەوەیە
بکەینە بیرهێنەرەوە بۆ ئێوە ﴿وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ﴾ وە تا لەگوێی بگرێت گوێگرێکی تێگەیشـتوو (١٢) ﴿فَإِذَا
نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ﴾ ئەمجا کاتێك فوو کرا بە کەڕەنادا بە تاقە فوو کردنێك (١٣) ﴿وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ﴾
وە زەوی و شـاخەکان هەڵگیـران ﴿فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ بـە جارێـك دران بەیەکـدا (وتەخـت کـران)
(١٤) ﴿فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ﴾ ئـەو ڕۆژە ڕوودای گـەورە ڕوودەدات (١٥) ﴿وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ﴾ وە ئاسـمان
لـەت دەبـێ ﴿فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ﴾ وە ئـەو لەو ڕۆژەدا سسـت و (بێ کەڵکـە) (١٦) ﴿وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ﴾ وە
فریشتەکان لە کەناری ئاسماندان ﴿وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ﴾ وە لەو ڕۆژەدا هەشت (فریشتەی
بەهێـز) عەرشـی پەروەردگـارت بەبان سـەریانەوە هـەڵ دەگرن (١٧) ﴿يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ﴾ لـەو ڕۆژەدا (لە
بەردەمی خوادا) هەمووتان نیشان دەدرێن ﴿لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ﴾ هیچ (کردەوەیەکی) پەنهانیتان بە نهێنی
نامێنێتەوە (١٨) ﴿فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ﴾ ئەوسا ئەو کەسەی کە نامەی (کردەوەی) درایە دەستی ڕاستی
﴿فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ﴾ دەڵـێ: ها نامەکەم بگـرن و بیخوێننـەوە (١٩) ﴿إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ﴾ بێگومان
من خۆم دەمزانی کە تووشـی ئەم لێپرسـینەوەیە دەبم (٢٠) ﴿فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ﴾ ئەو کەسـە لە ژیانێکی
پەسـەندا دەبێ (٢١) ﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ﴾ لە بەهەشـتێکی بەرزدا (٢٢) ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ﴾ کە میوەی نزیکە دەسـتە
(٢٣) ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا﴾ (پێ یان دەووترێت) بخۆن و بخۆنەوە، نۆشـتان بێ ﴿بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ﴾
بەهـۆی ئـەو چاکانەوە کە لـە ڕۆژانی ڕابـردوودا کردووتانـە (٢٤) ﴿وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ﴾ بەڵام
ئەو کەسـەی کە نامە درایە دەسـتی چەپی دەڵێ: ﴿يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ﴾ خۆزگە هـەر نامەم نەدرایەتێ (٢٥)
﴿وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ﴾ وە نەم زانیایە چی یە (سـەرئەنجامی) لێپرسـینەوەم (٢٦) ﴿يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ﴾ خۆزگە
مردنەکـەم یەکجـاری بووایـە (٢٧) ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ﴾ سـامانەکەم هیـچ قازانجێکـی پـێ نەگەیاندم (٢٨)
﴿هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ﴾ لەدەسـتم چـوو دەسـەڵاتەکەم (٢٩) ﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ﴾ (ئەمجـا بـە چاودێرانـی دۆزەخ
دەووترێـت) بیبگـرن زنجیـر بکەنـە دەسـت و گـەردنـی (٣٠) ﴿ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ﴾ لـە پاشـان بیبـەن بـۆ
دۆزەخ (بیسـوتێنن لـە دۆزەخـدا) (٣١) ﴿ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ﴾ ئەمجـا بـە زنجیرێکـی
حەفتـا گەزیی بی بەسـتنەوە (٣٢) ﴿إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ (چونکە) بێگومان ئـەو بڕوای بە خوای
گـەورە نەدەکـرد. (٣٣) ﴿وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ﴾ وە هانـی کەسـی نەدەدا بۆ خـۆراك دان بـە هەژاران
(٣٤) ﴿فَلَيۡسَ لَهُ ٱلۡيَوۡمَ هَٰهُنَا حَمِيمٞ﴾ ئەمڕۆ ئەویش لێرە نە دڵسۆزێکی هەیە (یارمەتی بدات) (٣٥)

﴿وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ﴾ وەنەخواردنیّ (بیخوات) جگەلە کیّم و زووخاوی جەستەی دۆزەخییەکان نەبیّ (٣٦)
﴿لَا يَأْكُلُهُ إِلَّا الْخَاطِئُونَ﴾ کە (کەس) نایخوات گوناهباران نەبێت (٣٧) ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ﴾ جا سویّند بەو
شتانەی کە دەیان بینن (٣٨) ﴿وَمَا لَا تُبْصِرُونَ﴾ وە بەوەش کە نایان بینن (٣٩) ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ بێگومان
ئەم قورئانە فەرموودەی ڕەوانە کراوێکی بەڕێزو گەورەیە (لە خواوە بۆتان دێنیّ) (٤٠) ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ
شَاعِرٍ﴾ وە ئەم (قورئانە) قسەی شاعیر نی یە ﴿قَلِيلًا مَا تُؤْمِنُونَ﴾ زۆر کەم بڕوا دەهێنن (بە قورئان)
(٤١) ﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ﴾ وە قسەی فاڵچی و زێوانیش نی یە ﴿قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ﴾ زۆر کەم بیر دەکەنەوە (٤٢)
﴿تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (ئەم قورئانە) نێرراوەتە خوارەوە لە پەروەردگاری جیهانیانەوە (٤٣) ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ
عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ﴾ ئەگەر (موحەممەد ﷺ) بەدەم ئێمەوە هەندیّ (ووتەی) هەڵببەستایە (٤٤) ﴿لَأَخَذْنَا
مِنْهُ بِالْيَمِينِ﴾ بێگومان ئێمە بەدەستی خۆمان تۆڵەمان لیّ دەسەند (٤٥) ﴿ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ﴾ لە پاشان
ڕەگی دڵیمان دەبڕی (٤٦) ﴿فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾ وە کەس لە ئێوە نەیدەتوانی بەرگری لیّ بکات
(٤٧) ﴿وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ﴾ وە بێگومان ئەم قورئانە ئامۆژگاری و پەندە بۆ پارێزکاران ولەخواترسان
(٤٨) ﴿وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ﴾ وە بێگومان ئێمە دەزانین کە هەندێکتان قورئان بە درۆ دەزانن (٤٩)
﴿وَإِنَّهُ لَحَسْرَةٌ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ وە بێگومان ئەم قورئانە هۆی پەشیمانی بیّ بڕوایانە (٥٠) ﴿وَإِنَّهُ لَحَقُّ الْيَقِينِ﴾
وە بەڕاستی قورئان ڕاست و درووست و دڵنیا بەخشە (٥١) ﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ کەواتە: (ئەی
موحەممەد ﷺ) تۆش هەمیشە یادی پەروەردگاری گەورەی خۆت بکە (٥٢)

## سورەتی ﴿المعارج﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ﴾ داواکارێك داوای سزایەکی (خوایی) کرد کە (ئەو سزایە) هەر ڕوو
دەدات (١) ﴿لِّلْكَافِرِينَ لَيْسَ لَهُ دَافِعٌ﴾ بۆ بیّ بڕوایان نی یە هیچ پاڵ پێوەنەرێك (کە بیان پارێزێت) (٢)
﴿مِّنَ اللَّهِ ذِي الْمَعَارِجِ﴾ لە (سزای) خوای خاوەن پلەو پایەی زۆر بەرز (٣) ﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ﴾
فریشتە و جبرییل سەر دەکەون بۆ لای خوا ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ لە ڕۆژێکدا کە
ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە (٤) ﴿فَاصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا﴾ کەوا بوو خۆت ڕابگرە (ئەی موحەممەد ﷺ)
بە خۆڕاگرتنێکی چاك و جوان (٥) ﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا﴾ بەڕاستی ئەو بیّ بڕوایانە ئەو ڕۆژە بە دوور
دەبینن (٦) ﴿وَنَرَاهُ قَرِيبًا﴾ ئێمەش زۆر بە نزیکی دەبینین (٧) ﴿يَوْمَ تَكُونُ السَّمَاءُ كَالْمُهْلِ﴾ ئەو ڕۆژەی
کە ئاسمان وەك مسی تواوە (یان خڵتەی زەیتی) لیّ دیّ (٨) ﴿وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ﴾ کێوەکانیش وەك
خوری شیکراوەیان لیّ دیّ (٩) ﴿وَلَا يَسْأَلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا﴾ وە هیچ کەسێك ناپرسێتەوە لە هیچ کەسێکی
خۆشەویستی خۆی (١٠)

﴿يُبَصَّرُونَهُمْ﴾ كه نیشـانی یەكتـری دەدرێن ﴿يَوَدُّ الْمُجْرِمُ﴾ تاوانبار ئـاوات دەخوازێ ﴿لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ
يَوْمِئِذٍ﴾ كه (قوربانی) بدایه لەبری ڕزگار بوونی خۆی له سـزای ئەو ڕۆژه ﴿بِبَنِيهِ﴾ به كوڕەكانی ﴿١١﴾
﴿وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ﴾ بـەژن و بـه براكانـی ﴿١٢﴾ ﴿وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ﴾ بـه هـۆزەكەشـیەوە كه پەنایـان دەدا ﴿١٣﴾
﴿وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ﴾ وە بـه هەرچـی كـەس لەسـەر زەوی یه (هەمـووی بدایه و) لەپاشـان هەر
خـۆی ڕزگـاری ببـێ ﴿١٤﴾ ﴿كَلَّا إِنَّهَا لَظَىٰ﴾ نەخێـر (وا نی یه) بەڕاسـتی ئاگـری دۆزەخ به بڵێسـەیه ﴿١٥﴾
﴿نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ﴾ داماڵێنەری پێستی سەره ﴿١٦﴾ ﴿تَدْعُو مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ﴾ (ئەو ئاگرە) بانگی كەسێك دەكات كه
پشتی هەڵكردبێ له خواو ڕووی وەرگێڕابێ ﴿١٧﴾ ﴿وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰ﴾ وە سامانی كۆ كردبێتەوە و هەڵی گرتبێ
﴿١٨﴾ ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا﴾ بێگومان ئادەمی دروسـت كراوە به چاو چنۆكێكی تەنگەتیلكه ﴿١٩﴾ ﴿إِذَا مَسَّهُ
الشَّرُّ جَزُوعًا﴾ كه ناخۆشـی یەكی تووش ببێ هاوارو ناڵه دەست پێ دەكات ﴿٢٠﴾ ﴿وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا﴾ كه
سـامانیش ڕووی تـێ بـكات ئەی گرێتەوە (لـه خەڵكی) ﴿٢١﴾ ﴿إِلَّا الْمُصَلِّينَ﴾ جگه نوێژگـەران نەبێت
﴿٢٢﴾ ﴿الَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ﴾ ئەوانـه كه بەردەوامن لەسـەر نوێژەكانیان ﴿٢٣﴾ ﴿وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ﴾
ئەوانـەی كـه بەشـێكی دیاری كراو لـه داراییانـدا هەیـه ﴿٢٤﴾ ﴿لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ بۆ هـەژاری داواكەر
وبێ نەوای داوانەكەر ﴿٢٥﴾ ﴿وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ﴾ وە ئەوانەی كه باوەڕیان به ڕۆژی پاداشت هەیه ﴿٢٦﴾
﴿وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ﴾ وە ئەوانەی كه له سـزای پەروەردگاری خۆیان دەترسـن ﴿٢٧﴾ ﴿إِنَّ عَذَابَ
رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ﴾ چونكه بەڕاسـتی سـزای پەروەردگاری ئـەوان كەس لـێ ی دڵنیا نیه ﴿٢٨﴾ ﴿وَالَّذِينَ هُمْ
لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ﴾ وە ئەوانـەی كه ئاگاداری داوێنی خۆیـان دەكەن ﴿٢٩﴾ ﴿إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ﴾ لەگەڵ ژنانی
خۆیـان نەبێت ﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ﴾ یا كەنیزەكێك كـه بووبن به خاوەنیان ﴿فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ بێگومان
ئەوانـه لۆمـه كراو نین ﴿٣٠﴾ ﴿فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ﴾ ئەمجا هەر كەسـێك دوای شـتی تـر بكەوێ ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ
الْعَادُونَ﴾ ئـەو كەسـانه ئەوانەن كه دەسـت درێژكـەرن ﴿٣١﴾ ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾ وە ئەوانەی كه
چاودێری سـپاردەو پەیمانی خۆیان دەكەن ﴿٣٢﴾ ﴿وَالَّذِينَ هُم بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ﴾ وە ئەوانەی كه شایەتی خۆیان
بـه تـەواوی دەدەن ﴿٣٣﴾ ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ وە ئەوانـەی كـه پارێزگـاری نوێژیـان دەكـەن ﴿٣٤﴾
﴿أُولَٰئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُّكْرَمُونَ﴾ ئەوانه (كه باس كران) ڕێز دەگیرێن له باخاتی بەهەشـتدا ﴿٣٥﴾ ﴿فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا قِبَلَكَ
مُهْطِعِينَ﴾ دەی چی یانه ئەو بێ بڕوایانه (كه تۆ دەرئەكەویت ئەی موحەممەد ﷺ) بەپەله دێن بۆ لات
﴿٣٦﴾ ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ عِزِينَ﴾ لەلای ڕاسـت و چەپتەوە دەسـته دەسته دەبن ﴿٣٧﴾ ﴿أَيَطْمَعُ كُلُّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ﴾
ئایـا هەمـوو یەكێـك لەوان بەتەمایـە ﴿أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ﴾ كه بخرێتە بەهەشـتی پڕ لە نـازو نیعمەتەوە ﴿٣٨﴾
﴿كَلَّا إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ﴾ وا نـی یـە: (وەك بەتەمان) بەڕاسـتی ئێمه درووسـتمان كـردوون لەوەی كه
دەیزانن ﴿٣٩﴾ ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ﴾ جا سـوێند به پەروەردگـاری ڕۆژهەڵاتەكان و ڕۆژئاواكان
﴿إِنَّا لَقَادِرُونَ﴾ بێگومان ئێمه به دەسەڵاتین ﴿٤٠﴾

﴿عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ﴾ لـە سـەر ئەوەی کـە بیانگۆڕین و باشـتر لـەوان بهێنین ﴿وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ﴾
وە کـەس لـە دەسـتمان دەرناچێ ﴿٤١﴾ ﴿فَذَرۡهُمۡ يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ﴾ ئەمجـا وازیان لێ بهێنە، با لـە بێباوەڕی
وقسـەی هیچ و پـووچ و گاڵتەی خۆیاندا ڕۆبچن ﴿حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ﴾ تـا دووچاری ئەو
ڕۆژەی خۆیـان دەبـن کە بەڵێنیـان پێ دراوە ﴿٤٢﴾ ﴿يَوۡمَ يَخۡرُجُونَ مِنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ سِرَاعٗا﴾ ئـەو ڕۆژەی کە بەپەلە
لـە گۆڕەکانیـان دێنـە دەرەوە ﴿كَأَنَّهُمۡ إِلَىٰ نُصُبٖ يُوفِضُونَ﴾ وەك ئـەوەی کە بۆ لای بتەکانیـان ڕابکەن ﴿٤٣﴾
﴿خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ﴾ چاویان شـۆڕو (سـەر بـەرەو ژێـرە) ﴿تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۚ﴾ ڕیسـوایی و شـەرمەزاری دایان
دەگرێ ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ﴾ ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە لەوەوپێش بەڵێنیان پێ درابوو ﴿٤٤﴾

## سورەتی ﴿ نُوحٍ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ﴾ بێگومـان ئێمـە نووحمان نـارد بۆ لای هۆزەکـەی ﴿أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ﴾ (وە پێمان
ووت) کـە هۆزەکەت بێدار کەرەوە وبیانترسـێنە ﴿مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ پێش ئەوەی کە سـزای
سـەختیان تووش ببـێ ﴿١﴾ ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ﴾ (نووح) ووتی: ئەی گەلی خۆم بەڕاسـتی من
(پێغەمبەرو) ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە ﴿٢﴾ ﴿أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ کە هەر خوا بپەرستن ﴿وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ﴾
و لـێ ی بترسـن وە فەرمانبـەرداری مـن بکەن ﴿٣﴾ ﴿يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ﴾ تـا خوا لـە گوناهەکانتان
خـۆش ببێ ﴿وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ﴾ وە (بە زیندوویی) دەتـان هێڵێتەوە تا کاتی دیاری کراوی مردنتان
﴿إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ﴾ بێگومـان کاتـێ سـزای خوا کـە هـات دوا ناکـەوێ ﴿لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر
بتانزانیایـە ﴿٤﴾ ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا﴾ ووتـی: ئـەی پەروەردگـارم مـن گەلەکـەی خۆمـم
(بە پەنهانی) بانگ کرد بە شەوو بە ڕۆژ ﴿٥﴾ ﴿فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارٗا﴾ وە تا بانگم دەکردن ئەوان زۆرتر
دوور ئەکەوتنـەوە لێم و هەڵئەهاتـن ﴿٦﴾ ﴿وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوۡتُهُمۡ لِتَغۡفِرَ لَهُمۡ﴾ وە بێگومان من هەر کات بانگم
دەکـردن (بۆ بڕوا هێنان) تـا لێیان خۆش ببیت ﴿جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ﴾ ئـەوان پەنجەکانیان دەکرد
بـە گوێچکەیانـدا ﴿وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ﴾ وە پۆشـاکەکانیان دەدا بـە سـەرو چاویاندا ﴿وَأَصَرُّواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ
ٱسۡتِكۡبَارٗا﴾ وە بـەردەوام دەبـوون لـە بـێ بـاوەڕی دا، وە سەرکەشـیان دەکرد چۆن سەرکەشـییەك ﴿٧﴾
﴿ثُمَّ إِنِّي دَعَوۡتُهُمۡ جِهَارٗا﴾ لەپاشـان بە ئاشـکرا بانگم کـردن ﴿٨﴾ ﴿ثُمَّ إِنِّيٓ أَعۡلَنتُ لَهُمۡ﴾ ئەمجـا (دەمێك) بۆم
ئاشـکرا دەکـردن ﴿وَأَسۡرَرۡتُ لَهُمۡ إِسۡرَارٗا﴾ (دەمێك) بۆم پەنهـان دەکردن بە پەنهـان کردنێکی تەواو ﴿٩﴾
﴿فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ﴾ ئەوسـا پێـم ووتـن: داوای لـێ خـۆش بـوون بکـەن لـە پەروەردگارتـان
﴿إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارٗا﴾ بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێ خۆش بووە ﴿١٠﴾

﴿يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا﴾ (ئەمجا گەر وا بکەن) بارانی خوڕەم و لێزمەتان بۆ دەبارێنێ (١١) ﴿وَيُمْدِدْكُم
بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ﴾ وە سامان و کوڕی زۆرتان پێ دەبەخشێ ﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ﴾ وە باخ و باخاتی زۆرتان
پێ دەدات ﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا﴾ وە جۆگە ئاوی زۆرتان دەداتێ (١٢) ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا﴾ ئەوە
چیتانە ناترسن لە شکۆو گەورەیی خوا؟ (١٣) ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ لە کاتێکدا کە دروستی کردوون
بە چەند قۆناغێك (١٤) ﴿أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا﴾ ئایا نابینن کە خوا چۆن حەوت
ئاسمانی دروست کردووە نهۆم لەسەر نهۆم (١٥) ﴿وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا﴾ وە مانگی گێڕاوە لە
ناویاندا بە ڕووناك ﴿وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا﴾ وە ڕۆژیشی گێڕاوە بە چرا (١٦) ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا﴾
وە خوا ئێوەی ڕواندووە لە زەوی بە ڕواندن (١٧) ﴿ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا﴾ لەپاشان دەتان باتەوە ناوی
﴿وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا﴾ وە دەرتان دەهێنێتەوە (لێ ی) بە دەرهێنان (١٨) ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا﴾ خوا زەوی
بۆ ڕاخستوون (١٩) ﴿لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا﴾ تا هاتوچۆ بکەن بە ڕێگە کراوەکانیدا (٢٠) ﴿قَالَ نُوحٌ رَّبِّ
إِنَّهُمْ عَصَوْنِى﴾ نووح ووتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان گەلەکەم بێ فەرمانیان کردم ﴿وَٱتَّبَعُوا۟ مَن لَّمْ يَزِدْهُ
مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ﴾ وە شوێن کەسانێ کەوتن کە ماڵ و منداڵی قازانجی پێ نەگەیاندوە ﴿إِلَّا خَسَارًا﴾ زیان
نەبێ (٢١) ﴿وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا﴾ وە پیلان و فڕو فێڵی زۆر گەورەیان کرد (٢٢) ﴿وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ﴾ وە
ووتیان دەست هەڵ نەگرن لە بت و خواکانتان ﴿وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ وە دەست
هەڵ نەگرن لە (پەرستنی) وەد و سواع و یەغووث و یەعوق و نەسر (ئەمانە کۆمەڵە پیاوچاکێك بوون،
جا کاتێك مردن، شەیتان هات ووتی بەشوێنکەوتوانیان کە چەند پەیکەرێکیان بۆ بتاشن تاوەکو
هەمیشە لەبەرچاوتان بن، جا پاش ماوەیەك کەبەسەر چوو شەیتان هات بەخەڵکی ووت ئەو ئەو
پەیکەرانە بپەرستن، چونکە باوباپیرانتان ئەو پەیکەرانەیان پەرستووە، ئێوەش لەسەر ڕێبازی ئەوان
بن) (٢٣) ﴿وَقَدْ أَضَلُّوا۟ كَثِيرًا﴾ وە بەڕاستی ئەوانە زۆر (خەڵك) یان گومڕا کرد ﴿وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلًا﴾
(خوایە) ئەم ستەم کارانە لە گومڕایی زیاتر هیچی تریان بۆ زۆر مەکە (٢٤) ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٰٔتِهِمْ أُغْرِقُوا۟﴾ بەهۆی
گوناهەکانیانەوەبەزریان خنکێنران ﴿فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا﴾ ئەمجاخرانەئاگرەوە ﴿فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا﴾
ئیتر بێجگە لە خوا هیچ یارمەتی دەرێکیان دەست نەکەوت (٢٥) ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ﴾ نووح
فەرمووی: ئەی پەروەردگار مەیهێڵە لەسەر زەوی ﴿مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا﴾ هیچ کەسێك لە بێ بڕوایان (٢٦)
﴿إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ﴾ (چونکە) بێگومان ئەگەر تۆ وازیان لێ بهێنیت، بەندەکانی تۆ گومڕا دەکەن
﴿وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا﴾ وە هەر منداڵی تاوانباری سوپاس نەکەر دەخەنەوە (٢٧) ﴿رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى
وَلِوَٰلِدَىَّ﴾ ئەی پەروەردگارم خۆش ببە لە خۆم و باوکم و دایکم ﴿وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ مُؤْمِنًا﴾ وە لەو
کەسە کە دێتە ماڵم بە بڕواداریی یەوە ﴿وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ وە لە هەموو پیاوان و ژنانی ئیماندار
﴿وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا﴾ وە بەشی ستەمکاران زیاد مەکە تیاچوون و لە ناوچوون نەبێ (٢٨)

## سورەتی ﴿الْجِنِّ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: نیگام بۆ كرا ﴿أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ﴾ كە بێگومان چەند
كەسێك لە جنۆكە گوێیان گرت (لە قورئان خوێندنەوەم) ﴿فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا﴾ ئەمجا ووتیان:
بەڕاستی ئێمە قورئانێكی سەر سوڕهێنەرمان بیست (١) ﴿يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ﴾ ڕێنموونیی دەكات بۆ
ڕێگای ڕاست ﴿فَآمَنَّا بِهِ﴾ ئێمەش باوەڕمان پێ كرد ﴿وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا﴾ وە هەرگیز كەس ناكەین
بەهاوبەشی پەروەردگارمان (٢) ﴿وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا﴾ وە بەڕاستی بڵندە گەورەیی پەروەردگارمان
- لە شتی ناشایستە - ﴿مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾ هیچ هاوسەرو منداڵێكی بۆ خۆی دانەناوە (٣)
﴿وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا﴾ بێگومان گێل ونەفامەكەمان درۆی ناڵەباری هەڵدەبەست دەربارەی
خوا (٤) ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ وە ئێمە پێمان وابوو كە ئادەمیی و جنۆكە هەرگیز درۆ
ناكەن دەربارەی خوا (٥) ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ﴾ بەڕاستی پیاوانێك لە ئادەمیی ﴿يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ﴾
پەنایان دەبردە بەر پیاوانێك لە جنۆكە (كە بیان پارێزن) ﴿فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ كەچی زۆرتر ماندوویان دەكردن
(٦) ﴿وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا﴾ وە ئادەمیی گومانیان بردووە ﴿كَمَا ظَنَنتُمْ﴾ هەروەك ئێوە - ئەی جنۆكە - گومانتان
بردووە ﴿أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَدًا﴾ كە ئیتر خوا هیچ پێغەمبەرێك نانێرێ (٧) ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ﴾ جنۆكەكان
ووتیان: ئێمە دەگەڕاین بە شوێن دەنگ و باسی ئاسماندا ﴿فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾ كەچی
دیتمان پڕكراوە لە پاسەوانی بەهێز و تیری ئەستێرەكان (٨) ﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ﴾ وە بێگومان
ئێمە جاران دادەنیشتین لە چەند شوێنێك لە ئاسمان بۆ گوێ گرتن ﴿فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ﴾ بەڵام هەر
كەسێك لەئێستا بە دواوە گوێ بگرێ ﴿يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا﴾ تیرێكی ئەستێرە دەبینێ لە بۆسەی دایە (٩)
﴿وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ﴾ وە بەڕاستی نازانین ئایا خراپی ویستراوە بۆ ئەوانەی كە لە سەر
زەوین؟ ﴿أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا﴾ یان پەروەردگاریان ڕێنموونیی ویستووە بۆیان؟ (١٠) ﴿وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ﴾
وە بێگومان ئێمە هەندێكمان چاكین ﴿وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ وە هەندێكمان لەوە كەمتر ﴿كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا﴾
ئێمە جاران خاوەنی ڕێبازی زۆر بووین (١١) ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن نُّعْجِزَ اللَّهَ فِي الْأَرْضِ﴾ وە ئێمە دڵنیا بووین كە
هەرگیز ناتوانین لە دەستی خوا دەرچین لە زەوی دا ﴿وَلَن نُّعْجِزَهُ هَرَبًا﴾ وە بە هەڵهاتنیش لە دەستی خوا
ڕزگار نابین (١٢) ﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَىٰ آمَنَّا بِهِ﴾ بەڕاستی ئێمە كاتێ ڕێنموونیی (قورئان) مان بیست
باوەڕمان پێ هێنا ﴿فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ﴾ ئەمجا هەر كەسێك بڕوای هێنا بە پەروەردگاری خۆی
ئیتر ناترسێ ﴿بَخْسًا وَلَا رَهَقًا﴾ نە لە كەمیی (پاداشت) و نە لە زۆریی (تۆڵە) (١٣)

﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَٰسِطُونَ﴾ وە بێگومان ئێمە هەندێکمان موسـولمانیین و هەندێکمان سـتەمکار
﴿فَمَنْ أَسْلَمَ﴾ ئەمجا ئەوانەی موسـولمان بوون ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا﴾ ئەوە ئەوانە ڕێگای ڕاسـتیان
دۆزیوەتـەوە (١٤) ﴿وَأَمَّا ٱلْقَٰسِطُونَ﴾ بـەڵام ئـەوانـەی لەڕێگـای ڕاسـت لایانـداوە (سـتەمکارەکان)
﴿فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا﴾ دەبنـە سـووتەمەنی دۆزەخ (١٥) ﴿وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ﴾ (ئەمجـا خـوای
گـەورە دەفەرموێـت) : ئەگـەر ئـەوان (مـرۆڤ و جنۆکە) بـەردەوام بوونایە لەسـەرڕێگای ڕاسـت
﴿لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا﴾ ئـاوی زۆرمان پـێ ئەنۆشـین (نیعمەتی زۆرمان دەدانـێ) (١٦) ﴿لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ هەتا
تاقیـان کەینەوە تیایدا ﴿وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ﴾ وە هەر کەسـێك ڕوو وەر گێڕێ لە یادی پەروەردگاری
خۆی ﴿يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا﴾ دەیخاتە ناو سـزای دژوارەوە (١٧) ﴿وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ﴾ بێگومان مزگەوتەکان
بۆ پەرسـتنی خـودان بەتەنهاجگە لەئەو کەسـی تری تێدا نەپەرسـترێت ﴿فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا﴾ کەواتە
لە گـەڵ خوادا هاوار لە کەسـی تـر مەکەن (١٨) ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ﴾ وە بەنـدەی خوا (موحەممەد
ﷺ) کاتێك کە هەستا لە خوا بپاڕێتەوە (و بی پەرستێ) ﴿كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾ (بێ بڕواکانی مەککە)
نزیـك بـوو داباڕن بە سـەریدا (١٩) ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُوا۟ رَبِّى﴾ بڵـێ: دڵنیا بن مـن هەر خوای خۆم دەپەرسـتم.
﴿وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا﴾ وە کەس ناکەم بە هاوبەشی (٢٠) ﴿قُلْ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا﴾ بڵێ: بەڕاستی من
نەزیـان و نەڕێنموونیـی ئێوەم بەدەسـت نی یە (٢١) ﴿قُلْ إِنِّى لَن يُجِيرَنِى مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ﴾ بڵێ: بێگومان کەسـێك
نیە کە من بپارێزێ لە (سـزای) خوا ﴿وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا﴾ وە بێجگە لەو پەناگەیەك شـك نابەم (٢٢)
﴿إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ﴾ (وە هیچم بەدەسـت نی یە) ڕاگەیاندن نەبێ لە خواوە و گەیاندنی پەیامانی ئەو
نەبێ ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ وە هەر کەسێ بێ فەرمانی خوا و پێغەمبەری بکات ﴿فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ﴾ ئەوە
بێگومان ئاگری دۆزەخ بۆ ئەوە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ تێیدا دەمێنێتەوە بەهەمیشەیی (٢٣) ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ﴾
تـا بەچـاوی خۆیان دەبینن ئەو سـزایانەی کـە بەڵێنیان پـێ دراوە ﴿فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا﴾
ئەمجـا ئـەو کاتـە دەزانن، کە کـێ یارمەتـی دەری کەمترە و ژمـارەی کەمـە (٢٤) ﴿قُلْ إِنْ أَدْرِىٓ﴾ بڵێ من
نازانـم ﴿أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ﴾ ئاخـۆ نزیکە ئەو ڕۆژی دواییەی کـە بەڵێنتان پێ دراوە ﴿أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّىٓ أَمَدًا﴾
یـان پەروەردگـارم ماوەیەکـی دووری بـۆ دانـاوە (٢٥) ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ﴾ هـەر خوایـە زانـا بـە نهێنیەکان
﴿فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا﴾ وە کـەس ئاگادار ناکات بەسـەر نهێنی خۆیدا (٢٦) ﴿إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ﴾
مەگـەر پێغەمبەرێکی کە لێی ڕازی بێ ﴿فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا﴾ جا بێگومان خوا
لەبەردەمی و پشـتیەوە پاسـەوان (لە فریشـتە) دەنێرێت (٢٧) ﴿لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمْ﴾ تا بزانێ کە
پەیامـی خـوای خۆیان گەیانـدووە ﴿وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ﴾ وە خوا ئاگادارە بـەوەی کە لایانە ﴿وَأَحْصَىٰ
كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًۢا﴾ وە هەموو شتێکی (لەسەریان) ژماردووە بە هەڵژماردن (٢٨)

# سورەتی ﴿ الْمُزَّمِّلِ ﴾

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿ يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ ﴾ ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیووە (١) ﴿ قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ شەو هەستە (شەو نوێژ
بکە) مەگەر کەمێکی نەبێت (٢) ﴿ نِصْفَهُ أَوِ انْقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴾ نیوەی یا کەمێ لە نیوەی کەم بکەرەوە (٣)
﴿ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ ﴾ یا کەمێ لێی زیاد بکە ﴿ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا ﴾ لەسەرخۆ قورئان بخوێنەرەوە و (بەڕێك
وپێکی) دەوری بکەرەوە (٤) ﴿ إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴾ بێگومان ئێمە لەمەولا بۆت دەنێرینە
خوارەوە گوفتاری (قورئان) ی قورس و گران (٥) ﴿ إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ ﴾ بەڕاستی هەستانی شەو
دوای خەو (بۆ خوا پەرستی) ﴿ هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا ﴾ قورسترەو گرانترە لە ڕووی کردارەوە (لە هی ڕۆژ
وبەهێزترە بۆ دڵ) ﴿ وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴾ دروسترە لە ڕووی ووتنەوە (٦) ﴿ إِنَّ لَكَ فِي النَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴾ بەڕاستی
تۆ لە ڕۆژدا لە هاتوو چۆکردنێکی زۆردایت (٧) ﴿ وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ ﴾ هەمیشە یادی پەروەردگارت بکە
﴿ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴾ وە خۆت یەکلا کەرەوە بە یەکلایی کردنەوەیەکی تەواو (٨) ﴿ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ﴾
ئەو خوای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە ﴿ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نی یە تەنها ئەو نەبێ
﴿ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴾ کەوابوو بیکە بە پارێزەر و پشتیوانی خۆت (٩) ﴿ وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ ﴾ دان بە خۆتدا
بگرە لەسەر ئەو قسانەی کە دەیڵێن ﴿ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴾ وە وازیان لێ بهێنەو لێیان گەڕێ بە واز
لێهێنانێکی جوان (١٠) ﴿ وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ ﴾ واز بهێنە لە من وئەو خاوەن ناز ونیعمەتانەی کە
ئایینی من بە درۆ دەزانن ﴿ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴾ وە کەمێك مۆڵەتیان بدە (١١) ﴿ إِنَّ لَدَيْنَا أَنْكَالًا ﴾ بێگومان لای
ئێمە هەیە کۆت و زنجیری قورس و گران ﴿ وَجَحِيمًا ﴾ وە ئاگری هەڵ گیرساو (١٢) ﴿ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ ﴾
وە خواردنی گەرو گیر ﴿ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴾ هەروەها سزای پڕ لە داخ و دەرد (١٣) ﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ ﴾
لەڕۆژێکدا کە زەوی و چیاکان دێنە لەرزە ﴿ وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَهِيلًا ﴾ وە کێوەکان دەبن بە گردۆڵکە
لە لمی هەڵڕژاو (١٤) ﴿ إِنَّا أَرْسَلْنَا إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَاهِدًا عَلَيْكُمْ ﴾ بێگومان ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ناردن کە
شایەتە لە سەرتان ﴿ كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴾ هەروەك پێغەمبەرێکمان نارد بۆلای فیرعەون (١٥)
﴿ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ ﴾ ئەمجا فیرعەون سەرپێچی ئەو پێغەمبەرەی کرد ﴿ فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴾ ئێمەش
تۆڵەمان لێ سەند بە تۆڵە سەندنێکی سەخت (١٦) ﴿ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِنْ كَفَرْتُمْ ﴾ جا ئەگەر بێ بڕوایی
بکەن چۆن خۆتان دەپارێزن ﴿ يَوْمًا يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا ﴾ لە ڕۆژێکدا کە (بە ترس و سامی خۆی)
مندالآن پیر دەکات (١٧) ﴿ السَّمَاءُ مُنْفَطِرٌ بِهِ ﴾ ئاسمان لەت دەبێ بەهۆی (سەختیی) ئەو ڕۆژەوە
﴿ كَانَ وَعْدُهُ مَفْعُولًا ﴾ بەڵێنی خوا دێتە دی (١٨) ﴿ إِنَّ هَٰذِهِ تَذْكِرَةٌ ﴾ بەڕاستی ئەم ئایەتانەی پێشوو پەند
و ئامۆژگارین ﴿ فَمَنْ شَاءَ اتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِ سَبِيلًا ﴾ ئەمجا هەرکەسێك کە بیەوێ ڕێگا دەگرێ بۆلای
پەروەردگاری (١٩)

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ دەزانێ (ئەی موحەممەد ﷺ) کە تۆ هەڵ دەسیت
(بۆ شەو نوێژکردن) شتێك کەمتر ﴿مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ﴾ لە دووبەش لە سێ بەشی شەوو نیوەی
یان سێ یەکی ﴿وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ﴾ وە دەستەیەك لەوانەی کە لـە گەڵتان ﴿وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ وە
خوا ئەندازەی شەو و ڕۆژ دیاری دەکات ﴿عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ﴾ (خوا) زانی کە ئێوە ناتوانن ئەندازەی
شەو نوێژ ڕابگرن ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ﴾ لە بەرئەوە لێتان خۆش بوو ﴿فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ﴾ دەی ئەوەندەی
بۆتان دەلوێ و ئاسانە لاتان قورئان بخوێنن ودەوری بکەنەوە ﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ﴾ (خوا) دەزانێ
کە لەمەولا کەسانێکتان نەخۆش دەبێت ﴿وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وە کەسانێکی ترتان دەڕۆن بەسەر
زەویدا ﴿يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ﴾ بە شوێن ڕۆزیی ونیعمەتی خوادا دەگەڕێن ﴿وَءَاخَرُونَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾
وەکەسانێکی ترتان دەجەنگن لە ڕێگای خوادا ﴿فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ﴾ ئەمجا بخوێننەوە لە قورئان
ئەوەندەی کە بۆتان دەلوێ ولاتان ئاسانە ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن
﴿وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ وە قەرز بدەن بەخوا بە قەرزێکی چاك (مەبەست ئەوەیە خێر و خێرات و
سەدەقە بکەن لە ڕێی خوادا) ﴿وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ﴾ هەر چاکەیەك پێش بخەن بۆ خۆتان ﴿تَجِدُوهُ عِندَ
ٱللَّهِ﴾ لای خوا دەستان دەکەوێتەوە ﴿هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا﴾ ئەوەیشی لای خوایە چاکتر و گەورەترە لە
ڕووی پاداشتەوە ﴿وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ﴾ وە داوای لێخۆش بوون بکەن لە خوا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ﴾ بەڕاستی
خوا لێخۆشبوویەکی میهرەبانە ﴿٢٠﴾

## سورەتی ﴿ٱلْمُدَّثِّرِ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ﴾ ئەی ئەو کەسەی کە خۆت پێچاوەتەوە ﴿١﴾ ﴿قُمْ فَأَنذِرْ﴾ هەستە (خەڵکی) بێدار کەرەوە
﴿٢﴾ ﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ﴾ وە پەروەردگارت بە گەورە بگرە ﴿٣﴾ ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ وە پۆشاکت بە پاك ڕابگرە ﴿٤﴾
﴿وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ﴾ بەردەوام بە لەوازهێنان لە بت پەرستی و گوناه ﴿٥﴾ ﴿وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ﴾ وە شت مەبەخشە
و بەزۆری بزانیت ﴿٦﴾ ﴿وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ﴾ وە لەبەر پەروەردگارت خۆت ڕابگرە ﴿٧﴾ ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِى ٱلنَّاقُورِ﴾
هەر کاتێك کە فوکرا بە کەڕەنادا ﴿٨﴾ ﴿فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی سەخت وگرانە ﴿٩﴾
﴿عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ﴾ لەسەر کافران سووك و ئاسان نی یە ﴿١٠﴾ ﴿ذَرْنِى وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا﴾ واز لە من و
ئەو کەسە بێنە کە دروستم کردووە بە تەنها ﴿١١﴾ ﴿وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا﴾ وە دارایی زۆر و زەبەندەم
پێ داوە ﴿١٢﴾ ﴿وَبَنِينَ شُهُودًا﴾ وە کوڕانی ئامادەو بەردەست ﴿١٣﴾ ﴿وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا﴾ وە هۆی ژیانم بۆ
ڕاخستووە بە چۆن ڕاخستنێك ﴿١٤﴾ ﴿ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ﴾ دوای ئەمانەش هێشتا بە تەمایە زیاتری بدەمێ ﴿١٥﴾
﴿كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِءَايَـٰتِنَا عَنِيدًا﴾ نەء ،(چاوەڕوان نەبێ) بە ڕاستی ئەو دەربارەی ئایەت و نیشانەکانی ئێمە
بێباوەڕێکی کەلە ڕەقە ﴿١٦﴾ ﴿سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا﴾ بەم زووانە سزای سەختی پێ دەچەژم ﴿١٧﴾ ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ﴾
(چونکە) بیری کردەوە و هەڵی سەنگاند (قسەکەی خۆی) ﴿١٨﴾

﴿فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ﴾ دەك بـە كوشـت چـیّ چۆنی هەلّ سـەنگاند ﴿١٩﴾ ﴿ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ﴾ دووبارە بە كوشـت
چـیّ چۆنـی لێكداوەتـەوە ﴿٢٠﴾ ﴿ثُمَّ نَظَرَ﴾ لـە پاشـان تەماشـایەكی كـرد ﴿٢١﴾ ﴿ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ﴾ ئەوسـا
ناوچەوانـی گـرژو ڕووی تـرش كـرد ﴿٢٢﴾ ﴿ثُمَّ أَدۡبَرَ وَٱسۡتَكۡبَرَ﴾ ئەمجـا بە فیزێكـەوە پشـتی هەڵكرد ﴿٢٣﴾
﴿فَقَالَ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ﴾ جـا ووتـی ئـەم قورئانـە هیچی تر نـی یـە جادوویەك نەبـیّ كـە وەرگیراوە
﴿٢٤﴾ ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ﴾ ئـەم قورئانـە هـەر گوفتـاری مرۆڤـە ﴿٢٥﴾ ﴿سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ﴾ (ئەو كەسـە) زوو
دەیخەمـە دۆزەخـەوە ﴿٢٦﴾ ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ﴾ تۆ چووزانیت كـە دۆزەخ چی یە ؟ ﴿٢٧﴾ ﴿لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ﴾
(ئاگرێكـە) هیـچ ناهێڵێتـەوە و واز ناهێنیّ ﴿٢٨﴾ ﴿لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ﴾ (بە یەكەم هاڵاو) پێسـت ڕەش دەكاتەوە
ودەیبرژێنیّ ﴿٢٩﴾ ﴿عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ﴾ نۆزدە فریشتە ئەوەتان بە سەریەوە ﴿٣٠﴾ ﴿وَمَا جَعَلۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةٗ﴾
هـەر فریشـتەمان كردووە بـە كار بەدەسـتی دۆزەخ ﴿وَمَا جَعَلۡنَا عِدَّتَهُمۡ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وە ژمـارەی ئەو
فریشـتانەمان نەگێـڕاوە مەگـەر بـۆ تاقی كردنـەوەی ئەوانـەی بیّ بـاوەڕن ﴿لِيَسۡتَيۡقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾
تـا ئەوانـەی كتێبیـان پێدراوە دڵنیا بـن ﴿وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗا﴾ وە بـڕوادارەكان بڕواكەیـان زیاد بكات
﴿وَلَا يَرۡتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ وە هیچیان دوو دڵ نەبن ئەوانەی كتێبیان پێدراوە ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ ئیماندارانیش
﴿وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ﴾ وە تـا بڵێـن ئەوانـەی كە نەخۆشـی (ناپاكیـی) یان لـە دڵایە ﴿وَٱلۡكَٰفِرُونَ﴾
وە بیّ بڕواكان ﴿مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗا﴾ خوا چی مەبەسـتە بەم ژمارەیە كە لە غەریبیدا وەك مەسەل وایە
﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ﴾ ئا بەوجۆرە خوا ئەو كەسەی كە بیەویّ گومڕای دەكات ﴿وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾ وە ئەو
كەسەی كە بیەویّ ڕیّ نموونیی دەكات ﴿وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾ وە كەس ژمارەی لەشكر وسەربازانی
پەروەردگـاری تۆ نازانێت جگە خۆی نەبێت ﴿وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡبَشَرِ﴾ وە ئەم ئایەتانە هەر ئامۆژگاری
و پەندن بۆ ئادەمی ﴿٣١﴾ ﴿كَلَّا وَٱلۡقَمَرِ﴾ نەء (وانی یە) سوێند بە مانگ ﴿٣٢﴾ ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذۡ أَدۡبَرَ﴾ وە سوێند بەشەو
كـە پشـت هـەڵ دەكات و دەڕوا ﴿٣٣﴾ ﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَآ أَسۡفَرَ﴾ وە سـوێند بـە بەرەبەیان كـە ڕوون دەبێتەوە ﴿٣٤﴾
﴿إِنَّهَا لَإِحۡدَى ٱلۡكُبَرِ﴾ بیّ گومان سـەقەر (دۆزەخ) یەكێكە لەشـتە سـامناكە گـەورەكان ﴿٣٥﴾ ﴿نَذِيرٗا لِّلۡبَشَرِ﴾
ترسـێنەرە بۆ هەموو خەڵكی ﴿٣٦﴾ ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ﴾ بۆ ئەو كەسـەتان كـە دەیەویّ ﴿أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ﴾ پێش
بكەوێت (لە چاكەدا) یا دواكەویّ ﴿٣٧﴾ ﴿كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ رَهِينَةٌ﴾ هەموو كەسێك بارمتەی كارو كردەوەی
خۆیەتی ﴿٣٨﴾ ﴿إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ﴾ جگە هاوەڵانی دەستی ڕاست (چاكەكاران) نەبێت ﴿٣٩﴾ ﴿فِي جَنَّٰتٖ يَتَسَآءَلُونَ﴾
كـە لە باخاتی بەهەشـتدا پرسـیار لە یەكتـری دەكەن ﴿٤٠﴾ ﴿عَنِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ لـە (حاڵی) تـاوان باران ﴿٤١﴾
﴿مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ﴾ (هەر لە بەهەشتی یەكان وەڵام ئەداتەوە كە دیوومانن و پێمان ووتوون) چی ئێوەی
خسـتووەتە دۆزەخـەوە ﴿٤٢﴾ ﴿قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ﴾ ئەوانیـش وتیـان: ئێمە لـە نوێژ گـەران نەبووین ﴿٤٣﴾
﴿وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ﴾ وە خۆراكمـان نەدەدا بە هەژاران ﴿٤٤﴾ ﴿وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ﴾ وەڕۆ دەچووین
لەگـەڵ ئەوانـەی كـە ڕۆ دەچـوون (لـە قسـەی خراپـەو بـیّ شـەرعی دا) ﴿٤٥﴾ ﴿وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾
وە باوەڕمان بە ڕۆژی دوایی نەبوو ﴿٤٦﴾ ﴿حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ﴾ تا مردن یەخەی پێگرتین ﴿٤٧﴾

﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ﴾ ئیتـر تکای تکاکاران هیچ قازانجێکیـان پێ ناگەیەنێت ﴿٤٨﴾ ﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ
مُعْرِضِينَ﴾ ئـەوە چیانە ڕوو وەردەگێڕن لە ئامۆژگـاری قورئان ﴿٤٩﴾ ﴿كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ﴾ ئەڵێی کەرە
کێوی سـڵ کەرن ﴿٥٠﴾ ﴿فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾ لە شـێر ، (یان لەدەسـت کۆمەڵی تیر هاوێژ) هەڵهاتوون ﴿٥١﴾
﴿بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً﴾ بەڵکو هەموو یەکێك لەوان ئەیەوێ چەندەها نامەی کراوەی
بـۆ بنێردرێ(لە خواوە کە بڕوا بە موحەممەد ﷺ بێنێ) ﴿٥٢﴾ ﴿كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ﴾ با چاوەڕوانی ئەوە
نەبـن بەڵـکـو هەر ناترسـن لە ڕۆژی دوایـی ﴿٥٣﴾ ﴿كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ﴾ با پەشـیمان بنەوە بە ڕاسـتی قورئان
پەنـدو وئامۆژگاریـە ﴿٥٤﴾ ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾ ئەمجا هەر کەسێك بیەوێـت با پەندی لـێ وەربگرێت ﴿٥٥﴾
﴿وَمَا يَذْكُرُونَ﴾ ئامۆژگاری قورئان وەرناگرن ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ مەگەر خوا بیەوێت ﴿هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ﴾
خوا شیاوی لێ ترسانە ﴿وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ﴾ وە شیاوی لێ خۆشبوونە ﴿٥٦﴾

## سورەتی ﴿ٱلْقِيَٰمَةِ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ سـوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت ﴿١﴾ ﴿وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾ وە سـوێند دەخۆم بە
نەفسـی لۆمەکەر (لەسـەر خراپە) ﴿٢﴾ ﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ﴾ ئایا مرۆڤ وا دەزانێ کە ئێسقانە
(ڕزیوەکانی) کۆ ناکەینەوە ﴿٣﴾ ﴿بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ﴾ بەڵێ : بە توانایین لە سـەر ڕێك خسـتنەوەی
(نەقشـی) سـەر پەنجەکانی ﴿٤﴾ ﴿بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ﴾ بەڵکو ئینسـان دەیەوێ تا لە ژیان دایە هەر
تاوان و خراپە بکات ﴿٥﴾ ﴿يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ دەپرسـێ: کەی ڕۆژی دوایی دێ ؟.﴿٦﴾ ﴿فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ﴾
کاتـێ: کـە چـاو ئەبڵـەق بـوو ؟ ﴿٧﴾ ﴿وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ﴾ وە مانـگ گیـراو تاریـك بـوو ﴿٨﴾ ﴿وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ
وَٱلْقَمَرُ﴾ وە ڕۆژ و مانگ کۆ کرانەوە ﴿٩﴾ ﴿يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ﴾ ئەوڕۆژە مرۆڤ دەڵێت: لە کوێوە
هەڵبێین لە (سـزای خوا) ﴿١٠﴾ ﴿كَلَّا لَا وَزَرَ﴾ نەخێر هیچ پەناگەیەك نی یە ﴿١١﴾ ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ﴾ لەو
ڕۆژەدا ئارامگـا هـەر لای پەروەردگـاری تۆیە ﴿١٢﴾ ﴿يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾ لـەو ڕۆژەدا ئادەمیی
هەواڵی پێدەدرێت لەوەی کە پێشی خستووە و دوای خستووە (لە چاکەو خراپە) ﴿١٣﴾ ﴿بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ
بَصِيرَةٌ﴾ بەڵکو ئادەمی ئاگادارە بەحاڵی خۆی ﴿١٤﴾ ﴿وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾ با بڕو بیانووی زۆریش بهێنێتەوە ﴿١٥﴾
﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ﴾ زمانـت مەجوڵێنە (بەخوێندنەوەی قورئان لەکاتی دابەزینی وەحییدا) ﴿لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾
تا پەلەی تیا بکەیت ﴿١٦﴾ ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾ بە ڕاستی (وەك بەڵێنمان داوە) بێگومان لەسەر ئێمەیە
کۆکردنەوەی لە سنگتداو خوێندنەوەی ﴿١٧﴾ ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ﴾ ئەمجا کاتێ کە قورئانمان بۆ خوێندیتەوە (بە
هۆی جبریلەوە) ﴿فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾ تۆش شـوێن خوێندنەوەی ئەو بکەوە ﴿١٨﴾ ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾ لە پاشـان
دڵنیابە ڕوون کردنەوەشی لەسەر ئێمەیە ﴿١٩﴾

﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ﴾ (زیندوو کردنەوە هەر دەبێت) بەڵکو ئێوە هەر دونیاتان خۆش دەوێت ﴿٢٠﴾
﴿وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ﴾ گوێ بە ڕۆژی دوایی نادەن! ﴿٢١﴾ ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ﴾ زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا گەشاوەن
﴿٢٢﴾ ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ تەماشای پەروەردگاریان دەکەن ﴿٢٣﴾ ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ﴾ وە زۆر ڕووخساریش
لەو ڕۆژەدا گرژو تاڵن ﴿٢٤﴾ ﴿تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ﴾ دەزانن کە سزای پشت شکێن دەدرێن ﴿٢٥﴾ ﴿كَلَّا
إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ﴾ نەخێر (ئاوا ناچێتە سەر بۆتان، جا پەشیمان ببنەوە!) چونکە کاتێك کە گیان گەیشتە گەرو
(لە کاتی کێشانیدا) ﴿٢٦﴾ ﴿وَقِيلَ مَنْ ۜ رَاقٍ﴾ ئەوسا (هەندێك لەوانەی کە بەدەوریدان) دەڵێن: کەسێك نیە
چارەسەری بکات وفریای بکەوێت؟ ﴿٢٧﴾ ﴿وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ﴾ (ئەو کەسەی گیانی دەکێشرێت) دڵنیایە ئەوە
(ی تووشی بووە مردن و) جیابوونەوەیە ﴿٢٨﴾ ﴿وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ﴾ وە قاچ و لوولاقی بەیەکدا ئالا ﴿٢٩﴾
﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ﴾ ڕاپێچکردن لەو ڕۆژەدا بۆ لای پەروەردگارتە ﴿٣٠﴾ ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ﴾ جا
(کافر) نەبڕوای هێناو نە نوێژی کرد ﴿٣١﴾ ﴿وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ بەڵکو ئایینی بەدرۆ دەزانی و پشتی تێ
دەکرد ﴿٣٢﴾ ﴿ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰ أَهْلِهِ يَتَمَطَّىٰ﴾ لەپاشان بە کەشخەو فیزەوە گەڕایەوە بۆ لای ماڵ و منداڵی ﴿٣٣﴾
﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ﴾ تیاچوون بۆ تۆ، (ئەی ئادەمی بێ بڕوا) ئەمجا تیاچوون بۆ تۆ ﴿٣٤﴾ ﴿ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ﴾
دووبارە تیاچوون بۆ تۆ، ئەمجا تیاچوون بۆ تۆ ﴿٣٥﴾ ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾ ئایا مرۆڤ وا
دادەنێت کە هەروا بەرەڵا دەکرێ (و پشت گوێ دەخرێ) ﴿٣٦﴾ ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ﴾ ئایا دڵۆپە
ئاوێك نەبوو لەتۆو کە دەڕژێنرا (یە منداڵدانەوە) ﴿٣٧﴾ ﴿ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ﴾ لە پاشان بوو بە
پارچە خوێنێك، ئەمجا دروستی کرد و ڕێکی خست ﴿٣٨﴾ ﴿فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ﴾ ئەمجا لەو تۆوە دوو
جۆری دروست کرد ﴿الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ﴾ نێر و مێ ﴿٣٩﴾ ﴿أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ﴾ ئایا ئەو
زاتە توانای نی یە بەسەر ئەوەدا کە مردووان زیندوو بکاتەوە ﴿٤٠﴾

## سورەتی ﴿الْإِنسَانِ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ﴾ بێگومان بەسەر ئادەمی دا تێپەڕی ﴿حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ﴾ ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار
﴿لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا﴾ کە شتێکی وانەبوو ناوببرێ ﴿١﴾ ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ﴾ بەڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان
دروست کرد ﴿مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ﴾ لە دڵۆپێك ئاوی تێکەڵ لە گەڵێ توخم ﴿نَّبْتَلِيهِ﴾ تا تاقی بکەینەوە
﴿فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ ئەمجا ژنەواو وبینا مان کرد (چاو و گوێمان پێبەخشی) ﴿٢﴾ ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ﴾
بێگومان ئێمە ڕێنموونیمان کرد بۆ ڕاستەڕێ، ﴿إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ جا یان سوپاسگوزارە، وە
یان ناسوپاس و سپڵە ﴿٣﴾ ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ بێ بڕوایان
﴿سَلَاسِلَا وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا﴾ زنجیرو تەوقی زۆر (کە دەکرێتە گەردنیان) و ئاگری هەڵگیرساو ﴿٤﴾
﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾ بێگومان چاکەکاران لە پەرداخێکدا (شەراب) دەخۆنەوە کە
ئاوێتەکەی لە سەرچاوەی کافورەوەیە ﴿٥﴾

﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ﴾ کە کانی یەکە (لە بەهەشتدا) بەندەکانی خوا لێ ی دەخۆنەوە ﴿يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾
(لەهەر شوێنێکدا بیانەوێ) هەڵیدەقوڵێن وفوارە دەکات ﴿٦﴾ ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ﴾ وەفا بە نەزر دەکەن ﴿وَيَخَافُونَ
يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا﴾ وە لـە ڕۆژێکیش دەترسـن کە بەدی و سـەختی یەکەی هەمـووان دەگرێتەوە ﴿٧﴾
﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ وە خواردن ئەدەن بە هەژاران و هەتیوان و دیلەکان هەرچەند
خۆیان حەزیشیان لێی بێت ﴿٨﴾ ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ﴾ (دەڵێن) بەڕاستی ئێمە تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا
خواردنتان دەدەینێ ﴿لَا نُرِيدُ مِنكُمْ﴾ چاوەڕوانی ناکەین لە ئێوە ﴿جَزَاءً وَلَا شُكُورًا﴾ نە پاداشت و نە سوپاس ﴿٩﴾
﴿إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾ بەڕاستی ئێمە لە سزای پەروەردگارمان دەترسین لە ڕۆژێکی ترش و تاڵ
و دژواردا ﴿١٠﴾ ﴿فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ الْيَوْمِ﴾ جا خوا پاراستنی لە بەدی ئەو ڕۆژە ﴿وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا﴾ وە ڕووی
گەش و شادومانی پێ بەخشین ﴿١١﴾ ﴿وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا﴾ وە پاداشتی دانەوە بەهۆی خۆڕاگرتنیان
(لەسـەر چاکـە و دوور کەوتنەوە لە خراپە) بە بەهەشـت و (پۆشـاکی) ئاوریشـم ﴿١٢﴾ ﴿مُّتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى
الْأَرَائِكِ﴾ پاڵی تیا دەدەنەوە لەسەر تەخت و قەنەفەی زۆر ﴿لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا﴾ نابینن تێیدا نە گەرمی ڕۆژ
﴿وَلَا زَمْهَرِيرًا﴾ وە نـە سـەرما (واتە هەوایەکی زۆر خۆشـی هەیە) ﴿١٣﴾ ﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا﴾ وە سـێبەری
درەختانی بەهەشت بەسەر سەریانەوەیە ﴿وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا﴾ وەهێشووی میوەکانی نزیکەدەست وئاسان
کراوە ﴿١٤﴾ ﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ﴾ دەگەڕێن بەسەریاندابە قاپی زیوییین ﴿وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا﴾ وپەرداخی
شووشـەوە ﴿١٥﴾ ﴿قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٍ﴾ شووشە لە زیوو ﴿قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا﴾ بە ئەندازەی پێویست ئامادەکراون ﴿١٦﴾
﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا﴾ لە بەهەشـتدا شـەرابیان لە پەرداخێکدا پێ دەنۆشـرێ کـە زەنجەبیلی
تێکـەڵاوە ﴿١٧﴾ ﴿عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا﴾ (کە ئەویش) کانی یەکە لە بەهەشـت دا ناودەبرێ بە سەلسـەبیل
﴿١٨﴾ ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ﴾ دەگەڕێـن بە سـەریاندا نەوجەوانانی هەمیشـە لاو و ڕوخۆش وپاك ﴿إِذَا
رَأَيْتَهُمْ﴾ کاتێـك بیان بینیت ﴿حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا﴾ وا دەزانیت دانەی مرواری پرژو بڵاوون ﴿١٩﴾ ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ
ثَمَّ﴾ وە کاتێك بڕوانیت لـەوێدا ﴿رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا﴾ ناز و نیعمەت و دەسەڵاتێکی گەورە دەبینیت ﴿٢٠﴾
﴿عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ﴾ لە بەریاندایە بەرگی نەرم و نۆڵی سـەوزکار و پۆشاکی ئاوریشمین
﴿وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ﴾ وە ڕازێنراونەتـەوە بە بازنی زیوو ﴿وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾ وە پەروەردگاریان
شـەرابی پاك و تەمیزی پێ نۆشـین ﴿٢١﴾ ﴿إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً﴾ (پێیان دەوترێت) ئەم بەهەشـتە پاداشـتی
ئێوەیە ﴿وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا﴾ وە هەموو کۆششێکتان سوپاس کراوە ﴿٢٢﴾ ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنزِيلًا﴾
بێگومـان ئێمـە قورئانمـان بۆ ناردیتە خـوارێ بە ناردنی (بەش بـەش) ﴿٢٣﴾ ﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ﴾ کەواتە
چاوەڕوانـی فەرمانـی خوا بکـە ﴿وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ آثِمًا أَوْ كَفُورًا﴾ وە فەرمانبەرداری هیـچ گوناهبار و بێ
باوەڕێـك مەکـە ﴿٢٤﴾ ﴿وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ﴾ وە زیکـر ویـادی پەروەردگـارت بکە ﴿بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ بـە بەیانیان
وئێواراندا ﴿٢٥﴾

﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ﴾ وە لە شەوا سوژدەی بۆ بەرە (نوێژ بکە) ﴿وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا﴾ وە ستایشی خوا
بکە لە بەشێکی زۆر لە شەودا ﴿٢٦﴾ ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ﴾ بێگومان ئەم بێ بڕوایانە دونیای بێ بەقایان
خۆش دەوێ ﴿وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا﴾ وە پشت گوێی دەخەن ڕۆژێکی قورس و گران (کە قیامەتە)
﴿٢٧﴾ ﴿نَّحۡنُ خَلَقۡنَٰهُمۡ وَشَدَدۡنَآ أَسۡرَهُمۡۖ﴾ ئێمە ئەوانمان دروست کرد و جومگەکانیانمان قایم پێکەوە بەستووە
﴿وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ تَبۡدِيلًا﴾ وە کاتێک بمانەوێت دەیان گۆڕین بە کەسانی تری وەک خۆیان
چۆن گۆڕینێک ﴿٢٨﴾ ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ﴾ ئەم سورەتە ئامۆژگاری و پەندە ﴿فَمَن شَآءَ﴾ ئەمجا هەر کەسێک
بیەوێت ﴿ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا﴾ ڕێگا دەگرێتە بەر بۆ لای پەروەردگاری ﴿٢٩﴾ ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ﴾
وە ئێوە حەز ناکەن (لە گرتنی ئەو ڕێ یە) مەگەر کاتێک کە خوا بیەوێ (وە بە زۆر ناچارتان بکات)
﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ بێگومان خوا دانای دروست کردارە ﴿٣٠﴾ ﴿يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ﴾
ئەوەی (خوا) بیەوێ دەیخاتە ناو میهرەبانی خۆیەوە ﴿وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا﴾ وە ئامادەی
کردووە بۆ ستەمکاران سزای سەخت ﴿٣١﴾

## سورەتی ﴿ٱلۡمُرۡسَلَٰتِ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا﴾ سوێند بە بای ڕەوانە کراوی، یەک لە دوای یەک ﴿١﴾ ﴿فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا﴾ وە بەو (با)
توندانەش هەڵ دەکەن بە هەڵکردنێکی قایم ﴿٢﴾ ﴿وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا﴾ وە بەو بایانەی کە هەور دەبەن
وبڵاوی دەکەنەوە ﴿٣﴾ ﴿فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا﴾ سوێندیش بەو (فریشتانە) ی بەچاکی حەق لە ناحەق جیا
دەکەنەوە ﴿٤﴾ ﴿فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا﴾ ئەمجا سوێند بەو (فریشتانە) ش پەیامی (خوا بە پێغەمبەران) دەگەیەنن
﴿٥﴾ ﴿عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا﴾ بۆ (نەهێڵانی) بەهانە (ولێخۆشبوونیان) یا بۆ ترساندن ﴿٦﴾ ﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٞ﴾
بەڕاستی ئەوەی کە بەڵێنتان پێ دراوە (لە هاتنی ڕۆژی دوایی) دێتە دی ﴿٧﴾ ﴿فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ﴾ ئەمجا
کاتێک کە ئەستێرەکان تاریک بوون ﴿٨﴾ ﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ﴾ وە دەمێک کە ئاسمان کەلێنی تێ بوو ﴿٩﴾
﴿وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ﴾ وە کاتێک کێوەکان لە بێخ هێنران و تەخت کران ﴿١٠﴾ ﴿وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتۡ﴾ وە ساتێک کە
کات وشوێنی دیارکراو دانرا بۆ پێغەمبەران لەگەڵ ئوممەتەکانیاندا ﴿١١﴾ ﴿لِأَيِّ يَوۡمٍ أُجِّلَتۡ﴾ بۆ چ ڕۆژێ
دوا خراوە؟ ﴿١٢﴾ ﴿لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ﴾ بۆ ڕۆژی جیاکردنەوە ﴿١٣﴾ ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ﴾ تۆ چووزانییت
ڕۆژی جیاکردنەوە چی یە؟ ﴿١٤﴾ ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ وای بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا ﴿١٥﴾ ﴿أَلَمۡ نُهۡلِكِ
ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ئایا گەلانی پێشینانمان لە ناو نەبرد ﴿١٦﴾ ﴿ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ لە پاشان گەلانی دوای
ئەوانمان وەک ئەوان لێ نەکرد ﴿١٧﴾ ﴿كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ هەر بەو جۆرەش دەکەین بە گوناهباران
﴿١٨﴾ ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ وای بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا ﴿١٩﴾

﴿أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ﴾ ئایا ئێوەمان دروست نەکردووە لە ئاوێکی بێ نرخ؟. ﴿٢٠﴾ ﴿فَجَعَلۡنَٰهُ فِي قَرَارٖ مَّكِينٍ﴾
ئەمجا خستمانە جێگایەکی پتەوەوە ﴿٢١﴾ ﴿إِلَىٰ قَدَرٖ مَّعۡلُومٖ﴾ تا ماوەیەکی دیاری کراو ﴿٢٢﴾ ﴿فَقَدَرۡنَا فَنِعۡمَ
ٱلۡقَٰدِرُونَ﴾ ئەمجا بەئەندازەگیریەکی رێك وپێك دروستمان کرد، ئای (ئێمە) چ ئەندازەگیرێکی
تەواو وچاکین ﴿٢٣﴾ ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ وای بۆ بێ بڕوایان لەو رۆژەدا ﴿٢٤﴾ ﴿أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ كِفَاتًا﴾
ئایا ئێمە زەویمان نەکردۆتە کۆ کەرەوە ﴿٢٥﴾ ﴿أَحۡيَآءٗ وَأَمۡوَٰتٗا﴾ بۆ زیندووان و مردووان ﴿٢٦﴾ ﴿وَجَعَلۡنَا فِيهَا
رَوَٰسِيَ شَٰمِخَٰتٖ﴾ وە لە ناویدا شاخانی بەرزی لەنگەر داکوتاومان داناوە ﴿وَأَسۡقَيۡنَٰكُم مَّآءٗ فُرَاتٗا﴾
وە ئاوی شیرینمان پێ نۆشیین ﴿٢٧﴾ ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ (بەم بێ بڕوایانە دەوترێت) وای بۆ بێ بڕوایان
لەو رۆژەدا ﴿٢٨﴾ ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ بڕۆن بۆ لای ئەو دۆزەخەی کە بە درۆتان دەزانی ﴿٢٩﴾
﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلّٖ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٖ﴾ بڕۆن بۆ لای سێبەری دوکەڵێکی سێ بەش. ﴿٣٠﴾ ﴿لَّا ظَلِيلٖ وَلَا يُغۡنِي مِنَ ٱللَّهَبِ﴾
نە سێبەرێکی فێنکەو نەشتێك لە گڕی (دۆزەخ) بەرگری بکات ﴿٣١﴾ ﴿إِنَّهَا تَرۡمِي بِشَرَرٖ كَٱلۡقَصۡرِ﴾
بەڕاستیی دۆزەخ پزیسکی وەك کۆشك دەهاوێژێ ﴿٣٢﴾ ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٞ صُفۡرٞ﴾ (بەرودوا دەڕۆن) ئەڵێ
ی کاروانی حوشتری زەردن ﴿٣٣﴾ ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ وای بۆ بێ بڕوایان لەو رۆژەدا ﴿٣٤﴾ ﴿هَٰذَا يَوۡمُ لَا
يَنطِقُونَ﴾ ئەمرۆ رۆژێکە (بێ باوەڕان) ناتوانن قسەی تێدا بکەن ﴿٣٥﴾ ﴿وَلَا يُؤۡذَنُ لَهُمۡ فَيَعۡتَذِرُونَ﴾ وە مۆڵەت
نادرێن کە بڕوبیانوو بهێننەوە ﴿٣٦﴾ ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ وای بۆ بێ بڕوایان لەو رۆژەدا ﴿٣٧﴾ ﴿هَٰذَا يَوۡمُ
ٱلۡفَصۡلِۖ﴾ ئەمرۆ رۆژی بڕیاردانە (جیاکردنەوەیە) ﴿جَمَعۡنَٰكُمۡ وَٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ئێوەو پێشینانمان کۆ کردوەتەوە
﴿٣٨﴾ ﴿فَإِن كَانَ لَكُمۡ كَيۡدٞ فَكِيدُونِ﴾ سا ئەگەر فێڵ و پیلانێکتان هەیە ئەنجامی بدەن ﴿٣٩﴾ ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾
وای بۆ بێ بڕوایان لەو رۆژەدا ﴿٤٠﴾ ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي ظِلَٰلٖ وَعُيُونٖ﴾ بێگومان پارێزکاران ولەخواترسان
لە سێبەرو (قەراغی) کانیاوی زۆران ﴿٤١﴾ ﴿وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشۡتَهُونَ﴾ وە لەناو میوەهاتێکدان کە حەزی لێ
دەکەن ﴿٤٢﴾ ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ (پێیان دەڵێن) بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێ بەهۆی ئەوەی
کە دەتان کرد ﴿٤٣﴾ ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بێگومان ئێمە ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە
﴿٤٤﴾ ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ وای بۆ بێ بڕوایان لەو رۆژەدا ﴿٤٥﴾ ﴿كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا﴾ (ئەی کافران)
بخۆن و بەهرەمەند ببن ماوەیەکی کەم (لە دونیادا) ﴿إِنَّكُم مُّجۡرِمُونَ﴾ بەڕاستی ئێوەن تاوانباران ﴿٤٦﴾
﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ وای بۆ بێ بڕوایان لەو رۆژەدا ﴿٤٧﴾ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرۡكَعُواْ﴾ وە کاتێك پێ یان
بوترێ (لەخوا بترسن و) کڕنوش بەرن ﴿لَا يَرۡكَعُونَ﴾ کڕنوش نابەن ﴿٤٨﴾ ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾
وای بۆ بێ بڕوایان لەو رۆژەدا ﴿٤٩﴾ ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ﴾ (ئەگەر ئەوان باوەڕ بە قورئان نەکەن)ئیتر
بە چ فەرموودەیەکی تر بڕوا دەهێنن دوای قورئان؟ ﴿٥٠﴾

# سورەتی ﴿ النَّبَإِ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ﴾ ئەوە لەچی پرسیار لەیەکتری دەکەن (ئەو بێ بڕوایانە) ﴿١﴾ ﴿عَنِ النَّبَإِ الْعَظِيمِ﴾ لەو
دەنگ و باسە گەورەیە پرسیار دەکەن؟! ﴿٢﴾ ﴿الَّذِي هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ﴾ کە ئەوان تێیدا جیاوازن ﴿٣﴾
﴿كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾ نەء با پەشیمان بنەوە، لەمەولا تێ دەگەن ﴿٤﴾ ﴿ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾ دووبارە(دەڵێم) نەء
لەمەولا تێ دەگەن ﴿٥﴾ ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا﴾ ئاخۆ زەویمان بۆ ڕانەخستوون ؟ ﴿٦﴾ ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾
وە کێوەکانمان نەگێڕاوە بە مێخ ؟! ﴿٧﴾ ﴿وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا﴾ وە ئێوەمان دروست نەکردوە بەجووت
﴿٨﴾ ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا﴾ وە نوستنمان نەکردووە بەهۆی حەسانەوەتان ﴿٩﴾ ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا﴾
وە شەومان نەگێڕاوە بەکاڵا (داپۆشەر) ﴿١٠﴾ ﴿وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا﴾ وە ڕۆژمان نەگێڕاوە بەکاتی ژیان
(و هەڵسوڕان و پەیداکردنی ژیوار) ﴿١١﴾ ﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا﴾ وە حەوت ئاسمانی بەهێزمان
دروست نەکردوە لە سەرتانەوە ؟ ﴿١٢﴾ ﴿وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا﴾ وە دروستمان نەکردوە چرایەکی
درەوشاوە (کەڕۆژە) ﴿١٣﴾ ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا﴾ وە ئاوی لێزمە و بەخوڕمان نەناردۆتە خوارەوە
لە هەورە گوشراوەکانەوە ﴿١٤﴾ ﴿لِّنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا﴾ تا پێ ی بڕوێنین دانەوێڵەو گژو گیاو ﴿١٥﴾
﴿وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا﴾ باخاتی پڕ و چڕ ﴿١٦﴾ ﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا﴾ بەڕاستی ڕۆژی جیاکردنەوە (ی چاك
و خراپ) کاتێکی بۆ دیاری کراوە ﴿١٧﴾ ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا﴾ ئەو ڕۆژەی کە فوو دەکرێ
بەکەڕەنادا ئەمجا پۆل پۆل دێن ﴿١٨﴾ ﴿وَفُتِحَتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ أَبْوَابًا﴾ وە ئاسمان (لە هەموو لایەکەوە) کرایەوەو
بوو بەدەرگا ﴿١٩﴾ ﴿وَسُيِّرَتِ الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا﴾ وە کێوەکان خرانە ڕێ و بوون بە (تراویلکە=سەراب)
﴿٢٠﴾ ﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا﴾ بەڕاستی دۆزەخ پەرێزگای بێ بڕوایانە (ودەمێکە چاوەڕوانیانە) ﴿٢١﴾
﴿لِّلطَّاغِينَ مَآبًا﴾ وەجێ گەڕانەوەی یاخییانە ﴿٢٢﴾ ﴿لَّابِثِينَ فِيهَا أَحْقَابًا﴾ تێیدا دەمێننەوە هەزاران ساڵ
(ماوەیەکی زۆر) ﴿٢٣﴾ ﴿لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا﴾ تێیدا نا چەژن نەساردی و فێنکی و نەخواردنەوە
﴿٢٤﴾ ﴿إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا﴾ ئاوی لەکوڵ و کێم و زوخاو نەبێت ﴿٢٥﴾ ﴿جَزَاءً وِفَاقًا﴾ پاداش دەدرێنەوە
بەپێ ی کردەوەیان ﴿٢٦﴾ ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ حِسَابًا﴾ چونکە بێگومان ئەوان بەتەمای لێ پرسینەوە
نەبوون ﴿٢٧﴾ ﴿وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَّابًا﴾ وە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانی چۆن بەدرۆ زانینێك ﴿٢٨﴾
﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ كِتَابًا﴾ لە کاتێکدا هەموو شتێکمان ژماردووە (لە سەریان) بە نوسیین ﴿٢٩﴾
﴿فَذُوقُوا﴾ ئەمجا بچەژن(سزای خۆتان) ﴿فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا﴾هیچتان بۆ زیاد ناکەین
سزا نەبێت ﴿٣٠﴾

﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا﴾ بێگومان جێگای پیرۆز و بەهرەمەندی هەیە بۆ پارێزکاران ولەخواترسان ﴿٣١﴾ ﴿حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا﴾
باخـات و هەمـوو جـۆرە تـرێ یـەك ﴿٣٢﴾ ﴿وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا﴾ وە کچانـی تـازە مەمـك كـردووی هاوتەمـەن ﴿٣٣﴾
﴿وَكَأْسًا دِهَاقًا﴾ وەپەرداخی پڕ (لەشەراب) ﴿٣٤﴾ ﴿لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا﴾ قسەی بێهوودەو درۆی تێدانابیستن ﴿٣٥﴾
﴿جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا﴾ (پـاداش دەدرێنـەوە بـە) پاداشـتێكی تـەواو لەلایـەن پەروەردگـاری تـۆوە
﴿٣٦﴾ ﴿رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی و نێوانی ئەوانە خوایەكی بەخشندەو
میهرەبانە و ﴿لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا﴾ كەس توانای تكا كردن و (قسە كردنی) نی یە ﴿٣٧﴾ ﴿يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا﴾
لە ڕۆژێكدا كە جیبریل و فریشتە بەڕیز دەوەستن ﴿لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾ كەسیان قسە ناكەن
مەگەر ئەوە كەخوا ڕێ ی بدات و قسەی بەڕێ و جێ بكات ﴿٣٨﴾ ﴿ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ﴾ ئەو ڕۆژە ڕاست و بێگومانە
﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا﴾ ئەمجا هەركەسێك ویستی ڕێگـای گەڕانـەوە دەگرێ بـۆ لای پەروەردگاری
خۆی ﴿٣٩﴾ ﴿إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا﴾ بێگومان ئێمە ئێوەمان ئاگادار كرد لە سـزایەكی نزیك ﴿يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ
يَدَاهُ﴾ لـە ڕۆژێكـی وادا كە مرۆڤ دەبینێ (پاداشـی) ئەو كردەوانەی كەپێشـەكی بەدەسـتی خـۆی ناردوونی
﴿وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا﴾ وە بێ بڕوا (لەو ڕۆژەدا) دەڵێ: خۆزگە گڵ بوومایە (نەك مرۆڤ) ﴿٤٠﴾

## سورەتی ﴿النَّازِعَاتِ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرْقًا﴾ سـوێند بـەو فریشـتانەی كـە گیانـی كافران(لـە لەشـیان) بـە سـەختی دەردەهێنـن ﴿١﴾
﴿وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشْطًا﴾ وە بـەو فریشـتانەی كـە گیانـی بـاوەڕداران بـە ئاسـانی دەردێنـن ﴿٢﴾ ﴿وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبْحًا﴾
وە سـوێند بـەو فریشـتانەی كـە خێـرا فەرمانی خـوا جێ بەجـێ دەكـەن ﴿٣﴾ ﴿فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبْقًا﴾ وە سـوێند بەو
فریشـتانەی كە پێش بڕكێ دەكەن (لە بەجێ هێنانی فەرماندا) ﴿٤﴾ ﴿فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا﴾ وە سـوێند بەو فریشـتانەی
كـە تەگبیری كاروبـار دەكەن (واتە سـوێند بەمانە ئـەوەی بەڵێنتان پێـدراوە دێتە دی)﴿٥﴾ ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ﴾
ڕۆژێكـە بومەلـەرزە زەوی دەلەرزێنێ ﴿٦﴾ ﴿تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ﴾ بومەلەرزەیەكی تریشـی بەدوایـدا دێت، مردووان
زینـدوو دەبنـەوە ﴿٧﴾ ﴿قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ﴾ زۆر دڵ لـەو ڕۆژەدا دەلـەرزێ ﴿٨﴾ ﴿أَبْصَٰرُهَا خَٰشِعَةٌ﴾ چاویـان
سـەر بـەرەو ژێر دەبـێ ﴿٩﴾ ﴿يَقُولُونَ﴾ (ئەمڕۆ بە گاڵتـەوە) دەڵێـن ﴿أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ﴾ ئاخـۆ ئێمە(لە پاش
مـردن) دەگەڕێنرێنـەوە بـۆ ژیانی پێشـوو؟ ﴿١٠﴾ ﴿أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً﴾ ئایـا كە بووین بـە ئێسـقانی ڕزیو (چۆن
زینـدوو دەبینـەوە) ﴿١١﴾ ﴿قَالُوا۟﴾ ووتیـان ﴿تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ﴾ ئائـەوە ئەگـەر وابـێ گەڕانەوەیەكـی بەزیانـە ﴿١٢﴾
﴿فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ﴾ بێگومـان ئـەو زینـدوو بوونەوەیـە هەر یـەك نەعرەتەیـە ﴿١٣﴾ ﴿فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾ ئیتر كتوپڕ
وان لـە دەشـتێكی سـپی كاكی بـە كاكیـدا ﴿١٤﴾ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾ ئایا داسـتانی موسـات پێ گەیشـتووە
﴿١٥﴾ ﴿إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى﴾ كاتێك كەپەروەردگاری بانگی كرد لەشیوی پیرۆزی طووا وە ﴿١٦﴾

﴿ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ (پێی ووت) بڕۆ بۆ لای فیرعەون(چونکە) بەڕاستی یاخیی بووە (١٧)
﴿فَقُلۡ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ﴾ وە پێ ی بڵێ: ئایا دەتەوێ پاك ببیتەوە (لە گوناه) (١٨) ﴿وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخۡشَىٰ﴾
وە ڕێت نیشاندەم بۆ(ناسینی) پەروەردگارت تا لێی بترسییت (١٩) ﴿فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾ ئەمجا
نیشانە هەرە گەورەکەی نیشان دا (گۆچان لەگەڵ دەستە سپیەکەی) (٢٠) ﴿فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ﴾ کەچی
بە درۆی زانی و سەرپێچی کرد (٢١) ﴿ثُمَّ أَدۡبَرَ يَسۡعَىٰ﴾ لە پاشان پشتی هەڵکرد و ڕۆی بەپەلە (٢٢)
﴿فَحَشَرَ فَنَادَىٰ﴾ ئەمجا(جادوو گەرانی) کۆکردەوەو بانگی کردن (٢٣) ﴿فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾ پاشان
ووتی: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم (٢٤) ﴿فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ﴾ ئەمجا خوا
گرفتاری کرد بە سزای هەردوو جیهان (٢٥) ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةً﴾ بەڕاستی لەم داستانەدا پەند هەیە
﴿لِّمَن يَخۡشَىٰٓ﴾ بۆ کەسێك لەخوا بترسێ (٢٦) ﴿ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا﴾ ئایا دروست کردنی ئێوە گرانترە
یان ئاسمان ؟ وە دروستیشی کرد (٢٧) ﴿رَفَعَ سَمۡكَهَا فَسَوَّىٰهَا﴾ بالآی بەرز کردەوەو ڕێکی خست (٢٨)
﴿وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا﴾ وە شەوی ئەوی تاریك کرد و ﴿وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا﴾ دەری خست(ڕووناکی) ڕۆژی (٢٩)
﴿وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ﴾ لە پاشان زەوی ڕاخست (٣٠) ﴿أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا﴾ ئاو و لەوەڕگای لێ
دەرهێنا (٣١) ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا﴾ وە شاخەکانی پتەو دامەزراند (٣٢) ﴿مَتَٰعًا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ﴾ بۆ بەهرەمەندی
وژیانی خۆتان و ئاژەڵتان (٣٣) ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾ ئەمجا کاتێك کە ڕووداوی گەورە هات (کە
ڕۆژی دوایی یە) (٣٤) ﴿يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ﴾ ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ کردەوەی خۆی تێدا بیر دەکەوێتەوە
(٣٥) ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ﴾ وە دۆزەخ پیشاندرا بۆ هەر کەسێك کە بڕوانێ (٣٦) ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ﴾
(لەو ڕۆژەدا چاکە و خراپە بەپێ ی کردەوە دابەش دەکرێ) ئەمجا ئەو کەسەی سەر کەش بووبێت
(٣٧) ﴿وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا﴾ وە ژیانی دونیای هەڵبژاردبێ (٣٨) ﴿فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ﴾ ئەوە بێ گومان دۆزەخ
جێگایەتی (٣٩) ﴿وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ﴾ وە ئەو کەسەی کە ترسابێت لە وەستانی بەردەم پەروەردگاری
بۆ لێپرسینەوە ﴿وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ﴾ وە بەرگری نەفسی خۆی کردبێ لە ئارەزووی خراپە (٤٠)
﴿فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ﴾ ئەوە بێ گومان بەهەشت جێگایەتی (٤١) ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ﴾ (ئەو بێباوەڕانە
بەگاڵتە ولاقرتیەوە) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆژی دوایی ﴿أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَا﴾ کەی دەبێت وکەی
دێت (٤٢) ﴿فِيمَ أَنتَ مِن ذِكۡرَىٰهَآ﴾ تۆ چیت داوە لە بیر لێکردنەوەی (تۆ چۆن لەم بارەوە دەدوێی)؟ (٤٣)
﴿إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ﴾ زانینی ئەوە هەر لای پەروەردگارتە (٤٤) ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخۡشَىٰهَا﴾ بێگومان تۆ هەر
ترسێنەری کەسێکیت کەلەو ڕۆژە بترسێ (٤٥) ﴿كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَهَا﴾ بێ بڕواکان کە ئەو ڕۆژە دەبینن وا
دەزانن ﴿لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا﴾ کە نەماونەتەوە ئێوارەیەك یا چێشتەنگاوێك نەبێ لە دونیادا (٤٦)

## سورەتی ﴿عَبَسَ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ (پێغەمبەر ﷺ) ڕووی گرژ کرد و پشتی هەڵکرد (١) ﴿أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ﴾ کە کوێرێك (عەبدوڵلای
کوڕی ئوم مەکتوم) هاتە لای (٢) ﴿وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ﴾ تۆ چووزانیت؟ بەڵکو ئەو (کوێرە) بیەوێ پاك ببێتەوە
(٣) ﴿أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ﴾ یان بیری بکەوێتەوە (ئەوەی کە لە بیری چۆتەوە) ئەمجا ئەو بیر کردنەوەیە سوودی
پـێ بگەیەنێـت (٤) ﴿أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ﴾ کەچـی ئەوی کە خـۆی بێ نیاز دەزانێ (مەبەسـت پێی بت پەرستەکانی
قوڕەیشـە) (٥) ﴿فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ﴾ تـۆ ڕووی تـێ دەکەیـت (٦) ﴿وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ﴾ وە هیـچ لەسـەر تـۆ نی یە کە
ئـەو بـێ بڕوایـە خـۆی پـاك نەکاتـەوە (٧) ﴿وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسۡعَىٰ﴾ بەڵام ئەو کەسـەی کـە بەپەلـە دێ بۆ لات (٨)
﴿وَهُوَ يَخۡشَىٰ﴾ وە لەخوا دەترسێ (٩) ﴿فَأَنتَ عَنۡهُ تَلَهَّىٰ﴾ تۆ خۆتی لێ هەڵە دەکەیت (١٠) ﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذۡكِرَةٞ﴾ وا مەکە!
بـێ گومان ئەو ڕێنموونی یانە(ی کەبۆت هاتـووە) بێدارکەرەوە(ی ئادەمی) یە (١١) ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾ ئەمجا ئەو
کەسـەی بیەوێ یادی خوا دەکات (١٢) ﴿فِي صُحُفٖ مُّكَرَّمَةٖ﴾ (کە ئەو ڕێنموونی یانەش نوسـراونەتەوە) لە چەند
پەڕەیەکـی بەڕێـز وپیـرۆزدا (١٣) ﴿مَّرۡفُوعَةٖ مُّطَهَّرَةِۭ﴾ پایە بڵندی پاك (١٤) ﴿بِأَيۡدِي سَفَرَةٖ﴾ کە بەدەسـت نوێنەرانی
(١٥) ﴿كِرَامِۭ بَرَرَةٖ﴾ بەڕێـزی خێـر خواوەن (١٦) ﴿قُتِلَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَآ أَكۡفَرَهُۥ﴾ بەکوشـت چێ (خراپتریـن نەفرینی لێ
بـێ) ئادەمی، چەند پێ نەزان وسـپڵەیە (١٧) ﴿مِنۡ أَيِّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ﴾ (بییرناکاتەوە بزانێ کە) خوا لە چی دروسـتی
کردووە؟ (١٨) ﴿مِن نُّطۡفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ﴾ لەدڵۆپێك ئاو دروستی کردووە و ڕێکی خستووە (١٩) ﴿ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ﴾
لەپاشـان ڕێگای (چاك و خراپی) بۆ ئاسـان کردووە (٢٠) ﴿ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقۡبَرَهُۥ﴾ ئەمجا دەیمرێنێ و دەیخاتە گۆڕەوە
(٢١) ﴿ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ﴾ لە پاشان کاتێ کە وویستی زیندووی دەکاتەوە (٢٢) ﴿كَلَّا لَمَّا يَقۡضِ مَآ أَمَرَهُۥ﴾ بەڕاستی ئەوەی
کـە خوا فەرمانی پێ داوە هێشـتا (ئادەمیی) بەجێ ی نەهێناوە (٢٣) ﴿فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ﴾ دەبا مرۆڤ سـەیری
خواردەمەنیەکەی بکات (٢٤) ﴿أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا﴾ بەڕاستی ئێمە لە هەورەوە بارانمان داڕژاند چۆن داڕژاندنێك
(٢٥) ﴿ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا﴾ لە پاشـان زەویمان لەت لەت کرد (بە گیا) چۆن لەت کردنێك (٢٦) ﴿فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا﴾
ئەمجـا ڕوواندمـان لەناوییدا دانەوێڵـە (٢٧) ﴿وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا﴾ و ترێ و سـەوزە (٢٨) ﴿وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا﴾ وزەیتون و دار
خورمـا (٢٩) ﴿وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا﴾ و باخاتـی چڕوپـڕو (٣٠) ﴿وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا﴾ میـوە و لـەوەڕ (٣١) ﴿مَّتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ﴾ بـۆ
ژیانـی خۆتـان و ئاژەڵتـان (٣٢) ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ﴾ کاتێـك کە شـاخە و شـریخە (ی ڕۆژی دوایـی) هات (٣٣)
﴿يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ﴾ ئـەو ڕۆژەی کـە مرۆڤ ڕادەکات لە برای (٣٤) ﴿وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ﴾ وە لە دایکی و باوکی (٣٥)
﴿وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ﴾ وە لـە ژنـی و کوڕەکانی (٣٦) ﴿لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ﴾ هەمـوو یەکێك لەوان لەو
ڕۆژەدا کارێکی وای هەیە کە سەر کەسی تری نەپەرژێ (٣٧) ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ﴾ زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا
گەش و جوانن (٣٨) ﴿ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ﴾ دەم بە پێکەنین و شـادمانن (٣٩) ﴿وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ﴾ وە زۆر
ڕوخسار لەو ڕۆژەدا، تەپوتۆزیان بەسەرەوەیە (٤٠)

﴿تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ﴾ لە داماویدا ڕەش داگیرساون ﴿٤١﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ﴾ ئەوانە ئەوانەن کە بێ
باوەڕ و گوناهکار و تاوانبارن ﴿٤٢﴾

## سورەتی ﴿ التَّكۡوِيرِ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ﴾ کاتێك کە ڕۆژ پێچرایەوەو (ڕووناکی نەما) ﴿١﴾ ﴿وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ﴾ وە دەمێك
کە ئەستێرەکان هەڵ وەرین و کەوتنە خوارەوە ( تاریك بوون) ﴿٢﴾ ﴿وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ﴾ وە کاتێك
کە کێوەکان خرانەڕێ (واتە لە شوێنی خۆیان خزێندران) ﴿٣﴾ ﴿وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ﴾ وە کاتێك کە
وشترە ئاوسەکان وازیان لێ هێنرا ﴿٤﴾ ﴿وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ﴾ وە کاتێك کە جانەوەران کۆکرانەوە ﴿٥﴾
﴿وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ﴾ وە دەمێك کە دەریاکان هەڵگیرسێنران (تێکەڵ کران) ﴿٦﴾ ﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ﴾
وە ساتێك کە هەموو گیانێك جووتکرایەوە (لەگەڵ لاشەدا) ﴿٧﴾ ﴿وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ﴾
وە کاتێك پرسیارکرا لە کچانی زیندە بە چاڵ ﴿٨﴾ ﴿بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ﴾ کە بەچ گوناهێك کوژران ﴿٩﴾
﴿وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ﴾ وە کاتێك کەنامە(ی کردەوە) بڵاوکرایەوە (و دابەشکرا) ﴿١٠﴾ ﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ﴾
وە دەمێك کە ئاسمان داماڵێنراو پێچرایەوە ﴿١١﴾ ﴿وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ﴾ وە کاتێك کە دۆزەخ هەڵگیرسێنرا
﴿١٢﴾ ﴿وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ﴾ وە ساتێك کە بەهەشت نزیك خرایەوە ﴿١٣﴾ ﴿عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ﴾ ئەوکاتە
هەموو کەسێك دەزانێ کەچی ئامادە کردوە (بۆ خۆی لە چاکەو خراپە) ﴿١٤﴾ ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ﴾ سوێند
بەو(ئەستێرە گەڕۆکانەی) دەگەڕێنەوە ﴿١٥﴾ ﴿ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ﴾ بەو ئەستێرانەی کە پەنا دەگرن ودیار نامێنن
﴿١٦﴾ ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ﴾ وە بەشەو کەتاریك دەبێت ﴿١٧﴾ ﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ وە بە بەیانی کە هەناسە دەدات
﴿١٨﴾ ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ﴾ بێگومان ئەو قورئانە گوفتاری ڕەوانەکراوێکی پایە بەرزە (کە فریشتەی
وەحیە) ﴿١٩﴾ ﴿ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ﴾ بەهێزە، لای خاوەنی عەرش(لای خوای گەورە)، وخاوەنی
پلە و پایەیە ﴿٢٠﴾ ﴿مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ﴾ قسە ڕەوایە لەناو فریشتەدا ودەست پاکە ﴿٢١﴾ ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ﴾
هاوڕێکەتان(کە موحەممەدە ﷺ) شێت نی یە (وەك ئێوە دەڵێن) ﴿٢٢﴾ ﴿وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ﴾ سوێند بەخوا
بێگومان (فریشتەی وەحی) دیبوە لە ئاسۆی ڕووندا ﴿٢٣﴾ ﴿وَمَا هُوَ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ بِضَنِينٖ﴾ وە ئەو ڕژد و چرووك
نیە لەگەیاندنی وەحی وپەیامەکەیدا ﴿٢٤﴾ ﴿وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَيۡطَٰنٖ رَّجِيمٖ﴾ وە ئەو(قورئانە) قسەی شەیتانی
دەرکراو لە بەزەیی خوا نی یە (وەك ئێوە دەڵێن) ﴿٢٥﴾ ﴿فَأَيۡنَ تَذۡهَبُونَ﴾ ئەوە بۆ کوێ دەڕۆن ﴿٢٦﴾ ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ
لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئەو قورئانە تەنها ئامۆژگاری یە بۆ هەموو جیهانیان ﴿٢٧﴾ ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ﴾ بۆ ئەو
کەسانەی کە بیانەوێ بەڕێ ی ڕاست دا بڕۆن لە ئێوە ﴿٢٨﴾ ﴿وَمَا تَشَآءُونَ﴾ ئێوە ئارەزوو(ی ڕێ ی
ڕاست) ناکەن﴿ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ مەگەر کاتێك کە پەروەردگاری هەمووان بیەوێت وە
ناچارتان بکات پێ ی ﴿٢٩﴾

## سورەتی ﴿ الانفطار ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ﴾ کاتێك کەئاسمان لەت بوو (١) ﴿وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ﴾ وەدەمێك کەئەستێرەکان (کەوتنە
خوارەوە) بە پەرش و بڵاوی (٢) ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ﴾ وە ساتێك کە دەریاکان تێکەڵ کران (٣)
﴿وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ﴾ وە ساتێك کە گۆڕەکان ژێرە و ژوور کران واتە (مردووەکان هاتنە دەرەوە) (٤)
﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ﴾ ئەو کاتە هەموو کەسێك دەزانێت کە چی لەپێشەوە ناردوەو (چیشی)
دوا خستوە (بۆ خۆی) (٥) ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ﴾ ئەی ئینسان ﴿مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ﴾ چی تۆی خەڵەتاندووە
بە پەروەردگاری بەڕێز و گەورەت (وا لێی یاخی بوویت) (٦) ﴿الَّذِي خَلَقَكَ﴾ ئەو (پەروەردگار) ەی
کە دروستی کردوویت و ﴿فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ ڕێکی خستوویت و جیای کردویتەوە (لە گیان لەبەرانی
تر) (٧) ﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ لە هەر وێنەیەکدا کە خۆی ویستبێتی یەکی خستوویت (٨)
﴿كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ﴾ وانی یە (کە تێ ی گەیشتوویت) بەڵکو (ڕۆژی) پاداشت بەدرۆ دەزانن (٩)
﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ﴾ بێگومان چەند چاودێرێکتان بەسەرەوەیە (١٠) ﴿كِرَامًا كَاتِبِينَ﴾ کە بەڕێزو
نووسەرن (١١) ﴿يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾ هەرچی بکەن دەیزانن (١٢) ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾ بەڕاستی چاکەکاران
لەناو نازو نیعمەتدان (١٣) ﴿وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾ بێگومان بەدکاران لە دۆزەخان (١٤) ﴿يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ
الدِّينِ﴾ لە ڕۆژی پاداشتدا دەچنە ناویەوە (١٥) ﴿وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ﴾ وە ئەوان لێ ی دەرناچن (١٦)
﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ﴾ تۆ چووزانیت کە ڕۆژی پاداشت چی یە (١٧) ﴿ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ﴾
دووبارە چووزانیت ڕۆژی پاداشت چی یە (١٨) ﴿يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئًا﴾ ڕۆژێکە کە هیچ کەس
هیچی بەدەست نی یە بۆ هیچ کەس ﴿وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ﴾ وە فەرمان لەو ڕۆژەدا هەر بۆ خوایە (١٩)

## سورەتی ﴿ المطففين ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾ هاوار بۆ تەرازوو بازان (١) ﴿الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ﴾ ئەوانەی کە کاتێك
پێوانە بکەن (بۆ خۆیان) لەسەر (ماڵی) خەڵکی بەتەواوی وەری دەگرن (٢) ﴿وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾
بەڵام کاتێك بۆیان پێوانە یان کێشانە بکەن کەمیان دەدەنێ (٣) ﴿أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ﴾ ئایا ئەوانە
نازانن کە بێگومان زیندوو دەکرێنەوە؟! (٤)

﴿لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ لـە ڕۆژێکـی گـەورەدا ﴿٥﴾ ﴿يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ڕۆژێـك كـە خەڵـك لەبـەردەم پەروەردگـاری جیهانیـان دا دەوەسـتن ﴿٦﴾ ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٖ﴾ بـا پەشیمان بنـەوە، چونکـە بەڕاسـتی نامەی تاوانباران لە ناو دەفتەرێکی پەسـتی ڕەشـدایە ﴿٧﴾ ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ﴾ تۆ چوزانییت ئـەو دەفتـەرە چـی یـە ﴿٨﴾ ﴿كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ﴾ دەفتەرێکـی نوسـراوە ﴿٩﴾ ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ هـاوار لـەو ڕۆژەدا بـۆ بـێ بڕوایان ﴿١٠﴾ ﴿ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ ئەوانەی کە بڕوا ناکەن بەڕۆژی پاداشـت دانەوە ﴿١١﴾ ﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ﴾ کەس ئەو ڕۆژە بە درۆ نازانێت مەگەر هەموو ستەم کارێکی گوناهبار ﴿١٢﴾ ﴿إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا﴾ هـەر کاتێك کە ئایەتەکانی ئێمەی بۆ بخوێنرێتەوە ﴿قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ دەڵێ (ئەمانە) ئەفسـانەی پێشـینانن ﴿١٣﴾ ﴿كَلَّاۖ﴾ نەخێـر وانـی یـە ﴿بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ بەڵكـو ژەنگـی ئەو(خراپانەی) کە دەیانکرد پەردەی هێناوە بەسەر دڵیاندا ﴿١٤﴾ ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ﴾ نەخێر بەڕاسـتی ئەوان لەو ڕۆژەدا، بێ بەشـن لە بینینی پەروەردگاریان ﴿١٥﴾ ﴿ثُمَّ إِنَّهُمۡ لَصَالُواْ ٱلۡجَحِيمِ﴾ لە پاشـان بێگومـان ئـەوان دەچنە دۆزەخـەوە ﴿١٦﴾ ﴿ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ ئەمجا پێ یـان دەوترێت ئەمە ئەوەیە کە بڕواتان پێ نەدەکرد ﴿١٧﴾ ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ﴾ بەڕاستی نامەی (کرداری) چاکەکاران لەناو دەفتەرێکی بەرزدایە ﴿١٨﴾ ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ﴾ تۆ چوزانییت ئەو دەفتەرە بەرزە چی یە؟ ﴿١٩﴾ ﴿كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ﴾ دەفتەرێکـی نوسـراو(ی ئەمەنـدە بەفـەڕە) ﴿٢٠﴾ ﴿يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾ نزیکانی خـودا دەیبینن ﴿٢١﴾ ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾ بێگومـان چاکـەکاران لـە نـازو نیعمەتـدان ﴿٢٢﴾ ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾ لەسـەر تەخـت و بارەگـاوە سـەیر دەکـەن ﴿٢٣﴾ ﴿تَعۡرِفُ فِي وُجُوهِهِمۡ نَضۡرَةَ ٱلنَّعِيمِ﴾ دەبینیـت لـە ڕوخسـاریاندا جوانـی وگەشـاوەیی خۆشـگوزەرانی ﴿٢٤﴾ ﴿يُسۡقَوۡنَ مِن رَّحِيقٖ مَّخۡتُومٍ﴾ شـەرابی پاکـی سـەر بەمۆریان پێ دەدرێ بیخۆنـەوە ﴿٢٥﴾ ﴿خِتَٰمُهُۥ مِسۡكٞۚ﴾ کـە دوا قومـی بۆنی میسـکە ﴿وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ﴾ بۆ ئـەوە با پێشـبڕکێ بکەن پێشـبڕکێ کاران ﴿٢٦﴾ ﴿وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسۡنِيمٍ﴾ تێکەڵ کراو لە ئاوی تەسـنیمە. ﴿٢٧﴾ ﴿عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾ کانـی یەکـە کە نزیك کـراوەکان لـێ ی دەخۆنـەوە ﴿٢٨﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ﴾ بێگومـان ئەوانەی کە بەدکار بوون ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ﴾ پێ دەکەنین بەوانەی کە بڕوایان هێنا بوو ﴿٢٩﴾ ﴿وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ﴾ وە کاتێك کە بەلایاندا بڕۆشتنایە چاویان لێ دادەگرتن ﴿٣٠﴾ ﴿وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ﴾ وەکاتێکیـش بگەڕانایەتـەوە بـۆ لای مـاڵ و منداڵیان، بە پێکەنیـن و گاڵتەکردن (بەموسـوڵمانان) ەوە دەگەڕانـەوە ﴿٣١﴾ ﴿وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ﴾ وە کاتێکیـش بیانبینینایـە ئەیانوت: ئەمانە گومڕان ﴿٣٢﴾ ﴿وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ﴾ لە کاتێکدا کە(ئەوان) بە چاودێر نە نێرراون بۆ سەر موسڵمانەکان (تا ئەم قسەیە بکەن) ﴿٣٣﴾

﴿فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُوا مِنَ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ﴾ ئەمڕۆ(کـە ڕۆژی دوایی یە) ئەوانەی کە بڕوادار بوون بە
بێ بڕواکان پێ دەکەنن (٣٤) ﴿عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ﴾ لەسـەر قەنەفەو کورسـیەوە سـەیر دەکەن (٣٥) ﴿هَلْ
ثُوِّبَ الْكُفَّارُ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ﴾ (تا بزانن) تۆڵەی ئەو بێ بڕوایانە دراوەتەوە، لەسەر ئەو کردەوانەی کە دەیان
کرد( لە دونیادا)؟ (٣٦)

## سورەتی ﴿الانشقاق﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ﴾ کاتێـك کـە ئاسـمان لـەت بـوو (١) ﴿وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾ وە ملکەچـی کـرد بـۆ
پەروەردگاری و دەبێ هەرواش بێت (٢) ﴿وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ﴾ و سـاتێك کە زەوی ڕاکێشـراو پانکرایەوە
(ڕاخرا) (٣) ﴿وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ﴾ وەئەوەی تێیدابوو فڕێی داو هیچی لەناودانەما (٤) ﴿وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾
وە ملکەچـی کـرد بـۆ پەروەردگـاری و دەبـێ هـەرواش بێـت (٥) ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ﴾ ئـەی ئینسـان
﴿إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ﴾ تۆ بێگومان تێکۆشـەرییت بەرەو پەروەردگارت بەتێکۆشـان ! ئەوسا
پێ ی دەگەیت (٦) ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ﴾ ئەمجا ئەو کەسەی کە نامەی(کردەوەی) درایە دەستی
ڕاسـتی (٧) ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾ ئەوسـا پرسـینەوەیەکی سـووك و ئاسـانی لەگـەڵ دەکرێ (٨)
﴿وَيَنقَلِبُ إِلَىٰ أَهْلِهِ مَسْرُورًا﴾ وە بەدڵخۆشـی دەگەڕێتـەوە بۆ لای کـەس و کاری (٩) ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ
ظَهْرِهِ﴾ وە ئـەو کەسـەی نامەی لە پشـتەوە درایە دەسـتی (١٠) ﴿فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُورًا﴾ ئەوە بـە زووی داوای
مردنی خـۆی دەکات (١١) ﴿وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا﴾ وە دەچێتە دۆزەخەوە (١٢) ﴿إِنَّهُ كَانَ فِي أَهْلِهِ مَسْرُورًا﴾ (چونکە)
بێگومـان ئەو لەناو کـەس و کاری دا دڵخۆش بووە (١٣) ﴿إِنَّهُ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ﴾ وە ئەو وای گومان دەبرد،
کـە هەرگیـز ناگەڕێتـەوە (لای خـوا) (١٤) ﴿بَلَىٰ إِنَّ رَبَّهُ كَانَ بِهِ بَصِيرًا﴾ نەخێـر وانی یە ! چونکە بەڕاسـتی
پەروەردگاری ئەو ئاگادار بووە بەو (١٥) ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ﴾ سـوێند بە سـووریی کەناری ئاسـمان (١٦)
﴿وَاللَّيْلِ وَمَا وَسَقَ﴾ وە بەشـەوو ئـەو شـتانەی کە کۆیـان دەکاتـەوە (١٧) ﴿وَالْقَمَرِ إِذَا اتَّسَقَ﴾ وە بەمانگ
کاتێـك کـە پـڕ دەبێتـەوە (١٨) ﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ﴾ (ئێوە) تـێ ئەپەڕن لـە حاڵێکەوە بـۆ حاڵێکی تر (١٩)
﴿فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئیتر بۆچی بـڕوا ناهێنن ؟ (٢٠) ﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ ۩﴾ وە کاتێك کە
قورئانیان بۆ بخوێنرێتەوە سوژدە نابەن (مل کەچی ناکەن) (٢١) ﴿بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا يُكَذِّبُونَ﴾ بەڵام ئەوانەی
کـە بـێ بـڕوان بە درۆی ئەزانـن (٢٢) ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ﴾ وە خوا چـاك ئاگادار و زانایـە بەوەی کە
لەدڵی دەگرن (٢٣) ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ کەواتە مژدەیان بدەرێ بە سزای سەختی (قیامەت) (٢٤)

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەلام ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و کردەوە باشەکانیان کردووە
﴿لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ﴾ بۆ ئەوان هەیە پاداشتی بێ بڕانەوە ﴿٢٥﴾

## سورەتی ﴿ ٱلۡبُرُوجِ ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ﴾ سوێند بە ئاسمانی خاوەن بورجەکان ﴿١﴾ ﴿وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡمَوۡعُودِ﴾ وە بەو ڕۆژەی کە
بەڵێنی پێدراوە ﴿٢﴾ ﴿وَشَاهِدٖ وَمَشۡهُودٖ﴾ وە بەهەموو بینەرو بینراوێك(یا شایەت و شایەتی لەسەر
دراو یا ڕۆژی هەینی و ڕۆژی عەرەفە) ﴿٣﴾ ﴿قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ﴾ بەکوشت چن خاوەن چاڵەکان (لە
غەمەکان) ﴿٤﴾ ﴿ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ﴾ ئەو ئاگرەی خاوەن سووتەمەنی (و بڵێسەیە) ﴿٥﴾ ﴿إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ﴾
کاتێك کە ئەوان دانیشتبوون بەدەوری (ئاگرەکە) دا ﴿٦﴾ ﴿وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ﴾ وە ئەوان
سەیری ئەوەیان دەکرد کە دەیان کرد بە بڕوادارەکان ﴿٧﴾ ﴿وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ﴾ وە ئەم سزایەش
هەر لەبەر ئەوە دەدران ﴿أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ کە بڕوایان هێنابوو بەخوای بەدەسەلاتی
سوپاسکراو ﴿٨﴾ ﴿ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ ئەوخودایەی کە موڵکی ئاسمانەکان و زەویی بۆ ئەوە
﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ وە خوا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا ﴿٩﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾
بەڕاستی ئەوانەی کە ئازاری پیاو و ژنە بڕوادارەکانیان داو ﴿ثُمَّ لَمۡ يَتُوبُواْ﴾ لەپاشان پەشیمان نەبوونەوە
﴿فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمۡ عَذَابُ ٱلۡحَرِيقِ﴾ ئەوە بۆ ئەوان هەیە سزای دۆزەخ، وە سزای(ئاگری) سوتێنەر
﴿١٠﴾ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناو کردەوە چاکەکانیان کرد
﴿لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ﴾ بۆ ئەوان هەیە بەهەشتانێك کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوات بەژێریاندا
﴿ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ﴾ ئا ئەوەیە سەرکەوتنی گەورە ﴿١١﴾ ﴿إِنَّ بَطۡشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾ بەڕاستی دەست وەشاندنی
پەروەردگاری تۆ زۆر سەختە ﴿١٢﴾ ﴿إِنَّهُۥ هُوَ يُبۡدِئُ وَيُعِيدُ﴾ بێگومان هەر ئەوە کە لەسەرەتاوە(مرۆڤ)
دروست دەکات و(دوای مردنیش) زیندووی دەکاتەوە ﴿١٣﴾ ﴿وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلۡوَدُودُ﴾ وە هەر ئەوە لێخۆشبووی
میهرەبان ﴿١٤﴾ ﴿ذُو ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡمَجِيدُ﴾ خاوەنی عەرش و بەرزو پایە دار ﴿١٥﴾ ﴿فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ﴾ هەرچیەکی
بیەوێت دەیکات ﴿١٦﴾ ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡجُنُودِ﴾ ئایا پێت گەیشتووە باس و بەسەرهاتی لەشکرەکانی ﴿١٧﴾
﴿فِرۡعَوۡنَ وَثَمُودَ﴾ فیرعەون و سەموود ﴿١٨﴾ ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٖ﴾ بەڵکو ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون
هەمیشە لە بە درۆ زانینی (قورئان) دان ﴿١٩﴾ ﴿وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ﴾ وە خواش(بە دەسەلات و زانینی)
لە پشتیانەوە دەوری داون ﴿٢٠﴾ ﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ﴾ بەڵکو ئەوە(ی کە بەدرۆی دەزانن) قورئانێکی گەورەو
بەڕێزە ﴿٢١﴾ ﴿فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ﴾ لە لەوحێکی پارێزراو دایە (کە پێی دەوترێت لوح المحفوظ) ﴿٢٢﴾

## سورەتی ﴿ الطَّارِقِ ﴾

﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ﴾ سوێند بە ئاسمان و ئەوەی کە لەشەوا دەردەکەوێ (١) ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ﴾
تۆ چوزانیت دەرکەوتووی شەو چی یە ؟ (٢) ﴿ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ﴾ ئەستێرەی درەخشانی تاریکی کون
کەرە (٣) ﴿ إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ ﴾ (سوێند بەمانە) کەس نی یە کە چاودێرێکی بەسەرەوە نەبێ (٤)
﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴾ دەی با مرۆڤ سەرنج بدات کە لەچی دروست کراوە (٥) ﴿ خُلِقَ مِن مَّآءٖ دَافِقٖ ﴾
دروست کراوە لە ئاوێکی فرێدراو (هەڵقوڵاو) (٦) ﴿ يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴾ کە دەردەچێ لە
ناوەندی پشت (ی پیاو) و دانەی (پەراسووی) سنگی (ژن) ەوە (٧) ﴿ إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجۡعِهِۦ لَقَادِرٞ ﴾ بەڕاستی خوا
بەدەسەلاتە لەسەر زیندوو کردنەوەی (٨) ﴿ يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴾ لە ڕۆژێکدا کە هەرچی نهێنی هەیە ئاشکرا
دەکرێ (٩) ﴿ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ وَلَا نَاصِرٖ ﴾ ئەو نە هێزێك شك دەبات و نە پشتیوانێك (١٠) ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴾
سوێند بە ئاسمانی خاوەن باران (١١) ﴿ وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ ﴾ وە بەزەوی خاوەن درزو قلَیش (١٢)
﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ﴾ بێگومان ئەم(قورئانە)م وتەی ڕاست و جیاکەرەوەیە (١٣) ﴿ وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ﴾ وە گاڵتە نی
یە (١٤) ﴿ إِنَّهُمۡ يَكِيدُونَ كَيۡدٗا ﴾ بێگومان بێ بڕواکان (پیلان دەگێڕن) و فێڵ دەکەن چۆن فێڵ کردنێك (١٥)
﴿ وَأَكِيدُ كَيۡدٗا ﴾ وە منیش پیلان دەگێڕم (ونەخشە دەکێشم لەبەرامبەر پیلانی ئەواندا) چۆن پیلان
ونەخشە کێشانێك (١٦) ﴿ فَمَهِّلِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ ئەمجا (تۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ) مۆڵەتی بێ بڕواکان
بدە ﴿ أَمۡهِلۡهُمۡ رُوَيۡدَۢا ﴾ منیش کەمێك لێیان دەوەستم (پاشان دەبینیت چیان بەسەر دەهێنم بە
سزادانایان) (١٧)

## سورەتی ﴿ الأَعۡلَىٰ ﴾

﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ﴾ تەسبیحاتی پەروەردگاری هەرە بڵندت بکە (١) ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴾ ئەوەی(هەموو
شتێکی) دروست کردووەو ڕێك وپێکی کردووە (٢) ﴿ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴾ وە ئەوەی کە نەخشەی
کێشاوە(بۆ هەموو شتێك) ئەمجا شارەزای کردووە (٣) ﴿ وَٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ ﴾ وە ئەوەی کە لەوەڕی
دەرهێناوە (٤) ﴿ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ ﴾ ئەمجا دەیکات بە پوشی ڕەش داگەڕاو (٥) ﴿ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴾
(ئەی موحەممەد ﷺ قورئانت) بەسەردا دەخوێنینەوەو هەرگیز بیرت ناچێتەوە (٦) ﴿ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ ﴾
مەگەر ئەوەی کە خوا بیەوێت ﴿ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ ﴾ بێگومان ئەو بە هەموو شتێکی ئاشکراو پەنهان
ئاگادارە (٧) ﴿ وَنُيَسِّرُكَ لِلۡيُسۡرَىٰ ﴾ وە یارمەتیت دەدەین بۆ ڕێ ی ئاسان (٨) ﴿ فَذَكِّرۡ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴾ ئەمجا
تۆش هەردەم ئامۆژگاری بکە ئەگەر سوودی گەیاند (٩) ﴿ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخۡشَىٰ ﴾ بێگومان ئەوەی لە خوا
بترسێ پەندی لێ وەردەگرێ (١٠)

﴿وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلۡأَشۡقَى﴾ وە ئـەوەی زۆر خراپیـش بـێ خۆی لـێ دوور دەخاتەوە ﴿١١﴾ ﴿ٱلَّذِي يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾
ئـەوەی دەچێتـە نـاو ئاگـری هـەرە گـەورەوە ﴿١٢﴾ ﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ﴾ لەپاشـان نـە دەمـرێ تێیـدا
(تا ڕزگاری بێت) وە نە دەژی (تێیدا بە ئاسایی) ﴿١٣﴾ ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ﴾ بەڕاستی سەرفراز بوو ئەوەی کە
خـۆی پاك ڕاگرت ﴿١٤﴾ ﴿وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ﴾ وەناوی پەروەردگـاری خۆی دەبات و کەوتە نوێژ کردن
(وپاڕایەوە) ﴿١٥﴾ ﴿بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا﴾ بەڵکو ئێوە ژیانی دونیا هەڵدەبژێرن ﴿١٦﴾ ﴿وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ﴾
کەچی(ژیانـی) دوا ڕۆژ باشـترو پایـە دارتـرە ﴿١٧﴾ ﴿إِنَّ هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ﴾ بـێ گومـان ئەمـەی
(کەباسکرا) لە نامەی پێشوەکاندایە ﴿١٨﴾ ﴿صُحُفِ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ﴾ نامەکانی ئیبراهیم و مووسا ﴿١٩﴾

## سورەتی ﴿ٱلۡغَاشِيَةِ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ﴾ ئایـا هەواڵی ڕۆژی دوایی(ڕۆژی داپۆشـەرت) پێگەشـتووە ﴿١﴾ ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ
خَٰشِعَةٌ﴾ زۆر دەم و چاو لەو ڕۆژەدا ترسـناك و ڕیسواو شەرمەزارن ﴿٢﴾ ﴿عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ﴾ هەوڵدەرێکی
ڕەنجـەڕۆن ﴿٣﴾ ﴿تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةٗ﴾ دەچنـە نـاو ئاگـری هـەرە گەرمـەوە ﴿٤﴾ ﴿تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ﴾ ئـاو
دەدرێن لەسـەرچاوەی کوڵ بەکوڵ و زۆر گەرم ﴿٥﴾ ﴿لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ﴾ خۆراکیان هەر دڕکی
حوشـتر خوار(ی ئاگرینە) ﴿٦﴾ ﴿لَّا يُسۡمِنُ وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٖ﴾ نە قەڵەوی دەکات و نە برسـێتی لا دەبات ﴿٧﴾
﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاعِمَةٞ﴾ زۆر ڕوخسـار لـەو ڕۆژەدا پـاراوە (جوان و گەشـن) ﴿٨﴾ ﴿لِّسَعۡيِهَا رَاضِيَةٞ﴾ ڕازیین
لەکۆششی خۆیان ﴿٩﴾ ﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ﴾ وان لە بەهەشتی بەرزو بڵندا ﴿١٠﴾ ﴿لَّا تَسۡمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةٗ﴾ قسەی هیچ
وپوچی تێدا نابیسـتن ﴿١١﴾ ﴿فِيهَا عَيۡنٞ جَارِيَةٞ﴾ تێیدایەتی سەرچاوەی ڕەوان ﴿١٢﴾ ﴿فِيهَا سُرُرٞ مَّرۡفُوعَةٞ﴾ تێیدایەتی
زۆر قەنەفـە و تەختـی بەرز ﴿١٣﴾ ﴿وَأَكۡوَابٞ مَّوۡضُوعَةٞ﴾ وە پەرداخی دانراو ﴿١٤﴾ ﴿وَنَمَارِقُ مَصۡفُوفَةٞ﴾ وە پشـتی
ڕیزکراو ﴿١٥﴾ ﴿وَزَرَابِيُّ مَبۡثُوثَةٌ﴾ وە قاڵی ڕاخراو لە هەموو لایەکەوە ﴿١٦﴾ ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ﴾ دەی
بۆ وورد نابنەوە لە حوشتر کە چۆن دروست کراوە ﴿١٧﴾ ﴿وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ﴾ وە لە ئاسمان کە چۆن
بەرز کراوەتەوە ﴿١٨﴾ ﴿وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ﴾ وە لە شاخەکان کە چۆن داکوتراون و دامەزرێنراون؟ ﴿١٩﴾
﴿وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ﴾ وە لـە زەوی کـە چـۆن ڕاخـراوە ﴿٢٠﴾ ﴿فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ﴾ کەوابوو
ئامۆژگـاری بکـە، تـۆ هەر ئامۆژگـاری کاریـت ﴿٢١﴾ ﴿لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ﴾ تۆ دەسـەڵات دار نیت
بەسەریاندا ﴿٢٢﴾

﴿إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ﴾ بەلاّم ئەو كەسەی كە پشت هەڵكاو بیّ بڕوا بێت ﴿٢٣﴾ ﴿فَيُعَذِّبُهُ اللَّهُ الْعَذَابَ الْأَكْبَرَ﴾
ئـەوە خـوا سـزای دەدات بە سـزای زۆر گـەورە ﴿٢٤﴾ ﴿إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ﴾ بێگومان هەر بـۆ لای ئێمەیە
گەڕانەوەیان ﴿٢٥﴾ ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم﴾ لە پاشان بەڕاستی لەسەر ئێمەیە لیّ پرسینەوەیان ﴿٢٦﴾

## سورەتی ﴿ الفَجرِ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿وَالْفَجْرِ﴾ سـوێند بە بەرەبەیان ﴿١﴾ ﴿وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾ وە بە دە شـەوی سەرەتای مانگ(ی ذي الحجة) ﴿٢﴾
﴿وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ﴾ وە بەتـاك و جـووت ﴿٣﴾ ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ﴾ وە بەشـەوگار كاتێـك كـە تـیّ دەپەڕێت ﴿٤﴾
﴿هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ﴾ ئایا ئەمانەی كە سوێندیان پیّ خورا شایستەی سوێند پیّ خواردن نیین لای
كەسانی تێگەیشتوو ﴿٥﴾ ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ﴾ ئایا نابینیت كە پەروەردگاری تۆ چی كرد بە گەلی عاد
﴿٦﴾ ﴿إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ﴾ وە بەهۆزی ئیرەم ؟ خاوەنی پایە (و دەسـەلاّت) ﴿٧﴾ ﴿الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ﴾ كە
وێنەیان دروسـت نەكرابوو لە هەموو وولاّتدا ﴿٨﴾ ﴿وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ﴾ وە(چی كرد) بە گەلی
سەموود ئەوانەی كە(شاخی) بەردیان دەتاشیی لە شیوو دۆڵە كاندا ﴿٩﴾ ﴿وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ﴾ وە فیرعەونی
خـاوەن سـنگی زۆر (وەك ئەهرامـەكان ،كـە وەك سـنگ چـوون بە زەویـدا) ﴿١٠﴾ ﴿الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ﴾
ئەوانـەی كـە یاخـی بـوون لـە ولاّتـدا ﴿١١﴾ ﴿فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ﴾ وە زۆریـان خراپـە تێداكـرد ﴿١٢﴾
﴿فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ﴾ ئەمجـا پەروەردگاری تۆ دایگرتن بە قامچی سـزا ﴿١٣﴾ ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾
بەڕاسـتی پەروەردگـاری تـۆ لە كەمینی سـتەم كاراندایـە ﴿١٤﴾ ﴿فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ﴾ جا كاتێك
كـە خـوا ئادەمـی تاقی كـردەوە ﴿فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ﴾ و ڕێـزی گرت و نازو نیعمەتی بەسـەردا ڕشـت
﴿فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ﴾ ئەوە دەڵـیّ پەروەردگارم ڕێزی گرتووم ﴿١٥﴾ ﴿وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ﴾ وە ئەگەر
تاقـی كـردەوەو ڕۆزی كـەم پێدا ﴿فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ﴾ ئەوسـا دەڵـیّ پەروەردگارم ڕیسـوای كردووم ﴿١٦﴾
﴿كَلَّا﴾ نـەء وانـی یە (كە ئێوە بیری لیّ دەكەنـەوە) ﴿بَل لَّا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ﴾ بەڵكو ئێوە ڕێزی هەتیوان
ناگـرن ﴿١٧﴾ ﴿وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ وە هانـی یەكتری نادەن لەسـەر خواردەمەنـی دان(و بەخێو
كردنی) هەژاران ﴿١٨﴾ ﴿وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا﴾ (بەڵكو سەرەڕای ئەمەش بەشە) میراتی(بەشداران)
هەمووی(بـە هەڵپـە) دەخۆن ﴿١٩﴾ ﴿وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا﴾ وە ماڵ و سـامانتان خۆش دەوێت بە خۆش
ویستنێكی زۆر ﴿٢٠﴾ ﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا﴾ نابیّ وا بكەن ! كاتێك كەزەوی بە توندی درا بەیەكدا و
پارە پارە كرا ﴿٢١﴾ ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ (لەڕۆژی دواییدا) پەروەردگارت دێت ( بۆ لێپرسینەوەی
خەڵكی، هاتنێك شیاوی زاتی خۆی بێت، بڕوامان پێیەتی بەبـیّ هیچ لێچواندن ولێكدانەوەیەك، وە
چۆنیەتیەكەی نازانین، تەنها خودا خۆی دەزانێت) وە فریشتەكانیش پۆل پۆل دێن ﴿٢٢﴾

﴿وَجِاْيٓءَ يَوْمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ﴾ وە لـەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێت(بۆ ساحەی مەحشـەر) ﴿يَوْمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ
ٱلْإِنسَٰنُ﴾ لـەو ڕۆژەدا ئینسـان(كردەوەی خـۆی) بیـر دەكەوێتـەوە ﴿وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ بـەڵام ئـەو
بیر كەوتنەوەیە چ سوودێك بەو دەگەیەنێت؟ ﴿٢٣﴾ ﴿يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي﴾ (ئەمجا بە داخەوە) دەڵێ
خۆزگـە لە دونیادا كاری چاكەم پێش بخستایە بۆ ئەم ژیانەم ﴿٢٤﴾ ﴿فَيَوْمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ﴾ ئەمجا
لەو ڕۆژەدا كەس سزای كەس نادات وەكو سزای خوا ﴿٢٥﴾ ﴿وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ﴾ وە كەس كەلەپچەی
كـەس ناكات وەكو كەلەپچە كردنی خوا (بۆ بێ بـاوەڕان) ﴿٢٦﴾ ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ﴾ (لەو ڕۆژەدا
بە خوا پەرست دەووترێت ) ئەی نەفسی بە ئارام ﴿٢٧﴾ ﴿ٱرْجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرْضِيَّةٗ﴾ بگەڕێرەوە بۆ لای
پەروەردگـاری خـۆت بە ڕەزامەندی و لێ ڕازی بوون ﴿٢٨﴾ ﴿فَٱدْخُلِي فِي عِبَٰدِي﴾ ئەمجا بچۆرە ناو بەندە
چاكەكانی من ﴿٢٩﴾ ﴿وَٱدْخُلِي جَنَّتِي﴾ و بچۆرە ناو بەهەشتی منەوە ﴿٣٠﴾

## سورەتی ﴿ ٱلْبَلَدِ ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾ سـوێند بـەم شـارە (كـە مەككەیـە) ﴿١﴾ ﴿وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾ وە تـۆ لـەو شـارەدا
نیشـتەجێی (كە ئازاردانی تۆی تێدا بڕیار دراوە) ﴿٢﴾ ﴿وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ﴾ وە سـوێند بە باوك (باوكە ئادەم)
وئـەوەی كە لێی كەوتۆتەوە ﴿٣﴾ ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاسـتی ئادەمیمان دروسـت
كـردووە هەمیشـە لەڕەنج وكێشـە ونارەحەتیدایـە ﴿٤﴾ ﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٞ﴾ ئایـا وا دەزانێ كە
كەس دەسـەڵاتی بەسـەریدا نی یە ﴿٥﴾ ﴿يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالٗا لُّبَدًا﴾ (بەفیزەوە) دەڵێ ماڵی زۆرم لەناو داوەو
بەخشیووە ﴿٦﴾ ﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ﴾ ئایا وا دەزانێ كە كەس نەیدیوە ﴿٧﴾ ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ﴾ ئایا دوو
چاومـان نەداوەتێ ﴿٨﴾ ﴿وَلِسَانٗا وَشَفَتَيْنِ﴾ وە زمانێك و دوو لێومان پێ نەداوە؟ ﴿٩﴾ ﴿وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ﴾
وە ڕێ ی چـاك و خراپمـان نیشـان نەداوە ﴿١٠﴾ ﴿فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ﴾ كەچی هێشـتا (زۆرێـك لە خەڵكی)
پەلامـاری پلـەی سـەختی نـەداوە ﴿١١﴾ ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ﴾ تۆ چوزانییـت پلەی سـەخت كامەیە ﴿١٢﴾
﴿فَكُّ رَقَبَةٍ﴾ ئازاد كردنی كۆیلەیە ﴿١٣﴾ ﴿أَوْ إِطْعَٰمٞ فِي يَوْمٖ ذِي مَسْغَبَةٖ﴾ و ناندانە لەڕۆژی گرانی و برسێتی دا ﴿١٤﴾
﴿يَتِيمٗا ذَا مَقْرَبَةٍ﴾ بەهەتیـوی خـزم ﴿١٥﴾ ﴿أَوْ مِسْكِينٗا ذَا مَتْرَبَةٖ﴾ یا بە هـەژاری خاكە سـەر (كەفتەكار) ﴿١٦﴾
﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ سـەرەڕای ئەمانـەش لەو كەسـانە بێ كـە بڕوایـان هێنابێ ﴿وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ﴾
وە ئامۆژگـاری یەكتریان كردبـێ بە ئارامگرتن ﴿وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْمَرْحَمَةِ﴾ و ئامۆژگاری یەكتریان كردبێ بە
بەزەیی و میهرەبانی ﴿١٧﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ﴾ ئەوانە هاوەڵانی دەستی ڕاستن ﴿١٨﴾

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ﴾ وە ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون بە موعجیزەو نیشانەکانی ئێمە ئەوانە هاوەڵانی
دەستی چەپن ﴿١٩﴾ ﴿عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌ﴾ دایگرتوون ئاگری دەرگا داخراو ﴿٢٠﴾

## سورەتی ﴿الشَّمْسِ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا﴾ سوێند بەخۆر و ڕووناکییەکەی ﴿١﴾ ﴿وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا﴾ وە سوێند بەمانگ کەدوا بەدوای
ئەو هەڵبێ ﴿٢﴾ ﴿وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا﴾ وە سوێند بە ڕۆژ کاتێ کەخۆر دەردەخات ﴿٣﴾ ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا﴾ وە
سوێند بەشەو کەخۆر دادەپۆشێ ﴿٤﴾ ﴿وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا﴾ وە سوێند بە ئاسمان و بەوەی دروستی کردووە ﴿٥﴾
﴿وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا﴾ وە سوێند بە زەوی و ئەوەی ڕای خستووە ﴿٦﴾ ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا﴾ وە سوێند بە نەفسی
ئادەمی و ئەو زاتەیشی کە ڕێك و پێك بەدیهێناوە ﴿٧﴾ ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ ئەمجا ڕێگای چەوت
وخراپ وچاك و خواپەرستیشی پیشاندا ﴿٨﴾ ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا﴾ (سوێند بە هەموو ئەوانە) بەڕاستی
ڕزگاری بوو ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پاك کردەوە ﴿٩﴾ ﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾ بێگومان نا ئومێد بوو
ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی(بە گوناە) وون و تاوانبار کرد ﴿١٠﴾ ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا﴾ بڕوای نەهێنا هۆزی
سەموود بەهۆی سەرکەشی یانەوە ﴿١١﴾ ﴿إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا﴾ کاتێك کە خراپترینیان هەستایەوە (بۆ سەربڕینی
حوشترەکە) ﴿١٢﴾ ﴿فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا﴾ ئەمجا پێغەمبەرەکەی خوا (صالح علیه السلام) پێ ی
ووتن: واز بهێنن لەم حوشتری خوایە و نۆرە ئاوەکەی ﴿١٣﴾ ﴿فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا﴾ کەچی بڕوایان پێ نەکردو
حوشترەکەیان سەر بڕی ﴿فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا﴾ ئەمجا پەروەردگاری ئەوان سزای ڕشت
بەسەریاندا بەهۆی گوناهەکانیانەوە و تەختی کردن ﴿١٤﴾ ﴿وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا﴾ وە(خوا) ناترسێ لە پاشەڕۆژی ئەم
(تۆڵە لێ سەندنەیان) ﴿١٥﴾

## سورەتی ﴿اللَّيْلِ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ﴾ سوێند بەشەو کاتێك کە(زەوی) دادەپۆشێ ﴿١﴾ ﴿وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ﴾ وە بەڕۆژ کاتێ کە ڕووناك
دەبێتەوە ﴿٢﴾ ﴿وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ﴾ وە بەو زاتەی کە نێرو مێ ی دروست کردوە ﴿٣﴾ ﴿إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ﴾ بەڕاستی
هەوڵ و کۆششی ئێوە جۆراو جۆرە ﴿٤﴾ ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ﴾ ئەمجا ئەو کەسەی(ماڵ) ببەخشێ و لەخوا
بترسێت و پارێزکاربێت ﴿٥﴾ ﴿وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ﴾ وە بڕوای ببێ بەوەی زۆرچاکە(لا اله الا الله یا بەهەشت) ﴿٦﴾
﴿فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ﴾ ئەوە بێگومان یارمەتی دەدەین بۆ ڕێ ی ئاسان (کە چاکەیە) ﴿٧﴾ ﴿وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ﴾ وە ئەو
کەسەی ڕژدی بکات (لەماڵ بەخشین) وخۆی بێ نیاز بزانێ (لە پاداشتی پەروەردگاری) ﴿٨﴾ ﴿وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ﴾
وە بڕوای نەبێ بەچاکە (کە لا اله الا الله یە یان بەهەشت) ﴿٩﴾

﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ﴾ ئـەوە بێگومـان ڕێ ی سـەختی بۆ ئاسـان دەکەین.(١٠) ﴿وَمَا يُغْنِى عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ﴾ وە سـەروەت و سـامانەکەی قازانجـی پێ ناگەیەنـێ کاتێك کە تیا دەچێ (١١) ﴿إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ﴾ بەڕاسـتی لەسـەر ئێمەیـە ڕێنموونـی (١٢) ﴿وَإِنَّ لَنَا لَلْءَاخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ﴾ وە هەردوو جیهان هـی ئێمەیە (١٣) ﴿فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ﴾ من ئێوەم ترسـاند بە ئاگرێکی بڵێسـەدار ( کە دۆزەخە) (١٤) ﴿لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى﴾ کەس ناچێتە نـاو دۆزەخـەوە خراپتریـن کەس نەبێـت (١٥) ﴿ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ ئەو کەسـەی کە بڕوای نەبێ و پشـتی هەڵکردبـێ (لـە ئایینـی ڕاسـت) (١٦) ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى﴾ وە لـێ ی دوور دەخرێتـەوە پارێزکارتریـن کـەس (١٧) ﴿ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ﴾ ئەوەی ماڵی خۆی دەبەخشـێ تـا (دڵ و دەرونی) پاك ببێتەوە (١٨) ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ﴾ لە کاتێکدا کەس چاکەیەکی وای بەسـەریەوە نی یە کەپاداشت بدرێتەوە (١٩) ﴿إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ تەنها مەبەسـتی ڕەزامەندی پەروەردگاری بـەرزو بڵندە (٢٠) ﴿وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ﴾ سوێند بەخوا(ئەو کەسەی وابێت) لەمەولا ڕازی دەبێ (بە پاداشتی دوا ڕۆژ) (٢١)

## سورەتی ﴿ ٱلضُّحَىٰ ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَٱلضُّحَىٰ﴾ سـوێند بـە چێشـتەنگاو (١) ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ﴾ وە سـوێند بەشـەو کاتێك کە ئـارام دەگرێ (بزرنگێتـەوە) (٢) ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾ پەروەردگـارت وازی لـێ نەهێناویت و لێـت دڵگیر نەبووە ( ئـەی موحوممـەد ﷺ) (٣) ﴿وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ﴾ وە(پاداشـتی) دوا ڕۆژ بۆتـۆ چاکتـرە لـە دونیـا (٤) ﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ﴾ سـوێند بەخـوا لەمـەولا پەروەردگـارت ئەوەنـدەت پـێ دەبەخشـێ کـە ڕازی ببیت (٥) ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ﴾ ئایا تۆی نەدیی بەهەتیـووی وحەواندیتیەوە (٦) ﴿وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ﴾ وە تـۆی نەدیـی بەسـەر لـێ شـێواوی وڕێنموونـی کردییـت (٧) ﴿وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ﴾ وە ئایـا تـۆی نەدیـی بەهـەژاری ودەوڵەمەنـدی کردیـت (٨) ﴿فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ﴾ کەواتە (تۆش) هەتیوو مەچەوسـێنەرەوە (٩) ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ﴾ وە هەڵمەشـاخێ بە پرسـیارکەر (هەژارو سـواڵکەر) دا (١٠) ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ وە نیعمەت و بەخششـی پەروەردگارت دەربخە (بەیارمەتیدانی هەژاران) (١١)

## سورەتی ﴿ ٱلشَّرْحِ ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾ ئایا سـنگمان بۆ ئاسـوودەو گوشـاد نەکردییت (١) ﴿وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ﴾ وە داممان گرت لێت ئەو بارە گرانەی (٢)

﴿ٱلَّذِيٓ أَنقَضَ ظَهۡرَكَ﴾ کـە پشـتی زۆر قـورس کردبوویـت ﴿٣﴾ ﴿وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ﴾ وە نـاوو ناوبانگتمـان
بـۆ بـەرز کردییتەوە ﴿٤﴾ ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا﴾ بەڕاسـتی لەگـەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشـی و ئاسـانی
دێـت ﴿٥﴾ ﴿إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا﴾ بێگومـان لەگـەڵ هەمـوو تەنگانەیەکـدا خۆشـی و ئاسـانی دێـت ﴿٦﴾
﴿فَإِذَا فَرَغۡتَ فَٱنصَبۡ﴾ ئەمجـا کە لەکارێـك بوویتەوە، خۆت ماندوو بکە (بـە کارێکی تری چاکەوە) ﴿٧﴾
﴿وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرۡغَب﴾ وە هەر لە پەروەردگارت بپاڕێرەوە (بۆ کارەکانت) ﴿٨﴾

## سورەتی ﴿ٱلتِّينِ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ﴾ سـوێند بـە هەنجیـرو زەیتـون ﴿١﴾ ﴿وَطُورِ سِينِينَ﴾ وە سـوێند بـە طـووری سـینا ﴿٢﴾
﴿وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ﴾ وە بـەم شـاری ئارام و بـێ ترسـە(کە مەککەیە) ﴿٣﴾ ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ﴾
سـوێند بەخوا بەڕاسـتی مرۆڤمان دروسـت کـرد لـە جوانترین شـێوەدا ﴿٤﴾ ﴿ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ﴾ لە
پاشان(ئەگەر بێ باوەڕبێ) دەیکەین بە پەست ترینی هەموو پەستێك ﴿٥﴾ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾
جگـە لەوانەی کە بڕوایـان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کـردووە ﴿فَلَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ﴾ بۆ ئەوان هەیە
پاداشـتی نەبـڕاوە ﴿٦﴾ ﴿فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعۡدُ بِٱلدِّينِ﴾ جـا ئیتـر چی بـێ بـاوەڕت دەکات بـە ڕۆژی دوایی ﴿٧﴾
﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ﴾ ئایا خوا فەرمان ڕەواترینی هەموو فەرمان ڕەواکان نییە ؟ ﴿٨﴾

## سورەتی ﴿ٱلۡعَلَقِ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بخوێنـە بـە نـاوی پەروەردگارتـەوە کـە هەمـوو
شـتێکی دروسـت کردووە ﴿١﴾ ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ﴾ مرۆڤی دروسـت کردوە لە خوێنێکی بەستوو ﴿٢﴾
﴿ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ﴾ بخوێنە،پەروەردگاری تۆ(لە هەموو کەس) بەخشندەترە ﴿٣﴾ ﴿ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ﴾
ئەوەی کە(مرۆڤی) فێر(ی نووسین) کردووە بەقەڵەم ﴿٤﴾ ﴿عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ﴾ مرۆڤی شارەزا کردووە
بەو شـتانەی کە نەی دەزانی ﴿٥﴾ ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ﴾ نا (وانیە ) بەڕاسـتی مرۆڤ یاخی دەبێت ﴿٦﴾
﴿أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ﴾ کـە خـۆی ببینـێ وادەوڵەمەند بـووە ﴿٧﴾ ﴿إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ﴾ بێگومـان هەر بۆ لای
پەروەردگاری تۆیە گەڕانەوە ﴿٨﴾ ﴿أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ﴾ ئایا بینیت ئەو کەسـەی کە جڵەوگیریی ئەکات
﴿٩﴾ ﴿عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ﴾ لـە بەندەیەك کەنوێژ بکات ؟ ﴿١٠﴾ ﴿أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ﴾ ئایا پێم بڵێ ئەگەر(ئەو
کەسە) لەسەر ڕێی ڕاست بووایە ﴿١١﴾ ﴿أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ﴾ یان فەرمانی بدایە بەپارێزکاریی ولەخوداترسان
(باشتر نەبوو) ﴿١٢﴾

﴿أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ ئایا بینیت ئەگەر بڕوای (بە ئایینی ڕاست) نەبێت و پشتی لێ هەڵکات (ڕزگاری
دەبێ) ﴿١٣﴾ ﴿أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ﴾ ئایا نەی زانیوە کەخوا دەی بینێ ﴿١٤﴾ ﴿كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ﴾
وا نییە (کە بیری لێ دەکاتەوە) بە ڕاستی ئەگەر واز نەهێنێ ڕای دەکێشین (بە قژی) پێشەسەری ﴿١٥﴾
﴿نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ﴾ پێشەسەرێکی درۆزنی بە هەڵەدا چوو ﴿١٦﴾ ﴿فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ﴾ ئەمجا با ئەو بانگی
هاوڕێکانی خۆی بکات ﴿١٧﴾ ﴿سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ﴾ ئێمەش بانگی فریشتەی زەبر بە دەست دەکەین ﴿١٨﴾
﴿كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ۩﴾ نەخێر، بە گوێ ی (ئەو کەسانە) مەکە، وە کوڕنوش بەرەو (لەخوا)
نزیك بکەوەرەوە ﴿١٩﴾

## سورەتی ﴿ ٱلْقَدْرِ ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ﴾ بێگومان ئێمە قورئانمان ناردە خوارەوە لەشەوی بەفەڕو بەڕێزدا ﴿١﴾
﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ﴾ تۆ چوزانییت کە شەوی بەفەڕو ڕێز چی یە ﴿٢﴾ ﴿لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾
شەوی بەفەڕو ڕێز چاکترە لە (خێری) هەزار مانگ ﴿٣﴾ ﴿تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا﴾ لەو شەوەدا فریشتە
و جیبریلیش لە ناویاندا دێنە خوارەوە ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ﴾ بەفەرمانی پەروەردگاریان لەهەموو
کاروبارێکدا ﴿٤﴾ ﴿سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ﴾ ئەو شەوە (کاتی) هێمنی و ئاشتیی دەبێ تا هەڵاتنی
سپێدەی بەیان ﴿٥﴾

## سورەتی ﴿ ٱلْبَيِّنَةِ ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون ﴿مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ لە خاوەن نامە و ﴿وَٱلْمُشْرِكِينَ﴾ بت
پەرستان ﴿مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ﴾ دەستیان هەڵنەگرت (لەو بێ بڕوایی یە) تا نیشانە ڕوونەکەیان بۆ
هات ﴿١﴾ ﴿رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً﴾ (کە ئەویش) پێغەمبەرێکە لە خواوە چەند پەڕەیەکی پاکیان
(بەسەردا) دەخوێنێتەوە ﴿٢﴾ ﴿فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ﴾ کە تێیاندایە چەند نوسراو (سورەت) یکی بەنرخ ﴿٣﴾
﴿وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ﴾ وە جیانەبوونەوە ئەوانەی کە پەیامیان بۆ هاتبوو ﴿إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ﴾
دوای ئەوە نەبێ کە نیشانە ڕوونەکەیان بۆ هات (کە پێغەمبەری ئیسلامە) ﴿٤﴾ ﴿وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟
ٱللَّهَ﴾ (لەگەڵ ئەوەشدا) کە فەرمانیان پێ نەدرا بوو مەگەر بەوەی کە پەرستشی خوا بکەن
﴿مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ﴾ بەدڵسۆزی ملکەچی بۆ بکەن و خۆیان بە دوور بگرن لە هەموو بیرو
باوەڕێکی خوارو خێچ ﴿وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن ﴿وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ﴾
وە ئەمەیە ئایینی ڕاست ﴿٥﴾

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ﴾ بێگومان ئەوانەی کە بێ بڕوابوون لە خاوەن پەیام و بت
پەرستەکان ﴿فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ لە ئاگری دۆزەخدان، تێیدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی ﴿أُولَٰئِكَ هُمْ
شَرُّ الْبَرِيَّةِ﴾ ئا ئەوانە خراپترینی هەموو دروست کراوێکن ﴿٦﴾ ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾
بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێناو کردەوە چاکەکانیان کرد ﴿أُولَٰئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ﴾ ئا ئەوانە چاکترینی
هەموو دروستکراوێکن ﴿٧﴾ ﴿جَزَاؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ﴾ پاداشتی ئەوان لای پەروەردگاریان
بەهەشتانێکە جێ ی دانیشتن و مانەوەی هەمیشەیی یە ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ رووبارەکان بەژێریاندا
دەڕوات ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ﴾ تێیدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی، خوایش لێیان ڕازی بووە ﴿وَرَضُوا
عَنْهُ﴾ وە ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون ﴿ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ﴾ ئەمە بۆ کەسێکە کەلە خوا بترسێ ﴿٨﴾

## سورەتی ﴿الزَّلْزَلَة﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾ کاتێك زەوی هاتە لەرزە بەلەرزینی خۆی ﴿١﴾ ﴿وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾
وە زەوی هەرچی شتی قورس و گرانی(ناوی) هەیە هەمووی فڕێ دایە دەرەوە ﴿٢﴾ ﴿وَقَالَ الْإِنسَانُ مَا لَهَا﴾
وە مرۆڤ لەو ڕۆژەدا دەڵێ: ئەوە زەوی چی یەتی ؟ ﴿٣﴾ ﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾ لەو ڕۆژەدا(زەوی)
دەنگ و باسی خۆی دەگێڕێتەوە ﴿٤﴾ ﴿بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا﴾ کە پەروەردگاری تۆ (وای) وەحی بۆ کردوە
﴿٥﴾ ﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا﴾ لەو ڕۆژەدا خەڵکی دەردەچن بەپەرەگەندە و پەشێوی ﴿لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ﴾
تا(پاداشتی) کردەوەی خۆیان نیشان بدرێ ﴿٦﴾ ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ﴾ ئەمجا هەرکەسێك بە
ئەندازەی هەرە وردیلەیەك چاکەی کردبێ دەیبینێتەوە ﴿٧﴾ ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ وە هەر
کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك خراپەی کردبێ دەی بینێتەوە ﴿٨﴾

## سورەتی ﴿الْعَادِيَات﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
﴿وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحًا﴾ سوێند بە ئەسپانی تاودەر(کە دەپڕمێنن) چۆن پڕمەیەك (لەکاتی غەزاکردندا) ﴿١﴾
﴿فَالْمُورِيَاتِ قَدْحًا﴾ وە سوێند بە ئاگر هەڵگیرسێنەران لەبەرد بەناڵی سمیان ﴿٢﴾ ﴿فَالْمُغِيرَاتِ صُبْحًا﴾
وە سوێند بە (ئەسپانی) هێرش بەران لە بەیانیاندا ﴿٣﴾ ﴿فَأَثَرْنَ بِهِ نَقْعًا﴾ کە بەوە تەپ و تۆز هەڵدەستێنن ﴿٤﴾
﴿فَوَسَطْنَ بِهِ جَمْعًا﴾ وە بەو تەپ و تۆزەوە، خۆیان دەکەن بە ناوەڕاستی کۆمەڵی دوژمندا ﴿٥﴾

﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لِرَبِّهِ لَكَنُودٌ﴾ بەڕاستی مرۆڤ بۆ پەروەردگاری نا سوپاسە ﴿٦﴾ ﴿وَإِنَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ﴾ وە
بێگومان خۆی لەسەر ئەم ناسوپاسی یە شایەتە ﴿٧﴾ ﴿وَإِنَّهُ لِحُبِّ الْخَيْرِ لَشَدِيدٌ﴾ وە بەڕاستی مرۆڤ بۆ
خۆشەویستی ماڵی دونیا زۆر بەگیرە ﴿٨﴾ ﴿أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ﴾ دەی ئایا نازانی کاتێك کە
مردووی ناو گۆڕەکان زیندوو کرانەوە و(هێنرانە دەرەوە) ﴿٩﴾ ﴿وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ﴾ وە ئاشکرا بوو
هەرچی ڕازی ناو دڵانە ﴿١٠﴾ ﴿إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ﴾ بێگومان پەروەردگاریان لەو ڕۆژەدا ئاگادارە
بە کردەوەیان ﴿١١﴾

## سورەتی ﴿ الْقَارِعَةِ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الْقَارِعَةُ﴾ ڕۆژی داچڵەکێنەر (ناوە بۆ ڕۆژی قیامەت) ﴿١﴾ ﴿مَا الْقَارِعَةُ﴾ ئاخۆ چۆن بێ ئەو ڕۆژە؟
﴿٢﴾ ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ﴾ تۆ چوزانییت ئەو ڕۆژە چی یە ﴿٣﴾ ﴿يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ﴾
ڕۆژێکە خەڵکی وەك پەپولەی پەراگەندە بڵاودەبنەوە ﴿٤﴾ ﴿وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ﴾
وە شاخەکان وەك خوری شیکراویان لێ دێت ﴿٥﴾ ﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ﴾ ئەمجا ئەوەی
کێشی(چاکەکانی) قورس و گران بێ ﴿٦﴾ ﴿فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ﴾ ئەوە ئەو کەسە لە گوزەرانێکی
پەسەندا ئەبێ ﴿٧﴾ ﴿وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ﴾ وە ئەوەی کێشی (چاکەکانی) سووك بێ ﴿٨﴾ ﴿فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ﴾
ئەوە جێ ی ئەو (هاویە) یە ﴿٩﴾ ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ﴾ تۆ چوزانییت (هاویە) چی یە ﴿١٠﴾ ﴿نَارٌ
حَامِيَةٌ﴾ ئاگرێکی هەڵگیرساوە ﴿١١﴾

## سورەتی ﴿ التَّكَاثُرِ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ﴾ ئێوەی بێ ئاگا کردووە شانازیتان بە زۆریی سەروەت و سامانەوە ﴿١﴾ ﴿حَتَّىٰ زُرْتُمُ
الْمَقَابِرَ﴾ تا دەمرن و دەچن بۆ گۆڕستان ﴿٢﴾ ﴿كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ وامەکەن ! لەمەولا دەزانن ﴿٣﴾ ﴿ثُمَّ
كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ دووبارە وامەکەن لەمەولا دەزانن ﴿٤﴾ ﴿كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ﴾ وانی یە (وەکو خۆتان
دەیزانن) ئەگەر(ئەنجامی خۆتان) بزانیایە بەدڵنیایی یەوە (وا بێ ئاگا نەئەبوون) ﴿٥﴾ ﴿لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ﴾
سوێند بەخوا بێگومان دۆزەخ دەبینن ﴿٦﴾ ﴿ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ﴾ دووبارە سوێند بەخوا دڵنیا بن
بە چاوی ڕاستەقینە دەی بینن ﴿٧﴾ ﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾ لە پاشان سوێند بەخوا لەو ڕۆژەدا (لەسەر
هەموو ناز ونیعمەتێك کە خوا پێی دابوون لەدونیادا) لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکرێت ﴿٨﴾

## سورەتی ﴿ الْعَصْرِ ﴾

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَالْعَصْرِ﴾ سوێند بەکات ﴿١﴾ ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ﴾ بێگومان هەموو خەڵکی لە زیاندان ﴿٢﴾
﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ جگە لەوانەی کە بڕوایان هێنابێت و ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ کردەوە چاکەکانیان
کردبێت ﴿وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ﴾ وە ئامۆژگاریی یەکتریان کردبێ بە ئایینی ڕاست (ودەست پێوەگرتنی
وکارکردن بەفەرمانەکانی خودا) ﴿وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێت بە ئارامگرتن
(لەسەر پەرستن وبەندایەتی خودا) ﴿٣﴾

## سورەتی ﴿ الْهُمَزَةِ ﴾

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ﴾ سزاو لەناوچوون بۆ هەموو نەنگ گرێکی بەدگۆ (عەیب گرێکی
تانە دەر) ﴿١﴾ ﴿الَّذِي جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ﴾ ئەوەی کە هەرماڵ و سامان کۆ دەکاتەوەو دەیژمێرێ ﴿٢﴾
﴿يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ﴾ وا دەزانێ کە ماڵەکەی هەر دەیهێڵێتەوە ﴿٣﴾ ﴿كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ﴾ نەخێر
وانی یە، بێگومان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرێکی تێکشکێنەرەوە ﴿٤﴾ ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ﴾ تۆ چووزانیت
ئەو ئاگرە چی یە ﴿٥﴾ ﴿نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ﴾ ئاگرێکی تاودراوی خوایی یە ﴿٦﴾ ﴿الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ﴾ کە
دێ بەسەر دڵاندا (هوروژم دەباتە سەر دڵان) ﴿٧﴾ ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ﴾ بێگومان ئەو ئاگرە داخراوە
لەسەریان (و دەرچوونیان نی یە) ﴿٨﴾ ﴿فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ﴾ (زنجیر کراون) لەناو چەند کۆتێکی ڕاکشاودا
(بەستراونەتەوە بەچەند ستونێکی بەرزو بڵندەوە) ﴿٩﴾

## سورەتی ﴿ الْفِيلِ ﴾

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ﴾ ئایا نەت بینی کە پەروەردگارت چی کرد بە خاوەن فیلەکان
(بە ئەبرەهە ولەشکرەکەی کە وویستی کەعبەی پیرۆز بڕوخێنێت)؟ ﴿١﴾ ﴿أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي
تَضْلِيلٍ﴾ ئایا فڕوفێڵەکەیانی پوچەڵ نەکردەوە ﴿٢﴾ ﴿وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ﴾ وە ناردیە سەریان باڵندەی
زۆر پۆل پۆل ﴿٣﴾ ﴿تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ﴾ بەرد بارانیان دەکردن بە ووردە زیخی گڵین ﴿٤﴾ ﴿فَجَعَلَهُمْ
كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ﴾ سەرئەنجام (لەشکرەکەی ئەبرەهەی) وەك كای خوراو لێ کرد ﴿٥﴾

